Farhan kurdi

5 PHILOSOPHY & SCIENCE
زنجیرەی فەلسەفە و زانست

# خورافەی ئیلحاد

دکتۆر عەمر شەریف



وەرگێڕانی : حمزە فەرەج عەولاقەسرێ
پێداچونەوەی: د. جەعفەر گوانی

# خورافەی ئیلحاد

نووسینی: دکتۆر عەمر شەریف، مزەفەر عەولا قەسرێی(وەرگێڕ)



چاپی یەکەم ٢٠١٨ز- ١٤٣٩ك



**نوسینگەی تەفسیر**

بۆچاپ و بڵاوکردنەوە

هەولێر- شەقامی 30 مەتری تەنیشت منارەی چۆلی

+964 750 818 08 66

www.al-tafseer.com

tafseeroffice@yahoo.com

/TafseerOffice

ئامادەکردنی پێڕست - نوسینگەی تەفسیر

قەسرێی، مزەفەر عەولا

خورافەی ئیلحاد، دکتۆر عەمر شەریف(نووسەر)، مزەفەر عەولا قەسرێی (وەرگێڕ)،

٨٢٤ لاپەڕە،

١٧* ٢٤ سم،

بابەت، ئایینی، زانستی، فەلسەفی

ISBN: 978-9933-593-65-0

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان

هەرێمی کوردستان ژمارە سپاردنی (٣٠٤) ی ساڵی ٢٠١٧ پێدراوە.

"بیروبۆچونی ئەم کتێبە، مەرج نیە هەمان بیرو بۆچونی نوسینگەی تەفسیر بێ"

خەتی بەرگ :نەوزاد کۆیی

دیزاین: زەردەشت کاوانی

# خورافەی ئیلحاد

دکتۆر عەمر شەریف

وەرگێڕانی
مزەفەر عەبدولا قەسری

پێداچوونەوەی
د. جەعفەر گوانی

## دەروازە...

تەوەری یەکێك لە وانەکانم دەربارەی بێباوەڕیی (الإلحاد) بوو، لە پێناسەکەیدا گوتم: بێباوەڕیی بە سادەیی بریتییە: لە نکوولیکردن لە بوونی خودا..

پاشان گوتم: مێژووی مرۆڤایەتی شەپۆلێکی بێباوەڕیی وا بەهێزی بەخۆیەوە نەبینیوە وەك ئەوەی لەسایەی ژیارستانیەتی ماددی هاوچەرخدا بینیویەتی. هەروەك چۆن وڵاتانی ئێمە لە دەیەکانی کۆتایی نەبێت بێباوەڕییان تێدا نەبووە، بە تایبەت دوای ئەو ڕووداوانەی ناوی (بەهاری عەرەبی)یان لێندرا.

بەردەوام بووم و جۆرەکانی بێباوەڕیی، پاشخانە مێژوویەکەی، بەڵگەکانی بێباوەڕان و چۆنییەتی بەرپەرچدانەوەیانم شیدەکردەوە..

لەکاتی وانەکەمداپرسیارێکم لە ئامادەبووان کرد: کێ لە ئێوە کەسێکی بێباوەڕ لە بازنەی ژیانیدا هەیە؛ خۆی، یان دراوسێیەکی، یان هاوپۆل و هاوکاری، یان هاوڕێی، یان کەسێکی نزیکی هاوڕێکەی، یان. یان. ژمارەیەکی کەم لە گەنجان دەستیان بەرزکردەوە.

دوای وانەکە ژمارەیەك لە کەسە بەتەمەنەکان (مسوڵمان و مەسیحی) هاتنە لام و پێیان گوتم: ئەو پرسانەی تۆ ووروژاندنت زیاتر بێباوەڕان دەیانکەن؛ وەك بۆچی سزاو ئازار لەدنیادا هەیە؟ و بنچینەی مرۆڤ چییە؟ و کێ خودای

دروستکردووە؟.. کە هەرگیز بە بیری ئێمەدانەهاتوون، سوپاس بۆ خودا ئێمە باوەڕدارین و هیچ گومانێکمان بەبیردا نایەت.

ئەم دوو هەڵوێستە پەیامێکی گرنگیان هەڵگرتووە؛ ئەویش ئەوەیە کە بێباوەڕیی ئەگەرچیلەولاتەکانماندا و لە نێو گەنجاندا سەری دەرهێناوە، بەڵام لە بەرامبەردا کەسە پێگەیشتووەکاندڵیان پڕە لە باوەڕ و لە دەرەوەی بازنەی گومان و دڵەڕاوکێدا دەژین.

## ئەم کتێبە بۆچی؟

لە کاتێکدا کە پڕۆژە فیکرییەکەم لە سەر پەیوەندی نێوان زانست و فەلسەفە و ئایینە، ئامانجم نوێکردنەوەی فیکری زانستی و نوێسازییەلە فیکری ئایینیی، بۆیە سروشتییە کە کتێبەکانی ترم باسی بێباوەڕییان تێدا بێت.

داواکاری زۆرم پێگەیشتن تا کتێبێکی گشتگیر بنووسم دەربارەی بێباوەڕیی، لە جوانترین ئەو داواکاریانەش داواکاری بەڕێز دکتۆر موحەممەد ئەلعیوەزی ڕاگەیاندنکاری گەورەی کوێتی بوو، کە بە تەنیا بە هاندان بۆ چاپکردنی کتێبەکەوازی نەهێنا،بەڵکو بەردەوام سەرچاوەی بۆ دەهێنام و هەر لە سەرەتاوە تا ناردنی کتێبەکە بۆ چاپ هەمیشە پێشنیاری بۆ دەکردم، هەروەها هۆکارێکی تریش کە پاڵنەرم بوو بۆ بە دەنگەوە چوونی ئەو داواکارییانە زیادبوونی ژمارەی بێباوەڕانی وڵاتی ئێمە بوو لەمساڵانەی دواییدا، تا ئاستێك کە بە نزیککراوەیی هەفتانە گەنجێکی بێباوەڕ دەبینم، کە کەسێك یان لایەنێك بۆ دیبەیتکردن و وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی دەینێرنە لام.

لەماوەی ساڵی ڕابردوودا هەستم بەوە کرد کە پێویستەپرسی بێباوەڕیی لە سەرووی پڕۆژە فکرییەکانمەوە بێت. بۆیە بە دەنگ بانگەوازی بیرمەندی گەورەی ئیسلامی (د.محمد عمارە)وە چووم بۆ دانانی کتێبێك لە سەر بێباوەڕیی کە بۆ ئەوە بشێت وەك دیاری هاوپێچی گۆڤاری ئەزهەر گونجاو بێت

و، لەگەڵ ژمارەی موحەڕڕەمی ١٤٣٥ کۆچی لەکەڵ گۆڤارەکەدا بەناونیشانی (وهم الالحاد) دەرچوو. بەهەمان شێوە بابەتی وتارە هەفتانەکەم لە ڕۆژنامەی (أخبار اليوم) بە ناوونیشانی (في بيتنا ملحد) دەنووسی، کۆڕ و سیمینارەکانم لە زانکۆکان و ناوەندە جیاوازەکاندا لەسەر هەمان بابەت بوون.

لە کۆتایشدا ئەم کتێبەی بەردەستت دێت، کە زۆر بە وردیی و درێژیی پرسەکە بە شێوەیەکی قوڵ و بنچینەیی دەخاتە ڕوو.

ئەم کتێبە لە ڕێی دوو پرۆژەی فیکری زۆر گرنگ و هەستیار لە وڕێنەی بێباوەڕیی دەکۆڵێتەوە، ئەوانیش:

١- نوێکردنەوەی هزری زانستی؛ بە جۆرێك زانایان بزانن کە هیچ تێکگیرانێك لە نێوان زانست و ئاییندا نییە، تەنانەت گونجانێکی زۆریش لە نێوانیاندا هەیە. سەرچاوەکەیشی ئەوەیە کە زانستی نوێ لە ئایینەوە سەرچاوە دەگرێت.

هەروەها ئەوەش بزانن کە گەیشتن بە میکانیزمەکانی دیاردە زانستییەکان لەگەڵبوونی ئامانجێك لە پشتیانەوە تێکناگیرێت. بەمەش لە کۆتایی ڕێگادا زانست دەمانگەیەنێتە ئەوەی کە دان بە بوونی خودای بەدیهێنەری بوون و بەڕێوەبەر و پارێزەریدا بنێین[1].

٢- نوێکردنەوەی هزری ئایینی؛ بە جۆرێك کە گوتارێکی ئایینی وا بێنێتە کایەوە کە هۆکارێکی سەرنجڕاکێشان بێت، دوای ئەوەی گوتاری باو هۆکارێکی دوورخەرەوە بووە لە بازنەی باوەڕدا.

وەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: خودا لە سەرووی هەموو سەد ساڵێك کەسێك لەم ئوممەتەدا دەنێرێت کە ئایینەکەی بۆ نوێ بکاتەوە.[2]

---

(١) ئەم جۆرە خستنەڕووە شتێکی نوێ نییە، گەورە زانایانی دوای شۆڕشی هاوچەرخی زانست، وەك ئیسحاق نیوتن و ماکسوێل و فۆلتا و ئەنیشتاین و ماکس بلانك و چەندانی دی باوەڕیان وابووە.

(٢) ئەم فەرموودەیە یەکێکە لە فەرموودە سەحیحە بەناوبانگەکان کە هاوەڵی بەڕێز (ابو هريرە) گێڕاویەتەوە. رواه داوود، صححه السخاوي و الحاكم و البيهقي و ابن حجر و الالباني.

ئەم دوو پرۆژەیە نوێیەش لەگەڵ ڕێبازی ڕەسەنی ئیسلامیی لە بانگەوازەکەدا یەکدەگرن کە لەگەڵ ئەم سەردەمەدا و بەڵێنی خودا بڕوات:

﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ﴾ فصلت: ٥٣

واتە: بەڵگەکانمانیان نیشان دەدەین لە ئاسۆکاندا و لە دەروونیاندا، تا ئەوکاتەی بۆیان دەردەکەوێت کە ئەم ڕێبازە حەقە.

واتە: سەرەڕای چارەسەرکردنی ئەفسانەی بێباوەڕیی، کتێبەکە بانگەوازێکە بۆ ئەوەی فێری خوێندنەوەی کتێبی بینراوی خودا (ئاسۆکان و دەروونەکان) ببین، هەروەك چۆن کتێبی خوێنراوی خودا (قورئانی پیرۆز) دەخوێنینەوە و، لە هەردووکیان بەڵگەی بوونی خودا دەربێنین. هەروەها بانگەوازێکیشە بۆ قەبوڵ کردنی ئەو هەوڵانەی بۆ نوێکردنەوەی ئایین لە ئارادان، ئەگەرنا لافاوی ماددیگەرایی ڕەحممان پێناکات.

ئەو کەسەی بەرەنگاری ئەم هەڵمەتە دەبێتەوە، هەروەك گوتراوە وەك ئەوە وایە خۆی بخاتە نێو دوویەردەکەی دەستاڕ یان نێوان چەکوش و سندانەوە! چونکە هەوڵەکانی نوێکردنەوەی هزری زانستیی زانایانی ماددیگەرا و هاوڕێنەکانیان ڕازی ناکات، هەروەك چۆن هەوڵەکانی نوێکردنەوەی هزری ئایینی زۆربەی زانایانی پێشینخواز و هاوڕێنەکانیان ڕازی ناکات.

نموونەی ئەوەش ئەو هێرشەی کە کرایە سەرمن لە سەر نووسین لەبارەیچەمکی (پەرەسەندنی ئامانجداری زیندەوەران) کە لەگەڵ زانستدا دێتەوە بەڵام دیندارە پێشینخوازەکان ڕەتیدەکەنەوە، هەروەها لەگەڵ ئایینیشدا دێتەوە بەوەی کە خودا بەدیهێنەرەو لەڕێی میکانیزمی پەرەسەندنەوە ئەوەی کردووە، داروینیزمەکان و دیندارە پێشینخوازەکانیش ئەمە ڕەتدەکەنەوە[1].

---

(١) ئەم بابەتە لە تەوەری شەشەمدا بە درێژی باس دەکەین.

## مەنهەجی کتێبەکە

لەسەرەتادا وا بڕیاربوو کتێبەکە وەك بەرپەرچدانەوەیەك بێت بۆ ڕاو بۆچوونی گەورە بێباوەڕانی ڕۆژئاوا، بەتایبەتی ریچارد دۆوکنز، بەوپێیەی کە بێباوەڕانی وڵاتانی ئێمە پشت بە بۆچوونەکانی ئەوان دەبەستن. داوتر هەستم کرد کە ئەوە وەك ئەوە وایە ماسییەك بدەیتە هەژارێکی برسی! لە کاتێکدا وا باشترە فێری راوەماسیی بکەین.

لەبەر ئەوە وام بە باشتر زانی، کە کتێبەکە بەجۆرێك بابەتەکە بتوێژێتەوە وەك ئەوەی ئێمەی پزیشکان لەگەڵ نەخۆشێکدا دەیکەین؛ خستنەڕووی هۆکارەکانی نەخۆشییەکە، مێژووی سەرهەڵدانی، دۆزینەوەی، کاریگەریی و نیشانەکانی، تەشەنەکردنی، خۆ لێپاراستنی، بەم شێوەیە سەرکەوتنێکی گەورەتر بەدەستدێنین بۆ ریشەکێشکردنی نەخۆشییەکە.

گومانیش لەوەدا نییە کە ئەم جۆرە خستنەڕووە بەرگرییەکی بەهێزتر بەخوێنەر دەبەخشێت بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی گومانەکانی دەروون و توانایەکی گەورەتر دەدات بۆ بەرەنگاربوونەوەی گومانە بێباوەڕییەکان.

هەندێك لەوانەی گرنگی بە نووسینەکانم دەدەن لێیان پرسیم: دەبینین هەندێك بیرۆکە یان بابەت یان باسێك یان زیاتر لە کتێبەکانتدا دووبارە دەکەیتەوە، ئایا ئەمە زیان بە سەربەخۆیی هەر کتێبێك ناگەیەنێت؟

پێم گوتن:

ئەو نووسەرەی لە چەند بوارێکی جیاجیا دەنووسێت دەتوانێت بۆ هەر بوارێك کتێبێکی تایبەت تەرخان بکات، بەبێ ئەوەی بیرۆکە و بابەتەکانی دووبارە بکاتەوە، بەڵام کەسێك (بە درێژایی تەمەن خاوەنی پرۆژەیەکی فیکری) بێت، ئەوا پرۆژەکەی لە چەند گۆشە و لایەنێکی جیاوازەوە دەخاتەڕوو بۆ ئەوەی وێنەیەکی تەواوەتیی و گشتگیر بخاتەڕوو، لەکاتی بوونی تەنها یەك پرۆژەدا تێکەڵی و دووبارەکردنەوەی بیرۆکە و بابەتەکان ناچارییە. ئەمە لە نووسینەکانی مامۆستاکانمان (د.مصطفى محمود) و (د. عبد الوهاب المسيري)یشدا بەڕوونی بەدی دەکرێت.

خوێنەری بەڕێز: بۆیە ئەوەت لە سەرەتاوە پێدەڵێم، چونکە لەم کتێبەی بەردەستت چەند بیرۆکە و بابەتی دووبارەی تێدایە، کە لە کتێبەکانی ترمدا نووسیومە، بۆیە داواکارم بمبووری.

## ئەم کتێبە بۆ کێیە...

لەبەرهەمی کۆتایی کتێبەکەمدا (گەشتی عەقڵ)[1] نووسیومە، کە کتێبەکە لەگەڵ پێنج جۆر عەقڵدا گفتوگۆ دەکات، بێگومان تۆی خوێنەریش یەکێکی لەو پێنج جۆرە:

١- دیندارێك کە دەیەوێت ئاستی باوەڕەکەی بەرزبکاتەوە، لە باوەڕی سەر ناسنامەو لەدایکبوونەوە بۆ باوەڕی دڵنیایی، تا دڵی پڕ ببێت لە هەستکردن بەوەی، کە خودا حەقە:

﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْـَٔافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ﴾ فصلت: ٥٣

لەوانەیە بەم کارە مرۆڤ لە پلەی لەخواترسانیش نزیکبێتەوە:

﴿ إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُا۟ ﴾ فاطر: ٢٨

٢- دیندارێك کە حەقیقەتی مرۆڤی لەلا ونە، وەك بوونەوەرێکی تەواو و گشتگیر پێکهاتووە لە لاشە و لایەنی نامادی (ڕۆح - نەفس - عەقڵ).

---

(١) کتێبی (گەشتی عەقڵ) نووسینی هەمان نووسەر و وەرگێڕانی هەمان وەرگێڕی ئەم کتێبەیە و لە نووسینگەی تەفسیر چاپ کراوە و بڵاوکراوەتەوە.

لێرەشەوە بە دیدێکی کوێرانە دەڕوانێتە مرۆڤ، جگە لە مادیاتێکی پوچ، یان ڕەوحانیەتێکی دوور لە واقیع هیچی تری لێ نابینێت.

٣- دیندارێك وایدەبینێت ئەو تێگەیشتنەی ئەو بۆئایین کە لەسەری پەروەردە بووە ((تەواوی تەواوە))!، بۆیە عەقڵ و زانستی لە شوێنی خۆی دانەناون بۆ پشپێبەستن لە دامەزراوەی باوەڕ، بەمەش زۆر شتی لێ ونبووە، بگرە زۆرێك لەوەی وەدەستی هێناوە لێی ون بووە، لەوانەیە ئەمە وای لێکردبێت بووبێتە یەکێك لەو کۆمەڵانەی دوای ئەمە.

٤- دیندارێك کە سەرسامە بە قسە (گەورەکانی) بێباوەڕان دەربارەی ڕۆڵی زانست لە دووپاتکردنەوەی چەمکەکانی بێباوەڕی، تەنانەت ئەو قسانەش کە گوتیان: ((خودا وەهمێکی گەورەیە و، ئایین تلیاکی گەلانە))؛ بۆیە لە دەروونیدا هەستبە کەم و کورتی بەهۆی ئەومیسەر بەو کۆمەڵە دواکەوتووەی (دیندارەکان)، لەجیاتی ئەوەی هەست بە شانازی بکات.

٥- بێباوەڕێك یان گوماندرائێك برماڵی زانستی بەخۆی داداوە، چ لە خۆبەزلزانی بێت یان لە نەزانی، بەڵگەی بێباوەڕی لە زانستدا دەبینێت لە بری ئەوەی بەڵگەی باوەڕی تێدا ببینێت، جا لەسەرمان پێویست بوو حەقیقەتەکەی بۆ ڕوون بکەینەوە تا لە نەفسی خۆی ڕزگاری بکەین.

دوای تێپەڕبوونی چوار ساڵ، بەم کتێبەم (وڕێنەی ئیلحاد)ڕووی گفتوگۆ لە هەر پێنج جۆرە عەقڵەکە دەکەم کە پێشتر بە کتێبی (گەشتی عەقڵ) گفتوگۆم لەگەڵ کردبوون، بەو ئومێدەی عەقڵە باوەڕدارەکانیەقین و بەرزکردنەوەی باوەڕیان بەدەستبێنن و، عەقڵە بێباوەڕو بە گومانەکانیش نوور و هیدایەت.

**ئەم دەروازەیە بە هەڵوەستەیەك لە تەك ناوەڕۆك و پێرستی كتێبەكە كۆتایی پێدێنین:**

كتێبەكە چوار بەشە و چواردە تەوەر لەخۆ دەگرێت.

**بەشی یەكەم: لەژێر ناوو نیشانی (زانست و ئایین و بێباوەڕیی)، لە سێ تەوەر پێكهاتووە:**

**یەكەم:** (بێباوەڕی هاوچەرخ)، تێیدا باسی دەركەوتنی بێباوەڕیی هاوچەرخ و خاسیەتەكانی دەكەین.

**دووەم:** (سروشتی زانست)، تێیدا چەمكی زانست و توانا و سنوورەكانی ڕووندەكەینەوە.

پاشان لە تەوەری سێیەمدا لەژێر ناوونیشانی (ناكۆكییەكی خەیاڵیی )ئەوە ڕووندەكەینەوە كە گونجانێكی قووڵ هەیە لەنێوان ئایین و بنچینەكانی زانست، نەك ناكۆكیی و هەڤدژیی وەك هەندێ كەس گومان دەبەن.

**بەشی دووەم: بە ناوونیشانی (لە نێوان خودا و بێباوەڕیی)دا، گرنگترین دیاردە گەردوونیی و بایۆلۆجیی و مرۆیی و غەیبییەكان دەخەینەڕوو، پاشان ڕوونی دەكەینەوە، كە هەریەكە لە باوەڕداران و بێباوەڕان چۆن سەیری ئەو چەمكانە دەكەن، لەگەڵ خستنەڕووی بەڵگەی هەردوولا، ناوونیشانی تەوەرەكانی چوارەم تا نۆیەم بەم شێوەیەیە:**

گەردوون لەنێوان خودا و بێباوەڕیدا.

ژیان لەنێوان خودا و بێباوەڕیدا.

پەرەسەندنی داروینی لەنێوان خودا و بێباوەڕیدا.

دیزاینی زیرەك و پەرەسەندن لەنێوان خودا و بێباوەڕیدا.

عەقڵ لەنێوان خودا و بێباوەڕیدا.

**بەشی سێیەم: لەژێر ناوونیشانی (زەلکاوی بێباوەڕان)دا بیرۆکەی بێباوەڕان لە ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵاتدا دەخەینەڕوو.**

تەوەری دەیەممان بە ناوونیشانی (ریچارد دۆوکنز، سەرقافڵەی بێباوەڕە نوێیەکان)دەبێت، کە تایبەتمان کردووە بە خستنەڕووی دیدی بێباوەڕیی پێشەوای بێباوەڕە نوێیەکانی ڕۆژئاواو ڕێبازە فەلسەفییەکەی و بەرپەرچدانەوەی و پوچەڵکردنەوەیان.

تەوەری یازدەهەمیش باسی هزری بەناوبانگترین شوێنکەوتووانی دۆوکنز دەکات، لەگەڵ خستنەڕووی گرنگترین نووسینەکانیان، لە ژێر ناوونیشانی (دەستەی بێباوەڕیی نوێ).

پاشان لە تەوەری دوازدەهەمدا بە ناوونیشانی (بێباوەڕیی لە جیهانی ئیسلامیی)دا، مێژووی سەرهەڵدانی بێباوەڕیی و جەنگی هەڵگەڕاوەکان تا دەگاتە بێباوەڕیی هاوچەرخ دەخەینەڕوو.

**بەشی چوارەم و کۆتایی بە ناوونیشانی (لەگەڵ خودا):**

لە تەوەری سێزدەهەم لەژێر ناوونیشانی (ڕێگای بەرەو خوا چوون) گەشتی ئیمانیی چوار گەورە بیرمەند دەخەینەڕوو، کە پێکەوە دامەزراوەیەکی ئیمانیی تەواومان نیشان دەدەن.

لە تەوەری چواردەهەم و کۆتایی (دەرچوون لە زەلکاوەکە) بەرهەمی بەشەکانی گەشتەکەمان دەخەینەڕوو، هەروەها هەنگاوەکانی دەرچوون لە زەلکاوی بێباوەڕیی بەرەو فیردەوسی باوەڕ، لەگەڵ خستنەڕووی گرنگترین ئەرکی سەرشانی مسوڵمانانی ئەم سەردەمە، کە بریتییە لە نوێکردنەوەی هزری ئیسلامیی.

بەم شێوەیە گەشتەکە تەواو دەبێت لەبێباوەڕییەوە بەرەو باوەڕ ئینجا بەرەو ئیسلام.

لە خودا داواکارم کە ئەم کارەمان لێوەربگرێت و بیکاتە ترێشووی دوارۆژمان، بمانکاتە کۆمەڵی سەر بە شایەتمانی(لا إله إلا الله محمد رسول الله) و لەسەری بژین و لەسەری بمرین و لەژێر سایەیدا بە دیداری خودا شاد ببین.

# تەوەری یەکەم

## بێباوەڕیی هاوچەرخ

((یەکێك لە جیاوازییە ئازاربەخشەکان ئەوەیە، کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا هەندێك لە پیاوانی ئایین دژی زانست وەستانەوە؛ بە بیانووی ئەوەی، کە (هەڕەشە) بوو لەسەر باوەڕبوونیان بە خودا، لە سەدەی بیستەمیشدا هەندێك کەس دژایەتی زانست دەکەن بە بیانووی ئەوەی (ڕێخۆشکەرە) بۆ باوەڕهێنان بە خـــودا!)

ئەلڤین پلاتینگا[1].

لە منداڵیدا فێربووی نکە کافرەکانی مەککە، ئەوانەی خودا بە پێغەمبەرەکەی پەیامی ئیسلامی بۆ ناردن نکۆڵییان لە بوونی خودا دەکرد، بەڵام کاتێك پێگەیشتم و لە تێگەیشتنی قورئانی پیرۆز نزیك بوومەوە، زانیم، کە زۆربەی کافرانی ئەوسا ددانیان بە بوونی خودا داناوە؛ بەوەی کە بەدیهێنەری گەردوون و ژیان و مرۆڤە[2]، بەڵام لەگەڵ خودا خوداوەندی دیکەیان بە هاوبەش داناوەو

---

(١) Alvin platinga: مامۆستای بەناوبانگی فەلسەفەی دینداری ئەمریکی، لە زانکۆی نۆتردام مامۆستایە و لەساڵی ١٩٣٢ز لەدایك بووە.

(٢) ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ ۚ قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٥﴾﴾ لقمان: ٢٥

﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ ۖ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٨٧﴾﴾ الزخرف: ٨٧

لەڕێی بتپەرستیان ویستوویانە لە خودا نزیك ببنەوە[1]، بەڵام نکۆڵیکردن لە بوونی خودا - هەروەك چۆن بێباوەڕانی ئەم سەردەمە دەیکەن - ئەوا پێش سەردەمی نوێ زۆر دەگمەن بوو، تا ئەو ئاستەی کە دەتوانین بڵێین بێباوەڕیی هاوچەرخ دروستکراوی نوێی ئەوروپایە.

ئەو بیرۆکانە لە مێشکمدا دەهاتن و دەچوون، لەکاتێکدا کە بەدوای دەرکەوتن و ڕەگ و ریشەی بێباوەڕیی هاوچەرخدا دەگەڕام، ئەوەچ شتێك بوو بە هۆکاری داڕمان لە کوفرێکەوە بۆ کوفرێکی گەورەتر؟

با لەسەرەتای گەشتەکەوە دەستپێبکەین:

## لەدایکبوونی بێباوەڕیی هاوچەرخ

### چیرۆکەکە بەر لە چەند سەدەیەك دەستپێدەکات[2]

تا پێنج سەد ساڵی ڕابردوو، سەرچاوەی سەرەکی زانست لە ئەوروپا کتێبی پیرۆز بوو، بە هەردوو پەیمانەکەی (پەیمانی کۆن: تەورات و، پەیمانی نوێ: ئینجیل)، هەروەها پیاوانی ئایین لە کڵێسای کاسۆلیکی بۆچوونە زانستییەکانی (ئەرستۆ) و (پەتلیمۆس)[3] یان دەربارەی گەردوون و هەسارەی زەوی و فیزیا و کیمیا و مێژووی سروشتیی.. وەردەگرت و بە چەمکە پیرۆزەکانەوە دەیانبەستنەوە.

---

(١) ﴿ أَلَا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ ۚ وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَىٰ إِنَّ اللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِي مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ۗ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَنْ هُوَ كَاذِبٌ كَفَّارٌ ﴿٣﴾ ﴾ الزمر: ٣

(٢) لە پێشەکی کتێبی (ئایین و عەقڵی نوێ)ی فەیلەسوونی ئەمریکی واڵتەر ستیس وەرگیراوە.

(٣) پەتلیمۆس ptolemy: لە شاری تیبەی میسر لە ساڵی ٨٥ی زایینی لەدایك بووە و، لەشاری ئەسکەندەریە لە ساڵی ١٦٥ی زایینی مردووە، زانایەکی گەردوونی و بیرکاری و جوگرافی بووە و، یەکێك بووە لە بەناوبانگترین زانایانی مێژووی کۆن، بۆچوونە گەردوونییەکانی تا سەدەکانی ناوەڕاست هەر بڵاو بوون.

بە پشت بەستن بەم سەرچاوانە، مرۆڤی سەدەکانی ناوەڕاست لە ئەورووپا بەم شێوەیە وێنەی جیهانی دەکێشا:

١- زەوی لەچەقی گەردووندا وەستاوە، خۆر و مانگ و ھەسارەکانی دی بەدەوریدا بەشێوەی بازنەیی دەخولێنەوە.

٢- خوا جیهانی لە ساڵی (٤٠٠٤) پ.ز درووستکردووە، کە قەشەکانی کڵێسا ئەم بەروارەیان لە کۆکردنەوەی تەمەنی نەوە یەك لە دوا یەکەکانی پێشو؛ لە کوڕەکانی ئادەمەوە دەستکەوتووە، بەو جۆرەی لە تەورات لە (سفرالتکوين)دا ھاتووە.[1]

٣- کۆتایی جیھان (ڕۆژی قیامەت) لە بەروارێکی زۆر دوور نییە، ساڵی ٤٠٠٤ ز. بۆ ئەوەی کە ژیانی مەسیح بکەوێتە ناوەڕاستی مێژووی جیھان.

٤- خوا لە چرکە ساتێکدا لە ڕابردوودا جیھانی درووستکردووە، ھەروەك چۆن مرۆڤەکان خانو و ئامراز و کەلوپەل درووست دەکەن. تاکە جیاوازی ئەوەیە کە خەڵك ئەو کەلوپەلانەی درووستیان دەکەن لەو کەلوپەلانە دروستیان دەکەن کە پێشتر بوونیان ھەبووە.

٥- ھەموو شتێك لە جیھاندا بەپێی نەخشەیەکی خودایی دەڕوات، ھەموو شتێك لە گەردووندا ئامانجێکی ھەیە. خۆر بۆ ئەوە درووستبووە تا لە ڕۆژدا ڕووناکی بۆ مرۆڤ فەراھەم بکات، لەشەویشدا مانگ ئەم کارە دەکات، ھەروەھا پەلکەزێڕینە بۆ ئەوەیە ئەو بەڵێنە بە بیر مرۆڤ بێنێتەوە کە بە نوح پێغەمبەری دابوو، کە جارێکی تر بە لافاو ڕەگەزی مرۆڤایەتی لەناونەبات.

جا ئەگەر ھەندێك شتی پیس و قێزەون بوونی ھەبێت، وەك جانەوەر و مار و

---

(١) پەیمانی کۆن، کتێبی پیرۆزی جوولەکەیە و، وەك بەشی یەکەمی کتێبی پیرۆزیش لەلای مەسیحییەکان سەیر دەکرێت. تەوراتی موسا یەکەمین بەشی پەیمانی کۆن و گرنگترین بەشیەتی؛ بۆیە دەکرێ ھەندێ جار بەتەنیا ناوی تەورات لەو بەشەش بنرێت. (سفرالتکوين) یەکەمین بەشی پێنج تەوراتەکەیە و باسی درووستبوونی بوونەوەر دەکات تا دەگاتە وەفاتی یوسفی پەیامبەر (علیه السلام).

مەگەزەکان، ئەوە بۆ سزادانی مرۆڤە لەسەر گوناهی ئەسڵی، کاتێك ئادەم بێ فەرمانی خودای کردوو لە درەختەکەی خوارد.

لە کۆتاییدا، عەقڵی مرۆڤ ناتوانێت پەی بە هەموو نهێنییەکانی نەخشەی خودایی ببات، بەڵکو لەسەریەتی متمانەیەکی تەواوی بەوە هەبێت، کە هەموو شتێك ئامانجێکی هەیە.

٦- جیهان سیستەمێکی ڕەوشتی دەنوێنێت، ئەم بیرۆکەیە لە مێژووی عەقڵی و ڕۆحی ڕەگەزی مرۆڤایەتیدا زۆر گرنگە. ئەم بیرۆکەیە ئەوە دەگەیەنێت کە بنەما ڕەوشتیەکان (وەك چاکە و خراپە) رەهان و خوا دیارییان دەکات، ئەوەك ڕێژەیی بن و پشت بە ویستی مرۆڤەکان و بەرژەوەندی و هەست و سۆزیان ببەستێت.

٧- لە پشت هەموو ئەمانەوە خودایەکی بەدیهێنەر هەیە، بیرۆکە و بۆچوونی هەیە، لەوانەیە کاردانەوەو هەست و سۆزیشی هەبێت.

٨- پیاوانی کڵێسا واسیتە و پەیوەندی نێوان خواو خەڵکن، لەوەرگیرانی تەوبە و دەستکەوتنی لێخۆشبوون و چوونە بەهەشت.

هەژموونی پیاوانی کڵێسا بەسەر ئایین و زانستدا هێزێکی گەورەی دەسەڵات و پارە و پوولی پێبەخشین. بۆسەدەمێکی زۆر کڵێسای کاسۆلیکی لە ڕۆما دەسەڵاتی خۆی بەسەر گەلانی ئەوروپا و فەرمانڕەواکانی سەپاندبو، تاگەیشتبووە ئەو ئاستەی پاپاکانیان فەرمانڕەواکانیان دادەنا و لایاندەبرد.

جا لەبەرئەوەی هەستی ئایینی هەستێکی سروشتییە، خەڵك ئەو هەژموونەیان قبووڵ کرد و، ئازادی و هەرچی هەیانە کردیانە قوربانی لە بەرژەوەندی پیاوانی ئایین[1].

---

(١) دەسەڵاتی پیاوانی ئایین بەسەر خەڵکی ئاسایی و فەرمانڕەواکاندا لە مێژوودا زۆر دووبارە بۆتەوە. میسرییە کۆنەکان وەك خوا سەیری فەرمانڕەوا فیرعەونەکانی خۆیانیان دەکرد و وەك پەیوەندی نێوان خوا و خەڵك سەیری پیاوانی ئایینیان دەکرد، بۆیە کاتێك ئەخناتون بەرەنگاری دەسەڵاتی پیاوانی ئایین بووەوە، کوشتیان و توت عەنخ ئامونیان وەك فیرعەون و خوا لەجێدانا!

## زانست لە قۆرییەکە دەچێتە دەرەوە :

مێژوونووسان دەرچوونی کتێبی(خولانەوەی گەردون - فی دوران الافلاك)ی کۆپەرنیکۆس بە کۆتاهاتنی سەدەکانی ناوەڕاست و دەستپێکی سەردەمی نوێ دەزانن، (لە دیدی کڵێسادا) قیامەت هەڵسا کاتێك کۆپەرنیکۆس[1] (بە هاوکێشە بیرکارییەکانی) و پاشان گالیلۆ[2] (بە تەلیسکۆب)ەکەی سەلماندیان کە زەوی چەقی گەردوون نییە، بەڵکو تەنیا هەسارەیەکی پاشکۆیە و بەدەوری خۆردا دەخولێتەوە، بەڵام هەردوو زاناکە باجی بوێرییەکەیاندا؛ کاتێك کڵێسا هەڵمەتێکی کوێرانەی دەستپێکرد بۆ چەوساندنەوە و ئەشکەنجەدان و کوشتنی زانایان بەوەی کە جادووگەر و فاڵچین.

بەهەمان شێوە دۆزینەوەی مایکرۆسکۆب(لەساڵی ۱۵۹۵ز)گورزێکی بەهێزبوو؛ بەوپێیەی بەهۆیەوە بۆ یەکەمجار زانایان توانیان بەکتریاکان ببینن، کە دوای ئەوە سەلماندیان بەکتریاکان بەرپرسن لە زۆر نەخۆشی، ئەمە چۆن دەبێت؟! مەگەر خودا (یاخود شەیتان) نەبوو کە تاعوون و دەردیان بۆ مرۆڤ دەهێنا؟ کەواتە چۆن نوێژ و دوعای(بەپارەی)پیاوانی ئایین دەتوانێت نەخۆشییەکان چارەسەر بکات؟!

---

(۱) Copernicus : (۱٤۷۳-۱٥٤۳ز) ئەلەکناسێکی پۆڵەندییە، بیردۆزەکەی دەربارەی مەرکەزیەتی خۆر لە کتێبەکەیدا De revolutionbus Orbiun Coelestium بڵاوکردۆتەوە کە لە ڕۆژی مردنیدا دەرچوو.

(۲) Galieleo Galieli : (۱٥٦٤-۱٦٤۲ز) زانای ئەلەکناسی بەناوبانگی ئیتاڵی.

## ئیسحاق نیوتن و لابلاس و.. سیستەمی جیهان...

بەهۆی بلیمەتی ئیسحاق نیوتن (١٦٢٤-١٧٢٧) توانا زانستییەکان گەیشتنە لوتکە، کاتێك بنچینەکانی زانستی هاوچەرخی دامەزراند. نیوتن مەسیحییەکی پابەندی دامەزراو بوو، بێگومان خۆشی توشی شۆك دەبو گەر بیزانیایە کە دۆزینەوە زانستییەکانی پایەکانی ئایین لە ڕۆژئاوادا دەپوکێنێتەوە.

نیوتن سێ یاسا بەناوبانگەکەی جوڵەی دۆزییەوە، لەگەڵ یاسای هێزی کێشکردن،هەروەك لە ڕێگەی ئەم یاسایانە - بەوردی - بنچینەی کۆمەڵەی خۆر (خۆر و هەسارەکانی دەوری) وەسف کرد. هەر بەو یاسایانەش وەسفی کەوتنی سێوەکە لە دارەکەو، وەسفی ئەنجامی بەریەککەوتنی دوو شەمەندەفەر دەکات.

بۆیە فیزیاناسەکان سیستەمی خۆر (وەك نیوتن باسی کردووە) بە کاتژمێری زەنبەرکی دەچوێنن، کە پڕ دەکرێت لە لم و پاشان وازی لێدەهێنرێت و خۆی کار دەکات.

هێزی کێشکردن و، هێزی دەرکردنی ناوەندیی و یاساکانی جوڵە بەسن بۆ پارێزگاریکردن لە کارکردنی سیستەمی کۆمەڵەی خۆر، بەبێ دەستێوەردانی هێزی دەرەکی.

بیرۆکەی سیستماتیکی جیهان، وەك ئاگر بە پوشدا بڵاو بووەوە، ئیتر زانا و فەیلەسوفەکانی ئەوروپا هەموو شتێکیان لە ڕووی سیستماتیکەوە لێکدەدایەوە. تەنانەت تۆماس هۆبز (فەیلەسوفی بێباوەڕی بەناوبانگی بەریتانی) کاری کۆئەندامەکانی لاشەی مرۆڤی بە کۆمەڵێك ئامراز دەچواند کە یاساکانی فیزیا هەڵیان دەسوڕێنن.

نیوتن تێبینی جیاوازییەکی کردبو لە نێوان شوێنی هەسارەکان کە حیساباتەکانی ئەو دیاری کردبو، لەگەڵ ئەو شوێنەی تەلیسکۆب دەریدەخست. جا ئەگەر ئەو

جیاوازیانە بە تێپەڕبوونی کات کەڵەکە ببن، ئەوا سیستەمی گەردوونی ناوەڕوو دەبێتەوە؛ بەجۆرێك کە خۆر هەسارەکان قوت دەدات، یان ئەوەتا لەژێر کۆنتڕۆڵی دەردەچن و بە بۆشایی پان و بەریندا بڵاو دەبنەوە.

نیوتن بەسەر ئەو کیشەیەدا زاڵبوو بەوەی کە باوەڕی بەوە هێنا کە خوا لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر ڕێچکەی هەسارەکان ڕێکدەخاتەوە! ئەمە دواپین جار بوو کە زانایەکی گەورە بیرۆکەی دەستێوەردانی هێزێکی نادیار بۆ لێکدانەوەی دیاردەیەکی سروشتی بخاتەڕوو.

پاشان فەلەکناسی فەرەنسی مارکێز لابلاس (١٧٤٩-١٨٢٧) سەلماندی کە ئەو ئینحیرافاتانەی نیوتن نەیتوانی بە یاسای سروشتی لێکیان بداتەوە کەڵە نەبوونەو، ئەوانە دوای ماوەیەك یەکتر ڕەتدەکەنەوە، بۆیە پێویستی بە دەستێوەردانی خودایی نییە بۆ ڕاستکردنەوەی. لەبەر ئەوە کاتێك (ناپلیۆن) دەربارەی ڕۆڵی خوا لە سیستەمی گەردوون پرسیاری لێکرد، لابلاس وتی کە پێویست بەو گریمانەیە ناکات!!

هەر بۆیە ئێمە باس لە (حەتمیەتی لابلاس) دەکەین بەو مانایەی کە ئەم گەردوونە بە تەواوی ملکەچی یاساکانی سروشتە.

### بێباوەڕی سەرهەڵدەدات...

بەڵام، چۆن ئەو دۆزینەوانە و (زۆری تر) بوونە هۆی دروستبوونی ناکۆکی لە نێوان زانست و ئایین لە ئەورووپا؟.

ململانێی نێوان زانست و ئایین بەهۆی چەند دۆزینەوەیەکی (دیاریکراو)ی زانستی نەبو کە لەگەڵ بیروباوەڕێکی دیاریکراوی ئایین تێك گیرابێت.

بە هەمان شێوە ئەو بۆچوونانەی کە دەبو کڵێسا لەبەردەم لافاوی زانست دەستبەرداریان ببێت، هی وایان تێدا نەبوو بۆئایین پێویست بێت. جا بنچینەکانی ئایین لە سێ خاڵدا کورت دەبنەوە، کە پێی دەڵێین (دیدی ئایین بۆ جیهان):

١- خودایەك هەیە کە گەردوونی بەدیهێناوە.

٢- خوا نەخشەیەکی گەردوونیی و ئامانجێکی گەردوونیی هەیە لە درووستکردنی بوونەوەردا.

٣- جیهان سیستەمێکی رەوشتی دەردەخات کە خوا دیاریدەکات.

بە دڵنیاییەوە هەر لە سەرەتای شۆڕشی زانستی لە سەدەی حەڤدەهەمەوە - تائێستاش - هیچ دۆزینەوەیەکی زانستی یان بیرۆکەیەکی لۆژیکی دەرنەکەوتووە لەگەڵ ئەم بنچینانەدا تێك بگیرێت، کە ئەگەر ئەو بنچینانە نەبوونایە ئایین دەڕوخا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، شۆڕشی زانستی کاریگەرییەکی وێرانکەری بۆ سەر ئایین هەبو؛ بەو پێیەی کە ڕاستەوخۆ تەوژمێکی گوماناوی بێباوەڕیی گەورەی بە دوای خۆیدا هێناو، سەدەی هەژدەهەمی کردە گەورەترین سەدەی گومان لە مێژووی هاوچەرخدا، تا کار گەیشتە ئەوەی پاشای ئینگلتەرا سکاڵای ئەوەی دەکرد کە نیوەی قەشەکانی کڵێساکەی بێباوەڕن!.

چۆن شۆڕشی زانستی بووە هۆی لەرزین و هەژانی دیدی ئایین بۆ جیهان، سەرەڕای ئەوەی جیاوازییەك نییە ئەگەر زەوی چەقی گەردوون بێت، یان تەنیا شوێنکەوتوویەکی بچووك بێت لە خولگەی خۆردا بسوورێتەوە، ئەمە بەهیچ شێوەیەك ڕێگر نییە لەبەردەم بوونی خودایەك کە هەموو شتێکی بەدیهێناوە؟.

هەروەها ڕاستگۆتر و دەستپاکترو دڵسۆزترو دادگەرتر(سیستەمی ڕەوشتی) نابین ئەگەر دەست بە یاسای جوولەی ئەرستۆوە بگرین و بە یاساکانی جوولەی نیوتن نەیانگۆڕینەوە؟!

**بـۆچـی....؟**

بە دڵنیاییەوە جەخت لەوە دەکەینەوە کە سەرهەڵدانی ئەم هەستە گەورەیەی گومانبردنی بێباوەڕیی و نکۆڵیکردن لە (بنچینەکانی دیدی ئایین) بە هیچ جۆرێك کێشەیەکی زانستی نەبوو، بەڵکو کێشەیەکی دەروونی فەلسەفی بوو![1]، ئەمەش بۆ کۆمەڵێك هۆکاری دەروونی (سایکۆلۆژی) دەگەڕێتەوە، گرنگترینیان ئەمانەی خوارەوەن:

**یەکەم:** گومان لەوە دانییە کە ئەو زوڵم و ستەم و چەوساندنەوەی زانایان لە سەر دەستی کڵێسا توشی بوون، هۆکارێك بوو بۆئەوەی زانا و بیرمەندان هەڵوێستێکی دوژمنکارانە لە دژی ئایین وەربگرن، کە ڕەنگدانەوەی بەسەر هەڵوێستی خەڵکیش هەبوو.

**دووەم:** ئەگەر نیوتن پەیوەندی خوا و گەردوونی گێڕابێتەوە بۆ سەردەمی درووستبوونی کۆمەڵەی خۆر و ڕۆڵێکی بۆ خودا هێشتبێتەوە بۆ ڕێکخستنەوەی خولگەکان لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر، ئەوا لابلاس ئەوە هەڵدەوەشێنێتەوە کە خوا هیچ ڕۆڵێکی گەردوونی هەبووبێت. بەمەش تێڕوانینی کڵێسا هەرەسی هێنا کە پێیان وابوو خوا پێش شەش هەزار ساڵ گەردوونی درووستکردووە و ئادەمی باپیرەمانی بەدەستەکانی خۆی درووستکردووە، ئەو بۆچوونە ئەوەی دەگەیاند کە پەیوەندییەکە زۆر نزیکە و خودا زۆر گرنگیمان پێدەدات.

بە هەمان شێوە هەستکردن بە نزیکی خودا بەوە ئاو دەدرێت کە باوەڕو ئیمانمان هەبێت بەوەی خوا دەستێوەردانی ڕاستەوخۆی هەیە لە ژیانی مرۆڤەکاندا؛ بۆیە هەورەتریشقەکان دوژمنانی ئایین لەناودەبەن، بوومەلەرزە گوناهبارو لە فەرمان دەرچووەکان سزا دەدات..

---

(١) دەکرێ لەو کێشەیە تێبگەین، بەوەی کە عەقڵی مرۆڤ بەم شێوەیە کارناکات وەك لۆژیکییەکان دەڵێن. ئەگەر کەسێك بەبیرۆکەیەکی دیاریکراو (أ) باوەڕی هەبێت، بەشێوەیەکی لۆژیکی بڕوات باوەڕ بەبیرۆکەی (ب) بێنێت، ئەوا واقیع پێمان دەڵێت کە ئەم گواستنەوە لۆژیکییە ڕیزبەڕە نەك ڕێسا! چونکە بەگشتی و زۆربەی ئەم گواستنەوە هزریانە دەروونین نەك لۆژیکی.

بەڵام لێکدانەوە زانستییەکان بۆ ئەم دیاردانە، هیچ بوارێکی بۆ ئەم هەستانە نەهێشتەوە.

**سێیەم:** ئەوانەی (دەیانویست دارەکە لەناوەڕاستەوە بگرن) دەیانگوت کە خودا جیهانی دروستکردووە و چەند یاسایەکی سروشتی بۆ داناون کە جیهان هەڵدەسوڕێنن پاشان وازی لە دونیا هێناوە. ئەمە واتای ئەوەیە کە خودای بەدیهێنەر ئیتر هیچ شتێك بۆ ئێمە ناکات و بچووکترین کاریگەری لەسەر ڕووداوەکانی جیهان نییە. بەکورتی خودایەکە کە هیچ گرنگی نییە و پێویستیمان پێی نییە!.

**چوارەم:** زانست لەوەدا سەرکەوتوو بوو کە بە هۆی چەند ئالیات و ئامێرێکەوە لێکدانەوە بۆ دیاردە سروشتیەکان بکات بە جۆرێك پێویست بەوە ناکات بەدوای مەبەست و ئامانجێکدا بگەڕێین. بە هەمان شێوە سەرکەوتوو بوو لە پێشبینیکردنی دیاردە سروشتییەکانی وەك خۆرگیران و مانگ گیران و لافاو و ڕەشەبا. ئەمەش خزمەتگەلێکی ڕاستەوخۆی پێشکەشی مرۆڤ کرد، ئیدی ئەو مرۆڤە لە ڕۆژێکی دیاریکراودا کاری دەریاوانی نەدەکرد ئەمەش لە ترسی هەڵچڕانی پێشبینی کراوی دەریا، لەبەرئەوە مرۆڤ باوەڕی کرد بەوەی لێکدانەوە و پێشبینییەکانی پیاوانی ئایین سادە و ساکارن.

**پێنجەم:** مرۆڤی سەردەمی زانست باوەڕی وابو ئەم سەرکەوتنەی لێکدانەوەی ماددی بۆ دیاردە سروشتیەکان و ونبونی ئامانجداریی ڕووداوەکانی گەردوون، مانای وایە تازە ئامانجی دروستبوونی گەردوون بە تەواوی بزر بوو.

**شەشەم:** کاتێك هیچ ئامانجێك بۆ خودا نەمایەوە لە دروستکردنی مرۆڤدا و هیچ ڕۆڵێکی لە ژیانیاندا نەما، تازە هیچ بیانوویەك نەما کە ڕێسا ڕەوشتییەکانیان بۆ دابنێت (کە چی پێویستە بیکەن و چی پێویست نییە بیکەن). بەم شێوەیە شۆڕشی زانستی ئەو باوەڕەی ڕوخاند کە جیهان بریتییە لە سیستەمێکی ڕەوشتیی، ئیتر بەها ڕەووشتییەکان بەسترانەوە بە بەرژەوەندییە ماددیە ڕاستەوخۆکانی مرۆڤ.

**حەوتەم:** زانستی سەردەم توانی بۆ مرۆڤی ئەمەن مامناوەندی ئێستا خزمەتی زۆر زیاتر لەوەی پێشوو پێشکەش بکات، چەندەها بەرهەمی زانستی و ژیارستانی

پێشکەش کرد کە خۆشگوزەرانی و دەوڵەمەندییەکی وەهای بۆ فەراهەم بکات کە ڕۆژێ لە ڕۆژان بیریشی لێ نەکردبێتەوە، بۆیە ئەو مرۆڤە عەقیدەکەی لەباوەڕبوون بە خودا گۆڕی بۆ باوەڕبوون بە زانست و توانا و داهێنانەکانی.

**هەشتەم:** لەبەر هەموو ئەمانە، بیرمەندان هاتنە سەر ئەوەی بپرسن: ئەگەر زانست هەنگاوێکی گەورەی نابێت سەبارەت بە تێگەیشتنی ئەو بابەتانەی پێشتر بە میتافیزیکا لیکدەدرانەوە، وەك ئەخۆشییەکان و هەورەتریشقە و بروسکەو بومەلەرزە و...، ئیدی چ بەربەستێك هەیە لەبەردەم ئەوەی زانست بگاتە ئەو ئاستەی لێکدانەوە بۆ هەموو ئەو شتانە بکات کە میتافیزیکین؟ بەم تێگەیشتنە پێویستبوون بە ئایین و خودا بە تەواوی هەڵوەشایەوە.

ئەو هۆکارە دەروونییانە[1] بیرمەندان و زانایان و خەڵکی ئاسایی سەدەی هەژدەهەمیان خستە ناو زۆنگاوی گومانەوە، تا وای لێهات سەدەی نۆزدەهەم -بە بەراورد بە پێش خۆی- بە سەدەی گەڕانەوە بەرەو باوەڕ ناودەنرا، ئەمەش

---

(١) سەرەڕای هۆکارە عەقڵی و دەروونییەکان کە لە سەدەی هەژدەهەمدا لە ڕکابەرێتی زانست و ئایندا تای تەرازووی زانستیان یەکلاکردەوە، لێرەدا جۆرێك لە کەموکوڕی دەروونی Neurosis باس دەکەین، کە دەبێتە هۆی وەرگرتنی بیری بێباوەڕی لە ئاستی تاکەکەسیدا، بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەکەمان دەربارەی هۆکارە دەروونییە جۆراوجۆرەکانی پشت وەرگرتنی بیری بێباوەڕی بخەینەڕوو.

دوای لێکۆڵینەوەیەکی زۆر کە پسپۆڕی پزیشکی دەروونی زانکۆی نیویۆرك پۆل ڤیتز paul vits لەسەر زۆر کەسایەتی بێباوەڕی سەردەم ئەنجامی داوە گەیشتووەتە ئەو ئەنجامەی کە وەرگرتنی بێباوەڕی لەوانەیە هۆکارەکەی کەموکوڕییەکی دەروونی دەمارێت Atheism is aNeurosis کە ئارەزوونێکی شاراوەی لەپشتە بۆ ڕزگاربوون لە دەسەڵاتی باوك و جێگرتنەوەی (هەروەك سیگمۆند فرۆید ) دەڵێت. لە کاتێکدا لە پشت باوەڕبوون بە خوداشەوە وەستاوە، بەڵام ئەمەیان بۆ هەستکردن بە ئارامی.

لەبەرئەوەی ڤیتز چەمکێکی داناوە کە ناوی ناوە (دیدی کەموکوڕی باوکایەتی Defective father hypothesis کە تێیدا پەیوەندییەك دروستدەکات لەنێوان دەسەڵاتی باوکی مرۆڤی و ئەو باوکەی لە ئاسمانە، بۆ ئەمەش چەند نموونەیەك دێنێتەوە. ئەوەتا فەیلەسوفی گەورەی فەرەنسی (ڤۆڵتێر)، کە بە یەکێك لە گومانکارە گەورەکان دادەنرێت زۆر ئازاری لە دەستی باوکی دیوە، تا ئاستێك ڕەتیدەکردەوە کە ناوەکەی هەڵبگرێت. لیستەکەی فرۆید خۆیشی تێدایە و کارل مارکس و تۆماس هۆبز و ئەوانی دیش.

هەروەك چۆن ڤیتز وای دەبینێت کە بێبەش بوونی منداڵ لە باوکی بەهۆی مردنەوە، لەلایەن منداڵ وەك خیانەت سەیری دەکرێت بەهۆی ئەوەی کە لە باوکیەتی بێبەشی کردووە و هەستی بێباوکی تێدا دروستکردووە، بۆ ئەمەش نمونە بە (جان پۆل سارتەر) و (بێرتراند راسل) دێنێتەوە.

پۆل ڤیتز تا نزیك تەمەنی چل ساڵی هەر بێباوەڕ بو، دوای ئەوە بووە باوەڕدار و گرنگی دا بە پەیوەندی نێوان ئاین و دەروناسی و ئەو بابەتەی لە کتێبە بەناوبانگەکەی Fath of the Psychology of Atheism بڵاوکردۆتەوە، کە لەساڵی ١٩٩٩ بڵاو کرایەوە.

بەهۆی ئەو ڕەوتە ڕۆمانسییەی کە تێیدا دەرکەوت. بەڵکو دەتوانین بڵێین کە عەقڵی عەلمانی هاوچەرخ بەرهەمی شۆڕشی زانستی سەدەی حەڤدەهەمە، نەوەك سەدەی نۆزدەهەم یان سەدەی بیستەم.

لەگەڵ چوونە ناو سەدەی بیستەم، وتەی (ئایین تلیاکی گەلانە) دەرکەوت کە کارل مارکس گوتی. مەبەستیشی ئەوە بوو کە دەوڵەمەندان و ئەرستۆکراتییەکان چەمکی ئایین بۆ بێهۆشکردنی هەژاران بەکاردەهێنن و ناچاریان دەکەن ئەم واقیعە تاڵە قبوڵ بکەن، لەبری ئەو چاوەڕێی فیردەوسی ژیانی دوای مردن بکەن.

لە دەرەنجامی هەموو ئەمانەش وتەی (فریدریك نیتچە)[1] بڵاوبوویەوە کە لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم گوتی: ئایا خودا مردووە؟ Is God Dead?، جا لەبری ئەوەی ئەم وتەیە وەك وتەی فەیلەسوفێك بمێنێتەوە کە باوەڕی پێی بووە، بوو بە ناونیشانی دووبارەی ڕۆژنامەکان.

## هزری بێباوەڕی هاوچەرخ :

**هزری بێباوەڕی هاوچەرخ ئەم چەمکانە لەخۆ دەگرێت :**

١- گەردوون لەخۆیەوە دروستبووە، لە ئەنجامی چەند ڕووداوێکی هەڕەمەکی و بەبێ پێویستی بە دروستکەرێك.

٢- ژیان بەشێوەیەکی خۆکرد لە ماددەوە دروستبووە، لە ڕێگەی یاساکانی سروشتەوە.

---

(١) فریدریك نیتچە: فەیلەسوفی بێباوەڕی بەناوبانگی ئەڵمانی (١٨٤٤-١٩٠٠).

٣- جیاوازی نێوان ژیان و مردن جیاوازییەکی فیزیایی ڕووتەو، ڕۆژێك دێت زانست پەی بەو جیاوازییە دەبات.

٤- مرۆڤ جگە لە لاشەیەکی ماددی هیچی تر نییە، بە مردن لەناو دەچێت.

٥- چەمکی (ڕۆح) بوونێکی ڕوونی نییە.

٦- لە دوای مردن ژیانێکی تر بوونی نییە.

٧- لە دەرەنجامی هەموو ئەو شتانەی پێشەوە، دەگەینە ئەوەی هیچ پێویستییەك نییە تا باس لە بوونی خودا بکرێت.

ئەو چەمکانە و دیدی بێباوەڕان دەربارەیان و هەڵتەکاندنیان لەلایەن باوەڕدارانەوە لە تەوەرەکانی دواتردا بە درێژی باس دەکەین.

## بێباوەڕانیش دەبن بە چوار کۆمەڵە:

١- زانا و فەیلەسوفەکان، کە ڕێچکەی بێباوەڕییان هەڵبژاردووە، پاشان لە ڕێگەی بیردۆزی پەرەسەندنی داروینی(پەرەسەندنی زیندەوەران لەڕێی ڕێکەوتەوە) بەڵگە زانستییەکەی خۆیان دەستکەوت.

٢- شیوعییەکان، ئەوانەی دەیانەوێت کۆمەڵگا مرۆڤایەتییەکان بگۆڕن بۆ کۆمەڵگای زۆرەملێیی سیستەمێکی وەك شاری مێرووله و هەنگ، ئەم ئامانجەش لەژێر سایەی بیروباوەڕە ئایینییەکان بەدی نایەت، بۆیە ئەوان پێیان وایە پێویستە ئەو بیروباوەڕانە لەناو ببرێن ئەگەر بەهێزیش بێت.

٣- چەند تاکێکی ناپسپۆڕی کەم شارەزا، لە ڕێگەی دانانن بە بێباوەڕییەوە خۆیان لە دەست کۆت و بەندی ئایین ڕادەکەن یان بۆ خۆدەرخستن یان بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندی دیکە.

٤- ژمارەیەکی زۆر لە بێباوەڕە بێدەنگەکان! لەناو هەموو ئایین و کۆمەڵگا و ڕەگەزەکان، ئەوانەی گومانیان هەیە، بەڵام گومانەکەیان ناخەنە بەر گفتوگۆ. هۆکاری گومانی ئەم کۆمەڵەیە بۆ دوو هۆکار دەگەڕێتەوە:

- روکەشە زانستی و فەلسەفیەکە، کە هەڵگرانی هزرە بەهێزەکانی بێباوەڕیی بۆچوونەکانیان پێ دەخەنەروو.

- ئەو شێوازە وشك و داخراوەی لێیەوەفێری ئایینەکانیان بوون، کە تێیدا مامۆستاکان هەموو جۆرە لۆژیك و زانستێك ڕەتدەکەنەوە کە پێچەوانەی بیرکردنەوەیان بێت، کە بە شێوازی (تەنیا بەم جۆرمیە just-so). هەروەك ئەو مامۆستایانە بانگەشەی ئەوە دەکەن ئەوان تاقانەن لە تێگەیشتن و ناسینی خودا، پێویستە ئەوانی دی دان بەم کارمیان دابنێن.

## هزری بێباوەڕی دابەش دەبێتە سەر دوو ئاست:

### (أ) هزری بێباوەڕی بەهێز Strong (Positive) Atheism

ئەوانەن کە بوونی خودا ڕەتدەکەنەوە، بۆ ئەو بۆچوونەشیان بەڵگە کۆدەکەنەوە، بیردۆز بنیات دەنێن و، بانگەشە بۆ بیروباوەڕەکەیان دەکەن.

### (ب) هزری بێباوەڕی لاواز Weak (Negative) Atheism

ئەوانەن کە هێشتا بەڵگەی تەواویان دەستنەکەوتووە قەناعەتیان پێ بێنێت خودا هەیە، بەڵام بانگەشە بۆ هزرەکەیان ناکەن. ئەو کۆمەڵەیە هەموو ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە گرنگییەکی تەواویان بە پرسەکە نەداوە.

**لەبواری بێباوەڕیدا چەند چەمکێك هەن پێویستە لەیەکیان جیابکەینەوە، کە گرنگترینیان:**

**بێباوەڕ (الملحد-Atheist)** : ئەو کەسەیە نکوولّی لە ئایین و بوونی خودا دەکات.

**بێدین (اللاديني)**: بێباوەڕان پتر حەز دەکەن پێیان بگوترێ بێ ئایین، لە کاتێکدا کە بێ ئایین واتا ئەوەی کە باوەڕی بە هیچ ئایینێك نییە. ئەمەش مانای وانییە دەبێ نکوولّی لە بوونی خودا بکات.

**دژە ئایین (Antitheist)**: ئەو بێباوەڕەیە کە هەڵوێستێکی دوژمنکارانەی گرتۆتەبەر لە هەمبەر خودا و ئایین و دیندارەکان.

**پەروەردگاریی (الربوبي - Diest)**: کەسێکە باوەڕی هەیە بەوەی خودا گەردوونی بەدیهێناوە، بەڵام نکوولّی لەوە دەکات کە خودا لە ڕێی ئایینەکانەوە پەیوەندی بە مرۆڤەوە کردبێت.

**نەزانکار (اللا أدري -Agnostic)**: ئەو کەسەیە کەباوەڕی وایە پرسەکانی خوایەتی و غەیب ناکرێ بسەلمێنرێن و بەڵگەیان لەسەر بهێنرێتەوە (هەروەك چۆن ناکرێ نەریێ بکرێن و ڕەتبکرێتەوە)، وا دابندرێن لەسەرووی توانای عەقڵ و هەستەکانەوەن.

**گومانکار (المتشكك -Skeptic)**: ئەو کەسەیە وای دەبینێت بەڵگەکانی خوایەتی بەس نین بۆ ڕازیکردن و قەناعەتپێهێنانی، لە هەمان کاتدا ناکرێ ئەو بەڵگانە بە هەند وەرنەگرێت.

**عەلمانیی (Secularist)** : عەلمانیەت بریتییە لە بانگەوازیکردن بۆ دامەزراندنی ژیان لەسەر زانستی ماددی و عەقڵ و ڕەچاوکردنی بەرژەوەندی، دوور لە ئایین. لە پاشان عەلمانیەت چەمکێکی سیاسییە و هیچ پەیوەندی بە بیرو باوەڕی ئایینی تاکەوە نییە، گومان لەوەدانییە کە زۆرێك لە عەلمانییەکان بێ ئایینن. بە تایبەت لەوڵاتانی خۆرئاوا.

## ئایا بێباوەڕی بڵاوبۆتەوە؟

دوای تاوتوێکردنی هۆکارەکانی دەرکەوتنی بێباوەڕیی لە خۆرئاوادا، کە لە دوای شۆڕشی زانستی هەر دوو سەدەی شازدە و حەڤدە دەستی پێکرد، دەپرسین: لە ئێستادا پرسەکە گەیشتۆتە چ ئاستێك؟.

لە ڕاپرسییەکدا کە بێژەری بەناوبانگی کەناڵی بەریتانی BBC جۆن هێمڤری ئەنجامی داوە و ٢٢٠٠ هاوڵاتی بەریتانی بەشدارییان تێدا کردووە، ئەنجامەکەی بەم شێوەیە بووە:

٢٨٪باوەڕیان بە خودا هەیە، ٢٦٪ باوەڕیان بە شتێك هەیەبەڵام دڵنیانین کە چییە، ١٦٪ خۆیان بە بێباوەڕ دەزانن، ٩٪ نەزانکارن (لە ناویاندا هێمڤری خۆیشی). ئەوانەی ماونەتەوەش یان ئەوەتا بیریان لە بابەتەکە نەکردۆتەوە، یان نەیانزانیوە، یان وەڵامیان نەداوەتەوە.

لە توێژینەوەیەکیشدا کە هەمدیسان کەناڵی BBC لە ساڵی ٢٠٠٤ لە (١٠) دە وڵاتی ئەورووپی ئەنجامی داوە، ڕێژەی بێباوەڕان ٨٪ بووە. لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش، پەیمانگای جالوب لە ساڵی ٢٠٠٥ توێژینەوەیەکی ئەنجامداوە، دەریخستووە کە ڕێژەی بێباوەڕان ٥٪ ە، زۆر توێژینەوەی تریش هەن کە ئەنجامی نزیك لە ئەنجامەکانی پێشوویان دەرخستووە.

هەرچی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتن، ئەوا ئاماری وردمان لە بەردەستدا نییە، بەڵام بەگشتی وا دەردەکەوێت کە ڕێژەکە زۆر لەوە کەمترە، ئەگەرچی شەپۆلێکی بێباوەڕیی لە دوای شۆڕشەکانی بەهاری عەرەبی و ئەو ئازادییەی فەراهەمی کردووە دەرکەوتووە، کە لە تەوەرەی دوازدەهەمدا باسی لێوە دەکەین.

# فەلسەفەی بێباوەڕیی هاوچەرخ

گومان لەوەدا نییە کە هۆکاری سەرەکی بێهێزبوونی ئایین لە ڕۆژئاوا و لە سەردەمی نوێدا بریتییە لە بڵاویی ئەو فەلسەفانەی کە میتافیزیکا (دواوەی سروشت) ڕەتدەکەنەوەو زانست لە لایەنی تاقیکاری کورتدەکەنەوە، تەنانەت لە زانستە مرۆییەکانیش!. جا بۆ ئەوەی بتوانین بەدواداچوون بۆ کاروانی بێباوەڕیی هاوچەرخ بکەین، ڕەوشی فەلسەفەی بێباوەڕیی لە سەدەی بیستەم و سەرەتای سەدەی بیست و یەکەم دەخەینەڕوو، ئەویش لە ڕێگەی خستنەڕووی چەمکەکانی فەلسەفەی ماددیگەرایی لۆژیکی Logical Positivism و بێباوەڕیی نوێ New Atheism.

## فەلسەفەی ماددیگەرایی لۆژیکی Logical Positivism :

فەیلەسووفی فەڕەنسی (ئۆگست کۆمت[1] August comte) بەدامەزرێنەری فەلسەفەی ماددیگەرایی دادەنرێت، کە تەنیا لە دیاردە و ڕاستییە ماددییەکان دەکۆڵێتەوە و، دروشمی (ئەوەی ناتوانرێ ببینرێ بوونی نییە) بەرز دەکاتەوە،

---

(١) ئۆگست کۆمت: فەیلەسوف و زانای کۆمەڵناسی بەناوبانگی فەڕەنسی (١٧٩٨-١٨٧٥).

هەموو بیرکردنەوەیەکی غەیبی ڕەتدەکاتەوە، لە سەرووی هەمووشیانەوە بوونی خودا.

پاشان فەیلەسووفی ئینگلیزی سێر ئەلفرێد ئایەر[1] A.J.Ayer لە ساڵی ١٩٣٦ فەلسەفەی مادیگەرایی لۆژیکی[2] Logical Positivism وەك لقێك لە فەلسەفەی مادیگەرایی خستەڕوو. ئەم فەلسەفەیەش لەسەر (بنەمای سەلماندن The verification Principle) وەستاوە، کە پێی وایە وەرگرتنی هەر گریمانەیەك یان پرسێك لەسەر توانای سەلماندنی یان ڕەتکردنەوەی وەستاوە، ئەمەش لە ڕێگەی کرداری و بە تاقیکردنەوە، یان بە بیرکاری، یان بە لۆژیکی، لە ڕێگەی واتای ئەو وشانەی ئەم چەمکە ڕوون دەکەنەوە. تا لێرەدا، هەر گریمانەیەك یان پرسێك بکەوێتە دەرەوەی بازنەی زانستی ئەزموونگەرایی یان بیرکاری یان لۆژیکی ڕاستەوخۆ، هیچ مانا و بەهایەکی نییە.

هەر لێرەوە، فەلسەفەی مادیگەرایی لۆژیکی پێی وایە چەمکەکانی وەك خودا، ڕۆح، دینداری، بێباوەڕی هیچ مانایان نییە؛ چونکە ناتوانرێ ڕاستی و هەڵەی ئەو چەمکانە بەشێوەیەکی تاقیگەیی یان بیرکاری یان لۆژیکی بسەلمێنرێت، لەبەر ئەوە قسەیەکی وەك (خودا بوونی هەیە) هیچ مانایەکی نییە، بۆیە مرۆڤ باوەڕدار یان بێباوەڕ بێت لە بەرامبەر عەقڵدا یەکسانە.

سەردەمی فەلسەفەی مادیگەرایی لۆژیکی بەوە کۆتایی هات، کاتێك بیردۆزەر و پێشەوا گەورەکەی (سێر ئایەر) لە پەنجاکانی سەدەی بیستەم ڕایگەیاند کە ئەم فەلسەفەیە پڕە لە دژیەك و پێچەوانە، سەرەڕای ئەوەی ساڵانێکی دوور و درێژی لە چارەسەرکردنی هەڵەکانی ئەم فەلسەفەیەدا بەسەر بردبوو.

---

(١) سێر ئەلفرێد ئایەر (١٩١٠-١٩٨٩): فەیلەسووفێکی ئینگلیزییە و، بەرپرسی یانەی سوقراتە لە زانکۆی ئۆکسفۆرد

(٢) ئایەر ئەم پرسەی لە کتێبی (زمان و ڕاستی و لۆژیك Language، Truth and Logical خستۆتەڕوو یەکەمین دەرکەوتنی ئەم فەلسەفەیەش لە بیستەکانی سەدەی بیستەم بوو، لەلایەن کۆمەڵێك فەیلەسووفی ئەورووپی، کە بە کۆمەڵەی (ڤیەننا) ناسراون.

ئایەر دەرکی بەوە کردبوو کە وەك چۆن ناتوانرێ یاساکانی گەڕان و لێکۆڵینەوە لەو زانستە پراکتیکییەکانەی، کە لەسەر هەستەکان وەستاون (وەك کیمیا و فیزیا) لەسەر زانستە مرۆڤایەتییەکانی (وەك فەلسەفە و لۆژیك و ڕەوشت) جێبەجێی بکەین. بەم جۆرەش ناتوانرێ لێکۆڵینەوە لە چەمکە ئایینییەکان بە پێوەری چەمکە زانستییەکان بێت، بۆیە - بۆ نموونە - پێویست ناکات هەوڵدان بۆ تێگەیشتن لە قسەی (خودا لە هەموو شوێنێك بوونی هەیە - كلي الوجود)، بە پێوەری شوێن لە فیزیای نیوتن یان فیزیای ئەنیشتاین بپێورێت.

بەم شێوەیە ئایەر هەڵستا بە ڕاگەیاندنی مردنی فەلسەفەی مادیگەرایی لۆژیکی و بەخاکسپاردنی.

## گەڕانەوەی هۆش و دینداری عەقڵانی Rational Theism :

فەیلەسووفەکان دەستیان لە فەلسەفەی ماددیگەرایی لۆژیکی بەردا، دوای ئەوەی ئەنتۆنی فلو[1] دەرگای گفتوگۆکردنی لەگەڵ دیندارەکاندا خستەسەر پشت، ئیتر لە گۆڕەپانەکەدا کۆمەڵە پرسیارێك پەیدابوون دەربارەی واتای (بوونی خودایی– الوجود الالهي)، یان ئەگەری بوونی باوەڕێکی خوارسك بە خودا لە دەروونماندا و...

ئەم ڕەوتە لە بەرگی گۆڤاری تایم Time لە ژمارەی ئەپرێلی (١٩٨٠) زۆر بە ئاشکرایی دەرکەوت، لە وتاری بەرگەکەدا هاتبوو: ((هەندێك لە گەورە فەیلەسووفەکان شۆڕشێکی هزری سپی بەڕێوەدەبەن، کە لەماوەی دوو دەیەدا هیچ کەس چاوەڕێی نەدەکرد، ئەم شۆڕشە ئامانجی ئەوەیە خودا بگێڕێتەوە سەر عەرشی خۆی)).

---

(١) پاش کەمێکی تر دەیناسێنین و ڕۆڵی لە پرسی بێباوەڕیدا دەخەینەڕوو.

## بێباوەڕی نوێ The New Atheism :

### هەڵگەڕانەوە بەرەو فەلسەفەی ماددیگەرایی لۆژیکی :

جارێکی دی بێباوەڕی لەسەر یەك کەڵەکە دەبێتەوە، تا لەژێر ناوی بێباوەڕی نوێ The New Atheism سەری دەربێنێت، ئەم زاراوەیە بۆ یەکەمین جار لە گۆڤاری تۆڕی زانیاری[1] Wired Magazine ی ژمارەی نۆڤێمبەری (٢٠٠٦) بەکارهات.

ئەو کتێبانەی باسی ئەم چەمکە تازەیەیان دەکرد ڕەواجێکی زۆریان پەیداکرد؛ چونکە ڕاگەیاندن ماددیەکی دەوڵەمەند و گەرم و گوڕو وروژێنەری تێدا چنگ کەوت، سەرەڕای سادەیی ئەو بەڵگانەی دەیانخستەڕوو[2].

ئەو نووسینانە هێرشیان دەکردە سەر هەموو ئایینەکان (ئاسمانی و زەمینی)، بەڵام بە زاراوەیەکی ئامۆژگاریکارانە ئەو کارەیان دەکرد و، نووسەرەکان جلی ئەو ئامۆژگاریکارانەیان دەپۆشی کە خوێنەریان وەك نەفام و ڕووکەش سەیردەکرد، ئەنگوستی نەفرەتیان ئاڕاستە دەکردن ئەگەر تۆبە لەسەر باوەڕە سادەکەیان بە خودا و پەروەردگاریەتی (الربوبيه والألوهية) نەکەن!.

---

(١) گۆڤاری تۆڕی زانیاری Wired Magazine:

(٢) لە گرنگترین ئەو کتێبانە :

- The Blind watch maker.
- The God Delusion.
- Breaking the spells.
- Six Impossible things Befor Break fast.

لەسەر خوێنەرانی ئەم نووسەرانە پێویست بوو کە هەڵوێستێکی دیاریکراویان هەبێت: ئەوەی لەگەڵیان نەبێت دژیانە، یان سپی یان ڕەش، بواری فێڵبازی و هەڵوێستی ناڕوون نییە! تەنانەت ئەو فەیلەسوفە گەورانەش کە ڕێزیان بۆ هەندێك بەڵگەی دیندارەکان دادەنا، خرانە ناو لیستی ڕەش و کاروانی خیانەتکار و سادە و ڕووکەشەکان.

## ئەنتۆنی فلو لە کاروانی بێباوەڕیدا :

بێنەوەی بوێریمان لەسەر وردی زانستییەوە هەبێت، دەتوانین بڵێین کە سێر ئەنتۆنی فلو[1] مامۆستای فەلسەفەی بەناوبانگی بەریتانی پێشەوای بزووتنەوەی بێباوەڕیی بوو بۆ ماوەی زیاتر لە نیو سەدە. زیاتر لە سی کتێب و توێژینەوەی فەلسەفی نووسیوەکە وەك تەخشەڕێگای هزری بێباوەڕیی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم وابوو.

لەبەر ئەوە هەواڵی داننانی ئەنتۆنی فلو بەوەی (کە خودایەك هەیە) وەك هەورەتریشقە دای بەسەر فەیلەسوف و بیرمەندە بێباوەڕەکان، ئیتر کەوتنە پەلەقاژێ بۆ بەرگریکردن لە باوەڕی پیرۆزی بێباوەڕییان! تووڕەیی و بێزاریی خۆیان بەرامبەر بەو گۆڕانە نیشاندا و هەرچی تۆمەتی خراپە خستیانە پاڵ ئەو پیاوە.

---

(١) Sir Antony Flew : لە ١٩٢٣/٢/١١ لەلەندەن لەدایك بووە، باوکی یەکێك بوو لە گەورە پیاوانی ئاینی مەسیحی، هەر لە گەنجییەوە بوو بە بێباوەڕ و پاشان بووە فەیلەسوفێکی بێباوەڕ. کاتێك گەیشتە تەمەنی هەشتا ساڵی(دیسەمبەری ٢٠٠٤) رایگەیاند کە بەهۆی بەڵگەی زانستیی گەیشتۆتە ئەو باوەڕەکی کە خودایەك هەیە. لە ساڵی ٢٠٠٧ کتێبێکی دەرکرد کە تیایدا هۆکارەکانی باوەڕهێنانی روونکردۆتەوە، کتێبەکە بە ناوونیشانی ئەوەی کە خودایەك هەیە: چۆن توندترین بێباوەڕ لە بێباوەڕیی هەڵگەڕایەوە.
There is a god: How the worlds most notorious atheist changed his mind
لە ٢٠١٠/٤/٨ لە لەندەن کۆچی دوایی کردووە.

لەچوارچێوەی باسکردن لە فەلسەفەی بێباوەڕیی هاوچەرخدا دەپرسین: ئەنتۆنی فلو لە ڕێبازی چارەسەرکردنی فەلسەفەی بێباوەڕیدا چی زیاد کرد؟.

دەکرێ بگوترێت - بەبێ هیچ زیادەڕۆییەک-کە لەماوەی سەد ساڵی ڕابردوودا هیچ فەیلەسووفێکی خاوەن سەنگێکی بێباوەڕی بەشێوازی قووڵ و ڕێکخراوی ئەنتۆنی فلو هزری بێباوەڕیی نەخستۆتەڕوو، چونکە ئەو پیاوە بەڵگەی نوێی دژی باوەڕبوون بە خودا خستەڕوو، هەروەك چۆن بە بیرۆکە ڕەسەنەکانی ئەخشەڕێگایەکی بۆ ئەو فەیلەسووفانە دانا کە لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم دژی باوەڕ و دینداریی دەوەستانەوە.

ئەگەر کتێبی فەیلەسووفێکی گەورەی وەك (بێرتراند ڕاسل[1] Bertrand Russel) بە نموونە وەربگرین وەك کتێبێکی بێباوەڕیی کە لە سەدەی نۆزدەم و بیستەمدا نووسراوە، دەبینین لە چوارچێوەی وتارگەلێکی ئەدەبی ڕووکەش دەرناچن و هزرێکی قووڵ ناخەنەڕوو، لە باشترین بارودۆخی کتێبەکەدا تەنیا کێشە دەروونییەکانی مرۆڤ وەك (کۆژانەکانی مرۆڤ بەهۆی خراپە و ئازار) دەخاتەڕوو، بەبێ ئەوەی چارەسەرێکی تازەیان بۆ بدۆزێتەوە[2].

---

(١) بێرتراند ڕاسل Bertrand Russel: لە ڕێلز لەدایك بووە (١٨٧٢-١٩٧٠). کە فەیلەسووفێکی گەورە و پیاوێکی لۆژیکی بوو، یەکێك بوو لە زانایانی بیرکاری و شارەزا بوو لە مێژووی ئینگلیز. هەروەها یەکێك بوو لە نەیارانی جەنگ و داگیرکاری. لە ساڵی ١٩٥٠ خەڵاتی نۆبڵی لە ئەدەب وەرگرتووە؛ ئەمەش بەهۆی نووسینەکانی لەسەر نموونە باڵاکانی مرۆڤایەتی و بەرگریکردنی لە ئازادی بیروڕا.

(٢) لێرەدا ئاماژە بۆ سێ توێژینەوەی دیاری بواری فەلسەفەی بێباوەڕیی دەکەین کە ئەنتۆنی فلو دایناون:

یەکەم: ساختەیی زانستی لاهوت Theology and falsification : توێژینەوەیەکە ئەنتۆنی فلو لەساڵی ١٩٥٠ پێشکەشی کردووە، تێیدا هەوڵیداوە کە پرسی باوەڕ لە بناغەوە هەڵبتەکێنێت، بەوپێیەی جەختی لەوە کردۆتەوە کە گوتارە ئاینییەکان خاڵین لە چەمك و دەستەواژەی واتادار. لەهەمان کاتدا بانگەوازی بۆ گفتوگۆی نێوان بێباوەڕان و باوەڕداران کردووە. ئەم توێژینەوەیە یەکێك بوو لە بڵاوترین توێژینەوەکانی سەدەی بیستەم.

دووەم: خودا و فەلسەفە God and philosophy ١٩٦٦ز: تیایدا فلو جەخت لەوە دەکاتەوە کە پێویستە لەپرسی (ئایا خودایەك هەیە؟)دا هیچ بڕیارێك نەدرێت، بەرلەوەی دیندارەکان دیدێکی ڕوون بۆ سیفەتەکانی ئەو خودایە بخەنەڕوو، هەروەها ئەو پێی وایە کە هیچ واتایەك بۆ وەسفی دیندارەکان نییە بەوەی کە خودا (ڕۆح، هەموو بوون، هەموو زانستە).

وا دیارە کە فەیلەسوفە مەزنەکان خۆیان لەوە بە گەورەتر زانیوە کە ((دەستە ناسکەکانیان و عەقڵە داناکانیان بەم کێشە بازاڕییە ناست نزمە پیس بکەن!))، کێشەی دینداری و بێباوەڕیی.

لەکۆتاییدا دەڵێین: ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەیە کە سێر ئەنتۆنی فلو کە لە دژی فەلسەفەی مادیگەرایی بێباوەڕیی وەستایەوە و ئەو خۆبەگەورەزانیی و سووک تەماشاکردنەی بەرامبەر بە چەمکە ئایینییەکان دەکرا رەتیکردەوە، هەر خۆی لە دژی بێباوەڕیی نوێ وەستایەوە. ئەو ئەو پیاوە بوو کە توانای بەرپەرچدانەوەی بەڵگەکانی بێباوەڕە کۆن و نوێیەکانی هەبوو، هەڵدەستا بە شیکردنەوەی ئەوەی زانستی نوێ لەو بارەیەوە پێشکەشی دەکات. لە تەوەرەی سێزدەهەمدا بە جۆرێك لە درێژی باسی لێوە دەکەین.

## ڕێبازی بێباوەڕە نوێیەکان :

((ئەگەر پشیلەکان نەشبن بە ڕەوە Herd ئەوا ژمارەیەکی زۆریان دەتوانن دەنگەدەنگێکی بێزارکەری وا دروست بکەن کە نەتوانرێ پشتگوێ بخرێن).

ئا بەم شێوەیە ریچارد دۆوکنزی[1] گەورەی بێباوەڕە نوێیەکان ڕێبازی

---

سێیەم: کتێبی گریمانەی بێباوەڕیی The Presumption of Atheism ١٩٧٦ز: تێیدا فلو تۆپەکە دەخاتە گۆڕەپانی دیندارەکان و کاری سەلماندنی خودایان پێدەسپێرێت، لەکاتێکدا شێوازی فەلسەفی پێشوو داوای سەلماندنی نەبوونی خودای لە بێباوەڕان دەکرد.

(١) ریچارد دۆوکنز Richard Dawkins: زانایەکی بەریتانییە لە نیروبی لە کینیا لە ساڵی ١٩٤١ لەدایك بووە. ئێستا لە ئۆکسفۆرد دەژی. زانایەکی بایۆلۆجییە، پێشتر مامۆستای سادەکردنەوەی زانستەکان بوو لە زانکۆی ئۆکسفۆرد. لە ڕێی کتێبی (جینی خۆپەرست The Selfish Gene بەناوبانگ بوو کە لە ساڵی ١٩٧٦ دەرچوو، کە تیایدا تێگەیشتنی خۆی بۆ پەرەسەندن لە ڕێی جیناتەوە خستۆتەڕوو. یەکێکە لە نەیارانی چەمکی دروستبوونی تایبەت و دیزاینی زیرەك، هەروەك لە کتێبی (دروستکەرە کوێرەکەی

کارکردنی ئایینە بۆ مێگەلەکەی دیاریدەکات (هەروەك خۆی) لە کتێبی (وهم الإله) باسی کردووە، داوای ژاوەژاوو قیژەقیژی زیاترو زیاتر دەکات لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئایینەکان. بەڵام بۆچی؟ چی پاڵنەریانە؟ ئامانجیان چییە؟.

لەدوای ریچارد دۆکنز (گەورەی مێگەلی بێباوەڕە نوێیەکان) سێ سەربازی بێباوەڕی لەو کەمناوبانگتر دێن. یەکەمیان کەسێکی بەریتانیەو لەئەمریکا لە دایکبووە بەناوی کریستۆفەر هیتچنز Christopher Hitchens نووسەرو ڕاگەیاندکار و مامۆستای لێکۆڵینەوە ئازادەکانە لە نیویۆرك، بەهۆی کتێبی (خودا گەورە نییە God is not Great) ناوبانگی دەرکرد، لەدوای ئەویش فەیلەسووف دانیێل دێنیت Daniel Dennett دێت، ئەو خۆی وەها وەسف دەکات کە فەیلەسووفێکە هیچ خودایەکی نییە، خاوەنی کتێبی: (دەرچوون لەدەق: ئایین وەك دیاردەیەکی سروشتی Breaking the Spell: Religion as a Natural Phenomenon)، لەکۆتاییشیاندا بچووکترینیان دێت، سام هاریس Sam Harris پسپۆڕی زانستەکانی مێشك و دەمار، خاوەنی کتێبی (کۆتایی باوەڕ: وتارێك بۆ گەلی مەسیحی The End Of Faith، Letter To a Christian Nation).

جگە لەم کۆمەڵە چوارقۆڵییەی بێباوەڕان، لەم ساڵانەی دوایی سەرۆکی بەشی فیزیای تیۆری پێشووی کامبریدج ستیڤن هۆکینگ[1] Stephen

---

کاتژمێر The Blind watch maker)دا باسی کردووە. لە ساڵی ٢٠٠٦ کتێبی (وەهمی خودا The God Delusion)ی دەرکرد، کە تێیدا بوونی هەموو هێزێکی غەیبی ڕەتدەکاتەوە و وەك گومڕایی و خەڵەفان سەیری ئیمان دەکات، لە ئێستادا لە هەموویان بەناوبانگترە.

(١) (ستیڤن هۆکینگ Stephen Hawking: زانای فیزیای تیۆری و بیرکاری پراکتیکی بەریتانی، مامۆستای بیرکارییە لە زانکۆی کامبریدج، لە شوێنی ئیسحاق نیوتن. لە ساڵی ١٩٤٢ لەدایك بووە. بە توێژینەوەکانی لە بواری گەردوونناسیدا بەناوبانگە بەتایبەت کونە ڕەشەکان. هەوڵی سادەکردنەوەی زانستەکانی داوە بۆ خەڵکی ئاسایی. کتێبەکەی (مێژوویەکی کورتی کات) یەکێکە لە پڕ فرۆشترین کتێبی زانستی بە درێژایی مێژوو، بەو پێیەی هەر ٥٠٠ کەسێك لەسەر ڕوی زەوی کتێبێکی لێ کڕیوە. لە سەرەتای گەنجیدا تووشی نەخۆشی Amyotrophic lateral sclerosis بوو، کە تووشی پەککەوتوویی تەواوی کرد لە ماسولکەکانی مل و سەردا، لە ڕێی دەزگای ئەلیکترۆنییەوە لە ڕێی جوڵەی چاو و لێوەکانی پەیوەندی لەگەڵ دەوروبەریدا هەیە!!چونکە توانای قسەکردنی لەدەست داوە.

Hawking وەك ئەستێرەیەكی بێباوەڕیی درەوشایەوە، دوای ئەوەی بۆماوەیەكی دوور و درێژ دەرگاكەی بەپێچ و پەنای ناڕاستەوخۆ هێشتەوە، لەدوایین كتێبیدا (دیزاینە مەزنەكە The Grand Design)دا رایگەیاند، كە هیچ بوارێك بۆ ئەوە نەماوەتەوە، كە ددان بە بوونی خودادا بنێین[1].

## ئامرازەكانی بێزاركردن :

لە پێناو ئەوەی ڕەوەی پشیلەكان و گەورەكەیان دۆوكنز دەنگەدەنگی پێویست دەربخەن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئایینەكان، ئەوا تەنیا بە ئامرازە باوەكان وازیان نەهێنا؛ وەك نووسینی كتێب و وتار و پێشكەشكردنی وانە و بەستنی دیبەیت و دەركەوتن لە بەرنامەی تەلەفزیۆنی و كەناڵە ئاسمانییەكان و قسەكردن لەڕێی تۆڕی زانیاریەكان(ئینتەرنێت)، ئەمانە ڕێگای باون بۆ خستنەڕووی بیرو بۆچوونەكان، بەڵام ئەوان بەوەندە وازیان نەهێنا، بەڵكو چەند ڕێگای نوێیان داهێناوە.

لەكاتی پیاسەكردنت بە ناو شەقامەكانی لەندەندا، دەكرێ چاوت بكەوێتە سەر پاسی گواستنەوەی گشتی ڕەنگ سووری دوو نهۆمی كە ریكلامی وانەیەك یان دیبەیتێكی دۆوكنزی پێوە هەڵواسراوە. زۆر جاران چاوت بەریكلامێك دەكەوێت تێیدا نووسراوە: ((ڕەنگبێ هیچ خودایەك بوونی نەبێت، با دڵەڕاوكێت

---

(١) لەوانەی بە زمانی ئینگلیزی ئانووسن. فەیلەسوفی فەرەنسی مایكل ئۆنفرای Michel Onfray خاوەنی كتێبی بەرگری لە بێباوەڕی In Defence of atheism و لە ئیتاڵیا پیێرجۆرجیۆ ئۆدیفرێدی Piergiorgio Odiffreddi خاوەنی كتێبی(بۆچی ناتوانین مەسیحی بین Why we cant be Christians كە تیایدا گاڵتە بە كڵێسا دەكات.

هەرچی جیهانی ئیسلامییە سەرەڕای دەركەوتنی شەپۆلێكی بێباوەڕی لەم دواییانەو زیادبوونی لەگەڵ بەهاری عەرەبیدا، بەڵام هێشتا دەنگی بێباوەڕان بەرز نییە و هێشتا زۆربەیان شاراوەن. لەتەوەری دوازدەهەمدا باس لە هەندێك نموونە و خاسیەتەكانی بێباوەڕییان دەكەین.

نەبێت، چێژ لە ژیانت وەربگرە))[1]، ئەمە سەرەڕای ئەوەی ئەم جۆرە نووسینانە لەسەر کاڵا جیاوازەکانیش بەرچاودەکەون بۆنموونە لەسەر بیرە. دۆوکنز خۆی کرێی زۆربەی ئەو هەڵمەتانە لە ئەستۆ دەگرێت.

یەکێکی تر لە ریکلامەکانی سەر پاسەکان، کە دۆوکنز بە هاوبەشی لەگەڵ یەکێتی مافی مرۆڤی بەریتانیا لە ساڵی (٢٠٠٩)وە کرێکەی دەدەن، ئەو ریکلامەیە کە تیایدا دوو منداڵی دڵخۆش دەردەکەون و هەر یەکێکیان بە دایك و باوکی دەڵێت: (تکایە بە(دیندار)م دامەنێن، لێگەڕێن گەورەبم و خۆم بەئازادی بیروباوەڕم هەڵبژێرم)[2]. لەڕاستیدا ئەم ریکلامە بەناوی ئازادی ویست و ئیرادە بانگەشە بۆ بێباوەڕیی دەکات، بێباوەڕان پێمان دەڵێن کە منداڵەکانمان نەخەینە ژێر کاریگەری پەروەردەیەکی وا کە بۆ باوەڕ بانگیان بکات، کەچی خۆیان دەستپێشخەری دەکەن لە دانانی کاریگەریی لەسەریان و بۆ بێباوەڕیی ئاڕاستەیان دەکەن. بە هەمان شێوە ریکلامی: (رەنگبێ هیچ خودایەك بوونی نەبێت، دڵەڕاوکێت نەبێت، چێژ لە ژیانت وەربگرە)) هەڵخلیسکانێکی پەروەردەیی مەترسیدارە.

لە ئەڵمانیاشدا، بێباوەڕان نەیانتوانی مۆڵەت وەرگرن بۆ هەڵواسینی ئەو دروشمەکانە لەسەر پاسە گشتییەکان، بۆیە پاسی تایبەتییان بەکرێ گرتووە و کۆمەڵێك قسەیان لەسەر هەڵواسیون، وەك: ((هیچ خودایەك نییە))[3]،((ژیانی خۆش پێویستی بە باوەڕ نییە)). بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم هەڵمەتانەش مەسیحییەکان چەند پاسێکیان دەستەبەر کردووەو لەسەریان نووسیوە: ((چی ڕوودەدات ئەگەر سەلمێندرا خودا هەیە)). ڕاگەیاندنەکانیش ئەم دیمەنانەی پاسەکانیان قۆستۆتەوەو وێنەیان دەگرن و دەیانکەن بابەتی گەرموگوڕی بەرنامەکانیان.

---

(١) There is probably no God. now stop worrying and enjoy your life

(٢) Please don't label me. let me grow up and choose for my self

(٣) بەریتانییەکان وشەی(probably)بەپێی گومانی زۆر خودا بوونی نییە، بەکاردێنن لەترسی ئەوەی لەلایەن دیندارەکانەوە تووشی لێپێچینەوەی یاسایی ببن، چونکە بێباوەڕان ناتوانن بیسەلمێنن کە خودا بوونی نییە.

## نەخشەکێشان: جێگرەوەی خــودا

شتێکی سروشتییە کە بێباوەڕان دیداریان هەبێت بۆ ئەوەی بگەنە یەك بۆ ئەوەی قسەکانیان یەکبخەن و نەخشەرێگایەك بۆ مێگەلەکەیان دابنێن تا ژاوەژاوو دەنگەدەنگێکی زیاتر دروست بکەن. یەك لە گرنگترین دیدارەکانیشیان ئەو کۆنگرەیە بوو کە ساڵی ٢٠٠٦ لە دامەزراوەی ساڵك Salk لە کالیفۆڕنیا بەسترا. ناوونیشانی کۆنگرەکە بریتی بوو لە: (چی لەپشت باوەڕەوە هەیە: زانست - ئایین - عەقڵ - ژیان)[1]، هەر یەك لە گەورە بێباوەڕانی وەك ریچارد دۆوکنز و ستیڤن و وینبێرگ بە وتار بەشداریان تێدا کرد.

ناوونیشانی کۆنگرەکە ئەوە دەردەخات کە بێباوەڕیی نوێ تەنیا جەخت لەسەر عەلمانیەتی گشتگیر ناکاتەوە لە ڕێگەی سڕینەوەی خودا لە بووندا، بەڵکو بەهەمان شێوە گرنگی بە دانانی جێگرەوەیەکیش دەدات. هەروەها ناوونیشانەکە جەخت لەوە دەکاتەوە کە ئەوەی بەو کارە هەڵدەستێت کۆمەڵگە و فەلسەفە نین، بەڵکو تەنیا زانستە توانای خستنەڕووی جێگرەوەکەی هەیە، تەنیا زانست پادشایە.

کۆنگرەکە سێ پرسیاری دەخستەڕوو:

١- ئایا زانست دەتوانێت ئایین لە ژیان بخاتە دەرەوە؟

٢- زانست چ شتێك وەك جێگرەوەی ئایین دەخاتەڕوو؟

٣- ئایا دەکرێ بەبێ ئایین کەسی باش بین(Good)؟

دوو پرسیاری یەکەم ئەو ڕاستییە دەردەخەن کە بێباوەڕیی بەشێکە لە ئامانجێکی گەورەتر، ئەویش دانانی زانستە لەسەر عەرشی گەردوون و مرۆڤ، لەبەرئەوەی

---

(1) Beyond Belief: Science, Religion, Reason and Survival

ڕێکخەرانی کۆنگرەکە دەیانزانی کە بەها مەسیحییەکان سەرچاوەی چەمکە ڕەوشتییەکانن لە ڕۆژئاوادا، بۆیە پرسیاری سێیەمیان دانا، بە مەبەستی ئەوەی بە یەکجاری ئایین لە تەواوی کایەکانی ژیان وەدەرنێن، بەمەش بیسەلمێنن کە ئایین بە تەنیا لە لایەنی عەقڵی و زانستییەوە هەڵە نییە، بەڵکو لەلایەنی بەها و ڕەوشتیەکانیش.

کۆنگرەکە بە دانانی چەند چەمکێکی بنچینەیی کۆتایی پێهات کە پێویستە خشتەی کارەکانی بێباوەڕی هاوچەرخی لێوە دەربچن، ئەو چەمکانەش بریتین لە:

١- ئایین وەهمێکی مەترسیدارەو دەبێتە مایەی توندوتیژی و جەنگ.

٢- پێویستە خۆمان لە ئایین ڕزگار بکەین، زانستیش بەم کارە هەڵدەستێت.

٣- پێویستیمان بە خودایەك نییە تا بە ڕەوشت بین، دەکرێ بێباوەڕی دەرچەیێکی بەهێزبێت بۆ گەیشتن بە ڕەوشتبەرزی.

گۆڤاری The New Scientist ئەم کۆنگرەیەی بە کۆنگرەیەکی زۆر گرنگ دانا، تەنانەت لە ژمارەی تایبەتی بەبۆنەی تێپەڕبوونی پەنجا ساڵ بەسەر دەرچوونیدا وتارێکی دەربارەی کۆنگرەکە بڵاوکردۆتەوە بەناوونیشانی (جێگرەوەی خودا In Place Of God).

## ئایا بێباوەڕە نوێیەکان شتێکی نوێیان پێیە؟

بێباوەڕە نوێیەکان ناوێکی نوێ لەخۆیان دەنێن The Brights (درەوشاوەکان- بریسکەدارەکان - ڕووناکی بەخشەکان - شەوقدارەکان، پرشنگدارەکان، زیرەکەکان - ....)، کە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە کەسانی دیکە (دیندارەکان) کەسانێکی (تاریك- کووژاوە- تەمبەڵ- تەنانەت گەمژەن). بێباوەڕە نوێیەکان وەها

پێناسەی خۆیان دەکەن کە چەمکە زانستییەکان وەردەگرن و چەمکە غەیبییەکان ڕەتدەکەنەوە. هەروەها ئەوان خۆیان بە وەچەو نەژادی قۆناغی ڕۆشنگەریی Enlightenment دەزانن، کە لە ئەوروپادا لە سەرەتاکانی سەردەمی نوێ لە دژی تاریکی چەمکە ئایینییەکان دەرکەوت کە باڵی بەسەر ئەوروپادا کێشابوو لە سەدەکانی ناوەڕاستدا.

ئەو پرسیارەی لێرەدا خۆی دەخاتەڕوو ئەوەیە کە: ئایا نووسەرانی ئەم تەوژمە توانیویانە بابەتی گفتوگۆ فەلسەفی و زانستییەکان کە لە دەیەکانی ڕابردوودا دەربارەی ئایین وروژێنراون دەوڵەمەندتر بکەن؟

**وەڵامەکە بە نەخێرە، لەبەر سێ هۆکار:**

یەکەم: زانا خۆبەفەیلەسووفزانە بێباوەڕە نوێیەکان هیچ شتێکی نوێیان لەپرسە فەلسەفییەکانی پەیوەست بە خوایەتی[1] نەخستۆتەڕوو، بەڵکو دەبینین زۆر بە سەیروسەمەرەیی لەو پرسانە رادەکەن. ئەوەتا گەورەکەیان ریچارد دۆوکنز درووستبوونی ژیان و عەقڵ وەسف دەکات و دەڵێت (ڕووداوێکی لابەلا بوو لە ئەنجامی لێدانی بەخت)ەوە ڕوویدا!، هەروەها لویس وۆلبێرت[2] دەڵێت: (لە باسی درووستبوونی عەقڵ ئەنقەست خۆم لە بێئاگایی داوە؛ چونکە ئێمە هێشتا هیچی لێ تێناگەین!). لە کاتێکدا فەیلەسوف و زانای بایۆلۆجی ئەمریکی دانییل دێنیت[3] گرێکوێرەی درووستبوونی عەقڵ زۆر بە سادەو ساکاری شی دەکاتەوەو دەڵێت: (پاشان موعجیزەکە ڕوویدا!!)

---

(١) لەبەشەکانی کتێبەکەدا ئەم پرسانە دەخەینەڕوو.

(٢) Lewis Wolbert: لە ئینگلتەرا لە ساڵی ١٩٢٩ لەدایک بووە. مامۆستای بایۆلۆجیای پەرەسەندنە لە بەشی شیکاریی لە زانکۆی لەندەن. ڕاگەیاندکار و نووسەرێکی بەناوبانگە، بەناوبانگترین کتێبی Six impossible things before breakfast کە لە ساڵی ٢٠٠٦ دەرچووە.

(٣) دانیال دێنیت Daniel Dennett: مامۆستای فەلسەفەی ئەمریکییە لە بۆستن، لە ساڵی ١٩٤٢ لە دایک بووە.
یەکێکە لەوانەی گرنگی بە فەلسەفەی زانست و عەقڵ و پەیوەندییان بە پەرەسەندنەوە دەدات.

دووەم: بێباوەڕە نوێیەکان دەرکیان بە خاڵە لاوازە بنچینەییەکانی (فەلسەفەی ماددیگەرایی لۆژیکی)ی گۆڕبەگۆڕ نەکردووە، کە کار بۆ زیندووکردنەوەی دەکەن، گرنگترینی ئەو خاڵانەش بریتییە لە جێبەجێکردنی مەنهەجی تاقیگەیی لەسەر زانستە مرۆییەکان. گومانیش لەوەدا نییە، کە هەر کەسێك هەڵە مەنهەجییەکان پشتگوێ بخات لەو پرسەی کاری لەسەر دەکات، ئەوا بێگومان خۆیشی تێدەکەوێت، هەر ئەوەش ڕوویدا.

سێیەم: بێباوەڕە نوێیەکان نە ئاگاداری ئەو لێکۆڵینەوە فەلسەفییە زۆر و زەوەندە نوێیانەن، نە ئەو بەڵگە زانستییە بەهێزانەش کە زانست پێشکەشی کردوون و خزمەتی پرسی باوەڕ دەکەن.

لەبەرئەوە ئەوانەی خۆیان بە بێباوەڕە نوێیەکان The New Atheists ناوزەد دەکەن بەهیچ جۆرێك هیچ چەمك و بەڵگەیەکی نوێیان پێشکەش نەکردووە، تاکە شتی نوێ ئەو شێوازە توند و تیژ و دژایەتییەیە، کە بەکاریدەهێنن، چونکە بەوە نەوەستاون کە ئەو (بێ ئایینانە Atheists) نکوڵی لە بوونی خودابکەن، بەڵکو خۆیان بە دژمنایین Antitheists وەسف دەکەن. سەیری گوتەکەی کریستۆفەر هیتچنز بکە: من بە ئەندازەی ئەوەی دژی ئایینم ئەوەندە بێدین نیم، من تەنیا باوەڕم وانییە کە هەموو ئایینەکان درۆن، تەنانەت باوەڕم وایە کە کاریگەریی کڵێسا زیانبەخشە. پاشان هیتچنز هزری خۆی لەو وتەیە کورت دەکاتەوە کە پێیەوە بەناوبانگ بوو (ئایین هەموو شتێك ژەهراوی دەکات Religion Poisons Every thing)، پاشان سام هاریس پشتگیری لەم قسەیە دەکات و دەڵێت: ئامانجی ئێمە ئەوەیە کە ڕێزی هەموو ئەو بەهاو چەمکانە تێکبشکێنین کە مەسیحییەتی پێ بەناوبانگ بووە.

کەواتە شتە نوێیەکەی بێباوەڕە نوێیەکان هێرشکردنە سەر خودا و ئایینەکانە بەوبەڕی بێڕێزی و چەواشەکاریی، وەك نیشاندانی بەشێك لە لەدەستدانی ڕێزگرتنیان لە مەسیحییەت.

بۆیە بەوپەڕی بابەتیانەوە دەڵێین، کە بێباوەڕیی نوێ هیچ نییە جگە لە هەڵگەڕانەوەیەکی چەواشەکاریی بۆ فەلسەفەی ماددیگەرایی لۆژیکی کە لەلایەن خوێنگەرمترین لایەنگرانی رەتکراوەتەوەو نێژراوە.

## ئەم هەمووو رق و کینەیە چییە دژبە خودا و ئایین و، دژی ئیسلام!

بێباوەڕان لاپەڕە دوای لاپەڕە بە بە دوورو درێژی پڕ دەکەنەوە بە باسی ئەو خراپەکاری و ترس و تۆقاندنەی ئایینەکان دروستی دەکەن؛ هەر لە مسوڵمانە توندڕەوەکان بگرە کە دەبنە مایەی خراپی و توندڕەوی لە رێگەی کارە خۆکوژییەکانیان و رفاندنی خەڵکی بێتاوانەوە، تا دەگاتە دەستدرێژی سێکسی هەندێ قەشە بۆ سەر منداڵان، کە بەمەش بەرائەتی و پاکیان لێ دادەڕن و چەندان کێشەی دەروونیان بۆ دروست دەکەن، هەروەها تا دەگاتە باسی شووشتنەوەی مێشك لەلایەن ئەو پیاوەئایینیانەی لە رێگەی جیاجیاوە سامان و پارەی خەڵکی دەدزن، هەروەها تا باسی پاکتاوی رەگەزیی لە بەلقان و،باسی قەسابخانەو کوشتارگەکانی نێوان کاسۆلیك و پرۆتستانت لە ئێرلەندای باکوور و، تا دەگاتە چینایەتی ئایینی لە کۆمەڵگەی هیندیدا...

دۆوکنز - هەروەك چۆن جۆن لینۆن(گۆرانی بێژی بیتڵز) لە یەکێك لە گۆرانییەکانیدا دەڵێت - رایدەگەینێت کە خەون بە جیهانێکی بێ ئایینەوە دەبینێت؛ جیهانێکی خاڵی لە جەنگی نێوان ئیسرائیلییەکان و فەلەستینییەکان و خاڵی لەوانەی ژنەکانیان دارکاری دەکەن بەهۆی ئەوەی کە بستێکی جەستەیان دەرخستووە.

لە دیدارێکدا کە گۆڤاری (دێر شپێگڵ)ی ئەڵمانی لەگەڵ دۆوکنز ئەنجامیداوە، دۆوکنز دەڵێت کە ڕووداوەکانی ١١[١]ی سێپتێمبەر ئەویان کردە مرۆڤێکی توندڕەو (رادیکاڵی) Radicalised Him. لە شوێنێکی تردا دەڵێت: لەگەڵ دووکەڵ و تەپ و تۆزی تەقینەوەکانی ١١ی سێپتێمبەر هەرچی ڕێزی بۆ ئایینەکان هەمبوو بەباداچوو. گۆڤارەکە دەڵێت کە ئەو ڕووداوە تۆقێنەرە هۆکاری لەدایکبوونی بێباوەڕیی نوێ بوو. ناونیشانی ووتارەکە بریتی بوو لە: خودا لە هەموو شتێك بەرپرسە.

هەروەها لە دیدارێکدا، هەرچی رق و کینەی ناخی دۆوکنز هەبوو بەرامبەر بە ئیسلام لە سەری ڕژا و، رایگەیاند: ((دەکرێ مەسیحییەت دوا قەڵا بێت لەبەردەم خراپەیەکی لەوە خراپتر)). کەواتە پرسەکە دژایەتیکردنی ئایین نییە بەرەهایی، بەڵکو دوژمنایەتی و رق و کینەیە بەرامبەر بە ئیسلام بە تایبەتی، لەکۆتاییدا دەمامکەکە کەوت و حەقیقەتەکە ئاشکرابوو.

هەروەها بێباوەڕان ڕەواج بەو بیرۆکەیەیان دەدەن کە جیهانی پێشکەوتوو چیدی تاقەتی ئارامگرتنی نەماوە بەرامبەر ئایین- بەتایبەتی لەسەر ئیسلام - کە تا ئاستێکی دوور مەودا توندڕەو و مەترسیدار بووە، لەبەرئەوە پێویستە لەناوببرێت. هەروەها ستیڤن وینبێرگ خاوەنی خەڵاتی نۆبڵ دەڵێت: پێویستە جیهان بەخەبەربێتەوە لە کابووسی ئایینەکان کە زۆری خایاند، ئێمە وەك زانایان لەسەرمان پێویستە هەرچی لەدەستمان دێت ئەنجامی بدەین بۆئەوەی دەسەڵاتی ئایین کەم بکەینەوە، بێگومان ئەمە گەورەترین خزمەتە کە پێشکەشی ژیارستانیەتی بکەین! سەرنجی ئەم وشەی (هەرچی لە دەستمان دێت) بدە، ئەگەر گەورەترین خزمەتی زانایان بۆ ژیارستانیەت دژایەتیکردنی ئایینەکان بێت،ئەی کێ گرنگی بە زانست دەدات!

دۆوکنز ڕێگای ئەوە پوخت دەکاتەوە و دەڵێت: پێویستە هۆشیاری خەڵك بەرز بکرێتەوە بە دەرخستنی سەرنجڕاکێشیی بێباوەڕیی، بەمەش قاچەکانی بێباوەڕیی لە جیهانی توندڕەویدا دەچەسپێنین.

---

(١) ئاماژەیە بۆ تەقینەوەی دوو تاوەرە بازرگانییەکەی نیویۆرك لەساڵی ٢٠٠١ز.

**ئەی خودایە.. ئەم هەموو رق و کینەیە چییە لە دژی خودا و، دژی ئایین و، دژی ئیسلام؟!**

گومان لەوەدا نییە کە ئەم جۆرە قسانە دەنگدانەوەی خۆیان دەبێت لەو جیهانەی قیژەو هاواریەتی بە دەست ئەو تیرۆرەی توندئاژۆکان دروستی دەکەن. کێ لە ئێمە خەون بە جیهانێکی خاڵی لەو ترس و تۆقاندنە نابینێت، هیچ کەسیش نکۆڵی لەوە ناکات کە کۆمەڵێك کێشە هەن کە توندڕەوە دیندارەکان دروستی دەکەن.

بەڵام ئایا ئەم توندڕەوییە بەتەنیا لەلایەن ئایینەوە ئەنجام دەدرێت؟ ئایا سەدان کەس بەهۆی ناکۆکی نێوان هاندەرانی تۆپی پێ نەکوژراون!.

ئایا شێواندن و ساختەکردنی مێژوو دەگاتە ئەو رادەیەش؟ ئایا زۆرترین کوژراوانی جەنگەکان قوربانی ململانێ ئایینییەکان بوون؟، ئایا هەر دوو جەنگی جیهانی یەکەم و دووەم-کە دڕوارترین کوشتارگە بوون لە مێژووی مرۆڤایەتیدا- جەنگی ئایینی بوون؟.

ئایا یەکێتی سۆڤیەتی بێ ئایین وڵاتێکی پیرۆز (مدینە فاچلە) بوو؟، ئایا دروستکردنی ئەم دەوڵەتە بێباوەڕە چ زیانێکی لە مرۆڤایەتی دا؟.

ئایا ژیانی مرۆڤ بەبێ ئایین ژیانێکی ئارامە؟، سەرنجی قسەی جان پۆل سارتەر بدەن کە دەڵێت: ((بێباوەڕیی پرسێکی ئازاربەخش و سەختە Atheism is a Long. hard and cruel Business چونکە سەلماندنی نەبوونی خودا لەسەر دەروونی مرۆڤ لە سەلماندنی بوونی قورسترە)). سەبارەت بەو بێباوەڕانەش کە تووشی دڵەڕاوکێ نابن، ئەوانەن کە لە بیرکردنەوە وەستاون.

هەموو ئەو ململانێیانەی بێباوەڕان باسی دەکەن بۆ کەموکورتی دەروونی مرۆڤایەتی دەگەڕێنەوە،کە ئایین - و شتەکانی تر - دەکاتە پەردەی رق و کینەکانی، خۆ ئەگەر ئایینیش نەبێت ئەو دەروونە نەخۆشانە ناکۆکییەکانیان لەژێر ناوێکی تر ئەنجام دەدەن.

## بەدوای یەکدا
## هزری ماددی، ژیارستانیەتی ماددی،
## پاشان بێباوەڕیی[1]

دەرکەوتنی بێباوەڕیی پەیوەندییەکی توندوتۆڵی بە دەرکەوتنی هزری ماددییەوە هەیە، تا ئەو ئەندازەیەی کە دەتوانین بڵێین بێباوەڕیی کوڕی ڕاستەقینەی ئەم هزرەیە. د.عبدالوهاب المسیری لە باشترین ئەو کەسانەیە کە ئەو پەیوەندییەیان بە ڕوونی و گونجاویی لە هاوکێشەگەلێکی وادا خستۆتەڕوو کە ئەستەمە هەڵبوەشێنرێنەوە.

لەبەرئەوە ناکرێ باسی دەرکەوتنی بێباوەڕیی هاوچەرخ و خاسیەتەکانی بکرێت بەبێ خستنەڕووی چەمکەکانی د.المسیری دەربارەی هزری ماددیگەرایی و ژیارستانیەتی ماددی.

---

(١) لە کتێبی: (رحلە الدکتور عبدالوهاب المسیری الفکریە)، توێژینەوەیەکە دەربارەی ژیان و فیکری، نووسینی د.عەمرو شەریف.

د.عبدالوهاب المسیری لە دەمەنهووری میسر لەدایک بووە لەساڵی ١٩٣٨ و لەساڵی ٢٠٠٨ لە قاهیرە کۆچی دوایی کردووە.دەرچووی کۆلێژی ئادابە بەشی زمانی ئینگلیزی لە زانکۆی ئەسکەندەریە، پاشان لە زانکۆی کۆلۆمبیا ماستەری وەرگرتووە، پاشان لە زانکۆی ریتجەرز دکتۆرای وەرگرتووە. گرنگترین کتێبی (موسوعە الیهود والیهودیە والصهیونیە: نموذج معرفي جديد).

## ژیارستانیەتی ماددی :

د.المسیری دەڵێت: ژیارستانیەتی نوێ - لەدیدی مندا - ژیارستانیەتێکی عەقڵانیی ماددییە(نەك تەنیا عەقڵانیی)، چونکە دەستکەوتە گەورەکانی ئەو شارستانیەتە لە (تەکنۆلۆجیا - زانست - هەژموون بەسەر جیهان) بەرهەمی دیدە ماددییەکەیەتی، کە خواستی دوورخستنەوەی زۆرێك لە پێکهاتەکانی ڕەوشتیی و مرۆیی(ڕەگەزی نامادیی)هەیە، ئەمەش بۆ ئەوەی واقیعەکە سادە بکەن بە ئامانجی کۆنتڕۆڵ کردنی(بەوپێیەی شتی سادە نەبێت کۆنتڕۆڵ ناکرێت).

سەبارەت بە شکستەکانی ژیارستانیەتی ماددی نوێ، ئەوە لە دەستکەوتەکانی کەمتر نین، گرنگترین ئەو شکستانەش: قەیرانی ژینگەیی - جەنگە جیهانییەکان - لەدەستدانی ئاڕاستە (واتە مرۆڤ نازانێت بەرەو کوێ دەڕوات) - دەرکەوتنی بێ ئامانجیی(واتا مرۆڤ وادەزانێت کە جیهان هیچ واتایەکی نییە و ڕێکەوتی کوێرانە بەڕێوەی دەبات) - گۆڕانی ئامرازەکان بۆ ئامانج...، ئەم شکستانەش - وەك دەستکەوتەکان - بەرهەمی تێڕوانینی ماددین بۆ ژیارستانیەتی نوێ.

**ژیارستانیەتی نوێ وێنەی (بونیادێکی ماددی) خاوەن دوو ئاست دەنوێنێت:**

ئاستێکی فەلسەفی(هزرە ماددییەکان، کە بەرهەمی عەقڵی ماددین).

ئاستێکی پراکتیکی کرداری، کە لە ڕووکاری ژیارستانیەتی نوێ بە ئەرێنی و نەرێنییەوە خۆی دەنوێنێت.

## عەقلی ماددی :

دەربارەی وەسفکردنی عەقلی ماددی، د. المسیری دەڵێت: عەقلی ماددی (کە ئەو شارستانیەتەی دروست کردووە) عەقڵێکی بێلایەنە. هیچ پەیوەندییەکی بە رەووشت و پرسیارە گشتگیرەکانەوە نییە(کە تایبەتن بە درووستبوونی مرۆڤ و سەرەنجامی و، ئامانج لە بوونی لەناو گەردووندا)هەروەها هیچ پەیوەندییەکی بە پیرۆزی ئەوشتانەشەوە نییە کە سنووری پێنج هەستە ڕاستەوخۆکەی مرۆڤ تێدەپەڕێنن.عەقلی ماددی لەگەڵ ئەو زانیارییانەدا مامەڵە دەکات کە سنووردارن و ناتوانێ لەو زانیاریانە تێپەڕێت کە پێی دەگەن. بۆیە تەنیا ئەو شتانە دەخاتەڕوو کە دەکرێ ناوی بنێین(لۆژیکی ئەمری واقیع) یان (ڕەوشتی گۆڕان) واتا ددان بەوەدا نانێت کەبەهاگەلێکی ڕەوشتی یان مرۆیی جێگیر و نەگۆڕهەن. بەڵکو وایدەبینێت کە هەموو شتێك - بەو بەهایانەشەوە - لە رەوشی گۆڕانکاری بەردەوامدان. هەر لەبەرئەوە ئەم لۆژیکە لەسەر مرۆڤی پێویست دەکات کە بەهاکانی لە واقیعە گۆڕاوەکەی وەربگرێت.

عەقلی ماددیش گرنگی بە خاسیەتە تایبەتەکانی دیاردەکان نادات، یان بە تایبەتمەندییەکانی هەر تاکێك، چونکە جەخت لە لایەنە گشتییەکان دەکاتەوە. دەکرێ بە تیشکی ئێکس بچوێندرێت، کە دەتوانێت وێنەی پەیکەری ئێسکی مرۆڤمان بداتێ، بەڵام ناتوانێت وێنەی ڕاستەقینەی رووی مرۆڤمان لە کاتی دڵتەنگیی و دڵخۆشیدا بۆ بگوازێتەوە. لەهەمان کاتدا ئەم عەقڵە زیادەڕەوی دەکات لە گرنگیدان بە وردەکارییەکان! لەبەرئەوە دەتوانرێت بە مایکرۆسکۆبیش بچوێندرێت کە وردترین پێکهاتەکانی خانەمان نیشان دەدات بەبێ ئەوەی وێنەیەکی گشتگیری هەموو خانەمان نیشان بدات.

بەو پێیەی مێژوو بونیادێکی ناماددییە و سازکردن و ناڕوونیی تێدایە، عەقلی ماددی ناتوانێت بە باشی مامەڵەی لەگەڵدا بکات، بەتایبەتی لەکاتێکدا

کە مێژوو دروستکراوی مرۆڤی خاوەن دوو لایەنی (ماددی و رۆحانی)یە. هەر بۆیە عەقڵی ماددی لەسەر حیسابی ڕاستی مێژوویی، ئەمری واقیع پیرۆزو تەقدیس دەکات. (دکتۆر المسیری لەوەدا ئاماژە بۆ ململانێی عەرەب و ئیسرائیل دەکات).

لەوەوە دەگەینە ئەوەی کە کاری عەقڵی ماددی بریتییە لە وردکردنەوەی هەموو شتێك تەنیا لەلایەنی ماددییەوە (الاختزالیة) - تەنانەت مرۆڤیش -، واتە عەقلی مادی شیکارێکی وردی هەموو شتێك دەکات، بەڵام شیکارەکەی تەنیا لەلایەنی مادیەوەیە، ئەمەش بەمەبەستی سوود لێوەرگرتنی، جا لەبەر ئەوە هەڵدەستێت بە وردکردنەوەو هەڵوەشاندنەوەی مرۆڤ بۆ پێکهاتە ماددییە سەرەتاییەکانی. هەروەها هزری ماددی وایدەبینێت کە وەك چۆن گەدە خواردن هەرس دەکات و چۆن جگەر زەرداو دەردەدات ئاواش عەقڵ بیردەکاتەوە. ئەم دیدە عەقڵانییە ماددییەش بۆ مرۆڤ، مرۆڤ دەگێڕێتەوە بۆ قوڕێتی و پیرۆزییەکەی لێدادەڕنێت و مەرکەزییەتیەکەی لەگەردووندا لێدەستێنێتەوە.

## هـزری ماددی :

شتێکی سروشتی بوو کە عەقڵی ماددی هزرێکی ماددی بێنێتەبوون، کە د.المسیری گرنگترین نیشانەکانی باس دەکات و دەڵێت: لەوانەیە هۆبز[1] یەکەمین بیرمەند بێت کە لەگەڵ چەمکە تاریکەکانی عەقڵانیەتی ماددیگەرایی رۆیشتووە، کاتێك گوتی مرۆڤ گورگی برا مرۆڤەکەیەتی و، مامەڵەی کۆمەڵایەتی نێوان مرۆڤەکان بەهۆی سروشت و فیترەتێکی چاکەخوازییەوە نابێت، بەڵکو دەرەنجامی زۆر ترسانیانە، پاڵنەرەکەشی حەزی خۆشەویستی

---

(١) Thomas Hobbes: (١٥٨٨-١٦٧٩ز)، یەکێکە لە گەورە فەیلەسوفە سیاسییەکانی بەریتانیا.

مانەوەیە. (میکافیلی)[1]ش لەگەڵیدا هاوڕایە کاتێك گووتی هەموو هۆکارەکان تەنیا بیانوون بۆ بەدیهێنانی دەسەڵاتی سیاسی.

هەرچی (سپینۆزا)[2] و (نیوتن)[3]ن ئەوا جیهانێکی تەواو ئالی و ڕۆبۆتیان خستۆتەڕوو، کە خوودی مرۆڤیش لە یاسا ماددییەکانی بەدەر نییە. فەلەکناس(لاپلاس)[4]یش هەمان ئەو واتایەی دووپات کردەوە کاتێك بە ناپلیۆنی گوت: دیدو بۆچوونی ئەو دەربارەی بنچینەی گەردوون پێویستی بە گریمانەکردنی بوونی خودا نییە.

هەروەها (جۆن لۆك)[5] جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە عەقڵ لاپەڕەیەکی سپییە بەرهەمە ماددییەکانی لەسەر کەڵەکە دەبن و فیترەتی باش هیچ ڕۆڵێکی نییە لە ئاراستەکردنی عەقڵدا. مارکێز (دێ ساد)[6] و (فرۆید)[7] ئەوەیان ڕوون کردۆتەوە، کە مرۆڤ لەناخیدا گورگێك (کە پاڵنەرەکانن)، لەدەرەوەشی (ڕەفتارەکان)ی لەخۆگرتووە، خوودی ژیارستانیی مرۆڤیش بریتییە لە بەرگێکی بێهێز کە تاریکییەکی حەشار داوە کە لە ناوەوە دەرەوەی مرۆڤ دەوەڕێت، جگە لەوە هیچی تر نییە. هەروەها (داروین)[8] ململانێ و دەبەر

---

(١) Niccolo Machiavelli: (١٤٦٩-١٥٢٧ز)، فەیلەسوفێکی ئیتاڵییە، قسەیەکی بەناوبانگی هەیە کە دەڵێت گرنگ گەیشتنە بە ئامانج جا بەهەر شێوازێك بێت(الغایە تبرر الوسیلە).

(٢) Baruch Spinoza: (١٦٣٢-١٦٧٧ز)، فەیلەسوفێکی ئەڵمانی جولەکەیە، یەکێکە لەوانەی بانگەواز بۆ یەکبوون(وحدە الوجود)دەکات.

(٣) Isaac Newton: (١٦٤٢- ١٦٧٧ز) زانای فیزیایی بەناوبانگی بەریتانی، خاوەنی یاساکانی جووڵە و هێزی کێش کردن.

(٤) Marquis de leplace : (١٧٤٩-١٨٢٧ز)، زانای فەلەکناس و بیرکاریی فەرەنسی.

(٥) John Locke: (١٦٣٢-١٧٠٤ز)فەیلەسوفی سیاسی ئینگلیزی.

(٦) Marquis de sade: (١٧٤٠-١٨١٤ز)، خانەدان و فەیلەسوف و نووسەری فەرەنسی.

(٧) Sigmund Freud: (١٨٥٦-١٩٣٩ز)پزیشکی نەمسایی نەخۆشییەکانی دەمار، دامەزرێنەری زانستی شیکاری دەروونییە.

(٨) Charles Darwin: (١٨٠٩-١٨٨٢ز)، زانای بەناوبانگی بایۆلۆجی بەریتانی، خاوەنی بیردۆزی پەرەسەندن.

یەکراچوون بە پێویست دەزانێت لەپێناوی مانەوەدا، وایدەبینێت کە مانەوە بۆ باشترینە. هەروەها (نیتچە)[1] رایگەیاند کە ئەوەی خوودی مرۆیی (الذات الإنسانیة) فەرزی دەکات لە ئاکارە جوان وپێشەنگە وەهمییەکان یەکێکن لەو فرت و فێڵانەی لەڕێیەوە بێهێزەکان دەیانەوێت دەست لە بینای مافی بەهێزەکان بدەن.

هەروەها( مارکس)[2] وایدەبینێت، کە خوودی مرۆیی سەربەخۆ ئەوپەڕی وەهم و خەیاڵە، بۆیە لە پشتەوەی ئاکارو بەهاکان ململانێی چینایەتی و هۆکارەکانی بەرهەمهێنان هەن.

ئەم تەوژمە لە هزری دوای نوێگەریدا دەگاتە لوتکە،کە دیریدا[3] بەناوبانگترینی فەیلەسووفەکانیەتی، ئیتر لەوێدا خوودێکی مرۆیی بوونی نییە کە مرۆڤ بەو بەهاو ئاکارانەی هەڵیگرتووە لە شتە ماددییەکانی دەوروپشتی جیا بکاتەوە، هەروەك چۆن هیچ ئامانجێکی بەرز بۆ بوونی مرۆڤ لە گۆڕێدا نییە.

ئەم تیۆرە فەلسەفییە رەنگدانەوەی بەسەر بنچینەی کۆمەڵگا ماددییەکانەوە هەبووە، واتا لەسەر ئاستی جێبەجێکاریی کردەیی. دەکرێ بگوترێ سەدەی نۆزدەهەم راگوزەرییەکی پلەبەندی بەخۆیەوە بینی لەتێڕوانینی ئالی وئامرازانە بۆ مرۆڤ بۆ دیدی ئەندامێتی (العضویة). ئەگەر نیوتن گەردوونی کردبێتە کاتژمێر و خوداش درووستکەری کارامەی کاتژمێرەکان بێت (بە تێڕوانینی ئالی و ئامرازیی)، ئەوا جیهانی ئەندامیی (داروین) بەتەواوی خودای تێدا ون دەبێت؛ جا بنچینەو رەچەڵەکی مرۆڤ دەگەڕێتەوە بۆ پێشینەکانی مەیموونە بەرزەکان

---

(١) Friedrich Nitzche: (١٨٤٤-١٩٠٠ز)، فەیلەسووفی بێباوەڕیی بەناوبانگی ئەڵمانی، کە مژدەی مرۆڤی بەرزترینی دا(سووپەرمان).

(٢) Karl Marx: (١٨١٨-١٨٨٣ز)، فەیلەسووفی بەناوبانگی کۆمەڵایەتی ئەڵمانی، گرنگترین بەرهەمەکانی کتێبی (سەرمایە)یە.

(٣) Jacques Derrida: (١٩٣٠-٢٠٠٤ز)، فەیلەسووفی جوولەکەی فەرەنسی، لە جەزائیر لەدایك بووە. بە ڕێبازی فەلسەفەی شیکاریی بەناوبانگ بوو کە پێی دەڵێن فەلسەفەی هەڵوەشاندنەوە (تفکیکی) Deconstruction. کە جگە لە بنچینەی ماددی شتەکان و دیاردەکان ددان بە هیچ شتێکی تردا نانێت و نکۆڵی لە هەموو شتێکی غەیبیی دەکات. زیاتر لە چل کتێبی هەیە.

و لەپێش ئەوانیشەوە خشۆکەکان. پاشان فرۆید وایدەبینێت کە جەنگەڵستانی مەیموونەکان بەشێوەیەکی (نەستی و نائاگایی) تاریك و پڕ لە ئارەزووی هەڵقووڵاوەوە لەناخی مرۆڤدایە.

زانای رووسی (پاڤلۆڤ)[1] تاقیکردنەوەکانی لەسەر سەگ ئەنجامداوە پاشان ئەنجامەکانی لەسەر مرۆڤ جێبەجێکردووە، چونکە پێی وابوو هیچ جیاوازییەکی جەوهەری لەنێوانیاندا نییە. لەکۆتاییدا (فوکویاما)[2] (فەیلەسووفی دوای نوێگەریی)دێت تا قورەکە خەستتر بکات، کاتێك مرۆڤایەتی بەهەندێك هێڵی نەخشێنراوی سەر لم دەچوێنێت، کە دواتر شەپۆلەکان دەیانسڕنەوە! واتا ئێمە هیچ نین.

لێرەدا قسەکانی د. المسيري کۆتاییان هات.

بەم شێوەیە خودا ون بوو، هەروەك چۆن مرۆڤی بەرزو مەزنیش لە جیهانی هزری ماددیدا ون بوو، بەمەش بێباوەڕیی بوو بە دەردراوی ڕاستەوخۆی ئەم هزر و بیروباوەڕە.

**خوێنەری بەڕێز :**

((بێباوەڕیی هاوچەرخ بەرهەمێکی ئەورووپییە))، لەم تەوەرەیەدا بۆمان دەرکەوت کە ئەم قسەیە چەند ڕاستە. ئەگەرچی ئەورووپا لەدوای شۆڕشی زانستی بەهێزترین شەپۆلی بێباوەڕیی ڕووی تێکرد، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە زانست باوکی رۆحی بێباوەڕی بێت، چونکە هیچ کام لە دۆزینەوە زانستییە زۆرو زەوەندەکان لەگەڵ بوونی خودا تێکناگیرێن، بەڵکو دەرکەوتنی

---

(١) Ivan Pavlov: (١٨٤٩-١٩٣٦)ز)، زانای بەناوبانگی فسیۆلۆجیای رووسی، خەڵاتی نۆبڵی لە فسیۆلۆجیا و پزشکیدا وەرگرتووە لە ساڵی ١٩٠٤.

(٢) Y.F.Fukuyama: مامۆستای زانستە سیاسییەکان و ئابووری سیاسی، بەرەگەز ئەمریکییە، لەساڵی ١٩٥٢ لەدایك بووە- بەناوبانگترین کتێبی (نهاية التاريخ)ە کە لە ساڵی ١٩٩٢ دەرچووە.

بێباوەڕیی دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێکی دەروونی کە لەگەڵ ئەو شۆڕشە پەیدابوون.

هەرچی باوکی رۆحیی بێباوەڕییە، ئەوە هزری ماددییە، کە هەستا بە دووبارە ژیاندنەوەی فەلسەفەی ماددیگەرایی لۆژیکی دوای ئەوەی فاتیحەی لەسەر خوێندرابوو! ئەو فەلسەفەیەی بۆ هەر گریمانەیەك و بۆ هەر پرسێك داوای بەڵگەی تاقیگەیی یان بیرکاریی یان لۆژیکیی ڕاستەوخۆ دەکات، بۆیە شتێکی سروشتی بوو، کە ئەو فەلسەفەیە هەموو زانستە مرۆیی و ئایینییەکان ڕەت بکاتەوە، کە لەسەر ئەم جۆرە بەڵگانە دانەمەزراوە!، ئەم تێڕوانینەش - بەسروشتیی - هزری بێباوەڕیی هێنایە کایەوە.

لەلاکەی تریش، هزری ماددیگەرایی ژیارستانیەتی ماددیی هاوچەرخی هێنایە بوون، کە مرۆڤی لە سێکوچکەی (بەرهەمهێنان و بەکاربردن و چێژ وەرگرتن) کورت کردەوە، بۆیە دیسان سروشتی بوو کە هزری ئایینی و باوەڕبوون بە خودا ون ببێت.

بێباوەڕیی هاوچەرخ و نوێ لە ڕۆژئاوادا لە بەربەرەکانی لەگەڵ ئایین سەری هەڵدا لە ڕێگەی ڕەتکردنەوەی زۆرێك لەو چەمکە مەسیحییانەی لەگەڵ لۆژیك و زانستی هاوچەرخدا تێکدەگیران، پاشان ئەم دیدو بۆچوونەیان بەسەر هەموو ئایینەکاندا گشتگیر کرد.

بەرهەڵستیکردنی ئایین لەسەرەتادا شێوەی (نکۆڵی کردن)ی وەرگرتبوو، بێباوەڕان ناویان لەخۆیان نا ((بێ دینەکان Atheists))، پاشان ئەو بەرهەڵستییە پەرەی سەند بۆ ((دوژمنایەتی)و، هەڵوێستیان ((دژی دین Antitheists)) وەرگرت.

لەکۆتاییشدا بێباوەڕان لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا کتوپڕ ئێمەیان سەرسام کرد، بەکەمکردنەوەی دژایەتیکردنی ئایینەکانیان بە شێوەیەکی گشتی وئایینی مەسیحی بەتایبەتی، ئیدی ڕووی هەموو ڕق و کینە و دوژمنارییان لە ئیسلام کرد!.

خەجاڵەتی و شەرمەزارییە کە بێباوەڕە نوێیەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ئەوان ((بێباوەڕییەکی زانستیی)) پەیڕەو دەکەن، لەکاتێکدا سەلمێنراوە ((کە لەسەررووی هەموو دۆزینەوە زانستییەکانی زانستی نوێ،دۆزینەوەیەک دێت کە خودایەک هەیە))!، ئەو قسەیەی گۆڤاری تایمی ئەمریکی لەسەر گۆڕانی ئەنتۆنی فلوی پێشەوای بێباوەڕانی سەدەی بیستەم لە بێباوەڕییەوە بۆ باوەڕبوون بە خودا بەپێی بەڵگەی زانستی نووسیبووی، ئەم پرسەش لە تەوەرەکانی دواتردا تاوتوێ دەکەین و لە بەشی داهاتوو بە ناوونیشانی (سروشتی زانست) ڕێخۆشکردنی بۆ دەکەین.

## تەوەرەی دووەم

# سروشتییەتی زانست

((ئائەمەیە رووباری فەلسەفە، کە بە بەردەوامیی ئاوی نوێی لەبەر دەڕوات؛ تا وەك توانادارێکی دروستکەر، گەشەکردن بە هەموو کون و کەلەبەرێکی ژیارستانیەتی مرۆیی هەڵدەقوڵێنێت، لە ئێستادا زانست لە سەرووی ئەم چەم و سەرچاوانەیە).

د.یمنی طریف الخولی[1]

((لەسەرەتای گەشتەکەم لەگەڵ زانستدا نەمدەزانی، کە نەزانم، دوای گەشتی دوور و درێژیزانستیم بۆم دەرکەوت کە چەندە نەزانم)).

د.عمرو شریف

---

(١) د.یمنی طریف الخولی: مامۆستای فەلسەفەی زانستەکان و ڕێبازەکانی توێژینەوەکانە، سەرۆکی بەشی فەلسەفەیە لە کۆلێژی ئادابی زانکۆی قاهیرە. ئەندامی لیژنەی قەومییە بۆ مێژوو و فەلسەفەی زانستەکان لە ئەکادیمی توێژینەوەی زانستیی و تەکنۆلۆجیا و ئەندامی لیژنەی فەلسەفەیە لە ئەنجوومەنی باڵای رۆشنبیری لە میسر.

## زانست لە سەردەمی نوێدا :

لە سەدەی حەڤدەهەمەوە ماریفەت و زانیاری ڕێگایەکی تری هەیە، کە جیاوازە لە چەمکەکانی پیاوانی ئایین و فەیلەسووفەکان، ئەویش زانستە[1].

ئامانجی زانست گەیشتنە بەو یاسایانەی چەند ڕاستییەکی دیاریکراو بەیەکەوە دەبەستنەوە و توانای لێکدانەوەی هەبێت بۆ ڕوودانی دیاردەیەک بەجۆرێکی دیاریکراو، نەک بەجۆرێکی تر، تەنانەت توانای پێشبینییکردنیشی هەبێت بۆ گەشەکردنی ئەو دیاردانە لە ئایندەدا.

زانیاری زانستیی (المعرفة العلمية) بەوە جیادەکرێتەوە کە لەڕووی عەقڵییەوە قەبووڵکراوە و هیچ هەڤدژییەکی لۆژیکی لەناودا نییە، شیاوی تاقیکردنەوەیە لەڕێگەی تێبینیکردن و تاقیکردنەوەی زانستیی.

بەمەش مەعریفەی زانستیی بە تەواویی و بنەڕەتیانە لە باوەڕی کوێرانە (دۆگماتی Dogmatic) جیاوازە، کە بریتییە لە تەسلیمبوونی ڕەها بە ڕاستی و دروستیی بابەتێک، بێئەوەی بنەمایەکی عەقڵی هەبێت یان بە شێوەی ئەزموونی لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت.

---

(١) چەمکی زانست Science لە وشەی لاتینی scientia وەرگیراوە کە بەواتای مەعریفە دێت.

## ئامانجدارێتی و ئامرازێتی[١]، فەلسەفە و زانست

**ڕێگای بەدەستهێنانی زانیاری (هەر زانیارییەك بێت) بە وەڵامدانەوەی دوو پرسیار دەبێت:**

**پرسیاری یەکەم: بۆچی (ئامانجدارێتی یان حیکمەت) Why ؟**

بۆچی گەردوون بەدیهاتووە؟ بۆچی ژیان درووستبووە؟ بەدبەختی و ئازارچەشتن بۆچییە؟....

زانایان دەرکیان بەوە کردووە، کە چوون بەلای ئەم پرسیارانەی، کە لە (ئامانج)ی شتەکان دەکۆڵنەوە، لەدەرەوەی بازنەی زانستن، بۆیە هەندێکیان ئامانجدارێتی ڕەتدەکەنەوە، هەندێکیشیان قەبووڵی دەکەن و بۆ شارەزایانی پێشین جێیدەهێڵن، ئەوانیش فەیلەسووفەکان و پیاوانی ئایینن.

**پرسیاری دووەم: چۆن (میکانیزم یان چۆنیەتی) How ؟**

ئەمەیان بواری زانستە، بەڵام بە مەرجی دەرکردنی فێڵباز و چەواشەکاران لە گۆڕەپانی زانستدا.

بۆبەدیهێنانی ئەم مەرجەش، زانایان چوار ڕێسایان بۆ ئەم یارییە داناوە، کە هەرکەسێك نیازی بەشداریکردنی هەبێت دەبێت پێیانەوە پابەند بێت:

**ڕێسای یەکەم:** ئێمە پێنج هەستمان هەیە، کە لە کاتی توێژینەوەی هەر بابەتێکی زانستی ئەوانە ئامرازی زانستین. بەڵام کاتێك بەو پێنج هەستەمان هەستمان بە

---

(١) مەبەست لە (ئامانجدارێتی - الغاية) ئەوەیە بزانین داخۆ مەبەست لە دروستکردنی ئەم گەردوونە چییە.هەروەها (ئامرازێتی –الآليه) باس لە ئالەت و پێکهاتەکانی شتەکان دەکرێت.

بەشە زۆر بچووکەکانی بچوکتر لە گەردیلە و کونە ڕەشەکان و هی تر نەدەکرد لەبەرامبەردا زانایانی (بیرکاری) وردتر لە هەستیان داهێنا وەك سەرچاوەیەك بۆ زانیاری.

**ڕێسای دووەم:** پێویستە ڕێبازێکی دیاریکراو بگیرێتە بەر بۆ وەدەستهێنانی مەعریفەی زانستی، کە بە ڕێبازی زانستی ناسراوە و، کۆمەڵە قۆناغێکی یەك بە دوای یەك لەخۆ دەگرێت:

١- کۆکردنەوەی زانیاری و تێبینیکردنی ئەو دیاردانەی پەیوەندییان بەو بابەتەوە هەیە کە خەریکین لێیان دەکۆڵینەوە.

٢- دارشتنی ئەو گریمانانەی کە دەکرێ ئەم زانیارییانە بەیەکەوە ببەستنەوە.

٣-ئەنجامدانی ئەو تاقیکردنەوانەی ئەم گریمانانە دەپشکنن، لەگەڵ تێبینیکردنی ئەنجامەکان و گەیشتن بە چەند دەرەنجامێك.

٤- پاشان لە ڕێی دەرەنجامەکانەوە گەیشتن بەو یاسایانەی جۆرە دیاردەیەك بەڕێوەدەبەن.

٥- لە یاساکانیشەوە گەیشتن بە بیردۆزێکی زانستی کە لەڕووی لۆژیکییەوە گونجاو بێت و، ئەو ڕاستییانەمان بۆ ڕوون بکاتەوە کە پێشتر تێبینیمان کردبوون و، توانای ئەوەشی هەبێت کە پێشبینی ڕوداوگەلێکی نوێ بکات.

**ڕێسای سێیەم:** دوورخستنەوەی هەموو لێکدانەوەیەکی میتافیزیکی (غەیبی) بۆ هەر کێشەیەکی زانستی. زانایان ئەم جۆرە لێکدانەوانە بە بەربەستەکانی بەردەم زانست دەزانن، تەنانەت هەندێکیان دەڵێن کە دەکرێ پێشکەوتنی زانست بە تەواوەتی لەبار ببات. خۆ ئەگەر زانایان بەوە وازبێنن کە بۆ نموونە خودایە (یان شەیتان)هۆکاری نەخۆشیەکانە، ئەوا ڤایرۆس و هۆکارەکانی تری نەخۆشیەکانمان نە دەدۆزینەوە و، زانستی پزیشکی هەر لە قۆناغی پێش هیپۆکرات[1] دەمایەوە.

---

(١) هیپۆکرات Hippocrates: گەورە پزیشکی یۆنانی (٤٦٠ پ.ز-٣٧٠ پ.ز)، بە باوکی پزیشکان بەناوبانگە؛ بەهۆی ئەوەی زانستە پزیشکییەکانی لەسەر بناغەی زانستی دامەزراند. هەروەها سوێندی

**ڕێســـای چوارەم:** پێویســتە مەعریفە زانستییەکان بە بەڵگە تـــاقیکراوە و عەقڵییەکانیانەوە بخرێنەڕوو بۆ پسپۆڕ و شارەزاکان، بەمەبەستی هەڵسەنگاندن، ئینجا وەربگیرێن یان ڕەتبکرێنەوە، ئەمەش لە ڕێگەی گۆڤارە زانستییەکان و کۆنگرە و کتێب و ئامرازەکانی ترەوە وەردەگرێت.

لە ئەنجامی ئەو ڕێبازە توندەی زانست، دەبینین کە زانست لە پرسە زانستییەکاندا هەڵوێستگەلێکی بابەتیانەوەردەگرێت، کە تێیدا زانا دەچێتە ژێرباری ئەو ئەنجامەی سروشت پێی دەڵێت.کەچی فەلسەفە گوزارشت لە هەڵوێستی تایبەتی و بۆچوونی تایبەتی دەکات، کە زۆر جار تێکگیران و هەڤدژی لە بۆچوونی فەیلەسوفەکاندا ڕوودەدات.

سەرەڕای ئەوەی لە ڕووکەشدا تێکدەگیرێن، بەڵام هەریەکە لە زانست و فەلسەفە خزمەتی گەورە پێشکەش دەکەن. ئەگەر مرۆڤ پێویستی بە زانست هەبێت کە لایەنە ماددی و لاشەییەکان دەتوێژێتەوە، ئەوا پێویستی بە فەلسەفەش هەیە بۆ ئەوەی لایەنە عەقڵی و دەروونییەکانی بۆ ڕوون بکاتەوە، تا دەکرێ بگوترێت کە فەلسەفە و زانست دوو ڕووی یەك دراون لە مێژووی هزری مرۆڤایەتی. هەردوو ڕووی دراوەکەش(زانست و فەلسەفە)ن، کە لەژێر کەشێکی گشتیدا کاردەکەن کە باڵی بەسەر کۆمەڵگادا کێشاوە، جا یان کەشێکی دینییە یان بێباوەڕییە، بۆیە گەردوون بە بوونی خودا و زۆر جیاوازترە لە گەردوون لەگەڵ نەبوونی خوادا[1].

---

پزیشکی بە ناوی ئەوەوە بەناوبانگە، کە پێویستە هەموو پزیشکێك بەر لە دەست بەکاربوون سوێند بخوات کە پەیوەست بێت بە ڕەوشتی پزیشکیی بەرامبەر نەخۆش و هاوکار و پیشەکەی.

(1) ریچارد دۆوکنز زۆر ئەم قسەیە دووبارە دەکاتەوە و ئێمەش لەو قسەیەدا لەگەڵیدا هاوڕاین، سەرەڕای ئەوەی کە لە زۆربەی بۆچوونەکانیدا لەگەڵیدا ناکۆکین.

## جۆرەکانی زانست :

کاتێك گوێمان لە وشەی (زانست) دەبێت، یەکسەر زانستە سروشتییەکانمان دێنە مێشکەوە، ئەمەش تێکەڵی و ناڕوونییەکی گەورە درووستدەکات لەکاتی توێژینەوەی ڕێبازەکانی زانست و بەڵگەکانی و لە کاتی بیرکردنەوە لەپەیوەندی نێوان ئایین و زانست. چونکە زانست دابەش دەبێت بۆ دوو کۆمەڵەی گەورە؛ زانستە سروشتییەکان و زانستە مرۆییەکان.

زانستە سروشتییەکان زانستەکانی کیمیا و بایۆلۆجیا لەخۆدەگرێت، کە دەکرێ هەردووکیان بگێڕدرێنەوە بۆ سەر فیزیا، لەبەرئەوە فیزیا بە گرنگترین زانستی سروشتیی داندراوە ئەو ڕێبازە زانستی ئەزموونیەی کە باسمان کرد تەنیا رووەو ئەو کۆمەڵەی زانستیەیە[1].

کۆمەڵەی دووەم، زانستە مرۆییەکانن، ئەمەیان زانستگەلێکی زۆر لەخۆدەگرێت؛ وەك فەلسەفە و ڕەوشت (ئەخلاق) و کۆمەڵایەتی و یاسا و ئاداب و هی تر.

هەر یەکە لەو زانستانەش ڕێبازێکی زانستی تایبەت بەخۆی هەیە.

ویستمان جۆرەکانی زانست بخەینەڕوو، هەروەك چۆن بەڵگە جیاوازەکانیشیان دەخەینەڕوو، تا ئەو وێنەیە لە مێشکدا لاببەین کە زانستەکان تەنیا زانستە سروشتییە تاقیگەییەکانن، جگە لەوان هیچی تر زانست نین، کە ئەمە کەوتنی سەرەکی فەلسەفەی مادیگەرایی لۆژیکی و شوێنکەوتووە بێباوەڕەکانی بوو.

---

(١) لەم توێژینەوەیەماندا، وشەی زانست وەك ئاماژە بۆ زانستە سروشتییەکان بەکاردەهێنین، مەگەر بەتایبەت باسی زانستێکی تر بکەین.

## بەڵگە زانستییەکان :

بەهەمان شێوە کاتێك باسی بەڵگە زانستییەکان دەکرێت ڕاستەوخۆ تەنیا (بەڵگەی زانستیی تاقیگەیی )مان دێتە مێشکەوە، لەکاتێکدا تاقیکردنەوە یەکێکە لە بەڵگە زانستییەکانەو بەهێزترینیان نییە. بەهێزترین بەڵگە (بەڵگەی بیرکاری )یە، کە خەریکە بەتەنیا ناوی بەڵگە (البرهان) هەڵبگرێت،لە کاتێکدا زۆر لە زانایان ناوی نیشانە(دلیل) لە بەڵگەکانی تر دەنێن. هەروەها لە بەبەڵگەدانان‌دا (بەڵگەی عەقڵی )ش لە پێش بەڵگەی تاقیگەییە، بۆنموونە کاتێك زانایان تێبینی ئەوەیان کرد کە سەرەوەی کەشتییەکان پێش خوارەوەیان لە ئاسۆدا دەردەکەوێت زانیان کە زەوی خڕە.

بەڵگەی چوارەم (بەڵگەی هەستی )یە، کە پشت بە دەرك پێکردنی هەستەوەرەکان دەبەستێت، بەتایبەتی بینین و بیستن و بەرکەوتن، ئەو بەڵگەیەی ماددیگەراکان - بەهەڵە - وادەزانن کە بەهێزترین بەڵگەیە، بۆیە کەسانێك داوایان لە موسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەربێت) کرد کە:

﴿ أَرِنَا ٱللَّهَ جَهۡرَةً ﴾ النساء: ١٥٣

واتە: (خودامان بە ئاشکرا نیشان بدە).

من وامدەزانی کە ئەم جۆرە داواکارییە ئیتر بەسەرچووە، تا ئەو کاتەی زۆرێك لە بێباوەڕان لە دیبەیتەکانمدا داوای هەمان بەڵگەیان لێکردووم، سبحان الله، ئەوەتا بێباوەڕان هەمان بەڵگەی هەزاران ساڵ پێش خۆیان دەڵێنەوە.

هەروەها بەڵگەی هەستیی لەڕووی زانستییەوە بەڵگەیەکی لاوازە؛ چونکە دەکرێ بە ئاسانی هەستەوەرەکان بەهەڵەدا ببرێن، بۆنموونە چاو سەراب وەك

ئاو دەبینێت، هەروەها کەوچکی ناو کوپێك چای بە شکاوی و خوارو خێچ دێتە بەرچاومان نەك بەڕاستی. مادام بەڵگەی تاقیگەییش پشت بە هەستەوەرەکان دەبەستێت لە دیاریکردنی دەرەنجامەکان کەواتە ئەویش بەهەمان شێوە شایەنی هەڵەیە.

گومانیش لەوەدا نییە کە هەستەوەرەکانی مرۆڤ بێتوانان لە دەرککردن بە (حەقیقەتی بوون)ی دەوروبەرمان، چونکە توانای هەستەوەرەکان لە وەرگرتندا زۆر سنووردارە؛ ئەگەر ئەو شەپۆلانەی دەوروبەرمان بە هێڵێك بچوێنین کە درێژییەکەی ۱٥٠ ملیۆن کیلۆمەتر بێت ئەوا چاوەکانمان تەنیا ١،٥ مەتر دەبینێت!!، بەهەمان شێوە توانای مێشکی مرۆڤ لە مامەڵەکردن لەگەڵ زانیارییەکانی دەوروبەرمان زۆر سنووردارە!! ئایا دەزانی کە مێشك لەیەك چرکەدا ٤٠٠ ملیار زانیاری پێدەگات، بەڵام مێشك تەنیا دەرك بە ٢٠٠٠ زانیاری دەکات!! ئای خودایە.. مێشکی مرۆڤ و هەستەوەرەکانی چەند بێتوانان لە دەرککردن بە حەقیقەتی بوونی دەوروبەرمان.

دوای هەموو ئەمانە بێباوەڕان تووشی شۆك دەبن کاتێك پێیان دەڵێین خودای ئێمە (هەستەوەرەکان دەرکی پێناکەن) و داوامان لێدەکەن کە بەڵگەی هەستییان لەسەر بوونی خودا پێشکەش بکەین لەکاتێکدا خودا نە ماددەیە نە وزە!!

ڕێبازێکی تایبەت هەیە بۆ بەڵگەهێنانەوە لەسەر ئەو ڕووداوانەی قابیلی دووبارەبوونەوەو تاقیکردنەوە نین، کە زانستەکانی مێژوو و مێژووی سروشتیی (بایۆلۆجیا) و درووستبوونی گەردوون و مرۆڤ کە بە زانستەکانی سەرەتاکان ناسراون لەخۆ دەگرێت، ئەو مەنهەجەش پێی دەگوترێت مەنهەجی (پەنابردنە بەر باشترین لێکدانەوە Inference to the best explanation).

بۆنموونە باشترین لێکدانەوە چییە بۆ هێرشی فەرەنسا بۆ سەر میسر؟ باشترین لێکدانەوە چییە بۆ توانای ئەو کەسانەی دەتوانن کرکراگەی گوێچکەیان بجوولێنن؟ باشترین لێکدانەوە چییە بۆ درووستبوونی گەردوون لە نەبوونەوە؟.. پەنابردنە بەر باشترین لێکدانەوە زۆر لە مەنهەجی تاقیگەیی دوور نییە؛ چونکە زانایان بەدوای باشترین لێکدانەوەدا دەگەڕێن بۆ ئەنجامی تاقیکردنەوەکانیان.

هەروەها هەندێك ئاماژە بۆ (حەدس Intuition) یان (هەستی شەشەم) دەکەن وەك جۆرێکی لەو مەعریفەت و زانیاریەی کە لۆژیك و بەڵگەهێنانەوە بەکارناهێنێت و لەپڕ لە مێشکەوە هەڵدەقوڵێت. فەیلەسوفەکانیش جیاوازن لە متمانەکردنیان بە بەبەڵگەدانانی (بەڵگەی حەدسی) لەنێوان کەسانێك کە زۆر بە متمانەن و کەسانێکی بە گومان کە بە خەیاڵی دەزانن.

گەورە فەیلەسوفی فەرەنسی دیکارت[1] (کە ئێمەش لەگەڵیدا هاوڕایین) وایدەبینێت، کە دەکرێ مێشك بەلاڕێدا ببرێت بەهۆی ئەو ئایدۆلۆژیا و بیروباوەڕانەی مرۆڤ باوەڕیان پێدێنێت، یان بەهۆی ئەو کەموکورتیانەی تووشی عەقڵ دەبن، بۆیە متمانەی رەهای بەو بەڵگانە نییە کە پشت بە عەقڵ دەبەستن. لەبەرئەوە دیکارت وایدەبینێت (چەمکە سەرەتاییە بەدیهیەکان) کە مرۆڤیان لەسەر لەدایك دەبێت ئەوان پارێزراون لەهەڵە، وەك(من بیردەکەمەوە کەواتە من هەم)، هەروەها وەك(هەموو مەوجودێکی بەدیهێنراو پێویستە بەدیهێنەرێکی هەبێت)، بۆیە دیکارت بەڵگەکانی لەسەر بوونی خودا لەسەر ئەم دوو شتە بەدیهییە بنیات دەنێت.

ئەمانە گرنگترین ئەو بەڵگە زانستییانەن کە هەر زانستەو کامەی لەوانە بۆ دەگونجێت بەکاری دێنێت. هەموو زانستەکانیش هەڵپەیانە تا ببنە زانستی چەندیی، بۆئەوەی بەڵگەی بیرکاریی بخەنە نێو بەڵگەکانیان، بۆیە لەم دواییانە گوێمان لە فیزیای بیرکاریی، کیمیای بیرکاریی، تەنانەت دەبینین بایۆلۆجییەکانیش زانستی خۆیان بۆ گۆڕەپانی بیرکاری هێناوەتە خوارەوە.

سەرەڕای ئەوەش پێشکەشکردنی نیشانە(دلیل) کە لە بەڵگە(برهان) لاوازترە مانای ئەوە نییە کە ناکرێ ئەو پرسە یەکلایی بکرێتەوە، چونکە تۆ بڕیارێکی مەترسیدار دەدەی بەوەی ژیانی خۆت دەدەیتە دەستی فڕۆکەوان یان دکتۆرێکی نەشتەرگەریی بە پشت بەستن بەو نیشانە(دلیل)انەی کە ئاماژە

---

(١) Rene Descartes: (١٥٩٦-١٦٥٠ز)، فەیلەسوف و زانای بیرکاری و فیزیا بوو، بە باوکی فەلسەفەی نوێ دادەنرێت.

بۆ شیاوی ئەو کەسانە دەکەن لە کارەکەیان. بەهەمان شێوە من ناتوانم بەڵگەی حاشاهەڵنەگر پێشکەش بکەم لەسەر ئەوەی کە هاوسەرەکەم منی خۆشدەوێت، بەڵام بەیەکەوەبوونمان بۆماوەی نزیکەی ٣٥ ساڵ ئەم خۆشەویستییە یەکلایی دەکاتەوە،ئەمەش لە دەرئەنجامی کەڵەکەبوونی ئەو هەموو بەڵگانەی دەگەنە ئاستی(ئەو بەڵگانەی کە حاشا هەڵنەگرن) و بەبەڵگە (بورهان) دادەنرێن. بەهەمان شێوە پێویستە باوەڕی ئایینیش لەسەر کەڵەکەبوونی بەڵگەکان بنیات بنرێت Evidence Based تا دەگاتە ئەو پلەیەی هیچ گومانێك هەڵنەگرن، بەمەش نابێتە باوەڕێکی کوێرانە.

## پێناسەکردنی زانست و کۆت و بەندەکانی[1] :

بەپێچەوانەی ئەو بۆچوونەی لەنێو خەڵکی گشتی باوە بگرە لە ناو پسپۆڕانیش هەیە، پێناسەیەکی کۆڕامان نییە لەسەر زانست!، سەرەڕای ئەوەی کە کۆڕاییەك هەیە لەنێو زانایاندا لەسەر ژمارەیەك لەو چەمك و دەستەواژانەی لە مەنهەجی زانستیدا بەکاردەهێنرێن؛ وەك کۆکردنەوەی زانیاری و، خستنەڕووی گریمانەکان و، ئەنجامدانی تاقیکردنەوەو، شیکردنەوەی بەڵگەکان و، دەستکاریکردنی گریمانەکان و، پێشبینیکردنی ئەنجامەکان و، دانانی بیردۆز و،وەرگرتنی بڕیاری کەسانی هاوشان و پسپۆڕەکانی بوارەکان...هتد.

سەرەڕای زەحمەتی پێناسەکە، پێویستی سەرشانمانە پێناسەیەك هەڵبژێرین تا شیکردنەوەکانمانی لێوە دەستپێبکەین، با پێناسەی مایکل ڕۆس[2] هەڵبژێرین کە

---

(١) لەوانەیە هەندێك خوێنەری بەڕێز وابزانن کە ئێمە چەند لاپەڕەیەك پێناسەی زانستمان دواخستووە، بەڵام قسەکانی پێشوومان پێویست بوون وەك ڕێخۆشکردنێك بۆ خستنەڕووی سروشتی ئاڵۆزی ئەو زانستەی کە خەریکین پێناسەی دەکەین.

(٢) Michael Ruse: فەیلەسوفی زانستەکان، بەریتانییە، یەکێکە لە گرنگیدەرانی پەیوەندی نێوان

دەڵێت: ((زانست مەنهەجێکە لەگەڵ ئەو شتانەدا رەفتار دەکات کە لە سروشتدا بەشێوەیەکی سروشتی دووبارە دەبنەوە و یاساکانی سروشتت هەڵیاندەسوورێنن)).

گومان لەوەدا نییە، کە ئەم پێناسەیە چەند لایەنێکی ئەرێنی هەیە، ئەم لایەنانە بۆنموونە یارمەتیمان دەدات تا جیاوازی بکەین لەنێوان فەلەکناسی و ئەستێرەناسی، هەروەها لەنێوان کاری پزیشکیی و چارەسەرە فۆلکلۆرییەکان. بەڵام ئەم پێناسەیە چەند لایەنێکی نەرێنیشی هەیە، گرنگترینیان لەوەدایە کە زۆربەی زانستە نوێیەکانی فەزاو تەواوی زانستەکانی سەرەتاکان لە خانەی زانست دەخاتە دەرەوە، چونکە ئەو زانستانە باسی رووداوی وا دەکەن کە ناکرێ دیاری بکرێن و دووبارە بکرێنەوە، وەك سەرەتای گەردوون و سەرەتای ژیان.

## زانست جیهانیی و بێلایەنە :

کاتێك بوویتە زانا، ئەمە واتای ئەوەیە کە بوویتە ئەندامی کۆمەڵگایەکی جیهانی کە سنووری هەموو سنوورە ئایدۆلۆجییەکان تێدەپەڕێنێت؛ سنوورە رەگەزیی و ئایینیی و سیاسیی و...هەموو ئەو شتانەی دەکرێ مرۆڤەکان بۆ دەستە و کۆمەڵەکان دابەش بکەن. هەموو ئەو ناوونیشانانە ون دەبن کاتێك زانایان هەوڵدەدەن کە ناڕوونی و پەردەی پرسە زانستییە جیاوازەکان لاببەن و لەپێناو ئەوە گریمانە و بیردۆز دادەنێن، یان ئەوکاتەی رووبەڕووی نەخۆشییە کوشندەکان دەبنەوە، یان ئەو کاتەی بەدوای سەرچاوەی جێگرەوەی وزەدا دەگەڕێن دوای ئەوەی کە خەریکە وزەی ژێرزەمینیی[1] تەواو ببێت، یان کاتێك... یان کاتێك....

---

فەلسەفە و بایۆلۆجیا و ئاین. لەساڵی ١٩٤٠ز لەدایك بووە.

(١) وەك خەڵووز و نەوت و گازی سروشتیی، کە سەرچاوەکەی زیندەوەرەکانن-بەزۆریی رووەکین- کە پێش ملیۆنان ساڵ لەژێر زەمیندا ماونەتەوە.

نهێنی بێلایەنی زانستیش لەبەرامبەر هەموو تەحەددییە ئایدۆلۆجییەکان ئەوەیە کە ئەو تەحەددییانە هیچ کار ناکەنە سەر تێگەیشتنمان لە سروشتی ڕەگەزەکان و، نەگۆڕە فیزیاییەکان و، بنچینەی DNA و، یاساکانی نیوتن، بیردۆزی ڕێژەیی ئەنیشتاین،.. لە دەرئەنجامی شانازیکردنی زانایان بە مەنهەجی زانستی کە دوای هەوڵێکی زۆر و قوربانی گەورە پێی گەیشتوون، هەندێکیان هەست بە دڵەڕاوکێ و دەمارگیریی دەکەن کە پرسە غەیبییەکانیان بەمێشکدا بێن، یان دەربارەی خودا گفتوگۆ بکرێت.

بەڵام ئەگەر زانست بێلایەن بێت، ئایا زانایان بێلایەنن؟ئەمە پرسیارێکی گرنگە، دوای کەمێکی تر قسەی لەسەر دەکەین.

## ڕێبازی وردکردنەوە (اختزالی) و نەرێنییەکانی Reductionism :

یەکێك لەو ڕێبازە زانستییانەی، کە پشکدارییەکی کاریگەرانەی زۆری لەسەر پێشخستنی زانست هەبوو، ئەو ڕێبازەیە کە بە ڕێبازی وردکردنەوە(اختزالی) ناسراوە کە دیاردەکان بۆ پێکهاتە سەرەتاییەکانیان خورد دەکاتەوە، ئەو ڕێبازە یارمەتی مرۆڤی داوە، تا بگاتە قووڵایی ئەو بوونەوەرانەی دەیانخاتە ژێر لێکۆڵینەوە. لەهەمان کاتیشدا لەبنچینەیدا زۆر نەرێنی لەخۆ گرتووە، کە لەکاتی لێکۆڵینەوە لە سێ ڕەگەزەکەی ڕێبازی وردکردنەوەدا (الاختزال) دەردەکەون، ئەوانیش:

### ١- وردکردنەوەی مەنهەجیی Methodological Reductionism :

بۆنموونە لێکۆڵینەوە لەهەر ((بوونێك)) زانایان پەنا دەبەنە بەر شیکردنەوەی بۆ پێکهاتەی هەرە سادەکانی، پاشان لێکۆڵینەوە لەو پێکهاتانە، بەمەش وێنەیەکی

تەواومان دەربارەی بوونەوەری تەواو (الموجود المتكامل) پێدەدات. نموونەش بۆ ئەوە وەك شیكردنەوەی دارستان بۆ پێكهاتەكانی، پاشان لێكۆڵینەوە لە سیفەتەكانیان وەك رووەكەكان و ئاژەڵان و جۆگا ئاویەكان، بەمەش بۆچوونێكمان دەربارەی تایبەتمەندییەكانی دارستانەكە وەك دامەزراوەیەكی ژینگەیی پێدەدات.

گومان لەوەدا نییە كە وردكردنەوەی مەنهەجی سنوورێكی هەیە، چونكە بۆنموونە لێكۆڵینەوەكردن لە بەشەكانی كاتژمێر بەشێوەیەكی جیاجیا هیچ بۆچوونێكمان دەربارەی كاركردنی كاتژمێرەكە پێنادات، بەهەمان شێوە لێكۆڵینەوە لە دوو بەشەكەی ئاو (گەردەكانی هایدرۆجین و ئۆكسجین) بۆچوونێكمان دەربارەی تایبەتمەندییەكانی ئاو پێنادات، ئیدی هەر بەم شێوەیە. هەروەها هەمان پێكهاتەكان دەتوانن بەرهەمی جیاواز دروست بكەن، هەروەك یاریەكانی لۆگۆ Logo دا ڕوودەدات.

**٢- وردكردنەوەی زانیاریی Epistomological Reductionism:**

بەو واتایەی دەكرێ ((دیاردە)) بەرزەكان بە كردارگەلێك لێكبدرێنەوە كە لە ئاستێكی نزم تەواو دەبن، ئەمەیان بە لێكدانەوەی لەخوارەوە بۆ سەرەوە ناسراوە. وەك ئەوەی ئەو ژانەزگە(هەست)ەی هەندێكجار هەستی پێدەكەین، بە زیادبوونی جووڵەی ریخۆڵەكان و هەناو (میكانیكا)لێكی بدەینەوە، یان جیاوازی ئەو رەنگانەی دەیانبینین (هەست)، بە جیاوازی درێژیی شەپۆلەكانی رووناكی (فیزیای شەپۆلەكان)[1] لێكی بدەینەوە.

دیدی وردكردنەوەی زانیاریی - سەرەڕای بەشدارپێكردنی لە پێشخستنی زانستدا - كۆمەڵێك لایەنی كەموكورتیشی هەن، چونكە بۆتە هۆی وردكردنەوەی

---

(١) وەك شوێنكەوتنێك بۆ وردكردنەوەی زانیاری بە فیزیا لێكدانەوە بۆ كیمیا دەكرێت، بە كیمیا لێكدانەوە بۆ كیمیای زیندەیی دەكرێت، بە كیمیای زیندەیی لێكدانەوە بۆ بایۆلۆجیا دەكرێت، بە بایۆلۆجیای دەمار لێكدانەوە بۆ زانستی دەروونناسیی دەكرێت، بە زانستەكانی مێشك لێكدانەوە بۆ زانستی كۆمەڵناسیی دەكرێت و بەم شێوەیە. لەوبارەیەشەوە فرانسیس كریك دەڵێت: (ئامانجی بەرز كە زانایانی بایۆلۆجیا بۆی تێدەكۆشن ئەوەیە كە بایۆلۆجیا بە كیمیا و فیزیا لێكبدەنەوە).

دیاردە زۆر ئاڵۆزەکانی (وەك ڕەفتارە مرۆییەکانمان و کردارە عەقڵییەکانمان و ژیان) بۆ فیزیا، کە بە دیدی فیزیایی Physicalism ناسراوە، کە شێوەیەکە لە شێوەکانی ماددیگەرایی توندڕەو. گومانیش لەوەدا نییە کە ئەم دید و بۆچوونە کورتبین و مەترسیدارە! بۆنموونە لەکاتی لێکۆڵینەوە لە خانەی زیندوو وردکردنەوەی مەنهەجی دەمانگەیەنێتە ڕەگەزە سەرەتاییەکانی خانە(گەردیلەکانی کاربۆن و هایدرۆجین و ئۆکسجین و نایترۆجین و گۆگرد و فۆسفۆر).

جا ئەگەر بمانەوێ وردکردنەوەی زانیاریی جێبەجێ بکەین، واتە تێگەیشتن لە ژیانی (هەرە ئاڵۆز) بەهۆی لێکۆڵینەوە لە ڕەگەزە سەرەتاییەکانی(هەرە سادە) ئەوا هیچ دەرەنجامێکمان دەستگیر نابێت، چونکە ئەوکاتە دیاردەی ژیان بەتەواویی لە خانەدا ون بووە. بەهەمان شێوە هەوڵدانمان بۆ وردکردنەوەی ماددەی مێشکی مرۆڤ(بە هەردوو ڕێگەی وردکردنەوەی مەنهەجی و وردکردنەوەی زانیاری) دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە عەقڵی ئەنیشتاین و ئەو پارچە خەڵووزەی خەڵکانێك تووتنی سەر نێرگەلەی بەهۆیەوە پێدەکەن یەکسان بێت!.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە لە زۆر حاڵەتدا ناکرێ ئەوەی لە ئاستە بەرزترەکە ڕوودەدات بەوە لێکدانەوەی بۆ بکرێت کە لە ئاستە نزمترەکە ڕوودەدات، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە دیدی وردکردنەوەی زانیاری کەموکورتییەکی زۆری تێدایە.

**٣- وردکردنەوەی بوونگەرایی Ontological Reductionism:**

ئەمە وردکردنەوەیەکە سەرتاپای هەڵەیە، کە لەسەر (چەمکی تایبەتکردن - مفهوم الحصر) دامەزراوە بە بەکارهێنانی ئامرازی جیاجیا، کە گرنگترینیان زاراوەی(هیچ نییە جگە لە Nothing but)ە!، ریچارد دۆوکنز زۆر جاران دەکەوێتە ئەم هەڵەیەوە، سەرنجی بدە دەڵێت: ((لەڕاستیدا گەردوون (هیچ نییە جگە لە) کۆمەڵێك گەردی جووڵاو، مرۆڤیش (هیچ نییە جگە لە) ئامرازێك بۆ پارێزگاریکردن لە جینات)). کێشەکە لە زاراوەی (هیچ نییە جگە لە) دایە، جا ئەگەر ئەو زاراوەیە لاببەین قسەکە بەم شێوەیەی لێدێت: گەردوون کۆمەڵێك گەردی جووڵاوە، مرۆڤیش ئامرازێکە بۆ پارێزگاریکردن لە جینات، ئەم دوو

قسەیەش لەرووی زانستییەوە قەبوولکراون، چونکە ئەم هەردووکیان بەشێکن لە حەقیقەت (نەك تەواویی حەقیقەت بن). بێگومان زیادکردنی (هیچ نییە جگە لە) چەندین لایەن لە بوونی ڕاستەقینەی دیاردەکە دووردەخاتەوە و، تووشی دیدێکی رووتی (ماددی / سروشتیی)مان دەکات.

هەروەها فرانسیس کریکیش دەکەوێتە هەمان هەڵەوە کاتێك دەڵێت: ((مرۆڤ بە خۆشی و ناخۆشییەکانی و بیرەوەری و ئامانج و هەستکردنی بە خوودی خۆی و ویستیی (هیچ نییە جگە لە) دەرەنجامی رەفتاری کۆمەڵێکی زۆری دەمارەخانەکان و گەردیلەکانیان))ە. ئەم قسەیە نەك تەنیا چەمکەکانی جوانیی و ڕەوشتیی و ئایینیمان نزم دەکەنەوە و نەك تەنیا پێچەوانەی زانستن، بەڵکو سنووری لۆژیکیش تێدەپەڕێنن؛ کوا چ بەڵگەیەکی هەیە بۆ ڕاستی قسەکەی؟ ئاخر چۆن متمانە بە حوکمەکانی عەقڵێك بکەین کە هەر لە خۆوە لە ماددە هەڵقوڵیوە؟ چۆن چالاکییە کارۆکیمیاییەکانی مێشك کاریگەری دەکەنە سەر پرسی ڕاستیی و هەڵەییەوە؟! ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە وردکردنەوەی بوونگەرایی لەناوخۆیدا ڕەگەزگەلێکی لەخۆگرتووە خودی ڕێبازەکە رەت دەکەنەوە، تا ئەو ئاستەی دەکرێ ناو لەو کارە بنێین خۆکوژی.

زۆربەی کات ماددیگەراکان لەیەك کاتدا تووشی هەرسێ جۆرەکەی وردکردنەوە دەبن. بۆنموونە، لەکاتی لێکۆڵینەوەکردنیان لەسەر عەقڵی مرۆڤ، دەیگێڕنەوە بۆ ڕەگەزە سەرەتاییەکانی مێشك(ئەمەیان وردکردنەوەی مەنهەجی)یە، هەروەها بانگەشەی ئەوە دەکەن کە (هیچ نییە جگە لە) کۆمەڵێك گەردیلە(ئەمەش وردکردنەوەی بوونگەرایی)یە، هەروەها چالاکییە عەقڵییەکانمان دەرەنجامی چالاکی ئەو گەردیلانەن(ئەمەش وردکردنەوەی زانیاریی—مەعریفی-)یە. لەگەڵ ئەوەشدا داروین خۆی زۆرجار بەرامبەر بە مێشکی مرۆڤ تووشی شڵەژان و داماوی بووە، تەنانەت گوتوویەتی: هەرکاتێ بیر لە دروستبوونی مێشکی مرۆڤ دەکەمەوە رەشەبای گومان لە ناخم هەڵدەستێت، ئایا هەر بەڕاستی مێشك لە بوونەوەری نزمترەوە پەرەی سەندووە؟ ئەوەیە کە گومانی داروینی پێ وەسف دەکەین Darwin's Doubt. هەرچی ئەلفرێد والاسی هاوتاو

هاوڕێی داروینە، کە لەهەمان کاتی داروین گەیشتە بیردۆزی پەرەسەندن، ئەو وایدەبینێت کە ناکرێ عەقڵی مرۆڤ بەم مەنهەجەی وردکردنەوە لێکبدرێتەوە، کەواتە جگە لە بەخششێکی خودایی ناکرێ هیچی تر بێت.

لەمەدا بۆمان دەردەکەوێت، کە زانست بازدانێك چووە پێشەوە کاتێك مەنهەجی وردکردنەوەی پەیڕەو کرد، بەڵام لەهەمان کاتدا بووە هۆی پشتگوێ خستنی ڕەگەزە نامادییەکانی زۆر دیاردەی وەك ژیان و عەقڵی مرۆڤ، بەمەش بەرگێکی ماددی بەبەر ئەو دیاردانەدا کردووە کە خزمەتی پرسی بێباوەڕیی دەکەن.

## پەیدابوون ( الإنبثاق ) :

بۆدەرچوون لەو کێشانەی مەنهەجی وردکردنەوە درووستی کردبوون، کە گرنگترینیان بێتوانایی بوو لە لێکدانەوەی ئەوەی لە ئاستی بەرزتردا ڕوودەدات بە شتێك، کە لە ئاستی نزمتر ڕوودەدات، زانا و فەیلەسوفە ماددیگەراکان چەمکی ((پەیدابوون Emergence ))یان داهێناوە، مەبەستیان لێی ئەوەیە(کە سیفاتە بەرزەکان بەشێوەیەکی یەکەوسەری لە سیفەتی نزمتر درووست دەبن، کاتێك دامەزراوەکە دەگاتە پلەیەکی بەرزی ئاڵۆزیی، بەبێ ئەوەی پێویستی بە ڕێکخستنی زیاتر یان تێخستنی زیاتر هەبێت) و ناوی ((سیفەتە پەیدابووەکان Emergent Properties ))یان لێناوە.

نموونە لەسەر ئەوە پەیدابوونی سیفاتەکانی ئاوە، کە یەکێکیان توانای کوژاندنەوەی ئاگری هەیە لە سیفەتی هەردوو پێکهاتەو عونسوری هایدرۆجین کە توانای سووتانی هەیە و ئۆکسجین کە یاریدەی سووتان دەدات!، هەروەها پەیدابوونی جوانیی لە دانانی رەنگە زەیتییەکان لەسەر قوماشدا!

یەکێك لە زۆرترین تەتبیق و جێبەجێکردنی زاراوەی پەیدابوون لە زانستی

بایۆلۆجیادا بەکارهێنانی بووە بۆ لێکدانەوەی درووستبوونی دوو دیاردەی زۆر گرنگ؛ ئەوانیش ژیان و عەقڵی مرۆڤە. چونکە زانا ماددیگەراکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە هەرکە ماددە گەیشتۆتە ئەندازەیەکی دیاریکراو لە ئاڵۆزیی ئەوکات یەکسەر ژیانی لێوە پەیدابووە، هەروەها مێشکی مەمکدارەکانیش کاتێك لە مێشکی مرۆڤ گەیشتۆتە پلەیەکی زۆر بەرزی ئاڵۆزیی ئەوکات یەکسەر توانا عەقڵییەکانی لێپەیدابووە. بەڕاستی گوتنی ئەوەی کە ژیان و عەقڵ بەشێوەیەکی خۆکردو یەکسەری لە ماددەی نازیندووی ناعاقڵ پەیدابووە، ئەوە بانگەشەیەکی زۆر سەیرە، چونکە ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە هەردوو سیفەتی ژیان و عەقڵ لە ماددەی نازیندوودا بوونیان هەیە!، ماددیگەراکان بەم کارەیان سیفاتی وا دەدەنە پاڵ ماددەوە کە ئەگەر کەسە رۆحانییەکان ئەوە بکەن، بە تۆمەتی توندڕەویی لە رۆحانییەتەکەیان تۆمەتبار دەکران[1].

باوەڕبوون بە پەیدابوون بەوپێیەی کە(وەسف)ی ڕوودانی دیاردەکە بکات ڕاستە، بەڵام ئەو قسەکەیان بەو واتایەی کە ماددیگەراکان بەکاریدەهێنن بەوەی کە - ئەو پەیدابوونە - (تەفسیرو لێکدانەوە) بۆ ڕوودانی دیاردەکە دەکات، قسەیەکی هەڵەیە، چونکە هیچ شتێك لێکناداتەوە. ئەو پەیدابوونەی ماددیگەراکان باسی دەکەن جگە لە کرداری خەلق کە دینداران باسی دەکەن شتێکی تر نییە. ئەوەی جێی سەرسوڕمانە ئەوەیە، کە بەناوبانگترین فەیلەسووفی زانستەکان (کارل پۆپەر[2]) وشەی(خەلق دروستکردن Creation) وەك هاوواتای وشەی ((پەیدابوون Emergence)) بەکاردەهێنێت.

---

(١) یەکێك لە بەکارهێنانە هەڵەکانی وشەی پەیدابوون، ئەو بانگەشەیەیە کە ریچارد دۆکنز دەیکات بەوەی کە توانای کۆمپیوتەر لە چارەسەرکردنی زانیارییەکەیان خاسیەتێکی پەیدابووە! بەڵام گومان لەوەدا نییە کە ئەمە ساختەکردنێکی خراپە، چونکە کۆمپیوتەر پێویستیی بە ژمارەیەکی زۆری زانیاری هەبووە کە دیزاینەرانی کۆمپیوتەر بە عەقڵە بلیمەتەکانیان بۆ کۆمپیوتەریان زیاد کردووە.

(٢) Carl popper: لە ئەسینا لە ساڵی ١٩٠٢ لەدایك بووە و لەساڵی ١٩٩٤لە لەندەن مردووە. یەکێکە لە گەورەترین فەیلەسووفەکانی زانست لە سەدەی بیستەمدا. دایك و باوکی جوولەکەن و خۆی بە نەزانکار Agnostic دەزانێت. بیرکاری و مێژوو و زانستی دەروونناسی و فیزیا و مۆسیقای خوێندووە. لەساڵی ١٩٦٥ نازناوی (سێر)ی وەرگرتووە. لەنێوان ساڵانی ١٩٤٩ تا ١٩٦٩ مامۆستای لۆژیك و مەنهەجە زانستییەکان بوو لە زانکۆی لەندەن. ئەم قسەیەی لە کتێبەکەی خوود و مێشکەکەی The Self and its Brain دا هاتووە.

## بوارو سنوورەکانی زانست :

لە تەمەنی منداڵیمدا وتەیەکی فەیلەسووفی مەزن (بێرتراند راسل)م خوێندەوە، کە دەڵێت: ((هەموو مەعریفەت و زانیارییەك پێویستە بەهۆی زانستەوە بەدەست بهێنرێت، هەر شتێکیش زانست توانای دۆزینەوەی نەبێت مرۆڤیش ناتوانێ بیزانێت)).

هەروەها (پیتەر ئەکتینز)[1]یش هاوبەشی ڕای راسل دەکات کاتێك دەڵێت: ((لەڕاستیدا زانست تاکە ڕێگای گەیشتنە بە حەقیقەت، زانست توانای لێکدانەوەی هەموو شتێکی هەیە، هیچ بیانوویەکیش نییە بۆئەوەی بڵێین کە تواناکانی زانست سنوورێکیان هەیە)). زۆر بیرم لەو ڕایە کردۆتەوە، هەندێ جار پاڵپشتیم کردووە، هەندێکجاریش بەرهەڵستی، ئایا ئەم بۆچوونە ڕاستە؟.

## ئایا زانست تاکە سەرچاوەی حەقیقەت و زانیارییە؟

گومان لەوەدا نییە کە زانست یارمەتیمان دەدات بۆ تێگەیشتن لە زۆرێك لەو شتانەی پێشتر تێیانەدەگەیشتین، نهێنی زۆرمان دەربارەی سروشت بۆ ئاشکرا دەکات کە یارمەتیمان دەدات لەگەڵیدا هەڵبکەین. بەڵام ئایا سنوورێك هەیە بۆ ئەو شتانەی زانست بۆمان ئاشکرا دەکات و بۆمان لێکدەداتەوە؟

---

(١) Peter Atkins: مامۆستای کیمیای زیندەیی لە زانکۆی ئۆکسفۆرد. لەساڵی ١٩٤٠ لەدایك بووە.

ئەو ئاراستەیەی راسل و ئەتکنز لەسەرین نموونەی مەنهەجی ((زانستیی Scientism))ن، کە کەمێك پێش ئێستا خستمانەڕوو، ئەو ئاراستەیەی وایدەبینێت کە هەر قسەکردنێك دەربارەی خودا و ئایین یان ئەزموونەرۆحییەکان دەکەونە دەرەوەی بازنەی زانست، کەواتە ڕاستەقینە نین، قسەکردنیش دەربارەی ئەو چەمکانە ئەگەرچی چێژبەخش یان لەوانەیە سوودبەخشیش بن، هیچ جیاوازییەکیان نییە لەگەڵ قسەکردن دەربارەی دێو و ئەژدیها و بابانوئێل و چراکەی عەلائەددین و شتە جنۆکەییەکان!، ریچارد دۆوکنز لە کتێبەکەی (وهم الإله)دا رەواج دەداتە ئەو چەمکە و دەڵێت: ((ئایا ناکرێ چێژ لە جوانی باخچە وەربگرین بەبێ ئەوەی وا بیربکەینەوە کە جنۆکەی جوانیی تێدا نیشتەجێیە؟!)) مەبەستی ئەوەیە کە ئەو جوانییەی لە بووندا هەیە دەکرێ لێکدانەوەی ماددی بۆ بکرێت و پێویستی بە بوونی خودا نییە!.

ئێمە هاوڕاین لەگەڵ دۆوکنز لەوەی کە جنۆکەکانی ناو باخچەکان (دیارە ئاماژە بۆ خوا دەکات) شتێکی خەیاڵی هەڵەیە، بەڵام گومان لەوەدا نییە کە کۆمەڵە بوونەوەرێکی دیکە هەن بەرپرسیارن لە جوانی و سپاردنی باخچە!، چیت لە باخەوان و چیت داوە لە باخچەکە؟ بۆیە ئەگەر هیچ جنۆکە لە باخچەدا نەبن ئەوان باخچەوان و خاوەنێکیان هەیە!.

لەڕاستیدا گوتنی ئەوەی کە زانست تاکە سەرچاوەی حەقیقەت و مەعریفەیە زۆرێك لەو زانیارییانە هەڵدەوەشێنێتەوە کە لە قوتابخانە و زانکۆکاندا فێریان بووین. ئەی چی دەربارەی فەلسەفە و ئەدەب و هونەر و مۆسیقا و زانستی ڕەوشت؟! چۆن زانست بڕیار بەسەر ئەوەدا دەدات کە هۆنراوەیەك خراپە یان داهێنانێکی گەورەیە؟ ئایا ئەوە دەکرێ لەڕێگەی ژماردنی وشەکان یان زانینی ریزبەندیی وشەکانەوە بزانرێت؟.

چۆن زانست بڕیار بەسەر ئەوەدا دەدات کە تابلۆیەك پارچەیەکی هونەری گرانبەهایەو تەنیا پیسکردنی پارچە قوماشێك نییە بەهۆی ڕەنگەکانەوە؟ بێگومان ئەمە لەڕێی شیکردنەوەی کیمیایی بۆیەکانەوە ناکرێت. زانست دەتوانێت

پێت بڵێت کە تێکەڵکردنی ژەهری نیسترکنین کەسێك دەکوژێت، بەڵام زانست پێت ناڵێت کە هەڵەیە ئەو کارە لەگەڵ ئەنکتدا بکەی بۆ ئەوەی شتەکانی بە میرات بگری.

قسەی بێرتراند راسل ((هەموو مەعریفەت و زانیارییەك پێویستە بەهۆی زانستەوە بەدەست بهێنرێت، هەر شتێکیش زانست توانای دۆزینەوەی نەبێت مرۆڤیش ناتوانێ بیزانێت)) پڕە لە هەڤدژیی، ناکرێ ئەم قسەیە بە بەڵگەی زانستی بسەلمێنرێت، بەڵام راسل چۆن زانی کە ڕاستە و بەتووندی دەستی پێوە گرتووە؟ ئەمە واتای ئەوە دەگەیەنێت کە لە ناو مەزهەبی زانستی خۆیدا ئەوەندە هەڤدژیی هەیە بەسە تا بە هەڵەی دابنێین، بۆیە پێویستی بە هۆکارە دەرەکییەکان نییە بۆ هەرەس و فەشەل پێهێنانی.

## زانست دەرك بە ئامانج ناکات :

### کێکی فەزیلەی پوورم :

نموونەیەك دێنینەوە کە یەکێك لە گرنگترین لایەنەکانی کەموکوڕی زانستمان بۆ ڕوون دەکاتەوە:

فەزیلەی پوورم ((کێك))ێکی ئاهەنگی بۆ بۆنەیەك ئامادە کردبوو، سەرەڕای ئەندامانی خێزان کۆمەڵێکی زۆری زانایانی لە پسپۆڕییە جیاوازەکان بانگهێشت کردبوون، منیش ئەوەم بە هەل زانی و داوام لە هەر زانایەك کرد کە لە دیدی پسپۆڕیی خۆیەوە کێکەکەمان پێبناسێنێت. زانای بواری خۆراك باسی ئەوەی کرد کە چەند گەرمۆکەی تێدایە وبەهای خۆراکی چەندە. زانای کیمیای زیندمیش باسی پێکهاتەی کێکەکەی کرد لەڕووی پرۆتین و چەوری و کاربۆهیدرات. زانای کیمیاش باسی پەیوەندییە کیمیاییەکانی نێوان

پێکهاتەکان و کاریگەری پێگەیاندنی گەرمی کرد لەسەر ئەم پێکهاتانە. زانای فیزیاش باسی ئەو ڕەگەزانەی کرد کە پێکهاتەکانی کێکەکەی لێ پێکهاتووە. زانای بیرکاریش چەند هاوکێشەیەکی پێشکەش کرد کە ڕەفتاری ئەو ڕەگەز و بەشانەی دەردەخست کە کێکەکەی لێ پێکهاتووە. لە کۆتاییشدا زانای ئابووری باسی تێچووی دروستکردنی کێکەکەی بۆ کردین.

گومان لەوەدا نییە کە زانایان ((چۆنیەتی How))ی دروستکردنی کێکەکەیان لە هەموو لایەنێکەوە خستەڕوو، دوای ئەوە پرسیارێکم ئاڕاستەی ئەو زانایانە کرد؛ ((بۆچی Why کێکەکە دروستکراوە؟)) واتا ئەو مەبەستە چییە کە کێکەکەی بۆ دروستکراوە؟ کە بە ((ئامانجدارێتی)) ناسراوە، هیچ کام لە زاناکان نەیانتوانی وەڵامێك بخەنەڕوو، بەڵام ئەمە لە توانا و شارەزایی ئەوان کەم ناکاتەوە، پووریشم لەولاوە بزەیەکی کرد. ئایا پەیامەکە گەیشت؟.

ئەگەر بێرتراند راسل هێشتا زیندووبوایە لێمان دەپرسی: زانایان نەیانتوانی پەی بەوە ببەن کە بۆچی کێکەکە دروستکراوە، بەڵام ئایا زانینی هۆکارەکەی شتێکی مەحاڵە؟ هەر ئەوەندیە لە پوورە فەزیلەم دەپرسین و پێمان دەڵێت!. کەواتە بانگەکەشەی راسل بەوەی زانست تاکە ڕێگای گەیشتنە بە حەقیقەت و وەدەستهێنانی ماریفەت بانگەشەیەکی بێبنەمایەو تەنانەت سووکایەتیشە بۆ خوودی زانست.

سەرەڕای ئەو بانگەشەیەی، کە متمانەی ڕەهای راسل بە زانست دەردەخات، ئەوا لە بەرامبەر ئەوەدا قسەیەکی تری هەیە دەڵێت: ((گرنگترین و وورووژێنەرترینی پرسیارەکان دەکەونە دەرەوەی بازنەی زانستەوە! وەك: ئەگەر بوون دابەش ببێت بۆ سەر ماددە و عەقڵ، ئەی ماددە و عەقڵ چین؟ چ پەیوەندییەك لە نێوانیان هەیە؟ ئایا گەردوون ئامانجێکی هەیە؟ ئایا هیچ یاسای سروشتی هەن کە جیهان بەڕێوەدەبەن، یان ئەوانە دروستکراوی تێڕوانین عەقڵی خۆمانن کە ئارەزووی یاسا و سیستماتیکی دەکەین؟ ئەی بۆچی عەقڵی ئێمە ئارەزووی سیستەم دەکات؟ ڕاستی و حەقیقەتی مرۆڤ چییە؟

ئایا لە ژیاندا رێگایەکی باش هەیە و رێگایەکی پێچەوانەی ئەوەش هەیە، یان ئەوە گریمانە و دروستکراوی خۆمانە؟ ئەم پرسیارانەو - چەندین پرسیاری تریش - هەن کە لە تاقیگەدا وەڵامێکیان نییە)).

لە کتێبەکەیدا: (ئامۆژگاری بۆ زانایەکی لاو))[1] سێر پیتەر مێداوار[2] (خاوەنی خەڵاتی نۆبڵ) یاسایەکی زێڕین پێشکەشی ئەو زانایە دەکات: ((هیچ شتێك ئەوەندەی ئەوە نابێتە هۆی لەدەستدانی متمانە بە زانایەك کە بڵێت زانست وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانە دەزانێت(یان بەم زووانە دەزانێت)کە شیاوی ئەوەن بپرسرێن و ئەو پرسیارانەش کە وەڵامێکی زانستییان بۆ نییە شیاوی ئەوە نین کە بپرسرێن و زانستی درۆینەن و تەنیا گەمژەکان ئەو پرسیارانە دەکەن و تەنیا سادەکانیش هەوڵی ئەوە دەدەن کە وەڵامییان بدەنەوە)).

پاشان مێداوار دەڵێت: ((گومان لەوەدا نییە کە زانست سنوورگەلێکی هەیە کە ناتوانێت بیانبەزێنێت؛ تەنانەت زانست ناتوانێت وەڵامی ئەو پرسیارە سروشتییانەش بداتەوە کە منداڵەکانمان لێمان دەپرسن: چۆن ئەم بوونە دەستیپێکردووە؟ چۆن هاتینە سەر ئەم زەمینە؟ ئامانج لە ژیانی ئێمە چییە؟ و زۆر پرسیاری تریش)). ئەم جۆرە پرسیارانە تەنیا لەلای فەیلەسووفەکان و پیاوانی ئایین وەڵامیان هەیە.

فرانسیز کۆڵنز[3] (سەرۆکی پرۆژەی جینۆمی مرۆیی) ئەو واتایە دووپات دەکاتەوەو دەڵێت: ((زانست بێتوانایە لە وەڵامدانەوەی سادەترین پرسیارەکان؛ بۆچی گەردوون دروست بووە؟ بۆچی ئێمە لێرەین؟ دوای ئەوەی دەمرین چی ڕوودەدات؟

---

(١) Advice to a young Scientist

(٢) Sir Peter Medawar: (١٩١٥-١٩٧٨ز)، پزیشکێکی بەریتانییە و بەڕەچەڵەك لوبنانییە، لەساڵی ١٩٦٠ خەڵاتی نۆبڵی لە پزیشکیی وەرگرتووە.

(٣) Frencis Collins: زانای بایۆلۆجیای بەشیی و سەرۆکی پرۆژەی جینۆمی مرۆیی، باوەڕی بە پەرەسەندنی ئاڕاستەکراو هەیە، زۆر کتێبی نووسیوە، بەناوبانگترینیان کتێبی ((زمانی خودا))یە. لە ئێستادا راگری کۆلێژی خوێندنی باڵایە لە ڤاتیکان. لەساڵی ١٩٥٠ز لەدایك بووە.

## میکانیزمەکان ئامانجداریتی رەتناکەنەوە :

ئەوەی کە ئێمە لێرەدا باسی دەکەین دەربارەی بێرتراند راسل و فەزیلەی پوورم لەسەردەمی ئەرستۆ و ئیمامی غەزالییەوە زانراو بووە، ئەوان بۆ هەر بوونێك چوار هۆکاریان داناوە: هۆکاری ماددی، ئەو ماددانەی کێکەکەی لێ دروستکرابوو. هۆکاری وێنەیی، ئەو شێوەیەی کێکەکەی لەسەر دروستکرابوو. هۆکاری بکەر، کە فەزیلەی پوورمە. هۆکاری ئامانجداریتی، کە بریتییە لەو مەبەستەی کێکەکەی بۆ دروستکراوە. هۆکاری ئامانجداریتی کە دەکەوێتە دەرەوەی بازنەی زانستەوە و جگە لە هۆکاری بکەر (ئەوەی دروستی کردووە) هیچ کەسێکی دیکە ناتوانێت پێمان بڵێت.

جا لەبەرئەوەی کە زانست ناتوانێت پەی بە هۆکاری ئامانجداریتی ببات، ماددیگەراکان / رووشتییەکان دەڵێن پێویست ناکات بەدوای ئامانجدا بگەڕێین! بەڵام ئەمە - سەرەڕای نابەدڵیی بەرهەڵستکاران- ئەوە نەریٚ ناکات کە ئامانج هۆکارێکی سەرەکی شتەکانە. هەروەها ئەمەش ئەوە نەریٚ ناکات کە عەقڵ ڕۆڵی لەگەڵ هۆکاری ئامانجداریتیدا هەیە، چونکە عەقڵ - ئەگەر بەخۆیشی نەتوانێت بگاتە خودی ئامانجەکە - بڕیار لەسەر ڕاستی و درووستیی دەدات. بۆنموونە ئەگەر فەزیلەی پوورم پێی راگەیاندبایین کە کێکەکەی بەبۆنەی یادی لەدایکبوونی ئیسرائی کچی دروستکردووە، لە کاتێکدا کە هیچ کچێکی نییە بەو ناوەوە، ئەوا عەقڵ ئەو ئامانجەی رەتدەکردەوە.

پاشان، ئەگەر دینداره‌کان پێمان بڵێن کە خودایەك هەیە و هۆکاری بکەری ئەم گەردوونەیە و ئامانجی دروستکردنی مرۆڤی پێڕاگەیاندووین و وەڵامی ئەو پرسیارانە دەداتەوە کە عەقڵ بەتەنیا ناتوانێت وەڵامیان بداتەوە، ئەوا عەقڵ

دەتوانێت لەو زانیاریانە تێبگات و بڕیار لەسەر ڕاستی و درووستییان بدات. کەواتە دانان بە بوونی خودا نە بەڵگە Evidence نە لۆژیک Rationality نە عەقڵ Reason پەکناخات.

## هەندێك لە لایەنەکانی کەموکوڕی خوودیی زانست :

لەکاتی شیکاریی لایەنەکانی سنووردارێی زانستی تاقیگەیی و بەو دەرەنجامەی کە زانستی تاقیگەیی باسی زانستە مرۆییەکان و ((ئامانجی)) شتەکان ناکات، کە بە ئامانجدارێتی ناسراوە، ئێستاش دێینە سەر دوو کۆت و بەندی قوڵتر کە ڕیشەییانە پەیوەستن بە بنچینەی زانست.

چەمکی ناحەتمیی لە فیزیای چەندیی پێمان دەڵێت کە ((یاساکانی سروشت کە بەشێوەیەکی بیرکاریانە گوزارشتیان لێدەکەین بەشەکانی بچووکتر لە گەردیلەمان وەك خۆی بۆ وەسف ناکات، بەڵام گوزارشت لە(بۆچوونمان دەکات) بۆ ئەو بەشانە. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە تێبینیکار ڕۆڵی هەیە لە دیاریکردنی ماهییەتی ماددە، بەمەشناجێگیری و نەبوونی ڕەها لە کرۆکی سروشتی زانستە. ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە بەخشین و ئەنجامەکانی زانست خوودین و لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جیاوازە، چونکە زانست دیدێکی بابەتیانەمان دەداتێ دەربارەی جیهان، کە ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی باسی بیردۆزەکانی گالیلۆ پاشان نیوتن پاشان ئەنیشتاین بکەین، ئەگەرچی ئەم بۆچوونە گوزارشت لە حەقیقەتی ڕەها بۆ بوون ناکات.

کۆت و بەندی دووەم لەکاتی مامەڵەکردنمان لەگەڵ پرسی خوایەتیدا دەردەکەوێت، چونکە هەر زانستێك لە زانستەکان بەشێکی بوون بۆخۆی دادەبڕێت تا لێی بکۆڵێتەوە و نهێنیەکانی ئاشکرا بکات، جا کاتێك خودا لەدەرەوەی بوونی

ماددیمانە و ناچێتە ژێر باری هیچ کام لە زانستە ماددییەکانمان، کەواتە گەڕان بەدوای زاتی خودا و سیفاتەکانی دەکەوێتە دەرەوەی سنووری هەموو زانستەوە. ئەگەر لۆژیکی سروشتی بەڵگەنەویستیش ئاماژە بۆ ئەوە بکات کە((قشپلی وشتر بەڵگەیە لەسەر بوونی وشترەکە))[1]، ئایا لەڕووی عەقڵییەوە ڕاستتر نییە کە بڵێین بوونی گەردوون بەڵگەیە لەسەر بوونی بەدیهێنەری گەردوون؟ یان ئەمەیان بە وەهم دابنێین و پێداگریی بکەین لەسەر ئەوەی کە بوونی خودا بخەینە ژێر لێکۆڵینەوەی زانستیی تاقیگەیی!.جەخت بکەینەوە لەسەر ئەوەی قشپلەکان (مادە بێگیانەکان) بوونەوەری زیندوو بەرهەم دێنن، وەک چۆن ماددیگەراکان دەیکەن!.

## زانایان لەنێوان بێلایەنیی و لایەنگیریدا

شتێکی لۆژیکییە کە ڕێبازی فەلسەفی وەک دەرداوی زانستە سروشتییەکان بێتەکایەوە، چونکە زانا یەکەمجار لە گەردوون دەکۆڵێتەوە و بیردۆزەکانی دادەڕێژێت، دەبینێت کە دەرئەنجامەکەی ڕێبازێکی نوێی فەلسەفیی دروست دەکات، یان ئەوەتا دەچێتە ژێر باری ڕێبازێکی فەلسەفی دیاریکراوەوە (ڕێبازی سروشتی، یان ڕێبازی بوونگەرایی، یان ڕێبازی ئایینی خەلقی...) و خۆی دەداتە پاڵ ئەو ڕێبازەوە.

بەڵام ئەوەی لە واقیعدا ڕوودەدات بەتەواویی پێچەوانەی ئەوەیە! چونکە زۆربەی کات زانست شوێنی ئایدۆلۆجیا دەکەوێت نەک بەپێچەوانەوە! ئەمەش بەهۆی ئەوەی عەقڵی تەواو بێلایەن لە ریزی شتە مەحاڵەکانە. ئەوەتا زانای

---

[1] یەکێک لە دەشتەکییەکان ئەو قسەیەی وەک بەڵگە لەسەر بوونی خودا هێنایەوە، کاتێک پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)بانگەوازی کرد بۆ ئیسلام).

بەرگریی لەش جۆرج کلین[1] بە راشکاوی پێمان دەڵێت کە بێباوەڕییەکەی لە زانستەوە سەرچاوەی نەگرتووە، بەڵکو باوەڕێکی پێشوەخت بووە و لە منداڵییەوە بۆی ماوەتەوە. زانای زانستی بۆماوەیی ریچارد لیوۆنتین[2] هەمان واتامان بۆ دووپات دەکاتەوە کاتێك باسی هاوڕێکەی کارل ساگان[3] دەکات و دەڵێت: ڕوون و ئاشکرایە کە بڕوای ساگان پێشوەخت بوو، کە بۆچوونی دەربارەی زانست لەو بڕوایەوە سەرچاوەی گرت. ریچارد لیۆونتین لەسەر هەمان بڕوایە کە داویەتە پاڵ ساگان و دەڵێت: ماددیگەرایی رەهایە و رێگا بە خوایەتی نادەین لە دەرگا نزیك بکەوێتەوە.

لەبەرئەوە کاتێك ئەو جۆرە زانایانە تووشی هەڵوێستێکی زانستی دەبنەوە کە جگە لە دەستی خودایی هیچ لێکدانەوەیەکی تر هەڵناگرێت، خێرا دەستدەکەن بە رەتکردنەوەی یان شێواندنی و یان ونکردن و شاردنەوەی، کەچی لێکدانەوەی سروشتی ماددی وا قەبووڵ دەکەن کە عەقڵی دادگەر ناتوانێت قەبووڵی بکات، ئەمەش یەکێکە لە گەورەترین هەڵدێرەکانی لایەنگرانی زانستە سروشتییەکان.

ئەمە وەك ئەوە وایە کە زانایەك ئامێرێك دروست بکات کە تەنیا توانای چاودێریکردنی شەپۆلە بینراوەکانی ڕووناکی هەیە، پاشان بانگەشەی ئەوە بکات کە شەپۆلی نەبینراو لە گەردووندا بوونیان نییە(وەك تیشکی سەروو بنەوشەیی و ژێر سوور)! بێگومان تۆ ئەوە بەکارێکی ناشرین دەزانی کە زانایەك ئەو کارە بکات، بەڵام لەڕاستیدا ئەوە ڕوویداوە. ئەوەتا زانایان مەنهەجێکیان بۆ لێکۆڵینەوەی زانستی داناوە کە تەنیا چاودێری سروشت دەکات، پاشان زانا ماددیگەراکانیان دەڵێن کە زانست جگە لە سروشت هەموو شتێك نەفی و نەرێ دەکات!!

---

(1) George Klein: زانایەکی بایۆلۆجی سویدییە. گرنگی دەدات بە لێکۆڵینەوەکان دەربارەی شێرپەنجە، چەند کتێبێکی هەیە دەربارەی بێباوەڕی، گرنگترینیان((ئیباوەر و شاری پیرۆز))ە. لەساڵی ١٩٢٥ز لەدایك بووە.

(2) Richard Lewontin: زانایەکی ئەمریکییە و گرنگی بە پەرەسەندن دەدات. لەساڵی ١٩٢٩ لەدایك بووە.

(3) Carl Sagan: (١٩٣٤-١٩٩٦)، زانایەکی فەلەکناسی ئەمریکییە، راوێژکاری ناسا بوو، بە بەرنامەی ((گەردوون))ناوبانگ بوو، کە پڕبینەرترین بەرنامەی تەلەفزیۆنییە لە مێژوودا.

## ئێمــە بـەڵگــە بۆ ئـەو شـوێنــە ئاڕاستە دەکەین، کە دەمانەوێت!

یەکێك لە هەڵوێستە پرشنگدارەکانی فەلسەفەی هاوچەرخ هەڵوێستەکەی (سێر ئەنتۆنی فلو)ە، کە دوای تەمەنی هەشتا ساڵی بیروباوەڕەکەی لە بێباوەڕییەوە بۆ باوەڕ گۆڕی، ئەمەشی وەها لێکدایەوەکە بەدرێژایی شەست ساڵ بەڵگە بەرەو بێباوەڕیی بردبوو، بەڵام دواتر بەڵگە بەرەو باوەڕی برد[1].

بەڵام سروشتی ئاسایی زۆربەی زانا و فەیلەسووفەکان ئەوەیە کە عەقڵەکانیان ئەسیری لایەنگیری چەند چەمکێکی پێشوەختەیە بۆ ماوەیەکی درێژ بەر لەوەی بتوانن خۆیانی لێ ڕزگار بکەن[2].

لە لێکۆڵینەوەیەکی بەناوبانگدا، فەیلەسووف پۆل کێرتز[3] ڕوونی کردۆتەوە کە لەوانەیە شڵەژانێکی زۆر تووشی ئەو کەسانە ببێت، کە گرنگی بەو بوارە دەدەن ئەگەر تاقیکردنەوەکانی زانایان دەرەنجامەکانی پێچەوانەی چەمکە باو و پێشوەختەکانیان بێتەوە Paradigm.

نموونەش لەسەر ئەوە، ئەو دۆخەیە تووشی پیاوانی کڵێسا هات کاتێك لێکۆڵینەوەکانی گالیلۆ پێچەوانەی چەمکەکانی ئەرستۆ بوو کە باوەڕیان پێی

---

(١) وەك ئاماژەیەك بۆ وتەی فەیلەسووفی گەورە سوقرات، کە وتەیەك بوو ئەنتۆنی فلو بە درێژایی ژیانی لەسەری ژیا، بەوەی شوێنی بەڵگە بکەوین جا بۆ هەرکوێمان ببات To follow The Evidence Wherever it leads.

(٢) گومان لەوەدا نییە کە عەقڵەکان ئامادەی وەرگرتنی چەمکە نوێیەکان. بۆنموونە کاتێك سەلمێنرا کە DNA هەڵگریی شەفرەی بۆماوەییە لە خانەدا نەك پرۆتین، لە تەنیا شەوێکدا هەموو شتێك گۆڕا.

(٣) Paul Kertz: (١٩٢٥-٢٠١٢ز)، فەیلەسووفێکی ئەمریکییە، لە گومانکارەکان بوو، بە باوکی عەلمانیەتی مرۆیی دادەنرێت، بە کتێبی میوەی قەدەغە بەناوبانگ بوو.

هەبوو. بەهەمان شێوە مارکسیەکان دۆزینەوەکانی مێندلیان ڕەتکردەوە لەبواری زانستی بۆماوەییدا، چونکە لەگەڵ چەمکە سیاسییەکانی مارکسدا تێکدەگیرا!.

شتەکان ئاوەژوو بوونەتەوە، لەبری ئەوەی بەڵگە بەرەو حەقیقەتمان ببات ئێمەین کە بەڵگە بەرەو ئەو شوێنە دەبەین کە دەمانەوێت.

## ڕێبازی زانستیی نە بـاوەڕدارە نە بێبـاوەڕە نە سروشتییـە :

لەکاتی لێکۆڵینەوە لە دیاردەیەکی زانستی،ئایا ڕێبازە زانستییەکە دەگۆڕێت ئەگەر زاناکە بێباوەڕ یان باوەڕدار بێت؟..ئێمە ئەو پرسیارە دەوروژێنین ئەگەرچی سـادە و ساکار دیارە بەڵام لەئێستادا هەندێك کەس دەرکەوتوون کە بانگەشە بۆ ڕێبازێکی زانستیی باوەڕدار دەکەن، بەو واتایەی ئەو ڕێبازە زانستییەی لەئێستادا بوونی هەیە بێباوەڕە! ئەم بانگەشەیە پاڵپشتی بانگەشەی بێباوەڕان دەکات بەوەی کە زانا باوەڕدارەکان لایەنگیرن، هەروەها ئەوەش دەسەلمێنێت کە بێباوەڕیی لەپشت ئەو سەرکەوتنانەوەیە کە زانست تا ئێستا بەدەستی هێناون.

بۆ سەلماندنی هەڵەیی بە ئایدۆلۆژیاکردنی ڕێبازی زانستیی دەپرسین: ئایا دەرەنجامەکانی لێکۆڵینەوەکە دەگۆڕێت ئەگەر لێکۆڵەرەکە بێباوەڕبێت و وایبیبنێت گەردوون بە ڕێکەوت گەیشتۆتە ئەو دۆخەی ئێستای و وا دەردەکەوێت کە دیزاین و نەخشەی بۆ کێشراوە، لەکاتێکدا لێکۆڵەری باوەڕدار وایدەبینێت کە بەڕاستی گەردوون درووستکراوە؟

گومان لەوەدا نییە، کە هەریەك لە لێکۆڵەرەکان بە هەمان ڕێباز لێکۆڵینەوە دەکەن و وایدادەنێن کە گەردوون بە دیزاین و نەخشە ڕێکخراوە، جا ئەوە بە ڕێکەوت ڕوویدابێت یان بە مەبەست.

بەهەمان شێوە زاراوەی ((ڕێبازی زانستیی سروشتیی Naturalism)) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە باوەڕداران بە خودا ڕێبازی زانستی پەیڕەو ناکەن. ئا لێرەوە، پێویستە هەموو ئەو ریزبەندییانە رەت بکەینەوە، چونکە هەموویان پاشخانێکی ئایدۆلۆجییان هەیە، بۆیە پێویستە تەنیا باسی ڕێبازی زانستی بکەین.

## ئـازادبوونی زانست :

لەم بەشەی تەوەرەکەماندا بیرۆکەکانی کتێبێك دەخەینەڕوو کە ئەو ناوونیشانەی هەیە، لە نووسینی زانای بایۆلۆجی بەریتانی رۆبێرت شێلدرێیك[1]، بەم خستنەڕووە تێگەیشتنمان دەربارەی سروشتی زانست تەواو دەکەین. راگەیاندکار مایك ئادەمز[2] بەوە وەسفی ئەو کتێبە دەکات، کە باشترین کتێبە، کە لە دەیەی یەکەمی سەدەی بیست و یەکەم لەو بوارەدا نووسرابێت؛ بەوپێیەی وەك شۆڕشێکی دەستپێشخەرە لە زانستدا کە هاوتاو ڕاستکەرەوەی ئەو شۆڕشەیە کە کتێبی (أصل الأنواع)ی داروین بەرپای کرد، کە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم دەرچوو.

کتێبەکە دەڵێت - ئێمەش لەگەڵیدا هاوڕاین - کە زانستی هاوچەرخ لە دە ڕێسا (گریمانە)ی سەرەکی دەستپێدەکات، کە بەڵگەی زانستییان لەسەر

---

(١) Rupert Sheldrake: زانای فسیۆلۆجیای رووەك، سەرپەرشتیاری ناوەندی لێکۆڵینەوەکانی بایۆلۆجیای خانە لە کامبریدج، هەروەها مامۆستای وانەبێژە لە زانکۆی کۆنێکتیکت لە ویلایەتە یەکگرتووەکان. لەساڵی ١٩٤٢لە بەریتانیا لەدایك بووە.
ئەو بیرۆکانەی لەساڵی ٢٠١٢ بڵاوکرایەوە لە بەریتانیا بەناوونیشانی Science Delusion و لە ئەمریکاش بە ناوونیشانی Science Set Free.

(٢) Mike Adams: دامەزرێنەری سایتی Natural News لەسەر تۆڕی زانیاریەکان. لە ساڵی ٢٠١١ وەك دووەم بەناوبانگترین راگەیاندکاری تۆڕ هەڵبژێردرا لەسەر ئاستی جیهان. لەساڵی ١٩٦٩ز لەدایك بووە.

نییە، واتا بیروباوەڕی دۆگماتین Dogmas کە زانست لە چەمکە فەلسەفییە کۆنەکانی یۆنان وەری گرتوون، وایدەبینێت زانست حەقیقەتی ڕەها و ئەزەلییە.

نووسەر وایدەبینێت - ئێمەش لەگەڵیدا هاوڕاین - کە تا زانست دەست بەو ڕێسایانەوە بگرێت ئەوا بۆ تێگەیشتن لە خوودی مرۆڤایەتی و گەردوون لە ئاستێکی دیاریکراو تێناپەڕێنێت، کە لەڕاستیدا ئەمەش ئامانجی هەرە بەرزی زانستە.

بۆیە ئەگەر زانست بیەوێت ئاسۆی فراوانتر لە تێگەیشتن و پێشکەوتن واڵا بکات و دامەزراوەی وا ئاشکرا بکات، کە گەردوون هەڵدەسووڕێنن و هێشتا نەزانراون، ئەوا پێویستە سەرەتا خۆی لەو بیروباوەڕە دۆگماتییانە رزگار بکات کە پێچەوانەی حەقیقەتن، ئەو دە ڕێسایانەش ئەمانەن:

## (١) گەردوون دامەزراوەیەکی ماددییە[1]:

زانستی هاوچەرخ لەوەوە دەستپێدەکات کە گەردوون((جگە لە مادده شتێکی تر نییە)) و وەك دامەزراوەیەکە کە تەنیا بە زمانی میکانیکا و کارەبا و کیمیا ڕەفتار دەکات و، ئەو دامەزراوەیە خاڵییە لە هۆش و عەقڵ و ڕۆح.

لەبەرئەوە زانایان زۆر بەجددی هەوڵ دەدەن، کە بگەنە وردترین بەشەکانی مادده و وەسف کردنی میکانیزم و کاردانەوەکانی و وەسف کردنی بەوەی کە ئەمە هەموو ئەوەیە کە لە وجوددا بوونی هەیە. بەمەش پێویستبوون بە بوونی (خودا / بەدیهێنەر / زیرەکی بەرز) نامێنێت، هەروەها ئەوەش دەگەیەنێت کە مرۆڤ بە مردنی بەتەواوی لەناودەچێت.

---

(١) The Universe is Mechanical: ئەو ناونیشانە ئینگلیزیانەی لەم بەشەدا لە پەراوێزەکاندا دەیاننووسین ناونیشانی بەشەکانی کتێبەکەی شێڵدرێکە وەك چۆن خۆی نووسیویەتی و ئێمەش بە واتای نزیککراوە لە ناونیشانەکان وەرمانگێڕاون.

ئایا زانست بەڵگەیەکی هەیە لەسەر ئەوەی کە گەردوون ((داخراوە و خۆی خۆی بەڕێوە دەبات)) و ناچێتە ژێر باری دەستکاریی خوداییەوە؟ زانست تاکە بەڵگەیەکیشی لەسەر ڕاستی و درووستی ئەو گریمانەیە پێشکەش نەکردووە!!

## (٢) وزە و مادده دروووست ناکرێن و لە ناو ناچن و ئەندازەیان ناگۆڕێت[1]:

زانستی هاوچەرخ سەلماندوویەتی کە وزە و ماددەی گەردوون لە نەبوونەوە هێنراونەتە بوون، لەهەمان کاتیشدا پێویستە یاسای (مانەوەی وزە/مادده) قەبووڵ بکەین کەجەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە وزە و مادده درووستناکرێن.

کاتێك زانایان بۆیان دەرکەوت کە ئەندازەی هێزی کێشکردنی نێوان گەلەستێرەکان لەوە گەورەترە کە بارستایی ئەو گەلەستێرانە لێکی بداتەوە، بەبێ هیچ بەڵگەیەك گریمانەی بوونی ((ماددەی رەش))یان کرد کە بەهەمان شێوە ناتوانرێ چاودێری بکەین و بیبینین!. بە هەمان شێوەی کاتێك زانایان دەریان خست کە خێرایی لێکچوونی گەردوون لە زیادبوون دایە، بەبێ (هیچ بەڵگەیەك) گریمانەی بوونی (وزەی رەش)یان دانا، کە ناکرێ ببینرێ و چاودێری بکرێت، هاوکێشە بیرکارییەکانیش دەریانخستووە کە ئەندازەی مادده و وزەی رەشی گریمانەکراو دەگاتە ٪٩٦ لە کۆی مادده و وزەی گەردوون.

گومان لەوەدا نییە کە گریمانەکردنی بوونی ئەو ئەندازە زۆرەی مادده و وزە(بەبێ بەڵگە) لەپێناو پارێزگاریکردن لەو بیروباوەڕە دەبێتە کۆسپ لەبەردەم گەیشتن بە دامەزراوەی تر کە دەکرێ ڕاستتر بن و کاریگەرتر بن بەسەر دیاردە گەردوونییەکان، ئەمەش دەبێتە ڕێگر لەبەردەم زانست کە بچێتە نێو ئاسۆیەکی نوێوە.

---

(١) The total amount of matter and energy is always constant: کە بە یاسای مانەوەی مادده و وزە ناسراوە.

### (٣) جێگیرە سروشتییەکان ناگۆڕێن[١] :

زانستی هاوچەرخ لەوەوە دەستپێدەکات کە خێرایی ڕووناکی ناگۆڕێت، بەهەمان شێوە جێگیرە سروشتییەکانی تریش؛ وەك بارگە و بارستایی بەشەکانی ژێر گەردیلە(وەك ئەلیکترۆن و پرۆتۆن) و ئەندازەی هێزی کێشکردن و هی تر.

بەپێچەوانەی ئەوە، دیدی بەراوردکاری نێو کتێبە فیزیاییەکان بەدرێژایی دەیەکان پێمان دەڵێن کە خێرایی ڕووناکی لەساڵی ١٩٢٦ تا ١٩٤٥ بە ئەندازەی ١٠ کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا کەمی کردووە، پاشان بە ئەندازەی بیست کیلۆمەتر لە ساڵی ١٩٤٦ تا ١٩٦٥ز!. بەهەمان شێوە دەبینین کە جێگیری کێشکردن (G) لە ماوەی دە ساڵی ڕابردوودا بە ئەندازەی ١،٣٪ کەمی کردووە! ئایا هەر بەڕاستی ئەو جێگیرە سروشتییانە گۆڕاون؟. وەڵامەکەی بە نەخێرە! بەڵام زانایان ئەندازەی ئەو بڕانەیان گۆڕیوە لەپێناو پارێزگاریکردن لە هاوسەنگیی هاوکێشە فیزیاییەکانیان، تا چەمکە فیزیاییەکانیان بپارێزن و دووریان بگرن لە گۆڕان و دووبارە چاپێداخشاندنەوەیان!.

پێویستە زانایان لێرەدا وانەیەك لە یەکێك لە گەورەکانیان وەربگرن؛ کاتێك هاوکێشەکانی ئەنیشتاین دەریانخست کە گەردوون لێکدەکشێت یان وێك دێتەوە، کە لەگەڵ تێگەیشتنی باوی ئەوسا تێکدەگیرا بەوەی گەردوون((جێگیر و ئەزەلی))یە، بۆیە ئەنیشتاین شتێکی بۆ هاوکێشەکانی زیاد کرد کە پێی دەگوترێت((جێگیری گەردوونی))تا بەهۆیەوە پارێزگاری لە جێگیری گەردوون و ئەزەلیەتی بکات. بەڵام کاتێك ئیدوین هابڵ سەلماندی کە گەردوون دەکشێت، ئەنیشتاین دانی بەوەدانا کە زیادکردنی جێگیری گەردوونی گەورەترین هەڵەی زانستی بوو لە ژیانیدا. خۆزگە هەموو زانایان وەك ئەنیشتاین بابەتیانە بوایەن.

---

(١) The Laws of Nature are fixed

### (٤) سروشت بوونێکی بێ ئامانجە[1]:

زانستی هاوچەرخ دەست بە لێکدانەوە داروینییەکانەوە دەگرێت کە وایدەبینێت سیستەمە بایۆلۆجی و رەفتاری و کۆمەڵایەتییەکان و تەنانەت میکانیکییەکانیش شوێنی هەڵبژاردنی سروشتیی دەکەون کە هیچ مەبەست و ئامانجێکی نییە.

لە تەوەرەکانی بەشی دووەمی کتێبەکەدا دەبینین کە چۆن هەڵبژاردنی سروشتیی هەرەمەکی خاڵی لە ئامانج بێتوانایە لە لێکدانەوەی دروستبوونی گەردوون و ژیان، بەهەمان شێوە بێتوانایە لە پێشکەشکردنی لێکدانەوەیەك بۆ پەرەسەندنی زیندەوەران و دروستبوونی زیرەکیی مرۆڤ. گومانیش لەوەدا نییە کە ئەو بێتوانایییە ناچارمان دەکات دەان بە مەبەست و ئامانجدا بنێین کە زیرەکییەکی رەهایان لە پشتەوەیە.

### (٥) بۆماوەیی بـایۆلۆجی کردارێکی مـاددییە، کـە تەنیا لەرێی میکانیزمی DNA یەوە ئەنجام دەدرێت[2]:

کاتێك واتسۆن و کریك گەیشتنە بنچینەی DNA و رێگا و چۆنیەتی ئەنجامدانی فرمانەکانی، زانایان وایان گومان برد کە گەیشتوونەتە نهێنی ژیان، ئیتر بایۆلۆجییەکان دی ئێن ئەیان وەك بەرپرس لە لەشولار و رەفتار و کەسایەتی و بڕیارەکانمان هەژمارکرد.

پاشان بەم دواییانە بوونی چەند میکانیزمێکی زۆر ئاڵۆز سەلمێنرا کە چالاکی جینەکان ئاراستە دەکەن و، ئەو میکانیزمانە هۆکارگەلێکی ژینگەیی

---

(١) Nature is Purposeless, with No Goal or Direction

(٢) All Biological Inheritence is Material, Carried in DNA

و دەروونی زۆر لەخۆدەگرن. هەروەها سەلمێنراوە کە مرۆڤ ئازادیی ویستی هەیە، تەنانەت لەڕێی ئەو ویستەو تەرکیزی عەقڵییەوە دەتوانێت ئەو چالاکییە جەستەییانەش پەکبخات یان دەستکاری بکات، کە جینەکان خەریکن ئەنجامی دەدەن[١].

سەرەڕای ئەوەی کە بایۆلۆجیای نوێ سەلماندوویەتی، کە سەیرکردنی دی ئێن ئەی وەك هەڵسوڕێنەری لاشە و ژیانمان دیدێکی کۆنە و باوی نەماوە، کەچی هێشتا زانا مادیگەراکان دەستیان گرتووە بەو چەمکانەی ناویان ناوە ((حەتمییەتی جینی))، بەمەش حەقیقەتی مرۆڤیان لێ ون بووە، کە تەوەری لێکۆڵینەوەکانیانە.

### (٦) تەنانەت. مرۆڤیش. دامەزراوەیەکی ماددی ناهۆشیارە[٢]!

زۆربەی زانایان نکۆڵی لەوە دەکەن کە مرۆڤ بوونەوەرێکی هۆشیارە! وایدادەنێن کە مرۆڤ جگە لە ڕۆبۆتێکی بایۆلۆجی/زیندوو هیچی تر نییە، هەروەها هۆشیاری مرۆیی جگە لە خەیاڵی دەرئەنجامی چالاکی کیمیایی مێشك هیچی تر نییە. ئەوەی جێی سەرسوڕمانە زۆرێك لەو زانایانە وایدەبینن هەندێك بوونەوەری نازیندووی (وەك بلوورەکان) ئەندازەیەکی هۆشیارییان هەیە!!

لەڕاستیدا زانایان هیچ بەڵگەیەکی زانستییان نییە لەسەر ئەوەی کە هۆشیاری مرۆڤ تەنیا خەیاڵە!

---

(١) لە تەوەرەی پێنجەمدا بە درێژی باسی ئەم چەمکە دەکەین.

(٢) All matter is unconcious

### (٧) عەقڵ جگە لە نارێکیی لە فەرمانەکانی مێشکدا هیچی تر نییە[١] :

هێشتا زۆربەی زانایانی مێشك و دەمار ئەوە رەتدەکەنەوە دان بەوەدا بنێن کە عەقڵ دەرککردنێکی هۆشیارانەی ناماددی((هاوپێچی))مێشکە بەڵام لە چالاکییە کارۆکیمیاییەکەی سەرچاوەی نەگرتووە. ئەوان پێداگری دەکەن لەسەر ئەوەی کە عەقڵ جگە لە چەمکێك بۆ وەسفکردنی خەیاڵە ناڕاستەقینەییەکانی مێشك شتێکی تر نییە، ئەوان بەم کارەیان عەقڵیان بەکاردەهێنن تا نکوڵی لە بوونی عەقڵ بکەن!.

هۆکاری کێشەکە ئەوەیە کە زانایان بۆ لێکۆڵینەوە لە چالاکییە عەقڵییەکان نامرازی ماددی بەکاردەهێنن، ئیتر تەنیا دەستیان بەر ماددە دەکەوێت. رێك وەك ئەوەی بتەوێ ئەندازەی سەرسامیی و دڵەڕاوکێت لەهەمبەر هەڵوێستێکدا بە گەرمی پێو(تەرمۆمەتر)بپێوی!!.

### (٨) یادەوەری لە مێشکدا لەشێوەی کارۆکیمیایی هەڵدەگیرێت و بەمردنیش لەناودەچێت[٢] :

زانا ماددیگەراکان وایدەبینن کە یادەوەری لەشێوەی بازنەی کارەبایی یان پێکهاتەی کارەبایی لەمێشکدا هەڵدەگیرێت، سەرەڕای ئەوەی نەیانتوانیوە میکانیزمەکەی دیاری بکەن، هەروەك چۆن بێتوانا بوون لە دیاریکردنی شوێنێکی دیاریکراو بۆ یادەوەرییەکە،سەرەڕای ئەوەی زۆر کەس هەن کە

---

(١) There is no such thing as a mind other than artifact of Brain Function

(٢) Memories are stored Chemically in the brain. and disappear at death

چالاکیە عەقڵییەکانی پەیوەست بە یادەوەرییەوە بەشێوەیەکی ئاسایی ئەنجامدەدەن سەرباری ئەوەی کە ٧٥٪ی مۆخیان دەرهێنراوە!

لەڕاستیدا تەرح و خستنەڕووی دیندارەکان لە حەقیقەتی عەقڵ نزیکترە (هۆش - چالاکییە عەقڵییەکان و لەناویشیاندا یادەوەری)، بەوەی کە دەرەنجامی چالاکی هەمەگی - گشتی - Holistic ن کە تێیدا مێشکی ماددی لەگەڵ ڕۆحی نامادیدا کارلێك دەکات. ئەم بابەتە لە تەوەرەی هەشتەمدا باشتر ڕوون دەکەینەوە.

### (٩) دەرککردنەکانی دەرەوەی هەستەوەرەکان جگە لە خەیاڵ هیچی تر نین[١]:

زانایان رایان وایە کە هەندێك دیاردەی دەرەوەی هەستەوەرەکان (وەك پەیوەندیکردنی دوور و خەونی پێشوەختە و خەونی ڕاستگۆیانە) تەنیا خەیاڵن، چونکە نەیانتوانیوە بە نموونە ماددییەکانیان لێکدانەوەی بۆ بکەن.

فیزیای نوێ لێکدانەوەی بۆ زۆرێك لەو دیاردانە پێشکەش کردووە لەڕێی ئەوەی بە تێکهەڵکێشی چەندیی Quantum Entangelment ناسراوە، کە لەنێوان هەموو پێکهاتەکانی گەردوون و مێشکی مرۆڤیشدا ڕوودەدات، ئەنیشتاین ناوی کاریگەری لە دوورەوەی تارمایی Spooky actionی لێناوە[٢].

گومانیش لەوەدا نییە کە گەیشتنی زانست بەو جۆرە لێکدانەوانە نموونەیەکی باشە بۆ پەکخستنی بیروباوەڕە دۆگماتییەکان(ئەگەر پێیان رازی بین) و ئاسۆی فراوانتر بەڕووی زانستدا دەکەنەوە، هەروەك چۆن مژدەی ئەوەش دەدەن کە ئەو پرسانەی بە پرسی غەیبییان دادەنێین Metaphysics یان ناسروشتی - Para normal دەکەونە چوارچێوەی زانست و حەقیقەتەوە.

---

(١) Unexplained phenomena such as Telepathy are illusary

(٢) بۆ بەرچاوڕوونی زیاتر بگەڕێوە سەر کتێبی(أنا تتحدث عن نفسها)ی د.عمرو شریف.

## (١٠) پزیشکیی نوێ تاکە لە رووی راستی و چالاکیی و کاریگەریدا[1]:

ملیارەها مرۆڤ لە وڵاتانی رۆژهەڵاتی دوور و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئەمریکای باشوور و ناوەڕاست بە جۆرەها شێوازی پزیشکیی کلاسیکی چارەسەر وەردەگرن، کە کاریگەریی راستەقینە و کاریگەریی خەیاڵییان تێکەڵ بەیەکتر کردووە.

کۆمەڵەی ئەمریکیی بۆ خۆراك و دەرمان FDA بەیاننامەیەکی دەرکردووە تێیدا رایگەیاندووە کە زۆرێك لە شێوازەکانی چارەسەری پزیشکی چینی کۆن (بەتایبەت دەرزی چینی) کاریگەریی هەیە بۆ دیاریکردن و چارەسەرکردنی نەخۆشیەکان، سەرەڕای ئەوەی لەگەڵ زانیارییە شیکارییەکانمان و فرمانییەکانی لاشەی مرۆڤدا نایەتەوە.

ئایا ئەم دانپێدانانەی دەستەی ئەمریکی هەڵەیی ئەوەمان بۆ دەرناخات کە بەتەنیا پشت بە شێوازی رۆژئاوایی ببەستین بۆ چارەسەری پزیشکیی، کە لەو سەدانەی دواییدا بەتەنیا لە گۆڕەپانەکەدایە، بگرە زۆربەی پزیشکان تەنیا ئەم جۆرە وەك پزیشکیی تەماشا دەکەن. ئایا ئەمە نابێتە هۆی ئەوەی کە دەرفەتەکانی سوودوەرگرتنمان لە چەند جۆرێکی چارەسەر لەدەست بچێت کە لە چەندین ژیارستانییەتی گەورەدا و بەدرێژایی هەزاران ساڵ چەسپاون و سوودیان لێوەرگیراوە؟!

---

(١) Mechanical Medicine is the only kind that Really works

## ئــازادبــوون :

ئەنیشتاینی بلیمەت تێکەڵەیەکی چارەسەری (روشتە)مان بۆ دەرچوون لەدیلی و بەندی ئەو بیروباوەڕە زانستییە دۆگماتییانە پێشکەش دەکات، کە رێ لە زانست دەگرێت و ناهێڵێت بەرەو ئاسۆی فراوانتر هەنگاو بنێت، دەڵێت: ((ئێمە ناتوانین کێشەکان بەهەمان ئەو شێوازەی بیرکردنەوە چارەسەر بکەین کە ئەو کێشانەیان بۆ درووست کردووین))، ئەو شێوازەش بریتییە لەو شێوازە یەککەوتووەی زانستی هاوچەرخ پەیڕەوی دەکات. چی دەڵێی ئەگەر ئەنیشتاین و ماکس پلانك و زانا فیزیاییە نوێیەکانی تر ئەو ئاستەنگانەی هاتوونەتە پێشیان بە فیزیای نیوتن چارەسەریان کردبا؟ گومان لەوەدا نییە کە لە تێپەڕاندنی ئەو ئاستەنگانە شکستیان دەهێنا و بە خەیاڵیان دادەنا! ئەگەر ئەو کارەیان کردبا ئەوا بیردۆزی رێژەیی و فیزیای چەندیی نەدەهاتنەکایەوە و زانست هەر لە قۆناغی فیزیای کلاسیکیدا دەمایەوە!!

**لەبەرئەوە شیڵدرێیك جەخت لەسەرئەوە دەکاتەوەو - ئێمەش هاوڕاین - کە:**

لەگەردووندا شتی زیاتر لە ماددە بوونی هەیە.

لە بایۆلۆجیادا شتی زیاتر لە دی ئێن ئەی و هەڵبژاردنی سروشتیی، بوونیان هەیە.

لە هۆشی مرۆڤدا شتی زیاتر لە کارەبا و کیمیای مێشك بوونی هەیە.

وانەی گەورە کە لەو خستنەڕووەی ڕابردوودا فێری دەبین ئەوەیە کە زانست حەقیقەتی بابەتیی رەها پێشکەش ناکات، بەڵکو - وەك فەلسەفە و ئایین - پەنا دەباتە بەر باشترین لێکدانەوە Inference to the Best Explanation کە

لەگەڵ ئایدۆلۆجیای مرۆڤدا دێتەوە، لە تەوەرەی دواتردا ئەوە ڕوون دەکەینەوە - کەبەداخەوە - زانستی هاوچەرخ ئایدۆلۆجیای ماددیگەرایی پەیڕەو دەکات.

شیلدرێیك مژدەی ئەوەمان پێدەدات کە ئەوبیروباوەڕە دۆگماتییانە بەرەو نەمانن، چونکە لە ئاییندەدا زانست زۆر چەمکی ناماددی قەبووڵ دەکات، دوای ئەوەی ژمارەی دەرچووانی کۆلێژە زانستییەکانی ڕۆژهەڵاتی دوور (کە باوەڕیان بە رەهەندی ناماددی هەیە) لە دە ساڵی ڕابردوودا چەند ئەوەندەی ژمارەی دەرچووانی ئەمریکا و ئەوروپایە. ئەمانە پێشەکی شۆڕشی هۆشیارین The Concious Revuolution کە هۆش لەبەر ماددە دانامالێت.

## پێویستیی مرۆڤ بۆ خـودای حەق :

### داماڵینی پیرۆزی لە گەردوون

مرۆڤی کۆن ڕاهاتبوو کە بەرگی پیرۆزی بەبەر بوونەوەرەکانی گەردوون و دیاردە سروشتییەکاندا بکات، گومانیش لەوەدا نییە کە ئەمە کۆسپێکی گەورەبوو لەبەردەم زانستدا. ئەگەر دەستمان بە لێکدانەوە کۆنەکانەوە گرتبا، وەك ئەوەی کە هەورەتریشقە و نەخۆشییەکان و کارەساتە سروشتییەکان تووڕەبوونی خودان، ئەوا لە لێکۆڵینەوە لەو دیاردانە دەوەستاین و میکانیزمەکانیمان نەدەزانی، بەمەش زانست پێشنەدەکەوت. کێشەکە لەوەدایە کە ماددیگەراکان / سروشتییەکان لەم بەدیهیاتانەوە هەنگاوێکی زۆر گەورەی بێ بیانوویان نا و وایان دانا کە داماڵینی پیرۆزیی لەبەر گەردوون واتا بێباوەڕی زەرورەت و پێویستە بۆ پەیڕەوکردنی زانستی ڕاستەقینە!.

بێباوەڕان بەهۆی پەیڕەوی کردن لە فەلسەفەی یۆنانی کۆن کەوتنە ئەم هەڵەیەوە، لەو سەردەمەدا تێکەڵکردن لە نێوان گەورە خوداوەندەکان و سروشت

لەلوتکەدابوو، تەنانەت سیفاتەکانی خوداوەندەکان ڕەنگدانەوەی سیفاتەکانی مرۆڤی یۆنانی بوو بە هەموو کەموکوڕییەکانیەوە[1]، زانست لە یۆنانی کۆندا پێشنەکەوت تا ئەو کاتەی کۆمەڵێك لە بیرمەندان(تالیس، ئەناکیمینس، ئەناکسیماندەر...) هەستان بە داماڵینی پیرۆزی لە هێزە سروشتییەکان و ڕەتکردنەوەی ئەو چەمکانەی شاعیرەکانیان ڕەواجیان پێدەدان، وەك هۆمیرۆسی خاوەنی هەردوو داستانی ئیلیازە و ئۆدێسا.

بەڵام میسرییە کۆنەکان تووشی ئەو تێکەڵییە نەبوون؛ سەرەڕای ئەوەی بۆ هەر دیاردەیەکی سروشتی ڕەمزێکی پیرۆزیان دانابوو (لافاو و هەورە تریشقەو...) بەڵام ئەوە نەبووە ڕێگر لەبەردەم داهێنانی زانستە سروشتیی و ئەندازیارییەکان و فێرکردنی مرۆڤایەتی.

گومان لەوەدا نییە کە سێ ئایینە یەکخواپەرستەکە پیرۆزییان لەبەر بوونەوەرەکانی گەردوون داماڵیوە، ئەمە بە ڕوون و ئاشکرایی لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە، لە چیرۆکی پێغەمبەری خودا ئیبراهیم (سەلامی خودای لەسەربێت) کاتێك ڕەتیکردەوە، کە گەلەستێرەکان خودابن[2]. هەمان واتا لە فەرمودەی

---

(١) بۆنموونە زینۆفانس Xenophanes (٥٠٠پ.ز) دەڵێت: ((ئەگەر مانگا و ئەسپ و ئاژەڵە دڕندەکان توانای وێنەکێشانیان هەبوایە، ئەوا خودایان لەسەر شێوەی خۆیان دروستدەکرد))ئەم ڕەوت و شێوازە تائێستاش هەر بەردەوامیی هەیە!

(٢) ﴿ ۞ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ ءَازَرَ أَتَتَّخِذُ أَصْنَامًا ءَالِهَةً ۖ إِنِّىٓ أَرَىٰكَ وَقَوْمَكَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٧٤﴾ وَكَذَٰلِكَ نُرِىٓ إِبْرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلْمُوقِنِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ ٱلَّيْلُ رَءَا كَوْكَبًا ۖ قَالَ هَٰذَا رَبِّى ۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَآ أُحِبُّ ٱلْءَافِلِينَ ﴿٧٦﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلْقَمَرَ بَازِغًا قَالَ هَٰذَا رَبِّى ۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمْ يَهْدِنِى رَبِّى لَأَكُونَنَّ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧٧﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلشَّمْسَ بَازِغَةً قَالَ هَٰذَا رَبِّى هَٰذَآ أَكْبَرُ ۖ فَلَمَّآ أَفَلَتْ قَالَ يَٰقَوْمِ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴿٧٨﴾ إِنِّى وَجَّهْتُ وَجْهِىَ لِلَّذِى فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ حَنِيفًا ۖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٧٩﴾ ﴾ الأنعام: ٧٤ - ٧٩ ئەوەمان بۆ باس بکە کە چۆن وەختی خۆی ئیبراهیم بە ئازەری باوکی وت: ئەوە بۆ چی ئەو بتانە ئەپەرستی و بە خودایان حیساب ئەکەی؟! کاری وەها کەی ڕەوایە؟ بە ڕاستی من وا ئەزانم و دڵنیام کە تۆش و قەومەکەیشت ڕێگاتان لێ تێکچووەو لە گومڕاهییەکی ئاشکرادان. ئا وەها دەلیلی خودایەتیی خوداو پەروەردگاریی ئەو بە ئیبراهیم پیشان ئەدەین، کە خودا خاوەنی ئاسمانەکان و زەوییە، تا بە تەواوی یەقین پەیدا بکات بەوەی باوەڕی پێیەتی و خەڵکی بۆ بانگ

درووستیشدا بەدی دەکەین، ئەوەتا کاتێك ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەری خودا (سەلامی خوای لەسەربێت) کۆچی دوایی کرد و هەر لەو شەوەشدا مانگ گیرا، هەندێك لە مسوڵمانان گوتیان، کە مانگ لە هاوسۆزی بۆ کوڕی پێغەمبەری خودا گیراوە، بەڵام پێغەمبەری خودا پێی فەرموون:

(إن الشمس والقمر آيتين من آيات الله لا ينخسفان لموت أحد ولا لحياة أحد....).
رواه البخاري ومسلم، عن ابن عباس.

واتە: ((مانگ و ڕۆژ دوو بەدیهێنراوی خودان نەلەبەر ژیانی کەس نە لەبەر مردنی کەس ناگیرێن،...)).

بێباوەڕان کەوتنە تێکەڵکردنێکی گەورەوە کاتێك وایانزانی داماڵینی پیرۆزی لە گەردوون و خوداوەندەکانی یۆنان و خوداوەندەکانی هاوبەشیدانەران واتای داماڵینی پیرۆزییە لەبەر چەمکی خودایەتیی و خودای تاقانە!

---

نەکات، چونکە ئینسان تا باوەڕو یەقینی بە شتێ نەبێ ناتوانێ خەڵکی بۆ بانگ بکات.کە باوکی بەجێهێشت و نەفرەتی لە بتەکانی ئەکرد و بەدوای ڕاستیدا ئەگەڕا و شەوی بەسەردا دەهات، ئەستێرەیەکی گەشی جوانی دی، وتی: ئەمەیە پەروەردگاری من، بەرزو دەس پێ نەگەییوە و، ڕووناك و ورشەدارە! کە ئەستێرەکە ئاوا بوو و شوێنەواری نەما وتی: من شتی ئاوابووم خۆش ناوێ، شتێکم خۆش ئەوێ هەمیشەیی بێ. جا کە مانگی دی هەڵهات و ڕووناکی پەخش کردەوە وتی: ئەمەیە خودای من و پەروەردگاری من. کە ئەمیش ئاوا بوو وتی: ئەمە چییە؟ بەڕاستی ئەگەر خودا نەمخاتە سەر ڕێگای ڕاست و بەرچاوم ڕوون نەکاتەوە ئەچمە ڕیزی گومڕایانەوە.ئەمجارە کە خۆری پڕتەوداری دی هەڵهات و جیهانی پڕکرد لە تین و ڕووناکی، وتی: ئا ئەمەیە خودای من ئەمە لەوانی تر گەورەترە. کە ئەمیشی دی ئاوا بوو و، لەبەرچاو ون بوو، وتی: ئەی خێڵەکەم ! من دوورم لەو شتانەی کە ئێوە کردووتانن بە هاوبەشی خودا.بێ گومان وا من ڕووم کردە ئەو پەروەردگارە بێ وێنەیە کە هەموو ئاسمانەکان و زەوی درووست کردووە و، لە نەبوونەوە هێناونیەتە بوون. من لەوانە نیم هاوبەش بۆ خودا دائەنێن، خودا تاك و تەنیایە.

## میکانیزم پێویستی بە هۆکاری سەرەتا هەیە :

لەوانەیە گەورەترین و مەترسیدارترین هەڵە، کە زانا ماددیگەراکان(نەك زانست) تێی کەوتوون وایانزانیوە تێگەیشتنمان بۆ میکانیزمە فیزیاییەکان کە گەردوونیان لەسەر دەڕوات واتای ئەوە دەگەیەنن کە خودایەك بوونی نییە کە نەخشەی گەردوونی کێشابێت و بەدیهێنابێت. ئەم خوێندنەوەیە هەڵەیەکی لۆژیکی گەورەیە کە بەم نموونەیە ڕوونیدەکەینەوە:

ئەگەر مرۆڤێکی سەرەتایی ناوچەیەکی دوورەدەستی جیهان بێنین، با وادابنێین ناوی (حور) بێت، ئۆتۆمۆبێلێکی جۆری فۆردی پێبدەین، گومانی زۆر ئەوەیە کە حور وا بیردەکاتەوە کە خودایەك هەیە(مستەر فۆرد )لەناو بزوێنەری ئۆتۆمۆبێلەکەدا خۆی حەشارداوە و ئۆتۆمۆبێلەکە دەجوولێنێت، هەروەها لەوانەیە وا بیریکاتەوە کە تا مستەر فۆرد لێمان رازی بێت ئەوا ئۆتۆمۆبێلەکە بە هێواشی و هێمنی دەڕوات، ئەگەر لێشمان تووڕە ببێت ئەوا ئۆتۆمۆبێلەکە پەکدەخات، پاشان حور دەچێتە بەر خوێندنێکی چڕ بۆ فێربوونی ئەندازیاری ئۆتۆمۆبێل، ئیتر بۆی دەردەکەوێت کە ئۆتۆمۆبێلەکە بە میکانیزمی سووتاندنی ناوەکیی دەڕوات و هیچ پێویستی بەوە نییە کە مستەر فۆرد لەنێو بزوێنەرەکەدابێت. بەڵام ئایا ئەوە ئەوە رەتدەکاتەوە کە هێنری فۆرد داهێنەری بزوێنەرەو بارودۆخی کارکردنی بۆ فەراهەم کردووە؟ ئایا دوورخستنەوەی ئەوە هەڵەیەکی لۆژیکی و مەنهەجی نییە؟.

ماددیگەراکان / سروشتییەکان دەکەونە هەمان ئەو هەڵەیەوە کاتێك وابیردەکەنەوە کە زانینی میکانیزم و بنەما فیزیاییەکان کە گەردوون و ژیانیان لەسەر دەڕوات پێویستیی بۆ بوونی خودایەك کە بەدیهێناوە و ڕێکیخستووە دووردەخاتەوە، واتا ئەوان میکانیزم و هۆکاری یەکەمیان تێکەڵ بەیەکتر کردووە.

کاتێك سێر ئیسحاق نیوتن یاساکانی جووڵە و هێزی کێشکردنی دۆزییەوە، ئەی گوت: ئەو میکانیزمانەم دۆزیەوە کە گەلەستێرەکان دەجووڵێنێت، کەواتە بوونی خودا پێویست نییە، بەڵکو دۆزینەوەکانی بوونە هۆی ئەوەی کە باوەڕی بە بوونی خودا زیاتر ببێت، کە ئەو میکانیزمە پتەو و ڕێکخراوانەی داڕشتووە.

ئەگەر لاپلاس پێویستی بوونی خودای ئەرێ کردبێت، کاتێك ناپلیۆن پرسیاری لێکرد دەربارەی ڕۆڵی خودا لە سیستەمی گەردوونیدا، با ئەوە بێنینە بەرچاوی خۆمان کە ناپلیۆن پرسیارێکی تایبەتتری لە لاپلاس بکردایە و پرسیاری لێکردبا: چۆن گەلەستێرە ماددییەکانی گەردوون کە لەژێر کاریگەری جووڵە و کێشکردندان دەکرێ بەشێوەیەکی وردی بیرکارییانە گوزارشتیان لێبکرێت؟ گومان لەوەدا نییە کە لاپلاس خۆی لەبەردەم هەڵوێستێکی قورسدا دەبینییەوە و (بەناچاری) لە وەڵامدا دەیگوت خـودا، یان دەیگوت: نازانم.

ئۆستن فارێر[١] قسە لەسەر وەڵامە ساختە ئەسڵیەکەی لاپلاس بۆ ناپلیۆن دەکات و دەڵێت: خـودا نە هێزە نە یاسای ناو هاوکێشە میکانیکییەکانە، لەبەرئەوە لە زانستەکانی فیزیا و فەلەك و بیرکاریدا باسی ناکرێت.

مایکل پوولْ[٢] پەیوەندی نێوان میکانیزمیی و هۆکاری یەکەم و ئامانجدارێتی لە دیبەیتەکەیدا لەگەڵ ریچارد دۆوکنز کورتکردۆتەوە کە دەڵێت: ((هیچ هەڤدژییەك نییە لەنێوان بوونی لێکدانەوەی زانستی بۆ دیاردەیەکی دیاریکراو و، بەدیهێنەری ئەو دیاردەیە و، ئامانج لە بەدیهێنانی)). هەروەك چۆن ئەوە بەسەر داهێنانەکانی مرۆڤدا جێبەجێ دەبن، بەهەمان شێوەش بەسەر ئەفراندراوەکانی خوداش جێبەجێ دەبن، ئەمە شتێکی بەدیهی عەقڵییە و هیچ پەیوەندی بەوەوە نییە کە باوەڕداری یان بێباوەڕ.

---

(١) Austin Farrer: (١٩٠٤-١٩٦٨)، فەیلەسوفێکی ئایینی بەریتانییە.

(٢) Michael Poole: فەیلەسوفێکی ئینگلیزیە، گرنگی بە زانست و ئاین دەدات، خەڵاتی تێمپلتۆنی وەرگرتووە.

## خودایەك نییە بۆ پڕکردنەوەی بۆشاییەکان :

هیچ دیبەیتێکی نێوان باوەڕداران و بێباوەڕان بەبێ باسکردنی چەمکی (خودای پڕکردنەوەی بۆشاییەکان God of Gaps) ئەنجام نادرێت، بێباوەڕان بەوە باوەڕداران تۆمەتبار دەکەن کە هەرکاتێك لە پێشکەشکردنی لێکدانەوەیەکی زانستیی بۆ دیاردەیەك بێتوانا بوون، ئەوا کارەکە دەدەنە پاڵ خودا بۆ داپۆشینی نەفامییان، پاشان هەمان ئەو نەفامییەیان دەکەنە بەڵگەی بوونی خودا.

بابگەڕێینەوە بۆ لای مستەر فۆرد، ئایا قسەکردن لەبارەیەوە بۆ پڕکردنەوەی کەموکورتی زانیارییەکانمان بوو لەسەر میکانیزمی سووتاندن کە بزوێنەرەکە کاری پێدەکات؟! لەهیچ هەنگاوێکی پەیوەندیدار بە میکانیزمەوە باسی فۆرد نەکراوە، چونکە ئەو میکانیزم نییە. بەڵام بەرپرسە لە بوونی ئەو میکانیزمانەی کە زادەی عەقڵ و کاری دەستی ئەون.

گەورەترین سەرکەوتنەکانی زانست ئەوەیە کە نیشانمان بدات کە جیهانی سروشتی ڕێکخراو و بەیەکەوە گونجاوە، لەسەرئەوە ئەنیشتاین دەڵێت: ((گەورەترین شتی یاخی گەردوون لە تێگەیشتندا بریتییە لەوەی کە لە گەردوون تێدەگەین))[1] هەروەها وایدەبینێت کە ئەو قابیلیەتە بۆ تێگەیشتن پێویستە هۆکارێکی قووڵتر و بەهێزتری لەپشتەوەبێت. فەیلەسووفی باوەڕدار ریچارد سوینبێرن[2] ئەوە

---

(١) The most Incomprehensible Thing in the Universe is that it is Comprehensible

(٢) (ریچارد سوینبێرن Richard Swinburne: بەریتانییە لە ساڵی ١٩٣٤ لە دایك بووە. مامۆستای فەلسەفەی شیکاری بوو لە زانکۆی ئۆکسفۆرد و گرنگییەکی زۆری بە فەلسەفەی ئاینەکان و فەلسەفەی زانست دەدا. هەر دوو سێ ساڵ جارێك کتێبێکی فەلسەفی قوڵ بڵاودەکاتەوە، بە شێوازێکی وا دەنوسێت کە خەڵکی ئاساییش تێی بگەن. لە گرنگترین ئەو کتێبانە ?Is there a God، کە بۆ سەر زیاتر لە ١٢ زمان وەرگێڕدراوە.

شیدەکاتەوەو دەڵێت: ((کاتێك باسی خودا دەکەم، من باسی خودایەك ناکەم بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییانەی تائێستا زانست وەڵامێکی بۆ نەدۆزیونەتەوە، من نکۆڵی لە توانای زانست ناکەم بۆ تەواوکردنی لێکدانەوەکەدا، بەڵام من پرسی بوونی خودایی بۆئەوە دەخەمەڕوو کە (بۆچی) زانست توانای پێشکەشکردنی لێکدانەوەیەکی گونجاوی هەیە)). بە واتای ئەوەی سوینبێرن هەست بەوە ناکات کە پێویستیمان بە خودایە بۆ لێکدانەوەی ئەو شتانەی زانست ناتوانێت لێکدانەوەیان بۆ بکات، بەڵکو بۆ لێکدانەوەی ئەوەی زانست لێکی دەداتەوە.

کەواتە داننان بە خودا بۆ لێکدانەوەی ئەو شتانە نییە کە ناتوانین لێکدانەوەیان بۆ بکەین، نە لێکدانەوەشە لەبری زانست، ئەو لەپشتەوەی لێکدانەوەکانە، جا ئەوە بێت کە پێی گەیشتووین یان بێ توانابووین، لەبەرئەوە بانگەشەی بێباوەڕان بەوەی کە دیندارەکان ئەو شتانە لێکدەدەنەوە کە زانست هێشتا نەیتوانیوە لێکیان بداتەوە ئەوە بانگەشەیەکی بەلارێدابراوە و هەر لەسەرەتاوە هەڵەیە.

## یاساکانی زانست لە میکانیزمەکانی کاری خودان :

خودا وای ویستووە کە کاری لە گەردووندا لەڕێی هێز و یاساکانی سروشت بێت، زۆرێك لە بێباوەڕان (هەندێك لە دیندارەکانیش) بەهەڵە لە واتای فەرموودەی پەروەردگار تێگەیشتوون کە فەرموویەتی:

﴿ إِنَّمَآ أَمۡرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيۡـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ٨٢ ﴾ یس: ٨٢.

ئەوان واتێگەیشتوون، کە (كُن فيكون) واتا دەستکاری ڕاستەوخۆی خودایی لە هەموو هەڵوێستێکدا، لە کاتێکدا قورئانی پیرۆز لە شوێنی تردا ئەوەی ڕوون کردۆتەوە کە خودا لەڕێی هۆکارەکانەوە ئەوە دەکات، بەلایەنی کەمەوە لە حەوت

شوێندا[١] خوای پەروەردگار باسی ئەوەمان بۆ دەکات کە ئاوی بەکارهێناوە بۆ سەوزکردن و روواندنی رووەك، ئایا خودا لە توانایدا نەبوو ڕاستەوخۆ رووەکە بڕوێنێت؟!.

ئامادەکردنی هەسارەی زەوی بۆ ئەوەی ببێتە شانۆی ژیان دە بلیۆن ساڵی خایاندووە، هەروەها بوونی هەریەکە لە ئێمە ئەوەی پێویست بووە کە دایك و باوکمان جووت ببن و بۆ ماوەی نۆ مانگ لە سکی دایکماندا بمێنینەوە، ئەو بابەتانە و چەندانی تریش کە دەچنە ژێر باری یاساکانی سروشت لە حەقیقەتدا بە وشەی (کُن) ئەنجامدراون.

ئەمە بەو واتایە نا کە ڕۆڵی خودا لە بەدیهێنان و پاڵپشتی هێز و دانانی ئەو یاسایانەی بوونەوەر بەڕێوە دەبەن کۆتایی بێت، پاشان دامەزراوەکە بەخۆی بچێت بەڕێوە، وەك کاتژمێری زەنبەرکی پڕی بکەین و لێی بگەڕێین خۆی کار بکات، هەروەك ئەرستۆ و رەوتی خوداییەکان Diests باوەڕیان وابوو، یان وەك ئەوەی کافرانی مەککە لە ڕۆژگاری هاتنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دا باوەڕیان وابوو:

---

(١) ﴿ إِنَّمَآ أَمْرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيْـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٨٢﴾ ﴾ يس: ٨٢

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى يُرْسِلُ ٱلرِّيَـٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَقَلَّتْ سَحَابًا ثِقَالًا سُقْنَـٰهُ لِبَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَنزَلْنَا بِهِ ٱلْمَآءَ فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ ۚ كَذَٰلِكَ نُخْرِجُ ٱلْمَوْتَىٰ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾ الأعراف: ٥٧

﴿ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ مَهْدًا وَسَلَكَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّن نَّبَاتٍ شَتَّىٰ ﴿٥٣﴾ ﴾ طه: ٥٣

﴿ أَمَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَنۢبَتْنَا بِهِۦ حَدَآئِقَ ذَاتَ بَهْجَةٍ مَّا كَانَ لَكُمْ أَن تُنۢبِتُوا۟ شَجَرَهَآ ۗ أَءِلَـٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ ﴿٦٠﴾ ﴾ النمل: ٦٠

﴿ خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ۖ وَأَلْقَىٰ فِى ٱلْأَرْضِ رَوَٰسِىَ أَن تَمِيدَ بِكُمْ وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ ۚ وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ ﴿١٠﴾ ﴾ لقمان: ١٠

﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ ثَمَرَٰتٍ مُّخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهَا ۚ وَمِنَ ٱلْجِبَالِ جُدَدٌۢ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ ﴿٢٧﴾ ﴾ فاطر: ٢٧

﴿ وَنَزَّلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً مُّبَـٰرَكًا فَأَنۢبَتْنَا بِهِۦ جَنَّـٰتٍ وَحَبَّ ٱلْحَصِيدِ ﴿٩﴾ ﴾ ق: ٩

﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ... ﴾ لقمان: ٢٥.

واتە: ئەگەر لێیان بپرسی کێ ئاسمان و زەوی بەدیهێناوە، دەڵێن خودا!)، بیروباوەڕی دینداران بەو جۆرەیە کە خودا (بەڕێوەبەر)ی گەردوونە، واتا بەردەوام بە دانان و کاراکردنی یاساکانی سروشت و بۆ تەنانەت چرکەساتێکیش لێی غافڵ نابێت[1]:

﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَىُّ ٱلْقَيُّومُ لَا تَأْخُذُهُۥ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ ... ﴾ البقرة: ٢٥٥.

داننان بەوەی کە خودا لەڕێی هێز و یاسا سروشتییەکانەوە گەردوون بەڕێوە دەبات، ڕێگریی لەوە ناکات کە هەندێك هەڵوێست هەبێت خودا ڕاستەوخۆ کاریگەری تێدا درووست بکات، وەك سەرەتای سەرەتاکان (سەرەتای گەردوون و ژیان...). ئێمە، کە ئەو قسەیە دەکەین لە نەزانیی و کەمی زانیاریی و تەمبەڵییەوە سەرچاوەی نەگرتووە، بەڵکو لە کاتی لێکۆڵینەوە لە سەرەتاکانی گەردووندا بۆمان دەردەکەوێت کە ماددە لە نەبوونەوە هاتۆتەبوون، ئەو بابەتەی زانست پێمان دەڵێت ئەوە شتێکی مەحاڵە، ئا لەو کاتەدا هیچ ڕێگایەکی ترمان لەبەردەمدا نییە جگە لەوەی ددان بە کاریگەری ڕاستەوخۆی خودا بنێین، بۆ درووستکردنی (تاك Singularity) کە لێیەوە تەقینەوە گەورەکەی گەردوون ڕوویداوە کە گەردوونی لێ هاتۆتەبوون[2].

گومانیش لەوەدا نییە، کە موعجیزە خوداییەکانیش لەو هەڵوێستانەن، کە خودا ڕاستەوخۆ هەستاوە بە لابردنی دامەزراوەی هۆکارەکان تەنانەت پێچەوانەکردنەوەیان، ئەمەش وەك دەرخستنی توانای خودا و بەڕاستدانانی پێغەمبەرەکانی.

---

(١) لەتەوەرەی چواردەهەمدا بە دوور و درێژی باسی ئەم چەمکە دەکەین.

(٢) لە تەوەرەی چوارەمدا بە دوور و درێژی باسی ئەو بابەتە دەکەین.

**خوێنەری بەڕێز :**

سەرەڕای ئەو قووڵیی و پسپۆڕییەی (فەلسەفەی زانست) پێیگەیشتووە، بەڵام چەند چەمکێکی هەڵە بڵاوبوونەتەوە دەربارەی سروشتی زانست و پەیوەندی بە خودایەتی و دینداریییەوە. بۆ ڕاستکردنەوەی ئەو چەمکانە باسی زانستمان خستە سەرەتای کتێبەکە، تا تەئسیل و بناغە دابنێین بۆ ژمارەیەك چەمك کە لەلای زۆر کەس و تەنانەت پسپۆڕانیش ناڕوونە، گرنگترینیان:

- زانست جیهانیی و بێلایەنە، مەنهەجی زانستیش بەوە وەسف ناکرێت کە باوەڕدار یان بێباوەڕ یان سروشتییە، تەنیا مەنهەجێکی زانستییە و تەواو.

- بەڵگەی هەستیی بۆ سەلماندنی ڕاستی و درووستیی پرسە زانستییەکان لە بەهێزیدا لەدوای بەڵگەی بیرکاری و بەڵگەی عەقڵی و بەڵگەی زانستیی تاقیگەیی دێت.

- شوێنکەوتنی مەنهەجی وردکردنەوە(اختزالی)بووە هۆی برەودان بە کاروانی زانست، بەڵام بووە هۆی وەلانانی ڕۆڵی لایەنە نامادییەکان بۆ دیاردە جیاوازەکان.

- زانستی تاقیگەیی لەسەر مامەڵەکردن لەگەڵ میکانیزمە زانستیی و جێبەجێکارییەکانی زانست دامەزراوە و توانای دەرککردنی نییە بە هۆکاری یەکەم و ئامانجدارێتی دیاردەکان.

- عەقڵی تەواو بێلایەن یەکێکە لە شتە مەحاڵەکان، هەر بۆیەلەئێستادا زانست شوێن ئایدۆلۆجیای جیاواز دەکەوێت، لەجیاتی ئەوەی کە ڕێبازی فەلسەفی زادەی زانستە سروشتییەکان بێت، ئەمەش یەکێکە لە گەورەترین بەڵگەکانی لایەنگیریی زانست.

- زانا و فەیلەسوفە ماددیگەراکان زاراوەی ((پەیدابوون Emergence))یان بۆ لێکدانەوەی ئەو پرسانە داهێناوە کە زانست بێتوانایە لە لێکدانەوەیان، ئەمەش

وەك جێگرەوەیەك بۆ چەمكی (خەلق)، تەنیا بۆ هەڵاتن لە دانانان بە بوونی خودای بەدیهێنەر.

- ماددیگەراكان لەوەدا هەڵە دەكەن كە پێیان وایە هەرچی یاساكانی سروشت لێكی بداتەوە پێویستیی بە بوونی خودا نییە و هەر میكانیزمێك كە زانست پێی دەگات دەبێتە هۆی كەمكردنەوەی پێگەی خوایەتی. خودا یاسا گەردوونییەكان لە بەڕێوەبردنی گەردووندا بەكاردەهێنێت، ئەوەش بریتییە لە میكانیزمی كاری خودایی (كُن).

پاكی و بێگەردی بۆ ئەو بەدیهێنەرەی یاساكانی سروشتی داناوە و بوونەوەری ناچاركردووە كە پێیەوە پابەند بێت و بەشێوەیەكی پلەبەندی بۆ مرۆڤی دەرخستووە و توانای ئەوەی پێبەخشیوە كە بەكاریان بێنێت، تا بتوانێت وەك جێنشینی خودا لەسەر زەوی بە ئەركی خۆی هەڵبستێت.

## تەوەرەی سێیەم

# ناکۆکییەکی هەڵە..

((هیچ شتێك ئەوەندەی ئەوە نابێتە هۆی لەدەستدانی متمانە بە زانایەك، کە بڵێت زانست وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانە دەزانێت (یان بەم زووانە دەزانێت)کە شیاوی ئەوەن بپرسرێن و ئەو پرسیارانەش، کە وەڵامێکی زانستییان بۆ نییە شیاوی ئەوە نین کە بپرسرێن و زانستی درۆینەن و تەنیا گەمژەکان ئەو پرسیارانە دەکەن و تەنیا سادەکانیش هەوڵی ئەوە دەدەن کە وەڵامیان بدەنەوە)).

سێر پیتەر موداوەر[1]

((بێباوەڕە نوێیەکان زانستی نین وەك بانگەشەی بۆ دەکەن، ئەوان هەرکاتێك بەڵگەکان بوونە هۆی ئەوەی گومان لە ڕێبازی ماددیگەرایی بکەن و بەڵگەکان بەلای داننان بە بوونی خودا بوون، ئەوکاتە دەمارگیرییان دەردەکەوێت و دەبنە کەسانی نازانستی، تەنانەت دەبنە دژی زانستیش، وەك هەر کەسێکی دۆگماتی ))[2].

جۆن لینۆکس[3]

---

(١) خاوەنی خەڵاتی نۆبڵ لە پزیشکیدا، لەتەوەرەی رابردوو ناساندمان.

(٢) دۆگماتیی Dogmatic : بریتییە لە دەمارگیریی بۆ بیروباوەڕێك بەبێ بوونی بەڵگە.

(٣) John Lennox: مامۆستای بیرکاریی و فەلسەفەی زانستەکانە لە زانکۆی ئۆکسفۆرد، بەریتانییە، بە نووسینەکانی و دیبەیتەکانی لەدژی بێباوەڕیی بەناوبانگ بوو، بەتایبەت لەگەڵ ریچارد دۆوکنز.

لەنێو بێباوەڕە نوێیەکان دەنگۆی ئەوە گەرمە کە هەر پێشکەوتنێکی زانستیی لە پێگەی خوایەتی کەمدەکاتەوە و بزمارێکی تر دەدرێ لە تابووتی خودا. پیتەر ئەتکینز ئەو بۆچوونە بەرجەستە دەکات و دەڵێت: ((پێویستە مرۆڤایەتی ئەوە قەبووڵ بکات کە زانست هەموو بیانوویەکی بۆ بوونی ئاسمانجدارێتی لە بوونەوەردا لەناویردووە، ئەوەی لەو جۆرە بیرکردنەوەیە ماوەتەوە تەنیا خەیاڵاتێکە بە سۆزدارییی ئاودەدرێت)).

پێشەوای بێباوەڕە نوێیەکان ریچارد دۆوکنز هەنگاوێك لەوە دوورتر دەڕوات، ئەو پێی وایە کە باوەڕبوون بە خودا خراپەیەکە پێویستە لاببرێت، دەڵێت: ((ئەگەر پێمان وابێت نەخۆشی ئایدز و شێتی مانگا لەو مەترسیانەن کەهەڕشەن لەسەر ژیانی مرۆڤایەتی، ئەوا باوەڕبوون بە خودا یەکێکە لە گەورەترین شەڕو خراپەکانی جیهان، تەنانەت لە نەخۆشی ئاوڵە(جدری)یش مەترسیدارترە کە توانرا لەناوببرێت.

باوەڕ ڕەزیلەتی هەموو ئایینێکە، چونکە بیروباوەڕێکە هیچ بەڵگەیەکی لەپشتەوە نییە)). هەندێ کات دۆوکنز توندی هێرشەکەی سووکتر دەکات، لەجیاتی ئەوەی دین بە ڕەزیلەت دابنێت بە وەهمی دەزانێت، دەڵێت: ((کاتێك کەسێك کێشەی وەهم و خەیاڵاتی هەبێت ئێمە بە شێتی دادەنێین، بەڵام کاتێك خەڵکانێکی زۆر ئەو کێشەی وەهم و خەیاڵاتەیان هەبێت ئێمە بە دیندارەکانیان دادەنێین))[1].

هەروەها دۆوکنز وایدەبینێت کە هەموو باوەڕێکی ئایینی باوەڕێکی کوێرانەیە، ئەو وایدەبینێت کە چێژی باوەڕیش لەوەدایە!، ئێمەش لێی دەپرسین بەڵگەی چییە لەسەر ئەوە؟ لەهەمان کاتدا لەوەدا لەگەڵی هاوڕاین کە زۆرن ئەوانەی باوەڕەکەیان لە بەڵگەی عەقڵی و زانستی سەرچاوەی نەگرتووە، لەبەدبەختی دۆوکنزە کە تووشی هەڵخلیسکان هاتووە لە ئاست زۆرێکیان!.

---

(١) دۆوکنز ئەو وتەیەی لە ڕۆبێرت پیرسینگ وەرگرتووە لە کتێبی: Zen And The Art Motor Cycle Maintenance

جێگەی سەرسامییە کە پێشەواکانی بێباوەڕان وادەزانن کە جەنگی نێوان زانست و خودا هەر بەڕاستی لە بەرژەوەندی زانست کۆتایی پێهاتووە! و خودا مردووە(وەك نیچە گوتوویەتی) و زانست ناشتوویەتی!، سەرنجی ئەوە بدە کە پیتەر ئەتکینز نووسیویەتی: ((ناکرێ زانست و ئایین بەیەکەوە هەڵبکەن، پێویستە مرۆڤایەتی پێگەی منداڵەکەی خۆی(مەبەستی لە زانستە) بزانێت و هەموو ئەو هەوڵانە رەتبکاتەوە کە لەپێناو پێکهاتن و ئاشتکردنەوەیان دەدرێن و، شکستی ئایین بەرامبەر بە زانست بە ئاشکرایی رابگەیەنێت و زانست بخاتە سەر تەختی پاشایەتی)). ئای چەندە زمانێکی ناشرین و پڕ لە خەڵەتاندن و درۆیە.

**ئایا ئەو ململانێ گەرمەی بێباوەڕان بانگەشەی بۆ دەکەن لە نێوان زانست و ئایین ململانێیەکی ڕاستەقینەیە؟**

زۆربەی ئەو دیندارانەی گرنگی بە فەلسەفەی زانست دەدەن (منیش لەگەڵیاندا هاوڕام) وایدەبینن کە:

ناکۆکیی نێوان ئایین و زانست ناکۆکییەکی هەڵەیە.

بۆ تێگەیشتنی کورتبینی زانست دەگەڕێتەوە، کە دژایەتی ئایین دەکات.

هەروەها تێگەیشتنی کوورتبینیی ئایین، کە دژایەتی زانست دەکات.

کەواتە ئەوەی دەیبینین ناکۆکیی نێوان ئایین و زانست نییە.

بەڵکو زانایانی دیندار و زانایانی بێباوەڕ دەبینین.

ناکۆکیی ڕاستەقینە ناکۆکیی نێوان ڕێبازی سروشتی و ئایینە.

بەڵکو ئەوە دڵنیا دەکەینەوە کە گونجانێکی ڕاستەقینە هەیە لەنێوان ئایین و بنچینەکانی زانستدا.

لەم تەوەرەیەدا هەڵدەستین بە گفتوگۆکردن دەربارەی هەریەك لەم چەمکانە بەتەنیاو ئینجا رامان لە پەیوەندییان بەیەکەوە، بۆ ئەوەی پەیوەندی ڕاستەقینەی نێوان زانست و ئایینمان بۆ دەربکەوێت.

## بەڵکو زانایانی دیندار و زانایانی بێباوەڕ هەن

جۆن هۆت[1] دەڵێت: ((بوونی یەك قەلی سپی ئەو بانگەشەیە هەڵدەوەشێنێتەوە کە هەموو قەلەکان ڕەشن))، بەهەمان شێوە بوونی کۆمەڵە مرۆڤێکی کەم کە ئایینەکەیان لە زانست و لۆژیکەوە سەرچاوەی گرتبێت، هەموو بانگەشەکانی بێباوەڕە نوێیەکان سەبارەت بە بوونی هەڤدژیی لەنێوان زانست و ئایین هەڵدەوەشێنێتەوە. بەڵگەکەمان بەهێزتر دەکەین و دەپرسین: ئایا کە دەڵێین هەندێك ئەدیب بێباوەڕن ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە ئەدەب بێباوەڕ بێت؟!.

گومان لەوەدا نییە کە دۆخەکە لە ڕۆژهەڵات و جیهانی ئیسلامی زۆر جیاوازی هەیە لەگەڵ ڕۆژئاوای مەسیحیی، چونکە لە یەکەمیاندا بێباوەڕان وێنەی قەلە سپییەکان دەنوێنن، بەڵام لە ڕۆژئاوادا بابەتەکە پێویستیی بە ڕوانینێکی قووڵتر هەیە. ئەگەر سەرنجی چینی زانایان بدەین دەبینین کە ٪٩٠ لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی فەلەکناسیی[2] لە ئینگلتەرا باوەڕدارن. لە ویلایەتە یەکگرتووەکانیش، لێکۆڵینەوەیەك لەسەر ١٠٠٠ زانا ئەنجام دراوەو لە گۆڤاری Nature (لە ئەپریلی١٩٩٧) بڵاوکراوەتەوە تێیدا ژمارەی زانا دیندارەکان و بێباوەڕان لەساڵی ١٩١٦دا یەکسانە، پاشان لە ساڵی ١٩٩٦ بێباوەڕەکان بە ڕێژەی ٪٦ زیادیان کردووە،واتا دوای هەشتا ساڵ لە پێشکەوتن و ئەو بانگەوازە بێباوەڕییە توندەی دەکرا، تەنیا بە ڕێژەیەکی کەم نەبێت زیادیان نەکردووە.

لە بەرامبەر هەڵوێستی بێباوەڕانی وەك دۆکنز و ئەتکینز دا، دەبینین زۆربەی گەورە زانایان لە دامەزرێنەرانی فیزیای چەندیی و ئەوانەی هەموویان

---

(١) John Haught: پیاوی لاهوتی ئەمریکیی، گرنگی دەدات بە پەیوەندی نێوان ئاین و زانست.

(٢) کۆمەڵەی ئەلەکناسیی Royal Society گەورەترین دەستەی زانستییە لە ئینگلتەرا. لە ١٤٠٠ گەورە زانای زانستە پراکتیکییە جیاوازەکان پێکهاتووە. لە ساڵی ١٦٦٠ز دامەزراوە.

خەلاتی نۆبڵیان وەرگرتووە زانای خودایی بوون، لەسەرووی هەموویانەوە ئەنیشتاین، ماکس پلانك، هیزنبێرگ، شرۆدینگەر، پۆڵ دیراك. بەهەمان شێوە بەناوبانگترین پێشەوایانی زانایانی مێشك و دەمار لە باوەڕداران بوون، لەوانە رۆجەر سپێری، ویڵەر پێنفیڵد، چارڵس شرینگتۆن، جۆن نیکلز، کە هەر چواریان خەلاتی نۆبڵیان وەرگرتووە. گومان لەوەدا نییە کە ئەو دوو نموونەیە ئەو قسە بێ بنەمایانەی بێباوەڕان دەیکەن هەڵدەوەشێنێتەوە کە گۆڕەپانیان پێ پڕ کردووەو دەیڵێنەوە بەوەی زۆربەی زانایان بێباوەڕبوون و، ئامارەکان ساختە دەکەن لەپێناو سەلماندنی قسەکەیان.

هەروەها سەرنجی پێشەوا گەورەکان بدە لە زانا دیندارەکان. ئەوەتا گالیلۆ رایدەگەیەنێت کە لە پشت عەقڵە پرسیارکەرو توێژەرەکەی لە بواری حەقیقەتدا، قەناعەتێکی ناوەکیی هەیە بەوەی ئەو بەدیهێنەرەی هەستەکان و عەقڵ و زیرەکیی پێداوین داوامان لێدەکات بەکاریان بێنین بۆ گەیشتن بە زانیاریی.

هەروەها ئەوەتا کۆپلەر رایدەگەیەنێت کە ئامانجی سەرەکی گەڕان لە جیهانی دەرەوەدا بریتییە لە دۆزینەوەی ئەو سیستەمە لۆژیکییەی خودا دایناوە، ئەوەی کە لە زمانی بیرکاریدا بۆمانی دەرخستووە. هەروەها ئەنیشتاین جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئامانجی سەرەکیی بریتییە لەوەی بزانێت چۆن خودا بیردەکاتەوە، جگە لەوە شتەکانی تر وردەکاری و لاوەکین.

هەروەها سێر جۆن هۆفتن[1] زانای گەورەی کەش و هەوا دەڵێت: ((زانستەکەمان باوەڕی بە خودا هەیە، خودا لەپشت تەواوی چیرۆکی زانستەوەیە؛ سیستەمی سەرسوڕهێنەر، مەحکەمیی، ڕاستگۆیی، ئاڵۆزی سەرسوڕهێنەر، هەموو ئەوانە تەنیا چالاکییەکانی خودان)). هەروەها سەرنجی قسەی سێر جیلیان پرانس[2] بدە کە دەڵێت: ((ساڵانێکی زۆرە من باوەڕم وایە کە خودا نەخشەی

---

(١) John Haughton: زانا و مامۆستای کەش و هەوا لە زانکۆی ئۆکسفۆرد، یەکێکە لە ئەندامانی لیژنەی بەخشینی خەلاتی نۆبڵی ئاشتی، قسەکە لە کتێبی Our Sciense is God Sciense وەرگیراوە، لە ساڵی ١٩٣١ز لە بەریتانیا لەدایکبووە.

(٢) Ghilleaan Prace: گەورە زانای رووەکناسی و ژینگە، لە ساڵی ١٩٣٧ز لە بەریتانیا لەدایکبووە.

بوونی کێشاوەوبەدیهێناوە، هەموو لێکۆڵینەوە زانستییەکانم ئەو باوەڕو ئیمانە دەسەلمێنن)).

جگە لەوانەش زانای تری بەناوبانگی زۆر هەن لەوانە پاسکاڵ و پۆیڵ و نیوتن و فارادای و مێندل و باستێر و ماکسوێل.

دەرەنجام ئەوەیە کە زانای گەورەمان هەیە کە بوونی خودا و دەسەڵاتی بەسەر بووندا دەسەلمێنن، لەبەرامبەریشدا هەندێکی تریان خۆیان بە هەڵەدا دەبەن، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە پەیوەندی نێوان خودا و زانست سادە نییە، بەڵکو پێویستی بە تێڕامانێکی قووڵ هەیە.

## تێگەیشتنی کورتبینی زانست، دژایەتی ئایین دەکات

لە دوو تەوەرەی ڕابردوودا باسی ئەوەمان کرد کە نیشانەکانی ڕێبازی زانستی لە بارودۆخی ململانێی نێوان پیاوانی زانست کە لە حەوجۆش (قمقم)ەوە سەرچاوەی گرتووە لەگەڵ پیاوانی کڵێسا ئەوانەی ڕژدبوون لە بەرگریکردن لە بیرۆکە دۆگماتی و دەسەڵاتەکەیان.

بینیمان کە چۆن ئەو ناکۆکییە بووە هۆی ئەوەی زانایان زیاتر جەخت لەسەر لێکدانەوەی میکانیزمیی بکەنەوە، ماددیگەراکانیشیان ئەمەیان بە تەواوی حەقیقەت و ڕاستی دادەنا، هەروەها وایان دەزانی کە ئالیەت و میکانیزمیی لەکۆڵنەوەمان دەکاتەوە بەدوای ئامانجدارێتی و هۆکاری یەکەمدا بگەڕێین، ئەم تێگەیشتنە کورتبینەش بۆ زانست بووە هۆی ئەوەی ئەوانە بەتەواویی نکۆڵی لە ئایین و خودا بکەن.

## تێگەیشتنی کورتبینیش بۆ ئایین، دژایەتی زانست دەکات

هێندە گوناحی وا خراونەتە سەر شانی ئایین کە هیچ پەیوەندی پێوە نەبووە، ئەوەی کەسە دڵسۆزەکان بەهۆی تێگەیشتنی کورتبینیانەوە بە ئایینیان کردووە تاکە نیازخراپەکان پێیان نەکردووە.

چەند زۆرن ئەوانەی دڵسۆزانە لە میانڕەوی دەرچوون بۆ هەوڵدان بۆ پاکڕاگرتنی خودا و بەرزکردنەوەی پێگەی ئایینەکەیان، کەچی ئەنجامەکەی پێچەوانەی ئەوە بووە، سێ نموونەت لەسەر ئەوە پێشکەش دەکەم:

## لاهووتی ئۆگەستین هەزار ساڵ زانستی دواخست:

گومان لەوەدا نییە کە لاهووتی ئۆگەستین[1]، کە بۆ ماوەی زیاتر لە هەزار ساڵ دەستی بەسەر ئەورووپادا گرتبوو و ئەو بیرۆکەیەی خستبوویەڕوو لەسەرئەوەی کە مەسیح خۆی فیدای مرۆڤایەتی کردووە، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە ئاڕاستەی گرنگیدان بە دونیا بگۆڕێت بۆ گرنگیدان بە غەیب، لەگەڵ ئەوەشدا دیدی ئۆگەستین دیدێکی مەجازی بۆ سروشت هەبوو کە دیاردە و ڕووداوەکانی سروشت ئاماژەن بۆ چەمکی ئایینی غەیبی، ئەنجامەکەیشی بریتی بوو لە کەمبوونەوەی گرنگیدانی خەڵك بە سروشت و بنیاتنانی ژیارستانیەت.

پیتەر هاریسۆن[2] مامۆستای مێژووی زانست و ئایینەکان لە ئۆکسفۆرد

---

(١) augustin: (٣٥٤-٤٣٠) لە جەزائیر لەدایك بووە، بە قەشە ئۆگەستین ناسراوە، بە یەکێك لە کاریگەرترین کەسایەتییەکانی مەسیحی لە ڕۆژئاوا ناسراوە.

(٢) Peter Harrison: لە ساڵی ١٩٥٥ لەدایك بووە.

ئەوەمان بۆ ڕووندەکاتەوە کە دەرکەوتنی ئاڕاستەی پرۆتستانتی[1] لە مەسیحییەتدا لە سەدەی شازدەهەمدا کۆتایی بە بیرۆکەی فیدای مەسیح و ڕەمزییەتی سروشت هێنا بەو شێوەیەی تۆگەستین لە تەورات تێیگەیشتبوو، ئەمەش لەپشت ڕزگاربوونی زانستەوەبوو لە کۆت و بەندەکان.

## ناکۆکی کڵێسا لەگەڵ گالیلۆ

گالیلۆ باوەڕێکی قووڵی بە خودا هەبوو، باوەڕی وابوو، کە خودا بە دەستی خۆی یاساکانی سروشتی بە زمانی بیرکاریی نووسیوە و عەقڵی مرۆڤیش گەورەترین کارەکانی خودایە. بۆیە لە سەرەتادا پاڵپشتییەکی زۆری کرا لەلایەن زانا و فەلەکناسە دیندارەکان، لەکاتێکدا زۆر بە توندی لەلایەن فەیلەسووفانی عەلمانی ئەکادیمیای زانستیی هێرشی کرایە سەر بەهۆی ئەوەی کە لە بۆچوونەکانی ئەرستۆ دەرچووە، بۆیە سەرۆکەکانی کڵێسایان لە دژی هاندا.

هەروەها لەلایەکی تریشەوە ئەو سەردەمەی گالیلۆ سەردەمێکی زۆر ناخۆش بوو بۆ کڵێسای ڕۆمانی دوای ئەوەی بانگەوازی پرۆتستانتی بۆ چاکسازیی دەرکەوت، ئەنجامەکەشی ئەوە بوو کە باسکردنی هزری گالیلۆ قەدەغەکرا و نیشتەجێبوونیشی سنووردار کرا.

ناکۆکیی گالیلۆ لەگەڵ ئەرستۆ لەرووی مەنهەجییەوە بوو هەر وەك چۆن لەرووی وردەکاریشەوە بوو. لەرووی مەنهەجییەوە، لەجیاتی ئەوەی گالیلۆ بۆچوونەکانی دەربارەی ئاسمان لەسەر هزری فەلسەفیی دابمەزرێنێت، رووی تەلیسکۆبەکەی کردە ئاسمان و بەمەش وردەکاری زۆری پێگەیشت. گالیلۆ

---

(١) ئاڕاستەی پرۆتستانتی ئاڕاستەی عەقڵانییە لە ئاینی مەسیحیدا، بانگەواز بۆ گەڕانەوە بۆ کتێبی پیرۆزی ڕەمەن دەکات، لەگەڵ وەلاتانی هەموو ئەو شتانەی خزێنراونەتە ناو مەسیحییەت لە بیروباوەڕ و لێکدانەوە، هەروەك چۆن بانگەواز دەکات بۆ هەڵوەشاندنەوەی دەسەڵاتی پاپاکان. یەکێك لە بەناوبانگترین دامەزرێنەرانی ئەو ئاڕاستەیە مارتن لۆسەری ئەڵمانییە(١٤٨٣-١٥٤٦) لەگەڵ جۆن کالڤنی فەرەنسی(١٥٠٩-١٥٦٤).

ئەوەی سەلماند کە کۆپەرنیکۆس گوتبووی بەوەی کە خۆر چەقی گەردوونە نەوەك زەوی. هەروەها گالیلۆ پەڵە خۆرییەکانی سەلماند کە لەگەڵ چەمکی خۆر وەك ئەستێرەیەکی نموونەیی تێکدەگیرا، هەروەك چۆن ئەستێرەکانی سوپەر نۆڤای (تەقێنراوەی) وەسف کرد، کە بوونیان لەگەڵ ئاسمانە جێگیرەکاندا تێکدەگیرا، هەردووکیشیان دوو چەمکن کە فەیلەسووفە ئەرستییەکان بۆیان دەمارگیرن، کە تێیاندا کەموکوڕی کەمال و تەواوەتیی واجب لە بەدیهێنانی خوداییدا دەبینن.

کەواتە ناکۆکی پرسی گالیلۆ ناکۆکییەك بوو کە پیاوانی کڵێسا بەناوی ئایین درووستیان کردبوو، لەنێوان چەمکە فەلسەفییەکانیان و لەنێوان زانستدا.

### کارەساتی ئەشعەرییەکان[1]:

تێگەیشتنی کورتبینی بۆ ئایین - بەتایبەتی پێگەی سروشت و پەیوەندی بە خوداوە - بەتەنیا تایبەت نەبوو بە ئایینی مەسیحی، بەڵکو کۆمەڵێك لە زانایانی عیلمی کەلامیش لەکاتی شیکردنەوەی بیروباوەڕی ئیسلامیدا وەك ئەوان تووشی خلیسکان بوون.

لەگەڵ مندا سەرنجی ئەوە بدە کە دکتۆرە یمنی طریف الخولی بە کارەساتی ئەشعەرییەکان وەسفی کردووە:

وەك خەمخۆرییەکی ئەشعەرییەکان بۆ بەپاکڕاگرتنی خودا، وایان دانا کە ڕەهایی توانای خودایی پێویستی بەوە هەیە کە کاری خودایی کارێکی ڕاستەوخۆ بێت بە وشەی (کُن)، بۆیە کاریگەریی هۆکارەکانیان لادا، بۆنموونە

---

(١) ئەشعەرییەکان: یەکێکن لە گرنگترین کۆمەڵەکانی بیروباوەڕی ئیسلامیی، دەدرێنە پاڵ پێشەوا أبو الحسن الأشعري(٢٦٠-٣٢٤ك)، لە بیروباوەڕ و وەڵامدانەوەی نەیارانیاندا شێوازی ئەهلی عیلمی کەلام بەکاردێنن.

وایان دانا کە - چەقۆ نابڕێت بەڵکو لەکاتی بڕیندا خودا سیفەتی بڕینی بەبەردا دەکات، بەهەمان شێوە سووتانیش لەکاتی ئاگردا ڕوودەدات نەك بەئاگر.

د.یمنی الخولی (گوزارشت لە بۆچوونی فەیلەسووفەکان دەکات و ئێمەش لەگەڵیدا هاوڕاین) وایدەبینێت کە ئەم خستنەڕووەی ئەشعەرییەکان لەگەڵ ئەوەدا تێکدەگیرێت کە خودا بەهۆی هۆکارەکانەوە سەلماندوویەتی، نموونەی ئەوەش وەك ئەوەی کە لە کۆتایی تەوەرەی ڕابردوودا باسمان کرد بەوەی کە خودا بەهۆی ئاوەوە رووەك دەڕوێنێت. ئێمەش وایدەبینین کە وشەی (كُن) ئەوە دەسەلمێنێت کە میانگیرییەك هەیە بۆ کاری خودایی، بەهیچ جۆرێکیش ئەمە لەگەڵ توانای خوداییدا تێکناگیرێت.

هەروەها ئەم خستنەڕووەی ئەشعەرییەکان لەگەڵ واقیعی ژیانی هەموو مرۆڤێکیشدا تێکدەگیرێت کە لە کاریگەری هۆکارەکاندا بەدیدەکات، کە زانست و تەنانەت ژیانی ڕۆژانەمانی لەسەر بنیاتنراوە. ئەم خستنەڕووە بووە هۆی ئەوەی کە مسوڵمانان لە پشت بەستن بە هۆکارەکان بە درێژایی سەدان ساڵ کەمتەرخەمی بکەن، ئەوەش بووە هۆکار بۆ ئەو بارودۆخەی پێیگەیشتووین لە دواکەوتوویی و شکست[1].

لەوەی رابورد ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە ناکۆکی ڕاستەقینە لەنێوان ئایین و زانستدا نەبووە، بەڵکو (لەنێوان هەندێك لە پیاوانی زانست و ئاییندا هەبووە)، هەروەها (لەنێوان هەندێك لە پیاوانی ئایین و زانستدا)، بەو پێیەی بۆچوونی کۆمەڵێك زانا مەرج نیە رای زانست بێت، بە هەمان شێوە بۆچوونی کۆمەڵێك لە پیاوانی ئایین مەرج نییە رای ئایین بێت.

---

(١) بۆ زانیاری زیاتر لەسەر هەڵوێستی ئەشعەرییەکان لە پشت بەستن بە هۆکارەکان، سەرنجی تەوەرەی کۆتایی کتێبەکە بدە.

## باوەڕ هەڵوێستێکی دەروونی بێ بەڵگە نییە :

بێباوەڕان لە گفتوگۆ و دیبەیتەکاندا بەڵگەیەك زۆردووبارە دەکەنەوە و بانگەشەی ڕاستی و دروستی دەکەن، دەڵێن ناکرێ ڕاستی و درووستی پرسی خوایەتی بسەلمێندرێت، هەندێ کاتیش - وەك دڵدانەوەیەك - دەڵێن هەروەك چۆن ناشتوانرێ هەڵەیی بسەلمێندرێت، چونکە ئەمە پرسێکی ئیمانییە. مەبەستیشیان لە ئیمانیی ئەوەیە کە پرسێکی دەروونی نابابەتییە و ناکرێ بخرێتە ژێر بەڵگەی زانستییەوە.

بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو بەڵگەیەش دوو پرسیار دەخەینەڕوو؛ ئایا باوەڕی ئایینی بەڕاستی پرسێکی دەروونی بێ بەڵگەیە؟ ئایا چەمکە زانستییەکان - سەرەڕای بابەتییان - ئەندازەیەك لە باوەڕی خودیی تێکەڵ نییە؟ لەوانەیە پرسیاری دووەم نامۆ و عەیبداربێت بۆ ئەوانەی گرنگی بە ڕێبازی زانستی دەدەن، بەڵام با بەقووڵی سەرنجی بابەتەکە بدەین.

## ئایا باوەڕ لەگەڵ بەڵگەدا تێکدەگیرێت؟

هەڵە تێگەیشتنێکی گەورە هەیە بۆ واتای وشەی (باوەڕ) لەلای هەردوولا؛ بێباوەڕان و باوەڕداران[1]. پوختەی هەڵوێستی بێباوەڕە نوێیەکان ئەوەیە کە باوەڕی

---

(١) هەڵوێستەکە بۆ ئەوانەی زمانی دایکیان ئینگلیزییە ئاڵۆزترە، بەوپێیەی دوو وشەی جیاواز هەن Faith و Belief، فەرهەنگەکانی زمانی ئینگلیزیش قورەکە خەستتر دەکەن لە شیکردنەوەی واتای ئەم دوو وشەیە.

زانستی Belief لەسەر بەڵگە دامەزراوە، هەرچی باوەڕی ئایینییە Faith ئەوا لەسەر بەڵگە دانەمەزراوە. جیاوازی عەیبداری ئەو بانگەشەیەشیان ئەوەیە کە دەڵێن: باوەڕمان بەوە هەیە کە گەردوون هیچ خودایەکی لەپشتەوە نییە، واشی دادەنێن کە ئەو باوەڕەیان باوەڕێکی زانستییە، بەبێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکیان لەسەر هەبێت. هەروەها کاتێك بێباوەڕەکان باوەڕی ئایینی بەوە وەسف دەکەن کە لەسەر بەڵگەی زانستی دانەمەزراوە، ئەوا لەو کاتەدا چاوپۆشی لە زۆر لە گەورە زانایان دەکەن کە باوەڕە ئایینییەکەیان لەسەر بەڵگە دامەزراندووە. لە دیبەیتێکدا لەگەڵ جۆن لینۆکس، دۆوکنز پێداگری دەکات لەسەر ئەوەی کە باوەڕی ئایینی Faith لەسەربەڵگە دانەمەزراوە، هەروەها باوەڕبوون بە کەسایەتییەکانیش بەهەمان شێوە لەسەر بەڵگە دانەمەزراوە،جا لینۆکسیش دەمکوتی دەکات کاتێك ڕاستەوخۆ دەربارەی دڵسۆزی هاوسەرەکەی پرسیاری لێدەکات، ئایا ئەوەش بەڵگەی لەسەر نییە؟!

بێباوەڕان تادێ زمانیان درێژتر دەبێت، لە ئێستادا بانگەشەی ئەوە دەکەن کە بەڵگە باوەڕ لاواز دەکات و بەهێزی ناکات، لەوبارەیەوە هیتچنز[1] دەڵێت: هەرچەند باوەڕی مرۆڤ بە شتێك زیاد بکات، ئەوا ئەندازەی هەڵی ئەوەی کە ئەو بابەتە حەقیقەتی تێدابێت کەم دەبێتەوە. لەیەکێك لە دیبەیتەکاندا لینۆکس لێی پرسی؛ ئایا تۆ باوەڕت بەوە هەیە کە هەیت؟ ئەگەر بڵێی بەڵێ ئەوا ئەندازەی هەلی ئەوەی کە ئەو وەڵامە حەقیقەتی تێدابێت کەم دەبێتەوە، هەرچەند باوەڕیشت بە بوونت زیاد بکات، ئەوا ئەندازەی حەقیقەتی قسەکەت کەمتر دەبێتەوە! ئەمە لۆژیکێکە خۆی لەگەڵ خۆیدا دژیەکە.

گومان لەوەدا نییە کە هەڵوێستی فەیلەسووفی گەورە ئیمانوێل کانت[2] تا رادەیەکی زۆر بەرپرسە لە بڵاوبوونەوەی بانگەشەی هەڵە بە دژیەکی نێوان

---

(١) Ch.Hitchens: یەکێکە لە پیاوە بەناوبانگەکانی بێباوەڕیی نوێ. لە تەوەری یازدەهەمدا بە درێژی باسی دەکەین.

(٢) Immanuel Kant: (١٧٢٤-١٨٠٤)، بەناوبانگترین فەیلەسوفی ئەڵمانیا بوو لە سەدەی دوازدەهەمدا. کۆتا فەیلەسوفی کاریگەری ئەورووپایە لە بیردۆزی زانیاری.

باوەڕ و زانیاری. سەرنجی قسەکەی بدە[1] کە دەڵێت: ((لەپێناو ئەوەی بوارێك بۆ باوەڕ جێبهێڵین پێویستە نکۆڵی لە زانیاری بکەین))، زۆر کەس وا لەو قسەیەی تێگەیشتوون کە ئەگەرهاتوو بەڵگە لەسەر بوونی خودا هەبوو ئەوا بوارێك بۆ باوەڕ نابێت.

گومان لەوەدا نییە، کە گوتنی ئەوەی، کە زانیاری لەگەڵ باوەڕدا تێکدەگگیرێت بەتەواوی پێچەوانەی ڕاستییە، چونکە لۆژیك و ئەزموونی ڕۆژانەمان دڵنیامان دەکەنەوە کە هەرچەند باشتر شتێك یان کەسێك بناسین زیاتر باوەڕی پێدەکەین. پەروەردگار بۆمان ڕووندەکاتەوە کە دەرککردن بە حەق لە بەڵگەکانیەوە دەستپێدەکات، لە ئاسۆکان و دەروونەکاندا:

﴿ سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ ﴾ فصلت: ٥٣

واتە: "بەڵگەکانمانیان نیشان دەدەین لە ئاسۆکاندا و لە دەرونیاندا، تا ئەوکاتەی بۆیان دەردەکەوێت کە خودا حەقە".

ئەوە بەڵگەیەکە لەسەر هەستکردن بە کاریگەری و شوێنەوارەکان بنیاتنراوە، بەتەواوی وەك بەڵگەهێنانەوە بە کاریگەرییەکانی کێشکردن و کونە ڕەشەکان و گەردیلەکان، بەڵگەهێنانەوەش بە شوێنەوارو کاریگەرییەکان یەکێکە لە بەهێزترین جۆری بەڵگە زانستییەکان، کەمتر نییە - بەڵکو زیاتریشە - لە هەستکردنی هەستەوەرەکان.

لەوبارەیەوە ئەنیشتاین قسە جوانەکەی خۆی کردووە: ((ناتوانم وێنای زانست بکەم بەبێ باوەڕێکی قووڵ. دەکرێ هەڵوێستەکە بە وێنەیەکی بەرجەستەکراو بچوێندرێت، بەوەی: زانست بەبێ ئایین شەلە Lame و ئایینیش بەبێ زانست کوێرە Blind))[2]. لە وتارێکیشدا کە ئەنیشتاین بۆ یەکێك لە قوتابییە کچە

---

(١) لە کتێبە بەناوبانگەکەی(نقد العقل الخالص). کە نیشانەیەکی دیاری فەلسەفەی نوێیە.

(٢) لە کتێبی Einstein and Religion نووسینی Max Jammer کە یەکێك بوو لە هاوڕێ نزیکەکانی ئەنیشتاین. ل٤٨.

بچووکەکانی خۆی ناردووە[1] دەڵێت: ((زانست هەستێکی ئایینی تایبەت بۆ ئێمەی زانا درووستدەکات، کە لە هەستی ئایینی سادەی لای زۆرێك لە خەڵکی جیاوازە. تەنانەت من ناتوانم وێنای زانایەکی ڕاستەقینە بکەم کە باوەڕی بەوە نەبێت)). ئەنیشتاین لێرەدا باسی باوەڕی کوێرانە ناکات Blind Faith بەڵکو باسی باوەڕی قووڵ دەکات Profound Faith، کە لە لۆژیکییەتی جیهان و سیستماتیکی بوون سەرچاوەی گرتووە[2]. بۆیە ئەگەردۆوکنز - بەدرۆ - ئەنیشتاین بە بێباوەڕ ناوزەد بکات، ئەوا ئەنیشتاین - بەم قسەیەی - دۆوکنز و هاوشێوەکانی بەوە ناوزەد دەکات کە زانا نین تا باوەڕ بە خودا نەهێنن.

## باوەڕ یەکێکە لە بنچینەکانی زانست :

بێباوەڕە نوێیەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە باوەڕ چەمکێکی ئایینییە (کە لەڕاستیدا وانییە)، بەوەش پێناسەی دەکەن کە بەڕاستدانانی بێ بەڵگەیە (ئەمەشیان ڕاست نییە)، لەم دوو هەڵەیەشەوە دووچاری هەڵەی گەورەتر دەبن، بەوپێیەی وادەزانن کە بێباوەڕیی و زانست هیچ باوەڕێکیان تێدا نییە، کەچی لەڕاستیدا بێباوەڕیی هەڵوێستێکی باوەڕدارانەیە و زانستیش خاڵی نییەلە باوەڕو ئیمان!

لەڕاستیدا بانگەشەکەی دۆوکنز بەوەی کە((زانست هیچ باوەڕی تێدا نییە))[3] لە دوو لاوە هەڵەیە، چونکە هەموو زانایان لەکاتی پیادەکردنی زانستدا لەو باوەڕیانەوە دەستپێدەکەن، کە گەردوون لۆژیکییە و شایەنی لێکدانەوەیە،

---

(١) Phyllis Wright: کچە قوتابی پۆلی سێیەم کە لە ساڵی ١٩٣٦ پرسیارێکی بۆ ئەنیشتاین ناردووە کە ئاخۆ زانایان نوێژ دەکەن؟!

(٢) ﴿إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُا۟﴾ فاطر: ٢٨ واتە: بێگومان بەندە زاناکان زیاتر لە خودا دەترسن.

(٣) The God Delusion P56

هەروەك چۆن باوەڕیان بەوەش هەیە کەحوکمەکانی عەقڵ درووستن و پێویستە پابەندی ئەو بەڵگانە بین کە پێشکەشی دەکات، بەمەش باوەڕ دەکەوێتە دڵی زانستەوە.

گەورەزانای فیزیایی پۆڵ دیڤیز[1] (کە بە زانایەکی دیندار پۆلێن ناکرێت) ئەو واتایە دووپات دەکاتەوە کاتێك دەڵێت: ((لەڕاستیدا ئاڕاستەی درووستی زانست هەڵوێستێکی ئایینییە! چونکە زانست کار ناکات مەگەر لە میانی ئەو تێڕوانینە بێت کە باوەڕی بەڕێکخراوی وسیستماتیکی گەردوون هەبێت، ئەمەش هەڵوێستێکی ئایینییە. بەبێ دەستگرتن بەو باوەڕەش زانست دەوەستێت بەڵکو دەڕووخێت)).

بۆیە ئامانجی زانستی نوێ ئەوە نییە کە تێگەیشتنەکانمان بەسەر مادده و کاری گەردووندا بسەپێنین، بەڵکو یاساکانی گەردوون و ئەو دیزاین و لۆژیکەی تێیدا هەیەبدۆزینەوە.

هەروەها بێباوەڕان کەوتوونەتە ((دوو هەڵەی گشتاندنی گەورەوە))[2]، کە بوونەتە بنچینەیەکی دەڕوونی بۆ بیرۆکەکانیان و پێویستیان بەهەوڵێکی زۆر هەیە تا لەمێشکیاندا دەسڕێنەوە. دوو هەڵەکانیش بریتین لە: باوەڕی ئایینی

---

(١) پۆل دیڤیز Paul Davies: زانایەکی بەریتانییە، لە ساڵی ١٩٤٦ لەدایك بووە.
مامۆستای فیزیایە لە زانکۆی ئەریزۆنا، پێشتر لە زانکۆی کامبریدج - لەندەن - نیوکاسڵ مامۆستا بوو.
پسپۆڕی زانستەکانی گەردوون و فیزیای چەندییە. لە ساڵی ١٩٥٥ خەڵاتی تیمپلتۆنی وەرگرت.

(٢) یەکێك لە کێشە گەورەکانی فەلسەفە بریتییە لەو کێشەیەی کە پێی دەگوترێت(کێشەی گشتاندن Induction)، فەیلەسوفی گەورە بێرتراند راسل بە نموونەی قەلەموونی بەخزمەت Inductivist Turkey ئەو چەمکە شیدەکاتەوە، کە بەوە راهاتووە چەند رۆژێك پێش کریسمس بەباشی خواردنی پێبدرێت و خزمەت بکرێت، ئەویش ئەو باوەڕایەی لەلا درووستدەبێت کە ئەو خزمەتە بەردەوام دەبێت، بەڵام کە رۆژی جەژن دێت سەری دەبڕدرێت و هەموو ئەو گشتاندنەی هەڵدەوەشێتەوە.
بەڵام ئەمە ئەبۆتە هۆی ئەوەی زانست بە هەندێك گشتاندن هەڵبستێت! وەك هەڵاتنی خۆر رۆژانە لە خۆرهەڵاتەوە. بەهەمان شێوە تەحەددای خەلیلی خودا ئیبراهیم(سەلامی خودای لێبێت) بۆ نەمرود کە ئەگەر ئەتوانێ با خۆر لە خۆرئاواوە هەڵبێنێت:

﴿...قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَأْتِى بِٱلشَّمْسِ مِنَ ٱلْمَشْرِقِ فَأْتِ بِهَا مِنَ ٱلْمَغْرِبِ فَبُهِتَ ٱلَّذِى كَفَرَ...﴾ البقرة: ٢٥٨

لەهەموو دۆخەکانیدا هەر کوێرە، هەروەها زانست تەنانەت گەردیلەیەکیش باوەڕی تێدا نییە. جۆن هاوت[١] ئەم مەینەتیە زانستییە لەناودەبات، کاتێك دەڵێت: ((باوەڕ)) پایەیەکی گرنگی هەموو لێکۆڵینەوەیەکی زانستییە، ئەگەر لەقسەکەشم گومانت هەیە ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ(باوەڕت) بە توانا عەقڵییەکانت، بەمەش هەوڵەکانی بێباوەڕی نوێ، کە بریتییە لە نەهێشتنی ڕۆڵی(باوەڕ) لەکاتی تێڕامان لە توێژینەوە زانستییەکان، سەرەنجامەکەی هەر شکستە.

## وەهمەکانی فرۆید یان وەهمەکانی بێباوەڕی!

وشەی وەهمەکان Delusions[٢] بە واتای زاراوەی دەروونناسیی واتە: ((بەڕاست دانانی هەڵەیەکی سەلمێندراو Fixed False Belief کە لەبەردەم کۆمەڵە بەڵگەیەکی بەهێزی پێچەوانە وەستاوەتەوە)). بێباوەڕە نوێیەکان چەمکەکانیان لە باوەڕی ئایینی سیگمۆند فرۆید وەرگرتووە، کە باوەڕبوون بە خودای بە جۆرێك لە وەهم داناوە، گێڕاویەتیشیەوە بۆ بێتوانایی مرۆڤ لە مامەڵەکردن لەگەڵ جیهانی ڕووبەڕووبوونەوەی بەربەرەکانییەکان، بۆیە پێویستی بە پاڵپشتییەکی غەیبی بەهێز بووە. کەواتە خوایەتی-لەلای فرۆید و لەلای بێباوەڕان- داهێنراوێکە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ مەترسییەکانی مرۆڤ کە ئەو مەترسیانە لەبەرزبوونەوەدان تا بەهۆی ترسی لەناوچوون بەهۆی مردنەوە دەگەنە لوتکە، کەواتە جۆرێکە لە ئامرازەکانی هەڵاتن.

هەروەها فرۆید وایدەبینێت کە ناکرێ متمانە بە باوەڕ بکرێت، چونکە لە بنچینەدا دەروونییە، بەم پێیەش ئەوە داماڵینی ئارەزووە توندە بێئاگاییەکانە -

---

(١) John Haught: پیاوی لاهوتی ئەمریکیی، گرنگی دەدات بە پەیوەندی نێوان ئاین و زانست.

(٢) Delude لە بنچینەدا وشەیەکی لاتینییە بەواتای فێڵدەکات دێت.

اللاواعية - (کە لە بنچینەدا ئارەزوی منداڵین)، لەئاسایش و ئارامیی. فرۆید بۆ لێکدانەوەکەی دەربارەی پەیوەندی بە خودا لە نموونەی مەسیحییەوە سەیری بابەتەکە دەکات، کە لە خودادا (ئەو باوکەی دەمانپارێزێت) و (ئەو باوکەی خۆشی دەوێین)دەبینێت.

بۆ پاڵپشتیکردنی چەمکەکانی فرۆید، مایکل ئۆنفرای وایدەبینێت کە باوەڕی ساختە کە ئارامیی بۆ عەقڵ دێنێت لەلای زۆر کەس لەو لۆژیکە باشترە کە تووشی دڵەڕاوکێیان دەکات، هەتا ئەگەر دەستگرتن بەو باوەڕەش ببێتە حاڵەتێکی بەردەوامی منداڵی عەقڵی!. بە پشت بەستن بەوە دۆوکنز دەڵێت: زانا باوەڕدارەکان بە خودا لە ناوەندە زانستییەکاندا دەبنە گاڵتەجاڕی هاوپیشەکانیان!.

هەردوو قسەکە تانەو تەشەر لەو عەقڵە زانستییە گەورانە دەدەن، کە مرۆڤایەتییان بەرەو پێش بردووەو هەموو مرۆڤایەتیش شانازییان پێوە دەکات. هەروەك چۆن دۆوکنز بەو قسەیەی ئەوە دەسەلمێنێت کە هیچ زانیاری نیە لەسەر ڕەوشتەکانی کۆمەڵگەی زانستی، کە تێیدا هیچ کەس خۆی بە بیروباوەڕی ئەوی ترەوە خەریك ناکات!.

زانای دەروونناسی لە زانکۆی نیویۆرك((پۆڵ ڤیتز)) شیکردنەوەکانی فرۆید هەڵدەتەکێنێت، دەڵێت: ئەگەر پاڵنەرەکانی باوەڕ دەروونیش بن ئەوە بیانوو نییە بۆ ئەوەی متمانەمان پێی نەبێت، چونکە هەموو دەستکەوتە زانستییە ژیارستانییەکان پاڵنەری دەروونییان هەبووە، جا مرۆڤ هەوڵیداوە بەدییان بهێنێت بۆئەوەی لە بەرامبەر تەحەدییەکانی سروشت پاڵپشتی بکەن (وەك ئایین لەلای فرۆید) ئایا ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە ناکرێ متمانە بەو دەستکەوتانە بکەین؟!

بەهەمان شێوە ڤیتز نموونەهێنانەوەی فرۆید بە نموونەی مەسیحی باوکایەتی بۆ خودا ڕەتدەکاتەوە، چونکە ئەو نموونەیە لە زۆربەی ئایینەکانی پێش و پاشی مەسیحییەت بوونی نییە.

زانای ئەڵمانی مانفرێد کیوتز[1] جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە لێکدانەوەی فرۆید بۆ خودا بەتەواویی درووستە، ئەمە لەکاتێکدا ئەگەر هەر بەڕاستی خودا بوونی نەبێت.

بەڵام ئەگەر خودا بوونی هەبێت، ئەوا بەهەمان شیکردنەوەی فرۆیدی ئیلحادو بێباوەڕیی دەبێتە وەهم و خەیاڵبردن، چونکە بە هەڵاتن دادەندرێت لە رووبەڕووبوونەوەی حەقیقەت، کە لە دیداری مرۆڤ بۆ خودا لە ڕۆژی قیامەتدا خۆیدەنوێنێت، ئەمەش لەترسی ئەوەی لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکرێت لەسەر ئەو شتانەی لەژیانیدا ئەنجامی داون.

بەم جۆرەش بێباوەڕیی دەبێتە نامرازێکی بەرگری هەڵاتن لەترسی ئەوەی مرۆڤ رووبەڕووی ئەنجامەکانی کارەکانی ببێتەوە.

هەر لەو بارەیەوە زیسلۆ میلۆز[2] شاعیری پۆڵەندی کە خەڵاتی نۆبڵی لە ئەدەب وەرگرتووە دەڵێت: ((لەڕاستیدا گوتنی ئەوەی کە ئێمە لەدوای مردن بەیەکجاری لەناودەچین مۆرفینێکی بەهێزە! کە دەروونەکانمان سڕ دەکات و وامان لێدەکات وا هەست بکەین کە لێپێچینەوەمان لەگەڵدا ناکرێت لەسەر ئەو هەموو خیانەت و دزی و ئەتککردن و کوشتن و خۆپەرستیی و ترسنۆکییەی لەژیانماندا کردوومانە!)).

لەبەرئەوە ئەوەی فرۆید گوتوویەتی وەك بەڵگە هەژمار ناکرێت بۆ سەلماندنی بوون یان نەبوونی خودا، چونکە دەکرێ لە هەردوولاوە بخوێندرێتەوە. بۆیە ئەگە بێباوەڕان دەیانەوێت ئایین یان خودا رەتبکەنەوە ئەوا پێویستە بەدوای بیانووی تری جگە لە بیانووەکانی فرۆیدا بگەڕێن!.

---

(١) Manfred Cutz لە کتێبەکەی A Brief History Of The Greatest One

(٢) Czeslaw Milosz: (١٩١١-٢٠٠٤ز).

## ئەگەر زانست لەگەڵ بیروباوەڕەکانمان ناکۆک بوو :

ئەگەر زانایان بە هەندێك چەمکی زانستی گەیشتن کە لەگەڵ هەندێك لە بیروباوەڕە ئاینییە ڕاستەکانمان نەدەگونجا، ئەوا ئایا ئەمە واتای ئەوەیە کە هەڤدژییەك لەنێوان زانست و ئاییندا هەیە، یان ئەوەتا قەبوولی دەکەین، سەرەڕای بوونی ئەو ئەندازەی نەگونجانەی نێوانیان؟

وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە لەسەر چەند هۆکارێك دەوەستێت، کە بە دەوری ئەندازەی بەبەڵگەدانانی چەمکە زانستییە نوێکەو ئەندازەی ڕەسەنایەتی بیروباوەڕەکە دەخولێتەوە،(تا چەندە چەمکە زانستییەکە بەڵگەیەو تا چەندەش بیروباوەڕە هەڤدژەکەی ڕەسەنە) گرنگترینی ئەو هۆکارانەش:

**١- سروشتی چەمکە زانستییەکە کە بەرهەڵستی بیروباوەڕەکە دەکات:**

ئەگەر بە ئۆتۆمبێلەکەت بەلای لەوەڕگایەکدا تێپەڕیت، تۆ شتێکت بەرچاوکەوت و واتزانی کە مەڕ بووە، پاشان بە دیداری شوانە ڕاستگۆیەکە گەیشتیت، ئەو دڵنیای کردیەوە کە ئەو لەو ڕۆژانەدا هیچ مەڕێکی نییەو یەکێك لە سەگەکانی پاسەوانییە کە لە مەڕ دەچێت. ئەگەر کەسێکی لۆژیکی بیت ئەوا ئەگەری سەگەکە بەسەر ئەگەری مەڕدا دەدەی، بە خستنەڕووی سەگەکە و زاڵکردنی بە (چەمکی بەدرۆخستنەوە Rebutting defeater). هەروەها کاتێك لەپەنجەرەی ژوورەکەتەوە بینیت حەسەنی دراوسێت لەماڵەوە دەرچووە و خەریکە لە شەقامەکە دەپەڕێتەوە، دوای ماوەیەك پێیان گوتی کە حوسەینی برای حەسەن کە لەگەڵیدا دوانەیە و بەتەواوەتی لەیەکدەچن، لە دەرەوە گەڕاوەتەوە و لەگەڵیدا نیشتەجێ بووە و ئەوەی بینیوتە حوسەین بووە، لەو کاتەدا ڕاستەوخۆ گومانت بۆ دروستدەبێت دەربارەی ئەو کەسەی کە بینیوتە،

ئەو چەمكەش بە چەمكی كەمكەرەوەی ئەگەر Undercutting defeater ناسراوە، ئەو چەمكەش لە چەمكی بەدرۆخەرەوە بێهێزترە، بۆیە ئەگەری ئەوەی كە ئەو كەسەی بینیوتە حەسەن بووە هێشتا هەر بەهێزە.

**٢-سروشتی بەڵگەكە لەسەر چەمكی بەرهەڵستكاری بیروباوەڕەكە:**

ئەگەر لە ناوەندێكی لێكۆڵینەوەدا ئەفسەرێوویت و كاری لێپێچینەوە لە تاوانێكی كوشتنت پێسپێردرا، خزمەتكاری كوژراوەكە بۆی سەلماندی كە لەكاتی ئەنجامدرانی تاوانەكەدا ئەو لە سەردانی خزم و كەسی خۆی بووە لە دووری هەزار كیلۆمەتر، لەوكاتەدا ئەگەری ئەوەی كە ئەو ئەو كارەی كردبێت خەریكە هەر نەمێنێت. بەڵام ئەگەر خزمەتكارەكە لەو كاتەدا لە دووری دە كیلۆمەتر بووبێ، ئەوا ئەگەری ئەوەی كە ئەو بە ئەنجامدانی تاوانەكە هەستابێت زۆر زیاتر دەبێت.

**٣- سروشتی ئەو ڕێبازە فەلسەفییەی پێیەوە پابەندی:**

ئەگەر لە لایەنگرانی ڕێبازی سروشتی بیت، كە بەتەواوی چەمكە غەیبی و ئایینیەكان ڕەتدەكەنەوە، ئەوا گومان لەوەدا نییە كە بەر لە دەستپێكردنی گفتوگۆكە بیروباوەڕە ئایینییەكە كە خراوەتە بەر گفتوگۆ بڕیاری بێهێزی و ڕەتكردنەوەی بەسەردا دەدرێت.

**٤- سروشتی چەمكە تایبەتییەكانت:**

ئەگەر لە بەیانی ڕۆژێكی سارددا نەتتوانی ئۆتۆمبێلەكەت بخەیتەكار، ئەوا چەند ئەگەرێكت بەبیردا دێن لەبارەی ئەوەی كە ئاخۆ ئۆتۆمبێلەكەت چ كێشەیەكی هەیە، بەڵام هەرگیز ئەوەت بەبیردا نایەت كە ڕۆحێكی شەڕانگێز بزوێنەرەكەی وەستاندووە! بەڵام ئەگەر یەكێك بی لە هیندیە سوورەكان و ئەسپەكەت ڕەتی بكاتەوە بێتە ژێر بار، لەوەش زیاتر سڵ بوو و جووتەیەكی لێدای، ئەوا ئەگەری بوونی ڕۆحێكی شەڕانگێز بەهێزە.

**٥-رەسەنایەتی بیروباوەڕە ئایینییەکە جێی گفتوگۆیە:**

زۆرکەس نەگۆڕە ئایینییەکان کە شایەنی ڕەتکردنەوەنین، تێکەڵ دەکەن لەگەڵ ئەو هەوڵانەی بۆ شیکردنەوەی دەقە پیرۆزەکان ئەنجام دراون، کە زانایانی پێشین بەپێی ئەو ئاستەی زانست لەسەردەمی ئەواندا پێیگەیشتووە کردوویانە، وەك ڕاخرانی زەوی و خوولانەوەی خۆر بەدەوری زەویدا و بەدیهێنانی تایبەتی بۆ گیانلەبەران و مرۆڤ وەی تر...

بە سەرنجدان لەو پێنج هۆکارەی باسمان کردن، تائێستا هیچ هەڤدژییەکی ڕاستەقینەمان بەدی نەکردووە لەنێوان ڕاستییە زانستییەکان و بیردۆزە ئەندازەییە[1] چەسپاوەکانی و نێوان چەمکە ئایینییە ڕەسەنەکانمان. ئەگەر ئەم جۆرە هەڤدژییە بوونیشی هەبێت، ئەوا ئەو ڕایەی زانایانی تەفسیر لەسەرین - ئێمەش لەگەڵیاندا هاوڕاین - کە پێویستە دەقی ئایینی تەئویل بکرێت بۆئەوەی لەگەڵ زانستدا بێتەوە بەبێ لادان لە هیچ کامێکیان.

---

(١) بیردۆزی ئەندازەیی ئەو بیردۆزەیە کە لە ناوەندە زانستییەکاندا چەسپێنراوە و پێوانەی لەسەر دەکرێت، وەك بیردۆزی هێزی کێش کردن.

## ناکۆکی ڕاستەقینە

### ڕێبازی سروشتی لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئاییندا :

ئەگەر ناکۆکی نێوان زانست و ئایین ناکۆکییەکی وەهمی بێت، ئەوا ناکۆکییەکی (مەنهەجی) (ڕاستەقینە) بوونی هەیە، کە بە ناکۆکی نێوان ڕێبازی سروشتی و ئایین وەسفی دەکەین.

### ڕێبازی سروشتی چییە ؟

مامۆستاکەمان د.عبدالوهاب المسیری-ڕەحمەتی خوای لێبێت- دەڵێت: سیفەتەکانی (سروشت) هەمان سیفەتەکانی (مادده)ن، بۆیە هەرکات وشەی سروشت هات دەکرێ وشەی ماددەی لەجێ دابنێین. بۆیە ئەو بە (سروشت /مادده) دەینووسی[1]. ئاڕاستەی ماددی / سروشتی Naturalism / Materialism لە بەرامبەر (سەرووی سروشت Supernaturalism)دا دەوەستێتەوە و وایدەبینێت کە گەردوون بوونێکی داخراوە و خۆی خۆی بەڕێوە دەبات، کە ڕێ بە

---

(١) لە فەرهەنگی ئۆکسفۆردی فەلسەفیدا The Oxford Companion To Philosophy هاتووە: ((بە ناسایی ڕێبازە ماددیگەراکان دەستەواژەی مادده بە یەکێك لە میکانیزمەکانی زانستی سروشتی دەگۆڕن. بۆیە دەکرێ بگوترێ کە ماددیگەراکان سروشتییەکانن)).

دەستتێوەردانی دەرەکی نادات، جا ئەو دەستتێوەردانە لەلایەن ڕۆحەکانەوە بێت یان لەلایەن خوداوەندەکانەوە. سەرەڕای زۆری و جیاوازی خستنەڕووی شێوەکانی ڕێبازی ماددی / سروشتی[1]، ئەوا چەمکێك هەیە کۆیان دەکاتەوە، کە کارل ساگان[2] وەسفی دەکات و دەڵێت: ((ئەم گەردوونە هەموو شتێکە، هەر بەم شێوەیە بووە و تاهەتایەش هەر بەم شێوەیە دەمێنێتەوە)).

هەروەها ستێرلینگ لامپرێخت پێناسەیەکی گشتگیر بۆ ڕێبازی سروشتی دەکات، بەوە وەسفی دەکات کە ((هەڵوێستێکی فەلسەفییە وایدەبینێت کە هەموو بەدیهێنراوەکان بەدیهاتوون و بەدیدێن لە دەرەنجامی چەند هۆکارێك کە لە ناو سروشتدان، هیچ شتێکیش نیە جگە لە سروشت کە بە سیستەمی هۆ و ئەنجام کاردەکات)).

---

(١) ماددیگەرایی/ سروشتی لەسەر دوو شێوە دەرکەوت؛ یەکەمیان (ڕەفتاری سیاسی Political Behaviourism) کە مارکسیەتی لینین نوێنەرایەتی دەکات و وایدەبینێت کە مێشکمان لەکاتی لەدایکبووندا وەك لاپەڕەیەکی سپی وایە و جگە لە پێویستییە جەستەییە سەرەکییەکان هیچی تری تێدا نییە و شتەکانی تر بە فێربوون پەیدا دەبن کە کلتووری ئاراستەکراو لەلایەن مێژووەوە بەڕێوە دەبرێت، هەروەها ئێمە بەرهەمی باروددۆخی سیاسی و ئابووریمانین کە دامەزراوەی شیوعی جوانترین وێنەیەتی. لەسەر گۆڕەپانی واقیعیشدا، جێبەجێکردنی سیاسی ئەم دامەزراوە مرۆییە زیاتر لە نۆەەد ملیۆن کەسی کردە قوربانی، ئەمە سەرەڕای وێرانکارییەکی ئابووری گەورە، کە نیشانەی شکستی گەورەی ئەو ڕەوتەبوو.

شێوازی دووەمیش بۆ ماددیگەرایی/سروشتی بریتییە لە(مرۆڤایەتی زانستی Scientific Humanism) کە لەگەڵ ڕەفتاری سیاسیدا ناکۆکە هەروەك چۆن لەگەڵ لەگەڵ ئاینیشدا ناکۆکە، ئەو بنچینەیە لەخۆدەگرێت کە مرۆڤایەتی(دۆخێکی بایۆلۆجییە) کە بەدرێژایی ملیۆنان ساڵ درووستبووە و زیرەکی مرۆڤ بەرهەمی کاریگەری کلتووری میراتییە کە کاری کردۆتە سەر پاشخانی بایۆلۆجی هەست و نەستە غەریزییە ئاڵۆزەکان. واتا مرۆڤایەتی بەرهەمی وەڵامدانەوەیەکی میراتییە لەسەر گۆڕەپانێکی غەریزیدا، کە بێگومان دیدێکی داروینییە.

(٢) لە بەرنامە تەلەفزیۆنییە بەناوبانگەکەی: گەردوون Cosmos

## دیدی ئایینی بۆ بوون :

لەبەرامبەر دیدی مادیگەرایی سروشتی بۆ بوون دیدی ئایینیمان هەیە، کە وایدەبینێت گەردوون سەرەتایەکی هەیە و خودا لەنەبوونەوە هێناویەتیە بوون. هەر لەو بارەیەوە پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت:

(كان الله ولم يكن شيئ غيره، وكان عرشه على الماء، وكتب في الذكر كل شيئ، وخلق السموات والأرض)[1].

واتە: خودا هەبوو و هیچ شتێك بوونی نەبوو، عەرشی خودا لەسەر ئاوبوو، هەموو شتێکی لە لەوحی مەحفووزدا نووسی، پاشان ئاسمانەکان و زەوی بەدیهێنان. هەروەها لە سەرەتای سیفری تەکوین لە تەوراتدا هاتووە: (في البدء خلق الله السموات والأرض).

واتە: لەسەرەتادا خودا ئاسمانەکان و زەوی بەدیهێنان.

هەروەها دیدی ئایینی وایدەبینێت کە خودا هەر خۆی (هەڵسوڕێنەر)ی گەردوونە، واتا بەردەوام بە دانان و کاراکردنی یاساکانی سروشت بەڕێوەی دەبات و بۆ تەنانەت چرکەساتێکیش لێی غافڵ نابێت:

﴿ اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ لَا تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ ... ﴾ البقرة: ٢٥٥.

واتە: (خوا زاتێکە جگە لە ئەو هیچ خوایەکی ترنیە کە شایەنی پەرستن بێت و ئەو هەمیشە زیندووە و راگرو سەرپەرشتیاری (هەموو دروست کراوەکانیەتی)، نە وەنەوز دەیگرێت و نە خەو).

هەروەها خودا لەتوانایدا هەیە کە سنووری ئەو یاسایانە ببڕێت و ڕاستەوخۆو بێ هیچ هۆکارێك دەست بخاتە ناو گەردوونەوە.

---

(١) فەرموودەی بدء الخلق - صحيح البخاري.

پێویستە لێرەدا جەخت لەسەر ئەوە بکەینەوە کە لێکدانەوە غەیبی و خوداییەکان - ئەگەرچی لەدەرەوەی بازنەی لێکدانەوە سروشتییەکانیشدا بن - ئەوا بێگومان لێکدانەوەی (لۆژیکین)، بۆچی نالۆژیکییە کە بڵێین خودا بوونی بەدیهێناوە؟ پێویستبوو ئەو هۆشیارییە بدەین بۆئەوەی لێکدانەوەی لۆژیکی و لێکدانەوەی سروشتی تێکەڵ بەیەکتر نەکرێن.

لەکاتی بەراوردکردنی نێوان ڕێبازی سروشتی و دیدی ئایینی بۆ بوون، دەزانین کە ناکۆکیی ڕاستەقینە لەنێوان ماددیگەرایی / سروشتی و ئایینداییە، نەوەك لەنێوان زانست و ئاییندا، لەبەرئەوە پرسیارە ڕاستەکە ئەوەیە کە بگوترێت: کام دید و بۆچوون زانست لەخۆدەگرێت: دیدی سروشتی یان ئایینی؟.

## مەنهەجی سروشتی و خراپییەکانی

**Methodological Naturalism**

پێشتر پێناسەی مایکل ڕۆسمان بۆ ئایین خستەڕوو، بەوەی کە ڕێبازێکە لەگەڵ ئەو شتانەدا مامەڵە دەکات کە بوونیان هەیە و بەشێوەیەکی سروشتی دووبارە دەبنەوە و یاساکانی سروشت بەڕێوەیان دەبەن. چەمکی (سروشتی Natural) کە لە پێناسەکەدا هاتووە، واتا هەموو شتەکان و هەموو ئەو بابەتانەی کە زانست لێیان دەکۆڵێتەوە لە سروشتدا هەن، هەروەها ئەوەش دەگەیەنێت کە لێکدانەوەکانمان بۆ دیاردە زانستییەکان پێویستە بە چەمکە فیزیایی و کیمیاییەکان پێشکەش بکرێن، بەبێ پەنابردنە بەر چەمکە غەیبی و خوداییەکان.

لەکاتی شۆڕشی زانستی هەردوو سەدەی شازدەهەم و حەڤدەهەمدا زانایان مەنهەجێکی زانستییان داناوە کە تایبەت کراوە بە گەڕان بەدوای دیاردە سروشتییەکان و هۆکارە سروشتییەکان، ئەم مەنهەجەش بە (مەنهەجی سروشتی) ناسراوە. سەرەڕای ئەوەی کە لێکدانەوەی (لۆژیکی) غەیبی لەهەندێ کاتدا

پێویستە(وەك زانستی سەرەتاكان)، بەڵام سەرەڕای ئەوەش لەدیدی مەنهەجی سروشتیدا بە لێكدانەوەیەكی زانستی هەژمار ناكرێت.

یەكێك لە گرنگترین باشییەكانی ڕێبازی سروشتی ئەوەیە كە سنوورێكی ڕوونی داناوە لەنێوان زانستی ڕاستەقینە و ئەفسانەدا، ئەو ڕێبازە زانستە ئاسمانییەكان لە ئەستێرەناسی و بورجەكان جیادەكاتەوە، كیمیا و خیمیا[1] Alchemy لەیەكتر جیادەكاتەوە. هەروەها ئەو ڕێبازە بووە هۆی پەڕاوێزخستنی تەمبەڵی زانستی بەوەی دیاردەكان بە كاری خودا لێكبدرێنەوە.

بەڵام مەترسیدارترین خراپەو (هەڵەی) ڕێبازی سروشتی ئەوەیە كە هەرشتێك لێكدانەوەیەكی سروشتی بۆنەكرێت زانست نییە و زانایان بە جددی وەرینا گرن و لەوانەشە زۆر بە توندی ڕووبەڕووی ببنەوە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی كە هیچ بەڵگەیەك لەسەر ئەم جۆرە دید و بۆچوونە نییە نە لە فیزیای كلاسیكی نە لە فیزیای نوێ. بەتەنیا دانانی وەسفی (زانستی) بۆ ئەم مەنهەجە ئەوە ناگەیەنێت كە ئیتر بۆتە زانستی، ئەمە ڕێك وەك ئەوە وایە كەیەكێكمان ناوی تەڕمزان لە كوڕەكەی بنێت!.

## ڕێبازی سروشتی و مەنهەجی سروشتی :

ئەگەر ڕێبازی سروشتی(فەلسەفەی سروشتی) فەلسەفەیەك بێت كە باوەڕی بە خودا و هیچ بوونێكی سەرووی سروشت نەبێت، ئەوا مەنهەجی سروشتی(مەنهەجی زانستی) باوەڕبوون بە فەلسەفەی سروشتی بە پێویست دانانێت، كە دیدێكی بێباوەڕانەیە بۆ سروشتی بوون، چونكە زانای باوەڕدار بە خودا لەكاتی لیكۆڵینەوە لە وجودو بوون مەنهەجی سروشتی پەیڕەو دەكات. لەبەرئەوە زانستی سروشتی ئەگەرچی لەگەڵ خودا و سەرووی سروشتیش ڕەفتار نەكات ئەوا نكۆڵییان لێناكات.

---

(١) (خیمیا: هەوڵدانە بۆ گۆڕینی كانزا هەرزانەكان بۆ كانزا گرانبەهاكان، وەك گۆڕینی مس بۆ زێڕ.

مەنهەجی سروشتی بەشێوەیەکی بەهێز و ڕاستەوخۆ لەسەر بنچینەی بیردۆزە زانستییەکان ڕەنگیداوەتەوە و وایلێهاتووە کە زانیارییەکانی لە سەرچاوە بیرکاری و تاقیکاری و ئەزموونی و عەقڵییەکان و چەمکە بەدیهییە درووستەکان وەردەگرێت و غەیبییات ڕەتدەکاتەوە، هەروەك چۆن دەرەنجامەکانیشی لێکدانەوەی غەیبیی وەك بوونی خودا لەخۆناگرێت.

پوختەی قسان ئەوەیە کە ئێمە باسی مەنهەجی سروشتی دەکەین کە هەڵگرانی ڕێبازی سروشتیی فەلسەفی پەیڕەوی دەکەن، ئەوانیش بێباوەڕانن، هەروەها مەنهەجێکی سروشتی کە هەڵگرانی ئەو مەنهەجە، ڕێبازی سروشتی پەیڕەو ناکەن، ئەوانیش باوەڕدارانن.

## گونجانی نێوان ئایین و ڕەگ و ریشەی زانست :

لەوەی رابورد ئەوەمان ڕوونکردەوە کە هیچ ناکۆکییەکی ڕاستەقینە لەنێوان زانست و ئاییندا بوونی نییە، بەڵام ئایا گونجانیان لەنێواندا هەیە؟

ئێمە بانگەشەی ئەوە دەکەین کە گونجانێکی قووڵ هەیە لەنێوان ئایین و ڕەگ و ریشەی زانستدا، ئەو بانگەشەیەشمان لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە هەموو زانستەکان لەسەر بڕوایەکی تەوەرەیی وەستاون، ئەویش ئەوەیە کە گەردوون ڕێکخراوە[1]، ئەنیشتاین ئەوەی بە وتە بەناوبانگەکەی دەربڕیوە کە دەڵێت: ((گەورەترین شتی یاخی گەردوون لە تێگەیشتنندا بریتییە لەوەی کە ئێمە لە گەردوون تێدەگەین))، بەبێ ئەو جۆرە بڕوایە زانست درووستنەدەبوو و نەدەگەیشتە ئەم قۆناغەی ئێستای.

---

(١) ئەم چەمکە بەسەر چەمکی گەردوونی ورد(گەردیلە) و بەسەر گەردوونی فراوانیشدا جێبەجێ دەبێت.

## نیشانەکانی ڕێکخراویی گەردوون :

### ١- ڕێکخراویی و ڕاستگۆیی و شایەنبوون بە تێگەیشتن و پێشبینیکردنی بوون :

لە تەوەرەی ڕابردوودا ئەوەمان خستەڕوو کە هەستانی زانست بە ئەنجامدانی ئەرکەکانی پێویستی بە ئەندازەیەکی بەرزی ڕێکخراویی و ڕاستگۆیی و شایەنبوون بە تێگەیشتن و پێشبینیکردن لە گەردووندا هەیە، ڕێك وەك کارە بەئەنقەستەکانمان. بۆنموونە تۆ ناتوانی ئۆتۆمبێلەکەت لێبخوڕی ئەگەرهاتوو ئەگەری ئەوە هەبێت لە کاتێکی نادیاردا ئۆتۆمبێلەکەت بگۆڕێت بۆ شتێکی تر، بۆنموونە ببێتە کەتری یان ببێتە چەپکێك گوڵ.

دەربارەی سەرچاوەی ئەو بڕوایەش پۆڵ دێڤیز دەڵێت؛ ئەگەر لەوەتەی هۆشمان هاتۆتەبەر خۆر لە خۆرهەڵاتەوە هەڵدێت، ئەوا بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگرمان نییە لەسەر ئەوەی کە سبەینێش بەهەمان شێوە هەڵدێت، بنچینەی ڕێکخراویی سروشت لەسەر باوەڕ بنیاتنراوە، کە ئەگەر ئەو باوەڕە نەبوایە زانست نەدەبوو.

### ٢- جێگیری و یاسایی[1]:

یەکێکی تر لە خاسیەتە گەردوونییە پێویستەکان بۆ دەرکەوتنی زانست ئەوەیە، کە ئەو ڕێکخراویی و ڕاستگۆیی و شایەنی بوونە بۆ پێشبینیکردن

---

(١) ئەگەر ڕێساکانی سروشت بۆئەوە دانراون کە ماددەی ناعاقڵ بەڕێوە ببەن، ئەوا ماددە هیچ بژاردەیەکی تری لەبەردەمدا نییە. فەرمانە زیندەییەکانی لاشەی مرۆڤیش بەهەمان شێوەن، کە درووستبوونی هەر ناڕێکییەك دەبێتە هۆی ئەوەی مرۆڤەکە بمرێت، وەك گرژبوون و خاوبوونەوەی ماسولکەی دڵ و کرداری هەناسەدان، کە مرۆڤ هیچ بژاردەیەکی لەبەردەمدا نییە جگە لە پەیوەست بوون پێیانەوە. ئەمە پێچەوانەی یاسا ڕەوشتییەکانن کە مرۆڤ تێیاندا ویستێکی ئازادی هەیە.

بە (جێگیریی)یەو شێوەی یاساکانی سروشت وەربگرێت. لەبەرئەوە ستیفن هۆوکینگ دەڵێت: ((تا زیاتر گەردوون بناسین زیاتر دڵنیا دەبینەوە کە بە ڕێسا بەڕێوە دەچێت)). هەروەها ریچارد فێینمان[1] (خاوەنی خەڵاتی نۆبڵ لە فیزیا) دەڵێت: ((بوونی ڕێسای ڕێکخراو بابەتێکی پەکخەرە، ئەم ڕێکخراوییە هیچ لێکدانەوەیەکی نییە، بەڵام یارمەتیمان دەدات کە پێشبینی بکەین، چونکە پێش ئەنجامدانی تاقیکردنەوە ئەوەمان پێڕادەگەیەنێت کە پێشبینی دەکەین)). ئەنیشتاین دەستی دەخاتە سەر لێکدانەوەکە و دەڵێت: ((هەر مرۆڤێك بەجددی گرنگی بە زانست بدات هەست بەوە دەکات کە ڕێساکانی سروشت ڕەنگدانەوەی بوونی رۆحێکی گشتگیرن کە زۆر بەرزترە لە رۆحی مرۆڤ))[2].

## ٣- پابەندبوون بەو بیرکارییەی شیاوی تێگەیشتنە :

بیرکاری شانبەشانی زانستە سروشتییەکان لەکاتی شۆڕشی زانستی لە ڕۆژئاوادا پێشکەوت. زانست گەیشتە ئەوەی کە بنچینەی زانست و ڕەفتاری- سەرەڕای ئاڵۆزییان - شیاوی ئەوەن کە بە هاوکێشە بیرکارییەکان گوزارشتیان لێبکرێت. ئەم نیشانەیەش بە کردەیی بیرکاری Efficacy ناسراوە. لەوبارەیەشەوە پۆڵ دیراك[3] دەڵێت: ((خودای بەدیهێنەر باشترین بیرکارە؛ بەرزترین ئاستەکانی بیرکاری لە درووستکردنی گەردووندا بەکارهێناوە)).

یەکێکی تر لە خاسیەتەکانی فیزیا و بیرکاری پەیوەندیدار بە جیهانی سروشتی، بریتییە لە ئاسانی تێگەیشتن Accessibility، چونکە زانست لەوە بێتوانایە کە بە ئەرکەکانی هەڵبستێت، ئەگەرهاتوو ئەو یاسا سروشتی و بیرکارییانە زۆر ئاڵۆز و قووڵ بن و لەتوانای عەقڵی مرۆڤ بۆ تێگەیشتن بەدەربن.

---

(١) Richard Feynman: (١٩١٨-١٩٨٨ز) زانای ئەمریکی بەناوبانگی فیزیای چەندیی.

(٢) Spirit Vastly Superior to that of man

(٣) Paul Dirac: (١٩٠٢-١٩٨٤ز)، زانای بەریتانی فیزیای تیۆری، خاوەنی خەڵاتی نۆبڵ.

کێپلەر[1] لەسەرەتاکانی زانستی نوێوە تێبینی ئەوەی کردووە، بۆیە گوتوویەتی: ((لەڕاستیدا ڕێسا سروشتییەکان لەئاست توانای تێگەیشتنی عەقڵی مرۆڤدان، خودا ویستوویەتی کە بیانزانین بۆئەوەی لەبیرۆکەکانیدا هاوبەشی بکەین، دوای ئەوەی ئێمەی لەسەر شێوەی خۆی بەدیهێناوە))، ئێمەش ئەوەی بۆ زیاددەکەین: هەروەها بۆ ئەوەی ئەو ڕێسایانە بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکانی جێنشینیمان لەسەر زەویدا بەکاربهێنین)).

## گونجانی نێوان عەقڵی ئێمە و بوون :

هەستکردن بەم نیشانانەی ڕێکخراوبی گەردوون، کە پێشتر باسمان کرد پێویستی بەوە هەیە کە گونجانێك هەبێت لەنێوان بنچینەی گەردوون و یاساکانی و توانای هەستکردن و مەعریفی و لۆژیکی عەقڵمان، هەروەها ئەوە دەخوازێت کە عەقڵمان باوەڕی بەوە هەبێت کە گەردوون ئەو سیفاتانەی هەیە. لەڕاستیدا ڕێبازی سروشتی ڕووبەڕووی ئاستەنگێکی زۆر دەبنەوە لە لێکدانەوەی ئەو گونجانە، کە لەسەرووی توانای هەڕەمەکیی و ڕێکەوت و سروشتی شتەکانەوەیە.

تاکە لێکدانەوە بۆ گونجانی نێوان سیفەتەکانی گەردوون و توانا عەقڵییەکانی ئێمە (لۆژیکییەتی بوون) بریتییە لە لۆژیکییەتی خودای بەدیهێنەر. لەبەرئەوە شتێکی سەیرنەبوو کە پێشبینییە فیزیاییە بیرکارییەکان، کە عەقڵی مرۆڤ پێشتر پێیگەیشتبوو[2] زۆر بەوردی بەسەر ئەو گەردوونەدا جێبەجێ ببێت کە خودا درووستی کردووە.

---

(١) Johannes Kepler: (١٥٧١-١٦٣٠) زانای بیرکاری و فەلەکناسی بەناوبانگی ئەڵمانی. سێ یاسای گرنگی داناوە کە وەسفی جووڵەی هەسارەکان دەکەن.

(٢) وەك بیردۆزی ڕێژەیی و کونە ڕەشەکان.

## یەکخوایی بنچینەی زانستی نوێیە :

میلڤن کالڤین[1]، خاوەنی خەڵاتی نۆبڵ لە کیمیای زیندەیی، ئەو ڕێکخراوییەی گەردوون کە باسمان کرد بۆ خودای تاقانەی دەگێڕێتەوە کە ئەو گەردوونەی بەدیهێناوە و بە سیستەمێکی گونجاو بەڕێوەی دەبات؛ بەوپێیەی کە هەرەمەکیی و چەندخودایی وا دەکات هەر یەکەیان گەردوون بە یاساکانی خۆی بەڕێوە ببات، ئەمەش دەبێتە هۆی نەمانی گەردوونەکە:

﴿ لَوْ كَانَ فِيهِمَآ ءَالِهَةٌ إِلَّا ٱللَّهُ لَفَسَدَتَا ۚ فَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾ الأنبياء: ٢٢.

واتە: (ئەگەر لە ئاسمان و زەویدا چەند پەرستراوێك هەبوایە جگە لە خوا بێگومان (ئاسمان و زەوی) هەر دوو کاول و وێران دەبوون، دەی پاك و بێگەردی بۆ خوای پەروەردگاری عەرش لەوەی بێ باوەڕان ڕەوایی دەدەن بۆ خوا)، ئەم باوەڕبوونە بە یەك خودا دەگێڕنەوە بۆ سەردەمی میسرییە کۆنەکان، بەڵام کالڤین دەیگێڕێتەوە بۆ عیبرانییەکان کە پێغەمبەر ئیبراهیم(سەلامی خوای لەسەربێت)یان تێدا نێردراوە. بەهەرحاڵ، داننان بە یەکخوایی بنەمای مێژوویی ڕەسەنە بۆ زانینی ئەوەی کە گەردوون ڕێکخراوە، بەم شێوەیەش یەکخوایی دەبێتە بنچینەی زانستی نوێ.

بەهەمان شێوە شۆڕشی زانستی کە لەژێر سایەی ژیارستانیەتی ئیسلامیدا ڕوویدا بەرهەمی دوو ڕەگەزی سەرەکی بوو؛ یەکەمیان جەختکردنەوەی قورئانی پیرۆز لەسەر ئەوەی کە گەردوون ڕێکخراوە، تەنانەت زانایانی مسوڵمانیش زاراوەی چەمکی سوننەتە گەردوونییەکانیان یاساکانی سروشت بەکار هێناوە.

---

(١) Melvin Calvin: (١٩١١-١٩٩٧ز)، زانای ئەمریکی کیمیای زیندەیی.

دووەمیشیان بانگەوازی قورئانی پیرۆز بۆ سەرنجدان و بیرکردنەوە لە ئاسۆکان، ئەمەشی بە بەرزترین جۆری پەرستن داناوە:

﴿ ٱلَّذِينَ يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمٗا وَقُعُودٗا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمۡ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلۡقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ رَبَّنَا مَا خَلَقۡتَ هَٰذَا بَٰطِلٗا سُبۡحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ١٩١ ﴾ آل عمران: ١٩١.

واتە: (ئەوانەی کە یادی خوا دەکەن بە پێوە و بە دانیشتنەوە بە راکشانەوە وە بیر دەکەنەوە لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی (ئەڵێن) ئەی پەروەردگارمان ئەم (جیهان)ەت بە بێهودە دروست نەکردوە، پاك و بێگەردی بۆ تۆ، دەسا تۆش بمانپارێزە لە سزای ئاگری دۆزەخ).

فرانسس بیکۆنیش[1] کە باوکی زانستی نوێیە ئاگاداری هزری ئیسلامی بوو، لەزاری ئەوەوە گێردراوەتەوە کە گوتوویەتی خودا دوو کتێبی بۆ ئێمە ناردووە؛ کتێبی سروشت و کتێبی پیرۆز، هەروەها گوتوویەتی کە ئەگەر بتەوێ فێرخوازێکی ڕاستەقینەبیت، ئەوا پێویستە عەقڵت بۆ تێگەیشتن لە هەردوو کتێبەکە بخەیتەکار. زانای لاهوتی سەردەم ك.س.لویس[2] ئەو تێگەیشتنە کورت دەکاتەوەو دەڵێت: مرۆڤ لەو کاتەدا زانستی پەیڕەو کرد کە زانی سروشت شوێنی یاساگەلێك دەکەوێت، ئەمەش لەو کاتەدا ڕوویدا کە باوەڕی هێنا بە خودای تاقانەی دانەری یاساکان.

پێشتر بینیمان کە مەنهەجی وردکردنەوە (اختزالی) چۆن لۆژیکییەتی گەردوونی لەناوبرد، پاشان باشترین لێکدانەوە بۆ ڕێکخراوی گەردوون بریتییە لە داننان بە خودایەکی دانای بەتوانا، کە کردارەکانی بەڵگەیی و لۆژیکییەتییان بە

---

(١) Sir Francis Becon: (١٥٦١-١٦٢٦ز)، فەیلەسوف و نووسەر و پیاوی دەوڵەتی ئینگلیزی، بەوە ناسراوە کە سەرکردایەتی شۆڕشی زانستی کردووە لەڕێی فەلسەفە نوێیەکەی کە لەسەر(تێبینی کردن و تاقیکردنەوە) دامەزرابوو، یەکێك بوو لەو پێشەوایانەی کە هەستیان بەوە کرد کە لۆژیکی ئەرستی کە پشت بە ئەندازەگیری دەبەستێت سوودی نییە.

(٢) C.S.Lewis: (١٨٩٨-١٩٦٣ز)، زانای لاهوتی بەناوبانگی مەکسیکی ئەمریکی، لە سەدەی بیستەم ژیاوە.

زانست بەخشیوە. ئەگەر مایکل ئۆنفرای[1] بە گاڵتەجارییەوە دەڵێت: (خودای وەهمی هەموو ئەو شتانە دەکوژێت کە دەکەونە سەر ڕێگاکەی: لۆژیك-زیرەکیی-عەقڵی ڕەخنەگر، جا دوای ئەوەی ئەم بەربەستانەی بەرگری دارمان ئەوان قوربانیەکانی دیکەش بەدوای یەکدا دێن: فەلسەفە - هونەر - داهێنان...))، جا ئێمەش دەڵێین مایکل ئۆنفرای ڕاستدەکات! چونکە خودا وەهمییەکان دوژمنی عەقڵن، بەڵام خودای تاقانەی ڕاستەقینە بەهیچ جۆرێك بەم شێوەیە نییە.

**خوێنــەری بەڕێــز :**

زۆرێك لە بێباوەڕان و تەنانەت زۆر لە دیندارەکانیش ڕەواج بەوە دەدەن کە ناکۆکیی و هەڵدژییەك لەنێوان زانست و ئاییندا هەیە، تەنانەت بێباوەڕان بانگەشەی ئەوەش دەکەن کە ئەو ناکۆکییە لە بەرژەوەندی زانست کۆتایی پێهاتووە! ئێمە لەم تەوەرەیەدا ناڕاستی ئەو بانگەشانەمان سەلماند و نیشانماندا کە ناکۆکیی ڕاستەقینە لەنێوان زانایانی دیندار و زانا بێباوەڕەکاندایە، ئەمەش لە ئەنجامی تێگەیشتنی کورتبینیی هەریەکە لە زانست و ئایین.

ئەگەر بێباوەڕان باوەڕداران بەوە تۆمەتبار دەکەن کە باوەڕیان بە خودا لەسەر پاڵنەری دەروونی خوودی بنیاتناوە بەبێ هیچ بەڵگەیەکی عەقڵی یان زانستی، ئەوا سەلماندمان کە هەریەکە لە باوەڕی ئایینی و پرسە زانستییەکانیش لە بەڵگەی بابەتیانە و قەناعەتە دەروونییە بەدیهییەکانەوە سەرچاوە دەگرن. ئایا بڕوای زانستی نییە، کە عەقڵمان جێی متمانەیە و دەبێت باوەڕی پێبکەین کاتێك - بۆنموونە - پێمان دەڵێت، کە خۆر وەك چۆن هەزاران ملیۆن ساڵە لە خۆرهەڵاتەوە هەڵدێت سبەینێش بەهەمان شێوە لە خۆرهەڵاتەوە هەڵدێت! کە ئەمە گریمانەیەکە هیچ بەڵگەیەکی زانستی لەسەر نییە!..تەنانەت زۆرێك لە گەورە بێباوەڕان بەو چەمکە بێباوەڕییانەوە پەیوەستن کە لەسەریان پەروەردەبوون،

---

(١) Michel Onfray: فەیلەسووفی فەرەنسی دوای نوێگەری، هەوڵی ئەوەی دەدا کە فەلسەفە لە کۆشکە خەیاڵییەکان بێتە ناو خەڵکی ئاسایی.

ئەگەر پێچەوانەی زانستیش بن، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە باوەڕی دەروونی لە بنچینەکانی بێباوەڕیشە.

ئەگەر فرۆید و ئەو بێباوەڕانەی بەدوایدا هاتن باوەڕبوون بە خودا بە جۆرێك لە ئامرازەکانی هەڵاتن لە مەترسییەکان بزانن کە ڕووبەڕووی مرۆڤایەتی دەبنەوە، کە گرنگترینیان لەناوچوونە بە مردن، ئەوا بێگومان بێباوەڕیش ئەو ئامرازی هەڵاتنیە کە مرۆڤ لە ترسی سەرەنجامی کردارە بەد و ناشرینەکانی لەدوارۆژدا پەنای بۆ دەبات.

بۆیە دەڵێین کە ناکۆکی ڕاستەقینە لەنێوان زانست و ئاییندا نییە، بەڵکو لەنێوان ڕێبازی سروشتی و ئاییندایە، چونکە ڕێبازی سروشتی جگە لە سروشت و هەست، دان بە هیچی تردا نانێت و هەرچی لەسەرەوەی سروشتە و ئایین و خوایەتیش رەتدەکاتەوە، تەنانەت زانستە مرۆییەکان و ئایینیش بۆ گۆڕەپانی مەنهەجی سروشتی پەلکێش دەکات، کە تەنیا بۆ ئەوە دانراوە مامەڵە لەگەڵ زانستە تاقیگەیی و ئەزموونییەکاندا بکات.

لەم تەوەرەیەدا نەك تەنیا هەر ئەوەمان ڕوونکردەوە کە ناکۆکی نێوان ئایین و زانست وەهمییە، تەنانەتە سەلماندمان کە گونجانێکی قووڵ هەیە لەنێوان ئایین و بنچینەکانی زانستدا. ئەو گونجانەش لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە زانست لەوەوە دەستپێدەکات کە گەردوون ڕێکخراویی و ڕاستگۆیی و شیاوی تێگەیشتن و پێشبینیکردنی هەیە و عەقڵی ئێمە بەجۆرێك درووستکراوە کە بەشێوەیەکی درووست ئەو نیشانانە هەست پێبکات. مرۆڤیش دانی بەو ڕێکخراوییەدا ناوە کە لە خاسیەتە گەردوونی و عەقڵییەکاندا هەیە و باڵەخانەی زانستیی لەسەر بنیاتناوە، دوای ئەوەی لەوە تێگەیشت کە لەپشت تەواوی وجودو بوونەوە خودایەکی دانای بەتوانای تاقانە هەیە.

﴿...سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ۝٩١﴾ المؤمنون: ٩١

واتە: (پاك و بێگەردی بۆ خوای پەروەردگاری عەرش لەوەی بێ باوەڕان رەوایی دەدەن بۆ خوا).

## تەوەرەی چوارەم

## گەردوون
## لەنێوان خودا و بێباوەڕیی دا

﴿ قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ ﴾ العنكبوت: ٢٠

واتە: (ئەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بڵێ: بڕۆن بگەڕێن بە زەوی دا و سەرنج بدەن کە چۆن دروستکراوەکانی لە سەرەتاوە بەدیهێناوە).

((ئەو سیستەمە جوانترین و سەرسوڕهێنەرترینەی خۆر و هەسارەکان و کلکدارەکان لەخۆدەگرێت، بەدیهێنەرێکی بلیمەت و بەتوانا نەبێت کەس ناتوانێت بەدیبێنێت، بەدیهێنەرێك کە دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەبێت، نەك وەك ڕۆحی جیهان، بەڵکو وەك خودایەك لەسەروو هەمووانەوە)).

ئیسحاق نیوتن

سێ گەورە فەیلەسووفەکەی یۆنانی[1] کۆن(سوقرات، ئەفلاتون، ئەرستۆ) باوەڕیان بە خودای بەدیهێنەری گەردوون هەبوو، لەبەرئەوەی عەقڵی فەلسەفی ئەوسا (تائێستاش لەلای زۆرێك لە فەیلەسووفەکان هەر وایە) بێتوانابوو لە وێناکردنی ئیمکانیەتی (بەدیهێنان لە نەبوونەوە)،بۆیە ئەرستۆ پەنای بردە بەر ئەوەی کە بڕوای بە بوونێك هەیە کە((بوونێکە لە ماددە ناچێت)) (درووستنەبووە و هیچ سیفاتێکیان وەرنەگرتووە) و ناوی ناوە (هیۆلا Heola) (بنچینەی بوون)، ئەرستۆ ئەم هیۆلایە بە قەدیم و ئەزەلی دەزانێت، کە خودا گەردوونی لێ درووستکردووە، بەڵام ئەرستۆ ئەوەی ڕوون نەکردۆتەوە کە چۆن ئەم هیۆلا ئەزەلییە درووستبووە!

---

(١) ئەرستۆ و ئەفلاتون و سوقرات گەورەترین سێ کوچکەی فەلسەفەی یۆنانی کۆنن، کە فەلسەفەی نوێی ڕۆژئاوا و تەنانەت ژیارستانییەتی ڕۆژئاواشی لەسەر بنیاتنراوە. ئەرستۆ قوتابی ئەفلاتون بوو و ئەفلاتونیش قوتابی سوقرات بوو.

ئەرستۆ Aristotle: (٣٨٤ پ.ز-٣٢٢ پ.ز) یەکێکە لە گەورەترین فەیلەسووفەکانی مێژووی مرۆڤایەتی، بە مامۆستای یەکەم بەناوبانگە، مامۆستای ئەسکەندەری گەورەبوو. داهێنانەکانی لە بواری زانستیدا (فیزیا- گەردوون- زیندەزانی) کێبڕکێی داهێنانەکانی بواری زانستە مرۆڤایەتییەکان دەکەن (فەلسەفە- سیاسەت- ڕەوشت- شانۆ- مۆسیقا- خوایەتییەکان). هەروەها دامەزرێنەری بناغەی زانستی لۆژیکە؛ هەر بۆیە بە پێوەری ئەرستی بەناوبانگە. کڵێسای کاسۆلیکی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بیرۆکە زانستییەکانی ئەرستۆی وەردەگرت و لە پێگەیەکی پیرۆزی دادەنان و بۆ هیچ زانایەك نەبوو دژیان بوەستێتەوە. بۆیە یەکێك بوو لەو هۆکارانەی گالیلۆ و زانایانی تری تووشی چەوسانەوە کرد.

ئەفلاتون plato: (٤٢٨ پ.ز-٣٤٧ پ.ز) گەورە فەیلەسوفی یۆنانی گرنگی دەدا بە ڕەوشت و بەها باڵاکان. لە کتێبەکەیدا (کۆمار) باسی هەموو ئەو شتانەی کردووە کە پێویستە لە شارە چاکەکەدا خەڵك پەیڕەویان بکەن. دامەزرێنەری ئەکادیمیای ئەسینایە، کە بە یەکەمین قوتابخانەی خوێندنی باڵا دادەنرێ لە ڕۆژئاوای کۆندا. گرنگیشی بە بیرکاری دەدا. هەروەك چۆن گفتوگۆکانی لەگەڵ مامۆستاکەی (سوقرات)ی بۆ ئێمە گێڕاوەتەوە، ئەگەر ئەو گفتوگۆیانەی نە نوسیبایەوە، مێژوو هیچی دەربارەی سوقرات بۆ نەدەگێڕاینەوە.

سوقرات Socrates: (٤٧٠ پ.ز-٣٩٩ پ.ز). خاوەنی زیادکردنێکی گەورەیە لە فەلسەفەدا، چونکە پێشتر فەلسەفە تەنیا گرنگی دەدا بە بنچینەی ماددی گەردوون و ژیان (خاك- ئاو- هەوا- ئاگر)، بەڵام سوقرات گرنگیدان بە ڕەوشت و بەها باڵاکانی بۆ زیادکرد. هەروەها گرنگییەکی زۆری دەدا بە لۆژیك و بنچینەکانی زانیاری. مێژوو ئەو هەڵوێستە بەناوبانگەی، بۆ تۆمار کردووە کاتێك دادگای ئەسینا بڕیاری کوشتنی لە ڕێگەی خواردنی ژەهر بەسەردا سەپاند، بە تۆمەتی ئەوەی کە مێشکی گەنجانی تێکداوە!! سەرەڕای ئەوەی کە بواری هەڵهاتنی بۆ ڕەخسا، بەڵام ڕەتیکردەوە، بۆ ئەوەی نیشانی گەنجانی بدات کە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی دەوڵەت بن، هەروەها لەبەر ئەوەش کە باوەڕی وابوو نابێ فەیلەسووف لەو مردنە بترسێت کە گیان لە زیندانی جەستە ڕزگار دەکات.

پاشان فەیلەسووفی سەکەندەری جۆن فیلۆپۆنس[1] لە سەدەی شەشەمی زایینیدا یەکەمین کەس بوو کە گوتی گەردوون درووستکراوە(سەرەتایەکی هەیە) بەڵگەی فەلسەفیشی لەسەر ئەوە هێناوەتەوە.

ئەو پرسیارانەی دەربارەی درووستبوونی گەردوون کراون و فەیلەسووفەکانی تووشی سەرسووڕمان کردووە، زۆر بە سادەیی وەڵامەکانی لە وەحی خوداییدا هەیە، دوای ئەوەی خودا ڕوونکردنەوەی پرسە غەیبییەکانی کردۆتە ئەرکی خۆی، پێیڕاگەیاندووین کە گەردوون سەرەتایەکی هەیەو لە نەبوونەوە بەدیهێناوە:

﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُولِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾

آل عمران: ١٩٠.

واتە: (بەڕاستی لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەویدا و لە ئاڵو گۆڕی شەو و ڕۆژدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانی ژیر و هۆشمەند)، (خەلق) واتا بەدیهێنان لە نەبوونەوە بەشێوەیەك کە پێشتر هاوشێوەی نەبووبێت. بەهەمان شێوە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (كان الله ولم يكن شيئ غيره)رواه البخاري. واتە: خودا هەبوو و هیچ شتێك جگە لەو بوونی نەبوو.

لە بەرامبەریشدا، بەدرێژایی مێژوو بێباوەڕان چەندان راو بۆچوونی جیاوازیان هەبوونە کە جەخت لەسەر ئەزەلییەتی گەردوون دەکەنەوە(کە قەدیمە و سەرەتای نییە)، کەواتە پێویستی بە بوونی خودا نییە.

ڕۆژگار دەڕوات و زانست کاری خۆی دەکات —شانبەشانی فەلسەفە و ئایین- سەبارەت بە پرسی گەردوون، ئایا زانستی نوێ پاڵپشتی کامیان دەکات، خوایەتی یان بێباوەڕیی؟.

---

(١) John philoponus: (٤٩٠-٥٧٠ز)، فەیلەسووفێکە بە ناوی یوحەننا سێکەندەری ناسراوە، گرنگی داوە بە نووسین لەسەر نووسینەکانی ئەرستۆ، چەند کتێبێکی لە بواری ئایینناسیدا داناوە.

# چیرۆکی گەردوون

## گەردوون سەرەتایەکی هەیە:

(ویلیەم لەین کریگ)[1] مامۆستای فەلسەفەی ئایینەکان پێمان دەڵێت، کە زانا مسوڵمانەکان (لەسەرووی هەموویشیانەوە ئەبو حامد ئەلغەزالی، (١٠٥٨-١١١١ز) پرسی درووستبوونی گەردوون و پێویستی بەبوونی خودای بەدیهێنەریان بەتەواوی ڕوون کردۆتەوە، ئەو زانستەش کە تایبەتە بە شیکردنەوەی بیروباوەڕ ناویان ناوە عیلمی کەلام (کە لە بەرامبەر عیلمی لاهوتی مەسیحیدایە).

ئەو زانستە ناوە عەرەبییەکەی هەر پێوە ماوە Science of Kalam دوای ئەوەی لەڕێی ئیسپانیاوە گوازرایەوە بۆ ڕۆژئاوا، پاشان لە ڕۆژئاوادا لەسەر دەستی فەیلەسوفی ئەڵمانی (ئیمانوێل کانت)[2] لە سەدەی هەژدەهەمداناوبانگی پەیداکرد.

---

(١) William lane Craig: مامۆستایە لە زانکۆی تالبۆت Talbot لە ویلایەتە یەکگرتووەکان، هەروەها زانای ئایینناسییە و دیبەیت لەگەڵ بێباوەڕاندا دەکات، خاوەنی دەستەواژەی (بەڵگەی قسەی کۆزمۆلۆجییە Kalam Cosmological Argument، لەساڵی ١٩٤٩ لەدایك بووە.

(٢) Immanuel Kant: (١٧٢٤-١٨٠٤)، بەناوبانگترین فەیلەسوفی ئەڵمانیا بوو لە سەدەی دوازدەهەمدا، یەکێکە لە زانایانی فەلسەفەی نوێ.

لەچوارچێوەی عیلمی کەلامیشدا و بۆ سەلماندنی ئەوەی کە گەردوون سەرەتایەکی هەیە، پێشەوا غەزالی پشتی بە بەڵگەی فەلسەفە و بیرکاری بەستووە، کە ئەوە دڵنیا دەکاتەوە کە(مەحاڵە قەدیمییەکی بێ کۆتایی هەبێت، واتا پێویستە ڕابردوو سەرەتایەکی هەبێت)[1].

## ئەنیشتاین و کێشەی قەدیمی گەردوون...

سەرەڕای بەڵگەی فەلسەفی بیرکاری کە دەگەڕێتەوە بۆ هەزار ساڵی ڕابردوو لەسەر ئەوە ڕۆیشتووەکە گەردوون سەرەتای هەیە، بەڵام لە کاتی

---

(١) بۆ سەلماندنی ئەم خستنەڕووە پێشەوا غەزالی ئەم چەند بەڵگەیە دەخاتەڕوو: وا دابنێ کە من ژمارەیەکی بێ کۆتایی وردە بەردم هەیە، منیش دەمەوێ ژمارەیەکی بێ کۆتایی بەرد بەتۆ بدەم. ئەمە بە چەند ڕێگایەك دەکرێ:

١- دەکرێ من هەموو بەردەکانی خۆمت بدەمێ، بەڵام بەم شێوەیە هیچ بۆ من نامێنێتەوە.

٢- دەکرێ ژمارە جووتەکانت بدەمێ(٢،٤،٦،....) کە ژمارەی بێ کۆتایین، بەم شێوەیە من ژمارە تاکەکانم بۆ دەمێنێتەوە(١،٣،٥،....)کە دیسان ئەوانیش ژمارەی بێ کۆتایین.

٣- دەکرێ من چەند دانەیەك بۆخۆم هەڵبگرم و ئەوانی ترت پێبدەم، بۆ نموونە سێ دانە بهێڵمەوەو ئەوانی ترت پێبدەم، بەم شێوەیەش ژمارەی بێ کۆتایی دەمێنێت.

لە سێ حاڵەتی ڕابردوودا ژمارەیەکی بێ کۆتاییمان(ئەوانەی پێمدای) لە ژمارەیەکی بێ کۆتایی(ئەو بەردانەی پێمبوون)دەرکرد، ئەنجامی جیاوازمان دەستکەوت.لەکاتێکدا کە زانایانی بیرکاری ئەوە دووپات دەکەنەوە کە ئەگەر ژمارەیەکی نەگۆڕ(لەم حاڵەتەدا ژمارەی بێ کۆتایی) لە ژمارەیەکی گۆڕاو(بێ کۆتایی) دەربکەین، ئەوا پێویستە لە هەموو حاڵەتەکاندا ئەنجامەکەی هەمان شت بێت. بەڵام دەستکەوتنی ئەنجامی جیاواز(ئەوەی لەلای من ماوەتەوە) بۆ کردارێکی بیرکاری ئەوا ئەوان وایدادەنێن کە ژمارەکە ناڕاستەقینەیە.

ئەگەر ئەو نموونەیە لەسەر کات جێبەجێ بکەین، ساڵانێکی بێ کۆتایی لە تەمەنی گەردوون دەربکەین(وەك بێباوەڕان گریمانەی دەکەن) ئەوا وەڵامی جیاجیامان دەستدەکەوێت، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە دانانی تەمەنی گەردوون بە بێ کۆتایی گریمانەیەکی ناڕاستەقینەیە؛ لەبەرئەوە پێویستە کات سەرەتایەکی هەبێت.

شۆڕشی زانستییەوە زانایان وەك قەدیمێکی ئەزەلی لە گەردوون دەڕوانن(کە سەرەتای نییە). تا سێیەکی یەکەمی سەدەی بیستەم چەند گریمانەیەك بوونیان هەبوو بانگەشەیان بۆ ئەوە دەکرد کە گەردوون بەردەوام بوونی هەبووە Steady State Universe، بەبێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکی زانستییان لەسەر ئەوە هەبێت.

کاتێك ئەنیشتاین لەساڵی ١٩١٥دا بیردۆزی ڕێژەیی گشتی دانا، حیساباتەکانی بۆیان دەرخست کە گەردوون دەکشێت یان دەچێتەوەیەك، ئەمەش واتای ئەوەیە کە ناکرێ ئەزەلی بێت، بۆیە پێویستە سەرەتای هەبێت. بۆ دەرچوون لەو تەنگ و چەڵەمەیە، ئەنیشتاین لە هاوکێشەکانیدا نەگۆڕێکی دانا و ناوی نا(نەگۆڕی گەردوونی Fudge Constant) بۆئەوەی بەهۆیەوە بەسەر کاریگەری هێزی کێشکردندا زاڵبێت، بۆئەوەی قەبارەی گەردوون جێگیربێت و گەردوون بکاتە ئەزەلی، تا لەگەڵ تێگەیشتنی باوی هەڵەی ئەوکاتدا بێتەوە.

پاشان ئەنیشتاین بیستی کە ئیدوین هابڵ[1] لەساڵی ١٩٢٩دا دیاردەی دوورکەوتنەوەی سووری گەلەستێرەکان[2] Red Shift ی دۆزیوەتەوە، کە واتای ئەوەیە گەلەستێرەکان لەیەکتر دووردەکەونەوە و گەردوون دەکشێت، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە گەردوون سەرەتای هەیە. هەرکە ئەنیشتاین بەوەی زانی ڕاستەوخۆ سەردانی هابڵی کرد لە ڕوانگەکەی لە کالیفۆڕنیا و خۆی لەوە دڵنیا بووەوە کە بیستبووی، بۆیە دانی بەوەدانا کە دانانی نەگۆڕی گەردوونیی بۆ جەختکردنەوە لە ئەزەلییەتی گەردوون گەورەترین هەڵەی زانستیی بووە لە ژیانیدا.

---

(١) Edwin Hubble: (١٨٨٩-١٩٥٣ز)، یەکێکە لە بەناوبانگترین زانایانی گەردوونناسی سەدەی بیستەم، خاوەنی گەورەیی گرنگیدانە بە گەلەستێرەکانی تری جگە لە گەلەستێرەی خۆمان.

(٢) دیاردەی دوورکەوتنەوەی سوور: ئەگەر سەرچاوەیەکی ڕووناکی لە ڕووانگە دووربکەوێتەوە، ئەوا ڕەنگەکانی پەلکەزێڕینە کە لێیەوە دەردەچن ڕەنگی سووری زیاتر دەبێت، هابڵ ئەو زیادبوونەی تێبینی کردبوو کە لە گەلەستێرەکانەوە بۆمان دێت، بۆیە هەستی بەوە کرد کە گەلەستێرەکان لێمان دووردەکەونەوە لەمەشەوە ئەوەی دەرهێنا کە گەردوون دەکشێت.

## گەردوون سەرەتای هەیە..لە گومانەوە بۆ باوەڕ..

پێش تەواوبوونی سەدەی بیستەم، زانایانی گەردووونناسی چوار بەڵگەی حاشاهەڵنەگریان هەبوو لەسەر ئەوەی کە گەردوون سەرەتایەکی هەیە، ئەو بەڵگانەش ئەمانەن:

یەکەم: ئاماژەمان بۆ ئەوە کرد کە ئەوەی هابڵ سەلماندوویەتی لەوەی گەلەستێرەکان لەیەکتر دووردەکەونەوە (دیاردەی دوورکەوتنەوەی سووری گەلەستێرەکان)، واتا گەردوون دەکشێت، ئەگەر حیساباتە بیرکارییەکان بگێڕینەوە دواوە، دەگەینە ئەوکاتەی کە مەودای نێوان گەلەستێرەکان سفر بووە، واتا ساتی درووستبوونی گەردوون.

دووەم: یەکێك لە چەمکە بنەڕەتییەکانی ((یاسای دووەمی داینامیکای گەرمیی Second Law Of thermo-Dynamics) ئەوەیە کە گەرمیی گەردوون بەردەوام کەمدەکات لە (بوونی گەرمیی) تا دەگاتە(نەبوونی گەرمیی)، واتا گەردوون سارد دەبێتەوە (لە ئێستادا ٣،٧ لە سەرووی سفری رەهایە). ئەگەر گەردوون ئەزەلی بوایە، واتا سەرەتای نەبوایە، ئەوا هەموو گەرمییەکەی لەدەستدەدا و دەمێك بوو لەناوچووبوو.

سێیەم: کاتێك دوو زانا فیزیاییە ئەمریکییەکە (ئارنۆ بنزیاس، رۆبێرت ویڵسن) لە کارگەی تەلەفۆنیی بوون لە نیوجێرسی و خەریکی تاقیکردنەوەی یەکێك لە میلە ورد و هەستیارەکانی شەپۆلەکانی مایکرۆیی Microwaves بوون[1]، لەوکاتەدا میلەکە تەشویشێکی زیاتری وەرگرت لەوەی دوو لێکۆڵەرەکە چاوەڕێیان دەکرد و ئەو تەشویشەش بەشەو و ڕۆژ و بەدرێژایی ساڵ هەر بەردەوام بوو،

---

(١) فڕنی مایکرۆویف کە بۆ کوڵاندنی خواردن بەکاریدەهێنین شەپۆلەکانی رێك وەك شەپۆلەکانی رووناکی وان، تەنیا ئەوەی جیاوازە کە درێژییەکەیان زۆر زیاترە و دەگاتە نزیکەی سەنتیمەترێك.

## گەردوون سەرەتای هەیە..لە گومانەوە بۆ باوەڕ..

پێش تەواوبوونی سەدەی بیستەم، زانایانی گەردووناسی چوار بەڵگەی حاشاهەڵنەگریان هەبوو لەسەر ئەوەی کە گەردوون سەرەتایەکی هەیە، ئەو بەڵگانەش ئەمانەن:

**یەکەم:** ئاماژەمان بۆ ئەوە کرد کە ئەوەی هابڵ سەلماندوویەتی لەوەی گەلەستێرەکان لەیەکتر دووردەکەونەوە (دیاردەی دوورکەوتنەوەی سووری گەلەستێرەکان)، واتا گەردوون دەکشێت، ئەگەر حیساباتە بیرکارییەکان بگێڕینەوە دواوە، دەگەینە ئەوکاتەی کە مەودای نێوان گەلەستێرەکان سفر بووە، واتا ساتی درووستبوونی گەردوون.

**دووەم:** یەکێك لە چەمکە بنەڕەتییەکانی ((یاسای دووەمی داینامیکای گەرمیی Second Law Of thermo-Dynamics) ئەوەیە کە گەرمیی گەردوون بەردەوام کەمدەکات لە (بوونی گەرمیی) تا دەگاتە(نەبوونی گەرمیی)، واتا گەردوون سارد دەبێتەوە (لە ئێستادا ٣،٧ لە سەرووی سفری رەهایە). ئەگەر گەردوون ئەزەلی بوایە، واتا سەرەتای نەبوایە، ئەوا هەموو گەرمییەکەی لەدەستدەدا و دەمێك بوو لەناوچووبوو.

**سێیەم:** کاتێك دوو زانا فیزیاییە ئەمریکییەکە (ئارنۆ بنزیاس، رۆبێرت ویڵسن) لە کارگەی تەلەفۆنیی بوون لە نیوجێرسی و خەریکی تاقیکردنەوەی یەکێك لە میلە ورد و هەستیارەکانی شەپۆلەکانی مایکرۆیی Microwaves بوون[1]، لەوکاتەدا میلەکە تەشویشێکی زیاتری وەرگرت لەوەی دوو لێکۆڵەرەکە چاوەڕێیان دەکرد و ئەو تەشویشەش بەشەو و ڕۆژ و بەدرێژایی ساڵ هەر بەردەوام بوو،

---

(١) ئرنی مایکرۆویڤ کە بۆ کوڵاندنی خواردن بەکاریدەهێنین شەپۆلەکانی رێك وەك شەپۆلەکانی رووناکی وان، تەنیا ئەوەی جیاوازە کە درێژییەکەیان زۆر زیاترە و دەگاتە نزیکەی سەنتیمەترێك.

ئەمە سەرەڕای خوولانەوەی زەوی بەدەوری خۆیی و بەدەوری خۆردا.هەروەها دوو لێکۆڵەرەکە ئەوەیان بۆ دەرکەوت کە تەشویشەکە لەهەموو لایەکەوە دێت و بەهەمان هێزیش، چ لە کۆمەڵەی خۆری ئێمەوە بێت یان لە شوێنێکی تری گەلەستێرەکەمان یان لەدەرەوەی گەلەستێرەکەمانەوە.جێگیریی تەشویشەکە ئەوەی دەرخست کە گەردوون لەهەموو لایەکەوە وەك یەکە[1].

چوارەم: ڕەگەزە قوورسەکان(وەك ئاسن و مس و زێڕ) لەڕێگەی بەیەکەوەلکانی ڕەگەزە سووکەکانەوە دروستدەبن، گەرمی بەرزی پێویستیش هەبووە بۆ دروستبوونی ئەو پێکەوەلکانە لە ئەستێرە گڕگرتووەکاندا Supernova. هەرچی ڕەگەزە سووکەکانن(هایدرۆجین و هیلیۆم) کە لە تەنۆلکەی بچووکتر لە گەردیلە پێکدێن ئەوا پێویستییان بە پلەیەکی گەرمی زۆر بەرزتر هەیە، جا لەبەرئەوەی کە ئەو ڕەگەزانە بەشێوەیەکی یەکسان بە هەموو ناوچەکانی گەردووندا بڵاوبوونەتەوە، ئەمە واتای ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو گەرمییە زۆرە لە هەموو ئەو ناوچانەدا بوونی هەیە، واتا گەردوون بە یەك ڕووداوی بەهێزی بەرهەمهێنەری گەرمیی پەیدابووە، نەوەك بە ڕووداوی دووبارەی هاوشێوەی شوێنی جیاواز، ئەم ڕووداوەش جگە لە تەقینەوە گەورەکەی گەردوون هیچی تر نییە.

زانست بەم شێوەیە وەڵامی ئەم پرسە فەلسەفییە ئاڵۆزەی داوەتەوە دەربارەی ئەوەی ((گەردوون قەدیمە یان بەدیهێنراوە؟))، زانست لەو بارەیەوە قسەی خۆی کردووە - کە لەگەڵ قسەی ئایین دێتەوە - بەوەی کە گەردوون بەدیهێنراوە، ئەو چەمکە وەك حەقیقەت و بەدیهییەتێکی زانستی سەیردەکرێت.

پرسەکە دەچێتە سەر پرسیارێکی تر: چۆن بەدیهاتنی گەردوون دەستپێکردووە؟

---

(١) سەرچاوەی ئەم تەشویشە نەگۆڕەی گەردوون چییە؟ گەردوون لە سەرەتادا زۆر گەرم و درەوشاوە بوو تا ئاستی سپێتی ئەمەش لە دەرئەنجامی ئەو تەقینەوە گەورەیەی کە بەهۆیەوە گەردوون دروستبووە، پێویست بوو ئەو درەوشانەوەیە(ڕووناکی) لە هەموو بەشێکی گەردوونەوە پێمان بگات. جا لەبەرئەوەی گەردوون دەکشێت، ڕووناکی تووشی دوورکەوتنەوەیەکی سووری گەورە بووە، تا لەسەر شێوەی تیشکی مایکرۆوی پێمان گەیشتووە(تەشویش) لەجیاتی ڕووناکی بینراو. ئەمەیان بەڵگەیەکی ((کردەیی)) گەورەیە کە ناتوانرێ ڕەت بکرێتەوە، بەوەی گەردوون هاوشێوەیە، دەکشێت، سارد دەبێتەوە. بۆیە دوو خاوەنەکەی شایەنی ئەوەبوون کە خەڵاتی نۆبڵی لەسەر وەربگرن. لەساڵی ١٩٧٨.

ناحەتمیی هایزنبێرگ کاریگەری دادەنێ[1]، واتا ئەوەی بەسەرماندا کاریگەرە (ئەگەر)ە نەک (سەلمێنراو)، ئەمە بەو واتایەی، کە تواناکانمان بۆ دیاریکردنی ئەندازە فیزیاییەکان (وەک هێزی تەقینەوەکە و خێرایی کشانی و دوورییەکانی) دیاریکراون. پاشان ناڕوونییەك هەر دەمێنێتەوە کە ناکرێ پشتگوێ بخرێت کە ڕەفتاری گەردوونە تازە پەیدابووەکەیە لەو کاتەدا.

## تەقینەوە گەورەکەی گەردوون[2] The Big Bang :

ستیڤن هۆوکینگ[3] لە هەردوو کتێبەکەیدا ((مێژوویەکی کورتی کات))[4] ساڵی ١٩٨٨ و ((مێژوویەکی کورتتری کات))[5] ساڵی ٢٠٠٥، سیناریۆی دروستبوونی گەردوون بە تەقینەوە گەورەکە شیدەکاتەوە، دەڵێت: لە ساتێکی ڕابردوودا (نزیکەی ١٣،٧ بلیۆن ساڵ ± ٢٠٠ ملیۆن ساڵ) گەردوون (بەپێی حیساباتە بیرکارییەکان) لە خاڵێکدا بچووك کرابووەوە کە قەبارەکەی سفر بوو! کە زانایان ناوی ((تاك Singularity))یان لێناوە، پاشان ئەوەی بەسەرهاتووە کە پێی دەڵێین ((تەقینەوە گەورەکەی گەردوون The Big Bang))، ئەوەش سەرەتاکە بوو.

بەڵام چی لە پێش تەقینەوە گەورەکەی گەردوون هەبووە، ئەوا ستیڤن هۆوکینگ وەڵام دەداتەوە و دەڵێت: ئەگەر ئێمە هەندێك شت دەربارەی ئەوە بزانین، کە لەکاتی تەقینەوە گەورەکەی گەردوون ڕوویداوە و (بەپێشکەوتنی

---

(١) پاش کەمێکی تر باسی بنچینەی ناحەتمیی دەکەین.

(٢) وەرگێڕانی وشەیی بریتییە لە(تەقینەوە گەورەترینەکە)، کە زیاتر گوزارشت لە بابەتەکە دەکات.

(٣) لە تەوەرەی یەکەمدا ناساندوومانە.

(٤) A Brief History of time

(٥) A Briefer History of time

زانست زیاتر دەزانین)، بەڵام ناتوانین ئەوە دیاری بکەین، کە پێش ئەوە ڕوویداوە. پێویستە بارودۆخی پێش تەقینەوە گەورەکە هیچ شتێك لە دید و بۆچوونی زانستیمان بۆ گەردوون پێکنەهێنێت! پێویستە بەوەندە وازبێنین، کە تەقینەوە گەورەکە سەرەتای کاتە، کەواتە ئەو پرسیارانەی دەربارەی ئەوەن، کە چۆن بارودۆخ بۆ ئەو تەقینەوەیە ڕەخساوە، لەو پرسیارانە نین، کە زانست وەڵامیان دەداتەوە!.

هەروەها سەرەڕای بوونی زۆرێك بۆشایی و پرسیار، کە (تائێستا) وەڵام نەدراونەتەوە دەربارەی ئەوەی، کە چۆن گەردوون لەم تاکە درووستبووە، هەروەها سەرەڕای ئەوەی، کە ئەو شتە نوێیانەی زانست ڕۆژانە دەیاندۆزێتەوە وردەکارییەکان دەگۆڕێت و دەکرێ ڕۆژێ لە ڕۆژان تەقینەوە گەورەکەش بگۆڕێت و جێگرەوەیەکی بۆ دابنێت، بەڵام چوار ڕاستی سەرەکی هەن، کە لە سیناریۆی گەردووندا ناگۆڕێن؛ گەردوونە لەدایکبووەکە ئەمانەی بەسەر هاتووە:

- کشان Expansion

- ساردبوونەوە Cooling

- چڕبوونەوە Condensation

- پەرەسەندن Evolution: وزە ← تەنۆلکەی بچووکتر لە گەردیلە ← پێکهێنانی گەردیلە.

## پەرەپێسەندنی زیرەکانەی گەردوون[1]..

لێرەدا چیرۆکی دروستبوونی گەردوون کورتدەکەینەوە کە نیشانەکانی پەرەسەندن لە بوونەوەردا دەردەخات، هەروەها بە ڕوونی ئەو خاسیەتانە دەردەخات کە سیناریۆکە هەیەتی لە زیرەکی و مەبەست:

لە ساتی سفرڈا، کە دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی ١٣،٧ بلیۆن ساڵ تاك (Singularity) پەیدابوو کە تەقینەوە گەورەکەی لێوە پەیدابوو. تاکەکە شێوەی خاڵێکی وەرگرت کە سیفاتی وای هەبوو یاساکانی فیزیای، کە ئێستا گەردوون بەڕێوە دەبەن پەکخست لەوەی بتوانن بوونی لێکبدەنەوە: بێکۆتایی بچووك، بێکۆتایی گەرم، بێکۆتایی چڕ، هەروەها تێیدا هەر چوار هێزە سروشتییەکە لەیەك هێزدا یەکیانگرتووە[2].

هەر لەکاتی ڕوودانی تەقینەوە گەورەکەی گەردوون (ساتی دروستبوون) گەردوونی پەیدابوو بەخێرایی ملیار ملیار جار خێراتر لە خێرایی ڕووناکی کشاوە، بەڵام خێراییەکە بە توندی کۆنترۆڵ کرابوو بۆئەوەی پێکهاتەکانی گەردوون پەرش و بڵاو نەبن، هەروەها نەبێتە هۆی ئەوەی کە بەسەر خۆشیدا بشکێتەوە.

پاشان تەنۆلکە سەرەتاییەکانی مادده (کوارك[3] و ئەلیکترۆن[4]) لە وزەوە دروستبوون، لە ئەنجامی ساردبوونەوەی گەردوونی تازە پەیدابوو. هەروەها

---

(١) لە کتێبی (موجز تأريخ الكون من الإنفجار الأعظم إلى الإستنساخ البشري) نووسینی (د. هانی رزق) بە دەستکارییەوە.

(٢) چوار هێزەکە بریتین لە: هێزی کێش کردن، هێزی ئەتۆمیی بەهێز، هێزی ئەتۆمیی بێهێز، هێزی کارۆمەگناتیسی. دوای کەمێکی تر بەدرێژی باسیان دەکەین.

(٣) تەنۆلکەکانی خوار گەردیلە، سروشتیان بەپێی بارگە و ڕەنگ و بارستایی و بۆنەکەی دەگۆڕێت.

(٤) تەنۆلکەکانی خوار گەردیلە، بارگە سالب بەخولگە بە دەوری ناوکی گەردیلەدا دەخولێنەوە.

لەماوەی بەشێکی زۆر بچووکی چرکەدا لە کوارکەکانەوە پرۆتۆن[1] و نیوترۆن[2] درووستبوون، کە دوای ئەوە ناوکی گەردیلەکانی هایدرۆجینی قورس و هیلیۆمی لێپەیدابووە، پاشان ئەو ناوکانە ئەلیکترۆنەکانیان لە خولگەکانی دەوروبەری خۆی گلداوەتەوە بۆ ئەوەی گەردیلە پێکبهێنن.

هەنگاوەکانی پێشوو روویان نەدەدا بەبێ پەیدابوونی چوار هێزە سروشتییەکە، کە کرداری بەدیهێنانی ئاراستە کردووە، چونکە دوای ڕوودانی تەقینەوە گەورەکەی گەردوون و دابەزینی یەك لەدوای یەکی پلەی گەرمی گەردوونی تازە پەیدابوو (هێزی کێشکردن) پەیدابوو، کە بەبێ پەرش و بڵاوکردن دەرئەنجامەکانی تەقینەوەکەی بەئاڕاستەیەکی تردا برد.

پاشان پلەی گەرمی گەردوون کەم بووەوە تا ئاستێك کە ڕێگای بە پەیدابوونی (هێزی ئەتۆمیی بەهێز)دا، کوارکەکان یەکتریان گرت و پرۆتۆن و نیوترۆنیان درووستکرد،هەروەك چۆن ئەو هێزە تەنۆلکەکانی پێکەوە بەستەوە بۆئەوەی ناوکەکانی هایدرۆجینی قورس و هیلیۆم پێکبهێنن. کاتێك پلەی گەرمی گەردوون بۆ ئاستێکی وا کەمبووەوە کە ڕێگای بە پەیدابوونی (هێزی کارۆموگناتیسی دا) ئەو هێزە هەستا بە گلدانەوەی ئەلیکترۆنەکان لە دەوری ناوکەکان تا گەردیلە سووکەکان پێکبهێنن. لەگەڵیشیدا (هێزی ئەتۆمیی بێهێز) پەیدابوو، پاشان دوو هێزەکەی کۆتایی لەگەڵ نزمبوونەوەی زیاتری پلەی گەرمی گەردوون جیابوونەوە.

ماددەی گەردوون بەشێوەیەکی هاوسەنگ بە گەردووندا بڵاوبووەوە، هەروەها بەهۆی چەند هۆکارێکەوە کە تائێستا زانست لێکدانەوەیەکی بۆ نەدۆزیوەتەوە لێرەو لەوێ دوورگەی بچوك بچوك درووست بوون، کە چڕی ماددە تێیاندا بە جیاوازییەکی زۆر کەم لە هەموو ناوچەکانی تری گەردوون زیاترە (بەشێك لە سەد هەزار بەش)، ئەو دوورگانەش بوونە تۆوی گەلەستێرەکانی ئایینده.

---

(١) تەنۆلکەی بارگە موجەب دەکەوێتە ناوەوەی ناوکی گەردیلە و لەسێ کوارك پێکدێت.

(٢) تەنۆلکەی بارگە هاوتا دەکەوێتە ناوەوەی ناوکی گەردیلە و لەسێ کوارك پێکدێت.

لەناو ئەو گەلەستێرانەدا نەوەی یەکەمی ئەستێرەکان درووستبوو، تێیاندا زنجیرەی یەکگرتنی ئەتۆمی ڕوویدا کە ڕێگای دا زۆرێك لە ڕەگەزە کیمیاییەکان درووست ببن، ئەو ڕەگەزانەش کاتێك بە گەردووندا بڵاوبوونەوە کاتێك هەندێك لەو ئەستێرانە تەقینەوە (سوپەرنۆڤا).

لەبەرئەوە ئەستێرە و هەسارەکانی نەوەی دووەم و سێیەم، لەناویشیاندا خۆر و زەوی ئێمە، زۆر ڕەگەزی قورسیان لەخۆ گرتووە.

**بەمەش بوونەوەر پەرەیسەند:** تاك← وزە ← ماددە (کوارك و ئەلیکترۆن)← ناوکی گەردیلە ← گەردی هایدرۆجین و هایدرۆجینی قورس(دیتریۆم) و هیلیۆم" ← درووستبوونی گەلەستێرەکان" ← درووستبوونی نەوەی یەکەمی ئەستێرەکان ← "درووستبوونی ڕەگەزەکانی خشتەی خولی ← درووستبوونی نەوەی دووەم و سێیەمی ئەستێرەکان ← "پەیدابوونی کۆمەڵەی خۆر ← " جێگیربوونی هەسارەی زەوی.

فراوانبوونی گەورەی گەردوون شتێکی حەتمی بوو بۆ پەیدابوونی ڕەگەزە قورسەکان کە هەسارەی زەوی لێ پێکهاتووە، ئەمە سەرەڕای پەیدابوونی ڕەگەزەکانی ژیان (کاربۆن، ئۆکسجین، نایترۆجین)،

بەوپێیەی ئەو ڕەگەزانە لە کوورەی ئەتۆمی گەورە درووستبوون، کە پێویستە زۆر زۆر لەیەك دوور بن، کە بە ئەستێرەکانی سوپەرنۆڤا ناسراوە، بەو واتایەی کە لاشەکانمان لە تۆزێکی گەردوونی پێکهاتووە کە پێش بلیۆنان ساڵ لەیەکێك لەو کوورانە کولێنراوە. ئایا گەردوون بەم فراوانیەی کە درووستکراوە بۆ ئەوە درووستکراوە کە ببێتە کارگەیەك بۆ بەرهەمهێنانی ڕەگەزەکانی زەوی، و چێشتخانەیەك بۆ کوولاندنی ڕەگەزەکانی ژیان؟!!

## بەبەڵگەدانانی بیردۆزی تەقینەوە گەورەکە :

جۆرێك لە رێككەوتن لەنێوان زانایانی گەردوونناسی بوونی هەیە لەبارەی ئەم بیردۆزە، سەرەڕای بوونی هەندێك جیاوازی لە وردەکارییەکاندا، چونكە سەرەڕای چوار بەڵگە فیزیاییەکە کە باسمان کرد لەسەرئەوەی گەردوون سەرەتای هەیە، ئەوا هەموو ڕووداوەکانی تەقینەوە گەورەکەی گەردوون کە زانایان خستوویانەتەڕوو دەکرێ بەڵگەیان لەسەر بهێنرێتەوە کە لە گەردووندا ڕوویانداوە، هەروەك چۆن دەکرێ ڕوودانی تەقینەوەی تری بچووکی هاوشێوە بەدی بکرێن کە تائێستا ڕوویانداوە، تەنانەت دەکرێ بەتاقیکردنەوەش بگەینە هەندێك لەو ڕووداوانە[١]، وەکو:

- یەکبوونی ماددە و دژە ماددەکان.

- پێکهێنانی ناوکی جێگیر بۆ هەندێك گەردیلە.

- گلدانەوەی ئەلیکترۆنەکان لە دەوری ناوکەکان بۆ پێکهێنانی گەردیلەکانی هایدرۆجین و دیتریۆم و هیلیۆم.

تاکە سات کە ناتوانین قسەی لەسەر بکەین، یان نازانین بە وردی چی تێدا ڕووداوە بریتییە لە یەکەمین $١\times١٠^{-٤٣}$ لە چرکەدا لە تەمەنی گەردوونی

---

(١) پرۆژەی CERN گەورەترین پرۆژەی لێکۆڵینەوەی فیزیای بەشەکانی بچوکتر لە گەردیلەیە لە جیهاندا. بە ناوی(دەستەی ئەورووپی بۆ لێکۆڵینەوە ئەتۆمییەکان European Organization for Nuclear Research ) کە دەکەوێتە سەر سنووری فەرەنسا-سویسرا. پرۆژەکە شەش خێراکەر بۆ تەنۆلکەکانی ژێر گەردیلە لەخۆدەگرێت، کۆی درێژترینی ٢٧ کیلۆمەترە و دەکەوێتە قووڵایی ١٠٠ مەتر لەسەر رووی زەوی. پرۆژەکە لە ساڵی ١٩٥٤ دامەزراوە و ٢٦٠٠ فەرمانبەر بەبەردەوامی کاری تێدا دەکەن سەرەڕای ٧٩٣١ زانا و ئەندازیار کە سەر بە ٥٨٠ زانکۆن و نوێنەرایەتی ٨٠ وڵاتی جیهان دەکەن لەناریشیاندا میسر.

تازە پەیدابوو!! ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە تەقینەوە گەورەکەی گەردوون کە ڕوویدا نە شوێن نە کات نە مادده نە وزە بوونی نەبوو، ئەمەش دۆخێکە کە لەئێستادا لەتوانامان‌دا نییە تێیبگەین.

## لەسەرووی هێزی زانستەوە :

لەکاتی ڕوودانی تەقینەوە گەورەکەدا-واتە سەرەتای درووستبوونی گەردوون- پێنج نیشانەی سەرسوڕهێنەر پەیدابوون کە ناچنە ژێر باری هیچ یاسایەکی فیزیایی باو، و زانست ناتوانێت بەتەنیا لێکی بداتەوە:

١- بچووکی ئەو خاڵەی تەقینەوەکەی لێوە روودا (تاك Singularity)، کە لە درێژیی پلانك[1] بچووکترە. بەپێی یاساکانی فیزیا مەحاڵە تاکێك بەم درێژییە ناکۆتاییە لە بچوکیدا بوونی هەبێت.

٢- تاکەکە بێکۆتا چڕ بوو(خاڵێکی بچووکتر لە درێژیی پلانك هەموو بارستایی ئێستای گەردوونی لەخۆگرتبوو) کە بێگومان چڕتر بوو لە بەرزترین چڕی کە تائێستا لە گەردووندا دۆزراوەتەوە، ئەویش چڕی ئەستێرەی نیترۆنییە.

٣- تەقینەوە گەورەکە لە پلەی گەرمییەکدا ڕوویدا کە پلەی گەرمی پلانکی تێپەڕاندبوو[2]، کە دەگاتە دە ملیار ملیار ملیار ملیار (١٠٣٧) پلەی رەها(کلڤن)[3].

---

(١) درێژی پلانك: بچوکترین درێژییە کە لەڕووی تیۆرییەوە دەکرێ ماددەی لەسەر بێت، ئەگەرنا دەگۆڕێت بۆ کونێکی رەش کە هەموو شتێك قووت دەدات، تەنانەت رووناکیش، یەکسانە بە ١٠٣٣ سەنتیمەتر.

(٢) پلەی گەرمی پلانك: ئەو پلەی گەرمییەیە کە لەڕووی فیزیاییەوە ناکرێ تێپەڕێندرێت(١٠٣٢پلەی رەهایە). درێژی پلانك و گەرمی پلانك دەگەڕێنەوە بۆ زانای بلیمەتی ئەڵمانی ماکس پلانك دامەزرێنەری بیردۆزی چەندیی، لەساڵ١٩٥٨ لەدایك بووە و لەساڵی ١٩١٨ خەڵاتی نۆبڵی وەرگرتووە و لەساڵی ١٩٤٧ کۆچی دوایی کردووە.

(٣) سفری رەها(کلڤن): بە ئەندازەی ٢٧٣ پلەی سەدی لە سفری سەدی کەمترە.

٤- خێرایی کشانی گەردوونی تازەپەیدابوو خێرایی ڕووناکی تێپەڕاند بە ئەندازەی ملیار ملیار جار.

٥- چوار یاساکەی سروشت لە یەك یاسادا یەکیان گرتبوو لەناو تاکە یێکۆتاییە بچوکەکەدا.

حیساباتە بیرکارییەکان سەلماندوویانە، کە بەدەستهێنانی وزەیەك، کە هەر چوار هێزەکە لەیەك هێزدا یەکبخات پێویستی بە بنیاتنانی خێراکەرێك هەیە Accelerator کە یەکسان بێت بە قەبارەی کۆمەڵەی خۆر، کەواتە چۆن چوار هێزەکە لە تاکەکەدا یەکیان گرتووە؟!.

**لەوەی رابورد ئەم دەرەنجامانەمان دەستکەوت:**

**یەکەم:** گەردوون لە (نەبوونی رەها Absolute Nothingness) دەستی پێکردووە:

بێ شوێن - بێ کات - بێ ماددە - بێ وزە.

**دووەم:** درووستبوونی گەردوون بە پێنج دیاردەی یاساشکێنی یاسا فیزیاییە باوەکانی ئێستا دەستیپێکرد.

**سێیەم:** گەردوون پێشکەوت:

- لە دۆخی نارێکی رەها[1] و ئەوەی لە گەڵیدا پەیدابوو لە لەدەستدان و دابەشکردنی خراپی وزە بۆ دۆخی رێکوپێکی و بەکارهێنانی باشی وزە(بنیاتنانی ماددە لەجیاتی لەدەستدانی وزە وەك وزەیەکی گەرمی).

- لە بنچینەی سادەتری کەم سوودتر بۆ بنچینەی ئاڵۆزتری گونجاو بۆ ئامانجێکی دواتر.

- لە ماددەی خاوەن فەرمانی کەم ڕۆڵتر و کەم تواناتر بۆ فەرمانێکی باشتر لە ڕووی ڕۆڵ و لەڕووی تواناوە.

---

(١) بە چەمکەکانی (شەوەش Chaos)، و (بڵاوبوونەوە Entropy) وەسف دەکرێت.

لەبەرئەوەی یاسای دووەمی داینامیکای گەرمیی ئەوە دیاریدەکات کە ناڕێکی لە دامەزراوەیەکدا (System) بە ئاڕاستەی پەرش و بڵاوبوون و ناڕێکی و لەدەستدانی وزەی زیاتر دەڕوات ئەگەر کارتێکەرێکی دەرەکی رێکی نەخات، رۆیشتن بە ئاڕاستەی ڕێکخراویی زیاتر و ئاڵۆزی بنچینەیی و ڕۆڵی باشتر و فەرمانی باشتر بەشێوەیەکی حەتمی پێویستی بە دەستتێوەردانێکی زیرەکی کارا هەیە لە دەرەوەی دامەزراوەکە کە ڕێکەوت هیچ ڕۆڵێکی تێدا ناگێڕێت، چونکە ڕێکەوتی بێ نەخشەو ئاڕاستەی دیاریکراو ملیۆنان ئەگەرمان دەخاتە بەردەم کە ناکرێ بەسەر ئەو پەرش و بڵاوی و ناڕێکییەیدا زاڵ بین.

لەمەوە بەدڵنیاییەوە دەڵێین کە دیزاینەری زیرەك (خـودا) میکانیزمی پەرسەندنی ئاڕاستەکراوی هەڵبژاردووە بۆ ئەوەی ئەم بوونە بەدیبێنێت.

## دیدی فیزیا بۆ گەردوون

فیزیای هاوچەرخ بە دوو قۆناغی سەرەکیدا تێپەڕبوو؛ فیزیای کلاسیکی، فیزیای نوێ (فیزیای چەندیی و بیردۆزی ڕێژەیی)، باببینین هەر یەکێکیان چۆن سەیری گەردوونی کردووە.

### فیزیای کلاسیکی :

یاساکانی نیوتن بۆ جوولە و کێشکردن لەسەرووی فیزیای کلاسیکییەوە دێن[١] هەروەها یاساکانی ماکسوێل بۆ کارۆموگناتیسی و یاساکانی گەرمیی. فیزیای کلاسیکی وەك ئامێرێکی میکانیکی سەیری گەردوون دەکات کە بەپێی یاسا فیزیاییە نەگۆڕەکان کاردەکات. واتا گەردوون بریتییە لە: مادده + وزە +

---

(١) فیزیای یاسا بەناوبانگەکانی مانەوە Conservation:

- یاسای مانەوەی گوڕ: گوڕ(هێزی پاڵنەر) سیستەمێکی دیاریکراو و نەگۆڕە لەڕووی ئەندازە و ئاڕاستەوە ئەگەر کارتێکەرێکی دەرەکی کاری تێنەکات.

- یاسای مانەوەی مادده: مادده لەناوناچێت و دروستناکرێت.

- یاسای مانەوەی وزە: وزەی دامەزراوەیەك بە نەگۆڕیی دەمێنێتەوە ئەگەر کارتێکەرێکی دەرەکی کاری تێنەکات.

یاساکانی فیزیای کلاسیکی. وشەی (میکانیکی) واتا یاساکانی فیزیا بەتەنیا بەسن بۆ وەسفکردنی رەفتاری گەردوون، تەنانەت یاسا کیمیایی و بایۆلۆجییەکانیش کە لە گەردووندا هەن دەکرێ بگێڕدرێنەوە بۆ یاساکانی فیزیا، لەبەرئەوە یاساکانی فیزیا بە تەواو و بێ کەموکوڕی دادەنرێن کە تەنیا خۆیان بەسە.

**فیزیای کلاسیکی لە دیدی فەلسەفیدا بە دوو قۆناغی یەک لەدوای یەکدا تێپەڕیوە:**

**أ- دیدی نیوتن:** سەرەڕای دید و بۆچوونی ڕابردوو دەربارەی فیزیای کلاسیکی، نیوتن ڕۆڵی خودایی لە دامەزراوەی کاری گەردووندا پاراست بەوە کە ڕۆڵی خودا لەسەر دوو کۆڵەگە دامەزراوە؛ یەکەم یاساکانی سروشت درووستکراوی خودان، چ بەوەی کە کردوویەتی بە پێکهاتەیەکی جێگیری بنچینەی مادده، یان بەوەی کە ئەو رەفتارەی بۆ مادده دیاریکردووە کە پێویستە لەسەری بڕوات و بەوە ناچاری کردووە. کۆڵەگەی دووەمیش؛ ئەوەیە کە خودا دەستی لە گەردوون بەرنەداوە، بەرپرسە لە پاراستنی گەردوون و چاککردنی هەر کەموکوڕییەک کە تێیدا ڕوودەدات، وەک (کەموکوڕی لە خولگەی هەسارەکاندا).

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە (گەردوون کراوەیە) بۆ کار و ویستی خودایی، کەواتە حەتمییەت بەڕێوەی نابات. بەهۆی ڕۆڵی بەرچاوی لە بەیەکەوە بەستنی فیزیا و ئایین، پاپا ئەلیکسەندەر فەرمانی بەوە کرد کە لەسەر گۆڕەکەی نیوتن بنووسرێت: یاساکانی سروشت لە تاریکایی شەوەزەنگدا ون بووبوون، پاشان خودا فەرمانی کرد با نیوتن لەدایک بێت، ئیتر هەموو شتێک ڕووناک بوو.

**ب- دیدی لابلاس:** کاتێک ناپلیۆن لە لابلاسی فەلەکناسی پرسی دەربارەی ڕۆڵی خودا لە درووستبوونی گەردوون و کارەکانی، بەوە وەڵامی دایەوە کە هیچ پیانوویەک بۆ ئەم گریمانەیە شک نابات، واتا (خودا هیچ ڕۆڵێکی لە گەردووندا نییە)، بەمە لابلاس چەمکێکی فەلسەفی وای بۆ فیزیا زیاد کرد کە ناچێتە ژێر باری سەلماندنەوە، ئەویش ئەوەیە کە گەردوون خاڵییە لە دەستتێوەردانی خودایی، واتا (گەردوونێکی داخراوە) خۆی خۆی بەڕێوە دەبات، هەروەها رەفتاری گەردوون و هەموو ئەوەی تێیدا هەیەحەتمییە، لەبەر ئەوەیە کە باس لە(حەتمییەتی لابلاس) دەکەین، کە ڕۆڵی توانا و ویستی خودایی ڕەتدەکاتەوە، لەبەرئەوە:

دیدی لابلاس = دیدی نیوتن + گەردوونی داخراو و حەتمی

ئەگەر بە قووڵی سەرنج بدەین، دەبینین کە فیزیای کلاسیکی لەگەڵ دیدی ئایینی تێکنا گیرێت، تەنانەت لەگەڵ ڕوودانی موعجیزەش تێکنا گیرێت! لەبەرئەوەی یاسا فیزیاییەکان ئەوە دیاری ناکەن کە کاتێك گەردوون داخراوە و خۆی خۆی بەڕێوە دەبات چۆن بەڕێوە دەچێت، ئەمەش گریمانەیەکە کە ناکرێت لەڕووی زانستی و فەلسەفییەوە بسەلمێنرێت.

## فیزیای نوێ[1]:

یەکێك لە جیاوازییە سەرسوڕهێنەرەکان ئەوەیە کە لە لوتکەی ناکۆکی لەپێناو سەپاندنی چەمکی گەردوونی داخراو و حەتمییەتی فیزیای چەندیدا دەرکەوت، کە هەندێ کەس وا گومانیان برد کە دوو چەمکەکەی پێشوو دڵنیا دەکاتەوە، بەڵام (با) بەپێچەوانەی کەشتی ماددیگەراکان هەڵیکرد.

---

(١) فیزیای چەندیی(Quantum Physics): فیزیای کلاسیکی بەجۆرێك سەیری ماددە دەکات بەوەی کە لە چەند تەنێك پێکهاتووە کە بەپێی یاساکانی نیوتن کار لەیەك دەکەن، هەروەك چۆن گرنگی بە لێکۆڵینەوە لە بوارە مەگناتیسی و کارەباییەکان دەدات لەڕێی هاوکێشەکانی ماکسوێل، بەهەمان شێوە فیزیای گەرمیش دەگرێتەوە کە دەچێتە ژێرباری سێ یاسا فیزیاییەکەی گەرمی.

خاسیەتی هاوبەشی نێوان بوارە جیاوازەکانی فیزیای کلاسیکی بریتییە لەوەی کە بەشێوەیەکی ڕەها دەچێتە ژێرباری ئەو یاسا فیزیاییانەی کە بەڕێوەی دەبەن کە بە (حەتمییەتی ڕەها Complete Determinism) ناسراوە.

هەرچی فیزیای چەندییە زانستێکە کە لەسەرەتای سەدەی بیستەم دەرکەوت، سەرکەوتوو بوو لە لێکدانەوەی زۆرێك لەو دیاردانەی فیزیای کلاسیکی پێشتر نەیتوانیبوو لێکدانەوەیان بۆ بکات.
فیزیای چەندیی(کوانتەم)کۆمەڵێك بنەما لەخۆدەگرێت کە کار لەگەڵ سیستەمە فیزیاییە وردەکاندا دەکات: بەشەکان و گەردیلەکان و پرۆتۆنەکان و نیوترۆنەکان و ئەلیکترۆنەکان و کوارکەکان و تەنۆلکەکانی تری ژێر گەردیلەیی، هەروەها لە شەپۆلە جۆراوجۆرەکانی وزەی جیاواز دەکۆڵێتەوە.

لەوانەیە گرنگترین چەمکەکانی فیزیای چەندیی کە پەیوەستە بە پرسەکەمانەوە بریتی بێت لە چەمکی ناحەتمیی[1] Indeterminism Or uncertainity، کە حەتمییەتی لابلاس هەڵدەتەکێنێت. چونکە لە فیزیای کلاسیکیدا ئەگەر دامەزراوەیەکمان هەبێت کە لە کۆمەڵێك تەنۆلکە پێکبێت، هەریەکێکیان شوێن و بارستایی و خێرایی لەکاتی((ن))دا هەبێت، لە ساتی دواتردا ((ن + ١)) ئەوا شوێن و بارستایی و خێرایی دەگۆڕێت بۆ بەهای تری دیاریکراو، کە دەکرێ پێشبینی بکرێ.

هەرچی فیزیای نوێیە، لەژێر ڕۆشنایی ناحەتمی تەنۆلکەکان ((ن)) و ((ن + ١)) بەهایێکی دیاریکراویان نابێت، بەڵکو ((ئەگەر)) دادەنێت، کە (کۆمەڵێکی بێکۆتایی لە ئەگەرەکان کە هەر یەکێکیان ڕێژەی خۆی هەیە) بۆ سیفەتە جیاوازەکانی هەر تەنێك کە بوونی دەبێت.

فیزیای نوێ تەنیا حەتمییەتی لابلاسی ڕەتنەکردەوە، بەڵکو بە چەمکی ئەگەریی (الاحتمالية) دەرگای بەرووی دەستتێوەردانی خوداییدا واڵا کرد، چونکە خودا بەتوانایە بەسەر دەستتێوەردانی هەر دامەزراوەیەك بۆئەوەی

---

(١) چەمکی (ناحەتمیی) یەکێکە لە چەمکە سەرەکییەکانی فیزیای چەندیی، بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم چەمکە دوو نموونە دەخەینەڕوو: ئەگەر سەد فۆتۆن(یەکەی تەنۆلکەکانی ڕووناکی) بکەونە سەر ئاوێنەیەك، ئەوا ٪٩٥یان بە ئاڕاستەی چاوەکانمان دەبن بۆ ئەوەی وێنەکە ببینین، لەکاتێکدا ٪٥یان لەڕێی ئاوێنەکەوە ون دەبن. بەڵام ئەگەر تەنیا یەك فۆتۆن بکەوێتە سەر ئاوێنەکە ئەوا ناتوانین دڵنیابین لەوەی کە ئایا ئەم فۆتۆنە تیشك دەداتەوە یان لەناودەچێت. بەڵام دەتوانین بڵێین کە ئەگەری ٪٩٥ هەیە لەوەی کە تیشك دەداتەوە و ئەگەری ٪٥ هەیە لەوەی کە ون بێت.

زانراوە کە گەردیلەکانی ڕەگەزە تیشکدارەکان وەك یۆرانیۆم نیوەی توانای تیشکدانەوەی لەدەستدەدات و دەگۆڕێت بۆ ڕەگەزی سست لەماوەیەکدا کە فیزیاییەکان بە(ماوەی نیوەی تەمەن) ناوی دەبەن. بەڵام کام نیوەیەی گەردیلەکانە لە تیشکدانەوە دەوەستێت، نازانین، ئەوپەڕی ئەوەی کە دەتوانین بیڵێین ئەوەیە کە لەبەردەم هەر گەردیلەیەکدا هەلێك هەیە بەئەندازەی٪٥٠ لەوە کە لە تیشکدانەوە بوەستێت و بگۆڕێت بۆ گەردیلەیەکی سست(گەردیلەی قورقوشم لە دۆخی یۆرانیۆم دا).

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە ئێمە بەپێی (ئەگەرەکان Probability) لە ڕەفتاری تەنۆلکەکان(هەروەها شەپۆلەکان) دەکۆڵینەوە. (ئەمەش بە بنەمای ناحەتمیی Uncertainty Principle) ناسراوە. کە زانای فیزیایی نەمسایی ڤێرنەر هایزنبێرگ دایناوە. ئەمەش لە بەرامبەر حەتمییەتی ڕەهایە کە فیزیای کلاسیکی کاری پێدەکات.

ئەگەرێك بەسەر ئەگەرەكانی تردا زاڵ بكات، بەمەش دەرئەنجامەكە بەشێوەیەكی بنەڕەتی دەگۆڕێت[١].

ئەنیشتاین بەرهەڵستی (چەمكی ناحەتمیی) لە فیزیای چەندیدا دەكات، وایدەبینێت كە یاسای زۆر ورد - كە هێشتا نایانزانین - رەفتاری تەنۆلكەكانی ژێر گەردیلەیی بەڕێوە دەبەن[٢]، بەمەش دەمانگێڕێتەوە بۆمیكانیكێتی فیزیای كلاسیكی. بەڵام ئەنیشتاین حەتمییەتی لابلاس رەتدەكاتەوە، كە لەسەر ئەوە دامەزراوە كە گەردوون داخراوە، بەڵكو وایدەبینێت كە خودا ڕۆڵی لە گەردووندا هەیە، هەروەك چۆن نیوتن باوەڕی وابوو. پاشان ئەگەر فیزیای چەندیی لەسەر ئەم ناحەتمییەی ئێستای بمێنێتەوە یان چەمكی میكانیكی پەیڕەو بكات، ئەوا ئەو میكانیكییە باوەڕدارەكەی نیوتنە نەك میكانیكییە حەتمییە بێباوەڕەكەی لابلاس.

## هەڵوێستی بێباوەڕە هاوچەرخەكان بەرامبەر بە گەردوون :

لەكاتێكدا فەلسەفە بوونی گەردوون بە گرنگترین پرسەكانی خۆی هەژمار دەكات، هەروەها گرنگترین پرسیارەكانی خۆی دەربارەی دەخاتەڕوو: بۆچی گەردوون بەدیهاتووە؟ بۆچی بوون دەركەوت لەجیاتی ئەوەی كە نەبوون بەردەوام بێت؟.. دەبینین كە چەمكی بنچینەیی كە زانا و فەیلەسووفە بێباوەڕەكان لێیەوە دەستپێدەكەن بریتییە لە (گەردوون بوونی هەیە و تەنیا پێویستە لێی بكۆڵینەوە!

---

(١) هەندێك لە زانایانی فیزیای چەندیی پشتگیری لەم چەمكە دەكەن. لەوانە Willian Pollard (سالی ١٩٥٨). (Weber-Rimini- The Ghirardi،GRW Approach).

(٢) هەمان چەمك بەسەر دامەزراوەكانی شەواش جێبەجێ دەبێت، كە زۆرێك بە دامەزراوی هەڕەمەكیی ناویان دەبەن. بەڵام لەڕاستیدا لەسەر یاسای زۆر ورد دەڕۆن كە لەسەرووی توانای هەستكردنی ئێمەوەن.

ئەگەر هەر زنجیرەیەکیش سەرەتایەکی هەبێت با ئێمە زنجیرەکەمان لە تەقینەوە گەورەکەی گەردوونەوە دەستپێبکەین).

بێرتراند راسل پشتگیری لەم بۆچوونە دەکات و دەڵێت: (گەردوونی ئێمە یەکێکە لەو شتانەی کە دەکرێ لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر بەدیبێت).

پیتەر ئەتکنز خستنەڕوویەکی ساکاری تر دەخاتەڕوو و دەڵێت: (کات و شوێن خۆیان خۆیان بەدیهێناوە[1]).

کیس وۆرد[2] گاڵتە بەم خستنەڕووە دەکات و ڕوونی دەکاتەوە کە ئەم چەمکە لەگەڵ خۆیدا تێکدەگیرێت و دەڵێت: ئەمە یەکێکە لە مەحاڵە لۆژیکییەکان کە هۆکارێك بەرلەوەی بوونی هەبێت کاریگەری هەبێت، پاشان ئەتکنز مادییگەرێتییەکەی پاڵنەری بووە بۆ ئەم لێکدانەوەیەی نەك زانست.

پاشان کیس وۆرد دەڵێت: شورەییە زانست لەسەر ئەوە دابمەزرێت کە هەموو شتێك هۆکارێکی هەیە کەچی گرنگترین شتەکانیش بێ هۆکارن، کە ئەمەیان بریتییە لە بوونی هەموو شتەکانی تر، بوونی گەردوون، بەدڵنیاییەوە تامەزرۆیی مرۆڤ کە لە زانیاری تێرنابێت ناهێڵێت ئەم پرسیارەی بەبێ وەڵام بەسەردا تێبپەڕێت.

---

(١) پیتەر ئەتکنز ئەم خستنەڕووە بە(قەیتانی پێڵاوی گەردوونی Cosmic Bootstrap) ناودەبات، بەمە ئاماژە بۆ ئەو کەسە دەکات کە قەیتانی پێڵاوەکەی بۆسەرەوە بەرز دەکاتەوە تا خۆی بەرز بێتەوە!

(٢) Keith Ward: مامۆستای فەلسەفە و لاهووت لە زانکۆی ئۆکسفۆرد، لەساڵی ١٩٣٨ لەدایك بووە.

## ڕۆڵی یاساکانی فیزیا

هەندێك لە بێباوەڕان لێکدانەوەی سێیەم دەخەنەڕوو بۆ بوونی گەردوون، ئەویش ئەوەیە، کە یاساکانی فیزیا گەردوونیان بەدیهێناوە، گەورەزانای فیزیا پۆڵ دیڤیز (هەروەها منیش) پاڵپشتی ئەو خستنەڕووە دەکات ((بەمەرجێك بدرێتە پاڵ خودا وەك هۆکاری یەکەم، دەڵێت: من بەو بیرۆکەیە ئاسوودە نیم کە تەنەکەسازێکی ئاسمانی گەردوونی بەدیهێنابێت، بەڵکوگوتنی ئەوەی کە هەندێك یاسای بیرکاری بە وردییەکی زۆرەوە توانیویانە گەردوون بەدیبێنن موعجیزەتر و بەڵگەترە لەسەر بوونی خودا)).

ستیڤن هۆوکینگ لە کتێبەکەی(مێژوویەکی کورتی کات)[1] ئەم خستنەڕووە تەواو دەکات و دەڵێت: گەیشتن بە هاوکێشەگەلێك، کە بوونی گەردوون لێکبدەنەوە Mathematical Model ئەوە لێکناداتەوە کە چۆن ئەم هاوکێشانە گەردوونیان بەدیهێناوە و بۆچی؟ تەنانەت ئەگەر زانایانیش بگەنە بیردۆزێکی کۆڕا بۆ هەموو شتێك[2]، ئەوا پێویستە بیربکەینەوە کە چۆن پەیدابوون و ئایا پێویستییان بە خودا هەیە؟

---

(١) بەرلەوەی هۆکینگ ببێتە بێباوەڕ ئەم قسەیەی کردووە، بەڵام باوەڕدار بێت یان بێباوەڕ ئەم پرسیارانە هەر دەمێننەوە.

(٢) بیردۆزی کۆڕا Theory Of Everything T.O.E بیردۆزێکە کە فیزیاییەکان خەونی پێوە دەبینن، کە لە یاساکانیدا یاسا بەڕێوبەرەکانی چوار هێزەکەی سروشت کۆ بکەنەوە، وا گومان دەبەن کە بەمە دەتوانن لێکدانەوەیەك بۆ درووستبوونی گەردوون بخەنەڕوو.

لەپێناو ئەوەی کە دەست بخەینە سەر ڕۆڵی یاسا سروشتییە ڕاستەقینەکان لە درووستبوونی گەردووندا، ئەم دوو نموونەیە دێنینەوە:

یاساکانی جووڵەی نیوتن دەتوانن وەسفی ڕێگای تۆپی بلیارد بکەن، بەڵام داری بلیارد کە یاریزانەکە بەکاری دێنێت تۆپەکە دەجووڵێنێت. یاساکان پێویستییان بە بوونەوەرێك هەیە کە هێزێك لە کات و شوێنێکدا کاریان تێبکات، بەبێ ئەم چوار ڕەگەزە (مادده - وزە - شوێن - کات) یاساکان ناتوانن کار بکەن، بەڵکو تەنیا بوونیان دەبێت.

هەروەها سەرنجی سادەترین یاسا بیرکارییەکان بدە: ١+١ = ٢. ئایا ئەم یاسایە لەتوانایدا هەیە هیچ شتێك بێنێتەبوون؟ ئایا ئەم یاسایە هیچ شتێك بۆ حیسابە بانکییەکەم زیاد دەکات؟! بەڵام ئەگەر هەزار دۆلار لە بانك دابنێم و دوای ماوەیەکی تر هەزار دۆلاری تر بخەمە سەری، ئەوا ئەو یاسایە ئەوە دیاریدەکات کە حیسابەکەم بوو بە دوو هەزار دۆلار، بەڵام بەبێ هەڵستانم بەم کارە سەرەڕای بوونی یاساکەش حیسابەکەم هەر بە سفر دەمێنێتەوە.

پاشان، بانگەشەکردن بۆ ئەوەی کە یاساکانی سروشت گەردوونیان بەدیهێناوە ((شێتییە))، بەڵام ئەگەر بە زانست وەسفی بکەم ئەوە ((فێڵێکی بێ نرخە)). لەڕاستیدا بیردۆزەکان و یاساکان ڕێگای کارەکان بە وردی وەسف دەکەن، بەڵام ناتوانن هیچ شتێك بێننە بوون.

دوای ئەوەی هەڵوێستی بێباوەڕانمان دەربارەی گەردوون خستەڕوو، نۆرەی هەڵوێستی باوەڕداران دێت، کە لە ژێر سێ چەمکی سەرەکیدا دەیخەینەڕوو:

- بەڵگەی گەردوونی Cosmic Argument
- بەڵگەی ڕێکخستنی ورد Fine Tunning Argument
- بەڵگەی مرۆیی Antropic Principle

## بەڵگەی گەردوونی Cosmic Argument :

((دروستبوونی گەردوون لە نەبوونەوە بەڵگەیە لەسەر خودای بەدیهێنەر))

بیردۆزی تەقینەوە گەورەکە بەرپەرچی وەڵامدانەوەی پرسیارەکان دەداتەوە دەربارەی ((ڕووداوی یەکەم First Event) لە دروستبوونی گەردووندا، بەڵام ڕەفتار لەگەڵ (هۆکاری یەکەم First Cause) ناکات، گومان لەوەدا نییە کە جیاوازییەك هەیە.

لەبەرئەوە دوای ئەوەی زانایانی گەردوون لە خستنەڕووی هەر لێکدانەوەیەکی ماددی عەقلی بۆ ڕوودانی تەقینەوە گەورەکەی گەردوون بێتوانابوون، زۆرێك لە فەیلەسوف و زانا هاوچەرخەکان، ئەوەی کە بە(بەڵگەی هێنانەبوون یان بەڵگەی خەلق) لە عیلمی کەلامەوە دێننە گۆڕەپان و ناویان ناوە بەڵگەی گەردوونی، کە بۆتە یەکێك لە بەهێزترین (بەڵگە زانستی / لۆژیکی)یەکان دەربارەی خودای بەدیهێنەری گەردوون. ئەم بەڵگەیەش لە دوو پێشەکی و ئەنجامێك پێکهاتووە:

أ- هەموو بوونێك سەرەتایەکی هەیە، کە پێویستە سەرچاوەیەکی پێشووی هەبێت (بەدیهێنەر).

ب- گەردوون سەرەتای هەیە.

کەواتە: گەردوون سەرچاوەیەکی پێشووی هەیە(بەدیهێنەر).

ئەگەرچی ئەم بەڵگەیە لەسەر بوونی خودای بەدیهێنەر لەسەرەتادا وەك بەڵگەیەکی فەلسەفی لەلایەن زانایانی عیلمی کەلامی مسوڵمانان سەریهەڵداوە، ئەوا زانستی نوێ بەڵگەی زانستی بۆ زیاد کردووە (سەلماندوویەتی کە گەردوون

سەرەتای هەیە)، بەمەش بەرزی کردۆتەوە بۆ ریزی ئەو ڕاستییە زانستییانەی کە دەچنە ژێر باری لێکۆڵینەوەی زانستییەوە.

## بەرهەڵستکارانی بەڵگەی گەردوونی:

سەرەڕای ڕەوانی و درووستی ئەم دەرەنجامە لۆژیکییە و پشتبەستنی بە زانست و فەلسەفە، بەڵام هێشتا هەندێك هەن کە لە داننان بە بەدیهێنەرێکی زیرەکی بە توانا ڕادەکەن، کە ئەم گەردوونەی ئێمەی دروستکردووە.

نموونەی ئاشکراش لەسەر ئەوە، هەڵوێستی پڕ لە داخی گەورە زانای فیزیا سێر جۆن مادۆکس[1]ی سەرنووسەری گۆڤاری Nature. مادۆکس ئەوە ڕەتدەکاتەوە، کە گەردوون سەرەتای هەبێت! کێشەنییە، بەڵام کوا بەڵگە زانستییەکەی؟

بەڵام ئەو (هەروەك خۆی دەڵێت) بۆیە ئەوە ڕەتدەکاتەوە چونکە داننان بە بوونی سەرەتایەك بۆ گەردوون داننانە بە بەڵگەیی ڕای دیندارەکان!!

بە سەرنجدان بە دروستی ئەم دەرەنجامە، بێباوەڕان جەختیان لەسەر هەردوو پێشەکییەکەی بەڵگەکە (أ،ب) کردۆتەوە و زۆر بەرپەرچدانەوەیان لە بارەیەوە خستۆتەڕوو، کە دەکرێ لە شەش خاڵدا کۆبکرێنەوە:

**یەکەم: گەردوونەکەمان قەدیمە و سەرەتای نییە (ئەزەلییە):**

ئەم بەرپەرچدانەوەیە کە لە ڕابردوودا لە بەهێزترین بەڵگەکانی دژی بەڵگەی گەردوونی بوو، تا ئەو کاتەی زانست سەلماندی (و بێباوەڕان دانیان بەوە دانا) کە گەردوونەکەمان سەرەتایەکی هەیە.

---

(١) Sir John Madox: (١٩٢٥-٢٠٠٩ز)، پسپۆری فیزیا و کیمیا و بایۆلۆجیا بوو، لە تەمەنی بیست و دوو ساڵیدا دەستیکرد بە نووسینی بابەتی زانستی بۆ گۆڤاری Nature و بۆ ماوەی بیست ساڵ بوو بە سەرنووسەری گۆڤارەکە.

**دووەم: گەردوونەکەمان سەرەتایەکی هەیە، بەڵام پێویستی بە بەدیهێنەر نییە:**

بۆ دەرچوون لە کێشەی پێشوو، نکۆڵیکارانی نەوەی، کە خودا گەردوونی بەدیهێناوە، پەنایان بردە بەر خستنەڕووی چەند بیردۆزێك کە دەیسەلمێنن گەردوونەکەمان سەرەتایەکی هەیە و پێویستی بە بەدیهێنەر نییە.

لە گرنگترین ئەو بیردۆزانە، بیردۆزی ((گەردوونی ناجێگیر Oscillating universe))ە کە لە بیردۆزی تەقینەوە گەورەکەی گەردوون Big bang دەچێت، بەڵام وایدەبینێت کە گەردوون لە ((تەقینەوە گەورەکە)) درووستبووە و بە دوایدا (ورد و خاشبوونێکی گەورە) ڕوویداوە، کە گەردوونی گەڕاندۆتەوە دۆخی تاکێتی، پاشان دوای ئەوە تەقینەوەیەکی تری گەورە ڕوویداوە، پاشان ورد و خاشبوونێکی تر، بەم شێوەیە تا ناکۆتایی لە قەدیمیدا، واتە ئەم ناجێگیرییە ئەزەلییە.

بەڵام ئەم گریمانەیە لە زۆربەی ناوەندە زانستییەکاندا ڕەتکراوەتەوە[1]، بەڵکو دوو زانا ڕووسیەکە[2] کە ئەم بیردۆزەیان پێشکەشکردووە لە ساڵی ١٩٦٣، دوای تەنیا حەوت ساڵ لە خستنەڕووی ئەو بیردۆزە پەشیمان بوونەوە. بەڵام سەرەڕای ئەوەش بێباوەڕان پێداگری لەسەر دەکەن و بە بەڵگە دەیهێننەوە.

---

(١) سێ هۆکاری سەرەکی هەن بۆ ڕەتکردنەوەی ئەم بیردۆزە لەلایەن زانایانەوە:

١- فیزیا سەلماندوویەتی کە ئەم گەردوونەمان بە تەقینەوە گەورەکە دەستپێکردووە و ورد و خاشبوونێکی گەورەی بە دوادا هاتووە، بەڵام تاکە بەڵگەیەکی زانستی نییە لەسەر ئەوەی کە دوای ورد و خاش بوونەکە تەقینەوەیەکی تر هاتبێت.

٢- بە هەمان شێوە هیچ بەڵگەیەکە زانستی نییە لەسەر ئەوەی ئەم گەردوونەمان گەردوونێکی تری ورد و خاشی لە پێشدا هەبووە، کەواتە بابەتەکە لە گریمانەیەك زیاتر هیچی تر نییە.

٣- لە نموونەی گەردوونی ناجێگیردا یاساکانی داینامیکای گەرمی ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە کاتی ڕوودانی خولی ئایندە پێویستە لەو خولەی ئێستا درێژتر بێت و ئەگەر بۆ دواوە بگەڕێینەوە و ژماردنەکە پێچەوانە بکەینەوە، دەبینین کە هەر خولێکی ڕابردوو کورتترە لەوەی دوای خۆی، تا دەگەینە خولێك کە کاتەکەی سفرە، کە ئەمەش سەرەتای خولە ناجێگیرەکانە، واتە ناگونجێ ناجێگیریەکە ئەزەلی بێت.

(٢) دوو زاناکە Isaac Kbalatnikov & Evgenii Lifshitzن.

چەمکێکی تر هاوشێوەی گەردوونی ناجێگیرە، کە وای دەبینێت ئەو ماددە سەرەتاییەی تەقینەوە گەورەکەی گەردوونی لێوە درووستبوو دەکرێ ئەزەلی بێت و بەو پێیەش تەقینەوە گەورەکە سەرەتایەکی دەبێت، بەڵام پێویستی بە بەدیهێنەر نییە.

ئەو بیردۆزە (وەك پێشینەکانی) پێویستی بە بەڵگەیەکی زانستی هەیە.

وەك گریمانەی سێیەم، هەندێك ئەوە دەخەنەڕوو کە گەردوونێکی گەورەی بێ سنوور (ئەزەلی) هەیە، کە زۆر گەردوونی لێ درووست بوون، لەوانە گەردوونی ئێمە.

ئەم بەرپەرچدانەوەیە درێژەی بەرپەرچدانەوەی پێشووترە، لەگەڵ بوونی یەك جیاوازی، ئەویش دانەپاڵی ئەزەلیەتە بۆ ((گەردوونی دایك)).

گومان لەوەدا نییە کە بێباوەڕان ناتوانن ئەزەلییەتی گەردوونی دایك ڕوون بکەنەوە، هەروەك چۆن لە ڕوونکردنەوەی ئەزەلیەتی گەردوونەکەمان بێ توانا بوون.

زانای گەردووناسی دیار پیبلز P.J.E.peebles جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئەم خستنەڕووانە تەنیا گریمانەن و، بیردۆزی زانستی نین کە حەقیقەت یان زانیاری یان تەنانەت تێبینی بەجێی لە پشت بێت. لە خەیاڵی زانستی نزیکترن نەك لە زانست[1].

---

(١) زانای دیاری گەردووناسی P.J.E.peebles لە (گۆڤاری زانستەکانی ئەمریکا Scientific American دا لە ژمارەی فێبریوەری، ٢٠٠٥)دا بیردۆزەکانی درووستبوونی گەردوونی بە پێی ئەندازەی بابەتیانەی بیردۆزەکان ڕێکخستووە. پیبلز پلەی A+ داوەتە ئەو بیردۆزانەی دەڵێن گەردوون لە بارودۆخی چڕ و زۆر گەرمدا درووستبووە، لە گرنگترینیان (بیردۆزی تەقینەوە گەورەکەی گەردوون)ە. هەرچی بیردۆزەکانی ترە پلەی B،+B،-A-. وەرنەگیراوی پێبەخشیون.

ڕێکخستنی پیبلز بە پێی بەڵگەی زانستی بۆ چوار ئاستی جیاواز ڕێکخراون:

یەکەم: ڕاستییەکان (facts)کە هیچ گومانیان تێدا نییە.

دووەم: گریمانە لۆژیکیەکان Reasonable Hypothese کە بەڵگەی باشیان لە پشتە.

سێیەم: گریمانەی قایلکەر Plausible Speculations کە بەڵگەی پاڵپشتی نییە.

چوارەم: گریمانەی ڕەتکراوە Inplausible Speculations کە بەڵگەی پاڵپشتی نییە و، لەگەڵ ڕاستییەکاندا تێکدەگیرێن.

**سێیەم: پێویست ناکات هەموو بوونێك سەرەتای هەبێت!**

دوای ئەوەی بێباوەڕان بێتوانابوون لە گەیشتن بە سەرچاوەیەکی ماددی ئەزەلی بۆ گەردوونەکەمان، هیچیان لە بەردەمدا نەما جگە لەوەی بڵێن، دەکرێ گەردوون لە هیچەوە و بەبێ هیچ هۆکارێك درووستبووبێت!! تەنانەت گەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە ئەو قسە سەیرە بۆتە گەورەترین بەربەرچ کە ماددییگەراکانی ئەم سەردەمە دەیخەنەڕوو!

بیردۆزی لەرینەوەی بۆشایی چەندیی Quantum Vacuum Fluctuations بە بەناوبانگترین ئەو بیردۆزانە دادەنرێت کە زانا فیزیاییە بێباوەڕەکان لەو بوارەدا خستوویانەتەڕوو. ئەم خەملاندنانە وایدەبینن کە تەنۆلکەکانی ژێر گەردیلە دەکرێ خۆکردانە لە بۆشاییدا درووست ببن و ون ببن(ناوی بۆشایی چەندیی Quantum Vacuum) یان لێناوە، داویانەتە پاڵ بیردۆزی چەندیی- کوانتەم). بەهەمان شێوە دەکرێ گەردوونی ئێمەش بەشێوەیەکی خۆکرد لە بۆشاییدا درووست ببێت.

گەورە زانای فیزیایی((پۆل دێڤیز))[1] بەتەواوی ئەو گریمانانە رەتدەکاتەوە، بەوپێیەی درووستبوونی تەنۆلکەکان لە بۆشایی چەندیدا نیشانەو نموونە نییە بۆ درووستبوونی ماددە لە هیچەوە، بەڵام لە ئەنجامی گۆڕانی وزە لە بۆشاییدا دەگۆڕێت بۆ ماددە، واتا بۆشایی نەبوونێکی رەها نییە، کەواتە سەرچاوەی ئەم وزەیە چییە؟! هەروەها سەرچاوەی ئەو یاسایانە چییە کە بەڕێوەی دەبەن؟!.

زانایان وزەی بۆشایی بە وزەیەکی ناپێکهاتوو دادەنێن، بەوپێیەی کە ناتوانرێت ببینرێت، هەروەها بەجۆرێك پێوانەیان کردووە کە ئەوەی لەبۆشاییەکدا بوونی هەیە کە قەبارەکەی ١سم$^3$ (ئەندازەی بەستەری پەنجەی بچووك) یەکسانە بە وزەی بەرهەمهاتوو لە گۆڕانی هەموو ماددەی گەردوون بۆ وزە!!

---

(١) پۆل دێڤیز Paul Davies: زانایەکی بەریتانییە، لە ساڵی ١٩٤٦ لەدایك بووە. مامۆستای فیزیایە لە زانکۆی ئەریزۆنا، پێشتر لە زانکۆی کامبریدج - لەندەن - نیوکاسڵ مامۆستا بوو. پسپۆڕی زانستەکانی گەردوون و فیزیای چەندییە. لە ساڵی ١٩٥٥ خەڵاتی تێمپلتۆنی وەرگرتووە.

کارەکە هەندێك لە زانا فیزیاییە ماددیگەراکانی[١] گەیاندۆتە ئەو ئاستەی کە بانگەشەی ئەوە بکەن کە تەنۆلکەکانی ژێر گەردیلەیی دەکرێ لە نەبوونی رەهای خاڵی لە وزەی بۆشاییەکەدا درووست ببن - پاشان لەناو بچن - ! ئەگەر زانست دوای ماوەیەکی تر توانای ڕوودانی ئەوە بسەلمێنێت، پرسیارەکە ئەوە دەبێت کە: چۆن نەبوونی رەها ئەم تایبەتمەندییە سەرسوڕهێنەرەی بۆ پەیدابوو؟ ئایا ئەوە تێکناگیرێت لەگەڵ یاسای مانەوەی ماددە، کە دەڵێت (ماددە لەناوناچێت و درووست نابێت)؟!!

بە هەمان شێوە ستیڤن هۆوکینگ لە بەناوبانگترین کتێبەکەیدا (مێژوویەکی کورتی کات)دا نموونەیەکی هێناوەتەوە بۆ چۆنیەتی درووستبوونی گەردوون بەبێ ئەوەی پێویستی بە بەدیهێنەر هەبێت[٢].

---

(١) لەوانە لیۆنارد میلودنۆ Leonaard Milodinow زانای فیزیا لە زانکۆی کلتیك لە ویلایەتە یەکگرتووەکان. لەگەڵ ستیڤن هۆوکینگدا بەشداربوو لە کتێبی کۆتایی The Grand Design.

٢ بە نموونەی هارتل - هۆوکینگ، یان نموونەی چەندیی گەردوون ناسراوە، ئەم نموونەیە پشت بە چەمکێك دەبەستێت کە هۆکینگ یەکەمجارە دەیخاتەڕوو، ئەویش چەمکی (کاتی خەیاڵی) بوو، کە پراکتیکی ژمارەی خەیاڵییە.

ئەگەر بەدوای ڕەگی چوارجای ژمارەی (- ٤)دا بگەڕێین، ئەوا ژمارەیەکی ڕاستەقینە نابینین (چونکە - ٢×٢- = ٤+) بۆیە هۆکینگ هەستا بە دانانی هێمای (×) وەك ئاماژەیەك بۆ ئەو ژمارەیەی بوونی نییە و، دانانی هێمای × لە هاوکێشە تایبەتەکانی دەربارەی کات، لە ئەنجامدا کاتێکی خەیاڵی دەستکەوت، بۆیە کاتێك هۆکینگ ئەو هێمایانەی لە هاوکێشەکانیدا بەکارهێنا، پێویستی بوونی بەدیهێنەری یەکەمی لە حیسابەکانی خۆی سڕیەوە.

سێر هێربێرت دینگڵ Sir Herbert Dingle سەرۆکی کۆمەڵەی فەلەکناسی شاهانە لە ئینگلتەرا پێمان دەڵێت کە، ئەگەر چەمکی ژمارە خەیاڵیەکان ڕاستبێت لە ڕووی بیرکارییەوە، ئەوا لە ڕووی پراکتیکیەوە هیچ پایەیەکی نییە، بۆ ئەوەش پشت بە نموونەیەك دەبەستێت کە هەموو قوتابیانی بیرکاری دەیزانن.

ئەگەر ژمارەی پیاوانی پێویست بۆ ئەنجامدانی کارێك بریتی بێت لە (×) و × لە هەندێ هاوکێشەدا موجەب، سالب، ژمارەی تەواو، کەرت، ژمارەی خەیاڵی، ژمارەی ناڕێك، سفر، بێ کۆتایی یان هەر شێوەیەکی تر بێت کە بە بیری زانایانی بیرکاریدا هاتووە، ئەوا بە دڵنیاییەوە × (ژمارەی فەرمانبەرە پێویستەکان) بە ژمارەیەکی تەواو موجەب دادەنێین و ئەگەرەکانی تر وەلا دەنێین.

لە ڕاستیدا بیرکاری بە تەنیا ناتوانێت لە نێوان ئەگەرەکاندا لە نموونەی ڕابردوودا یەکێکیان هەڵبژێرێت، بۆیە پشت بە لۆژیك و ئەزموون دەبەستین.

گومان لەوەدا نییە کە ستیڤن هۆوکینگ پیاوی سەردەمە، بەهۆی بلیمەتییەکەی و چەند هۆکارێکی تر، بەڵام ئەوە ڕێگر نییە لەبەردەم سەرکەوتنی زانــا فیزیاییەکانی تر لەپووچەڵکردنەوەو بەهەوادابردنی نموونەکەی، بەرپەرچدانەوەی ئەوان لەسەر بۆچوونە بیرکارییەکەی نەبوو، بەڵکو لەسەر بەریەککەوتنی لۆژیکی ناو نموونەکەی بوو.

**ئەوانەی ئەو قسە بێ بنەمایانە ڕەتدەکەنەوە (بەوەی، کە شتێك لە هیچ شتێکەوە و بەبێ هۆکار درووست ببێت) لەبەر چوار هۆکار ڕەتیدەکەنەوە:**

١- ئەوانەی بانگەشەی ئەم خەمڵێنراوانە دەکەن هیچ بەڵگەیەکیان لەسەر ڕاستی ئەو خەمڵێنراوانە نەخستۆتەڕوو.

٢- نەبوونی ڕەها (هیچ شتێك) کە ئەوان بانگەشەی بۆ دەکەن، بەوەی کە گەردوونی لێ پەیدابووەتوانا و پاڵنەری نییە بۆ ئەوەی شتێك بەرهەم بێنێت، خۆ ئەگەر گریمانەی ڕووداني ئەوەش بکەین ئەوا هەر ناکرێ نەبوونێکی ڕەها بێت.

٣- کێشەی گەورەی بێباوەڕان ئەوەیە، کەوا بیردەکەنەوە ئەگەر بڵێن (خودا بەدیهێنەرە) لەگەڵ (ڕێبازی زانستی) تێکدەگیرێت. ئەگەر وایە ئایا درووستبوونی شتێك لە هیچەوە و بەبێ هۆکار لەگەڵ ڕێبازی زانستی تێکناگیرێت؟ ئەمە زانست وێران دەکات، کە بەدوای پەیوەندی نێوان هۆ و ئەنجامدا دەگەڕێت. بە تەنیا گوتنی ئەوەی کە ئەم شتە تەنیا ڕوویداوە، کۆتایی بە بیرکردنەوە و شیکردنەوەی لۆژیکیانە دێنێت.

٤- مرۆڤەکان (بە درێژایی مێژوو و جوگرافیا) بە سروشتی دەرك بەوە دەکەن کە (هەموو ئەنجامێك هۆکارێکی هەیە)، ئەمەش پێی دەگوترێ (پەیوەندی نێوان هۆ و ئەنجام Law of Cause and effect). بۆیە گوتنی ئەوەی کە گەردوونی

---

پاشان ئەو کاتە خەیاڵییەی لە دانانی ژمارە خەیاڵییەکان لە هاوکێشەکانی هۆوکینگدا پەیدا بووە، هیچ تیمەتێکی نییە و، پێچەوانە دەبێتەوە بۆ کاتی ڕاستەقینە، ئەگەر ژمارە خەیاڵیەکە بگۆڕدرێت بۆ ژمارەی ڕاستەقینە، ئەو کات پێویستی بۆ (بەدیهێنەری یەکەم) دەردەکەوێت.

درووستکراو (سەرەتایەکی هەیە) و بەدیهێنەر و سەرچاوەیەکی پێشووی نییە، ئەمە ئەزموونێکی نوێ و تاکە ئەزموونی مرۆڤایەتییە لەو بوارەدا!!!

چــوارەم: ئەگەر هەموو بوونێك سەرەتایەکی هەبێت، بەدیهێنەرێکی هەبێت، کەواتە پێویستە بەدیهێنەری سەرەتاش (خودا)بەدیهێنەری هەبێت.

بێباوەڕان بەم بەرهەڵستییەیان هەموو بنەماکانی بیرکردنەوەی لۆژیکی تێکدەشکێنن! جا ئێمە دەڵێین: هەموو بوونەوەرێك بەدیهاتووەو (سەرەتایەکی هەیە) سەرچاوەکە، لە کاتێکدا خودا بەدینەهاتووە.هەر خوا هۆکاری یەکەمینە کە لۆژیك بوونەکەی بە حەتمی دادەنێت و بە ئەو زاتەی بوونەکەی بە واجب دادەنێت بەبێ بەدیهێنەر (واجب الوجود دون موجد).

لەبەر ئەوە هەندێك لەبێباوەڕان داندەنێن کە ئەگەر - گریمان - سەلماندیان هۆکاری یەکەم هەیە، ئەوان لەگەڵ باوەڕداران هاوڕ دەبن کە دەبێ ئەم هۆکارە سەرمەدی بێت (نە سەرەتای هەبێت، نە کۆتا)و، بەدیهێنەری نەبێت.

پێنجــەم: ئەگەر هەر پێویست بێت بەدیهێنەری یەکەم هەبێت، ئایا پێویستە خودا بێت؟.

وەڵامی ئەو پرسە نکۆڵیکارییە دەدەینەوە، بەوەی سیفاتەکانی بەدیهێنەری یەکەم دەخەینەڕوو، بە لایەنی کەمەوە پێویستە بەدیهێنەری یەکەم:

١- دەبێ بوونی پێویست بێت - واجب الوجود - The Necessary being: چونکە ڕێناکردنی نەبوونی لە کاتێکدا بەدیهێنەری یەکەمە، ئەوەی بە دوادا دێت کە ئێمە و گەردوون بوونمان نەبێت.

٢- بوونەکەی پێویستی بە هۆکار نییە Uncaused: ئەمەش شتێکی سروشتییە، چونکە ناکرێ لە سەرچاوەی بوونەوەر بۆ ناکۆتایی بڕۆین[1] لەبەر ئەوە ناکرێ بەدیهێنەری یاسای هۆکار بچێتە ژێر باری یاساکەی خۆیەوە.

---

(١) زانایانی لۆژیك چەمکی (ڕیزبەستن ڕێگرە) بەکاردێنن.

٣- ئەزەلی Eternal: ئەگەر کات لەگەڵ تەقینەوە گەورەکەدا درووستبووە، ئەوا پێویست دەکات کە بەدیهێنەری یەکەم، کە کاتی درووستکردووە لە دەرەوەی کات بێت (ئەزەلی - بێ سەرەتا).

٤- نامادەی، شوێن سنوورداری ناکات: مادده و شوێن (لەگەڵ درووستبوونی کاتدا) لەگەڵ تەقینەوە گەورەکەدا درووستبوون، پاشان ناکرێ هۆکاری یەکەم لەناو مادده و شوێندا بێت، لە کاتێکدا ئەو خۆی بەدیهێناون.

٥- ڕەهایی توانا Omnipotent: ئەگەر بەدیهێنەری یەکەم توانای بەدیهێنانی هەبێت لە نەبوونەوە، ئەوا گومان لەوەدا نییە، کە توانای ئەنجامدانی هەر شتێکی هەیە.

٦- رەهایی زانیاری Omniscint: پێویستە بەدیهێنەری بوون زانیاری تەواوی دەربارەی بوونەوەرەکانی هەبێت و، دەربارەی هەموو ئەو شتانەش کە لە گەردووندا ڕوودەدەن.

٧- توانای بڕیاردانی هەبێت Decision maker: ئەگەر بێباوەڕان بڵێن سەرەتای بەدیهاتنی گەردوون کردارێکی خۆکردی بوو بۆ باروودۆخێکی پەیدابوو، ئەوا پێویستە بۆمان ڕوون بکەنەوە کە چۆن باروودۆخ لە نەبوونی ڕەها پەیدا دەبێت، هەروەها بۆچی باروودۆخەکە پێش ١٣،٧ ملیار ساڵ پەیدابوو دوای ئەوەی نەبوون بە ئەزەلی جێهێڵدرابوو(ئەم بەڵگەیە بە بەڵگەی ماوەی وازلێهێنان ناسراوە). لەڕاستیدا بوونی گەردوون سەرەتای هەیە کە لە کاتێکی دیاریکراودا درووست بووە، دوای ئەوەی کە نەبوونی ڕەها ئەزەلی بوو، پێویستی بە بوونی (هۆکارێکی یەکلاکەرەوە)هەبوو کە لەسەر کۆتاییهێنان بە ماوەی وازلێهێنان بڕیارێك بدات و لەم کات و ساتەدا گەردوون بێنێتە بوون.

ئەمانە کەمترین ئەندازەی ئەو سیفەتانەن کە پێویستە لە بەدیهێنەری یەکەمدا هەبێت، ئایا تۆش واینابینی کە ئەم سیفەتانە تەنیا لە خودای بەدیهێنەر، دانا، بەتوانا، قەدیم و ئەزەلیدا بوونیان هەیە و لەو سروشتەدا بوونیان نییە کە دەرەنجامی کات و شوێن و وزە و ماددەیە و هەموو ئەوانەش درووستکراون و پێویستییان بە بەدیهێنەر هەیە.

باشە، بۆچی یەك خودا و چەند خودا نا؟، بەم شێوەیە هەندێك بێباوەڕان قسە دەکەن.

لەوانەیە ئەم پرسیارکردنە قبوڵکراو بووبێت بەر لەوەی زانستی نوێ یەکێتی بنچینەی گەردوون بسەلمێنێت لە زەڕەوە تا گەلەئەستێرە، تەواوی بوونیش لەلایەن چوار هێزەکەی سروشتەوە بەڕێوە دەبرێن و یاساکانی یەکێك دەیانجوڵێنن، بە هەمان شێوە یاسا لۆژیکییەکە دەڵێت کەدەکرا بابەتەکە بە شێوەیەکی سادەتر لێکبدرێتەوە، جا پێویست ناکات پەنا ببەینە بەر لێکدانەوەی ئاڵۆز، باشە بۆچی یەك خودایی ڕەتبکەینەوە و پەنا ببەینە بەر چەند خودایی، کە تێکەڵی و ئاڵۆزییەکی لێ پەیدا دەبێت ئەوانەی باوەڕیان بە یەك خوا هەیە دەیزانن!

**شەشەم: خودای پڕکردنەوەی بۆشاییەکان God of the Gaps :**

بێباوەڕان وایدەبینن کە داننان بە خودای بەدیهێنەری گەردوون، وەك دەرەنجامی کۆتایی بۆ هەردوو پێشەکی بەڵگەی گەردوونی، قۆستنەوەیەکی هەڵەیە بۆ بێتوانایی زانایان (تا ئێستا) لە وەڵامدانەوەی هەموو پرسیارەکان و، بێباوەڕان جەخت لەسەر بۆچوونی خۆیان دەکەنەوە، بەوەی کە زانست ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لێکدانەوە بۆ ئەو پرسانە پێشکەش دەکات کە پێشتر خەڵك بە کاری خوداییان دادەنان، هەروەك چۆن بەکتریاکانی وەك هۆکاری نەخۆشیەکانی گواستراوەیان دۆزییەوە، پاشان ناکرێت هەر بۆشاییەك دەرکەوت کە زانست نەیتوانی پڕی بکاتەوە پەنا ببەینە بەر پڕکردنەوەی بە توانای خودایی.

با ئەو بانگەشەیە وەلانێین، با چاوێك بە بەڵگە سەرەکیەکاندا بخشێنینەوە کە بەڵگەی گەردوونی لەسەر بنیاتنراوە، بۆ ئەوەی بزانین ئاخۆ زانست لە ئاییندەدا دەتوانێت دەروازەیەك بدۆزێتەوە، یان ئەوە ڕاستییە ڕەهاکەیە.

**ئـایـا زانست لە ئاییندەدا دەتوانێت ئەوە بدۆزێتەوە کە:**

١- گەردوون هیچ سەرەتایەکی نییە و لە ئەزەلەوە بوونی هەیە؟...نەخێر

٢- ئەو گەردوونەی کە سەرەتایەکی هەیە دەکرێ لە نەبوونی ڕەها خۆ کردانە درووست ببێت؟... نەخێر

٣- هۆکاری یەکەمی بوونی گەردوون دەکرێ هۆکاری ماددی بێت؟...نەخێر

واتا داننان بە بوونی بەدیهێنەرێکی زیرەك تەنیا پڕکردنەوەی بۆشایی نییە، یان چارەسەرێکی کاتی نییە بۆ ئەو پرسانەی ناتوانین لێکدانەوەیان بۆ بکەین. بۆیە لە کۆتاییدا جەخت لەسەر ئەوە دەکەینەوە کە ڕەتکردنەوەی لێکدانەوە ماددیەکان لەسەر بوونی کەموکورتی لە زانیاری زانستی (نەزانی) بنیات نەنراوە بەڵکو ڕەتکردنەوەیەکی بە زانیارییەوەیە[1].

پێشتر ئەوەمان ڕوونکردەوە کە داننان بە بوونی خودا بۆ ئەوە نییە لێکدانەوە بۆ شتێك بکەین کە زانست نەیکردووە بەڵکو بۆ لێکدانەوەی ئەو شتانەیە کە زانست شیکردوونەتەوە.

سبحان الله! لەسەدەی شازدەهەمدا پیاوانێك دژی زانست وەستانەوە چونکە دەترسان کە لەگەڵ بوونی خودا تێکبگیرێت، لە ئێستاشدا بیردۆزە زانستییەکان ڕەتدەکرێنەوە لەترسی ئەوەی بەڵگەی سەلماندنی بوونی خودا بەهێزتر بکات!

---

(١) با واتای ڕەتکردنەوەی بە زانیارییەوە ڕوون بکەینەوە، با نموونەیەك بێنینەوە، دەڵێین: ئەگەر دوای لێکۆڵینەوەیەکی گشتگیر بۆ پێکهاتەی لەشی مرۆڤ و فەرمانەکانی بگەینە ئەو دەرەنجامەی کە مرۆڤ ناتوانێت بفڕێت، مەگەر ئامرازێك بەکاربێنێت کە یارمەتی فڕینی بدات، ئایا دەکرێت کەسێك ڕەخنە بگرێت و بڵێت: نا. لەوانەیە زانست دوای ماوەیەك ئەوە بدۆزێتەوە کە مرۆڤ دەتوانێت بەبێ ئامرازی یاریدەدەر بفڕێت. ئایا ڕەتکردنەوەمان بۆ بوونی ئەو قسەیەمان دەگەڕێتەوە بۆ بوونی کەموکورتی لە زانیارییەکانماندا (نەزانی) یان ڕەتکردنەوەیەکی بە زانیارییە؟.

## بەڵگەی ڕێکخستنی ورد The Fine Tunning Argument :

((وردی بنچینەی گەردوون و یاساکانی بەڵگەن لەسەر بوونی خودای بەدیهێنەر))

کاتێك کۆپەرنیکۆس ڕێگای زانستە فەلەکییەکانی ڕاستکردەوە و سەلماندی کە زەوی جێگیر نییە و چەقی گەردوون نییە و دامەزراوە نوێکەی بەوە وەسف کرد، کە: ((زەوی هەسارەیەکی کلاسیکییە، بە دەوری ئەستێرەیەکی کلاسیکیدا دەسووڕێتەوە، دەکەوێتە باڵی یەکێك لە گەلەستێرە کلاسیکییەکانیشەوە)). دەستەواژەی (کلاسیکی) کە کۆپەرنیکۆس چەندبارەی کردۆتەوە، واتا بنچینەی گەردوون و ئەو هێزانەی بەڕێوەی دەبەن و خاسیەتەکانی هەسارەی زەوی بابەتی ((سادەن))! ئایا کۆپەرنیکۆس گەیشتۆتە حەقیقەت؟

**گەردوونێکی جێگیری ڕێکخراو، کە شیاوی تێگەیشتن و پێشبینیکردنە:**

من زۆر بۆچوونەکانی ئەنیشتاین بە نموونە دێنمەوە، چونکە بەڕاستی لەلای من پێگەیەکی بەرزی هەیە و پێویستە لە بەڵگەکانی بێئاگا نەبین:

((ئەوەی لە هەموو شتێك یاخیترە بۆ تێگەیشتن لە گەردوون بریتییە لەوەی کە قابیلی تێگەیشتنە))[1]، ئەنیشتاین قسە لەسەر ئەم (شیاوییە) دەکات و دەڵێت((لەوانەیە سەرت بسووڕمێت لەوەی کە من شیاوی گەردوون بۆ تێگەیشتن وەك موعجیزەیەکی ناڕوونی هەمیشەیی دادەنێم. ئەمەش لەبەرئەوەی کە گەردوونێکی نارێك ناکرێت ڕووداوەکانی یان ئاڕاستەکانی بزانرێت، ئەمەش ئەنجامێکی بەدیهییە کە پێویستە بەدوای تەقینەوە گەورەکەی گەردووندابێت. سیستەم و شیاوی بۆ تێگەیشتن و پێشبینیکردن کە بیردۆزی کێشکردنی نیوتن

---

(١) The most Incomprehensible Thing in the Universe is that it is Comprehensible

- بۆنموونە - دەریدەخات بەتەواوی شتێکی سەرسوڕهێنەرە، ناکرێ لە سیناریۆی سەرەتای دروستبوونی گەردووندا پێشبینی بکرێت، ئەمە موعجیزەیە کە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ و لەگەڵ پێشکەوتنی زانست و زانیاری بۆمان دڵنیاتر دەبێتەوە)).

پۆڵ دیڤیز قسەی زیاتر دەخاتە سەر ئەو قسانە و دەڵێت: ((ئەوەی زیاتر موعجیزەیە ئەوەیە کە شیاویی گەردوون بۆ تێگەیشتن زۆر بە وردی دەچێتە ژێر پەیوەندییە بیرکارییەکانەوە)). گومان لەوەدا نییە کە هەندێك کەس دەڵێن یاساکانی سروشت بەشێوەیەکی بیرکاریانە ڕێکخراون، چونکە هیچ چەمکێك لە چەمکەکان بە یاسای سروشتی دانانرێت مەگەر بە شێوەیەکی بیرکاریانە ڕێکخرابێت. لە وەڵامی ئەوانەدا دەڵێین: گەیشتن بە زۆرێك لە یاسا و بیردۆزەکان((وەك بیردۆزی ڕێژەیی)) بە حیساباتی بیرکارییانەی ورد پێیگەیشتووین، ئەمە بەڵگەکەتان بەرلەوەی لە جیهانی واقیعدا ببینرێت دووری دەخاتەوە، پاشان بۆمان ئاشکرابووە کە واقیع لەگەڵ حیساباتەکانماندا دێتەوە، کەواتە زانایان ئەو شتانەیان هەڵنەبژاردووە کە لە واقیعدا بە ڕێکخراویی بوونی هەیە تا یاسایەك یان بیردۆزێکی لێ درووست بکەن.

گەورە زانای فیزیایی سێر ڕۆجەر پینرۆز[1] لە سەرچاوەی پەیوەندی نێوان فیزیا و بیرکاری ورد دەبێتەوە و دەڵێت: ((ناتوانم باوەڕ بەوە بێنم کە ئەو بیردۆزە سەرسوڕهێنەرانە لە دەرئەنجامی هەڵبژاردنی سروشتیی خۆکرد Natural Selection بە هەڵبژاردنی بیرۆکەی گونجاوتر لەنێو چەند بیرۆکەیەکدا پەیدابووبن، چونکە گونجاوترین بیرۆکە بریتییە لەوەی کە زۆر گونجاوە! The Good Ideas are Too Good بە جۆرێك کە ناکرێ بدرێنە پاڵ خۆکردیی، پێویستە عەقڵێکی لەڕادەبەدەر زیرەك بیرکاری و فیزیا بەیەك بگەیەنێت و وامان لێبکات بیرکارییانە لە جیهانی فیزیا تێبگەین، تا وای لێهاتووە کە ڕێکخراویی گەردوون بۆتە بەدیهییاتی سەرەتایی زانست کە بۆی بەدوای لێکدانەوەدا ناگەڕێین، ئەوە جۆرێکە لە باوەڕ کە زانایان پەیڕەوی دەکەن)).

---

(١) Sir Roger Penrose: مامۆستای فیزیای بیرکاری بەریتانی لە زانکۆی ئۆکسفۆرد لەساڵی ١٩٣١ لەدایك بووە.

گەورە زانای فیزیا و خاوەنی خەڵاتی نۆبڵ یوجین وینگەر[1] هەمان واتا دووپات دەکاتەوە و دەڵێت: (شوێنکەوتنی جیهانی فیزیا بۆ بیرکاری بەم شێوازە وردە کارێکی سەرسوڕهێنەرە، کە لێکدانەوەی بۆ ناکرێت، ناکرێ بەهیچ جۆرێکیش بدرێتە پاڵ ڕێکەوت، پێویستە وەك پرسێکی باوەڕپی تایینی قەبوڵی بکەین.

هەروەها ئالان سانداج[2] باوکی فەلەکناسیی نوێ دەڵێت: ((من وایدەبینم کە بەهیچ جۆرێك ناکرێت سیستەمی گەردوون بەشێوەیەکی خۆکرد لەم ناڕێکخراوییە پەیدابوویێت، پێویستە ڕێکخەرێك بوونی هەبێت. ئەگەر خودا لەلای من ناڕوون بێت، بەڵام لەلام تاکە لێکدانەوەیە بۆ ئەو ڕێکخراوییە و بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارەی کە بۆچی نەبوون کۆتایی هات و بوون دەرکەوت)).

پاشان، زانستە فەلەکییە نوێیەکان زۆر لەگەڵ وەسفی کۆپەرنیکۆسدا تێکدەگیرێن، بەوەی کە گەردوونی بە((کلاسیکی سادە))وەسفکردووە.

ئەم زانستانە سەلماندوویانە کە درووستبوونی گەردوون و مانەوەی لەسەر ئەم شێوەیەی کە ئێستا لەسەریەتی و پاشان دەرکەوتنی ژیان لەسەری، پێویستی بە چەندان کرداری ڕێکخستنی زۆر و زۆر ورد هەبووە، کە پێویستی بە شیکردنەوە هەیە.

---

(١) Eugene Winger: (١٩٠٢-١٩٩٥ز) زانای فیزیا و بیرکاری مەجەری - ئەمریکی.

(٢) allan Sandage: (١٩٢٦-٢٠١٠ز)زانای فەلەکناسی ئەمریکی دۆزەرەوەی ئەستێرە تریەدارەکان Quasars و خاوەنی خەڵاتی Crafuurd Prize لە فەلەکناسیدا، کە بەرامبەر خەڵاتی نۆبڵە.

**ئێستاش چەند نموونەیەکی ئەو ڕێکخراوییە ناکلاسیکییە دەخەینەڕوو:**

## بنچینەی جێگیریی گەردوون:

لە کتێبی (تەنیا شەش ژمارە Just Six Numbers)دا، سێر مارتن ریز[١] Sir Martin Rees (گەورەزانای گەردوونناسی ئینگلیزی) بەشە بەهای ژمارەیی دیاریدەکات، کە بەرپرسن لە خاسیەتەکانی گەردوون کە بە تەواوی گونجاوە بۆ دروستبوونی ژیان و بەردەوامبوونی و، ریز ئەوە ڕووندەکاتەوە کە بچوکترین گۆڕانکاری لەو بەهایانەدا بوونی گەردوون بەو شێوەیەی ئێستا دەکاتە شتێکی مەحاڵ[٢].

---

(١) Sir Martin Rees: گەورە زانای فیزیایی و فەلەکناسی بەریتانی، لەساڵی ١٩٤٢ز لەدایك بووە

(٢) ئەو ژمارە نەگۆڕانەی ریز دیاری کردوون بریتین لە:

یەکەم: کشانی گەردوون لە دوای تەقینەوە گەورەکە (تا ئێستا) بە بزوێنەری سەرەکی قۆناغەکانی دروستبوونی دادەنرێت، کە بووە هۆی ساردبوونەوەی گەردوون و ئەو ڕووداوانەی بە دوایدا هاتن.
کەواتە ئەگەر ئەو هێزەی گەردوون دەکشێنێت بەهێزتر بووایە لە ئەندازەی ئێستای، ئەوا گەردوون بەسەر خۆیدا دەڕوخا، ئەگەر بەهێزتریش بووایە، ئەوا گەلەستێرەکان پەیدا نەدەبوون.

دووەم: گەلەستێرەکان لە دەرئەنجامی زۆربوونی چڕی ماددەی گەردوون لە هەندێك ناوچەدا جیاواز لە شوێنەکانی تری گەردوونی نوێدا زیاتر بوو، بە ئەندازەی ١:١٠٠،٠٠٠ کە بووە هۆی دابینکردنی ماددەی پێویست بۆ دروستبوونی گەلەستێرەکان لەو ناوچانەدا.
ئەگەر ئەو ڕێژەیە لەو ئەندازەیە کەمتر بووایە، ئەوا گەردوون هەر لە دۆخە گازییەکەیدا دەمایەوە و، ئەگەر ماددەی گەردوون چڕتر دەبوو و، دەبوو بە کونە ڕەشەکان و هەموو ماددەی گەردوونی قوت دەدا.

سێیەم: ئەگەر ئەندازەی هێزی کێشکردن کە خولگەکان بە یەکەوە گرێدەدات لە ئەندازەی ئێستا زیاتر بوایە، ئەوا گەردوون بەرلەوەی ژیانی تێدا دروست ببێت بەسەرخۆیدا دەڕووخا، ئەگەر لەو ئەندازەی ئێستاش بێهێزتر بوایە، ئەوا گەلەستێرە و ئەستێرەکان دروست نەدەبوون. هێزی کێشکردن بە وردی ڕێکخراوە کە ١:١٠٠،٠٠٠تێدەپەڕێنێت.

چوارەم: ئەندازەی وزەی بەردەست بۆ بەیەکەوە بەستنەوەی ناوکی گەردیلەی هیلیۆم لەناو ئەستێرەکاندا (وزەی ناوەکی بەهێز):

سەرچاوەی وزە کە ئەستێرەکان (وەك خۆر) دەریدەکەن، یەکگرتنی ناوکی ئێوان گەردیلەکانی هایدرۆجینە

مارتن ریز ئەوەی دڵنیا کردۆتەوە کە بەهای ئەم شەش نەگۆڕە هیچیان لەسەر ئەوی تر ناوەستێت، پاشان ناکرێت بانگەشەی ئەوە بکرێت، کە بوونی یەکێك لەم نەگۆڕانە بەڕێکەوت بەشێوەیەکی خۆکرد بۆتە هۆی نەگۆڕەکانی تر بە بەها گونجاوەکانیان.

سەرەڕای ئەم شەش نەگۆڕە کە ریز لە کتێبەکەی خۆیدا خستوویەتیەڕوو توێژەران دەیان نەگۆڕی تریان خستۆتەڕوو کە ئەگەر بوونیان نەبوایە گەردوون و ژیان بوونیان نەدەبوو[1].

---

و ٠,٠٠٧٪ لەو وزەیە بۆ بەیەکەوە بەستنەوەی پێکهاتەی ناوکی گەردیلەی هیلیۆم، کە لە ئەنجامی ئەو بەیەکەوە گرێدانە درووستبووە. ئەگەر چینی گەردیلەیی هایدرۆجینی بۆ بەرهەمهێنانی ئەو وزەیە ٠,٠٠٦٪ یان کەمتر بوایە، ئەوا خۆر نەیدەتوانی گەرمی و ڕووناکی خۆی بڵاوبکاتەوە. هەروەها ئەگەر ڕێژەکەی ٠,٠٠٨٪ یان زیاتر بویە، ئەوا ئەو هایدرۆجینەی لە گەردووندا هەیە کۆتایی دەهات، کە سەرچاوەی وزەکەیەتی.

بە کورتی، ئەگەر ڕێژەکە ٠,٠٠٦ بێت لە جیاتی ٠,٠٠٧ ئەوا جگە لە هایدرۆجین هیچ لە گەردووندا بوونی نابێت، ئەگەر ببێتە ٠,٠٠٨ ئەوا بە هیچ جۆرێك هایدرۆجین بوونی نابێت.

پێنجەم: بەندە کارەباییەکان Electrical Bonds (بەندی ئایۆنی و بەندی هاوبەش) کە گەردیلەکان بەیەکەوە دەبەستنەوە بۆ پێکهێنانی پرۆتۆن بە ئەندازەیەکی زۆر زیاترە لە هێزی کێشکردنی نێوانیان Gravitational force.

هەر کەموکورتیەك لە نێوان هەردوو هێزەکەدا، زۆر لە تەمەنی گەردوون کەمدەکاتەوە و، قەبارەی گەورەترین گیانلەبەر بۆ قەبارەی مێرووەکان بچوکدەکاتەوە، یان وای لێدەکات گەورە ببێت و بناوسێت تا دەتەقێت.

شەشەم: بنچینەی بۆشایی گەردوونی بە شێوەی سێ دوورییە، کە گونجاوە بۆ ژیان، بەو پێیەی ئەگەر گەردوونەکەمان دوو دووری یان چوار دووری بوایە، ئەوا بۆ ژیان گونجاو نەدەبوو.

(١) یەکەم: لە ساتەکانی سەرەتای دوای تەقینەوە گەورەکەی گەردوون، بەشێك لە وزەی گەردوونە نوێکە گۆڕاوە بۆ تەنۆلکەکانی مادده (کوارك و ئەلیکترۆن) و دژە تەنۆلکەی مادده (دژە کوارك و دژە ئەلیکترۆن)، کە بە یەکگەیشتنی تەنۆلکەکانی مادده و دژەکانی بۆتە هۆی لەناوچوونی هەردووکیان. تەنۆلکەکانی مادده لە دژەکانی زیاتر بوون بە ئەندازەی تەنۆلکەیەك بۆ سێ ملیۆن تەنۆلکە، لەو زیادەیەش لە کوارك و ئەلیکترۆنەکان ئەندازەی پێویستی بۆ درووستبوونی گەردوون فەراهەم کردووە.

دووەم: ئەگەر ئەندازەی بارگەی ئەلیکترۆنەکان (کە لە دەوری ناوکی گەردیلەدا دەخولێنەوە) لەو دۆخەی ئێستای جیاواز بوایە، ئەوا ئەو یەکگرتنە ناوەکییە لە نێوان گەردیلەکانی هایدرۆجین لە ئەستێرەکاندا (لەناویشیاندا خۆر) ڕوونەدەدا و، هیچ وزەیەك لەو ئەستێرانە پەیدا نەدەبوو.

سێیەم: بارستایی پرۆتۆن ١٨٣٦ ئەوەندەی بارستایی ئەلیکترۆنە، ئەگەر ئەو ڕێژەیە گۆڕانکاری بەسەردا هاتبا، ئەوا گەردیلە و تەنۆلکەی مادده بوونیان نەدەبوو.

## ڕێکخستنی ورد وەك ڕێخۆشکردنێك بۆ پەیدابوونی ژیان[1]:

چوارەم: جۆن بارۆ John Barrow بیست و پێنج نەگۆڕی بنچینەیی دیاریکردووە، کە بنچینەی گەردوون لەسەری وەستاوە (وەك ڕووناکی - نەگۆڕی بلانك - سفری گەرمی ڕەها..)، ئاماژەی بۆ ئەوە کردوو کە هەر کەمترکەمیەك لە بەهای یەکێك لەم نەگۆڕانەدا ڕوویبدایە، ڕێگای بەوە نەدەدا کە گەردوون جێگیر ببێت و ژیان درووست ببێت.

(١) بۆ ئەوەی پێویستی پەیدابوونی ژیان بۆ ڕێکخستنی ورد بخەینەڕوو، جگە لە نموونەکانی ڕابردوو دوو نموونە دێنینەوە کە گوزارشت لە وردییە پێویستەکە دەکات:

پێکهاتنی ڕەگەزی کاربۆن کە ڕەگەزێکی پێویستە بۆ ژیان، چونکە کاربۆن بە نەرمیی بەستەرەکانی نێوان گەردیلەکانی ناسراوە، ئەمەش ڕێگای دەدات کە لەگەڵ گەردیلەی ئۆکسجین و هایدرۆجین و نایترۆجین و فۆسفۆر و گۆگرد یەك بگرێت بۆ پێکهێنانی پێکهاتە ئەندامییە زیندووەکانی ماددە، وەك پرۆتینەکان و ترشە ناوکییەکان. ئەگەر کاربۆن بە نزیکترین ڕەگەزەکان لەخۆیەوە لەڕووی سیفاتەوە بەراورد بکەین، کە بریتییە لە سلیکۆن، دەبینین کە ئەوەی کۆتایی ناتوانێت هیچ ئاوێتەیەکی کیمیایی پێکبێنێت، ئەمەش بەهۆی توندی پەیوەندی نێوان گەردیلەکانی.

ڕەگەزی کاربۆ، بە دوو شێواز پەیدادەبێت؛ یەکگرتنی سێ گەردی ڕەگەزی هیلیۆم و، یەکگرتنی گەردێکی هیلیۆم لەگەڵ گەردێکی ڕەگەزی بریلیۆم (هایدرۆجینی قورس) Berillium. زانای بەناوبانگی فەلەکناسی و بیرکاری بەناوبانگ سێر فرێد هۆیڵ، گەیشتە ئەو دەرەنجامەی کە ئەمە پێویستی بە بوونی هاوسەنگی هەیە لە وزەی هەردوو دامەزراوەکەدا، ئەگەر هاوسەنگییەکە بە ئەندازەی ١٪(بە زیادبوون یان بە کەمبوون) بگۆڕێت، ئەوا ڕەگەزی کاربۆن کە بۆ پەیدابوونی ژیان پێویستە درووستنەدەبوو.

نموونەی دووەم، گەورە زانای فیزیایی بەناوبانگ پۆل دێڤیز باسیدەکات، دێڤیز تێبینی ئەوەی کردووە کە ڕێژەی ئەو هێزە موگناتیسییەی ئەلیکترۆنەکانی گەردیلە لە دەوری ناوکدا دەپارێزێت لەگەڵ هێزی کێشکردندا کە بەش و گەردیلە و تەنەکان بۆلای یەکتر ڕادەکێشێت ڕێژەیەکی هەستیارە، چونکە ئەگەر ئەو ڕێژەیە بە ڕێژەی ١×١٠-٤٠ زیاد ببێت، ئەوا تەنیا ئەستێرە بچوکەکان بوونیان دەبێت، بەڵام ئەگەر بە هەمان ئەندازە کەم بکات ئەوا تەنیا ئەستێرە گەورەکان بوونیان دەبێت. لە ڕاستیدا بوونی هەر یەك لە دوو قەبارەکەی ئەستێرەکان بۆ پەیدابوونی ژیان پێویستبوون، چونکە ئەستێرە گەورەکان لە کوورەکانیاندا گەردیلەی زۆر گەرم ڕەگەزە قورسەکانی ماددەی پێویستیان بەرهەمهێنا کە پێویستن بۆ بەشەکانی ماددەی زیندوو، هەرچی ئەستێرە بچوکەکانن ئەوا پێویستن بۆ پشتگیریکردنی ژیان لە هەسارەکانی دەوروبەریان. بەڵام ئایا ڕێژەی ١×١٠-٤٠ زۆر بچوکە؟!

بانموونەیەکت بۆ بێنمەوە: ئەو ڕێژەیە هەمان ڕێژەی دەرفەتی ئەوەیە کە تیرهاوێژێك لەملای گەردوون تیرێك بهاوێژێت و لەولای گەردوون دراوێکی کانزایی بپێکێت؛ واتا لە دووری بیست بلیۆن ساڵی ڕووناکی! نموونەیەکی تر کە زانای فەلەکناس ڕۆس دەیخاتەڕوو، ئەگەر کیشوەری ئەمریکا بە دراوی کانزایی

ئەگەر سەرنجی سەلماندنی بەڵگەی ڕێکخستنی ورد و پەیوەندی بە پەیدابوونی ژیانەوە بدەین، دەبینین کە لە دوو ئاست دایە:

أ- ڕێکخستنی وردی دوو لایەنە: بۆ نموونە با سەرنجی هێزی کێشکردنی زەوی(X) بدەین وەك یەکێك لە نەگۆڕە گرنگەکان بۆ درووستبوونی ژیان. ئەگەر ئەندازەی (X) لەنێوان (٥-١٠٠) دابێت لەکاتێکدا ئەندازەی پێویست بۆ درووستبوونی ژیان مەودایەکی تەسك (٣٠-٣٥)ی بوێت، پاشان دەبینین کە ئەندازەی (X)ی واقیعی بریتییە لە (٣٢)، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ڕێکخستنێکی ورد هەیە لە هەردوو لاوە:

- ئەندازەی (X)ی گونجاو بۆ درووستبوونی ژیان (٣٠-٣٥) دەکەوێتە ناو مەودای ڕێپێدراو بۆ هێزی کێشکردنی زەوی (٥-١٠٠).

- ئەندازەی کێشکردنی واقیعی (٣٢) دەکەوێتە ناو مەودای ڕێپێدراو بۆ درووستبوونی ژیان (٥-١٠٠).

لەبەرئەوە ناوی ڕێکخستنی وردی دوو لایەنەمان لەم نموونەیە نا.

ب- ڕێکخستنی وردی یەك لایەنە: ئەگەر ئەندازەی (X)ی پێویست بۆ درووستبوونی ژیان بریتی بێت لە(٣٢) و کەمترین ئەندازەش بۆ درووستبوونی ژیان بریتی بێت لە(٣٠)، لەکاتێکدا کە نازانین بەرزترین ئەندازە چەندە، هەروەك چۆن نەمانزانی کە مەودای ڕێپێدراو بۆ هێزی کێشکردنی زەوی چەندە، ئەمە ڕێکخستنی یەك لایەنەیە.

زانا فیزیاییە بیرکارییەکان وای دادەنێن کە ڕێکخستنی یەك لایەنە بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر بە سەلماندنی بەڵگەی ڕێکخستنی ورد، بەڵگەی دوو لایەنە لەپێشترە و واقیعی حاڵە لە نەگۆڕە فیزیاییەکاندا.

---

داپۆشین بە بەرزییەك کە بگاتە مانگ (٣٨٠٠٠٠کم) و هەمان شت لە بلیۆن کیشوەری هاوشێوەدا دووبارە بکەینەوە، پاشان یەکێك لەو دراوانە بە ڕەنگێکی جیاواز ڕەنگ بکەین، ئەوا هەلی ئەوەی کە کەسێکی چاوبەستراو ئەو دراوە هەڵبژێرێت بریتییە لە ١×١٠-٤٠.

رۆبن کۆڵینز[1] کاریگەری جێگیریی بەهاکانی ئەم نەگۆڕە گەردوونیانەی بەیەکەوە تورێژیوەتەوە بۆ دەرکەوتنی توانای بەدیهێنانی ژیان لە گەردووندا بەرێکەوت، دەرکەوت کە ئەگەرەکە بریتییە

لە ١×١٠-١٢٣ کە ئەمەش ژمارەیەکی زۆر کەمە و ناکرێ وێنا بکرێت!! تەنانەت مەحاڵە بشنووسرێت! ئەگەر لەسەر هەر تەنێکی گەردوون سفرێك دابنێین ئەوا ١٠٨٠ سفرمان دەبێت کە ژمارەی تەنۆلکەکانە لە گەردووندا.

سێر فرید هۆیل قسە لەسەر ڕێکخستنی ورد دەکات و دەڵێت: هیچ شتێك بێباوەڕییەکەمی نەلەرزاند وەك ئەوەی کە زانیم کە هیچ هێزێکی کوێرانە لە سروشتدا بوونی نییە، وەك هەندێك لە ماددیگەراکان گومان دەبەن، بەڵکو زیرەکییەکی بەرز بوونی هەیە کە کیمیا و فیزیا و بایۆلۆجیا تێکەڵ بە یەکتر دەکات.

ئەوەی خستمانەڕوو دەربارەی چەمکی (ڕێکخستنی ورد) لەسەر ڕاستی زانستی باوەڕپێکراو لەلای زۆربەی زانایانی فیزیا و فەلەکناسیدا چەسپاوە، ئەگەرچی هەندێکیشیان لەسەر گرنگترین دەرئەنجامەکانی ناکۆکن، ئەوانەی ئاماژەن بۆ بوونی خودا.

ئایا هێشتا گومانێك بوونی هەیە لەسەر ئەوەی کە گەردوون بەشێوەیەکی دانایی و زیرەکیی ڕەها ڕێکخراوە تا بێتەبوون و بەردەوام بێت و شیاوبێت بۆ دەرکەوتنی ژیان؟

---

(١) Robin Collins: مامۆستای فەلسەفە، ئەمریکییە. ئەو بابەتەی لە بەناوبانگترین کتێبیدا Evidence for fine tunning خستۆتەڕوو.

## بنچینەی مرۆیی Anthropic Principle :

((گەردوون بە جۆرێك درووستكراوە، كە بە تەواوی گونجاوە بۆدرووستبوونی ژیان و دەركەوتنی مرۆڤ)).

زانا فیزیاییە باوەڕدارەكان وایدەبینن كە بنچینەی گەردوون زۆر لەگەڵ پێداویستییەكانی مرۆڤدا گونجاوە. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئامانجدارێتی Teleology، بەو واتایەی كە خودا گەردوونی بەم شێوەیە درووستكردووە تا بۆ ژیان بە گشتی و ژیانی مرۆڤ بە تایبەتی گونجاو بێت. ئەم چەمكەش بە چەمكی بنچینەی مرۆیی[1] Anthropic principle ناسراوە.

زانا باوەڕدارەكان بە دارشتەی بەهێز گوزارشتیان لە بنچینەی مرۆیی كردووە، گوتوویانە: ((چۆن گەردوونێكی خاڵی لە ئامانجدارێتی دەتوانێت مرۆڤێك درووست بكات كە ئامانجدارێتی بیجووڵێنێت؟))[2].

هەروەها هەریەكە لە جۆن گریبن John Gribbin و مارتن ریز Martin Rees[3] باسیان لەم دەستەواژەیە كردووە: (وا دەردەكەوێت كە وردەكاری گەردوون

---

(١) یەكەم كەس كە ئەم دەستەواژەیەی بەكارهێنا براندۆن كارتەر Brandor Carter بوو لە ساڵی ١٩٧٣، كە زانایەكی فیزیایی بەریتانیە، لە زانكۆی كامبریدج مامۆستایە.

(٢) سێر جۆن تێمپڵتۆن: (١٩١٢-٢٠٠٨ز) بلیۆنێری ئینگلیزی، یەكێك بوو لە گەورە بازرگانەكان، دامەزراوەی تێمپڵتۆنی دامەزراند خەڵاتی تێمپلتۆن Templeto prize: خەڵاتێكە دامەزراوەی تێمپلتۆن لە ویلایەتە یەكگرتووەكان لە ساڵی ١٩٧٣ وە دەیبەخشێت.
ئەو خەڵاتە بۆ ئەو دۆزینەوە و توێژینەوە زانستانەیە كە خزمەتی لایەنەكانی ئاین و ڕۆحانیەت دەكەن، دوای ئەوەی هەستیانكرد خەڵاتی نۆبڵ ئەو لایەنەی پشتگوێ خستووە. نرخەكەی ٦،١ ملیۆن دۆلارە (لە خەڵاتی نۆبڵ بە نرختره كە ٢،١ ملیۆن دۆلارە).

(٣) زانا فیزیاییەكانی ئەم بەشەمان لە پەراوێزی باسی حەوتەم لە بەشی یەكەم ناساندوون.

بە پێی ئەندازەی مرۆڤ داڕێژراوە[١] Tailor - made for man)). هەروەك چۆن فریمان دیسۆن Freeman dyson باسی لە هەمان واتا کردووە دەڵێت: ((وا دیارە گەردوون دەیزانی، کە ئێمە دێین)).

هەرچەند زانیارییەکانمان دەربارەی دروستبوونی گەردوون و بنچینەکەی زیاد بکات، زیاتر ئەندازەی گونجانی ئەم پەیدابوون و بنچینە و گونجانی یاسا گەردوونییە فیزیاییەکانمان بۆ دەردەکەوێت بۆ دەرکەوتنی ژیان و دروستبوونی مرۆڤ. تا ئەو ئەندازەیەی کە دەتوانین بڵێین ئەگەر مرۆڤ لە چەقی ماددی گەردووندا نەبێت، ئەوا بێگومان لە چەقی ئامانجدارێتی گەردووندایە[٢].

## هەسارە جیاوازەکەمان :

ئەگەر گەردوون بۆ دەرکەوتنی ژیان و دەرکەوتنی مرۆڤ ئامادەکرابێت، ئەوا ((هەسارەی زەوی))یش بەشێوەیەکی تایبەت ئامادەکراوە بۆئەوەی ببێتە شوێنی دیاردەی ژیان و لانەی مرۆڤ.

ئەگەرچی هەندێك لە زانایانیش زەوی و ملیۆنان یان ملیاران هەسارە لە گەردووندا یەکسان بکەن و پێشبینی بوونی ژیانێکی عاقڵانە لەسەر زۆرێك لەو هەسارانە بکەن، ئەوا لە بەرامبەردا زۆریان وایدەبینن کە هەسارەی زەوی زۆر جیاواز و تاکە، چ لەڕووی سیفەتەکانی، یان لەڕووی هەسارەکانی دراوسێی، یان شوێنکەوتنی بۆ ئەستێرەیەکی جیاوازی وەك خۆر، یان هەڵکەوتەی جیاوازی

---

(١) ئەمەیان لە کتێبەکەیان (ماددەی گەردوون The stuff of the universe) باسکردووە.

(٢) لە کتێبی The new story of science نووسینی رۆبێرت ئاگرۆس Robert Augros و جۆرج ستانکیۆم George Stancium.

لەناو گەلەستێرەیەکی جیاوازدا هەیە[١]. هەروەها ئەوان وایدەبینن کە زەوی هەسارەیەکە ئەستەمە هاوشێوەی لە گەردووندا هەبێت، بۆیە شایەنی ئەوەیە کە لەڕووی دیاردەی ژیانەوە تاقانە بێت[٢].

**دەربارەی ئەو واتایە وتەی هەندێك لە بلیمەتانی زانستە گەردوونییەکان لەگەڵم بخوێنەوە:**

((یەك هەسارە لە گەردووندا بوونی هەیە کە دەکرێ ژیانێکی زیرەکانەی لەخۆ گرتبێت، لەوانەیە ئەو هەسارەیە بناسن!)) جۆن ئۆ کیف[٣]، باوکی رۆحی توێژینەوەکانی بۆشاییەکانی ئاسمان.

((بەڕاستی هەسارەیەکی ناوازەیە، تاکە هەسارەی ئەم گەلەستێرەیە، بەڵکو لە هەموو گەردووندا، کە بەژیان ئاوەدان بۆتەوە))پیتەر وۆردو دۆناڵد براونلی[٤]، هەردووکیان لە زانکۆی واشنتن - سیاتل مامۆستان.

((مۆزارتێکی تر و بیتهۆڤنێکی تر بوونیان نییە)) دۆن جۆنسۆن[٥] بەڕێوەبەری ناوەندی لێکۆڵینەوە لە بنچینەی مرۆڤ لە زانکۆی ئەریزۆنا.

تاو ناتاوێك لە گۆڕەپانی زانستیدا ئەو پرسیارە نوێ دەبێتەوە کە دەربارەی ئەگەری بوونی ژیان لە شوێنی تری گەردووندا دەکرێت، بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە زانای بۆشاییەکانی ئاسمان( فرانك دراك Frank Drake) هاوکێشەکەی Drak Equation ی (لەساڵی ١٩٦١ خستۆتەڕوو و لەساڵی ٢٠٠٠ دەستکاری

---

(١) بۆ بەرچاوڕوونی زیاتر بگەڕێوە سەر کتێبی هەسارە جیاوازەکە The Privalegd planet کە لەساڵی ٢٠٠٤ دەرچووە.

(٢) سیر فرێد نۆیل Sir Fred Hoyle.

(٣) John A. O Keefe، بە لێکۆڵینەوە لەبارەی ئەگەری بوونی ژیان لە شوێنی تری گەردووندا بەناوبانگ بوو. ئەنجامی توێژینەوەکانی لە کتێبی God and theAstronomers بڵاوکردۆتەوە.

(٤) مامۆستای جیۆلۆجیا Peter Ward و مامۆستای گەردوونناسی Donald Brownlee بۆچوونەکانیان لە کتێبەکەیان Rare Earth دا بڵاوکردۆتەوە.

(٥) Don Johanson دۆزەرەوەی بەناوبانگترین حەفریاتی شێوە مرۆڤەکان؛ لوسی Lucy.

کرا) بۆ حیسابکردنی ژمارەی ئەو ژیارستانییەتانەی دەکرێ لە گەلەستێرەکەماندا پەیدا ببن و لەگەڵ ئێمەدا پەیوەندی ببەستن. دراك گەیشتە ئەوەی کە ئەم ئەگەرە ئەوەندە کەمەنزیکە لەوەی هەر بوونی نەبێت. ئەگەر گریمان رووشبدات ئەوا ئەم ئەگەرە نزیکە لە مەحاڵ. ئایا چەمکە بێباوەڕییەکان پشتگیری لەوە دەکەن؟! ئایا خودا بێتوانایە لە دروستکردن و بەڕێوەبردن و چاودێریکردنی ژیان لەسەر چەند هەسارەیەك؟!

## ئەیارانی بنچینەی مرۆیی :

بەرهەڵستکارانی بوونی خودای بەدیهێنەر وایدەبینن کە بەتەنیا بوونی ئێمە لە گەردووندا بەڵگەیەکی بەدیهییە لەسەر ئەوەی کە بنچینەکەی شیاوە بۆ دەرکەوتنی ژیان و دروستبوونی ئێمە، ئەگەر وانەبوایە ئێمە دروستنەدەبووین، ئەوان گونجانی گەردوون بۆ دروستبوونی ئێمە بەبەڵگەی هیچ پرسێکی غەیبی نازانن، لەبەرئەوە ئەوان بیرۆکەی ئەوەی کە گەردوون بە ئەندازەی مرۆڤ دارێژراوە رەتدەکەنەوە، لەبری ئەوە وایدەبینن کە یاساکانی سروشت مرۆڤیان والێکردووە کە لەگەڵ بنچینەی گەردووندا بگونجێت[1].

بەهەمان شێوە دۆوکنزیش لەکاتی قسەکردنی دەربارەی بنچینەی مرۆیی لە کتێبی (وهم الإله)دا دەکەوێتە هەمان هەڵەوە کە بەردەوام تێیدەکەوێت، ئەویش ئەوەیە کە بانگەشەی ئەوە دەکات کە بوونی بارودۆخ بەسە بۆ ڕوودانی دیاردە. بانگەشەی دۆوکنز بانگەشەیەکی هەڵەیە، چونکە بنچینەی مرۆیی وەك ئەو قسەیەی ئێمە وایە کە دەڵێین: بۆ ئەوەی لەسەر ئاستی قوتابییەکانی کۆلێژی

---

(١) جۆن بارۆ ئەم چەمکەی لە کتێبی گەردوونی سەرسوڕهێنەر The Artful Universe خستۆتەڕوو کە لەساڵی ١٩٩٥ دەرچووە.

پزیشکی زانکۆی (عین شمس)دا یەکەم بێت، ئەوا پێویستە سەرەتا پەیوەندی بە کۆلێژەکەوە بکەی، بەڵام چۆن یەکەم دەبی؟ ئەوە بابەتێکی ترە.

فەیلەسوفی باوەڕدار جۆن لیسلی[1] وەڵامیان دەداتەوە بەوەی کە خودا یاساکانی گەردوون بەکاردەهێنێت بۆ دروستکردنی گەردوون لەسەر ئەو شێوەیەی خۆی دەیەوێت. لیسلی رای ئەوانەی دەڵێن (مادام ئێمە بوونمان هەیە کەواتە گەردوون گونجاوە) بە نموونەیەکی بەناوبانگ ئەو رایە هەڵدەوەشێنێتەوە: وایدابنێ کە کەسێك بڕیاری کوشتنی بەگوللەی بۆ دەرکراوە، دە سەربازی شارەزا لەبەردەمی ریزبوون بۆئەوەی تەقەی لێبکەن، هەریەکەیان گوللەی خۆی تەقاند، بەڵام بەرینەکەوت. ئایا ئەوە بەسە کە بڵێین سروشتییە کە نەیانپێکاوە، بەبەڵگەی ئەوەی کە نەمردووە، یان پێویستە بەدوای هۆکاری سەرنەکەوتنی ئەو سەربازە شارەزایانەدا بگەڕێین لە نەپێکانی پیاوەکەدا. دانانان بە بوونی دیاردەیەك ئەوە رەتناکاتەوە کە پێویستە لێکدانەوەی بۆ بکرێت.

**هەروەها نەیارانی بنچینەی مرۆیی لە دوو شت بێئاگان:**

**یەکەم:** جیهان بەتەنیا بۆ دروستبوونی ژیان ئامادە نەکراوە، بەڵکو بۆ دەرکەوتنی بونەوەری زیندوی زیرەکی لۆژیکی کە تێبینی دەکات و لەو گونجاوییە تێدەگات.

**دووەم:** زۆری ئەو گونجانەی لە گەردووندا بوونی هەیە لەسەرووی پێویستییەکانی زیندەوەرانە و خۆشگوزەرانی و چێژوەرگرتنیان بۆ فەراهەم دەکات، بەتایبەت مرۆڤ کە خاوەنی پێداویستی دەروونی جۆراوجۆرە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە ئەندازەیەکی زۆر کەمتر لە گونجان بەس بوو بۆ دەرکەوتنی ئەو بوونەوەرانە.

دوای هەستکردن بەم دوو لایەنەی گونجان، لایەنگرانی (بنچینەی مرۆیی) ناوی ((بنچینەی مرۆیی بەهێز Strong Anthropic Principle))یان لێناوە، ئەمەش لە بەرامبەر چەمکی (بنچینەی مرۆیی بێهێز) کە تەنیا ئاماژەیە بۆ چەمکی (ئێمە بوونمان هەیە، کەواتە گەردوون گونجاوە).

---

(١) جۆن لیسلی John Leslie: مامۆستای فەلسەفەی زانستەکان لە کەنەدا، یەکێکە لەوانەی باوەڕی بە بنچینەی مرۆیی هەیە. بەناوبانگترین کتێبی بریتییە لە(عەقڵی رەها Infinitle mind) کە لەساڵی ٢٠٠١ز دەرچووە.

## یان خودا یان فرەگەردوونی :

جۆن لیسلی پێمان دەڵێت: گونجانی گەردوون بۆ دروستبوونی ژیان و دەرکەوتنی مرۆڤ دەمانخاتە بەردەم یەکێك لەم دوو ئەگەرانەوە:

**یەکەم:** بوونی خودا، کە گەردوونی ئامادەکردووە بۆ ئەوەی گونجاوبێت بۆ درووستبوونی ژیان و مرۆڤ.

**دووەم:** گریمانەی فرەگەردوونیی Multiverse، کە دیڤید دۆچ[1] دەیخاتەڕوو. بەواتای ئەوەی کە ئەگەری ئەوە هەیە کە ژمارەیەکی بێکۆتایی گەردوون بوونیان هەبێت، کە هەریەکێکیان بارودۆخی فیزیایی هەیە، کە گونجاوە بۆ درووستبوونی گەردوونێکی جیاواز، پاشان لەدوای هەر بارودۆخێکی فیزیایی ژمارەیەك گەردوونمان دەبێت، کەواتە هیچ قورسییەك لەوەدا نییە کە وێنای بوونی گەردوونێکی وەك گەردوونەکەمان بکەین، کە بارودۆخی دەرکەوتنی ژیان و مرۆڤی وەك گەردوونەکەی ئێمەی لەسەر هەیە[2].

---

(١) David Deutch: زانای فیزیایی بەریتانی، لەساڵی ١٩٥٣ لەدایك بووە، ئەم گریمانەیەی لە کتێبەکەی The Fobic Of Reality دا خستۆتەڕوو.

(٢) لایەنگرانی ئەم گریمانەیە وایدەبینن کە دەکرێ گەردوونە جۆراوجۆرەکان لە گەردوونی دایکەوە پەیدابووبن، دەشکرێ بەدوای یەکدا هاتبن (تاك»تەقینەوە گەورەکە»وردو خاشبوونێکی گەورە»تاك»تەقینەوەیەکی گەورە»...بەم شێوەیە).

## هەڵتەکاندنی گریمانەی چەند گەردوونیی :

زانای فیزیای چەندیی جۆن پۆلکینگهۆرن[١] گریمانەی چەندگەردوونیی ڕەتدەکاتەوە، بەوەی کە بەشێکە لە خەیاڵیی زانستیی نەك فیزیا، بەوپێیەی کە لەڕووی زانستییەوە مەحاڵە لێکۆڵینەوە لە بوونی بکرێت، بەهەمان شێوە فەیلەسووف ریچارد سوینبێرن[٢] ڕەخنە لەوە دەگرێت بەوەی کە بوونی تریلیۆن تریلیۆن گەردوون لەجیاتی دانانان بە بوونی خودای بەدیهێنەر کە بەدیهێنەری ئەم ڕێکخراوییەیە بەرزترین پلەی نالۆژیکییەتە.

ئەوەتا زانای فەلەکناس ئێدوارد هاریسۆن[٣] دەڵێت: پێویستە هەڵبژێری؛ یان ڕێکەوتی کوێرانە کە ملیارەها گەردوونی بەدیهێناوە، یان ئەو ڕێکخراویی و دیزایینەی پێویستی بە خودایەك هەیە. هەروەها ئارنۆ بێنزیاس(خاوەنی خەڵاتی نۆبڵ لە فەلەکناسیدا) بە توندی ڕەخنە دەگرێت و دەڵێت: هەندێ کەس لەپێناو ڕاکردنیان لە دانانان بەوەی کە گەردوون بەشێوەیەکی دانایی دروستکراوە، هاتوون دوورترین ئەگەرمان دەخەنە بەردەم کە ناکرێ بخرێتە بەر لێکۆڵینەوە.

دەکرێ هەموو ڕەخنەکانی ڕابردوو لەوەدا کورت بکرێنەوە کە گریمانەی چەندگەردوونیی لەگەڵ بنچینەی کۆدی(موسا) ئۆکام Occams Razer

---

(١) John Polkinghome: زانای فیزیای بیرکاری بەریتانی، لەساڵی ١٩٣٠. لەدایك بووە.

(٢) ریچارد سوینبێرن Richard Swinburne: بەریتانییە لە ساڵی ١٩٣٤ لە دایك بووە. مامۆستای فەلسەفەی شیکاری بوو لە زانکۆی ئۆکسفۆرد و گرنگییەکی زۆری بە فەلسەفەی ئاینەکان و فەلسەفەی زانست دەدا. هەر دوو سێ ساڵ جارێك کتێبێکی فەلسەفی قوڵ بڵاودەکاتەوە. بە شێوازێکی وا دەنوسێت کە خەڵکی ئاساییش تێی بگەن. لە گرنگترین ئەو کتێبانە Is there a God? کە بۆ سەر زیاتر لە ١٢ زمان وەرگێڕدراوە.

(٣) Edward Harisson: (١٩١٩-٢٠٠٧ز)، مامۆستای فەلەکناسی بەریتانی.

Principle تێکدەگیرێت، کە لە کاتی هەڵبژاردنی بیردۆزەکاندا هەوڵ بۆ سادەترین لێکدانەوە دەدات. بەوپێیەی کە گریمانەی بوونی ژمارەیەکی بێکۆتایی گەردوونەکان بەبێ پێشکەشکردنی شیکردنەوە قوورسترین بژاردەیە بە بەراورد لەگەڵ دانانان بە خودایەك کە گەردوونی دیزاین کردووە.

جۆن لیسلی تا کۆتایی لەگەڵ ئەو کۆمەڵە خەڵەفاوە دەڕوات کە باسی چەندگەردوونیی دەکەن، دەڵێت: لە ئەگەری سەلماندنی ئەم گریمانەیەش هێشتا پێویستیمان بە لێکدانەوە هەیە بۆ چۆنیەتی پەیدابوونی ئەم گەردوونانە و بۆچی تەنیا یەکێکیان شیاوی دەرکەوتنی ژیان بووە لەسەری. هێشتا بوونی خودا هەر پێویست دەبێت بۆ ئەنجامدانی هەردوو کارەکە.

تاکە شتێك کە ئەم خەڵەفاوانە کردوویانە ئەوەیە کە پێویستی بوونی خودایان هەنگاوێکی تر بردۆتە پێشەوە. وەك ڕوونکردنەوەیەك بۆ بابەتەکە دەڵێین، خستنەڕووی گریمانەی چەندگەردوونی لەلایەن هەندێ کەس دوای ئەوەی، کە بێتوانابوون لە لێکدانەوەی گونجاویی گەردوونەکەمان بۆ درووستبوونی ژیان و دەرکەوتنی مرۆڤ، وەك هەڵوێستی ئەو قوتابییە وایە کە مامۆستاکە باوەڕی بەوە نەکرد، کە سەگێك دەفتەری ئەرکەکانی قوتابخانەی خواردووە، پاشان قوتابیەکە قوڕەکە خەستتر بکات و بڵێت، کە ژمارەیەك سەگ (کە ژمارەکەیان نەزانراوە) دەفتەری ئەرکەکانی قوتابخانەیان خواردووە!!

## میکانیکای چەندی و فرەگەردوونی :

زانایانی فیزیای نوێ گریمانەی چەندگەردوونی لەژێر ناونیشانی (لێکدانەوەی میکانیکای چەندیی بۆ چەندجیهانی[1]) کە وایدەبینێت(هەر گەردوونێك کە لەڕووی لۆژیکییەوە ئەگەری بوونی هەبێت پێویستە بێتە بوون).

گەورە فەیلەسووفی ئەمریکی ئەلڤین پلاتینگا لەگەڵ ئەو لێکدانەوەیە دەڕوات و دەڵێت: یەك گەردوون کە یەك خودای تێدا هەیە، لە ئەگەرە لۆژیکییەکانە، کەواتە بوونی گەردوونێکی ئاوا - بەپێی میکانیکای چەندیی - بوونی هەیە.

پاشان، ئەگەری چەندگەردوونیی وەك چۆن پلاتینگا باسی کردووە، خۆی خۆی ڕەتدەکاتەوە و دەمانگەیەنێتە یەك گەردوونیی!.

بەهەمان شێوە گریمانەکە پڕە لە قووڕسی لۆژیکی و زانستی و تەنانەت ڕەوشتیش، بێنە بەر چاوی خۆت کە لە گەردوونێکیاندا بکوژ بیت، لە دووەمیان زیناکاربیت، لە سێیەمیاندا بەرتیلخۆربی، لەچوارەمیاندا قەشەبیت، لەپێنجەمیاندا زاهید بیت... هەمووشیان ئەگەری لۆژیکین... ئایا ئەمە بەربەستێکی لۆژیکی ڕەوشتی نییە؟!.

---

(1) The many worlds Interpretation of Quantum Physics

## درووستبوونی گەردوون
## لە قورئانی پیرۆزدا[1]

قورئانی پیرۆز لەوکاتەدا دابەزی کە باوەڕێکی هەڵە باوبوو بەوەی کە ئەو گەردوونەی تیایدا دەژین قەدیم و ئەزەلییە و بۆ تاهەتایە دەمێنێتەوە و گەردوونێکی بێ کۆتاییە و هیچ سنوورێکی نییە. گەردوونێك کە جێگیرە و لە شوێنی خۆی ناجووڵێت. ئەم چەمکانە وایدەبینن کە گەردوون لە چوار ڕەگەزەکە درووستبووە (خاك، ئاو، هەوا، ئاگر)، هەروەها ئاسمان بە ئەستێرە جێگیرەکانیەوە وەك پارچەیەك لەگەڵ خۆیدا بە دەوری زەویدا دەخولێنێتەوە، لەگەڵ چەندین ئەفسانە و خورافیاتی تر.

لەکاتی باوی و بەربڵاوی ئەو چەمکانەدا قورئانی پیرۆز هات، تا ئەوە دڵنیا بکاتەوە کە گەردوون درووستکراوە و سەرەتای هەیە و ڕۆژێ لە ڕۆژانیش کۆتایی دێت. هەروەها ئەوەی دڵنیا کردەوە کە هەموو خولگەکانی ئاسمان لە جووڵەی بەردەوامدان، هەروەها ئاسمان خۆیشی لە فراوانبوونێکی بەردەوامدایە تا کاتێکی دیاریکراو. هەروەك چۆن کە ئاسمانەکان و زەوی لە سەرەتادا یەك تەن بوون بەڵام خودا لەیەکتری جیاکردوونەتەوە، بەمەش ئەم ماددەی تەنی یەکەمە بۆتە دووکەڵ کە زەوی و ئاسمانەکانی لێ درووستبووە.

---

(١) بە دەستکاری و کورتکردنەوە لە (موسوعە الآیات الکونیە فی القرئن الکریم)ی د.زغلول النجار وەرمانگرتووە.

هەروەها قورئانی پیرۆز پێمان دەڵێت کە ئەم گەردوونە دەپێچرێتەوە بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە سەر شێوازی سەرەتای تەنێکی تاك و تەنیا، پاشان ئەم تەنە جارێکی تر دەبێتەوە دووکەڵێك کە زەوییەکی جیاواز لەم زەوییەی ئێستامانی لێ درووست دەبێت و ئاسمانێکی جیاواز لە ئاسمانی ئێستای ژیانی دنیامانی لێ درووستدەبێت، بەمەش گەشتی ژیانی یەکەم کۆتایی پێدێت و گەشتی ژیانی دوارۆژ دەستپێدەکات.

پەروەردگارمان (تبارك وتعالى) کرداری درووستکردنی ئاسمان و زەوی و دووبارە درووستکردنەوەیان لە شێوازێکی گشتگیری تەواودا، پێش زیاتر لە هەزار و چوارسەد ساڵ پێش ئێستا ئەوەی پێ ڕاگەیاندووین و بۆی کورتکردووینەتەوە، بەتەنیا لە شەش ئایەتدا[1] بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- ﴿ وَٱلسَّمَآءَ بَنَيْنَٰهَا بِأَيْيدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾ الذاريات: ٤٧

واتە: (ئێمە ئاسمانمان بەدەستی قودرەتی خۆمان دروست کرد، بەردەوامیش گەورەی دەکەین و فراوانی دەکەین).

ئایەتەکە ئاماژە بۆ کشانی گەردوون دەکات لە ساتی یەکەمی درووستبوونییەوە تا ئەو کاتەی خودا خۆی دەیەوێت.

٢- ﴿ أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا ۖ وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ ۖ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ الأنبياء: ٣٠

واتە: (ئایا ئەیان دی (ئەیان زانیوە) ئەوانەی بێ بڕوا بوون کە ئاسمانەکان و زەوی هەردووکیان پێکەوە لکابوو (یەك پارچە بوون) ئینجا لە یەکترمان جیاکردنەوە وە فەراهەممان هێنا لە ئاو هەموو شتێکی زیندوو، دەی ئایا ئەوانە هەر باوەڕ ناهێنن؟).

---

(١) د.زغلول النجار تەنیا پێنج ئایەتی باس کردووە، ئایەتەکانی سورەتی (یس) نووسەر زیادی کردووە.

ئـایەتەکە ئاماژە دەکات بۆ:

* دەستپێکردنی درووستبوونی گەردوون لە تاکە تەنێکی سەرەتایی (قۆناغی لێکدانی یەکەم).

* جیاکردنەوەی ئەم تەنە سەرەتاییە واتا تەقاندنەوەی (قۆناغی جیاکردنەوەی یەکەم).

٣- ﴿ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِىَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ٱئْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَآ أَتَيْنَا طَآئِعِينَ ﴿١١﴾ ﴾ فصلت: ١١

واتە: (لە پاشان رووی کردە ئاسمان لە کاتێکدا کە دوکەڵ بوو ئینجا بە ئاسمان و بە زەوی فەرموو: وەرن بە ویستی خۆتان یا بە ناچاری (بێنە ژێر فەرمانم) هەر دووکیان وتیان بە ویستی خۆمان هاتین).

ئـایەتەکە ئاماژە دەکات بۆ:

* گۆڕانی تەنی یەکەم لەکاتی جیاکردنەوە(تەقاندنەوەی) بۆ دووکەڵ (قۆناغی دووکەڵ).

* درووستکردنی گەردوون و زەوی (بەتایبەتی) لە دووکەڵە گەردوونییەکە (قۆناغی بەدیهێنانی زەوی و ئاسمانەکان).

٤- ﴿ وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلَّيْلُ نَسْلَخُ مِنْهُ ٱلنَّهَارَ فَإِذَا هُم مُّظْلِمُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلشَّمْسُ تَجْرِى لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا ۚ ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴿٣٨﴾ وَٱلْقَمَرَ قَدَّرْنَٰهُ مَنَازِلَ حَتَّىٰ عَادَ كَٱلْعُرْجُونِ ٱلْقَدِيمِ ﴿٣٩﴾ لَا ٱلشَّمْسُ يَنۢبَغِى لَهَآ أَن تُدْرِكَ ٱلْقَمَرَ وَلَا ٱلَّيْلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِ ۚ وَكُلٌّ فِى فَلَكٍ يَسْبَحُونَ ﴿٤٠﴾ ﴾ يس: ٣٧ - ٤٠

واتە: (ئەویش بەڵگەو نیشانەیە بۆ ئەوان کە ئێمەڕۆژی لێ دەردەهێنین ئینجا لە ناکاودا تاریکی هەموویان دەگرێتەوە * خۆریش بەرەو بنکەی خۆی (لە گەڕاندایەو) دەڕوا ئەوە بڕیار دراوی (خوای) زاڵی زانایە * وە بۆ مانگیش چەند قۆناغێکمان داناوە (دوای تەواو کردنی قۆناغەکانی) هەتا وەکو لقی دار خورمای کۆنی (ووشك بووی) لێ دێت * خۆر بۆی نی یە (ناتوانێ) بگات بە مانگ و شەویش ناتوانێ پێشکەوێ لەڕۆژ و هەر یەکەیان (خۆرو مانگ) لە خولگەیەکدا مەلە دەکەن و دەسوڕێنەوە).

**ئــایەتەکان ئاماژە بۆ کۆمەڵێك خاسیەتی هەسارەی زەوی و ئەستێرەی خۆر دەکەن، کە شوێنکەوتووی ئەون و تەنی مانگ کە شوێنکەوتەمانە، لەنێوان درووستبوونی گەردوون و لەناوچوونی، لەو خاسیەتانەش.**

* زەوی هەسارەیەکی خڕە.

* خۆر ئەستێرەیەکی جووڵاوە و چەقی جێگیری گەردوون نییە.

* مانگ دەچێتە ژێرباری یاساکانی سروشت بۆیە لەسەر مرۆڤ پێویستە لە جووڵەکەی تێبگات و سوودی لێوەربگرێت.

* هەریەکە لە خۆر و مانگ خوولگەی تایبەتی خۆیان هەیە کە تیایدا جووڵە دەکەن.

* تەنە ئاسمانییەکان بۆ خزمەتی مرۆڤ رام کراون.

٥- ﴿ يَوْمَ نَطْوِي ٱلسَّمَآءَ كَطَيِّ ٱلسِّجِلِّ لِلْكُتُبِ ۚ كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ ۚ وَعْدًا عَلَيْنَآ ۚ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿١٠٤﴾ ﴾ الأنبياء: ١٠٤

واتە: (بێنەوە بیریان ئەو ڕۆژەی کە ئاسمانەکان دەپێچینەوە وەك پێچانەوە (لوول کردنی) پەرە بۆ ئەوەی کە (تێیدا) نوسراوە یەکەم جار چۆن دروستمان کرد(بە رووت و قووتی) (پاش مردنیش) ئەو(دروست کردنە) دووبارە دەکەینەوە

ئەوە بەڵێنێکە (جێ بەجێ کردنی) لەسەر ئێمەیە بێگومان ئێمە (ئەو بەڵێنە) بەدی دێنین).

ئـایەتەکە ئاماژە دەکات بۆ:

* حەتمییەتی گەڕانەوەی گەردوون بە هەموو پێکهاتەکانییەوە بۆ تاکە تەنێکی سەرەتایی هاوشێوەی تەنی یەکەم کە بەدیهێنانی لێوە دەستپێکردووە (قۆناغی لێکدانی دووەم، یان پێچانەوەی ئاسمان یان ورد و خاشبوونی توندی گەردوون).

* حەتمییەتی جیابوونەوەی ئەم تەنەی دووەم، واتا تەقینەوەی(قۆناغی جیابوونەوەی تەنی دووەم).

* حەتمییەتی گۆڕانی تەنی دووەم دوای جیابوونەوەی بۆ دووکەڵێکی گەردوونی.

٦- ﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ ۖ وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴿٤٨﴾ ﴾

إبراهيم: ٤٨

واتە: (لە ڕۆژێکدا کە ئەم زەوی یە دەگۆڕێ بە زەوییەکی تر و ئاسمانەکانیش (دەگۆڕێن بە ئاسمانی تر) ئەوسا هەموو (لە گۆڕەکانیان دێنە دەرەوە) دەردەکەون بۆ خوای تەنیای زاڵ بەسەر هەموو شتێکدا).

ئـایەتەکە ئاماژە دەکات بۆ:

* دووبارە دروستکردنەوەی زەوی بەشێوەیەکی جیاوازتر لەم زەمینەی ئێستاو ئاسمانەکان بۆ شێوەیەکی جیاوازتر لەوەی ئێستا و دەستپێکردنی گەشتی کۆتایی[1].

ئەم حەقیقەتە گەردوونییە گەورانەی لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی، مرۆڤ نەیتوانی بەهیچ یەکێك لەم حەقیقەتانە بگات تا ناوەڕاستی سەدەی

---

(١) لەوانەیە ئەو کارە لەدوای وردو خاشبوونی ئەم گەردوونەی ئێستامان یان لەدوای چەند خولێکی ورد و خاشبوونی یەك لەدوای یەکدا ڕوویدات، بەڵام لەکۆتاییدا گەشتی دواڕۆژ هەر دەستپێدەکات.

بیستەم و ساڵانی دواتر، کاتێك(بیردۆزی تەقینەوە گەورەکە) هاتەکایەوە، کە لە هەموو بیردۆزەکانی تر لەلای زانایانی فەلەکناسی و زانایانی فیزیای فەلەکی و تیۆری رازیکەرترە لەبارەی لێکدانەوەی درووستبوونی گەردوون.

قورئانی پیرۆز وێنەیەکی تەواوەتی گشتگیری ئەم ڕووداوە گەردوونییە گەورەیەمان بۆ دەخاتەڕوو، وردەکارییەکانیشی بۆ زانایانی فەلەکناسی و فیزیای تیۆری و بیرمەندان جێهێشتووە، کە بیر لە درووستبوونی ئاسمانەکان و زەوی دەکەنەوە. ئەوانەی کە تێبینییە زانستییە وردەکانیان لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا ئەرکی ڕاستی پەیامی خودا، کە لە دوایین کتێبەکانیدا و پێش هەزار و چوارسەد ساڵ بۆ کۆتا پێغەمبەر ناردوویەتی بسەلمێنن. ئەم دەستپێشخەرییە قورئانییە بەتەواوەتی یەکانگیرە لەگەڵ بیردۆزی تەقینەوە گەورەکەی گەردوون.

وسبحان ربي العلي الاعلى الوهاب.

خـوێنەری بـەڕێـز...

زانایانی سەدەی بیستەم توانیان ئەو کێشەیە چارەسەر بکەن کە فەیلەسووفەکانی بەدرێژایی هەزاران ساڵ سەرقاڵ کردبوو، کاتێك بە بەڵگەی حاشا هەڵنەگر گەیشتنە ئەو دەرئەنجامەی کە گەردوون سەرەتای هەیە و لە نەبوونی رەها پەیدابووە (بەڵگەی گەردوونیی) هەروەك چۆن وردەکاری گەورە بۆ زانایان دەرکەوت کە بەهۆیەوە سیناریۆی درووستبوونی گەردوون (بەڵگەی ڕێکخستنی ورد)یان لەڕێوە بەڕێوەدەبرد ئاشکرابوو.

مرۆڤە دادگەرەکان بۆیان دەرکەوت کە ئەوەی گەردوونی درووستکرد تەقینەوە گەورەکە نەبوو! چونکە تەقینەوەکە ڕووداوێکی نارێکخراو بوو و پشێوی و نارێکخراوییەکی زۆری تێدا هەبوو، بەڵام ئەوەی کە ڕوویدا شتێکی تەواو جیاوازبوو، بۆیە شیاوی ئەوەیە کە ناوی بنێین پلانە گەورەکە! کە جگە لە خودای دانای بەتوانا کەس توانای بەسەردا نییە.

بەهەمان شێوە سیناریۆی درووستبوونی گەردوون بە فەراهەمبوونی بارودۆخی وردی گونجاو بۆ درووستبوونی ژیان و پەرەسەندنی زیندەوران تا دەگاتە مرۆڤ (بنچینەی مرۆیی) جیادەکرێتەوە. تا ئەو ئاستەی کە وایلیهات دان بەوەدا بنرێت، کە گەردوون بەپێی ئەندازە و پێداویستییەکانی مرۆڤ ئامادە کراوە.

ماددیگەراکان هەوڵیاندا میکانیزم و لێکدانەوەی هەڕەمەکی پێشکەش بکەن کە رێگا دەدات گەردوون لە نەبوونەوە بەم شێوەیەی ئێستا بێتە بوون، وەك راکردنێك بۆ گێڕانەوەی ڕووداوەکان بۆ خودای بەدیهێنەر، بۆیە نووسینەکانیان پڕن لە ناعەقڵانی و نازانستی، زۆربەیان نزیکترن لە خەیاڵی زانستی. بۆ سەلماندنی ئەوە، ئەوەمان بەسە کە نموونەیەك لەسەر ئەو وردەکارییە بخەینەڕوو کە هەڕەمەکیی پەیڕەوی دەکات بۆ ئەوەی رێ بە درووستبوونی ژیان بدات، ئەمە رێك هاوشێوەی ئەوەیە کە لە یەکێك لە سووچەکانی گەردوون تیرێك بە ئاراستەی دراوێکی کانزایی بهاوێژی کە لە سووچەکەی تری گەردوونە(واتا لە دووری بیست بلیۆن ساڵی ڕووناکی) و بەریبکەوێت.

ئەگەر تۆ باوەڕت بە تواناکانت هەیە، کە کارێکی لەم شێوەیە ئەنجام بدەی ئەوکات باوەڕیشت بە هەڕەمەکیی هەبێت کە گەردوونێکی گونجاو و ڕێکخراو بێنێتە بوون.

هەرچی یەکانگیری چیرۆکی درووستبوونی ئاسمانەکان و زەوی و رامکردنیەتی بۆ مرۆڤ بەو شێوەیەی لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە و هاتنەوەی لەگەڵ ئەو ڕاستییانەی کە زانستەکانی بۆشاییەکانی ئاسمان پێیگەیشتوون و بیردۆزی تەقینەوە گەورەکەی گەردوون لەخۆی گرتووە، دوو ئاماژەی هەیە:

یەکەم، ئەوە دڵنیا دەکاتەوە کە زانست سەلماندوویەتی کە خودا بەدیهێنەری ئەم گەردوونەیە. دووەمیش، ئەوەی کە قورئانی پیرۆز لەلایەن خودای داناوە نێردراوە.

پاك و بێگەردی بۆ ئەوخودایەی فەرموویەتی:

﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٥٣﴾ ﴾ فصلت: ٥٣

واتە: (لەمەودوا بەڵگەکانی خۆمانیان نیشان دەدەمین لە ئاسۆی دونیا وە لە خودی خۆیاندا هەتا بۆیان ڕوون بێتەوە بێگومان ئەم (قورئانە) ڕاستە ئایا پەروەردگارت بەس نی یە کە بەڕاستی ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکدا).

## تەوەرەی پێنجەم

## ژیان لەنێوان خودا و بێباوەڕیدا

﴿ يُخْرِجُ ٱلْحَيَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَيِّ ﴾ الروم: ١٩

واتە: (خوا زیندوو لە مردوو دەردێنێ و، مردوو لە زیندوو دەردێنێ وە، زەوی زیندوو دەکاتەوە...).

((هەروەك چۆن بوون میوانێکی نوێ بوو بۆ نەبوون، ئاواش ژیان میوانێکی تەواو نوێیە بۆ بوون))

ئەنتۆنیۆ لازکانۆ[1]

دیاردەی ژیان زیاتر لە بنچینەی گەردیلە و تەنۆلکەکان و یاسا فیزیاییەکان و تەنانەت هەموو گەردوونیش ڕەگەزی سەرسوڕهێنەرتری لەخۆ گرتووە[2].

---

(١) Antonio Lascano: سەرۆکی کۆمەڵەی نێودەوڵەتی بۆ لێکۆڵینەوە لە بنچینەی ژیان، لەساڵی ١٩٥٠ لە مەکسیك لەدایك بووە.

(٢) ئەمە لەدیدی ئێمەوە وەك مرۆڤێك کە هەست بە ئاڵۆزی ژیان دەکەین و وایدەبینین کە زیندەوەر نهێنی ژیان لەخۆدەگرێت، سەرەڕای هەموو دامەزراوە فیزیاییە کاراکان لە گەردووندا(چوار هێزەکەی گەردوون و یاساکانی سروشت). بەڵام قورئانی پیرۆز پێمان دەڵێت کە بنچینەی گەردوون لە بنچینەی

ناکۆکی لەسەر سەیرکردنی ژیان لەنێوان ئەوانەی دانئەنان بە خوایەتی پەیڕەو دەکەن لەگەڵ ئەوانەی بێباوەڕی پەیڕەو دەکەن، لەسەر چوار پرس وەستاوە:

**یەکەم:** ئاڵۆزکردنی دیاردەی ژیان.

**دووەم:** چۆنیەتی پەیدابوونی ژیان.

**سێیەم:** سەرچاوەی زانیارییە پێویستەکان بۆ پێکهاتنی خانە و نووسینەوەی کۆدی بۆماوەیی (پێکهاتەی زانیاری).

**چوارەم:** ئایا جینەکانمان ڕەفتاری دیاریکراومان بەسەردا دەسەپێنن؟ (حەتمییەتی جینی).

بێباوەڕان وایدەبینن کە ژیان دیاردەیەکی ماددییە و بەڕێکەوت درووست بووە، هەروەك چۆن زانیارییە پێویستەکانیش بەڕێکەوت کەڵەکەبوون، هەروەها پێداگیری دەکەن لەسەرئەوەی کە مرۆڤەکان کۆیلەی جینەکانیانن، کە ژیانیان بەرەو ڕێڕەوێکی دیاریکراو ئاڕاستە دەکەن. بەڵام باوەڕداران وایدەبینن کە مەحاڵە ژیان بەبێ دەستتێوەردانی خوایی بەبەر ماددەی نازیندوودا بکرێت، هەروەك چۆن زۆری زانیاری پێویست و وردیی و شێوازی نووسینەوەی زانیارییەکان پێویستی بە بەدیهێنەرێکی زیرەك هەیە، هەروەها وایدەبینن کە ژیان دیاردەیەکی نامادییە و بەردەوامبوونی پێویستی بە دەستتێوەردانی بەردەوامی خوایی هەیە، هەروەها باوەڕداران وایدەبینن کە مرۆڤ ئازادی ویستی هەیە و ئێمە خۆمان گەورەی سەرەنجامەکانی خۆمانین.

خوێنەری بەڕێزم.. وەرە باپێکەوە لەدیدی زانستەوە سەرنجی ئەم چوار پرسە بدەین، بۆئەوەی ببینین ئاخۆ زانست لەلای کامیان دەوەستێت.

---

مرۆڤ ئاڵۆزترە ﴿ ءَأَنتُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَمِ ٱلسَّمَآءُ ۚ بَنَىٰهَا ﴿٢٧﴾ ﴾ النازعات: ٢٧. لەوانەیە لەبەرئەوەبێت، کە گەردوون یاساکانی لە نەبوونەوە پەیدابوویێت، بەڵام خانەی زیندووی مرۆڤ لە ماددەی گەردوونەوە پەیدابووە، بەهەرحاڵ هیچ شتێك لەلای خودا لەهیچ شتێکی تر ئەستەمتر نییە، بەڵام پەیامەکە بۆ ئێمەیە کە ڕاهاتووین بەراورد لەنێوان شتەکاندا دەکەین.

## ژیـــان چییە؟

وەك هەموو چەمکە بنەڕەتییە سەرەتاییەکان، ناکرێ پێناسەیەکی دیاریکراو بۆ ژیان دابنرێت، بەڵکو لەڕێی رووکار و خاسییەتەکانیەوە دەیناسین، لەبەرئەوە لە دوو ئاستدا لە ژیان دەکۆڵینەوە؛ یەکەم، (ئاستی بایۆلۆجی Biological)، کە ئاستێکی رووکارییە و تیایدا بنچینەی خانەی زیندوو و پێکهاتەی کیمیایی خانە دەزانین، هەروەها تیایدا فەرمانەکانی زیندەوەر و بیردۆزەکانی دروستبوونی ژیان دەزانین. هاوشێوەی ئەوەیە کاتێك وەسفی تابلۆیەکی هونەری دەکەین بەوەی کە بریتییە لە چەند رەنگێکی زەیتی کە خراوەتە سەر پارچەیەك قوماش و چوارچێوەیەکی ئاوزێڕی هەیە، یان وەك ئەوەی وێنەی سەر شاشەی تەلەفزیۆن پێناسە دەکەین بەوەی کە لە پێکسڵ Pixels[1] پێکهاتووە.

ئاستی دووەم بۆ وەسفکردنی ژیان بریتییە لە (ئاستی بوون Ontological)،کە لەبەرامبەر ئەو واتا و هەستانە دادەنرێت کە تابلۆی هونەرمەندەکە یان وێنەی تەلەفزیۆنەکە هەڵیگرتووە، ئەم ئاستەش بەتەواویی لە ئاستی بایۆلۆجی جیاوازە، چونکە لە خاسیەتی قووڵتری چالاکی خانەی زیندوو دەکۆڵێتەوە، کە لە فەرمانە بایۆلۆجییە ئاساییەکان جیاوازە، وەك زیرەکیی و کۆدی بۆماوەیی و ئامانجدارێتی، کە خاسیەتی نزیکترن لە حەقیقەتی ژیان.

کاتێك دەربارەی بنچینەی ژیان لە پسپۆڕان دەپرسین، زۆربەیان پەنا دەبەنە بەر قسەکردن دەربارەی ماددە کیمیاییەکان و بارودۆخە فیزیاییەکان کە پێش دەرکەوتنی زیندەوەران پەیدابووە و چەند بیردۆزێك بۆ شیکردنەوەی دروستبوونی

---

(١) (پێکسڵ: بچووکترین ئاکە رەگەزە کە دەکرێ نیشان بدرێت یان دەستکاری تایبەتمەندییەکانی بکرێت لەوێنەی شاشە ژمارەییەکان.

ئاستی بایۆلۆجی دەخەنەڕوو، بەڵام باسی بنچینەی ژیان بە واتای بوون ناکەن، کە بریتییە لەوەی چۆن تەنۆلکەی ماددەی نازیندوو خاسیەتی بوونی جیاکەرەوەی بۆ خانەی زیندوو فەراهەم کردووە.

## ژیان لەلای ماددیگەراکان :

لەپێناو دانانی پێناسەیەك بۆ ((کرۆکی ژیان)) سەدان کۆنگرە بەستراون، لەوانە کۆنگرەی فراوان Symposium کە لە زانکۆی (براندیز Brandes) لە ویلایەتە یەکگرتووەکان بەسترا لە ساڵی ١٩٩٣، دوای کۆنگرەکە ئەندامەکان پێناسەیەکی بایۆلۆجی زۆر درێژیان ڕاگەیاند، کە لە رووکاری بایۆلۆجی زیندەوەران دەرنەدەچوو[1]!

---

(١) پێناسەی ژیان: ژیان بریتییە لە کۆمەڵێك کرداری کارۆکیمیایی کە زیندەوەران (سادە و ئاڵۆز) ئەوانەی لە خانە پێکهاتوون پێیەوە هەڵدەستن، خانەکانیش لە تەنۆلکەی پێکهاتوو لە گەردیلەی ڕێکخراو کاربۆن و هایدرۆجین و ئۆکسجین و نایترۆجین و هەندێك رەگەزی تر پێکدێت. خانەکان هەڵدەستن بە کاری خۆراکیی (Metabolism) کە تیایدا خۆراك بەکاردێت بۆ بەدەستهێنانی وزە پاشان دەرکردنی پاشەڕۆ، دەکرێ خۆراك و پاشەڕۆ لەشێوەی ڕەق یان شل یان گازی بێت. زیندەوەرەکە ئەو وزەیەی لە گەشەکردنەوە بەرهەمی دێنێت (تا ئەندازەیەکی دیاریکراو) و لە چاکردنەوەی ئەو پێکانانەی تووشی دەبێت، هەروەك چۆن بۆ جووڵەش بەکاریدێنێت.

زیندەوەر بە کاری زۆربوون هەڵدەستێت بۆ بەرهەمهێنانی بوونەوەری هاوشێوەی خۆی (لەگەڵ بوونی جیاوازی سادە). زیندەوەر لە ژینگەی خۆیدا دژی بە پشت بەستن بەخۆی بەبێ ئەوەی پێویستی بە بوونەوەرانی تر هەبێت تەنیا بە ئەندازەیەکی کەم نەبێت. هەروەها زیندەوەر توانای گۆڕینی ژینگەکەی هەیە بۆ ئەو ژینگەیەی سوودی لێدەبینێت (یان زیان).

لەکۆتاییدا ژیانی زیندەوەر بە مردن کۆتایی دێت کاتێك لە بەرهەمهێنانی وزە دەوەستێت. قۆناغەکانی زۆربوون لەو وەسفە هەڵاوێردراون (هێلکۆکە و سپێرم و تۆوەکانی موتوربە و تۆوەکانی تر) بەوپێیەی خواردن لە دەرەوە بەکارناهێنن. هەرچی ڤایرۆسەکانن ئەوا بەتەواوی لەسەر زیندەوەرەکانی تر (خانەکان) دەبەستن، پاشان زۆربەی زانایان بە زیندەوەریان دانانێن.

هەروەها یەکێك لە هۆکارە سەرەکییەکان بۆ قورسبوونی تێگەیشتن لە ژیان ئەوەبوو کە هزری ماددیگەرایی کاتێك کە هەستا بە لێکۆڵینەوە لە دیاردەی ژیان (مەنهەجی وردکردنەوە (اختزالی)Reducationism)ی بەکارهێنا، کە هەڵدەستێت بە لێکدانەوە بۆ هەر دیاردەیەك یان پرسێك و وردیان دەکاتەوە بۆ ڕەگەزە سەرەتاییەکانی.

لەبەرئەوە لەکاتی لێکۆڵینەوە لە دیاردەی ژیان بایۆلۆجییەکان زیندەوەریان وردکردەوە بۆ ڕەگەزەکانی: کۆئەندامەکانی جەستە پاشان شانەکان پاشان خانەکان پاشان تەنۆلکە ئەندامییەکان پاشان گەردیلەکان پاشان پێکهاتەکانی بچووکتر لە گەردیلە (پرۆتۆن - نیوترۆن - ئەلیکترۆن)، بۆیە پێیان گوتین کە جگە لە ماددە هیچمان نەدۆزییەوە، بۆیە جگە لە ماددە هیچی تر نییە بۆ لێکدانەوەی ژیان. ئەوانە لەوە بێئاگابوون کە ئەو ژیانەی بە ڕێبازی وردکردنەوەکەیان خەریکن لێی دەکۆڵنەوە لەوانەیە بەتەواوەتیی ون بوویێت کاتێك هەستاون بە وردکردنەوە و شیکردنەوە و بەم کارەشیان بایۆلۆجیایان کردۆتە فیزیا!

## بنچینەی زیندەوەر :

**بنچینەی زیندەوەر بە دوو شێواز جیادەکرێتەوە:**

**١- ((شێوازی جینیی Genotype)) (پێکهاتەی بۆماوەیی):**

کە لەناو ناوکدا پارێزراوە، ڕیزبەندی نکلۆتیدات(بنچینە نایترۆجینییەکان) دیاریدەکات، کە بەشدارن لەپێکهێنانی DNA[1] کە کۆدی بۆماوەیی هەڵگرتووەو زۆر لەو زانیارییانەی لەخۆگرتووە کە زیندەوەر پێویستی پێیەتی، DNA لەڕێی ئەو زانیارییانەوە بەم فەرمانانەی خوارەوە هەڵدەستێت:

---

(١) ماددەی بۆماوەیی(جینات)کە لەناو ناوکی خانەکانی جەستەی مرۆڤ (و هەموو زیندەوەرە ئاژەڵی و ڕووەکییەکاندا) بوونی هەیە پێکهاتووە لە چەند زنجیرەیەك لە تەنۆلکەی ترشیی کە بە ترشە ناوکییەکان ناسراوە-بەهۆی بوونی لەناو ناوکدا - Nucleotide Acids. کە بریتییە لە DNA (ترشی ناوکی رایبۆزی جیاکراوە لەئۆکسجین DNA ،) Deoxyribonucleic acid لە یەکەی کیمیایی بەیەکەوە بەستراوی بەدوای یەکدا هاتوو پێکهاتووە، وەك ئاڵقەکانی زنجیر کە هەریەکێکیان بە نەکلۆتید Nucleotide= بنچینەی نایترۆجینی ناسراوە. DNA لەناو ناوکدا لەشێوەی دوو زنجیری پێکەوە بەستراوی هاوشانی یەکتر کە بەبەستەری هایدرۆجینی پێکەوە بەستراون وەك نۆرگانەکانی شەمەندەفەر یان پلیکانەی لە دار درووستکراو. شەش هەزار ملیۆن(بەستەری هایدرۆجینی) لە جەستەی مرۆڤدا هەیە. دوو زنجیرەکە بەدرێژیی لەشێوەی لوولپێچ Double Helical Structure لێك ئاڵاون، پاشان ئەم زنجیرە لوولپێچە هەزاران جار بەتوندی بەدەوری خۆیدا لوولی خواردووە بۆئەوەی لە بۆشایی تەسکی ناوکدا جێگای ببێتەوە، بەمەش کرۆمۆسۆمەکان Chromosomes پێکدێنێت. نەکلۆتیدات لە زنجیرەی DNA واتا لە کرۆمۆسۆماتدا لەسەر شێوەی چەند کۆمەڵەیەك ڕێکخراوە کە بە جینات ناسراوە. جین (Gene)یش بەشێکە لە زنجیرەی DNA کە زانیاری تایبەتی دەربارەی بنیاتنانی بەشەکانی پرۆتین هەڵگرتووە. خانەی مرۆیی نزیکەی سی هەزار جین لەخۆدەگرێت.

ناوکی سپێرم Sperm و ناوکی هێلکۆکە Ovum ٢٣ کرۆمۆسۆم لەخۆدەگرێت، خانەکانی لاشەی تیمەش(خانە لاشەییەکان Somatic cells) دوو ئەوەندەی ئەو ژمارەیە لەخۆدەگرن؛ چونکە لە یەکگرتنی ناوکی ئەم دوو خانەیە(هێلکۆکە و سپێرم) پەیدابووە.

١- ناڕاستەکردنی دابەشبوونی خانە و زۆربوونی.

٢- گواستنەوەی سیفەتە بۆماوەییەکان بۆ نەوەکانی دواتر.

٣- ناڕاستەکردنی رایبۆزۆم Ribosomes کە لەناو سایتۆپلازمی خانەدا بوونیان هەیە بۆ دروستکردنی پرۆتینە جیاوازەکان کە زیندەوەر پێویستی پێیان هەیە.

DNA بە رەقترین و بەهێزترین بتیۆلۆجی دادەنرێت کە زانستی بایۆلۆجی تائێستا پێیگەیشتووە The strongest Biological Molecule.

٢- ((شێوازی ڕووکاری Phenotype))، کە بریتیە لە:

- سیفەتە بونیادییەکانمان، وەك رەنگی پێست و درێژی باڵا و نەرمی پرچ.

- سیفەتە فەرمانییەکانمان، وەك جووڵە و بینین و سووتاندنی شەکر.

بەشەکانی پرۆتین بە یەکەی بونیادی و فەرمانی شانەکانی لاشە دادەنرێت، کە گەورەترین بەشی بنچینەی خانەکانی جەستە نیشان دەدات، هەروەها دروستکەری زۆربەی ماددە کاراکانە، کە بەرپرسن لە فەرمانەکان وەك هۆرمۆنەکان[١] و ئەنزیمەکان[٢] هەر خانەیەك لەماوەی یەك چرکەدا بە دروستکردنی دوو هەزار بەشی پرۆتین هەڵدەستێت.

---

(١) هۆرمۆن: ئەو ماددانەن کە غودەی بێ لوو راستەوخۆ دەیانڕژێنێتە ناو خوێنەوە، بەبێ پشتبەستن بە هیچ گوێزەرەوەیەك. هۆرمۆنەکان هەڵدەستن بە ڕێکخستنی چالاکییە ناوەکییەکانی ناو جەستە، وەك گەشەکردن و خۆراك و سووتاندنی شەکر. هۆرمۆنی ئەنسۆلین وەك نموونە.

(٢) ئەنزیم: پرۆتینی خاوەن کێشی بەشیی بەرزن، هەڵدەستن بە رۆڵی ئامرازی یاریدەدەر بۆ تەواوکردنی کارلێکە کیمیاییە زیندەییەکان. هەر خانەیەك نزیکەی ١٠٠٠ ئەنزیم لەخۆدەگرێت، هەر یەکێکیشیان یاریدەدەرە بۆ تەواوکردنی کارلێکێکی کیمیایی دیاریکراو، بەڵام ناچێتە ناو کارلێکەکەوە. بەبێ بوونی ئەنزیمەکان تەواوکردنی کارلێکە کیمیاییەکان پێویستییان بە کاتێکی زۆر و پلەی گەرمی بەرز هەیە، کە شانەکانی لاشەی زیندەوەر بەرگەی ناگرن.

پێکهاتەی بۆماوەیی (شێوازی جینی) شێوازی بونیادی (ڕواڵەتی) بەڕێوە دەبات، لەڕێی دیاریکردنی جۆرەکانی پرۆتین کە ڕایبۆزۆمەکانی خانە هەڵدەستن بە بنیاتنانی. هەروەك باسمان کرد، ئەم پرۆتینانە بەپێی زانیاری تۆمارکراو لە DNA دا پێکدێن، کە RNA[1] لەناو ناوکی خانەوە دەیگوازێتەوە بۆ ڕایبۆزۆمەکان لەناو سایتۆپلازمی خانەدا.

پاشان، دەتوانین بڵێین کە زیندەوەر سێ بەشی ئەندامیی گەورە Macromo-ecules لەخۆدەگرێت (سەرەڕای هەزاران بەشی تر)، کە بە ڕۆڵێکی بنچینەیی هەڵدەستن لە بنچینە و فەرمانەکانی زۆربوونیدا: بەشی DNA - بەشی RNA - بەشی پرۆتین. پەیوەندی نێوان ئەم بەشانەش بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

پێکهاتەی بۆماوەیی - RNA ← پێکهێنانی پرۆتین ← ڕووکار

DNA ڕایبۆزۆم

لەناو ناوکدا لەناو سایتۆپلازمدا

## درۆی خانەی سەرەتایی :

گومان لەوەدا نییە، کە خانەی زیندوو زۆر ئاڵۆزە. زانای بۆماوەزانی مایکل دینتۆن[2] پێمان دەڵێت، کە گۆڕانی ماددەی نازیندوو بۆ خانەی زیندوو گرنگترین و گەورەترین قۆناغی ڕاگوزەر بوو لە مێژووی سروشتدا، چونکە جیاوازی لەنێوان نزیکترین بوونەوەرەکان بۆ ژیان، کە بلوورەکانن و لەنێوان خانەی زیندوودا زۆر زۆرە. دینتۆن وایدەبینێت، کە هەموو بەڵگەکان ئاماژە بۆ ئەوە

---

(١) RNA: دووەم ترشی ناوکییە، کە لەیەك زنجیری بنچینە نایترۆجینییەکان پێکدێت. جیاواز لە DNA کە لە دوو زنجیرە پێکدێت.

(٢) Michel Dinton: زانای بایۆلۆجیای ئوسترالی کە گرنگی بە بۆماوەیی مرۆیی دەدات. لەساڵی ١٩٤٣ لەدایك بووە.

دەکەن، کە خانەی زیندوو هەر لەسەرەتاوە و بەتەواوەتیی درووستبووە، تەنانەت توانای ئەوەی هەبووە کە بەهەمموو ئەو فەرمانانە هەڵبستێت کە بەرزترینی مەمکدارەکان (جگە لە مرۆڤ) پێی هەڵدەستن، وەك زۆربوون و جووڵە و هەناسەدان و خواردن و دەردان.... لەبەرئەوە ناکرێ باسی خانەی سەرەتایی سادە Primitive Cell بکرێت کە بە پلەبەندی پەیدابووە و بوونەوەران لەوەوە پەرەیانسەندووە، تەنانەت خانەی سەرەتایی بە واتا جینییەکەی(وەك بەکتریا کە ناوکی نییە) ئاڵۆزترە لەو خانە جیاوازانەی کە تایبەت کراون، (وەك خانەی ماسوولکەیی و خانەی پێست).

جاکۆ مۆنۆد[1] زانای بایۆلۆجی خاوەنی خەڵاتی نۆبڵ جەخت لەو واتایە دەکاتەوە و دەڵێت: هیچ بۆچوونێکمان دەربارەی خانەی سەرەتایی نییە، وەك داروینییەکان بانگەشەی بۆ دەکەن، لەڕاستیدا سادەترین بوونەوەری زیندوو بە تەواوەتی پەیدابووە.

## موعجیزەی ژمارەکان :

بچووکترین خانەی بەکتریایی سەد هەزار ملیۆن گەردیلە لەخۆدەگرێت ($10^{11}$)، لەکاتێکدا خانەی تایبەت بە بوونەوەرە فرەخانەییەکان (وەك مرۆڤ) دە ملیۆن گەردیلە لەخۆدەگرێت($10^{13}$).

درێژەی زنجیرەی DNA لە یەك خانەی مرۆییدا ٢،٠٤ مەترە و بەمەش درێژی زنجیرەکانی DNA لەخانەکانی مرۆڤی پێگەیشتوودا (نزیکەی سەد هەزار ملیار خانەیە) یەکسانە $2.04 \times 10^{14} \times 10^{-3} = 2.04 \times$ ملیار کیلۆمەترە! ئەم زنجیرەیە نزیکەی ١٣٦٥جار ماوەی نێوان زەوی و خۆر دەبڕێت!

---

(١) Jacques Monod: (١٩١٠-١٩٧٦) زانای بایۆلۆجی فەرەنسی.

مرۆڤ لە هەریەکە لە دایك و باوك شەش بیکۆگرام(گرام= ١٠٠٠ملیار بیکۆگرام)ی لە DNA بە بۆماوەیی بۆ دەمێنێتەوە، کە لەسەری سپێرم و هاوشێوەکەشی لە هێلکۆکەدا هەیە. ئەم بارستە بچووکەی DNA یە کە مرۆڤایەتی لە سەرەتای بوونیەوە تا ئێستا بە بۆماوەیی بۆی دەمێنێتەوە و بەرپرسە لە پارێزگاریکردن لە ڕەگەزی مرۆڤایەتی.

یەك گرام DNA ئەندازەیەکی وا زانیاری لەخۆدەگرێت، کە هاوتایە لەگەڵ ئەو زانیارییانەی ملیۆن ملیۆن CD لەخۆیدەگرێت، DNA بۆ هەر خانەیەك $10^{12}$ زانیاری دەنێرێت (هەر پیتێك لە پیتەکانی زمان لە Bits8 پێکدێت، کە بە One Byte ناسراوە)، بەهەمان شێوە ئەندازەی DNA لە ئەندازەی سەری دەرزییەك دەکرێ ئەندازەیەکی وا زانیاری هەڵبگرێت، کە بلیۆن جار لە ئەندازەی فلاش میمۆرییەکی ٤ گێگا بایتی زیاتریێت. بۆیە DNA گەورەترین دامەزراوەی فراوانی زانراوە لە هەڵگرتنی زانیاریدا.

هەروەها خانە - کە ٢٠٠ دانە لێی بەو ئەندازەیەی خاڵی پیتی(ب) داگیری دەکات - ١٠٠ ملیۆن بەشی پرۆتینی ١٠٠ هەزار جۆر لەخۆ دەگرێت، ئەگەر سەرنجی یەك بەشی پرۆتین بدەین، بۆ نموونە هیمۆگلۆبین، دەبینین کە ٥٣٩ ترشی ئەمینی لە خۆ دەگرێت، کە دووبارەکردنەوەی بیست جۆری ترشە ئەمینییەکان نیشان دەدات، کە جەستەی مرۆڤ لە خۆی گرتووە.

بە حیسابێکی بیرکاری سادە دەبینین، کە ژمارەی ریزبەندە بەردەستەکان کە دەکرێ تیایدا ئەم ١٠٠ ترشە ئەمینییە بۆ درووستکردنی یەك بەشی هیمۆگلۆبین ریز ببن یەکسانە بە ژمارە ١ و ٦٢٠ سفر لە لای ڕاستییەوە، جگە لەوەی کە یەك ریزبەندییان گونجاوە بۆ ئەوەی ئەم بەشە بە تەواوی کاری خۆی بکات کە گواستنەوەی ئۆکسجینە لە لاشەی مرۆڤدا، بەڵکو تەنانەت بوونی هەڵەیەك لە یەك ترشی ئەمینیدا بەسە بۆ ئەوەی بەشێك بەرهەم بێنێت، کە بە ڕێگایەکی پڕ کەموکوڕی مەترسیدار کار بکات، یان هەر کار نەکات.

دوای ڕیزبوونی ترشە ئەمینییەکان بۆ پێکهێنانی زنجیرەی پەپتیدی، نۆرەی گرنگترین چالاکی لە درووستکردنی بەشی پرۆتین دێت کە بریتییە لەو ڕێگایەی زنجیرەکان بە هۆیەوە لێك ئاڵاون.

ئەم کردارە زۆر ئاڵۆزە، ئەگەر زانیارییە پێویستەکان بۆ لەیەك گرێدانی زنجیرەکانی بەشی پرۆتین (بۆ نموونە لە ١٠٠ ترشی ئەمینی پێك بێت) بخەینە سوپەر کۆمپیوتەرەوە بۆ ئەوەی بە هەوڵدانی هەڕەمەکییانە بەم کردارە هەڵبستێت، ئەوا نزیکەی $١٠^{١٢٧}$ ساڵی دەوێت! لە کاتێکدا ئەو کردارە لە خانەدا لە بەشێکی زۆر کەمی چرکەدا ئەنجام دەدرێت. ئەگەر ئەم کردارە بە شێوەیەکی ناتەندرووست ئەنجام بدرێت، ئەوا ژەهرێکی کوشندە بەرهەم دێنێت لە بری ئەوەی ماددەیەکی زیندوو بەرهەم بێنێت.

لەبەر ئەوە، ئەگەری درووستبوونی بەشێکی پرۆتین بە ڕێکەوت پێویستی بە ئەندازەیەکی وەهای ماددە هەیە کە زیاتر بێت لە بلیۆن جار لەو ماددەیەی لە هەموو گەردووندا بوونی هەیە، بۆ ئەوەی ڕێککەوتنە هەڕەمەکییە بەرهەمهێنەرەکان ڕووبدەن، ئەم هەوڵانەش کاتێکی درێژتر لە تەمەنی گەردوونی دەوێت(پێویستی بە نزیکەی $١٠^{٢٣٤}$ دەبێت!) ئەم هەوڵانەش پێویستییان بە گۆڕەپانێك هەیە کە تیایاندا ئەنجام بدرێت کە ڕووبەرەکەی $١٠^{٨٣}$ ساڵی ڕووناکی بێت(گەورەتر لە قەبارەی گەردوون کە ڕووبەرەکەی $٢×١٠^{١٠}$ ساڵی ڕووناکییە.

ئایا مافی ئەوەمان نییە کە گاڵتە بە ماددیگەراکان بکەین، کاتێك دەڵێن کە ژیان بە شێوەیەکی هەڕەمەکی درووست بووە و پێیان بڵێین:وای لە جوانیەکانی ڕێکەوت!!.

## خاسیەتە وجوودییەکانی ژیان :

لە سەرەتای تەوەرەکەدا باسی ئەوەمان کرد کە سەرنجدان لە خانە بە دیدێکی بایۆلۆجییانە (سەرەڕای ئاڵۆزییەکەی) وەك سەرنجدانە لە تابلۆی مۆنالیزای لیۆناردۆ داڤینشی کە چەند ڕەنگێکە بەسەر پارچەیەك قوماشەوە و چوارچێوەیەکی ئاوزێڕی هەیە. لە پێناو نزیك بوونەوە لە تێگەیشتن لە حەقیقەتی ژیان، پێویستە ئەم دیدە بایۆلۆجییە[1] بۆ ((دیدی بوونگەرایی Ontological) تێپەڕێنرێت. چونکە ژیان و زیندەوەران چەند خاسیەتێکی وجودی جیایان دەکاتەوە، کە دیدی بایۆلۆجی بێ توانایە لە شیکردنەوەی چۆنیەتی درووستبوونی، گرنگترین ئەو خاسیەتانەش:

### یەکەم: ژیان = زانیاری Life = Information

دواتر هەڵدەستین بە خستنەڕوو و شیکردنەوەی چەمکی (زانیارییەکان) بەوپێیەی خاسیەتی وجودی تەوەرەییە بۆ ژیان، کە لە کۆتایی تەوەرەکەدا بە دوور و درێژی باس دەکەین لەژێر ناوونیشانی (نهێنی نهێنیەکانی ژیان: پێکهاتەی زانیاری).

---

(١) سیفەتە بایۆلۆجییەکانی ژیان وەك: جووڵە و خواردن و هەست کردن و مردن....

## دووەم: ژیان دامەزراوەیەکی زیرەکانەیە Life is Intelligent

ماددیگەراکان پێداگری دەکەن لەسەر تێڕوانین بۆ ژیان بەدیدێکی ماددیگەرانەو، وەسفکردنی کردارە زیندەییەکانی زیندەوەران بە زیرەکانە رەتدەکەنەوە. ماددیگەراکان رەخنەکەیان لە رێبازی وردکردنەوە (اختزالي)یەوە سەرچاوەدەگرێت، کە وایدەبینێت ئەگەر زیندەوەرەکان ورد بکەینەوە بۆ پێکهاتە سەرەتاییەکانیان (ئەندامەکان ←» شانەکان ←» خانەکان ←» بەشەکان ←» گەردیلەکان←» تەنۆلکەکانی بچووکتر لە گەردیلە)، ئەوا لە کۆتاییدا دەگەینە ئەو وزەیەی کە یاساکانی فیزیای چەندیی بەڕێوەی دەبات، کە سەرەڕای ئەو پشێوی و ناحەتمییە Uncertanity[1] ی تێدا هەیە و، لە کۆتاییدا هیچ مەبەست یان ئامانج یان زیرەکی یان جوانی نادۆزینەوە، تەنیا بوارەکانی وزەی هەرەمەکیی بوونیان دەبێت.

چۆن بوارەکانی وزەی هەرەمەکیی هەڵدەستن بە بەرهەمهێنانی خوێندنی باڵندەکان و ئەزموونیان لە دروستکردنی هێلانەو ئەو وێنەیەی لە کاتی کۆچکردنیاندا لە ئاسماندا دروستیان دەکەن کە سەرنجی مرۆڤ رادەکێشێت؟ بۆچی ئەگەر باڵندەکە مرد ئەم دیاردانە ون دەبن(ژیان بە هەموو دیمەنەکانییەوە ون دەبێت) سەرەڕای ئەوەی کە هەمان بوارەکانی وزە بوونیان هەر دەمێنێت؟

لەوانەیە بیردۆزی پەرەسەندنی داروینی هاوچەرخ Modern Darwinism بتوانێت ئەو هەنگاوانەمان بۆ شیبکاتەوە کە باڵندە دەنووکدارەکان و باڵدارەکان بەهۆیەوە پەرەیانسەندووە، کە بە تووک لە خشۆکە دداندارەکان و لاشە بە پوولەکە داپۆشراوەکان جیا دەبنەوە. چۆن ئەو گۆڕانکارییانە روویانداوە، سەرەڕای ئەوەی کە باڵندەکان و خشۆکەکان لە ئاستە چەندییەکەیاندا[2] هەمان بوارەکانی وزەیان هەیە؟!

---

(١) (فیزیای چەندیی و بنچینەی ناحەتمیمان لە پەراوێزەکانی تەوەری چوارەمدا خستۆتەڕوو.

(٢) وردترین ئاستەکانی فیزیایە، دەدرێتە پاڵ بیردۆزی چەندیی(کوانتەم).

چۆن بوارەکانی وزە ئەومیان بۆ ڕەخساوە کە دروست ببن و بوونەوەری زیندوو بە سیفاتە بایۆلۆجییەکان و خاسیەتە وجودییەکان کە باسیان لێوە دەکەین بەرهەم بێنن؟ چۆن ئەم سیفات و خاسیەتانە ئاڵۆزتر دەبن لە بوونەوەرە نزمەکانەوە بۆ بوونەوەری بەرزتر؟ ئایا بوارەکانی وزە بۆ ماددە نازیندووەکان بە شێوەیەکی نادیار ئەو سیفەت و خاسییەتانەیان هەڵگرتبوو کە زیندەوەران جیا دەکاتەوە، پاشان ئەو خاسییەتانەیان لە کاتی دروستبوونی ژیاندا تێدا دەرکەوتووە؟ ئەگەر کارەکە بەم جۆرەیە ئەوا چی وای لێکردووە کە دەربکەوێت؟! یان ئەوەتا کە سیفات و خاسیەتە بایۆلۆجییەکان و وجودییەکان بۆ بوارەکانی وزەی ماددەی نازیندوو زیادکراون و ژیانیان بەبەردا کراوە؟!

ئەمانە پرسیارگەلێکی قورسن کە بەسەر ماددیگەراکان دادەبارێن و سەریان شۆڕ دەکەن.

سەرنجدان لە دیاردەی ژیان تەنیا لەسەر ئاستی فیزیایی و کیمیایی هۆکاری تێکەڵکردنی ئاڵۆزی کارتەکانە، هەروەها بەلاڕێماندا دەبات(بەڵکو بە تەواوی کوێرمان دەکات) بۆ زانینی حەقیقەتەکەی. ئەلیکترۆن و پرۆتۆن و نیوترۆن بە تێکەڵەیەکی دیاریکراو چەنگێك لمان بۆ بەرهەم دێنێت، کە هەمان پێکهاتەیش خانەکانی مێشکی ئەنیشتاینیان پێکهێناوە. خانەکانی مێشکمان واقیعی دەوروبەرمان هەست پێدەکەن و بە هەستە جیاوازەکان لەگەڵیاندا کارلێك دەکات و بەمەش دیاردەی عەقڵی لێ پەیدا دەبێت، کە هەموو ئەمانە وەردەگرێت و تامیان دەکات، جا یان پێیان دڵخۆش دەبێت یان دڵتەنگ، ئەمە بە هەمان ئەلیکترۆن و پرۆتۆن و نیوترۆنەکان ئەنجام دەدرێت.

لەوەی رابورد بۆمان دەردەکەوێت کە دیدی ماددیگەراکان بۆ دیاردەی ژیان و سروشت بە شێوەیەکی گشتگیر، بەوەی کە وجودێکی خاڵییە لە زیرەکی، دیدێکی زۆر کورتبینە، چونکە ئەگەر زیرەکی بەوە پێناسە بکەین کە بریتییە لە توانای چارەسەرکردن و دروستکردنی زانیاری، ئەوا دیاردەی ژیان و بەهەمان شێوە سروشتیش جگە لە تۆڕی بەیەکەوە بەستراوی سیستەمی زیرەکی شتێکی تر نییە، کە لە چوار ئاستدا بۆمان دەردەکەوێت:

**یەکەم: زیرەکی پەنهان Embedded Intelligence:**

کە ئەو سیستەمە زیرەکانە بەکاری دەهێنن کە شوێنی یاسای فیزیایی دیاریکراو دەکەون، بەڵام کارکردنیان خۆکردیی نییە، نموونەی وەك گەردیلەو شەپۆلەکانی دەریا.

**دووەم: زیرەکی تایبەتی خودی Auto Nomous یان زیرەکی چالاك Active Intelligence:**

کە زیندەوەران پەیڕەوی دەکەن، چونکە بوونێکی سەربەخۆیان هەیە و خۆیان چاودێری خۆیان دەکەن و زۆر دەبن و لەگەڵ بووندا کارلێك دەکەن و لێیەوە فێر دەبن و کاری تێدەکەن.

**سێیەم: زیرەکیی هەستپێکەر بە خودی خۆی Self-aware Intelliogence:**

کە تایبەتە بە مرۆڤ، بەوە جیادەکرێتەوە کە خۆی خۆی دەناسێت و توانای بیرکردنەوەی رووتی هەیە و ئازادی و هەڵبژاردنی بەدەست خۆیەتی.

**چوارەم: زیرەکی رەها Infinity Intelligence:**

کە سەرچاوەی سێ جۆرەکەی پێشووە، کە بریتییە لە سیفەتەکانی خودای بەدیهێنەر.

(سێر جۆن مادۆکس) سەرنووسەری پێشووی گۆڤاری(سروشت Nature) جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کە ژیان پێش نزیکەی ٣،٧ بلیۆن ساڵ لە سادەترین وێنەیدا (پرۆکاریۆتات) دەرکەوتووە، کە هەموو سیفەتە بایۆلۆجی و خاسیەتە وجودییەکانی ژیانی هەڵگرتووە، ئیتر لە ناکاو ژیان هەڵقوڵا، بە هەموو ئەو زیرەکییانەی تێیدا هەیە. هەروەها مادۆکس دەڵێت؛ وادیارە، کە سروشتی ژیان و چۆنیەتی پەیدابوونی بە نهێنی سەرسوڕهێنەری بەدیهاتن دەمێنێتەوە.

## سێیەم: ژیان و سیستەمی کۆدی و چارەسەرکردنی زانیارییەکان
**Codding System and Information Processing**

خاسییەتی سێیەمی بوون، کە پەیوەستە بە ژیانەوە بریتییە لە (سیستەمی کۆدی Codding System) و (چارسەر کردنی زانیارییەکان Information Processing)، کە لە هەموو زیندەوەراندا بوونی هەیە[1].

چونکە زانیاری تایبەت بە بنیاتنانی پرۆتین و چۆنیەتی کارکردنی خانە و هەروەها سیفەتەکانی زیندەوەر، کە بۆ نەوەکانی دواتر دەگوازرێتەوە، لە DNA ی جینەکانی خانەدا (کۆدی خراوەتە سەر) بە بەکارهێنانی چوار پیت[2]، کە بە ڕیزبەندی بیرکاری جیاواز ریز دەبن.

زانیارییەکان لەو جینانەدا، کە لەناو ناوکی خانەدا بوونیان هەیە دەگوازرێنەوە بۆ رایبۆزۆمەکان لەناو سایتۆپلازمدا، ترشی ناوکی RNA نێرەر m RNA کە لە بەرامبەر ئەو تەلانەیە، کە لە سیستەمی تەلیگرافدا کۆد دەگوازێتەوە. رایبۆزۆمەکان هەڵدەستن بە کردنەوەی کۆدەکەو تێگەیشتن لە ناوەڕۆکەکەی

---

(١) (دیڤید بێرلینسکی David brrlinski) زانای بیرکاری و فەلسەفە مەبەستی ئەم سیستەمەمان بۆ شیدەکاتەوە و دەڵێت: سیستەمی کۆدی بریتییە لەو سیستەمەی کە دوو شت یان دوو سیستەم بەهۆی هێماوە بەیەکەوە دەبەستێتەوە. بۆ ئەوەی لەوە تێبگەین با سەرنجی کۆدی مۆرس Morse Code بدەین لە(تەلیگراف Telegraph) کە لەسەر سێ هەنگاو وەستاوە:

کۆد - گواستنەوەی زانیاری - کردنەوەی کۆدەکە.

نێرەری کۆدەکە پیتەکانی ئەو وشانەی دەیەوێت بیاننێرێت دەیانگۆڕێت بۆ دوو رەمز (خاڵ و نیشانە) و، هەموو پیتەکان بەم دوو ڕەمزە و بە ڕێگای بیرکاریانە دەخرێنەڕوو (کرداری بەکۆدکردن).

(ا = ـ. ـ- گ= ـ. ـ و =. ـ. بەم شێوەیە)، پاشان ئەم ڕەمزانە دەگۆڕدرێن بۆ ئاماژەی کارەبایی، کە لە ڕێی وایەرەوە بۆ شوێنی وەرگرەکە دەگوازرێنەوە، کە هەڵدەستێت بە کردنەوەی کۆدەکە و وەرگێڕانی بۆ واتا ئەسڵەکەی Decoding.

(٢) ئەم چوار پیتە چوار ناوتەی کیمیایین، لەو کۆمەڵەیەن کە بە (ئەکلۆتایدات Nuclotides= بنچینە نایترۆجینییەکان) ناسراون، بە پیتەکانی A T C G ئاماژەیان بۆ دەکرێت.

Translation= Decodding و بە بەکارهێنانی ئەم ناوەرۆکە زانیارییە لە ڕێکخستنی ترشە ئەمینییەکان بۆ پێکهێنانی پرۆتینە جۆراوجۆرەکان، کە بە زۆربەی فرمانەکانی خانە هەڵدەستن[1].

لە ڕاستیدا ئەم کۆدە بۆماوەییە کە لە هەموو زیندەوەراندا بوونی هەیە، لە نزمترینیان (بەکتریا) تا بەرزترینیان (مرۆڤ) ناکرێ (بەرهەمی چەندیی) بێت بۆ سیفەتە فیزیایی و کیمیاییەکانی ڕەگەزی پێکهاتەکانی، نەك تەنیا لەبەر ئەو ئاڵۆزییەی کە لە بنچینە و فەرمانی ئەم پێکهاتانەدا هەیە، بەڵکو لەبەرئەوەی کە پێکهاتەکانی ئەم کۆدە بە شێوەیەکی تەواوکاری گونجاو کار دەکەن، کە ئەوە دەکاتە شتێکی حەتمی کە بەشێوەیەکی تەواو هەر لە کاتی خانە سەرەتاییەکەیەوە هاتۆتە بوون و بە شێوەی پلە بەندی پێی نەگەیشتوون.

---

(١) نموونەیەك لەسەر سیستەمی کۆدی و چارەسەر کردنی زانیاری دێنینەوە کە زیرەکی ئەم سیستەمە دەردەخات و نزیکترمان دەخاتەوە لە تێگەیشتن لە سروشتی یان: مۆسیقارەکان بۆ سەمفۆنیای سێیەمی بیتهۆڤن (البطولە) - وەك نموونە - پشت بە دوو شتی بنەڕەتی دەبەستن، ئامێرە مۆسیقییەکان کە بە کوالێتییەکی بەرز لە کەرەستەی سەرەتایی دروستکراون و نۆتە مۆسیقییەکان کە بە شارەزاییەکی زۆرەوە نووسراون بە بەکارهێنانی زمانێك کە مۆسیقارە بلیمەتەکان دایانناوە. ئایا ئێمە دەڵێین کە ئامێرە مۆسیقییەکان و نۆتەکان کرۆکی ئەم کارە مۆسیقییە ناوازەیەن، یان زیرەکی و بەهرە و توانا کە لە چەند قۆناغێك خۆی دەبینێتەوە:

یەکەم: هونەرمەندی میوزیکژەنی موعجیزە(بیتهۆڤن) کە سەمفۆنیاکەی داناوە.

دووەم: داهێنەری سیستەمی نۆتەی مۆسیقی کە لە ناوەرۆکەکەیدا بریتییە لە گۆڕینی ئەو ڕەمزانەی کە لەنێوان هێڵەکانی پەیژەی مۆسیقیدا دەینووسێت(کۆد)، کە بۆ ئەوەی میوزیکژەنەکە بیخوێنێتەوە و کۆدەکەی بکاتەوە و لەشێوەی ئاوازێك و لەڕێی ئامێرەکەیەوە بۆمان بێنێتە بوون.

سێیەم: وەستای شارەزا کە ئامێرە مۆسیقییەکانی بە پشوو درێژی و هێمنی دروستکردووە تا بە شێوەیەك دروستی بکات کە بە سەدان هەزار دۆلار بفرۆشرێت.

چوارەم: میوزیکژەنی شارەزا، کە ساڵانێکی دوور و درێژ(زۆربەی کات لە منداڵییەوە ڕاهێنانی پێ کراوە)، بۆ ئەوەی بە ئامێرە مۆسیقییەکەی ئەم مۆسیقا جادووییەمان بۆ بەرهەم بێنێت.

پێنجەم: بوونی ئەو گوێگرانەی کە گوێی مۆسیقییان هەیە؛ بۆئەوەی چێژ لەو مۆسیقایە وەرگرن.

بە ئەندازەگیری لەسەر ئەم نموونەیە دەبینین کە DNA(ڕەشنووسە زیندووەکە Living blue Print) یە بۆ چالاکی خانەکە، کە لە بەرامبەر نۆتە مۆسیقییەکەیە. لەکاتێکدا کە ڕایبۆزۆمەکان مۆسیقارەکانن کە هەڵدەستن بە بنیاتنانی پرۆتینەکان کە لە بەرامبەر ئاوازە ژەنراوەکەن.

بەڵێ ئەوە (ژیان)ێکی زیرەکانەیە کە لە پشت سیستەمە سەرسوڕهێنەرەکەی کۆدییەوە هەیە، گەورە زانای فیزیا پۆڵ دیڤیز زۆر بە وردیی و بە سادەیی گوزارشت لەوە دەکات و دەڵێت: ((بەکارهێنانی سیستەمی کۆدی لە نووسینەوەی هەردوو زمانەکەی ژیان(ترشە ناوکییەکان و پڕۆتینەکان) پاشان گواستنەوەی زانیاری لە نێوانیاندا پرسێکی زۆر ئاڵۆزە، بەڵکو بە موعجیزە دادەنرێت، ئاخر چۆن کارلێکە کیمیاییەکان کە بینایان نییە دەتوانن بەم کارە هەڵبستن؟!)).

## چوارەم: توانای پەیدابوون - شێوەگرتن - Morphogenesis

DNA تەنیا کۆگای زانیاری نییە، بەڵکو هەڵدەستێت بە ئاڕاستەکردنی میکانیزمی دروستکردنی پرۆتینەکان (DNA- رایبۆزۆمەکان)، واتا گۆڕینی زانیاری بۆ وجودێکی ماددی سێ رەهەندی. چەند سیستەمێکی تریش لە خانەدا هەڵدەستن بە ئاڕاستەکردنی ئەم پڕۆتینانە بۆ دەرکردنی شێوەی کۆتایی زیندەوەر[1]، لەڕێی بەکارهێنانی خێزانێك لە پرۆتینە بەرزەکان کە بە(پێکهاتە پرۆتینییەکان Morphogenic proteins) ناسراون.

دەتوانین (کرداری پەیدابورن Morphogenisis) بە نموونەیەك ڕوون بکەینەوە، کە وێنەکەمان بۆ نزیك بکاتەوە: کە بریتییە لە سیستەمێك بۆ گۆڕینی ئەو وشانەی، کە لەسەر کاغەز دەیاننوسین و تیایدا بە وردی شێوەی مرۆڤ وەسف دەکەین و گۆڕینی بۆ مرۆڤێکی ڕاستەقینەی گۆشت و خوێن)! ئایا ئەمە لە بنچینەکانی دیاردەی ژیان نییە؟

---

(١) وەك ئەوەی کە بنچینەی هەر ئەندامێك و شێوەکەی و شوێنەکەی دیاری بکەی، بۆ نموونە گورچیلە لەمە و لەوە پێکدێت، شێوەکەی وەك شێوەی دەنکە فاسۆلیا وایە، دوو گورچیلەکە دەکەونە ئەم شوێنەی سکەوە، هەموو ئەندامەکانی تری لاشەی زیندەوەریش بە هەمان شێوە.

## پێنجەم: زیندەوەران ئامانجێکیان هەیە کە لە بنچینەیاندا چەسپێنراوە = ئامانجدارێتی Purpose fulness

یەکێك لە خاسیەتە بنچینەییە جیاوازەکانی ژیان ئەوەیە کە زیندەوەران ئامانجێکیان هەیە کە لە بنچینەیاندا چەسپێنراوە، ئەویش (پارێزگاریکردنە لە بوونیان، واتا مانەوەیان)، ئەم ئامانجەیش لە ماددەی نازیندوودا بوونی نەبوو کە بوونەوەرانی لێوە درووست بوون. کاتێك ئەرستۆ تێبینی ئەو پەیوەندییەی کرد، پێناسەی ژیانی بەوە کرد کە بریتییە لەوەی شتێك رژدو لە خەمی بوونیدا بێت.

چەند ئامانجێکی تری لاوەکی یاریدەدەری ئەم ئامانجە سەرەکییەن کەپاڵنەری زیندەوەرن و لە ژیانیدا ئاراستەی دەکەن، کە بێگومان گرنگترینیان بریتییە لە زۆربوون، کە سێکس یارمەتیدەرە، پاشان بوونی خواردن و جووڵە و دەردان و هی تر...کە ئامانجەکە (بریتییە لە پارێزگاریکردن لە بوون)، هەروەها ئەو ئامانجە لاوەکییانەی کە خزمەتی دەکەن فیترەتێکی غەریزیین تا ئەو ئاستەی کە ژیان بۆتە خاسیەتێکی بەهێز کە پێگەی خۆی لە دەروونی زیندەوەراندا جێگیر کردووە!

## شەشەم: خودکاری بەڕێوەبردن Autonomous

ئۆتۆمبێلی ئۆتۆماتیك کە بە کۆمپیوتەرێکی پێشکەوتووەوە بەستراوەتەوە پێویستی بە کەسێك هەیە کە دیزایینی بکات و درووستی بکات، پاشان پێویستی بە وزە هەیە، پاشان پێویستی بە کەسێك هەیە کە کاری پێ بکات و ئاراستەکەی دیاری بکات و لێی بخورێت. هەرچی زیندەوەرە، ئەوا دیزاینەرە زیرەکەکەی (خوای پەروەردگار) توانای زۆربوونی پێداوە، بۆیە پێویستی بە درووستکەر نییە، هەروەك چۆن ئامرازی پێویستیشی بۆ داناوە بۆ بەدەستهێنانی

وزە لە خۆراك و ئۆكسجین، ئامانجیشی لە بنچینەكەیدا چەسپاندووە تا ئاڕاستەی بكات بۆ كارێك و بەدەستهێنانی ئەو شتەی كە سوودی بۆی هەیە، هەموو ئەم شتانە بەبێ پێویستبوون بە یارمەتیدەرێكی دەرەكی ئەنجام دەدرێن.

بە هەمان شێوە ئەگەر زیندەوەر بە رۆبۆت بەراورد بكەین كە وا دێتە بەرچاو كە خۆی خۆی بەڕێوە دەبات، ئەوا دەبینین كە ئەم ئامرازە پێویستی بە كەسێك هەیە كە درووستی بكات و بەرنامەڕێژی بۆ بكات و وزەی پێ ببەخشێت و چاكی بكاتەوە، لەبەرئەوە (بەڕێوەبردنی خودكار)خاسیەتێكی زۆر تایبەتە و بەڵگەیە لەسەر ژیان.

## حەوتەم: كاركردن بە یەككگرتوویی Uniti

هەموو چالاكییە بایۆلۆجییەكان و خاسیەتە وجودیەكانی، وەك وجودێكی یەكگرتوو خزمەتی زیندەوەر دەكەن، ئەگەرچی ڕوودانی ئەم كردارە لە بوونەوەرە تاك خانەكان ئاسانترە، چونكە ڕوودانی لە بوونەوەرە فرەخانەییەكان زۆر ئەستەمە، چونكە ئەم بوونەوەرانە وەك یەك خانە (هێلكۆكەی پیتێنراو = زیجوت) كە بۆ ملیۆنان یاخود ملیارەها خانە دابەش ببێت، پاشان هەر كۆمەڵەیەك لەم خانانە جیا دەبێتەوە، بۆ ئەوەی ببێتە شانەیەك پاشان ئەندامێكی دیاریكراو، ئەم شانە و ئەندامانەش بە ڕێكخراویی كار دەكەن بۆ ئەوەی ئەو بوونەوەرە بەدی بێنن كە وا هەست دەكات یەكگرتووە.

هەرچەند زانست پێش بكەوێت ئەوا هێشتا یەكگرتوویی زیندەوەر لەسەر ئاستی بایۆلۆجی و وجودییەوە پڕ دەبێت لە نهێنی[1].

---

(١) بۆ ئەوەی ئەندازەی ئاڵۆزی ئەم خاسیەتە بزانین و لەوە تێبگەین كە پرسێكی بەدیهی نییە، ئاماژە بۆ ئەوە دەكەین كە ئەو نەخۆشانەی تووشی تێكچوونێكی دیاریكراو لە بەشی دیواری لای راستی مێشك بوون، دەكرێ تووشی نەناسینەوەی یەكێك لە ئەندامەكانیان بن(بۆنموونە لەپی دەستیان) و هەست بەوە نەكەن كە بەشێكە لە لاشەیان، یاخود لەوانەیە وەك مارێك لێی بڕوانن، ئەم دۆخەی نەخۆشیش بە(هاوڕێچی لەپی دەستی نامۆ Alllen Hemineglect یان Hand Syndrome.

## هەشتەم: توانای زۆربوون[1] Replicable

زۆربوون میکانیزمی سەرەکی پەرسەندنە؛ چونکە ڕوودانی هەڵبژاردنی سروشتی پێویستی بە زۆربوونی زیندەوەران هەیە، پاشان ناکرێ پەرەسەندن بە هەڵبژاردنی سروشتی هۆکاری پەیدابوونی زۆربوون بێت هەروەك چۆن داروینییەکان بانگەشەی بۆ دەکەن! واتا زۆربوون ئەو ئەسپەیە کە عارەبانەی هەڵبژاردنی سروشتی رادەکێشێت، نەك بە پێچەوانەوە.

گومان لەوەدا نییە کە درووستبوونی زۆربوونی ڕەگەزی بەڵگەی حاشا هەڵنەگرە لەسەر ئەوەی کە پەرەسەندن بە پلانێکی پێشوەخت ڕوویداوە، چونکە ئەوە پێویستی بە دەرکەوتنی سیفاتی نوێ هەیە، کە زۆر بە وردی لە نێر و مێدا گونجاوبێت، ئیتر چۆن ئەم گۆڕانکارییە ڕێکخراوانە بە ڕێکەوت لە هەر یەکە لە دوو ڕەگەزەدا بە سەربەخۆ ڕوویانداوە؟!!

بە هەمان شێوە بوونی زۆربوون وەك خاسیەتێکی هاوشانی ژیان ئەوە دڵنیا دەکەنەوە کە پەیدابوونی ژیان کارێکی هەڕەمەکی نەبووە، بەڵکو نەخشەیەکی پێشوەخت بوونی هەبووە، کە ئامانجی بەردەوامبوونی وجودی زیندەوەران بووە لە ڕێی وەچەکانیانەوە.

ئەمانە خاسیەتی وجودی جیاکەرەوە و هاوپێچی دیاردەی ژیانن، کە نیشانمان دەدات ژیان تەنیا چەند فەرمانێکی بایۆلۆجی نییە کە زیندەوەر پێی هەڵدەستێت، بەڵکو دیاردەیەکی زۆر ئاڵۆزە کە پێویستی بە دیزاینەرێکی زیرەك هەیە کە لەپشت پەیدابوون و بەردەوامبوونییەوە وەستابێت.

---

(١) (زۆربوونی زیندەوەرەکان بە شێوەیەکی نائێکسی دەستی پێکرد، کە بوونەوەری تەواو هاوشێوە لە جیناتی خانەی بنچینەییدا بەرهەم دەهات، تا ئێستایش ئەم جۆرە زۆربوونە لە بوونەوەرە سەرەتاییەکاندا بوونی هەیە، وەك بەکتریا و کەڕووەکان، پاشان زۆربوونی سێکسی پەیدابوو کە تیایدا جیناتی دایك لەگەڵ جیناتی باوك تێکەڵ دەبن و بوونەوەری خاوەن بنچینەی جینی نوێ پەیدادەبێت.

## پەیدابوونی خانەی زیندوو :

ریچارد دۆکنز و ئەندامانی مێگەلەبێباوەڕکەی (کە خۆی وەها وەسفیان دەکات)، ژیان بە دیاردەیەکی سەربەخۆ دادەنێن، کە دەکرێ دوور لە پەیدابوونی خانەی زیندوو لە پەیدابوونی بکۆڵرێتەوە! هەروەها وایدەبینن کە پەیدابوونی ژیان تیشك دەخاتە سەر بەدەستهێنانی DNA ی شیاو بۆ دابەشبوون، هەروەها بانگەشەی ئەوە دەکەن کە درووستبوونی ئەو بەشانەی ماوەتەوە لە خانە کارێکی ئاسانە و دی ئێن ئەی دەتوانێت ئەم بەشە ئاڕاستە بکات. لە کاتی خستنەڕووی خاسیەتە وجودییەکانی ژیان هەڵەیی ئەم چەمکەمان سەلماند و، بینیمان کە ژیان دیاردەیەکە بەبەر زۆربەی بەشەکانی خانەدا دەکرێت[1].

زانستی نوێ هەر بوونەوەرێك وەك دوو پێکهاتە سەیر دەکات؛ پێکهاتەی ماددی و پێکهاتەی مەعریفی، لەبەرئەوە پێویستە لە کاتی بەرپەرچدانەوەی لێکۆڵینەوە لە خانەی زیندوو بە دوای سەرچاوەی ئەم دوو پێکهاتەیەدا بگەڕێین. دەکرێ سەرنجی (پێکهاتەی ماددی)[2] بۆ خانە بدەین بەو پێیەی

---

(١) جگە لە هەندێك ماددەی خۆراکی هەڵگیراو و بۆیاغ و ئەم جۆرە شتانە.

(٢) یەکێك لە راسترین ئەو سیناریۆیانەی بۆ لێکدانەوەی خانەی زیندوو خراونەتەڕوو، بریتییە لە ریزبوونی نەکلۆتیدەکان لەسەر ڕووی بلوورەکانی قوڕی سوورەوەکراو بەهۆی بارگە کارەباییەکانەوە، پاشان بەیەکەوە لکانیان بۆ پێکهێنانی بەشی RNA. بلوورەکانی قوڕ ڕۆڵێکی تریشیان هەیە لە پەیدابوونی ژیان، چونکە پێکهاتەی ئاڕتە کاربۆنییە تازە پەیدابووەکان لەلایەن ڕووی قوڕەکەوە دەمژرێن(تایبەتمەندی مژین Adsorption)، کە ڕێگا بە بەردەوامبوونی کارلێك دەدات بە ئاڕاستەی پێکهێنانی ئاڕتەی نوێ و کارلێکەکە بە پێچەوانە نابێت.

RNA لەم قۆناغەدا لە ڕووی پێکهاتنییەوە لە ریزبەندی نەکلۆتیدەکان لە ڤایرۆسەکان دەچێت، ئەگەرچی لەلایەنی پێویستنەبوونی بە خانەی زیندوو کە لەڕێیەوە ڤایرۆس زۆر دەمێت جیاوازە لێی، لەبەرئەوە بیردۆزەکە ناوی بیردۆزی نیمچە ڤایرۆسی(ڤایرۆسۆید Virosoid)ی لێنراوە، بۆ دەستکەوتنی وزەی پێویست بۆ زۆربوون بەشی RNA هەستاوە بە شیکردنەوەی ماددە ئەندامییەکان کە لەناو شلەی

دەوریدا بوونیان هەیە، بە هەمان شێوە هەندێك لە ڤایرۆسۆیدەكان بە دەوریاندا پەردەیەكیان درووست كردووە كە مادده خۆراكییەكانی تێدا هەڵ بگرێت. بەمەش یەكەم پرۆكاریۆت (بوونەوەری تاك خانەیی و ناوك سەرەتایی) لەسەر ڕووی زەوی پەیدابوو(قۆناغی یەكەمی درووستبوونی خانە).

دوای ئەوە خانە ((یۆكاریۆتییەكان Eucaryotes)) (ناوكدار درووست بوو پێش نزیكەی ٢،٧ بلیۆن ساڵ). سیناریۆ ڕاستەكە بۆ درووستبوونی ئەم خانانە ئەوەیە كە لە یەكگرتنی جۆری جیاوازی پرۆكاریۆت پەیدابوون، ئەمەش وەك شوێنكەوتنێك بۆ (بیردۆزی پێكەوەژیانی ناوخۆیی Endosimbiotlce Theory)، كە ژنە زانای بایۆلۆجی ئەمریكیی لین مارگۆلیس Lynn Margwlis كە لە ساڵی ١٩٦٧ داینا.

بەپێی ئەم دید و بۆچوونە هەندێك لە خانە پرۆكاریۆتییە نا هەواییەكان هەستاون بە قووتدانی خانە پرۆكاریۆتییەكان كە توانای نیشاندانی ڕووناكیيان پەیدا كردووە، بەمەش هاوشێوە كلۆرۆ پلاستات كە لە خانە ڕووەكییەكاندا بوونی هەیە بۆی پەیدا بووە، هەروەها هەندێك لە خانە نا هەواییەكانی تر هەستاون بە قووتدانی خانە هەواییەكان، بەمەش لە هاوشێوەی مایتۆكۆندریای ناو خانە ئاژەڵییەكانی بۆ پەیدابوو، بەمەش خانە نا هەواییەكان توانای ڕەفتار كردنیان لەگەڵ ئۆكسجینی ژەهراویدا پەیدا كرد. لە هەمان كاتدا خانە قووتدراوەكان بەرگری و خۆراكیان لەناو ئەو خانانە پەیدا كرد كە قووتیان دابوون، واتا سوودەكە ئاڵوگۆڕە، لەبەرئەوە بیردۆزەكە بە بیردۆزی پێكەوە ژیانی ناوخۆیی ناسراوە.

هەروەها ماددەی بۆماوەیی DNA هەندێك لە پرۆكاریۆتەكان لەناو یەك ناوكدا كۆكرایەوە، لەپێناو ڕێكخستنی دابەشبوونی خانە، جگە لە ماددەی بۆماوەیی مایتۆكۆندریا و كلۆرۆپلاست، كە لە دەرەوەی ناوك مانەوە.

بەمەش ژمارەیەك لە پرۆكاریۆتەكان بوون بە خانەیەك لە ڕاستییەكانی ناوكدا (یۆكاریۆتات)، ئەمەش (قۆناغی دووەمی درووستبوونی خانەیە).

ئەوانەی گرنگی بە لێكۆڵینەوە لە درووستبوونی ژیان دەدەن وایدەبینن كە ڕای درووست ئەوەیە كە بوونەوەرە ساواكان RNA یان وەك كۆدی بۆماوەیی لە ناو كرۆمۆسۆمەكانی خانەكانیاندا بەكارهێناوە، بۆماوەی نزیكەی پێنج سەد ملیۆن ساڵ (بوونەوەركانی ئەو ماوەیە بە بوونەوەركانی جیهانی ئاڕ ئێن ئەی(RNA World) ناسراون، بەڵام ئەو جیهانە بەهۆی لاوازی بەشەكانی ئاڕ ئێن ئەی تووشی ئەمان هات و هەندێك تەنۆلكەی بۆ جێهێشتین كە ئاڕ ئێن ئەی لەخۆ گرتبێت كە وەك نیشانەكانی گەورەیی ئاڕ ئێن ئەی لە ماوەكانی پێشووتردا مانەوە، لەو نیشانانەش ئەو ڕایبۆزۆمانەی كە لە خانەكانی لاشەماندا بوونیان هەیە.

لەدوای ئەوە چەند دەستكارییەك لە بەشی ئاڕ ئێن ئەی ڕوویاندا، گەردیلەی ئۆكسجین لە ئاڕ ئێن ئەی جیاكرایەوە(كە وایلێدەكات ناجێگیر بێت) ئەمەش ڕێگای بەوەدا كە دی ئێن ئەی درووست بێت-كە لە ئاڕ ئێن ئەی جێگیرترە- كە لە زنجیرەی لوولپێچی زۆر درێژتر پێكهاتووە(كە دەگاتە ملیۆنان نایكلۆتید) و دەتوانێت بە شێوەیەكی توندتر و كەم هەڵەتر زانیارییەكان هەڵبگرێت، هەروەك چۆن بەتواناترە لە كۆپی بوون بەهۆی ئەوەی كە دوو سەرەیە.

لە دی ئێن ئەیشەوە كرۆمۆسۆماتی خانە درووست بوون، كە شێوازی جینی بۆ زۆربەی بوونەوەرانی ئێستا هەڵگرتووە(جیهانی دی ئێن ئەی DNA World). شایانی باسە كە تەمەنی كۆنترین حەفریاتی بەكتریا كە تیایدا ماددەی بۆماوەیی لە دی ئێن ئەی پێكهاتبێت دەگەڕێتەوە بۆ پێش ٣،٧ ملیار ساڵ.

کە سێ گۆشەیە، گۆشەیەکیان بریتییە لە درووستبوونی پرۆتینەکان، کە یەکەی بنیاتنانی زۆربەی پێکهاتەکانی خانەی زیندووە، دووەمیشیان بریتییە لە درووستبوونی دی ئێن ئەی و میکانیزمی بەکۆدکردن، کە ئەنجامی دەدات، هەرچی گۆشەی سێیەمیانە ئەوا بریتییە لە درووستبوونی پەردەی خانەی موعجیزە سەرسامکەرەکە کە دەوری خانەی داوە. لەم بەشەی ئەم تەوەرەیەدا چەند هەڵوەستەیەک دەکەین، کە بە ڕوونی درووستبوونی خانەی زیندوو بە شێوەیەکی هەڕەمەکییانە دەردەخات، پاشان لە کۆتایی تەوەرەکەدا هەڵوەستەیەک دەکەین بۆ قسەکردن دەربارەی سەرچاوەی پێکهاتەی زانیاری خانەی زیندوو، کە بە شێوەیەکی گەورەتر پێویستی بۆ بوونی خودای دانای بە توانا دەسەلمێنێت.

## بیردۆزەکانی درووستبوونی خانە :

ئەو بیردۆزانەی بۆ تەفسیرکردنی چۆنیەتی درووستبوونی خانەی زیندوو دانراون، بۆ سەر دوو کۆمەڵەی گەورەدابەش دەبن:

### یەکەم: سەرەتا جینەکان Replicator First

ریچارد دۆوکنز ئەم چەمکە پەسەند دەکات و لە کتێبەکەی (جینی خۆپەرست) دا دەڵێت: ((لە قۆناغێکی دیاریکراودا (بە ڕێکەوت Accident) بەشی دی ئێن ئەی(جادوویی) جیاواز پەیدابوو، کە توانای بەرهەمهێنانی کۆپی هاوشێوەی خۆی هەیە Replication، ئەم بەشەیش کە (زانیاری) پێویست بۆ بنیاتنانی پرۆتینەکان هەڵیگرتووە (ئەم جادووگەرە لەکوێیە کە ئەم جادووەی ئەنجامداوە؟! سەرچاوەی ئەم زانیارییانە چییە؟! سڵاو لەو زانستە...ئا بەم سادەییە، ئەمە کاری ڕێکەوت و جادووە، بەڵام ئایا ئەمە بە زانست دادەنرێ؟!).

وا گومان نەبەی کە من ئەو پیاوە تۆمەتبار دەکەم، تۆیش دەتوانی بگەڕێیتەوە سەر سەرچاوەکانی ئەم پیاوە خەڵە فاوە[١].

## دووەم: سەرەتا کیمیا - ڕێکخستنی خودکار Self organization

ئەم سیناریۆیە باس لەوە دەکات کە بەشی پرۆتین دەکرێ بەشێوەیەکی خودکار و لەڕێی ڕێکخستنی پێکهاتەکانییەوە پەیدا ببێت، بەبێ ئەوەی پێویستی بەو کۆدە هەبێت کە دی ئێن ئەی هەڵیگرتووە. ئەمەش بە تەوژمە بازنەییە ڕێکخراوەکان دەچوێنن کە لە ناودا ڕوودەدەن بەر لەوەی بکوڵێت، ئایا تایبەتمەندییە فیزیاییەکانی ڕەگەزەکانی پێکهاتەکانی پرۆتین (کاربۆن و هایدرۆجین و ئۆکسجین و نایترۆجین و فۆسفۆر) ئەوەیە کە بەشی پرۆتینی زۆر ئاڵۆز بەرهەم بێنێت؟ هیچ زانایەکی فیزیا قسەیەکی لەم جۆرەی نەکردووە.

## پشێوی بەدیهێنەر و ڕێکخراوی خۆکرد :

بۆ لێکدانەوەی چۆنیەتی خانەی زیندوو جا چ سەرەتا جین بێت یان کیمیا. ماددیگەراکان پەنایان بردە بەر شێوازێك، کە زۆر جار بۆ لێکۆڵینەوە لەم جۆرە دیاردانە پەنای بۆ دەبەن، ئەویش بریتییە لە ناونانی دیاردەکە بە ناوێك، کە خەڵك پێیەوە سەرقاڵ بن و بەدوای لێکدانەوەی ڕاستەقینەی دیاردەکەدا نەگەڕێن. داروینییەکان ئەمجارەیان پەنایان بردۆتە بەر چەمکی (پشێوی بەدیهێنەر و ڕێکخراوی خۆکرد)[٢]، کە مەبەست لێی پەیدابوونی ڕێکخراوییە لە نا

---

(١) لە کتێبی (جینی خۆپەرست) Selfish- Gene oxford 1989.p.12

(٢) (الفوضی الخلاقی والتنظیم الذاتي Creative Chaos and self oraganisation).

ڕێکخراوبی فەوزاو و پشێوییەوە، بەوە پێناسەیان کردووە کە بریتییە لەو کرداری کە بەهۆیەوە هەر دامەزراوەیەك ڕێکخراوی خۆی زیاد دەکات، بەبێ دەستتێوەردانی هیچ هێزێکی دەرەکی و هیچ سەرکردایەتییەکی ناوەندیی ناوەخۆیی[1]!

گەورەترین هەڵە کە زۆر کەس تێیدەکەون وا تێدەگەن فەوزاو پشێوی بەدیهێنەرو ڕێکخراوبی خودی کردارێکی هەڕەمەکییە، لە ڕاستیدا ئەم کردارە ملکەچی کۆمەڵە یاسایەکی زۆر وردو ئاڵۆزە بە جۆرێك زانایان ناتوانن چاودێری و موتابەعەی بۆ بکەن.

بەرزترین شت کە پشێوی بەدیهێنەر (ئەگەر دانیش بەوەدا بنێین کە دەتوانێت) بەدیبێنێت بریتییە لە بەدیهێنانی هەندێك (ڕێکخراوبی Order)، وەك ئەوەی کە (با) چەند هێڵێك لەسەر لمی بیاباندا درووستی دەکات، ئەمەش خاڵی نییە لە چەند یاسایەك کە ڕێکی دەخات، بەڵام پەیدابوونی سیستەمەکان Systems وەك درووستکردنی کۆشکێك لەو لمە، یان درووستکردنی پرۆتین لە ترشە ئەمینییەکان و بنیاتنانی کۆدی بۆماوەیی لە بنچینە نایترۆجینییەکانەوە، ئەوا بێگومان پشێوی بەدیهێنەر کە باسی دەکەن ناتوانێت بەدیبێنێت.

---

(١) ئەوانەی باوەڕیان بە پشێوی بەدیهێنەر هەیە قسەی هونەرمەندی گەورە (پیکاسۆ) لەسەر پشێوی بەدیهێنەر بە بەڵگە دێننەوە، کە دەڵێت: ((هەروەك چۆن ناتوانی هێلکە و ڕۆن بەبێ شکاندنی هێلکەکە درووست بکەی، ئاوایش ناتوانی هونەرێك پێشکەش بکەی بەبێ ئەوەی پشێوی و ناجێگیری پێشوەختت هەبێت)). ئەوان خۆیان لەوە بێ ئاگا کردووە کە عەقڵێك بوونی هەیە کە کرداری درووستکردنی هێلکە و ڕۆنەکە یان داهێنانی هونەرمەندەکە ڕێکدەخات، ئایا بەدیهێنانی گەردوون و ژیان پێویستی بە عەقڵێکی لەم جۆرە نییە؟!. لە کاتی جەنگی عیراقدا، سەرۆکی ئەمریکا جۆرج بۆش چەمکی پشێوی بەدیهێنەری بەکارهێنا، بۆئەوەی مژدەمان بداتێ کە ئەو خاپوور کردن و کاولکردنە لەلایەن وڵاتەکەیەوە کۆمەڵگایەکی بەرزی دیموکراسی جێگیر بەرهەم دێنێت. ئەگەر چاوپۆشی لە هەموو ئەو هەڵانە بکەین کە لەو بانگەشەیدا بوونیان هەیە، ئەوا ئایا ئەو کۆمەڵگایەی باسی دەکرد بەبێ هەوڵ و تێکۆشان و قوربانی ڕۆڵە دڵسۆزەکانی عیراق دێتەدی؟ لەم دوو نموونەیەدا (پیکاسۆ و بۆش) دەستتێوەردانێکی دەرەکی دەبینین لە سیستەمەکەدا، بکەرێکی ڕێکخەر بوونی هەیە.

ئەگەر درووست بێت ئەم چەمکە لە هونەر و سیاسەت بەکاربێت، ئەوا بەکارهێنانێکی مەجازییە و ناکرێ پەلکێشی گۆڕەپانی زانستی بکەین. ئەگەر زانستێکی تایبەت بۆ لێکۆڵینەوە لە دیاردەی پشێوی بەدیهێنەر (زانستی شەواش) هەبێت، ئەوا بە هاوکێشە وردەکانی لە ئەگەرەکانی درووستبوونی دیاردەکان دەکۆڵێتەوە و لە هۆکارەکانی دواتری ناکۆڵێتەوە.

## دروستبوونی پرۆتین :

کاتێك زانایان هەستیان بە ئاڵۆزییە سەرسوڕهێنەرەکەی خانە کرد، پەنایان بردە بەر دابەشکردنی کێشەکە بۆ چەند قۆناغێك، بەو هیوایەی بتوانن چارەسەرێك بۆ هەر قۆناغێك بە تەنیا بدۆزنەوە. زانای رووسی (ئەلیکساندەر ئۆپارین[1]) پەیڕەوی لەم ئاراستەیە کردووە.بۆیەلە ساڵی ١٩٢٤ز گریمانەی دروستبوونی خانە زیندووەکان بەشێوەیەکی پلەبەندی لە ماددەی نازیندووەوە لە رێی ژمارەیەك کارلێکی کیمیاییەوە خستەڕوو. کە سەرەتا بە پێکهێنانی پێکهاتەی ئەندامی سادە لە گازەکانەوە دەستی پێکرد کە لە هەوای زەویدا بوونیان هەبوو(میسان و ئەمۆنیا و هایدرۆجین و هەڵمی ئاو)، ئەمەش لە ژێر کاریگەری وزەی خۆر و وزەی هەورە تریشقەدا، پاشان ئەم ئاوێتانە ریزبوون و لەناو خۆیاندا کارلێکیان کرد بۆ ئەوەی ئاوێتەی ئاڵۆزتر و ئاڵۆزتر بەرهەم بێنن، تا ئەو کاتەی پرۆتینەکان پەیدابوون، کە خانەی زیندوویان دروستکرد.

کاتێك ستانلی میلەر لە تاقیکردنەوە بەناوبانگەکەیدا کە لە ساڵی ١٩٥٣ز ئەنجامیدا[2] توانی چەند ترشێکی ئەمینی بدۆزێتەوە، هەندێ کەس وایان زانی، کە ئەمە سەلماندنە بۆ گریمانەی زانا رووسییەکە ئۆپارین، بەڵام بەر لە کۆتایی هاتنی سەدەی بیستەم، زانایان هەڵەیی ئەو دەرەنجامەیان سەلماند، بەو هۆیەی، کە دڵنیابوونەوە هەوای زەوی بە تەواوی لەو هەوایە جیاوازە، کە

---

(١) Alex Ander Opparin: (١٨٩٨-١٩٨٠ز) مامۆستای کیمیای زیندەیی لە زانکۆی مۆسکۆ و ئەندامی ئەکادیمیای رووسی بۆ زانستەکان.

(٢) ستانلی میلەر لە نامەی خوێندنیدا ویستوویەتی کە گریمانەکەی ئۆپارین تاقی بکاتەوە، بۆیە تێکەڵەی گازەکانی لە دەفرێکی شووشەییدا داناوە و پریشکی کارەبایی پێدا تێپەڕ کردووە، دوای چەند رۆژێك لەسەر دیواری دەفرەکەدا چەند ترشێکی ئەمینی پەیدابوون، کە بەشدارن لە پێکهێنانی پرۆتین، لەو کاتەدا هەندێ کەس دەنگیان هەڵبڕی و وایان دانا کە ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەگەری دروستبوونی ژیان بەشێوەیەکی خۆکرد!

میلەر تاقیکردنەوەکەی تێدا ئەنجامداوە، چونکە گازە بڵاوەکان بریتیبوون لە نایترۆجین و دووەم ئۆکسیدی کاربۆن و هەڵمی ئاو، سەرەڕای ئەندازەیەکی زۆری ئۆکسجین، کە ئەمانە بەس بوون بۆ ئۆکسان و لەکارخستنی یەك بە یەکی ئەو ئاوێتانەی کە درووستدەبوون.

## لە هـەواوە بۆ ئـاو :

دوای ئەوە ڕۆڵی هەنگاوی دووەم هات(لە دابەشکردنی بابەتەکەدا)، بۆیە زانایان لە هەواوە چوونە سەر لێکۆڵینەوە لە ئاو و گریمانەیەکیان خستەڕوو بە ناوی(شۆربای سەرەتا Primordial Soupa)، کە وایدەبینێت ئاوی زەریاکان پڕبوون لە بەشی ئەندامی وەك ترشە ئەمینییەکان و ترشە ناوکییەکان و کاربۆهیدرات...) و دەوڵەمەندە بە هەندێك خوێ کە گرنگترینیان فۆسفاتە، هەروەها لەڕێی بلیۆنەها کارلێکی کیمیایی هەڕەمەکی لە نێوان ئەو ئاوێتانە بە درێژایی ملیۆنان ساڵ ماددەی زیندوو درووستبووە.

سەرەڕای ئەوپێگەی ئەو شێوەیەی کە لە گریمانەی شۆربای سەرەتایی بەدی دەکرێت، بەڵام زانایان ئەم گریمانەیەیان ڕەتکردۆتەوە. ئەوەتا گەورە زانای جیۆلۆجی ج.پرۆکس لە کتێبەکەیدا (rigin of life) ١٩٨٥ز، جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، چینەکانی زەوی کە بەهۆی دزەکردنی ئاوی زەریاکانەوە لە سەردەمی پێش کۆمپری(ماوەی ئامادەکاری بۆ پەیدابوونی ژیان) درووستبووە، ڕەگەزی نایترۆجینی کەم بووە[1]، کە پێکهێنەری بنچینەیی ترشە ئەمینی و پرۆتینەکانە، بۆیە ئەم شۆربا سەرەتاییە لە بنچینەدا بوونی نییە، تەنیا لە ئەقڵی ئەوانەدا نەبێت کە باسی دەکەن.

---

(١) ئاستەکەی لە ٠,٠١٥٪ تێنەدەپەڕی.

## بێ توانـایی ڕێکەوت :

سەرەڕای ئەوەی کە زانایان ڕۆڵی ئەنجامەکانی تاقیکردنەوەکەی ستانلی میلەریان لە درووستبوونی ژیان ڕەتکردەوە، هەروەها شکستیان بە گریمانەی (شۆربای سەرەتایی) هێنا، بەڵام چەند ئاستەنگێکی تریان خستەڕوو لەبەردەم ئەوەدا کە پرۆتین لە ترشە ئەمینییەکان پێك بێت. ئاستەنگی یەکەم بریتییە لە درووستبوونی زنجیرەی پەپتیدی (Peptide chins) بە ڕێکەوت و لەرێی پەیوەندی نێوان ترشە ئەمینییەکانەوە بوویێت، چونکە هەلی درووستبوونی زنجیرەیەکی پەپتیدی لە سەد ترشی ئەمینی بەشێوەیەکی هەرەمەکیی بریتییە لە ١٠-٨٠، ئەمەش هەلێکی زۆر لاوازە، هەروەها لەگەڵ یاسای دووەمی داینامیکای گەرمی تێکدەگیرێت کە وایدەبینێت دامەزراوەکان ئەگەر لەلایەن ڕێکخەرێکەوە ڕێك نەخرێن بەرەو ناڕێکی زیاتر دەچن.

زانای فیزیا پۆل دیڤیز پێمان دەڵێت کە لە دۆخی زۆر دەگمەندا دەکرێ دامەزراوەکە بەرەو بنیاتنان بڕوات لەبری ئەوەی بەرەو ناڕێکی و پشێوی بڕوات، بەڵام ئەمە پێویستی بە ئەندازەیەکی وا لە ترشە ئەمینییەکان هەیە کە هەموو گەردوون دەخاتە گەڕ بۆ دەستکەوتنی تەنیا تاکە زنجیرەیەکی کورتی پەپتیدی!.

ئاستەنگی گەورە لەبەردەم پێکهێنانی بەشی پرۆتین بریتییە لەوەی، کە زنجیرەی پەپتیدی بەشێوەیەکی تاکی زۆر ئاڵۆز لێك بنالێت بۆ درووستکردنی ئەم بەشە[1].

---

(١) زانای بایۆلۆجیای بەشی (ئارم سمیس) لە کتێبی (دیوانی شیعر) دا ئەمە دەچوێنێت بە نووسینەوەی دیوانێکی شیعر بە بەکارهێنانی پیتەکانی زمان، بەوەی کە دانانی هەر پیتێك لە شوێنێکی دیاریکراودا پێویستە بەپێی یاسای زمان و شیعر بێت.

هەلی ئەوەی، کە ئەمە بە ڕێکەوت روویدات لە زنجیرەیەکدا، کە درێژییەکەی سەد ترشی ئەمینی بێت بریتییە لە $١٠^{-١٣٠}$ هەرچی ئەگەری دروستبوونی پرۆتینە پێویستەکانە بۆ یەك خانە ئەوا دەگاتە $١×١٠^{-٤٠٠٠٠}$.

گەورە زانای فیزیا سێر فرێد هۆیڵ هەلی ڕوودانی ئەمە بەشێوەیەکی هەڕەمەکی بەوە دەچوێنێت کە بایەکی توند بە کۆگایەکی کۆنە ئاسندا تێپەڕ ببێت و پارچە ئاسنەکانی ناوی پێکەوە بلکێن و فرۆکەیەکی بۆینگ٧٤٧ دروست بکەن!.

ئەگەر گریمانەی ئەوە بکەین کە ماوەی بەردەست لە نێوان ساردبوونەوەی زەوی دوای دروستبوونی و لەنێوان دەرکەوتنی یەکەمین حەفریاتی زیندەوەران نزیکەی سەد ملیۆن ساڵ دەبێت، ئایا ئەم کاتە بەس دەبێت بۆ ئەوەی پرۆتینەکانی خانەی زیندوو بە ڕێکەوت دروست بکات[1]؟

پێشتر وەڵامی ئەو پرسیارەمان دایەوە، کاتێك ئەوەمان ڕوونکردەوە کە مەحاڵە یەك بەشی پرۆتین بە ڕێکەوت دروست ببێت(هیمۆگلۆبین) ئەگەر لە ماوەی هەموو تەمەنی گەردوونیش بێت، ئیتر چی دەڵێی دەربارەی دروستبوونی هەزاران بەشی پرۆتین کە خانەی زیندوو پێویستی پێیان هەیە.

ئەوەی کە دەست بە دیدی هەڕەمەکیی و ڕێکەوتەوە بگرێت بۆ لێکدانەوەی دروستبوونی ژیان، ئەوا جگە لە بێ ئاگایی زۆری دەربارەی یاساکانی ڕێکەوت و زانستی بایۆلۆجیا هیچی تر ناسەلمێنێت، لەبەرئەوە زۆربەی زانا ماددیگەراکان کە گرنگی بە بنچینەی ژیان دەدەن(لە شەستەکانی سەدەی بیستەمەوە) دیدی ڕێکەوت رەتدەکەنەوە و دان بە بێ توانایی خۆیاندا دەنێن لە

---

(١) سەرنج بدە، ئەگەر پێکهاتنی بەشێکی پرۆتین پێویستی بە بوونی * ترشی ئەمینی گونجاو لە جۆری چەپ Left Handed هەبێت. ** ڕیزبوونی ئەم ترشانە بە ڕیزبەندی داواکراو (وەك پیتەکان لەناو ڕستەدا). *** دروستبوونی پەیوەندی لەنێوان ئەم ترشە ئەمینیانە. **** پێنج خواردنی زنجیرەی پەپتیدی پەیدابوو بۆ ئەوەی شێوەیەکی زۆر ئاڵۆز وەربگرێت، کە بە بنیادی لاوەکی ناسراوە. ***** کۆبوونەوەی ئەو زنجیرانەی کە بونیادی لاوەکییان هەیە لە شوێنێکدا کە بە بنچینەی چواری بەشی پرۆتین ناسراوە. ئەمەش بۆ ئەوەی توانای ئەوەی هەبێت کە بە فرمانەکانی هەڵبستێت.

پێشکەشکردنی لێکدانەوەیەکی زانستی و لۆژیکی، ئەگەرچی کەسی بایۆلۆجی ئاسایی هێشتا باوەڕیان وایە کە ئەگەر بێت و ترشە ئەمینییەکان لەگەڵ یەکتردا بۆ ماوەی چەند ملیۆن ساڵێك جێبهێڵین ئەوا ژیان پەیدا دەبێت.

## کێشەی هێلکە و مریشك : کامیان پێش کامیان؟!

لەوەی رابورد ئەو میکانیزمە خەیاڵیانەمان پووچەڵکردەوە، کە داروینییەکان بۆ لێکدانەوەی پەیدابوونی ژیان بەرێکەوت خستبوویانەڕوو و لایەنە کەموکوڕییەکانیمان خستەڕوو، بەڵام سەرەڕای ئەوەش کێشەی هێلکە و مریشکە، کە بەتووندی لەبەردەم لێکدانەوەکانی مادیگەراکان وەستاوەتەوە لە دوو لایەنەوەیە:

### ا- پەرەسەندنی کیمیایی Chemical Evolution رەتکراوەیە :

لایەنگرانی داروینیزمی نوێ بانگەشەی ئەوە دەکەن کە هەڵبژاردنی سروشتی بەر لە درووستبوونی خانەی سەرەتایی، هەستاوە بە هەڵبژاردنی شیاوترین بنچینە نایترۆجینییەکان بۆ پێکهێنانی بەشی نزیك لە بەشی دی ئێن ئەی، کە لە ئێستادا لەناو خانەی زیندوودا بوونی هەیە، پاشان ئاوێتە هەڵبژێردراوەکە چۆتە ژێر باری چەند کردارێکی چاکسازی تا گەیشتۆتە ئەم شێوەیەی ئێستای بەشی دی ئێن ئەی، ئەم کردارەشیان ناوناوە (هەڵبژاردنی سروشتی پێش بایۆلۆجی Prebiological Natural Sellection) یان (پەرەسەندنی کیمیایی Chemical Evolution)، ئەم قسەیەش سەر لە بەری رەتکراوەتەوە.

ئەگەر هەڵبژاردنی سروشتی رۆڵێکی گرنگی لە پەرەسەندنی زیندەوەراندا هەبوویێت لەسەر ئاستی بایۆلۆجی (واتا دوای دەرکەوتنی ئەم بوونەوەرانە)، ئەوا

مەحاڵە پێش درووستبوونی ژیان ڕۆڵیکی گێڕابێت (لەسەر ئاستی کیمیایی).
لەبەرئەوەی پەرەسەندن(هەتا ئەگەر کیمیاییش بێت) پێویستی بە زۆربوونی بوونەوەران هەیە بۆ ئەوەی هەڵبژاردنی سروشتی سیفەتە بۆماوەییە باشەکان بۆ نەوەکانی دواتر بگوازێتەوە، کەواتە ڕوودانی هەڵبژاردنی سروشتی پێویستی بە زۆربوون هەیە، کە ئەویش پێویستی بە کۆدی بۆماوەیی هەیە، ئیتر چۆن ڕۆڵی دەبێت لە درووستکردنی ئەم کۆدەدا، هەروەها چۆن ڕۆڵی دەبێت لە درووستکردنی خانەی زیندوودا؟!

لەبەرئەوە چەمکی (هەڵبژاردنی سروشتی پێش بایۆلۆجی Prebiological Natural Sellection) دەستەواژەیەکی دژیەکە. ئەمە کێشەی هێلکە و جوجەڵەیە، کامیان یەکەمجارە: لەپێناو ڕوودانی پەرەسەندنی کیمیایی بۆ گەیشتن بە کۆدی بۆماوەیی گونجاو پێویستە زۆربوون رووبدات، لەپێناو زۆربوونیش پێویستە کۆدی بۆماوەیی گونجاوبێت!!

پرسەکە لە پیاوێك دەچێت کە کەوتبێتە چاڵێکەوە، جا بۆ ئەوەی لە چاڵەکە دەربچێت پێویستی بە ئامرازێکی وەك قادرمە هەیە، چی دەڵێی دەربارەی عەقڵی کەسانێك کە پێشنیاری ئەوە بکەن کە پیاوەکە لە چاڵەکە بێتە دەرەوە بۆ ئەوەی قادرمەیەك بۆ خۆی بێنێت ئینجا پێیدا سەر بکەوێت؟!

## کامەیان پێشتر؛ پرۆتین یان دی ئێن ئەی؟

کێشەی هێلکە و مریشك کە کامیان پێش کامیانە؟! جارێکی تر لە کاتی گفتوگۆکردنمان دەربارەی پەیوەندی نێوان کۆدی بۆماوەیی دی ئێن ئەی و پرۆتین دێتەوە بەردەممان، کە بریتییە لە یەکێك لە گەورەترین ئەو کێشانەی رووبەڕووی ئەو کەسانە دەبێتەوە کە گرنگی بە بنچینەی ژیان دەدەن.

کێشەکە لێرەدا لەوەدا کورت دەبێتەوە، کە کۆدی بۆماوەیی(دی ئێن ئەی) پێویستی بە ئەنزیم هەیە بۆ ئەوەی بە کاری خۆی هەڵبستێت، ئەنزیمەکانیش جگە

لە پرۆتینات هیچی تر نین، واتا کۆدی بۆماوەیی پێویستی بە پرۆتین هەیە، لە هەمان کاتدا بنیاتنانی پرۆتین پێویستی بە کۆدی بۆماوەیی هەیە بۆ دیاریکردنی ترشە ئەمینییەکان کە لێی پێکهاتووە، هەروەها بۆ بەیەکەوە بەستنەوەیان.

کەواتە پرۆتینەکان بەبێ دی ئێن ئەی درووست نابن، دی ئێن ئەییش بە پرۆتین نەبێت کار ناکات، ئیتر چۆن دوو سیستەمی جیاواز بە شێوەیەکی سەربەخۆ و هەرەمەکییانە درووست دەبن، لە کاتێکدا کە هەر یەکێکیان پێویستی بەوی تریان هەیە بۆ بوون و کاروفەرمانەکانی!!

لە پێناو زاڵبوون بەسەر ئەو کێشەیەدا ماددیگەراکان زۆر لێکدانەوەی ماددییان خستۆتەڕوو[1]، کە هیچ شتێکی لە بابەتەکە نەگۆڕیوە؛ چونکە هەموویان پێویستییان بە سەرچاوەیەکی زیرەکانەی زانیاری هەیە، هەروەك دواتر دەیبینین.

---

(١) یەکێك لە بەناوبانگترینی لێکدانەکان (گریمانەی ئار ئێن ئەی یەکەمجار RNA First Hypothesis)ە، کە وای دەبینێت کە ژیان بەو بوونەوەرانە دەستیپێکردووە کە کۆدی بۆماوەییان لە ئار ئێن ئەیدا هەڵگیراوە و کە بریتییە لە ترشێکی ناوکی هاوشێوەی دی ئێن ئەی؛ کە کۆدی بۆماوەیی هەڵدەگرێت و ریزبەندی ترشە ئەمینییەکان لە پرۆتینەکاندا رێکدەخات، لە هەمان کاتدا پێویستی بە ئەنزیم نییە بۆ ئەوەی بە کاری خۆی هەڵبستێت، دوای ئەوە بەشی دی ئێن ئەی وەك هەڵگری کۆدی بۆماوەیی لە زیندەوەراندا پەیدابووە، لە ئەنجامی لێکئاڵانی دوو بەشی ئار ئێن ئەی بە دەوری یەکتردا.

گریمانەی(سەرەتا ئار ئێن ئەی) کێشەی درووستبوونی ژیانی چارەسەر نەکرد، چونکە زۆر پرسیار بەبێ وەڵام ماونەتەوە:

یەکەم: چۆن ئار ئێن ئەی لە سەرەتادا درووست بوو؟

دووەم: بەشی ئار ئێن ئەی بەشێکی ناجێگیرە، کەواتە چۆن هەوای بەهێزی زەوی لە کات و ساتە قورسەکاندا خۆی گرتووە؟

سێیەم: گرنگترین بەندی کۆدی بۆماوەیی بریتییە لە بوونی زانیاری، ئەو زانیارییانەی بۆمان کۆد کراون لە ئار ئێن ئەیدا لە کوێوە هاتوون؟

چوارەم: ئار ئێن ئەی لە پێناو زۆربوونیدا پێویستی بە بەشێکی ئار ئێن ئەی هاوشێوەی خۆی هەیە کە لە تەنیشتییەوە بێت، جارێکی تر گەڕاینەوە سەر کێشەی رێکەوت و یێتوانایەکەی، بەوپێیەی کە ئەگەری روودانی ئەو رێکەوتە لە ١×١٠-٧٣ تێپەڕ ناکات.

پێنجەم: چۆن بەشی ئار ئێن ئەی گۆڕاوە بۆ بەشی دی ئێن ئەی کە وا ناوبانگی دەرکردووە کە بریتییە لە بەهێزترین بەش کە تائێستا زانستی بایۆلۆجیا ناسیویەتی.

لە کۆتاییدا دەڵێین: چ کۆدی بۆماوەیی لە دی ئێن ئەیدا هەڵگیرابێت یان لە ئار ئێن ئەیدا، ئەوا هیچ لە بابەتەکە ناگۆڕێت، چونکە زانیاری لە کۆدی بۆماوەییدا بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگرە لەسەر بوونی خودای بەدیهێنەر.

فرانسیس کۆڵینز[١] حەقیقەتی هەڵوێستی پێش هێلکە و مریشکمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، کاتێك دەڵێت: ((دی ئێن ئەی ژیانی بەدینەهێناوە، بەڵکو ژیان دی ئێن ئەی بەدیهێناوە، دی ئێن ئەی زیاتر پشت بە ژیان دەبەستێت لەوەی ژیان پشت بە دی ئێن ئەی ببەستێت)) ئەمە ئەو ژیانەیە کە جگە لە خودای باڵادەست سەرچاوەیەکی نییە.

بەرهـــەم:

ئەو هەڵوێستەی کە تائێستا دەربارەی ژیان پێیگەیشتووین لەڕێی بۆچوونی هەندێك لەو زانایانەی گرنگی بەو پرسە دەدەن ڕوون دەکەینەوە:

پۆڵ دیڤیز جەوهەری ژیان بەوە دیاریدەکات، کە: (ژیان تەنیا بریتی نییە لە ڕێکخستن، بەڵکو ڕێکخستنێکی زاتییە، کە خانەکە لە ناوەوە ئاڕاستەی دەکات). ئەگەر ئەو شەپۆلانەی لەناو ئاودا پەیدا دەبن بریتی بن لە ڕێکخستنێك، کە لە کارلێکی هۆکارە دەرەکییەکان(وزەی گەرمی) لەگەڵ خاسیەتەکانی ئاو ڕوویدات، ئەوا ڕێکخستنی خانەی زیندوو لەناوەوەی خانەوە ئەنجام دەدرێت(جینات - هۆکارە ڕێکخەرەکانی جینات - پەردەی خانە -...).

هەروەها فرانسیز کۆڵینز گوزارشت لە سەرسامبوونی خۆی دەکات دەربارەی پەیدابوونی ژیان تەنیا لە ماوەی یەك ملیۆنساڵدا دوای ئەوەی، کە زەوی سارد بووەوە، دەڵێت: هەموو ئەو میکانیزمانەی خراونەتەڕوو هیچ شتێك شی ناکەنەوە.

سەرەڕای ئەوەی کە لەگەڵ موعجیزەکاندا هاوسۆز نییە، سێر فرانسیس کریك دەڵێت: وا دەردەکەوێت کە ژیان بە موعجیزە دەستیپێکردووە، یان ئەوەتا لە هەسارەیەکی ترەوە بۆ زەوی نێردراوە[٢].

---

(١) Francis Collins: لە پەڕاوێزەکانی تەوەری دووەمدا ناساندوومانە.

(٢) زانایان پەیدابوونی ژیانیان لەسەر هەسارەی زەوی بەوە شیکردۆتەوە بەوەی کە بۆشایی دەرەکی پڕە لە تۆوی ژیان(ئەمە لە کوێوە هاتووە؟!!) کە دەست بە گەشە کردن دەکات تا دەگاتە هەسارە گونجاوەکە. نموانە بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ئەم تۆوانە لەسەر نەیزەکەکانەوە هێرشیان کردۆتە سەر زەوی، بێ ئاگان

خوێنەری بەڕێز سەرسام مەبە، چونکە فرانسیس کریک یەکێکە لەو زانا دەستپاکانەی کە بڕوای بەوە نەهاتووە کە ژیان لەسەر هەسارەی زەوی بە شێوەیەکی هەڕەمەکی پەیدابوبێت، چونکە زاناکان کێشەکەیان بە جۆرێك بەلاڕێدا بردووە، کە ناتوانین لێی بکۆڵینەوە، وەك ئەوەی پێمان بڵێن خۆتان ماندوو مەکەن بە گەڕان. بەڵام فرانسیس کریك لەگەڵ خۆیدا ڕاستگۆ بووە کاتێك دەرگای بەڕووی دەستخستنەناوی خوداییدا بە کراوەیی بەجێهێشتووە و درووستبوونی ژیانی بەوە وەسف کردووە کە دەکرێ موعجیزە بێت.

ستیڤن مایەر[1] دەست دەخاتە سەر حەقیقەت و دەڵێت: ئەوەی کە داواکراوە بۆ لێکدانەوە لە درووستبوونی ژیان سەرچاوەی پێکهاتە ماددییەکانی ژیان و سەرچاوەی سیستەم نییە، بەڵکو سەرچاوەی زانیارییە پێویستەکانە بۆ پێکهێنانی خانە، چونکە ژیان دیاردەیەکی کیمیایی نییە بەڵکو دیاردەیەکی مەعریفییە. لە کۆتایی تەوەرەکەدا ئەمە ڕوون دەکەینەوە.

---

لەوەی کە پلەی گەرمی بەرز و تیشکەکان کە دەکەونە سەر ئەم بوونەوەرە وردانە بەسن بۆ ئەوەی کە هەموو جۆرەکانی ژیان لەناو بیەن. لەبەرئەوە هەندێکی تر گوتوویانە: بوونەوەری عاقڵ لە هەسارەکانی ترەوە بەکتریاکانیان لەناو کەشتی ئاسمانیدا لەگەڵ خۆیاندا هێناوە! و دوای ئەوە پەرەسەندنی داروینی دەستپێکردووە، ئەم گریمانەیەش بە (بڵاوبوونەوەی تۆوەکان Pansperm ratheorets )ناسراوە.

(١) Stephen meyer: مامۆستای فەلسەفەی زانستەکان ئەمریکییە و یەکێکە لە کۆڵەگەکانی چەمکی دیزاینی زیرەك و دامەزراوەی دیسکەڤەری، لە ساڵی ١٩٥٨ز لەدایك بووە.

## درۆی حەتمییەتی جینی :

کاتێك جێیمس واتسۆ، و فرانسیس کریك گەیشتنە بنچینە و ڕێگای چۆنیەتی کارکردنی بەشی دی ئێن ئەی و فرمانەکانی و ڕۆڵی لە چالاکی خانەدا، زانایان وایان زانی ئیتر گەیشتنە نهێنی ژیان، بە جۆرێك سەرنجی دی ئێن ئەیان دەدا، بەوەی کە بەشی میحوەری و تەوەرەییە لە بەڕێوەبردنی بایۆلۆجیای خانە و سیفاتە بنچینەییەکانی، پاشان دید و بۆچوونەکە فراوانتر بوو و بیر و باوەڕەکە بە جۆرێك بڵاو بووەوە کە دی ئێن ئەی ڕەفتار و کاردانەوەکانمان بەڕێوە دەبات، واتا ئەگەر تۆ جینی بەدبەختیت بە بۆماوەیی بۆ مابێتەوە، ئەوا هەرگیز بەختەوەر نابیت!!.

لەم خستنەڕووەدا سێ هەڵەی ئابڕووبەر بوونیان هەیە: یەکەم، ئەو جیناتانەی سیفاتە بونیادەکانمان بەڕێوە دەبەن، ناتوانن خۆیان بەڕێوە ببەن، بەڵکو پێویستە ڕێکخەرێك بوونی هەبێت کە چالاکییەکانی ئاراستە بکات. دووەم هەڵە لەوەدایە وای دادەنێن کە جینەکان هەموو چالاکییە بایۆلۆجییەکانی خانە بەژیانی ئێمەشەوە بەڕێوە دەبەن، ئەمەش دەمارگیرییەکی نالۆژیکییە، کە هیچی لە دەمارگیری دیندارە توندڕەوەکان کەمتر نییە. هەڵەی سێیەم لەوەدایە کە وادەبیندرێت کەمە جینێك دەستیان هەیە لە هەڵسوڕاندنی ڕەفتار و کاردانەوەکانمان، چونکە ئەوەی لە ئێستادا سەلمێنراوە ئەوەیە کە ئەم فرمانانە زۆر هۆکاری ژینگەیی و دەروونی کاریان تێدەکەن، سەرەڕای پەیوەندییەکی گەورەی نێوان ناوەندەکانی مێشك.

## بایۆلۆجیـای نوێ :

لەگەڵ ڕاگەیاندنی دەرەنجامەکانی پرۆژەی جینۆمی مرۆیی لە ساڵی ٢٠٠٠ز دا، شتێکی چاوەڕواننەکراو ڕوویدا، سەلمێنرا کە ژمارەی جینەکانی خانەکانی لاشەی مرۆڤ لە بیست و پێنج هەزار جین تێپەڕ ناکات، واتا ٪٢٠ی ئەو ژمارەیەی پێشتر مەزندە کرابوو، ئەمە بە سادەیی واتای ئەوەیە کە ژمارەی جینەکان بەس نییە بۆ ئەوەی ژیانی مرۆڤ بەپێی چەمکەکانی پێشوومان شیبکەنەوە[1] و پێویستە بەدوای میکانیزمی تردا بگەڕێین. گەورە زانای بایۆلۆجی دێڤید باڵتیمۆر[2]- خاوەنی خەڵاتی نۆبڵ لە پزیشکیدا-گرنگترین دەرەنجامە فەلسەفییەکانی پرۆژەی جینۆمی خستەڕوو بەوەی کە ((ونبوونی دیدی حەتمییەتی جینییە Genetic Determinism))، باوەڕی وایە جینەکان سەرەنجامەکانمان دیاری دەکەن. هەڵەیی ئەو بۆچوونەش دڵنیا بووەوە دوای ئەوەی سەلمێنرا، کە گۆڕانکارییە ژینگەییەکان، وەك خۆراك و پلەی گەرمی و هەروەها گۆڕانکارییە ناوەکییەکانی وەك کاردانەوە، دەکرێ چالاکییەکانی جینەکان بەبێ ئەنجامدانی گۆڕانکاری لە بونیادی سەرەکی جینۆمدا بگۆڕێت، تەنانەت دەتوانێت ئەم گۆڕانکارییە بۆماوەییانە(لە چالاکیدا) بۆ نەوەکانی دواتر بگوازێتەوە، بەپێی ئەم چەمکانە، بایۆلۆجیای نوێ دامەزراوە New Biology کە لەسەر زانستی بەڕێوەبردنی جینات Epigenetics، کە گرنگی دەدات بە

---

(١) بۆچوونی پێشوو وایدەبینی کە خانەکانی لاشەی مرۆڤ کە ١٠٠هەزار جۆر پرۆتین لەخۆ دەگرێت پێویستی بە ١٠٠هەزار جین هەیە بۆ دروستکردنی پرۆتینەکانی، بە کار کردن بەو یاسایەی ئەوسا باوبوو، بەوەی کە هەر جینێك پرۆتینێك کۆد دەکات، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە نزیکەی ٢٠هەزار جین کە کاری جینەکانی پێشووتریان ڕێکدەخست، واتا ناوکی هەر خانەیەك لە لاشەی مرۆڤدا پێویستە ١٢٠ هەزار جین لەخۆ بگرێت.

(٢) دێڤید باڵتیمۆر David Baltimore: زانای بایۆلۆجی، ئەمریکییە، لە ساڵی ١٩٣٨ز لە دایك بووە.

لێکۆڵینەوە لە میکانیزمەکانی کارتێکردنی ژینگەی(ناوخۆیی و دەرەکی) لەسەر جینات (چالاککردن، کپکردنەوە، دەستکاریکردنی چالاکی).

## میکانیزمەکانی بەڕێوەبردنی جینات :

کاتێك سەلمێندرا کە دی ئێن ئەی تەنیا نیوەی پێکهاتەی کرۆمۆسۆمەکانە و نیوەی دووەمی لە پرۆتینی ڕێکخەر[1] Regulating Proteins، کە کاری دی ئێن ئەی ڕێکدەخات و دەچێتە ژێرباری ناڕاستەکردنی کاریگەرییە ژینگەییەکان، دوای ئەوە چاوەکان کەوتنە سەر میکانیزمی بەڕێوەبردنی جینات.

دوای ئەوەی کە پاڵەوانێتی سەرەتایی بۆ جینات بوو و هاوکێشەی ژیان بریتی بوو لە:

DNA ← RNA[2] ← پرۆتینات.

پاڵەوانێتی سەرەتایی گوازرایەوە بۆ هۆکارە ژینگەییەکان، هاوکێشەی ژیان بەم شێوەیەی لێهات:

کارتێکەری ژینگەیی ← پرۆتینی ڕێکخەر ← DNA ← RNA ← پرۆتینەکان

هەروەها سەلمێنرا کە هۆکارە ژینگەییەکان کە جینات بەڕێوە دەبەن دەبنە هۆی هەڵبژاردنی یەکێك لە نێوان جۆرە زۆرەکانی پرۆتین، کە هەر جینێك

---

(١) لێکۆڵەران ئەم پرۆتینانەیان دەخستنە ناو زیلدانەوە، لەکاتی گەرمبوونیان لەسەر لێکۆڵینەوە لە دی ئێن ئەی، ئەم پرۆتینانە بەرگێك دروستدەکەن کە دەوری دی ئێن ئەی دەدات و ڕێ لە خوێندنەوەی ئەو زانیارییانە دەگرێت کە لە ناویاندا هەیە؛ پاشان ڕێنگری دەکات لەوەی کە بە ئەرکەکانی خۆی هەڵبستێت. لێرەدا ڕۆڵی کارتێکەرە ژینگەییەکان دێت، کە شێوەی بەرگی پرۆتین دەگۆڕێت و بەمەش لە دی ئێن ئەی جیادەبێتەوە، ئەوەش ڕێ بە خوێندنەوە و جێبەجێکردنی ئەو زانیارییانە دەدات کە هەڵیگرتووە.

(٢) ئار ئێن ئەی دووەم ترشی ناوکی ناو ناوکی خانەیە، کە پێکهاتەکەی لە دی ئێن ئەی سادەترە و، بە ڕۆڵی سەرەکی هەڵدەستێت لە گواستنەوەی زانیاری لە ناوکی خانەوە بۆ دەرەوەی خانە، پاشان هەڵدەستێت بە ناڕاستەکردنی کاری دروستکردنی پرۆتین.

دەتوانێت هەڵبستێت بە دروستکردنیان!، ئەمە دوای ئەوەی کە تێگەیشتنی باو بریتی بوو لە (یەك جین بۆ یەك پرۆتین). ئایا ئەمە ڕۆڵێکی گەورەی هۆکارە ژینگەییەکان نییە لە دیاردەی ژیاندا؟

ئەگەر مرۆڤ لە ژینگەی دەوروبەری فێربێت، ئەوا خانەکانیش بە هەمان شێوە لە ژینگەی دەوروبەری خۆیان فێردەبن، گرنگترین نموونەش لەسەر ئەوە خانەکانی بەرگری لەشن، کە یادەوەرییەکی خانەیی دروست دەکات بۆ تۆمارکردنی زانیارییەکان لە جینەکاندا و وای لێدەکات کە توانای ئەوەی هەبێت کە بەکتریا گازییەکان بناسێتەوە، ئەگەر هاتوو بۆ جارێکی تر هێرشیان کردەوە سەر لاشە، ئەم زانیارییە وەرگیراوانە لەڕێی جینەکانەوە بۆ نەوەی نوێی خانەکان دەگوازرێنەوە، ئەمەش ئەوە نەرێ دەکات کە خوێنگەرمانی حەتمییەتی جینی دەستیان پێوە گرتووە بەوەی کە سیفەتە وەرگیراوەکان لە جیناتدا تۆمارناکرێن و پاشان نابن بە بۆماوەیی. بەڕاستی ئەمە بە شۆڕشێك دادەنرێت دەربارەی زانیارییە بایۆلۆجییەکانمان.

## جینەکان بریتین لە جەرگی خانە و
## لوو (ئەندام)ەکانی خوارەوەی!

ئەگەر مێشك ئەندامی بەرپرس بێت لە بەڕێوەبردنی فەرمانی ئەندامەکان و ڕەفتاری بوونەوەر، ئەگەر نەمانی بەواتای مردن بێت، ئەوا ئایا جینەکانی ناوکی خانە هەمان گرنگییان هەیە، واتا ئایا جینەکان مێشکی خانەن؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە تەوەرەییە زانایانی خانەناسی چەند تاقیکردنەوەیەکیان ئەنجامداوە کە تیایدا ناوکی خانەیان لابردووە Enucleation و ئەنجامەکانی سەرسوڕهێنەر بوون، زۆر لە خانەکان توانیان بۆ ماوەی دوو مانگ بەبێ ناوك بژین، واتا بەبێ جینەکانیان، خانەکە توانی توانای جووڵە و قووتدانی خواردن و تواندنی خۆراکی و هەناسەدان، هەرسکردن، دەردان،

پەیوەندی لەگەڵ خانەکانی تر و کاردانەوەی بەرامبەر گۆڕانکارییە ژینگەییەکان بپارێزێت، خانەکە تەنیا نەیتوانی دابەشبوون و زۆربوون ئەنجام بدات، سەرەڕای بێتوانایی بۆ نوێکردنەوەی ئەو پڕۆتینانەی کە تەواو دەبوون، ئەمەش هۆکاری ئەوەبوو کە لە کۆتاییدا بمرێت. ئەمە بە واتای ئەوە دێت کە لەکاتی نەبوونی جینەکانیشی مێشکی خانە بوونی هەر بەردەوام بووە و کاری خۆی کردووە. لەبەرئەوە - سەرەڕای هەندێك زیادەڕەوی - دەڵێین کە ناوك بریتی نییە لە مێشکی خانە، بەڵکو بریتییە لە جەرگی خانە و لووەکانی خوارەوەی، کە لە بەرامبەر ئەندامەکانی خوارەوەی (هێلکە و گوون)ە لە ناژەڵاندا!

## پەردەی خانە بریتییە لە مێشکی خانە :

ئەگەر جینەکان بریتی نەبن لە مێشکی خانە و نهێنی ژیان، ئەوا نزیکترین پێکهاتە کە شیاوی ئەم وەسفە بێت چییە؟

یەکێك لە گرنگترین فرمانەکانی مێشك بریتییە لە هەستکردن بە ناوەندی ناوەوە و ناوەندی دەرەوە، کە دەوری زیندەوەریان داوە، پاشان ئاڕاستەکردنی چالاکییە جیاوازەکانی لاشە بۆ رەفتارکردن لەگەڵ ئەو گۆڕانکارییانەی کە لەو دوو ناوەندەدا ڕوودەدات، ئەگەر سەرنجی خانە بدەی دەبینی کە ئەوەی بەم کارە هەڵدەستێت و ژیانی لەسەر وەستاوە، بریتییە لە پەردەی خانە، کە ئەگەر تێك بچێت دەمرێت. ئەگەر ئەو (وەرگر و وەڵامدەرەوانەی ) لەناویدا هەیە لەکاربخرێن ئەوا خانەکە دەچێتە ناو دۆخی هۆش لەدەستدانەوە، کە لە دۆخی مردنی مێشك دەچێت لە مرۆڤدا! لەبەرئەوە پەردەی خانە شایەنی ئەوەیە کە بە مێشکی خانە و نهێنی ژیان دابنرێت.

لەپێناو ئەوەی کە پەردەی خانە بە کارە زیرەکەکانی خۆی هەڵبستێت، (وەرگر Receptors)ی بۆ دانراوە، کە وەك ئامرازی هەستکردن بەکاریان دێنێت بۆئەوەی بزانێت کە چی لە دەوروبەر و ناوەوەی خانەدا ڕوودەدات. هەروەك

چۆن پەردەی خانە(وەڵامدەرەوە Effectors)ی بۆ دانراوە، کە لە وەرگرەکانەوە زانیاری وەردەگرێت، لەم کاتەشدا دەرگاکانی دەکاتەوە یان دادەخات، بۆ ئەوەی رێبدات یان رێگر بێت لە بەردەم تێپەڕبوونی مادده جیاوازەکان بۆ ناوەوە و دەرەوەی خانە، ئەمەش بەپێی ئەو بارودۆخەی کە وەرگرەکان تێبینی دەکەن لە بارودۆخی ژینگەیی ناوەوەی خانە و دەرەوەی خانە.

سەدان هەزار وەرگر و وەڵامدەرەوە لە پەردەی هەر خانەیەکدا بوونیان هەیە کە لەگەڵ یەکدا بە هەماهەنگی و گونجانەوە کار دەکەن، ئەمەش بە شێوازی دەستەجەمعی Holisitic ناسراوە کە پشت بە فیزیا و کیمیای چەندیی (کوانتەم) دەبەستێت.هەروەها دەکرێ ڕۆڵی پەردەی خانە بە ڕۆڵی پارچەکانی کۆمپیوتەر Computer Chips بچوێنرێت، کە بە هەمان شێوازی دەستەجەمعی کار دەکات، کە هەڵدەستێت بە وەرگرتنی تێخستنەکان و چارەسەرکردنیان، پاشان زانیارییەکان دەنێرێت بۆ پێکهاتەکانی تر بۆ ئەوەی رەفتاری لەگەڵدا بکەن، ئەمەش یەکێکە لە فرمانەکانی پەردەی خانە، هەروەها هەردووکیان لە دەرەوە بەرنامەیان بۆ دادەڕێژرێت؛ بەرنامەدانەر بۆ کۆمپیوتەر و ژینگە - نەك جینەکان - بۆ پەردەی خانە. لەبەر ئەوە پێویستە بە جۆرێك سەیری جیناتی خانە بکرێت بەوەی کە بریتییە لە میمۆری Memory Disk کە تێکەڵەی بنیاتنانی پرۆتینەکانی هەڵگرتووە، نەك بەرنامە دانەر بێت، بەڵگەش لەسەر ئەوە - وەك باسمان کرد- لابردنی ناوکی خانە دەبێتە هۆی لەدەستدانی توانای دروستکردنی پرۆتین، نەك نەمانی بەرنامەی خانە.

زانست ژمارەیەك لە میکانیزمی زۆر وردی دۆزیوەتەوە، کە جینەکان هیچ ڕۆڵێکی تێدا نابینن[1]، کە ڕێگە بە یەك کۆدی بۆماوەیی لە یەك بوونەوەردا

---

(١) گرنگترین ئەو میکانیزمانەش:

یەکەم: ئەوەی کە باسمان کرد لەوەی کە یەك جین دەکرێ بە کۆد بکرێت بۆ بەرهەمهێنانی ژمارەیەکی زۆری پرۆتین، کە یەکێکیان بەپێی بارودۆخی ناو خانە و دەوروبەری هەڵدەبژێردرێت.

دووەم: ئەگەر وایدابنێین کە هەریەك لەم جینانە لە یەکێك لەم بارودۆخانەدا دەبێت(سست یان چالاك) بەپێی بارودۆخی بلاو، ئەوا جیاوازی لە چالاکی جینەکانی نێوان دوو بوونەوەردا، کە یەکێکیان بە دوو هەزار

(بۆ نموونە تۆ - أنت -) دەدات، کە ملیارەها ئەگەر لە دەرەنجامەکان بەرهەم بێنێت! بەپێی ئەو هۆکارانەی لە ناوەوە و دەرەوەی خانە دەوریان داوە، ئەوەی کە پەردەی خانە هەستی پێدەکات، لەوانە هۆکارە دەروونی و رۆحییەکان، هەروەك

جین - بۆنموونە- لەوی تریان زیاتر بێت، ئەوا دەکاتە ٢٢٠٠٠، کە ئەمەش جیاوازییەکی گەورەیە. هەروەها جینەکان تەنیا لە دۆخی سستی و چالاکیدا نابن، بەڵکو پلە و ئاستی تر بۆ چالاکی هەر جینێك بوونیان هەیە، کە ئەگەری رابردوو بە سەدان جار زیاتر دەکات! ئەگەر گرنگی بەوە بدەین کە هەر چالاکییەك یان سیفەتێك کۆمەڵێك جین کاری تێدەکەن، کە هەریەکەیان پلەی جیاوازی چالاکییان هەیە، ئەوکاتە هەست بە گەورەیی جیاوازی نێوان بوونەوەرەکان و یەك بوونەوەر لە بارودۆخە جیاوازەکاندا دەکەین.

سێیەم: چاککردنی هەڵەکان Error-Correction: تەنیا بوونی دی ئێن ئەی لە ناوکدا بەس نییە بۆ وەرگرتنی کۆپییەك و گواستنەوەی بۆ رایبۆزۆمەکان بۆ بنیاتنانی پرۆتین، چونکە لە کاتی کرداری کۆپی کردنەکەدا هەڵە روودەدەن، کە ئەنزیمی تایبەت هەڵدەستن بە چاککردنەوەیان. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە خانە دەستەوەستان ناوەستێت لە کاتی چالاکی زیندەییدا، بەڵکو بەشێکی زۆری وزەکەی بۆ راستکردنەوەی ئەو کەم و کورتییانە خەرج دەکات.

چوارەم: گۆڕینی پارچە و گەیاندن Alternative splicing: لە کاتێکدا کە کۆدی هەڵگیراو لە ئاڕ ئێن ئەیەوە لە رێگایدایە بۆ دی ئێن ئەی(لەناو ناوکی خانەدا) بۆ رایبۆزۆمەکان. بۆئەوەی بە دروستکردنی پرۆتینەکەی پێچەوانە و بەرامبەری هەڵبستێت، هەندێك جار بە میکانیزمی بڕین و دانانەوە Cut, Paste دەستکاری دەکرێت بۆئەوەی پەیامەکە بە تەواوەتی جیاواز بێت و ببێتە هۆی دروستبوونی پرۆتینێکی تەواو جیاواز! بەم میکانیزمە یەکێك لە جینەکانی کلکی میوە هەڵدەستێت بە دروستکردنی ٣٨٠١٦ جۆر پرۆتین. گومان لەوەدا نییە کە لەم میکانیزمەدا جین هیچ رۆڵێك نابینێت، بەڵکو بەرکارە، کەواتە بکەرەکە کێیە؟ هێشتا نازانین.

پێنجەم: بنچینەی سیانی پرۆتین Geometry of protein دروستکردنی زنجیرەی ترشە ئەمینییەکان لەژێر چاودێری دی ئێن ئەی بەس نییە بۆ دروستکردنی پرۆتین. گەورەترین هەنگاو ئەوەیە کە ئەم زنجیرەیە بەشێوەیەکی سێ دووری بچێتە ژێر ئاراستەی پرۆتینەکانی تر کە بە Chaperone ناسراوە و لەم کردارەش جینەکان هیچ رۆڵێك نابینن.

لەم پێنج میکانیزمەی پێشوودا بینیمان کە دروستکردنی پرۆتینەکانی خانە کە گرنگترین کرداری بنیاتنان و کار کردنی خانەیە، تەنیا بە هەڵگرتنی کۆدی ئەم پرۆتینانە لە جیناتدا ناوەستێت، چونکە جینەکان هیچ پەیوەندییەکیان بەم میکانیزمانەوە نییە. لەبەر ئەوە کۆمەڵەیەکی تری زانست پەیدابوو (پرۆتیۆم Proteome) بۆ لێکۆڵینەوە لە پرۆتینەکانی خانە.

هەروەها زانستەکانی ئینتراکتۆم Interactome پەیدابوو، کە گرنگی بە لێکۆڵینەوە لە کاردانەوەکان و پەیوەندی نێوان بەشە کیمیاییە جیاوازەکانی ناو خانەی زیندوو دەدات. پاشان بەرپرسە لە لێکۆڵینەوە لە وردترین ئاستەکانی ژیان و لێکۆڵینەوە لەوەی کە چۆن ژیان لە بەشەکانی ماددەی نازیندوو پەیدا دەبێت. ئەم زانستانە زۆر لە زانستی جینۆمی تایبەت بە لێکۆڵینەوە لە جینەکان ئاڵۆزترە، تا ئەو ئاستەی کە بۆتە گەورەترین تەحەددی عەقڵی کە رووبەڕووی زانایان بووبێتەوە.

چۆن ئەم میکانیزمانە رێگا بە زۆر جیاوازی دەدەن لە شێوازی رووکەشدا (بنچینە و فرمانی شانەکان) لە نێوان دوو بوونەوەردا، کە جیاوازی سادەیان لە نێواندا هەیە لەڕووی شێوازی جینەوە؛ بۆنموونە وەك ئەوەی لە نێوان مرۆڤ و شامپانزیدا بوونی هەیە.

لەبەرئـــەوە وایدادەنێین، کە ئـــەوەی بەرپرســـە لـــە ڕەفـــتارکردن لەگـەڵ گۆڕانکارییەکانی ناوەوە و دەرەوەی خانە و تەنانەت مامەڵەکردنی لەگەڵ جۆرە جیاوازەکانی هەست و سۆزی مرۆڤ بریتییە لە پەردەی خانە، کە وای کردووە ئەو شیاوی ئەوە بێت بە مێشکی ڕاستەقینەی خانە وەسف بکرێت نەوەك ناوك.

## پێداگری لەسەر هەڵە!

سەرەڕای ئەوەی کە زانست دەربارەی ڕۆڵی ڕاستەقینەی جینات ئاشکرای کردووە، بەڵام هێشتا زۆرێك لە زانایانی بایۆلۆجی و لە سەرووی هەموویانەوە ریچارد دۆوکنز بە جۆرێك سەیری دەکەن وەك ئەوەی بەرپرس بێت لە ژیانی خانە و بەرنامە بۆ دانانی، وای دادەنێن، کە حەتمییەتێکی جینی بوونی هەیە، واتا ناتوانین لەوە رابکەین، کە لە جیناتماندا بەرنامە کراوە. بۆ وەڵامدانەوەی ئەم قسە بێ بنەمایە ستیڤ جۆنز[1] زانای بۆماوەزانی دەڵێت: شامپانزی لە دی ئێن ئەی چالاکدا بە ٪٩٨.٧ لەگەڵ مرۆڤدا هاوبەشە، بەڵام ٪٩٨.٧ی مرۆڤ نییە، بەڵکو ئەو مەیموونی شامپانزییە.

بابەتەکە لەگەڵ مشك و پنجەکانی مۆزیش بەهەمان شێوەیە، چونکە ئێمە بە هیچ ڕێژەیەك لە ڕێژەکان پەنجەکانی مۆز نین. دانتان بەوەی کە جینات

---

(١) Steve Jones: زانای بایۆلۆجیا. بەریتانییە و لەساڵی ١٩٤٤ز لەدایك بووە.

سروشتمان دیاری دەکات بانگەشەیەکی بێ بنەمایە، لە لایەنی بایۆلۆجییەوە زۆر شت هەن کە لە پشت ژیان و بوونمان بە مرۆڤ وەستاون.

رزگاربوون لە چەمکی حەتمییەتی جینی وا دەکات کە سەرەنجامی ژیانمان لە دەستی خۆمان بێت، چونکە ئێمە لە توانامانددا هەیە کە لە رێی پەردەکەیەوە خانە بەرنامە بکەین(لە رێی بار و دۆخی ژینگەیی و دەروونی و رۆحیمان). تازە کار لە کار ترازاوە بۆ ئەوەی هێڵێك بکێشین کە دوو جیهانەکە لە یەکتر جیا بکاتەوە؛ جیهانی داروینی کە وەك رۆبۆتی زیندووی ناو ململانێکان وێنامان دەکات و، جیهانی بایۆلۆجیای نوێ کە بە جۆرێك سەیری ژیان دەکات، کە گەشتێکە خەڵکی بەهێز لە پێناو ژیانێکی بەختەوەر و پڕ خۆشەویستیدا یارمەتی یەکتر دەدەن. هەروەها ئەوەش تێپەڕیوە کە بزانین ئێمە کۆیلەی جیناتمان نین بەڵکو گەورەی سەرەنجامەکانی خۆمانین.

## نهێنی نهێنییەکانی بایۆلۆجیای ژیـان
## پێکهاتەی زانیاری (المكون المعرفي)

ستیڤن مایەر لە نهێنی ژیانی نزیك خستینەوە، کاتێك ئەوەی خستەڕوو کە ژیان (دیاردەیەکی کیمیایی نییە)، بەڵکو (دیاردەیەکی زانیاری (معرفی)یە. ئەمە واتای چییە؟

دەڵێین کە زانیاری پێویست بۆ پەیدابوونی خانەی زیندوو و هەستانی بە فرمانەکانی لە دوو ئاست دایە:

**ئاستی یەکەم:** زانیاری پێویست بۆ دروستکردنی پێکهاتەکانی خانەی زیندوو پاشان بە یەکەوە بەستنەوەیان.

ئاستی دووەم: ئەو زانیاریانەی کۆدی بۆماوەیی هەڵی گرتووە و بە شێوەیەکی زۆر لە چالاکییە جیاوازەکانی خانەدا بەشداری دەکات[1].

ئێستاش با لە تێگەیشتن لە زانیارییەکان نزیک ببینەوە.

## تێکەڵەی درووستکردنی شۆرباکە...

لە کتێبی (زانیاریەکان و بنچینەی ژیان)[2] براند ئۆلاف کۆپەر مامۆستای فەلسەفەی سروشتی، کە ئەڵمانییە، سەرنجمان رادەکێشێت و دەڵێت کە لە پێناو ئەوەی کە شۆربایەکی باش درووست بکەین، تەنیا ئەوە بەس نییە، کە پێکهاتەکانی شۆرباکە و سەرچاوەی وزەمان هەبێت، بەڵکو پێویستە وەسفی درووستکردنەکەمان بە هەموو وردەکاریەکانەوە لەبەردەستدا بێت. لەبەر ئەوە نزیکبوونەوە لە زانینی بنچینەی ژیان بەدی نایەت تا ئەو کاتەی کە سەرچاوەی زانیاری دەدۆزینەوە کە بنیاتنانی خانە پێویستی پێیەتی و کۆدی بۆماوەیی هەڵی گرتووە.

لە وتارێکدا لە گۆڤاری زانستەکان (دیسەمبەری ٢٠٠٣) جاکۆب بنکنستین[3] لە پرسەکە نزیکمان دەخاتەوە بە خستنەڕوونێکی سەرنجراکێش و دەڵێت: ئەگەر دەربارەی جیهانی ماددی لە زۆربەی خەڵك بپرسی دەڵێن(مادده و وزە)، بەڵام ئەگەر ئێمە ئەوە بێنینەوە بیری خۆمان کە لە قوتابخانە و زانکۆ دەربارەی فیزیا فێری بووین، ئەوا دەزانین کە جیهان بە پلەی یەکەم لە (زانیاری) پێکهاتووە و مادده و وزە دوو ڕەگەزی زیادکراون. سەرنجی ئەو رۆبۆتە بدە کە هەڵدەستێت بە کۆکردنەوەی پارچە جیاوازەکان لە کارگەی درووستکردنی ئۆتۆمبێلدا،

---

(١) لە سەرەتای تەوەرەکەدا رۆڵی کۆدی بۆماوەییمان لە بنیاتنانی پرۆتیندا خستەڕوو.

(٢) کتێبی (Information and the origin of life) دانراوی Bernd Olaf Kupper.

(٣) Jaccob D.Benkenstein: زانای فیزیای تیۆری، مەکسیکییە، یەکێکە لە دامەزرێنەرانی چەمکی کونە رەشەکان، لەساڵی ١٩٤٧ز لە دایك بووە.

گومان لەوەدا نییە کە ئەو پارچانەی بۆی زیاد دەکەن بێ بەها دەبێت ئەگەر بەرنامەیەکی کۆمپیوتەر نەبێت کە زانیاری بداتە رۆبۆتەکە.

ستیوارت کۆفمان[١] - زانای گرنگیدەر بە بنچینەی ژیان - پێمان دەڵێت: ((ئەگەر هەر مرۆڤێك پێی وتی کە من دەزانم چۆن پێش ٣،٧ بلیۆن ساڵ ژیان لەسەر هەسارەی زەوی درووست بووە، ئەوا یان نەفامە یان گێلە یان فێڵبازە، چونکە هیچ کەس نازانێت زانیاری پێویست بۆ درووستبوونی ژیان لەکوێوە هاتووە، کاتێك بارودۆخ زۆر خراپ بووە، هەروەها هیچ کەس نازانێت کە چۆن ئەو زانیارییانە پەیدابوون کە ئەم جۆراوجۆرێتییەی بوونەوەرانیان لە کاتی ڕوودانی تەقینەوەی زیندەوەری[٢] کۆمپێری هێناوەتە بوون.

لە ئێستادا سەرنجەکە کەوتۆتە سەر ژیان، هیچ کام لە زانا پێگەبەرزەکانی بایۆلۆجی لەو باوەڕەدا نین کە مادده و وزە بتوانن ژیان ببەخشن! بەڵکو زانیارییە کە ئەو کارە دەکات. کێشەی داروینییەکان لەوەدایە کە لە سەدەی بیست و یەکەمدا هێشتا هەر چەمکەکانی داروینی ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم - دەخەنەڕوو - کە لە گرنگی زانیارییەکان بێ ئاگا بووە. گومان لەوەدا نییە کە ئەگەر داروین زیندوو بوایە، ئەوا باسی پەرەسەندنی هەڕەمەکی نەدەکرد بۆ لێکدانەوەی جۆری بوونەوەرەکان و، هەروەها باسی پەرەسەندنی کیمیاییشی نەدەکرد بۆ لێکدانەوەی پەیدابوونی ژیان.

---

(١) Stuart Kauffman: مامۆستای بایۆلۆجی بەناوبانگی ئەمریکی، لە ساڵی ١٩٣٩ز لەدایك بووە.

(٢) لە تەوەرەی دواتردا باسی دەکەین.

## زانیارییەکان لەکوێوە هاتوون...

پرسیارە قورسەکە (و لە هەمان کاتدا زۆر سادە) کە رووبەڕووی لایەنگرانی پەرەسەندن دەبێتەوە ئەوەیە کە چۆن سروشت بەبێ ئاڕاستەکردنێکی زیرەکانە توانیویەتی ئەو زانیارییە زۆرە کە بۆ درووستبوونی ژیان پێویستە فەراهەمی بکات، کە لە سادەترین بوونەوەردا (وەك بەکتریا) دەگاتە ملیۆنان بیتس Bits[1]؟ ئەو زانیارییانە لەکوێوە هاتوون ئەگەر هەرەمەکێتی بەتەواوەتی بێتوانا بێت لە درووستکردنی وتەی شکسبیر To be or not to be that is the quation (کە تەنیا چوار سەد بت Bits لە خۆدەگرێت) لە کاتی ئەنجامدانی تاقیکردنەوەکان لەسەر چەمکی ڕێکەوت بە بەکارهێنانی کۆمپیوتەر؟

سێر ئەنتۆنی فلو[2] (مامۆستای فەلسەفە، بەریتانییە) وەڵامی ئەو پرسیارەمان دەداتەوە و دەڵێت: هەرچەندە سیناریۆکانی ژیان جیاواز بن، ئەوا هێشتا پێویستیمان بە سەرچاوەیەکی بەرزی زۆر زیرەکانە هەیە بۆ هەموو ئەو شتانەی کە لە خانەی زیندوودا بوونیان هەیە. ((دین کینیۆن[3])) کە بە (پیاوە بەڵگەکەی بایۆلۆجیای بەشی دادەنرێت) زیاتر بۆمان ڕوون دەکاتەوە و دەڵێت: ئێستا ئێمە لە بەرامبەر گەورەترین بەڵگەداین لە بووندا لەسەر بوونی خودای بەدیهێنەر.

---

(١) bit: یەکەی بنچینەییە بۆ پێوانی زانیارییەکان. Byte=8bits.

(٢) پێشەوای بزوتنەوەی بێباوەڕی بوو لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا. پاشان بەهۆی بەڵگەی زانستی ڕایگەیاند کە خودا بوونی هەیە و باوەڕ پێی هەیە، دوای ئەوەی تەمەنی گەیشتە هەشتا ساڵ.

(٣) Dian Kinyon: مامۆستای بایۆلۆجیا لە سان فرانسیسکۆ، یەکێك بوو لە داروینییە خوێنگەرمەکان، پاشان بوو بە یەکێك لە گەورە پێشەوایانی دیزاینی زیرەك، دوایین بیروڕاکانی لە کتێبەکەیدا Biochemical Predestination دا بڵاوکردەوە، کە لە ساڵی ١٩٦٩ بڵاو بووەوە، لە ساڵی ١٩٣٩ز لە دایك بووە.

کاتێك ئەم دوو وتەیەم لە یەکێك لە دیبەیتەکاندا بە نموونە هێنایەوە، بەرامبەرەکەم لێی پرسیم: چی دەڵێی ئەگەر زانایان توانیان ژیان درووست بکەن؟ ڕاستەوخۆ وەڵامم دایەوە: ئەمە بەڵگەیەکی بەهێز دەبێت لەسەر خودای بەدیهێنەری ژیان! چونکە ئەو کاتە کارەکە بەڕاستی و لە کارگەدا و بەهۆی توانای زانایان ئەنجامدراوە، کە زیرەکی و زانیاری و توانای تەواویان هەبووە، نەك بەشێوەیەکی هەڕەمەکی و لەڕێی ڕێکەوتەوە پەیدابووبێت!!

لەبەر گرنگی چەمکی پێکهاتەی زانیاریەکان، کە بەڵگەیەکی وا لەسەر بوونی خودا پێشکەش دەکات کە ناتوانرێت بەرپەرچ بدرێتەوە، لە هەمان کاتیشدا زۆر کەس هیچیان دەربارە گوێ لێنەبووە، بۆیە بە شێوازێکی تری پەیوەست بە دەستکەوتی زانستی دەیخەمەڕوو کە دنیای هەژاندووە.

## خوێندنەوەیەك بۆ خانەی کۆکراوە :

لە بیستی مەی ساڵی (٢٠١٠ز) دا گەورە زانای بایۆلۆجیای بەشی ئەمریکی کریگ ڤێنتەر[1] ئەوەی ڕاگەیاند کە تیمە لێکۆڵەرەکەی دوای پازدە ساڵ هەوڵدان دەستکەوتێکی زانستی گەورەیان بەدەستهێناوە[2]، لەوەدا کورت دەکرێتەوە کە بۆ یەکەمجار توانیان کۆدی بۆماوەیی DNAی یەکێك لە خانە بەکتریاییەکان لە خانە سەرەتاییەکانی کۆبکەنەوە(نایکلۆتیدات = بنچینە نایترۆجینیەکان)، پاشان ئەو کۆدەیان لەناو لاشەی خانەیەکی بەکتریایی تری زیندووی جۆرێکی تر(بەڵام لە هەمان ڕەگەز) دانا، دوای ئەوەی کۆدە

---

(١) Craig Venter: زانای بەناوبانگی ئەمریکی بایۆلۆجیای بەشی، لە ساڵی ١٩٤٦ز لە دایك بووە.

(٢) کۆنگرەیەکی گەورەی رۆژنامەوانیدا راگەیەنرا، کە لە هەمان رۆژدا بابەتەکە لە گۆڤاری زانستی بەناوبانگ Science بڵاو بووەوە.

بۆماوەییەکەیان لێ دەرهێنابوو، بینییان کە خانەکە دابەش دەبێت و فەرمانە زیندەییەکانی ئەنجام دەدات و هەڵدەستێت بە درووستکردنی پرۆتینەکان بەپێی کۆدە نوێیەکە.

ئەم دەستکەوتە گەورەیە کاردانەوەی دژیەکی زۆری (بە زانست و بێ زانست)ی بەدوای خۆیدا هێنا، لەنێوان تیمێك کە گەیشتبوە لوتکەی چێژوەرگرتن و دەنگی لە راگەیاندنەکاندا بەرز بووەوە: یەکەم خانەی دەستکرد، ژیانێکی دەستکرد، خانەیان درووست کرد، ژیانیان بەدیهێنا، بوونەوەرێکی نوێیان بۆ لیستی بوونەوەرە زیندووەکان زیاد کرد و...هی تر و هی تر. وا بڵاوبووەوە کە زانست لە کارگەدا ژیانی بەدیهێناوە، تیمەکەی تر تووشی خەم و پشێوی بوون چونکە وایاندەبینی کە ئەم دەستکەوتە مەترسییە بۆ سەر بیروباوەڕە ئاینییەکانیان بۆیە تا لە توانایاندا هەبوو لە ئاستی ئەو دەستکەوتەیان کەم کردەوە!

جا بۆ ئەوەی بگەینە حەقیقەتی بابەتەکە، ئەوا پێویستە بە دیدێکی زانستی بێلایەن سەیری ڕووداوەکە بکەین، سەرەڕای دیدێکی مەعریفی و فەلسەفی.

دەکرێ ئەوەی زانایان پێی هەستاون، بەوەی کە ئاوێتەیەکی کیمیایی دیاریکراولەناو (دی ئێن ئەی خانەC)[1] یان گۆڕی بە ئاوێتەیەکی تری کیمیایی دەستکرد، کە بریتییە لە (دی ئێن ئەی خانە M)[2] کە لە بنچینە و ریزبەندی بنچینە نایترۆجینییەکانی لاساییان کردەوە، رێك وەك ئەوەی کە تایوان لاسایی بەرهەمەکانی یابان دەکاتەوە، کە ئەمە جۆرێکە لە (ئەندازیاری پێچەوانە Reverse Engeneering)، کە تیایدا کارگەیەك هەڵدەستێت بە بەش بەشکردنی ئامێرێك کە کارگەیەکی تر دایهێناوە و درووستی کردووە، پاشان هەڵدەستێت بە لێکۆڵینەوە لە پێکهاتەکانی، پاشان درووستکردنی ئەو پێکهاتانە پارچە بە پارچە و کۆکردنەوەی لەسەر هەمان تایبەتمەندی، بەمەش هەمان ئامێری دەستدەکەوێت، ئەمە جۆرێکە لە (لاسایی کردنەوە).

---

(١) Mycoplasma Capricolum

(٢) Mycoplasma Mycoides

ئەگەر کەمێك لەوە رابمێنین، بۆمان دەردەکەوێت کە ئەمە لە لاساییکردنەوەش کەمترە، بەڵکو جۆرێکە لە (کۆکردنەوە)، کە وەك ئەوەی وڵاتان لە بواری دروستکردنی ئۆتۆمبێلدا ئەنجامی دەدەن. کاتێك پارچەی ئامادەکراوی ئۆتۆمبێلێك هاوردە دەکەین (خۆمان دروستی ناکەین) و هەڵدەستین بە کۆکردنەوە و لێکدانیان بەپێی تایبەتمەندییەکان. هەمان ئەو کارە کە ئەو زانایانە ئەنجامیان داوە، هەستاون بە کۆکردنەوەی بنچینە نایترۆجینییەکان بەپێی ریزبەندییەکەی لە جینۆمی (بەکتریای M)دا.

لە ڕاستیدا ئەو (دی ئێن ئەی)ەی گۆڕیویانە سەرچاوەی ژیان نییە، بەڵکو تەنیا زانیاری پێویستە بۆ بنیاتنانی پرۆتینەکانی خانە و دابەشبوونی، هەرچی خانەی زیندووە ئەوا بە تەواوی و بە هەموو پێکهاتەکانیەوە هێناویانە و دایانناوەتەوە[1]. گریمان کە خانە دروستکراوەکە توانی بە فەرمانە بایۆلۆجییەکانی خۆی هەڵبستێت؛ وەك خواردن و زۆربوون و مردان، ئایا دەتوانێت بە فەرمانە وجودییەکانی ژیانیش هەڵبستێت، وەك زیرەکی و ئامانجدارێتی، ئەوانەی باسمان کردن سەر بە جیهانی مادده نین؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە چەمکی پێکهاتەی زانیارییەکان و سیفەتە هەڵقوڵاوەکان دەخەینەڕوو.

---

(١) ئەو خانە زیندووەی پشتیان پێبەستبوو پەردەکەی زۆر ئاڵۆزە، کە هەست بە گۆڕانکارییەکانی ناوەوە و دەرەوەی خانە دەکات، هەروەها چەند دەروازەیەکی هەیە کە ڕێی پێدەدات ماددە جیاوازەکان هەڵبژێرێت کە دێنە ناو خانەوە یان لێیەوە دەردەچن، سەرەڕای وێستگەکانی وزە(مایتۆکۆندریا) و کارگەی دروستکردنی پرۆتین (رایبۆزۆمەکان) و...هی تر، زانایان نەیانتوانیوە ئەو پێکهاتانە دروست بکەن.

## پێکهاتەی زانیاری و سیفەتە هەڵقووڵاوەکان

لە تەوەرەی دووەمدا باسی سیفەتە هەڵقووڵاوەکانمان کرد (Emergent Properties)، مەبەستمان لەوەیە کە کاتێك دامەزراوەیەك دەگاتە ئاستێکی بەرزی ئاڵۆزی تاسیفاتی نوێی لێوە هەڵدەقوڵێت.

ئەگەر بزوێنەری ئۆتۆمبێل وەك نموونە وەربگرین، دەبینین کە لە سەدان پارچە پێکدێت، گومانیش لەوەدا نییە کە بەرهەمی کاری ئەم پارچانە(کە بریتییە لە جووڵاندنی بزوێنەرەکە) بە تەواوی جیاوازە لە دەرەنجامی کۆکردنەوەی فەرمانی هەر پارچەیەك بە تەنیا. کارلێکی نێوان پێکهاتەکانی بزوێنەرەکە فەرمانێکی تەواو نوێمان بۆ دێنێتە بوون، بەمەش جووڵە دەبێتە سیفەتێکی هەڵقووڵاوی پێکهاتەکانی بزوێنەرەکە.

ئەگەر وردتر سەرنجی (بزوێنەری ئۆتۆمبێل) بدەین، دەبینین کە ئەو نهێنییەی وای لێدەکات کە بەتوانا کار بکات لە دیزاین و دروستکردنی هەر یەکێك لە بەشە زۆرەکانیدایە، چونکە هەر بەشێکی بزوێنەرەکە لە داڕشتەیەکی خاوەن تایبەتمەندی دیاریکراو دروستکراوە و شێوە و ئەندازەی بە وردی دیاریکراوە کە دەگاتە بەشێك لە هەزار بەشی مللیمەترێك؛ بەشەکانی بزوێنەرەکەش بەپێی تایبەتمەندییەك بنیاتنراوە کە خاوەنەکانی ناوی (پێکهاتەی زانیاری) یان (نهێنی پیشە The Knoe how)یان لێناوە و، هەموو ئەمانەش لەپێناو ئەوەی کە هەر پارچەیەك لە کارکردندا لەگەڵ پارچەکانی تردا گونجاو و هاوکار بێت. هەرکە کارتی زانیاری (ئەگەر بزوێنەرەکە ئەلیکترۆنی بێت) بخەینە ناو و دواتر وزەی بۆ بنێرین ئەوا دەست بە کار و چالاکی دەکات. ئەمە ئەو نهێنییەیە کە نرخی بزوێنەرێك بەرز دەکاتەوە کە نرخی ماددە و پارچەکانی لە چەند ١٠ دۆلارێك تێپەڕ ناکات و بە دەیان هەزار دۆلار دەفرۆشرێتەوە.

ئایا دەکرێ ئەم نموونەیە لەسەر خانەی زیندوو جێبەجێ بکەین؟ لە ڕاستیدا پێکهاتەکانی خانە (پرۆتینەکان، ترشە ناوکییەکان، چەورییەکان، کحولییەکان، شەکرەکان و...) زۆر بە وردی دیزاین کراوە بەجۆرێك کە کارکردنیان لەگەڵ یەکدا بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر ڕێکخراوە. ئایا خودا هەر یەکە لەم پێکهاتانەی وا درووست کردووە کە ئەگەر لەگەڵ یەکدا لەسەر شێوەیەکی دیاریکراو و بە ڕێژەیەکی دیاریکراو بەیەکەوە ببەسترێن و زانیاری و وزەیان پێ بدرێت ژیانیان بێتە بەر؟ ئەمە واتای ئەوەیە کە ژیان لە هەر بەشێکی نازیندوودا بوونی هەیە!

ئەگەر بابەتەکە بەم شێوەیە بێت ئایا ئەمە بریتییە لە نهێنی ژیان؟ ئایا لەناو دیزاینی خانە وەك خانەی یەکگرتوو بوونیان هەیە و لە دیزاینی هەر بەشێك لە بەشەکانی و هێنانەبوونی ئەم بەشانە و کۆکردنەوەی بە ڕێژەی پێویست لە دۆزینەوەی گونجانی نێوان ئەم بەشانە و سەرچاوەی زانیاری و سەرچاوەی وزەدا نهێنییەکە بوونی هەیە؟

لە ئێستادا ئێمە لە بەردەم دوو چەمك داین بۆ تەفسیرکردنی موعجیزەی ژیان: یەکەم بریتییە لە چەمکی پێکهاتەی زانیارییەکان. دووەم بریتییە لە چەمکی فوو پیاکردنی غەیبی وەك نهێنییەك بۆ ژیان. گومان لەوەدا نییە کە چەمکی دووەم لە خانەیەکدا نەبێت کە بنچینەی ماددی و پێکهاتەی زانیاری تێدا نەبێت ڕۆڵ ناگێڕێت.

من وای دەبینم کە هەردوو ئەگەرەکە تەواوکەری موعجیزەی خودایین، چونکە فووپیاکردنی غەیبی دەلیل و بەڵگەبوونەکەی لەسەر بوونی خودای بەدیهێنەر زیاتر نییە لە بەبەرداکردنی ژیان بە خانەدا لەڕێی پێکهاتەی زانیارییەوە.

## پاك و بێگەردی بۆ خودا؛ بەدیهێنەری مەزن :

با کەمێك لەسەر ئەو خستنەڕووەمان هەڵوەستە بکەین، ئەگەر زانایان توانیان بەشە وردەکانی خانە درووست بکەن و لەگەڵ یەکتردا کۆیان بکەنەوە، بەمەش خانە بە کارە زیندەییەکانی هەڵبستێت، ئایا بەمە دەڵێین کە ئەوان ژیانیان درووستکردووە. ئایا ئەمە لەگەڵ ئەوەدا تێکناگیرێت کە ئێمە دەڵێین خودا بەدیهێنەر و زیندووکەرەوەیە؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم خستنەڕووە گریمانەییە دەگەڕێینەوە بۆ سەر بزوێنەری ئۆتۆمبێلەکە. ئەو کەسەی کە بەشەکانی بزوێنەرەکە لەسەر یەك هەڵدەگرێت و لەسەر هەمان شێوە بەشەکان درووستدەکات و کۆیان دەکاتەوە، ناڵێین کە ئەو کەسە بزوێنەری داهێناوە، بەڵکو دەڵێین لاسایی کردۆتەوە.باشترە بڵێین کە ئەو کارگانەی هەڵدەستن بە کۆکردنەوەی بەشە هەناردەکراوەکانی بزوێنەرەکە، پێی بڵێین بزوێنەرەکەی کۆکردۆتەوە و لێکیداوە، نەڵێین بزوێنەرەکەی داهێناوە، چونکە بزوێنەرەکە جارێك داهێنراوە و کارەکە کۆتایی هاتووە.

ئەوەی دەیەوێت بزوێنەرێك دابهێنێت ئەوا پێویستە کە شتێکی نوێ بە میکانیزمێکی نوێ درووست بکات. بۆنموونە پێشتر بزوێنەری هەڵمی هەبوو کە لە دەرەوە وزە دەدرایە ئامێرەکە، پاشان بزوێنەری سووتەمەنی ناوەکی داهێنرا کە هەڵدەستێت بە درووستکردنی وزە لەناو خۆیدا، پاشان بزوێنەری دووکەڵدار(نفاپ) داهێنرا. هەموو ئەوانە داهێنانی تەواو نوێن، یان بە لایەنی کەمەوە نیمچە نوێن. ژیانیش بە هەمان شێوە، پێکهاتەکانی خانەی زیندوو بە وردەکارییەکانییەوە و میکانیزمەکانی کارکردنی و کۆدە بۆماوەییەکەی درووستکراوە و کارەکە کۆتایی پێهاتووە. بۆیە ئەگەر زانایان هەستان بە کۆکردنەوەی ئەو بەشانە (کە بە تەواوی و بە هەموو تایبەتمەندییەکانییەوە درووستکراوە) و ژیانیان بەبەر

خانەدا کرد، ئەوا دەڵێین هەستاون بە کۆکردنەوەی خانەی زیندوو، نابێ بڵێین خانەی زیندوویان درووست کردووە.

بەڵام ئایا خودا تەحەددای هەموو بێباوەڕانی نەکردووە کە ئەگەر دەتوانن با مێشێك درووست بکەن؟ ئایا ئەوەی باسمان کرد ئەوە ناگەیەنێت کە ئەوان دەتوانن ئەو کارە بکەن؟

ئێستا گەیشتووینەتە ئەوەی کە ئەوەی زانایان هەوڵی ئەنجامدانی دەدەن، کۆکردنەوەی خانەی زیندووە، نەوەك درووستکردنی خانە و تەنانەت لاساییکردنەوەیشی، بۆیە ئەگەر ویستیان مێشێك درووست بکەن (درووستکردنیش بریتییە لە بەدیهێنان لە نەبوونەوە لەسەر شێوازێك کە پێشتر بوونی نەبووبێت) ئەوا پێویستە دامەزراوەیەکی تەواو نوێ بۆ ژیان دابهێنن، وەکو جۆرەکانی بزوێنەر کە باسمانکردن. پێویستە لەسەریان ماددەی سەرەتایی نوێ لە نەبوونەوە درووست بکەن، پێویستە لەسەریان ئەو یاسایانە دابهێنن و کارا بکەن کە ئەو ماددە سەرەتاییانە و دامەزراوە نوێیەکە بەڕێوە ببەن، تا ئەو کاتە دەڵێین کە توانیویانە دامەزراوەیەکی زیندوو درووست بکەن، من واینابینم کە بتوانن ئەو کارە بکەن.

با نموونەیەکی تر بێنینەوە بۆ ئەوەی مەبەستەکەمان ڕوونتر ببێتەوە، با سەرنجی قەسیدەیەك بدەین، بنچینەی زمان بریتییە لەو پیتانەی کە وشەکانی لێ پێکدێت، پاشان وشەکان دێڕەکانی قەسیدەکە درووست دەکەن، هەروەها یاسای ڕستەسازی و وشەسازی و بنچینەی ڕستە زمان بەڕێوە دەبەن، هەر وەك چۆن شیعریش لەڕێی بەحرەکانی شیعر و زانستی عەرووز و وەزن و قافیە و هی تر بەڕێوە دەبرێت. ئەوەی کە شاعیر ئەنجامی دەدات بریتییە لە بەکارهێنانی هەموو ئەو شتانە بۆ ئەوەی کە قەسیدەیەکی نوێمان بۆ بێنێتە بوون، ئەوەی کە زانایان لە ئێستادا ئەنجامی دەدەن زۆر لەوە کەمترە، ئەوان زمانێکی نوێیان دانەهێناوە، ئەو زمانەی ئێستاش بوونی هەیە بەکاریان نەهێناوە بۆ درووستکردنی قەسیدەیەکی نوێ، ئەوان دەیانەوێت کە قەسیدەیەکی نووسراو کۆپی بکەن.

- گریمان - زانایان توانیان کۆدێکی بۆماوەیی تەواو نوێ دابهێنن، ئەوا ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە قەسیدەیەکی نوێیان درووست کردووە بە بەکارهێنانی هەمان زمانی ژیان. لەو کاتەدا هەمان ماددەیان بەکارهێناوە.

- با وا دابنێین - کە زانایان توانیان کۆدێکی بۆماوەیی تەواو نوێ درووست بکەن، ئەمە واتای ئەوەیە کە قەسیدەیێکی نوێیان لە هەمان زمانی ژیان دارِشتووە، تا لەو کاتەدا هەمان کەرستە (قورِ- چیمەنتۆ- ئاسن- لم)یان بۆ درووستکردنی ڤێلایەکی تازە بەکارهێناوە، بە بەکارهێنانی هەمان یاساکانی تەلارسازی.

لە ئێستادا جیهان پرِە لە جۆری تازەی رووەك و ئاژەڵ کە زانست لەرِێی (دوورِەگی-تهجین)و ئەندازیاری بۆماوەیی پێیگەیشتووە، لەپێناو دەستکەوتنی بەرهەمێکی باشتر، ئەمەش تووشی سەرسورِمانی نەکردووین.

کریگ ڤێنتەر لەگەڵ خۆیدا راشکاوانەبوو و گوتی: ((ئامانجی ئاییندەمان ئەوە نییە کە تێبگەین و دی ئێن ئەی بە هەمان کۆدەکانی ئێستای بەکاربێنین، بەڵکو ئامانجمان درووستکردنی شێوەیەکی نوێی ژیانە کە خزمەت بە مرۆڤایەتی بکات، ئەمەش لە رِێگەی پەرەسەندنی داروینییەوە نا، بەڵکو لەرِێی زیرەکی مرۆڤەوە)).

تێبینی قسەکەی ڤێنتەرت کرد((درووستکردنی شێوەی نوێی ژیان؟)) هەمان ژیانە، بەڵام بەدوای جۆرێکی تری فیلدا دەگەرِێت!

گومان لەوەدا نییە کە وشەی درووستکردن ((تخلیق)) هەستی دیندارەکان دەجوولێنێت. لەرِاستیدا وشەکە داتاشراوی (خلق Criation) نییە، بەڵکو مەبەست لێی درووستکردن و بنیاتنانە Synthesis. لەبەرئەوە لەم رِۆژگارەدا جیهان باسی (بایۆلۆجیای بنیاتنان Synthetic Biology) دەکات نەك بایۆلۆجیای خەلقکردن.

## کۆدی بۆماوەیی (الشفرة الوراثية) :

باسی ئەوەمان کرد کە زانیارییەکان پێویستن بۆ ئەوەی خانە بە دوو فەرمانی بنچینەیی هەڵبستێت:

**یەکەمیان:** بنیاتنانی پێکهاتەکانی خانە و ڕێکخستنیان بۆ دروستکردنی خانەی زیندوو.

**دووەمیان:** بریتییە لە کۆدی بۆماوەیی کە دی ئێن ئەی هەڵیگرتووە. فرمانی یەکەممان باس کرد، ئێستاش لە باسکردنی یەکێك لە گرنگترین نهێنیەکانی خانەی زیندوو نزیك دەبینەوە، ئەویش سەرچاوەی میکانیزمی بەکۆدکردنە، کە بەهۆیەوە دی ئێن ئەی بە فرمانەکانی هەڵدەستێت، هەروەها سەرچاوەی ئەو زانیاریانەیە کە هەڵیگرتووە.

باسی ئەوەمان کرد کە رایبۆزۆمەکان لە خانەکانی لاشەماندا وزە بۆ کۆکردنەوەی ترشە ئەمینیەکان بەکاردەهێنن بۆ دروستکردنی پرۆتین، بەڵام بەبێ زانیاری ناتوانێت بەو کارە هەڵبستێت کە کۆدی بۆماوەیی (دی ئێن ئەی) لە ناوکی خانەدا بۆی دابین دەکات.

هەروەها ڕۆڵی دی ئێن ئەی بە هەڵگرتنی زانیاری ناوەستێت، بەڵکو درێژدەبێتەوە بۆ ئاڕاستەکردن و بەکارهێنانی ئەو زانیاریانە لە کرداری بنیاتنان و بەکارخستندا، ئەمەیە، کە بە (چارەسەرکردنی زانیاری Information Processing ) ناسراوە.

لەبەرئەوە لەوکاتەوە کە بنچینەی دی ئێن ئەی و شێوازی کارکردنی دۆزراوەتەوە لە ساڵی ١٩٥٣ز، پاشان دامەزراندنی زانستی بایۆلۆجیای بەشی،

زانایان دەرکیان بەوە کرد کە ئەوان خەریکن لەگەڵ زانستێکی مەعریفی مامەڵە دەکەن کە لەسەر چوار پیت دامەزراوە، کە زانیاری پێویستی زیندەوەری هەڵگرتووە، پاشان تێگەیشتن لە چالاکی خانەی زیندوو کە لەڕێی (بیردۆزی زانیارییەکان Information Theory)[1]ەوە ئەنجام دەدرێت.

بیڵ گەیتس[2] دامەزرێنەری کۆمپانیای مایکرۆسۆفت بۆ کۆمپیوتەر دەڵێت: ئەگەر لێکچوونێك لەنێوان دی ئێن ئەی و بەرنامەکانی کۆمپیوتەردا هەبێت، ئەوا یەکەمیان زۆر لە باشترینی ئەو کۆمپیوتەرەی ئێمە توانیومانە دایبهێنین بە کارەکانی هەڵدەستێت.

هەروەها بێرنار لۆفنشتین[3] دەڵێت: ئای ئەوە چ میکانیزمێکی سەرسوڕهێنەرە؛ چوار پیت کە هەموو بوونەوەران بەکاری دەهێنن؛ لە بەکتریاوە پێش سێ بلیۆن ساڵ تا دەگاتە مرۆڤ.

دۆگلاس هۆفستادەر[4] (بەشێك) لە پرسی درووستبوونی ژیان کورتدەکاتەوە و دەڵێت: هەر لێکۆڵەرێکی بەرنامەی کاری دی ئێن ئەی ئاڵوزی سەرسوڕهێنەر پرسیارێکی بەدیهی دێتە بەردەم: چۆن ئەم میکانیزمە پەیدابووە؟ هەموو بیردۆزەکانی درووستبوونی ژیان بە ناتەواو هەژمار دەکرێن، تا ئەو کاتەی دەتوانن وەڵامی ئەو پرسیارە بدەنەوە.

---

(١) لە تەوەری حەوتەمدا باسی بیردۆزی زانیاریەکان دەکەین.

(٢) Bill Gates: پیاوی کار و داهێنەر و بەرنامە دارێژەری بەناوبانگ، دامەزرێنەری کۆمپانیای مایکرۆسۆفت بۆ کۆمپیوتەر، لە ساڵی ١٩٥٥ز لە دایکبووە.

(٣) Verner Loifnstein: مامۆستای فیزیای زیندەیی لە زانکۆی کۆڵۆمبیا، کە گرنگی دەدات بە پەیوەندی نێوان فیزیای کوانتەم و فرمانەکان مێشك.

(٤) Doglas Hofstader: مامۆستای زانستە مەعریفیەکان، ئەمریکییە، لە ساڵی ١٩٤٥ز لەدایك بووە.

## سەرچاوەی زانیاریەکان

ئەگەر ئەو زانیاریانەی دی ئێن ئەی هەڵیگرتووە لەسەر ریزبەندی چوار پیتەکە وەستابێت(بنچینە نایترۆجینیەکان) ئەوا پرسیارە بەدیهی و تەوەرەییەکە لێرەدا بریتییە لە: چۆن ئەم پیتانە ڕێکدەخرێن؟ داروینییەکان وەك پیشەی هەمیشەییان بەوە وەڵامی دەدەنەوە کە (ئەوە ڕێکەوتە!).

پاشان لە بێبنەمایی ئەو قسەیە تێگەیشتن، بۆیە زۆرێك لە زانایان هەوڵیاندا بیرۆکەی کێشکردنی ڕەگەزەکان و پێکهاتە نائەندامیەکان گشتگیر بکەن(وەك لە نێوان سۆدیۆم و کلۆرین ڕوودەدات بۆ پێکهێنانی بلورەکانی خوێی چێشت) و، گشتگیری بکەن بەسەر پێکهاتە ئەندامیەکاندا، بۆیە گریمانەی بوونی (قابیلیەتی کیمیاییان کرد) بۆ ترشە ئەمینیەکان، بۆ ئەوەی بۆ پێکهێنانی پرۆتینەکان کۆببێتەوە، هەروەها قابیلیەتی بنچینە نایترۆجینیەکان بۆ پێکهێنانی ترشە ناوکیەکان (دی ئێن ئەی، ئاڕ ئێن ئەی) و ئەو زانیاریانەی هەڵیانگرتووە کۆببێتەوە.

یەکێك لە بەناوبانگترین ئەو زانایانەی پەیڕەوی گریمانەی قابیلیەتی کیمیاییان کرد(دین کینیۆن)[1] بوو، بەڵام دواتر هەڵگەڕایەوە و خۆی لێ بەری کرد، هەروەك چۆن پێشتر خۆی لە چەمکەکانی ڕێکەوت و هەڕەمەکی بەری

---

(١) Dian Kinion: پێشتر و هەر لەم تەوەیەدا ناساندوومانە.

کردبوو، ئەمەش لەبەر ئەوەی کە قابیلیەتی کیمیایی جگە لە دووبارەبوونەوەیەك کە لە بلوورەکانی خوێی چێشت(کلۆریدی سۆدیۆم) دەچێت هیچی تر بەرهەم ناهێنێت، بۆنموونە لە یەك زنجیرەی بەشی دی ئێن ئەی A –T-A-T-A-Tمان دەستدەکەوێت، گومانیش لەوەدا نییە کە ئەم دووبارەبوونەوەیە هیچ کۆدێکی بۆماوەیی هەڵنەگرتووە. هاوشێوەی ئەوە ئەوەیە کە کتێبێك بدۆزیتەوە، کە لە هەموو لاپەڕەکانیدا پیتی (م) و (ن)ی تێدا دووبارە کرابێتەوە. هەروەها هاوشێوەی ئەوە ئەوەیە کە منداڵ(لە سەرەتای فێربوونی قسەدا) دەیزانێت لە لێکدانی پیتەکانی (م، ب، ا) دەبینین دەڵێت بابا و.. بەم شێوەیە.

#### زانیارییەکان بریتین لە نەبوونی ڕێکوپێکی لە دووبارەبوونەوەدا

لە زمانە نووسراو و دەربڕاوەکاندا، دەستکەوتنی زانیاری پێویستی بە ریزکردنی پیتە جیاوازەکان هەیە لە تەنیشت یەکترەوە بۆ دروستکردنی وشە و ڕستە، لەگەڵ ڕەچاوکردنی یاساکانی وشەسازی و ڕستەسازی، کەواتە دەستکەوتنی زانیاری پێویستی بە ریزبوونی پیتەکان هەیە لەگەڵ لەبەرچاوگرتنی یاساکانی زمان، بارودۆخی کۆدی بۆماوەییش بە هەمان شێوەیە، چونکە دەستکەوتنی زانیاری پێویستی بە ((نارێکوپێکی دووبارەبوونەوەی بنچینە نایترۆجینیەکان Irregularity in sequencing)هەیە لەگەڵ ڕەچاوکردنی یاساکان.

پوختەی بابەتەکە ئەوەیە کە (دووبارەبوونەوەیەکی سادە Simple Order) زانیاری هەڵناگرێت، بەڵام پێکهاتەی ئاڵۆز Complexity زانیاری هەڵدەگرێت[1].

ئەگەر یاساکانی سروشت لەگەڵ ئەو دیاردانەدا مامەڵە بکەن کە ڕێکخراون (Regularity) و دووبارە دەبنەوە (Repetition)، وەك یاساکانی کێشکردن و جووڵە، ئەمە واتای ئەوە دەگەیەنێت کە یاساکانی سروشت ناتوانن مامەڵە

---

(١) مەبەست لە پێکهاتە لێرەدا بریتییە لە:

جۆراوجۆرێتی Variability

نارێکی Irregularity

ناتوانرێت پێشبینی بکرێت Unpredictability

لەگەڵ ئەو زانیاریانە بکەن کە نارێکی و دووبارەبوونەوە بە مەرج دەگرن، وەك کۆدی بۆماوەیی.

بەمەش عەقڵ وەك تاکە سەرچاوەی زانیاریەکان دەمێنێتەوە، نەوەك ڕێکەوت و هەڵبژاردنی سروشتی و قابیلیەتی کیمیایی و یاساکانی سروشت.

جۆرج ونستۆن لە کتێبەکەیدا (ئایا داروین ڕاستی پێکا؟ - هل کان داروین مصیبا؟ )[1] دەمانخاتە دووڕیانێکەوە، دەڵێت: ئەگەر لە ئاسمانەوە سیدییەکمان بۆ بێتە خوارەوە، کە زانیاری کۆدی بۆماوەیی زیندەوەرێکی لەسەر تۆمارکرابێت، هەموان بە دڵنیاییەوە دەڵێن ٪١٠٠ ئەمە بەڵگەیە لەسەر بوونی زیرەکی لە گەردووندا[2] و لە دەرەوەی هەسارەی زەوی. بەڵام کە تووشی ئەو زانیارییانە دەبین کە لە کۆدی بۆماوەیی مرۆڤدا تۆمار کراون داروینییەکان دەڵێن کە ئەمە بەرهەمی هەڕەمەکیتی و ڕێکەوتە!!

لەبەرئەوە کاتێك لە خوێندنەوەی جینۆمی مرۆیی[3] تەواوبوون و، ئەو دەرەنجامانەی پێیگەیشتن بە ئەندازەی پڕکردنەوەی ٧٥،٤٥٠ لاپەڕەی ڕۆژنامەکان بوو، لەو کاتەدا فرانز کۆلێنز بەڕێوەبەری پڕۆژەی جینۆم رایگەیاند: ((ئێستا خودا فێری ئەو زمانەی کردین کە ژیانی پێ درووستکردووە)).

**خوێنەری بەڕێز :**

زانایانی بایۆلۆجی و فەیلەسووفە ماددیگەراکان لە کاتی لێکۆڵینەوە لە بنچینە و ماهییەتی ژیان ڕووبەڕووی تەنگ و چەڵەمەیەکی وا دەبنەوە

---

(١) Did Darwin Get it Right? George Gohnson کە لە ساڵی ١٩٩٨ز دەرچووە.

(٢) وشەی کۆزمۆز کە لە زمانی یۆنانیدا بە واتای گەردوون بەکاردێت، واتا ڕیزبەندی و ڕێکخراوەیی. پێچەوانەکەیشی کیوس Chaos ە، کە بە واتای ناڕیزبەندی و نارێکخراوەیی دێت.

(٣) مەبەست لە خوێندنەوەی جینۆمی مرۆیی ریزکردنی سێ بلیۆن و نیو جووتی پیتەکانی کۆدی بۆماوەیی مرۆڤە، واتا زانینی جۆر و ڕیزبەندی چوار بنچینە نایترۆجینییەکە، کە دی ئێن ئەی مرۆڤی پێکهێناوە و دابەشکردنی بۆ جینات و، زانینی ڕۆڵی هەر جینێك لە خانەی زیندوودا.

کە جێگای بەخیلی پێبردن نین، ئەویش گرفتێکی چەند لایەنەیە کە هیچ لێکدانەوەیەکیان بۆ هیچ کامێکیان نەخستۆتەڕوو:

١- ئاڵۆزی زۆری بنچینەی بەشەکانی خانە (پەردەی خانە - مایتۆکۆندریا - رایبۆزۆمات...).

٢- ئاڵۆزی سەرسوڕهێنەر لە بنچینە و فرمانی بەشەکانی ژیان (دی ئێن ئەی - ئارِ ئێن ئەی - پرۆتینات)، هەتا ئەگەر زانست بگاتە ئەوە کە ئەم بەشانە لە تاقیگەدا درووست بکات، ئەوا زانست بەپێی بنچینەی ئەم بەشانە ئەو کارە دەکات کە خودا بەدیهێناوە.

٣- سەرچاوەی زانیاری لە خانەدا، ئەمەش شێوازی درووستکردنی هەر بەشێك لە بەشەکانی ماددەی زیندوو و ئاڕاستەکردنی کار و دیاریکردنی کارلێککردنی لەگەڵ بەشەکانی تر دەگرێتەخۆ، هەروەها کۆدی بۆماوەییش دەگرێتەوە کە دی ئێن ئەی هەڵیگرتووە.

ئەم ئاڵۆزییە سەرسوڕهێنەرە و ئەو زانیاریانە نهێنی درووستکردنی خانەی زیندوون The Know How.

بۆ ئەوەی بتوانین وێنای ئەو هەڵوێستە قورسە بکەین کە ماددیگەراکان لە کاتی هەوڵدان بۆ لێکدانەوەی ئەم کێشانە ڕووبەڕووی دەبنەوە، با بۆچوونی پێشەواکانی فیزیا لە جیهاندا بزانین:

- ((ئاندرۆ کنۆڵ[1] (مامۆستا لە زانکۆی هارڤارد) دەڵێت: ئەگەر کۆتا شت کە زانست دەربارەی درووستبوونی ژیان پێیگەیشتووە هەڵبسەنگێنین، ئەوا دەبینین کە:

١- هێشتا بەتەواوی نازانین کەی ژیان دەستیپێکردووە!

---

(١) Andrew Knoll: لە تەمەنی سی ساڵیدا بوو بە مامۆستای مێژووی سروشتی و حەفریاتەکان لە زانکۆی هارڤارد، بەناوبانگترین کتێبی کتێبی (ژیان لەسەر هەسارەیەکی درووستکراو: سێ بلیۆن ساڵەکەی سەرەتای ژیان Life on the young Planet)، لە ساڵی ١٩٥١ز لە دایك بووە.

٢- هێشتا نازانین لە چ بارودۆخێکدا ژیان پەیدابووە!

٣- هێشتا نازانین چۆن ژیان لەسەر ئەم هەسارەیە دەستیپێکردووە!

ئەوە سەبارەت بە لایەنە ماددییەکانی پەیدابوونی ژیان، ئەی چۆن بتوانین سیفەتە وجودییە ئاڵۆزترەکان تەفسیر بکەین؟ هەروەها سەرچاوەی (پێکهاتەی زانیاری گەورە) کە نهێنی بایۆلۆجیای ژیانە چییە؟

- زانای فیزیای ناوکی (جیراڵد شرۆیدەر)[1] دەڵێت: بە تەنیا بوونی بارودۆخی ژیان بۆ پەیدابوونی ژیان بۆمان ڕوون ناکاتەوە، کە چۆن دروستبووە.

- ئەوپەڕی- دەتوانین بڵێین کە (ئەم بارودۆخە ڕێگایدا بە پەیدابوونی ژیان و بەردەوامبوونی لەسەر گەردوونەکەمان، بەڵام هەموو یاسا سروشتییەکان پێکەوە کە ئێمە دەیانزانین ناتوانن پەیدابوونی ژیان لە ماددەی نازیندوو تەفسیر بکەن.

- ئەنتۆنیۆ لازگانۆ[2] (سەرۆکی کۆمەڵەی نێودەوڵەتی بۆ لێکۆڵینەوە لە بنچینەی ژیان) دەڵێت: یەکێك لەو پرسیە لۆژیکی و زانستییانەی کە لەسەرمان پێویستە دانی پێدابنێین، ئەوەیە کە ژیان بەبێ (میکانیزمی بۆماوەیی Genetic Mechanism) پەیدانەدەبووە، کە لە ڕاستیدا بریتییە لە سیستەمی بەکۆدکردن و چارەسەرکردنی زانیاری، کە بەرپرسە لە هەڵگرتنی زانیاری و گواستنەوەی بۆ نەوەکانی دواتر، لەگەڵ ڕوودانی هەندێك گۆڕانکاری تیایدا (پەرەسەندن)، هەروەها توانای گۆڕینی زانیاری هەیە بۆ وجودێکی ماددی سێ دووری. چۆن ئەم ماددە نازیندووە ئەم میکانیزمەی پەیدا کرد؟ نازانین.

لەبەرامبەر ئەم ئەمانەتە زانستییە دەبینین کە هەندێك کەس بانگەشەی ئەوە دەکەن کە هزری ماددیگەرایی شتێکی بەنرخی بۆ تەفسیرکردنی پەیدابوونی

---

(١) Gerald Schroeder: ئەمریکییە، دکتۆرای لە فیزیای ناوکی و زانستە گەردوونییەکان هەیە، لە ساڵی ١٩٦٥ز لە MIT وەریگرتووە، لە زانکۆی عیبری لە قودس مامۆستایە. یەکێکە لەو کەسانەی کە گرنگی بە پەیوەندی نێوان زانست و ڕۆحانیەتەکان دەدات، بەناوبانگترین کتێبی God of Science ».

(٢) Lazcano Antonio: مامۆستای بایۆلۆجیا، مەکسیکییە، بەناوبانگترین کتێبی The origin of life.

ژیان پێشکەشکردووە، بەڵام لە ڕاستیدا هیچ شتێکی وای پێشکەش نەکردووە کە ڕێز لە عەقڵ بگرێت. سەرنجی هەندێك لە وتەکانی پێشەوای بێباوەڕە نوێیەکان (ریچارد دۆکنز) بدە تا ببینی کە چۆن خۆی دەدزێتەوە و بەڵگەکانی چەندە لاواز و بێ توانان لە خستنەڕووی هەر سەرنجێکی زانستی ڕاستەقینە سەبارەت بە گیروگرفتی پەیدابوونی ژیان و ماهییەتی ژیان.

دۆکنز لە چەند بۆنەیەکی جیاوازدا دەڵێت:

- ژیان لە دەرەنجامی ڕوودانی چەند کارلێکێکی کیمیایی پەیدابووە، کە بۆتە هۆی فەراهەمکردنی بارودۆخی زیندەیی، ئەویش ڕێگای دا بە هەڵبژاردنی سروشتی!

- هەرکە دی ئێن ئەی پەیدابوو دەستیکرد بە پەرەسەندن لە ڕێگەی هەڵبژاردنی سروشتییەوە!

- ئەمە چۆن ڕوویدا؟ زانایان باوەڕیان بە توانای جادوویی ژمارە گەورەکان هەیە (ژمارەی بەشەکان، کاتی درێژکراوە) بۆ بەرهەمهێنانی هەر شتێك!

- هەموو ئەو شتەی پێویستمان پێیەتی تەنیا تەنۆلکەیەکی جیاواز و بەشێکی کەمی کاتە!

تۆش واینابینی کە ئەمە قسەگەلێکی بێ بنەما و جادوویین، کە بانگەشەی ڕوودانی هەر شتێك لە هەر شوێنێك و هەر کاتێکدا بکەین؟!

گەورە زانای فسیۆلۆجیا (جۆرج والد)[1] -خاوەنی خەڵاتی نۆبڵ- ئەم قسە بێ بنەمایە ڕەتدەکاتەوە و لە حەقیقەتی بنچینەی ژیان نزیکمان دەخاتەوە و دەڵێت:

سەرەڕای ئەوەی کە لە سەرەتادا وەك شۆکێك وابوو بۆ بیرکردنەوەی زانستیم، بەڵام پێویستە دان بە بوونی (زیرەکی و دیزاین Intelligence and design)

---

(١) George wald: ئەمریکییە، (١٩٠٦-١٩٩٧ز)، مامۆستای فەرمانەکانی ئەندامەکانی لەش بوو لە زانکۆی هارڤارد، خاوەنی خەڵاتی نۆبڵ لەسەر توێژینەوەکانی دەربارەی تۆڕی چاو.

دا بنێم لەپشت بنیاتنانی گەردوون تا وای لێبێت کە بۆ پەیدابوونی ژیان و بەردەوامبوونی لەسەر هەسارەکەمان گونجاو بێت. لەوەش ئاڵۆزتر درووستبوونی خودی ژیانە، پاشان پەیدابوونی زیندەوەر، کە لە بەرزبوونەوەدا پلەبەندن تا دەگاتە زیندەوەرە عاقڵەکە، کە توانای گەیشتنی بە دۆزینەوە زانستییەکان و داهێنانی هونەری و تەکنۆلۆجیا و خستنەرووی زانیارییەکانی هەیە. بەڵام ئەگەر نکۆڵی لە زیرەکی و دیزاین بکەین و وای دابنێین کە ژیان بە ڕێکەوت درووستبووە، ئەوا لێکدانەوە قورسترینەکەمان هەڵبژاردووە.

گەورە زانای بایۆلۆجیا (جۆرج چێرچ)[1] یش دەرکی بە موعجیزەی خودایی کردبوو لە بوونەوەردا، هەربۆیە گوتوویەتی: دەستکەوتە مرۆییەکان لە چاخی بەردینەوە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆمان وەك ڕووناکی مۆم وایە، ئەگەر بەراوردی بکەین بە گەورەترین ئەستێرە تەقاوەکانی گەردوون. ئێمە لەکوێی ئەم کردارەی خودای بەدیهێنەرداین؟ ئێمە وزە و تەنۆلکەکانی بچووکتر لە گەردیلەمان لە نەبوونەوە بەدی نەهێناوە، ئێمە دیزاینمان بۆ تەقینەوە گەورەکە نەکردووە، ئێمە ژیان و زیندەوەر و مێشکی مرۆڤمان دیزاین نەکردووە. هەموو ئەو کارەی کە ئێمە ئەنجامی دەدەین ئەوەیە کە هەوڵدەدەین لاسایی بکەینەوە، نەخێر ئێمە تەنیا هەوڵ دەدەین مامەڵەیان لەگەڵدا بکەین.

ئەگەر بمانەوێ دیدی زانستی بۆ ماهییەتی ژیان کورت بکەینەوە، بۆ ئەوەی کە لایەنەکانی موعجیزەی خودایی لە درووستکردنی زیندەوەردا هەست پێبکەین، دەڵێین:

زانستی نوێ ژیان دەگێڕێتەوە بۆ گونجانی سەرسوڕهێنەر و هاوسەنگی نێوان بنچینە و خاسیەتە جیاوازەکانی تەنۆلکەکانی ماددەی زیندوو و، هەروەها ئەو یاسایانەی ڕەفتاری ئەم تەنۆلکانە بەڕێوەدەبەن. سەرچاوەیەکی وزەش پاڵپشتی ئەم دامەزراوەیە دەکات، هەموو ئەوانەش لەلایەن ئەرشیفێکی گەورەی زانیارییەوە ئاڕاستە دەکرێن، کە کۆدی بۆماوەیی خانەی زیندوو هەڵیگرتووە.

---

(١) George Church: مامۆستای زانکۆی هارڤارد،ئەمریکییە. زۆرێك لە تەکنیکەکانی گەڕانی لە بواری بایۆلۆجیای بەشیدا داهێناوە. لە ساڵی ١٩٥٤ز لە دایکبووە.

لە ڕاستیدا زانست وەك پێكهاتەی مەعریفی (نهێنی پیشە) سەیری هەموو ئەمانە دەكات، تا ئێستا زانست نەیتوانیوە ئەرێنی و نەرێنیبوونی نهێنی غەیبی بسەلمێنێت، لە پێكهاتەی ماددی و پێكهاتەی مەعریفی خانەی زیندوودا. هەتا ئەگەر نەبوونی ئەم نهێنییەش بسەلمێنرێت، ئەوا لایەنەكانی موعجیزەی خودایی لە بەدیهێنانی ژیاندا هەر لەسەر موعجیزەیی و تەحەددای خۆیان دەمێننەوە.

## ژیـــان و ڕۆح :

ناكرێ ئەم خستنەڕووەی چەمكی ژیان كۆتایی پێبێنین بەبێ ڕوونكردنەوەی چەمكێكی گرنگ، ئەویش ئەوەیە ((ژیان جیاوازە لە ڕۆح))، كە قورئانی پیرۆز لە چەند شوێنێكی جیاوازدا پێمان دەڵێت كە خودا ڕۆحی بەبەر ئادەمدا كردووە هەروەها بەبەر مەریەمیشدا و هەروەها بەبەر هەموو مرۆڤەكاندا لە قۆناغی كۆرپەلەییدا. ئەم بەبەرداكردنە بەبەرداكردنی ڕۆحە نەك ژیان! بەڵێ، جیاوازییان لەنێواندا هەیە؛ ڕۆح تایبەتمەندی مرۆڤە كە بەهۆیەوە لە هەموو گیانلەبەرانی تر جیا كراوەتەوە و بەهۆیەوە بۆتە شیاوی جێنشینێتی خودا لەسەر زەویدا، بەڵام ژیان، كە پێشتر هەر لەم تەوەرەیەدا باسمان كرد، خاسیەتی هەموو بوونەوەرە زیندووەكانە، كە بەهۆیەوە لە ماددە نازیندووەكان جیادەكرێنەوە، لەبەرئەوە پێویستە بەباشی ئاگامان لەم جیاوازییە بێت لەكاتی سەرنجدان لە ئایەتەكانی قورئانی پیرۆزدا.

كەواتە دەكرێ بگوترێت مرۆڤ دوو ڕۆحی هەیە[1]؛ ڕۆحێكی ئاژەڵی، كە بریتییە لەو ژیانەی هەموو زیندەوەران تیایدا هاوبەشن، هەروەها ڕۆحێكی هەستپێكەر، كە بریتییە لە بەبەرداكردنێكی خودایی و بەهۆیەوە لە هەموو

---

(١) ئەم شیكردنەوەیە هی پێشەوا (أبو حامد الغزالي)یە لە كتێبی (إحياء علوم الدين)، بەشی العلم.

بوونەوەرانی تر جیادەکرێنەوە، ئەم دوو ڕۆحەش پەیوەندییان بە مردنەوە هەیە. سەرنجی فەرموودەی پەروەردگار بدە:

﴿ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَٱلَّتِى لَمْ تَمُتْ فِى مَنَامِهَا ۖ فَيُمْسِكُ ٱلَّتِى قَضَىٰ عَلَيْهَا ٱلْمَوْتَ وَيُرْسِلُ ٱلْأُخْرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾ ﴾ الزمر: ٤٢.

واتە: (هەر خوایە کە گیانەکان دەکێشێت لەکاتی مردنیاندا، هەروەها ئەو گیانەش کە نەمرد لە خەوەکەیدا هەر خوا بۆی دەنێرێتەوە، جا ئەو کەسەی کە خوا بڕیاری مردنی دابێت روحەکەی دەگرێتەوە و ناگەڕێتەوە بۆ لاشەی، ئەو کەسەش کە ڕۆژی تەواو نەبوبێت دەینێرێتەوە بۆی تا کاتێکی دیاریکراو، بەڕاستی ئا لەو دیاردانەدا چەندەها بەڵگە و نیشانەی زۆر هەیە بۆ کەسانێك کە تێفکرن و بیر بکەنەوە).

لە ئایەتەکە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە مردن کردارێکە لە دوو دۆخدا تووشی مرۆڤ دەبێت؛ لە کاتی نووستن و لە کاتی مردندا، واتا مراندن(التوفي) شتێکی جیاوازە لە مردن(الموت)، لەژێر ڕۆشنایی ئەم تێگەیشتنە دەبینین کە مرۆڤ لەکاتی خەوتندا ڕۆحی هەستپێکەری لێ جیادەبێتەوە، لەکاتێکدا کە ژیان لە جەستەیدا بەردەوام دەبێت، بەڵام لەکاتی مردندا هەردوو کردارەکەی بەسەردا دێن، کرداری بایۆلۆجی کە بریتییە لە مردن؛ کە بەسەر هەموو زیندوەراندا دێت، کرداری مراندن؛ کە خودا لەڕێی فریشتەی گیانکێشانەوە پێی هەڵدەستێت، بە بردنەوەی ئەمانەتەکەی(ڕۆحی هەستپێکەر) کە بەهۆیەوە مرۆڤی شەرەفمەند کرد.

## تەوەرەی شەشەم

## پەرەسەندنی داروینی لەنێوان خودا و بێباوەڕیدا

((وا دەردەکەوێت کە جیهان ماوەیەکی زۆربوو بۆ پێشوازیکردن لە مرۆڤ خۆی ئامادە دەکرد، ئەم قسەیە لە روویەکەوە بە تەواوەتی ڕاستە؛ چونکە مرۆڤ لە پەیدابوونیدا قەرزاری هێڵێکی دوور و درێژی پێشینانی خۆیەتی ئەگەر تاقە ئەڵقەیەك لەو زنجیرەیەدا بەدی نەهاتبایە ئەوا مرۆڤ بەو شێوەیەی ئێستای نەدەبوو)).

"چارڵس داروین"

((داروین باوەڕی بەوە هەبوو کە یەکەمین خانەی زیندوو بەدیهێنەرێکی گەورەی لەپشتەوەیە، پاشان سروشت ئەرکی پەرەسەندنی گرتۆتە ئەستۆ تا گەیشتۆتە ئەو جۆراوجۆرییەی بوونەوەر کە ئێستا دەیبینین. سەیرکە قوتابیەکانی داروین و موریدەکانی چۆن بیردۆزەکەیان شێواندووە، وایان لێکردووە ببێتە رەمزی بێباوەڕی!)).

"د.عەمر شریف"[1]

هەرکە ناوی (بیردۆزی داروین) لە ناوەندە فکرییەکاندا دەهێنرێت، شەپۆلێك مشت و مڕ بەدوای خۆیدا دێنێت، لەنێوان ئەوانەی وایدەبینن، کە پەرەسەندن

---

(١) لە کتێبی گەشتی عەقڵ، کە هی هەمان نووسەرە و هەمان وەرگێڕ وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی و هەر لە نووسینگەی تەفسیر چاپ کراوە و بڵاو کراوەتەوە.

ڕاستییەکی زانستییە، زانستی بایۆلۆجیای لەسەر دامەزراوە[1]، تا ئاستێك کە لەوانەیە بیکاتە نیشانە و بەڵگە بۆ نکۆڵیکردن لە بوونی خودا، لەبەرامبەریشدا ئەوانەی بە تەواوی نکۆڵی لە پەرەسەندن دەکەن و وای تێدەگەن کە داننان بە پەرەسەندن دەرچوونە لە بازنەی باوەڕ و ئایین. دەکرێ لایەنەکانی جیاوازی لە دوو خاڵی سەرەکیدا کورت بکرێنەوە:

١- ئایا پەرەسەندنی بایۆلۆجی ڕاستییەکی زانستییە یان بەلایەنی کەمەوە بیردۆزێکی چەسپاوە کە پێویستە حیسابی بۆ بکرێت؟

٢- ئایا داننان بە چەمکی پەرەسەندن نکۆڵیکردنی بوونی خودامان بەسەردا فەرز دەکات، یاخود دەکرێ ئەم دوو بۆچوونە پێکەوە ڕێکبخرێن؟

لە ڕاستیدا ئەو چەمکەی کە پەیڕەوی لێدەکەین و لەڕێی ئەم تەوەرەیەوە هەوڵ بۆ سەلماندنی دەدەین، بریتییە لە قەبوڵکردن و داننان بە پەرەسەندنی بوونەوەر لە نزمترینەوە بۆ بەرزترین، لەگەڵ ڕەتکردنەوەی ئەوەی کە هەڕەمەکیتی (العشوائية) میکانیزمی ئەو کردارە بێت، بەڵکو پێویستە لە پشت پەرەسەندنەوە خودایەکی کاربەجێی بەتوانا هەبێت.

لەم تەوەرەیەدا، لەگەڵ زانستدا بۆ دۆزینەوەی حەقیقەتی پرسەکە گەشتدەکەین.

---

(١) زۆر کەس وایدەبینن کە چەمکی پەرەسەندن ئەوەندە گرنگە بۆ زانستی بایۆلۆجیا وەك چەمکی خولانەوەی زەوی و خولانەوەی بەدەوری خۆردا بۆ زانستی فەلەکناسی. ئێمە بە هەستیارییەکی زۆرەوە کار لەگەڵ ئەم وەسفە دەکەین، چونکە خولانەوەی زەوی بە دەوری خۆردا، ڕاستییەکی سەلمێنراوە بە بەڵگەی زانستی ڕاستەوخۆ و، ناکرێ بە چەمکێك یەکسان بکرێت، کە بەهیچ جۆرێك ناخرێتە ژێر تێبینی کردنەوە، وەك ئەوەی بڵێین باڵندەکان و مەمکدارەکان لە خشۆکەکانەوە پەیدابوون. لەڕاستیدا یەکسانکردنی ئەم دوو چەمکە بەهیچ جۆرێك خستنەڕوونکی زانستی نییە و هەڵوێستێکی ئایدۆلۆجی لەپشتە کە لێکدانەوەکانی تر ڕەتدەکاتەوە.

## داروین و بیردۆزی پەرەسەندن

**با لەسەرەتاوە سەرنجی چیرۆکەکە بدەین[1]**

دوای گەشتێك بەدەوری جیهاندا (١٨٣١-١٨٣٦ز)، کە پێنج ساڵی خایاند بە کەشتی بیگڵ The Biagle (سەگی راو)، هەروەها دوای لێکۆڵینەوەیەکی هێواش (بەدرێژایی چارەگە سەدەیەك) بۆ نموونەی ئاژەڵ و ڕووەك، کە لە هەموو کیشوەرەکانی جیهان کۆیکردبوونەوە، زانای بایۆلۆجیای بەریتانی (چارلس داروین Charles R. Darwin) (١٨٠٩-١٨٨٢ز)، کە لە ساڵی ١٨٥٩ز هەڵستا

---

(١) چەمکی پەرەسەندن لە نووسینەکانی زۆرێك لە زانا مسوڵمانەکان بە نزیکەی هەزار ساڵ پێش داروین هاتووە (نووسینەکانی ابن خلدون ١٣٣٢-١٤٠٦ز) و(ابن مسکویە ٩٣٢-١٠٣٠ز) هەروەها نامەکانی (اخوان الصفا سەدەی نۆیەمی زایینی) و(جاحظ ٧٧٦-٨٦٨ز لە کتێبی الحیوان باسی ئەوەی کردووە کە بوونەوەران لەنێوخۆیاندا لەپێناو مانەوەدا کێبڕکێ دەکەن. هەروەها ژینگە کاردەکاتە سەر زیندەوەر و بەمەش گۆڕانکارییەکی تێدا ئەنجام دەدات و بەمەش دەیکاتە جۆرێکی تر، واتا هەندێکیان لە هەندێکی ترەوە پەیدا دەبن). ئەمانە لەرێی سەرنجدان و بیرکردنەوە لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و بیرکردنەوە لەو نیشانانەی کە لە زیندەوەراندا بوونیان هەیە گەیشتوونەتە چەمکی پەرەسەندنەوە. خستنەڕووی ئەو چەمکە لەلایەن ئەو زانایانەوە زۆر ڕوون و بەهێز بوو و بەڵگەی رازیکەریان لەپشتەوەبوو، کە بووە هۆی ئەوەی زانای کیمیا و فەیلەسووف و مێژوونووسی ئەمریکی (جۆن ویلیام دراپەر John Wiliam Draper)، (١٨١١-١٨٨٢ز)، کە گرنگی بە پەرەسەندنی بایۆلۆجی دەدات کە دەربارەی (بیردۆزی پەرەسەندنی موحەممەدی Mohammedian Thory of Evolution) بڵێت کە بە زیاتر لە ١٠٠ساڵ پێش بیردۆزەکەی داروین هاتووە. ئەم قسەیەی لە کتێبەکەیدا (مێژووی کێبڕکێی نێوان ئاین و زانست History of Conflict between Religion and Science)دا باس کردووە.

بەبڵاوکردنەوەی کتێبی (بنچینەی جۆرەکان و پەرەسەندنیان لەرێی هەڵبژاردنی سروشتییەوە The Origin of spesies by means of natural selection).

کتێبەکە ئەوە روونەکاتەوە کە زیندەوەران بەشێوەی پەرەسەندن لە یەک رەچەڵەک و بنچینەوە پەیدابوون، یان لە ژمارەیەکی سادەی پێشینە هاوبەشەکانەوە. داروین سووربووە کە خۆی لە باسی پەرەسەندنی مرۆڤ بەدوور بگرێت، چونکە نەیویستووە مشتومڕ و مقۆمقۆ درووست بکات، بەڵام لەساڵی ١٨٧١ز داروین هەستی بەوە کرد کە ئیتر شتێك نەماوە لە دەستی بدات، بۆیە کتێبەکەی (پەیدابوونی مرۆڤ the Descent of man)ی بڵاوکردەوە، کە تیایدا باسی لە بەدیهاتنی مرۆڤ کردووە لەرێی پەرەسەندنەوە.

داروین سەرەڕای کەمی بەڵگە زانستییەکانی بەردەستی لەو کاتەدا گەیشتۆتە ئەو بیردۆزە، هەروەها لە کاتی بڵاوبوونەوەی ئەم دوو کتێبە و تائێستایش زانست هەنگاوی گەورەی لە زۆر بواردا ناوە، کە یاریدەدەر بوون بۆ لێکۆڵینەوە و بەهێزکردنی چەمکی پەرەسەندن.

هەروەها داروین لە بیردۆزەکەیدا باسی لە پەیدابوونی ژیان نەکردووە، چونکە ئەو باوەڕی بە پێویستی دەستخستنەناوی خودایی هەبوو بۆ بەدیهێنانی خانەی سەرەتا، ئینجا دوای ئەوە پەرەسەندن هەڵبستێت بە ئەنجامدانی جۆراوجۆرێتی گەورە لە زیندەوەردا، هەروەها سەرەڕای ئەوەش دامەزرێنەرانی داروینیزمی نوێ[١] هەستان بە فراوانکردنی چەمکی پەرەسەندن بۆئەوەی پەرەسەندن ئاستی کیمیاییش بگرێتەوە[٢]، تا لەرێیەوە بگەنە تەفسیرێك بۆ دەرکەوتنی خانەی سەرەتایی بەبێ پێویستی بە دەستخستنەناوی خودایی[٣].

---

(١) داروینیزمی نوێ پشت بە لێکدانەوەی چەمکەکانی داروین دەبەستێت لەژێر رۆشنایی یاساکانی مێندل بۆ بۆماوەیی.

(٢) لە تەوەری پێشتر مەحاڵی رووداونی ئەوەمان سەلماند.

(٣) چەمکی (پەرەسەندن) دوو واتا دەگرێتەوە، کە کۆڕاییان لەسەرە و هیچ کام لە نکۆڵیکارانی داروینیزم نکۆڵییان لێنەکردووە. ئەوانیش پەرەسەندنی ورد Micro Evolution کە بە واتای گۆڕانکاری دیاریکراوە لە زیندەوەردا، وەك پەیداکردنی بەرگری هەندێ میکرۆب لە دژی هەندێك لە دژە تەنەکان. واتای

## پەرەسەندن قەبووڵ دەکەین و داروینیزم رەتدەکەینەوە :

یەکێتی ئەمریکی بۆ پێشخستنی زانستەکان AAAS[1] بە گەورەترین کۆمەڵەی زانستی دادەنرێت لە جیهاندا، لە ١٩ فێبریوەری ساڵی ٢٠٠٦ز دا یەکێتییەکە بەیاننامەیەکی دەرکرد کە تیایدا هاتووە:

(لە ناوەندە زانستییەکاندا ناکۆکییەکی وا نییە، کە شیاوی باسکردن بێت دەربارەی چەمکی بنچینەی زیندەوەران، بەڵکو پەرەسەندن لە ئێستادا بە بەهێزترین و قبوڵکراوترین بنەمای زانستی بایۆلۆجیا دادەنرێت).

بەیاننامەکەی یەکێتییەکە باسی بنەما یان چەمکی پەرەسەندن دەکات، بەڵام کاتێك دەستەواژەی داروینیزم (یان پەرەسەندن)ی لێبنرێت، ئەوا ئاماژەیە بۆ دامەزراوەیەك کە لە سێ رەگەز پێکهاتووە:

---

دووەمیش بریتییە لە هەڵبژاردنی دەستکرد Artifitial Sellection. نموونەیشی وەك کرداری پێتاندن کە جۆرەها گوڵ و بەرهەم و ئاژەڵی نوێی لە بنچینەی جیاواز بۆ بەدیهێناوین.

پەرەسەندن دوو واتای تری هەیە کە جێگای ناکۆکین. چ لە روودانیان یان لە لێکدانەوەی میکانیزمەکەیان. یەکەمیان بریتییە لە پەرەسەندنی دیار(بەرجەستە-گەورە) Macro Evolution، کە ئاماژەیە بۆ دەرکەوتنی ئەندام یان بوونەوەری نوێ لە دەرئەنجامی دروستبوونی کۆدی بۆماوەیی نوێ. داروینیزمەکان رووداني ئەوە دەگێڕنەوە بۆ کەڵەکەبوونی زۆر هەنگاو لە پەرەسەندنی ورد. جۆری دووەم بریتییە لە پەرەسەندنی کیمیایی بەشی Cemical molecular Evolution، لایەنگرانی ئەم جۆرە مەبەستیان لە دەرکەوتنی خانەی زیندووە لەماددەی نازیندووەوە. لە تەوەرەی رابردوودا مەحاڵی رووداني ئەم بانگەشەیەمان سەلماند. لەم تەوەرەیەدا دەستەواژەی (پەرەسەندن) وەك ئاماژەیەك بۆ (پەرەسەندنی دیار-بەرجەستە-گەورە) بەکاردەهێنین، مەبەستیشمان لێی گواستنەوەیە لە جۆرێك لە زیندەوەران بۆ جۆرێکی تری بەرزتر، ئەگەرچەگە لەوە هیچ رشەیەکی ترمان لەگەڵ بەکارنەهێناوە.

(١) AAAS : the American Assocation For advancement of science، لە ساڵی ٢٠٠٦ز دا ئەندامەکانی گەیشتە زیاتر لە ١٢٠ هەزار زانا، لە وڵاتە جیاجیاکانی جیهان و پسپۆڕییە جیاوازەکان، ئەم کۆمەڵەیە بەرپرسە لە دەرکردنی گۆڤاری زانست Science

یەکەم: بنچینەی هاوبەش یان پێشینی هاوبەش Common and castor بە واتای ئەوەی کە هەموو زیندەوەران چ ئاژەڵی یان رووەکی لە یەك رەچەڵەك و بنچینەوە پەرەیان سەندووە(کە بریتییە لە بوونەوەری تاك خانەیی)یاخود لە چەند بنچینەیەکی کەم، واتا چەند خانەیەك. هەندێ کاتیش مەبەست لە بنچینەی هاوبەش ئەوەیە کە بوونەوەری یەکەم لە یەك شوێنی جیهاندا بوونی هەبووە، لەویشەوە بوونەوەرانی تر پەرەیان سەندووە و بە ناوچەکانی تری زەویدا بڵاوبوونەتەوە.

دووەم: گۆڕانە هەڕەمەکییەکان Random Motations کە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات بەرزبوونەوە لە بوونەوەرێکەوە بۆ بوونەوەرێکی ئاڵۆزتر لە ئەنجامی گۆڕانکاری هەڕەمەکی بووە لە کۆدی بۆماوەیی بوونەوەردا لەسەر ئاستی کرۆمۆسۆمات یان جینات. داروینیزم وایدەبینێت کە گۆڕانکارییە بەسوودەکان بەشێوەیەکی زۆر هێواش لەڕێی نەوە یەك لە دوای یەکەکان کەڵەکە دەبن، تا گۆڕانکارییەکی بەرچاو لە زیندەوەرەکەدا درووستدەکات و بەرز دەبێتەوە بۆ بوونەوەرێکی تر.

سێیەم: هەڵبژاردنی سروشتی Natural selection: میکانیزمێکە کە بەهۆیەوە هەنگاوە هەڕەمەکییە بەسوودەکان بۆ نەوەکانی دواتر دەگوازرێتەوە، پاشان پارێزگارییان لێدەکرێت. هەرچی ئەو بوونەوەرانەن کە بازدانی زیانبەخشیان هەڵگرتووە دەمرن و پەرش و بڵاودەبنەوە و لەناودەچن. هەڵبژاردنی سروشتی بە یاسایەکی زانستی دادەنرێت، بەو واتایەی کە گونجاوترین و شیاوترینیان بۆ ژیان دەمێنێتەوە و نەگونجاوەکەش لەناودەچێت، ئەمەشیان شتێکی بەدیهی و عەقڵییە.

زانست بەڵگەی رازیکەر لەسەر چەمکی پەرەسەندن لە بنچینەی هاوبەش (ڕەگەزی یەکەم) پێشکەش دەکات، بەڵام بانگەشەی داروینیزم بەوەی کە میکانیزمی پەرەسەندن بریتییە لە هەڵبژاردنی سروشتی لەنێوان بازدانە هەڕەمەکییەکاندا (ڕەگەزەکانی دووەم و سێیەم) ئەمە گریمانەیەکە پێویستی بە

بەڵگە هەیە، چونکە زانست ناتوانێت هەڕەمەکێتی ئەو هەنگاوانە بسەلمێنێت و بیسەلمێنێت کە لەلایەن خودای بەدیهێنەرەوە ئاراستە ناکرێت!! بەڵکو زانست بێتوانایی هەڕەمەکێتی لە پێشکەشکردنی بازدانی سوودبەخش سەلماندووە، لەبەرئەوە ئەم میکانیزمە رەتدەکەینەوە. واتا ئێمە پەرەسەندن قەبوڵ دەکەین و داروینیزم رەتدەکەینەوە.

چەمکە داروینییەکان واتای ئەوە نین کە داروین وەك زۆر کەس بانگەشەی بۆ دەکەن بێباوەڕ بووە، سەرنجی ئەو قسەیەی بدە کە دەڵێت: ((من هیچ پاساوێك نادۆزمەوە بۆ ئەوەی کە چەمکی پەرەسەندن بیروباوەڕی دیندارەکان لەق بکات)).

هەروەك چۆن ئێمە چەند بەشێك لەو قسانەی کە لە ژیاننامەی خۆیدا باسی کردووە دەگوازینەوە، بەڵکو ئەو چەند وشەیە پاکانەی بۆ بکەن و ببن بە بەڵگە بەسەر بێباوەڕانەوە: ((زۆر قورسە بەڵکو مەحاڵە، کە گەردوونێکی گەورەی وەك گەردوونەکەمان کە بوونەوەرێکی وای تێدا دەژی کە توانای مرۆیی زۆر گەورەی هەیە، لە سەرەتاوە بە ڕێکەوتی کوێرانە درووست بووبێت، یان لەبەرئەوەی کە حاجەت و پێویستی دایکی داهێنانە. کاتێك لە دەور و پشتم بەدوای هۆکاری یەکەمدا دەگەڕێم لە پشت ئەم بوونەوە، وا خۆم دەبینم کە ناچارم دان بە بوونی عەقڵێکی زیرەکدا بنێم، بۆیە من باوەڕم بە بوونی خودا هەیە[1])).

---

(1) ((Reason tells me of the] extreme difficulty or rather impossibility of] conceiving this immense and wonderful universe, including man with his capaibility of looking far into futurity, as the result of blind chance or necessity. When thus reflecting I feel compelled to look to a First Cause having an intelligent mind in some degree analogous to that of man; and I deserve to be called a Theist))

ویستم دەقی دانپێدانانی داروین لە ژیاننامەکەیدا لێرە دابنێم، کە دەیسەلمێنێت، (داروین باوەڕی بە خوداهەبووە، لێرەدا سەرچاوەکە بە دیاریکراوی دادەنێین:

Charles Darwin the autobiography of Charles Darwin, ed. Nora Barlow (London: collins, 1958. 92-3.

## بەڵگەی زانستی لەسەر پەرەسەندن :

کاتێك لەگەڵ بیباوەڕە نوێیەکان لەسەر ڕوودانی پەرەسەندن هاوڕابووین، ئەوا لێرەدا پێویستیمان بە ڕوونکردنەوەی بەڵگە زانستییەکانی نییە، هەروەها پێویستیشمان بەوە نییە کە باوەڕ بە نەیارانی پەرەسەندن بهێنین، چونکە ئەمە بوارێکی تری گفتوگۆی دەوێت[١]. لەبەرئەوە هەر بەخێرایی بەڵگەکان دەخەینەڕوو، ئەوانیش:

**یەکەم:** بەڵگەی بایۆلۆجیای بەشی (جینات)، کە بەهێزترین بەڵگەی سەردەمە.

**دووەم:** بەڵگەی شیکاری بەراوردکاری لەنێوان بوونەوەراندا: کە بریتییە لە بەڵگەی سەرەکی کە داروین پشتی پێبەستووە، لەکاتی دانانی بیردۆزەکەیدا.

**سێیەم:** بەڵگەی پەیدابوونی کۆرپەلەیی، داروین لە زانستی کۆرپەلەناسیدا پسپۆڕ نەبوو، لەبەرئەوە پشتی بە پسپۆڕانی ئەو بوارە بەستووە.

**چوارەم:** بەڵگەی تۆماری حەفریاتەکان، کە لە سەردەمی داروینداز زۆر دەگمەن بوو، بەڵام پێشبینی ئەوەی کردووە، کە دەکرێ پسپۆڕان بە تێپەڕبوونی کات حەفریاتی زیاتر بدۆزنەوە، بەشێکی ئەو پێشبینییەشی لە ئێستادا هاتۆتەدی.

پێویستە جەخت لەسەر ئەوە بکەینەوە، کە ئەو بەڵگانە بەڵگەی حاشاهەڵنەگر نین لەسەر ڕوودانی پەرەسەندن، بەڵکو بەڵگەی یەکلاییکەرەوەن بۆ کێشەکەو یەکتر بەهێز دەکەن، داننان بە پەرەسەندن (بە باشترین لێکدانەوە) دادەنرێت بۆ بوونی ئەو بەڵگانە. هەڵوەستەی شیکاریمان بۆ هەر بەڵگەیەك لەو بەڵگانە

---

(١) دەکرێ بۆ پێداچوونەوە بە ڕووداوەکانی پەرەسەندن بگەڕێیتەوە بۆ کتێبەکەمان (کیف بدأ الخلق - تەوەرەی پێنجەم).

دەبێت لە تەوەرەکەدا، ئەگەر بزانین خزمەتمان دەکات بۆ ڕوونکردنەوەی چەمکی پەرەسەندن، لەگەڵ رەتکردنەوەی ئەوەی کە ئەوە بە ڕێکەوت ڕوویدابێت.

## داروینیزم لە ڕۆژگاری داروینداا :

بێباوەڕانی هاوچەرخ وایدەبینن کە داروینیزم کۆڵەگەی سەرەکی بانگەشەکەیانەلەسەر نەبوونی خودا، تا گەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە بێباوەڕی و داروینیزم وەك هاوواتا بەکاربێن، ئایا ئەوە رای داروین و کۆمەڵگەی زانستی سەردەمی خۆی بوو؟ بێگومان نەخێر..! لەم تەوەرەیە و لە تەوەرەی پێشووتردا چەند وتەیەکی داروینمان وەك بەڵگە هێنایەوە کە دەیسەلمێنن داروین باوەڕی بە بوونی خودا هەبووە.

هەروەها تۆماس هیکسلی[1] (یەکەمین قوتابی داروین و خرۆشگەرمترین کەس بۆ بیردۆزەکەی) بێباوەڕ نەبوو. لە دیبەیتێکدا کە مێژوو تۆماری کردووە کە لەگەڵ قەشە وڵبرفۆرسدا لە ساڵی ١٨٦٠ز ئەنجامی دا، هیکسلی گوتی: هۆکاری بەرزتر هەن کە حوکم بەسەر پەرەسەندندا دەدەن، کە بیردۆزەکە لێیان نزیك نەکەوتۆتە. هەروەها گوتی: پەرەسەندن چەمکێکی زانستی فەلسەفییە و لە ئایینەکان نزیك ناکەوێتەوە، تەنانەت هیکسلی وایدەبینی کە پرسی بوونی خودا ناکرێ لەڕێی زانستی بایۆلۆجیاوە یەکلا بکرێتەوە، بۆیە نووسیویەتی[2]: لەڕاستیدا زانست (نەزانکار - لا أدری Agnostic)[3]ە، چونکە هیچ ئامرازێکی

---

(١) T.H.Huxely: (١٨٢٥-١٨٩٥ز)، زانای زیندەزانی بەریتانی، کە بە سەگی داروینی بۆڵدۆگ بەناوبانگ بوو، بەهۆی زۆری پشتگیری کردنی لە داروین.

(٢) لە وتارێکدا کە لە ساڵی ١٨٨٣ز بۆ Charles watts ی هاوڕێی نووسیبوو.

(٣) هیکسلی یەکەمین کەسە کە ئەم دەستەواژەیەی بەکارهێناوە.

بۆ لێکۆڵینەوە لە بوونی خودا لەبەردەستدا نییە، لەبەرئەوە پێویست بەوە ناکات کە بێباوەڕان بۆ سەلماندنی بۆچوونەکانیان پەنای بۆ ببەن، هەروەك چۆن نابێت دیندارەکانیش ئەو کارە بکەن[١]، هیکسلی لە دیبەیتەکانیدا جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە پەرەسەندن پێویستی بە گەردوونێکی زۆر وردی ڕێکخراو هەیە، کە کەرەستەی پێویستی لە ڕووی جۆر و چۆنیەتییەوە تێدابێت و یاسای ئاڵۆز بەڕێوەی ببەن.

کەواتە بەڵگەکانی ڕێکخراویی ورد کە کیمیا و فیزیا و فەلەکناسی وەك بەڵگە لەسەر ئەو بابەتە دەیخەنەڕوو، بە بیردۆزی پەرەسەندن کاریگەر نەبووە. هیکسلی تەفسیرێکی گریمانەکراوی بۆ ڕوودانی پەرەسەندن خستۆتەڕوو، ئەویش ئەوەیە کە خودا لە سەرەتاوە بوونەوەری بەجۆرێك بەدیهێناوە کە بازدانی گونجاو لە کاتی گونجاودا ئەنجام بدرێت(بە واتای ئەوەی کە بازدانەکە ئاراستەکراوە، وەك ئەوەی ئێمەیش باوەڕمان پێی هەیە).

زۆرێك لە گەورە زانایانی هاوچەرخی داروین بەو جۆرە سەیری میکانیزمەکانی پەرەسەندنیان کردووە، کە بریتییە لە ئامرازی خودا بۆ بەدیهێنانی جۆراوجۆریتی بوونەوەر، لەوانە هاوڕێکەی، گەورە زانای ڕووەکناس لە زانکۆی هارڤارد ئاسا گرای[٢]، کە یەکەمین کەس بوو لە دەرەوەی بەریتانیا داروین بیردۆزەکەی نیشان بدات.

هەروەها کاتێك داروین کتێبەکەی (بنچینەی جۆرەکان)ی بڵاوکردەوە، ڕۆماننوسی فەیلەسووف چارلس کینگزلی[٣] وتارێکی بۆ داروین نووسی، کە

---

(١) ئێمە لەو بارەیەوە لەگەڵ هیکسلیدا هاوڕانین و، باوەڕمان بەوە هەیە کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە، کە دەفەرموێت: ﴿ سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ ﴿٥٣﴾ ﴾ فصلت: ٥٣، واتا پێویستە زانست بۆ سەلماندنی بوونی خودا بەکاربهێنرێت و، هەموو تەوەرەکانی ئەو کتێبەش جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە.

(٢) Asa Gray: (١٨١٠-١٨٨٨ز)، بەناوبانگترین زانای ڕووەکناسی ئەمریکی لە سەدەی نۆزدەهەمدا.

(٣) Charles Kingsley: (١٨١٩-١٨٧٥ز)، ڕۆماننوس و فەیلەسووفی بەریتانی، کە هاوڕێی داروین بوو.

تیایدا هاتووە: لە ڕاستیدا بیردۆزەکەت دەربارەی هەڵبژاردنی سروشتی گەورەیی و توانای خودا دەسەلمێنێت، کە توانای بەدیهێنانی خۆیانیانی بە زیندەوران بەخشیوە. سەرەڕای ئەوەی کە کینگزلی زانایەکی بایۆلۆجی نەبوو، بەڵام داروین ئەو قسەیەی لە چاپی دووەمی کتێبەکەیدا چەسپاندووە، لەوانەیە بۆ ئەوە بووبێت کە ئاستی ئەو پاڵەپەستۆیە کەم بکاتەوە کە لەلایەن دیندارەکانەوە لە سەری بوو.

## داروینیزم لە نێوان حەقیقەت و گۆڕانی زانستیدا :

بیردۆزی داروینی دوای ئەوەی لە ساڵی ١٨٥٩ز خرایەڕوو پێشوازییەکی گەورەی لێکرا، پاشان زۆربەی زانایانی بایۆلۆجی لەگەڵ هاتنی ساڵی ١٩٠٠ز چەمکی هەڵبژاردنی سروشتییان ڕەتکردەوە.

پاشان لە سییەکانی سەدەی بیستەمدا بیردۆزەکە گەڕایەوە ناو گۆڕەپانەوە، دوای ئەوەی داروینیزمی نوێ چەمکەکانی داروین و یاساکانی (مێندل بۆ بۆماوەیی )یان بەیەکەوە بەستەوە، لە کۆتاییەکانی سەدەکەدا چەمکە هەڕەمەکیتی خۆری بەرەو ئاوابوون چوو، دوای ئەوەی زۆرێك لە زانا بایۆلۆجییەکان گۆڕیانەوە بە هۆکارە کەشناسییەکانەوە، کە لەسەر زەویدا باوبوون وەك بزوێنەری شەمەندەفەری پەرسەندن.

هەروەها لە ساڵی ٢٠٠١ز دامەزراوەی دیسکەڤەری ماڵپەڕێکی لەسەر ئینتەرنێت درووستکرد، بۆئەوەی زانا نەیارەکانی داروین تیایدا بۆچوونەکانیان بخەنەڕوو[1]، لەماوەی پێنج ساڵ زیاتر لە ٧٠٠ گەورە زانای زانکۆ بەناوبانگەکانی جیهان ڕاوبۆچوونە ناکۆکەکانی خۆیانیان خستەڕوو.

---

(١) Www.dissentfromdarwin.org

گومان لەوەدا نییە کە دەیان و سەدانی تریش دێنە سەر لیستەکە، ئەگەر لە نەفەوتانی ئایینەدی زانستییان دڵنیا بن، کە داروینییەکان زۆر بە توندی هەڕەشەیان لێدەکەن ئەگەر را ناکۆکەکانیان ئاشکرا بکەن! هەروەك چۆن لە فیلمی (دەرکراوەکان - المطرودون - Expelled)دا ڕوودەدات، کە باس لە ڕووداوێکی ڕاستەقینە دەکات.

Expelled: No Intelligence Allowed[1]

لەگەڵ ئەوەشدا، هێشتا زۆربەی زانایانی بایۆلۆجی لە ڕۆژئاوا پشتگیری لە داروینیزم دەکەن، بەڵام ئایا کۆڕایی زانستی Science Consesus هەموو کات لایەنگیری حەقیقەت دەبێت[2]؟!! لە ڕاستیدا بانگەشەی کۆڕایی چەمکێکی زانستی نییە، بەڵکو شێوازێکی گفتوگۆیە کە سیاسەتمەدارەکان و پیاوانی ئایین بۆ رەواجدان بەو شتانەی کە باوەڕیان پێی هەیە بەکاری دەهێنن. زانست لە بەڵگەهێنانەوە لەسەر بانگەشەکانمان بە ڕێبازی زانستی دروست سەرچاوە دەگرێت، پاشان گفتوگۆیەکی پاك بۆ هەڵسەنگاندنی ئەو رەخنانەی کە ناڕاستەی بانگەشەکانمان دەکرێن، تەنانەت گەورە زانایانی مێژووی زانست (وەك حەسەنی کوری هەیسەم و نیوتن و ئەنیشتاین) بەهۆی دەرچوونیان لە کۆڕایی و دۆخی باو گەیشتن بەو پێگەیە.

داننان بە کۆڕایی زانستی رێگایەکە بۆ بەهەڵەدابردنی کەسی بەرامبەر بەوەی کە ئەم بۆچوونە سەبارەت بەم پرسە جێگیربووەو، بەرهەڵستیکردنی هیچ سوودێکی نییە و تەنیا نەزانییە دەربارەی ئەو شتانەی کە زانایان لەسەری رێککەوتوون.

---

(١) (تەوەری فیلمەکە لەسەر دەیان مامۆستای زانکۆی ئەمریکی دەخولێتەوە، ئەوانەی کە بەهۆی نکۆڵی کردنیان لە داروینیزم و پەیڕەوی کردن لە چەمکی دیزاینی زیرەك لە کارەکەیان دوورخراونەتەوە.

(٢) سەرنجی ئەوە بدە کە لەماوەی چل ساڵ لە زانستی بایۆلۆجیدا روویداوە، دوای ئەوەی کە کۆڕاییەکی زانستی لە کۆنگرەی نێودەوڵەتی فراوانکراودا لە ساڵی ١٩٦٠ز روویدا، لەسەر ئەوەی کە دروستبوونی باران دەگەڕێتەوە بۆ رووداني هاتنەخوارەوەی گەورە Geocyclinal Theory، لە ساڵی ١٩٧٠ز بیردۆزەکە گۆڕاو ئەو بیردۆزە جێگای گرتەوە کە دروستبوونی باران دەگێڕێتەوە بۆ جوڵەی کیشوەرەکان و چینە جیۆلۆجییەکان لە قووڵای دەریادا Plate tectonics دوای ئەوەی کە وادەزانرا کە چینەکانی زەوی جێگیرن.

پوختەی قسان، ئەگەر زانست بوونی هەبێت ئەوا کوێرایی بوونی نییە، ئەگەر کوێراییش هەبێت ئەوا زانست بوونی نییە.

## داروینیزمیان کردۆتە ئایینێکی ناخودایی :

لەوە تێدەگەم کە ئوسوڵییە ئایینییەکان دانتان بە پەرسەندنی داروینی واسەیر دەکەن کە لەگەڵ ئاییندا تێکدەگیرێت، بەڵام ئەوەی کە داروینییەکان بڵێن کە لەسەرمان پێویست دەکات کە بێباوەڕبین، ئەوا ئەو قسەیە پێویستی بە بیرکردنەوە و شیکردنەوە و ساغکردنەوە هەیە.

فەیلەسووفی ئەمریکی نەزانکار(لا أدری) ئینگەرسۆڵ[1] دەڵێت: پێویستە سەدەی نۆزدەهەم بە (سەدەی داروین Darwins Century) دابنرێت، چونکە بیردۆزەکەی هەموو پاشماوەکانی ئایینی مەسیحییەتی ئەرسۆدۆکسی لە عەقڵی مرۆڤەکاندا سڕیەوە. هەروەها سێر جولیان هیکسلی[2] لە وتارێکدا کە لە ساڵی ١٩٥٩ز لە شیکاگۆ بە بۆنەی تێپەڕبوونی سەد ساڵ بەسەر بیردۆزەکەدا پێشکەشیکرد رایگەیاند، کە ((هیچ پێویستییەك و شوێنێك لە دامەزراوەی پەرسەندندا نەماوە بۆ قسەکردن دەربارەی خودا، چونکە زەوی بەدینەهێنراوە، بەڵکو پەرەیسەندووە، بە هەمان شێوە هەموو ئەو ئاژەڵ و ڕووەکانەیش کە لەسەر زەوی دەژین پەرەیانسەندووە، تا گەیشتە مرۆڤ بە مێشك و عەقڵ و رۆحییەوە))، بەمەش هیکسلی سروشتی لە شوێنی خودا داناوە، ئیتر هیچ شتێکمان لەبەردەمدا نییە، جگە لە ماددیگەرایی-سروشتی بۆ لێکدانەوەی

---

(١) Robert Green Ingersoll: (١٨٣٣-١٨٩٩ز)، یەکێك لە گەورە سیاسەتمەدارە ئەمریکییەکان کە بانگەشە بۆ مافی مرۆڤ دەکەن.

(٢) Sir Julian Huxley: (١٨٨٧-١٩٧٥ز)، گەورە زانای بایۆلۆجیای بەریتانی، نەوەی تۆماس هیکسلی کە بە سەگی داروینی بۆڵدۆگ ناسرابوو.

هەموو شتێك، تەنانەت ژیان و هۆشی مرۆیی و داهێنانی مرۆیی و هەستە ڕۆحییەکانیش، لە ئێستاشدا هەڵوێستی بێباوەڕەکانمان دێتە بەردەم، ئەوانەی کە پێداگری دەکەن لەسەر ڕەواجدان بە هەمان بیرۆکە و بانگەشەکردن بەبێ هیچ بەڵگەیەك، بەوەی کە پەرەسەندن لە ڕێی چەند هەنگاوێکی سادە ڕوویداوە کە هیچیان پێویستی دیزاینەرێك نییە، پاشان هەنگاوە یەك لە دوای یەکەکان کۆبوونەتەوە و میکانیزمی چالاککەریان دروستکردووە، واتا هەڵبژاردنی سروشتی بەبێ ئەوەی هیچ عەقڵ و پاڵنەرێکی هەبێت دیزاینی دەکات، واتا بەبێ ئەوەی خۆشی بزانێت دیزاین دەکات،هەروەها بەبێ ئەوەی دیزاین بکرێت!

گومان لەوەدا نییە، کە داروینیزم وەك بوومەلەرزەیەك بوو بۆ هزری مرۆیی لە ڕۆژئاوادا و، کاریگەرییەکەی هەموو لایەنەکانی ژیانی گرتەوە، چونکە ئەگەر ژیان و جۆراوجۆرێتی زیندەوەران دەرەنجامی کردارێکی سروشتی پەرەسەندن بێت، ئەوا ڕەوشت و بەها مرۆییەکان و، چەمکی ڕاست و هەڵە و دادپەروەری و حەق و هەستە ڕۆحییەکانیش بە هەمان شێوە!.

دەربارەی ئەم واتایە ویلیام پرۆڤین[1] دەڵێت: لە ڕاستیدا چەمکە رووخێنەرەکانی بایۆلۆجیای پەرەسەندن ئەوەی تێپەڕاند، کە تەنیا کاریگەری بەسەر ئایینەکانەوە هەبێت، بەڵکو گەیشتۆتە چەمکە مرۆییە قووڵەکانیش. دانێل دینێت[2] وەسفیی ئەو کاریگەرییە دەکات، بەوەی کە بیردۆزی داروین قووڵاییەکان دادەدڕێ و دەگاتە سەرچاوەی چەمکە مرۆییە بنچینەییەکانمان، لەبەرئەوە - وەك جنێوێك - ناوی لێدەنێت (بیرۆکە مەترسیدارەکەی داروین Darwins Dangerous Idea).

هەروەها ریچارد دۆوکنز باوەڕی وایە کە بیردۆزەکە شۆڕشێکی ریشەیی بوو لە جیهانی هزردا و، ئیتر پاساوێك نەماوە بۆ ئەوەی کە پرسیارە فەلسەفییە تەوەرەییەکان سەرسامهان بکەن، وەك واتای ژیان چییە؟ بۆچی ئێمە لێرەین؟

---

(١) William Provine: مێژوونووسی ئەمریکی، کە گرنگی دەدا بە مێژووی زانستەکان و پەرەسەندن و بۆماوەیی رەگەزەکان.

(٢) Daniel Dennet: یەکێك لە جەمسەرەکانی بێباوەڕیی نوێ، لە تەوەرەی یازدەهەمدا بیر و هزری دەخەینەڕوو.

ڕاستی مرۆڤ چییە؟.. و زانای حەفریاتەکان ج. ج. سیمپسۆن[1] ئەوە دووپاتدەکاتەوە و دەڵێت: هەموو هەوڵەکان بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکە دەربارەی حەقیقەتی مرۆڤ پێش ساڵی ١٨٥٩ز لە ئێستادا هیچ پێویست نین، لە ئێستادا پێویستە لەسەرمان لە بیرکردنەوە لەو بابەتە وازبێنین!.

ئەم جۆرە بۆچوونە بەتەنیا ناوەندە فەلسەفییەکان و کتێبە زانستییە گشتییەکانی نەگرتۆتەوە، بەڵکو گەیشتۆتە کتێب و سەرچاوە زانستی و بایۆلۆجییەکانی قوتابخانە و زانکۆکانیش، سەرنجی ئەو وتەیە بدە کە لە یەکێك لە کتێبەکانی قوتابخانە نووسراوە: ((لە ڕاستیدا ئەو ترسەی لە هەمبەر ئەوەدا هەیە کە داروینیزم خودا لەسەر عەرشی خۆی هەڵبستێنێت پاساوی خۆی هەیە))، پاشان کتێبەکە پرسیارێك دەخاتەڕوو: ئایا ئامانجێك لە بەدیهێنانی مرۆڤدا هەیە؟ پاشان وەڵامی پرسیارەکە دەداتەوە: پەرسەندن دەڵێت نەخێر، چونکە پەیدابوونی ڕەگەزەکان و گونجانی مرۆڤ هەڵبژاردنی سروشتی لەپشتە نەك دیزاین.

## هەموویان، تەنیا داروینیزم نەبێت!!

ئەگەر تۆ یەکێکیت لەو کەسانەی کە لە داروینیزمی ڕۆژئاوایی دەکۆڵیتەوە، ئەوا ئاگاداربە نەکەی پرسیارێکی سادە و ساکاری وات بەبیردا بێت دەربارەی توانای پەرسەندنی داروینی هەڕەمەکیانە لە ئەنجامدانی کارەکە، لەڕاستیدا خستنەڕووی ئەو پرسیارە (زانستییە) لەوێ گڕکانێك لە مشتومڕ و هێرش درووستدەکات و وزەیەکی جەهەننەمیت لە بەرامبەردا دەکاتەوە، کە دەربارەی هەر شتێکی تری زانستی پرسیار بکەی ئەوە ڕوونادات!

---

(١) G.G.Simpson: (١٩٠٢-١٩٨٤ز)، یەکێك لە بەناوبانگترین زانا ئەمریکییەکان کە پسپۆڕ بوو لە حەفریاتەکان و زانستی مرۆڤ.

بۆ نموونە ئەگەر گومانت لە خێرایی ڕووناکی یان لە بیردۆزی ڕێژەیی هەبێت، ئەوا هیچ ڕوونادات، بەڵام ئەگەر گومانت لە داروینیزمی نوێ هەبێت ئەوا قیامەت هەڵدەستێت! سەیری پڕوپووچی ء چەواشەکاری دۆوکنز بکە کاتێك دەڵێت: ((ئەگەر کەسێکت بینی باوەڕی بە داروینیزم نییە، ئەوا بێگومان بە کە تۆ بەرامبەر مرۆڤێکی نەفامی گێل یان شێتیت کە خۆیشی نازانێت چی دەڵێت، نامەوێ بڵێم کە بەرامبەر کەسێکی دڕندە و نازاردەر وەستاویت)). ئەمە دەمانخاتە هەڵوێستێکی بێزارکەرەوە ئەگەر بێین لەگەڵ دۆوکنز دیبەیت بکەین؛ کام لەو سیفاتانە هەڵبژێرین!. پاشان دۆوکنز دەڵێت: ((بە هیچ جۆرێك پێویست ناکات کە گومانمان لە پەرەسەندنی داروینی هەبێت)). لەکاتێکدا زانایان گومانیان لە بیردۆزەکانی نیوتن و ئەنیشتاین هەبووە و سەرەڕای ئەوەی کە گومان دەرگا فراوانەکەی پێشکەوتنی زانستە، تەنانەت هەموو زانستەکان لەو دەروازەیەوە پێشکەوتوون کە دەرگایان والاکردووە بەرامبەر چاوخشاندنەوە بە سەلمێنراوەکانیاندا. ئەو هێرشە دڕندەیە لەپای چی؟ ئەو پیرۆزکردن و بێبەشکردنە Taboo لەگەڵ داروینیزمدابۆچی؟!

لە ساڵی ١٩٩٩ز گەورە زانای حەفریاتەکانی چینی جون یوان چێن Jun-Yuan Chen سەردانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی کرد و چەند وتارێکی دەربارەی ئەو حەفریاتانە پێشکەشکرد کە لە ناوچەی شانگ جیانگ دۆزیبوویەوە، کە چەند پرسیارگەلێك دەربارەی ڕاستی داروینیزم دەوروژێنن. وتارەکانی پێشوازییەکی زۆر ساردیان لێکرا، بۆیە تووشی سەرسوڕمان بوو، هەر لەبەر ئەوە دەربارەی ئەوە پرسیاری لە یەکێك لەو کەسانە کرد کە میوانداریبیان کردبوو، وەڵامی دایەوە کە زانایانی ویلایەتە یەکگرتووەکان بەوە تووڕە دەبن ئەگەر شتێکی دژی داروینیزم ببیستن، بۆیە لەو کاتەدا قسە بەناوبانگەکەی کرد: ((لە چین دەتوانی ڕەخنە لە داروین بگری بەڵام ناتوانی ڕەخنە لە حکومەت بگری، کەچی لە ئەمریکا دەتوانی ڕەخنە لە حکومەت بگری بەڵام ناتوانی ڕەخنە لە داروین بگری!)).

## ئەو دەمارگیرییە دڕندانەیە لەپێناو چی؟

مایکل رۆس[١]، کە فەیلەسوفێکی حەقبێژی ناوداری لایەنگیری پەرەسەندنە، دەڵێت: ململانێیەکە لەوەدایەکە زۆر کەس هەوڵی قۆستنەوەی بیردۆزی پەرەسەندن دەدەن بۆ نکۆڵیکردن لە بوونی خودا، پەرەسەندن لەلای ئەو کەسانە بۆتە ئایینێکی ناخودایی. هەروەها فەیلەسوفی بەناوبانگی زانستەکان کارل پۆپەر[٢] ئەو واتایە زیاتر قووڵ دەکاتەوە و دەڵێت: ((تەنانەت بیردۆزە زانستییەکانیش دەکرێ ببن بە مۆدێل، دەکرێ شوێنی ئایین بگرنەوە، دەکرێ ببنە ڕاستییەکی سەلمێندراو کە قابیلی گفتوگۆ لەسەرکردن نەبن. ئائەوەیە لەگەڵ بیردۆزی پەرەسەندندا ڕوویداوە)).

بۆ شیکردنەوەی ئەو دەمارگیرییە د.م.واتسۆن[٣] دەڵێت: ((قبووڵکردنی داروینیزم بەهۆی بەهێزی بەڵگەکانییەوە نییە، بەڵکو لەبەرئەوەیە کە بەرامبەرەکەی کە لە کاتی دەرکەوتنی بیردۆزەکە باو بوو، کە بریتییە لە بەدیهێنانی تایبەتی (الخلق الخاص) جێگرەوەیەکی شیاو نەبوو بۆ باوەڕپێهێنان Uncredible))! ئایا بەڕاستی جێگرەوەکەی (بەدیهێنانی تایبەتی) شیاوی باوەڕپێهێنان نییە؟ بەڵێ، بەڵام لەلای ئەو ماددیگەرایانەی کە تەنیا بەدوای میکانیزمی ماددی دیاردەکاندا دەگەڕێن، هەروەها لەلای ئەو بێباوەڕانەی کە ئەو هەلەیان وەك هەلی تەمەنیان قۆستەوە، بۆیە گیانی خۆیان کردە فیدای داروینیزم و بەرگریلێکردنی.

---

(١) Michael Ruse: گەورە فەیلەسوفی بەریتانی، کە گرنگی بە بایۆلۆجیا و پەیوەندی نێوان زانست و ئاین دەدا، وتەکەش لە وتارێك وەرگیراوە کە لە بەردەم یەکێتی ئەمریکی بۆ پێشخستنی زانستەکان لە ساڵی ١٩٩٣ز پێشکەشی کرد. لە ساڵی ١٩٤٠ز لە دایك بووە.

(٢) Carl Popper: (١٩٠٢-١٩٩٤ز)، فەیلەسوفی بەناوبانگی زانستەکان لە سەدەی بیستەمدا، بە ڕەگەزنامە بەریتانییە و بە ڕەچەڵەك نەمساوییە.

(٣) D.M.S. Watson: (١٨٨٦-١٩٧٣ز)، مامۆستای زانستی ئاژەڵ و شیکاری بەراوردکاری، بەریتانییە.

دۆناڵد ماکای[١] (پسپۆری زانستەکانی مێشك و دەمار) ئەو زنجیرەیە شیدەکاتەوە کە بۆتە هۆی ڕوودانی ئەو کارەساتە! دەڵێت: ((سەرەتا داروینیزم وەك بیردۆزێکی بایۆلۆجی دەرکەوت، کە زۆر کەس وەك جێگرەوەی خودا بۆ جیهانی زیندەوەران سەیریان دەکرد، پاشان پرسیان: بۆچی لە بوارەکانی تریشدا نەخرێتە گەڕ؟ پاشان دوای ئەوەی کە تەنیا گریمانەیەکی زانستی بایۆلۆجی بوو، دواتر بوو بە بنچینەیەکی غەیبی بۆ بێباوەڕی و هەموو گەردوونی گرتەوە و هەموو پابەندبوونێکی ئایینی لەسەر مرۆڤ هەڵگرت، بەمەش داروینیزم (Darwinism)، یان پەرەسەندن (Evolutionism) بوو بە فەلسەفەی دژی ئایین، بەڵکو وەك خودایەکی بەرجەستەی لێهات کە موریدەکانی وەك هێزی ڕاستەقینەی گەردوون سەیریان دەکرد)).

سیناریۆی دەمارگیری بۆ داروینیزم لەگەڵ ك.س. لویس[٢] بەناوبانگترین زانای لاهووتی مەسیحی لە سەدەی بیستەم کۆتایی پێدێنین، کە دەڵێت: ((چەمکی پەرەسەندن وەك ئەفسانەیەکی کولەپووری و دیدێکی فەلسەفی بڵاوبووەوە، بەرلەوەی وەك گریمانەیەکی زانستی بخرێتەڕوو، لە بری ئەوەی کە بیردۆزە زانستییەکان ببنە هۆی پەیدابوونی بۆچوونە فەلسەفییەکان، فەلسەفەی ماددیگەرایی- سروشتی، کاتێك لە سەرەتادا دەرکەوت پێویستی بە لێکدانەوەی ماددی هەبوو بۆ لێکدانەوەی دیاردەکان، ئا لێرەوە دەرگا واڵاکرا بۆ گریمانەیەکی وەك پەرەسەندن)).

خۆشحاڵی ماددیگەراکان بەهۆی بیردۆزی پەرەسەند نموونەیەکی بەرچاوی مێژووی زانست بوو! چونکە هیچ بیردۆزێکی تر لە مێژوودا نییە کە ئەو هەموو کاردانەوەیەی لە هەموو بوارەکان بەدوای خۆیدا هێنابێت، تا ئەو ئەندازەیەی کە گوێبیستی فەلسەفەی داروینی و ئابووری داروینی و زانستی کۆمەڵایەتی

---

(١) Donald Mackay: (١٩٢٢-١٩٨٧ز)، مامۆستای فیزیا لە زانکۆی کیل لە ئینگلتەرا، کە گرنگی بە نێوانی فیزیا و زانستەکانی مێشك و دەمار دەدات.

(٢) C.S.Lewis: (١٨٩٨-١٩٦٣ز) زانای لاهووتی بەناوبانگ، بەریتانییە، هەروەها ئەدیب و ڕەخنەگریش بوو، ئەم وتەیەشی لە وتارێکە بە ناونیشانی (تەرمی ئەفسانەیەکی بەناوبانگ).

داروینی و چەمکە ڕەوشتییە داروینییەکان و سیاسەتی داروینی و...دەبین. ئەو گاڵتەجارییە چییە! تۆ سەرنجی ئەوە بدە کە هیچ هەوڵێکی ماددیگەرایی یان نا ماددی یان خودایی لەئارادا نەبوو بۆ گەورەکردنی هیچ بیردۆزێك، وەك بیردۆزی نیوتن یان ئەنیشتاین یان کوانتەم! هەرگیز گوێمان لە نیوتنیزم یان ئەنیشتاینیزم یان کوانتەمیزم نەبووە!.

هەڵوێستی داروینییەکانی سەردەم لە بەرامبەر نەیارانیان هاوشێوەی هەڵوێستی کڵێسایە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لە بەرامبەر گالیلۆ، گالیلۆ باجێکی قورسی دا بەهۆی بەرهەڵستیکردنی، ئەگەرچی دواتریش سەلمێنرا کە لەسەر حەق بوو، سەرەڕای ئەوەی کە هەرکەسێك دوو چاوی ساغی هەبێت وای لێ دیارە کە زەوی جێگیرە و خۆر بە دەوریدا دەخولێتەوە! ئایا لەوەوە وانەیەك فێرنابین، ئایا دەکرێ بەرگری لە هەموو شتێك بکەین کە داروین گوتوویەتی، هەروەك چۆن کڵێسا بەرگری لە هەموو ئەو شتانە دەکرد کە پەتلیمۆس و ئەرستۆ گوتبوویان؟!

## پاچ بۆ ڕووخاندنی داروینیزم :

## کەموکورییەکانی داروینیزم :

گوتاری داروینییەکان وامان لێدەکات وا هەست بکەین کە لەبەردەم بیردۆزێکی تەواوی بێ کەموکوڕی داین، کە هەموو وردەکارییەکی پێویستی دەربارەی پەیدابوونی هەر بوونەوەرێك تێدایە؛ کەی و چۆن پەیدابووە، ئەو بازدانەی کە تیایدا ڕوویداوە چۆن سەرکەوتوو بووە کە ئەو بوونەوەرە بگۆڕێت بۆ بوونەوەرێکی تر. ئەوان دەیانەوێت وا بخەنە خەیاڵمان کە چەند ئەسفارێك بوونیان هەیەو هەموو شتێکیان لەخۆ گرتووە و توانای پێکهێنانی ئەوەی هەیە کە بتوانین ناوی بنێین کتێبخانەی ژیان، لەکاتێکد پێویست بوو ئەو کتێبخانەیە لە سەدان هەزار لاپەڕە

پێکبێت، کە لە ڕاستیدا تاکە لاپەڕەیەکی نووسراویشمان لەبەردەستدا نییە، چونکە شوێنکەوتنی بنچینە و لقەکانی بوونەوەرێکیشمان نییە! هەموو ئەوەی بوونی هەیە تەنیا بریتییە لە چەند خەیاڵ و گریمانەیەك!.

هەروەها هەڤدژییەکی گەورە هەیە لەنێوان ئەو قسانەی داروینییەکان دەربارەی بناغەی بیردۆزەکەیان دەیکەن. لێرەدا دوو نموونە لەسەر ئەو هەڤدژییە دێنینەوە:

**یەکەمیان:** تایبەتە بە ڕێڕەوی پەرەسەندن، ریچارد دۆوکنز دەڵێت: کاتێك ژیان دەستی پێکرد، شتێکی حەتمی بوو کە هەر دەبوو بگاتە ئەو قۆناغەی کە ئێستا پێی گەیشتووە(دیدی حەتمییەتی ڕەها)، ستیڤن جای گۆڵد[1] لەگەڵ دۆوکنزدا هاوڕا نییە، چونکە وایدەبینێت کە ئەگەر شریتی پەرەسەندن جارێکی تر لێبدەینەوە، ئەوا دەبینین کە ڕێکەوتەکان دەکرێ جیهانێکی تەواو جیاواز لەو جیهانەی کە لە ئێستایدا تیایدا دەژین بەدیبێنن (دیدی گونجانی ڕەها).

**نموونەی دووەم:** بۆ ناکۆکی داروینییەکان دەربارەی هەڵبژاردنی سروشتییە؛ چ شتێك دەتوانێت شیبکاتەوە؟ چ شتێك ناتوانێت شیبکاتەوە؟ چ شتێك پێویستە کە بە میکانیزمی تر شیبکرێتەوە؟

ئەو ناکۆکییەی لە نێوان ڕێبازە جۆراوجۆرەکانی داروینیزمی نوێدا هەیە ئەرکی هەڵتەکاندنی بیردۆزەکەمان لەسەر لادەبات، چونکە بەشێکیان بەشێکی تریان هەڵدەوەشێننەوە.

زانای فیزیایی ڕۆبێرت لۆگلین[2] (خاوەنی خەڵاتی نۆبڵە و باوەڕی بە بوونی خودا نییە)، دەڵێت: ((زۆرێك لە چەمکە بایۆلۆجییە باوەکان لەڕێی ئایدۆلۆجیایەکەوە دەجووڵێنرێن)).

---

(١) Stephen Jay Gold: (١٩٤١-٢٠٠٢ز)، گەورە زانای حەفریات و بایۆلۆجیای پەرەسەندن، ئەمریکییە، گرنگی دەدات بە مێژووی زانست و یەکێکە لە بەناوبانگترین نووسەرە زانستییەکانی سەردەمی خۆی.

(٢) Rober Lauglin: مامۆستای فیزیا لە زانکۆی ستانفۆرد، ئەمیکییە، لە ساڵی ١٩٥٠ز لە دایك بووە.

بۆ نموونە داروینییەکان لێکدانەوەی وا دەخەنەڕوو کە شیاوی تاقیکردنەوە نین (وەك چەمکی هەڵبژاردنی سروشتی، کە لە دوای بازدانە هەڕەمەکییەکانەوە پەیدابوویێت).

ئەوەندە بەس نییە کە ئەم هەڵسوکەوتە بە نازانستی دابنێین بەڵکو دژی زانستە، دەرگا بە رووی بیرکردنەوە دادەخات، لەبەر ئەوە لە ڕاستیدا بیردۆزەکەی داروین بە دژە بیردۆز Anti-Theory دادەنێم، کە لەپێناو پڕکردنەوەی کەموکوڕییەکی تاقیگەیی دانراوە و، هەر کاتێك کە پێویست بێت بۆشاییەك پڕ بکرێتەوە پەنای بۆ ببرێت، وەك: چۆن بەشی AAv پێکدێت؟ پەرەسەندن کردوویەتی! چۆن کارلێکە کیمیاییەکان بوونەتە مریشك؟ پەرەسەندن کردوویەتی!.ئەو عەقڵە مرۆییەی کە هیچ کۆمپیوتەرێك ناتوانێت رکابەری بکات چۆن پەیدا بووە؟ پەرەسەندن کردوویەتی!.. پەرەسەندن بۆتە خودایەك بۆ پڕکردنەوەی بۆشاییەکان!)).

ئێمە لەم تەوەرەیەدا -و لە تەوەرەکانی تری کتێبەکەدا- پەیڕەوی لە چەمکی (پەرەسەندنی ناڕاستەکراو) دەکەین، کە زانست بۆ ڕوودانی پەرەسەندن بەڵگەکانی قبوڵ دەکات و، بانگەشەکانی داروینییەکان رەتدەکاتەوە بەوەی کە پەرەسەندن هەڕەمەکی بووە. بەڵگەکانیشمان لەسەر ڕاستی ئەو چەمکە لەسەر دوو تەوەرەی سەرەکی دەبێت:

**تەوەرەی یەکەم: سەلماندنی هەڵەی داروینییەکان (پەرەسەندنی هەڕەمەکی) و ئەو بابەتە هەر لەم تەوەرەیەدا لەڕێی باسکردنێکی سێ لایەنە دەخەینەڕوو، کە ئەمانە دەگرێتەوە:**

**یەکەم:** خوێندنەوەیەك لە تۆماری حەفریاتەکاندا وەك بەڵگەیەکی داروینییەکان؛ کە تیایدا هەڵەیی بانگەشەی هەڕەمەکێتی پەرەسەندن دەسەلمێنین.

**دووەم:** سەلماندنی بێتوانایی میکانیزمی پەرەسەندنی داروینی (بازدانە هەڕەمەکییەکان + هەڵبژاردنی سروشتی) لە ئەنجامدانی جۆراوجۆرێتی گەورە لە زیندەوەردا.

سێیەم: سەلماندنی ئەوەی کە پەرەسەندنی هەرەمەکی سنوورێکی هەیە کە ناتوانێت تێیبپەڕێنێت، بەوەی کە بێتوانایە لە ئەنجامدانی پەرەسەندنی ورد و بەهەمان شێوە بێتوانایە لە ئەنجامدانی پەرەسەندنی دیار.

بەم سیانە چەمکی پەرەسەندنی هەرەمەکی داروینی دادەتەپێ و ڕێگا بۆ پەرەسەندنی ئاڕاستەکراو دەکاتەوە.

**تەوەرەی دووەم: سەلماندنی ئەوەی کە کرداری بەدیهێنانی ژیان و زیندەوەران کردارێکی زۆر ئاڵۆزە، کە ناتوانرێت ڕۆڵی دیزاینی لێ بەدەر بکرێت، پاشان پێویستی بە دیزاینەرێکی زیرەک هەیە کە هەڵدەستێت بە ئاڕاستەکردنی بەدیهێنانی ژیان و پەرەپێسەندنی بوونەوەر، لە تەوەرەی دواتردا بە تایبەتی باسی لەم بابەتە دەکەین.**

## یەکەم: نهێنییەکانی تۆماری چاڵەکان (حەفریاتەکان)

لە کاتی باسکردنی تۆماری حەفریاتەکان، داروینییەکان لە گفتوگۆکردن دەربارەی چەند خاسیەتێك رادەکەن کە کرداره نوێیەکانی هەڵکەندنی چاڵەکان دەریانخستووە، کە گرنگترینیان دەگمەنی ئەڵقە گوێزەرەوەکان و ڕوودانی جۆراوجۆرێتی بوونەوەرانە بە خێراییەکی زۆر، هەروەها بوونی چەند بوونەوەرێك کە پێشینیان نییە، هەموو ئەو پرسانەش بە شێوەیەکی سەرەکی لەگەڵ هەرەمەکیتیدا تێکدەگیرێن، لێرەدا گفتوگۆ لەسەر ئەم سێ خاسیەتە دەکەین:

### أ- دەگمەنی بوونەوەرە گوازراوەکان:

داروین وای داناوە کە گەورەترین تەحەددی کە ڕووبەڕووی بیردۆزەکەی دەبێتەوە بریتییە لە کەمی بوونەوەرەکان (ئەڵقە گوێزەرەوەکان) کە پێویستە لە

دەرەنجامی گواستنەوە لە بوونەوەرێکەوە بۆ بوونەوەرێکی تر بوونیان هەبێت، داروین دەستی نەخستۆتە سەر تاکە تۆمارێکی حەفریاتەکانیش لەسەر زنجیرەی پەرەسەندن، کە ئەندازەی پێویستی بوونەوەرە گوازراوەکانی لەخۆ گرتبێت. دوای تێپەڕبوونی زیاتر لە سەد و پەنجا ساڵ بەسەر خستنەڕووی بیردۆزەکەدا، بارودۆخەکە هەر وەکو خۆیەتی، سەرەڕای ئەوەی کە تۆماری حەفریاتەکان لە ئێستادا بەوە جیادەکرێتەوە کە زۆر دۆڵەمەندە(زیاتر لە دوو سەد و پەنجا هەزار بوونەوەری تێدایە)، دوای ئەوەی هەوڵێکی زۆر درا بۆ هەڵکەندنی ئەو چاڵانە. لە ئێستادا گوازراوەکان کەمترن بە بەراورد بە ڕۆژگاری داروین[1]! کەواتە دەگمەنی زۆری ئەڵقە گوازراوەکان بە گرنگترین نهێنی زانستی حەفریات دادەنرێتە کە پشتگوێخراوە و بە ئەنقەست خۆیان لێ بێدەنگ کردووە.

تەنانەت زانای حەفریاتی بەریتانی (کۆلن پاترسۆن)[2] چاودێری حەفریەی (ئەرکیۆپتیرکس)ی بەناوبانگ لە مۆزەخانەی سروشتی، دەڵێت تاکە حەفرییەیەکی راگوزەری Transitional بوونی نییە کە بۆ ئەوە بشێت ببێتە بنچینەی بوونەوەرێکی پەرەسەندووی تر و، ئەوەی کە داروینییەکان باسی لێوە دەکەن لە حەفریاتە راگوزەریەکانی وەك ئەرکیۆپتیرکس هیچ نین جگە لە حەفریاتی ناوەندی Intermediate لە نێو بوونەوەردا، واتا سیفەتی ناوەندی نێوان دوو بوونەوەری (أ،ب)ی هەیە، بەبێ بوونی بەڵگە لەسەر ئەوەی کە لە(أ)ەوە پەیدابووە و پێشینە بۆ (ب)، هەروەك چۆن پێویستە لە بوونەوەرە گوازراوەکانیشدا هەبێت، تەنانەت زانست تائێستاش هیچ میکانیزمێکی بەدەستەوە نییە کە ئەم پەیوەندییە بسەلمێنێت.

---

(١) ئەم قسەیە قسەی زانای حەفریاتەکان (دیڤد رۆب David Raub)، لە مۆزەخانەی سروشتی لە لەندەن مەبەستی لەوەیە کە هەرچەند حەفریاتی بوونەوەری نوێمان دەستبکەوێت پێویستیمان بە ئەڵقەی گواستنەوە دەبێت کە بۆتە هۆی پەیدابوونی.

(٢) Collin Patterson (١٩٣٣- ١٩٩٨ز).

## ب- پەرەسەندنێکی زۆر هێواش نەبوو، تەقینەوەی کامبیری

داروین جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە پێویستە پەرەسەندنی هەرچەکی زۆر بە هێواشی ڕوویدات، تەنانەت دەڵێت کە بەبێ ئەم خاسیەتە بیردۆزەکەی رازیکەر نابێت.

زانای پەرەسەندن ستیڤن جای گۆڵد داروینییەکانی تووشی شۆك کرد کە بە دەرەنجامی لێکۆڵینەوە زۆرەکانی دەریخست کە تۆمارەکانی حەفریاتەکان ڕوودانی پەرەسەندنێکی زۆر هێواش نیشان نادەن، بەڵکو دوو خاسیەتی بنچینەیی بوونیان هەیە کە بەرهەڵستی ئەوە دەکەن کە ئێوە بانگەشەی بۆ دەکەن، ئەوانیش:

**یەکەم:** دەرکەوتنی تەواوەتی لەناکاو، بوونەوەران لە تۆماری حەفریاتەکاندا بە کەموکوڕی دەرناکەون، کە دواتر تەواوبووبێتن، بەڵکو بە تەواوی و بێ کەموکورتی دەرکەوتوون.

**دووەم:** جێگیری و وەستاوی Stasis: بوونەوەران لە تۆماری (ئوحفوریدا) هەر لەسەر شێوەی خۆیان ماونەتەوە لەگەڵ ڕوودانی گۆڕانکاری زۆر بچوك تا گەیشتوونەتە ئێمە، یان ئەوەتا بەر لەوە لەناوچوون.

بە پشت بەستن بەم دوو سیفەتە، گۆڵد لەگەڵ هاوڕێکەی نیلز ئێلدریك[1] بیردۆزی هاوسەنگی خاڵرێژی The Punctuate Equilibrium Theory دانا، کە ئەوە دەردەخات مێژووی سروشتی بە ماوەیەکی دوور و درێژی وەستان تێدەپەڕێت، کە لەپڕ هەڵقوولانی گەورەی پەرەسەندنی دیار Macroevolution ی کەوتۆتەناو، لە گرنگترین ئەو هەڵقوولانانەش کە گۆڵد لە کتێبەکەیدا Wonderful life باسی کردووە ئەوەیە کە زۆربەی تۆرگانەکان کە لە ئێستادا بوونیان هەیە (٣٤ لە ٣٦) لە بوونەوەرە ئاژەڵییەکان - جگە لە ژمارەیەکی

---

(١) گەورە زانای بایۆلۆجیا و حەفریاتە کۆنەکان لە ساڵی ١٩٤٣ز لە دایك بووە.

زۆر لەوانەی کە لەناوچوون - لە ماوەیەکی کورتدا کە (٥ تا ١٠) ملیۆن ساڵە دەرکەوتوون، ئەمەش لە سەردەمی کامبێری پێش ٤٥٠ ملیۆن ساڵ، ئەم دەرکەوتنە لەناکاوەش بە تەقینەوەی کامبێری Camberian Explosion ناسراوە و لەبەر تەقینەوە گەورەکەی گەردوون ناونراوە تەقینەوە گەورەکەی زیندەزانی[1].

لە ڕاستیدا بیردۆزی هاوسەنگی خاڵڕێژی بە تەواوی لە بەرهەڵستی و کێبڕکێی بەردەوامدایە لەگەڵ لایەنگرانی داروینیزمی نوێ، کە بە پلەبەندییەکان Gradualists ناسراون، کە پاڵپشتی بۆچوونەکانی داروینیزم دەکەن بەوەی، کە پەرەسەندن لەڕێی بازدانە هەڕەمەکییەکان، پاشان هەڵبژاردنی سروشتی زۆر بە هێواشی ڕوویانداوە و پێویستە جێمنجەی لە تۆماری ئۆحفوریدا لەسەر شێوەی ڕاگوزەری تۆمار کردبێت، سەرەڕای ئەوەی، کە ئەگەر تەنیا یەك سەرنجی تۆمارەکان بدەین دەبینین کە بوونەوەرەکان لەناکاو پەیدادەبن پاشان وەك خۆیان دەمێننەوە و ناگۆڕێن، تا دەگەنە سەردەمی ئێمە یان لەناودەچن، هەروەها هەردوو دامەزرێنەرانی بیردۆزی خاڵڕێژی، داروینییەکان بەوە تۆمەتبار دەکەن کە شتی ناڕاست دەدەنە پاڵ تۆماری حەفریاتەکان و بانگەشەی شتی وا دەکەن کە هیچ بەڵگەیەکیان لەسەر نییە.

ئەوەی کە تۆماری ئۆحفوری دەریخستووە لە هاوسەنگی خاڵڕێژی بەتەواوەتی لەگەڵ پەرەسەندنی ناڕاستەکراودا یەکانگیرە، چونکە دەستخستنەناوی خودایی بەبێ پێویستبوون بە بوونەوەرە ڕاگوزەرییەکان پەرەسەندن لە ماوەیەکەوە بۆ ماوەیەکی تر ئەنجام دەدات.

---

(1) Biological Big Bang)

## ج- بوونەوەرانێک کە پێشینیان نییە

لە لێکۆڵینەوە گەورەکەیدا (دەربارەی بنچینەی ئۆرگانەکان)[1] جەیمس ڤالێنتین[2] ئەوە ڕوونەکاتەوە کە زۆرێک لە لقەکانی بنچینەی ژیان لە بنچینەوە براون[3] واتا ناتوانین پێشینی بوونەوەرەکە بزانین، وەک ئەوەی کە لەناکاو پەیدابووبێت یان بە خەلقی تایبەت یان بە ئەنجامدانی زۆر گۆڕانکاری جینی ئاراستەکراو.

داروینییەکان پاساو بۆ بڕانی بنچینەی ئەو بوونەوەرانە دێننەوە بەوەی کە ئەو بوونەوەرانە خاوبوون و لاشەیان نەبۆتە حەفریات. پاشان ئەم خستنەڕووە زەبرێکی کوشندەی بەرکەوت، کاتێک لە (چیانگ یانگ) لە چین چەند حەفریاتێکی کۆرپەلەی ئیسفەنج دۆزرایەوە کە بۆ سەردەمی پێش کامبێری دەگەڕێنەوە، لەوکاتەدا زانای حەفریاتەکان پۆڵ شین[4] پرسیارێکی زۆر جەرگبڕی لە داروینییەکان کرد: ئەگەر چینەکانی سەردەمی پێش کامبێری کۆرپەلەی ئیسفەنجی بە خاوی هێشتۆتەوە، ئەی بۆچی حەفریاتی زۆرێک لە بوونەوەرەکان بە تەواوەتی نەپارێزراوە، لە کاتێکدا کە ئاسانترە لە پاراستنی کۆرپەلەی خاو؟!.

توێژینەوە نوێیەکان بوونەتە هۆی ئاشکراکردنی ئەو نهێنیانەی لە تۆماری حەفریاتەکاندا بوونیان هەیە، ئیتر ئەو تۆمارانە بوونەتە بەڵگە لەسەر پەرەسەندنی ئاراستەکراو، دوای ئەوەی داروینییەکان ویستیان بیکەنە بەڵگە لەسەر پەرەسەندنی هەڕەمەکی.

---

(١) On The Origin of Phyla

(٢) James Valentine: مامۆستای بایۆلۆجیای پەرەسەندنە لە زانکۆی کالیفۆرنیا.

(٣) درەختی ژیان: دیێکە داروین دایمەزراندووە کە خانەی سەرەتایی تێیدا (بنچینەی هاوبەش) قەدی درەختەکە دەنوێنێت و لقەکانی ئەو بوونەوەرانە نیشان دەدەن کە لەو خانەیەوە پەرەیان سەندووە.

(٤) Paul Cien: زانای بایۆلۆجیا و حەفریاتەکان بە ڕەچەڵەک چینییە و بە ڕەگەزنامە ئەمریکییە. یەکێکە لە لایەنگرانی چەمکی دیزاینی زیرەک لە ساڵی ١٩٤٧ز لە دایک بووە.

## دووەم: بێتوانایی میکانیزمی پەرەسەندنی داروینی
## بازدانە هەڕەمەکییەکان + هەڵبژاردنی سروشتی

لایەنگرانی داروینیزمی نوێ بانگەشەی ئەوە دەکەن کە پەرەسەندنی بایۆلۆجی هیچ دیزاین و پلان و هێڵکارییەکی تێدانییە، لە هەمان کاتدا نکۆڵیش لەوە دەکەن کە هەڕەمەکێتی تێدا بێت، ئەوان وای دەبینن کە پەرەسەندن بەرهەمی یاسای هەڵبژاردنی سروشتییە و بەتەواوی خۆیان لە ڕۆڵی بازدانە هەڕەمەکییەکان بێ ئاگا دەکەن و بانگەشەی ئەوە دەکەن کە بازدانەکان هەرچۆنێك بن ئەوا هەڵبژاردنی سروشتی سیفاتە باشەکانی تێدا هەڵدەبژێرێت و شەمەندەفەری پەرەسەندن بەرەو پێشەوە دەبات، ئایا ئەمە ڕاستە؟

گومان لەوەدا نییە کە ئەم بانگەشەیە سەرلەبەری هەڵەیە، ئەگەر ئەندازەیەکی تەواو لە گۆڕانکاری بە سوود لە کۆدی بۆماوەیی (بازدانە سوودبەخشەکان) بوونی نەبێت، ئەوا هەڵبژاردنی سروشتی شتێك نادۆزێتەوە تا هەڵیبژێرێت، بەم شێوەیەش گۆڕانکارییە پەرەسەندنییەکان ڕوونادەن. لە ڕاستیدا هەڵبژاردنی سروشتی کۆکەرەوەی ئەو بەرهەمەیە کە باشترین میوەکە دەچنێت، بۆیە ئەگەر باشترینمان نەبێت ئەوا بەرهەمێکی باشمان دەستناکەوێت.

ئێستاش بەرەو زیاتر دەربارەی بازدانەکان و هەڵبژاردنی سروشتی...

## فێڵی بازدانە هەڕەمەکییەکان:

بازدانە هەڕەمەکییەکان هیچ نین جگە لە (چەند هەڵەیەك) کە لە ریزبوونی پیتەکان (بنچینە نایترۆجینییەکان = نایکلۆتیدات)دا ڕوودەدەن، کە کۆدی بۆماوەیی (DNA)یان لێ پێکهاتووە و پێویستە ئەم دەستکاریکردنە لە خانەکانی

ئەندامەکانی خوارەوە (ئەو خانانەی کە سپێرم و هێلکۆکە درووستدەکەن)دا ڕوودەدات نەک لە هەر خانەیەکی تری لاشە.

ئەو پرسیارەی لێرەدا خۆی دەخاتەڕوو ئەوەیە کە ئایا ئەم هەڵە هەڕەمەکییانە دەتوانن گۆڕانکارییەک لە کۆدی بۆماوەییدا ئەنجام بدەن، کە ببێتە هۆی دەستکاری سوودبەخش کە لە نەوەی زیندەوەردا دەربکەوێت و ببێتە هۆی دەرکەوتنی جۆرە بوونەوەرێکی تری نوێ؟.

زانایانی بایۆلۆجی تێکڕای ڕوودانی بازدانەکان بەوە مەزەندە دەکەن کە بریتین لە چوار بازدان لە هەر سەد هەزار سپێرم یان هێلکۆکەیەکدا، هەروەک چۆن مەزەندەی ئەوە دەکەن کە ٪٩٩ی ئەو بازدانانە زیانبەخشن و، لەوانەیە لە ٪١ی بارودۆخەکاندا سوودبەخش بن، لەبەرئەوە مەحاڵە ئەم ڕێژە زۆر کەمەی بازدانە سودبەخشەکان بتوانن کە پەرەسەندنی زیندەوەر ئاراستە بکەن، بەتایبەت ئەگەر هەر دەستکارییەکی فەرمانێک بە هەند وەربگرین کە پێویستی بە زۆر گۆڕانکاری جینی هەیە کە دەست لەناو دەست و بەشێوەیەکی یەکگرتوو کار دەکەن[1]، هەر وەک چۆن پێویستی بە دەستکاریکردنێک هەیە کە هێشتا لە میکانیزمەکانی بەڕێوەبردنی جینات Epigenetics کە تا ئێستا شتێکی وای لە بارەوە نازانین.

لەبەرئەوە چەمکی هەڕەمەکی Randomless وەک هۆکارێکی بەرپرس لە پەرەسەندن لەلایەن زۆرێک لە داروینییەکان خۆیان ڕەتدەکرێتەوە! بۆیە ئاماژە بە ڕۆڵی (بارودۆخی کەش و هەوا و کیمیایی) دەکەن، کە لە کاتی پەیدابوونی ژیان باڵی بەسەر زەویدا کێشاوە، دوای ماوەیەک گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە بەوپێیەی کە بەرپرسە لە دیاریکردنی سروشتی گۆڕانکارییە بۆماوەییەکان

---

(١) زانای مایکرۆبایۆلۆجیا و بۆماوەزانی سویسری Werner Harber))، کە لە ساڵی ١٩٧٨ز خەڵاتی نۆبڵی وەرگرتووە سەرنجمان ئاراستە دەکات بۆ ئەو تاقیکردنەوانەی کە زانایان بەهۆیانەوە هەستاون بە ئەنجامدانی گۆڕانکاری لە کۆدی بۆماوەییدا بۆ مێشی میوە(ذبابە الفاكهە)، کە چەند جۆرێکی شێواوی مێشیان بەرهەمهێنا(هەندێکیان بەبێ باڵ و هەندێکیشیان قاچیان لە سەریاندا دەردەچوو)، کە بۆ ئەوە ناشێن بیانکەین بە بەڵگە بۆ ڕۆڵی سوودبەخشی بازدانە هەڕەمەکییەکان، بەڵکو ئەو تاقیکردنەوانە بەڵگەن لەسەر بێتوانایی ئەو بازدانانە، بەوپێیەی کە زانایان لە کارگەکانیاندا تەنانەت تاکە گۆڕانکارییەکیشیان بەرەو باشتر دەستنەکەوتووە لە هەشت سەد مێشی میوەدا.

(بازدانەکان) لە بوونەوەرەکاندا لە هەر قۆناغێك لە قۆناغەکاندا[١]، هارۆڵد مۆرۆتز[٢] (بەڵگەی داینامیکای گەرمی لە زیندەوەردا) قسە لەسەر ئەم چەمکە دەکات بەوەی کە پێویستە هەڕەمەکی رەها وەك هۆکارێکی کاریگەر لە گۆڕانکارییە بۆماوەییەکان بگۆڕین بە یاسا زانستییە رێکخراوەکان وەك بزوێنەری شەمەندەفەری پەرەسەندن.

جیراڵد شرۆیدەر لە هەردوو کتێبە نایابەکەی[٣] (زانستی خوایەتی) و (رووی شاراوەی خودا) جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئەگەر بێتو چاوپۆشی لە هەموو لایەنەکانی بێتوانایی بازدانە هەڕەمەکییەکان بکەین لە ئەنجامدانی گۆڕانکاری سوودبەخش، ئەوا بەربەستێکی گەورە لە بەردەم داروینییەکاندا دەمێنێتەوە کە ناتوانن بیبڕن، ئەویش ئەوەیە کە ئەو کاتەی بەردەست بووە بۆ دەرکەوتنی ئەم جۆراوجۆرێتییە گەورەیە لە زیندەوەراندا بە شێوەیەکی هەڕەمەکی بەهیچ جۆرێك بەش ناکات، بەتایبەت دوای ئەو رووداوانەی لە تەقینەوەی زیندەزانی کامبیریدا روویانداوە، کە تۆماری حەفریاتەکان دەریخستووە.

لە هەمان سۆنگەوە (کاتەکە زۆر کورتە) پیتەر براون[٤] (سەرۆکی یەکێتی سەرنووسەرانی گۆڤارە زانستییەکان) ئەوە رەتدەکاتەوە کە بازدانە هەڕەمەکییەکان بەرپرس بن لە ڕوودانی پەرەسەندن.

---

(١) نموونە بۆ گۆڕانکاری سروشتی کە گۆڕانکاری لە کۆدی بۆماوەیی بوونەوەراندا ئەنجامداوە:

١- کەش و هەوای خاڵی لە ئۆکسجین یارمەتیدەربوو بۆ دەرکەوتنی بەکتریای ناهەوایی.

٢- کاتێك کە بەکتریا هەڵسا بە دابڕینی هایدرۆجین لە ئاو و رزگارکردنی ئۆکسجین، رێژەی ئۆکسجین لە هەوادا یاریدەدەربوو بۆ پەیدابوونی خانەی ناوکدار.

٣- بارودۆخی کەش و هەوای باو لەدوای ئەوە یاریدەدەربوو بۆ دەرکەوتنی بوونەوەری چەندخانەیی.

٤- ژیانی زیندەوەری لە ناودا دەستیپێکرد، پاشان گوازرایەوە بۆ وشکانی کاتێك رووناکی رووەکەکان رێژەی ئۆکسجینی لە ناودا بەرزکردەوە.

(٢) Harold Morowitz: لە ساڵی ١٩٢٧ز لە نیویۆرك لە دایك بووە، مامۆستای فیزیای بایۆلۆجیای زیندەیی بوو لە زۆرێك لە زانکۆکانی ئەمریکا.

(٣) Sciense of God، 1997- The hidden face of god.2002

(٤) Peter Brown: پێشتر سەرنووسەری گۆڤاری مێژووی سروشتی Natural History بوو، پێشتریش سەرنووسەری گۆڤاری زانستەکان Scienses بوو.

## فێڵی هەڵبژاردنی سروشتی :

زانای بایۆلۆجی کۆڵن پاترسۆن لە کتێبەکەیدا (پەرەسەندن)، کە لە مۆزەخانەی مێژووی سروشتی لە لەندەن دەرچووە میکانیزمی هەڵبژاردنی سروشتی شیدەکاتەوە و دەڵێت: کاتێك بوونەوەران زیاد دەبن جیاوازی جینی (بازدانی بۆماوەیی)یان تێدا ڕوودەدات، کە هەیانە بۆ زۆربوون بەسوودە و دەمێنێتەوە و دەگوازرێتەوە بۆ نەوەکانی دواتر و لەوانەیە ببێتە هۆی گۆڕانکاری لە بوونەوەرەکاندا، تێشیاندا هەیە کە بازدانی زیانبەخشە و دەبێتە هۆی نەمانی ئەو بوونەوەرانەی کە هەڵیانگرتووە.

لە ڕاستیدا هەڵبژاردنی سروشتی بەم شێوەیە نایێت بە بەدیهێنەر، چونکە لەنێوان دوو تاکی بەدیهێنراو و ئامادەدا ئەو کارە دەکات؛ هەڵدەستێت بە سڕینەوەی نەوەی لاواز و هێشتنەوەی نەوەی بەهێز کە لە واقیعدا بوونی هەیە و بازدانە بۆماوەییەکان هێناویانەتەبوون. بریتییە لە کرداری (جێگیرکردن) یان (سڕینەوە)ی بوونەوەری ئامادە و توانای گۆڕینی بوونەوەر یان توانای ئەنجامدانی هیچ شتێکی نوێی نییە بەو شێوەیەی داروینییەکان بانگەشەی بۆ دەکەن.داروینیش لە ڕۆژەکانی کۆتایی تەمەنیدا هەستی بەو واتایە کرد، بۆیە دەستەواژەی هەڵبژاردنی سروشتی گۆڕی بۆ (پارێزگاری سروشتی Natural Preservation).

هەڵبژاردنی سروشتی پشت بەوە دەبەستێت کەبەروبوومی خۆراکی سنووردارە، بەمەش مانەوە بۆ ئەوە کە بەتواناترە(باشترە) لە بەدەستهێنانی خۆراکدا. بەڵام چی ڕوودەدات ئەگەر بەروبوومەکە بەشی هەمووان بکات، هەروەك چۆن ئێستا لە دارستان و زەریاکاندا هەیە، کە ژیان تێیاندا پەرەیسەندووە؟ گومان لەوەدا نییە کە هەموو بوونەوەران (باشترو ناباشتر) زیاد دەبن و دەمێننەوە، بەمەش ڕۆڵی هەڵبژاردنی سروشتی ون دەبێت و جگە لە ڕۆڵی هەرەمەکیتی بازدانەکان هیچی تر نامێنێتەوە. گومان لەوەدا نییە کە ئەو حەقیقەتە ریچارد دۆوکنز تووشی

بێتاقەتی دەکات، چونکە ئەو پشت بە کەمی مادده خۆراکییەکان دەبەستێت لەپێناو ئەوەی کە هەڵبژاردنی سروشتی بەرەو کارکردن پاڵ بنێت، ڕۆڵی بازدانە هەڕەمەکییەکان کەمدەکاتەوە (بەڵکو هەر ڕەتیدەکاتەوە).

لە ڕاستیدا سەیرکردنی هەڵبژاردنی سروشتی بەوەی کە ڕۆڵێکی دیاریکراوی هەیە و بەدیهێنەر نییە بیرۆکەیەکی نوێ نییە، چونکە پێشتر زانای بەناوبانگی ڕووەکناسی (سێر جۆزێف هۆکەر)[1] لە نامەیەکدا کە بۆ داروینی ناردووە لە ساڵی ١٩٦٢، تیایدا نووسیویەتی ((زۆر بە توندی ڕۆڵی بازدان لە پەرەسەندندا دڵنیا دەکەمەوە، چونکە ئەگەر ئەوە نەبوایە پەرەسەندنی سروشتی کاری نەدەکرد. وا دابنێ کە دوو کەس هەن کە توانای زۆربوونیان هەیە و کەرەستەی زۆریش لەبەردەستدا هەیە، گومان لەوەدا نییە، کە دوای ماوەیەک نەوەکانی هەردوو کەسەکە دەبینین کە سیفاتی دوو نەوەکە لەسەر جیاوازییەکانی نێوان دوو کەسەکە وەستاوە، لە کاتێکدا هەڵبژاردنی سروشتی هیچ ڕۆڵێک نابینێت)).

هۆکەر لە وتارەکەی بۆ داروین ئەوە زیاد دەکات و دەڵێت: ئەگەر پێتوایە هەڵبژاردنی سروشتی توانای ئەنجامدانی گۆڕانکاری هەیە، ئەوا هەموو گریمانەکانت هیچ بەهایەکیان نامێنێت. سەیری هەشت منداڵەکانت بکە، گومان لەوەدا نییە کە لە زۆر شتدا زۆر لە یەکتر جیاوازن، لەوانەیە بڵێی کە ئەوان چەند جیاوازییەکیان هەڵگرتووە کە لەڕێی بۆماوەییەوە لە پێشینەکانیانەوە بۆیان ماوەتەوە، بەوە وەڵامت دەدەمەوە کە ئەگەر ئێمە بەرەو سەرەوە بڕۆین تا دەگەینە یەکەمین نێر و مێی ڕەگەزی مرۆڤایەتی، گومان لەوەدا نییە کە ئەو دووانە هەموو ئەو جیاوازییانەی کە لە نەوەکانی ئەوان و نەوەکانی تۆدا هەیە هەڵیان گرتووە. هەروەها گومان لەوەدا نییە، کە گۆڕانکارییە هەڕەمەکییەکان کە لە نەوەکانی ئەواندا ڕوویانداوە بەرپرسە لە ئەنجامدانی جۆراوجۆریتی و جیاوازی بەبێ ئەوەی کە هەڵبژاردنی سروشتی ڕۆڵێکی بەرچاوی لە ئەنجامدانی ئەو جیاوازییانەدا هەبێت، لە ڕاستیدا ڕۆڵەکە هەمووی هی بازدانەکانە.

---

(١) Joseph Hooker: ١٨١٧-١٩١١ز، یەکێک بوو لە بەناوبانگترین زانایانی ڕووەکناسی لە سەدەی نۆزدەدا، بەریتانی بوو، یەکێک بوو لە دامەزرێنەرانی جوگرافیای ڕووەک و، نزیکترین هاوڕێی داروین بوو.

داروین بە وتارێك وەڵامی هۆکەری داوەتەوە کە تیایدا هاتووە؛ ئاماژەدانت بە جیاوازی نێوان تاکەکانی ئەوەیەك دەگەڕێتەوە بۆ بازدانەکان و هەڵبژاردنی سروشتی ڕۆڵی تێدا نابینێت، ڕاستەوخۆ ڕای گۆڕیم! گومان لەوەدا نییە کە لە ئێستادا هاوڕاتم لەوەی کە من ڕۆڵی بازدانەکانم وەلاناوە بۆ بەرژەوەندی هەڵبژاردنی سروشتی.

ئەوەی کە هۆکەر خستوویەتیە ڕوو بە (بەڵگەی هووکەر Hookers Argument) ناسراوە زۆر گرنگە، ئەوەش دووپات دەکاتەوە کە باسمان کرد ئەوەی، کە ڕۆڵی بازدانەکان زۆر لە ڕۆڵی هەڵبژاردنی سروشتی گرنگترە.

ئایا تۆش وایدەبینی کە میکانیزمی پەرەسەندنی داروین(هەڵبژاردنی سروشتی لە نێوان بازدانە هەڕەمەکییەکاندا) میکانیزمێکی بێتوانایە، کە سەپێنراوە بۆ ئەوەی کە دیدی ماددیگەرایی بۆ زیندەوەران تەواو بکات لەسەر حیسابی خودای بەدیهێنەری بزوێنەری میکانیزمی پەرەسەندنی ئاڕاستەکراو؟.

## سێیەم: سنوورەکانی پەرەسەندنی داروین

### دیاردە بایۆلۆجییەکانی سەرووی وزەی داروینیزم

لە جیهانی زیندەوەراندا زۆر دیاردەی بایۆلۆجیمان دێتە بەردەم کە(میکانیزمی سروشتی لە نێوان بازدانە هەڕەمەکییەکان) بێتوانایە لە پێشکەشکردنی لێکدانەوە. ئەوانیش چەند دیاردەیەکن کە زانست تەفسیرێکی ماددییان بۆ شك ناباتە هەرچەندە لە ئاییندەدا زانیاری زیاتریشی بۆ ئاشکرا ببێتە. لەوانەش:

### أ- سەرسامکردن لە بنچینەدا کێشەی هیمۆگلۆبین[1] و کلۆرۆفیلە

هیمۆگلۆبین بریتییە لە بەشێکی پرۆتینی کە لە چوار زنجیرە پێکهاتووە، کە هەر یەکێکیان لە سەد و چل و شەش ترشی ئەمینی پێکدێت و هەلی پێکهاتنی یەك زنجیرە لە ڕێی ڕیزبوونی هەڕەمەکی ئەو ترشە ئەمینیانە دەگاتە ١٠$^{-١٩٠}$. کێشەی لەوەش گەورەتر ئەوەیە کە پێویستە ئەم بەشە لە یەکێك لەو هەوڵانەدا بە تەواوەتی درووست ببێت، بەوپێیەی کە بەشی شێواو ڕێگای ژیان و زۆربوون بە بوونەوەر نادات و، بەمەش هەڵبژاردنی سروشتی ناتوانێت کاری چاکسازی و چاککردنەوە لە بەشی تێکچوودا ئەنجام بدات[2].

---

(١) هیمۆگلۆبین بنچینەی ژیانی ئاژەڵییە، بەوپێیەی کە هەڵدەستێت بە هەڵگرتنی ئۆکسجین لە سییەکانی ئاژەڵدا و بۆ شانەکان و دوورخستنەوەی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن.

(٢) ئەم دیاردەیە بە ئاڵۆزی نەشیاو بۆ وردکردنەوە و نیختیزال ناسراوە، لە تەوەری دواتردا بە دوور و درێژی باسی دەکەین.

هەرچی کلۆرۆفیلە، ئەوا بریتییە لە بنچینەی ژیانی ڕووەکی(و ئاژەلی)، بەوپێیەی کە هەڵدەستێت بە دروستکردنی بەشەکانی شەکر لە وزەی خۆر و ئاو و دووەم ئۆکسیدی کاربۆن، لە هەمان کاتدا گازی ئۆکسجین دەبەخشێتە ژیان!! هەموو ئەمانە لەرێی کرداری نواندنی ڕووناکی ڕوودەدەن، تەکنۆلۆجیای مرۆیی تائێستا نەیتوانیوە ئەم کارە ئەنجام بدات، بەڕاستی ئەوەیان موعجیزەیەکە لەشێوەی بەشێکی کیمیاییدا.

## ب- سەرسامکردن لە فەرماندا: کێشەی هەستە وردەکان:

داروینییەکان لەوەدا هەڵەن کە وادەزانن پەیدابوونی پێنج هەستەکە[1] کارێکی ئاسانە، بەوپێیەی کە وەرگرتن فەرمانێکی نەرێنییە لە زیندەوەردا! بۆ ئەو مەبەستەش سەدان لاپەڕەیان پڕکردۆتەوە بەوەی کە چۆن هەندێك خانەی پێست بە شێوەیەکی هەڕەمەکی دەگۆڕێن بۆ چاوێکی بینەر. لە ڕاستیدا توێژینەوەیەکی دەستپاکانەی قووڵ بۆ ئەو ئاڵۆزییە سەرسوڕهێنەرەی لە هەستەکاندا هەیە و ئەندازەی ئەو گونجانە سەرسوڕهێنەرەی لە ئەندامەکانیدا هەیە لەنێوان بنچینە و فەرماندا، بەبێ هیچ گومانێك سادەیی و لایەنگیری ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە دەسەلمێنێت.

## ج- سەرسامکردن لە ڕەفتاردا: کۆچکردنی باڵندە و ماسییەکان:

زانست سەلماندوویەتی کە باڵندەکان ڕێگای خۆیان دەزانن لە کاتی کۆچکردنی ساڵانەیان بۆ شوێنی زۆربوونیان و هەروەها ڕێگای گەڕانەوەش دەزانن، کە هەزاران کیلۆمەتر بەسەر زەریا و بیابان و دارستانەکاندا دەڕۆن، ئەو کارەش بەهۆی شوێنکەوتنی بواری موگناتیسییە. هەرچی مارەماسییەکانن، ئەوا چیرۆکەکەیان زۆر سەرسوڕهێنەرترە، چونکە لە دوای دانانی هێلکە،

---

(١) بینین-بیستن-بۆن کردن- تام کردن- بەرکەوتن.

دایکەکان لە تاراوگەدا دەمرن، لە کاتێکدا کە بەچکەکانیان دەگەڕێنەوە بۆ نیشتمانی دایکیان، بە هەمان ئەو ڕێیەشدا کە لێوەی هاتبوون، دەگەن بە هەمان ئەو کەلێنە بچوکەی کە لە رووباری نیلی گەورەدا دایکەکان تێیدا ژیاون، تا ئەوانیش لە هەمان شوێندا بژین. چۆن زانیارییەکان لە کۆدی بۆماوەیی باڵندە و ماسییەکاندا دانراون، ئایا وادەزانی کە ئەوە ڕێکەوتە؟!

## د- سەرسامکردنی گونجانی نێوان نێر و مێ و زۆربوونی سێکسی، بۆچی؟ چۆن؟

بوونەوەری تاکخانەیی کە بە دابەشبوونی دوانەیی (زۆربوونی ناسێکسی) زیاد دەبێت تاکە بوونەوەرە لەسەر هەسارەکەمان کە بە درێژایی سێ بلیۆن ساڵە لەسەر زەوی دەژی، تائێستاش هۆکار و چۆنیەتی گواستنەوە لەم جۆرە زۆربوونەوە بۆ زۆربوونی سێکسی یەکێکە لە نهێنییە بایۆلۆجییەکان. کێشەی لەوەش گەورەتر ئەوەیە کە چۆن بە ڕێکەوت گۆڕانکارییە ڕێك و پێکەکان لە هەریەك لە ڕەگەزەکەدا بە تەنیا ڕوودەدات[1].

ئایا دەزانی، کە داروینییەکان چۆن ئەم گونجانە لێکدەدەنەوە؟

زانای بایۆلۆجیای داروینی مات رایدلی[2] لە کتێبەکەیدا (شاژنە سوورەکە The Red Queen) دا دەڵێت: پەیدابوونی زۆربوونی سێکسی و ئەو گونجان

---

(١) نموونەش بۆ ئەوە لەژمارە نایەن:

- چۆن کرۆمۆسۆمە هاوشێوەکان لە هەریەکە لە نێر و مێدا بە جیا دروستدەبن، بەجۆرێك کە لە کاتی پیتاندنی هێلکۆکەدا یەیەك دەگەن و بۆئەوەی پێکەوە دوانەی کرۆمۆسۆماتی هاوشێوە دروست بکەن؟!

- چۆن ئەنزیمی پێویست لەسەر سپێرم دروستدەبێت بۆئەوەی بتوانێت دیواری هێلکۆکە بدڕێت کە نێرینە هیچ شتێك دەربارەی پێکهاتەکانی نازانێت؟

- چۆن لاشەی مێینە بە جۆرێك دروستبووە کە هەستی نێرینە بوروژێنێت؟ کە هۆرمۆنی ڕەگەزی نێرینەیە دەڕژێت لە کاتێکدا ئەو هۆرمۆنانە خاسیەتی چێژوەرگرتنیان لە جوانی نییە ؟

(٢) Matt Raidley: زانای بایۆلۆجیا و ڕاگەیاندکاری بەریتانی، لە ساڵی ١٩٥٨ز لە دایك بووە.

و ڕێکییەی پێویستی پێی هەبوو، تەنیا ڕووداوێکی بەرەستنی لاوەکییە، ڕێک وەك ئەوەی کە ئۆتۆمبێل لە سایدی هەڵە لێبخوڕێت! ئیتر بۆچی گرنگییەکی تایبەتی پێبدەین؟! من وەك خۆم ئەوە بە تەفسیرێکی زانستی نازانم بەڵکو بە فێڵێکی ساکارانەی دادەنێم ئایا تۆ ئەم لێکدانەوەیەت قبوڵە؟!

## هـ-سەرسامکردنی پێکەوەژیان[1] لە نێوان دوو جۆردا Symbiosis: پێکەوەژیانی ڕووەکخۆرەکان و بەکتریا

ئاژەڵە گیاخۆرەکان پێویستییان بە جۆرە بەکتریایەکی دیاریکراو هەیە بۆئەوەی بە کرداری هەرسکردنی ماددەی سلیلۆز هەڵبستن، کە خۆراکە ڕووەکییەکەی لێ پێکهاتووە و ئاژەڵەکان ئەم بەکتریایە پەیدادەکەن کە دواتر لە ناو گەدەی ئاژەڵەکەدا لەگەڵ خواردنی یەکەمین ژەمی گیادا شوێنێك بۆ ژیانی خۆی دروستدەکات.

چی ڕوودەدات ئەگەر ئەو بەکتریایە لەناوبچێت؟ بێگومان ئاژەڵە ڕووەکخۆرەکان دەمرن و پاشان ئەو ئاژەڵە گۆشتخۆرانەش دەمرن کە لەسەر ئەوان دەژین و لە کۆتاییشدا ژیانی مرۆڤ دەکەوێتە مەترسییەکی ڕاستەقینەوە! چۆن ئەم پرسە ڕێکخراوە و مەرجەکانی لە کۆدی بۆماوەیی هەردوو بوونەوەرەکەدا دانراوە؟!

---

(١) مەبەست لە پێکەوەژیان ئەوەیە کە بوونەوەرێك لەگەڵ بوونەوەرێکی تری جۆرێکی تر پێکەوە بژین و سوود ئاڵوگۆڕ بکەن.

## و- سەرسامکردنی گونجان لە نێوان چەند جۆرێکدا
**Interspecies Coordination**

**کێشەی دیاردەی مشەخۆری Parasitism :**

٪١٠ی زیندەوەرە مشەخۆرەکان لەسەر زیندەوەرانی تر دەژین و زۆرێك لەم مشەخۆرانە سووڕی ژیانیان لەڕێی دوو سەرچاوەی خۆراکییەوە تەواو دەکەن، سەرچاوەیەکی بنچینەیی کە لە قۆناغی پێگەیشتنیدا کە مشەخۆرەکە تێیدا دەژی، هەروەها سەرچاوەیەکی لاوەکی کە تیایدا خولی ژیانی تەواو دەکات.

کەواتە ئەم جۆرە مشەخۆرە پەیوەندی نێوان سێ بوونەوەر نیشان دەدات[1]، چۆن ئەم پەیوەندییە لە نێوان ئەو سێ بوونەوەرەدا دروستدەبێت؟!

## هەڵاتنێکی سەرشۆڕانە :

دەکرێ ئەو دیاردە بایۆلۆجییە سەرسوڕهێنەرانەی باسمانکردن و داروینییەکانیان پێتوانا و دەستەوەستان کردووە دابەش بکەین بۆ دوو کۆمەڵەی گەورە؛ کە یەکەمیان ئیعجازێکی گەورە لە بنچینەی بەشەکانی ژیان(هیمۆگلۆبین و کلۆرۆفیل) و وردی ئەنجامدانی فەرمانەکان لەلایەن بوونەوەرانەوە(ئاژەڵە

---

(١) ئەگەر خولی ژیانی مشەخۆری بەلهارسیا وەك نموونە وەربگرین، دەبینین کە گونجانێکی گەورە هەیە لە نێوان سێ بوونەوەرەکەدا؛ کرم و بەلهارسیا(نێر و مێ) و بەخێوکەری نێوەندگیر(جۆرێکی دیاریکراو لە ئاژەڵە قەوقەعییەکان) و مرۆڤ(خێزانی بنچینەیی). گومان لەوەدا نییە کە لە هەر قۆناغێك لە خولی ژیانی کرمی بەلهارسیا چەند لایەنێکی گونجان هەیە کە پێویستی بەوە هەیە هەر یەك لە هەر سێ بوونەوەرەکە ئاگاداری کیمیا و بایۆلۆجیا و فیزیای بوونەوەرەکەی تر بێتە تەنانەت شێوازەکانی ژیانی و عادەتە کۆمەڵایەتییەکانیشی.

کۆچکەرەکان)، کۆمەڵەی دووەمیش گونجانی گەورەی نێوان نێر و مێی یەك بوونەوەر و دوو بوونەوەر و سێ بوونەوەر. ئیتر چۆن داروینییەکان ئەم گونجان و رێککەوتنە تەفسیر دەکەن؟

کاتێك هەندێك لە زانا و فەیلەسوفەکان دەیانەوێت کە بڕوا بە کەسانی تر بێنن سەبارەت بە بیرۆکەیەك کە هیچ بەڵگەیەکی زانستی یان عەقڵی لەسەر نەبێتە ئەوا چەمك و ناوێکی بۆ دادەنێن (Give-ait-a-name)ی لێدەنێن و وا دەردەکەوێت کە حەقیقەتە، ئیتر لەبری ئەوەی کە گفتوگۆکە بە ئاڕاستەی ڕاست و هەڵەی بیرۆکەکە بڕوات، ئەوا گفتوگۆکارەکان بە چەمکەکەوە سەرقاڵ و رازی دەبن!

داروینییەکان ئەو شێوازەیان بەکارهێناوە بۆ ئەوەی، کە ئەو گونجانە سەرسوڕهێنەرە تەفسیر بکەن کە باسمان کرد، دەڵێن کە ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ (پەرەسەندنی گونجاوی نێوان بوونەوەرەکان Co-Evolution ) و بەس!

شێوازێکی تر کە داروینییەکان پەنای بۆ دەبەن تا دەربارەی پرسێك بڕوامان پێبێنن کە ناتوانن تەفسیرێکی لۆژیکیمان پێشکەش بکەن دەڵێن (بەم شێوەیە ڕوویداوە Just-so) و بەس.

بۆئەوەی کە گومانت بۆ ئەوە نەچێتە کە من خەریکی گاڵتەکردن یان تۆمەت بەخشینەوەم، هەروەها بۆ ئەوەی کە وا بیر نەکەیتەوە کە ئەو سەدان کتێبەی لە بازاڕدا هەن و پەرەسەندنی هەرچەکی شیدەکەنەوە شتێکی لۆژیکی دەخەنەڕوو، ئەوا چەند دەقێکی بەڵگەکانیان دەخەمەڕوو:

لە فەرهەنگەی زانیارییەکان (دائرة المعارف)ی ئەمریکی چاپی ١٩٨٢ز دا هاتووە: ((بە –ڕێکەوت By accident– یان بە – تاقیکردنەوە Experiment– (دۆزراونەوە) کە مشەخۆرەکان سوودیان هەیە کە لەسەر بوونەوەری تر دەژین. لە چاپی ١٩٩٤ی مەوسوعەکەدا هەردوو وشەی (دوزراونەتەوە) و (بە تاقیکردنەوە) سڕاونەتەوە و وشەی بە ڕێکەوت ماوەتەوە!!

هەروەها مەوسوعەی (گینس) بۆ زیندەوەران[1] باس لەوە دەکات و دەڵێت: ((ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ پەرەسەندنی گونجاو Co-Evolution)). هەروەها لە کتێبی ((ئایا خودا یاری بە زاری تاوڵە دەکات؟ - Does God Play Dice?))، کە لە ساڵی ١٩٩٧ز دەرچووە، نووسەر[2] دەڵێت: یەکێك لەو پرسانەی پەرەسەندنی بەسەردا زاڵبووە دیاردەی حەشەراتە خوێنمژەکانی وەك (مێشوولە)یە.

لەڕاستیدا بوونی خوێن لە مەمکدارەکان و بوونی دەرزی لە مێشوولەدا کە توانای کونکردنی پێست و مژینی خوێنی هەیە لە دەرەنجامی (پەرەسەندنی گونجاو Co- Evolution)دا ڕوویانداوە. ئەوەك بەهۆی پەرەسەندنی سەربەخۆی هەر زیندەوەرێك جیاواز لە زیندەوەرێکی تر! کاتێك لە دیدارێکدا دەربارەی واتای ئەوە پرسیار لە نووسەر کرا، لە وەڵامەکە رایکرد و گوتی: بابچینە سەر بابەتی گرنگتر!!.

لەوەی رابورد بێتوانایی میکانیزمی پەرەسەندنی داروینیمان سەلماند (هەڵبژاردنی سروشتی لەنێو بازدانە هەڕەمەکییەکاندا) لە ئەنجامدانی ئەو جۆراوجۆرێتییەی لە زیندەوەراندا هەیە. ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە کە (سنووری پەرەسەندنی داروینی) بزانین. تا توانا‌کەیمان بۆ دەربکەوێت.

---

(١) چاپی ١٩٩٢ لاپەڕە ١٧

(٢) کتێبەکە هی زانای بیرکاری ئییان ستیوارت Ian Stewart ە کە لە ساڵی ١٩٨٩ز دەرچووە، تیایدا بنچینە بیرکارییەکانی چەمکی پشێوی Chaos باسدەکات.

## سنووردارێتی ڕۆڵی پەرەسەندنی هەڕەمەکی:

**لەژێر ئەو ناوونیشانەدا دوو پرسیار تاوتوێ دەکەین :**

- پەرەسەندنی ورد گۆڕانکاری لە زیندەوەردا ئەنجامدەدات، بەڵام ئایا بە کەڵەکەبوونی ئەو گۆڕانکارییانە دەکرێ زیندەوەرەکە بگۆڕن بۆ زیندەوەرێکی تر(پەرەسەندنی دیار) ؟

- ئایا تواناکانی پەرەسەندنی داروینی سنووریان هەیە، یاخود بەشێوەیەکی ڕەها توانای ئەنجامدانی هەموو ئەو جۆراوجۆرێتییەی هەیە کە لە زیندەوەراندا بەدی دەکەین؟

داروینییەکان دانانی سنوورێکی جیاکەرەوە لەنێوان پەرەسەندنی ورد Microevolution و پەرەسەندنی دیار Macrroevolution ڕەتدەکەنەوە، وایدادەنێن کە دووەمیان بەهۆی کەڵەکەبوونی یەکەمیانەوە ڕوودەدات، بۆیە وایدەبینن کە پەرەسەندنی دیار پێویستی بە میکانیزمی تایبەت بە خۆی نییە. لە بەرامبەریشدا، کۆمەڵێکی گەورەی بایۆلۆجییەکانی پسپۆڕ لە بۆماوەزانی[1] وایدەبینن کە میکانیزمەکانی پەرەسەندنی ورد کە دەیانزانین هەرچەند بەسەر یەکەوە کەڵەکە ببن بەس نین بۆ ئەنجامدانی پەرەسەندنی دیار و، ئەوەی کۆتایی بەهۆی میکانیزمگەلێکی تر ڕوویداوە کە هیچیان دەربارەوە نازانین.

پۆل ئیربرێخت (زانای بایۆلۆجیا و فەیلەسوف) ئەوە ڕووندەکاتەوە کە میکانیزمی هەڵبژاردنی سروشتی لەنێوان بازدانە سروشتییەکاندا شتێکی نوێ

---

(١) لەوانە: E.s Zathmary ، Goodwin- Richard Goldschmidt - John Maynard Smith - Siegfried Schrerer

ناهێنێتە بوون، بەڵکو میکانیزمێکی کۆنترۆڵکردنی کارایە، چونکە وا لەو سیستەمە دەکات، کە بوونی هەیە کە خۆی لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی ژینگەدا بگونجێنێت، ڕێك وەك ئەوەی کە کۆمپیوتەری ئۆتۆمبێل کاری ماتۆڕەکە ڕێکدەخات کاتێك زیاتر پێ لەسەر پەیدانی بەنزین دادەگری، کەواتە ئەو میکانیزمانەی دەیانزانین دەبنە هۆی مانەوەی باشترین Survival of Fittest نەوەك دەرکەوتنی باشترین لە گۆڕەپانەکەدا Arrival of Fittest.

یەکێك لە گەورە زاناکان کە میکانیزمەکانی داروینیزمی نوێ ڕەتدەکەنەوە (پییێر گراسیێ)[1]یە. گراسیێ چەند تاقیکردنەوەیەکی لەسەر هەزاران نەوەی مێشوولەی میوە (درۆسۆفیلا) ئەنجامداوە و هەموو ئەو بازدانانەی دەکرێ تێیدا ئەنجامداون، کەچی گراسیێ هیچ بازدانێکی سوودبەخشی دەستنەکەوت، تەنانەت بازدانە خراپەکان لە سنوورێکی دیاریکراودا ڕوویاندەدا و نەدەتوانرا تێیپەڕێندرێن، هەروەك چۆن حەشەراتە عەیبدارکەرەکان بە خێرایی ون دەبوون لە دەرەنجامی ((ڕێکخستنی بۆماوەیی Genetic Homeostasis)) بەوپێیەی کە نەزۆك دەبوون و زیادیان نەدەکرد.

هەموو ئەوانە ئەوەیان سەلماند کە ماحاڵە پەرەسەندنی ورد ببێتە هۆی پەرەسەندنی دیار.

---

(١) Pierre Grasse: لە زانکۆی سۆربۆن مامۆستای بایۆلۆجیا بوو و، سەرۆکی ئەکادیمیای فەرەنسی بوو بۆ زانستەکان و سەرنووسەری کاری مەوسوعی گەورەی زانستەکانی ناژەڵ Traite de zoologie کە (٢٨) بەرگە. گراسیێ مەوسوعەکە بە مەوسوعەی زانستەکانی ژیان ناودەبات و دەڵێت کتێبەکەم(پەرەسەندنی زیندەوەران) هێڵی هێرشبەری یەکەمی دژ بە داروینیزمە.

## توێژینەوەکانی مایکل بێهی:

مایکل بێهی[1] بە یەکێك لە گەورە زانایانی بواری بایۆلۆجیای بەشی دادەنرێت کە گرنگییان بە لێکۆڵینەوە لە تواناکانی پەرەسەندن داوە، زۆر لێکۆڵینەوەی لەو بوارەدا ئەنجامداوە و لە کتێبێکدا تۆماری کردوون بە ناوونیشانی ((سنوورەکانی پەرەسەندن The Edge of Evolution)). بێهی لە تاقیکردنەوەکانیدا تێبینی ئەوەی کردووە، کە ئەو گۆڕانکارییانەی بازدانە سروشتییەکان لە زیندەوەراندا ئەنجامیانداوە پەرەسەندنی نەبوون Evolution (و هیچ شتێکیان ئەنجامنەداوە)، بەڵکو هەرەسهاتوو بوون Devolution لە ئەنجامی قوربانیدان بە چەند بەشێکی زیندەیی زیندەوەرەکە. هەروەك چۆن بێهی بێتوانایی هەڵبژاردنی سروشتی لەنێوان بازدانە هەڕەمەکییەکاندا سەلماندووە لە پێکهێنانی تاکە بەشێکی نوێی پرۆتین[2].

---

(١) Michael Bohe: لە تەوەرەی ئایندەدا دەیناسێنین.

(٢) یەکێك لە بەناوبانگترین تاقیکردنەوەکانی بێهی بریتی بوو لە زیادکردنی ٣٠،٠٠٠ نەوەی بەکتریا E.Coli، کە دەکاتە نزیکەی ملیۆن ساڵ لە تەمەنی مرۆڤ. ئەو بازدانانەی کە لە بەکتریاکەدا ئەنجامیداوە بووە هۆی لەکارکەوتنی هەندێك لە چالاکییە زیندەییە گرنگەکانی تایبەت بە بنیاتنانی چەند بەشێکی RNA کە بۆ زۆربوون پێویستە و، بەکتریاکە سەرەڕای گرنگی ئەو هەنگاوە کەچی بەکتریاکە کردی بە قوربانی، چونکە ئەندازەیەکی زۆری وزەی پێویستە.

لەمەشەوە بێهی گەیشتە ئەو دەرەنجامەی کە پەرەسەندنی هەڕەمەکی زیندەوەران تێکدەشکێنێت و هیچ شتێکی سوودبەخش ئەنجام نادات.

یەکێکی تر لە تاقیکردنەوە گرنگەکانی بێهی ئەو تاقیکردنەوەیە بوو کە لەسەر مشەخۆری مەلاریا ئەنجامیدا، لەبارەیەوە دەڵێت: مشەخۆری مەلاریا کەوتە ململانێیەکی درێژخایەن لەگەڵ دەرمانە بکوژەکانی کە مرۆڤ دۆزیویەتیەوە، کە گرنگترینیان Chloroquine ە، هەندێك لە تاکەکانی مشەخۆرەکە بەرگرییان لە دژی دەرمانەکان پەیداکرد، ئەمەش لەرێی کردنە قوربانی بەشێك لە کۆدی بۆماوەییەکەی، لەڕاستیدا بەرگرییەکە دەرەنجامی کرداری شکان بوو نەوەك بنیاتنان. سەرەڕای لەدایکبوونی سەد بلیۆن مشەخۆر لەو شوێنانەدا کە مەلاریایان تێدا بڵاوە بە درێژایی پەنجا ساڵی رابردوو تەنانەت تاکە پڕۆتینێکی نوێ لەو مشەخۆرانە دەرنەکەوتووە

بەو جۆرەی کە پێشبینی دەکرا، دەیان لێکۆڵینەوە بۆ بەرپەرچدانەوەی خستنەڕووەکەی بێهی دەرکەوتن، بەڵام هیچیان بەهیچ جۆرێك بابەتیانە نەبوون، بەڵکو بەشێوازێکی دوژمنکارانە و چەواشەکارانە بوون، کە ئەوە بەسە بۆ ئەوەی متمانە لەدەست بدەن. لەوانەیە بەناوبانگترین ئەو ڕەخنە پووچانەش ڕەخنەکانی دۆوکنز و جێری کوین بن، کە ڕەخنەیان لەو حەقیقەتانەی بێهی خستبوونیەڕوو ئەوە بوو، کە هەڵبژاردنی دەستکرد لە ماوەی چەند سەد ساڵێك توانیویەتی چەند جۆرێك Species لە سەگ بەرهەم بهێنێت! لەوە بێئاگان کە لە هیچ کام لەو جۆرانەدا دوو جۆر پرۆتینی نوێی چاکی بەیەکەوە گونجاو لە کارکردندا بەرهەم نەهاتوون[1]. بێهی لە کتێبەکەیدا ئەو ڕەخنەیەی پووچەڵ کردۆتەوە (بەر لەوەی ڕەخنەکە بخرێتە ڕوو!) کاتێك باسی لەوە کردووە کە پەرەسەندنی داروینی توانای دەرخستنی خێزانی نوێی هەیە Familles، کەواتە ئاساییترە، کە جۆری جیاواز لە یەك خێزاندا دەربخات، بەڵام بێتوانایە لە بەرهەمهێنانی پلە Orders و پۆل Classes و لق Phylum.

دەرەنجامی توێژینەوەکانی بێهی لەوەدا پوخت دەکەینەوە کە پەرەسەندن سنوورێکی وای هەیە کە بازدانەکان و هەڵبژاردنی سروشتی ناتوانن بیبەڕن. لە هەمان کاتیشدا بێهی جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ناکرێ بەڵگەکانی بنچینەی هاوبەش پشتگوێ بخرێن، لەبەرئەوە دەستخستنەناوی خودایی دەکاتە تەفسیری ڕوودانی پەرەسەندنی دیار و جۆراوجۆری نێو زیندەوەران.

---

لەپێناو زاڵبوون بەسەر ئەو دەرمانانەدا. واتا دەرفەتی پەیدابوونی تەنها پرۆتینێك کەمترە لە ١٠-٢٠.

پاشان بێهی دەچێتە سەر لێکۆڵینەوە لە ڤایرۆسی ئایدز AIDS و ململانێی لەگەڵ دەرمانەکاندا کە مرۆڤ بەکاریان دێنێت، پێمان دەڵێت کە دوای چەند دەیەیەك لە ململانێ نزیکەی ١٠-٤٠ جۆر لە ڤایرۆسەکە درووست بوون، بێئەوەی کە تاکە پرۆتینێکی نوێ بەرهەم بێنن. بە هەمان شێوە ئەگەری پەیدابوونی دوو پرۆتینی باش پێکەوە کەمترە لە ١٠-٤٠. ئەمەش ژمارەیەکە زیاترە لە ژمارەی ئەو بوونەوەرانەی بەدرێژایی مێژوویان لەسەر ڕووی زەوی دەرکەوتوون، ئیتر چی دەڵێی دەربارەی ٣ پرۆتین کە پێکەوە بگونجێن، یاخود چی دەڵێی دەربارەی ئامێری پرۆتینی (زیندەوەر) کە یەك کارلێکی کیمیایی تیایدا بە لایەنی کەمەوە پێویستی بە ١٠ بەشی پرۆتینی هەیە، ئیتر چی دەڵێی دەربارەی دەیان و سەدان و هەزاران بەشی پرۆتینی؟!.

(١) New Protein - Protein Interaction sites.

**خوێنەری بەڕێز :**

**لەو تەوەرەیەدا بۆمان دەرکەوت کە:**

**داروینیزم = پەرەسەندنی بایۆلۆجی + هەڕەمەکێتی**

هەروەها بە کورتی بەڵگەکانی زانستمان لەسەر بنچینەی هاوبەشی زیندەوەران خستەڕوو. هەروەك چۆن بەڵگەمان لەسەر بێتوانایی هەڕەمەکێتی لە پێشەوابیکردنی شەمەندەفەری پەرەسەندندا خستەڕوو، کە خۆی دەبینێتەوە لە نهێنییەکانی تۆماری حەفرییاتەکان کە تا ئێستا دۆزراونەتەوە، کە ڕاستەوخۆ دیدی ئەویان گۆڕی لە بەرامبەریدا؛ لە بەڵگەیی لەسەر هەڕەمەکێتی بۆ دژەکەی، ئەو فێڵەشی ئاشکرا کرد کە هەڵبژاردنی سروشتی لەنێوان بازدانە سروشتییەکاندا هەڵیگرتووە، هەروەها ئەوەیش کە پەرەسەندنی داروینی تەنیا لە چوارچێوەی پەرەسەندنی ورددا دەمێنێتەوە و لە بەرامبەرئەنجامدانی پەرەسەندنی دیاردا بێتوانایە. ئەمەش جگە لە دانتان بە پەرەپێسەندنی خودایی ئاڕاستەکراو هیچ بوارێکی تر ناهێڵێتەوە.

سەرەڕای ئەوەش،داروینییەکان زیاتر لە دەمارگیری دیندارە ئوسوڵییە توندڕەوەکان بۆ ئایینەکەیان بۆ مەزهەبەکەیان دەمارگیرن! تا ئەو ئاستەی داروینیزم لەلای ماددیگەراکان بۆتە پیرۆزترین پیرۆزی کە ناکرێ خاوەن عەقڵە ڕەخنەگرییەکان بەلایدا بچن، بەتایبەت دوای ئەوەی دەرفەتی ژیانیان بۆ رەتکردنەوەی دانتان بە خودای بەدیهێنەر لە داروینیزمدا دۆزییەوە.

کەواتە، دوای ئەوەی داروینیزم گریمانەیەکی زانستی بایۆلۆجی بوو، لە ئێستادا بۆتە بنەمایەکی غەیبی بێباوەڕیی کە هەموو گەردوون دەگرێتەوە، هەموو پێویستی و پەیوەستییەکی ئایینی لەسەر مرۆڤ هەڵدەگرێت. بەمەش (داروینیزم) یان (پەرەسەندن) بۆتە فەلسەفەی دژ بە ئایین، بەڵکو بۆتە خودایەکی بەرجەستە، کە مووریدەکانی وەك هێزێکی ڕاستەقینەی گەردوون سەیری دەکەن.

گەورە فەیلەسوفی ئەمریکی ئالڤین پلانتینگا لە کتێبە ناوازەکەیدا: (أين يكمن الإختلاف)[1] دا چەمکێکی زۆر گرنگ دەخاتەڕوو، تیایدا بەڕەکە لەژێر پێی بێباوەڕان دەردێنێت لە پرسی نکۆڵیکردن لە بوونی خودا، سەرنجی بدە کاتێك دەڵێت: ((لە ڕاستیدا هەڤدژییەکی قووڵ لە نێوان بێباوەڕیی و سیناریۆی پەرەسەندندا بوونی هەیە بەو شێوەیەی کە بیردۆزی داروین بۆمانی وێنا دەکات!)).

پلانتینگا ئەو چەمکە شیدەکاتەوە و دەڵێت: ((لەپێناو ئەوەی کە دەرك بەو هەڤدژییە بکەین وەرە با پێکەوە سەرنجی بیردۆزەکەی داروین بدەین، بۆ ئەوەی جیاوازی بکەین لە نێوان چەمکە زانستییەکانمان و لێکەوتە فەلسەفی و ئایینییەکان بکەین کە زۆر کەس بەهۆیانەوە بەلاڕێدا چووە. بیردۆزەکە باس لەوە دەکات کە ژمارەیەك بازدانی سوودبەخش لە کاتێکی گونجاودا ڕوویانداوە و بۆتە هۆی ڕوودانی پەرەسەندنێکی جوانتر لە خەیاڵ و، کۆدی بۆماوەیی خانەی یەکەم زۆر گونجاوبوو بۆئەوەی ببێتە پێشین بۆئەو جۆراوجۆرێتییە گەورەیەی لە زیندەوەراندا هەیە، هەروەها هەندێك ڕووداوی سروشتی گەورە ڕوویانداوە کە ڕێگای بە لەناوچوونی هەندێك ڕەگەزی دیاریکراو دا بۆ ئەوەی ڕێگا بۆ ڕەگەزی تر خۆش بکات[2].

ئەوەی باسمان کرد ئەوە دەردەخات کە ئێمە بیردۆزێکی زانستی ڕێژدارمان هەیە و بەڵگەی خۆی هەیە، بوونی دیزاین و پلان و مەبەست و ئامانج و شوێنکەوتنی سیناریۆیەکی دیاریکراو دووپات دەکەنەوە، سەرەڕای ئەوەش گەلانی تر هاتوون و دەرەنجامی فەلسەفییان بۆ زیادکردووە کە بانگەشەی هەڕەمەکێتی ڕووداوەکان دەکەن (بە تایبەتی بازدانەکان) بەبێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکیان هەبێت!)).

---

(١) Where the Conflict really lies. Oxford University press. 2011.

(٢) وەك کەوتنی نەیزەکێکی زەبەلاح بۆ سەر زەوی پێش ٦٥ ملیۆن ساڵ و، بووە هۆی لەناوچوونی خشۆکە زەبەلاحەکان(داینەسۆرەکان)، ئەوەش ڕێگای بۆ دەرکەوتنی مەمکدارەکان خۆش کرد.

زانای حەفریاتەکان و گەورە زانای بایۆلۆجیا ستیڤن جای گۆڵد بە شێوەیەکی گاڵتەجاڕی گوزارشت لە تێکەوتنی داروینییەکان دەکات و دەڵێت: یان ئەوەتا نیوەی هاوکارەکانم زۆر گێلن یان ئەوەتا داروینیزم پڕە لەو چەمکانەی کە لەگەڵ ئاییندا دێنەوە و هەروەها ئەو چەمکانەش کە لەگەڵ بێباوەڕیدا دێنەوە.

پوختەی قسان ئەوەیە کە ئەو باوەڕەی بێباوەڕەکان و دیندارە ئوسوڵییە توندڕەوەکان هەیانە بەوەی کە پەرەسەندن لەگەڵ خوایەتیدا تێکدەگیرێت دەگەڕێتەوە بۆ هەڵەیەکی مەنهەجی بنچینەیی، چونکە ئەوان وادەزانن کە خودا و پەرەسەندنی بایۆلۆجی جێگرەوەی دژیەکن Mutually Exclusive Alternatives، واتا دانانی بە یەکێکیان رەتکردنەوەی ئەوی تریانە، لە ڕاستیدا ئەوە بە هیچ جۆرێك جێگای قەبوڵکردن نییە، مەگەر خودا و پەرەسەندن بچنە ژێر باری هەمان ئاستی تەفسیرکردنەوە، ئەمەش هەڵەیەکی ڕوون و ئاشکرایە. چونکە پەرەسەندن(میکانیزمێکی بایۆلۆجییە)، بەڵام خودا (بکەری یەکەمە و بوونێکی ڕاستەقینەی هەیە)، کە (سەرەڕای کارەکانی تر) بە کرداری دیزاین و بەدیهێنانی میکانیزمەکان هەڵدەستێت.

لەبەرئەوە دانانمان بەوەی کە خودا کرداری پەرەسەندنی ئاڕاستە کردووە تاکە چەمکە کە توانای کۆکردنەوەی میکانیزمەکە(کە بریتییە لە پەرەسەندن و زانست سەلماندوویەتی) و بکەری یەکەمین کە ئەو میکانیزمانەی بەدیهێناون.

## تەوەرەی حەوتەم

## دیزاین و پەرەسەندن
## لەنێوان خودا و بێباوەڕیدا

﴿إِنَّمَآ أَمۡرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيۡـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ۝٨٢﴾ يس: ٨٢.

واتە: (بێگومان هەر کتێك فەرمانی خوا دەرچوو، ویستی شتێك جێبەجێ بکات و بیهێنێتە دی، پێی دەڵێت ببە، ئەویش دەستبەجێ و بێ دواکەوتن پێش دێت و ئەنجام دەدرێت و دروست دەبێت.).

((لە سەرەتادا وشەکە بوو)) - سفر التكوين -

((لە سەرەتادا زانیارییەکە Bit بوو)) - بیردۆزی زانیارییەکان -

پێش نزیکەی دە ساڵ، چەمکی (دیزاینی زیرەکانە) بۆتە بیردۆزێکی زانستی کە پەیدابوونی زیندەوەران تەفسیر دەکات. بیردۆزەکە باس لەوە دەکات کە ئەو بوونەوەر و بەشە ئەندامییانەی لێیان پێکهاتوون بۆ بەدیهاتن و مانەوەیان و کارکردنیان پێویستییان بە بوونی زیرەکییەك هەیە، هەڕەمەکێتی ناتوانێت تەفسیری بکات. ئەو چەمکە درێژبۆتەوە تا هەموو زانستە جیاوازەکان لەخۆبگرێت، وەك پەیدابوونی گەردوون و زیرەکی مرۆڤ.

چەمکێکی تر بوونی هەیە کە بە دیزاینی زیرەکەوە دەبەسترێتەوە، ئەویش ((پەرەسەندنی ئاراستەکراو))ە، بە واتای ئەوە دێت کە پەرەسەندنی زیندەوەران لە خانەی سەرەتاییەوە بۆ ئەو جۆراوجۆرێتییەی لە ئێستادا لە جیهانی زیندەوەراندا بوونی هەیە بەهۆی ئاراستەکردنێکی زیرەکانە و بە تواناوە ئەنجامدراوە، هەڕەمەکێتی ناتوانێت ئەنجامی بدات.

لایەنگرانی چەمکی ((دیزاینی زیرەك)) لە ڕۆژئاوادا هەوڵدەدەن خۆیان بەسەر (دیزاینەری زیرەك)ەوە نەبەن کە خودایە؛ چونکە ئەو کارمیان خستنەڕوو و تەرحەکەیان (ئایا گەردوون و ژیان و زیندەوەران پێویستییان بە زیرەکی هەیە یاخود هەڕەمەکێتی توانای ئەوەی هەیە کە بەدییان بێنێت؟) لە تەرح و خستنەڕوونکی زانستییەوە کە دەکرێ بخرێتە ژێر وردبینی زانستی دەگوازێتەوە بۆ بواری ئایین و خوای بەدیهێنەر، کە ماددیگەراکان بە دەرچوونێکی راشکاوانەی دەزانن لە عەقڵ و زانست و چوونە ژێر چەتری شتە غەیبییەکانا.

لەو تەوەرەیەدا هەڵدەستین بە تاوتوێکردنی هەردوو چەمکی دیزاینی زیرەك و پەرەسەندنی ئاراستەکراو و، بەدرۆخستنەوەی بەڵگەکانی بێباوەڕان لە دژی هەردوو چەمکەکە و، زانینی ئاستی بەڵگەبوونیان لەسەر بوونی خودا.

ئەگەر گەشتێکت ئەنجامدا، سەرنجی هەموو ئەو شوێنانەت دا کە بۆی دەڕۆی، ئەوا تێبینی دەکەی، کە عەقڵی مرۆڤ و زیرەکییەکەی و توانای دیزاینکردنی لە پشتی زۆر شتەوە وەستاوە:

ئەو میوانخانەیەی لێیدەمێنیتەوە و هەرچی تیایدا هەیە: ژوورەکانی، چێشتخانەکانی، هۆڵەکانی، حەوزەکانی مەلەوانی...ئەو دوکانانەی بۆ کڕینی دیاری رووبان تێدەکەی و، خوودی دیارییەکان.

ڕێگا و بان و تووننێلە گەورەکان کە بە دیزاین و تەکنیکێکی وەها درووستکراون کە ئەوپەڕی سەلامەتی فەراهەم بکەن.

هەروەها، ئامرازەکانی گواستنەوە کە بەکاریان دەهێنیت؛ فڕۆکە، کەشتی، شەمەندەفەر، ئۆتۆمبێل، هەروەها ئامێرەکانی پەیوەندیکردن وەك تەلەفۆن و ئینتەرنێت.

هەموو شتێك، هەموو شتێك، هەموو شتێك.

بەڵام ئایا نیشانەکانی دیزاین تەنیا لەو شتانەدا دەبینرێن کە مرۆڤ بەدیهێناون؟

ئایا نیشانەکانی دیزاین لە سروشتی دەوروبەرتدا بەدیناکەی؟

لەوانەیە نیشانەکانی دیزاین لە شاخێکی زەبەلاحدا یان لە شەپۆلەکانی دەریادا یاخود تەپۆڵکە لمییەکانی بیاباندا بەدینەکەی. ئەگەر بەراوردی بکەی بە گوڵێکی ڕەنگاوڕەنگی بۆنخۆش یان بە جۆگەلە ئاوێك کە بەناو باخێکدا دەڕوات. نەخێر، لە ڕاستیدا ئەمیان و ئەویان نیشانەی دیزاین و زیرەکییان هەڵگرتووە، ئەگەر بە قووڵی لێیان بڕوانین و بیریان لێبکەینەوە و لەو یاسایانە تێبگەین کە لێیان پێکهاتوون.

بەڵام، بۆچی حوکممان دا بە بوونی دیزاین لەو دروستکراوانەی مرۆڤ درووستی کردوون و بەسەر دیاردەکانی سروشتدا؟ ئەوانەی گرنگی بە چەمکی (دیزاین Design) دەدەن، هەستاون بە گەڕان بەدوای نیشانەکانی دیزاین لە هەموو شتێکی دەوروبەرمان. بۆئەوەی چەمکەکە تەنیا لە ئارەزووکردن و هەستەوە بگۆڕدرێت بۆ چەمکێکی زانستی، کە شیاوی لێکۆڵینەوە بێت. بەمەش ژمارەیەك خاسییەتیان دەرهێناوە، کە ئەگەر لە بوونێکدا بوونیان هەبوو ئەوا پێویستە بڵێین، کە نیشانەی دیزاینی بە مەبەستی تێدا هەیە.

## نیشانەکانی دیزاین لە جیهانی زیندەوەراندا :

ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز سەرنجمان بۆ ئەوە رادەکێشن کە جیهانی زیندەوەران پڕە لە سەیروسەمەرەی بێ سنوور[1]. کتێبەکانی فەیلەسوفە مسوڵمانەکان پڕن لە بیرکردنەوە و تێفکرین لەو سەیروسەمەرانەی لە جیهاندا بوونیان هەیە، وەك کتێبی (الحیوان)ی (الجاحظ) و نووسینەکانی ئیبن خەلدوون و ئیبن مسکویە. پێش ئەوانیش فەیلەسوفەکانی یۆنان بەتایبەتی ئەفلاتون و ئەرستۆ دەرکیان بە هەمان واتا کردبوو. هەرچەند زانست زیاتر پێشبکەوێت دەرککردنمان بەو شتە سەرسوڕهێنەرانە زیاتر دەبێت کە سنوورێکیان نییە.

تەنانەت پێشەوای بێباوەڕە نوێیەکانیش ریچارد دۆوکنز نکۆڵی لە بوونی نیشانەکانی دیزاین ناکات لە جیهانی زیندەوەراندا، ئەوەتا زانستی بایۆلۆجیا بەوە پێناسە دەکات کە((بریتییە لە لێکۆڵینەوە لە شتە زیندووە ئاڵۆزەکان، کە هەستێکی وامان پێدەدات کە بۆ ئامانجێك دیزاین کراوە))[2]، هەروەها لە یەکێك لە وتارەکانیدا دەڵێت: ((لە ڕاستیدا زیندەوەران بە ئەندازەیەکی زۆر وا دەردەکەون

---

(١) ﴿ سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ ﴾ فصلت: ٥٣، واتە: بەڵگەکانی خۆمانیان لە ئاسۆکان و دەروونیاندا نیشان دەدەین، تا بۆیان ئاشکرا دەبێت کە خودا و ڕێبازەکەی حەقە.

﴿ وَإِنَّ لَكُمْ فِي الْأَنْعَامِ لَعِبْرَةً ۖ نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهِ مِن بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَّبَنًا خَالِصًا سَائِغًا لِّلشَّارِبِينَ ﴿٦٦﴾ ﴾ النحل: ٦٦، واتە: بەڕاستی لە حەیواناتدا پەند و چاوڕووناکی هەیە بۆ ئێوە. ئەوەتا ئێمە لەوەی کە لە سکی ئەو جینسە دەرئەچێ لە مابەینی پیسی و خوێندا شیرێکی سافی گەواراتان دەرخوارد ئەدەین بۆ ئەوانەی شیر ئەخۆنەوە.

﴿ أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى الْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ ﴿١٧﴾ ﴾ الغاشیە: ١٧ واتە: ئەوە بۆ سەیری وشتر ناکەن کە چۆن خولقێنراوە؟

(٢) لە کتێبەکەی Blind Watchmaker. London 1986 p.1.

کە دیزاین کراون))[1]. سەرنجی ئەوە بدە کە دۆوکنز و بێباوەڕەکانی تر جەخت لەسەر وشەی (وا دەردەکەوێت)دەکەنەوە Strong Inpressing of Design. بە هەمان شێوە سێر فرانسیس کریك بەوە بەلاڕێماندا دەبات کە هەستکردن بە دیزاین حەقیقەت ئاوەژوو دەکاتەوە! دەڵێت: لەسەر زانایانی بایۆلۆجی پێویستە هەمیشە ئەوە بیری خۆیان بخەنەوە کە ئەوەی دەیبینن دیزاین نەکراوە، بەڵکو بەرهەمی پەرەسەندنی داروینییە!.

سبحان الله!! ئەگەر شتێك شێوەی وەك مراوی وابێت، وەك مراوی بڕوات، دەنگێکی وەك مراوی دەربکات، ئیتر بۆچی نەڵێین کە ئەوە مراوییە؟! بۆچی ماددیگەراکان پێداگری لەسەر ئەوە دەکەن کە ئەوە تەنیا لە مراوی دەچێت؟ بۆچی پێداگری لەسەر ئەوە دەکەن کە میکانیزمی پەرەسەندنی داروینی هەڕەمەکی و کوێرانەی خاڵی لە هەموو زیرەکییەك توانای بەدیهێنانی ئەو ئاڵۆزییە سەرسوڕهێنەرەی هەیە کە لە جیهانی زیندەوەراندا بەدی دەکەین؟!.

**بوونەوەران (وا دەردەکەون کە دیزاین کراون) چونکە (لە ڕاستیدا دیزاین کراون).**

گومان لەوەدا نییە کە نکۆڵیکردن لە دەرککردنی بەدیهی بەوەی کە مراوی مراوییە پاشخانێکی ئایدۆلۆجی بێباوەڕی هەیە. ئەوەش لە قسەی بێباوەڕ دانییل دینیت[2] بە ڕوونی دیارە کاتێك دەڵێت: ((داروین جیهانێکی پڕ لە گومانی بۆ بەجێهێشتووین، میکانیزمێکی بۆ بەدیهێنانی دیزاین لە پشێوییەوە بۆ خستووینەتەڕوو بێ ئەوەی پێویستی بە عەقڵێك هەبێت)). دینیت بیرۆکەکەی داروین وەك ترشە سووتێنەرەکان هەژمار دەکات کە هەموو بیرۆکەکانی پێش خۆی سووتاندووە، چونکە لە بری ئەوەی بڵێت ماددەی گەردوون و هەموو ئەو شتانەی تێیدا هەیە بەرهەمی عەقڵێکی دانایە، دەڵێت عەقڵ بەرهەمی ماددەی گەردوونە! لەڕێی کردارێك کە عەقڵی نییە، ئاڕاستەکراو نییە و هیچ ئامانجێکی نییە!.

---

(١) وتارەکە Royal Institution Christmas Lectures.1991.

(٢) Darwins Dangerous Idea نووسینی Daniel Dennit.

ئەگەرچی بەڵگەی دیزاین پێش زیاتر لە دوو هەزار ساڵ خراوەتەڕوو[1]، بەپێی ژیارستانییەتەکان و سەردەمەکان چەندەها شێوازی وەرگرتووە، ئەوا ئێمە لەم تەوەرەیەدا باس لەوە دەکەین کە چۆن زانستی نوێ لەڕێی (بیردۆزی زانیارییەکان) بەڵگە کۆتاییەکانی خستۆتەڕوو کە ناتوانرێ پووچەڵ بکرێنەوە، ئەویش پێویستی بوونەوەرە بە دیزاینەرێکی زیرەك.

---

(١) فەیلەسوف و سیاسەتمەداری رۆمانی سیسیرۆ Cicero (١٠٦-٤٣ پ.ز) رێکخراوی جوولەی ئەستێرە و هەسارەکانی بە ئامێرێك چواندووە کە بە وردی و زیرەکانە دیزاین کراوە و، لەمەشەوە ئەوەی هەڵێنجاوە کە ئاسمانەکان و هەموو ئەو رێکخراوییەی تێیاندا هەیە پێویستییان بە دیزاینەرێکی ئاسمانی ورد و زیرەکانە هەیە.

## بیردۆزی زانیارییەکان

## Information Theory

لە ژیانی ڕۆژانەماندا وا ڕاهاتووین کە هەر کەسێکی پڕ زانیاری و خاوەن زانیاری قووڵ ببینین بە زیرەك وەسفی دەکەین، پسپۆڕان دەڵێن کە زانیارییەکان(چەندێتی و قووڵی و چۆنیەتی ڕەفتارکردن لە گەڵیدا) بەڵگەیە لەسەر زیرەکی، لەرێیەوە بۆ پێوانەکردنی زیرەکی چەند تاقیکردنەوەیەکیان داڕشتووە.

ئەو بەڵگانەی پەیدابوونی ژیان پێشکەشی دەکات(کە لە تەوەرەی پێنجەمدا باسمان کرد) بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئەوە دەسەلمێنن کە زیرەکی و دیزاین و مەبەست لە بەدیهاتنیان بوونی هەیە. پاشان شۆڕشی زانیاری، کە ئەوەیان دەرخست ئەو زانیارییانەی لە دیاردەی ژیاندا بوونیان هەیە بەشێوەیەکی (ڕاستەوخۆ) ئەوە دەسەلمێنن کە زیرەکی و مەبەست و دیزاینیان تێدا هەیە و، ئەوەش بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ ئاماژەن بۆ خودای بەدیهێنەر[1].

---

(١) ئەو تەوەرەیە، کە تیایدا باس لە پرسی چارەسەرکردنی (چەمکی زانیارییەکان) دەکەین، بەهێزترین (و لەوانەیە قورسترین) تەوەرەکانی کتێبەکە بێت، چونکە بەڵگەکانی نوێترین و بەهێزترین و یەکلاکەرەوەترین ئەو بەڵگانەن کە زانست پێشکەشی کردوون لە بواری بەڵگەهێنانەوە لەسەر خوایەتی.

## زانیارییەکان بنچینەن :

پۆل دیڤیز لە کتێبەکەیدا New Scientist دا دەڵێت: ئێمە وا راهاتووین کە بە جۆرێك سەیری جیهان بکەین کە لە تەنۆلکەی مادده پێکهاتووە، زانیارییەکان دیاردەیەکی لاوەکین و سەر بەو تەنۆلکە و بەشانەن. بەڵام بەم دواییانە بۆچوونەکە گۆڕاوە، چونکە بە جۆرێك سەیری بوون دەکەین کە زانیارییە و مادده هاتووە بەرجەستەی بکات، لەبەرئەوە دوای ئەوەی وەك دیاردەیەکی فیزیایی سەیری گەردوونمان دەکرد و وەك دیاردەیەکی کیمیایی سەیری ژیانمان دەکرد، لە ئێستادا وەك دوو دیاردەی زانیاری سەیریان دەکەین. فیزیاناسی بەریتانی جۆن ویلەر[1] یەکەمین کەس بوو کە لەساڵی ١٩٨٩ز دا ئەو چەمکەی خستەڕوو، کاتێك گوتی: سبەی ئەوە فێردەبین کە چۆن بە زمانی زانیارییەکان لە فیزیا تێدەگەین.

لە ڕاستیدا ئەم چەمکە شتێکی نوێ نییە، چونکە قورئانی پیرۆز پێمان دەڵێت کە خودا هەموو شتێك بە (وشەی) (کُن-ببە) بەدیدێنێت، هەروەها تەورات پێمان دەڵێت کە بنچینە (وشەکە)بوو.

لە ڕاستیدا وشەکە کۆدی واتایە، پەیوەندییە، فەرمانە، زانیارییەکە کە توانای بەدیهێنانی هەیە. وشە بنچینەکەیە، چونکە ئەگەر مادده / وزە شوێنی بەدیهێنراو بکەوێت، ئەوا وشە شوێنی بەدیهێنەر دەکەوێت.

لەبەرئەوە ئێمە باوەڕمان بەوە هەیە کە بوون لە بنەڕەتدا بوونێکی زانیاریانە بووە لە زانستی خودادا، پاشان بە وشەی (کُن-ببە) لە بوونی ماددی

---

(١) John Archimald Wheeler: (١٩١١-٢٠٠٨ز) زانای فیزیای تیۆری، ئەمریکییە، توانی گرنگیدان بە بیردۆزی ڕێژەیی لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا ببووژێنێتەوە لە دوای جەنگی جیهانی دووەم.

بەرجەستەدا دێتەبوون[1]، بەمەش ماددە بۆتە بەرجەستەکاری بوون و وجودی زانیاری نامادی.

ئەمە واتای ئەوەیە، کە مرۆڤی بەدیهاتوو لە گەردووندا (نوێیە)، بەڵام لە هەمان کاتدا لە زانستی خودای تەدیمدا (ئەزەلییە). حاشا کە زانستێك لە زانستی خودا نوێتر بێت و بەسەریدا زاڵبێت.

## زانیارییەکان چین و چۆن پێوانەیان بکەین:

لە بەکارهێنانی ڕۆژانەماندا وا ڕاهاتووین بڵێین: زانیاریمان بۆهات، زانیاریمان وەرگرت، زانیاریم پێدا. لەبەرئەوە وشەی زانیارییەکان وەسفی شتگەلێك دەکەن کە پێشتر نەماندەزانین و ئێستا دەیانزانین، بەمەش زانیارییەکان بەوە وەسف دەکرێن کە لە ئاست(پلەی) دڵنیانەبوونمان کەمدەکەنەوە.

لەوانەیە قورسترین کێشە کە لەکاتی مامەڵەکردن لەگەڵ زانیارییەکاندا ڕووبەڕوومان دەبێتەوە بریتی بێت لە چۆنیەتی دابەشکردن و پێوانەکردنی، بیردۆزی زانیارییەکان گرنگی بەوە داوە، تا ئەو ئاستەی کە گەورەترین دەستکەوتەکانی بریتی بوو لە دانانی میکانیزمی چەندایەتی(واتە ئەندازە)ی زانیارییەکان. با پێناسەی زانیارییەکان و بەشەکانی و ڕێگەی پێوانەکردنی بە دوو نموونە ڕوون بکەینەوە:

ئەگەر چووینە میوانخانەیەکی بچووك کە لە هەشت ژوور پێکهاتبوو، پێشتر ژوورمان نەگرتبوو، ئەوا ئەگەری ئەوەی کە لە ژوورێکی دیاریکراودا نیشتەجێ ببین بریتییە لە١/٨، ئەو ئەگەرەش پێوانەیەکی ڕاستەوخۆیە بۆ دڵنیانەبوونمان.

---

(١) دەکرێ ئەوە بە شێوەی ئەو باڵەخانەیە بچوێنێ کە لە مێشکی ئەندازیارێکدا بوونی هەیە، ئەوە بوونێکی زانیاریانەیە. پاشان ئەندازیارەکە باڵەخانەکە بە چەند ئاستێکدا دێنێتە بوون، کە بە وێنەی ئەندازەیی(سکێتچ). پاشان بە نموونە (ماکێت) پاشان لەسەر ڕووی زەمینی واقیعدا جێبەجێ دەکرێت.

بەڵام ئەگەر پێشتر پێیان ڕاگەیاندین کە لە ژووری ژمارە(٥) دەمێنینەوە، ئەوا ئەو زانیارییە گومانمان ناهێڵێت.

هەروەها دەکرێ ئەندازەی زانیارییە پێویستەکان بۆ نەهێشتنی گومان بە شتێکی تریش دیاری بکرێت، لە ڕێگەی ژمارەی پرسیارە ڕاستەوخۆکان(کە بە یەکێك لە وەڵامەکانی بەڵێ یان نەخێر) وەڵامیان دەدرێتەوە و، پێویستە بۆ زانینی ئەو بابەتە ئەو پرسیارانە بخرێنەڕوو. لە نموونەکەماندا دەبینین کە (ژمارەی ژوورەکە) لە ڕێی هەشت پرسیارەوە(بە ئەندازەی ژمارەی ژوورەکانی میوانخانە بچوکەکە) دڵنیا دەکرێتەوە، کە تەنیا بە (بەڵێ و نەخێر)یش وەڵام دەدرێنەوە، بە زمانی زانایانی بیرکاری دەڵێین:

بۆئەوەی ئەگەری ئەوەی کە لە کام ژوور لە (هەشت ژوورەکە) دەمێنینەوە دیاری بکەین، ئەوا بە بوونی دوو ئەگەر بۆ هەر ژوورێك(بەڵێ یان نەخێر) ئەوا ٨=٢٣ بەوپێیەی کە هەردووکیان(بەڵێ و نەخێر) بنچینەکەن Base و، ٣ بریتیە لە هێزی بنچینەیی Power، بۆئەوەی ژمارە (٨)مان دەستبکەوێت. بەهۆی چەند هۆکارێکی بیرکارییانەی ئاڵۆز، دەڵێین کە هێزی بنچینەیی(٣) بریتییە لە زانیارییە پێویستەکان و، بەوە وەسفی دەکەین کە ٣ بتە(Bit کورتکراوەی Binary digits= ژمارەی دووانی). بە شێوازێکی بیرکارییانەی تر دەڵێین: ((٣)) بریتییە لە لۆگاریتم Logarithm (ژمارەی چەندجارەی لێکدراو) بۆ دەستکەوتنی (٨) ئەگەر بنچینەی(٢) بێت. بەم شێوەیە دەنووسرێت $Log_2 8 = 3$ و، بەم شێوەیە دەخوێندرێتەوە (٣) لۆگاریتمی ژمارە (٨) بۆ بنچینەی (٢).

با ئەو چەمکە لەسەر نموونەیەکی تر جێبەجێ بکەین:

ئەگەر نامەیەك بۆ مۆبایلەکەمان بێت، بە زمانی ئینگلیزی نووسرابێت و ٢٦ پیت + سپەیس = ٢٧ ڕەمز، ئەوا ئەگەری ئەوەی کە هەریەکێك لەو ڕەمزانەمان بۆ دەربچێت (با پیتی A بێت وەك نموونە) بریتییە لە ٢٧/١ و، لەبەردەم هەر دوو پیتی بەدوای یەکداهاتوودا دوو ئەگەر هەیە(کە بەشێکە لە نامەکە یاخود نا)، بەمەش ئەو زانیارییانەی هەر پیتێك زیادیدەکات = $Log_2 27$ واتا لۆگاریتمی

ژمارە (٢٧) بۆ بنچینەی (٢) و یەکسانە بە نزیکەی ٤،٧٦. بەمەش نامەیەك بە درێژی m لە ڕەمز زانیاریمان بۆ دەگوازێتەوە بە ئەندازەی $mLog_2 27$، ئەگەر بێتو نامەکە سەرەڕای پیتە ئەبجەدییەکان ژمارەشی تێدابێت، ئەوکاتە ٣٧ ڕەمزمان دەبێت(٢٧پیت + ٩ ژمارە + سفر)، ئەوکات ئەو زانیارییانەی پەیامەکە بۆمان دەگوازێتەوە $mLog_2 37$ دەبێت.

لەو دوو نموونەیەدا ژمارە (٢) ڕۆڵێکی سەرەکی دەگێڕێت (بەڵێ یان نەخێر).

لە زمانی کۆمپیوتەریشدا بۆ ئاماژەکردن بۆ هەر پیتێکی زمانەوانی دوو ڕەمزی (١،٠) بەکاردێنین، لەبەرئەوە پێنج ڕەمز لەو ڕەمزانە بەسن بۆ گوزارشتکردن لە ٢٧ڕەمز کە زمانی ئینگلیزی لەخۆیگرتوون. بەمەش بۆ نموونە:

(سپەیس=00000، A=00001،B=00010،C= 00011)...

## جۆری زانیارییەکان:

**زانیاری ڕەمزی [1] Semantic، و زانیاری پێکهاتەیی [2] Synthetic**

وادابنێ کە ئەو پەیامە کە درێژییەکەی ١٦ پیتە بۆ مۆبایلەکەت هات:

ZXXTRQ NJOPW TRP، ناوەڕۆکی زانیاری ئەو نامەیە بریتییە لە $Log_2 27$ ١٦بت Bits.

لەوانەیە بڵێی، بەڵام من هیچ لە زانیارییەکانی نامەکە تێنەگەیشتم، منیش بەوە وەڵامت دەدەمەوە کە: لەوانەیە ڕەمز و کۆدکرابێت، ئەوەش مەبەستەکەیە. هەموو نامەیەك واتای هەیە هەتا ئەگەر لەڕێی کۆدیشەوە بێت چونکە زانیاری

---

(١) Semantic: لە وشەیەکی یۆنانی داتاشراوە و، بە واتای (ڕەمزێکە بۆ واتایەك) دێت.

(٢) Synthesis: لە یۆنانیدا بە واتای بنچینە یان پێکهاتە دێت. لێرەشدا بەواتای ئەوە دێت (کە بنچینە یان پێکهاتەیەکە کە ڕەمزێك نییە بۆ واتایەك).

ڕەمزی هەڵگرتووە کە ئاماژەن بۆ واتایەك. ئەگەر نامەکەش بەهیچ جۆرێك واتای نەبوو، ئەوا پێکهاتەیەکە کە ڕەمز و نیشانە نییە بۆ هیچ شتێك،سەرەڕای ئەوەش لە دیدی بیردۆزی زانیارییەکان هەمان ئەندازەی زانیاری هەڵگرتووە، ئەوەش جێگای سەرسوڕمانە، چونکە ئێمە زانیارییەکانمان بەوە وەسفکرد کە ئەندازەی دڵنیانەبوونمان کەمدەکاتەوە، بەڵام زانیارییە ئاوێتەکان (التركيبية) شتێکی لەو جۆرە ئەنجامنادەت).

بیر لەوە بکەوە، کە ڕۆژانە لەڕێی تەلەفۆنەوە پێتدەگات، لە یەك کاتدا دەکرێ چەند زانیارییەکی جۆراوجۆرت پێبگات، دەنگی، فاکس، زانیاری ژمارەیی تەنانەت تەشویش، کە هەندێك لەو زانیارییانە واتادارن بۆ هەندێك و بێواتان بۆ هەندێکی تر، بۆنموونە ئەوەی لە زمانی چینی تێنەگات وشە و قسە چینییەکان بۆ ئەو هیچ واتایەکیان نابێت[1].

نموونەیەکی تر: ئەگەر چووم بۆ کتێبخانە بە مەبەستی گەڕان بە دوای کتێبێك لە زانستی نەخۆشییەکانی گورچیلە Nephrology، لەوانەیە فەرمانبەری کتێبخانە گوێی لەم زانستە نەبووبێت، بەڵام کاتێك پێم گوت کە سەر بەم بەشەی پزیشکییە، ئەوا لەو کاتەدا زانیاری وەهام پێداوە کە ئەندازەکەی ١٠[2] $Log_2 27$ و، کاتێك لە پێڕستی کۆمپیوتەرەکەیدا دەگەڕێت ئەوا ڕاستەوخۆ دەگاتە ناوی کتێبەکان و شوێنەکەیان و ژمارەکەیان، لێرەدا فەرمانبەرەکە وەك میانگیری کاری کرد بۆ گواستنەوەی زانیارییەکان(پێکهاتەی بێمانا بۆ فەرمانبەرەکە) بۆ کۆمپیوتەرەکە، سەرەڕای ئەوەی کە وشەکە بۆ من واتادارە(زانیاری ڕەمزی)[3].

---

(١) ئەندازیاری پەیوەندییەکان هیچ بۆی گرنگ نییە کە چ پەیامێکت لەڕێی تەلەفۆنەوە پێدەگات، ئەو تەنیا گرنگی بە توانای هێڵەکە دەدات، واتا لە چرکەیەکدا چەند زانیاری دەگوازێتەوە و، چەند زانیاری هەڵە لەڕێی تەشویشەوە دەنێرێت!

(٢) (١٠) بریتییە لە ژمارەی پیتەکانی وشەکە و (٢٧) ژمارەی پیتە ئەبجەدییەکانەی ئینگلیزییە+سپەیس.

(٣) ئەگەری ئەوەیە کە پیتەکە لە وشەکەدا هەبێت یان نا.

٩٣) پێوەری چەندی زانیارییە پێکهاتەییەکان(کە هیچ واتایەکیان نییە) کردارێکی سادەیە کە لەلای حیساباتە بیرکارییەکان وەستاوە، هەرچی سەبارەت بە زانیارییە ڕەمزییەکانە(کە ڕەمزێکن بۆ واتایەك) ئەوا هەڵسەنگاندنیان قورسترە. چونکە واتا لەسەر پێکهاتەکە وەستاوە، بۆنموونە ئەگەر نامەیەکت بۆ

## بیـــردۆزی لۆگـــاریتمی زانیـــارییەکان[1] :
## Algorithmic Information Theory AIT

گومان لەوەدا نییە کە گەورەترین دەستکەوتی زانستی نوێ بریتییە لە گەیشتن بە بیردۆزی لۆگاریتمی زانیارییەکان، ئەو بیردۆزەی کۆمپیوتەر بەکاریدەهێنێت، هەمان ئەو سیستەمەیشە کە هەر لە کاتی درووستبوونی ژیان پێش ٣،٧ بلیۆن ساڵ بەکاریدەهێنێت! لەبەرئەوە پێویستە ئەوانەی گرنگی بە لێکۆڵینەوە لە بنچینەکانی ژیان دەدەن لە بنچینەکانی ئەو بیردۆزە تێبگەن.

بۆ شیکردنەوەی بیردۆزەکە، ئەو یاسا گشتییە دەخەینەڕوو کە بەرێوەی دەبات: شوێنکەوتەی دووانەیی(٠،١) لەسەر شێوەی سیانەی دووبارەبووەوە بێنە بەرچاوی خۆت، کە ٦ بلیۆن رەمزی دابەشکراو بەسەر ٢ بلیۆن سیانەیی لەخۆدەگرێت.....٠٠١٠٠١٠٠١.

ئەو شوێنکەوتەیە ٦بلیۆن بت زانیاری هەڵگرتووە.

لەڕاستیدا ئەو کردارە دووبارەبووەوەیە کە زانایانی بیرکاری پێی دەڵێن (لۆگاریتم Algorithm) و کاری کۆمپیوتەریش پشتی پێدەبەستێت، بەهۆیەوە

---

هات تێیدا نووسرابوو (بەڵێ)، ئەوا زۆر زانیاری زیاتر پێویستە بۆ تێگەیشتن لە پەیامەکە، ئایا (بەڵێ) وەڵامە بۆ پرسیارێك: ئایا هاوسەرگیریم لەگەڵدا دەکەیت؟ ئایا رازیت خانووەکەت بفرۆشیت؟ ئایا هێشتا لێم تووڕەیت؟....

(١) وشەی لۆگاریتم Algorithm لە ناوی زانای بیرکاری محمدی کوڕی موسای خوارزمی داتاشراوە، کە لە خانەی حیکمەتی بەناوبانگدا لە بەغدا کاریدەکرد لە سەدەی نۆیەمی زاینی.

دوو زانا Chaitan (ئەرژەنتینی ئەمریکی) و Kolmogorov (رووسی) بیردۆزەکەیان داناوە، بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو ئاڵۆزییەی زانیاری خاوەن شوێنکەوتەی تایبەتی جیادەکاتەوە (وەك I Love You).

دەتوانی لەرێی هەوڵێکی سادەوە وا لە کۆمپیوتەر بکەی کە ئەو کارە زۆر ئاڵۆزە ئەنجام بدات، بەوەی تەنیا زانیاری پێبدەی:

.For n=1-2billion. Write 001.Stop

گریمان n= ١-٢ بلیۆن، بنووسە ٠٠١، بوەستە.

نووسینی ئەوە پێویستی بە ٣٩ لێدان هەیە لەسەر تەختەکلیلی کۆمپیوتەر، لەوکاتەدا کۆمپیوتەر ٦بلیۆن رەمز بەکاردێنێت. چ کردارێکی ئاڵۆزە (لە هەمان کاتدا سادەیە)!

بە پشتبەستن بەو یاسایە، سێ نموونە دەخەینەڕوو کە یارمەتیمان دەدات بۆ تێگەیشتن لە ڕۆڵی بیردۆزەکە لە دیاردەی ژیان.

**نموونەی یەکەم:** وێنای شوێنکەوتەیەکی ٣ وشەیی بکە کە ٢ بلیۆن جار دووبارە ببێتەوە IloveyouIloveyouIloveyou.، ئەگەر شوێنکەوتەی پێشوو (٠٠١٠٠١) زانیاری پێکهاتەیی بێ واتای هەڵگرتبێت، ئەوا ئەم نموونەیە زانیاری رەمزی هەڵگرتووە(واتادار). واتاکەش لە سێ وشەکەی سەرەتا دایە پاشان دووبارە دەبێتەوە و، دەکرێ فەرمانەکەی بدەینێ:

.For n=1-2 billion. Write ILoveyou. Stop

هیچ پێویست بەوە ناکات کە خۆمان بە نووسینی ١٦بلیۆن رەمز ماندوو بکەین (٢بلیۆن×٨پیت).

لەڕاستیدا کورتکردنەوەی ئەو ژمارە زۆرەی رەمزەکان بۆ رەمزی کەم(نزیکەی ٤٠ رەمز) بە بەکارهێنانی بەرنامەکانی کۆمپیوتەر لەپشت بیردۆزی لۆگاریتمی زانیارییەکانەوە وەستاوە.

دەکرێ پێناسەی لۆگاریتم بکەین بەوەی کە (رێگایەکە) بۆ جێبەجێکردنی شتێك لەرێی چەند هەنگاوێکی دیاریکراوەوە[1]، لەبەرئەوە بەرنامەکانی

---

(١) A way of Getting something donr in a finite number of steps.

کۆمپیوتەر Software بریتین لەو لۆگاریتمانەی یاریدەی کۆمپیوتەر دەدەن Hardware کە بتوانێت زانیارییەکان چارەسەر بکات.

بەپێی بیردۆزی لۆگاریتمی زانیارییەکان AIT، ئەگەر شوێنکەوتەیەکی دووبارەبووەوەی لە ڕەمز پێکهاتوو وەربگرین بۆنموونە ILoveyou (کە واتادار)ە یاخود شوێنکەوتەیەکی بێ واتا وەك #~^٨×@ئەوا کۆمپیوتەرەکە بە ئاسانی کارەکە ئەنجامدەدات، هەرچەند جارەکانی دووبارەبوونەوەی ئەو شوێنکەوتەیەش زۆر بێت (هەتا ٦ بلیۆن ڕەمزیش-بۆ نموونە- هەروەك لە خانەکانی لاشەی مرۆڤدا هەیە).

**نموونەی دووەم:** ئەگەر شوێنکەوتەیەکی تر وەربگرین، کە گوزارشت بێت لە ٦ بلیۆن ڕەمز هەروەك نموونەکەی پێشوو، بەڵام لە بەرەنجامی لێدانەکانی مەیموون بۆ تەختەکلیلی کۆمپیوتەر پەیدابووە (شوێنکەوتەی هەڕەمەکی بێ دووبارەبوونەوە)، ئەوا دەبینین کە ناتوانرێ بەرنامەیەکی کورتی بۆ بنووسرێت(لۆگاریتمی) بۆ جێبەجێکردنی ئەو شوێنکەوتەیەی زانیارییەکان، هەر بەرنامەیەکیش بۆ ئەوە دەبێت بە درێژی هەر ٦ بلیۆن ڕەمزەکە بێت. ئەو شوێنکەوتەیەش بەوە وەسف دەکەین کە ناکرێ بە شێوەیەکی لۆگاریتمی پەستانی بخرێتە سەر، لەبەرئەوە بەوە شێوەیەکی لۆگاریتمی توانای پەستانی نییە (Algorithmic Incompressibility) ڕێگایەکی نایابە بۆ پێناسەکردنی هەڕەمەکێتی و، ئەو شوێنکەوتەیە کە مەیموونەکە دایناوە ئەوپەڕی ئاڵۆزی هەیە- Maximally - Complex بە گەڕانەوە بۆ پێوەرەکانی ئەو ئاڵۆزییە[1].

نموونەی سێیەی (دوای دوو نموونەکەی (I Love you) و لێدانەکانی کۆمپیوتەر و لێدانەکانی مەیموونەکە): کتێبێکی ئەدەبی ئینگلیزی بێنە بەرچاوی خۆت، کە بە هەمان شێوە شەش بلیۆن ڕەمزی لەخۆگرتووە، ئێمە ناتوانین ئەندازەیەکی بەرچاوی پەستانی لۆگاریتمیمان دەستبکەوێت، گومانیش لەوەدا نییە کە هەر بەرنامەیەکیش بۆ جێبەجێکردنی ئەوە زۆر ئاڵۆز دەبێت

---

(١) هەر لەم تەوەرەیەدا پاش کەمێکی تر دەیخەینەڕوو.

وەك نموونەی مەیموونەکە، بەڵام لەوەدا جیاوازە کە نموونەی مەیموونەکە زانیاری پێکهاتەیی (بێ واتا)ی هەڵگرتبوو، بەڵام شوێنکەوتەیی کتێبەکە زانیارییەکانی رەمزین(واتادارن)، توانای تێگەیشتنمان لێیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئێمە فێری زمانی ئینگلیزی بووین، لەبەرئەوە دەڵێین کە ئەو شوێنکەوتەیە ئاڵۆزییەکی سەربەخۆی هەیە Specified Complexity، هەرچی شوێنکەوتەی ILoveyou وە ئەوا زانیاری رەمزی(واتادار)ی هەڵگرتووە کە زۆر شیاوە بۆ پەستانی لۆگاریتمی.

لەبەرئەوە دەتوانین شوێنکەوتە نەپەستراوەکان لە رێگای لۆگاریتم (وەك نموونەکانی مەیموونەکە و کتێبەکە) بەوە وەسف بکەین کە ناکرێ بە شێوەیەکی خۆکرد لە کرداری لۆگاریتمی لەخۆی سادەتر پەیدابببێت هەروەك نموونەی (ILoveyou).

بۆ زیاتر تێگەیشتن لە جیاوازی نێوان لێدانەکانی کۆمپیوتەر و نموونەکەی ئەدەبی ئینگلیزی، دەڵێین: ئەگەر چەند دڵۆپێك مەرەکەب بکەونە سەر پەڕەیەکی سپی ئەوا پەڵەی وەها درووستدەکەن کە مەحاڵە یەکێکیان لەوی تریان بچێت، کەواتە هەر پەڵەیەك بە شێوازێکی تایبەت بە خۆی جیادەکرێتەوە (Specified) و لەگەڵ ئەوەشدا دەکرێ وەك نموونەی مەیموونەکە بدرێتە پاڵ رێکەوتەوە، بەڵام ئەگەر کەسێك بابەتێك بە قەڵەم جاف لەسەر پەڕەیەك بنووسێت، ئەوا ئەوەیان بە ((ئاڵۆزییەکی سەربەخۆیە کە زیرەکی لەپشتەوەیە))و، لەبەر گرنگی ئەو چەمکە زیاتر شیدەکەینەوە:

## ئاڵۆزی سەربەخۆ[1] Specified Complexity :

ئەوەی باسمان کرد چ پەیوەندییەکی هەیە بە بیردۆزی لۆگاریتمی زانیارییەکان و نموونەکانی خۆشەویستی و مەیموونەکە و کتێبە ئەدەبییەکە و بوونی دیزاین و زیرەکی لە گەردوون و ژیاندا؟

کاتێك زیرەکی شتێك دادەهێنێت کە نیشانەکانی (دیزاین Design)ی تێدا دەربکەوێت، کە پسپۆڕان بەوە وەسفی دەکەن کە جێپەنجە یاخود ئیمزای دیزاینە بەسەر ئەو شتە یاخود ئەو کارەوە.

لەو جێپەنجانە ئەوەیە کە بە(ئاڵۆزی سەربەخۆ Specified Complexity) ناسراوە و بە هەردوو پیتی SC ئاماژەی بۆ دەکرێت. فیلمی بەناوبانگی (پەیوەندی Contact)[2] سەرکەوتوو بووە لە نزیکخستنەوەی ئەو چەمکە لە مێشکماندا، فیلمەکە باس لە هەوڵەکانی ژنەزانای بۆشاییەکانی ئاسمان (ئیلی ئاروای Ellie Arroway) دەکات بۆ دۆزینەوەی ژیانێکی زیرەکانە لە دەرەوەی زەوی[3].

---

(١) زانای بیرکاری William Dembski ئەو چەمکەی خستۆتەڕوو، کە یەکێکە لە کۆڵەگەکانی بزووتنەوەی دیزاینی زیرەك.

(٢) لە دەرهێنانی دەرهێنەری جیهانی Robert Zemeckis و چیرۆکەکە نووسینی زانای بۆشاییەکانی ئاسمان کارل ساگانە، فیلمەکە لە ساڵی ١٩٩٧ز بەرهەمهێنراوە.

(٣) چیرۆکەکە پێمان دەڵێت کە نیلی لە دامەزراوەیەکی راستەقینەدا کار دەکات کە گرنگی بە گەڕان بەدوای زیرەکیدا دەدات لە دەرەوەی زەوی The Search For Extraterrestrial Intelligence بە ناوی (بەرنامەی سێتی SETI Program) و ئاژانسی ئەمریکی بۆ بۆشاییەکانی ئاسمان NASA ملیۆنان دۆلاری تێدا خەرجکرد تەنیا بۆ ئەوەی یەك پەیامی لە ئاسمانەوە پێبگات کە نیشانە بێت بۆ زیرەکی.

لەنێوان هەزاران لەو ئاماژانەی ئیلی لە ئاسمانەوە وەریگرتن ئاماژەیەك بوونی هەبوو کە وەك ئاماژە لە بوونەوەری زیرەك هەژماری کرد؛ چونکە جێبەنجەی دیزاینی پێوەدیاربوو؛ (ئاڵۆزی سەربەخۆ)ی هەبوو.

ئاماژەکان گوزارشتبوون لە دووبارەبوونەوەی ژمارە سەرەتاییەکان[1] کە کەوتۆتە نێوان (٢) و (١٠١). ئاماژەکە لەسەر شێوەی: ١١- ١١١- ١١١١١-.. و بەم شێوەیە.

**ئیلی و هاوکارە لێکۆڵەرەکانی ئەو ئاماژانە بەوە هەژماردەکەن کە بە ڕێکەوت دەرناچن، ئەمەش بەهۆی دوو هۆکار:**

١- لەڕاستیدا ئەو ژمارانە هیچ نین جگە لە دووبارەبوونەوەیەکی بیرکاریانەی ڕاستەوخۆ، چونکە وەك (١٠،٨،٦،....) نییە، کە دووبارەبوونەوەی ژمارە (٢) ن، هەروەها وەك (١٦،٨،٤،٢،....)یش نییە کە لێکدانی ژمارە(٢)ن. لە ڕاستیدا ژمارە سەرەتاییەکان لەڕووی بیرکارییەوەپشت بە یەکتر نابەستن Indpendent؛ ((سەربەخۆن Specified)).

٢- ئاماژەکە ((دووبارەی)) شوێنکەوتەیەکی((درێژ)) بوو لەو ژمارانەی کە ناکرێ جارێکی تر بە ڕێکەوت ڕوویداتەوە، بۆنموونە بەتەنها دووبارەی ٢،٣،٥ نییە، لەبەرئەوە ئەوە دووبارەبوونەوەیەکی((ئاڵۆزە Complex)) و، مەبەست لە ئاڵۆز لێرەدا بریتییە لەوەی کە ئەگەری ڕوودانی نییە لەرێی ڕێکەوتەوە Improbable.

لەڕاستیدا کۆبوونەوەی(سەربەخۆ) لەگەڵ (ئاڵۆز) بریتییە لە (ئاڵۆزی سەربەخۆ) SC، ئەمەش یەکێکە لە جێبەنجەکانی (دیزاین Design)، کە لەرێی (زیرەکی Intelligence) نەبێت بوونی نییە[2].

---

(١) ژمارە خۆبەخشەکان Prime Numbers ئەو ژمارانەن کە بەسەر خۆیاندا نەبێت دابەش نابن، یاخود تەنیا بەسەر (١) دا، وەك ٢،٣،٥،١١،.......١٠١،٩٧،....

(٢) بە نموونە بابەتەکان ڕوون دەبنەوە.
سەرنجی ئەو سێ کۆمەڵە بیتە بکە:

•THE THE THE THE THE THE THE THE THE THE THE THE THE

•XGOENAODIWGTNHPLXCVWQIZIDLRETPTRMNSTEJKI

ئەو واتایە لەشێوەی هاوکێشمیەکدا دەخەینەڕوو:

ئەو ژمارانەی پشت بە یەکتر نابەستن (سەربەخۆ)+ ئەو ژمارانەی ئەگەری ڕوودانیان نییە لەڕێی ڕێکەوتەوە (ئاڵۆز) = ئاڵۆزی سەربەخۆ = دیزاین = زیرەکی.

Independent + Improbable = Specified Complexity = Design = Intelligence

ئیلی و هاوکارەکانی لە ناوەندی توێژینەوەکان SETI دووبارەبوونەوەیەکی کورت (نائاڵۆز)یان بۆ هاتووە لە ژمارە سەرەتاییەکانەوە (٢،٣،٥) وەك نموونە. ئایا ئیلی دەتوانێت بانگەشەی ئەوە بکات کە ئەو ئاماژانە لە زیرەکییەکی دەرەوەی زەوییەوە دەردەچن؟

بەدڵنیاییەوە نەخێر، چونکە ئەو ئاماژانە ئاڵۆزنین بە ئەندازەی ئەوەی ڕێگری لەوە بکەن کە بە ڕێکەوت دووبارە ببنەوە. ئەمەش لە ڕاستیدا ڕوویداوە، کە

---

•THIS SENTENCE CONTAINS VALUABLE INFORMAATION

پیتەکانی کۆمەڵەی یەکەم: هاوشێوەی نموونەکەی ILoveyou ی پێشووە:
١- شێوەیەکی سەربەخۆی هەیە Specified pattern بەوپێیەی کە پەیوەندییەکی بیرکاریانە لەنێوان E، H، T دا بوونی نییە.
٢- ئاڵۆز نین Not comlex، بەوپێیەی ناکرێ لەڕێی ڕێکەوتەوە دووبارە ببنەوە.
٣- واتایەکی سادەیان هەڵگرتووە.

پیتەکانی کۆمەڵەی دووەم: هاوشێوەی لێدانەکانی مەیموونە لە تەختەکلیلی کۆمپیوتەر،
١- سەربەخۆن: لەنێوان پیتەکاندا هیچ پەیوەندییەکی بیرکاریانە بوونی نییە.
٢- ئاڵۆزن: پێشبینی ناکرێت کە لەڕێی ڕێکەوتەوە دووبارە ببنەوە.
٣- هیچ واتایەکیان نییە.

پیتەکانی کۆمەڵەی سێیەم: هاوشێوەی نموونەکەی ئەدەبی ئینگلیزییە:
١- سەربەخۆن.
٢- ئاڵۆزن: کەواتە بەوە جیادەکرێنەوە کە ئاڵۆزییەکی سەربەخۆیان هەیە، کەواتە زیرەکییەك نیشاندەدەن.
٣- واتای ئاوێتەیان لەخۆگرتووە.

زانایان ئاماژەی لەو جۆرمیان چەند جارێك بینی و، هیچ کامێکیان نەیگوت کە ئەوە ئاماژەیە بۆ زیرەکی. هەرچی دووبارەبوونەوەی شوێنکەوتەی درێژی ژمارە سەرەتاییەکان لە ٢-١٠١ ئەوە شتێکی ترە.

لەبەرئەوە کاتێك زانایانی SETI لە فیلمی Contact پەیامەکەیان وەرگرت هاواریان کرد:

((ئەوە تەشویش نییە، ئەوە بنچینەیەکی تری هەیە This is not noise. This has Structure)).

ئەو بنچینەیە یەکێکە لە نیشانەکانی دیزاین، ئەوە شوێنپەنجەی زیرەکییە.

هەروەها ئەگەر ئەو نووسەرەی چیرۆکی فیلمەکەی نووسیوە (گەورە زانای گەردووناسی کارل ساگان) وایدەبینێت کە تاکە پەیامێك بەو سیفەتانەوە بەسە بۆئەوەی بیسەلمێنێت کە زیرەکی لە هەموو شوێنێکی دەرەوەی زەویدا بوونی هەیە، ئیتر بۆچی هەمان پێوەر بۆ پێوانی دیاردەکانی سەر هەسارەکەمان بەکارنەهێنین؟!

لە ڕاستیدا فیلمی (پەیوەندی Contact)بە تەواوەتی ڕۆڵی ڕێکەوت لە تەفسیرکردنی ئەو دیاردانەی (ئاڵۆزی سەربەخۆ)یان هەیە دووردەخاتەوە، بەڵام دوورخستنەوەی ڕێکەوت بەتەنیا بەس نییە بۆ دانان بە بوونی دیزاین و زیرەکی و مەبەست، بەڵکو پێویستە بە هەمان شێوەی ڕێکەوت (حەتمییەت Necessity)یش ڕەتبکەینەوە. ئەمە واتای چییە؟

## ناحەتمییەت No Necessity:

هەندێ کەس چەمکی دیزاینی زیرەك بە شێوازێکی هەڵە دەخەنەڕوو، دەڵێن: بونیادی شتە سروشتییەکان دەگەنە ئاستێك کە ناکرێ بۆ ڕێکەوت بگێڕدرێنەوە، کەواتە پێویستە دیزاینی زیرەکی لەپشتەوە بێت. واتا بوونی پێکهاتەیی دەکەنە بەڵگە لەسەر بوونی دیزاین.

**ئەم خستنەڕووە لەبەر دوو هۆکار هەڵەیە:**

**یەکەمیان:** (ڕێکەوت) هەندێ کات شتی (زۆر پێکهاتوو) بەڵکو (زۆر جوان) درووستدەکات. بۆنموونە سەرنجی ئەو دیمەنەی بەرچاوت بدە کە چۆن بەدیهاتووە، هەرکات باران باری ئەو دەنکە تۆوانە دەڕوێن کە بە ڕێکەوت کەوتوونەتە سەر زەوی و دار و درەخت و گژوگیا و گوڵ و گوڵزار دەڕوێن، پاشان ئەو ڕووەکانە پەپولەی ڕەنگاوڕەنگ و سەرنجڕاکێش بۆ خۆیان رادەکێشن. لەڕاستیدا ئەو دیمەنە زۆر پێکهاتوو و ئاڵۆز و جوانە بە مەبەست دیزاین نەکراوە.

**دووەم:** هەندێ شتی پێکهاتوو و ئاڵۆزی جوان لە دەوروبەرمان بوونیان هەیە، کە بەرهەمی ڕاستەوخۆی حەتمی یاساکانی سروشتن، بۆنموونە بلوورەکانی بەفر کە لە شەوە ساردەکان درووستدەبێت بە سیستەمێکی سەرنجڕاکێش جیادەکرێنەوە ئەمە بەرهەمی تایبەتمەندییە فیزیاییەکانی ئاون. لە ڕاستیدا ئەو بلوورانە بەرهەمی یاساکانن، کە ئێمە بە بەرهەمی (حەتمییەت Necessity)ی دادەنێین.

خودای بەدیهێنەر توانای پێکهاتنی لە یاساکانی سروشتدا داناوە، بەڵام ئەو دیزاینەی کە ئێمە مەبەستمانە، لە کاری ئەندازیارێك دەچێت کە باڵەخانەیەك دیزاین دەکات، یان ئامێرێك دادێنێت، ئێمە مەبەستمان لە دیزاینی بە مەبەستە ئەوەك ئەو یاسایانەی دیزاینەر بۆ جێبەجێکردنی بیرۆکەکانی بەکاریان دەهێنێت، لەبەرئەوە سەرەڕای دیمەنە سروشتییەکان(کە بەرهەمی ڕێکەوتن) و بلوورەکانی بەفر(کە بەرهەمی حەتمییەتن) هەیانە لەو پێکهاتوویی و جوانی و دیزاینە خوداییە، بەڵام ئەوە بەس نییە بۆ ئەوەی لەکاتی دیبەیت لەگەڵ بێباوەڕاندا بکرێتە بەڵگە، چونکە بۆ ئەوەی کە ئەوە بسەلمێنین کە شتێك بە مەبەستەوە دیزاین کراوە، ئەوا پێویستە هەریەکە لە (ڕێکەوت Chance) کە (ئاڵۆزی سەربەخۆ دووریخستەوە) و (حەتمییەت Necessity) دوور بخەینەوە، بۆ ئەوەی کە بێباوەڕان نەیانکەن بە بەڵگە.

## زانیارییەکان نهێنی ژیانن :

ئێستاش با ئەو بنەمایانەی زانیمان لە بنەماکانی بیردۆزی لۆگاریتمی زانیارییەکان بەسەر کۆدی بۆماوەیی زیندەوەران (DNA) دا جێبەجێیان بکەین.

گومان لەوەدا نییە کە گەورەترین دەستکەوتی زانست لە سەدەی بیستەمدا بریتی بوو لە گەیشتنی زانایانی بایۆلۆجیای بەشی بەوەی کە چوار پیتەکەی دی ئێن ئەی (بنچینە نایترۆجینییەکان - چوار نەکلۆتایدەکە کە بە پیتەکانی A،T، C، G) ئاماژەیان بۆ دەکرێت لە چەند کۆمەڵەیەکدا ریز دەبن، کە بریتین لەو جیناتانەی بەرپرسن لە بەکۆدکردن بۆ دروستکردنی پرۆتینەکان. جینۆمی مرۆیی کە درێژییەکەی ٧بلیۆن پیتە واتا نزیکەی ٧بلیۆن بت زانیاری، ئەو ریزبوونە لەلای پسپۆران زانیاری رەمزی واتادارن، بەڵام لەلای ئەوانەی پسپۆڕ نین تەنیا زانیاری پێکهاتەیین و هیچ واتایەکیان نییە.

چوار پیتەکەی دی ئێن ئەیش پەیڕەوی لە ریزبەندییەکی تایبەتی دەکەن لەناو جینەکەدا بۆ ئەوەی کارا بێت، ئەوە سەرەڕای ئەوەی کە دەتوانێت هەر شوێنێك لەوێدا بگرێت، واتا دووبارەبوونەوە نییە وەك ٠٠١، یان ILoveyou، بەمەش بە هەڕەمەکی Random دادەندرێت بە دیدی بیرکاریانە، کەواتە لۆگاریتمێك دەنوێنێت کە شیاوی پەستان نییە، ئەمەش وامان لێدەکات کە وا گومان ببەین کە ریزبەندییەکەی بەتەواوەتی هەڕەمەکییە. بەڵام لە ڕاستیدا شتێکی ترە، چونکە ئەو ریزبەندییانەی لە چوار بنچینەکەی دی ئێن ئەیدا بڵاوبوونەتەوە کۆدی دروستکردنی پرۆتینەکانیان هەڵگرتووە، واتا واتایەکی زۆر ئاڵۆزی هەڵگرتووە (چەند ئەوەندەی ئەو زانیارییانەی لە فەرمانگەی زانیارییەکانی بەریتانیدا) هەیە.

هەروەها ئەو ئاڵۆزییە سەربەخۆیەی کە ئەو کۆدە هەڵیگرتووە Specified Complexity لە هەموو ئەو ئاڵۆزییە زیاترە کە لە زمانەکاندا هەیە و ئێمە دەیانزانین[1].

## هەڕەمەکیتی زانیاری بەرهەمناهێنێت:

دێریك بیکرتۆن[2] (گەورە زانای زانستەکانی زمان) نموونەیەك لە جیهانی زماندا دەخاتەڕوو کە ئەندازەی ئەو ئاڵۆزییە سەربەخۆیە دەردەخات کە لە کۆدی بۆماوەییدا هەیە، دەڵێت: رستەیەکی واتادار بنووسە کە لە دە وشە پێکهاتبێت، وشەکانی ئەم رستەیە دەکرێ لە ٣،٦٢٨،٨٠٠شێوازدا رێکبخرێتەوە، بەڵام تەنیا ئەو رستەیە واتادارە و لەڕووی زمانەوانییەوە ڕاستە کە نووسیوتە، پێچەوانەی ٣،٦٢٨،٧٩٩رستەکەی ترلەای خودایە؛ چۆن هەڵبژاردنە درووستەکە هەڵبژێردراوە[3]؟!.

ئەگەر ئەم نموونەیە بکەینە پێوەر بۆ ئەوەی کە لە جیهانی دی ئێن ئەیدا ڕوودەدات، دەبینین کە بچوکترین پرۆتین(کە نزیکەی ١٠٠ ترشی ئەمینی لەخۆدەگرێت) پێویستی بە ریزبوونی بنچینە نایترۆجینییەکان هەیە کە دەکرێ لە ١٠^١٣٠ جێگرەوەدا بێت، کە تەنیا یەکێکیان توانای ئەوەی هەیە کە کاری بەکۆدکردن بۆ ئەم پرۆتینە بکات، لەڕاستیدا ئەو هەڵبژاردنە خەریکە لە مەحاڵ

---

(١) لە بەرامبەر نموونەکەی کتێبی ئەدەبی ئینگلیزی کە پێش ئێستا هێنامانەوە.

(٢) Derek Bickerton: مامۆستای بەناوبانگی ئەمریکی زانستەکانی زمان لە زانکۆی هاوای. لە ساڵی ١٩٢٦ز لە دایکبووە، لە کامبریدجیش وانەی گوتووەتەوە.

(٣) گومان لەوەدا نییە کە باوکانمان و مامۆستاکانمان ئەوەیان فێرنەکردووین، بەڵام عەقڵەکانمان میکانیزمی فیتری زۆر ئاڵۆزیان تێدا هەیە کە بەم کارە هەڵدەستێت. لەبەرئەوەی کە ئەو میکانیزمە لەسەر هەموو ئەو زمانانە کاردەکات کە مرۆڤ دەیانزانێت، ئەوا ژمارەیەك رستەی وەها دووردەخاتەوە کە ژمارەیان لە ژمارەی هەموو گەردیلەکانی سەر ڕووی زەوی زیاترە! ئایا بە بیرکردنەوە لە بنچینەی زمانە مرۆییەکان تووشی سەرسامبوون نابین؟!

نزیك بێت[1]، لەگەڵ تێبینیکردنی ئەوەی کە گۆڕینی تاکە ترشێکی ئەمینی بە یەکێکی تر دەکرێ ببێتە هۆی ڕوودانی کارەساتێك کە ببێتە مەترسی بۆ سەر ژیانی زیندەوەرەکە. تێبینی تەوەرەیی لێرەدا بریتییە لەوەی کە ئەو ریزبەندییەی دی ئێن ئەی جگە لە پرۆتین هیچی تر درووست ناکات، واتا (وەك پێش کەمێك باسمان کرد) ئاڵۆزییەکی سەربەخۆی واتادار دەنوێنێت Specified Complexity، ئەگەرچی لە دیدی بیرکاریدا بە هەڕەمەکیش هەژمار بکرێت.

### یاساکانیش زانیاری بەرهەمناهێنن :

لەم چەمکەوە پۆڵ دێڤیز زنجیرەکە درێژ دەکاتەوە بۆئەوەی بگاتە دەرەنجامە یەکلاکەرەوەکە، دەڵێت: ئایا دەکرێ ئاڵۆزی سەربەخۆ لە جیهانی بایۆلۆجیادا بەرهەمی حەتمییەتی میکانیزمی میکانیکی بێت کە فیزیا و کیمیای بەسەر شۆربای سەرەتاییدا ئەنجامیانداوە کە ماددیگەراکان سەرەتای درووستبوونی ژیانی دەدەنە پاڵ؟ دێڤیز وەڵامدەداتەوە: نەخێر، ناکرێ یاساکانی فیزیا کە میکانیزمی جێگیرن ڕێگا بە کۆدی گۆڕاو بدەن. پاشان دەڵێت، لە ڕاستیدا بەشە بایۆلۆجییە گەورەکان (پرۆتینات و دی ئێن ئەی و ئار ئێن ئەی) بە سێ خاسیەتی سەرەکی جیادەکرێنەوە؛ دەوڵەمەندی زانیاری، ئاڵۆزی سەربەخۆی واتادار، نامیکانیکییەت[2]. ئەگەر هەڕەمەکێتی توانای ئەوەی هەبێت کە میکانیزمی سێیەم بەرهەم بێنێت، ئەوا بێتوانایە لە بەرهەمهێنانی سیفەتی یەکەم و دووەم (دەوڵەمەندی زانیاری، ئاڵۆزی سەربەخۆی واتادار)، کەواتە هیچ تەفسیرێکمان بۆ پەیدابوونی ژیان لەبەردەستدا نییە جگە لە بوونی سەرچاوەیەکی زیرەك بۆ زانیارییەکان.

---

(١) ئەگەر ئەگەری هەر شتێك لە ١×١٠-١٥٠ کەمتربێت ئەوا ڕوودانی لەڕێی ڕێکەوتەوە دەبێتە شتێکی مەحاڵ، کە بە (بەرزترین ئاستی ئەگەر Universal Probability Bound) ناسراوە.

(٢) لێرەدا مەبەست لە نامیکانیکی ئەوەیە کە لە دەرەوەی توانای یاساکانی سروشتە.

وەك جەختكردنەوەیەك لەو واتایە گریگۆری شاتین[1] یەكێك لە باوكەكانی بیردۆزی زانیارییەكان پێمان دەڵێت كە لۆگاریتمەكان سنووری زانیارییان هەیە. بۆنموونە، بەرنامەیەكی لۆگاریتمی توانای ئەوەی نییە كە شوێنكەوتەیەكی لەخۆی ئاڵۆزتر بەرهەمبێنێت، كەواتە بەرنامەیەك كە بە ڕێكەوت پێكهاتووە ناتوانێت هەموو ئەو ئاڵۆزییەی ناو دی ئێن ئەی بەرهەمبێنێت. هەروەها میكانیزمێك بوونی نییە كە توانای ئەوەی هەبێت زانیاری وەها بەرهەمبێنێت كە پێچەوانەی بنچینە زانیارییەكەی بێت، چونكە ماددە ماددە بەرهەمدێنێت بەڵام ژیان و عەقڵ بەرهەمناهێنێت.

هەروەها لە كتێبەكەیدا دەربارەی بیردۆزی زانیارییەكان لیۆنارد بریلۆوین[2] دەڵێت: لە ڕاستیدا خانە زیندووەكان(بە دیدێكی زانیارییانە) ئامێری بایۆلۆجین كە توانای چارەسەركردنی زانیارییەكانیان هەیە Digital Processing بە شێوازێكی زۆر باش، بەڵام بێتوانایە لە بەدیهێنانی جۆری نوێی زانیاری. گەورە زانای خاوەنی خەڵاتی نۆبڵ پیتەر ئاگر[3]یش لەوەدا لەگەڵیدا هاوڕایە.

بەمەش بیردۆزی لۆگاریتمی زانیارییەكان بەتەنیا لە خستنەڕوویەكی زانستی نەمایەوە، بەڵكو زۆرێك لە گەورە زانایانی بایۆلۆجیاش پەیڕەویان لێكرد. لەوانە گەورە زانای بنچینەی ژیان بێرند ئۆلاف كۆپەر[4]، كە چارەسەری گرفتی پەیدابوونی ژیانی لە چەند وشەیەكدا كورتكردۆتەوە، چونكە لە (زانینی بنچینەی زانیارییە ئەندامییەكان)دایە.

---

(١) Gregory Chaitin: زانای بیركاری و كۆمپیوتەر، ئەمریكییە و بە ڕەچەڵەك ئەرژەنتینییە، لە ساڵی ١٩٤٧ز لەدایكبووە.

(٢) Leonard Brillouin: (١٨٨٩-١٩٦٩ز)، زانای فیزیا و بیركاری، فەرەنسی، ئەمریكییە و لە زانكۆكانی فەرەنسا پاشان هارڤارد پاشان كۆڵۆمبیا مامۆستا بووە.

(٣) Peter Agre: پزیشكی ئەمریكی و زانای بایۆلۆجیای بەشی و خاوەنی خەڵاتی نۆبڵ لە كیمیا لە ساڵی ٢٠٠٣ز.

(٤) Bernd- Olaf Kuppers: زانای فیزیای بایۆلۆجی و كیمیا و فەیلەسوف، ئەڵمانییە، لە ساڵی ١٩٤٤ز لەدایكبووە.

## ئاڵۆزی نەشیاو بۆ وردکردنەوە (اختزال) :
## Irreducible Complexity(IC)

### کۆتا بزمار لە تابووتی هەڕەمەکیتیدا

فیلمی (لاشەکە[1] The Body) کە دەربارەی گەیشتنە بە لاشەی مەسیح، بیرۆکەکە بیروباوەڕی مەسیحییەکان دەخاتە تەرازووەوە، بەوپێیەی کە ئەوان باوەڕیان بەوە هەیە کە خودا مەسیحی بەرزکردۆتەوە ئاسمان دوای سێ ڕۆژ لە ناشتنی، بۆیە دۆزینەوەی لاشەی مەسیح واتا هەڵەیی ئەو بیروباوەڕە.

بە هەمان شێوە، داروین بیردۆزەکەی خۆی خستە تەرازووەوە، کاتێك لە کتێبەکەیدا (بنچینەی جۆرەکان) تەحەددییەکەی خۆی ڕاگەیاند و گوتی: ((ئەگەر مەحاڵی گەیشتنە بنچینەی هەر ئەندامێك لە بوونەوەرێکی زیندوودا لەڕێی گۆڕانکاری بچوکی لەدوای یەکی زۆر هێواش (بازدانەکان) بسەلمێندرێت، ئەوا بیردۆزەکەم دەڕووخێت، چونکە پەرەسەندن بێتوانایە لە هێنانەدی بازدانگەلێکی گەورە، لێرەوە هیچ ڕێگایەکی ترمان نییە جگە لە داننان بەوەی کە هێزێکی غەیبی یارمەتی دەدات)). ریچارد دۆوکنزیش پەیڕەوی لە هەمان تەحەددی دەکات.

تەحەدداکەی داروین تەحەددایەکی خوارە، ئەو وایدەزانی کە لە بەرژەوەندی خۆیدا دەبێت، ئەوە هاوشێوەی تەحەددییەکەی ئەو کەسانەیە کە دەڵێن ژیان لە هەسارەیەکی تر لەسەر کەشتییەکی ئاسمانی هاتۆتە سەر زەوی، ئەو کەسەش کە نکۆڵی دەکات پێویستە لەسەری کە هەڵەیی ئەو گریمانەیە بسەلمێنێت!

---

(١) فیلمەکە لە ساڵی ٢٠٠١ز لەلایەن دەرهێنەر Jonas McCord دەرهێنراوە و، چیرۆکەکە لە نووسینی Richard Sapir ە.

گومان لەوەدا نییە کە ئەم شێوازە هەڵەیە، چونکە زانست هەڵدەستێت بە پێشکەشکردنی بەڵگە لەسەر ئەوەی دەیڵێین، نەوەك لەسەر سەلماندنی هەڵەیی هەموو ئەگەرەکانی تر[1]. کەواتە پێویستە داروینییەکان بەڵگە لەسەر هەرەمەکێتی پەرەسەندن بخەنەڕوو.

لەگەڵ ئەوەشدا مایکل بێهی[2] تەحەددییەکەی قەبووڵ کردووە، لە کتێبە ناوازەکەیدا (سندووقە رەشەکەی داروین Darwins Black Box)[3] دا بەڵگەکانی خستوونەتەڕوو. بەڵگەکانی بێهی دژ بە هەرەمەکێتی پەرەسەندن جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە داروینییەکان لەوەدا بێتوانابوون کە بە ڕێکەوت و هەرەمەکێتی پەیدابوونی میکانیزمە بەشییە زۆر ئاڵۆزەکان لە زیندەوەردا تەفسیر بکەن، کە ناکرێ لەڕێی گۆڕانکاری سادەی بەدوای یەکی زۆر هێواشدا پەیدا ببن، کە پەرەسەندنی داروینی لەڕێیەوە کاردەکات.

بۆ سەلماندنی ئەوەش، بێهی تەحەددییەکی زۆر گرنگی بەرامبەر بە پەرەسەندنی هەرەمەکی خستۆتەڕوو، ئەویش چەمکی (سیستەمی ئاڵۆزی نەشیاو بۆ وردکردنەوە Irreducible Complexity)، ئەو سیستەمانەی لە چەند

---

(١) ڕاستەکە ئەوەیە کە لویس باستێر ئەنجامیداوە کاتێك سەلماندی کە ژیان بەشێوەیەکی خودکار بەدینایەت. باستێر بۆ سەلماندنی هەڵەیی ئەو چەمکە لە هەموو شێوازەکانی ژیان، چونکە ئەوە شێوازی زانست نییە، باستێر تەنیا لە یەك جۆری بەکتریای کۆلیەوە و گەیشتە میکانیزمی زۆربوونی، بەمەش هەڵەیی پەیدابوونی خۆکردی سەلماند، پاشان ئەنجامەکانی گشتاند بەسەر هەموو شێوازەکانی ژیاندا.
باستێر ناڕاستەی بابەتەکەی گۆڕی و وایلێکرد کە بەڵگە لەسەر ئەو کەسەیێت کە بانگەشە دەکات، بۆیە لەسەر ئەو کەسەی دەڵێت ژیان بە شێوەیەکی خۆکرد دروستبووە پێویستە کە بەڵگە پێشکەش بکات. ئەوەی جێی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە ماددیگەراکان باوەڕیان هەیە بە پەیدابوونی خۆکرد و پاشان ڕەتیدەکەنەوە!!

(٢) Michael Behe: مامۆستای بایۆلۆجیای بەشی لە Lehigh University لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و، یەکێك لە کۆڵەگەکانی بزووتنەوەی دیزاینی زیرەك، لە ساڵی ١٩٥٢ز لەدایکبووە.

(٣) زانایان دەستەواژەی سندووقی ڕەش بەکاردەهێنن وەك ئاماژەیەك بۆ ئەو سیستەمانەی بەکاریاندەهێنین و شێوازی کارکردنیان نازانین، بۆنموونە کۆمپیوتەر بۆ زۆربەمان سندووقێکی ڕەشە، بەکاریدەهێنین، بەڵام نازانین چۆن کاردەکات. خانەش لە سەردەمی داروینداا بەو جۆرە بووە، لەژێر مایکرۆسکۆبدا وەك دڵۆپێکی ماددەی جەلاتینی دەردەکەوت، بەڵام هیچی دەربارەی ئاڵۆزییە سەرسوڕهێنەرەکەی نەدەزانی.
گۆڤاری خاوەن پێگەی بەرێزی زانستی National Review کتێبەکەی بەوە وەسفکردووە کە گرنگترین کتێبی چیرۆکە کە لە سەدەی بیستەمدا دەرچووە(کتێبەکە لە ساڵی ١٩٩٦ز دا دەرچووە).

بەشێك و تەنۆلكەیەكی بایۆلۆجی پێكهاتووە كە لەڕووی فرمانییەوە دەست دەخەنە ناو دەستی یەكترەوە بۆ جێبەجێكردنی كارێكی سەرەكی دیاریكراو، لەهەمان كاتدا ئەگەر یەكێك لەو پێكهاتانە بوونی نەبێت ئەوا سیستەمی كاركردنەكە بەتەواوەتی لەكاردەكەوێت.

بێهی (تەڵەی مشك Mouse Trapper) وەك نموونە بۆ سیستەمی ئاڵۆزی نەشیاو بۆ وردكردنەوە دێنێتەوە (شێوەی ١). چونكە تەڵەی مشك لە پێنج بەشی سەرەكی پێكدێت (چوارچێوەیەكی تەختە، قولاپێكی خواردن، سپرینگ، ستوونێكی كانزایی، مشكگر)، بۆ ئەوەی تەڵەكە پیشەكەی ببینێت ناكرێ ڕۆڵی هیچ یەك لەو پێنج بەشانە پشتگوێ بخرێت، چونكە ئەگەر یەكێكیان لاببرێت كاری تەڵەكە بە ٪٢٠ كەم دەبێتەوە، بەڵكو بەتەواوەتی لەكاردەكەوێت. لەبەرئەوە لەكاتی درووستكردنی تەڵەكەدا پێویستە لەیەك كاتدا هەر پێنج پارچەكە بەیەكەوە ببەسترێن، بۆئەوەی شیاوی كاركردن بێت.

نموونەیەكی تری بێهی كە بەناوبانگترینە لە هەموویان زیاتر لە جیهانی بەكتریادا خواستی لەسەرە بریتییە لە (قامچی بەكتریا Flagellum) كە بەهۆی جووڵەكەیەوە بەكتریا بەرەو پێشەوە پاڵدەدات ڕێك وەك ماتۆڕی بەلەم (شێوەی ٢).

مامۆستای بایۆلۆجیا لە زانكۆی هارڤارد(هاوردبێرگ)[١] قامچی بەكتریا بەوە وەسف دەكات كە بەتواناترین ئامێری گەردوونە Most Efficient Machine (in Universe)[٢].

---

(١) Howard Berg: مامۆستای فیزیا و بایۆلۆجیای بەشی لە زانكۆی هارڤارد، لە ساڵی ١٩٣٤ز لەدایكبووە.

(٢) قامچییەكە بە تێكڕای ١٠ هەزار خوول لە خولەكێكدا دەجووڵێت و، لەماوەی چوار خولدا دەتوانێت ئاراستەی جووڵەكەی بگۆڕێت.١٠٠٠٠٠/١ئینج(هەر ٣٥٠٠٠ ماتۆر ١مم بەكاردەخات) و، مرۆڤ تا ئێستا نەیتوانیوە ماتۆڕێكی بە قەبارە و توانای ئەو درووست بكات، تەنانەت بەهێزترین ماتۆڕی ئۆتۆمبێلی هۆندا(Honda S2000) خێرایی خوولانەوەی ٩٠٠٠تەنها ٩٠٠٠خوولە لە خولەكێكدا! بۆ یەكەمجار لە ساڵی ١٩٧٣ز وەسفی قامچی بەكتریا كرا.

قامچی بەکتریا لە سێ بەشی سەرەکی پێکدێت (قامچی- قوولاپ- ماتۆڕ) کە لە دووسەد بەشی پرۆتینی پێکدێت، چل بەش لە دووسەد بەشەکە ئەو ماتۆڕە پێکدێنن کە بەشێوەیەکی گونجاو و تەواوکاری وەك پێکهاتەکانی کاتژمێر (و تەڵەی مشك) کاردەکات، ئەگەر یەکێك لەو پرۆتینانە بوونی نەبێت سیستەمەکە بەتەواوەتی لەکاردەکەوێت.

لەبەرئەوە پێویستە هەر لەسەرەتاوە سیستەمەکە بەشێوەیەکی تەواو و بێ کەموکوڕی بەدیبێت، ئەگەر بمانەوێت کار بکات و بۆماوەیی ئەنجام بدات.

کەواتە، مەحاڵە قامچییەکە لەڕێی چەند هەنگاوێکی هێواشی بەدوای یەکدا بەدیبێت، کە لە هەر هەنگاوێکدا بەشێکی پرۆتینی یان زیاتر بەدیبێت، هەروەك پەرەسەندنی هەڕەمەکی بانگەشەی بۆدەکات، جگە لە بەدیهێنەری زیرەك هیچ هێزێکی تر ناتوانێت ئەو کارە ئەنجام بدات.

زانایانی بیرکاری هەستاون بە مەزندەکردنی ئەگەری ئەوەی، کە قامچی بەکتریا بە ڕێکەوت پەیدابێت بریتییە لە ١×١٠^-١١٧٠!!

نموونەی دووەم کە بێهی خستوویەتیەڕوو بریتییە لە بینین، چونکە کەوتنی فۆتۆنەکانی ڕووناکی بەسەر تۆڕی چاو دەبێتە هۆی زنجیرەیەك کارلێکی کیمیایی زیندەیی، کە ئەگەر یەکێکیان لەکاربکەوێت ئەوا بینین لەدەستدەدەین.

بێهی لەبەرئەوە گرنگی بە بینین داوە، چونکە شیکاری چاو یەکێك بوو لەو نموونانەی کە داروینییەکان لەسەر ئەگەری ڕوودانی پەرەسەندن لەڕێی هەڕەمەکییەوە دەیهێننەوە، سەرەڕای بێهێزی بەڵگەکەیان بێهی ئاڕاستەکەی گۆڕیوە و ڕۆچۆتە ناو بنچینە بەشییەکەی و فرمانە زیندەییەکانی.

نموونەی سێیەم کە لە جیهانی بایۆلۆجیا لەسەر ئاڵۆزی نەشیاو بۆ وردکرنەوە دەیهێننەوە بریتییە لە ((میکانیزمی مەیینی خوێن Blood Clotting Mechanism)) کە ژیانی زۆر کەس لە مردن رزگار دەکات. لە شوێنکەوتەیەك Cascade ی دە هەنگاوی پێکهاتووە، کە لە بیست ئاوێتەی بایۆلۆلۆجی زۆر

ئاڵۆز پێکدێت[1]. ئەو سیستەمەش یان دەمێت بەیەکەوە و بە یەك هەنگاو بەدیبێت بۆئەوەی کار بکات، یان ئەوەتا بەهیچ شێوەیەك کارناکات.

ئایا وایناببینی کە ئەو سێ سیستەمە(قامچی بەکتریا و تۆڕی چاو و میکانیزمی مەیینی خوێن) خاسییەتی ئاڵۆزی نەشیاو بۆ وردکردنەوەیان هەیە کە مایکل بێهی خستوویەتیەڕوو، هەروەها خاسیەتەکانی ئاڵۆزی سەربەخۆشیان تێدا هەیە کە ویلیام دیمبسکی خستوویەتیەڕوو، ئەوانەی بێگومان نیشانەن بۆ بوونی دیزاین و زیرەکی و توانا؟

## بەرگری داروینییەکان...

هات و هاواری داروینییەکان بەرامبەر بە بێهی بەرزبووەوە؛ چۆن زانایەکی ڕاستەقینە بوێری ئەوەی هەیە کە قسەی لەم جۆرە بکات، بۆیە بە فێڵبازی و دووفاقی و یاریکردن لەسەر پەتی دووڕوویی تۆمەتباریان کرد. هێرشکردنی ماددیگەرا توندڕەوەکانی لە دژایەتیکردنیان بۆ ئایین هێرشی پیاوە ئایینییە توندڕەوەکانمان بیردەخاتەوە دژ بە زانست لە سەدەکانی ناوەڕاستدا!. جێگای خۆشحاڵییە کە هەندێك خستنەڕووی باشتر و کەم هیستیریا بوونیان هەبوو کە دەکرێ تاوتوێ بکرێن[2]، ئەوان هەوڵیان داوە کە لە چنگی چەمکی(ئاڵۆزی

---

(١) بە هەمان شێوە، میکانیزمی مەیینی خوێن سیستەمێکی تەواوە و، خاوەنی نەخشەیەکە کە بە کات و شوێنەوە پەیوەندە! چونکە ئەگەر خوێن لە شوێنێکی نەگونجاودا بمەیێت(وەك مێشك و دڵ) ئەوا لەوانەیە ببێتە هۆی مردنی مرۆڤ و، ئەگەر لەکاتی پێویستیشدا نەمەیێت ئەوا لەوانەیە دیسان ببێتە هۆی مردنی مرۆڤ!! میکانیزمی مەیینی خوێن بۆئەوەی سوودەکەی تەواوتی و گشتگیر بێت پێویستی بە گونجانی کرداری هەیە لەنێوان کاری جگەر و دڕکە پەتك و بۆرییەکانی خوێن.

(٢) بەکێك لە وتارە میانڕەوەکان وتاری فەیلەسوف Paul Draper ، بە ناونیشانی Irreducible Complexity and Darwinian Gradualism کە لە گۆڤاری ٢ ٢،٢٠٠١-Faith and Phylosophy دا بلاوبکردۆتەوە.

نەشیاو بۆ وردکردنەوە) رابکەن، بە خستنەڕووی میکانیزمگەلێکی وەها کە ڕێگا بە پەیدابوونی سیستەمی ئاڵۆز بدات بە شێوەیەکی پلەبەند و لەڕێی هەڵبژاردنی سروشتییەوە. بۆ ئەو مەبەستەش سێ میکانیزمیان خستۆتەڕوو کە بێهی زۆر بە تواناوە بەرپەرچی داونەتەوە:

**میکانیزمی یەکەم، ڕێگای ڕاستەوخۆ:** هەڵبژاردنی سروشتی هەڵدەستێت بە باشترکردنی سیستەمێکی سادەتر کە بەهەمان فرمان هەڵدەستێت.واتا قامچی بەکتریا پێشتر بە شێوەیەکی سادەتر بوونی هەبووە، پاشان هەڵبژاردنی سروشتی هەستاوە بە باشترکردنی پێکهاتەکانی تا بگاتە ئەو پلەیەی ئاڵۆزی کە لە ئێستادا دەیبینین، لەگەڵ هێشتنەوەی فرمانەکە وەکو خۆی (کە بریتییە لە پاڵنانی بەکتریا لە ئاودا). لەوەدا دوو کێشە بوونیان هەیە کە ئەو میکانیزمە توانای ئەوەی نییە تەفسیرێکیان بۆ پێشکەش بکات:

- چۆن سیستەمە سادەترینەکە هاتۆتە بوون؟

- چ پێویستییەك هەیە بۆ ئاڵۆزکردنی سیستەمێکی سادە کە بە هەمان فرمان هەڵبستێت؟

**میکانیزمی دووەم، پێشینە گۆڕاوەکان:** هەڵبژاردنی سروشتی میکانیزمێکی سادەتری بەکارهێناوە کە بۆ فرمانی تر بەکاردێت و گۆڕانکاری و ئاڵۆزی تێدا ئەنجامداوە بۆئەوەی قامچی بەکتریا بەو فرمانانەی ئێستایەوە بەرهەم بهێنێت.

بۆ ئەمەش ئەو ترومپایەیان هەڵبژاردووە کە بەکتریای تاعون بۆ تێکردنی ژەهر لە خانەکانی قوربانییەکەدا بەکاریدەهێنێت، ئەو ترومپایە تەنیا لە دە جۆر پرۆتین پێکهاتووە کە لە قامچی بەکتریاشدا بوونیان هەیە. لەسەر داروینییەکان پێویستە تەفسیرێك بۆ ئەوە پێشکەش بکەن کە چۆن دەیان جۆری تری پرۆتینی بۆ زیادکراوە کە لە قامچییەکەشدا بوونیان هەیە، ئەوە جگە لە دانانی میکانیزمگەلێك و چەند قۆناغێك کە تیایدا فەرمانەکان دەگۆڕێن و ترومپاکە ببێتە قامچی، لە تەوەرەی پێشووتردا باسمان لەوە کرد کە هەڵبژاردنی سروشتی کردارێکی ئەرێنییە و توانای بەدیهێنانی میکانیزمی نوێی نییە.

بێهی وایدەبینێت کە پێچەوانەکەی ڕاستە، ئەوەی کە هەندێك بەشی قامچی بەکتریا (ئاڵۆزترەکە) بۆ بەدیهێنانی ترومپاکە (سادەترەکە) بەکارهاتووە، کە ئەمە (شکانەوە Devolution)یە نەوەك (پەرەسەندن Evolution)، بێهی ئەوەی لە تاقیکردنەوەکانیدا سەلماندووە کە لەسەر بەکتریای E.Coli ئەنجامیداوە.

**میکانیزمی سێیەم، کۆکردنەوە:** هەڵبژاردنی سروشتی هەڵدەستێت بە کۆکردنەوەی ئەو بەشانەی کە پێشتر بوونیان هەبووە و خزمەتی فرمانی تریان کردووە بۆ ئەوەی کە بە فرمانێکی تر هەڵبستێت، ڕێك وەك ئەوەی بەشەکانی ئۆتۆمبێل و پاسکیل بێنین و فڕۆکەی لێ درووست بکەین.

ئەگەر ئەو میکانیزمە لەڕووی عەقڵییەوە شیاوی ڕوودان بێت ئەوا لەڕووی کردەییەوە مەحاڵە، ئەگەر لە ئەنجامی کۆکردنەوەکەدا فڕۆکەمان دەستبکەوێت ئەوا گەورەییەکە بۆ ڕێکەوت ناگەڕێتەوە، بەڵکو لەسەرەتادا بۆ ئەو ئەندازیارەی لەسەرەتادا دیزاینی کردووە، پاشان بۆ ئەوەی کە کەرەستە سەرەتاییەکانی درووستکردووە! هەمان شتیش ڕاستە بۆ قامچی بەکتریای خاوەن بەشی زۆر ئاڵۆز و گونجاو.

(لین مارگولیس)[1] ئەم سێ میکانیزمە هەڵدەسەنگێنێت و دەڵێت: (لەڕاستیدا داروینییەکان دیدێکی رازیکەریان بۆ پەیدابوونی قامچی بەکتریا نەخستۆتەڕوو، ئەوان هیچ دەرچەیەکیان نەدۆزیوەتەوە بۆ هەڵاتن لە بەکارهێنانی وشەی وەك (لەناکاو دەرکەوت) و (لەدایکبوو) و (سەرئاوکەوت) و(بازیدا) و(دەرکەوت)....، چۆن؟...هیچ تەفسیرێکی نییە.

یەکێکی تر لە بەرگرییەکانی داروینییەکان لە دژی بیرۆکەکانی بێهی بریتییە لەوەی کە دەکرێ بەوە وەسف بکرێت کە بریتییە لە (لێدان لەدواوە)، بێهی هەشت منداڵی هەیە، چوارەمیان ناوی (لیۆ Leo)یە و، لە ساڵی ٢٠١١ز لیۆ

---

(١) Lyn Margulis: (١٩٣٩-٢٠١١ز)، ژنە زانای بایۆلۆجیا، ئەمریکییە، لە زانکۆی ماساشوستس مامۆستا بوو و، بیردۆزێکی بەناوبانگی هەیە بەناوی خۆیەوە بۆ تەفسیرکردنی پەیدابوونی خانەی ناوکدار.

بێباوەڕبوونی خۆی ڕاگەیاند، کە هێشتا نەچووبووە زانکۆ. لە یەکێك لە دیمانە تەلەفزیۆنییەکاندا لیۆ باسی لەوە کرد کە دوای خوێندنەوەی کتێبی (وهم الإله)ی ریچارد دۆوکنز بێباوەڕبووە. دۆوکنز و ئەو بێباوەڕانە بەو قسەیە چەند دڵخۆش دەبن کاتێك ئەم بەشەی ئەم کتێبەی من دەخوێننەوە، بەڵام نارام بن..لیۆ دەڵێت کە بێباوەڕبوونەکەی بەهۆی بیرۆکەکانی باوکی و رەنگدانەوە فەلسەفییەکانی نەبووە! بەڵکو قەناعەتی بە چۆنییەتی ڕەخنە و بەرپەرچدانەوەکانی دۆوکنز هاتووە کە بەرامبەر بە کتێبی پیرۆزی مەسیحییەکان نووسیویەتی! دیسان خودا باجی لادان و گۆڕانکارییەکانی کتێبی پیرۆز دەدات!.

## سنوورەکانی پەرەسەندن - جارێکی تر:

بۆ بەرپەرچدانەوەی نارەزاییەکان و ئەو هێرشەی کرایە سەر کتێبەکەی (سندووقە رەشەکەی داروین) بیهی کتێبێکی تری دەرکرد بە ناوونیشانی (سنوورەکانی پەرەسەندن The Edge of Evolution)، کە تیایدا بەرپەرچی بەرهەڵستکارانی دەداتەوە و ئەوە دووپاتدەکاتەوە کە پێکهاتەکانی خانە لەسەر ئاستی بەشیدا لەرێی هەڵبژاردنی سروشتی ناڕاستەنەکراوەوە پەیدانابێت، لەسەر ئەوەش بەڵگەی بێدەنگکەر و بەشێوازێکی چەندیی دەخاتەڕوو، ئەمە یەکێکە لە باشترین و بەهێزترین ئەو بەڵگانەی لەو بوارەوە خراونەتەڕوو[1].

بیهی لە کتێبەکەیدا ئەوەی ڕوونکردۆتەوە کە دامەزراوە ئاڵۆزەکان کە شیاوی وردکردنەوە نین پێویستییان بە دیزاینێکی زیرەکانەو دیزاینەرێکی زیرەك هەیە، کە ئەوە بزانێت پێویستە دامەزراوەکە چۆن بێت و کاتێك تەواو دەبێت بە چ شێوازێك دەردەچێت، ئەوە دیاریبکات کە چۆن بە شێوەیەکی تەواو و بێ کەموکوڕی

---

(١) هەندێك لەو بەڵگانەمان لە تەوەرەی رابردوودا خستەڕوو.

بەدیدەهێنێت. بۆ ئەوەش بێهی بۆچوونی بروس ئالبێرتز[1] (سەرۆکی فەخری ئەکادیمیای نەتەوەیی بۆ زانستەکان) وەك نموونە دێنێتەوە، ئەگەرچی یەکێکیش نییە لە لایەنگرانی دیزاینەری زیرەك، کاتێك دەڵێت: لە ڕاستیدا ئەو کیمیایەی وادەکات کە ژیان بەدیبێت لە هەموو شتێك ئاڵۆزترە کە تائێستا مرۆڤایەتی پێیگەیشتووە و خوێندوویەتی، چونکە هەر کارلێکێکی گرنگ لەناو خانەدا لەڕێی ئاوێتە (ئەنزیمەکان)ەوە ئاڕاستە دەکرێت کە لە زیاتر لە دە بەشی پرۆتینی پێکدێت، ئەو ئاوێتانەش لەگەڵ ئاوێتەی تردا کارلێك دەکەن کە ئاڵۆزییان لەوان کەمتر نییە، ئابەم شێوەیە. لەبەرئەوە دەتوانین وایدابنێین کە خانە کارگەیەکی گەورەیە و لە چەندەها هێڵی بەرهەمهێنانی بەیەکەوە گونجاو پێکهاتووە کە بریتین لەو زنجیرە ئاڵۆزانەی لە بەشی پرۆتین پێکهاتوون.

ئەمە بە تەنیا رای بێهی نییە. ئەوەتا زانای کیمیای زیندەیی جێیمس شاپیرۆ[2] ئەوە دڵنیادەکاتەوە کە پەرەسەندنی بەشی هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نییە، پشتئەستوور نییە بە بەڵگەی زانستی و لە تاکە گۆڤارێکی زانستی پێگە بەرزدا لێکۆڵینەوەیەکی دەربارە نەخراوەتەڕوو! بەهەمان شێوە هیچ لێکۆڵینەوەیەك بوونی نییە لەسەر پەیدابوونی ئەندامەکان یان دامەزراوە ئاوێتەکان لەڕێی پەرەسەندنی بەشییەوە. لەولاشەوە زانای بایۆلۆجیای پەرەسەندن ستیڤن جای گۆڵد-سەرەڕای بەرهەڵستیکردنی بەردەوامی بۆ بێهی- دەڵێت: زانست توانیویەتی چەند دامەزراوەیەکی سادەی وەك جووڵەی هەسارەکان و خشتەی خولی تەفسیر بکات، هەرچی دامەزراوە ئاڵۆزەکانی نەشیاو بۆ وردکردنەوەن، ئەوا بەهیچ جۆرێك زانست لە تەفسیرکردنیان نزیکنەبۆتەوە، بەڵکو ئێمە بۆ تەفسیرکردنی ئەو جۆرە دامەزراوانە پێویستیمان بە بۆچوونی فەلسەفی نوێ هەیە(نەیگوتووە میکانیزمی زانستی).

---

(١) زانای کیمیای زیندەیی، ئەمریکییە و، لە ساڵی ١٩٣٩ز لەدایکبووە.

(٢) James Shapiro: مامۆستای بایۆلۆجیا لە زانکۆی شیکاگۆ. ئەمریکییە.

## بردنەوەی یاریەکە بە لێدانی کوشندە...

گومان لەوەدا نییە کە چەمکی ئاڵۆزی نەشیاو بۆ وردکردنەوە (IC) داروینییەکانی دووچاری مردن کردەوە، چونکە بەڵگەیەکی دووسەرەیە، لە یەك کاتدا نەرێنی و ئەرێنییە، بێهی بە خستنەڕووی تەحەددییەکەی داروین دەستیپێکردووە بەوەی کە بێتوانابوون لە تەفسیرکردنی پەیدابوونی هەر سیستەمێکی ئاڵۆز لەڕێی هەنگاوی زۆر هێواشەوە واتای هەڵەیی بیردۆزەکەی دەربارەی پەرەسەندنی هەڕەمەکی دەگەیەنێت، پاشان بێهی سەلماندوویەتی کە هەموو سیستەمەکانی IC ناکرێ بە پەرەسەندنی داروینی تەفسیر بکرێن.بێهی تەنیا بەوە نەوەستاوە، بەڵکو هەنگاوێکی تری ئەرێنی چۆتە پێشەوە، دیدێکی بۆ پەیدابوونی ئەو سیستەمانە،ئەو دید و بۆچوونەش لە یەك وشەدا کورتبۆتەوە (دیزاین)، ئەمە خستنەڕووێکی زانستییە و دەکرێ بخرێتە ژێر لێکۆڵینەوەی زانستی، هەروەك چۆن لە کاتی خستنەڕووی بیردۆزی لۆگاریتمی زانیارییەکاندا خستمانەڕوو.

لەبەرئەوە ئەگەر بەڵگەی ڕێکخستنی ورد گەورەترین بەڵگەبێت لەسەر ئەوەی کە گەردوون دیزاینکراوە، ئەوا ئەوەی بێهی خستوویەتیەڕوو بە گەورەترین بەڵگەی سەلماندنی دیزاین لە بواری بایۆلۆجیا دادەنرێت.

## بەڵگەی دیزاین (هەستکردنە) نەوەك (هەڵێنجان):

ریچارد دۆکنز و مێگەلە بێباوەڕەکەی، بەر لەوان دێڤید هیوّم و فەیلەسووفەکانی تری بێباوەڕی، وەك (بەڵگەیەکی پێوانەیی Inductive- Analogical) سەیری (بەڵگەی دیزاین)[1] دەکەن، کە لە دوو پێشەکی و دەرەنجامێك پێکهاتووە:

---

(١) بەڵگەی دیزاین لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە هەستکردن بەوەی کە سروشت دیزاینکراوە بەڵگەیە بۆ سەلماندنی خوایەتی. عیلمی کەلامی ئیسلامی بۆ یەکەمین جار ئەم بۆچوونەی خستۆتەڕوو، پاشان

١- لە ڕاستیدا هەموو ئەو ڕێکخراوەییەی لە گەردووندا بوونی هەیە هاوشێوەی داهێنانە ڕێکخراوەکانی مرۆڤە.

٢- داهێنانەکانی مرۆڤ بە مەبەست دیزاین کراون.

کەواتە سروشت بە مەبەست دیزاین کراوە، واتا ئێمە سروشتمان بە داهێنانەکانی مرۆڤ پێوانە کردووە. هەندێك لە فەیلەسووفەکانی زانست دەڵێن کە دانان بە دیزاینی بە مەبەست و ئامانجدار دەچێتە خانەی باشترین تەفسیرەکان، نەوەك بەڵگەیەکی پێوانەیی.

بە درێژایی مێژوو، زۆر کەس پێیان وابوو کە بەڵگەی دیزاین زۆر رازیکەرە. داروینیش لە کاتی خوێندنی لە کامبریدج یەکێك بوو لەوان، چونکە یەکێك بوو لەوانەی باوەڕی بە بەڵگەی دروستکەرەکەی کاتژمێری ویلیام پێلی هەبوو، کە گەردوونی بە کاتژمێر دەچواند، کەواتە پێویستە بەدیهێنەرێکی هەبێت هەروەك چۆن کاتژمێر دروستکەری هەیە، تەنانەت داروین لە لایەنی عەقڵییەوە وەك پێشەوای بەرزی خۆی سەیری پێلی دەکرد. پاشان دیدی داروین گۆڕانکاری بەسەردا هات و ئیتر باوەڕی بەوە هێنا کە هەڵبژاردنی سروشتی بکەرە نەوەك خودا[1].

---

لە زانستی لاهوتی مەسیحیدا باسکراوە، کە بەڵگەی دروستکەری کاتژمێرەکە کە ویلیام پێلی(١٧٤٣-١٨٠٥ز) خستوویەتیەڕوو باشترین وێنەیەتی. لە زانستی نوێشدا بەڵگەی دیزاین لەگەردووندا لە بەڵگەی ڕێکخستنی ورددا لە بەرامبەریەتی و، لە زانستی بایۆلۆجیادا بەڵگەی ئاڵۆزی نەشیاو بۆ وردکردنەوە و سنوورەکانی پەرەسەندنی مایکل بێهی بوونیان هەیە. هەروەك چۆن بەڵگەی (ئاڵۆزی سەربەخۆ)ی ویلیام دێمبسکی لە بواری گەردوون و بایۆلۆجیا پێکەوە خستوویەتیەڕوو.

(١) یەکێك لە لایەنە ئەرێنییەکانی بەڵگەکەی ویلیام پێلی بریتییە لەوەی کە جەختی لەسەر چەند نموونەیەکی دیاریکراو کردۆتەوە بۆ گونجان لە جیهانی زیندەوەراندا و زۆر دەستەواژەی Just-So ی بەکارهێناوە بۆ تەفسیرکردنی پەیدابوونی ئەو زیندەوەرانە و، کاتێك زانستی بایۆلۆجیا تەفسیری بۆ ئەو دیاردانە پێشکەش کرد بەڵگەکەی داڕووخا. هەروەها پێلی جەختی لەسەر لایەنی بەزەیی سروشت کردۆتەوە و لایەنی خراپە و کۆژانەکانی پشتگوێ خستووە، لەبەرئەوە بەرهەڵستکارانی هاتوون جەختیان لەسەر ئەو لایەنانە کردۆتەوە بۆ نکوڵی کردن لە بوونی خودایەکی بەبەزەیی. تەنانەت دیندارەکان خۆیشیان گوتوویانە کە خستنەڕووی زانستیانەی ئاین لەگەڵ مەسیحییەتدا یەکانگیر نایەتەوە و، وایدەبینن کە خستنەڕووی پێلی بۆ کردەیی و بەردەوامی یاساکانی سروشت لەگەڵ چەمکی موعجیزەدا تێکدەگیرێت لە مەسیحییەتدا و پشتگیری لەو کەسانە دەکات کە باوەڕیان بە ئاینی سروشتی هەیە، کە هەموو دەستخستنەناوێکی خودایی لە گەردووندا ڕەتدەکەنەوە. بەمەش لەهەمان کاتدا بەڵگەکەی پێلی لەلایەن

پێش داروینیش فەیلەسووفی نەبوونگەرایی (العدمية) دێڤید هیوم یەکێك بوو لە بەرهەڵستکارانی درووستی بەڵگەی دیزاین. ئەو وایدەبینی کە بەڵگەکە لەسەر لێکچواندنی کەم و کورت دامەزراوە؛ چونکە ئەگەر گوتمان کە خانوو ئەندازیار و درووستکەری هەیە کەواتە گەردوونیش ئەندازیار و درووستکەری هەیە، کێ دەڵێت گەردوون لە خانوو دەچێت؟ هەروەها هیوم دەڵێت ئێمە جیهانێکی ترمان نییە تا بەراوردی بکەین بە جیهانەکەمان و بگەینە ئەو دەرەنجامەی کە ئەوەی کۆتایی دیزاین کراوە، بەمەش وا دەردەکەوێت کە نیشانەکانی دیزاین کاڵن و پێویستییان بە بەراوردێکە دەریانبخات.

گومان لەوەدا نییە کە بەرپەرچ و ڕەخنەکانی هیوم هەڵەن، چونکە پەیوەندی هەیە لەنێوان گەردوون و خانوودا، بەوپێیەی هەردووکیان بوونێکی بەدیهێنراون لە شوێنێکدا کە لە ماددە پێکهاتووە و پێویستییان بە وزەیەك هەیە بۆ بنیاتنان و بەکارخستنیان. هەروەها نیشانەکانی دیزاین لە گەردوونەکەماندا تا ئاستێکی وا ڕوون و ئاشکران کە پێویستییان بەوەیە لەگەڵ گەردوونێکی تردا بەراورد بکرێن، هەروەك چۆن لە زانستیشدا هەندێك ڕووداو هەن کە لەسەر بەراورد و دووبارەبوونەوە بنیاتنەنراون، بۆنموونە ئێمە ناتوانین تەقینەوە گەورەکە یان سەرەتای ژیان یاخود هەر ڕووداوێکی مێژوویی دووبارە بکەینەوە.

---

دینداره ئوسوڵییەکان و بێباوەڕانەوە لێیدرا.

## حەقیقەتی بەڵگەی دیزاین :

حەقیقەتی پرسەکە ئەوەیە کە (بەڵگەی دیزاین) بۆ ئاشکراکردنی دیزاین پشت بە (هەستکردنی ڕاستەوخۆ) دەبەستێت، نەوەك بەڵگەی پێوانەیی (وەك هیۆم و دۆوکنز) دەڵێن، هەروەها بریتی نییە لە باشترین تەفسیرەکان (وەك هەندێك لە فەیلەسوفەکان دەڵێن)، ئەگەرچی ئەو دوو بەشە بچکۆلانەیەشی تێدا هەیە[1].

بۆ نزیککردنەوەی وێنەکە، نموونەیەك دێنینەوە: ئەگەر لەسەر یەکێك لە هەسارەکانی گەلەستێرەی دراوسێمان دابەزیت،هیچ رووکارێکی ژیان و ژیارستانییەتت تێدا بەدینەکرد، پاشان ئامێرێکی ئاڵۆزت دۆزییەوە کە نەتدەزانی بەکاری بێنی، بەڵام نیشانەکانی دیزاینت تێدا بەدیدەکرد، گومان لەوەدا نییە کە لەو کاتەدا ڕاستەوخۆ (هەستدەکەی) کە ئامێرەکە دیزاین کراوە. ئەوە (هەستکردنی ڕاستەوخۆیە نەوەك بەڵگەی عەقڵی کە پێشەکی هەبێت و بتوانرێ بەرپەرچیان بدرێتەوە، یاخود دەرەنجامی هەبێت کە گومان لە شێوازی گەیشتن بە چۆنیەتی گەیشتن بەو دەرەنجامانە بکرێت.

دۆق جۆرج کامبڵ[2] سەرنجمان بۆ ئەوە رادەکێشێت کە داروین گرنگی (هەستکردنی ڕاستەوخۆ)ی جوانی و دیزاینی زیندەوەرانی دەزانی، لەوبارەیەشەوە ئەو گفتوگۆیەمان بۆ باسەکات کە ساڵێك بەر لە مردنی[3] لەنێوان ئەو و داروینیدا ڕوویداوە. دۆق دەڵێت: ((وەك قسەکردن لەسەر بیردۆزە گەورەکەی

---

(١) فەیلەسوفی ئەمریکی ئەم خستنەڕووەی پێشکەش کردووە.

(٢) George Cambell: (١٨٢٩-١٩٠٠ز)، کە بە دۆق ئەرجێلی دووەم ناسراوە، سیاسەتمەدارێکی دەروشاوە و نووسەرێکە پسپۆڕ بوو لە زانست و ئاین.

(٣) لە کتێبی دۆق : ?What is Sciense ١٨٨٥ ئەوەرەکە بە ناوونیشانی Perceiving Design.

داروین-لەدیدی خۆی- کە بوونی مەبەست و ئامانجێك لە سروشتدا دەردەخات بە بەڕێز داروینم گوت: مەحاڵە بەبێ هەستکردن بەوەی کە بەرهەمی عەقڵێکی حەکیمانەیە سەیری بوون و چالاکییەکانی سروشت بکرێت، وەك زۆربوونی گوڵی ئۆرکیدا. هەروەها ئاماوم وەڵامەکەی مستەر داروین لەبیرناکەم، کاتێك بە چاوە ماندووەکانی سەیری کردم و گوتی: زۆرکات ئەو بیرۆکەیە دێتە ناو مێشکمەوە[1]، پاشان سەری لەقاند و گوتی: لە هەندێك کاتی تریشدا نامێنێت))، لە ڕاستیدا قسەکەی داروین دەرئەنجامێکی لۆژیکی نەبوو کە لەسەر چەند پێشەکییەك بنیاتنرابێت، بەڵکو گوزارشتکردن بوو لە هەستکردنی ڕاستەوخۆ.

دۆق حەقیقەتی بەڵگەی دیزاین بە شێوەیەکی سادە شیدەکاتەوە و دەڵێت: ((کێ دەڵێت کە بەڵگەی دیزاین لەسەر لێکچواندن دامەزراوە؟! لە ڕاستیدا داننان بەوەی کە زیندەوەران پێویستییان بە دیزاین هەیە لەسەر ئەوە دانەمەزراوە کە بە درووستکراوەکانمان بەراورد بکرێت، بەڵکو خستنەڕوونێکی سەربەخۆیە، جا بوونەوەرەکان لە کاتژمێر بچن یاخود نا، یان گەردوون لە خانوو بچێت یاخود نا، مەبەستیش لە لێکچواندنی بە درووستکراوەکانمان، ئەوە تەنیا بۆ ئاسانکردنی وێناکردنە بۆ عەقڵەکانمان)).

بەهای خستنەڕووەکەی بێهی لەوەدا نییە کە بەڵگەی عەقڵی و پێوانەیی لەسەر بوونی دیزاین پێشکەشکردووین، بەڵکو سەرنجی ڕاکێشاوین بۆ شتگەلێك کە وامان لێدەکەن (هەست بە بوونی دیزاین) بکەین.

لێرەدا ئاماژە بەوە دەکەین کە قورئانی پیرۆز بۆ بیرکردنەوە لە بەڵگە و نیشانەکانی ئاسۆکان و دەروونەکان ئاڕاستەمان دەکات، دەفەرموێت:

﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَـٰتِنَا فِى ٱلْـَٔافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ﴾ فصلت: ٥٣

---

(١) دەقی وشەکانی داروین: Well. That is Often comes over me with overwhelming Force.

واتە: (بەڵگەکانمانیان نیشان دەدەین لە ئاسۆکاندا و لە دەرونیاندا، تا ئەوکاتەی بۆیان دەردەکەوێت کە خودا حەقە). بانگمان ناکات بۆ بەڵگەیەکی پێوانەیی عەقڵی، بەڵکو بەڵگەی بەهێزترین بەکاردەهێنێت، ئەویش بریتییە لە راکێشانی سەرنج بۆ هەستکردن(سنريهم اياتنا)، تا بەڵگەکانی خوایەتی لە بوون و دەرروونەکان دەردەکەون.

## دیزاینی ناتەواو یاخود دیزاینی زیرەك...

بۆئەوەی بەڵگەهێنانەوەکەمان لەسەر بوونی دیزاینی زیرەك لە دامەزراوەی ژیاندا تەواوبێت، ئەوا پێویستە بەرپەرچی بەڵگەیەك بدەینەوە کە زۆرکات دارونییەکان پشتی پێدەبەستن بۆ سەلماندنی هەرەمەکێتی پەرەسەندن، ئەویش ئەو بەڵگەیەیە کە پێی دەڵێن (دیزاینی ناتەواو Imperfect Design)، مەبەستیان لەوەیە کە دیزاینی هەندێك ئەندامی زیندەوەران دەکرا لەم شێوەیەی ئێستایان باشتر بوایەن، بۆیە ئەگەر خودا دیزاینەرەکە بوایە ئەوا بە شێوەیەکی تێر و تەسەل بەدیدەهێنا.

دارونییەکان وەك نموونەیەك بۆ دیزاینی ناتەواو نموونە بە (تۆڕی چاوی مرۆڤ[1]) (شێوەی:٣٠) دێننەوە، چونکە وەرگرەکانی ڕووناکی لە تۆڕی چاودا دەکەونە نزیك رووی پشتەوەی، دارونییەکان ئەوە بە ناتەواوی لە دیزایندا هەژمار دەکەن، بەوپێیەی کە ئەو چینانەی کە لە رووی پێشەوەی تۆڕەکە بوونیان هەیە بەرلەوەی کە ڕووناکییەکە بکەوێتە سەر ئەو چینە تەنکەوە پەرش و

---

(١) تۆڕی چاو Retina کە ئەستوورییەکەی ئەوەندەی پەڕی جگەرە وایە، سەرەڕای ئەو تەنکییەی لە دە چینی دەمارەخانە پێکهاتووە، رووی پێشەوەی رووی لە ڕووناکییە، لەکاتێکدا رووی دواوەی رووی لە چینی دواترە، کە چینێکی تاریکی دەوڵەمەندە بە دەماری خوێن، کە بە (دەماراوی چاو Choroid) ناسراوە.

بڵاودەبێت، هەروەها ئەو دۆخە بۆتە هۆی بوونی پەڵەیەك لەسەر تۆڕەكە، كە بەهیچ جۆرێك هەستیاری بەرامبەر بە ڕووناكی نییە، كە بە (پەڵە كوێرەكە[١]) ناسراوە. داروینییەكان وایدەبینن كە باشتر وابوو كە وەرگرەكانی ڕووناكی دەبوایە لە رووی پێشەوەی تۆڕی چاو بوایە، بۆئەوەی كە رووی لە ڕووناكی بێت و بوونی پەڵە كوێرەكە پشتگوێ بخرێت.

لایەنگرانی دیزاینی زیرەكیش وەڵامیان دەدەنەوە و دەڵێن كە ئەوە باشترین دۆخە بۆ تۆڕی چاو،چونكە ئەم دۆخەی ئێستای وەرگرەكانی ڕووناكی وایانلێدەكات كە بە دەمارە خوێنییەكانەوە بلكێن، كە لە چینی دواتردا بوونیان هەیە، ئەمەش ڕێگا دەدات كە خوێنی تەواوی بۆ بڕوات، بەتایبەتی لە كاتێكدا كە خانە وەرگرەكان لە هەموو خانەكانی تری جەستە زیاتر پێویستییان بە ئۆكسجین هەیە. هەرچی بوونی پەڵە كوێرەكەیە ئەوا بە بواری بینینی تۆڕی چاوەكەی تر قەرەبوو كراوەتەوە.

بۆ بەهێزكردنی زیاتری ئەو چەمكە نموونەیەك لە سروشت دێنینەوە؛ لەوانەیە بۆ كەروێشك وا باشتر بێت كە خێراتر بێت بۆئەوەی كە بتوانێت لەو ڕێوییانە رابكات كە شوێنی دەكەون، بەڵام ئایا ئەوە نابێتە هۆی ئەوەی كە ڕێوییەكان لە برسا بمرن؟ دۆخی ئێستا نموونەییە بۆ زنجیرەی خۆراك و هاوسەنگی ژینگەیی.

كاتێك ئەندازیارەكان ئامێری (لاپتۆپ Laptop)یان دیزاین كرد، ڕەچاوی چەند ڕەگەزێكیان كرد، وەك قەبارە و كێش و نرخ و چاككردنەوە...و نەیانگوت كە شاشەی گەورەتر باشترە، ئەگەر بێتو ئەوە لەسەر حیسابی قەبارە و نرخ بێت، نەیانویست كە تەكنیكێكی زۆر بەرزی وەهای تێدا بەكاربێت كە نەتوانرێت كاری چاككردنەوەی بۆ بكرێت.

دیزاینی نموونەیی بریتی نییە لە دانانی هەموو ڕەگەزەكان لە سیستەمەكەدا بە باشترین شێوە بۆ ڕەگەزەكان خۆیان، بەڵكو بەوەی كە ڕەگەزەكە لە باشترین

---

(١) پەڵە كوێرەكە Blind Spot، بریتییە لەو شوێنەی كە دەماری بینینی تێدا لە تۆڕەكە دێتە دەرەوە و، هیچ وەرگرێكی ڕووناكی تێدا نییە.

دۆخیدا بێت بۆ خزمەتکردنی سیستەمەکە. لەبەرئەوە دەکرێ دیزاین وەك یەکێك لە ڕەگەزەکان دەربکەوێت کە کەمتر خزمەت بەخۆی دەکات، بەڵام بەشێوەیەکی باشتر خزمەتی دامەزراوەکە دەکات. کەواتە دیزاینی زیرەك سیستەمێکی تەواوە، نەوەك لە هەموو وردەکارییەکدا تەواوترین بێت. بەم شێوەیە بەڵگەی دیزاینی ناتەواو دەڕووخێت.

## دیزاینی زیرەك و پەرەسەندنی خودایی :

چەمکی دیزاینی زیرەك ئەو دیاردە بایۆلۆجییانە دەتوێژێتەوە کە سروشتی کوێرانە بێتوانایە لەوەی کە بتوانێت بە هەڕەمەکیتی و ڕێکەوت بەدیبێنێت، گرنگترین ئەو دیاردانەش:

**١- پەیدابوونی ژیان لە ماددەی نازیندوو:**

لە تەوەرەی پێنجەمدا چەمکی ژیان و دەرکەوتنی ژیانمان تاوتوێ کرد، هەروەك چۆن لەو تەوەرەیەدا باسمان لەو بەڵگانە کرد کە پاڵپشتی لە دیزاین دەکەن لە دەرکەوتنی ژیاندا، ئەو بەڵگانەی کە ناتوانرێ پووچەڵ بکرێنەوە، ئەوەش لەڕێی بیردۆزی زانیارییەکان کە بەڵگەی ئاڵۆزی سەربەخۆی خستەڕوو، هەروەها لەڕێی خستنەڕووی بەڵگەی ئاڵۆزی نەشیاو بۆ وردکردنەوە.

**٢- ئەنجامدانی جۆراوجۆرێتی گەورە لە بوونەوەردا.**

ئەو بابەتە هەر لەم تەوەرەیەدا باس دەکەین.

٣- دەرکەوتنی ئەو شتانەی کە مرۆڤ لە بوونەوەرەکانی تر جیادەکەنەوە، وەك عەقڵ و تواناکان (لەڕووی جۆر و چەندێتییەوە)...لەبەرئەوە تەوەرەی داهاتوو بۆ نزیکبوونەوە لە عەقڵی مرۆیی تەرخان دەکەین.

لە بواری جۆراوجۆریتی زیندەوەرانیشدا (پەرەسەندن) دوو قوتابخانە هەن، کە پەیڕەوی لە چەمکی دیزاینی زیرەك دەکەن:

أ- دیزاینی زیرەك و بەدیهێنانی تایبەتی (الخلق الخاص).

ب- دیزاینی زیرەك و پەرەسەندنی خودایی: ئەم قوتابخانەیەش دەبێتە دوو ئاڕاستە:

١- دیزاینی زیرەك و دەستخستنەناوی خودایی.

٢- دیزاینی زیرەك و پەرەسەندنی ئاڕاستەکراو.

## (أ) دیزاینی زیرەك و بەدیهێنانی تایبەتی (الخلق الخاص).

ئەم قوتابخانەیە لە کاتی پێناسەکردنی خۆی جەخت لەسەر چەمکی (دیزاینی زیرەك) دەکاتەوە بەبێ پڕژانە سەر (شێوازی بەدیهێنان)، ئەگەرچی باوەڕی بە بەدیهێنانی تایبەتی هەیە، هەر بوونەوەرێك بە تەنها. لە ڕۆژئاوادا دامەزراوەی دیسکەڤەری[١] Discovery Institute پەیڕەوی لەم ئاڕاستەیە دەکات، جگە لە مایکل بێهی (یەکێك لە کۆڵەگەکانی دامەزراوەکە)[٢].

ئەم قوتابخانەیە وایدەبینێت کە دانانان بە پەرەسەندن پشتگیری لە چەمکە بێباوەڕییەکان دەکات، لەسەر باوەڕداران پێویست دەکات کە بەرەوڕووی بوەستنەوە. بەمەش ئەو کۆمەڵەیە زۆر نزیك دەبن لە خەلقییەکان (الخلقويين) ئەوانەی کە دەستیان گرتووە بە تەفسیرە کەلەپوورییەکانی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و تەورات.

---

(١) ئەمە شتێکی نامۆ نییە، چونکە دامەزرێنەری یەکەمی دامەزراوەی Discovery Institute (کە یەکەمین کەس بوو رەواجی بە چەمکەکانی دیزاینی زیرەکدا لە رۆژئاوا)، ئەویش فیلیپ جۆنسۆن بوو، کە پارێزەرێك بوو پارێزگاری دەکرد لە خودا لەبەردەم چەمکە ماددییەکاندا. ئەو پیاوێکی زانستی نەبوو کە ویستی تێگەیشتن لە ژیان و بنچینەکەی بیجووڵێنێت. لەبەرئەوە ئەم دامەزراوەیە هەمیشە ئامانجی ئاینی رەچاو دەکات.

(٢) دوای کەمێکی تر دێینە سەر بۆچوونەکەی مایکل بێهی.

## (ب) دیزاینی زیرەك و پەرەسەندنی خودایی.

ئەوانەی پەیڕەوی لە دیزاینی زیرەك دەکەن وایدەبینن کە خودا میکانیزمی پەرەسەندنی بۆ بەدیهێنانی زیندەوەران بەکارهێناوە، کەواتە ئەوان باوەڕیان بە بیرۆکەی بنچینەی هاوبەش (الأصل المشترك) هەیە، بەوپێیەی کە بەڵگە زانستییەکان پاڵپشتی لە پەرەسەندن دەکەن ناتوانرێ پووچ بکرێنەوە[1]. هەروەها ئەوانە وایدەبینن کە هەڕەمەکێتی و ناحەتمییەتی ماددی ڕەها بوونی نییە، بەڵکو ویستی خودا لەپشت کرداری بەدیهێنانەوەیە. دوای ئەو ڕێسا هاوبەشە ئەو کۆمەڵەیە دابەش دەبن بۆ دوو کۆمەڵە:

ب-١- دیزاینی زیرەك و دەستخستنەناوی خودایی: ئەو کۆمەڵەیە وایدەبینن کە خودای بەدیهێنەر لەکاتێکەوە بۆ کاتێکی تر گۆڕانکاری جینی پێویستی بۆ پەیدابوونی بوونەوەری نوێ ئەنجامداوە، دەکرێ ئەو گۆڕانکارییانە بە (بازدانی ئاڕاستەکراو) وەسف بکرێن. لایەنگرانی ئەو چەمکە دەست بەوەوە دەگرن کە بوونەوەرەکان دەگەنە ئاستی ئاڵۆزی وەها کە پێویست دەکات دیزاینەر ڕاستەوخۆ دەست بخاتەناوی (نەوەك لەڕێی یاساکانی سروشتەوە)، هەنگاو بە هەنگاو تا تەواو دەبێت. ئەم خستنەڕووە بە خستنەڕووی میانڕەوی نێوان خستنەڕووی زانستی و خستنەڕووی ئایینی ئوسوڵی هەژمار دەکرێت، لە دامەزراوەی

---

(١) ئەوانەی پەیڕەوی لەم بۆچوونە دەکەن؛ لە ڕۆژهەڵات د.هانی رزق (لە سوریا) و، د.عمرو شریف (مامۆستای نەشتەرگەری و نووسەری ئەم کتێبەی بەردەستت) لە میسر، د. محمد باسل الگائی (مامۆستای فیزیا) لە عیراق. هەروەك چۆن پێشتریش د.أحمد مستجیر (مامۆستای بۆماوەزانی لە میسر) و د.مصطفی محمود (بیرمەندی ئیسلامی میسری)ش ڕەحمەتی خوایان لێبێت پەیڕەویان لەم بۆچوونە کردووە.

شایانی باسە کە بیرمەندی گەورە د.مصطفی محمود ئەم چەمکەی لە نووسینەکانیدا و لە بەرنامە تەلەفزیۆنییەکەیدا (العلم والإیمان) دا پێش سی ساڵ باسکردووە. لە وتەیەکیدا بۆچوونەکەی خۆی کورت کردۆتەوە، کاتێك دەڵێت زیادکردنی تەنها پیتێك بۆ وشەی (پەرەسەندن - تطور) و گۆڕینی بۆ (پەرەپێسەندن - تطویر) کێشەکە چارەسەر دەبێت(بەلایەنی کەمەوە لەڕووی ڕوونکردنەوە و داڕشتنەوە).

دیسکەڤەری لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا مایکل بێهی پەیڕەوی لەو بۆچوونە دەکات.

ب-٢- دیزاینی زیرەك و پەرەسەندنی ئاڕاستەکراو: ئەو کۆمەڵەیە وایدەبینن کە خودای بەدیهێنەر کۆدی بۆماوەیی(جینۆم)ی بە شێوەیەکی گونجاو و ڕێك و پێك لە خانەی یەکەمدا داناوە، بەجۆرێك کە لەگەڵ یاساکانی سروشتدا بێتەوە، ڕێگای بدات کە کرداری پەرەسەندن ئاڕاستە بکات. پێشەوای ئەو کۆمەڵەیەش زانای بایۆلۆجیای بەشی (فرانسیز کۆلێنز Francis Colins)ە، کە دەرئەنجامەکانی کارەکانی لە پرۆژەی جینۆمی مرۆییدا لە کتێبە ناوازەکەیدا (زمانی خودا The Language of God) دا نووسیوە، کە لە ساڵی ٢٠٠٦ز دا بڵاوی کردۆتەوە، دەمەوێ بۆچوونەکانی ئەو قوتابخانەیە لە چەند دێڕێکی کتێبەکەدا بخەمەڕوو. فرانسیز کۆلێنز[1] دەڵێت:

((بەتەواوی خۆبەکەمگرییەوە دەڵێم، کە ئێمە یەکەمین سەرەداوومان بۆ خوێندنەوەی کتێبی ژیان دەستکەوتووە، کە پێشتر جگە لە خودا کەس نەیدەزانی)).

((کارکردنم لە پرۆژەی جینۆمی مرۆیی هەلی ئەوەی بۆ ڕەخساندم کە بەراوردی نێوان دی ئێن ئەی بوونەوەرە جیاوازەکانم بۆ ڕەخسا، لە مرۆڤەوە تا دەگاتە نزمترین زیندەوەر، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی کە گەنجینەیەك بەڵگەی وردم دەستبکەوێت، کە ئاماژە بۆ شۆڕبوونەوەی زیندەوەران دەکەن لە (پێشینی هاوبەش Common ancestors)ەوە)).

((خشوع گرتمی، کاتێك ئەو دیزاینە سەرسوڕهێنەرەی بەدیهێنەری مەزنم بینی کە بە حیکمەتەکەی یاساکانی سروشت و بەندوبارەکانی داناوە، بەجۆرێك کە ڕێگا بە پەیدابوونی ئەستێرە و هەسارەکان و ڕەگەزەکانی مادده و تەنانەت ژیان و مرۆڤیش بدات)).

---

(١) فرانسیز کۆلێنز دەستەوازەی Biologos ی بەسەر مەزهەبەکەیدا داوە، بە واتای پەرەسەندن لەڕێی وشەی خوداییەوە.

((خۆم لەبەردەم بۆچوونێکدا بینییەوە کە لەم ڕۆژگارەدا، کە لە هەر ساتێکدازانست ناڕوونی لەسەر گیروگرفتێك لادەدات جێگرەوەیەکی بۆ شك نابەم، ئەو دید و بۆچوونەش چەمکی (پەرەسەندنی ئاڕاستەکراو Directed Evolution)ە.

((ئەو چەمکە داهێنانی من نییە، بەڵکو زۆرێك لە دیندارە دڵسۆزەکانیش پەیڕەوی لێدەکەن، کە قەناعەتیان بە پەرەسەندن هەیە[1].

هەروەها بیروباوەڕی زۆرێك لە هیندۆسەکان و مسوڵمانەکان و جولەکەکان و مەسیحییەکان و تەنانەت هەندێك لە پاپا سەردەمییەکانی ڤاتیکانیشە)).

کۆڵێنز ئەوە ڕووندەکاتەوە کە دیدی پەرەسەندنی ئاڕاستەکراو لەسەر ئەم چەمکانەی خوارەوە دامەزراوە:

١- بەدیهاتنی گەردوون لە نەبوونی ڕەهاوە بۆ بوون پێش نزیکەی١٣،٧ بلیۆن ساڵ. هەروەها بنچینەی گەردوون بە ژمارەیەکی زۆری ڕێکخستنی ورد Fine Tunning جیادەکرێتەوە، کە ڕێگای بە پەیدابوونی گەردوون و گەیشتنی بە شێوەی ئێستای داوە.

٢- سەرەڕای بوونی چەندان ئەگەری بێکۆتایی بۆ نەگونجان، ئەوا بنچینەی گەردوون و ڕێساکانی گەردوون تەواو گونجاون لەگەڵ خواستەکانی پەیدابوونی ژیان و پەرەسەندنی بوونەوەران.

٣- هێشتا میکانیزمەکانی پەیدابوونی ژیان بۆ ئێمە نەزانراوە، بەڵام کاتێك ژیان دەرکەوت، میکانیزمەکانی پەرەسەندن و هەڵبژاردنی سروشتی توانیویانە ئەو جۆراوجۆرێتییە گەورەیەی کە لە ئێستادا لە زیندەوەراندا دەیبینین بەدیبێنێت.

---

(١) لەوانە زانای بەناوبانگی ڕووەکناسی Asa Gray، دوای ئەویش بە پەنجا ساڵ، زانای بەناوبانگی حەفرییاتەکان Charless D. Walcott پەنجا ساڵ دوای ئەویش دوو گەورەترین زاناکەی پەرەسەندن لە سەردەمی ئێمەدا D.theodosius. G.G. Simpson.

٤- هەرکە ئەو پەرەسەندنە دەستییێکرد کە بەپێی یاساکانی سروشت ڕێکدەخرێت(کە بەدیهێنراوی خودا و یارمەتییە بەردەوامەکانییەتی)ڕێزبوون، ئیتر بەبێ پێویستبوون بە دەستخستنەناوی رووتی خودایی یاساشکێن.

٥- مرۆڤ (وەك لاشە) بەشێکە لە کرداری پەرەسەندن، لە پێشینی هاوبەشدا لەگەڵ زیندەوەرە سەرەکییەکاندا هاوبەشە[1].

٦- مرۆڤ لە لایەنی عەقڵیدا لەناو زیندەوەراندا تاکە، کە فرمانە عەقڵییە بەرزەکان لەخۆدەگرێت، بە لایەنی ڕۆحیش کە لە دامەزراوەی ڕەوشتی و فیترەتی گەڕۆك بەدوای خودا خۆیدەنوێنێت، ئەم دوو لایەنە نەچوونەتە ژێرباری کرداری پەرەسەندنەوە، بەڵکو دوو بەخششی ڕاستەوخۆی خودایین.

کۆڵینز ئەوە دڵنیادەکاتەوە، کە ئەگەر مرۆڤ ئەم پێنج چەمکە وەربگرێت، ئەوا دیدێکی لۆژیکی یەکگرتووی دەستدەکەوێت، کە لەو چەند دێڕەی خوارەوەدا کورتیدەکەینەوە[2]:

((خودا (کە شوێن و کات سنووورداری ناکەن) گەردوونی دروستکردووە، ئەو یاسا سروشتییانەی تێدا داناون کە بەڕێوەی دەبەن، بەمەش شانۆی ژیانی ئامادەکردووە.

خودا میکانیزمی پەرەسەندنی بەکارهێناوە بۆنەوەی ئەو جۆراوجۆرێتییە گەورەیە لە زیندەوەراندا ئەنجام بدات، لە بوونەوەرە وردەکانەوە تا دەگاتە ڕووەکەکان و هەموو جۆرەکانی ئاژەڵ.

بەهەمان شێوە خودا هەمان میکانیزمی بۆ دارشتنی لاشەی مرۆڤ بەکارهێناوە، ئەو زیندەوەرە زیرەکەی توانای عەقڵی و فیترەتی ئایینی و ڕەوشتی پێبەخشراوە)).

---

(١) سەرەکییەکان پلەیەکی مەمکدارەکانن کە مرۆڤ و مەیموونە بەرزەکان و مەیموونەکان لەخۆدەگرێت.

(٢) کۆڵینز ڕای خۆی دەخاتە پاڵ ڕای گەورە زانای جەفریاتەکان لە کامبریدج Simmon Conway Morris چونکە ئەو وایدەبینێت کە گەردوون بە جۆرێك لە وردی وەها ڕێکخراوە کە ڕێگا بە پەیدابوونی و بەردەوامبوونی و پەیدابوونی ژیان و بوونەوەرانی تر بدات، ئەمەشی بە توانای ژیان بۆ چوونە ناو قووڵایی ئامانجەکان Navigation وەسفکردووە.

گومانیش لەوەدا نییە، کە پەرسەندنی ئاڕاستەکراو بەتەواوەتی لەگەڵ زانست و دەقە ڕەسەنەکانی کتێبە ئاسمانییەکاندا یەکانگیر دێتەوە، بە وازهێنان لە لێکدانەوە و تەفسیرە کەلەپوورییەکان.

## میکانیزمی پەرەسەندنی خودایی :

بۆ ئەوەی هەر بیردۆزێك تەواوبێت ئەوا پێویستە ئەو میکانیزمانە بخرێنەڕوو کە تەفسیری میکانیزمەکە دەکەن، لەبەرئەوە ڕۆڵی پرسیارێکی زۆر گرنگ دێت؛ ئەو میکانیزمە چییە کە بەدیهێنەری زیرەك بۆ ئاڕاستەکردنی پەرەسەندن بەکاریهێناوە؟

دیدی کلاسیکی بۆ درووستبوونی پرۆتین(کە بەرپرسە لە بنچینە و چالاکی خانەکان و هەروەها شێوەی بوونەوەرەکەش) بریتی بوو لە (یەك جین بۆ یەك پرۆتین)، ئەم جۆرە تێگەیشتنەش بوو بە بەربەستێکی گەورە لەبەردەم تەفسیرکردنی گۆڕانی بوونەوەرێك بۆ بوونەوەرێکی تر، چونکە ئەوە پێویستی بە تێخستنی ژمارەیەکی زۆری جینات هەیە. پاشان ئەنجامەکانی پرۆژەی جینۆمی مرۆیی دەرچوون، دواتریش چەند دۆزینەوەیەکی کاریگەری بەدواداهات لە بواری زانستی بایۆلۆجیای بەشی، کە هەڵەیی دیدی کلاسیکی دەرخست، بەشداری کرد لە دانانی وێنەیەکی سەرەتایی و هێڵە پانییەکانی میکانیزمی پەرەسەندنی خودایی[1]. گرنگترین ئەو دۆزینەوانەش:

---

(١) ئەو زانایانەی کە گرنگی بە پەرەسەندنی ئاڕاستەکراو دەدەن هێشتا وەڵامێکی تەواویان دەستنەکەوتووە، ئەمەش بەڕای من دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێك، گرنگترینیان: پرسەکە زۆر ئاڵۆزە و لەگەڵ چەمکە غەیبییەکاندا تێکئاڵاوە و، ئەوەش کە ئەو زانایانە هێشتا هەر لە قۆناغی خستنەڕووی چەمکی (پەرەسەندنی ئاڕاستەکراودان) بۆ ناوەندە زانستییەکان، هەروەها بەربەرچدانەوەی بەردەوامی (خەلقییەکان و دارونییەکان)، کە لێکەوتەکانی دانانی بەم چەمکە دەزانن.

(١) دۆزینەوەکان ئەوەیان دەرخست کە هەمان جین (لەڕووی چەندێتی و جۆرەوە) توانای ئەنجامدانی جۆراوجۆرێتییەکی گەورەیان هەیە لە پرۆتینەکان و دواتریش لە بنچینە و شێوەی بوونەوەرەکان[1]. بۆنموونە یەك جین لە مێشی میوە (ذبابة الفاكهة) توانای بەرهەمهێنانی زیاتر لە ٣٧,٠٠٠ جۆری پرۆتینی هەیە!

(٢) فیزیای چەندیی (کوانتەم) بەو ناحەتمییەتەی دەیخاتەڕوو بەشداریکرد لە ئاڕاستەکردنی میکانیزمەکانی ئەنجامدانی ئەو جۆراوجۆرێتییە، لە بری ئەوەی کە تەنها جۆرێك بەپێی حەتمییەتی فیزیایی بەدیبێنێت.

(٣) بەم دواییانە سەلمێنراوە کە ئەو گۆڕانکارییانەی لە چالاکی جینەکاندا ڕوودەدات بە بۆماوەیی دەمێنێتەوە و سیفەتە نوێکە بۆ وەچەی زیندەوەرەکان دەگوازرێتەوە، کە ڕێگە بە پەرەسەندنی بایۆلۆجی دەدات. ئەمەش پێچەوانەی ئەو بۆچوونەیە کە پێشتر کۆڕایی لەسەربوو، بەوەی کە سیفەتە نوێیە وەرگیراوەکان بە بۆماوەیی ناگوازرێنەوە!

لە پشت ئەو هۆکارانەوە (میکانیزمەکانی جۆراوجۆرێتی پرۆتینەکان، ناحەتمییەتی فیزیای کوانتەم، بۆماوەیی سیفەتە بەدەستهاتووەکان) دیزاینەرە زیرەکەکە دەتوانێت دەست بخاتە ناو کارەکەوە؛ چ بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ بێت بۆ یەکلاکردنەوەی یەکێك لە ئەگەرە زۆر و زەوەندەکان (دەستخستنەناوی خودایی)، یاخود لەڕێی هۆکارە فیزیایی و کیمیاییەکان (پەرەسەندنی ئاڕاستەکراو) وەك تیشك و کەمی و زیادی ئۆکسجین یان پلەی گەرمی بەرز یان ماددە کیمیاییەکان و هی تر. گومانیش لەوەدا نییە، کە ئەو گۆڕانکارییانە بە ڕێك و پێکییەکی ڕادەبەدەر ڕوودەدەن، بۆئەوەی بتوانێت ئەو جۆراوجۆرێتییەی زیندەوەران رووبدات، هەروەها بۆئەوەی بتوانێت ئەو گونجان و ڕێکخراوییە بەرهەمبێنێت کە باسمان کرد لەنێوان دوو ڕەگەزی هەمان جۆر و لەنێوان دوو زیندەوەر یان سێ بوونەوەر لە جۆری جیاوازدا[2].

---

(١) لە پەراوێزەکانی تەوەری پێنجەمدا پێنج میکانیزممان باسکرد کە دەکرێ ئەم جۆراوجۆرێتییە بەدیبێنن.

(٢) دکتۆر حوسەین ئەحمەد ئەمین مامۆستای مێژووی لە میسر، بیردۆزێك دەخاتەڕوو کە شایەنی

بەپێی ئەم میکانیزمە، دەبینین کە خانەی یەکەمین جینات پێویستی تێدا هەبووە بۆ دەرکەوتنی ئەو جۆراوجۆرێتییە گەورەیەی لە زیندەوەراندا بوونی هەیە، تا ئەو ئاستەی کە دەتوانرێ بە خانەی زایگۆت Zygot بچوێنرێت (کە لە پیتانی هێلکە بە سپێرم پێکدێت)، کە هەموو ئەو جینانەی هەڵگرتووە کە بەرپرسن لە پەیدابوونی هەموو شانەکان و کۆئەندامەکانی زیندەوەرەکە، بە جیاوازی لە قۆناغە جۆربەجۆرەکانی کۆرپەلەدا. زانستی بایۆلۆجیا زۆر نموونەمان بۆ دەخاتەڕوو کە ئەوە دووپات دەکەنەوە[1].

هەروەها ڕوودانی تەقینەوە گەورەکەی بایۆلۆجیا Biological Big Bang کە لە سەردەمی کامبریدا پێش ٥٤٠ ملیۆن ساڵ ڕوویداوە پشتگیری لەم خستنەڕووە دەکات، کە تیایدا لەماوەی ٥-١٠ ملیۆن ساڵ زۆربەی ئەو زیندەوەرانەی لەئێستادا لەسەر زەویدا بوونیان هەیە پەیدابوون، پەیدابوونی ئەو زیندەوەرانە بە جیاوازی کۆدی بۆماوەییان و لە ماوەیەکی زۆر کورتدا، کە بە دیدی مێژوویی پەرەسەندنی نقوومبوو لە قەدیمیدا وەك چاوترووکانێك وایە. پێویستی بەوە هەیە کە بە ئاسانی و بەخێرایی جیناتی ئەو بوونەوەرانەمان دەستبکەوێت، ئەمەش ئەو میکانیزمە ڕێگا بە پەیدابوونی دەدات کە باسمان کرد.

---

سەرنجدان و تێفکرینە، کە ناوی (خاوکردنەوە و هاندانی جینات Gene Suppression- Activation Theory=G-SAT ی لێناوە و لە کتێبێکدا بڵاویکردۆتەوە بە ناونیشانی Genes and Human Nature لە ساڵی ٢٠٠٧ز، ئێمەش لە کتێبی (كيف بدأ الخلق) دا کورتمان کردۆتەوە، لە تەوەری حەوتەمدا.

(١) بۆنموونە:

١- گواستنەوە لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر لە کاتی گەشەکردنی بوونەوەراندا، بۆنموونە لە کرمی ئاوریشمدا، کە لە قۆناغی سەرەتایدا لەشێوەی کرمە و دواتر بەتەواوەتی دەگۆڕێت و دەبێت بە پەپوولە.
هەروەها لە زیندەوەرە وشکاوەکییەکانی وەك بۆقی کلکدار، کە لە سەرەتادا وەك ماسییەکان بە ڕیشەکەرانە هەناسە دەدات و، پاشان دەبێتە بۆقی تەواو و وەك ئاژەڵەکانی تر لەڕێی سییەکانەوە هەناسە دەدات.
٢- ئەو گۆڕانکارییانەی بارودۆخی دەوروبەر فەرزیان دەکەن، وەك ئەوەی کە لە ماسی جۆری یابانیدا ڕوودەدات Japanes Gobby، کە لە کۆمەڵی ئەم جۆرە ماسییەدا یەك مێینە هەیە، کە ئەگەر دووربخرێتەوە یەکێك لە نێرینەکان دەبێتە مێینە و، هەرکات گێڕدرایەوە مێینە نوێیەکە دەگۆڕێتەوە بۆ نێرینە!

گەورە فەیلەسووفی هاوچەرخ ریچارد سوینبێرن پەرەسەندنی ناڕاستەکراو بە دیدێکی فەلسەفی شیدەکاتەوە و دەڵێت: ئەو میکانیزمانەی خودا بۆ پەرەسەندنی بوونەوەر لە سروشتدا دایناون هاوشێوەی ئەو ئامێرانەن کە مرۆڤ بۆ درووستکردنی ئامێری تر درووستیکردوون. لە ڕاستیدا دۆزینەوەی میکانیزمەکانی پەرەسەندن دیزاینەریان هەنگاوێك بردە دواوە؛ چونکە لە بری ئەوەی کە خودا بەدیهێنەری ڕاستەوخۆ بێت بوو بە بەدیهێنەر لەڕێی میکانیزمەکانەوە. وتە بەناوبانگەکەی فرانز کۆلێنزیش ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کاتێك گوتی: چی ڕێگرە لە بەردەم خودا کە میکانیزمی پەرەسەندن لە بەدیهێناندا بەکاربێنێت؟!

لەڕاستیدا دەنگ هەڵبڕین و قسەکردن بەدەنگی بەرز دەربارەی میکانیزمەکانی پەرەسەندنی داروینی و وەسفکردنیان بەوەی کە هەڕەمەکی و کوێرانەن و هیچ ئامانجێکیان لەپشتەوە نییە، دووبارەکردنەوەی بەردەوامی ئەوە لەلایەن بێباوەڕەکان لەنووسینەکانیاندا، وا لە مرۆڤ دەکات وا هەست بکات کە لێکۆڵەران دوای لێکۆڵینەوەیەکی زۆر گەیشتوونەتە ئەو دەرەنجامەی کە هیچ عەقڵێکی دیزاینەر لەپشت بازدانەکان و هەڵبژاردنی سروشتییەوە نییە، ئەمەش لە حەقیقەتدا وەهم و تەڵەکەبازییە، چونکە هیچ کامێك لە بێباوەڕەکان لەوەیان نەکۆڵیوەتەوە کە ئەو میکانیزمانە لەکوێوە هاتوون!!.

گەورە زانای فیزیایی سێر جۆن هۆفتۆن هەستی بەو واتایە کردبوو، گوتوویەتی: تێگەیشتنمان لە هەندێك لەو میکانیزمانەی کە گەردوون و دامەزراوە زیندووەکان بەهۆیانەوە کاردەکەن ئەوە ڕەتناکەنەوە کە دیزاینەرێکیان لەپشتەوەبێت. چونکە هەرچەند کاتژمێر ئۆتۆماتیکیش بێت ئەوە ناگەیەنێت کە دیزاینەرێکی لەپشتەوە نەبێت.

## ئایا دیزاینی زیرەك زانستە؟

گومان لەوەدا نییە کە یەکێك لە گرنگترین ئامانجەکانی زانست بریتییە لە گەیشتن بەوەی کە چۆن شتەکان هاتوونەتە بوون و چۆن کاردەکەن، چونکە زانست هەوڵی گەڕان بەدوای حەقیقەتدا دەدات، هەتا ئەگەر لە تەفسیرە مادییەکانیش دەربچێت. ئەمە دید و تێڕوانینی گەورە زانایان بووە بە درێژایی مێژوو، وەك ئومحوتەب و زەهراوی و ئیبن هەیسەم و نیوتن و ئەنیشتاین، تا دەیەکانی کۆتایی ئەو دید و تێڕوانینە گۆڕانکاری بەسەردا نەهات، دوای ئەوەی زۆر کەس بانگەشەیان بۆ ئەوە کرد (کە دیدی ماددیگەرایی تاکە ڕێگای گەیشتنە بە حەقیقەت). گومانیش لەودا نییە کە ئەم قسەیە پێچەوانەی زانستە! چونکە بە شێوازێکی زانستی، یاخود لۆژیکی تاقییان نەکردۆتەوە!.

ئەو پێناسەیەی زانایانی نوێ بۆ زانست کردوویانە داروینیزم قەبووڵ دەکات و جگە لەو هەموو ئەوانی تر لە گۆڕەپانەکەی دەردەکات! لەبەرئەوە لایەنگرانی چەمکی دیزاینی زیرەك ویستوویانە کە چەمکەکەیان لەناو سنووری جیهانی فیزیادا بپارێزن، بۆئەوەی ناچارنەکرێن بخرێنە جیهانی میتافیزیاوە، لە خستنەڕووەکەیاندا جەختیان لەسەر یەك پرسیار کردۆتەوە؛ ئایا لەپشت ئەم بوون و ژیانە و جۆراوجۆرێتی بوونەوەران و عەقڵی مرۆڤ (دیزاین Design)ێك بوونی هەیە، یاخود (ڕێکەوت و هەڕەمەکێتی) توانای ئەوەیان هەیە کە ئەم بوونەوەرانە بە شێوەیەکی خۆکردانە بەدیبێنن؟ لایەنگرانی ئەم قوتابخانەیە داوای ئەوە دەکەن کە پرسە سەرەکییەکەیان (دیزاین یان نادیزاین) بخرێتە ژێر لێکۆڵینەوەی زانستییەوە. ئەو قوتابخانەیە گەڕان بەدوای سەرچاوەی ئەم دیزاینە ناخەنەڕوو، بۆئەوەی کە دیزاینی زیرەك نەبێتە پرسێکی فەلسەفی و ئایینی و لە سنووری زانست بەو شێوەیەی کە زانایان پەیڕەویان لێکردووە دەرنەچێت.

لایەنگرانی دیزاینی زیرەك پشت بەوە دەبەستن کە مەنهەجی زانستی لە لێکۆڵینەوەدا بەوە وازدەهێنێت کە بەدوای هۆکاری ڕاستەوخۆی دیاردەکە یاخود هۆکارێکی پێشینیدا بگەڕێ، لەکاتێکدا کە پێویستە لێکۆڵینەوەکە بۆ هۆکاری یەکەمین درێژببێتەوە. بۆنموونە ئەگەر زانایان حەفریاتێکیان دۆزییەوە لە ناوچەیەکدا-بۆ نموونە دەفرێك- ئەوا بەدوای ژیارستانییەتەکە و بەدوای ئەو مرۆڤەدا دەگەڕێن کە ئەو دەفرەی درووستکردووە، ناچنە سەر سەرچاوەی ئەو ژیارستانییەتە و چۆنیەتی پەیدابوونی ئەو مرۆڤە. بە هەمان شێوە لە کاتی گەڕان بەدوای کەوتنی تەنەکان، ئەوا زانست تەنیا لە سنووری یاسای کێشکردندا دەوەستێت و بەدوای سەرچاوەی بەرزی ئەو یاسایەدا ناگەڕێ. بەهەمان شێوە، کاتێك داروینییەکان باسی کردەی سروشت و هەڵبژاردنی سروشتی دەکەن، بەدوای بنچینەی سروشت و سەرچاوەی یاسای هەڵبژاردنی سروشتیدا ناگەڕێن.

لە ڕاستیدا سەلماندنی هەڵەیی دیزاینی زیرەك وەك چەمکێکی زانستی پێویستی بەوە هەیە تەفسیرێك بۆ ئەو زانیارییە زۆر و زەوەندە بخرێتەڕوو کە کۆدی بۆماوەیی هەڵیگرتووە، هەروەها ئەگەری دەرکەوتنی سیستەمێکی ئاڵۆزی نەشیاو بۆ وردکردنەوە بەبێ پەنابردنە بەر زیرەکی، لەکۆتاییدا ئەو هەوڵانە ئەنجامدران و سەلمێنرا کە مەحاڵە سروشت بتوانێت ئەو کارە ئەنجام بدات.

سەرەڕای ئەوەش (ئەکادیمیای نەتەوەیی بۆ زانستەکان National Academy of Sciense) لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا رایگەیاند کە دیزاینی زیرەك زانست نییە! چونکە ناتوانرێت بخرێتە ژێر هەڵسەنگاندن بە ڕێگای زانستییانە، مایکل بیهی وەڵامیدانەوە و رایگەیاند کە ئەم هەڵوێستەی زانایانی ئەکادیمیا جێگای گاڵتەجارییە، ئەوان تەمەنی خۆیان لەوەدا خەرج کرد تا بیسەلمێنن کە دیزاینی زیرەك ناخرێتە ژێر هەڵسەنگاندنی زانستی، ئایا ئەمە ئەوە ناسەلمێنێت کە دەچێتە ژێر هەڵسەنگاندنی زاستییەوە؟!

## دیزاینی زیرەك لە دادگادا :

سەرەڕای ئەوەی کە زانا ماددیگەراکان دان بە بوونی زیرەکیدا دەنێن لە سروشتدا، بەڵام ئەوە رەتدەکەنەوە کە دان بە چەمکی (دیزاینی زیرەك)دا بنێن! ئەوان لە هەنگاوی دواتر دەترسن، کە بریتییە لە داننان بە (دیزاینەری زیرەك)،پاشان داننان بە ئایینەکان و، ئەو ڕووداوانەی بەدوایدا دێن لەوەی کە دووبارە تاریکی باڵ بەسەر ئەوروپادا بکێشێتەوە هاوشێوەی سەدەکانی ناوەڕاست. لەپێناو خۆبواردن لەو دەرەنجامانە، ماددیگەراکان لە پێناسەکانی زانستدا تەنیا ئەوانە هەڵدەبژێرن کە دیزاینی زیرەك دەخەنە دەرەوەی چوارچێوەکەیان! ئایا ئەوان لە هەڵبژاردنی پێناسەکاندا پێکاویانە؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە، با پێکەوە سەرنجی ئەو کەیسە بدەین کە لە ساڵی ١٩٨٢ز دا لە ویلایەتی (ئارکانساس Arkannsas)ی ویلایەتە یەکگرتووەکاندا بەرزکراوەتەوە، دەربارەی ئەوەی ئایا دەکرێ بایۆلۆجیا لە دیدی دیزاینی زیرەك هاوشانی دیدی داروینیزم لە قوتابخانەکاندا بخوێندرێت[1]؟.

دادوەرەکە بەوە بڕیاریدا کە دیدی دیزاینی زیرەك دیدێکی ئایینییە و دیدێکی زانستی نییە، کەواتە نابێت لە قوتابخانەکاندا بخوێندرێت. ئایا دادوەرەکە لە بڕیارەکەیدا پێکاویەتی؟

لەڕووی چۆنیەتی حوکمدا، دادوەرەکە خاسیەتەکانی زانستی دیاریکردووە و بەراوردی کردووە بە خاسیەتەکانی دیدی دیزاینی زیرەك و ئەو حوکمەی

---

(١) جگە لە دۆسیەکەی ویلایەتی ئەرکانساس، لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا دوو دۆسیەی تر هەن کە تیایاندا حوکم بەسەر دیزاینی زیرەکدا دراوە. دۆسیەی ویلایەتی ئەریزۆنا لە ساڵی ١٩٨٧ز و دۆسیەی ناوچەی ڕوفەر لە ویلایەتی پەنسلڤانیا، لە ساڵی ٢٠٠٥ز، کە تیایدا دادوەر جۆن جۆنز بەناوبانگ بوو و، لە هەردوو دۆسیەکەدا بڕیارێکی هاوشێوەی دۆسیەکەی ویلایەتی ئەرکانساس درا.

پێشووی دەرکردووە. بەراوردەکەی دادوەرەکە لەڕێی ئەم خشتەیەی خوارەوەدا دەخەینەڕوو:

| خاسیەتەکانی زانست و پرسە زانستییەکان | خاسیەتەکانی دیدی دیزاینی زیرەك |
|---|---|
| ١- دیاردە زانستییەکان دەخرێنە ژێر تێبینیکردنەوە Observable | ناچنە ژێر تێبینیکردنەوە Unobservable |
| ٢- لەگەڵ دیاردە و شتە دووبارەبووەکاندا مامەڵە دەکات Repeatable | لەگەڵ هەڵوێست و ڕووداوی دووبارەنەبووەوە مامەڵە دەکات (کرداری دیزاین) Unique Event |
| ٣- دیاردە زانستییەکان دەخرێنە ژێرتاقیکردنەوەوە Testable | ناخرێتە ژێر تاقیکردنەوەوە Untestable |
| ٤- لە جیهانی سروشت دەکۆڵێتەوە Natural | لە دواوەی سروشت دەکۆڵێتەوە (میتافیزیك) Super-Natural |

**ئێستاش با بێینە سەر دیدی شیکاری ئەو خاسیەتانە، تا ئەو هەڵە و پەڵانەی تێیدا هەیە ببینین:**

**١- چوونە ژێر باری تێبینیکردن:** زۆرکات زانایان ئەو پرسانە قەبووڵ دەکەن کە بە هیچ جۆرێك ناچنە ژێر باری تێبینیکردنەوە (وەك کوارکەکان و بیردۆزی الاوتار) ئەگەر بێتو توانای تەفسیرکردنی دیاردە زانستییەکانیان هەبێت، هەروەها دارونییەکان دەڵێن کە پەرەسەندنی جۆرێك بۆ جۆرێکی تر Macro Evolution زانستە، سەرەڕای ئەوەی کە ناچێتە ژێر باری تێبینیکردنەوە! کەواتە چوونە ژێر باری تێبینیکردن لە پرسی زانستیدا بە مەرج ناگیرێت.

**٢- دووبارەبوونەوەی دیاردەکە:** ناکرێ ئەو خاسیەتە بۆ دیاردەی زانستی بە مەرج بگیرێت، چونکە زانایان زۆرێك لە دیاردە دووبارەنەبووەکان(و ئەوانەش

کە شیاوی دووبارەبوونەوە نین) بە دیاردەی زانستییان هەژمار دەکەن، وەك تەقینەوە گەورەکەی گەردوون و سەرەتای ژیان لەسەر زەوی.

٣- چوونە ژێر باری تاقیکردنەوە: دادوەرەکە بەو بیانووە دیزاینی زیرەکی لە زانست دوورخستەوە گوایە ناچێتە ژێر باری تاقیکردنەوەوە، سەرەڕای بەڵگەهێنانەوەی بە قسەی داروینییەکان کە دەڵێن ئەم چەمکە دوای تاقیکردنەوە هەڵەیی سەلمێنراوە!! چۆن دەکرێ چەمکێك نەخرێتە ژێر تاقیکردنەوەوە و تاقیشکرابێتەوە؟!

٤- سروشت و دواوەی سروشت: چەمکی دیزاینی زیرەك لە شتی سروشتی دەکۆڵێتەوە، وەك دی ئێن ئەی و یاساکانی سروشت، هەرچی دواوەی سروشتە، کە خودای بەدیهێنەرە، ئەوا دیزاینی زیرەك نایخاتە ژێر لێکۆڵینەوە، چونکە ئەوە بوارێکی تری هەیە.

## پێناسەکانیان بە پێوانە هەڵبژاردووە :

لە پرسەکەی ئارکانساس دادوەر عارەبانەی پێش ئەسپەکە خستووە! چاوەڕێی چی بکەین ئەگەر لە بڕیاردانمان پشت بە پێناسەیەکی زانست ببەستین کە تەنیا بەسەر هۆکارە سروشتییەکاندا کورتکراوەتەوە؟ گومان لەوەدا نییە کە ئەگەر لێکۆڵینەوەکەمان بەوە دەستپێبکەین کە زانست تەنیا لە ماددە و وزە نەبێت لە هیچی تر ناکۆڵێتەوە، ئەوا هەڵدەستین بە رەتکردنەوەی هەموو شتەکان جگە لەم دووانە. دادوەرەکە لە ناو پێناسەکانی زانست پێناسەیەکی وای هەڵبژاردووە کە دەرەنجامەکەمان بەسەردا فەرز دەکات، ئەم مەنهەجە پڕ کەموکورتییەش بە (لۆژیکی بازنەیی Circular Reasoning) ناسراوە.

## باوکی نەزانی: دیزاینی زیرەکە یان داروینیزم

دوای ئەوەی ئەوەمان دەرخست کە کەوتۆتە عەقڵی زۆر کەسەوە(لەناویشیاندا دادوەرە ئەمریکییەکان) لە جۆرە تێکەڵکردن و شێواندنێك دەربارەی چەمکی دیزاینی زیرەك، تەنانەت دەربارەی زانستیش! بە سادەیی دەڵێین: بوون وا دەردەکەوێت کە دیزاین کراوە، چونکە هەر بەڕاستی دیزاینکراوە. ئەوەی نکۆڵیش لەوە دەکات پێویستە لەسەری بەڵگە لەسەر هەڵەیی ئەوە بۆ بخاتەڕوو کە لەبەرچاومان دیارە. پێویستە لەسەریان بیسەلمێنن کە ئەو زیندەوەرەی دەوەڕێت و کلکی وەکو سەگ دەجووڵێنێت سەگ نییە. لەسەر ئێمە پێویست نییە کە بیسەلمێنین کە سەگە، ئەوەندە بەسە کە وەك سەگ دەردەکەوێت!

لە ڕاستیدا دیزاینی زیرەك باشتر دەخرێتە ژێر تاقیکردنەوەی زانستی لە پەرەسەندنی داروینی؛ ئایا داروینییەکان بێتوانا نەبوون کە دیدێکی مەعقول (تەنیا دید و بۆچوونێك) لەسەر هەنگاوەکانی پەیدابوونی قامچی بەکتریا بخەنەڕوو، بەبێ پەنابردنە بەر دیزاینی زیرەك؟

ئەوەی جێی گاڵتەجاڕییە، ئەوەیە کە داروینییەکان لایەنگرانی دیزاینی زیرەك بەوە تۆمەتبار دەکەن کە بە پاشخانێکی ئایدۆلۆجی مامەڵە دەکەن. لەکاتێکدا پێچەوانەکەی ڕاستە! چونکە زۆربەی ئەو کەسانەی پاڵپشتی داروینیزم دەکەن بەهۆی بەهێزی بەڵگەکانەوە نییە (لەوانەیە ئەو بەڵگانە هەر نەزانن!) بەڵکو لەبەر هەڵوێستی ڕەتکەرەوەیانە بۆ ئایین و، زانینی ئەو لێکەوتانەی بەدوای دیزاینی زیرەکدا دێن. ئەمەیە کە وا لە نکۆڵیکارانی دیزاینی زیرەك دەکات کە کاردانەوەیان هەبێت و تووڕە ببن کاتێك کە باسی دیزاینی زیرەکیان گوێ لێدەبێت!.

داروینییەکان بەڵگەهێنانەوە بە دیزاینی زیرەك لەسەر بوونی خودای بەدیهێنەر بە بێتوانابوون لە تەفسیرکردنی هەندێك دیاردەی غەیبی هەژمار دەکەن (خودای

پڕکردنەوەی بۆشاییەکان) واتا بەڵگەیەکە کە (لەسەر نەزانین بنیاتنراوە). بۆ ئەو قسەیەشیان پشت بە ڕێسا لۆژیکییەکە دەبەستن کە دەڵێت (نابێت نەبوونی بەڵگە بکەینە بەڵگە).

Absence of evidence I not evidence.

بەوەی کە لە تەوەرەی سێیەمدا باسمان کرد وەڵامی ئەو کەسانە دەدەینەوە، کە ئێمە خودا وەك هۆکاری یەکەم تەماشا دەکەین، نەك وەك ڕووداوی یەکەم، واتا بۆ تەفسیرکردنی ئەوەی کە زانست تەفسیری کردووە، نەوەك ئەوەی کە زانست لە تەفسیرکردنی بێتوانا بووە. هەروەها کاتێك لایەنگرانی دیزاینی زیرەك تەفسیرە ماددییەکان ڕەتدەکەنەوە ئەوە ڕەتکردنەوەیەك نییە لەسەر کەمی زانیاری وەستابێت (واتا ڕەتکردنەوەیەکی نەزانانە بێت)، بەڵکو (ڕەتکردنەوەیەکە کە زانیاری لەپشتەوەیە).

بۆ ڕوونکردنەوەی جیاوازی نێوان هەردوو ڕەتکردنەوەکە نموونەیەك دێنینەوە: ئەگەر زانایانی شیکاریی و زانایانی فەرمانەکانی ئەندامەکانی لەش کۆبوونەوە، لە دوای گفتوگۆیەکی دوورو درێژ گەیشتنە ئەو دەرەنجامەی کە مرۆڤ ناتوانێت بەبێ پشت بەستن بە ئامرازێکی دەرەکی بفرێت، بۆیە هەر مرۆڤێکمان دیت دەفرێت ئەوا ئامرازێکی یاریدەدەری هەیە وەك فڕۆکە یانە پەرەشووت یان ئەوەتا ئامێرێکی بەکار هێناوە کە هێزی کێشکردنی زەوی نەهێڵێت. ئایا لەو کاتەدا دەکرێ بابای بەرهەڵستکار بڵێت: نەخێر.. لەوانەیە دوای ماوەیەك زانست ئیمکانیەتی ئەوە بدۆزێتەوە کە بکرێ مرۆڤ توانای فڕینی هەبێت بەبێ پشتبەستن بە هیچ ئامێرێك. ئایا کە ئەم قسەیە ڕەتدەکەینەوە، ڕەتکردنەکەوەکەمان بۆ کەمی مەعریفەی زانستی (نەزانین و جەهل) دەگەڕێتەوە یان ڕەتکردنەوەیەکی بە زانستەوەیە.

لەڕاستیدا داروینییەکان بەدوای تەفسیری ماددیدا دەگەڕێن بۆ پەیدابوونی ئەو دیاردانەی شیاوی وردکردنەوەنین، یان ئەوانەی کە ئاڵۆزی سەربەخۆیان هەیە (وەك قامچی بەکتریا)، هەر کات لەو تەفسیرکردنەوەیە بێتوانابوون، بەوە

دڵی خۆیان دەدەنەوە کە زانست دواتر تەفسیرێکی گونجاوی بۆ دەخاتەڕوو، ماددیگەراکان زانستیان کردۆتە خودای پڕکردنەوەی زانیارییەکان!.

کات دەڕوات، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زانست حەقیقەتی زیاتر دەدۆزێتەوە کە زانایان تووشی سەرسامی دەکات، تا ئەو ئەندازەیەی گوتراوە ((زانست بە زنجیرەی ژمارەیی زیاددەکات و نەزانیش بە زنجیرەی ئەندازەیی کەمدەکات[1]!!)). ئێستا بێت یان دواتر، ماددیگەراکان هیچ ڕێگایەکیان لە بەردەمدا نییە کە بتوانێت زۆرێك لەو پرسانەیان بۆ تەفسیر بکات کە لێیان بۆتە گرێ، جگە لە دانان بە چەمکی دیزاینی زیرەك.

لەبەرئەوە جێیمس شاپیرۆ (مامۆستای بایۆلۆجیا لە زانکۆی شیکاگۆ) دەڵێت، داروینییەکان هیچ تەفسیرێك بۆ پەیدابوونی ژیان لەسەر ئاستی خانەیی یان بایۆکیمیایی ناخەنەڕوو، هەموو ئەوەی پێشکەشی دەکەن تەنیا چەند تێڕوانینێکی ناتەواو و بێمانان! شاپیرۆ تەحەددییەکی گەورە دەخاتەڕوو و دەڵێت: ئەگەر بمانەوێ هەریەکە لە (زانست) و (نەزانی) بەسەر هەریەکە لە داروینیزم و دیزاینی زیرەکدا دابەش بکەین، ئەوا پێویستە چۆن دابەش بکرێن؟ کامەیان دەتوانن وەڵامی پرسیارەکان بدەنەوە دەربارەی:

- سەرچاوەی زانیارییەکان لە کۆدی بۆماوەییدا (دی ئێن ئەی).

- سەرچاوەی (ئاڵۆزی سەریەخۆ).

---

(١) شوێنکەوتە حیسابییەکان و شوێنکەوتە ئەندازەییەکان: شوێنکەوتەکان بریتین لە کۆمەڵێکی شوێنکەوتە، کە زانایانی بیرکاری بەپێی پەیوەندی نێوان ئەو سنوورانەی کە لێی پێکهاتووە ناوی جیاوازیان لێدەنێن. بۆنموونە شوێنکەوتەی ٢،٤،٦،٨ شوێنکەوتەی حیسابین، بەوپێیەی کە بەئەندازەیەکی جێگیر لەوەی پێش خۆی زیاد دەکات و، ئەو ئەندازەیەش بە بنچینەی شوێنکەوتەیی ناسراوە.
هەرچی شوێنکەوتەی ئەندازەییە، ئەوا ئەندازەکە جاران دەکرێت(بنچینەی شوێنکەوتەیی) بۆنموەی ئەو ئەندازەیەمان دەستبکەوێت کە بەدوایدا دێت بۆنموونە ٢،٤،٨،١٦،...و بەم شێوەیە.
بەمەش تێکڕای زیادبوون لە شوێنکەوتەی ئەندازەییدا زۆر زیاتر دەبێت لە شوێنکەوتەی ژمارەیی، ئێمەش لە بەنموونە هێنانەوەی لەو شوێنەدا مەبەستمان ئەوەیە. ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە هەر کات زانست وەڵامی پرسیارێکی دایەوە، دەرگا بۆ چەند پرسیارێکی تر واڵا دەکات.

- چۆن (ئاڵۆزی نەشیاو بۆ وردکردنەوە لەناکاو دەردەکەوێت؟).

- کێ یاساکانی سروشتی داڕشتووە؟

ئایا داروینیزم دەتوانێت وەڵام بداتەوە؟

گومان لەوەدا نییە کە چەمکی دیزاینی زیرەك دەتوانێت.

کەواتە کێ نەزان و نەفامە؟!

## داروینیزم - نەوەك دیزاینی زیرەك - زانست پەكدەخات!

داروینییەکان بەردەوام دەڵێن کە دانتان بە دیزاینی زیرەك زانست پەكدەخات، بەڵام لەڕاستیدا ئەوەی زانست پەکدەخات داروینیزمە، با نموونەیەك لەسەر ئەوە بێنینەوە:

سەرنجی دەستەواژەیەکی وەك دی ئێن ئەی پشتگوێخراو بدە Junck DNA کە بایۆلۆجییەکان دایانتاشیوە، دوای ئەوەی بینیان کە کۆدی بۆماوەیی مرۆڤ تەنیا ١،٢٪ ی دی ئێن ئەی هەڵگرتووە، بەوپێیەی کە باقییەکەی تر (٩٨،٨٪) هیچ فرمانێکی نییە! بوونی ئەو ئەندازە گەورەیەی (دی ئێن ئەی)یان گێڕاوەتەوە بۆ هەڕەمەکێتی. داروینییەکانیش هەڵەکەیان قۆستۆتەوە و گوتوویانە کە ئەگەر لەپشت پەیدابوونی خانە دیزاینەرێکی زیرەك هەبوایە ئەوا تەنیا ئەندازەی پێویستی دی ئێن ئەی لەناو ناوکدا دادەنا.

هەرچی ئەوانەن کە لایەنگیری دیزاینی زیرەکن، ئەوا باوەڕیان وایە کە مەحاڵە خودا ئەو کەموکوڕی و خراپ بەکارهێنانەی ئەنجامدابێت، ئەویان ڕەتکردۆتەوە کە ئەو ئەندازە گەورەیە بێ سوودەی ماددەی زیندووی لەناو ناوکی

خانەدا دانابێت. هەر ئەوەش سەلمێندرا، کاتێك سەلمێندرا کە ئەو دی ئێن ئەیەی بە پشتگوێخراو ناودەبرێت فرمانێکی وەهای هەیە کە بەبێ ئەو ژیان پەیدانابێت، کە بەرپرسە لە ئاڕاستەکردنی کاری جیناتی زیندەوەر، تا ئەو ئەندازەیەی کە ئەو ڕۆڵبینینە وەك چەند زانستێکی سەربەخۆ دەرکەوتوون، کە بە (زانستەکانی کۆنترۆڵکردنی جینات Epigenetics) ناسراون. بەم شێوەیە چەمکی دیزاینی زیرەك بۆتە پاڵنەر (نەوەك بەربەست) بۆ گەڕان بەدوای تەفسیرە زانستییە درووستەکانی یەکێك لە گەورەترین ئەو گیروگرفتانەی رووبەڕووی مرۆڤ دەبنەوە، کە بریتییە لە ژیان.

لەڕاستیدا یەکێك لە گەورەترین کێشەکانی داروینییەکان ئەوەیە کە دەرکیان بەو ئاڵۆزییە سەرسوڕهێنەرە نەکردووە کە لە دیاردەی ژیانندا هەیە، بۆیە بە بۆچوونە ساکارەکان خۆیان خەڵەتاندووە، لەگەڵ داننان بە هەڕەمەکێتی سەرچاوەکەی. ئەگەر داروین بیانوویەکی هەبوویێت بۆ پەیڕەویکردنی ئەو هەڵوێستە، ئەوا داروینییەکانی سەردەم دوای ئەو هەموو زانیاریانەی دۆزراونەتەوە دەربارەی ئاڵۆزی لە بنچینە و فرمانی ماددەی زیندوو و کۆدی بۆماوەییدا هەیە هیچ بیانووێکیان نییە.

**خوێنـــەری بەڕێز...**

ئەگەر نیشانەکانی دیزاین بە ڕوونی لە داهێنراوەکانی مرۆڤدا دیاربێت، ئەوا بە هەمان شێوە لە سروشت و جیهانی ژیانی ناوەکی و دەرەکیماندا بەڕوونی دەردەکەوێت ئەگەر بێتو بە قووڵی بیری لێبکەینەوە.

دوای ئەوەی پێشتر زانستی بایۆلۆجیا وەك دیاردەیەکی کیمیایی سەیری ژیانی دەکرد، لە ئێستادا وەك دیاردەیەکی زانیاری سەیری دەکات، کەواتە لەسەر ئەو کەسانەی لە بنچینەی ژیان دەکۆڵنەوە پێویستە لە توێژینەوەکانیاندا تەرکیزو تیشکی زیاتر بخەنە سەر سەرچاوەی زانیارییەکانی خانەی زیندوو.

بیردۆزی لۆگاریتمی زانارییەکان ئەوەی سەلماندووە کە ڕێکەوت و هەڕەمەکێتی ناتوانن ئەو ئەندازە گەورەیەی زانیارییەکان پێشکەش بکەن کە بۆ پەیدابوون و بەردەوامبوونی دیاردەی ژیان پێویستن، بەمەش بەڵگەی حاشاهەڵنەگری لەسەر بوونی دیزاین و زیرەکی و ئامانجدارێتی خستۆتەڕوو، ئەمەش لەڕێی ئاشکراکردنی ئەو (ئاڵۆزییە سەربەخۆیەی) کە ژیان جیادەکەنەوە و مەحاڵە لەڕێی هەڕەمەکێتییەوە بەدیبێن.

هەروەها بایۆلۆجیای نوێ چەمکی (ئاڵۆزی نەشیاو بۆ وردکردنەوە)ی خستۆتەڕوو، ئەوەی سەلماندووە مەحاڵە ژمارەیەکی زۆر لە دامەزراوە وردەکانی ژیان و ئەندامەکانی زیندەوەر کە خاسیەتی ئاڵۆزی وردیان هەیە بە شێوەیەکی پلەبەندی و قۆناغی زۆر هێواش بەدیهاتبن، هەروەك داروینیزم دەیخوازێت، کە هیچ تەفسیرێك ناهێڵێتەوە بۆ پەیدابوونیان جگە لە دانان بەوەی کە بە شێوەیەکی تەواو و بێ کەموکوڕی لە زیندەوەراندا دەرکەوتووە.

گومانیش لەوەدا نییە کە دانان بە بوونی دیزاین و زیرەکی لە دیاردەی ژیاندا(هەروەها لە دیاردە گەردوونی و سروشتییەکانیشدا) خستنەڕووەکە لە بازنەی زانست ناباتە دەرەوە، ئەوە لەبەرچاوی هەموو کەسێکی بینا ڕوونە، ئەوانەش کە پەیڕەوی لە دیزاینی زیرەك دەکەن جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە، بەبێ ئەوەی خۆیان هەڵبقورتێننە ناو باسکردنی دیزاینەری زیرەك، بۆئەوەی خستنەڕووەکەیان بە خستنەڕوونێکی غەیبی و ئایینیی وەسف نەکرێت.

## لە دیزاینەوە بۆ دیزاینەر :

بەڵام، ئایا هیچ نەنگی و خراپییەك لەوەدا هەیە كە لە داننان بە دیزاینی زیرەك بەوەی كە چەمكێكی زانستییە بڕۆینە سەر داننان بە دیزاینەری زیرەك؟ ئایا شتێكی سروشتی نییە كە دیزاین پێویستی بە دیزاینەر هەبێت؟

گومان لەوەدا نییە گواستنەوەی چەمكە زانستییەكان بۆ چەمكە ئایینییەكان لە ڕۆژئاوادا وەك عەیبە تەماشا دەكرێت، یاخود دەتوانین بڵێین لە ژیارستانیەتی ماددی نوێدا بە شێوەیەكی گشتی، چونكە ئەوان وایدەبینن كە زانستی نوێ نەیتوانی لەسەر پێی خۆی بوەستێت تا ئەو كاتەی كە بە تەواوی لە چەمكە ئایینییەكان جیاكرایەوە.

بەڵام لە ڕۆژهەڵاتدا، ئەوا (بە شێوەیەكی گشتی) ئەو عەیبەیە بوونی نییە، بەڵكو زۆربەی ڕۆژهەڵاتییەكان پەیڕەوی لە چەمكی بەدیهێنانی تایبەتی (الخلق الخاص) دەكەن، كە بەیەكەوە بەستنەوەی ئایین و دیزاینی زیرەك بە شتێكی سروشتی دەزانن، بە هەمان شێوە لە چەمكی ڕۆیشتن لە دیزاینەوە بەرەو گەڕان بەدوای دیزاینەردا بە شتێكی سروشتی دەزانن.

گومان لەوەدا نییە كە ئەو دیزاینەی لە گەردوون و ژیاندا بوونی هەیە (ڕێكخراویی و كۆنترۆڵ و ورد) هۆكاری یەكەمینی لەپشتەوە وەستاوە، ئەمەش ئەوەمان لەسەر پێویست دەكات كە ئەو هۆكاری یەكەمینە زیرەكی و توانای لەپشتەوە بێت.

هەروەها ئەگەر باوەڕداران باوەڕیان بە توانا و دانایی خودا هەبێت، ئەوا بێباوەڕان باوەڕیان بە سروشت هەیە! هەر یەكێكیان باوەڕیان بە توانایەكی بەدیهێنەر هەیە،

هەر یەکێکیان ئایینێکیان هەیە[1]، لە بری ئەوەی مرۆڤ سوپاسی خودای بەدیهێنەر بکات، کەسی داروینی سوپاسی سروشت دەکات. سەرنجی قسەی ستیڤن گۆڵد بدە کاتێك لە کاتی قسەکردنی دەربارەی لەناوچوونی داینەسۆڕەکان دەڵێت: لە ڕاستیدا بنچینەی داینەسۆڕەکان (وەك خشۆکی زەبەلاح) لەگەڵ دەرکەوتنی عەقڵی بیرکەرەوەدا ناگونجێت، بۆیە ئێمە بەبوونمان قەرزدارینین، قەرزاری ئەو کلکدارمین کە بەر زەوی کەوت پێش ٦٥ ملیۆن ساڵ و بوون بە مایەی لەناوچوونی داینەسۆڕەکان، ئەمەش ڕێگای بە مەمکدارەکاندا گەشە بکەن و بەرزببنەوە، تا مرۆڤ دەرکەوت!!.

لەبەرئەوە ئێمە (بەبێ ئەوەی کە لە بابەتییەت دوور بکەوینەوە و دژایەتی زانست بکەین) دانانان بە دیزاینی زیرەك بەرز دەبینەوە بۆ دانانان بە دیزاینەری زیرەك.

ئەوانەی پەیڕەوی لە دیزاینی زیرەك دەکەن دابەش دەبن بۆ دوو کۆمەڵەی سەرەکی ؛ یەکەمیان ئەوانەن کە باوەڕیان بە خەلقی خودایی تایبەتی هەیە، دووەمیان ئەوانەن کە باوەڕیان بە پەرەپێسەندنی خودایی هەیە، چ لە ڕێگەی دەستخستنەناوی ڕاستەوخۆی خوداییەوە بێت بۆ ئەنجامدانی بازدانە هەرەمەکییەکان کە بۆ پەرەسەندن پێویستن، یان لە ڕێگەی وەڵامدانەوەی کۆدی بۆماوەیی زیندەوەران بۆ گۆڕانکارییە ژینگەییەکان، بە بنیاتنان لەسەر گونجانێکی پێشوەختەی نێوانیان کە خودا دایناوە. ئەگەر زانستی سەردەم لە ئێستادا هێڵە پانییەکانی میکانیزمی پەرەسەندنی ئاڕاستەکراوی پێشکەشکردبێتین، ئەوا هێشتا زۆر زۆری لەبەردەمدا ماوە تا دەگاتە بنچینەیەکی ڕازیکەری ئەو میکانیزمانە.

لەوانەیە جوانترین قسە کە لەسەر پەرەپێسەندنی خودایی کرابێت قسەکەی گەورە زانای بایۆلۆجیای بەشی فرانسیز کۆڵینز بێت، کە دەڵێت: ((کێ ڕێ لە خودا دەگرێت لەوەی کە میکانیزمی پەرەسەندن لە بەدیهێناندا بەکاربێنێت)).

کەواتە چ خودا ڕاستەوخۆ بەدیهێنانی ئەنجامدابێت یان لەڕێی پەرەسەندنەوە ئەو کارەی ئەنجامدابێت، ئەوا لە هەردوو حاڵەتدا هەر خودا بەیهێنەرە.

---

(1) ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ (١) لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ (٢) وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ (٣) وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ (٤) وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ (٥) لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِىَ دِينِ (٦) ﴾ الكافرون: ١ - ٦

## تەوەرەی هەشتەم

# عەقڵ لەنێوان
# خودا و بێباوەڕیدا

((کاتێك هەنگاوەکانی مرۆڤ دەگێڕینەوە بۆ دواوە، بۆمان دەردەکەوێت، کە بەخششی عەقڵی ساغ و وشیار هەر لەسەرەتاوە تایبەتمەندی مرۆڤ بووە، ئەو قسەیەی پێی وایە مرۆڤایەتی لە قووڵایی ئاژەڵییەوە بە پلەبەندی هاتووە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نییە)). ماکس مۆلەر[1].

دیدی ئیسلامی بۆ عەقڵ لە دوو کۆڵەگەی تەوەرمییدا کورتدەبێتەوە کە مرۆڤ لە بوونەوەرەکانی تر جیادەکەنەوە. کۆڵەگەی یەکەم؛ ئەو توانا عەقڵییانەی کە مرۆڤ هەیەتی، هەروەها ئازادی ویست و هەست و سۆزە رۆحییەکان، کۆڵەگەی دووەم؛ بریتییە لە بەبەرداکردنی رۆحی غەیبی کە بۆتە تایبەتمەندی مرۆڤ. بە بەیەکەوە بەستنەوەی ئەم دوو تایبەتمەندییە دەبینین کە ئەم بەخششە غەیبییە بەرپرسە لە توانا عەقڵییەکان.

---

(١) Max Moller: (١٨٢٣-١٩٠٠ز)، یەکێك لە بەناوبانگترین زانایانی زمانەوانی لە سەدەی نۆزدەهەم، لە ئەڵمانیا لەدایکبووە و رەگەزنامەی ئینگلیزییە. مۆلەر لەو وتەیەیدا باسی مرۆڤایەتی مرۆڤمان بۆ دەکات کە لە عەقڵییەوەسەرچاوە دەگرێت، کە لە درێژەی تەمەرەکەدا مەحاڵی پەیدابوونی لەرێی پەرەسەندنەوە دەبینین-بە پێچەوانەی لاشە- کە لە بوونەوەری لەخۆی نزمترەوە سەرچاوەی گرتبێت.

هەرچی دیدی ماددیگەرایی داروینییە، ئەوا هەموو تایبەتمەندییە عەقڵییەکان کە مرۆڤ لە بوونەوەرەکانی تر جیادەکەنەوە دەیانگێڕێتەوە بۆ جیاوازی چەندیی، واتا تەنیا زیادبوونی (ئەندازە)یە لەو فرمانانەی کە ئەو بوونەوەرانە ئەنجامیدەدەن.

ماددیگەراکان ئەو زیادبوونە دەگێڕنەوە بۆ چەند چالاکییەکی پەرەسەندنی هەڕەمەکی کە بۆتە هۆی زیادبوونی قەبارە و ئاڵۆزبوونی تونکڵی مێشك. بۆیە ئەوان دەڵێن کە عەقڵ چالاکییەکی ڕاستەوخۆی مێشکە، وەك چۆن گورچیلەکان هەڵدەستن بە دەردانی میز، چۆن جگەر زەرداو دەردەدات، ئاواش مێشك کاری عەقڵ ئەنجام دەدات.

لەم تەوەرەیەدا هەڵدەستین بە هەڵسەنگاندنی هەردوو دید و بۆچوونەکە، ئایینی و ماددیگەرایی، بۆئەوەی بگەینە حەقیقەت، ئەمەش لە ڕێی وەڵامدانەوەی سێ پرسیار:

١- ئایا جیاوازی نێوان چالاکییە عەقڵییەکانی مرۆڤ و بوونەوەرەکانی تر (بەتایبەتی زیندەوەرە سەرەکییەکان) تەنیا جیاوازی چەندین، یاخود جیاوازی چۆنیەتی و جۆرین؟

٢-ئایا پەرەسەندنی داروینی دەتوانێت تەفسیرێك بۆ دەرکەوتنی توانا عەقڵییەکانی مرۆڤ پێشکەش بکات؟

٣- ئایا توانا عەقڵییەکانی مرۆڤ پێویستییان بە دیزاینکردن هەیە لەلایەن سەرچاوەیەکی زیرەك و داناوە؟

ئێستاش فەرموون لەگەڵ تاوتوێکردنی پرسە گەرموگوڕ و ئاڵۆزەکە...

## مێشك[1] و عەقل

---

(١) مێشکمان بە چی جیادەکرێتەوە؟ لەوانەیە گەورەیی قەبارەی مێشك بەتایبەتی بەشی پێشەوە، گرنگترین خاسیەتی جیاکەرەوەی مرۆڤ بێت کە بۆتە جیاوازییەکی گەورە لە نێوان مرۆڤ و پێشینەکانی، لەنێوان مرۆڤ و بوونەوەرە سەرەکییەکانی تر. ئایا عەقڵی مرۆڤ و دەستکەوتە ژیارستانییەکانی دەگەڕێتەوە بۆ گەورەیی قەبارەی مێشك؟ ئەگەر سەرەتای باسەکەمان لەگەڵ داروین و هێکسلی بێت، ئەوان وایدەبینن کە جیاوازی نێوان مرۆڤ و سەرەکییەکان تەنیا جیاوازی چەندیین(ئەندازەیـیـن) نەوەك جۆری.

لە ناوەڕاستی شەستەکانی سەدەی بیستەمدا، رالف هۆڵوای (گەورە مامۆستای ئەڵمانی بواری ئەنترۆپۆلۆجیا لە زانکۆی کۆلۆمبیا) بەرهەڵستی ئەو سادەکردنەوە ساکار و پێکەنەیەی کرد و، توانا عەقڵییە جاکەرەوەکانی مرۆڤ دەگێڕێتەوە بۆ دووبارە داڕشتنەوەی بنچینەی مێشك و فرمانەکانی، زیاتر لە قەبارەکەی. هۆڵوای وەك بەڵگەیەك بۆ قسەکەی نموونە بەوە دێنێتەوە کە قەبارەی مێشکی مرۆڤ نزیکەی ٪٢ کێشی جەستەیەتی. کەچ کێشی مێشکی مشکی گیرفان Pocket Mouse دەگاتە نزیکەی ٪١٠ !

ناکرێ باس لە لێکۆڵینەوە لە توانا عەقڵییەکان بکەین بەبێ قسەکردن لەسەر تونکڵی مێشك. پسپۆڕان تێبینیان کردووە کە قەبارەی رێژەیی(پەیوەندی نێوان ناوچەیەك و قەبارەی مێشك)ی تونکڵی مێشك و تونکڵی بەشی پێشەوەی مێشك لە سەرەکییەکاندا بەنزیککراوەیی یەکسانە. زۆرێك لە لێکۆڵینەوە نوێیەکان توانای بەرزی عەقڵی مرۆڤ دەگێڕنەوە بۆ (بنچینەی تونکڵی مێشك)لە بەشی پێشەوەی سەر Pre-Fontal Cortex (ئەم ناوچەیە رۆڵێکی گرنگی هەیە لە لایەنی هۆشیاری لۆژیکی بڕیاردان و، خاوکردنەوەی کاردانەوە هەستییە خۆنەویستییەکان بەرامبەر بە هەندێك هەڵوێست). قەبارەی ئەو ناوچەیە لە مێشکی مرۆڤدا دوو ئەوەندەی قەبارەکەیەتی لە مێشکی شامپانزیدا.

ئەم تونکڵە لە مەمکدارەکانی پێشووی سەرەکییەکاندا لە دوو ناوچەی بەرپرس لە لایەنی کاردانەوەی بوونەوەرەکە پێکهاتووە، لەکاتێکدا لە سەرەکییەکاندا ناوچەیەکی تری زیادە هەیە، کە بە ناوچەی دەیەم ناسراوە.

هەروەها ئەو ناوچەیەی پێشەوەی مێشکی مرۆڤ لە بەشەکانی تری بەشی پێشەوە جیاوازە بەهۆی بوونی چینێکی تری زیادە کە لە دەمارەخانە پێکهاتووە، کە بە ناوچەی دەنکۆڵەیی چوارەمی ناوەکی Internal Granular Layer IV ناسراوە و، زۆرێك لە پسپۆڕان توانا عەقڵییەکان دەگێڕنەوە بۆ ئەم چینە.

بۆچی قەبارەی مێشکی پێشینەکانمان گەورەبووە و، مێشکی شامپانزی وەك خۆی ماوەتەوە؟

لەگەڵ هاتنی سەرەتای سەدەی بیست و یەکەم، بروس لان و تیمەکەی لە شیکاگۆ تێبینی ئەوەیان کرد کە رێژەی جینە بەرپرسەکان لە پێکهێنانی مێشکی مرۆڤ بەرزترە لە شامپانزی. لێکۆڵەرانیش ئەمە بۆ ئەوە دەگێڕنەوە کە پێشینی هاوبەشی مرۆڤ و شامپانزی جیناتی پێکهێنانی مێشکی لە هەندێك لە تاکەکانیدا بازدانی زیاتری بەسەرداهاتووە، کە بۆتە هۆی دەرکەوتنی شێوە مرۆڤەکان. لە کاتێکدا لە تاکەکانی تردا بازدانی کەمتر روویانداوە و، بۆتە هۆی دەرکەوتنی شامپانزی.

ئەم بۆچوونە ئەوە دووپاتدەکاتەوە کە ژمارەی (جینە بکەرەکان) لە جەستەی مرۆڤ و شامپانزیدا (وەك جگەر و گورچیلە) یەکسانە. لەکاتێکدا ژمارەیان لە مێشکی مرۆڤدا دەگاتە ٣-٤ ئەوەندەی ژمارەی لە مێشکی شامپانزیدا.

لەژێر ڕۆشنایی بیردۆزی پەرەسەندنی داروینی زانستی هاوچەرخ گرنگیداوە بە گەڕان بەدوای (لێکچوونەکان) لەنێوان مرۆڤ و ئاژەڵەکان، لەڕووی بەدیهاتن و رەفتارەوە، لە جەختکردنەوە لەو لێکچوونانەدا زۆر قووڵبۆتەوە، تا ئەو ئەندازەیەی، کە لە (جیاوازی)یە زۆر و گەورەکانی نێوانیان بێئاگا بووە، تا ئەو ئەندازەیەی، کە وەك ئاژەڵ سەیری مرۆڤ دەکرێت!.

لە ڕاستیدا مرۆڤ دیاردەیەکی ناڕوونە، کە زانستی نوێ لە بەرامبەر زۆربەی تایبەتمەندییە مرۆییەکانیدا کە بە تێبینیکردن و تاقیکردنەوە هەستیان پێدەکەین دەستەوەستان وەستاوە. هەریەکە لە لێکچوون و جیاوازی گەورەی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ گرنگی تایبەتی خۆیان هەیە بۆ تێگەیشتن لە حەقیقەتی عەقڵی مرۆڤ. لێکۆڵینەوە تایبەتمەندەکان ڕۆژانە سەرچاوەی تری جیا لە سەرچاوەی ئاژەڵی بۆ دیاردەی مرۆڤ دەدۆزنەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا زانستی هاوچەرخ بێتوانایە لە دیاریکردنی ئەو بنچینانە.

دەتوانین بڵێین، کە (بە عەقڵ بیرکردنەوە -التعقل) بریتییە لەو سیفەتە کۆکەرەوەیە کە مرۆڤ لە بوونەوەرەکانی تر جیادەکاتەوە. ئەگەر ماددیگەراکان بڵێن کە (بە عەقڵ بیرکردنەوە) یەکێکە لە چالاکییە عەقڵییەکان کە لەڕێی مێشکەوە ئەنجامدەدرێت، ئەوا من لەوەدا لەگەڵیان هاوڕام کە مێشك ڕۆڵی هەیە لەو چالاکییانەدا، بەڵام هەستە ڕۆحییەکانیشی دەخەمە پاڵ، دوای ئەوەی کە زانستی نوێ ڕۆڵی سەرەکی لە چێژوەرگرتن لەو هەستانە سەلماندووە.

ئەگەر مێشك کۆئەندامێکی ماددی بێت کە لە چەند تۆڕێك دەمارە خانەی زۆر ئاڵۆز و ئاوێتە[1] پێکهاتبێت، کە هەموویان بە یەك زمان گفتوگۆ دەکەن، کە بریتییە لە زمانی کارۆکیمیایی، ئایا چالاکییە عەقڵییەکانمان و هەستکردنمان بە خوودی (هۆشیارمان) دەگەڕێتەوە بۆ کارەبا و کیمیای مێشك، کە لە کۆتاییدا تەنیا ئایۆناتی سۆدیۆم و پۆتاسیۆمە و لە جووڵەی بەردەوامدان لەڕێی دیواری دەمارە خانەکەدا؟!

---

(١) مێشك لە سەد ملیار خانە پێکدێت، کە ملیارەها ملیار بەستەر بەیەکەوە بەستراون!

چۆن جوولەی ئەم ئایۆناتانە وامان لێدەکەن بتوانین ژیارستانیەتی هاوچەرخ بە هەموو دەستکەوتە زانستی و داهێنانە هونەرییە گەورەکانییەوە بنیات بنێین، یاخود چۆن جوولەی ئەو ئایۆناتانە وامان لێدەکەن بتوانین هەست بە (چەمکە رووتەکان Concepts) بکەین، وەك ئەو قسەیەمان کە دەڵێین ((مرۆڤ ئەو بوونەوەرە بەرزەیە کە بەدوای واتادا دەگەڕێت، جوانی خۆشدەوێت، بە شتە پەنهانەکان سەرسامە، بەدوای حەق و حەقیقەت و چاکە و دادگەریدا دەگەڕێت))؟!.

لە ڕاستیدا جیاوازی نێوان مێشك و عەقڵ وەك جیاوازی نێوان دەربڕینی وشەیەك و واتای وشەکە وایە؛ چونکە دەربڕین میکانیزمێکە لە جیهانی سروشتی مادددیدا، گوزارشتە لە دەنگێکی بەردەوام کە لە قورگەوە لە شێوەی شەپۆل و لەرەلەرەوە بە هەوادا بڵاودەبێتەوە، پاشان هەریەکە لە قورگ و زمان و لێوەکان هەڵدەستن بە بڕینی ئەو دەنگە بۆ ئەوەی کە لە شێوەی پیت و وشە دەربکەون، بابەتەکە هەمووی فیزیایە، ئەمەیە دەربڕینی وشەکان. هەرچی واتایە شتێکی ترە، کە لەوانەیە گوزارشت بێت لە خۆشەویستی یان راگەیاندنی جەنگ بێت یان هەر واتا و چەمکێکی تر، واتای وشەکان شتێکی ترە و لە دەرەوەی ئەو میکانیزمە ماددی و پێکهاتە ماددییەی گەردووندایە.

## بە عەقڵ بووین بە مرۆڤ...

کاتێك داروینییەکان بەراوردی نێوان ئەو چالاکییە عەقڵییانە دەکەن، کە مرۆڤ ئەنجامیان دەدات لەگەڵ ئەوانەی، کە بوونەوەرە سەرەکییەکانی تر ئەنجامیان دەدەن، لێمان دێنە دەرو دەڵێن جیاوازی نێوان ئەو چالاکییانە جیاوازی چەندین (لە سنووری توانای پەرەسەندنی داروینیدا) نەوەك جیاوازی جۆری (کە لە توانای پەرەسەندنی داروینی بەرزترە، بەمەش دەبێتە بەڵگەیەکی ڕاستەوخۆ لەسەر دیزاینی زیرەك، کە پێویستی بە خودای بەدیهێنەرە)، ئایا ئەو بانگەشەیە ڕاستە[1]؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە - لە درێژەی تەوەرەکەدا - گرنگترین ئەو چالاکییە عەقڵییانە دەخەینەڕوو کە مرۆڤ ئەنجامیان دەدات، دواتر دەبینین ئاخۆ بوونەوەرە سەرەکییەکانی تر دەتوانن هاوشێوەی ئەنجام بدەن، ئەگەر چالاکییە عەقڵییەکان بەتەواوەتی لە مرۆڤدا نوێ بن، ئەوا بوارێك بۆ خستنەڕووی ئەو پرسیارە نامێنێتەوە، بەڵام ئەگەر زیندەوەرە سەرەکییەکان بەشێك لەو چالاکییانە ئەنجام بدەن، ئەوا ئەوکاتە دەتوانین بپرسین ئاخۆ جیاوازییەك لە نێوان چالاکیەکانیان هەیە؟ هەروەها ئایا ئەو جیاوازییانە چەندین یان جۆرین؟.

پسپۆڕان دەربارەی (بیردۆزی عەقڵ) بۆمان دەدوێن، بەوپێیەی کە گوزارشت دەکات لە چالاکی عەقڵی مرۆڤ و لە نزیکترین زیندەوەرە سەرەکییەکانی

---

(١) وەك نموونەیەك بۆ نزیککردنەوەی مەبەستمان لە پرسیارەکە دەڵێین: کیسەڵ دەجووڵێت و مرۆڤیش دەجووڵێت و بازیش دەجووڵێت، کەواتە هەرسێکیان لە کرداری (چالاکی) جووڵەدا هاوشێوەن. گومانیش لەوەدا نییە کە جووڵەی باز و مرۆڤ و کیسەڵدا جیاوازی جۆری بوونیان هەیە؛ چونکە یەکەمیان دەفڕێت و دووەکەی تریش بە پێ دەڕۆن. لە کاتێکدا جیاوازی نێوان جووڵەی مرۆڤ و جووڵەی کیسەڵ جیاوازییەکی چەندییە؛ چونکە مرۆڤ خێراترە.

جیادەکاتەوە کە بریتییە لە (شامپانزی)، چەند توانایەکی عەقڵی هەن کە لە پشتەوەی ئەو چالاکییەوە وەستاون، لەوەوە دەستپێدەکەن کە خوودی مرۆڤایەتی خوودێکی هۆشیارە، چونکە بە نەمانی هۆش تواناکانی عەقڵی مرۆڤ لەکار دەکەون. لەبەرئەوە لە خستنەڕووی دواترمان دێینە سەر قسەکردن دەربارەی (بیردۆزی عەقڵ)، دواتریش کێشەی هۆش،پاشان گرنگترین توانا عەقڵییەکانی مرۆڤ دەخەینەڕوو. دواتریش گرنگترین سێ تایبەتترین ئەو چالاکییە عەقڵییانە تاوتوێ دەکەین کە مرۆڤ ئەنجامیان دەدات، کە بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا جیاوازی نێوان ئێمە و بوونەوەرە لە ئێمە نزمترەکان دەردەخات، ئەو چالاکیانەش بریتین لە زمان، چێژوەرگرتن لە جوانی، توانای بەرزبوونەوەی رۆحی.

## بیردۆزی عەقڵ Theory of Mind

نیمچە ڕێککەوتنێك هەیە لەنێوان زانایانی دەروونزانی و پەروەردەیی لەسەر ئەوەی کە ((بیردۆزی عەقڵ[1])) (توانای وێناکردنی ئەوەی کە لە مێشکی کەسی بەرامبەردا هەیە)بە جیاوازی عەقڵی جەوهەری دادەنرێت لە نێوان مرۆڤ و بوونەوەرانی تردا.

هەروەها ڕێککەوتنێك هەیە لە نێوان زانایاندا، لەسەر ئەوەی کە زۆربەی ئاژەڵەکان (بەتایبەتی بەرزەکانیان) لەگەڵ منداڵە بچوکەکانماندا هاوبەشن لەوەی دەرك بەوە دەکەن کە لە عەقڵییاندا ڕوودەدات، ئەمەش لە فەلسەفەی عەقڵدا بە (ئاستی یەکەمی هەستکردن - ئاگاداربوون - First order Intentionality) ناسراوە. لە تەمەنی حەوت ساڵاندا منداڵەکانمان دەتوانن هەست بە هەندێك لەو شتانە بکەن کە لە عەقڵی کەسانی بەرامبەردا دەخولێنەوە، کە زیندەوەرە

---

[1] ڕاستتر ئەوەیە کە بگوترێ (بیردۆزێك دەربارەی عەقڵ).

سەرەکییەکان لەوەدا بێتوانان، دەکرێ ئەوەشیان ناوبنێین ((ئاستی دووەمی هەستپێکردن)). دواتر منداڵەکە دەستدەکات بە دارشتنی سیناریۆی خەیاڵی بۆ ئەو شتانەی کە لە مێشکی کەسی بەرامبەردا دەگوزەرێت، بۆنموونە وا خەیاڵ دەکات کە بووکەڵەکەی توانای خواردنەوەی کوپێك چای هەیە، بۆیە ئەگەر بەتاڵیش بێت پێشکەشی دەکات، هەروەها کاتێك کە منداڵەکان شتێکی ناڕاستمان پێدەڵێن (درۆ دەکەن) ئەوا لە ناخیاندا هەستێکی وایان بۆ دروستدەبێت کە کەسی بەرامبەر باوەڕیان پێناکات، هەست بەوە دەکەن کە کەسی بەرامبەر عەقڵی هەیە کە شتەکان وەردەگرێت یان رەتدەکاتەوە[1].

دوای ئەوەی مرۆڤ دەگاتە تەمەنی باڵغبوون، دەکرێ توانای هەستکردنی بۆ حەوت ئاستی بەرز درێژببێتەوە، لەوکاتەدا هەستدەکات کە کەسی بەرامبەر هەستدەکات کە کەسی سێیەم بیر لە چی دەکاتەوە، کەسی سێیەمیش هەست بەوە دەکات کە کەسی چوارەم بیری لێدەکاتەوە، ئیدی بەم شێوەیە[2]. توێژەران

---

(١) رۆبن دینبەر Robin Dunbar (سەرۆکی ناوەندی توێژینەوەکانی دەروونزانی پەرەسەندوو و رەفتاری ژینگەیی لە زانکۆی لیڤەرپول لە بەریتانیا) وایدەبینێت کە شامپانزی توانای ئەنجامدانی ئاستی دووەمی دەرکپێکردنی هەیە(وەك ئەوەی دەزانێت کە نێرەیەکی تری مەیموون دەیەوێت هێرشی بکاتە سەر). لەبەرئەوە هەندێك وایدەبینن کە توانا عەقڵییەکانی شامپانزی لە ئاستی عەقڵی منداڵێکی چوار ساڵان دایە. گومانیش لەوەدا نییە کە ئەم قسەیە زیادەڕۆییەکی زۆری تێدا هەیە، چونکە هەموو بوونەوەران هەرچەند سەرەتاییش بن دەتوانن دەرك بە هەڕەشەی بەرامبەرەکەیان بکەن.

(٢) با سەرنجی نموونەیەك بدەین لەگەڵ (عطیل)ی شکسبیر: بێنە بەر چاوی خۆت کاتێك دانیشتووە و خەریکە شانۆگەرییەکەی دەنووسێت. ئەو دەیەوێت باوەڕ بە بینەرانی شانۆگەرییەکەی بێنێت کە کەسایەتییە شەڕانگێزەکە (ئیاگۆ) دەیەوێت کە رکابەرەکەی (عطیل) بڕوا بکات کە هاوسەرەکەی (دیدمۆنە) کەسێکی تری خۆشدەوێت. جا لە پێناو ئاڵۆزی درامیدا شکسبیر کەسایەتییەکی تری زیادکردووە بە ناوی کاسیۆ، کە ئیاگۆ بانگەشەی ئەوە دەکات کە دیدمۆنە خۆشیدەوێت، لەپێناو تەواوکردنی ئاڵۆزییەکە، ئیاگۆ بە دەروونە پیسەکەی وا لە عطیل دەگەیەنێت کە (کاسیۆ لەگەڵ دیدمۆنە پەیوەندی خۆشەویستییان هەیە و، دەیانەوێت پێکەوە رابکەن. ئەمەش وایکرد کە هاوسەرە خۆشەویستەکەی و کاسیۆ بکوژێت.

ئاتێستا ئێمە لەبەردەم چوار بارودۆخی عەقڵیداین کە تایبەتە بە چوار کەسایەتی(ئیاگۆ- عطیل- دیدمۆنە- کاسیۆ). دوو عەقڵییەتی تریشی بۆ زیاد دەکەین (عەقڵییەتی شکسبیر) کە دەیەوێت لەڕێی ئالۆزی درامییەوە (بڕوا بە عەقڵییەتی بینەر بێنێت)، ئەگەرنا شانۆگەرییەکە دەکەوت.

شکسبیر مامەڵە لەگەڵ ئاستی شەشەمی دەرکپێکردندا دەکات، چونکە ئەو دەیەوێت وا لە بینەر بکات

باوەڕیان وایە کە کەسی خاوەن توانای عەقڵی مامناوەند دەتوانێت تا ئاستی پێنجەمیش بڕوات، دواتریش، توانای ئەوە لەدەستدەدات کە لەگەڵ هەستە عەقڵییەکانی کەسانی تر لە هەمبەر پرسێك ڕێبکات.

ئەگەر سەرنجی بەڵگەی مەیموونەکان بدەین، کە داروینییەکان لەسەر ئەگەری پەیدابوونی ژیان بە شێوەیەکی هەڕەمەکی دەیهێننەوە، کاتێك دەڵێن ئەگەر دە مەیموون بۆماوەی چەند بلیۆن ساڵێك لە تەختەکلیلی نووسین بدەن، ئەوا بێگومان یەکێکیان دەتوانێت شانۆگەری (عطیل)ی شکسبیر بنووسێتەوە! گریمان ئەو مەحاڵەش ڕوویدا، ئەوا ئەو ڕووداوە تەنیا ڕووداوێکی هەڕەمەکییە. تەنانەت ناگات بە ئاستی یەکەمی هەستکردنیش. چونکە مەیموونەکان نازانن چی دەکەن!.

## گرفتی هۆش :

هەر یەکێکمان هەست بەوە دەکەین کە خوودێکمان هەیە نوێنەرایەتی کەسایەتیمان دەکات، کە لەناو کەللەسەریدا خۆی حەشارداوە و سەیری جیهان دەکات. وەك ئەوەی کە قەزەمێك لەناو مێشکماندا هەیە و سەیری بوونی دەوروبەرمان دەکات. گومانیش لەوەدا نییە کە ئەو قەزەمە پێویستی بە قەزەمێکی بچوکتر هەیە کە لەناو مێشکیدا دانیشتبێت و سەیری بوون بکات، ئەو قەزەمەش پێویستی بە قەزەمێکی سێیەم هەیە، تا بەم شێوەیە...!

---

باوەڕ بکات کە ئییاگۆ ویستوویەتی وا لە عطیل بکات باوەڕ بکات کە دیدمۆنە کاسیۆی خۆشویستووە و کاسیۆش دیدمۆنەی خۆشویستووە.

شکسبیر زۆر بلیمەتانە توانیویەتی بینەر بۆ بەرزترین پلەی دەرکپێکردن بەرز کاتەوە کە بتوانێت ئەنجامی بدات (ئاستی پێنجەم-دوای دوورخستنەوەی ویستی شکسبیر)، لەبەرئەوە شایەنی ئەو ناوبانگەیە کە بەدەستیهێناوە.

لە ڕاستیدا هۆش بریتییە لە توانای بیرکردنەوە لە دەوروبەرمان و ناخمان، هۆش لەپشت هەست و سۆز و بیرۆکە و ئارەزوو و بیروباوەڕ و ئازادی ویستمان وەستاوە؛ هۆشە کە وامان لێدەکات هەست بکەین زیندووین.

هۆش بە سادەیی بریتییە لە جیاوازی نێوان مرۆڤی بێدار و مرۆڤی خەوتوو. کاتێك کە لە خەو هەڵدەستیت، ئایا وا هەست ناکەی کە نەبوو یان ئامادەنەبوو بوویت، پاشان هەست بە دەوروبەرت دەکەی: دەزانی کێ بێداری کردیتەوە، لەکوێی، بەر لە خەوتن بیرت لە چی دەکردەوە، ئەو کارانەی کە پێویستە لەو بەیانییەدا ئەنجامیان بدەی.تۆ گەڕایتەوە سەر شانۆی ژیان، تۆ ئێستا هۆشیاریت.

هەروەها دەکرێ هۆش بە تەزووی کارەبایی بچوێنرێت، کە بەهۆیەوە نەبێت کۆمپیوتەر کار ناکات، چونکە کۆمپیوتەرەکە لە کار دەکەوێت ئەگەر تەزووی کارەبایی بپچڕێندرێت.

گرفتە گەورەکە، کە ڕووبەڕووی زانا و فەیلەسووفەکان دەبێتەوە بریتییە لەوەی چۆن لە سیستەمێکی کرۆکسمایی کە مێشك بەهۆیەوە چالاکییەکانی ئەنجام دەدات، بڕۆینە سەر هەستکردنی هزری نامادی بە خوودمان و دەوروبەرمان؟ چۆن مێشك شەپۆلەکانی خاوەن درێژی دیاریکراو کە دەکەونە سەر تۆڕی چاو وەریاندەگێڕێت بۆ هۆشبردن بە ڕەنگی شین بۆ نموونە؟...

مادیگەراکان پرسەکە سادە دەکەنەوە تا لە چوارچێوە مادییەکەیدا بیهێڵنەوە بۆیەبانگەشەی ئەوە دەکەن کە زیادبوونی ئاڵۆزی لە بنچینەی مێشکدا بۆتە هۆی پەیدابوونی هۆشیاریمان و هەستکردنمان بە خوودمان و بە دەوروبەرمان[1]. لە ڕاستیدا ئەوان وەك ئەو کەسە دەردەکەون کە بەدوای ئەوەدا دەگەڕێت گۆڕانکارییەکی وەها لە ئامێری DVD دا بکات کە وایلێبێت (هۆشیاربێت) و (چێژ وەربگرێت) لەو مۆسیقایەی کە پەخشی دەکات!.

---

(١) چەمکی پەیدابوونمان لە تەوەرەی دووەمدا تاوتوێ کردووە.

### فەلسەفەش قسەی خۆی دەکات :

گومان لەوەدا نییە کە دیاردەی عەقڵی هۆشیار لە ئایینەکاندا وەڵامێکی ڕوون و ئاسانی هەیە، لە وشەی (ڕۆح) دا کورتدەبێتەوە. بەڵام ئایا فەلسەفە و زانست لە بوونی وەها جەوهەرێکی ناماددی مرۆڤ هاوڕان؟

فەیلەسووف (دێڤید شاڵمەرز)[1] پێمان دەڵێت کە دوو ڕەوتی سەرەکی باسیان لەم پرسە کردووە: ڕەوتی ماددیگەرایی فیزیایی کە هۆش وەك دیاردەیەکی ماددی بەرهەمی مێشك سەیر دەکات، وایدەبینێت کە کارەبا و کیمیای مێشك دەتوانن کردارەکانی بە عەقڵ بیرکردنەوە و ئەو هۆشیاری و هەست و سۆز و بیرۆکە رووتانەی مرۆڤ هەیەتی تەفسیر بکەن، کەواتە شتێکی تر لە دەرەوەی مێشکدا بوونی نییە.

هەرچی ڕەوتی ناماددییە، وایدەبینێت کە هۆش و چالاکییەکانی تری بە عەقڵ بیرکردنەوە نافیزیایی و نامادین، ئەگەرچی پەیوەندییان بە دیاردە فیزیاییەکانەوە هەیە.

ئەو ڕەوتە وایدەبینێت کە عەقڵێکی بەرپرس هەیە لەو دیاردانە کە بەتەواوەتی لە مێشك جیاوازە، چونکە مێشك سەر بە جیهانی ماددەیە، لەکاتێکدا عەقڵ سەر بە جیهانێکی نامادییە کە حەقیقەتەکەی نازانین. سەرەڕای ئەوەی کە شاڵمەرز سەر بە (گومانکارەکان)ە، بەڵام ڕەوتی ماددی فیزیایی ڕەتدەکاتەوە.

---

(١) مامۆستای بەناوبانگی فەلسەفە و بەڕێوەبەری ناوەندی توێژینەوەکانی عەقڵ لە ئوسترالیا. لە توێژینەوەیەکی ناوازەدا بەناونیشانی: هۆش و پێگەی لە سروشتدا Consciousness and its place in nature، کە یەکەمجار لە کتێبی فەلسەفەی عەقڵدا بڵاوکرایەوە (لە ساڵی ٢٠٠٢ز) Phylosophy of mind. classical and contemporary readings.

هەندێك لە زانایان دەستیانکردووە بە قسەکردن لەسەر بێتوانایی تەواوی چالاکی کارۆکیمیایی خانەکانی مێشك بۆ تەفسیرکردنی عەقڵی مرۆڤ.بۆیە داوا دەکەن کە بۆچوونە زانستییەکانمان فراوان بکەین، بۆ ئەوەی کە جۆرێك لە بوارەکانی (سەرووی ماددە Supernatural Fields)یش لەخۆ بگرێت، کە بەرپرس بێت لە عەقڵ. لەبەر ئەوە فرانکلین هارۆڵد ئەوە دووپات دەکاتەوە کە (هزری ماددی سروشتی Naturalism) شکستی هێناوە لە تەفسیرکردن یاخود تێگەیشتن لە سێ دیاردە گشتگیرەکە، کە بریتین لە: گەردوون - ژیان - عەقڵ. وایدەبینێت کە وەك دیاردەی بەرز[1] Epiphenomena تەماشایان بکرێت.

## دەرككردن - تێگەیشتن - بیرکردنەوە :

**کاتێك قوتابی قۆناغی ناوەندی بووم، ڕۆژێکیان مامۆستای فیزیا پرسیاری کرد:**

ئەگەر لە دارستانێکی خاڵی لە مرۆڤ وئاژەڵ درەختێك بەربێتەوە، ئایا درەختەکە دەنگەدەنگ درووستدەکات؟ دوای ئەوەی بەرامبەر بەو پرسیارە خەڵەتێنەرە دۆشدامایین، وەڵامی داینەوە گوتی: نەخێر، هیچ دەنگەدەنگێك دەرناکات، تەنیا شەپۆل دەردەکات، هەرچی دەرككردنە بەو شەپۆلانە وەك دەنگێك، ئەوە پێویستی بە مێشکەکانمان هەیە، چونکە لە مێشکەکانماندا ناوەندی وەها بوونی هەیە کە شەپۆلەکان دەگۆڕێت بۆ دەنگ و وێنە و بۆن و...بەم شێوەیە. مامۆستاکە بە زیرەکیم سەرسامبوو، کاتێك گوتم: ئەگەر مرۆڤ یاخود ئاژەڵێك بوونی نەبێت کە دەرك بە بوونی ئەو شەپۆلانە بکات، کەواتە دارستانێکیش بوونی نابێت!.

---

(١) کتێبی ڕێڕەوی خانە the way of the cell کە لە ساڵی ٢٠٠٣ز دا بڵاوکرایەوە. لە نووسینی فرانکلین هارۆڵد- Franklin Harold. مامۆستای کیمیای زیندەیی و بایۆلۆجیای بەشی لە زانکۆی کولۆرادۆ.

لێرەدا ئەو قسەیەمان دووپات دەکەینەوە، کە لە تەوەرەی دووەمدا لە باسی بەڵگەی هەستیدا باسمان کرد، بەوەی کە مێشکی مرۆڤ لە یەك چرکەدا زیاتر لە ٤٠٠ ملیار زانیاری پێدەگات، بەڵام تەنیا مامەڵە لەگەڵ دوو هەزار لەو زانیارییانەدا دەکات! بە هەمان شێوە چاوی مرۆڤ دەرك بە نزیکەی ١،٥ مەتر لە درێژی شەپۆلە کارۆموگناتیسییەکان دەکات کە لەسەر زەویدا بوونیان هەیە، ئەگەر بێتو بە هێڵێك بیچوێنین کە درێژییەکەی ١٥٠ ملیۆن کیلۆمەتر بێت! مێشکی مرۆڤ چەند سنووردارە بەرامبەر بە دەرککردن بە دەوروبەرمان!!.

گومان لەوەدا نییە کە فرمانی (دەرککردن - الإدراك) کە مێشك ئەنجامیدەدات بە تەنیا لە مرۆڤدا بوونی نییە، بەڵکو لە زۆربەی ئاژەڵەکاندا ڕوودەدات. هەرچی تایبەتمەندی مێشکی مرۆڤە ئەوا لەو لێکەوت و دەرئەنجامانەدا دەردەکەوێت کە بەدوای دەرککردنەکەدا دێن، وەك تێگەیشتن و بیرکردنەوە (الفهم والتفکیر).

## تێگەیشتن (الفهم) :

سەرەڕای ئەندازەیەکی زۆر کەم کە مێشك دەرکیان پێدەکات لەو زانیارییانەی بۆی دێن، سەرەڕای گەورەیی پەرش و بڵاوکەرەوەکانی دەوروبەرمان، مێشك هەڵدەستێت بە پێکهێنانی بۆچوونێکی گونجاو و ڕێك و پێك بۆ جیهانی دەوروبەرمان[1]. هەروەها لە پێناو گەیشتن بەو بۆچوونە، چەند میکانیزمێکی

---

(١) بۆ ڕوناکردنی ئەندازەی ئەستەمی ئەم کارە، سەرنجی ئەم بەراوردە بدە: ئەگەر منداڵێکی بچکۆلانە سەیری پشیلەیەکی سپی بدات کە پەڵەی پرتەقاڵی پێوەبێت، پاشان سەرینێکی پێبدەن کە ئەویش پەڵەی پرتەقاڵی پێوەبێت، لەگەڵ سەگێکی ڕەش، ئەوا منداڵەکە دەرك بەوە دەکات کە سەگەکە لە پشیلەکە نزیکترە، بەڵام کۆمپیوتەر سەرینەکە هەڵدەبژێرێت بەهۆی نزیکی ڕەنگەکانیان لە یەکترەوە! منداڵەکە چۆن پەیوەندی نێوان پشیلە و سەگی هەستپێکرد و لەیەکچوونی ڕەنگەکانی پشیلەکە و سەرینەکەی پشتگوێ خست؟!

فیتری (غەریزی) بۆ مێشك زیادكراون، كە بە گونجاوی و ڕێك و پێكییەكی تەواو كاردەكەن لەپێناو ئەوەی كە ئێمە وەك بوونەوەرە هۆشیارە دەركپێكەرەكە بمێنینەوە، كە لە جیهانی دەوروبەری تێدەگات و شیكردنەوە و لێكدانەوەی بۆ دەكات[1].

---

(١) یەكێك لە گرنگترین ئەو میكانیزمانە بریتییە لە میكانیزمی (بەیەكەوەبەستنەوە-التجمیع)، كە وامان لێدەكات بتوانین ناوەڕۆ و درەخت و ئاژەڵەكان وەك یەك دارستان سەیر بكەین، لە بەرامبەریشدا میكانیزمی (لەیەك دوورخستنەوە-التفكیك) وامان لێدەكات بتوانین بوونەوەرەكان بۆ بچوكترین ڕەگەزەكانیان ورد بكەینەوە، لە ڕێی ئەو میكانیزمەوەیە كە یەك سیستەمی ژینگەیی (سروشت) وەك كۆمەڵێك دامەزراوەی ژینگەیی ببینین (كەش و هەوا- ڕووەكەكان – بەرزاییەكان..) و چەمكە گشتییەكان لە بەیەكەوەبەستنەوە و لەیەكدوورخستنەوە چەمكە گشتییەكان دەردەكەون، بۆنموونە گورگ و سەگ و ڕێوی دەخەینە یەك كۆمەڵەوە و دەڵێین (كەڵبەدارەكان) و، میكانیزمی (داماڵین - التجرید) بەو كارە هەڵدەستێت، ئەم میكانیزمە وایكردووە بتوانین لەگەڵ چەمكە ڕووتەكانیشدا ڕەفتار بكەین، كە دەكەونە دەرەوەی سنووری پێنج هەستەوەرەكەوە و، بیردۆزی زانستی و بیرۆكەی فەلسەفی و ئایدۆلۆجیای سیاسی دابڕێژین و، لە بیروباوەڕی ئاینی تێبگەین.

میكانیزمی (بەرهەمهێنان - التولید)یش بوونی هەیە، كە یاریدەمان دەدات بۆ داڕشتنی ڕێژەیەكی بێئەندازە لە دەستەواژە و هێما؛ وەك نووسینی وشەكان لەڕێی پیتەكانەوە و، بەدواییەكداهاتنی ئاوازەكان لە پارچەیەكی مۆسیقیدا.

هەروەها میكانیزمی (چەندیی - التكمیم) یاریدەمان دەدات بۆ مامەڵەكردن لەگەڵ چەندێتییەكان (كات- مەودا- كێش...) لە ژیانی ڕۆژانەماندا، تا ئەو ئەندازەی كە ئەندازەگیری زانست (بەوەی لەڕووی چەندێتییەوە پێوانە بكرێت) بۆتە ئامانجی هەموو زانستەكان، چونكە فیزیا و كیمیا پێینەگەیشتن تا ئەو كاتەی بەچەندێتیكران، زانستی بایۆلۆجیاش بۆ ئەوە هەوڵدەدات، پسپۆڕانی زانستە مرۆڤایەتییەكانیش خەون بەوەوە دەبینن.

لەپێناو قووڵكردنەوەی تێگەیشتنمان بۆ شتەكان، كە مێشكمان بە دانانی دوو شتی پێچەوانەی یەكتر دایدەڕێژێت، سەرەوە لە بەرامبەریدا خوارەوە هەیە، ناوەوە و دەرەوە، سالب و موجەب، جیهانی غەیب و جیهانی بینراو، میكانیزمی دووسەرە (الشق الثنائی) بەو كارە هەڵدەستێت.

ئەو میكانیزمانەی باسمان كردن ئەگەر میكانیزمی بەكۆدكردن نەبوایە كاریان نەدەكرد، كە ناوی بە هەموو شتێك بەخشیوە و، هەر ئاوازێكی مۆسیقی ڕەمزێكی پێبەخشیوە، ئەو ڕەمزانە وایانكردووە بتوانین پارێزگاری لە مەعریفەكانمان بكەین و بۆ نەوەكانی دوای خۆمان بیانگوازینەوە، تەنانەت ئەو ڕەمزانەن وایانكردووە بتوانین بیریكەینەوە!

دوای ئەوەش، ئەو زانست و زانیارییانەی لە عەقڵماندایە ئەگەر میكانیزمی بەدیهێنان (إیجاد) نەبوایە نەدەهاتەبوون، كە دەیگۆڕێت بۆ بوونێكی بەرجەستە یاخود ماددی، بەهۆی ئەو میكانیزمەیە كە ئەندازیار بیرۆكەكانی دەگۆڕێت بۆ باڵەخانە و ئامێر.

## بیرکردنەوە (التفکیر) :

هەندێك بوونەوەر چالاكییەكانیان بە وردەكارییەكی زۆرەوە ئەنجام دەدەن، كە وەك ئەوە دەردەكەوێت كە توانای بیركردنەوەی هەیە، ئایا بەڕاستی بیردەكاتەوە؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە، سەرەتا پێویستە پێناسەیەكی بیركردنەوە بكەین. لەوانەیە باشترین پێناسەی بیركردنەوە ئەوە بێت، كە دەڵێت: ((بریتییە لە توانای مێشك بۆ مامەڵەكردن لەگەڵ ڕەمزەكان (بە شێوەیەكی كراوە) لەگەڵ پابەندبوون بە یاسا و ڕێساكانەوە))، بەڵام واتای (بە شێوەیەكی كراوە) چییە؟ با بە نموونەیەك وەڵام بدەینەوە؛ جاڵجاڵۆكە لە كاتی چنینی تەونەكەیدا پشت بە ڕێسای پشێوی ژێیە ڕاكێشراوەكان[1] دەبەستێت، بەڵام ئایا جاڵجاڵۆكە دەزانێت ئەو ڕێسایە چییە؟! لە ڕاستیدا مێشكی جاڵجاڵۆكە هەر نازانێت ئەو ڕێسایە چییە، بەڵام لە كاتی چنینی تەونەكەیدا پێیەوە پابەندە، ناتوانێت بۆ مەبەستی تر بەكاریبهێنێت، بە پێچەوانەی مرۆڤ؛ بۆنموونە ئەندازیار یاسایەك لە یاساكانی فیزیا دەخوێنێت، دەتوانێت لە چالاكی و كاروباری بێ سنووردا بەكاریبهێنێت (ئەمەیە واتای بە شێوەیەكی كراوە)، كە بریتییە لە گرنگترین چالاكی بیركردنەوە.

لەوانەیە تێبینی ئەوەت كردبێت، كە زۆربەی مەعریفەی مرۆیی دەكەوێتە نێوان ئەم دوو لایەنەوە؛ دەرككردنی سنوورداری جاڵجاڵۆكە و، تێگەیشتنی ڕووتی شیاو بۆ جێبەجێكردن و بەكارهێنانی زۆر و جۆراوجۆری كراوە.

---

ئەگەر میكانیزمەكانی ڕابردوو یارمەتیدەرمان بوویتن لەسەر شیكاركردن و تێگەیشتن لە بوونی دەوروبەرمان، ئەوا ناتوانن پاڵنەری دەروونیمان پێببەخشن بۆ كردنی كارێك یان وازلێهێنانی، چونكە ئەمە پێویستی بە هەست و سۆز هەیە؛ وەك ترسان لە شتێك و وابەستەبوون بە شتێك و..هەموو ئەمانە پێویستییان بە میكانیزمی كاردانەوە(الإنفعال) هەیە، ئەگەر ئەو نەبوایە تۆ نەدەبوویت بەو بوونەوەرەی كە ئێستا هەیت!

(١) Tension of Stretched Strings Law= Hooks Law.

ئەگەر مێشکی هۆشیار بە دوو فرمانی عەقڵی جیاواز هەڵبستێت و بەدوای یەکدا؛ دەرککردن بە دەوروبەرمان، پاشان تێگەیشتن لەوەی کە دەرکی پێکردووە، ئەوا ئەم سێ چالاکییەی کە بەدوای یەکتردا دێن (هۆش- دەرککردن- تێگەیشتن) بریتین لە گرنگترین تایبەتمەندییەکانی زیرەکی مرۆڤ. ئایا هێشتا کەسانێك هەن کە باوەڕیان بەوە هەبێت ئەم چالاکییە عەقڵییانە بەرهەمی هەڕەمەکیتی بن؟!

## ئازادی ویست و توانای هەڵبژاردن :

ئەوەی جێگای سەرسوڕمانە ئەوەیە کە هەندێك لە قوتابخانە ئایینی و فەلسەفییەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە مرۆڤ لە ڕەفتارەکانیدا ناچارکراوە، ئەوان بەم قسەیەیان لەگەڵ هەندێك لە زانا بایۆلۆجییەکاندا هاوڕان کە باوەڕیان بە حەتمییەتی بایۆلۆجی هەیە، واتا ڕەفتارەکانی مرۆڤ لەلایەن جیناتماندا فەرز دەکرێن، هەروەها لەگەڵ ئەو قوتابخانە پەروەردەییەشدا هاوڕان کە وایدەبینێت ڕەفتارەکان لێکەوتەی شێوازی پەروەردە و گەشەکردنن، لە کۆتاییدا هەر یەکێك لەوانە وایدەبینن کە مرۆڤ هیچ ویستێکی نییە و لە هەڵبژاردنەکانیدا ئازاد نییە.

لە ڕاستیدا پرسی ئەوەی کە (ئایا مرۆڤ ئازادە یان رامکراوە) کە لە دێر زەمانەوە و-تا ئێستاش- بیری مرۆڤایەتی زۆر سەرقاڵ کردووە، هەر پێویست نەبوو بخرێتەڕوو! چونکە ڕەفتارەکانی ڕۆژانەمان بەرامبەر بە ڕووداوەکان باشترین بەڵگەن لەسەر ئازادی ویست؛ بۆنموونە تۆ ئازادی لەوەی کە لە خوێندنەوەی ئەم کتێبە بەردەوام بیت یان دایبخەی، لەبەرئەوە ئازادی ویست بە یەکێك لە گرنگترین خاسیەتەکانی ڕەگەزی مرۆڤایەتی هەژمار دەکەین. هەروەها گومان لەوەدا نییە کە نکوڵیکردن و ڕەتکردنەوەی ئازادی ویست ئەوە

دەگەیەنێت کە هەموو ئایینەکان پێبنەمان، چونکە ئایینەکان لەسەر پاداشت و سزای هەڵبژاردنە ئازادەکانمان بنیاتنراون، لەبەرئەوە ئیسلام زۆر جەختی لەسەر ئازادی ویستی مرۆڤایەتی کردۆتەوە[1].

دەتوانین ئازادی ویست بەوە پێناسە بکەین، کە بریتییە لە هەڵبژاردنێکی هۆشیارانە لەنێوان بژاردەکاندا، لەو کاتەدا کە دەتوانرێ بژاردەیەکی تر هەڵبژێرین[2].

ئەگەر لە شەوێك لە شەوە ساردەکانی زستاندا، لە یەکێك لە شەقامەکانی شارەکەتدا خەریکی پیاسەکردن بوویت، لەناکاو بارانێکی بەخوڕ هەڵیکرد، گومان لەوەدا نییە- ئەگەر چەترت پێنەبێت و لەناو ئۆتۆمبێلدا نەبیت - ئەوا بە خێرایی رادەکەیت بۆ نزیکترین بنمیچ تا خۆت لە تەڕبوون بپارێزی. لە ڕاستیدا ئەم کارەت دەرئەنجامێکی سروشتییە بۆ ڕووداوەکە، چونکە تەنانەت پشیلەکانیش خێرا بەرەو نزیکترین ئۆتۆمبێل رادەکەن تا خۆیان لە ژێریدا حەشار بدەن. بەڵام ئەگەر - سەرەڕای ئەو بارودۆخە- بتەوێ هەر لەژێر بارانەکەدا بوەستیت، بەپێچەوانەی ئەوەی کە پێشەکییەکان لەسەرت پێویست دەکەن، ئەوا لێرەدا تۆ جۆرێك لە ئازادی ویستت ئەنجامداوە، کە هیچ پێشەکییەك کۆنترۆڵی نەکردووە و کاریگەری بەسەرەوە نەبووە.

---

(١) قورئانی پیرۆز لەو بارەیەوە فەرموویەتی:

﴿ وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا ۝٧ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا ۝٨ ﴾ الشمس: ٧ - ٨

﴿ إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ۝٣ ﴾ الإنسان: ٣

﴿ وَهَدَيْنَاهُ النَّجْدَيْنِ ۝١٠ ﴾ البلد: ١٠

﴿ وَقُلِ الْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَن شَاءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاءَ فَلْيَكْفُرْ إِنَّا أَعْتَدْنَا لِلظَّالِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا وَإِن يَسْتَغِيثُوا يُغَاثُوا بِمَاءٍ كَالْمُهْلِ يَشْوِي الْوُجُوهَ بِئْسَ الشَّرَابُ وَسَاءَتْ مُرْتَفَقًا ۝٢٩ ﴾ الكهف: ٢٩

(٢) بە پشت بەستن بە بڕوای زانستی دەروونناسی بە ئازادی ویستی مرۆڤ، باسای سزادان چوار مەرجی داناوە: پێویستە توانای خەیاڵکردنی جێگرەوەی تری کردارەکەی هەبێت، توانای ئەوەی هەبێت ئەو کارە نەکات، بزانێت سەرەنجامی دوور و نزیکی کارەکەی چییە، لە کۆتاییشدا پێویستی ئارەزووی ئەو دەرەنجامانە بکات کە لە کارەکەی دەکەونەوە. ئایا جەختکردنەوە لە ئازادی ویست لەمە زیاتر چییە؟!

بە هەمان شێوە دەبینین کە هەندێك کەس(بە ویستی خۆیان) ژیانی خۆیان دەکەنە قوربانی لەپێناو کەسانی تردا، هەروەك لە جەنگەکان و پەتاو تاعوونەکاندا ڕوودەدات.

لەوانەیە بڵێی، کە لەوانەیە ئەو کەسانە لەپێناو شەهیدبوون لەپێناوی خودا ئەو کارە بکەن، تا بچنە بەهەشتەوە، واتا باوەڕەکەیان پاڵنەریانە بۆ ئەو کارەیان. بەڵام دەبینین ئەو کەسانەش ئەو کارانە ئەنجام دەدەن، کە لەسەر هیچ ئایینێك نین، لەوانەیە کەسی بێباوەڕ بڵێت، ئەمە لە پێناو باوەڕبوونیانە بە نموونە باڵاکان - وەك قوربانیدان - و ئەوە بۆتە پاڵنەری ئەو کارەیان. هەتا ئەگەر لەو تەفسیرەدا لەگەڵیدا هاوڕابین، ئەوا گومان لەوەدا نییە، کە بڕیاری ئەو کەسانە کاتێك مردنیان هەڵبژارد - کە لەلای ئەوان واتا فەنابوونی یەکجارەکی - لەپێناو کەسانی تردا، ئەوە بەسەر خۆشەویستی مانەوەدا زاڵ بووە (کە بریتییە لە بەهێزترین غەریزەی مرۆڤ)، بەمەش ئەندازەیەکی گەورەی ئازادی ویستیان ئەنجامداوە[1].

## بوونەوەرێکی خەیاڵی، کە بە زەمەندا گوزەر دەکات :

تەنیا یەك بوونەوەر بوونی هەیە کە توانای وێناکردنی جێگرەوەکانی هەیە، پێشبینی باشترین و خراپترین، مەزندەکردنی دەرەنجامەکان بە شێوەیەکی پێشوەختە دەکات و پلان بۆ بەدیهێنانی باشترین دادەنێت، ئەو بوونەوەرەش مرۆڤە، کە توانای ئەوەی هەیە خۆی لە واقیع دەربێنێت و پرسیار بکات: بارودۆخەکە چۆن دەبوو ئەگەر شتەکان بە شێوەیەکی جیاواز بوایەن لەوەی کە ئێستا هەیە؟

---

(١) گومان لەوەدا نییە کە بوونی ڕەوشتی قوربانیدان لە دەروونی مرۆڤایەتیدا یەکێکە لەو گرفتانەی بێباوەڕان لە تەفسیرکردنی بێتوانا دەکات و، لە تەوەرەی ئایندەدا باسی دەکەین.

لە ڕاستیدا ئەومیان پێویستی بەوە هەیە کە مرۆڤ توانای وێناکردنی جیهانێکی خەیاڵی هەبێت، بەمەش مرۆڤ توانیویەتی ژیارستانیەتەکان بنیات بنێت و پێشکەوتنی تەکنۆلۆجی و زانستی و هزری بەدیبێنێت.

ئەو خەیاڵەش لەپشت زانست و ئەدەب و فەلسەفە و ئایین وەستاوە، چونکە زانست لەسەر پرسیارکردن دامەزراوە؛ بۆچی جیهان بەم شێوەیە کە ئێستا لەسەریەتی، لە کاتێکدا دەکرا لەسەر شێوەیەکی تر بوایە؟ زانست لەسەر گەڕان بەدوای ئەو (بۆچی)یە دامەزراوە.

بە هەمان شێوە، داهێنانی ئەدەبی لەسەر وێناکردنی ئەو ڕووداوانە دامەزراوە کە لە دەرەوەی ژیانی ڕۆژانەمانن، چ لە هەمان شێوازی ژیان بن یان ژیانێکی خەیاڵی و گریمانەیی جیاواز بن.

بە هەمان شێوە توانای وێناکردنی جیهانێکی جیاواز وامان لێدەکات بتوانین گریمانە و خەیاڵ سەبارەت بە جیهانێکی رۆحی بەرز دابڕێژین، هەروەها دەربارەی بوونمان بەر لە پەیدابوونی مرۆڤایەتی و ژیانی دوای مردنمان؛ ئەم توانایە یاریدەدەرمانە بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارە وجودییە تەوەرەییەکان کە فەلسەفەیان بەخۆیانەوە خەریك کردووە و ئایینەکان بۆ وەڵامدانەوەیان هاتوون.

## گوزەرکردنی عەقڵی بەناو زەمەندا Mental time travel

ئەوەی کە مرۆڤ بوونەوەرێکی خەیاڵییە توانایەکی تری گرنگی دێتە پاڵ، ئەویش بریتییە لە (گوزەرکردنی عەقڵی بەناو زەمەندا)، بە واتای توانای عەقڵی بۆ گێڕانەوەی ئەو ڕووداوانەی لە ڕابردوودا ڕوویانداوە، هەروەها پێشبینیکردنی ئەوەی کە لە ئاییندەدا ڕوودەدات. ئەمەش-هاوشێوەی خەیاڵ- سەلمێنراوە کە جگە لە مرۆڤ هیچ بوونەوەرێکی تر ئەو توانایەی نییە.

نوام تشۆمسکی وایدەبینێت کە گوزەرکردنی عەقڵی بەناو زەمەندا ڕەگەزێکی سەرەکییە لە گەشەکردن و بەکارهێنانی زماندا، چونکە مرۆڤ لە کاتی بەکارهێنانی زماندا بەنێو زەمەنەکاندا گوزەر دەکات، کە لە زمانی ئینگلیزیدا دەگاتە نزیکەی سی دەم (الزّمن). گوزەرکردنی عەقڵی بەناو زەمەندا لەلایەنی بیروباوەڕی ئاینییشەوە کاریگەری هەیە، چونکە یارمەتیمان دەدات بۆ بنیاتنانی دید و بۆچوونی بیروباوەڕی جیاواز گوزەر بکەین؛ دەربارەی پەیدابوونی گەردوون و، ئەوەی کە چی پێش لەدایکبوونمان هەبووە و، چی دوای مردنمان ڕوودەدات.

## باوەڕبوون (بە هۆکاریتی) :

مرۆڤ بەرگەی ئەوە ناگرێت کە بەرامبەر بە ڕووداوە گرنگەکان بوەستێت کە لە ژیانیدا پێیاندا تێپەڕ دەبێت؛ وەك مردن و نەخۆشی، بەڵکو بەرامبەر بە هەموو ئەو شتانەی کە لە دەوروبەریدا ڕوودەدەن، وەك هەڵکردنی با و بارینی باران و ئاگرکەوتنەوە و دامرکانەوەی. لەبەرئەوە باوەڕبوون بەوەی کە لە پشت هەموو ڕووداوێك هۆکارێك هەیە بۆ تەفسیرکردنی ڕووداوەکان پێویستە، بە گەورە و بچوکییەوە، بۆ تێرکردنی ئارەزووەکانی مرۆڤ و، بۆ ئەوەی کە جیهانی دەوروبەرمان واتایەکی هەبێت. هەروەها باوەڕبوون بە هۆکاریتی پاڵنەری یەکەمە بۆ گەڕان بەدوای هۆکاری یەکەمینی دواوەی بوون، کە بە (بەڵگەی بەدیهێنان) یاخود (بەڵگەی گەردوونی ) ناسراوە، کە بە بەڵگەی بوونی خودای دادەنێین.

زانایانی دەروونناسی باوەڕبوون بە هۆکاریتی بە قۆناغێکی سەرەکی گەشەی منداڵ و پێکهاتنی رەفتارەکانیان دەزانن، چونکە ویستی تەفسیرکردنی ڕووداوەکان (کە بە غەریزەی تەفسیری Explanatory Drive ناسراوە) و، بە بناغەی دەروونی منداڵ هەژمار دەکرێت، رێك وەك غەریزەی خواردن، بۆیە لە

ماوەی مانگەکانی سەرەتای ژیانیاندا پەرۆشییان بۆ تێگەیشتن لە دەوروبەریان دەردەکەوێت، جا ئەگەر بە شێوەیەکی غەریزی (جینی) منداڵەکان هەست بەوە بکەن کە شتەکان لە ڕێی پەیوەندی هۆکارییەوە بەرێوەدەبرێن، ئەوا بە فێربوون هەست بەوە دەکەن کە شتەکان بۆ بەدیهێنانی ئامانجێك دەخرێنە گەڕ.

## خۆشەویستی ئاشنابوون و گەڕان :

لە ڕاستیدا گەڕان لە ناوەندی دەوروبەردا تەنیا خاسیەتێکی تایبەت بە مرۆڤ نییە، چونکە هەموو بوونەوەرەکان دەگەڕێن. ڕووەکەکان بەدوای ڕووناکیدا دەگەڕێن. ئاژەڵەکانیش بەدوای خۆراکدا دەگەڕێن. میکرۆبەکانیش هەندێکیان بەدوای ڕووناکیدا دەگەڕێن و هەندێکیشیان بەدوای ئۆکسجیندا دەگەڕێن، هەموشیان لە هۆکارە زیانبەخشەکان دووردەکەونەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، هەندێك لە زانایانی بایۆلۆجیا پێشنیاری ئەوەیان کردووە کە ناوی (مرۆڤی گەڕۆك Homo quaevens) لە مرۆڤ بنرێت، وەك پێوانەیەك لەسەر ناوە بایۆلۆجییەکەی ئێستای (مرۆڤی عاقڵ)، کەواتە ئێمە لە گەڕاندا بە چی لە بوونەوەرانی تر جیادەکرێینەوە؟.

لە ڕاستیدا جیاوازی نێوان گەڕانی مرۆڤ و بوونەوەرانی تر جیاوازییەکی زۆر گەورەیە؛ چونکە گەڕانی مرۆڤ بەهۆی پێویستی و سوودی ڕاستەوخۆ نییە(وەك بوونەوەرانی تر). بەڵکو بۆ لایەنی خۆشەویستی ئاشنابوون و هۆگربوونە بە زانیاری و غەریزەی باوەڕبوونە بە هۆکارێتی[1].

---

(١) هیچ سوودێکی ڕاستەوخۆ لە پاڵ دۆزینەوەی سەرچاوەکانی نیل، یان چوونە سەر مانگ یان.... بوونی نییە. هەروەها چی وای لە پێشینەکانمان کرد کە لە ئەفریقیا دەربچن بەرەو ئاسیا و ئەوروپا، ئەماوەی نێوان ١.٩ملیۆن-١٠٠.٠٠٠ساڵ. هەروەها چی وای کرد کە لە باشووری ئاسیاوە زەریای هیندی بڕن پێش نزیکەی ٥٠.٠٠٠ساڵ. هەروەها چی پاڵنەری کەسانی تر بوو کە پێش ١٢.٠٠٠-١٦.٠٠٠ساڵ

لە لێکۆڵینەوەیەکدا کە تیمێکی توێژەرانی زانکۆی لەندەن لە ساڵی ٢٠٠٦ز دا ئەنجامیانداوە، بۆیان دەرکەوتووە کە لە کاتی بڕیارە مەترسیدارەکان و سەرکێشییەکان چەند شوێنێکی تایبەتی لە مێشکدا چالاك دەبن، بەڵام لە کاتی بڕیاردانی بڕیارەکانی خۆپاراستن چەند شوێنێکی تر چالاکدەبن.

هەروەها بۆیان دەرکەوتووە کە ناوچەکانی مەترسی بە بەراورد لەگەڵ ناوچەکانی پەیوەستبوون گەورەترن لە مێشکی مرۆڤدا بە بەراورد بە بوونەوەرە سەرەکییەکانی تر. ئەمەش ئەوە تەفسیر دەکات کە بۆچی مرۆڤ کۆکردنەوەی زانیاری نوێ (دۆزینەوە) بەسەر ئەوەدا فەرز دەکات کە تەنیا بەو زانیاریانە وازبێنێت کە هەیەتی و سەلامەتی بۆ فەراهەم دەکات[1].

## ڕەفتاری کۆمەڵایەتی مرۆڤ :

ئەگەر عەقڵی مرۆیی، بە هەموو ئەو بەهرە عەقڵییانەش کە بەدوایدا دێن، مرۆڤی کردبێتە زیرەکترینی بوونەوەرەکان، ئەوا گومان لەوەدا نییە کە سیفەتێکی تریشی پێبەخشیوە کە گرنگییەکەی کەمتر نییە لەو تایبەتمەندییە، ئەویش ئەوەیە کە مرۆڤ لە هەموو بوونەوەرەکانی تر زیاتر گرنگی بە ڕەفتارە کۆمەڵایەتییەکانی دەدات.

---

سیبیریا ببڕن و بگەنە ئالاسکا و پاشان دوو ئەمریکاکە. بۆچی پێشینەکانمان مەترسی ئەو کۆچانەیان لەکۆڵ کرد؟

(١) یەکێك لە ڕەفتارە گرنگەکان لەلای منداڵان، ئەوەیە کە بە وردەکارییەکی زۆرتر و ماوەیەکی درێژتر سەرنجی شتە نوێیەکان دەدەن و، بە دووبارەبوونەوەی لێی رادێن و گرنگیپێدانیان کەمدەبێتەوە، بەڵام ئەگەر گۆڕانکارییەکی تێیدا ڕوویدات دووبارە گرنگی پێدەدەنەوە، ئەمە بە بەدوای یەکداهاتنی ڕاهاتن و نوێنکردنەوە ناسراوە.

ئاندرۆ ویتن[1] (مامۆستای دەروونناسی پەرەسەندنی بەریتانی) ڕەخنە لەو کەسانە دەگرێت کە دەڵێن گەلانێکی وەك مێشە هەنگ و مێروولە لە ئێمەی مرۆڤ کۆمەڵایەتیترن، تەنیا لەبەرئەوەی کە کۆمەڵگاکانیان ژمارەیان زیاترە، هەروەها لەبەر ئەوەی چڕی کۆمەڵگاکانیان زیاترە و رەفتارەکانیان توووند و پابەندترە، دابەشکردنی بەرپرسیاریەتەکان لە نێوان خۆیاندا وردتر و توندترە. ئاندرۆ ویتن دەڵێت کە گرنگترین خاسیەتی چالاکی مرۆیی بریتییە لە (قووڵیی)، دەیگێڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ناوی (عەقڵی قووڵی کۆمەڵایەتی) ناسراوە و، خاسیەتەکانی دیاریدەکات کە بەهۆیانەوە لە رەفتاری کۆمەڵایەتی بوونەوەرەکانی تر جیاوازە، لە چوار خاڵدا کورتیان دەکاتەوە:

**١- خوێندنەوەی عەقڵ Mind Reading:** ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە کەسانی تر چۆن بیردەکەنەوە و باوەڕیان بەچی هەیە و چیان دەوێت. ئەگەرچی ئاژەڵانیش دەتوانن پێشبینی هەندێك رەفتاری ئاژەڵانی تر بکەن، وەك هێرشکردن، بەڵام ئەوە خاسیەتێکی رەفتاری فیترییە لە ئاژەڵاندا، بەڵام مرۆڤ بە بوونەوەرێکی عەقڵانی هەژمار دەکرێت زیاتر لەوەی کە رەفتاری بێت، لەبەر ئەوە تێگەیشتنمان لە عەقڵی کەسانی تر دەستەواژەی (بیردۆزی عەقڵ Theory of mind)ی لێدەنرێت.

**٢- جیاوازییە ژیارستانییەکان:** ئەگەر ژینگە لە هەندێك لە جیاوازییە رەفتارییەکانی نێوان تاکەکانی هەمان جۆری ئاژەڵاندا بەرپرس بێت[2]، ئەوا جیاوازییە ژیارییەکان بە شێوەیەکی زۆر قووڵتر لەوە پێکدەهێنێت. تا ئەو ئەندازەیەی کە هەندێك لە پسپۆڕان کاریگەرییە ژیارییەکان بە (کاریگەری پەتا Epidemic Representation) ناودەبەن، مەبەستیان ئەوەیە کە کاریگەرییە ژیاری و رۆشنبیرییەکان دەگوازرێنەوە (زۆردەبن) لە عەقڵێکەوە بۆ عەقڵێکی تر لە یەك ژینگەدا، لەژێر رۆشنایی چەمکەکانی ئایینەدا شیدەکرێنەوە و وەردەگیرێن لە میانی چەمکەکانی وەرگرەکە. گومان لەوەدا نییە کە ئەم خاسیەتە بۆ مرۆڤ خاسیەتێکی بێهاوتایە.

---

(١) Andrew Whitn: مامۆستا لە زانکۆی St Andrews.

(٢) وەك ماڵیکردنی هەندێك لە ئاژەڵەکان، وەك سەگ و پشیلە.

**٣- زمان و پەیوەندیکردن:** گومان لەوەدا نییە کە زمان هۆکارێکی نموونەییە بۆ پەیوەندیکردن، ڕێگامان دەدات ئەوەی لە عەقڵماندایە (نیاز- بیرۆکە- زانیاری) بۆ کەسانی تری بگوازینەوە، جگە لەوەش، هۆکارێکە بۆ بەدیهێنانی دوو ڕەگەزەکەی پێشوو (خوێندنەوەی عەقڵ و جیاوازییە ژیارییەکان). لەڕێی ئەو لایەنانەشەوە زمان قووڵییەکی بێ هاوتا بە عەقڵی کۆمەڵایەتی مرۆڤ دەبەخشێت، کە لە بوونەوەرانی تردا بوونی نییە.

**٤- هاریکاری:** کۆمەڵگە مرۆڤایەتییەکان دوو جۆر هاریکاری ئەنجام دەدەن:

(أ) یەکسانی کۆمەڵایەتی کە تا ئەوکاتەی سیستەمی چینایەتی پێش ١٠ هەزار ساڵ باو بوو.

(ب) هەماهەنگی لە پێناو دابەشکردنی کارەکاندا، گۆڕینەوەی زانیارییەکان لەڕێی زمانەوە یاریدەی ئەومیان داوە.

ئەگەر ڕوونترین نموونە بۆ ڕەفتاری کۆمەڵایەتی غەریزی شانشینی مێروولە بێت، کە وەك یەك بوونەوەری گەورە سەیر دەکرێت، ئەوا بە هەمان شێوە دەکرێ سەیری کۆمەڵگا مرۆییەکان بکرێت، بەوپێیەی کە هەر تاکێك ڕۆڵ و کاری خۆی هەیە(هەروەك چۆن هەر ئەندامێکی لاشە ڕۆڵی خۆی هەیە) لە پێناو بەدیهێنانی ئامانجەکانی کۆمەڵەکە، بۆیە-بۆنموونە- ئێمە بە (گەلی میسری) ناودەبرێین. سەرەڕای هەموو ئەوانەش، جیاوازی جەوهەری نێوان ئاژەڵ و مرۆڤ بریتییە لە هۆشیاری عەقڵی قووڵی هەر مرۆڤێك بۆ ڕۆڵەکەی لە پێناو خزمەتکردنی کۆمەڵ.

## داهێنانی ئامرازەکان :

گومان لەوەدا نییە کە دیاریکردنی کاتی سەرهەڵدانی توانا عەقڵییەکان شتێکی زۆر قورسە، چونکە حەفریاتێکمان نییە کە کاتی دەرکەوتنی توانا زمانەوانییەکان یاخود چالاکییە عەقڵییەکانی ترمان بۆ دیاری بکەن. لێکۆڵەران لە (حەفریاتەکانی ئامرازە درووستکراوەکان)دا، شتی وایان دەستکەوتووە کە لەو گرفتە یارمەتیدەریان بێت، چونکە ئەو حەفریاتانە زۆر زانیاری دەربارەی دەرکەوتنی توانا مرۆییەکان بۆ مرۆڤ ئاشکرا دەکەن.

## دەرککردن بە هۆکاریتی و داهێنانی ئامرازەکان :

بۆ نموونە، پسپۆڕان وەك بەڵگەیەك بۆ دەرککردنی مرۆڤ بە پەیوەندی نێوان ئامراز و ئەو مەبەستەی بۆی بەکاردێت بەکارهێنانی ئامرازەکان بە نموونە دێننەوە، بەکارهێنانی ئامرازەکان لەلایەن مەیموونە بەرزەکانەوە ناچێتە ئەو لایەنەوە، چونکە ناتوانێت ئامرازەکە بۆ مەبەستێکی تری جگە لەوەی فێریکراوە بەکاربێنێت، یان بتوانێت ئامرازێك ئامادە بکات(بۆنموونە وەك گەڵای درەخت) و بە شێوەیەکی باشتر بەکاریبێنێت، یان ئەوەتا زیاتر لە ئامرازێك بۆ بەدیهێنانی مەبەستێك بەکاربێنێت.

هەروەها مەیموونی شامپانزی کردارەکانی و ئەوەی کە لە دەوروپشتیدا ڕوودەدات پێکەوە نابەستێتەوە، بۆنموونە ئەگەر بەردێك لەژێر سندووقێکدابێت و ناهاوسەنگی بکات و مەیموونی شامپانزی نەتوانێت لەسەری بوەستێت، ئەوا بەهیچ جۆرێك شامپانزی بیر لەوە ناکاتەوە بڕوات بەردەکە لابەرێت. دەتوانین

جیاوازی نێوان دیدی مرۆڤ و دیدی شامپانزی بۆ هۆکارێتی بە نموونەیەك ڕوون بکەینەوە؛ شامپانزی ئەوە دەبینێت کە کاتێك قەدی درەختەکان بەهۆی باوە دەجووڵێن بەروبوم دەکەوێتە خوارەوە، کەچی هەرگیز ئەوە فێرنابێت کە بڕوات خۆی قەدەکە بلەرزێنێت، وەك چۆن مرۆڤ فێردەبێت.

ئەگەر وەستانی پێشینەکانی مرۆڤ لەسەر قاچەکانیان بگەڕێتەوە بۆ نزیکەی چوار ملیۆن ساڵ، ئەوا بەکارهێنانی ئامرازەکان بۆ ڕاو و کشتوکاڵ دەگەڕێتەوە بۆ ٢-٣ ملیۆن ساڵ، وادیارە مێشکی مرۆڤ پێویستی بەو ماوەیە هەبووە تا گەشە بکات و پسپۆڕی وەربگرێت و توانای دیزاینکردنی ئامرازەکان فێر ببێت و لە تایبەتمەندییە فیزیاییەکانی ئەو ماددانە تێبگات کە لێیان پێکهاتوون[١].

زانایان وەك بەڵگە لەسەر دەرککردنی پێشینەی مرۆڤ بە هۆکارێتی نموونە بە بەکارهێنانی ئەو ئامرازانە دێننەوە کە بە (ئامرازە لێکدراوەکان) (کە لە زیاتر لە پارچەیەك پێکهاتوون)، وەك تەور کە لە دەسك و سەر پێکهاتووە، هەروەها بەکارهێنانی ئامرازە لاوەکییەکان؛ بە واتای بەکارهێنانی ئامرازێك بۆ دروستکردنی ئامرازێکی تر، وەك بەکارهێنانی بەرد بۆ تاشینی بەردێکی تر و بەکارهێنانی وەك چەقۆ، ئەمەش بێگومان جیاوازە لە ئامرازە سەرەتاییەکان کە پێویستییان بە تێگەیشتنێکی سەرەتایی هەیە بۆ هۆکارێتی، وەك ئەوەی شامپانزی بەردێك بۆ شکاندنی گوێزێك بەکاربێنێت.

گومانیش لەوەدا نییە کە پەیوەندییەکی گەورە هەیە لەنێوان دەرککردن بە هۆکارێتی و پەیدابوونی زمان، چونکە زمان پەیدا نەدەبوو ئەگەر مرۆڤ پەیوەندی نێوان شتەکانی نەزانیایە(هۆ و ئەنجام)، ئەوەیە کە دوای کەمێکی تر بە جۆرێك لە درێژی باسی لێوە دەکەین.

---

(١) ئەنجامدانی کاری دەستی لەلای مرۆڤ(سەرەڕای گەورەبوونی قەبارەی مێشك) پێویستی بە گۆڕانکاری هەبوو لە ناوەندە هەستی و جووڵەییەکان، بەمەش پەیوەندی نێوان بەشی پێشەوەی مێشك و ناوچەکانی تەربیت و کۆنترۆڵی جووڵە زیادیکردووە، تا وایلێهاتووە کە ئەو ناوچانە بوونەتە تایبەت بە داهێنانی جووڵەیی بەتایبەتی جووڵەی دەست.

## دەرککردن لە دەرەوەی هەستەکان[1]:

مرۆڤ توانای دەرککردنی شتەکانی دەرەوەی توانای پێنج هەستەوەرەکەی هەیە، کە تیایدا سنووری کات یان شوێن دەبڕێت! ئەمەش تەفسیرێکی ماددی بۆ نییە. لەو دیاردانەش:

**١- دیاردەی بینینی پێشوەخت = دیاردەی هەستکردن بە هۆگری Déjà vu Phenomenon**

ئەم دیاردەیە دیاردەیەکی بەناوبانگە لە زانستی دەروونناسیدا، هەموومان یان زۆربەمان تێیدا ژیاوین.

بینینی پێشوەخت واتای ئەوەیە کە ئێمە لە ژیانماندا بە هەڵوێستێکدا تێپەر دەبین و لە بەرامبەریدا هەست بە هۆگری دەکەین، وادەزانین کە پێشتر هەمان هەڵوێست بە هەموو وردەکارییەکانییەوە ژیاوین، تەنانەت واهەستدەکەین کە عەقڵمان پێشتر لە یەکێك لە خەونەکانماندا ئەوەی نیشاندراوە کە چی لە وردەکارییەکانی ئەو هەڵویستەدا ڕوودەدات!!

ماددیگەراکان پرسەکەیان سادە کردۆتەوە تا لە تەنگ و چەڵەمەکە ڕزگاریان بێت، بەوە لێکیان داوەتەوە کە ئەوە تەنیا وەهمێکە و لەو ساتەدا هەستی پێدەکەین. هەر وەك چۆن، تەفسیرێکی تریان بۆ دیاردەکە کردووە، ئەویش ئەوەیە کە یەکێك لە دوو نیوەکەی مێشك پێش نیوەکەی تر بە ماوەیەکی زۆر کەمتر لە چرکەیەك هەستی بە هەڵوێستەکە کردووە و کاتێك نیوەکەی تر هەستی پێدەکات مرۆڤ لە بەرامبەر هەڵوێستەکەدا هەست بە هۆگری دەکات.

---

(١) Extra-Sensony Perception.

بۆ هەڵسەنگاندنی ئەو لێکدانەوە ماددیگەرایانە، هەندێ کەس لە نێویاندا نووسەری ئەو دێرانە، خەونە دوور و درێژەکانیان دەنووسنەوە، بۆ ئەوەی ئەگەر ڕووداوێکیان بەسەردا تێپەڕی و هەستیان بەوە کرد کە پێشتر بەسەریان هاتووە (بینینی پێشوەخت) بگەڕێنەوە سەر ئەو نووسینە کە زۆرجار لێکچونی تەواو هەیە لە نێوان ڕووداوەکەو خەونە نوسراوەکەدا، کەواتە ئەوە خەیاڵ و وەهم نییە.

**٢- دیاردەی خەونی ڕاستگۆیانە :**

دیاردەیەکی تر، کە بێگومان ئەویش بەسەر زۆربەمان هاتووە، کە لێرەدا نموونەیەکی دەخەمەڕوو:

یەکێك لەو هەڵوێستانە کە هاوڕێیەکم بۆی گێڕامەوە کە لە خەوندا بینیبوی کە بەشی لای ڕاستی پشتەسەری کوڕەکەی تاشرابوو، دوای ئەوە بە دوو ڕۆژ من و هاوڕێکەم دەگەڕاینەوە بۆ ئەو نەخۆشخانەیەی لێی دەوام دەکەین، بینیمان منداڵەکە لە ژووری پێشوازییە، پزیشکەکان لە دەوری کۆبونەتەوە و برینەکەی سەریان بۆ دەدوورییەوە، بە دیاریکراوی هەمان ئەو بەشەی پرچیان بۆ تاشیبوو کە لە خەوندا بینیبووی! گومان لەوەدا نییە کە ڕووداوەکە لە وردەکارییەکانیدا ئەگەری ڕوودانی ئەو ڕووداوانە لەڕێی ڕێکەوتەوە ڕەتدەکاتەوە، وەك چۆن ماددیگەراکان بانگەشەی بۆ دەکەن.

ئایا ئەم دوو نموونەیە ئەو پرسیارە ناورووژێنن کە چۆن مێشکی ماددی دەتوانێت دەرك بە شتگەلێك بکات کە هێشتا ڕوویاننەداوە و بە هەموو وردەکارییەکانییەوە! ئایا ترپەی کارۆکیمیایی دەمارەخانەکان دەتوانن کات ببڕن و بەرەو ئایینده بڕۆن؟!

**٣- دیاردەی پەیوەندیکردن لە دوورەوە Telepathy**

لەوانەیە دایك(یان هەر مرۆڤێکی تر) لە ساتێکدا هەست بە دڵەڕاوکێیەکی زۆر بکەن و هەست بە دڵتەنگی بکات بەهۆی ئەوەی کە کوڕەکەی لەڕێی

دەریاوە سەفەر دەکات، پاشان هەواڵی بۆ دێت کە لەهەمان ئەو کاتەدا ڕووداوێك بەسەر کوڕەکەی هاتووە. ئایا تا ئێستا ڕووینەداوە کە بیرت لەلای کەسێك بووبێت و دوای ئەوە زەنگی مۆبایلەکەت لێیدابێت، کاتێك سەیرت کردووە هەمان ئەو کەسەیە کە بیرت لێدەکردەوە؟! ئەو جۆرە ڕووداوانە زۆر زۆرن و لەژمار نایەن، کەواتە چ تەفسیرێك هەیە بۆ بڕینی بەربەستی شوێن و ئاگابوون لە ڕووداوێك کە لە دووری ئێمەوە ڕوودەدات؟.

### ٤- ئەزموونی ئەوانەی لەسەر مردن گەڕاونەتەوە Near Death Experiences

زۆر لێکۆڵینەوەی متمانەپێکراو دەربارەی ئەو بابەتە دەریانخستووە، کە هەستکردنی مرۆڤ تا دوای وەستانی مێشکیش هەر بەردەوام دەبێت، دەرکپێکردنەکەی تا هەندێك لە بوارە غەیبییەکانیش درێژ دەبێتەوە!

یەکێك لە گرنگترین لێکۆڵینەوەکان[1] ٦٣ نەخۆشی لەخۆ گرتووە کە تووشی جەڵتەی توندی دڵ بوون و، مردنیان ڕاگەیەنراوە، بەڵام دواتر چاك بوونەتەوە، هەندێکیان شتی سەیر دەگێڕنەوە.

هەندێکیان باسی ئەوەیان کردووە کە وایان هەستکردووە لە لاشەیان جیابونەتەوەو بەسەر لاشەکانیان سوڕاونەتەوە، پزیشك و پەرستارەکانیان بینیوە لە کاتی مامەڵەکردن لەگەڵ لاشەکانیان،پاشان هاتوونەتە خوارەوە تا جارێکی تر چوونەتەوە ناو لاشەکانیان!

هەندێکی تریان دەڵێن کە تووننێلێکی دوورو درێژی تاریکیان دیوەو لە کۆتاییەکەیدا بازنەیەکی ڕووناکیان بەدی کردووە. هەندێکی تریان دەڵێن کە پێڵاوی تێنسیان بینیوە فڕێ دراوەتە سەر نەخۆشخانەکە، ڕاستی هەموو ئەمانەش سەلمێنراوە.

---

(١) ئەم توێژینەوەیە لە گۆڤاری پێگە بەرزی زانستی Resuscitation بڵاوکراوەتەوە و، ئەنجامەکانی توێژینەوەکە لە ساڵی ٢٠٠١ز دا پێشکەش کران. لە بەردەم زانایانی مێشك و دەمار و چاودێری چڕدا لە The California Institute of Technology.

شتگەلێکی وایان دیوە کە لە یادەوەریاندا ماوەتەوە، هەندێ لەو شتانە سنوری هەستەکانیان تێپەڕاندووە، لەو ماوەیەی ئۆکسجین لە مێشک بڕاوە!

هەموو ئەوتەفسیرانەی زانا ماددیگەراکان بۆ دیاردەی دەرکپێکردنی دەرەوەی هەست دەیانخەنە ڕوو تینوێتی ناشکێنن[1]، تەنانەت کەسە حەقبێژەکانیان خۆیان دان بە بێتوانایییاندا دەنێن بەرامبەر بە تەفسیرکردنی ئەوەی کە چۆن توانا عەقڵییەکان و هەستکردن بە خوود لە مێشکی ماددییەوە هەڵدەقوڵێن.

گومان لەوەدا نییە کە ئەو دیاردانەی تیایاندا سنووری کات و شوێن دەبڕدرێن زانستی ماددیگەرایی دەخەنە مەوقیف و دۆخێکی قورس و ناخۆشەوە، چونکە چۆن ترپەی کارۆکیمیایی کە بریتییە لە زمانی مێشک دەتوانێت ئەو دیاردە نامادییانە تەفسیر بکات کە زانا و فەیلەسووفەکانی تووشی سەرسوڕمان کردووە، گومانیش لەوەدا نییە کە ئەوە وامان لێدەکات داوای تەفسیری نامادی ناکلاسیکی بۆ بکەین.

لە گەشتی ڕابردووماندا بەناو توانا عەقڵییەکانی مرۆڤ، لەنێو خاسیەتە مەعریفی و رەفتارییەکاندا ئەوانەمان هەڵبژارد کە ئەوەیان دەردەخست جیاوازییە عەقڵییەکانی نێوان مرۆڤ و بوونەوەرەکانی تر جیاوازی جۆرین نەوەك جیاوازی چەندی، کەواتە ئەوە دەسەلمێنرێت مەحاڵە پەیدابوونی عەقڵ کردارێکی ماددی هەڕەمەکی بێت، بەڵکو ناچارمان دەکات پەنا ببەینە بەر تەفسیرە غەیبییەکان.

مرۆڤ وایلێهاتووە بە بازدانی مەعریفی (جۆری) لە بوونەوەرەکانی تر جیا بکرێتەوە، مرۆڤ لەو کاتەدا بووە مرۆڤ کە توانای ئەوەی هەبوو زانیارییەکانی لەشێوەی پرسیارێکی مەنهەجی دابڕێژێت:

---

(١) زانایانی فیزیای نوێ باس لە (دیاردەی تێکئاڵان Entangelment) دەکەن، کە واتای گۆڕینەوەی کاتی وزەیە لە نێوان ئەو دامەزراوانەی کە پەیوەندییان بەیەکترەوە هەیە. هەندێك لە ماددیگەراکان بۆ تەفسیرکردنی دیاردەکانی سەرووی هەستەکان، کە مەودایەکی درێژی تێدا دەبڕدرێت پەنای بۆ دەبەن، وەك پەیوەندیکردن لە دوورەوە، بەڵام هێشتا ئەو دیاردانەی کە تێیاندا کات دەبڕدرێت لە دەرەوەی چوارچێوە فیزیاییەکاندا دەمێننەوە.

((کێ)) ((چی)) ((کرد)) ((بۆ کێ)) ((کەی)) ((لەکوێ)) ((بۆچی))؟

Who did what to whom; when.where and why?

لەو خاسیەتە عەقڵییە گشتییانەی چالاکییە عەقڵییەکان دەچینە سەر تاوتوێکردنی سێ لە گرنگترین تایبەتمەندییەکانی عەقڵی مرۆڤ، ئەوانیش زمان و چێژوەرگرتن لە جوانی و بەرزبوونەوەن.

بە زمان دەستپێدەکەین...

## عەقڵ و زمان...

(زمان) جیاوازییەکی جەوهەرییە لە نێوان مرۆڤ و بوونەوەرەکانی تردا، چونکە لەناو مێشکداو بە ئاراستەی بووندادەنرێت، وا لە مرۆڤ دەکات کە مێژووی هەبێت و لە ئێستادا ژیان بکات و پلان بۆ ئاییندە دابنێت. هەروەك چۆن زمان ئامرازێکی بنچینەییە بۆ بیرکردنەوە، بەتایبەتی ئەوانەی پەیوەستن بە چەمکە ڕووتەکانەوە، ئەمە سەرەڕای ڕۆڵی وەك گرنگترین هۆکارەکانی پەیوەندی. کەواتە ئەگەر زمانی نەتەوەیەك نەیتوانی لەگەڵ سەردەمدا ڕێ بکات، ئەوا دەبێتە هۆی دواکەوتنێکی هاوشێوە لە هزرو ژیارستانیەتدا.

پێویستە جیاوازی لە نێوان چەمکی پەیوەندی بە شێوەیەکی گشتی و زمان بە شێوەیەکی تایبەتی بکەین. لە ڕاستیدا پەیوەندی بریتییە لە گواستنەوەی زانیارییەکان لە ڕێی قسە یان نووسین یان ئاماژە یان ڕەفتارەکان، ئاژەڵەکانیش دەتوانن بەهۆکار و ڕێگای جیاواز لەگەڵ تاکەکانی ڕەگەزەکەیاندا پەیوەندی بکەن، وەك سەمای هەنگ و بۆنی ئاژەڵەکان و هی تر.. هەرچی زمانە، ئەوا بەهرەیەکە یان کارێکە یان توانای گوزارشتکردنە لە بیرۆکە و هەست و شتە

بەرجەستەکان، هەروەها پەیوەندیکردن لەگەڵ کەسانی تردا لە ڕێی دەربڕین یان نووسینی وشەکان، یان لە ڕێی ئاماژەکانەوە.

## پەیدابوونی زمـان:

**پەیدابوون و گەشەسەندنی زمان لە مرۆڤدا پێویستی بە سێ جۆر توانا هەبووە[1]:**

١- بەرەمزکردن و نیشانەکردن: ناونانی شتەکان و چەمکەکان.

٢- دیاریکردنی ڕێساکان، کە دروستکردنی ڕستە ڕێکدەخەن.

٣- پەیدابوون و دەرکەوتنی دەربڕینی دەنگەکان.

**لێرەدا باس لە دەرکەوتنی ئەو وشانە دەکەین:**

توانای (بە نیشانەکردن) یەکەمین مەرج و شارەزاییە کە زمان پێویستی پێی هەیە و مرۆڤ لە بوونەوەرەکانی تر جیادەکاتەوە، بەهۆیەوە مرۆڤ ناو لە هەموو بوون و شتێکی بەرجەستە دەنێت، جا چ شتێکی ماددی بێت یان نامادی. ئەگەر هەندێك لە ئاژەڵانیش هەمان کاری نیشانەکردن ئەنجامدەدەن، ئەوا ڕەمز و نیشانەکانی پەیوەندییان بەو شتانەوە هەیە کە ئاماژەیان بۆ دەکات، بۆ نێوچاوان گرژکردنی مەیمون ئاماژەیە بۆ توڕەیی.

بەڵام نیشانەکردنی مرۆڤ، کە زمان بۆ ئەوە بەکاردێنێت (بەدەگمەن نەبێت) هیچ پەیوەندی بەو شتانە یان ئەو کردارانە یان ئەو سیفەتانەوە نییە کە ئاماژەیان بۆ دەکات، بۆ نموونە چ پەیوەندییەك لە نێوان وشەی ئاگر و ئاگری ڕاستەقینەدا هەیە؟ یاخود لە نێوان سیفەتی بەخشندەیی و وشەی بەخشندە؟

---

(١) لەماوەی سەدەی بیستەمدا، لێکۆڵینەوەکانی (زانستە زمانەوانییەکان Linguistics) وگرنگی بە سێ لایەنەکەی قسەکردن داوە؛ (دەنگسازی یان دەرکردنی دەنگەکان Phonetics) و(واتا سازی یان واتای وشەکان Semantic) و (ڕستە سازی یان پێکهاتەی دەستەواژە و دروستکردنی ڕستە Syntax).

بەڵام کەی مرۆڤ ڕەمز و نیشانەکان (وشەکان) و جیهانی واقیعی پێکەوە بەستۆتەوە؟ نازانین.

هەرچی (دروستکردنی دەستەواژەو ڕستەکانە)، ئەو شێوازەیە کە بەهۆیەوە وشەکان بەیەکەوە دەبەسترێنەوە. هەروەها زمانە مرۆییەکان توانای داڕشتنی ژمارەیەکی زۆری ڕستەیان هەیە، چ ئەو ڕستانە پێشتر داڕێژرابن یاخود ڕستەی تەواو نوێ. هەروەها بەبێ ڕێساکانی ڕستەسازی، زمان دەبێتە چەند وشەیەکی پەرش و بڵاوی بێ واتا.

بە کورتی؛ زمان گوزارشتە لە وشەکان(ڕەمزو نیشانەکان) سەرەڕای ڕێساکان کە بەکارهێنانی زمان ڕێکدەخەن.

## بەڵام کەی مرۆڤ قسەی کردووە[1] ؟

لە ڕاستیدا زانینی ئەوەی کەی مرۆڤ فێری نووسین بووە کارێکی ئاسانە، چونکە(حەفریاتی نووسین) بوونیان هەیە کە تەمەنیان دەگەڕێتەوە بۆ دەیان هەزار ساڵ. بەڵام وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارەی(کەی مرۆڤ قسەی کردووە؟) ئەوا لەوپەڕی قورسیدایە، بەو پێیەی کە(هیچ حەفریاتێکی قسە بوونی نییە کە کاتی دەرکەوتنی ئەو توانایەمان بۆ دیاری بکات).

چەند نیشانەیەك لە ناو کەللەسەری (مرۆڤی دروستکەر - الصنّاع)[2] دا دۆزراونەتەوە، بوونی گرنگترین ناوەندەکانی زمانەوانی لە مێشکدا (لە ناوچەی برۆکا) لە مێشکی ئەو بوونەوەرەدا دەسەلمێنێت، کە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە

---

(١) کورتکراوەی وتارێکە لە گۆڤاری زانستەکانی ئەمریکی (زانستە ئەمریکییەکان Scmtific American)، ژمارەی دیسەمبەری ٢٠٠١، نووسینی زانای بایۆلۆجیا و ئەنترۆپۆلۆجیا ی ئەمریکی نیان تاتێرسل Ian Tattersell، ئەمینی مۆزەخانەی ئەنترۆپۆلۆجیات لە مۆزەخانەی ئەمریکی بۆ مێژووی سروشتی لە شاری نیویۆرك. وتارەکە بە ناونیشانی : چۆن بووین بە مرۆڤ How we came to be Human.

(٢) Homo-habilis، یەکێکە لە شێوە مرۆڤەکان یەکێکە لە هەنگاوەکانی پەرەسەندن پێش بوون بە مرۆڤی عاقڵ.

ئامادەکردنی مێشك بۆ دروستبوونی توانای قسەکردن پێش نزیکەی پێنج ملیۆن ساڵ لە مرۆڤدا دەرکەوتووە.

لە سەرەتادا مرۆڤ لە ڕێی (ئاماژە)کردن بە دەست و دەم و سەر دەستیکردووە بە پەیوەندیکردن لەگەڵ دەوروبەریدا، دەکرێ هەندێك دەنگیشی لەگەڵدا بووبێت. پاشان قۆناغی قسەکردنی بەدواداهات، کە - لە تەك ناوەندەکانی مێشکدا - پێویستی بە بوونی شوێنێکی تایبەت هەیە لە قوڕگدا، کە بریتییە لە نزمبوونەوەی لە ملدا بۆ ئەوەی ڕێگا بە دروستبوونی بۆشاییەکی تەواو بدات بۆ دەربڕینی هەموو پیتە جیاوازەکانی زمان.

توێژەرانیش گەیشتوونەتە ئەو دەرەنجامەی کە ئەو شوێنە نزمە تەنیا لە مرۆڤی نوێدا بوونی هەیە، لە مرۆڤی پێش خۆیدا (مرۆڤی نیاندەرتاڵ)[1] دا بوونی نەبووە، ئەمەش واتای ئەوە دەگەیەنێت کە توانای دەربڕینی قسە بەتەواوی دەرنەکەوت بە دەرکەوتنی مرۆڤی نوێ نەبێت.

لە منداڵەکانیشماندا شوێنی قوڕگ بەرزە(هەروەك مرۆڤی نیاندەرتاڵ)، لەگەڵ گەورەبوونی منداڵەکە ئاستی قوڕگ نزمدەبێتەوە، بەمەش زمانە بچکۆڵە درێژ دەبێت، ئەوەش ڕێگا بە ڕێکخستنی دەنگە دەربڕاوەکان دەدات و توانای دەربڕینی قسەی ڕوون زیاد دەکات، دوای ئەوەش ڕێکخستنی ڕستەکان و ئینجا دروستکردنیان بە شێوەیەکی ڕاست و درووست دێت، ئەو قۆناغە دوای نزیکەی دوو ساڵ دەردەکەوێت. ڕای ڕاستتر ئەوەیە کە دەرکەوتن و گەشەسەندنی زمان لەگەڵ پەرەسەندنی مرۆڤدا بە قۆناغی هاوشێوەی قۆناغەکانی زمان لە منداڵدا تێپەڕیوە.

هەروەك چۆن دەرکەوتنی ناوەندەکانی مێشکی زمانەوانی لە هاوشێوەکانی مرۆڤدا بەر لە پێنج ملیۆن ساڵ سەلمێندراوە، حەفریاتەکان ئەوەشیان دەرخستووە

---

(١) Homo-neanderalis: یەکێکە لە تاکەکانی ڕەگەزی مرۆڤ(Homo)، بە ئامۆزای مرۆڤی هاوچەرخ دادەنرێت، پێش ٣٥٠،٠٠٠ ساڵ دەرکەوتووە و پێش نزیکەی ٣٤،٠٠٠ ساڵ لەناوچووە. هەندێك دروستکراو و شوێنەواری جێهێشتوون کە بەڵگەن لەسەر ئەوەی هەندێك توانای عەقڵی هەبووە.

کە هاوشێوەکانی مرۆڤ گەرووی توانادار بۆ دەربڕینی قسەی ڕوونیان پێش نزیکەی نیو ملیۆن ساڵ پەیداکردووە؛ واتا بەر لەوەی پێشینانمان توانای بەکارهێنانی زمان و قسەکردنیان هەبێت. ئەمانە دوو نموونەن لەسەر خۆگونجاندنی پێشوەخت، کە واتای ئەوەیە گۆڕانکاری بایۆلۆجی دیاریکراو دەرکەوتوون (ناوەندەکانی قسەکردن لە مێشکدا و ڕێژەی دەنگ) لە قۆناغێکدا، وەك ڕێخۆشکردنێك بۆ ئەنجامدانی فرمانی تر لە قۆناغی دواتردا.

لێرەدا زانای ئەنترۆبایۆلۆجیا (ئییان تاتێرسل) پرسیارێکی قورس لە هەڵبژاردنی سروشتی هەرەمەکی دەکات؛ چۆن ناوەندی قسەکردن و ڕێژەوی دەنگ لە ناوەندەکانی مێشکدا بۆ ماوەی سەدان هەزار ساڵ بوونیان هەبووە بەر لەوەی قسەکردنمان دەرببڕین؟

تاتێرسل وەڵامدەداتەوە: گومان لەوەدانییە کە((دیزاینی زیرەك و پەرەپێسەندنی خودایی)) ئەویان کردووە.

## زمان بە شێوەیەکی جینی لە مێشکماندا بەرنامەڕێژکراوە

مرۆڤ بە شێوەیەکی خۆکرد و ناهۆشیار زمان بەکاردەهێنێت، تا ئەو ئەندازەیەی، کە بیرکردنەوە لە ماهییەتی زمان شتێکی بێمانایە، بەڵام لە شەستەکانی سەدەی بیستەمەوە چەند گۆڕانکارییەکی گەورە بەسەر تێگەیشتنماندا هاتوون بەرامبەر بە زمانی مرۆڤ، چونکە سەلمێندراوە کە توانای زمانەوانی مرۆڤ بەشێوەیەکی فیتری (جینی) لە بنچینەی مێشکماندا چەسپاوە[1] - Hard Wired.

باوکی زانستە زمانەوانییە نوێیەکان لە زانکۆی ئێم ئای تی MIT نوام تشۆمسکی[2] لە پشت ئەو قوتابخانەیەیە، کە سەلماندوویەتی زمانەکانی مرۆڤ

---

(١) باوەڕنەکردن وەڵامی زۆربەی پسپۆڕان بوو بەرامبەر بەم چەمکە، چونکە مرۆڤەکان هەزاران زمانی جیاواز قسە دەکەن، هەر توانایەکیش ئەو ئەندازەیە جۆراوجۆربێت، ئەوا بە شێوەیەکی ئاسایی دەرەنجامی فێربوونی کۆمەڵایەتییە نەوەك دەرەنجامی بەرنامەڕێژی فیتری مێشك کە بە شێوەیەکی جینی کۆنترۆڵ دەکرێت. بەڵام سەرنجی ئەم تێبینیانە بدە کە نوام تشۆمسکی وەك نموونە هێناویەتیەوە:

١- هەموو منداڵانی جیهان لە هەمان تەمەن فێری زمان دەبن، چونکە هەموویان لە دەوروبەری تەمەنی حەوت یان هەشت مانگیدا دەست بە گاڵەگاڵ دەکەن و، بە چاوپۆشی زمانی دایکییان هەمان دەنگ دەردەبڕن.

٢- منداڵەکان بە نزیککراوەیی بە هەمان زنجیرە فێری زمان دەبن، بۆنموونە منداڵانی ئینگلیز سەرەتا فێری دەنگی a دەبن بەر لە دەنگی أ ولا و، بە نزیکبوونەوەی یادی لەدایکبوونی یەکەمیان بە تەواوی بەکاردەهێنن، ئەمە بە چاوپۆشی لە زمان و ژینگە.

٣- فێربوونی زمان زۆر خێرایە، چونکە لە تەمەنی شەش ساڵیدا گۆڕانکارییەکی جۆری گەورە روودەدات و، دەبینین کە زۆربەی منداڵەکان بە رستەی تەواو و رێزمانی بە زمانی دایکییانەوە قسە دەکەن و، ئەوانەش کە تا شەش ساڵی فێری زمان نابن دواتریش کێشەی قسەکردنیان دەبێت. دەرچووی ناوەندی ئەمریکی نزیکەی ٤٥هەزار وشە بەکاردێنێت، گریمان لە تەمەنی ١٨ ساڵیدایە و لە یەك ساڵییەوە دەستی بە فێربوونی وشەکان کردووە، ئەوا ساڵانە دەکاتە ٢٦٠٠ وشە، حەوت وشە لە رۆژێکدا، یان وشەیەکی نوێ لە هەر کاتژمێرێکی هۆشیاریدا و بۆماوەی حەفدە ساڵی بەردەوام! ئەمە فێربوونێکی خێرایە و بەبێ بناغەیەکی بۆماوەیی ئەستەمە خەیاڵی فێربوونی بکرێت.

(٢) Naom chaomsky: لە دێسەمبەری ١٩٢٨ لەدایکبووە، مامۆستای زمان بوو لە زانکۆم ئێم

- سەرەڕای جیاوازی گەورەی ڕووکەشیان لە ڕێسا قووڵەکانی ڕستەسازیدا هاوبەشن، بە پشت بەستن بەو واتایە تشۆمسکی دوو چەمکی نوێی بۆ زانستە زمانەوانییەکان زیادکردووە:

چەمکی یەکەم: بریتییە لە((سیستەمی درووستکەر Generative Grammar)) تشۆمسکی ئەوەی سەلماندووە (کە لێکۆڵینەوەی نەخشەکانی مێشك دواتر دووپاتی کردەوە) کە کاتێك منداڵ لە دایك دەبێت مێشکی ئامادەیە بۆ درووستکردنی ڕستەی درووست و واتادار، چونکە تەنیا دوای ئەوەی چەند وشە و ڕستەیەك وەردەگرێت دواتر (بە ئەندازە لەسەر ئەو ڕستانە) ژمارەیەکی بێ کۆتا ڕستەی درووست درووستدەکات، ئەو کردارە لە قۆناغێکی زووی تەمەندا ڕوودەدات و ئەو زمانە دەبێتە(زمانی دایك).

چەمکی دووەم: بریتییە لە(سیستەمی جیهانی Universal Grammar). تشۆمسکی ئەوەی سەلماندووە کە هەموو ڕەگەزی مرۆڤایەتی کاردانەوەی هاوشێوەیان بەرامبەر زمان هەیە، هەرچەند ڕەچەڵەك و زمانیشیان جیاوازبێتە، مرۆڤەکان بە شێوەیەکی هاوشێوە ڕستەکانیان درووستدەکەن کە بە جۆرێك دەکەونە ژێرکاریگەری بارودۆخی دەوروبەر[1].

یەکێك لەو لەیەکچونانەش بریتییە لەوەی، کە ڕستە لە کارو بکەر و بەرکار پێکدێت، ڕووداوەکان کاتی ڕابردوو و ئێستا یان ئاییندەیان هەیە و.. هی تر.

---

ئای تی، لە سەدەی بیستەمدا کارەکانی لە بواری بیردۆزی زمانەوانیدا گرنگترینن و، کاریگەرییان بۆ زانستی دەروونناسیش درێژبوونەتەوە، تشۆمسکی سەرەڕای پسپۆڕییەکەی زانای بیرکاری و فەلسەفە و دەروونناسیشە و، مرۆڤێکی رۆشنبیرە و خاوەن ئاراستەیەکی سیاسییە کە بەگشتی لەگەڵ وڵاتانی باشووردا هاوسۆزە (بەتایبەتی پرسی فەلەستین) و هێرش دەکاتە سەر سەرمایەداری ئەمریکی.

(1) ئەمە بەسەر زمانە سەرەتاییەکانی هۆزەکانیشدا جێبەجێ دەبێت کە لەگەڵ هۆزی تردا تێکەڵ نەبوون، ئەوانەی لە باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا دەژین، تەنانەت بەسەر منداڵە کۆیلەکانیش کە لە ناوچە جیاوازەکانی ئەفریقیادا ڕفێندراون و، ناچاردەکرێن کە زمانێکی تایبەت بە خۆیان دابنێن، هەروەها لەگەڵ زمانی کەڕ و لاڵەکانیشدا جێبەجێدەبێت(زمانی ئاماژە).

یەکێك لە گەورە زانایانی زمان گوزارشتی لەو لەیەکچوونە کردووە و دەڵێت: (ئەگەر زانایەکی زمانەوانی لە مەریخ بێتە سەر زەوی، ئەوا دەگاتە ئەو دەرەنجامەی کە جگە لە چەند وشەیەکی واتادار، دانیشتوانی زەوی هەموویان بەیەك زمان قسەدەکەن[1].

## تەقینەوە گەورەکەی زمانەوانی:

داروینییەکان هەوڵێکی چڕوپڕیاندا بۆ تەفسیرکردنی پەیدابوونی زمانی مرۆڤایەتی لە ڕێی پەرەسەندنی میکانیزمەکانی پەیوەندییەوە، کە پێویستە لە پێشینی هاوبەشدا بوونی هەبێت کە بە شامپازیمان دەگەیەنێت ، بۆیە هەندێکیان بە پەرەسەندنی جوڵەی دەستەکان و هەندێکی تریان بە لێکدان و زیادکردن بۆ جووڵەی دەستەکان و جووڵەکانی سەر هەژماری دەکەن، هەندێکی تریش بۆ پچڕپچڕی هاوارکردنی پێشینەکانی مرۆڤی دەگێڕنەوە، کە دواتر بۆتە برگەی قسەکردن!.

هەروەك چۆن داروینییەکان بانگەشە بۆ ئەوەش دەکەن کە هەردوو ناوچەلەی قسەکردن لە مێشکی مرۆڤدا(برۆکا، ڤێرنیکا) وەك پەرەسەندنی ناوچەی هاوشێوەی شامپانزی گەشەیسەندووە، کە بریتییە لە ناوچەی F5.

لە ڕاستیدا ئەو میکانیزمانەی داروینییەکان بۆ تەفسیرکردنی دەرکەوتنی هەردوو ناوچەی برۆکاو ڤێرنك و پاشان پەیدابوونی ژیانخستوویانەتە ڕوو، سنووری ئەو قسە پووچ و بێبنەمایانە تێناپەڕێنێت کە ڕاهاتووین بۆ تەفسیرکردنی زۆربەی هەڵوێستەکانی پەرەسەندن لە ڕێی میکانیزمی هەرەمەکییەوە گوێمان لێدەبێت، کە کەسێك بە دوای حەقیقەتدا بگەڕێت بە قسەگەلێکی وەها باوەڕ ناکات[2].

---

(١) نووسەری ئەم رستەیە توێژەر ستیڤن پینکەر Steven Pinker ە لە ئێم ئای تی، لە کتێبە ناوازەکەی فیترەتی زمان The Language Instinct.

(٢) لەو قسە بێبنەمایانە، توانا زمانەوانییەکان بە شێوەیەکی کپکراوە لە ناوچەی F5 دا بوونی هەیە و دواتر چالاك دەکرێت، وەك چۆن گوتیان کە جووڵەکانی دەربڕین لە خەندەی بوونەوەرە سەرەکییەکانەوە

نوام تشۆمسکی، زاناو بەڵگەی زانستەکانی زمانەوانی لە سەدەی بیستەمدا، هەموو بانگەشەکانی داروینییەکان پووچەڵ دەکاتەوە، ئەوە دڵنیادەکاتەوە کە مەحاڵە زمان پەرەسەندنی هەرِمەکی هیچ کام لە هۆکارەکانی پەیوەندیکردن بێت لەلای زیندەوەرە سەرەکییەکان، بەڵکو ئەوە شتێکی تەواو نوێیە کە لە مرۆڤدا دەرکەوتووە. تشۆمسکی بیردۆزەکەی دەربارەی پەیدابوونی زمان ناوناوە(تەقینە گەورەکەی زمانەوانی The Big Bang Theory of Human Language)، هاوشێوەی تەقینەوە گەورەکەی گەردوون، کە گەردوونی لە نەبوونەوە بەدیهێناوە.

تشۆمسکی بۆ تەفسیرکردنی بیردۆزەکەی دەستەواژەیەك بەکاردەهێنێت، کە لایەنگرانی پەرەسەندن هەرکاتێك لە پێشکەشکردنی تەفسیرێکی ماددی(وەك دیاردەی ژیان) بێتوانا بوون پەنای بۆ دەبەن، ئەویش دەستەواژەی(پەیدابوون Emergence)ە، دەڵێت: کە مێشکی مرۆڤ کاتێك گەیشتە ئاڵۆزییەکی زۆرەوە زمانی لێ(پەیدابوو). ئەگەرچی ئێمە لەوەدا لەگەڵ تشۆمسکی هاوڕاین کە زمان شتێکی تەواو نوێیە و لەناکاو لە مرۆڤدا دەرکەوتووە، بەڵام لەوەدا لەگەڵی ناکۆکین کە (پەیدابوون)ەکە بەشێوەیەکی خۆکرد ڕوویدابێت، لە کۆتایی تەوەرەکەدا هۆکاری ئەوە دەخەینەڕوو.

## زمانی مرۆڤ و پەیوەندی ئاژەڵان :

گومان لەوەدا نییە کە زۆربەی تەکنیکەکانی پەیوەندیکردنی نێوان ئاژەڵان فیترین، پێویستیان بە فێربوون نییە. بۆ نموونە هەنگ پێویستی بە فێربوون نییە بۆ ئەنجامدانی ئەو جۆرە سەمایەی هەموو تاکەکانی خانە تێیدەگەن، بەڵکو ئەو تەکنیکە لە نەوەیەکەوە بۆ نەوە هەنگی دواتر لە ڕێی جیناتەوە دەگوازرێتەوە، ئەوەش ڕێگرنییە لەبەردەم بوونی کاریگەری ژینگەی دەوروبەر بەسەر ئەو

---

پەرەیسەندووە. داروینییەکان بۆیان روون نەکردووینەتەوە چۆن توانای کپکراوە لە مێشکی شامپانزیدا بوونیان هەبووە، یان چۆن خەندە پەرەیسەندووە بۆ وشە. کارەکە رووویداوە و تەواو!!

کردارەوە[1]. ئەگەر بوونی هۆکارێکی بۆماوەیی بۆ هەر توانایەکی پەیوەندیکردن لە ئاژەڵاندا سەلمێنراوە، ئەی بۆچی هەندێ کەس سەرسام دەبن کە باس لە هۆکارێکی بۆماوەیی هاوشێوە دەکەین بۆ زمانی مرۆڤایەتی!

هەروەها درۆینەیی و فێلبازی هەموو ئەو بانگەشانە سەلمێنراوە کە دەگوترێ هەندێك ئاژەڵ بەهرەی ئەوەیان هەیە کە دەتوانن فێری پەیوەندی زمانەوانی ببن لەگەڵ مرۆڤدا، کە داروینییەکان ئەوەیان بەهەڵ زانیوە بۆ برەودان بەوەی کە جیاوازییەکانی نێوان زیرەکی مرۆڤ و بوونەوەرەکانی تر تەنیا جیاوازی چەندین، دەکرێ بەراهێنان کەم بکرێتەوە[2].

ئەگەر شامپانزی (و بوونەوەرانی تر) میکانیزمی پەیوەندیکردنیان هەبێت، لەوانە دەرکردنی هەندێك دەنگ کە لەدەنگی هاوارکردن و پێکەنینی منداڵەکانمان دەچن، بەڵام بەکارهێنانی ڕەمزە دەنگییەکان لەلایەن مەیموونەوە لە زۆر لایەنی جیاوازی جۆری و جەوهەری لە زمانی مرۆڤ جیاوازە:

- زمانی مرۆڤایەتی تەنیا ئامرازی پەیوەندیکردن نییە، بەڵکو ئامرازی بیرکردنەوەشە، چونکە لە زۆر هەڵوێستدا مرۆڤ بە بەکارهێنانی زمان بیردەکاتەوە، هەروەها زمانی مرۆیی میکانیزمەکانی تێگەیشتن بەکاردێنێت(کە لە پەراوێزەکانی سەرەتای ئەوەرەکە باسمان کردن).

- زمانەکانی مرۆڤ بە دەوڵەمەندی وشەکان جیاوازن، وشەکان گوزراشتن لە

---

(١) یەکێك لەو تاقیکردنەوانە کە لەسەر باڵندەی مانگای ئەمریکی Cowbird ئەنجامدراوە، بێچووی باڵندەکەیان لە باکوری ویلایەتی کارۆلینا برد بۆ ویلایەتی تەکساس کە باڵندەی پێگەیشتووی لێبوو، لەوێ بێچووەکان فێری ئاوازێکی تێکساسی باڵابوون.

(٢) ناوەندە زانستییەکان بۆ ماوەیەکی زۆر باسی ئەسپی هانز Hans یان دەکرد. کە وەڵامی هەندێك کرداری کۆکردنەوەی ژمارە سادەکانی دەدایەوە، ئەمەش لەڕێی کوتانی سمەکەیەوە. تا لەدواتردا زانرا کە هانز لە کوتانی سمی بەردەوام دەبوو تا ئەو کاتەی کە ڕاهێنەرەکەی ئاماژەی بۆ دەکرد کە بوەستێت!! بە هەمان شێوە هەموو ئەو بانگەشانەش بەدرۆخرانەوە کە دەربارەی فێربوونی مەیموونی کانزی دەکران(یەکێك لە تاکەکانی مەیموونی شامپانزی لە جۆری بۆنۆبۆیە، کە زیرەکترینی مەیموونە بەرزەکانە) بەوەی کە فێری زمانی مرۆڤ بووە و، ئاستی لە ئاستی منداڵێکی تەمەن دوو ساڵ و نیوی نزیکبۆتەوە!

ڕەمزگەلێکی عەقڵی ڕووت؛ بۆ نموونە وشەی (خواردن) هیچ پەیوەندییەکی بە وێنەی خواردن یان دەربڕینی وشەکەوە نییە! بەڵام مەیموون ئەگەر بیەوێت باسی خواردن بکات، ئەوا زمانی بەجۆرێك و بەدەنگێك دەجوڵێنێت وەك ئەوەی کە خەریکی خواردن بێت، هەروەك چۆن ڕەمزەدەنگییەکانی زۆر کەمن و، ناتوانێت زیاتر لە دوو ڕەمز پێکەوە کۆبکاتەوە.

- ڕەمزەکانی ئاژەڵان تەنیا ڕەنگدانەوەی پەرچەکردارین کە ئاماژەن بۆ شت و ڕووداوی ڕاستەقینەی هەنووکەیی و خەیاڵ هیچ ڕۆڵێکی تێدا ناگێڕێت، بەڵام زمانی مرۆڤ توانای ئەوەی هەیە کە گوزارشت لە ڕابردوو و داهاتوودا تەنانەت واتای گریمانەیی و خەیاڵیش بکات.

- ڕەمزەکان(وشەکان) کە مرۆڤ بەکاریان دێنێت بە ڕێسا ڕێکخراون، زۆربەی زانایانی زمان ئەو خاسییەتە بە گرنگترین خاسیەت و جیاوازییەکانی زمانی مرۆڤ دەزانن.

- زمانی مرۆڤ مەجاز و خواستن و لێکچواندنی زۆری تێدا بەکاردێت، بەڵام مەجازی ئاژەڵان زۆر سەرەتایی و بەدیهییە، وەك ئەوەی مەیموونی نێر ئاماژە بۆ ئەندامی زاوزێی خۆی بکات لەبەردەم مەیموونێکی نێری تردا بەمەبەستی سوکایەتی پێکردن.

- زمانە مرۆییەکان بە بوونی وشەی فرمانی (Function Words) جیادەکرێنەوە، کە لە دەرەوەی ڕستەدا هیچ واتایەکیان نییە، وەك(پاشان) و (کاتێك) و(And) و(If) و (ثم) و(عندما).

- زمانی مرۆڤ بە سێ هەستەوەر هەستی پێدەکرێت(بیستن - بینین - بەرکەوتن) بەڵام تووتی - بۆ نموونە - هەرکە دەنگەکەی لەدەستدا زمانەکەشی لەدەستدەدات.

لە هەموو ئەوانە بۆمان دەردەکەوێت مەحاڵە زمانەکانی مرۆڤ بە هەرڕەمەکی لە هیچ هۆکارێکی پەیوەندی تر، کە لە نێوان بوونەوەرە سەرەکییەکاندا باوە

پەرەیان سەندبێت، بەڵکو دیاردەیەکی تەواو نوێیە و تەنیا لە مرۆڤدا دەرکەوتووە. بەڵێ؛ ئەوە تەقینەوەی گەورەی زمانەوانی بوو، کە هیچ تەفسیرێکی گونجاوی بۆ شک نابەین، جگە لە دانتان بە دیزاینەری ژیر.

## عەقڵ و چێژوەرگرتن لە جوانی :

پەندێکی هیندۆسی کۆنم خوێندەوە، کە زۆر پرسیار دەربارەی پەیوەندی هەستکردن بە جوانی بە پرسی خوایەتییەوە دەوروژێنێت، پەندەکە دەڵێت: ((هەستی جوانی بە مرۆڤ بەخشراوە، وایلێدەکات لە گەڵ جوانیدا ئاوێتە ببێت و دەستی خودایی لە هەموو ئەو شتانەی لە دەوروبەریدا هەیە ببینێت)).

ئایا ئەمە واتای ئەوەیە کە هەستی جوانی تایبەتمەندییەکی مرۆڤە، پێویستی بە دیزاینی زیرەك هەبووە کە بەڵگە بێت بۆ خودای بەدیهێنەر، یاخود ئەم هەستە دیاردەیەکی هاوبەشە لە نێوان مرۆڤ و ئاژەڵاندا و هەڕەمەکیتی بێتوانا نییە لە بەدیهێنانی؟.

ئەو پرسیارە بە درێژایی سەردەم عەقڵی فەیلەسوفەکانی سەرقاڵ کردووە، تا وایلێهاتووە (بەشی جوانناسی)یان کردۆتە بەشێکی سەربەخۆی فەلسەفە، کە گرنگی بە وەڵامدانەوەی پرسیارە فەلسەفییەکانی سەر بە پرسەکە دەداتەوە:

- چۆن هەستی جوانی بە مرۆڤ بەخشراوە و چۆن مێشکی مرۆڤ وەڵامی جوانی دەداتەوە؟ و کەی شتێك کە مرۆڤ بەرهەمی هێناوە بەوە وەسفی دەکەین کە هونەرە؟

- ئایا هەستکردن بە جوانی و ئەزموونی هونەری ڕەگەزێکی فیتری هەیە لەگەڵ ڕەگەزێکی وەدەستهاتوو لە ژینگەوە؟.

- ئەگەر چەندان قوتابخانەی هونەری بوونیان هەبێت، هەر یەکێکیان خاسیەتی جیاوازی خۆی هەبێت، ئایا کۆمەڵە سیفەتێکی گشتی وەها بوونیان هەیە کە سنوور و ژیارستانیەتەکان ببرێت و بە شێوەیەکی گشتی هونەر جیابکاتەوە؟

لەو بیرکردنەوە و پرسیارانەش چەند پرسێکی تری تەوەرەیی پەیدادەبن: ئایا کۆمەڵە میکانیزمێکی دەماری مێشکی وەها بوونیان هەیە وامان لێبکەن هەست بە جوانی و چێژوەرگرتن لە هونەر بکەین؟

ئایا دەتوانین بیردۆزێکی زانستی بۆ دەرککردن بە جوانی دابنێین، یاخود دارِشتنەوەیەکی دیکەی بیردۆزی زانستی بۆ ئەزموونی هونەری؟ ئایا دەکرێ وەك زانست باس لە هونەر بکرێت و دواتر باس لە زانستی هونەر Science Of Art بکەین؟

چەند بەڵگەیەکی نوێ ئەوەیان سەلماندووە کە هەستی جوانی شتێکی بۆماوەیی و بەدەستهاتوو نییە، دەردراوی ژیارستانییەتی مرۆڤایەتیش نییە، بەڵکو توانایەکی فیترِی غەریزەییە کە ئێمە و بوونەوەرانی تر بەیەکەوە کۆدەکاتەوە.

ئەگەر ئێمە بە جوانی گوڵ و رِەنگەکانی سەرسام دەبین، دەنگی بولبول مەستمان دەکات، جوانی و هەستکردنی گەورەیی لە نێرەی تاوسدا بەدیدەکەین، ئەوا ئەوەت لە بیربێت کە هەنگیش جوانی گوڵەکان هەستپێدەکات، مێینەی باڵندەکان بۆ دەنگی نێرینەی بولبولەکان و جوانی نێرینەی تاوسەکان مەست دەبن. جا ئایا جیاوازییەکانی نێوان چێژوەرگرتنی ئێمە لە جوانی و چێژوەرگرتنی ئاژەڵەکان جیاوازی چەندین یان جۆری؟

ئایا هەردوولامان هەمان میکانیزم بۆ چێژوەرگرتن بەکاردێنین؟.

## عەقڵ ڕیسای خۆی هەیە بۆ چێژوەرگرتن لە جوانی و هونەر

زانست بە ئەندازەی پێویست گرنگی بە پرسیارە فەلسەفییەکان دەربارەی جوانی نەداوە، سەرەڕای ئەوەی زۆرێك لە زانایان بڕوایان وایە هەستی جوانی یەکێکە لە تایبەتترین چالاکییە عەقڵییەکانی مرۆڤ. شارەزای زانستەکانی مێشك و دەمار و (هونەر) زانای گەورە (ڕاماشانداران) بەم دواییانە ئاوڕی لەو پرسەداوەتەوە و گرنگی پێداوە، بۆیە با بچینە لای ئەو بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە گرنگانەی خستمانەڕوو. ڕاماشاندران دەڵێت:

لەم دواییانە پرسی هەستکردن بە جوانی و چێژوەرگرتن لە هونەر و پەیوەندییان بە چالاکی مێشك سەرقاڵی کردووم، کلیلی وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانەش بریتییە لە وشەی (رازا Rasa)، کە لە هونەری هیندیدا زۆر دووبارە دەبێتەوە، وشەکە وشەیەکی سانسکریتییە و وەرگێڕانی قورسە، بەڵام بەنزیککراوەیی واتا ((گەیشتن بە جەوهەری شتێك و، خستنەڕووی بە جۆرێك کە هەست و میزاجی بینەر بورووژێنێت))، ئیتر چۆن هونەر دەگاتە ئەو جەوهەرە تا گوزارشتی لێبکات؟ هەروەها چۆن بینەر دەستی دەخاتە سەر ئەو جەوهەرە لە کاتی بیرکردنەوەی لە کارێکی هونەری تا چێژی لێوەربگرێت؟

کاری هونەر بریتی نییە لە گواستنەوەی کۆپییەك بۆ بوون، ئەگەر ئەوە کاری هونەر بوایە، ئەوا ئەوەندە بەس بوو کە تەنیا سەرنجی دەوروبەرمان بدەین. بەڵام بە پێچەوانەوەیە؛ لە ڕاستیدا کاری هونەر بریتییە لە گۆڕینی وێنەی بوون، یاخود تیشك خستنەسەر یەکێك لە بەشەکانی، بەمەبەستی بەدیهێنانی چێژو (هەندێك کاتیش قێز!) بۆ بینەر، هەرچەند هونەرمەند زیاتر لەوەدا ڕۆبچێت ئەوا ئاستی چێژوەرگرتن لە جوانی زیاد دەکات و هونەرمەندەکە دەبێتە هونەرمەندێکی گەورە. پاشان ڕاما دەڵێت؛ گەیشتوومەتە چەند خاسیەتێك(یان چەند یاسایەك) کە پێویستە هونەرمەند (یان دیزاینەری جل و بەرگ) پێیانەوە

پەیوەست بێت، ئەگەر بیەوێت چێژ بە بینەر ببەخشێت و هەستی جوانی لەلا بوروژێنێت، کە بینینی واقیعی ناتوانێت بەدیبێنێت.

گەیشتن بەو ڕێسا و میکانیزمانە واتای ئەوە نییە کە لایەنی دەروونی و ڕۆحی جوانی و هونەر نەمێنێت، چونکە دەرککردنمان بە میکانیزمەکانی خۆشەویستی و ئەنجامدانی کرداری سێکسی نابێتە هۆی لەدەستدانی لایەنی دەروونی و ڕۆحی، بە هەمان شێوە ئەگەر لە لێکۆڵینەوە زانستییە زمانەوانییەکاندا قووڵ ببینەوە نابێتە هۆی ئەوەی کە چێژ لە هۆنراوە و شاکارە ئەدەبییەکان وەرنەگرین، هەروەها زانینی ئەوەی کە ئەڵماس لە کاربۆن پێکدێت و گەیشتینە هەنگاوەکانی دروستبوونی لە ناخی زەویدا و لەماوەی ملیۆنان ساڵدا نابێتە هۆی ئەوەی کە ئافرەتان چێژی لێ وەرنەگرن. بەهەمان شێوە بوونی یاسا و میکانیزمی فیترى بە واتای نەبوونی ڕۆڵی پەروەردە و ژیارستانییەت نایەت لە چێژوەرگرتنمان لە هونەر و گوزارشتکردنی لە قوتابخانەیەکی دیاریکراو.

ئەوەی جێی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە زانای مسوڵمانی بلیمەتی فیزیا (حەسەنی کوڕی هەیسەم)[1] چەند پێوەرێکی بابەتیانەی بۆ چێژوەرگرتن لە جوانی داناوە، هەزار ساڵ پێش ڕاماشانداران، سەرنجی بدە کاتێك دەڵێت:

((چاو لە ڕێی هەموو سیفەتێك لە سیفەتەکانی بینین دەرك بە جوانی دەکات، بەڵکو ((هەر سیفەتێك جۆرێك لە جۆرەکانی جوانیمان پێدەبەخشێت)) و دەبێتە هۆی (ئاوێتەبوونی ئەو سیفەتانە)) بۆ هەستکردن بە جۆرەکانی تری جوانی کە ئاڵۆزتر و ئاوێتەترن:

بۆ نموونە (شوێنی شتەکان) جوانی بە شتەکان دەبەخشێت، هەروەك چۆن (ڕیزبەندیشیان) جوانییەکی تریان پێدەبەخشێت. بۆ نموونە پیتەکانی نووسین، کە جوانییەکەیان لە شوێن و ڕیزبەندییاندایە، بەمەش بۆتە هونەرێك لە هونەرەکان.

---

(١) حەسەنی کوڕی هەیسەم: (٩٦٥-١٠٤٠ز)، یەکێك لە گەورەترین زانایانی زانستی ڕۆشنگەری و بینین. کارەکانی بناغەی ئەو بوارەن کە زانایانی ڕۆژئاوا هەموو بیردۆزەکانیان لەسەر بنیاتناوە، چ لە دۆزینەوەی وردبین و تەلیسکۆب، یان لە فسیۆلۆجیای بینین.

بەهەمان شێوە (دووری شتەکان) جوانییەك بە شتەکان دەبەخشێت، ئەوەتا ئەستێرە پەرش و بڵاوو لەیەکدوورەکان لە ئەستێرەکانی ڕێگای کاکێشان جوانترن، لەبەر ئەوە بەهەمان شێوە گوڵە بڵاوەکانی نێو مێرگێك جوانترن لەو گوڵانەی لە چەپکە گوڵێکدا دانراون.

لە هەمان کاتدا (درێژبوونەوە)ش جوانی دەبەخشێت، لەبەر ئەوە دەبینی کە مێرگە سەوزە دووورودرێژەکان کە تا چاو بڕ دەکات سەوزاییە(بەهەمان شێوە ئاوی دەریاش) جوانترە لەو مێرگ و ئاوانەی خانو و ڕێگا و بانیان دەکەوێتە بەر. لەهەمان کاتدا(درێژبوونەوەی ڕەنگی سەوز)ی ئەو مێرگانە جوانترینی ئەو ناوچانەیە کە ڕەنگی جیاوازییان تێدا هەیە.

لێرەدا قسەکانی (ئیبن هەیسەم) تەواو دەبن کە پێش هەزار ساڵ دەربارەی چێژوەرگرتن لە جوانی نووسیویەتی.

بەم جۆرە ڕاماشانداران (و پێش ئەو حەسەنی کوڕی هەیسەم) وەڵامی پرسیارەکانمانی داوەتەوە، بەوەی کە هەستی جوانی و چێژوەرگرتنمان لە هونەر لە ڕێی ڕێسا و میکانیزمەوە ڕێکدەخرێن، بە تەواوی جیاوازن لە هەستکردنی غەریزی ئاژەڵانە بۆ جوانی.

پاکی و بێگەردی بۆ ئەو خودایەی مێشکی مرۆڤی ڕێکخستووە و میکانیزمی وەهای پێبەخشیوە کە توانای چێژوەرگرتنی هەبێت لەو جوانیانەی خودا لە گەردووندا دایناون.

ئەگەر گیانلەبەرە سەرەکییەکان هەستێکی جوانی سەرەتاییان هەبێت، ئایا پەرەسەندنی داروینی توانای ئەوەی هەیە کە یاسا و میکانیزم لە مێشکی مرۆڤدا دابنێت؟ لە ڕاستیدا داروینییەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە دەکرێ ئەوە ڕوویدات، تەنانەت میکانیزمی ڕوودانیشی دیاریدەکەن! دەڵێن: ئا بەم جۆرە ڕوویداوە Just-So! بەڵام ئایا بەو میکانیزمە ڕازیدەبین؟! ئەو پاڵنەرەی پەرەسەندن چییە ئەو توانای چێژوەرگرتن لە جوانی و هونەری داوەتە مێشکی مرۆڤ؟ئەو سوودەی پەرەسەندن چییە کە ئەو توانایە بەدیدەهێنێت؟

داروینییەکان وەڵامێکی تێرو تەسەلیان نەداوینەتەوە.

بەڵام ئێمە تەفسیرێکی گشتگیر و تێرو تەسەل پێشکەش دەکەین، ئەویش ئەوەیە کە پەیدابوونی هەستی جوانی لەلای مرۆڤ بەو شێوە زۆرناڵۆزە دەچێتە ژێرباری یاساگەلێکی وردەوە، بەتەواوی جیاوازە لە هەستی چێژوەرگرتن لە جوانی لەلای ئاژەڵان،ئەمەش بەڵگەیەکی حاشاهەڵنەگرە کە جگە لە خودایەکی کاربەجێی بەتوانا کەسی تر تواناى بەدیهێنانی نییە.

## عەقل و هەستە رۆحییەکان :

بانگەشەی ماددیگەراکان کە دەڵێن ئایینەکان داهێنراوی مرۆڤن تووشی سەرسامیم دەکات! دەڵێن مرۆڤ بۆ بەدیهێنانی سوودی ماددی و مەعریفی و دەروونی و گرنگترینیان هەستکردن بە هێمنی و ئاسایش بەهۆی بوونی هێزێکی غەیبی کە لە کاتی پێویستدا پشتگیریمان دەکات ئایینەکانیان داهێناوە.

هەروەها دەڵێن کە ئەو هێمنی و ئارامییە دەروونییە و هەست و سۆزە رۆحییە و هەستکردن بە بەرزبوونەوە تەنها وەهمگەلێکی دەروونین کە چالاکی ناتەندرووستی هەندێك لە ناوەندەکانی مێشك لێی بەرپرسیارن.

ئەگەر ماددیگەراکان ئایین بە داهێنراوێکی مرۆیی و دیاردەیەکی بیانووگەری دەزانن، ئەوا مافی ئەوەمان هەیە بپرسین؛ (تەحەدداى پەرەسەندن) چییە کە رووبەرووی مرۆڤ بۆتەوە تا ببێتە هۆی پەیدابوونی میکانیزمی بایۆلۆجی دەمار کە وایلێدەکات هەست بە کەمبوونەوەی هەستکردن بە خود و تەنانەت لەناوچوونی بکات، هەروەها خەیاڵی بوونی جیهانێکی بەرزی غەیبی ناراستەقینە بکات و پەیوەندی لەگەڵدا ببەستێت![1] ئەمەش بە تەواوی لەگەڵ

---

(١) ئاماژەیە بۆ چەمکی یەکبوون(وحدە الوجود) و یەکبین(وحدە الشهود)، کە پاش کەمێکی تر باسی دەکەین.

ئامانجی سەرەکی پەرەسەندندا تێکدەگیرێت، کە بریتییە لە پارێزگاریکردن لە خود؟ ئەمە واتای نەمانی (سوودی پەرەسەندن) دەگەیەنێت، بەڵکو دەتوانین بڵێین بە واتای شکستی پەرەسەندن دێت. جا ئەگەر ئایین گەورەترین کارەسات بێت کە تووشی مرۆڤ بوويێت (هەروەك ماددیگەراکان بانگەشەی بۆ دەکەن وەك ڕیچارد دۆوکنز)، ئەوا بۆچی میکانیزمی سروشتی هەر زوو خۆی لێ ڕزگار نەکرد؟!

## بوونی غەیبی بوونێکی ڕاستەقینەیە :

دکتۆر ئاندرۆ نیوبێرگ[1] چەند لێکۆڵینەوەیەکی لەسەر کۆمەڵێك لە عابد و زاهیدانی ئایینە جیاوازەکان کردووە، لەو لێکۆڵینەوانەدا نوێترین تەکنیکی وێنەگرتنی تیشکی مێشکی بەکارهێناوە[2]. ئەو توێژینەوانە سەلماندوويانە کە ئەو ئارامی و هەستە ڕۆحییانەی مرۆڤ بەهۆی بوونی هێزێکی غەیبی بەرزەوە لەسەر عەرشدا جێگیربووە هەستی پێدەکات، لە ڕاستیدا هەستی تەندروستن بۆ فرمانە تەندروستیەکانی مێشك، نەوەك تەنیا خەیاڵ و وەهم بێت.

هەمان لێکۆڵینەوەش سەلماندوويانە کە دابەشکردنی ئەو شتانەی عەقڵەکانمان هەستیان پێدەکەن بۆ (بوونێکی ماددی ڕاستەقینە) و (بوونێکی غەیبی ناماددی ناڕاستەقینە) دابەشکردنێکی زانستی نییە، چونکە بوونی ماددی کە مێشکەکانمان لە ڕێی میکانیزمەکانی هەستکردنی مێشکەوە هەستیان پێدەکات، لەوەدا هاوشێوەی ئەو بوونە غەیبییە کە هەندێکمان هەستی پێدەکەین[3].

---

(١) Andrew Newberg: مامۆستای تیشك و سەرۆکی ناوەندی توێژینەوە ڕۆحییەکان لە زانکۆی پەنسلڤانیا. یەکێکە لە دامەزرێنەرانی بایۆلۆجیای دەماری دینداری Neuro-Theology کە تایبەتە بە لێکۆڵینەوە لە بنچینە بایۆلۆجییەکانی هەستە ڕۆحییەکان.

(٢) FMRI-PET-SPECT Camera.

(٣) بۆ دەستکەوتنی زانیاری زیاتر لەسەر ئەو چەمکانە، بگەڕێنەوە بۆ کتێبەکەمان (ثم صار العقل مخا)، ئەویرەتی دەیەم.

## مێشك / عەقڵ و ئایین تەواوکەری یەکترن[1] :

یەکێك لە گرنگترین ئەو لایەنانەی مێشك/عەقڵی مرۆڤ جیادەکاتەوە، بریتییە لە بوونی زۆر میکانیزم کە خزمەتی دامەزراوەی ئایین دەکات. یەکەمیان، ئەوەیە کە عەقڵی مرۆڤ ئارەزوویەکی فیترِی هەیە لە بەرجەستەکردنی بیرۆکەو هەست و سۆزەکان، ئەو ئارەزووەش چەند ناوەندێك و خانەی دەماری لەپشتەوەیە.

بۆ نموونە دەبینین مۆسیقارەکان پەنجەیان لەگەڵ ئەو ئاوازە دەجووڵێنن کە بە خەیاڵیاندادێت، هەروەك چۆن ئێمەش کاردانەوەمان بەرامبەر بەو پارچە مۆسیقایە دەبێت کە گوێبیستی دەبین. لێرەدا ئارەزووی مێشك / عەقڵ بۆ بەرجەستەکردنی بیروباوەڕە ئایینییەکان پەیدابووە و لە شێوەی سرووت و پەرستشدا دەرکەوتووە، بەتایبەتی چەمکە گرنگەکانی مرۆڤ؛ وەك مردن و زیندووبوونەوە و پەیوەندیکردن بە جیهانی غەیب.

زۆربەی کات سرووتە ئایینییەکان بارگاویبوونێکی کاردانەوەییان لەگەڵدایە، ئەمەش لە دەرەنجامی کاریگەری ئیقاعی جووڵەو دەنگی سرووتەکان لەسەر دەزگای حووفی و کۆئەندامی دەماری خۆنەویستانەو توێکڵی مێشك[2]. لەو چالاککردنەشدا - لەگەڵ ئیقاعەکە - چەند دۆخ و سرووتێکی تریش بەشدارن، وەك رکوع و سوجدە و جووڵەی دەستەکان لە نوێژدا، هەروەها پێگەی شوێنەکە و ڕۆژوو وەهەناسەی ڕێك و پێك لە کاتی زیکرکردندا، بۆنی بخوور و هی تر، هەموویان هۆکارن کە وا لە مرۆڤ دەکەن هەست بە ترسێك بکات کە بێدەنگی و هەستکردن بە ڕێز و چێژی ئایینی تێکەڵ بێت.

---

(١) ئەم چەمکە لە دەرەنجامەکانی لێکۆڵینەوەکانی ئاندرۆنیوبێرگ وەرگیراوە، کە پێش ئێستا باسمان کرد.

(٢) دەزگای حووفی Limbic system بەرپرسە لە چالاکییە کاردانەوەییەکانمان و، دەزگای دەماری خۆنەویستانە ANS ش بەرپرسە لە فرمانە خۆنەویستەکانمان و، توێکڵی مێشکیش Cerebral Cortex بەرپرسە لە چالاکییە عەقڵی و بیرۆکە و بیروباوەڕەکانمان.

هەرچی ڕۆڵی تونکڵی مێشکە لەو سیناریۆیەدا، ئەوا ڕۆڵێکی یەکجار زیندووە؛ بەو پێیەی ئەو بیرۆکە و بیروباوەڕانەی تێدا هەیە لەگەڵ کاردانەوەکانی پێشووتردا تێکەڵ دەبن. بەمەش سرووتەکان دەبنە ئامرازی گۆڕینی بیروباوەڕ و تیۆرییەکان بۆ ئەزموونی هەستی و خودی.

## مێشک/ عەقڵی بەرزبووەوە :

بەهەمان شێوە مێشکی مرۆڤ میکانیزمی وەهای بۆ زیادکراوە کە یارمەتی عەقڵ بدات ڕۆح بەرزبکەنەوە، گرنگترین ناوچەکانی تونکڵی مێشکی مرۆڤ ئەو ناوچەیەیە کە بە(ناوچەی بەیەکەوە بەستنی ڕێکخستن OAA)[1] ناسراوە، کە بەرپرسە لە هەستکردنمان بە خوودی خۆمان و بوونی دەورووبەرمان[2]. سرووتە ئایینییەکان هەڵدەستن بە ئارامکردنەوەی عەقڵی هۆشیار و هەستەکان، بەمەش تێخستنە چالاککەرەکانی ناوچەی بەیەکەوە بەستنەوەی ڕێکخستنەکە OAA دەبێتە هۆی سستبوونی چالاکییەکەی، ئەمەش بە (داخستن Deafferentiation) ناسراوە، کە دەبێتە هۆی لەدەستدانی جیاکردنەوەی نێوان (من) و (بوون)، لەگەڵ بەردەوامبوونی سرووتەکان میکانیزمەکانی داخستن زیاتر چالاک دەبن، تا هەستکردنمان بە خوود و بوونی دەورووبەرمان لەناودەچێت[3]، بەمەش مرۆڤ

---

(١) Orientation Association Area.

(٢) ناوچەی بەیەکەوەبەستنەوەی ورد Orientation Association Area=OAA کە دەکەوێتە بەشی پشتەوەی دیواری مێشك بە گرنگترین ئەو ناوچانە هەژمار دەکرێت کە ڕۆڵی لە هەستە ڕۆحییەکاندا هەیە. ئەو ناوچەیە لە هەردوو لای مێشکدا هەیە و، هەردووکیان لە فرماندا لە یەکتر جیاوازن. بەڵام تەواوکەری یەکترن؛ چونکە لای چەپ بەرپرسە لە دیاریکردن و دەرك کردن بە وێنەی سێ دووری لاشەی ماددیمان، لای ڕاستیش بەرپرسە لە دیاریکردنی شوێنی لاشەمان و پەیوەندی بە بوونی دەورووبەرەوە. ئەگەر دەرك کردنمان بە خوود و بوون بوونێکی مێشکی بێت، کە بەیەکەوە بەستنەوەی ورد پێی هەڵبستێت، ئەمە واتای ئەوە نییە کە خوود و بوونی دەورووبەری بوونێکی ڕاستەقینەیە، بەڵکو ئەمە واتای ئەوەیە کە ئەو ناوچەیە وێنەی واقیع وەردەگرێت و وامان لێدەکات کە هەستی پێبکەین و، خوود و بوون لە نەبوونەوە بەدیناهێنێت..

(٣) دەتوانین هەمان کاریگەریمان لەڕێی ئیقاعی ڕێکەوە دەستبکەوێت، کە جەختکردنەوەی لەگەڵدایێت لە هەر شتێك کە ئەنجامی بدەین، وەك گوێگرتن لە مۆسیقا و خوێندنەوەی شیعر و لاڵانەوەی منداڵ و

دەگاتە ئەو پلەیەی کە عابیدان ناوی(فەنابوون)ی لێدەنێن، زۆربەی کات توانای ئاشکراکردن و زانینی جیهانی غەیب و، هەستکردن بە یەکبوون لەگەڵ ئەو جیهانانەدا لەگەڵدایە، هەندێکاتیش یەکبوون لەگەڵ ئەو خودایەی لەسەر عەرشەکەی جێگیربووە، کە بە (یەکێتی بینراو / بوون)[1] (وحدة الشهود / الوجود) ناسراوە.

لەوەی رابورد، بۆمان دەردەکەوێت مێشکی مرۆڤ بەتەواوی بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ بنچینەی ئاییندا ئامادەکراوە، ئەوەش لەچەند ئاستێکدا دەردەکەوێت، کە بە توانای تێگەیشتنی عەقڵی مرۆڤ بۆ وەحی ئاسمانی دەستپێدەکات، پاشان بوونی پەرۆشییەکی فیترِی بۆ چەمکەکانی خوایەتی و ئایین و،

---

نوێژ. هەروەها نیقاعە رێکە خێراکانیش؛ وەك رۆیشتن لە مەودایەکی دوور و درێژدا و ئەنجامدانی سێکس و درووشم گوتنەوە لەگەڵ هەزاران کەس لە یاری تۆپی پێدا. دەکرێ ببنە هۆی چالاك کردنی ناوچەی داخستن و هەست کردن بە یەکبوون لەگەڵ کەسانی تردا.

(١) دیندارەکان لە رازیبوون بەو چەمکە سۆفیگەرییە رەوانانە جیاوازییان هەیە، کە باس لەوە دەکەن هەندێ کات کەسی عابید بارودۆخی وای بەسەردا تێدەپەڕێت کە هەست کردن بە خوودی خۆی لەدەستدەدات(فەنابوون) و، لەوانەیە هەستی وای لەگەڵدابێت کە وادەست بکات کە هەرچی لە گەردووندا هەیە بەرەو فەنابوون دەچێت و، هیچ شتێکی تر جگگە لە خودا بوونی نەماوە. لەو کاتەدا وا هەستدەکات (وەك ئەوەی) بوون بریتی بێت لە خودا و خوداش بریتییە لە بوون(یەکبوون-وحدە الشهود). لەوانەشە وا هەست بکات، لەوانەیە وا هەست بکات کە خودا لەم بوونەدا تواوەتەوە(حلول)، یان ئەوەتا لەگەڵیدا یەکیگرتووە(اتحاد).

خوێنەری بەرێز، با لەگەڵت راستگۆ بم، ئەو چەمکانە (لە قۆناغێك لە قۆناغەکانی ژیانمدا) هۆشیان دەبردم، بۆیە وەرمگرتن، بەوپێیەی کە ئەمە بینینێکە تایبەتە بە کۆمەڵێکی تایبەتی بەندەکانی خودا، کە هەستیان بە خوودی خۆیان لەدەستداوە، لەکاتی بێهۆشبوون و فەنابووندا و، جگە لە خودا کەسی تریان نەبینیوە. بەڵام حەقیقەتی پرسەکە کە لە بیروباوەڕ و شەریعەتەوە وەریدەگرین چەمکی دوانەیی دووپات دەکەنەوە: خودا و بەندە، خالق و مەخلوق. پێشەوا عبدالحلیم مەحمود(شێخی پێشووی مزگەوتی ئەزهەر و گەورە پێشەوای سۆفیگەری) ئەو هەڵەیە روونەدکاتەوە کە بۆتە هۆی ئەوەی زۆر کەس رێگای سۆفیگەری پەیرەو بکەن، ئەوەیە کە هەندێك لە فەیلەسووفە سۆفیگەرەکان وایانداناوە کە ئەوەی سۆفیگەرەکان دەیبینن(لە کاتی بێهۆشییاندا) بەوەی کە ئاگایان لە بوونی ماددی و خوودی خۆیان نامێنێت، بریتییە لە حەقیقەتی بوون(واتا هیچ پەرستراوێك نییە بە حەق جگە لە خودا، بۆیە خودا بوونە و بوونیش خودایە). بۆیە پەیرەوییان لە یەکبوون(وحدە الوجود) کردووە کە هیندۆسەکانیش پەیڕەوی لێدەکەن و، لەو بارەیەشەوە بیردۆزی فەلسەفییان دارشتووە، کە دەرچوونە لە بیروباوەڕ و شەریعەتی ئیسلامی، چونکە بوون زاتی خودا نییە، بەڵکو بەدیهێنراوێکە لە بەدیهێنراوەکانی.

ئارەزووکردن لە بەرجەستەکردنی چەمکە عەقڵییەکان و، گۆڕینی چەمکە تیۆرییە عەقڵییەکانی بیروباوەڕبۆ ئەزموونی هەستی و خوودی، پاشان توانای داخستنی بازنەکانی هەستکردن بە خوود و بوونی ماددی، لەگەڵ هێنانە بەرچاوی هەستەکانی بەرزبوونەوەو پەیوەندیکردن لەگەڵ جیهانی غەیبدا.

پرسیارە تەوەرییەکە لێرەدا ئەوەیە؛ کە چۆن مێشك بەم شێوەیە ئامادەکراوە تا بەتەواوەتی بۆ بنچینەی ئایینەکان گونجاوبێت، یاخود ئایینەکان دارێژراون بۆ ئەوەی بە تەواوەتی بۆ بنچینەی مێشکی مرۆڤ گونجاوبێت؟

داروینییە ماددیگەراکان هیچ وەڵامێکیان بۆ ئەو پرسیارە نییە.

لێکۆڵینەوەکانی نیوبێرگ ئەوەیان دەرخستووە کە پەرستشەکان (نوێژ و زیکر و بیرکردنەو و ڕۆژوو و خوێندنەوەی کتێبە پیرۆزەکان) زۆر میکانیزمیان لە خۆگرتووە کە زانایانی پسپۆڕ بۆ باشکردنی تەندروستی جەستەیی و عەقڵی و دەروونی ئامۆژگاریمان دەکەن. هەروەها بۆ بەدیهێنانی ئارامی و بەرزبوونەوەی ڕۆحی. بەهەمان شێوە ڕووکردنە خودا بەوەی کە بەخشندە و میهرەبانە دەبێتە هۆی ئارامی و بەرزبوونەوەی زیاتر. هەرچی ئەو پەرستشەی تەرکیزو جەخت لەسەر ترسان لە خودا دەکاتەوە، یاخود توندڕەوی ئایینی، ئەوا دەبنە هۆی پەکسختنی زۆرێك لە خانە دەمارییەکانی مێشك، پاشان بۆ بەدبەختی و نەخۆشییە ئەندامییەکان و پیربوونی زوو.

## • مێشك/عەقڵ و پەرستشەکان:

قسەکانم دەربارەی هەستە ڕۆحییەکان و بەرزبوونەوە بە پرسیارێك کۆتایی پێدێنم کە کوڕە بچوکترینەکەم ئەوساڵ چوو بۆ زانکۆ لێی پرسیم، گوتی:

بۆچی ئایینە ئاسمانییەکان پەرستشیان تێدایە؟ ئایا ئەوە بەس نییە بیروباوەڕێك هەبێت دەربارەی خودا کە باوەڕمان پێی هەبێت، پاشان پەیوەستبین بە ڕەوشتە

جوانەکان و ڕەفتاری جوان لەگەڵ کەسانی تردا، هەروەك زۆرێك لە ئایینەکانی ڕۆژهەڵاتی دوور؟.

لەوکاتەدا، بەو زانیارییانەی ئەوسا هەمبوو وەڵامی کوڕەکەمم دایەوە و، پێمگوت: لە ڕاستیدا گرنگی پەرستشەکان بۆ ئایینەکان دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە:

**یەکەم:** نیشانەیە بۆ گوێڕایەڵی باوەڕدار بۆ فەرمانەکانی خودا، هەتا ئەگەر هیچ تەفسیرێکیش بۆ ئەو پەرستشانە شك نەبەین. وەك ژمارەی ڕکاتەکانی هەرنوێژێك، یاخود بۆچی هەندێکیان بەدەنگن و هەندێکیان بێدەنگن، لە کۆتایشدا بەڵگەیە لەسەر ڕاستگۆیی بەندایەتیکردن بۆ خودا.

**دووەم:** پەرستشەکان سوود و کەڵکی تایبەتی و گشتی گرنگی هەیە. بۆ نموونە نوێژ، کە لە تاوانی گەورە و بچووك دوورمان دەخاتەوە، یاخود ڕۆژوو کە بەرزکردنەوەی دەروونە و هەستکردنە بە کۆژان و ناخۆشییەکانی هەژاران، زەکات کە دەستەبەری کۆمەڵایەتییە...

ئەو دوو سوودە لە گرنگترین ئامانج و مەبەستەکانی شەریعەتن و من ئەوشتانەم هەر لە منداڵیمەوە دەزانی، بەڵام دوای ئەوەی سەرنجی دەرەنجامەکانی لێکۆڵینەوەکانی ئاندرۆنیوبێرگ و هی ترم دا، هەستم بەوە کرد کە ئەوەی بە کوڕەکەمم گوت کەم و ناتەواو بوو، لەبەر ئەوە ئەوانەی خوارەوەم بۆ زیادکرد:

**سێیەم:** پەرستشەکان بەرجەستکردنی بیروباوەڕ و هەست و نەستەکانمانن، ئەو فیترەتەش میکانیزمی خۆی لە مێشك/عەقڵدا هەیە و، بە هەنگاوێکی گرنگ دادەنرێت بۆ قووڵکردنەوەی بیروباوەڕەکانمان.

**چوارەم:** پەرستشەکان - و ئەو سرووتانەی تێیاندا هەیە - بیرباوەڕ لە چەمکگەلێکی عەقڵی تیۆری دەگۆڕن بۆ ئەزموونگەلێکی خوودی و هەست و نەست.

**پێنجەم:** کاتێك ئەنجامدانی پەرستشێك دەبێتە هۆی داخستنی ناوچەکانی هەستکردن بە خوود و دەوروبەر، لەوکاتەدا مرۆڤ هەست بە ئەندازەیەکی زۆری بەرزبوونەوە دەکات، کە لەوانەیە بگاتە ئاستی گەیشتنی ڕاستەقینە بە بوونی غەیبی یەکگرتووی ڕەها.

## ماددیگەراکان و عەقڵ :

### (هەڤدژییەکەی واڵاس) لە نێوان خوایەتی و داروینیزمدا :

باسکردنی خستنەڕووی ماددیگەراکان بۆ پەیدابوونی توانا عەقڵییەکانی مرۆڤ بە هەڵوەستەکردنێك لەگەڵ چەند بلیمەتێك لە بلیمەتانی بایۆلۆجیا دەستپێدەکەین، ئەوانیش (چارڵس داروین و ئەلفرێد واڵاس)ن، کە لە یەك کاتدا و بە جیا هەردووکیان گەیشتنە بیردۆزی پەرەسەندن[1].

داروین پەیدابوون و دەرکەوتنی زیرەکی مرۆڤ و توانای داهێنان و بلیمەتی دەگێڕێتەوە بۆ میکانیزمی پەرەسەندنی داروینی کلاسیکی، کە بریتییە لە هەڵبژاردنی سروشتی لە نێوان بازدانە سروشتییەکاندا، تەنیا و تەنیا ئەوە هۆکارەکەیە.

لە کاتێکدا، کە واڵاس وایدەبینێت، کە ئەو تەفسیرە توانای تەفسیرکردنی عەقڵی مرۆڤی نییە، ئەوە دڵنیادەکاتەوە کە عەقڵی مرۆڤ بەخششێکی خواییە.

بیانووەکانی واڵاس چین بۆ خستنەڕووی ئەو باسەی کە ماددیگەراکان شۆك دەکات؟ واڵاس گرنگییەکی زۆر بەوە دەدات کە ناوینراوە زیرەکی شاراوە Potential Intelligence، بۆ نموونە ئەگەر مرۆڤێك لە هۆزێکی سەرەتایی بێنین و بیخەینە بەر خوێندن لە قوتابخانەیەکی نموونەیی و لە شارێکی ژیارستانییدا، ئەوا هاوشێوەی قوتابییەکانی تر فێری بیرکاری و زمانەکان و کۆمپیوتەر و زانستەکانی تر دەبێت، واتا منداڵ زیرەکییەکی شاراوەی هەیە،

---

(١) ئەوەی جێگای سەرسوڕمانە ئەوەیە کە هەر یەکێکیان نکۆڵی لە فەزڵی ئەوی تریان نەکردووە، تەنانەت واڵاس کتێبێکی نووسیوە و ناوینناوە(داروینیزم) و، کاتێك داروین بەوەی زانی، نامەیەکی بۆ نووسی و بۆی نووسیبوو: پێویستنەبوو ناوی بنێی(داروینیزم)، بەڵکو (واڵاسیزم)یشە.

کە زۆر لەوە بەرزترە لەوەی پێویستییەتی بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ژینگەی ڕاستەقینەی خۆی. ئیتر ئەو زیرەکییە شاراوەیە چۆن پەیدابووە؟

لە ڕاستیدا هەڵبژاردنی سروشتی دەتوانێت دەرکەوتنی ئەو توانایانەمان بۆ تەفسیر بکات کە زیندەوەر لە ژینگەکەی خۆیدا و لە کاتی پەرەسەندنیدا پێویستی پێیەتی، بەڵام دەرکەوتنی ئەو سیفەتانە تەفسیرناکات کە شاراوەن و مرۆڤ دوای دەیان هەزار ساڵ کاری پێیان دەبێت، چونکە هەڵبژاردنی سروشتی دیدێکی ئایندەیی نییە.

ئەو هەڵوێستە بە (هەڤدژییەکەی واڵاس WallacesParadox) ناسراوە. باس لەوە دەکات کە ئەو زیرەکییەی مرۆڤ هەیەتی زۆر زیاترە لە پێویست و سنووری کاروباری ژیانی و کێشکردنی جنسی زیاترە، ئیتر چۆن هەڵبژاردنی سروشتی دەبێتە هۆی دەرکەوتن و بە میرات هێشتنەوەی تواناگەلێکی وەها کە بەکارنایەت و هیچ سوودێکی بۆ مانەوە نییە. لە کاتێدا تاکەکانی ئەو جۆرانە لەناو دەچن کە ئەو توانایانەیان نییە.

بە زمانێکی تر، چی وا لە جینێك لە جیناتەکان دەکات کە لە بەهرەی بیرکاری یان مۆسیقی بەرز پسپۆڕ بێت بێنەوەی پێویستیشی پێی هەبێت و، بۆ نەوەکانی دواتر بیهێڵێتەوە؟ واڵاس خۆی وەڵامیمان دەداتەوە و دەڵێت تاکە دەرچەی دەرچوون لەو هەڤدژییە بریتییە لە دانان بەوەی کە زیرەکی شاراوەی مرۆڤ بەخششێکی (زیرەکی خودایی)یە.

بەڵام، چۆن داروینیزمی ماددیگەرا تەفسیری(هەڤدژییەکەی واڵاس) دەکات؟

داروینییەکان وایدەبینن کە توانا عەقڵییە پێشکەوتووەکان یەکێك لە شێوە و ڕواڵەتەکانی ئەوەی کە ناویاناوە (زیرەکی گشتی General Intelligence)، کە گێراویانەتەوە بۆ کەڵەکەبوونی تواناکانی مێشك کە بە درێژایی سێ ساڵ قەبارەی گەورە بووە و ئاڵۆزتر بووە. مرۆڤ ئەو زیرەکییەی لە ڕاو و کشتوکاڵ و جەنگ و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بەکارهێناوە، کاتێك پێویستی پێی هەبوو

لە مەعریفەی ئاڵۆزتردا بەکاریهێنا، وەك بیرکاری و مۆسیقا و دیزاینکردنی ئامراز و داهێنانی ئامێرەکان.

داروینییەکان نموونەیەك لەسەر ئەوە دێننەوە بەوەی مێشك جووڵەی دەستەکان لە ڕاو و دەستگرتن بە لقی دارەکانەوە بەکارهێناوە، پاشان - لە کاتی پێویستدا - بۆ نووسین و ژەنینی مۆسیقاو بۆنە و ئەشتەرگەرییەکان بەکاریهێناوە.

لە ڕاستیدا ڕاکردنی داروینییەکان لە (هەڤدژییەکەی واڵاس) بە خستنەڕووی بیرۆکەی (زیرەکی گشتی) کێشەکە چارسەر ناکات، چونکە (زیرەکی گشتی) ڕووبەڕووی هەمان ئەو کێشەیە دەبێتەوە، کە (زیرەکی شاراوە) ڕووبەڕووی بووەوە، چونکە ماددیگەراکان پێیان نەگوتین بۆچی و چۆن پەرەسەندنی هەڕەمەکی توانای عەقڵی وەهای بە مرۆڤ بەخشیوە، کە دوای سەدان هەزار ساڵ بەکاربێنێت. بلیمەتی زانستەکانی مێشك و دەمار ڕاماشانداران گوزارشت لە ڕەتکردنەوەی ئەو بۆچوونە دەکات و دەڵێت: واناژانم کە ئەو زیرەکییەی بۆئاڕاستەکردنی ڕمێك بۆ ڕاوکردنی ئاسکێك بەکاردێت، هەمان زیرەکیش بۆ حیسابکردنی سێگۆشەکان و هاوکێشە بیرکارییە پێشکەوتووەکان بەکاردێت.

هەروەها سەلمێنراوە زیرەکی مرۆڤ چەند جۆرێکی جیاوازی هەیە (بیردۆزی فرەزیرەکی هاوارد گاردنەر)[1]، کە هەریەکێکیان بە کارێکی دیاریکراوە هەڵدەستێت، توانراوە ناوەندەکانی مێشك ئەو جۆرانەی زیرەکیش دیاریبکرێن. کەواتە زیرەکییەکی گشتی و شاراوە بوونی نییە، هیچ شتێك بەرامبەر بە زیرەکی شاراوە خۆی ناگرێت جگە لە قسەکەی واڵاس بەوەی کە بەخششێکی خوداییە...

---

(١) لە تەوەرەی دواتردا باسی ئەم بیردۆزە دەکەین.

## ئاڵۆزی و سیفاتە هەڵقووڵاوەکان[1] :

**دواین ئەو زانیارییانەی لە کاسەی زانستی ماددیگەراییدایە :**

ئەگەر دەنکۆڵەیەکی لم بخەینە سەر مێزێك، پاشان دەنکۆڵەیەکی تری پێوە بلکێنین، ئەوا هەریەك لە دەنکۆڵەکان فشار دەخاتە سەر ئەوی تریان، لە هەمان کاتدا بەهێزی تری وەك هێزی کێشکردنی زەویش کاریگەر دەبێت، دەرئەنجامی کۆتاییش بریتی دەبێت لەیەکسانبوونی هێزەکان و بەمەش هەر دەنکۆڵەیەك لە شوێنی خۆیدا دەمێنێتەوە، هەرچەند دەنکۆڵەی تر زیادبکەین ئەوا پەیوەندی نێوان هێزەکان لە کۆمە لمەکەدا ئاڵۆزتر دەبێت، بەڵام هەر بە جێگری دەمێنێتەوە.

لە کۆتاییدا، لە کاتی زیادکردنی دەنکۆڵەی لمی زیاتر، شلەیەك لە تەنیشتی کۆمە لمەکەوە دەردەچێت، لەوانەیە ئەو شلەیە تا دوای ملیۆنێك دەنکۆڵە (بۆ نموونە) دەرنەچێت، سەرەڕای ئەوەش ئێمە یەك لە ملیۆنی شلەمان دەستناکەوێت، لە کاتی دانانی دەنکۆڵەی یەکەم!

ئەوە نموونەیە بۆ ئەو چەمکەی بە(سیستەمە ئاڵۆزەکە Complex System) ناسراوە، کە بەکارلێکی ژمارەیەك هێز لەناو سیستەمێکدا جیادەکرێتەوە، بەو پێیەی ئەو هێزانە بە یەکسانی دەمێننەوە، ئەو ڕەفتارانەش بە(سیفاتە پەیدابووەکان E mekgentproperties ی سیستەمە ئاڵۆزەکە)[2] ناسراون، زانایانی دەمار وەك ئاڵۆزترین سیستەمی گەردوون سەیری مێشك دەکەن.

---

١. سەرنجی کتێبی (ئایا ئێمە بێ هاوشێوەین؟ Are we Unique?)ی نووسینی جەیمس تریفل، مامۆستای [illegible] لە زانکۆی جۆرج مەیسۆن [illegible] ئەم چەمکە بکە.

٢. [illegible] پێچەمدا [illegible] لە ڕای ماددیگەراکان کرد دەربارەی دیاردەی ژیان بەوپێیەی یەکێکە [illegible] هەڵقووڵاوەکان.

## توانا عەقڵییەکان وەك تایبەتمەندی لە مێشکەوە پەیدابوون:

ئەگەر سەرنجی یەك دەمارەخانە بدەین، دەبینین توانای ئەنجامدانی ژمارەیەکی دیاریکراوی فرمانەکانی هەیە، وەك بەرهەمهێنانی توانایەکی کارەبایی، لەکاتی نەبوونی خانە دەمارییەکانی تردا شتێکی تر بوونی نییە بتوانین ئەو توانا کارەباییەی بۆ بگوازینەوە. بەم تێڕوانینە، دەمارەخانە هاوشێوەی دەنکۆڵە لمەکەی نموونەکەی پێشوومانە.

ئەگەر دەمارەخانەی تر یەك لە دوای یەك بۆ سیستەمەکە زیاد بکەین و بەیەکەوەیان ببەستینەوە، ئەوا توانایەکی کارەبایی تر بۆ هەر خانەیەکی نوێ زیاددەبێت، لەوانەیە لەناکاو توانای تەواو نوێ لەو دامەزراوەیەدا پەیدابن کە زۆر ئاڵۆزبووە.

مادیگەراکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ئەوە لە توێکڵی مێشکدا ڕوودەدات شتێکی نوێیە بۆ مرۆڤی عاقڵ، کە لە ملیارەها دەمارەخانە و تریلیۆنەها بەستەر پێکهاتووە، بۆیە دەرکەوتنی فرمانی عەقڵی زۆر ئاڵۆز سەرسامت نەکات، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە مێشکەکانمان و مێشکی ئەو بوونەوەرانەی زۆر لە ئێمە نزمترن (وەك مشك) بە تەواوەتی لە ڕووی کیمیایی و کارەباییەوە هاوشێوەن.

ئەوە بۆچوونی ئەو کەسانەیە کە پەیڕەوی لە ئاڵۆزی و سیفەتە پەیدابووەکان دەکەن، وەك دواین زانیاری، کە لە کاسەی زانستدایە بۆ تەفسیرکردنی ئەوەی چۆن چالاکی کارۆکیمیایی مێشك توانا عەقڵییەکانمان بەرهەمدەهێنێت.

ئەگەر ئەو تەفسیرە ((وەسفی ئەوە بکات کە بەڕاستی ڕوویداوە)) (بوونی توانای عەقڵی زۆر ئاڵۆز لە مێشکدا) بەڵام بۆی ڕوون نەکردووینەتەوە کە (چۆن) عەقڵ لەو ئاڵۆزییەوە هەڵدەقوڵێت، واتا تەنیا وەسفێکە نەوەك تەفسیر، تەنیا قسەیەکە بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییانەی کە لە تەفسیرکردنی بێتوانان.

داروینییەکان بەو ئاستەی هەڵە نەوەستاون، بەڵکو بەهەڵەش لە چەمکی پەیدابوون تێگەیشتوون؛ سەرنجی ئەو قسەیە بدە کە کارل ساگان لە کتێبەکەیدا (سێبەری پێشینە لە بیرکراوەکان)دا باسی کردووە، دەڵێت: ئەگەر مێشکی جاڵجاڵۆکە یەك لەسەر ملیۆنی بارستایی مێشکی ئێمە بێت، ئایا نکۆڵی لەوە دەکەین کە جاڵجاڵۆکە یەك لەسەر ملیۆنی هۆش و هەستی ئێمەی هەیە. بە ساگان دەڵێین (نەخێر)، ئەم قسەیەی تۆ هاوشێوەی دمکۆڵە لمەکەیە کە یەك لە ملیۆنی شلەی لمکەی تێدایێت(کە لە نموونەکەی پێشوودا باسمان کرد) و ئەو قسەیەش قسەیەکی ڕەتکراوەیە.

## هەڵقووڵان جگە لە خەلق شتێکی تر نییە

کارل پۆپەر، گەورەترین فەیلەسوفی زانست لە سەدەی بیستەمدا، دەڵێت؛ ژیان و ئەزموونی هۆشیارانەی ئاژەڵان، پاشان عەقڵ و هۆشیاری مرۆڤ بە خودیو بوون و، ئەو داهێنانانەی لێیەوە پەیدادەبن، دیاردەی تەواو نوێن لە بووندا، ئەمە بەوە وەسفدەکات کە پەرەسەندنی جیهان(پەرەسەندنێکی پەیدابوو بووە Emergeut)، بەڵکو هەندێ کات چەمکی دینداڕەکان بەکاردێنێت، کە(پەرەسەندنێکی بەدیهێنەر - خالق - بووە Creative).

پۆپەر وەڵامدەداتەوە: ((کاتێك - بۆ نموونە - دەڵێم کە پەیدابوونی مرۆڤ کارێکی داهێنەرانەیە، بەڵگەمان لەسەر ئەوە ئەوەیە کە(ئێمە بەر لە دەرکەوتنمان توانای پێشبینیکردنی خۆمان نەبووە)، هەروەك چۆن ئەستەم بووپێشبینی پەیدابوونی ژیان لەسەر زەویدا بکرێت لە دەرککردنی تایبەتمەندییەکانی ڕەگەزەکانی ماددەی زیندوو. ئا لێرەوە (شیاونەبوون بۆ پێشبینیکردن) ئەو پێوەرەیە بەهۆیەوە حوکم بەسەر پەیدابوون و داهێنانی نوێدا دەدەین))[1].

---

(١) ئێمەش چەند نموونەیەك بۆ نموونەکانی پۆپەر زیاد دەکەین:

- ئەگەر دوای ساتی سەرەتای تەقینەوە گەورەکە، لەسەر گەردوونی پەیدابوو زانایەك هەبوایە، ئایا زانینی

ئەگەر پۆپەر لەگەڵ دینداره‌کاندا هاوڕایه، لەمەحاڵبوونی پێشبینیکردنی دیاردەکانی ژیان و هۆش و عەقڵ لە ڕێی زانینی بنچینەی جیهانی ماددی و، بە دیاردەی تەواو نوێ هەژماری کردوون، دواتر بیرۆکەی (پەرەسەندنی بەدیهێنەر یان پەرەسەندنی پەیدابوون)ی خستۆتەڕوو، کە تەنیا وەسفێکە بۆ ئەوەی کە ڕوویداوە، بەبێ ئەوەی تەفسیرێك بۆ چۆنیەتی ڕوودانی بخاتەڕوو،کەواتە بۆچی تەفسیرە سادە و ساکارە ڕاستەوخۆیەکە قەبوڵ ناکات، کە باوەڕداران باوەڕیان پێی هەیە، ئەوە خودا ئەو جیهانە تەواو نوێیانەی لە جیهانی ماددەوە بەدیهێناوە؟

پۆپەر وەڵامی ئەو پرسیارەمان دەداتەوە بەوەی فەلسەفە کاتێك هەوڵ بۆ تەفسیرکردنی دیاردەکان دەدات، خۆی ناچارکردووە پەیوەست بێت بەو هۆکارانەی کە لە بەردەستماندا هەن، پەنا نەباتە بەر هۆکارە میتافیزیکەکان، هەرچەند بێتوانایش بێت لە دۆزینەوەی تەفسیر لە جیهانە بەرجەستەکەماندا، واتا فەلسەفە هەوڵدەدات بۆچوونی دەربارەی گەردوون وابێت کە گەردوونێکی داخراوە و خۆی خۆی بەڕێوە دەبات، ئەوەك گەردوونێکی کراوە بۆ دەستخستنەناوی هێزی دەرەکی.

گومان لەوەدا نییە ئەو بیانووەی پۆپەر شیاوی قەبووڵکردن نییە، چونکە ئەوەتا پێشەوایانی فەلسەفەی یۆنانی، سێکوچکەی (سوقرات - ئەفلاتون - ئەرستۆ)، بەهەمان شێوە دیکارتییەکان[1] و زۆری تریش لە فەیلەسووفەکان باوەڕیان بە بوونی خودا و ڕۆڵی خودا لە کرداری بەدیهێنانی هەبووە.

---

بارودۆخی ئەوسای گەردوون و ئەو یاسایانەی بەڕێوەی دەبەن. ئایا دەیتوانی بزانێت کە دوای ١٣.٧ ملیار ساڵ (ئێستا) گەردوون چی بەسەردێت؟ بە دڵنیاییەوە نەخێر. کەواتە پەیدابوونی ئەم گەردوونەی ئێستا کاری هەڵقوڵانە.

- ئایا ئەو زانایە ئەگەر خاسیەتەکانی هایدرۆجینی (شیاو بۆ سووتان) و ئۆکسجین (کە یارمەتی سووتان دەدات)ی بزانیایە، دەیتوانی پەی بە پەیدابوونی ئاو ببات (کە ئاگر دەکوژێنێتەوە). کە لە هەردوو ڕەگەزەکە پێکهاتووە؟ بە دڵنیاییەوە نەخێر...

- ئایا بە زانینی پیتەکانی زمانی عەرەبی و یاساکانی و وەزنەکانی شیعر و بەحرەکانی. دەیتوانی پەی بە هۆنراوەکانی دیوانی شیعری ئەحمەد شەوقی ببات؟ بێگومان نەخێر...

کەواتە دەرکەوتنی ئەم بوونەوەرانە (گەردوون - ئاو - شیعری ئەحمەد شەوقی) کارێکی هەڵقوڵانی داهێنەرانەیە.

(١) ئەم قوتابخانەیە دیکارت و سپینۆزا و لایبنتز،....یش لەخۆدەگرێت.

## ئایا کۆمپیوتەر بە عەقل هەژمار دەکرێت؟!

لە میانەی هەوڵەکانیان بۆ کەمکردنەوەی تاقانەیی مێشك و عەقڵی مرۆڤ و پارێزگاریکردن لێیان لە چوارچێوەی دامەزراوەی ماددیدا. ماددیگەراکان هەمیشە قسەی (مێشك تەنیا کۆمپیوتەرێکە) دووبارە دەکەنەوە، پشت بەوە دەبەستن کە توانای کۆمپیوتەر لە ئەنجامدانی کرداری بیرکارییانەی زۆر ئاڵۆز زۆر خێرایە، ئەگەر بەراورد بکرێت بە توانای مرۆڤ. چواندنی مێشك بە کۆمپیوتەر لە پەنجاکانی سەدەی بیستەمدا دەرکەوت، کاتێك خەڵك دەستیانکرد بەبیرکردنەوە لە ئامێرە ژمێرەرەکان. لەوکاتەدا زانیاری بەردەست دەربارەی خانەکانی تەنیا وەك یەکەی کارەبایی تەماشا دەکرد کە بە کارەبا کار دەکات. ئەگەر خەڵکی ئەوسا ئەو زانیارییانەیان هەبوایە کە ئێستا دەربارەی میکانیزمەکانی مێشك لەبەردەستماندایە، ئەوا هیچ کامێکیان بوێری ئەوەی نەدەبوو بانگەشە بۆ شتێکی وەها بکات[1].

---

(١) نموونەیەك زۆر سەرنجی راکێشام کە بەرجەستەی ئەو هەڵەیە دەکات، کە لەلایەن مامۆستای فیزیا جەیمس تریفڵ James Trefil لە کتێبەکەیدا (ئایا ئێمە بێ هاوشێوەین؟) دا خستوویەتیەروو. دەڵێت: بێنە بەر چاوی خۆت کە بوونەوەرێکی ئاسمانی سەردانی هەسارەی زەوی کرد و ئەو بوونەوەرە لە هەسارەکەی خۆیدا گرنگی بە هاتوچۆ دەدا و، بینی شار زۆر قەرەباڵغە ؛ بینی کەسەکان ئۆتۆمبێل و لۆری و شەمەندەفەر و پاسکیل لێدەخوڕن و، ویستی شان لە شانی شارەکە بدات و، دەستیکرد بە دروستکردنی رۆبۆت کە هاوشێوەی مرۆڤ بڕوات و هەندێك لە ئامرازەکانی گواستنەوەشی کڕی و وایکرد کە ئەو رۆبۆتانە لێیبخوڕن، پاشان میوانەکە کۆنگرەیەکی رۆژنامەوانی ئەنجامدا و رایگەیاند کە ئەو لە ئێستادا شارێکی هەیە!

بوونەوەرە ئاسمانییەکە شاری لە (گواستنەوە و هاتوچۆ) کورتکردۆتەوە، گومان لەوەدا نییە کە ئەمە هەڵەیەکی روون و ئاشکرایە، چونکە لە راستیدا لەناو شاردا زۆر شت بوونیان هەیە؛ خەڵك حکومەتەکانیان هەڵدەبژێرن، لە قوتابخانە و زانکۆکاندا فێردەبن، دەکەونە خۆشەویستی و هاوسەرگیری دەکەن، ململانێ دەکەن، لەیەکتر دەبوورن...هەموو ئەو چالاکییانە هاتو چۆ و گەیاندن بەرهەم دێنن.

ئەم نموونەیە ئەوەمان بۆ دەردەخات کە ئەنجامدانی یەك چالاکی لە چالاکییە زۆر و زەوەندەکانی مێشك لەلایەن کۆمپیوتەرەوە، کە بریتییە لە کاری ژمێریاری تا لە هەموو بوارەکانی ژیانماندا یارمەتیمان بدات، بەهیچ جۆرێك نایخاتە بەراورد لەگەڵ مێشکی مرۆڤدا.

گوتنی ئەوەی کە مێشك لە کۆمپیوتەر دەچێت، بە ئەندازەیەکی زۆر وەك ئەوە وایە بڵێین لە پاسکیل دەچێت! چونکە بە هیچ جۆرێك هۆکارێکی ڕاستەقینە لە پشت ئەوەوە بوونی نییە کە بگوترێ کۆمپیوتەر و مێشك لەیەکدەچن، تەنانەت هیچ کەسێکی پسپۆڕ ئەو قسەیە ناکات. بەڵام لەلایەن نووسەرە ناپسپۆڕەکانەوە بەکاردەهێندرێت و هەر لەوانیشەوە بۆ ناو خەڵکی گشتی گوازراوەتەوە.

بەڵگە هێنانەوەکەی بلیمەتی بیرکاری و فەیلەسووفی بەریتانی سێر ڕۆجەر بنرۆز (مامۆستای کامبریدج پاشان ئۆکسفۆرد) زۆر سەرنجی ڕاکێشام، کاتێك وەڵامی ئەو بانگەشەیە دەداتەوە و دەڵێت:

((ئەوەی بانگەشەی ئەوە دەکات کە کۆمپیوتەر لە مێشك دەچێت، وەك ئەوە وایە بانگەشەی ئەوە بکات کە ئامێری DVD لەو فیلم و گۆرانی و مۆسیقایانە تێدەگات کە پەخشیان دەکات، لێرەدا جیاوازییە گەورەکە بریتییە لە هۆشیاری و هەستکردن بەوەی کە ئەنجامیدەدات. هەروەها جیاوازییەکی جەوهەری تریش بوونی هەیە، ئایا دەزانی کە ناوەندەکانی زیرەکی I.Q) لە کۆمپیوتەردا یەکسانە بە سفر(Zero)؟! ئەم دوو بەڵگەیە دوو بەڵگەی زۆر بەهێزن.

## عەقڵ فەلسەفەی ماددیگەرایی کوشتووەو ئێستاش دەینێژێت:

لەوەی ڕابورد لە تەوەرەکەدا ئەوەمان خستەڕوو کە تەفسیرە ماددییەکان لە پێشکەشکردنی میکانیزمی قایلکەر بۆ پەیدابوون و دەرکەوتنی توانا عەقڵییەکانی مرۆڤ بێتوانا بوون، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك توانای عەقڵی هەن ئەگەرچی سەرەتایین و زانست پشتیان پێدەبەستێت بەڵام زۆر یاخین بۆ تەفسیرکردن بۆ دیدی ماددیگەرایی / سروشتی و زیاتر بەڵگەن لەسەر خودای بەدیهێنەر، گرنگترین ئەو چەمکانەش[1]:

---

(١) ئەو چەمکانەمانەمان بە درێژی لە سێ تەوەرەی یەکەمدا باس کرد. لێرەشدا لە کاتی قسەکردنمان لەسەر عەقڵ کۆیاندەکەینەوە.

أ- توانای عەقڵەکانمان لە تێگەیشتنی دەوروبەر

هەر کاتێك وتەکەی ئەنیشتاین دەخوێنمەوە هەست بە چێژ دەکەم، کە دەڵێت: ((یاخیترین شتی گەردوون ئەوەیە ئێمە لە گەردوون تێدەگەین)).

ئەگەر عەقڵی ماددی گەردوونی بەدینەهێنابێت، ئەو عەقڵەش توانای تێگەیشتنمانی سنووردار نەکردبێت، ئەوا لەم دوو پێشەکییەوە دوو پرسیار پەیدادەبن کە زانستی ماددیگەرایی پەکدەخەن، ئەوانیش:

چۆن چالاکی کارۆکیمیایی مێشکمان دەرك بە حەقیقەتی ئەو ڕووداوانە دەکات کە لە دەوروبەرماندا ڕوودەدەن؟

چۆن هاوکێشەیەکی بیرکارییانە لە مێشکی زانایەکی بیرکاریدا دەخولێتەوە دەتوانێت پەی بەو ڕووداوانەی گەردوون ببات کە دەکەونە دەرەوەی مێشکمان؟

با ئەوە بە نموونەیەك ڕوون بکەینەوە: ئەگەر بوونەوەرێکی ئاسمانی سەردانی هەسارەکەمان بکات، گوێی لە زانای فیزیا بێت کە باس لە پلەی گەرمی بکات لە دامەزراوە جیاوازەکاندا (کەش و هەوای دەوروبەر - شلەکان - لاشەی مرۆڤ - ئەمە لە بەرامبەر گەردووندا)، پاشان لە یەکێك لە تاقیگەکانی توێژینەوەدا بینی کە ئامێرێك زۆر بە وردی بۆ پێوانی پلەی گەرمی ڕێکخراوە (تێرمۆمەتر (گەرمی پێو) - ئەمەش بەرامبەر بە مێشکمانە)، ئایا میوانەکە ئەو دامەزراوانە و بوون و دیزاینی گەرمی پێوەکە بەیەکەوە نابەستێتەوە؟ یان وا لێکدەداتەوە کە هەر یەکێکیان بوونێکی سەربەخۆی هەیە؟!

نهێنی ئەم گونجان و ڕێککەوتن و تەواوکارییەی نێوان مێشکمان و گەردوون چییە؟

**ب- سەرچاوەی چەمکە سەرەتاییەکانمان**

- مرۆڤ ناتوانێت لە یەک کاتدا لە دوو شوێن بێت.
- بەشێك بچوکترە لە هەموو.
- دژیەکەکان(ڕووناکی و تاریکی، گەرمی و ساردی) پێکەوە کۆنابنەوە.
- هەموو ئەنجامێك هۆکارێکی هەیە.

پسپۆڕان رای جیاوازیان هەیە لە نێوان نکۆڵیکارانی فیترییەتی ئەو چەمکانە و وایدەبینن کە بەدەستهاتوون (مکتسبات)، کۆمەڵێکی تر دەڵێن فیترین و پێویستییان بە تەفسیر نییە. بێگومان ئێمە لەگەڵ کۆمەڵی دووەمدا هاوڕاین بەوەی کە هەندێك چەمك هەن فیترین، بەڵام -لە دیدی یاسای هۆکارێتییەوە- ئەوە رەتدەکەینەوە کە لە عەقڵماندا تەفسیرێکی بۆ نەبێت هەروەك ماددیگەراکان بانگەشەی بۆ دەکەن. دیدی ئایینی زۆر بە سادەیی تەفسیرێکی قایلکەر دەخاتەڕوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیچ کێشەیەکمان نییە ئەگەر بێتو ماددیگەراکان تەفسیرێکی ماددیمان بۆ بخەنەڕوو!

**ج- بۆچی باوەڕ بە عەقڵەکانمان دەکەین**

زانست لەسەر متمانەکردن بە عەقڵەکانمان لە گەیشتن بە حەقیقەت بنیاتنراوە، ئایا عەقڵەکانمان بە مەبەست بەو شێوەیە دیزاین کراون، کە بگات بە حەقیقەت و پاشان باوەڕی پێبێنێت؟

وەك ڕێخۆشکردنێك بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە بە قسەی بێباوەڕە نوێیەکان دەستپێدەکەین: دۆوکنز وایدەبینێت کە پاڵنەری پەرەسەندن لە پشت پەیدابوونی عەقڵ بە هیچ جۆرێك بریتی نییە لە بەدەستهێنانی زانست و زانیاری، بەڵکو بۆ ئەوەیە یارمەتی کێبڕکێکردن بدات لە پێناو مانەوەدا، لەبەرئەوە بێباوەڕان وایدەبینن کە ئەو بیرۆکە و زانیارییانەی پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆیان بە مانەوە

نییە، ئەوا چەمکی لاوەکین و هاوپێچی فرمانەکانی عەقڵن کە یارمەتی مانەوە دەدەن، بە دیاردەی (ئەندامی دەماری خۆگونجاندن)[1] یان هەژمار دەکەن، وەك ئاماژەکانی دەستمان کاتێك کە قسە دەکەین!.

زانای بۆماوەزانی بەریتانی هاڵدۆن[2] پێش ماوەیەکی زۆر پرسیارێکی جەوهەری دەربارەی ئەو چەمکە خستۆتەڕوو، دەڵێت: ئەگەر بیرۆکەکانی عەقڵمان دەرئەنجامی میکانیزمێکی ناڕاستەنەکراوی بێ عەقڵ بێت، کە بریتییە لە جووڵەی گەردیلەکان (چالاکی کارۆکیمیایی)، کەواتە بۆچی متمانە بەو شتانە بکەین کە پێمان دەڵێت؟!

فەیلەسووفی بەناوبانگی ئەمریکی ئالڤین پلاتینگا زەبرێکی کوشندە لە خستنەڕووەکەی کۆتایی دۆوکنز دەدات و پێی دەڵێت: ((ئەگەر دۆوکنز ڕاستدەکات کە ئێمە بەرهەمی کردارێکی سروشتی هەڕەمەکی بێ عەقڵین، ئەوا ئەوە بیانوویەکی بەهێزمان پێدەدات بۆ گومانکردن لە توانا عەقڵییەکانمان، پاشان گومانکردن لە هەر زانست و زانیارییەك کە بەرهەمی عەقڵمان بێت، بە زانست و بێباوەڕییەکەی دۆوکنزیشەوە! دۆوکنز بەم کارەی زانستەکەی و باوەڕی بە مەزهەبی سروشتی دەخاتە بازنەی گومان و ململانێیەکی عەقڵییەوە، کە هیچ پەیوەندییەکی بە خوداوە نییە)).

بەمکارە بێباوەڕی وامان لێدەکات متمانەمان لەدەستبدەین بە هەر بەڵگەیەك لەسەر ڕاستی و دروستییەکەی، وامان لێدەکات کە تەنیا وەك کۆمەڵە وەهمێکی دژیەك سەیریان بکەین.

تەوەرەکە بە حەقیقەتێکی دەمکوتکەر کۆتایی پێدێنین کە گەورە فەیلەسووفی ئەڵمانی ڕۆبێرت سپینان[3] دەیخاتەڕوو، دەڵێت: ((لە ڕاستیدا بێباوەڕی نوێ

---

(١) Adaptive Neurophysiological phenomena

(٢) J.B.S Haldone1892-1964(لز).

(٣) Robert spaenann: یەکێك لە گەورە فەیلەسووفە ئەڵمانییە مەسیحییەکان کە بانگەواز بۆ مافەکانی مرۆڤ دەکات. لە ساڵی ١٩٢٧ز لەدایکبووە.

نامانخاتە بەردەم دوو بژاردەی خودا و زانستەوە هەروەك بانگەشەی بۆ دەكات، بەڵكو دەمانخاتە بەردەم هەڵبژاردن لە نێوان باوەڕبوون بە خودا و وازهێنان لە توانا عەقڵییەكانمان بۆ تێگەیشتن لە گەردوون كە باوەڕمان پێیان هەیە. بە سادەیی ئەگەر خودایەك بوونی نەبێت(وەك سەرچاوەیەكی دانا بۆ مێشكە داناكانمان) ئەوا بنچینەیەكی لۆژیكی بوونی نابێت بۆ باوەڕبوون بە عەقڵەكانمان، كەواتە هیچ متمانەیەكیش بە زانست ناكرێت، تەنانەت هیچ متمانە بە حەقیقەتیش ناكرێت.

بەمەش زانست و حەقیقەت ڕاستگۆیی و گەرەنتییەكەیان لەدەستدەدەن.

**خوێنەری بەڕێز...**

دیدی ئیسلامی وایدەبینێت كە ئەو بەخششە غەیبییەی خودا دەیداتە پاڵ خۆی (ڕۆح) بەرپرسە لەو توانا عەقڵییانەی كە مرۆڤ هەیەتی، لە كاتێكدا دیدی ماددیگەرایی ئەو توانایانە دەگێڕێتەوە بۆ گەورەبوون و ئاڵۆزبوونی تۆڕێكڵی مێشكی بوونەوەرە سەرەكییەكان لە ئەنجامی هەڵبژاردنی سروشتی نێوان بازدانە هەڕەمەكییەكان، بۆیە عەقڵ بە دەرەنجامی ڕاستەوخۆی مێشك دەزانێت، هەروەك چۆن گورچیلەكان هەڵدەستن بە دەردانی میز!

زانستەكانی دەروونناسی و پەروەردە ئەوەیان سەلماندووە كە جیاوازی جەوهەری نێوان چالاكییە عەقڵییەكانی مرۆڤ و بوونەوەرە سەرەكییەكانی تر لەوەدایە كە ناویانناوە (بیردۆزی عەقڵ)، كە بریتییە لە وێناكردنی ئەوەی لە مێشكی كەسی بەرامبەردا دەگوزەرێت.

هەروەها مرۆڤ بە بازدانی مەعریفی جۆریش جیادەكرێتەوە، كە لەوەدا خۆیدەبینێتەوە كە دەتوانێت زانیارییەكانی لە شێوەی پرسی مەنهەجی دابڕێژێت:

((كێ)) ((چی)) ((كردی)) ((بۆ كێ)) ((كەی)) ((لەكوێ)) ((بۆچی))؟

Who did what to whom; when.where and why?

گومان لەوەدا نییە کە مرۆڤ توانایەکی عەقڵی وردبینی هەیە لە بوونەوەرە سەرەکییەکانی تر جیای کردۆتەوە، کە گرنگترینیان دەرکپێکردن و تێگەیشتن و بیرکردنەوەیە، هەروەها ئازادی ویست و ئازادی هەڵبژاردن، هەروەها ئەوەی کە مرۆڤ بوونەوەرێکی خەیاڵییە و دەتوانێت بەناو زەمەندا گوزەر بکات، باوەڕی وایە کە لە پشت هەر دیاردەیەکەوە هۆکارێك بوونی هەیە و، توانای داهێنانی ئامرازەکانی هەیە، خۆشەویستی ئاشنابوون و گەڕان دەیجووڵێنێت، هەروەها لە هەموو بوونەوەرانی تر کۆمەڵایەتیترە، سەرەڕای هەموو ئەوانەش توانای بڕینی سنوورەکانی کات و شوێنی هەیە و دەتوانێت دەرك بەو ڕووداوانە بکات کە لە دەرەوەی پێنج هەستەوەرەکەی ڕوودەدەن!

گومانیش لەوەدا نییە کە بەکارهێنانی زمانەکان(قسەکردن و نووسین) یەکێکە لە گرنگترین خاسیەتە مرۆییەکان، ئەوەش سەلمێنراوە کە زمان بە پەرەسەندن لە ئامرازەکانی پەیوەندی بوونەوەرە سەرەکییەکانی ترەوە پەرەینەسەندووە، چونکە جیاوازییەکی زۆریان لە نێواندا هەیە، بەڵکو پەیدابوونی زمانی مرۆڤ هەڵقووڵانێکی لەناکاوبوو، کە وای کرد بەڵگەی زانستە زمانەوانییەکان ئوام تشۆمسکی ناوی بنێت تەقینەوە زمانەوانییە گەورەکە.

بە هەمان شێوە، چێژوەرگرتن لە جوانی، توانایەکی عەقڵییە و دەچێتە ژێر باری ڕێسای زۆر وردەوە، کە بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش لەگەڵ توانای عەقڵ بۆ دەرکپێکردن و تێگەیشتن لە گونجان و ڕێککەوتندایە. ئەویش(وەك زمان) بە تەواوەتی لە چێژوەرگرتنی غەریزی جوانی سادە جیاوازە کە هەندێك ئاژەڵ هەیانە.

ئەوەی ماددیگەراکان بانگەوازی بۆ دەکەن هەمووی بەبادا دەچێت کە خوایەتی و ئایین داهێنراوی مرۆڤن و دیاردەی بیانووگەرین و، هەست و سۆزە ڕۆحییەکان وەهمی دەروونی و قسەی بێبنەمان، هەموو ئەو بانگەشانە بەهەوادا دەچن لەبەرامبەر ئەوەی زانستی نوێ سەلماندوویەتی بەوەی بوونی غەیبی بوونێکی ڕاستەقینەیە و ئەو هەست و سۆزە ڕۆحییانەی مرۆڤ هەستیان

پێیدەکات شوێنی تایبەتی مێشك لێیان بەرپرسە. هەروەك چۆن زانست بوونی تەواوکاری نێوان بنچینەی مێشکی مرۆڤ و دامەزراوەی ئایینی سەلماندووە، کە پەرەسەندنی داروینی توانای تەفسیرکردنی نییە.

گومانیش لەوەدا نییە کە ئەو چەمکە سەرەتاییانەی عەقڵ هەیەتی، کە گرنگترینیان دەرککردنی مێشکمانە بەوەی کە لە دەوروبەرماندا ڕوودەدات، ئەو نەگۆڕە بەدیهییانەی هەمانە، مەیلمان بۆ بەڕاستدانانی ئەوەی کە عەقڵمان پێی دەگات، کۆڵەگەی سەرەکین کە زانستیان لەسەر بنیاتنراوە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە زانست بەتەواوەتی بێتوانایە لە تەفسیرکردنی ئەم جۆرە چەمکانە!

ئەگەر کۆتا شت کە لە گیرفانی زانستی مرۆییدایە بریتی بێت لە چەمکی هەڵقووڵان (الإنبثاق)، کە وایدەبینێت کاتێك مێشکی مرۆڤ گەیشتە ئەوپەڕی ئاڵۆزی عەقڵی بەبەردا کرا، ئەوا هەڵقووڵان تەنیا تەفسیرێکە بۆ ئەوەی کە ڕوویداوە، هیچ میکانیزمێکی بۆ چۆنیەتی ڕوودانی نەخستۆتەڕوو!

یەکێك لە بەربەستە گەورەکانی بەردەم تەفسیرە ماددییە/سروشتییەکان دەربارەی پەیدابوونی عەقڵ بریتییە لەوەی کە ئەو زیرەکییەی مرۆڤ هەیەتی زۆر زیاترە لەوەی کە مرۆڤ بۆ فرمان و ژیان و سێکس پێویستی پێیەتی، ئەمەش واتای ئەوە دەگەیەنێت کە پەیدابوونی دەکەوێتە دەرەوەی تواناکانی پەرەسەندنی داروینی هەڕەمەکییەوە، بەوپێیەی کە پەرەسەندن توانای عەقڵی یەدەگ و پەنهان بە مرۆڤ نابەخشێت و دیدێکی ئاییندەیی نییە.

لە هەموو ئەوانەش مەترسیدارتر ئەوەیە کە بێباوەڕی نوێ ئامانجاتە بەردەم هەڵبژاردن لە نێوان خودا و زانست هەروەك بانگەشەی بۆ دەکات، بەڵکو لە نێوان باوەڕبوون بە خودا و وازهێنانمان لە توانا عەقڵییەکانمان بۆ تێگەیشتن لە گەردوون. بەمەش زانست و حەقیقەت ڕاستگۆیی و گەرەنتییەکەیان لەدەستدەدەن.

لەبەرئەوە داننان بە دیزاینی زیرەك کە خودایەکی دانای بەتوانای لە پشتەوەیە بریتییە لە تەفسیری سادە و گونجاو بۆ هەموو بەڵگە و نیشانە زانستییەکان لەسەر توانا عەقڵییەکانی مرۆڤ.

## تەوەرەی نۆیەم

# خوایەتی- ئایین- ڕەوشت
# لەنێوان خودا و بێباوەڕیدا

((ئەگەر خودا بوونی نەبێت...ئەوا هەموو شتێك رەوایە)) دیستۆفیسکی

خوایەتی (الألوهیة) و ئایین و ڕەوشت لە دیدی ئیسلامیدا بەدوای یەکەوەن، بە باوەڕبوون بە خودا دەستپێدەکات، کە ئایینی ناردۆتە خوارەوە، تەواوکردنی دامەزراوەی ڕەوشتی مرۆڤی کردۆتە یەکێك لە بنچینەکانی، بۆ چەسپاندنی ئەم دامەزراوەیەش لە دەروونی مرۆڤایەتیدا ئیسلام ڕێڕەوێکی بەکارهێناوە، کە لە سێ میکانیزم پێکهاتووە و بەشێوەیەکی یەك لە دوای یەك کار دەکەن:

## فیترەت- پەیام- عەقڵ :

هەرچی هزری بێباوەڕییە ئەوا ئەم سێ میکانیزمە رەتدەکاتەوە و وایدەبینێت کە مرۆڤ هەستی خودایی و هەستی ئایینی و هەستی ڕەوشتی بە هەمان شێوەی خاسیەتەکانی تری بەدەستیهێناوە و، بریتییە لە پەرەسەندن لە پێناو بەرژەوەندیدا، واتا (پێویستی دایکی داهێنانە)، مەبەستیان ئەوەیە کە مرۆڤ بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هێزە سروشتییەکان و خراپە و ئازارەکان بە دوای هێزێکی

گەورەدا گەڕاوە کە پاڵپشتی و ئارامی لە بوونیدا بدۆزێتەوە، هەر بۆیە لەسەر ئاستی عەقڵی و دەروونی چەمکی خوایەتی و، چەمکی ئایینی داهێناوە، ئەمە هەمان ئەو شتەیە کە نیتچە مەبەستییەتی کاتێك دەڵێت:((مرۆڤ خودای درووستکردووە!)).

هەروەها بێباوەڕان وایدەبینن کە دامەزراوەی ڕەوشتیش هەر مرۆڤ دایهێناوە، کاتێك کە زانیویەتی پەیڕەوی ڕەوشتی پێگەیەکی بەرز و ژیاننامەیەکی جوان و ئەمری ناوەکەی لە ژیاندا پێدەبەخشێت، لە بەرەنگاربوونەوەی خراپەدا وای لێدەکات کە هەست بە ڕەزامەندی بکات! هەروەها هەندێکی تر ئەوەشی بۆ زیاد دەکەن کە مرۆڤ چاکە لە پێناو چاکەدا ئەنجام دەدات! لە کۆتاییدا و بەر لە هەموو شتێك مرۆڤ دەرکی بەوە کردووە ئەگەر بە ڕەوشت پەیوەست نەبین ئەوا هەموومان نقوم دەبین!

ئێستاش با گوێ لە قسەی عەقڵ و زانست بگرین و لەو پرسەدا ئەوان بکەین بە دادوەر.

# خوایەتی - ئایین - ڕەوشت
# لە دیدی ئیسلامدا

ئیسلام لە بنیاتنانی دامەزراوەی باوەڕدا پشت بە سێ میکانیزم دەبەستێت (فیترەت و پەیام و عەقڵ)، سەرەڕای ئەوەی کە ئێمە شێوازەکەمان بریتی نییە لە وەڵامدانەوە و هەڵتەکاندنی بەڵگەکانی بێباوەڕان سەبارەت بە ئایین، بەڵام لێرەدا وامان بە باشزانی کە باسەکەمان بە خستنەڕووی ئەو میکانیزمانە و پێگەکەیان لە قورئانی پیرۆزدا دەستپێبکەین، پاشان بەڵگەی زانستی و فەلسەفی لەسەر بهێنینەوە، بۆئەوەی دەرفەتێك بە خوێنەر بدەین کە لە کاتی گەشتکردنی بەو تەوەرەیەدا قسەی زانست و ڕێڕەوی ئیسلامی بەیەکەوە گرێ بدات.

قورئانی پیرۆز پێمان دەفەرموێت کە خودا (فیترەت)ی ئایین و باوەڕبوون پێی لە دەروونی مرۆڤدا چەسپاندووە:

﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ ... ﴾ الروم: ٣٠.

واتە: (ئەی مرۆڤ بە دڵێکی پاك و بێگەردەوە ڕوو لە ئایین بکە، پابەندی ئەو فیترەتە بە کە خودا مرۆڤی لەسەر بەدیهێناوە).

دانانی فیترەت لە دەروونی مرۆڤایەتیدا و بەبێ هیچ میانگیرییەك و فریشتەیەکی نزیك یان پێغەمبەرێك بووە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِىٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا۟ بَلَىٰ شَهِدْنَآ ...﴾ الأعراف: ١٧٢.

واتە: (کاتێك پەروەردگارت هەموو وەچەکانی ئادەمی ریز کرد و پەیمانی لێوەرگرتن و پێی فەرموون: ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم؟ ئەوانیش گوتیان بەڵێ شایەتی دەدەین کە تۆ پەروەردگارمانی).

ئەم فیترەتە لە پشت حەزو ئارەزووی مرۆڤ وەستاوە بۆ گەڕان بە دوای خودای حەق و ئایینی حەق.

قورئانی پیرۆز ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە دەکرێ فیترەت مرۆڤ رێنموونی بکات، ئەگەر ئایینە ئاسمانییەکانیش ئەو کارە نەکەن:

﴿... يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِىٓءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ ۚ نُّورٌ عَلَىٰ نُورٍ ...﴾ النور: ٣٥.

واتە[1]: (نوری وەحی نوری فیترەتی بۆ زیاد دەکرێت تا رێگای هیدایەت بۆ مرۆڤ رۆشن بکاتەوە).

سەبارەت بە (پەیامە ئاسمانییەکان)، قورئانی پیرۆز پێمان دەفەرموێت کە خودا هیچ گەلێکی بەبێ رێنموونیکارێك نەهێشتۆتەوە کە رێبازەکەی خۆی پێ بناسێنێت:

﴿... وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ ﴿٢٤﴾﴾ فاطر: ٢٤.

واتە: (هیچ گەلێك نییە پەیامبەری بۆ رەوانە نەکرابێت).

---

(١) راڤەی ئایەتەکان لە تەفسیری (نامی) مامۆستا عبدالکریم مودەڕیس(رەحمەتی خوای لێبێت) وەرگیراون.

پەیامە ئاسمانییەکان بۆ ئەوە هاتوون کە خودا و ئایین بە مرۆڤ بناسێنن، ئەو بەڵێنەی بیربخەنەوە کە خودا لە فیترەتی مرۆڤی داناوە، لەبەرئەوە قورئانی پیرۆز لە زۆرێك لە ئایەتەکانیدا (أفلا تذکرون) دووبارە دەکاتەوە.

دوای فیترەت و پەیام ڕۆڵی (عەقڵ) دێت، دەبینین قورئانی پیرۆز بانگەواز بۆ بە عەقڵ بیرکردنەوە لە نزیکەی پەنجا شوێندا دووبارە دەکاتەوە و جەخت لەسەر چالاکی عەقڵ دەکاتەوە و دەفەرموێت:

﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٥٣﴾ ﴾ فصلت: ٥٣.

واتە: (ئێمە لە مەوپاش بەڵگەو نیشانەکانی خۆمانیان لە جیهان و لە نەفسی خۆیانا پیشان ئەدەین تا بۆیان دەرکەوێ قورئان ڕاستەو کەلامی خوایەو لە خواوە هاتووەتە خوار بۆ سەر پێغەمبەر. ئاخۆ بەس نییە بۆ ئادەمیزاد بۆ گێڕانەوەی لە گوناهو لە بێ فەرمانیی خوا، کە خوای تۆ ئاگای لە هەموو شتێ هەیە؟).

هەروەها قورئانی پیرۆز ئەوە ڕووندەکاتەوە هەر کەسێك توانا عەقڵییەکانی خۆی پەك بخات و خۆی لە بەخششەکانی بێبەش بکات، ئەوا وەك ئاژەڵ وایە و تەنانەت خراپتریشە.

## زانست قسەی حەق دەکات :

کارین ئارمسترۆنگ[1] لە کتێبەکەیدا (مێژووی خودا a history of God) مرۆڤ بەوە وەسف دەکات کە بوونەوەرێکی رۆحیی و ناوێکی تر بۆ رەگەزی مرۆڤایەتی پێشنیار دەکات، کە بریتییە لە (مرۆڤی عاقڵ homo-sapiens)، بەمەش د. ئارمسترۆنگ جەخت لەسەر چەمکە ئایینییە فیترییەکانی مرۆڤ دەکاتەوە، دەرهێنانی رەگ و ریشەی ئایین لە دەروونی مرۆڤایەتیدا دەکاتە شتێکی مەحاڵ. بەو شێوەیەی کە بێباوەڕان چاویان تێبڕیوە، واتا پرسەکە بریتی نییە لە (وەهمی خودا The God Delusion) هەروەکو ریچارد دۆکنز بانگەشەی بۆ دەکات.

کەواتە سیفاتە مرۆیی و پاڵپشتە زانستییەکان چین کە لە پشت دیدی کارین ئارمسترۆنگەوە وەستاون؟

---

(١) Karen Armstrong: ژنە بیرمەندێکی ئینگلیزییە، کە گرنگی بە ئاینەکان دەدات، نووسینەکانی دەربارەی خاڵە هاوبەشەکانی ئاینە سەرەکییەکانە دەربارەی چەمکێکی دیاریکراو. وایدەبینێت کە چارەسەری ریشەیی بۆ هەموو کێشەکانی مرۆڤایەتی بریتییە لە (بەو جۆرە مامەڵە لەگەڵ خەڵکدا بکە کە پێت خۆشە مامەڵەت لەگەڵدا بکرێت). لە فێبریوەری ٢٠٠٨ز بانگەوازەی بۆ پێکهێنانی کۆڕبەندێکی جیهانی کرد بۆ یەکخستنی مسوڵمان و دیان و جولەکەکان. زۆر گرنگی بە ئاینی ئیسلام دەدات و زۆر رێزی لێدەگرێت، دوای ١١ی سێپتەمبەری ٢٠٠١ زۆر کتێبی لەسەر ئیسلام نووسی. لە ساڵی ١٩٤٤ز لە دایک بووە.

## بوونەوەرێکی سۆزدار، بە ڕەوشت، دیندار

د. ئێدوارد وێلسن[١] (مامۆستای بایۆلۆجییای کۆمەڵایەتی لە زانکۆی هارڤارد) پێمان دەڵێت کە مرۆڤ بە سروشتی خۆی سۆزدارە و ئەو هەستە لە جیناتماندا دانراوە.

هەروەك چۆن جەیمس واتسۆن[٢] لە کتێبەکەیدا (DNA) پێمان دەڵێت: کە (چەمکە ڕەوشتییەکان Moral codes ) هەر لە سەرەتای دروستبوونییەوە و بەر لە هاتنی ئایینەکان لە جیناتی مرۆڤدا چەسپێنراوە.

هەروەها رۆبێرت وینستۆن[٣] (سەرۆکی یەکێتی بەریتانیا بۆ پێشخستنی زانستەکان) لە کتێبەکەیدا (فیترەتی مرۆڤایەتی) پێمان دەڵێت، کە هەستی ئایینی بەشێکە لە بونیادی دەروونیمان و لە جیناتماندا دانراوە، لە مرۆڤێکەوە بۆ مرۆڤێکی تر لە ڕووی بە هێزی و لاوازییەوە جیاوازی هەیە.

---

(١) Edward. O. Willson: یەکێکە لەو کەسانەی گرنگی بە فەلسەفە و ئاین و مافەکانی مرۆڤ دەدەن، دوو جار خەڵاتی پۆلیتزەری جیهانی وەرگرتووە. کتێبەکەی (یەکێتی زانستەکان Conseliense) بە یەکێك لە گرنگترین کتێبەکان دادەنرێت کە دەربارەی پەیوەندی نێوان بایۆلۆجیا و سروشتی مرۆڤایەتی نووسراوە، لە ساڵی ١٩٢٩ز لە ویلایەتە یەکگرتووەکان لە دایك بووە.

(٢) James Watson: لە ساڵی ١٩٢٨ز لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە دایك بووە و لە تەمەنی پازدە ساڵیدا پەیوەندی کردووە بە زانکۆی شیکاگۆ، لە ساڵی ١٩٥٠ز دکتۆرای لە بۆماوەزانیدا وەرگرتووە، لە ساڵی ١٩٦٢ز خەڵاتی وەرگرتووە(بە هاوبەشی لەگەڵ فرانسیس کریك و مۆریس ویڵکنز)، بەهۆی دۆزینەوەی پێکهاتەی دی ئێن ئەی و، تائێستاش لە زۆربەی بوارە جیاجیاکانی توێژینەوە بایۆلۆجییەکان کاردەکات.

(٣) Robert Winston: ئینگلیزییە، مامۆستا و راگری پەیمانگای نەخۆشییەکانی ژنان و لە دایکبوون لە لەندەن کار دەکات و، چەند توێژینەوەیەکی بەناوبانگی هەیە دەربارەی منداڵی بلووری و سپێرم و خانە قەدیەکان و، نووسەر و راگەیاندکارێکی بەناوبانگە، لە ساڵی ١٩٤ز لە دایك بووە.

مایکل شێرمەر[١] (سەرنووسەری گۆڤاری گومانکار - الشکاك -) ئەوە دووپات دەکاتەوە کە هەستکردن بە دوانەیی لاشە و رۆح فیترییە و هەر لە لەدایکبوونمانەوە لە ناخماندا چەسپێندراوە، پۆڵ بلوم[٢] (مامۆستای زانستی دەروونناسی لە زانکۆی ییل لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا) پاڵپشتی هەمان بۆچوون دەکات و دەڵێت: ((ئێمە بوونەوەری دوانەیین (لاشە و رۆحین) و باوەڕبوون بە ژیانەکەی تر لە جیناتماندا چەسپێنراوە Hard-Wired، کە تیایدا رۆح دوای بەجێهێشتنی لاشەی فانی و لەناوچوو تیایدا دەژی، ئەم باوەڕە بنچینەی فیترەتی ئایینییە[٣])).

گومان لەوەدا نییە کە پەیوەندییەکی فیتری بەهێز هەیە لە نێوان ڕەگەزەکانی ئەم سێکوچکەیەدا: بەوەی مرۆڤ بوونەوەرێکی سۆزدارە، پەیڕەوی لە چەمکە ڕەوشتییەکان دەکات، وەڵامی هەستە ئایینییەکان دەداتەوە.

### ئێستاش با گوێ لە قسەی بایۆلۆجیا بگرین :

دیان هامەر[٤] (سەرۆکی یەکەی توێژینەوەکانی جینات لە پەیمانگای نیشتمانی بۆ شێرپەنجە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا) گەیشتۆتە ئەو دەرەنجامەی کە مرۆڤ کۆمەڵێك جینات بە بۆماوەیی وەردەگرێت، کە وای لێدەکات ئامادە بێت بۆ وەرگرتنی چەمکەکانی خوایەتی و ئایین God Gene Hypothesis.

---

(١) Miche Shermer: ئەمریکییە، مامۆستای ئابوورییە لە زانکۆی کلاریمۆنت. گرنگی بە فەلسەفە و زانستەکان دەدات. سەرنووسەری گۆڤاری Skeptic ، کە کۆمەڵەی Skeptics دەریدەکات و ٥٥٠٠٠ئەندام دەگرێتەخۆ و گرنگی بە پاککردنەوەی زانستەکان دەدات لەو لادانانەی تووشی دەبێت. لە ساڵی ١٩٥٤ز لە دایك بووە.

(٢) Paul Bloom: مامۆستای زانستی دەروونییە لە زانکۆی ییل. گرنگی بەوە دەدات کە چۆن جیهانی دەوروبەرمان بناسین. لە ساڵی ١٩٦٣ز لە کەنەدا لە دایك بووە.

(٣) ئەم خستنەڕووە لە کتێبەکەیدا هاتووە: Descartes baby:How the Science of child development Explains what makes us Human. لە ساڵی ٢٠٠٤ز بڵاوکراوەتەوە.

(٤) Dean Hamer: لە ساڵی ١٩٥١ز لە ویلایەتە یەکگرتووەکان لە دایك بووە.

بە پشت بەستن بەو توێژینەوانەی کە لەسەر جیناتی ڕەفتارەکان و توێژینەوەکانی بایۆلۆجیا و زانستی دەروونناسی ئەنجامیداوە گەیشتۆتە ئەو چەمکە، دەرەنجامەکانی ئەو توێژینەوانەی لە کتێبەکەیدا (جینی خوایەتی The God Gene: How Faith is Hardwired in our Genes) بڵاوکردۆتەوە، کە لە ساڵی[1] ٢٠٠٤ دەرچووە.

هەروەك پێشبینی دەکەی، کتێبەکەی دیان هامەر (جینی خوایەتی) لەلایەن هەندێك لە ناوەندە زانستییەکان بەرپەرچی درایەوە، لەوانەیە ئەوەش بۆ ناونیشانی کتێبەکە بگەڕێتەوە کە ماددیگەراکانی وروژاندووە، سەرەڕای ئەوەی کە ئەو چەمکە زانستییانەی دەیانخاتەڕوو نوێ نین، چونکە پێشتر زانستی دەروونناسی و زانستەکانی مێشك و دەمار باسیان کردووە[2].

ئەگەر ماددیگەراکان باوەڕیان بەوە هەبێت کە هەستەکانی مرۆڤ لە ڕێی جیناتەوە بەڕێوە دەبرێن (حەتمییەتی جینی)، ئیتر بۆچی ئەو هەستە لە ڕەفتار و هەستە ئایینییەکان ڕەتدەکەنەوە؟! ئەوەی دیان هامەر کردی (ئەگەرچی کەسێکی دینداریش نییە)، کاتێك گەیشتە ئەوەی کە جینی وا بوونیان هەیە کە

---

(١) لە گرنگترین جینە بەرپرسەکانی ئەم ئامادەکارییە ناسراوە بە VMAT2. کە بەرپرسە لە پێکهێنانی گوزەرەوەیکی کیمیایی لە مێشکدا بە ناوی Vesicular monamine transporter ناسراوە و، بەرپرسە لە دیاریکردنی ئاستی ژمارەی گوزەرەوە کیمیاییەکان کە کاری مێشك ڕێکدەخەن(سیرۆتۆنین-دۆپامین-نورنادرینالین)، هەروەك چۆن ڕۆڵی هەیە لە ئاراستەکردنی چالاکییەکانی ناوەندەکانی مێشك کە بەرپرسە لە لایەنە ڕۆحییەکان و چەمکە غەیبییەکان.

(٢) وەك کاردانەوەیەك بۆ کتێبەکە، گۆڤاری (تایم Time)، لە ژمارەی ئۆکتۆبەری ٢٠٠٤ز بابەتێکی گرنگی بە ناونیشانی (جینی خوایەتی) خستۆتەڕوو، کە تیایدا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە هەستکردن بە خودا و، ئارەزووکردن لە نزیکبوونەوە لە خودا لە ڕێی پەرستشەکان و، هەستکردن بە بوونی پاداشت و سزا لە ژیانەکەی تری دوای مردن، پرسی فیترین لەلای مرۆڤ و بەدرێژایی مێژوو و جوگرافیا لە هەموو ژیارستانییەتەکاندا بوونی هەبووە.

ڕوونترین نموونەش لەسەر ئەوە، گرنگیدانی فیرعەونییەکانە بە مردن و مۆمیا کردن و ژیانی دوای مردن، ئەمەش لە پەرستگا گەورەکان و وێنەی گۆڕستانە فیرعەونییەکاندا، هەروەها لە بەبەردبووەکانی وەك کتێبی مردووەکاندا دەردەکەوێت، توێژینەوەکان گرنگیدانێکی هاوشێوەیان لە لایەن پێشینانی هیندی و چینی و ئەمریکای باشور و ئیسپانیا و فەرەنسا و سوید بەدی کردووە.

بەرپرسن لە ئاراستە ئایینییەکان، کە ئەوەش لەگەڵ دامەزراوەی ماددیگەراکاندا دێتەوە، ئەوا ڕەخنە و نارەزایەتییەکەیان لە چ ڕوونکەوەیە؟!

## لەگەڵ زانستی دەروونناسیدا :

بیست ساڵ پێش کتێبەکەی دیان هامەر، کلۆد کلۆنینجەر[1](مامۆستای زانستە دەروونییەکان و پزیشکی دەروونی و مامۆستای بۆماوەزانی لە زانکۆی واشنتن)، ((بیردۆزی مەزاج و ڕەوشتە بۆماوەییەکان Temperament And Character Inventory))ی خستەڕوو و بوو بە یەکێك لە چەمکە نەگۆڕەکان لە ناوەندە زانستییەکاندا، لەو بیردۆزەدا کلۆنینجەر سێ جۆر ڕەوشتی بۆماوەیی خستۆتەڕوو کە وا لە جینەکانمان دەکات وەك ڕەوشت پەیڕەوییان لێبکەین، کە مەیل و ئارەزووە مرۆڤایەتی و ڕەوشتی و ڕۆحییەکانی مرۆڤ دیاریدەکات، ئەو ڕەوشتانەش بریتین لە:

١-ڕاستگۆیی خوود Self-directedness، کە ڕوونی ئامانجەکان (Purposefulness) و، بوونی مرۆڤ بە جێگای متمانە Relieble لەخۆ دەگرێت. (ئەمانەسیفاتگەلێکی تایبەت بە خودی مرۆڤن).

٢-هاوکاری Cooperativeness: کە ئامادەیی مرۆڤ بۆ یارمەتیدانی کەسانی تر دەگرێتەوە Helpfull، هەروەها بەرگەگرتنیان Tolerant و دوورکەوتنەوە

---

(١) Claud Robert Clononger: لە ساڵی ١٩٤٤ز لە ویلایەتە یەکگرتووەکان لە دایك بووە، پێشەوای توێژینەوەکانی جینات و بایۆلۆجیای دەمار و پزیشکی دەروونی و نەخۆشییە دەروونییەکان و، لەو پسپۆڕییانەدا مامۆستا بووە و، هەروەها بەڕێوەبەری ناوەندی تەندروستی دەروونی بوو لە زانکۆی واشنتن و، هەروەها بڵاوکەرەوەی سەرەکی زۆرێك لە گۆڤارە پێگە بەرزەکانە لە پزیشکیی دەروونناسی و بۆماوەزانی و بەشداری چوار کتێب و زیاتر لە ٤٠٠ توێژینەوەی زانستی کردووە.
کلۆنینجەر زۆر خەڵاتی پێبەخشراوە، لەوانە ئەندامێتی هەمیشەیی لە ئەکادیمیای ئەمریکی بۆ زانستەکان، لە ساڵی ٢٠٠٩ خەڵاتی یەکێتی نەخۆشییە دەروونییەکانی ئەمریکی پێبەخشرا، لە بەرامبەر هەوڵەکانی بۆ تێگەیشتن لە مرۆڤ بە شێوەیەکی تەواو و یەکگرتوو (لاشە- عەقڵ- دەروون- رۆح).

لە تۆڵەسەندنەوە Non-Revengefull (کە ئەوانە سیفاتێکن ڕەفتاری مرۆڤ لەگەڵ کەسانی تر ڕێکدەخەن).

٣- تێپەڕاندنی خوود (بەرزبوونەوەی دەروونی) Self-transcendence : کە مەیلە رۆحییەکان Spiritualness و داهێنان Creativity و نکۆڵیکردن لە خوود Self-Forgetfulness و دوورکەوتنەوە لە ماددیگەرایی Non-Materialism دەگرێتەخۆ (ئەو سیفەتانەش تایبەتن بە چەمکە بەرزەکان).

ئەگەر سەرنجی ئەو سێ کۆمەڵەیەی ڕەوشت بدەین، دەبینین کە وێنەی (بناغەی دەروونی) بۆ فیترەتی دینداری و فیترەتی دامەزراوەی ڕەوشتی لە مرۆڤدا دەنوێنن، پاشان هەڵدەستن بە پەروەردەکردنی ئەو ئاراستانە.

کۆمەڵە جیناتێکی دیاریکراو هەن (لە کۆرپەلە و قۆناغی منداڵیدا)، کە هەڵدەستن بە پێکهێنانی ئەو دەمارە خانانەی بەرپرسن لەو سیفەتانە و لە ناوەندە تایبەتییەکانی فێربوون و چەمکە پێشوەختاکانی پەردەی نوێی مێشک Neocortex کە بەهۆیەوە مرۆڤ لە مەمکدارەکانی تر جیاوازە.

## زیرەکی رۆحی (وجودی):

گرنگیدانی زانایانی دەروونناسی لەم ساڵانەی دواییدا پەرییەوە بۆ جۆرەکانی زیرەکی، جگە لەو زیرەکیانەی بەرپرسن لە توانا عەقڵییەکان کە پێویستن بۆ بڕوانامە و خوێندن، زۆر بیردۆز لەم بوارەدا دەرکەوتن، کە گرنگترینیان بیردۆزی زیرەکیی جۆراوجۆربوو[1] Multiple Intelligence Theory کە لەلایەن Howard Gardner خرایەڕوو.

---

(١) هاوەرد گاردنەر مامۆستایە لە زانکۆی هارڤاردی ویلایەتە یەکگرتووەکان، بۆیەکەم جار لەساڵی ١٩٨٣ لە کتێبەکەیدا بەناونیشانی (چوارچێوەکانی عەقڵ) بڵاو کردەوە و بۆماوەی زیاتر لە ٢٠ ساڵ کاری لەسەر پێشخستنی کرد.

بیردۆزی گاردنەر سەلماندنی کە تەنیا یەك جۆری زیرەکی مرۆڤایەتی بوونی نییە، بەڵکو چەند جۆرێك زیرەکی بوونیان هەیە، کە هەر یەکێکیان شێوازێکی تایبەت بەخۆی هەیە و هەر یەکێکیان ناوەندێکی سەربەخۆ لە مێشکدا داگیردەکات کە بە پشکنینە تیشکییەکان دەرکەوتوونە.

گاردنەر لە بیردۆزەکەیدا هەشت جۆر زیرەکیی خستۆتەڕوو[1]، پاشان جۆرێکی تری زیرەکیشی باس کردووە، کە بریتییە لە زیرەکی ڕۆحی Spiritual Intelligence ئەم دەستەواژەیەش بەرهەڵستییەکی زۆری کرا لەلایەن ئەوکەسانەوە کە وایدەبینن هەر شتێك بدرێتە پاڵ رۆح زانست نییە،بۆیە گاردنەر ئەم دەستەواژەیەی گۆڕی و لە شوێنی ئەودا دەستەواژەی زیرەکی وجودی Existential Intelligenc ی بەکارهێنا بۆ وەسفکردنی هەموو ئەو شتانەی دەیداتە پاڵ زیرەکی رۆحی، کە گرنگی دەدەن بە پرسەکانی سەرو هەست و پرسە سەرەکییەکانی بوونی مرۆڤ[2].

---

(١) هەشت جۆرە زیرەکییەکە ئەمانەن:

١- زیرەکی زمانەوانی
٢- زیرەکی لۆژیکی-بیرکاری
٣- زیرەکی شوێنی
٤- زیرەکی مۆسیقی
٥- زیرەکی جەستەیی- جوولەیی
٦- زیرەکی پەیوەندی لەگەڵ ئەوانی دی.
٧- زیرەکی تێگەیشتنی خوود.
٨- زیرەکی پۆلێنی.

(٢) پێکهاتەکانی زیرەکی ڕۆحی

١- هۆشیاری دەربارەی خوود: زانینی بیروباوەڕەکانم و، پێگەم لە بووندا و، پاڵنەرە قووڵەکانم.
٢- دەرك کردن بەوەی کە جیهانی ماددی بەشێکە لە راستییەکی گەورە، کە پەیوەندییەکان پێیانەوە دەمانبەستنەوە.
٣- توانای خستنەڕووی پرسیارە مەعریفییە کۆتاییەکان و، توانای تێگەیشتن لە وەڵامەکانی.
٤- توانای بەرزبوونەوە لە ئاست چەمکە ماددییەکان، بۆ ئاستێکی بەرزتر و گەورەتر و قووڵتر.
٥- ژیان بەپێی بنەما و بیروباوەڕ و پێشەنگیی.
٦- ڕێزدانان بۆ چەمکە ڕووحییەکان لە مامەڵەکردنی رۆژانەماندا.
٧- بوونی قەناعەتێکی تایبەتی بەرامبەر بابەتەکان، ئەگەر لەگەڵ زۆرینەشدا ناکۆك بێ.

## ناوەندەکانی دینداری لە مێشکدا!!

### ناوەندەکانی دینداری لە عەقڵی کاردانەوەیدا...

لە کتێبی (چەند تارماییەك لە ناو مێشکدا Phantoms in the Brain)دا نووسەرەکەی د.راماشاندران[1] (مامۆستا و سەرۆکی ناوەندی لێکۆڵینەوەکانی بایۆلۆجیای مێشك و دەمار لە زانکۆی کالیفۆرنیا) دەڵێت: باوەڕبوون بە بابەتەکانی دەرەوەی سنووری سروشت لە هەموو ژیارستانیەتە کۆن و نوێیەکاندا بوونی هەبووە، بە شێوەیەك کە ناچارمان دەکات لە مێشکدا بەدوای بنچینە بایۆلۆجییەکەیدا بگەڕێین، چونکە هیچ شتێك وەك ئەمەیان مرۆڤ لە زیندەوەرەکانی تر جیا ناکاتەوە.

د.راماشاندران پێمان دەڵێت کە خەڵکی گشتی بە چرکەساتی وادا تێدەپەڕن کە هەست بە بەرزبوونەوەی ڕۆحی دەکەن. هەست بەوە دەکەن کە لە حەقیقەت نزیك دەبنەوە، کاتێك گوێ لە مۆسیقا دەگرن یان دیمەنێکی سروشتی دڵڕفێن دەبینن. هەرچی ئەوانەن کە لەبیرکردنەوەی قووڵ ڕاهاتوون وەك سۆفییەکان

---

٨- خۆبەکەمزانیی، و زانینی قەبارەی ڕاستەقینەمان لە جیهاندا و، زانینی ئەوەی کە ئێمە تاکێکین لە کۆمەڵێك.

٩- قبووڵ کردنی بەرامبەر کە بەتەواوی لە ئێمە جیاوازە.

١٠- وەڵامدانەوەی فیترەت بۆ هاوکاریکردنی کەسانی دی.

١١- دەستگرتن بە ڕەوشت و، دەستگرتن بە پاکیی.

١٢- هەستکردن بەوەی کە بەختەوەریم لە ناخمدا هەڵدەقوڵێت، نەك لە دەستکەوتی کرداری یان ماددی.

١٣- بەهێزی عەقڵ و بیرتیژی و دووربینی و وردبینی.

(١) راماشاندران بە مارکۆپۆلۆی زانستەکانی مێشك و دەمار وەسف دەکرێت(مارکۆپۆلۆ گەڕیدەو دۆزەرەوەی بەناوبانگی سەدەکانی ناوەڕاستە) هەروەها بە پۆل برۆکای زانستی هاوچەرخ ناوزەد دەکرێت(پۆل برۆکا دامەزرێنەری زانستەکانی مێشك و دەمارە).

و راهیبەکان، ئەوا بەشێوەیەکی قووڵتر و زیاتر هەست بەو هەستانە دەکەن. لەنموونەی ئەم جۆرە بەرزبوونەوە ڕۆحییانە ئەوەیە کە ئەنیشتاین بۆمان باس دەکات کە هەست و سۆزە ڕۆحییەکان (دوور لە هەر ئایینێك) لەکاتی گەڕان لە بابەتێك لە بابەتە زانستی و گەردوونییەکان زیاتر دەبێت.

راماشاندران لێکۆڵینەوەکانی لەسەر دەزگای حوفی Limbic System ئەنجامداوە کە دەکەوێتە ناوەڕاستی مێشك و بەرپرسە لە فەرمانە هەستیی و کاردانەوەییەکان. لەکاتی چالاککردنی ئەو ناوچەیە (بە بەکارهێنانی بواری موگناتیسی) وەڵامی لاشەیی و هەستیی و کاردانەوەیی روودەدەن، لەوانە هەستکردن بە چێژێکی ڕۆحی بێ وێنە، کە هەندێکیان وەسفیان کردووە: هەست بە بوونی خودا دەکەم، هەست دەکەم لەگەڵ خودا لە پەیوەندی دام، هەست بە یەکبوون لەگەڵ بووندا دەکەم...

راماشاندران لێکدانەوە دەکات بۆ هەستکردنمان بە هەستە رۆحییەکان لەو کاتەی بۆنی دار بخورێك دەکەین لە پەرستگادا، بەوەی دەزگای حووفی لە تەنیشت ناوەندی بۆنکردنە، بەڵکو وەك بەشێك لەگەڵ کۆرپە درووستدەبێت، پاشان چالاکی ناوەندەکانی بۆنکردن دەبێتە مایەی چالاککردنی ناوەندی هەستە رۆحییەکان لە دەزگای حووفیدا.

## ناوەندەکانی دینداری لە عەقڵی لۆژیکیدا :

د.ئاندرۆ نیوبێرگ و د.یوجین داکویلی[1] لەکتێبی (بۆچی خودا نایەوێت ون ببێت؟ Why God wont go away?) زانستێکی نوێیان خستۆتەڕوو بەناوی Neuro – Theologgy کە تایبەتە بە لێکۆڵینەوە لە بنەما بایۆلۆجییە دەمارییەکانی ڕۆحانییەتەکان.

---

(١) کتێبەکە لەساڵی ٢٠٠١ دەرچووە.

ئەم دوو زانایە لێکۆڵینەوەکانیان لەسەر راهیبە بووزی و فرانسیسکان ئەنجامداوە لەکاتی بیرکردنەوە و نوێژەکانیان. گەیشتن بەوەی کە هەڵوێستە رۆحییەکان گۆڕانکاری راستەقینە (کە دەکرێ تێبینی بکرێت و تۆمار بکرێت و وێنەی بگیرێت) لە چالاکبوونی ناوچەی بەرپرس لە وەرگرتن و هەست کردن Otiention Association area لە مێشکدا روویدات. ئەو گۆڕانکارییانە دەبنە هۆی ئەو هەستە رۆحییانەی کە هەستییان پێدەکەین. واتە ئەو هەستانە تەنیا خەیاڵ و ئەندێشە نین[1]، بەڵکو ناوەندی دەماریان لە مێشکدا هەیە.

لەبەرئەوە دوو دانەرەکە ئەوە دووپاتدەکەنەوە کە مێشکی مرۆڤ بەجۆرێك دروستکراوە کە وەڵامی هەستە ئایینییەکان بداتەوە. هەروەك چۆن ئەوەش سەلمێنراوە کە هەستکردن بە خودا لەمێشکی مرۆڤدا چەسپێنراوە Hard wired هەروەك چۆن لە جیناتماندا چەسپێنراوە.

لەساڵی ٢٠٠٩، ناوەندی لێکۆڵینەوەکانی مێشك و بابەتە رۆحییەکان لە زانکۆی پەنسلڤانیا لە ویلایەتە یەکگرتووەکان، کە د.ئاندرۆ نیوبێرگ سەرۆکایەتی دەکات کتێبێکی دەرکرد بەناوونیشانی: چۆن باوەڕبوون بە خودا مێشکت دەگۆڕێت؟ How God Changes your Brain.

کتێبەکە لەسەر ئەو توێژینەوانە دامەزراوە کە ناوەندەکە لەسەر کۆمەڵێك لە باوەڕدارانی ئایینە جیاوازەکان (بوزی- هیندۆسی- مەسیحی - مسوڵمان)[2] ئەنجامیداوە، بەبەکارهێنانی تەکنیکی تیشکی هاوچەرخ، بۆ زانینی کاریگەری هەستە ئایینییەکان و رووحییەکان لەسەر فرمان و چالاکی مێشك!.

---

(١) لە لێکۆڵینەوە زۆرەکانیان، دوو زاناکە بوارە مەگناتیسییەکنیان بەکارهێناوە بۆچالاك کردنی ناوچەی بەرپرس لە وەرگرتن و هەست کردن Orientation Assocation area کە دەکەوێتە نزیك دیواری چەپی مێشك، کە ئەو ناوچەیە بەرپرسە لە هەستکردن بە خوودمان و لە کەسانی دی جیامان دەکاتەوە. لەکاتی چالاك کردنی ئەو ناوچەیە ژنە راهیبە فرانسیسکان وایان هەستدەکرد کە خودا لەگەڵیاندایە. هەروەك چۆن هەستی رووحی بێ وێنەیان هەبوو.

(٢) تاقیکردنەوەی مسوڵمانان لەکاتی نوێژ و خوێندنەوەی قورئان و هێنانی ناوە پیرۆزەکانی خوای پەروەردگار کراوە.

## خوایەتی - ئایین - ڕەوشت
## لە دیدی ماددیگەرایی/ بێباوەڕیدا

بێباوەڕان ئەوە ڕەتدەکەنەوە کە دان بە بوونی بنچینەی فیترى دابنێن بۆ هەستی خودایی و هەستی ئایینی و هەستی ڕەوشتی، هەروەك چۆن دانان بە پەیامە ئاسمانییەکان ڕەتدەکەنەوە، کە خودا بە مرۆڤ دەناسێنێت و مرۆڤ بەرامبەر بەو هەستە فیترییانە ئاگادار دەکاتەوە کە زۆر جار دەکەونە ژێر هەژموونی بەشە ماددییەکەی بنچینەی مرۆڤ، گومانیش لەوەدا نییە کە بێباوەڕان بەڵگەکانی عەقڵیش لەسەر ئەم دامەزراوەیە ڕەتدەکەنەوە.

بێباوەڕان دەرکەوتنی سیانەی (خوایەتی- ئایین - ڕەوشت) بە یەکێك لە دەرەنجامەکانی پەرەسەندنی داروینی هەژمار دەکەن لەکاتی ململانێی مرۆڤ لە ڕووبەڕووبونەوەی هێزەکانی سروشت و خراپە و ئازارەکان، هەروەها هزری ماددیگەرایی بۆ پەیدابوونی ئەم سیانەیە پەرەیسەندووە، بەڵام هێشتا هەر گیرۆدەی تاکە بیرۆکەیەکە کە بریتییە لە: (پێویستی دایکی داهێنانە!)، کە ئەنجامەکەیشی بریتی بوو لە تێکەڵەیەك لە زانستەکان کە لە ڕەتکردنەوەی چەمکە ئایینییەکان لەگەڵ یەکدا یەکانگیرن:

## داروینیزمی کۆمەڵایەتی[1] social Darwinism

لە یەکەم کتێبیدا (بنچینەی جۆرەکان) داروین خۆی لە قەرەی لایەنی کۆمەڵایەتی نەداوە، بەڵام لە دووەم کتێبدا (بنچینەی مرۆڤ)باسی کردووە، داروین پەیدابوونی ڕەوشتەکان بە دوو بنەمای تەواوکەری یەکتر تەفسیر دەکات: ((کێبڕکێکردن لەپێناو مانەوەدا)) و ((مانەوە بۆ باشترینە))، واتا(ڕەوشتی مرۆڤایەتی، پاشان دانتان بەخوایەتی و ئایین) پەرمیانسەندووە، پاشان بەوجۆرە جێگیر بووە کە بەرژەوەندی و باڵادەستی بۆ مرۆڤ بەدیبێنێت.

بە دەستپێکردن بەم دوو بنەمایە، (داروین و موریدەکانی) دانیان بەسەرکەوتنی ڕەگەزە بەرزەکان(قەوقازی)داناوە بەسەر ڕەگەزە نزمترەکان(تورکی)! پاشان پڕوپاگەندەی باڵادەستی ڕەگەزی ئاری Eugenics،سەرەڕای ئەوەی ئەم ڕەگەزپەرستییە ڤێزەونە بە یەکێك لە گەورەترین درۆکانی زانستی کۆمەڵناسی دادەنرێت، بەڵام بۆتەهۆی پەیدابوونی دوو لە خراپترین و پڕخەرجیترین سیستەمە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان لە مێژوودا؛ ئەوانیش شیوعیەت(لە یەکێتی سۆڤیەت)و نازیەت لە (ئەڵمانیا).

ئایا هەر بەڕاستی میکانیزمێکی ئاوا پڕ ململانێ و دەمارگیری سەرچاوەی چەمکە ڕەوشتی و خودایی و ئایینییەکانمانە؟!

سەبارەت بە ئەلفرێد والاسی(هاوتای داروین)ئەوا تێڕوانینەکەی داروینی ڕەتکردۆتەوە، لە ساڵی ١٨٦٤ز نووسیەتی و دەپرسێت:

---

(١) سەرەڕای ئەوەی داروینیزمی کۆمەڵایەتی ناوەکەی لە داروینەوە وەرگیراوە، بەڵام بیرۆکەکانی زیاتر نووسینەکانی پێش داروینن و لە نووسینەکانی زۆر توێژەری تر وەرگیراون، وەك هێربێرت سپینسەر و تۆماس مالتۆس و فرانسیس گالتۆن.

((چۆن هەڵبژاردنی سروشتی چەمکە ڕەوشتییە باشەکانی وەك لۆژیك و خۆرمنجاندن (الإیثار)ی بەدیهێناوە؟!))

والاس وایدادەنێت کە دوو بنەماکەی (کێبڕکێ لەپێناو مانەوەدا) و (مانەوە بۆ باشترینە) بۆتە هۆی سەرکەوتنی مرۆڤی نوێ بەسەر مرۆڤی کۆنی سەرەتاییدا، کە بەهۆی دوژمنداریتی باپیرەکانمان لەناوچوون، واتا مانەوەی یەکەمەکە لەسەر حیسابی لەناوچوونی دووەمینە، بۆیە ئەم دەرەنجامە لەگەڵ دامەزراوە ڕەوشتییەکەنماندا نایەتەوە، ئەمە واتای ئەوەیە کە ڕەوشتی ئێمە سەرچاوەیەکی تری هەیە جیاواز لە(ململانێ)، والاس وایدادەنێت کە ئەو سەرچاوە جگە لە خودای بەدیهێنەر شتێکی تر نییە، کە عەقڵی مرۆڤی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەدیهێناوە.

## بایۆلۆجیای کۆمەڵایەتی sociobiology :

دوای ئەوەی کە واتسۆن و کریك گەیشتنە بونیادی بەشی (DNA) و شێوازی ئەنجامدانی فرمانەکانی بە گرنگیدان بە کاریگەرییەکانی ئەم دۆزینەوە دەستیان بە کارەکانیان کرد.

ئێدوارد ویلسۆن، کە بە (باوکی بایۆلۆجیای کۆمەڵایەتی) دادەندرێت، لە ساڵی ١٩٧٥ز کتێبەکەی (بایۆلۆجیای کۆمەڵایەتی)[1]ی بڵاوکردەوە، کە تیایدا پەیڕەوی لەو بۆچوونە کردووە کە ڕەوشت(خۆگونجاندنێکی بایۆلۆجی پەرەسەندووە) و تەنیا (خەیاڵاتێکە) کە جیناتمان بۆمانی وێنا کردووە بۆ ئەوەی کرداری زۆربوون ڕێکبخات کە خزمەت بە مانەوەمان دەکات. کتێبەکە هێرشێکی توندی کرایەسەر، بەو پێیەی کە هەندێك کەس وایان هەژمارکرد کە بیانو بۆ دەستدرێژی سێکسی دێنێتەوەو ڕەواج بە جیاوازی ڕەگەزی (نێر بەسەر

---

(١) Sociobiology The New Synthesis

مێدا) دەدات و چەند ڕەوشتێکی خراپی تریش، لە کۆتاییدا ئەم کتێبە بانگەشە بۆ نەهێشتنی بەرپرسیارییەتی تاك دەکات و بنچینەکانی لێپێچینەوە لەگەڵ مرۆڤدا لەسەر هەڵەکانی هەڵدەوەشێنێتەوە، بەڕاستی ئەوانە ڕەوشتگەلێکی سەرسوڕهێنەری لاوازن، کە جیناتمان بەهۆیانەوە فێڵمان لێدەکەن، ریچار دۆوکنز پەیڕەوی لەم چەمکە دەکات لە کتێبی (جینە خۆپەرستەکە)[1] دەیگەیەنێتە لوتکە.

## زانستی دەروونناسی پەرەسەندن Evolutionary Psychology

لەگەڵ پێشکەوتنی زانستی بایۆلۆجیای بەشی (جینات) و زانستی (دەروونناسی پەرەسەندن) ئاوێتەبوونیان بە چەمکەکانی پەرەسەندنی داروینی، زانستی دەروونناسی پەرەسەندن دەرکەوت، کە پەیڕەوی لە زۆربەی چەمکە داروینییە کۆمەڵایەتییەکان و بایۆلۆجیای کۆمەڵایەتی دەکرد.

لێکدانەوەی دەرکەوتنی ئایینەکان، بریتییە لە تەحەددا گەورەکەی زانستی دەروونناسی پەرەسەندن، چونکە زۆر گریمانەی لێکچوی بۆ لێکدانەوەی دەرکەوتنی ئایینەکان خستۆتەڕو[2]، هەموویان باس لەوە دەکەن کە ئایینەکان(کۆمەڵە

---

(١) بۆچوونەکانی دۆوکنزمان دەربارەی ژیان لە تەوەری پێنجەمدا خستەڕو و، لە تەوەری دەیەمدا قسەی زیاتری لەسەر دەکەین.

(٢) فرۆید بە بەناوبانگترین ئەو کەسانە دادەنرێت، کەخۆیان لەقەرەی پەیدابوونی ئایینەکان داوە و بە خەیاڵگەلێك هەژماری کردوون کە ئامانج لێی ئامانجێکە Wish Fulfillment.

ڕۆدنی ستارك Rodney Stark پەیدابوونی ئاینەکان بەدەرئەنجامێکی لۆژیکی بۆ خەون بینینی مرۆڤ بە ژیانێکی باش و نەمر هەژمار دەکات، هەروەها پاسکاڵ بۆیار Pascal Boyar وایدەبینێت کە خەیاڵە ئاینییەکان (لێکەوتەکان = کاریگەرە لاوەکییەکان) دەرئەنجامی پەرەسەندنی مێشکمانن بۆ ئەم شێوەیەی ئێستا، تا وای لێهاتووە کە خەون بە جیهانی غەیبەوە دەبینێت کە تیایدا بەختەوەری هەمیشەیی بەدەستبێنێت. هەرچی(سکۆت ئاتران Scott Atran)ن وایدەبینێت کە ئاین بارگرانییەکە کە سودی کۆمەڵایەتی هەیە، هەروەها(ستیڤن پینکەر Steven Pinker) وایدەبینێت کە ئاین خۆگونجاندنە لەپێناو مانەوەدا. خوێنەری بەڕێز، من هیچ جیاوازییەکی بەرچاو لەنێوان ئەو گریمانەدا بەدی ناکەم!

خەیاڵێکی خۆگونجێنی خاوەن فەرمانن)، کە یارمەتی مرۆڤ دەدەن لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو پاڵەپەستۆو هەڕەشانەی لەم جیهانە پڕ لەخراپەو کۆژان و دڵەڕاوکێیەو دواجار مەرگ و مردن دووچاریان دەبێتەوە، لە هەمان کاتدا یارمەتی ڕێکخستنی کۆمەڵگا دەدات، لەبەرئەوە مرۆڤ هەڵسا بە داهێنانی (ئەو باوکەی لە ئاسماندایە) تا بەو هێزو زانیاری و خۆشەویستی و چاودێرییەی هەیەتی پاڵپشتی بکات، دیڤید و ویلسۆن زۆربەی ئەو گریمانانەی کە لەو بارەیەوە هەن لەوەدا کۆیکردوونەتەوە کە بە (لێکدانەوە بۆ فەرمانەکانی ئایین functional interpretation of religion ) ناسراوە.

## لێکدانەوە ماددیگەرایيەکان لە تەرازوودا

گومان لەوەدا نییە کە هەموو ئەو لێکدانەوانەی ماددیگەراکان بۆ لێکدانەوەی سەرچاوەی خوایەتی و ئایین و ڕەوشت خستویانەتەرو، زیاتر ڕەتکردنەوەی چەمکە غەیبییەکانی لەپشتەوەیە، نەك دیدێکی زانستی یان نیمچە زانستی لەدواوە بێت،(لە ڕاستیدا هەڵە ئابڕوبەرەکە) کە ماددیگەراکان تێیکەوتوون، بریتییە لە وێناکردنی بوونی سوود لە پشت بیرۆکەی خودا و ئایینەوە، واتە مرۆڤ بیرۆکەی خوداو ئایینی داهێناوە بۆ بەدیهێنانی ئەم سوودانە، پاشان وای بۆ دەچن کە ئەگەربوونی ئەم سودانە بسەلمێنن، ئەوا ئەومیان سەلماندووە کە خوایەتی و ئایین داهێنراوی مرۆڤن! وەك ئەوە وایە بڵێن ئەو شتانەی خودا بەدیهێناون پێویست ناکات سودێکیان هەبێت!!

سەرنجی ئەو نموونەیە بدە کە گاڵتەجاڕی دیدی ماددیگەرایی دەسەلمێنێت، ئەگەر تەزووی کارەبای ئەو شوێنەبچڕا کە بەشەو پێیدا دەڕۆیشتی، پاشان زانیت کە مۆبایلت پێیە و بۆ ڕووناککردنەوەی ڕێگاکە بەکارتهێنا، ئەوا ئەو بیرۆکەیە سودبەخش بوو، ئایا ئەمە وا دەریدەخات کە ئەم مۆبایلە تەنیا خەیاڵێکەو تۆ لەبەر

پێویستیت بە ڕووناکی لە خەیاڵتدا داتتاشیوە؟! یاخود بوونێکی ڕاستەقینەی هەیە، لە ڕاستیدا بوونی سود بوونی شتەکە رەتناکاتەوە، بەڵکو پشتڕاستی دەکاتەوە.

## پرسە ڕەوشتییەکە (خۆپەرستی، قوربانی، ویژدان)(١)

ئەو کاتەی شتێك چێژو بەختەوەریمان بۆ دێنێت ئەوا ئارەزوی دەکەین و وامان لێدەکات کە بەدوایدا بگەڕێین، کاتێکیش کە ئازارمان دەدات لە بەرامبەریاندا هەست بە رقێك دەکەین و وامان لێدەکات کە لێی رابکەین، ئەم پاڵنەرانەش بە(مەیلە خۆپەرستەکان) ناسراون و دروشمەکەی بریتییە لەوەی(هەموو شتێك بۆخۆمە با لەسەر حیسابی کەسانی تریش بێت).

هەندێك کەس هەن هەستێکی ناسکیان هەیە و لە بەرامبەر ئازاری کەسانی تردا ئەوانیش هەست بە ئازار دەکەن و بەخۆشی کەسانیتریش دڵخۆش دەبن، هەروەها هەوڵ بۆ سوککردنی ئازارەکانی کەسانی ترو بەختەوەرکردنیان دەدەن، ئەوەش بە(هاوبەشیکردنی ویژدانی) ناسراوە، ئەگەر پرسەکە بگاتە قوربانیدان ئەوا ئەوەیان دەبێتە نکوڵیکردن لە خود و پێ لەسەر دەروون دانان، ئەوانەش دروشمەکەیان بریتییە لە: (هەموو شتێك بۆ کەسانی ترە ئەگەر لە سەر حیسابی خۆشم بێت).

کاتێك کە دەگەینە تەمەنێکی پێگەیشتنەوە (ویژدان)ێکمان بۆ پەیدا دەبێت، کە دەبێتە هۆی هەستکردن بەوەی پێویستە کارێك ئەنجام بدەین و کارێکی تر پشتگوێ بخەین، ئەگەر ئەوەی لەسەرمان پێویستە کردمان یان وازمان لێهێنا، ئەوا رەزامەندی ڕەوشتی بەدەستدێنین، ئەگەر لە بەرامبەریشیدا کەمتەرخەم

---

(١) لە کتێبی(کێشەی رەوشت و فەیلەسوفەکان) دانراوی ئاندرێ کریستۆف.

بین ئەوا هەست بە ئازاری کپکردنەوەی ویژدان دەکەین و لە پاشان (وەحی و ویژدان)دەبنە سەرچاوەی سێیەمی بەختەوەری و بەدبەختی، درووشمی ئەو کۆمەڵەیەش بریتییە لە (رازیکردنی ویژدان لە هەموو شتێك گرنگترە). مرۆڤی هاوسەنگ هەرسێ پاڵنەرە ڕەوشتەکان کاریگەری لەسەر دادەنێن و کۆنترۆڵی دەکەن،(خۆپەرستی، قوربانی، ویژدان)، ئەو پاڵنەرانەش بنچینەیەك نیشان دەدەن کە لەلای فەیلەسوفەکان بە(پرسی ڕەوشتی)ناسراوە، کە لەوەدا کورتدەبێتەوە: ئێمە ویستی جیاوازمان تێدا دروست دەبێت، لە بەرامبەریاندا چۆنبین؟ ئایا شوێنی ویستی خۆپەرستی بکەوین یاخود وەڵامی سۆز و بەزەیی و قوربانیدان بدەینەوە؟ یان هەوڵ بۆ دڵنیایی ویژدان بدەین؟

ئایینەکان بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانە دێن تا پەیوەندی نێوان ئەو پاڵنەرانە ڕێکبخەن کە خودا لە فیترەتی مرۆڤدا داینانون؛ هانمان دەدەن بۆ کردەوە باشەکان و قەدەغەمان دەکەن لە کردەوە خراپەکان، ئایین بۆ بڕیاردان بەسەر هەر شتێکدا لەبارەی چاکی و خراپی دەیخاتە بەردەم پێوانەی ڕەهاوە کە خودا دیاریدەکات.

لە بەرامبەردا دیدی بێباوەڕی وایدەبینێت کە ئەو پاڵنەرانە لەلایەن پەرەسەندنی بایۆلۆجییەوە هاتونەتەبوون نەوەك لە لایەن خوداوە، ئامانجی پەرەسەندنیش لەوەدا بریتییە لە بەدیهێنانی سود کە خزمەت بە زۆربوونی بوونەوەرو مانەوەی دەکات و ئیتر ڕەوشت دەبێتە شتێکی ڕێژەیی، کە لە چوارچێوەی (گرنگ گەیشتنە بە ئامانج جا بە هەر هۆکارێك بێت) دێتە ئاراوە، ئەگەر پەیدابوونی پاڵنەری(خۆپەرستی) بەم میکانیزمە کارێکی ئاسان بێت، ئەوا تەفسیرکردنی پاڵنەری (ویژدان) بەم میکانیزمە کارێکی ئەستەمە، هەرچی پاڵنەری قەربانیدانە ئەوا دەبێتە بەربەستێکی بەردەوام لەبەردەم پەرەسەندنی داروینیدا.

## پەیدابوونی پاڵنەرە ڕەوشتییەکان لەلای داروینییەکان:

داروین وایدەبینێت کە ئەو ئاژەڵانەی (هەستی کۆمەڵایەتییان هەیە) لەوانەش مرۆڤ، کە دەگەنە ئاستێکی دیاریکراوی زیرەکی (پاڵنەرە ڕەوشتییەکان) پەیدا دەکات، کە یارمەتی دەدات بۆ ژیان لە بارودۆخە کۆمەڵایەتی باودا - واتا بارودۆخە کۆمەڵایەتییەکان ڕەوشت بەدیدێنن، پێچەوانەی دیدی ئایینی کە وایدەبینێت ڕەوشت هۆکاری ئاراستەکردنی ژیانمانەو پاشان بارودۆخە کۆمەڵایەتییەکانمان دێنێتە بوون، داروین بۆچوونەکەی بە نموونەیەك ڕووندەکاتەوە.

ئەگەر مرۆڤێك لەو بارودۆخەدا گەورە ببێت کە کۆمەڵی هەنگ تیایدا گەورە دەبێت(ئەو کۆمەڵەیەی کە کوشتنی برا نێرینەکانی هەنگی بە ئەرکێکی پیرۆز دەزانێت بۆ خزمەتکردنی خانەی هەنگ، هەروەك چۆن ئەو دایکەی کچەکانی کە توانای هێلکەکردنیان هەیە بەبێ هەستکردن بە تاوان دەکوژێت) ئەوا مرۆڤیش هەمان ئەو چەمك و ڕەفتارانە پەیڕەو دەکات.

داروین نموونەی واقیعمان لە ژیانی مرۆڤ بۆ دەخاتەڕوو، وایدەبینێت کە خزمەتی بیرۆکەکەی دەکات، دەڵێت: یەکێك لە خراپترین ڕاستییەکانی داروینیزمی کۆمەڵایەتی ئەوەیە کە هیندییە سوورەکان هاوڕێ بێهێزەکان لە چۆڵەوانیدا جێدەهێڵن بۆ ئەوەی بمرن، بە هەمان شێوە هۆزەکانی فیگیانس Feegians کە دایك و باوکە بەساڵاچو و نەخۆشەکانیان بە زیندوویی دەنێژن لەپێناو پارێزگاریکردن لە بەرهەمە کەمەکانی سروشت بۆ تاکە تەندروست و بەهێز و سودبەخشەکان بۆ کۆمەڵگا، کە ئەمە لەگەڵ چەمکی هەڵبژاردنی سروشتی یەکانگیرە.

## داروینیزم و ڕەوشتە سۆزدارییەکان :

پاشان داروین هەست بە جیاوازییەکی وا دەکات کە هیچ لێکدانەوەیەکی بۆ شك نابات،کە ئەمە بەس بوو بۆ ئەوەی تێگەیشتنەکەی بگۆڕێت، داروین دەڵێت: لەگەڵ پێشکەوتنی ژیارستانییەتدا، (سۆزداری Sympathy) بۆتە بەرزترین ئەو سیفەتەی کە لە سروشتی مرۆڤایەتیماندا هەیە، زۆرینەی زۆری مرۆڤەکان ئەوپەڕی توانای خۆیان دەخەنەڕوو بۆ چاودێریکردنی دایك و باوکە بەساڵاچو و نەخۆش و بێهێزەکانیان، ئەگەر ئەمە ببێتە هۆی سامانە کەمەکەشیان و تەنانەت ژیانیشیان، تەنانەت خەڵك نەخۆشخانەی تایبەت و یاسا بۆ پاراستنی ئەو کەسانەی دەیانناسن و نایانناسن دادەڕێژن. ئەو سۆزدارییە بۆ ئاستی ماڵیکردنی ئاژەڵەکانیش درێژبۆتەوە، سەرەڕای ئەو مەترسییەی لەسەر ڕەگەزی مرۆڤایەتی هەیەتی.

داروین لە تەفسیرکردنی پەیدابوونی ڕەوشتە سۆزدارییەکان (هەستکردن پاشان کردار) هەوڵێکی زۆر خەرج دەکات. گریمانەی ئەوە دەکات کە ئەمە لەپێناو سوککردنی هەستکردنمان بووە بە دڵتەنگی و ئازار لە کاتی بینینی ناخۆشی و کۆژانەکانی کەسانی تردا، هەرچەند مرۆڤ لە ڕووی ژیارستانییەتەوە زیاتر پێش بکەوێت سۆزداری فراوانتر دەبێت و درێژتر دەبێتەوە بۆ ئەوانەی دەیانناسین و ئەوانەش کە نایانناسین لە تاکەکانی کۆمەڵگادا، ڕێگا لە بەربەستی خۆپەرستی دەگرێت لەوەی کە دەستی سۆزداری بۆ کۆمەڵگاکانی تر درێژ بکات، دەکرێ مرۆڤ ئەو بەربەستەش ببڕێت بۆ ئەوەی سۆزدارییەکەی هەموو مرۆڤایەتی بگرێتەوە، پاشان هەموو ئاژەڵەکان و تەنانەت هەموو بونەوەریش بگرێتەوە.لێرەدا لە داروین دەپرسین؛ بۆچی مرۆڤ بەرامبەر بە کۆژانەکانی کەسانی تر هەست بە دڵتەنگی و ئازار دەکات؟ ئایا ئەو پاڵنەرەی پەرەسەندن چییە کەوا لە مرۆڤ دەکات دەستی سۆزداری بۆ ئەو کەسانەش درێژ بکات کە نایانناسێت، تەنانەت بۆ ئاژەڵانیش؟ ئایا ئەمە لەگەڵ هەڵبژاردنی سروشتی تێکناگیرێت؟

داروین دان بەوەدا دەنێت کە چاودێریکردن و سۆزداری مرۆڤ بۆ مرۆڤە نەخۆشەکان، بۆ کەسانی غەریبە و تەنانەت ئاژەڵانیش، بێگومان ئەوە هەڕەشەیە بۆ سەر ڕەگەزی مرۆڤایەتی، چونکە ڕێگری لە هەڵبژاردنی سروشتی و مانەوەی باشترین دەدات. هەروەها داروین بەدوای تاکە بیانوویەکدا دەگەڕێت بۆ بەیەکەوە بەستنەوەی هێزەکان لەنێوان بڵاوبوونەوەی سۆزداری (لەڕووی قووڵی و بەربڵاویدا) و لە نێوان ژیارستانییەتەکان دەڵێت: کاتێك دوو کۆمەڵگا کێبڕکێ دەکەن، ئەوا ئەو کۆمەڵگایەی سۆزداری زیاترە توانای پێکهێنانی لەشکرێکی تۆکمەتری دەبێت، بەمەش دەتوانێت شکست بە کۆمەڵگاکەی تر بهێنێت، ئا بەم جۆرە ڕەوشتی سۆزداری بۆتە باو و لە جیهاندا بڵاوبۆتەوە[1]!

ئەم خستنەڕووە لەگەڵ خستنەڕوونێکی تر کە هەر داروین خۆی پێشکەشی کردووە تێکدەگیرێت، بەو پێیەی وای دەبینێت کە دڕندەکان دەسەڵات وەردەگرن و لەماوەی چەند سەدەیەکدا مرۆڤی سۆزداری ژیارستانی لەناودەبەن، چونکە ئەوان دڕندەترو بەهێزترن، بەتواناترن بۆ لەناوبردنی مرۆڤە ژیارستانییە خۆشگوزەرانەکان[2].

ئەگەر سۆزداری بەو ئەندازەیە زیانی هەبێت ئەی بۆچی پەیدا بووە؟ ئەی بۆچی مرۆڤ پەیڕەوی لێکردووە؟ کەسێك کە لەسەر ئەو بابەتە چاودێری داروینی کردبێت، دەبینێت کە لە نێوان ماددیگەرایی پەرەسەندن و ویستیپارێزگاریکردن لەوەی کە بە بەرزترین و بەڕێزترین شتە کە لە سروشتی مرۆڤیماندا بوونی هەیە دوو دڵەو لەمیان بۆ ئەویان هاتوچۆ دەکات، نازانم بۆچی داروین سۆزداری بە بەرزترین و بەڕێزترین سیفەتی ئێمە هەژمارکردووە؟ ئەدی سۆزداری هەروەك ڕەنگی چاومان و دەربڕینی هەستەکانمان نییە، هەروەك لایەنگرانی پەرەسەندن باسی دەکەن؟!

---

(١) Descent of man. Princeton. university press.1.81. p. 162-163

(٢) .escent of man. Princeton. university press.1.81.p. 20

## مرۆڤێکی بەرێز سەرەڕای قسەی داروینییەکان :

گەر لێکۆڵینەوەکانی داروین جێبهێڵین و سەدە و نیوێك بڕۆینە پێشەوە، دەبینین کە لێکۆڵینەوە نوێیەکان بەرەکەیان لەژێر پێی داروینییەکان دەرهێنا. چونکە سەلمێنرا مرۆڤ پەیڕەوی لەپێناو (کێبڕکێ لەپێناو مانەوەدا) ناکات. بەڵکو بەپلەی یەکەم هەوڵدەدات لە بارودۆخە هەرە سەختەکانیشدا دەست بە پاڵنەرە ڕەوشتییەکانییەوە بگرێت، دەکرێ بەهێزترین لێکۆڵینەوە کە لەو بارەیەوە ئەنجامدراوە، ئەوە بێت کە (ساموێل مارشاڵ) مێژونووسی فەرمی لەشکری ئەمریکی[1]، ئەنجامیداوە کە دەریخستووە لە هەر چوار سەربازێکی ئەمریکی سێیانیان(٧٥٪) ڕاستەوخۆ گوللەیان بەرەوڕووی دوژمنەکیان نەتەقاندووە، هەتا ئەگەر لە مەترسیشدا بووبن، بەڵکو پاڵنەرە ڕەوشتییەکەیان کە کوشتن ڕەتدەکاتەوە و وایلێکردوون دوودڵ بن. ئەم ڕێژەیەش بە (ڕێژەی مارشاڵ بۆ گوللە تەقاندن لە جەنگەکان دا) ناسراوە.

ئەم بەربەستە ڕەوشتییە کێشەیەکی گەورەی بۆ لەشکری ئەمریکی دروستکردووە، بۆیە بەرپرسەکان شێوازی ڕاهێنانیان سەبارەت بە گوللە تەقاندن لەشەڕەکاندا گۆڕیوە، کردوویانەتە کارێکی هەڕەمەکی لەو کاتەی سەرباز دەکەوێتە مەترسییەوە، هەروەك چۆن کارەکە پێویستی بە ئامادەکردنی سەربازەکان هەبووە لەڕووی دەروونییەوە لەپێناو هاندانیان بۆ کوشتن. بەمەش ئەم ڕێژەیە لە جەنگی کۆریا و ڤێتنامدا کەم بۆتەوە لە جەنگی عێراقدا گەیشتە (١٠٪)!

سبحان الله؛ بنچینە لە مرۆڤدا بریتییە لە پەیڕەویکردن لە ڕەوشت نەوەك کێبڕکێ و ململانێ لەپێناو مانەوەدا وەك داروین دەڵێت، تەنانەت ئەگەر لە ناخۆشترین ساتی ڕووبەڕووبونەوەشدا بێت.

---

(١) Samuel lyman at wood marshal (١٩٠٠-١٩٧٧): مێژونووسی فەرمی لەشکری ئەمریکی لەمیانی جەنگی جیهانی دووەم و جەنگەکانی دواتر: زیاتر لە ٣٠ کتێبی دەربارەی ڕەفتاری سەربازەکان لەکاتی جەنگدا نوسیوە، بەناوبانگترینیان (men against fayer).

## داروینییەکان و قوربانیدان :

ئەگەر داروینییەکان لە پێشکەشکردنی تەفسیرێك بۆ دەرکەوتنی سۆزداری لەنێو مرۆڤەکاندا بێ توانابووبن، ئەوا گومان لەوەدا نییە کە تەفسیرکردنی پەیدابونی ڕەوشتی (قوربانیدان Altruism) کارێکی قورستر دەبێت، چونکە ئەمە ڕێك پێچەوانەی ئامانجە سەرەکیەکەی پەرەسەندنە، کە بریتییە لەپارێزگاریکردن و مانەوەی جۆرەکە.

لەسەر ئاستی تاکەکەسیدا چی وام لێدەکات کە گیانی خۆم بکەمە قوربانی لە پێناو کۆمەڵگا و ڕەگەزی مرۆڤایەتیدا؟ چی وا لە جینە خۆپەرستەکەم[١] دەکات کە خۆی بکاتە قوربانی؟

چی وا لە جینەکانی خرۆکە سپییەکانی خوێن دەکات خۆیان بکەنە قوربانی لەکاتی ململانێیان دژی میکرۆبەکان بۆ دوورخستنەوەی نەخۆشی لە جەستە؟!

لەسەر ئاستێکی باڵاتر چی وا لە کۆمەڵگا دەکات کە هەموو داهات و توانای تاکەکانی بکاتە قوربانی لە پێناو چاودێریکردنی کەسە بێهێزو نەخۆش و کەمئەندام و بەساڵاچووەکان؟

ئایا ئەوە دژی بنچینەی(مانەوە بۆ باشترینە) نییە؟ ئایا ئەمە هەل نارەخسێنێت بۆ مانەوەی شتێك کە ئاستی باشیەکەی کەمترە؟!

داروینییەکان گریمانەی ئەوە دەکەن، کە ئێمە ئەو کارە لە پێناو ئەوەدا دەکەین تا کاتێك ئێمەش نەخۆش کەوتین یاخود پیربووین هەمان کارمان بەرامبەر بکرێتەوە، سەرەرای ئەوەی کە ئەم لێکدانەوەیەش لەدیدی داروینیزمدا رەتکراوەیە، چونکە پەرەسەندن دیدگایەکی ئایندەیی نییە، پاشان پەیڕەوێکی ڕەوشتیمان

---

(١) ئەم وەسفە ئاماژەیە بۆ کتێبی جینە خۆپەرستەکە(selfish gene)ی نووسینی گەورەی بێباوەڕەکان (ریچارد دۆوکنز)ە.

بەسەردا ناسەپێنێت لە بەرامبەر کەسە بێهێزەکانماندا، بۆ ئەوەی دواتر کەسانی تریش یارمەتیمان بدەن، لە ڕاستیدا پەرەسەندن ئەو پەندە کوردییە نازانێت کە دەڵێت: (چی بچێنی ئەوە دەدوورییەوە).

لە وتارێکدا کە (هێلبێرت سیمۆن)[1] نوسیویەتی و لە لایەن داروینییەکانەوە پێشوازییەکی گەرمی لێکرا، دەڵێت: زانستی دەروونناسی پەرەسەندن پێمان دەڵێت کە مرۆڤ بەجۆرێك ڕێدەکات کە (شیاوی باشی) لە هەموو بوارەکاندا زیاد دەکات، گرنگترین بریتییە لە پارێزگاریکردن لە جینەکانی و گواستنەوەیان بۆ نەوەکانی دواتر. ئەگەر ڕەفتاری قوربانیدان لەگەڵ بەرژەوەندی مرۆڤدا تێکبگیرێت، ئەوا پەیدابوونی ئەم ڕەفتارە دەگەڕێتەوە بۆ دوو میکانزم کە لەگەڵ یەکتردا کار دەکەن، نەرمی و ئاسانی Docedity و، سنوورداریتی عەقڵی bounded rationality، چونکە کەسی نەرم و نیان، بەدەنگ داواکاری کەسانی ترەوە دەچێت، جیاوازی ناکات لەنێوان ئەوەی شیاویتی و باشی زیاد دەبێت یان کەم دەبێتەوە! خۆ ئەگەر ئەو کەسانە بە ئەندازەی پێویست زیرەك بوونایە ئەوا ئەو ڕەفتارەیان پەیڕەو نەدەکرد.

لێرەدا سیمۆن ڕەوشتی قوربانیدان دەگێڕێتەوە بۆ ڕەفتاری تاکەکان، پێچەوانەی ئەوەی کە پەرەسەندنی داروینی گریمانەی دەکات، بۆیە لەپێناو لەناوچووندا کێبڕکێ دەکەن نەوەك لەپێناو مانەوەدا! لێکدانەوەکەشی بۆ ئەو ڕەفتارە ئەوەیە کە دەڵێت: ئەوان گێلن نەوەك کەسایەتییان لاواز بێت، گومان لەوەدا نییە کە ئەم خستنەڕووە سیمۆنییە بەتەواوەتی لەگەڵ حەقیقەتدا تێکدەگیرێت، چونکە ئەوانەی کە خۆیان دەکەنە قوربانی کەسانی تر بەزۆری کەسانی خاوەن کەسایەتی بەهێزو زیرەکن.

بەڕاستی ئەمە خستنەڕوێکی شکستخواردووە، لە هەموو ئەو شتانەی کە ئێمە بە چاوەکانی خۆمان دەیانبینین بێناگایە، ڕەوشت و کردەوە بەرزەکان

---

(١) Herbert simon خاوەنی خەڵاتی نۆبڵ لە ئابووریدا، دواتر بوو بە مامۆستای کۆمپیوتەر و دەروونناسی لە زانکۆی(پترسبێرگ) وتارەکەی بە ناونیشانی (A mechanism of social selection of altruistic behavior)ە.

دەگۆڕێت بۆ کەم و کورتی و بەگێلانە وەسفیان دەکات، هەموو ئەوانەش تەنیا لەپێناو سەلماندنی بیرۆکەیەکی پێشوەخت.

دۆوکنز ئەم بۆچوونە سیمۆنییە ریزبەرە بۆ پەیدابوونی ڕەوشتی قوربانیدان دەگێڕێتەوە - لەژێر ڕۆشنایی تێگەیشتنی خۆی بۆ جینی خۆپەرست - تەفسیرێك کە نازانێت دەرەنجامەکانی بەسەر هەڵوێستە بێباوەڕەکەیەوە چی دەبن؟

دۆوکنز دەڵێت: (سەرەڕای ئەوەی کە مرۆڤ هیچ نییە جگە لە جینەکانی، ئەوا دەتوانێت بە ڕێگەیەکی تر کودەتای بەسەردا بکات و بەکارێکی پێچەوانەی ویستی هەڵبستێت، چونکە سەرەڕای ئەوەی کە ئێمە ئامێری جینین، بەڵام توانای ئەوەمان هەیە کودەتای بەسەردا بکەین، تەنیا مرۆڤ توانای ئەوەی هەیە کە کودەتا بەسەر سیستەمی ستەمکارانەی جینەکانیدا بکات[1]).

بەڵام چۆن کودەتا بەسەر جینەکانماندا بکەین؟! ئەی حەتمییەتی جینی چی بەسەر دێت؟

ئێمە ئازادی ویست و توانامان بەسەر هەڵگەڕانەوە لە کوێ بوو؟!

دۆوکنز وەڵاممان ناداتەوە، چونکە ئەگەر وەڵام بداتەوە، ئەوا ناچار دەبێت هاوشێوەی باوەڕداران دان بە ئازادی ویست و باوەڕبوون بە خودا دابنێت.

---

(١) the selfish gene. Oxford press.1976.p.215

## ڕەوشتێکی بێ ڕەوشت :

بینیمان کە چۆن داروین ڕەوشت بە دەرئەنجامی هەڵبژاردنی سروشتی لە بواری ڕەفتاردا هەژمار دەکات، هاوشێوەی هەر سیفەتێکی بایۆلۆجی تر؛ وەك دەنووکی باڵندە، ئایا دەکرێ دەنوکی باڵندە بەوە وەسف بکەین کە چاکە یان خراپ، کە خێرە یان شەڕ؟ تەنیا ئەوەیە کە سودی هەیە بۆ ئەنجامدانی فەرمانەکان، ئەمەش بەدیاریکراوی بۆ ئەم باڵندەیەو لە بارودۆخ و ماوەیەکی دیاریکراودا، لەبەر ئەوە بەکارهێنانی دەستەواژەی چاك یان خراپ لە لایەنی سودی مادییە نەوەك لە لایەنی بەها ڕەوشتییەکان، واتا ڕەوشتێکی باش یان خراپ بوونی نییە، بەڵکو ڕەفتارگەلێك و چەمکانێك بوونیان هەیە کە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ یارمەتی ململانێ دەدەن لەپێناو مانەوەدا.

لەکاتی قسەکردن دەربارەی کاریگەرییە لاوەکییەکانی چەمکی پەرەسەندن، بەر لە کۆتایی هاتنی کتێبەکەی (بنچینەی مرۆڤ) داروین دەڵێت: لە ڕاستیدا مرۆڤ هاوشێوەی ئاژەڵانی تر لەڕێی زۆربوونەوە گەیشتۆتە ئەو بوونەی ئێستای، لە کاتی کێبڕکێکردنیشی لەپێناومانەوەدا هەڵبژاردنی سروشتی ڕۆڵی خۆی گێڕاوە، ئەگەر ئەوە نەبوایە پیاوانی بەتوانا و لەوان کەم تواناتر یەکسان دەبوون بەوەش مرۆڤایەتی زۆر لاواز دەبوو.

لەبەر ئەوە پێویستە ئەم کێبڕکێیە بە کراوەیی لەنێوان پیاواندا جێبهێڵدرێت، پێویست بەوە ناکات کە پیاوە بەهێزترەکان بەپێی کەلتورو یاسا زۆرترین وەچە بخەنەوە[1].

لەم تێگەیشتنە بەهایەکی ڕەوشتیمان دەستدەکەوێت، ئەویش بریتیە لەوەی (کە پیاوی باشتر) پێویستە هەلی زیاتری بۆ زۆربوون پێبدرێت، بەمەش

---

(1) descent of man. Princeton. university press.1981. p.409

قەدەغەکردنی داوێنپیسی و هاندانی هاوسەرگیری دەبێتە مەترسی بۆ سەر مرۆڤایەتی، چونکە ڕێگری لە زۆربوونی کەسانی باشتر دەکات، واتا ئەوەی کە لە دیدی ئایینی و مرۆڤایەتی و ڕەوشتییەوە باشترە لە دیدی داروینیزمدا خراپترە، بەم شێوەیە پێویستە داروین بە فێڵکردن لە مرۆڤایەتی تاوانبار بکرێت! چونکە خۆی زۆر بۆ هاوسەرەکەی (بیما Bema) دڵسۆز بوو!.

ئەم هەڵوێستە بایۆلۆجییە بەریەککەوتنێک دروست دەکات لەنێوان(ڕەوشتی داوێنپاکی) کە ئێمە بە بەهایەکی بەرز سەیری دەکەین لەگەڵ ئەوەی سروشت لە بەرژەوەندی خۆی و بەرژەوەندی مرۆڤایەتی هەژماری دەکات، کە بریتییە لە (داوێنپیسی)، تۆ بڵێی کام لەم دوو ڕەوشتە ڕەوشتێکی باشەو کامیان خراپە؟! بە ماوەیەکی زۆر بەر لەوەی بیردۆزەکەی بخاتەڕوو فەیلەسوفەکان وەڵامی ئەو پرسیارەیان داوەتەوە، بەو پێیەی کە پەیڕەوییان لە دیدی ماددیگەرایی کردووە بۆ ڕەوشتەکان کە هەموو چاکی و پاکییەکەی لەبەر دادەماڵێت. لە سەدەی حەڤدەهەمدا فەیلەسوفی ماددیگەرایی (تۆماس هۆبز)[1] بە ڕوونی گوزارشتی لەو واتایە کردووە، بەو پێیەی کە سروشتی تەنیا بە ماددەیەکی جوڵاو وەسف کردووە، کەواتە باش و خراپی نییە، تەنیا ئەوەیە کە گرنگی بە باشەکە نادات.

لەبەر ئەوە پێویست بەوە ناکات باس لە چاکە و خراپە بکەین وەك دوو چەمکی ڕووت، ڕێك وەك ئەوەی باسی کارلێکی کیمیایی باش یان خراپ ناکەین، ئەمانە پرسگەلێکن کە بەپێی پێویستی ڕوو دەدەن و پاشان چاکە و خراپە هیچ نین جگە لەوەی کە ئارەزووەکانی مرۆڤن لە خۆشەویستی و ڕق و چەمکی ڕێژەیین، ئەگەر مایەپووچبوونی بەرامبەرەکەت بۆ ئەو خراپ بێت ئەوا بۆ تۆ باشترە، پاشان ڕەوشتی مرۆڤ (لەلای ماددیگەرەکان) هیچ نییە جگە لە چەند کارلێکێکی ماددی.

دوای سێ سەدە (نیتچە)ی فەیلەسوفی نازی هەمان بیرۆکەی خستەڕوو و گوتی: ((لە ڕاستیدا گەردوونێك بەبێ بوونی خودا خاڵی دەبێت لە چەمکەکانی

---

(١) Tomas Hobbes: (١٥٨٨-١٦٧٩ز)، فەیلەسوفی بەناوبانگی بەریتانی ماددیگەرایی بوو.

چاکە و خراپە، بەڵکو ئەم چەمکانە بۆچوونی مرۆیین کە خۆمان بەسەر گەردووندا فەرزیان دەکەین، لە کاتێکدا ئەو هیچ گرنگیمان پێنادات)).

ریچارد دۆوکنز پەیرەوی لە بۆچونەکانی هۆبز و نیتچە و داروین دەکات و دەڵێت: لە ڕاستیدا سروشت درندە نییە، بە بەزەیی و دڕندەیان نییە، لەڕاستیدا سروشت گرنگی بە ئازارەکانی مرۆڤ نادات، چونکە سروشت هیچ ئامانجێکی نییە[1].

## ئایا ژینگە گونجاوە وەك سەرچاوەیەك بۆ ڕەوشت؟

لەکاتی قسەکردنی دەربارەی سەرچاوەی ڕەوشت ریچارد دۆوکنز دەڵێت: ((ئێمە بۆ ئەوەی باش بین پێویستمان بە خودا نییە، چونکە جیاوازییەکی گەورە لەنێوان کاردانەوەی بێباوەڕان و دینداراندا بەدی ناکرێت، تەنانەت لەنێوان هەموو مرۆڤایەتیشدا لەهەمبەر هەڵوێستە ڕەوشتییە ئاڵۆزەکاندا)).

چۆن دۆوکنز بیری لەو قسەیە نەکردۆتەوە کە دەڵێت مرۆڤایەتی هەموویان سەرچاوەیەکی هاوبەشیان هەیە بۆ چەمکە ڕەوشتییەکان بۆ چاوپۆشی لە جیاوازی ڕەگەز و ژیارستانییەت و بیروباوەڕیان! ئەو هاوبەشی و لەیەکچوونە جگە لە یەکێك لەم دوو لێکدانەوەیە هیچی تر هەڵناگرێت؛ یان ئەوەتا چەمکە ڕەوشتییەکان فیترین و لە سروشتی مرۆڤایەتیدا چەسپێنراون، یا ئەوەتا پەیامێکی ئاسمانی یەکگرتوو بوونی هەبێت کە بە هەموو گەلانی سەر زەوی گەیشتبێت[2].

ئێمە هەردوو بۆچونەکە پێکەوە پەسند دەکەین(فیترەت و پەیام)، هەروەك چۆن لە سەرەتای تەوەرەکەدا باسمان کرد.

---

(١) river out of eden. New York. basic Book. 1995. P. 95-96

(٢) ﴿..وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ ﴿٢٤﴾﴾ فاطر ٢٤.

واتا: هیچ گەلێك نییە ئاگادارکەرەوەی بۆ رەوانە نەکرابێت.

بەڵام ئایا بێباوەڕە نوێیەکان هیچ کام لەم دوو ڕایە پەسەند دەکەن؟ بێگومان نەخێر.. ئەوان نە ئایین نە فیترەت پەسەند ناکەن و هیچیان لەبەردەمدا نەماوەتەوە جگە لە ژینگە (سروشت و کۆمەڵگا) وەك سەرچاوەیەك بۆ دامەزراوەی یەکگرتوی ڕەوشت، ئا لێرەدا بێباوەڕان دەکەونە ناو هەڤدژییەوە، چونکە دۆوکنز باسی جیهانییەتی ڕەوشتمان بۆ دەکات، دەیگێڕێتەوە بۆ هۆکارە سروشتی و کۆمەڵایەتییە هاوشێوەکان، کە هەموو ڕەگەزی مرۆڤایەتی پێیگەیشتووە، لەکاتێکدا لایەنگرانی پەرەسەندن وایدەبینن کە ئەو هۆکارانە جیاوازن و ڕەگەزێکی گرنگی جۆراوجۆرێتی ڕەوشتی مرۆڤایەتییە.

داروینییەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە شۆڕشی زانستی لە پێکهێنانی دامەزراوە ڕەوشتییە هاوچەرخەکاندا بەشداری کردووە، بەو پێیەی کە زانست بەشێکە لە دامەزراوەی ژینگەیی مرۆڤ. ئایا ئەو بانگەشەیە تا چەند ڕاستە؟

ئەنیشتاین لە کاتی قسەکردنی دەربارەی زانست و ئایین کە لەساڵی ١٩٣٠ ز لە بەرلین ڕێکخراوە، وەڵامی ئەو پرسیارانە دەداتەوەو دەڵێت: گومان لەوەدا نییە کە زانست بنچینەی ڕەوشتی هەیە، بەڵام ئێمە ناتوانین قسە لەسەر بنچینەی زانستی ڕەوشتەکان بکەین، هەموو هەوڵێکیش کە بیەوێ ڕەوشت بخاتە چوارچێوەی زانست و یاساکانی شکستی هێناوەو شکستیش دێنێت، کەواتە ناکرێت زانست سەرچاوەیەك بێت بۆ ڕەوشت.

ریچارد فیلمان[1] (زانای فیزیاو خاوەنی خەڵاتی نۆبڵ) لەگەڵ ئەنیشتایندا هاوڕایەو دەڵێت: گەورەترین هێزو یاسا فیزیاییەکان ناتوانن ئەوەمان بۆ ڕوون بکەنەوە کە چۆن بەکاریان بێنین، لەڕاستیدا زانست فێری چاکەو خراپەمان ناکات، لەبەر ئەوە بەها ڕەوشتییەکان دەکەونە دەرەوەی بازنەی زانستەوە.

---

(١) Rechar Feilman (١٩١٨-١٩٨٨ز): زانای فیزیای تیۆری، ئەمریکییە، پسپۆڕە لە فیزیای چەندی (کوانتەم).

هۆلمز رۆلستۆن[1] لایەنێکی دەروونی کێشەکە باس دەکات کاتێك دەڵێت: ئێمە زانستمان کردۆتە زاناترین و بەهێزترین شت، بەڵام لە هەمان کاتدا وامان لێکردووە کە کەمتر متمانەی پێبکرێت لە بواری ڕاستی و هەڵەدا، ڕابردووی پەرسەندنمان نەگونجاوە لەگەڵ ئێستای ڕەوشتیماندا، لەڕاستیدا ڕێگایەکی ڕوون نییە کە بایۆلۆجیا و ڕەوشت بەیەك بگەیەنێت، بەڕاستی سەرچاوەی ڕەوشت کێشەیەکی گەورەیە.

زانای بەناوبانگی ڕەوشتەکان پیتەر سینگەر[2] مەترسییەکانی خستنە دەرەوەی خودا لە هاوکێشەکاندا و پەنابردنە بەر ژینگە وەك سەرچاوەی ڕەوشتەکان باس دەکات و دەڵێت: پەرسەندنی داروینی ئێمەی خستۆتە هەڵوێستێکی قورسەوە، دوای ئەوەی کە بەربەستی نێوان ئێمە و بونەوەرانی تری لاداوە، دوای ئەوەی شکستی بە ئایین هێنا وەك دامەزراوەی بەرپرس لە ڕەوشتە بەرزەکانمان، ئیتر ناتوانرێ ڕەوشتەکانمان لەسەر مرۆڤێك بونیاد بنێین کە بەتەنیا بەدیهێنراوە و ڕۆحێکی نەمری پێبەخشراوە، گومان لەوەدا نییە کە ئێمە لە ئاییندەدا بێتوانا دەبین لە گێڕانەوەی چەمکە ڕەوشتە بەرزەکان، پێویستە لەسەرمان دان بەوەدا بنێین.

ئەوان بێ دین نین Atheists

ئەوان دژە دینن Antitheists

بێباوەڕە نوێیەکان بەوە وازیان نەهێناوە کە دان بە بوونی یان نەبوونی خودا نەنێن، یان بە بانگکردنی کەسانی تر بۆ ئەو بیروباوەڕە وازبێنن، کە ئەمانە هەموو بژاردەی بەردەستن بۆکەسێکی بێ ئایین، بەڵکو ڕوی تفەنگەکانیان کردۆتە(خودا) نەك تەنها لەسەر ئاستی پرسە زانستییەکان، بەڵکو لەسەر ئاستی پرسە ڕەوشتییەکانیش؛ چونکە بێباوەڕە نوێیەکان بێ پێچ و پەنا باس لەوە

---

(١) Holmez Rolston: مامۆستای فەلسەفە لە زانکۆی کۆلۆرادۆ. لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و لە ساڵی ١٩٣٢ ز لەدایك بووە.

٢ peter singer:مامۆستای فەلسەفە لە زانکۆی پرنستۆن لە نوستراڵیا. گرنگی بە فەلسەفەی ڕەوشتەکان دەدات. لە ساڵی ١٩٤٦ ز لەدایك بووە.

دەکەن کە ئەوان بەگشتی دژی ڕەوشتن، بەڵام لەڕاستیدا دژی ئەو چەمکە ڕەوشتییانەن کە دیندارەکان دەیانخەنەڕوو و جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە مرۆڤایەتی بەبێ ئەو چەمکانە بارودۆخی باشتر دەبێت، لەبەر ئەوە دەبینین کە کریستۆفەر هیتچنز(یەکێك لە پێشەواکانی بیروباوەڕی نوێ) تووشی دڵەڕاوکێ و پەشۆکان بووە بەرامبەر بە کابوسی پەیمانی کۆن و خراپەکانی پەیمانی نوێی مەسیحییەکان، دوژمنایەتی خۆی بۆ خودای ستەمکار و چەوسێنەر ڕاگەیاندووە کە هەمیشە چاودێریمان دەکات، ئەو خودایەی کە گەورە نییە[1] God is not Great بەو شێوەیەی دیندارەکان بانگەشەی بۆ دەکەن.

بێباوەڕە نوێیەکان بەوە وازناهێنن کە سیفەتی (بەرزی) لەبەر ئایینەکان دابماڵن، بەڵکو بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ئایین ژیانی مرۆڤی ژەهراوی کردووە.

ئەگەر ئەوەی هیتچنز باسی دەکات سەبارەت بە دەقەکانی پەیمانی کۆن ڕاست بێت، ئەوا هاوڕێیانی بێباوەڕی لە ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵاتدا ئەومیان بەهەل زانیوە و کردویانەتە هەڵمەتێك بۆ دژایەتیکردنی قورئانی پیرۆز، ئیتر بە هیممەت و خوێنگەرمییەوە کاردەکەن بۆ بەلاڕێدابردنی دەق و تەفسیری ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز، بەجۆرێك کە خزمەتی ڕەوتە دژە ئایین و دژە خوداکەیان بکات.

وینبێرگ[2] ڕایدەگەیەنێت کە ئایین ڕێز و شکۆی مرۆڤی شکاندووە و زیانی پێگەیاندووە، چونکە بە ئایین بێت یان بە بێ ئایین دەبینیت مرۆڤانێکی باش هەن کە کاری باش ئەنجام دەدەن و مرۆڤانێکی خراپیش هەن کە کاری خراپ ئەنجامدەدەن، بەڵام گەر بتەوێ مرۆڤانێکی باش ببینیت کاری خراپە ئەنجام بدەن، ئەوا پێویستی بە ئایین هەیە! ئەوەی جێگای سەرسوڕمانە ئەومیە کە بێباوەڕە نوێیەکان کە ئاڕاستە ڕۆحییەکانی بودایی ڕەتدەکەنەوە، تاکە وشەیەکیشیان لە دژی بودا نەنوسیوە! بەڵام نکۆڵیکردنیان لە خودای تاقانە وای لێکردوون هەزاران

---

(١) ناوی یەکێك لە کتێبەکانی کریستۆفەر هیتچنزە.

(٢) steven Weinberg: زانای فیزیای تیۆری ئەمریکییە، خاوەنی خەڵاتی نۆبڵی ئاشتییە، بە هاوبەشی لەگەڵ لەگەڵ (محمد عبدالسلام)ی پاکستانی و شیڵدۆن گلاشۆ، لەساڵی ١٩٣٣ز لە دایك بووە.

لاپەڕە پڕ بکەنەوە بۆ کەمکردنەوەی پێگەی خودا(جل جلالە)! لەبەر ئەوەیە دەڵێین بێباوەڕە نوێیەکان تەنیا بێدین نین بەڵکو دژی دین و دژی خودان.

**بەڵکو دژی ئیسلامن**

ڕیچارد دۆوکنز و تاکەکانی تری مێگەلەکەی - لەسەر زاری خۆی- جارێك رایدەگەیەنێت کە هەڵوێستە دوژمنداریەکەی بە ئاڕاستەی هەموو ئایینەکانە، جارێکی تر جەخت لەسەر مەسیحیەت دەکاتەوە کە بە باشی لە بیروباوەڕەکەی کۆڵیوەتەوە، (وەك خۆی دەڵێت)[1] نەبوونی لۆژیکییەت و دژایەتی بۆ زانست هەستی ئەویان تا ئەو رادەیە وروژاندووە. لە کۆتاییدا ماسکەکەی لادەچێت و دۆوکنز لەهەوڵیدا بۆ بەستنی ئاگربەستێك لەگەڵ دینداران ڕۆژئاوادا، دوای ئەوەی بە تەواوی پەراوێزیان خستبوو، دەڵێت: بەپێی زانیاری من هیچ مەسیحییەك بوونی نییە باڵاخانەیەکی تەقاندبێتەوە، گوێمان لەوە نەبووە کە هیچ مەسیحییەك خۆکوژ بێت، هیچ بانگخوازێکی مەسیحی شك نابەم باوەڕی بەوە هەبێت هەڵگەڕانەوە لە ئایین سزاکەی کوشتنە، من بەرامبەر بە مەسیحییەت هەستی جیاوازم هەیە، ئێستا باوەڕم بەوە هەیە دەکرێ مەسیحییەت قەڵایەك بێت بۆ پاراستنمان لەشتێکی خراپتر (مەبەستی ئیسلامە)[2]. دۆوکنز ئەو قەسابخانانەی لەبیر کردووە کە مەسیحییەکان دایانانا لە جەنگە خاچپەرستییەکان، هەروەها ئەو پاکتاوە ڕەگەزییەی کە لە ئەندەلوس و بۆسنەو هێرسك ئەنجامیان دا، هەروەها ئەو قەسابخانەیەی کە لە ئێرلەندا دایانانا و چەندان تاوان و کۆمەڵکوژی تریش.

مەسیحییەکان بەم گۆڕانەی دۆوکنز دڵخۆشبوون، بۆیە جۆن لینۆکس[3] دەڵێت: جێگای داخە کە دۆوکنز لەکاتی نوسینی کتێبەکەی (وهم الإله)دا بیری لەو شتانە نەکردۆتەوە، بەڵام من خۆشحاڵم کە ئێستا ئەو قسانەی دەخوێنمەوە.

---

(١) The God Delision. P.158

(٢) لە دیمانەیەکدا کە گۆڤاری (تایم) بڵاوی کردۆتەوە. لە (٢١ ئەپریل) ی ساڵی ٢٠١٠.

(٣) john lenox : زانای بیرکاری و فەیلەسوفی زانستەکان. بەریتانییە. ژمارەیەك نوسینی هەیە لەسەر بەرگریکردن لە مەسیحییەت و، بەدیبەتەکانی لەگەڵ ریچارد دۆوکنزدا بەناوبانگ بوو، لەساڵی ١٩٣٥ ز لەدایك بووە.

سبحان الله.. هەمیشە ئەمە قەدەری ئیسلامە، کاتێك لە گۆڕەپانەکە دەردەکەوێت یەکسەر بارودۆخەکان دەگۆڕێن.

## کارەساتەکانی ئایینی بێباوەڕی (ئیلحاد)

بێباوەڕە نوێیەکان تەنیا بەوە ناوەستن کە بانگەشەی ژەهریەتی ئایین و هێمنی و ئاسایشی بێباوەڕی بکەن، بەڵکو ماددیگەراکان بێباوەڕی دەکەن بە ئایینێك و بانگەشەی ئەوە دەکەن کە توانای ئەوەی هەیە بەسەر هەموو کەموکورتییەکانی دەروونی مرۆڤایەتیدا زاڵ بێت، هەروەك چۆن زۆر بێمنەتانە بانگەشەی ئەوە دەکەن کە رزگارکردنی مرۆڤایەتی لە دەستی ئەواندایە!

## بێباوەڕی ئاشتیخواز!!

ریچارد دۆوکنز و (مێگەلەکەی) بانگەشەی ئەوە دەکەن کە نکۆڵیکردنی مرۆڤێك بۆ خودا ناکرێ کەسانی تر ئازار بدات، ناکرێ کەسانی تر بۆ کاری خراپ ببات.

هەروەها لە دیمانەیەکدا دۆوکنز سەری دەخورێنێت و پرسێك دەخاتەڕوو کە وادەردەکەوێت شتێکی ئاراستەکراوە، دەڵێت: من هیچ جەنگێك شك نابەم کە بەناوی بێباوەڕییەوە هەڵگیرسابێت، مرۆڤ بۆچی لەسەر نەبوونی باوەڕ جەنگ بەرپا بکات؟ نموونەش لەسەر ئەوە دێنێتەوەو دەڵێت: باوەڕ ناکەم تاکە بێباوەڕێك ئامادەبێت کە مەککە بڕوخێنێت یان هەر شوێنێکی پیرۆزی تر.

ریچارد شرۆیدەر[١] (مامۆستای فەلسەفە لە بەرلین) گاڵتە بە بانگەشەکانی دۆوکنز دەکات و دەڵێت: شوێنە پیرۆزەکان زۆر لەوە بەرزترن کەوا بە ئاسانی بڕوخێنرێن، لەبەر ئەوە ستالین لە یەکییەتی سۆڤیەتدا و ماوتسی تۆنگ لە چین بڕیاریاندا بە دینامیت شوێنە پیرۆزەکان بتەقێننەوە؟

هەروەك چۆن زکیۆ برزینسکی[٢] ئەم قسە بێ بنەمایە رەتدەکاتەوەو دەڵێت: هەوڵەکانی دامەزراندنی شیوعییەت لە جیهاندا بووە هۆی لەناوبردنی ژیانی زیاتر لە حەفتا ملیۆن کەس، ئەمەش وا دەکات ببێتە پڕ خەرجیترین و پڕ قوربانیترین هەوڵی شکستخواردوو لە مێژوودا.

## نەزانی یان ساختەیی: مێژووی مارکسییەت و نازییەت

ریچار دۆوکنز مێژووی ژیانی سەر زەوی بەشێوەیەکی ناشیرین سادەکردۆتەوە (پەرەسەندنی هەڕەمەکی کەڵەکەبوو)، کە ئەگەر ژیانی بەدوادا هاتبا ئەوا ئێستا لە ژیان نەدەبووین! وا دەردەکەوێت کە پسۆڕییەکەی لەبارەی (سادەکردنەوەی زانستی سروشتی - بایۆلۆجیا) رەنگدانەوەی هەبووە بەسەر سادەکردنەوەی مێژووی مرۆڤایەتی! بۆیە وەك هەموو بێباوەڕە نوێیەکان لە زۆر کاری گرنگ (جا بە نەزانی بێت یان بە مەبەست) بێئاگا بووە لە مێژووی مرۆڤایەتی هاوچەرخ.

---

(١) rechard svhroeder: یەکێك لەوانەی کە گرنگی بە فەلسەفەی زانستەکان داوە.

(٢) zbighiew birinski: سیاسەتمەداری بەناوبانگی ئەمریکی، کە بە رەچەڵەك پۆڵەندییە، لە ساڵی ١٩٢٨ ز لەدایك بووە. قسەکە لە کتێبی out of control وەرگیراوە. ل ١٦-١٧. ژمارەی راستتر بریتییە لە ٩٤ ملیۆن قوربانی.

## لەگەڵ مارکسییەتدا

دۆوکنز وەك نموونەیەك لەسەر توانای ژیارستانییەتی بێ ئایین باس لە یەکێتی سۆڤییەت دەکات! بۆ وەڵامدانەوەی جۆن لینۆکس ئەو قسانە ورد دەکاتەوە کە بیرمەند و پسپۆڕە ئەکادیمییە رووسییەکان دەربارەی چۆنییەتی ژیانیان لە یەکێتی سۆڤییەتدا باسیان کردووە: وامان دەزانی کە دەکرێ بەبێ خودا باشتر بین، پارێزگاری لە مرۆڤێتی مرۆڤ بکەین، ئای چەند هەڵەبووین، ئێمە مرۆڤ و خودامان بەیەکەوە تێکشکاند!. هەندێکی تریان دەڵێن: ئەگەر دۆوکنز بەڕاستی حەقبێژە با گوێمان بۆ بگرێت بۆ ئەوەی پەیوەندی نێوان بێباوەڕی و تاوان و وەحشیگەری بزانێت.

دۆوکنز هەوڵ دەدات خۆی لەو ڕاستییە بدزێتەوەو دەڵێت: لەوانەیە هەندێك لە بێباوەڕان وەك تاکی جیاواز خراپ بوبێتن، بەڵام بە هیچ جۆرێك بەناوی بێباوەڕی خراپە ئەنجام نادەن. جۆن هێمفری[1] (ابێژەری بەناوبانگی رادیۆی بەریتانی BBC)، ڕەخنە لە بانگەشەکەی دۆوکنز دەگرێت و دەڵێت: گەورەترین شت کە سەرنجی منی ڕاکێشا بریتی بوو لە توندڕەوی بیروباوەڕی بێباوەڕە نوێیەکان، ئەوان دەرك بەوە ناکەن کە بێباوەڕییەکەیان لە کەموکورتییەکی زانستی گەورە و توندڕەوییەکی شێتانە سەرچاوەی گرتووە کە هەموو تێبینی و دەرەنجامەکانی بەو ڕەنگە ڕەنگ کردووە. وەك جەختکردنەوە لەسەر بۆچوونەکەی هێمفری سەرنجی (هیتچنز)ی بێ بێباوەڕ بدە کە دەڵێت: لە ڕاستیدا هەڵوێستمان دژ بە ئایین سەرچاوەی هەموو بەڵگەکانمانە(پێشەکی نەك دەرەنجام) بۆ هەموو سەرچاوە زانستی و مێژووییەکان و هەرچی پەیوەستە بە سروشتی مرۆڤایەتییەوە لەوەوە سەرچاوە دەگرێت! لەبەر ئەوە دەبینین لە نامەی دکتۆراکەیدا قسەی مارکس وەك نموونە دێنێتەوە کە دەڵێت: ((مرۆڤ بە ئازاد دانانرێت تا نەیێتە

---

(١) john humphry : خاوەنی بەرنامە بەناوبانگەکەی BBC بەناوی (هێمفری بەدوای خودادا دەگەڕێت).

گەورەی خۆی، هەرچی ئەو مرۆڤەیە کە بە پاڵپشتییەکی دەرەکی دژی ئەوا مرۆڤێکی ئازاد نییە و بەتەواوی شوێنکەوتەی کەسێکی ترە، چونکە کە هۆکاری بەدیهاتن و بەردەوامبوونی ژیانیەتی)). هەروەها مارکس دەڵێت: ((لەڕاستیدا سڕینەوەی ئایین وەك سەرچاوەی بەختەوەری هەڵە ڕێگای بەدەستهێنانی بەختەوەری ڕاستەقینەیە)). سەرەڕای ئەوەی کە قسەکەی مارکس ڕوون و دیارە، بەڵام بێباوەڕە نوێیەکان پێداگری لەسەر لەیەك جیاکردنەوەی مارکسییەت و بێباوەڕی دەکەن. گومان لەوەدا نییە کە بانگەشەکەیان جێگای پێکەنین و بەزەیی پێداهاتنەوەیە. ئایا دۆوکنز و مێگەلەکەی (کتێبە رەشەکەی شیوعییەت)[1] یان نەخوێندۆتەوە، ئایا ئەو قسەیان تێدا بەدینەکردووە کە دەڵێت: (سیستەمی شیوعییەت تاوانە بەکۆمەڵەکانیان کردبوونە کارێکی ڕەوا)، کە ژمارەی قوربانییەکانی نزیکەی ٩٤ ملیۆن کوژراو بوو، تەنیا لە رووسیا و چین نزیکەی ٨٥ ملیۆن قوربانی هەبوو. ئایا دۆوکنز ئاگاداری ملیۆنان قوربانی تر نییە ئەشکەنجەدان لە مردن نزیکی خستبوونەوە و ملیۆنانی تریش کە بەرەو سیبیریا دوورخرابوونەوە، کە زۆربەیان تووشی ئالوودەبوون بەمادده هۆشبەرەکان بوون، ئەمە سەرەڕای ملیۆنان کەسی تر کە تەمەنیان لە زیندانەکاندا بەسەر برد ئەمەش بەهۆی تاوانێکی گەورە کە ئەنجامیان دابوو، تاوانی ئەوەی کە باوەڕیان هەبوو!!.

گومان لەوەدا نییە کە ملیۆنانی تریش لەبەر هەمان هۆکار لە خوێندن بێبەشکراون، ئەمەش پێی دەوترێ کوشتنی هزر، کە زۆر لە رووخاندنی باڵەخانەکان خراپترو مەترسیدارترە.

هەندێ جار ستالین بە بەزەیی بوو بۆیە پەرستگاکانی نەتەقاندەوە بەڵکو دەیکردن بە مۆزەخانە و چێشتخانەو سینەما!! ستالین دەیان هەزاران مزگەوت و هەزاران کڵێسای داخست، ئایا دۆوکنز ئەمانەی نەخوێندۆتەوە؟!

---

(١) the black book of communism: دانراوی ژمارەیەك لە بیرمەند و سیاسەتمەدارە ئەوروپییەکان لە ساڵی ١٩٩٧ز لەژێر سەرپەرشتی سیڤان کۆرتێس بلاوکراوەتەوە.

## ئەی چی دەربارەی هیتلەر؟

لە کتێبی خودای هیتلەر (Hitler's God) (مایکل ریزمانی)[١] ی مێژوونووس ئەوە ڕووندەکاتەوە کە هیتلەر یاساکانی سروشت- کە گەردوون بەڕێوە دەبەن - بە خودای دادەنا، وای دادەنا کە مەسیحییەت ڕەواج بە دوو خودا دەدات (باوك و کوڕ)، ئەمەش گەورەترین گورز بەر مرۆڤایەتی کەوتووە، جیهان پاك و بێگەرد بوو بەر لەوەی ئاشنای دوو سەرچاوەکەی خەم و کۆژان بێت؛ کە جەدری و مەسیحییەتن[٢].

هیتلەر بەجۆرێك سەیری مەسیحییەت دەکات کە بیروباوەڕێکە بەناوی خۆشەویستی بەرهەڵستکارانی لەناو دەبات، تەوەرەکەی قەبوڵنەکردنی کەسی بەرامبەرە[٣].

هەرچەندی ئەو کەسانەی دەمارگیرییان بۆ هیتلەر هەیە هەوڵبدەن ئەوە دەربخەن کە هیتلەر سۆزداری بۆ مەسیحییەت هەبووە، بەهۆی ئەوەی لەناو ئاییندا گەورە بووە، بەڵام هەڵوێستی کردەیی لە دوژمنایەتی بۆ مەسیحی و جولەکەکاندا دەردەکەوێت، لە هەمان کاتدا بێباوەڕان هەوڵدەدەن خۆیان لەو بارە قورسە ڕزگار بکەن کە ستالین و هیتلەر بدرێنە پاڵ بێباوەڕی، بۆیە هیتچنز بەهۆی پاشخانە ئایینییەکەیانەوە دەیانداتە پاڵ دیندارەکان، ئێمەش شکست بەو هەوڵەیان دێنین و بیریان دەخەینەوە کە زۆربەی پێشەوا نوێیەکانی بێباوەڕی سەرەتا بە دینداریپێگەیشتوونە.

---

(١) Michael rissmann: مێژوونوسی ئەڵمانی، کە گرنگی بە مێژووی نازی و هیتلەر دەدات.

(٢) دۆوکنز کەمێك لە هیتلەر جیاوازە، لەوەدا کە ئاین وەك ڤایرۆسی جەدری ناو دەبات، کە تووشی عەقڵ دەبێت، بەڵام لەناوی نابات.

(٣) هەڵوێستی هیتلەر بەرامبەر مەسیحییەت هاوشێوەی هەڵوێستی نیچەیە کاتێك بە نەفرەتە گەورەکە وەسفی کردووە، کە بۆشایی و هەژارییەکی ناوەکییە، ئارەزووی تۆڵە سەندنەوەیە. کە هیچ شتێك بەرگەی ناگرێت، لەبەر ئەوە ناوێناوە کەموکوڕییە گەورەکەی مرۆڤایەتی.

هەروەها دۆوکنز هەوڵ دەدات خۆی لە کارەساتەکانی ستالین و هیتلەر بێبەری بکات، بۆیە قسەی گاڵتەجاڕانە دەکات و دەڵێت: هەتا ئەگەر ئەوەش قەبوڵ بکەین کە ستالین و هیتلەر لە بێباوەڕان دەچن، ئەمە واتای بوونی پەیوەندی نییە لەنێوان ستەمکاری و بێباوەڕیدا، ئایا لەبەر ئەوەی هیتلەرو ستالین وەکو سەدام حوسێن سمێڵیان هەبووە[1]، دەکرێ بڵێین ئەوان مسوڵمان بوونە؟! ئەمە چ قسەیەکی پووچە؟ ئێمە باس لە سیفەتی هاوبەش ناکەین، بەڵکو باس لەو بیروباوەڕە دەکەین کە ستالین و هیتلەر و کەسانی تری والێکردووە ملیۆنان کەس بکوژن بۆ رزگاربوون لە ئایین.

ساختەکردنی مێژووی بێباوەڕی لەلایەن بێباوەڕانەوە رێگری لەوە ناکات کە هەندێکیان بەرامبەر بە ڕاستییەکانی مێژوو راشکاو و دادگەربوون، ئەوەتا مارك هاوسەر[2] دەڵێت: بۆ ئەوەی بە دیدی تەڕەفگیری تۆمەتبار نەکرێین دەڵێین کە بێباوەڕان ژمارەیەکی زۆر تاوانی گەورەیان ئەنجامداوە، وەك قەسابخانەکانی ستالین کە قوربانییەکانی ملیۆنەها کەس بوون لە یەکێتی سۆڤییەتدا، هەروەها کێڵگەکانی کوشتن کە پۆڵ پۆت[3] کە زیاتر لە ملیۆنێك کەمبۆدی تێدا ناشتووە. ئەگەر هەموو بەڵگەکان پێکەوە بخەینە بەرچاومان، دەرەنجامێکمان بۆ دەردەچێت، ئەویش بریتییە لەوەی کە هەر یەکێك لە دیندارەکان یان بێباوەڕەکان لەسەر شانۆی تاواندا تەنیانین.

---

(١) The God Delusion. P. 309

(٢) Mark Hauser: زانای بایۆلۆجیای پەرەسەندن، ئەمریکییە و لە ساڵی ١٩٥٩ز لەدایك بووە.

(٣) Pol Pot: (١٩٢٣-١٩٩٨)ز پێشەوای بزوتنەوەی شیوعییەت، بەسەرکوتکردن بەناوبانگ بوو.

## بێباوەڕی ڕۆشنگەری سەرچاوەی توندوتیژییە :

چاوخشاندنەوە بە مێژوودا پێمان دەڵێت کە ئەو بزووتنەوانەی بە شیکردنەوەی فیکری پاشان بە دیبەیتە فیکرییەکان دەستپێدەکەن دەکرێ ببنە هۆی قەبوڵنەکردنی کەسی بەرامبەر، پاشان توندوتیژی لێبکەوێتەوە، نموونەی ئەوەش وەك کارل مارکس کە لە لەندەن لە کتێبخانەکەیدا دانیشتبوو و بەهێمنی بیرۆکە بێباوەڕییەکانی خۆی دەنووسییەوە، پاشان پرسەکە لە سەدەی بیستەمدا گەیشت بەو ئاستەی کە کوشتارگەکانی لێکەوتنەوە، مارکس خۆیشی پێشبینینەدەکرد.

بەڕاستی زۆرجار بیرۆکەکان دەرەنجام و سەرەنجامی وا بەدوای خۆیاندا دێنن کە قابیلی تەقینەوەن، لەبری ئەوەی کە بیرۆکە بێباوەڕییەکان ئایین و خودا لەناو ببەن مرۆڤایەتی مرۆڤیان لەناوبردووە.

پەردەیەکی ڕەش ئەو چەمکە بەدیهیەی لە عەقڵی بێباوەڕان دابڕیوە، بەمەش لە وەهمەکانیان بەردەوامن، ئەوەتا مایکل ئۆنفرای[1] گەورە فەیلەسوفانی بێباوەڕی وەك نیچەو مارکس و فیۆرباخ[2] بەوە وەسف دەکات کە پیاوانی ڕۆشنگەری (إستنارە) بوون، کە لە دوای (کانت)ی فەیلەسوفەوە هاتوون! ئای لەم وەسفە نەگونجاوە بۆ پیاوانێك کە بە فەلسەفە بێباوەڕییەکانیان عەقڵی ستەمکار و چەوسێنەرەوەکانی سەدەی بیستەمیان پڕکرد، بەمەش تاریکییان لە زۆربەی ناوچەکانی زەویدا بڵاوکردۆتەوە و ملیۆنان کەسیان خەڵتانی خوێن کردووە! لە ڕاستیدا ئەو کارەساتانەی بێباوەڕی بە تەنیا لە سەدەی بیستەمدا ئەنجامیداون زیاترن لە هەموو ئەو جەنگە ئایینییانەی کە بە درێژایی مێژوو ئەنجامدراون، ئایا هەر بەڕاستی ئەوانە پیاوی ڕۆشنگەری بوون؟!

---

(١) Michel Onfray: فەیلەسوفی بێباوەڕی فەرەنسی، لە ساڵی ١٩٥٩ز لە دایك بووە.

(٢) Feur Bach: (١٨٠٤-١٨٧٢ز)، فەیلەسوفی ئەڵمانی کە گرنگی بە زانستەکانی مرۆڤ داوە، بە ڕەخنەگرتنی لە مەسیحییەت بەناوبانگ بوو.

جۆن گرای[1] دەست دەخاتە سەر ئەو ڕاستییە و دەڵێت: (لەڕاستیدا ڕۆڵی بزووتنەوەی ڕۆشنگەری لە تیرۆریستی لە سەدەی بیستەمدا خاڵێکی ڕەشە بەنێوچاوانی ژیارستانییەتی هاوچەرخەوە، سیستەمی شیوعی تۆقێنەر لەناو دڵی خەونەکانی شارە پیرۆزەکەی فەیلەسوفەکانی ڕۆشنگەریدا هەڵقوڵا. ئەو ترسەی کە ستالین و لینین بڵاویان کردبووەوە هەموو ئەو کوژانانەی کە قەیسەرە دیندارەکان پێشتر لە ڕوسیادا ئەنجامیان دابوو بە بەراورد بە هی ئەوان هەر زۆر کەمە).

ئایا بێباوەڕە نوێیەکان بەڕاستی باوەڕیان وایە کە کۆمەڵگەی عەلمانی کە ئایینی تێدا نەبێت کەمتر توندوتیژی تێدا دەبێت لە کۆمەڵگایەك کە ئایین پەیڕەو دەکات؟! لەڕاستیدا ئەو بیرۆکەیە بەتەواوەتی ڕەتکراوەیە لەسەردەمێکدا کە کۆمەڵگا عەلمانییەکان بەدرێژایی مێژوو ئەوپەڕی شێوەکانی توندوتیژییان تێدا ئەنجامدرا.

## بێباوەڕی ئوسوڵی مەترسیدارترە:

دۆوکنز کە ڕقنەسترییە دانەمرکاوەکەی بەرامبەر ئایین ئاشکرا دەکات، دەڵێت: ((فێرکردنی ئایینی بەشێوەیەکی وەسەتی میانڕەوانە دەرگایە بۆ توندڕەوی ئایینی!))[2]، ئێمەش بە هەمان لۆژیکەکەی خۆی وەڵامی دەدەینەوە، دەڵێین: ناڕاستەی بێدینی میانڕەو دەکرێ دەرگا واڵا بکات بۆ توندڕەوی دژ بە ئایین، بەمەش کاردانەوەیەکی ئایینی توندڕەوی لێبکەوێتەوە. ئەم زنجیرەیە نە گریمانەیە نە بیروبۆچوونە، بەڵکو زنجیرەیەکی ڕاستەقینەیە کە باجی زۆری بە مرۆڤایەتی داوە، تەنیا چاوخشاندنەوەیەکی خێرا بەوەی کە پێی دەگوترێ ئوسوڵییەتی ئیسلامی کە هەندێك لە سەرانی ئەو ڕەوتە جۆرێك لە توندڕەوییان

---

(١) john Gray: نووسەری بەناوبانگی ئەمریکی. لە ساڵی ١٩٥١ز بەناوبانگ بووە.

(٢) The God Delusion. P. 342.

بەرامبەر بە ڕۆژئاوا پەیڕەوکردووە، ئەوە دەردەخات کە هەڵوێستێکی بەرگریکاری ڕاستەوخۆیە دژ بە هەوڵەکانی لەناوبردنی ئیسلام.

میلڤین کۆنەر[1] باس لە دوژمنداری بێباوەڕە نوێیەکان دەکات بەرامبەر بە ئایین و پێداگرییان لەسەر لەناوبردنی ئایین، کاتێك بە گاڵتەجارییەوە دەڵێت: بێباوەڕان لە هەموو لایەکەوە بۆ پرسەکە چوون و هیچ نەماوەتەوە جگە لەوەی بپرسین: ئایا بە چەکوشێکی ئاسنین لە ئایین دەدەن یان بە داری بەیسبۆڵ[2]!.

## دیاریکردنی کۆتایی :

دیڤید بێرلینسکی[3] دەستمان دادەنێتە سەر حەقیقەتی پەیوەندی نێوان بێباوەڕی و خراپە، کاتێك دەڵێت: ((ئەوانەی تاوانیان لە دژی مرۆڤایەتی ئەنجامداوە، وەك هیتلەر و ستالین و ماوتسی تۆنگ و ئەفسەرانی گۆستابۆ MKVD و نازی و شیوعییەکان، بەهیچ جۆرێك باوەڕییان بەوە نەبوو کە خودا چاودێرییان دەکات))،ئەمەش بە سادەیی بریتییە لە چەمکی (کۆمەڵگەی عەلمانی ڕەها). چونکە هزری عەلمانی وەك بەشێك لە سروشت سەیری مرۆڤ دەکات، باوەڕبوون بە ئایین وەك خۆکوشتنێکی بەردەوامی عەقڵی دەزانێت، لەبەر ئەوە عەلمانییەکان ئایین لە سەرچاوەی مەعریفەت و ڕەوشت و یاسا دووردەخەنەوە، ئەمانە لە ئەزموونی مرۆڤ و پسپۆڕیشیان وەردەگرن، بەمەش مرۆڤ لەبری خوا بە ڕەها دەزانن.

---

(١) Melvin J. Konner: مامۆستای زانستەکانی مرۆڤ و نەخۆشی دەروونی و دەمارییەکان لە زانکۆی ئیمۆری لە ویلایەتە یەکگرتووەکان.

(٢) ئەمە لەو کۆنگرەیەدابوو کە (the science network) لە (Jolla) لە کالیفۆرنیا ڕێکی خستبوو.

(٣) David Berlenisky: فەیلەسوفێکی ئەمریکییە یەکێکە لە کۆڵەگەکانی ئەتابخانەی دیزاینی زیرەك و دامەزراوەی (Discovery)، لەساڵی ١٩٤٢ز لەدایك بووە.

بە پشتبەستن بەم قسەیەی دیستۆڤیسکی کە لە رۆمانی (برایانی کرامازۆف) دا هاتووە، لە سەرەتای تەوەرەکەدا باسمان کرد، دێڤید بێرلینسکی ئەم پرسە لۆژیکییە بەم جۆرە دەخاتە ڕوو:

پێشەکی یەکەم: خودا بوونی نییە، کەواتە هەموو شتێك رەوایە.. دیستۆڤیسکی

پێشەکی دووەم: ئەگەر زانست ڕاستگۆ بێت ئەوا خودا بوونی نییە.. زانستی ماددیگەرانی.

کەواتە: ئەگەر زانست ڕاستگۆ بێت ئەوا هەموو شتێك رەوایە!!

ئەم دەرئەنجامە ئەوە ناگەیەنێت کە بێباوەڕان بێتوانان لەوەی کە شوێنی رەفتارگەلێکی ڕاست و دروست بکەون، بەڵکو ئەوە دەگەیەنێت کە بێباوەڕی دامەزراوەیەکی ڕەوشتییان پێنابەخشێت، بۆیە کاتێك بێباوەڕە نوێیەکان بوونی سەرچاوەیەکی ماددییان بۆ ڕەوشتەکانمان نەرێ کرد، لەبری ئەوە گریمانەی شوێنگرەوەیان پێنەبەخشین، بەمەش هەموو شتێکیان تەسلیم بە لەناوچوونێکی رەها کرد.

لە ڕاستیدا بێباوەڕە نوێیەکان بێباوەڕی گەمژەن، سەرەنجامی بێباوەڕییان نازانن!! تۆ بێنە بەرچاوی خۆت چی بەسەر نەوەکانی ئایندەماندا دێت ئەگەر ئەم جۆرە چەمکانەیان لە راگەیاندن و قوتابخانەکاندا پێ بگوترێتەوە!!

### خوێنەری بەڕێز

خوایەتی و ئایین و خودا و ڕەوشت لە دیدی ئیسلامیانەدا بەدوای یەکتردا دێن، بە باوەڕبوون بە خودا دەستپێدەکات کە ئایینی ناردۆتە خوارەوە، تەواوکردنی دامەزراوەی ڕەوشتی مرۆڤی کردۆتە یەکێك لە پایە بنەڕەتییەکانی ئایین، بۆ چەسپاندنی ئەم دامەزراوەیەش لە دەروونی مرۆڤایەتیدا ئیسلام مەنهەجێکی بەکارهێناوە کە لە سێ میکانیزم پێکهاتووە:

## فیترەت - پەیام - عەقل

بێباوەڕان ئەوە ڕەتدەکەنەوە، کە دان بە بنچینە فیترییەکانی هەستی خودایی و هەستی ئایینی و هەستی ڕەوشتی دابنێن، هەروەك چۆن ئەوەش ڕەتدەکەنەوە، کە دان بە پەیامە ئاسمانییەکاندا بنێن خودا و ئایین بە مرۆڤ دەناسێنن، بێداری دەکاتەوە بۆ ئەو هەستە فیترییانەی زۆرکات بەشی ماددی بنچینەی مرۆڤ کپیان دەکاتەوەو دەیان پوکێنێتەوە، گومان لەوەدا نیە، کە بێباوەڕان ئەوەش ڕەتدەکەنەوە کە عەقڵ بەڵگە لە سەر ئەو دامەزراوەیە بێنێتەوە، بێباوەڕان دەرکەوتنی یەك لەدوای یەکی (خوایەتی - ئایین - ڕەوشت)بە یەکێك لە دەرەنجامەکانی پەرەسەندنی داروینی دەزانن، لەکاتی ڕووبەڕووبونەوەی مرۆڤ لەگەڵ هێزە سروشتییەکان و خراپە و ئازارەکاندا.

لەڕاستیدا هەڵەی بنچینەیی، کە بێباوەڕان تێیدەکەون، بریتییە لەوەی، کە ئەوان وا دەزانن بوونی سوودێك لە پشت بیرۆکەی خوداو ئایین واتای ئەوەیە کە مرۆڤ خۆی ئەوانەی داهێناوە بە مەبەستی دەستەبەرکردنی ئەو سوودانە، بۆیە ئەوان وایدەبینن کە بە سەلماندنی ئەو سوودانە ئەوە دەسەلمێنن کە خوایەتی و ئایین داهێنراوی خودی مرۆڤن! وەك ئەوەی بڵێن نابێ خودا سوودێکی لە بونەوەرەکانیدا دانابێت!!

دەرکەوتنی ڕەوشتە باشەکان، وەك هاوسۆزی و قوربانیدان گەورەترین تەحەددین لەبەرامبەر داروینیزمدا لەکاتی بەرپەرچدانەوەی بۆ تەفسیرکردنی پەیدابونی دامەزراوەی ڕەوشتی مرۆڤ، چونکە ئەم دوو ڕەوشتە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لەگەڵ پەرەسەندنی هەرەمەکی داروینیدا تێکدەگیرێن، کە خۆپەرستانە هەوڵ بۆ بەرژەوەندی خودی مرۆڤایەتی و پارێزگاریکردن لەو خودە دەدات.

هەروەها داروینییەکان پێداگری لەسەر ئەوە دەکەن کە سروشتی ماددی سەرچاوەی ڕەوشتەکانی مرۆڤایەتییە، لەسەر مرۆڤ پێویستە ئەوە بزانێت کە چاکە و خراپە بوونیان نییە، جگە لە بەرژەوەندی هیچ شتێکی تر بونی نییە،. لە ڕاستیدا دایکە (سروشت) هیچ گرنگی بە ئازارو مەینەتییەکانی مرۆڤ نادات، چونکە هیچ ئامانجێکی نییە!!

بێباوەڕە نوێیەکان تەنیا بەوە وازیان نەهێناوە کە دان بە بوونی خودا دانەنێن، یاخود بە بانگکردنی کەسانی تر بۆ ئەوە، کە ئەمانە هەموویان بژاردەن لە بەردەم کەسی بێباوەڕدا، بەڵکو دەستیان کردووە بە ئاڕاستەکردنی تفەنگەکانیان بۆ (دژایەتی)کردنی خودا، نەك تەنیا لەسەر ئاستی پرسە زانستییەکان، بەڵکو تەنانەت لەسەر ئاستی ڕەوشتیش. چونکە بێباوەڕە نوێیەکان بە ئاشکرایی دەڵێن کە کتێبە پیرۆزەکان ئاستی ڕەوشتی نزم دەخەنە روو، جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە مرۆڤایەتی بەبێ ئەو چەمکانە بارودۆخی باشتر دەبێت.

نوسینەکانی ئەم دواییانەی بێباوەڕە نوێیەکان ئەوەیان سەلماندووە، کە دوژمنایەتی ئەوان بە پلەی یەکەم دژی ئایین، یان دژی مەسیحییەت نییە، بەو ئەندازەیەی کە دژی ئیسلامە.

هەروەك چۆن بێباوەڕە نوێیەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ناکرێ بێباوەڕی هیچ کەس وا لێبکات کە خراپەیەك بەرامبەر بە کەسانی تر ئەنجام بدات، ئەوە لەبیر خۆیان دەبەنەوە کە دامەزراندنی شیوعییەتی بێباوەڕ زیاتر لە ٩٤ ملیۆن کەسی کردە قوربانی، کە بە پڕخەرجیترین و شکستخواردووترین هەوڵی مێژوو دادەنرێت.

دەکرێ بە کورتی پەیوەندی نێوان بێباوەڕی و خراپە بەوە وەسف بکەین کە ئەو بێباوەڕانەی قەسابخانەیان لە دژی مرۆڤایەتیدا ئەنجامدا باوەڕیان بەوە نەبوو، کە خودا چاودێرییان دەکات، ئەمەش بە سادەیی بریتییە لە چەمکی (کۆمەڵگای عەلمانی) کە تەنیا بەوە وازناهێنێت کە ئایین لە بازنەی سیاسەتدا بخاتە دەرەوە (عەلمانی تایبەتی)، بەڵکو دەیەوێت لە بازنەی ژیان بیخاتە دەرەوە(عەلمانیەتی رەها).

لە کۆتاییدا جەخت لەسەر ئەوە دەکەینەوە کە زانست سەلماندوویەتی کە دامەزراوەی خودایی- ئایینی - ڕەوشتی لە فیترەتی دەروونی مرۆڤایەتیدا چەسپاوە، میکانیزمی جینی و دەماری و دەروونی لە پشتەوەیە، ناکرێ بە شێوەیەکی هەڕەمەکی پەیدابببێت، پێویستە خودایەکی دانای بەتوانای لە پشتەوەبێت.

## تەوەرەی دەیەم

# ریچارد دۆوکنز
# پێشەوای بێباوەڕە نوێیەکان

((زۆرێك لە بەڵگە فەلسەفییەکانی دۆوکنز ئەگەر لە تاقیکردنەوەکانی فەلسەفەی قوتابخانە ناوەندییەکاندا بخرێنەڕوو ئەوا پلەی ((کەوتن)) وەردەگرن!))

ئاڵڤێن پلاتینگا[1]

ڕۆژگاری بێباوەڕی فەلسەفی ڕەوشتبەرزانە بەسەرچوو، هەروەك چۆن ڕۆژگاری بێباوەڕە گەورەکانی وەك دێڤید هیوم و نیچە و بێرتراند راسل بەسەرچوو، لە ئێستادا گرنگیدان بە چەندێتی لە پێش چۆنیەتییە، گرنگ بەرزبونەوەی هات و هاوارە لە راگەیاندنەکان و تۆڕی جاڵجاڵۆکەیی و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان، ئێستا لە سەردەمێکدا دەژین کە بێباوەڕی لە ڕۆژئاوادا لە رێگاوبانەکاندا خۆی دەخاتەڕوو، بەڕاشکاوی نیازی خۆی لە لادانی ئایین لەسەر رێگاکەیدا دەردەخات. بێباوەڕانی ڕۆژهەڵاتیش شوێنی پێشەواکانی خۆیان دەکەون لە ڕۆژئاوادا، ئیتر خەریکە لێرە لەوێ گوێمان لە ورتەورتی هاوشێوە دەبێت.

---

(١) گەورە فەیلەسوفێکی ئەمریکییە.

لە دوو بەشەکەی ڕابردوودا پرسە زیندووەکانمان خستەروو، کە ناکۆکی نێوان باوەڕداران و بێباوەڕان لەسەری گەرم و گورە، چەمك و بەڵگە سەرەکییەکانی بێباوەڕی نوێمان بەدرۆخستنەوە.

لەم بەشەدا، خستنەڕووی هزری بێباوەڕی تەواو دەکەین، ئەم تەوەرەیە بۆ تەواوکردنی خستنەڕو و شیکردنەوەی هزری و مەنهەجی گەورەی بێباوەڕە نوێیەکان(ریچارد دۆوکنز) تەرخان دەکەین، لە ڕێی خستنەڕو و شیکردنەوەی نوسینە بەناوبانگەکانی. پاشان لە تەوەرەی دواتردا باس لە مێگەلەکەی دۆوکنز دەکەین و هزری هەندێك لە بەچکە بێباوەڕ دەخەینەڕوو، ئەم بەشە بە تەوەرەیەك دەربارەی بێباوەری لە ناوچەکەماندا کۆتایی پێدێنین. وا دەزانم کە ئەم خستنەڕووە بەس بێت بۆ ناساندنی هزری بێباوەری نوێ و بەدرۆخستنەوەی، بۆئەوەی کە خوێنەر بەرگرییەك لەدژی ئەو جۆرە هزرە پەیدابکات.

## ئەوویە ریچارد دۆوکنز [1]

### بێباوەڕێکی ئاستنزمی بێڕەوشت

وەك شوێنکەوتنی ئەو پەندەی دەڵێت: (شایەتێك لە خۆیان شایەتی دا)، تیشك دەخەینە سەر شێوازی ریچارد دۆوکنز و مەنهەجەکەی، لە ڕێگای خستنەڕووی کاردانەوەی هەندێك لە بێباوەڕەکان و لایەنگرانی داروینیزم بەرامبەر بە کتێبە نوێکەی (وهم الإله) :

---

(١) Richar Dawkins: بەریتانییە، لە نیرۆبی لە کینیا لە ساڵی ١٩٤١ز لە دایك بووە، ئێستا لە ئۆکسفۆرد دەژی، پێشتر مامۆستای سادەکردنەوەی زانستەکان بوو لە زانکۆی ئۆکسفۆرد، لەڕێی کتێبی(جینە خۆپەرستەکە The selfish gene) ناوبانگی دەرکرد، لە ساڵی ١٩٧٦ز بڵاوکرایەوە، کە تیایدا تێگەیشتنی خۆی بۆ پەرەسەندن خستۆتەڕوولەڕێی رۆڵی جینەکانەوە. هەروەها یەکێك لە نەیارانی چەمکی بەدیهێنانی تایبەتی و چەمکی دیزاینی زیرەك، هەروەها چۆن لە کتێبەکەی (The Blind watch maker) دا دەردەکەوێت. لە ساڵی ٢٠٠٦ز کتێبی(وهم الإله The God Delusion) ی بڵاوکردەوە، کە تیایدا نکوڵی لە هەموو هێزێکی غەیبی دەکات و، باوەڕ بە گومڕایی و خەیاڵ دەزانێت، ئەم کتێبەی لە ئێستا لە هەموویان بەناوبانگترە.

فەیلەسوفی بێباوەڕ مایکل رۆس[١] دەڵێت: ((کتێبی (وهم الإله) وایلێکردم هەست بە دڵەڕاوکێ و شپرزەیی بکەم Embarrassed بەوەی کە بێباوەڕم! چونکە کتێبەکە کە گوایە بە پلەی یەکەم پرسی ڕەوشت چارەسەر دەکات، هەڵمەتێکی خاچپەرستانەی بێ ڕەوشتانە بەرپا دەکات، کە پڕە لە فیزو هەڵەشەیی. چونکە دۆوکنز وەك فەیلەسوفێك رەفتار ناکات کە بەڵگەکان تاوتوێ بکات تا بگاتە دەرئەنجامێکی لۆژیکی، بەڵکو وەك ئامۆژگاریکارێکی ئوسوڵی مامەڵە دەکات کە رێگای رزگاری دەستنیشان دەکات و هەڕەشە لە بەرهەڵستکارەکانیش دەکات بە دورخستنەوەیان لە بەزەیی))، پاشان رۆس پرسیارەکەی دەخاتەڕوو((ئەگەر خودا بوونی نییە، ئەی ئەو توندڕەوی و دژایەتیەی ئایین بۆچی؟!)).

شێوازەکەی دۆوکنز دەربارەی خودا وای لە فەیلەسوفی بێباوەڕ تۆماس ناگڵ[٢] کرد کە ئارامی بەرامبەر دۆوکنز نەمێنێت و بڵێت: ((دۆوکنز لە کتێبەکەیدا ئامانجی ئەوەیە نکۆڵی لەوە بکات کە ئایین سەرچاوەی ڕەوشت و رەفتارەکانە Etiquette کە باڵی بەسەر ژیارستانیەتی هاوچەرخدا کێشاوە، ئەو نکۆڵیکردنە چەندی لە توانای دابێت بەشێوازێکی ناشرین و قێزەون Offensive دووبارەی دەکاتەوە)).

هەروەها زانای بۆماوەزانی پەرەسەندن هـ. ئالین ئاوەر[٣] دەڵێت: سەرەڕای ئەوەی پێشتر سەرسامی چالاکی دۆوکنز بووم، بەڵام ئیتر کاتی ئەوە هاتووە لە یەکتر جیا ببینەوە، بەڕاستی کتێبەکەی (وهم الإله) زۆر خراپە، سەرەڕای کە من پێشتر دۆوکنزم بەوە وەسفکردبوو، کە بێباوەڕێکی پیشەگەرە، بەڵام دوای ئەوەی کتێبەکەی (وهم الإله)م خوێندەوە بۆم دەرکەوت کە تەنیا بێباوەڕێکی

---

(١) Michel Ruse: ئینگلیزە، فەیلەسوفی زانستەکانە و پسپۆریشە لە فەلسەفەی بایۆلۆجی. لە ساڵی ١٩٤٠ز لە دایك بووە.

(٢) Tomas Nagel: مامۆستای فەلسەفە و یاسا لە ویلایەتە یەکگرتووەکان، گرنگی بە فەلسەفەی عەقڵ و رەوشت و سیاسەت دەدات، لە ساڵی ١٩٧٣ز لە سربیا لەدایك بووە.

(٣) H. Allien.Orr: مامۆستای بایۆلۆجیا، گرنگی بە بۆماوەزانی دەدات، لە زانکۆی رۆشێستەر لە ویلایەتە یەکگرتووەکان مامۆستایە.

ئاست نزمە، چونکە لە کتێبەکەیدا هیچ ڕەخنەیەکی بابەتیانەی لە ئایین نەگرتووە، سەرەڕای ئەوەی کە سەدان کتێبی بۆ هێرشکردنە سەر خودا تەرخان کردووە.

بەم جۆرە زۆرێك لە لایەنگرانی، پشتیان لەدۆوکنز کرد، دوای ئەوەی زۆر نابەرپرسانە لەخۆبایی بوونی لە دوا کتێبیدا خستۆتەڕو و پڕی کردووە لە تانە و تەشەر و قسەی ناشرین، لەوانە:

- هەرکە باوەڕداران ئەم کتێبەم دەخوێننەوە، بەر لەوەی دایبنێن دەبن بە بێباوەڕ[1].

- مێشکی باوەڕداران بەجۆرێك پڕ بووە لە بیرۆکەی وا کە وەڵامی- بەڵگەکان نادەنەوە، ڕێك چۆن بۆیە(ڕەنگ) دەچێتە ناو خورییەوە، ئەم بەرگرییەش بەشێوەیەکی پلەبەند هەر لە منداڵییەوە و ساڵانێکی زۆر لە تەڵقین و لەبن گوێ خوێندن درووست بووە[2].

- کاتێك تاکە کەسێك بە دەست وەهم وخەیاڵات دەناڵێنێت بە شێت وەسفی دەکەین، بەڵام کاتێك دەبینی کۆمەڵێك خەڵك هەمان کێشەیان هەیە، ئەوا پێیان دەڵێین دیندارەکان[3].

- ئەو کەسانەی خاوەنی ئاڕاستەیەکی ئایینین، کێشەی ئەومیان هەیە کە بێتوانان بەرامبەر بە جیاکردنەوەی شتێکی حەقیقی لەو شتەی خۆیان دەیانەوێ وەك حەقیقەت نیشانی بدەن[4].

- هیچ ژیارستانییەتێك نادۆزیتەوە کە خاسیەتی بەهەدەردانی کات و سامانی هەبێت، پڕ بێت لە کەشی دوژمنایەتی و بیرۆکەی ناکۆك لەگەڵ حەقیقەتدا و خەیاڵی ڕێگر لەبەردەم بەرهەمهێنان، بەو ئەندازەیەی لەناو گەلە دیندارەکاندا بەدیدەکرێت[5].

---

(١) The God Delusion. P. 4

(٢) The God Delusion. P. 5

(٣) The God Delusion. P. 5

(٤) The God Delusion. P. 108

(٥) The God Delusion. P. 166

- ئەو مەسیحییانەی خاوەن زیرەکییەکی کەمتر لە پلەی ناوەندن، هەستێکی درێژخایەنیان هەیە بە تاوانباری، کە وایان لێدەکات بکەونە بارودۆخێکی تەندروستی ناجێگیر کە ئەستەمە چارەسەر ببێت[1].

بەر لـە هەمـوو ئەو شـتانە، هەر لە ناونیشـانی کتێبەکـەیەوە، هەڵوێسـتە دوژمنداریيەکەی دۆوکنز بە ڕوونی دەردەکەوێت، کە تیایاندا نکۆڵی لە بوونی خودا دەکات و ئەوانەی لەگەڵ بیرۆکەکانیدا ناکۆکن بە خەیاڵاوی وەسفیان دەکات.

سکۆت هان[2] هۆکاری ناستنزمی ڕەوشتی کتێبەکە دیاریدەکات و دەڵێت: ((لە ڕاستیدا کتێبەکە کتێبێکی نازاربەخشە و پڕە لە توورەیی، بە کەوتنێکی شەرمەزارانە لەسەر دۆوکنز هەژمار دەکرێت، هەروەها وەك کارێکی فیکری بابەتیانە هەژمار ناکرێت، کاتێك کتێبەکە دەخوێنیتەوە هەستدەکەی لەبەردەم هەوڵێکی بێهیوایانەدای لەکەسێکەوە کە دڵتەنگی تەنگی پێ هەڵچنیوە؛ ئەمەش تەنیا لەبەر ئەوەی کە نەیانتوانیوە لە نەیارەکانی ڕزگاری ببێت کە گۆڕەپانەکەیان پڕ کردووە. لەڕاستیدا کتێبەکە وەك دیمەنی شاگەشکە بوونی کەسێك دەردەکەوێت کە پڕە لە غرور و خۆبەزلزانی، دوای ئەوەی کە بڕێکی زۆری مەی خواردبێتەوە، دەستی بە بەخشینەوەی جنێو و تانەو تەشەرە رقاوییەکانی کردووە، بەسەر ئەو کەسانەی ڕای جیاوازیان هەیە)).

لەبەر هەموو ئەو شتانە، فەیلەسوفی دیندار ئالگێن پلادینگا هۆشداری دەداتە خوێنەری کتێبی (وهم الإله) لەوەی وەك کارێکی عەقڵانی سەیری کتێبەکە بکات، چونکە کتێبەکە، لە لایەنی بابەتییانەوە زۆر دوورکەوتۆتەوە و، پڕە لە تۆمەت و جنێو و گاڵتەپێکردن.

---

(١) The God Delusion. P. 167

(٢) scott Hahn: بیرمەندێکی ئەمریکییە. گرنگی بە ئاینەکان دەدات. لە ساڵی ١٩٥٥ز لە دایك بووە.

## سۆفستاییەکی سەرەتایی 9
## ساختەکاری ڕاستییەکان :

سەرەڕای شێوازە گاڵتەجاڕییە ئاستنزمەکەی، دۆوکنز بۆ سەلماندنی بۆچونەکانی پەنا دەباتەبەر سۆفستائییەت، بە چاوپۆشی لە شوێنکەوتنی حەقیقەت، بۆیە کەوتۆتە هەڵەی گەورە و لۆژیکییەوە، با چەند نموونەیەك لەسەر ئەوە بێنینەوە، نەوەك گشتاندن بەڵکو تەنیا وەك چەند نموونەیەك لەسەر ئەو شتانەی دەیدەینە پاڵ:

١- یەکێك لە فێڵەکانی ڕێڕەوی سۆفستائی ئەوەیە کە ئەو دەرەنجامەی ئامانجییەتی پێی بگات، وەك پێشەکییەکی سەلمێنراوی بێ بەڵگە دەیخاتەڕو[1]، سەرنجی دۆوکنز بدە کاتێك دەڵێت: ((وا نازانم هیچ بێباوەڕێك لە جیهاندا بیەوێت کەعبە یان کڵێسای نۆتردام یان پەرستگاکانی کیۆتۆ یان پەیکەرەکانی بودا لە بامیان لە ئەفغانستان خاپور بکات[2].

ئایا دۆوکنز باسی ئەو دەیان هەزار مزگەوت و کڵێسایانەی نەبیستووە کە ڕژێمی بێباوەڕ لە یەکێتی سۆڤییەتدا خاپوری کردن، ئەمە جگە لەو قەسابخانانەی کە بۆ مسوڵمانان و مەسیحییەکانیان دامەزراند و قوربانییەکانی نزیکەی ملیۆنێك قوربانی لە مسوڵمان و مەسیحی بوو؟! هەڵەی مەنهەجی لێرەدا بریتییە لە خستنەڕووی دەرەنجامی مەبەست وەك پێشەکییەکی سەلمێنراو، ئەمەش ڕەنگدانەوەی نەزانییەکی گەورەیە، شێواندنی بەئەنقەستی مێژووە.

---

(١) سۆفستائییەت: بەچاوپۆشی لە سەرچاوە مێژووییەکەی، بە واتای بە لاڕێدابردنی بیرو، شێواندنی ڕاستییە لۆژیکییەکانە و، بە لاڕێدابردنی کەسی بەرامبەرە لە بۆچوونی ڕاست و دروست.

(٢) ئەم هەڵە لۆژیکییە بە petition Principle

٢- یەکێك لە تێکەوتنە زانستییەکانی دۆوکنز بریتییە لە هەڵوێستەکەی بەرامبەر بە پرسی: یەکەمجار زانیاری یان ماددە؟ چونکە دۆوکنز(وەك ماددیگەرەکانی تر) پەیڕەوی لەوەدەکات، کە دەکرێ زانیارییەکان بەشێوەیەکی خۆکرد لە ماددەدا کەڵەکە ببن. گەورە زانای بایۆلۆجی دیان کینیۆن[1] ئەو بۆچوونە ڕەتدەکاتەوە و دەڵێت: ((هەرچەندە زیاتر دەربارەی کیمیای ژیان بزانین، بەتایبەت بواری بایۆلۆجیای بەشی(جزیئی)، ئەوا کەمتر لێکدانەوە فیزیایی و کیمیاییەکان بۆ بنچینەی ژیان قەبوڵ دەکەین. زانستی نوێ پێمان دەڵێت کە پێویستە سەرچاوەی ئەو زانیارییانەی لە دی ئێن ئەیدا هەن سەرچاوەیەکی زیرەك بێت، ئەو سەرچاوەیە چییە؟ ئەمە لە دەرەوەی بازنەی زانستدایە، پێویستە بۆ ئایین و فەلسەفە جێبهێڵدرێن)).

بە هەمان شێوە ئالان سانداج[2] (زاناترین مرۆڤ بە گەردوون) پێمان دەڵێت کە گەردوون و ژیان زۆر ئاڵۆزن، زۆر لەوە ئاڵۆزترن کە بتوانین ئەو زانیارییانەی تێیدا هەن تەنیا بیدەینە پاڵ ڕێکەوتەوە.

٣- کاتێك کەسێك پرسیارێکی ئاڕاستەی دۆوکنز کرد، دەربارەی بابەتێك کە لەلای ئەو ڕاستە بەڵام هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نییە، دۆوکنز وەڵامی دایەوە: من(پێموایە) کە گەردوون بەشێوەیەکی خۆکرد لە نەبوونەوە پەیدا بووە، ژیان بوونێکی مادییە، عەقڵی مرۆڤ بەرهەمی هەڵبژاردنی سروشتییە وەك داروین وەسفی کردووە. دۆوکنز لە هەموو ئەو پرسە گرنگ و جەوهەرییانە تەنیا پشتی بە (بۆچوون)ی خۆی بەستووە و هیچ بەڵگەیەکی زانستی یان فەلسەفیان لەسەر شك نابات.

٤- یەکێك لە تێکەوتنە گەورەکانی دۆوکنز بریتییە لەوەی، کە قسەکانی ئەنیشتاینی دەربارەی (خودا) بەوە تەفسیرکردووە کە مەبەستی لە (سروشت)ە، هەروەك چۆن

---

(١) Deon Kinyon: مامۆستای بایۆلۆجیا لە زانکۆی سان فرانسیسکۆ، یەکێك لە لایەنگرانی بزوتنەوەی دیزاینی زیرەك.

(٢) Allan Samdage: (١٩٢٦-٢٠١٠ز)، زانای فەلەکناسی بەناوبانگی ئەمریکی.

بەردەوام پێداگری لەسەر ئەوە دەکات، کە ئەنیشتان بداتە پاڵ بێباوەڕی یاخود یەکبوون(وحدة الوجود)[1] Pantheism.

ئەمە لە کاتێکدایە کە ئەنیشتاین خۆی ئەوە دڵنیا دەکاتەوە کە باوەڕی بە عەقڵێکی حەکیمانە هەیە کە گەردوونی بەدیهێناوەو یاسا و ڕێساکانی سروشت هەڵدەسوڕێنێت. بە هەمان شێوە زۆرێك لە گەورە زانایانی هاوچەرخی فیزیا وەك هێزنبێرگ و پلانك باوەڕیان بەوە هەیە کە ئەنیشتاین باوەڕی پێیەتی. بەڵام دۆوکنز ئەو باوەڕەیان لەبەر دادەماڵێت، پێداگری لەسەر ئەوە دەکات کە بیانداتە پاڵ کۆمەڵی بێباوەڕە ماددیگەرەکان. ئەوانەی باوەڕییان وایە(هەر شتێك بە هەستەکان هەستی پێنەکرێت بوونی نییە).

هەروەها گەورە زانای فیزیا جۆن پارۆ[2] ڕەخنەیەکی گاڵتەجاڕانە ئاڕاستەی دۆوکنز دەکات و پێی دەڵێت: کێشەی تۆ لەگەڵ ئایین بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە تۆ زانایەکی ڕاستەقینە نیت، تۆ بایۆلۆجیت نەك فیزیایی[3]! لەبەر ئەوەیە تۆ ناتوانی وێنای ئەو ئاڵۆزییە بکەی کە لە ژیان و بووندا هەیە! پاشان جۆن بارۆ ڕەخنە کوشندەکەی ئاڕاستەی دۆوکنز دەکات، پێی دەڵێت: تۆ هێشتا گیرۆدەی گرێی زانایانی بایۆلۆجیای پەرسەندنی سەدەی نۆزدەهەمینی. وەك ئەوان دەتەوێ بەهەر نرخێك بێت بۆچوونی خۆت بسەلمێنیت. تەنانەت ئەگەر ئەوە لەسەر حیسابی حەقیقەتیش بێت. گومانیش لەوەدا نییە کە بەلاڕێدابردنی حەقیقەتەکان کەم تا زۆر هیچ لە تێگەیشتن لەو یاسایانە ناگۆڕێت کە گەردوون بەڕێوە دەبەن.

---

(١) یەکبوون (وحدە الوجود): مەزهەبێکی فەلسەفییە، وایدەبینێت کە خودا و بوونەوەر یەك شتن و، جیهان وێنەیەکە لە خودا، کەواتە جگە لە خودا هیچ شتێك بوونی نییە. ئەوانەی پەیڕەوی لەم مەزهەبە دەکەن باوەڕیان بەوە نییە کە جیهان بەدیهێنراوی خودا بێت. بەڵکو دەڵێن: جیهان بریتییە لە خودا و خوداش بریتییە لە جیهان.

(٢) John Parow: مامۆستای فیزیایە لە زانکۆی Memorial لە کەنەدا.

(٣) زانایانی فیزیا باوەڕیان وایە کە زانستی بایۆلۆجیا لە مێژووی زیندەوەران هەڵدەقوڵێت، لەبەر ئەوە دەیخەنە کۆتایی زانستە بیرکاری و تاقیگەرییەکان.

## ئایا ئەو قەزەمە بە بێرتراند راسل بەراورد دەکرێت؟!

هەندێ کەس ڕەواج بەوە دەدەن کە فەیلەسوفی گەورە بێرتراند راسل باوکی ڕۆحی دۆوکنزە، بەو پێیەی کە راسل بەرهەڵستکارێکی بەهێزی ئاینە ئاسمانییەکان بووە، بەرهەڵستییەکەی زۆر گاڵتەجاڕی و ئاماژەی زیادەڕەوی تێدابووە، بەڵام لەڕاستیدا جیاوازی یەکجار زۆر لە نێوان ئەو دوو کەسەدا هەیە.

کاترین تەیت Katharine Tait کچی راسل لە کتێبەکەی (باوکم،بێرتراند راسل My father. Bertrand Russel ) پێمان دەڵێت باوکم هەمیشە هەستی بە بۆشاییەك کردووە لە عەقڵ و دڵیدا، کە پێشتر لەکاتی منداڵیدا خودا ئەو بۆشاییەی داگیرکردبوو، بەڵام دواتر بەتاڵ بوو و نەیتوانی شتێك بدۆزێتەوە کە ئەو بۆشاییەی بۆ پڕبکاتەوە. کاترین دەڵێت باوکی هەمیشە هەستی بەوە دەکرد کە جەوهەری مرۆڤ سەر بەم جیهانە ماددییە نییە، هەر لەسەرەتاکانی کاری فەلسەفیدا و بەدرێژایی ژیانی بەگرنگییەوە و کۆڵنەدانەوە بەدوای خودادا گەڕاوە.

هەروەك چۆن لەگەڵ بیرمەندە گەورەکاندا ڕوودەدات، بێرتراند راسل(وەك کچەکەی بۆمان دەگێڕێتەوە) لەگەڵ زۆر مەسیحی دەمارگیردا ڕووبەڕووبۆتەوە، ئەوانەی ئایین بە شێوازێك دەخەنەڕوو، کە لێبوردەیی پەیوەندی نێوان خودا و مرۆڤ، مرۆڤ و مرۆڤ ناهێڵێت، هەروەك چۆن جوانی ژیان ناهێڵێت، ئەمەش وای لە راسل کرد بەتەواوی لە ئایین رابکات، تا ئەو ئاستەی کە کچەکەی بەتەواوی شکستی هێنا لەوەی لەگەڵ باوکیدا بکەوێتە گفتوگۆی ئاینییەوە.

کۆژانەکانی دەروونی بێرتراند راسل لە پێناو گەڕان بەدوای حەقیقەتدا لەکوێ و، ئەو کوێرییەی ڕیچارد دۆوکنز لەکوێ! هەروەها دۆوکنز لەوە بێئاگایە کە پێشەوا باڵاکەی-وەك بانگەشەی بۆ دەکات-بێرتراند راسل خۆی دەربارەی خۆی دەڵێت کە لە هەر چەند ساڵێکدا پەیڕەوی لە مەزهەبێکی فەلسەفی نوێ

دەکات(یان دایدەمەزرێنێت)، ئەمەش نەریتی زۆربەی فەیلەسوفە گەورەکانە وەك ئەنتۆنی فلو.

دۆوکنز بەراوردێك لەنێوان بێرتراند راسل وەك فەیلەسوفێکی بێباوەڕ کە بەدوای ئەمانەتی فیکرییەوەیە لەگەڵ فەیلەسوف ئەنتۆنی فلودا دەکات و دەڵێت ئەنتۆنی فلو دوای بە تەمەندا چوونی لە بێباوەڕی هەڵگەڕاوەتەوە و رایگەیاندووە کە(خودایەك هەیە)، تەنیا بۆ ئەوەی راگەیاندنەکان باسی بکەن، ئەمە لەکاتێکدا کە بێرتراند راسل فەیلەسوفێکی گەورەبووە و خەڵاتی نۆبڵی وەرگرتووە. ئایا تێبینی گاڵتەجارییەکەی دۆوکنزت کرد لەکاتی بەراوردکردنەکەدا کە دەربارەی ئەنتۆنی فلو گوتی(دوای ئەوەی بەتەمەنداچوو)و دەربارەی بێرتراند راسل کە(فەیلەسوفێکی گەورەیە)؟ دۆوکنز لەوە بێئاگایە کە بیرمەندە ڕاستەقینەکان پشتگیری لەبەڵگەکان دەکەن بەبێ گرێدانە رەچەڵەك یان ڕەگەز یان تەمەن.

ئەوە ڕێبازی دۆوکنزو ڕەوشتەکەیەتی، هەرکاتێك لە وەڵامدانەوەی شتێك بێئاگابوو؛ واز لە بابەتییەت دێنێت و بەزمانێکی پیس هێرش دەکاتە سەر کەسەکە.

باسەکەمان دەربارەی حەقیقەتی دۆوکنز بەوە کۆتایی پێدێنین کە ئەو سەر بە کۆمەڵێك لە نوسەری زانستییە، وەك کارل ساگان[١] و ئیسحاق عەزیمۆف[٢] کە تەنیا بەوە وازناهێنن کە زانا و نوسەربن، بەڵکو خۆیان بە کاهینانی زانست هەژماردەکەن و بەرگی ئامۆژگاریکاران دەپۆشن و وتار بۆ خەڵك دەدەن، بەو پێیەی کە ئەوان نێردراوی چاودێریی گرنگیدانی عەقڵین، بۆمان دیاری دەکەن

---

(١) Carl Sagan: لە ویلایەتە یەکگرتووەکان لە دایك بووە(١٩٣٤-١٩٩٦ز)، زانای بەناوبانگی فەلەکناسی و گەردوونناسی، یەکێك بوو لە گرنگیدەران بە ژیان لە دەرەوەی گەردوونەکەماندا، راوێژکاری ئاژانسی توێژینەوەکانی بۆشایی ئاسمانی ئەمریکی NASA بوو، هەروەها یەکێك بوو لەوانەی گرنگیان بە سادەکردنەوەی زانستەکان دەدا، ئامادەکاری بەرنامەی تەلەفزیۆنی (گەردوون Cosmos. A personal voyage) بوو، کە بە پڕ بینەرترین بەرنامەی تەلەفیزیۆنی دادەنرێت لە مێژوودا، کە زیاتر لە ٦٠٠ ملیۆن کەس لە ٦٠ وڵاتی جیاواز بینەری بوون.

(٢) Isaac Asimov: (١٩٢٠-١٩٩٢ز) مامۆستای کیمیای زیندەیی، لە رووسیا لە دایك بووەو بە رەچەڵەك ئەمریکییە، نزیکەی ٥٠٠ کتێبی دەربارەی سادەکردنەوەی زانستەکان و خەیاڵی زانستی هەیە.

کە لە شتە غەیبییەکاندا باوەڕمان بە چی هەبێت، هەرکەسێکیش نەیاریان بێت دەیدەنە بەر شاڵاوی نەفرەتەوە.

## فەلسەفەی بێباوەڕی لەلای دۆوکنز :

ئاڵڤین پلاتینگای فەیلەسوف لەمیانی قسەکردنی دەربارەی کتێبی (وەهم الالە)دا دەڵێت: ئەگەر زۆرێك لە بەڵگە فەلسەفییەکانی دۆوکنز لەتاقیکردنەوەی فەلسەفەی قوتابخانە ناوەندییەکاندا بخرێنەڕوو، ئەوا پلەی (کەوتن)وەردەگرن!

هەروەها فەیلەسوفی بێباوەڕ تۆماس ناجڵ هەوڵە فەلسەفییەکانی دۆوکنز بەوە وەسف دەکات، کە هەوڵی زۆر لاوازن و لەلایەن کەسێکی ئاستنزمی سەرەتاییەوە خراونەتەڕوو.

## ڕێڕەوی فەلسەفی دۆوکنز:

فەلسەفەی بێباوەڕانەی دۆوکنز لەسەر سێ چەمکی هەڵە دامەزراوە، کە دەکرێ بە سێ وشە گوزارشتییان لێ بکرێت:

هەڵدژی Contradiction

لێکچوون Similarity

ئەگەر Probability

## هەڤدژی، یان زانست یان خودا :

ئەم چەمکە وەك کۆڵکەی هاوبەشی بێباوەڕی هاوچەرخ وایە، چونکە کاتێك شۆڕشی زانستی لە ئەورووپادا بەرپا بوو، هەڵسا بە خستنەڕووی لێکدانەوەی میکانیزمی بۆ دیاردە فیزیاییە جۆراوجۆرەکان، خەڵك بەجۆرێك سەیری ئەو لێکدانەوانەیان دەکرد، کە جێگرەوەی لێکدانەوە ئامانجدارییەکانن کە رەنگدانەوەی ویستی خودان، هەر کات زانست بۆ یەکێك لە دیاردە سروشتییەکان لێکدانەوەیەکی پێشکەش دەکرد دەبووە هۆی کەمکردنەوەی باڵانسی خوایەتی و دەچووە سەر باڵانسی زانست، خەڵك ئەوەیان لەبیر کردووە کە پێکەوە کۆکردنەوەی لێکدانەوەی ئامانجدار و لێکدانەوەی میکانیزمی سروشتی شتەکانە، لە ئێستادا ڕێساکە لە ڕۆژئاوادا وایلێهاتووە، کە هەر شتێك زانست بتوانێ تەفسیری بکات پێویستی بە خودا نییە، ئەم تێکەڵبوونە هۆکاری سەرەکی پشت پەیدابوونی بێباوەڕی هاوچەرخە.

دوای داروین هەموو بیروبۆچوونەکان گوازرانەوە بۆ زانستی بایۆلۆجیا، ئیتر پەرەسەندن بە هەڵبژاردنی سروشتی لەنێوان بازدانە هەرەمەکییەکاندا بووە جێگرەوەی خودا لە بەدیهێنانی زیندەوەراندا، دۆوکنز بەم جۆرە گوزارشتی لەم چەمکە کردووە: ((ئەگەر پەرەسەندن بتوانێت ئەو دیزاینەی کە لە جیهانی زیندەوەراندا دەردەکەوێت تەفسیری بکات، ئەوا پێویست بەوە ناکات کە بیدەینە پاڵ سەرچاوەیەکی زیرەك))، ئەمە واتای ئەوە دەگەیەنێت کە هەر شتێك بە پەرەسەندن تەفسیر بکرێت پێویستی بە خودا نییە، واتا پەرەسەندن بریتییە لە بێباوەڕی. دەکرێ ئەم خستنەڕووەی دۆوکنز لە دوو پێشەکی و دەرەنجامێکدا دابڕێژرێنەوە.

**پێشەکی یەکەم:** پەرەسەندنی بایۆلۆجی: توانای لێکدانەوەی هەموو ئاڵۆزییەکانی هەیە کە لە جیهانی زیندەوەراندا بوونی هەیە.

**پێشەکی دووەم: پەرسەندنی بایۆلۆجی لەگەڵ بوونی خودادا ناگونجێت.**

کەواتە خودا بوونی نییە.

کێشەکە ئەوەیە دۆوکنز وا دەزانێت زانست پێشەکی یەکەمی سەلماندووە، پێشەکی دووەمیش شتێکی بەدیهییە.

بەڵام حەقیقەت ئەوەیە کە هەردوو پێشەکییەکە هەڵەن! چونکە زۆرێك لە زانایانی پەرسەندن دان بەوەدا دەنێن کە پەرسەندن لە بەرامبەر تەفسیرکردنی عەقڵی مرۆڤدا بێ توانایە[1]، هەروەها فرانسیس کۆلێنز هەڵەی پێشەکی دووەمی سەلماندووە کاتێك دەڵێت: کێ دەتوانێت رێ لە خودا بگرێت کە میکانیزمی پەرسەندن لە بەدیهێناندا بەکاربهێنێت.

ئای خودایە..ئایا گەمژەیی دۆوکنز بەو ئەندازەیەیە کە هەموو ڕێڕەوە بێباوەڕییەکەی لەسەر دوو پێشەکی هەڵە بنیات بنێت؟!

## لێکچوونی خودا سوپەرمانەکە

دۆوکنز بەجۆرێك مامەڵە لەگەڵ خودادا دەکات وەك ئەوەی کە (سوپەرمان) بێت، بەو پێیەی هەموو ئەو سیفەتانەی مرۆڤ هەیەتی ئەویش هەیەتی، بۆیە بۆچوونە مرۆییەکانی خۆی بەسەر خودادا دەسەپێنێت، بەڵام بە ئاستێکی گەورەتر!

### تاقیکردنەوەی دوعا (پاڕانەوە)

بۆ ئەوەی لە ڕەگەزی لێکچوون تێبگەین کە لە مەنهەجی فەلسەفەی دۆوکنزدا بوونی هەیە، با سەرنجی ئەم تاقیکردنەوە زانستییە بدەین! کە لە کتێبی (وهم الإله: لا ٦١-٦٦)دا ئەنجامی داوە و بڵاوی کردۆتەوە، ناوی ناوە (تاقیکردنەوەی دوعا Prayer experiment).

---

(١) لەوانە: ئەلفرێد والاس، هاوڕێی داروین.

دۆوکنز دوو کۆمەڵە نەخۆشی هێناوە و داوای لە کۆمەڵێك نەخۆش کردووە کە لە خودا بپاڕێنەوە تا تاکەکانی یەکێك لە کۆمەڵەکان شیفا بدات، چاودێری باری تەندروستی هەموو نەخۆشەکانی کردووە، دۆوکنز تێبینی کردووە کە پاڕانەوەکان هیچ کاریگەرییان نەبووە بۆ باشترکردنی تەندروستی ئەو کۆمەڵەیەی پاڕانەوەکەیان بۆ کراوە. ئا لەمەوە دۆوکنز ئەو دەرئەنجامەی هەڵێنجاوە کە خودا بوونی نییە، چونکە ئەگەر بوونی هەبووایە (پێویست بوو) وەڵامی پاڕانەوەکان بداتەوە!

وا گومان نەبەی کە خەریکم نوکتەیەکت بۆ باس دەکەم، بەڵکو ئەمە تاقیکردنەوەیەکی ڕاستەقینەیە کە دۆوکنز لەژێر چەند مەرجێکی زانستی ورد ئەنجامیداوە.

لەوانەیە ئەم تاقیکردنەوەیە بۆ تاقیکردنەوەی توانای کۆمپیوتەر گونجاو بێت، کە پێویستە هەموو ئەو فرمانانەی بۆی دەنێرین وەڵاممان بداتەوە، بەڵام بۆ بوون و نەبوونی خودا گونجاو نییە. دۆوکنز لە تاقیکردنەوەکەدا کەوتۆتە دوو هەڵەی گەورەی مەنهەجییەوە، کە هەموو بەڵگەیەکی لەبەر دادەماڵێت.

هەڵەی یەکەم: دۆوکنز پەیوەندی هۆکاری حەتمی (وەك بەرزکردنەوەی پلەی گەرمی ئاو بۆ سەد پلەی سیلیزی دەبێتە هۆی کوڵانی ئاوەکە) و لەگەڵ پەیوەندی هۆکاری نا حەتمی (پاڕانەوە وەڵامدانەوەی بەدوادا دێت)، دۆوکنز بەجۆرێك رەفتار لەگەڵ خودادا دەکات وەك ئەوەی هۆکارێکی سروشتی بێت، کە بچێتە ژێر باری یاساکانەوە، نەك بەو جۆرەی کە خودایەکی ئازاد بێت و سەرچاوەی ئازادی ویست بێت کە مرۆڤ هەیەتی.لەڕاستیدا دۆوکنز خودا ناچار دەکات (ئەگەر بوونی هەبێت) وەڵامی پاڕانەوە بداتەوە،ئەگەرنا بوونی نییە!

هەڵەی دووەم: ئەوەیە کە تاقیکردنەوە بوون یا نەبوونی خودا ناسەلمێنێت، بەڵکو یەکێك لە سیفەتەکانی تاقیدەکاتەوە: ئەویش ئەوەیە کە ئاخۆ خودا چاکەخوازە یاخود نا، هەروەك چۆن چەمکێکی دیاریکراوی دەربارەی چاکە بەسەردا دەسەپێنێت: ئەویش ئەوەیە کە وەڵامی هەموو ئەو کەسانە بداتەوە کە لێی دەپاڕێنەوە، هەموو ئەو شتانەشیان پێببەخشێت کە داوای دەکەن.

ئەگەر سەرنجی وەڵامدانەوەی خودای چاکەخواز بدەین بۆ پاڕانەوەکان دەبینین، کە چاکە چەند ئاستێکی هەیە. چی دەڵێی دەربارەی ئەو دیکتاتۆرە ستەمکارەی کە تووشی نەخۆشییەك بووەو وای لێدەکات کە بیر لە رەفتارەکانی و سەرەنجامەکەی بکاتەوە؟ ئایا بۆ خۆی و ئێمەش باشتر نییە کە خودا ڕاستەوخۆ وەڵامی داواکارییەکەی بۆ چاکبوونەوە نەداتەوە، هەروەها هەریەکە لە دایك و باوك دەزانن حیکمەت لەوەدا نییە کە هەموو داواکارییەکانی منداڵەکەیان جێبەجێ بکەن، تەنانەت لەوانەیە وەڵامدانەوەکە لە هەندێك حاڵەتدا لە بەرژەوەندی منداڵەکاندا نەبێت، لە ڕاستیدا ئەو چاکە گشتگیرەی کە ئێمە لە خودای گەورەوە تێیدەگەین بریتییە لە بەدیهێنانی هاوسەنگی ورد لە دامەزراوەی تەواو و کامڵدا، ئەگەرچی هەندێ کاتیش وەك زیانبەخش دەردەکەوێت[1].

چی دەڵێی دەربارەی ئەوەی ئەگەر هەموو مرۆڤایەتی پاڕانەوە و خوداش وەڵامی هەموویانی دایەوە و هەموویان بوون بە خاوەنی باشترین سیفەتی مرۆڤایەتی، ئەی چی دەڵێی دەربارەی میکانیزمی هەڵبژاردنی سروشتی، کە باشترین ئەو سیفەتانە هەڵدەبژێرێت؟ گومان لەوەدا نییە کە لە کار دەکەوێت.

چی ڕوودەدا ئەگەر بەهۆی پاڕانەوەکانەوە خودا نەخۆشەکانی تاقیکردنەوەکەی دۆکتۆری شیفابدایە، ئایا دۆکتۆر دانی بە خودای شیفابەخشدا دەنا؟ یاخود دەیوت شیفا تەنیا بەختێکی دووبارەیە؟ یاخود دەیوت کە وزەیەکی ماددی لە پاڕانەوەکە دەرچووەو بۆتە هۆی شیفا؟ یان ئەوەتا دەیوت لە ئایندەدا زانست تەفسیرێك بۆ ئەوە پێشکەش دەکات؟ یان....

---

(١) نموونە لەسەر ئەوە فەرموودەی دروستی پێغەمبەری خودایە(صلی الله علیه وسلم): ئافرەتێکی ڕەشپێست هاتە لای پێغەمبەری خوداو گوتی: من فێم هەیە و، لەکاتی فێگرتنیشدا لاشەم دەردەخەم، بۆیە داوام بۆ لە خودا بکە، پێی فەرموو(ئەگەر بتەوێ ئارام بگری ئەوا بەهەشتت پێ دەبەخشرێت و، ئەگەر دەشتەوێ داوات بۆ لەخودا دەکەم). ئافرەتەکە گوتی: ئارام دەگرم. بەڵام تەنیا داوای ئەوەم بۆبکە کە لاشەم دەرنەخەم ئەویش ئەو داوایەی بۆکرد.

**شەمشەمەکوێرە هەست بەچی دەکات؟**

بۆ بەرجەستەکردنی ئەو ئەنگی و ناڕوونییەی لە چەمکی لێکچووندا هەیە،دەرخستنی ئەو هەڵانەی لە تاقیکردنەوەی پارانەوەدا بوونیان هەیە، وچانێك لەگەڵ ئەو توێژینەوەیەدا دەدەین کە فەیلەسوفی بێباوەڕ تۆماس ناجڵ بڵاوی کردۆتەوە بەناوونیشانی: شتەکان چۆن دەردەکەون ئەگەر مرۆڤ ببێتە شەمشەمەکوێر[1]؟!

مەبەست لەو توێژینەوە چییە کە ناوونیشانەکەی لەسەرەتادا وەك شتێکی نامۆ دەردەکەوێت؟

مرۆڤ بوونی شتەکان و سیفەتەکانیان لەڕێی چاوەکانیەوە دەبینێت، کاتێك کە روناکییان دەکەوێتەسەر، هەرچی شەمشەمەکوێرە ئەوا لەڕێی کردارێکی راداری هەست دەکات بەوەی چی لەدەوروبەری هەیە، ئەمەش کاتێك شەپۆلی سەرووی دەنگیان دەکەوێتە سەر شتەکان و پاشان شەپۆلەکە دەگەڕێتەوەو دەکەوێتە گوێی شەمشەمەکوێرەکەوە. ئەگەرچی مرۆڤ و شەمشەمەکوێر هەردووکیان هەست بەو شتانە دەکەن کە لەدەوروبەریاندا هەیە، بەڵام ئەوەی هەریەکێکیان هەستی پێدەکات زۆر جیاوازە لەوەی ئەوی تریان هەستی پێدەکات، هەروەك چۆن هەست و سۆزی هەر یەکێکیان لەوی تریان جیاوازە بەرامبەر بەو شتانەی هەستیان پێدەکەن.

پاشان ناجڵ وەك تەنزێك قسە لەسەر ئەوە دەکات و دەڵێت: بۆئەوەی هەمان هەستەکانی شەمشەمەکوێرمان هەبێت، ئەوا پێویستە بەوە رازی بین کە لە هەردوو قۆڵەکەماندا پەردەی وەك شەمشەمەکوێرمان هەیە، چاوەکانمان ئەوەندە لاوازبێت کە لەڕێی ئامێری سۆنارەوە هەست بە شتەکان بکەین، لەشەواندا

---

(١) ناوونیشانی توێژینەوە بنچینەییەکە بریتییە لە what is it like to be a bat? دواتر ئەو توێژینەوەیە بوو بە یەکێك لە توێژینەوە گرنگەکانی مێژووی فەلسەفەو، دۆوکنز لە کتێبەکەی دروستکەرە کوێرەکەی کاتژمێر بە نموونە هێنارێتیەوە، ل٣٣٦.

بفڕین بۆ ئەوەی مێرو مەگەزەکان ڕاوبکەین و شەوانە لە ئەشکەوتە تاریکەکاندا بە قاچەکانمانەوە سەراوژێر هەڵبواسرێین! تەنیا پۆشینی جل وبەرگی پیاوی جاڵجاڵۆکە بەس نییە بۆ ئەوەی هەست بە هەست و سۆزەکانی شەمشەمەکوێرە بکەین. ئەم نموونەیە ئەوەمان بۆ ڕوونەکاتەوە کە جیاوازییەکی گەورە هەیە لە نێوان ئەوەی کە بەهەمان فرمان هەڵبستین(هەستکردن بەشتەکانی دەوروبەر) لەگەڵ ئەوەی کە هەمان ئەزموون و هەمان هەست بەدەستبێنێت[1].

لە نموونەی شەمشەمەکوێرەکەوە دەڵێین؛ لە ڕاستیدا هەستکردنی مرۆڤ بە هەستەکانی خوایەتی و ئەوەی کە چۆن خودا سەیری بابەتەکان دەکات شتێکی مەحاڵە، بەو جۆرە ناتوانین هەستی پێبکەین کە وێنای ئەوە بکەین ئیتر ئێمە وەك هێرقل بەهێزبووین، یاخود بە وێناکردنی خودا وەك مرۆڤێکی زەبەلاح، وەك ئەوەی کە مایکڵ ئەنجیلۆ لەسەربانی کڵێسای سستینی وێنەی کێشا، تۆ بەهیچ جۆرێك ناتوانی وێنای ئەوە بکەی کە شتەکان چۆن دەردەکەون بۆ خودای ڕەهای ئەبەدی ئەزەلی کە هۆکارەکان کاریگەرییان بەسەرەوە نییەو لە دەرەوەی کات و شوێندایە.

---

(١) ئەم توێژینەوە بەڵگەی زۆری تێدا هەیە و، لە شوێنێ تریشدا دێینەوە سەری.

## ئەگەری: ئەوانەیە بەڵێ، ئەوانەیشە نەخێر!

دۆوکنز وای دەبینێت کە مەحاڵە بە یەقینەوە هەموو ئەو شتانە بسەلمێنین یان نەریێ بکەین کە خەیاڵی بەپێتی هەر مرۆڤێك خەونی پێوە دەبینێت؛ وەك ساردکەرەوەی چای مایکرۆسکۆپی کە لە بۆشایی ئاسماندا دەخولێتەوە[1]، یان ئەو دێوانەی لە باخچەدا دەژین، یاخود ئەو وەحشە فڕۆکەی لە ماکەڕۆنەی ئەسپاگتی دروستکراوە، یان خودا! یان...، کەواتە پێویست بەوە ناکات خۆمان بە سەلماندن یان نەرێکردنی بوونی ئەو جۆرە شتانە سەرقاڵ بکەین، بەڵکو پێویستە کار لەسەر ئەوە بکەین کە ئاخۆ بوونیان (ئەگەرە) یاخود نا[2].

دۆوکنز واز لە ساردکەرەوەی چای و دێوو وەحشی ئەسپاگتی دێنێت، بەو پێیەی کە تەنیا خەیاڵن و گرنگ نین، دێت قسە لەسەر وەهمی خودا دەکاتلەمەش بەهۆی چەند هۆکارێکەوە؛ کە گرنگترینیان بریتییە لەوەی کە دیاردەکانی گەردوون و ژیان و مرۆڤ (فێڵمان لێدەکەن)و وادەردەکەون وەك ئەوەی دیزاین کراون، بەمەش زۆر کەس دەخەڵەتێنن و وایان لێدەکەن کە دیزاینەرێکی زیرەك لە پشت ئەو دیاردانەوە هەیە! بەمەش تەمەنی خۆیان بە دوای شتگەلێکی بێ سوود بە هەدەر دەدەن، هەروەها ئایینەکان دەبنە هۆکاری کارەساتی زۆر مەترسیدار بۆ مرۆڤایەتی!

لە کۆتاییدا دەڵێین بێگومان گەردوونێك کە خودای تێدایە زۆر جیاوازە لە گەردونێك کە خودای تێدا نەبێت[3].

---

(١) بێرتراند راسل ئەو نموونەیەی هێناوەتەوە و، مەبەستی لەوەیە کە تۆ ناتوانی نکۆڵی لە بوونی ساردکەرەوەی چای قەبارە مایکرۆسکۆپی بکەیت، کە بە دەوری خۆردا دەخولێتەوە؛ لە نێوان زەوی و مەریخدا، ئەمەش بەهۆی بێتوانایی بینینی بزنەوەرێکی ئاسمانی بەو قەبارە بچوکە.

(٢) The god Delusion.p.54-51

(٣) The god Delusion.p.13.55.31

بۆ رونكردنەوەی گاڵتەجاڕی و چەمكی ئەگەری (الاحتمالية)، با سەرنجی ئەم گفتوگۆیە بدەین: لە یەكێك لە دیبەیتەكاندا[1]، فەیلەسوفی بیركاری جۆن لینۆكس بە دۆوكنزی بێباوەڕی ڕاگەیاند كە سێرجۆن مادۆكس[2] ئەوەی رەتكردەوە دان بەوەدا بنێت كە گەردوون سەرەتای هەبێت، ئەمەش تەنیا بۆ ئەوەی كە پشتگیری لە رای دیندارەكان نەكات بە داننان بە خودای بەدیهێنەر! بەڵام كاتێك بەڵگەكان یەك دوای یەك هاتن دەربارەی ڕاستی بیردۆزی تەقینەوە گەورەكەی گەردوون، مادۆكس رایگەیاند كە ئێستا ئەوانەی دەڵێن گەردوون لە نەبوونەوە پەیدابووە بەڵگەیەكی بەهێزیان هەیە. لەو كاتەدا دۆوكنز دەستی كردەوە بە قسەی بێ بنەما و گوتی: ئەگەر تەنیاو دوو ئەگەر بوونیان هەبێت، ئەوەی كە گەردوون سەرەتایەكی هەبێت یاخود قەدیم و بێ سەرەتا بێت، ئەوا دیندارەكان دەرفەتی ٥٠٪ یان هەیە كە ڕاست بن و دەرفەتی ٥٠٪ ش هەیە كە هەڵە بن، رێك وەك بێباوەڕەكان!!

ئای خودایە، ئەم هەموو نابابەتی و نازانستییە چییە! لە هەڵوێستێكی لەم جۆرەدا پێویست بەوە ناكات كە بچینە ژێر باری چەمكی ئەگەرەوە، بەڵكو گرنگەكە ئەوەیە كە ئاخۆ بەڵگەكان لەسەر ئەوەی كە گەردوون سەرەتای هەیە تا چەند ڕاستن. ئەو هەڵوێستەی دۆوكنز هاوشێوەی ئەو پزیشكەیە كە بۆ دڵنیابوون لە مردنی كەسێك بانگكرا، پزیشكەكە بە خزمانی مردووەكەی گوت: ٥٠٪ ئەگەری ئەوەیە كە مردوبێت و ئەگەری ٥٠٪ ش هەیە كە زیندوو بێت، بۆیە نابێت بنێژرێت! ئایا كارە ڕاستەكە ئەوە نییە كە پزیشكەكە بەدوای بەڵگەی دڵنیاكەرەوەی مردنەكەدا بگەڕێت؟

بۆ دڵنیاكردنەوەی ڕەگەزی ئەگەری، دۆوكنز دەچێتەوە سەر ئارەزووە وتاریێژییەكەی، بەبێ پێشكەشكردنی هیچ بەڵگەیەكی(ڕاستەقینە) دەڵێت: ((تا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم(پێش داروین) هەموو كەسێكی عاقڵ باوەڕی وابوو كە زیرەكییەكی بەرز هەیە كە گەردوون و هەموو ئەو شتانەی تێیدا

---

(١) دیبەیتەكە لە ویلایەتی ئالاباما ئەنجامدرا.

(٢) Sir John maddox: سەرنوسەری گۆڤاری Nature.

هەیە، بە مرۆڤیشەوە بەدیهێناوە، بەڵام دوای داروین هەموو ئەو دیزاینەڕوونەی دەبینین دەگێردرێنەوە بۆ پەرسەندنی کوێرانە، بەمەش ئەگەری بوونی خودا بە ئەندازەیەکی گەورە پاشەکشێی کرد)).

لە ڕاستیدا ڕەگەزی ئەگەری (الاحتمالیە) دۆوکنز دەخاتە هەڵوێستێکی زۆر قورسەوە، چونکە ئەو وایدەبینێت کە بوونی خودا پرسێکی زۆر گرنگە، لە هەمان کاتدا وایدەبینێت کە لە رووی زانستی و فەلسەفییەوە مەحاڵە کە ئەو ئەریێ و نەرێیە یەکلایی بکرێتەوە!! بەمە دۆوکنز پرسی خوایەتی بە تەواوەتی بەلارێدا دەبات، دەیگۆڕێت بۆ ئەگەر ئەمە لە باشترین دۆخدا - : واتا ڕاست ئەوەیە کە خودا بوونی هەیە یان ڕاست ئەوەیە کە خودا بوونی نییە!!

ئەوەی جێگای سەرسوڕمانە بریتییە لە بەکارهێنانی چەمکی ئەگەر بە شێوەیەکی پێچەوانە! چونکە ئەگەر لێرەدا چەمکی(ئەگەر) بۆ (گومان) دروستکردن لەسەر پرسێك بەکاربێنێت کە بەڵگەی زانستی و عەقڵی لەسەر هەیە، ئەوا لە شوێنی تردا هەمان چەمك بۆ (یەکلاکردنەوە)ی پرسگەلێك بەکاردێنێت کە مەحاڵە روویدەن!!

هەروەها ئەو وایدەبینێت هەرشتێك مەحاڵێکی رەهایە دەکرێ روویدات. لێرەدا دۆوکنز دەکەوێتە هەڵەیەکی ئابڕوبەرەوە، ئەویش بریتییە لە تێکەڵکردنی (ئەوەی لە بیرکارییەوە مەحاڵە) لەگەڵ(ئەوەی لە ڕووی واقیعییەوە مەحاڵە) ئەو جیاوازییەش دوای کەمێکی تر دەخەینەڕو.

## بێباوەڕ یان گومانکار یان نەزانکار؟

دۆوکنز لەکتێبەکەیدا (وهم الإله) پلەبەندییەکی داناوە scale لە ١تا ٧، کە تیایدا مرۆڤەکان بەپێی ئاستی باوەڕیان بەخودا ڕێکدەخات، بۆ نمونە ئەوانەی باوەڕی ڕەهایان بە خودا هەیە(١) وەردەگرن، ئەوانەش کە بە تەواوی نکۆڵی لێدەکەن (٧) وەردەگرن، دۆوکنز خۆی لە پێگەی ٦.٩ دادەنێت، لە دیمانە تەلەفیزیۆنییەکەشیدا لە فێبرەوەری ٢٠١٢دا هەمان قسەی دووبارە کردەوە. ئەو قسەیە وای لە زۆرێك لە باوەڕداران کرد گومانی باش بە دۆوکنز ببەن، دەنگیان هەڵبڕن و بڵێن کە توندڕەوترین بێباوەڕ دەستیکردووە بە پێداچوونەوە بە هەڵوێستە بێباوەڕییەکەیدا، بەڵام حەقیقەتەکە شتێکی تر بوو. بێباوەڕان بەردەوام ئەو قسەیە دووبارە دەکەنەوە کە زانست ناتوانێت بوونی خودا بسەلمێنێت، دواتر دەڵێن، هەروەك چۆن ناشتوانێ نەبوونی بسەلمێنێت، ئەمەیە لۆژیکی دۆوکنز لە قسەکەیدا کە دەڵێت ناتوانێت بەتەواوەتی نکۆڵی لە بوونی خودا بکات، بەمەش خۆی خستۆتە پلەی ٦.٩. ئەمەش بە بێتوانایی دادەنرێت، ڕێك لە بێتوانایی لە نەرێنکردنی ساردکەرەوەی چای گەردوونی، دێوەکانی باخچە، وەحشی ماکەرۆنەی ئەسپاگتی.

لە ڕاستیدا نابێت بەم قسەیەی دۆوکنز بخەڵەتێین، چونکە دۆوکنز ناگات بە پلەی بەرزی لائەدری و گومانکارە ڕاستگۆکان، ئەوانەی کە ڕاستگۆیانە بەدوای حەقیقەتدا دەگەڕێن، چونکە ئەو خۆی لە زۆر شوێندا بەڕاشکاوی باسی ئەوەی کردووە کە ئەو تەنیا بێ ئایین نییە، بەڵکو دژی ئایینە، بەتایبەتی ئایینی ئیسلام. دۆوکنز چەندین جار باسی لەوەش کردووە کە ڕووداوەکانی ١١ی سێبتەمبەر، کە دەدرێنە پاڵ ئوسوڵییە ئیسلامییەکان ئەویان لە بێباوەڕێکی ئاشتیخواز کردۆتە بێباوەڕێکی ئوسوڵی توندڕەو fundamentalist!

## هەندێ لایەنی ڕێککەوتن :

زۆر بە وردی بەناو کتێبی (وهم الإله)دا گەڕام، بەڵکو شتێك بدۆزمەوە کە لەسەریدا لەگەڵ دۆوکنز هاوڕابم، لە ئەنجامدا دوو چەمکی رووکەشم دەستکەوتن، کە کێشە نییە ئەگەر وەریبگیرێن:

دۆوکنز ئەوە ڕەتدەکاتەوە کە بە(بەڵگەی ئەزموونی تایبەتی) ناسراوە، کە ئاماژەیە بۆ هەستکردن بە بەرزبوونەوە، ئەوەی کە هەندێکیان شتی سەرنجڕاکێش ئاشکرا دەکەن، دەیکەن بە بەڵگە لەسەر بوونی خودا. دۆوکنز وایدەبینێت کە ئەو ئەزموونانە تایبەتین و جگە لە خودی ئەو کەسەی دەیانبینێت و تێیاندا دەژی کەسی تری پێناچار ناکرێت.

هەروەها دۆوکنز ئەوەش ڕەتدەکاتەوە کە بە(بەڵگەی زانا دیندارە بەناوبانگەکان) ناسراوە، کە هەندێ کەس وەك بەڵگەیەك بۆ ڕاستی خوایەتی و ئایین دەیخەنەڕوو، بەهۆی ئەو پێگە زانستییە بەرزەی ئەو زانایانە هەیانە. لەوەشدا لەگەڵ دۆوکنز هاوڕاین، بەڵام بەو مەرجەی قسە و هەڵوێستەکانیان ساختە نەکات و نەڵێت کە بێباوەڕن(هەروەك چۆن لەگەڵ ئەنیشتایندا دەیکات). ئەمەش ڕێگریمان لێناکات کە هەڵوێستەکانی زانایانی دیندار بخەینەڕوو(وەك زانایانی فیزیای چەندی)، لەڕێی خستنەڕووی بەڵگەکانیان.

## مەنهەجی فەلسەفی دۆوکنز لە تەرازوودا:

مەنهەجی فەلسەفی بریتییە لەو ڕێگەیەی کەسی بیرمەند شوێنی دەکەوێت تا بگاتە حەقیقەت. بە پشتبەستن بەو پێناسەیە، بیرمەند هەڵدەستێت بە دوورخستنەوەی ئەو شتانەی بە هەڵە دەیانبینێت و بەوەوە دەیبەستێتەوە کە بە ڕاست دەیانبینێت، بۆ ئەوەی دیدێکی تەواوەتی دەستبکەوێت لەسەر پرسێکی

دیاریکراو. جا ئەگەر سەرنجی ئەو سێ ڕەگەزە بدەین کە مەنهەجی فەلسەفی دۆرکنزی لەسەر دامەزراوە (هەڵبژاردن - لێکچوون - ئەگەری) دەبینین کە ڕێگا بە پەیڕەویکردن لە هیچ شتێکی تر نادات!!

چونکە ڕەگەزی (هەڵبژاردن) لە سەرەتادا دەمانخاتە دووڕیانێکەوە، هەڵبژاردنەکە هەر لە سەرەتاوە یەکلایی کراوەتەوە. یان زانست یان خوایەتی! بەرپێیەی ناکرێ (لەلای دۆرکنز) ئەو دووانە پێکەوە کۆبکرێنەوە. ئەگەر هەر بەراستی ناتوانرێت ئەو دووانە پێکەوە کۆبکرێنەوە ئەوا من زانست هەڵدەبژێرم!!

دۆرکنز لە ڕەگەزی (ئەگەری)دا. لە پێشەکییەکی پێشوەختەوە دەستپێدەکات، کە مەحاڵە ئەوە بسەلمێنرێت کە خودایەك هەیە. ئیتر بۆچی کات و توانامان بەفیڕۆ بدەین لەپێناو پرسێکی وەهادا کە بێتوانایی لە سەلماندنی یەکلایی بۆتەوە.

ڕەگەزی ئەگەری.دۆرکنز دەخاتە بەردەم هەڵوێستەیەکی قورسەوە، چونکە ناتوانێت (ئەگەر)ی بوونی خودا ڕەت بکات. کەواتە دەرگای خوایەتی هەر بە کراوەیی دەمێنێتەوە. لێرەدا دۆرکنز ڕەگەزی سێیەم دەخاتەڕوو، ڕەگەزی (لێکچوون). کە گومانت ناهێڵێت و هەموو ئەگەرێکی بوونی خودا ڕەتدەکاتەوە! چونکە ڕەفتارە خوداییەکان وەك ڕەفتارە مرۆییەکانی ئێمە نابێت. ئەمەش واتلێدەکات لێپرسینەوە لە خوا بکەیت لەتەك هەر کردارێك کە پێچەوانەی ئەوە بێت کە لێمان چاوەڕوان دەکرد. لە گۆزەپانەکە دەربدەکەی. دەگەڕێینەوە بۆ چوارگۆشەی سفر، چوارگۆشەی بێباوەڕی.

فەیلەسوفی بێباوەڕ تۆماس ناجل مەنهەجەکەی دۆرکنز سەبارەت بە سەرنجی دەربارەی خودا ڕەتدەکاتەوە و دەڵێت: ((لەڕاستیدا ئەو خودایەی(باوەڕداران و بێباوەڕان باسی دەکەن) بوونێکی ماددی ئاڵۆز نییە کە نیشتەجێی جیهانە سروشتییەکەمان بێت(وەك دۆرکنز پێناسەی دەکات). لەبەر ئەوە تەفسیرکردنی بوونی خودا بەوەی کە ئەگەرێکە و لە دەرئەنجامی کۆبوونەوەی بەرێکەوتی گەردیلەکانەوە بەبێ پەرەسەندنێکی هەرەمەکییەوە پەیدابووە ڕەتکراوەیە.

لەڕاستیدا ئەو خودایەی کە ئاکۆکی لەسەرە بوونێکی تەواو جیاوازە لەو جیهانە مادییەی ئێمە و زانستە سروشتییەکەمان، لەڕاستیدا بوونێکی ناماددی بەتوانایە بۆ بەدیهێنانی بوونێکی ماددی. لەڕاستیدا ئەو تەفسیرە ماددییەی دۆوکنز هەموو کات پەیڕەوی لێدەکات تاکە تەفسیر نییە، بەڵکو تەفسیری عەقڵی mental و، ئامانجداری purposive و، مەبەست intentional، هەمووشیان لەپشت تەفسیرە ماددیەکەو یاساکانی سروشت وەستاون[1].

ئێمەش لەگەڵ ناجلدا هاوڕاین، بەوەی کە مەنهەجی دۆوکنز جێگای ڕەزامەندییە، ئەگەر بێت و ئێمە بەدوای خودایەکی ماددی خاوەن جەستەیەکی زل و زیرەکییەکی وەك زیرەکییەکەی ئێمەدا بگەڕێین. هەروەها ناجل لەوەدا لەگەڵ ئێمە هاوڕایە ئەو خودایەی ململانێ و دەمەتەقێی لەسەرە بەو جۆرە نییە. لەڕاستیدا ئەوەی ئێمە دەیسەلمێنین و دۆوکنز هەوڵدەدات نکۆڵی لێبکات بوونێکی تەواو جیاوازە، هەڵوێستەکەی دۆوکنز ڕێك وەك ئەوە وایە نکۆڵی لەوە بکەین بوونەوەرێکی وەها بوونی هەیە کە لە ڕێگەی ئامێری سۆنارەوە دەرك بە بوون دەکات، تەنیا لەبەر ئەوەی کە ئێمە وەك مرۆڤ لەڕێی بینینەوە دەرك بە بوون دەکەین!

مەنهەجەکەی دۆوکنز وەك ڕێگای هەڵە وایە، کە دەتگێڕێتەوە خاڵی سەرەتا. ئای کە مەنهەجێکی شەیتانییە، وەك پەرژینێکی ئاسنین وایە بۆ پاراستنی بیروباوەڕی بێباوەڕی، عەقڵ ناتوانێت بیبڕێت.

گومانیش لەوەدا نییە کە ریچارد دۆوکنز خۆی یەکەمین قوربانی ئەو مەنهەجەیە.

---

(1) Tomas Nagel: The fear of religion P.26

## خودا لە فەلسەفەی دۆوکنزدا :

### خودا گەردوونی بەدیهێناوە، ئەی کێ خودای بەدیهێناوە؟!

دۆوکنز بەناوبانگترین کتێبی خۆی کە لە هەموو کتێبەکانیشی زیاتر پشێوی درووست کردووە، کتێبی (وهم الإله). لەسەر ئەو پرسیارە ساکارە دادەمەزرێنێت، کە ئێمە لە تەمەنی هەرزەکاریدا و لە ئامادەییدا ئەو پرسیارەمان دەکرد، تا وایلێهاتووە کە ئەو جۆرە بێباوەڕییەی کە لەسەر ئەو پرسیارە دادەمەزرێت بە بێباوەڕی منداڵکارانە ناوی ببەم!

دۆوکنز لە کتێبەکەیدا زۆر جار ئەو قسەیەی دووبارە دەکاتەوە، کە دەڵێت: ((هیچ بەڵگەیەکی فەلسەفی یان زانستی لەسەر بوونی هۆکاری سەرەتایی بوونی نییە، چونکە ئەو بەڵگەیە لە کاتی گەڕان بەدوای هۆکاری ئەو هۆکاری یەکەمینە بەبادا دەچێت))[1]. ئێمە لە تەوەری سێیەمدا بەرپەچی ئەو لۆژیکە نەخۆشەمان دایەوە، سەلماندمان کە پێویستە هۆکاری یەکەمین هیچ هۆکارێکی نەبێت، ئیتر پرسیارکردن دەربارەی هۆکاری بوونێك کە هیچ هۆکارێکی نییە پرسیارێکی گەمژانەیە.

عیلمی کەلامی ئیسلامی بەر لە هەزار ساڵ وەڵامی ئەو پرسیارەی داوەتەوە، لاهوتی مەسیحیش لەوەوە وەریگرتووە، پاشان فەلسەفەی نوێ وەریگرتووە. هەروەها ئەنتۆنی فلو دانی بە هەمان شت دانا کاتێك لە بێباوەڕییەوە بەرەو باوەڕ ڕۆیشت، بابەتەکەی لە قسەیەکی حەکیمانەدا کورتکردەوە: پێویستە بەدیهێنەری یەکەمین بوونی هەبێت کە هەموو شتێکی بەدیهێناوە.

---

(١) لاپەڕەکانی: ١٠٩،١١٤،١٢٠،١٤١،١٤٣،١٤٧،١٥٥،١٥٦

## حەقیقەتی مەوجودی ئەزەلی :

کاتێك دۆوکنز پرسیارەکەی دەخاتەڕوو: کێ هۆکاری یەکەمینی بەدیهێناوە؟ ئەمە بە واتای ئەوە دێت کە بوونی هەر مەوجودێکی ئەزەلی بەدیهێنراو رەتدەکاتەوە، ئەو رەتکردنەوەیەش رەنگدانەوەی کەموکورتییەکی هزری ترە، چونکە دۆوکنز - هاوشێوەی بێباوەڕەکانی پێشووی خۆی لە یۆنانییە کۆنەکان، هەروەها مارکسییەکانیش - پەیڕەوی لەو لۆژیکە دەکات، کە وزە / ماددە ئەزەلییە و هۆکاری یەکەمینی گەردوونە. واتا ئەوان بەوە رازین کە ماددەی نا زیندووی بێ عەقڵ ئەزەلی بێت، بەڵام ئەوە کە خودا ئەزەلی بێت ئەوەیان شیاوی قەبوولکردن نییە!!

لە ڕاستیدا ناکۆکی نێوان بێباوەڕەکان و دیندارەکان لەسەر بوونی حەقیقەتێکی یەکەمینی ئەزەلی نییە، چونکە هەردووکیان لەسەر بوونی مەوجودێکی ئەزەلیدا کۆکن، بەڵکو ناکۆکییەکە لەسەر ماهییەتی حەقیقەتی ئەزەلی یەکەمینە: سروشت یان خودا؟

ئێمە لە تەوەرەی سێیەمدا باسمان لەوە کرد کە ناکرێ سروشت هۆکاری یەکەمین بێت، چونکە سروشت هیچ نییە جگە لە وزەو ماددە و کات و شوێن، زانست سەلماندوویەتی کە هەریەك لەو چوار ڕەگەزە سەرەتایان هەیە، واتا بەدیهێنراون، کەواتە سروشت بەدیهێنراوە، بەمەش ناکرێ هۆکاری یەکەمین بێت.

ئێمەش هەمان پرسیارەکەی دۆوکنز بۆ دیندارەکان، ڕووبەڕووی دۆوکنز خۆی دەکەینەوە: ئەگەر سروشت بەدیهێنەر بێت، ئەی کێ بەدیهێنەرەکەتی بەدیهێناوە؟

## زاتی خودا، ماددەی ئاڵۆز پێشکەوتووە؟

دۆوکنز وایدەبینێت کە شتە زیرەکەکان(وەك مرۆڤ) پێویستە ئاڵۆز بن، ئەو شتە ئاڵۆزانەش بە پەرەسەندن نەبێت بەدی نایەن، لەبەر ئەوە ئەگەر خودایەکی زیرەك بوونی هەبێت کە مرۆڤ و بوونی بەدیهێناوە، ئەوا پێویستە زۆر ئاڵۆز بێت و لە دەرەنجامی کردارێکی پەرەسەندنییەوە پەیدا بووبێت[1]! بە پشتبەستن بە مەنهەجە فەلسەفییەکەی، کە وەك(ئەگەر) لێکۆڵینەوە لەسەر خودا دەکات، دۆوکنز دەڵێت: لەڕاستیدا بوونی خودای(ئاڵۆزترین) ئەگەری کەمترە لە بوونی شتە (سادەترین)ەکان، کە هەوڵدەدەین لەڕێی بوونەوە تەفسیریان بکەین. دۆوکنز ئەو بەرهەڵستکارییەی لەسەر بوونی خودا بە (بەڵگەی ئاڵۆزکردنی خودا) ناو دەبات[2].

ئەو بەرهەڵستییەی دۆوکنز هەڵەیەکی ڕوونە، چونکە زۆر کات ئێمە شتێکی سادەترین بەشتێکی ئاڵۆزترین تەفسیر دەکەین بەبێ ئەوەی کە بوونی ئاڵۆزترینەکە ئەگەری کەمتر بێت. بۆ نموونە کەوتنی سێوێك بە یاسای کێشی نیوتن یان بە لاربوونەوەی کات و شوێن(بیردۆزی ڕێژەیی)تەفسیر دەکەین، هەروەها بوونی گەردیلەکان و بنچینەیان و تایبەتمەندییەکانیان بە فیزیای چەندی تەفسیر دەکەین، کە بریتییە لە یەکێك لە ئاڵۆزترین زانستەکان[3].

ئەگەر خستنەڕووەکەی دۆوکنز ڕاست بێت، ئەوا پێویستە تەفسیرکردنی گەردوون بە فیزیای کوانتەم کە زۆر لەو ئاڵۆزترە یان بە وزە کە لێی تێناگەین و حەقیقەتەکەی نازانین، ڕەتبکەینەوە، ڕێك وەك ئەوەی کە حەقیقەتی خودا نازانین.

---

(١) The God Delusion P. 31-73

(٢) The God Delusion P. 147

(٣) ریچارد فیمان پێمان دەڵێت کە هیچ کەس نازانێت چۆن فیزیای کوانتەم کار دەکات و، هیچ کەسیش ماهییەتی وزە نازانن کە ماددەی لێ پێکدێت!

ئەو هەڵەیەی دۆوکنز هەڵەیەکی مەنهەجییە، چونکە گرنگ ئەوە نییە کە تەفسیرەکە سادەترین یان ئاڵۆزترین بێت، بەڵکو(توانای لێکدانەوە و تەفسیرکردن) گرنگە، بێگومان ئەگەر زانایەکی شوێنەوارناس و جەفریاتەکان دوو هێڵی کێشراو بە شێوەیەکی ڕێك و پێك لەسەر دیواری ئەشکەوتێکدا ببینێت، ئەوا دەڵێت کە بوونەوەرێکی زیرەك ئەو هێڵانەی کێشاوە، بە هیچ جۆرێك گێڕانەوەی ئەو دوو هێڵە بۆ سەرچاوەیەکی ئاڵۆزتر بەوە هەژمار ناکات کە لە ڕووی زانستییەوە هەڵە بێت. ئایا دەکرێ ئەوە ڕەتبکەینەوە کە دۆوکنز نوسەری کتێبی (وهم الاله)ە، تەنیا لەبەر ئەوە کە دۆوکنز لە کتێبەکەی ئاڵۆزترە؟! وانازانم دۆوکنز بەوە ڕازیبێت.

## سیفەتەکانی خودا :

هەروەها دۆوکنز دەپرسێت: چۆن دیندارەکان زانستیانە سیفەتەکانی ئەو خودایە دەسەلمێنن کە باوەڕیان پێی هەیە؛ وەك ڕەهایی توانا، ڕەهایی زانست، وەڵامدانەوەی دوعا، لێخۆشبوون لە تاوانەکان،...؟ لەژێر ناونیشانی (بەڵگە لە کتێبی پیرۆزەوە)[1] دۆوکنز هەوڵێکی زۆر دەدات بۆ پینەکردنی ڕەتکردنەوەی هەموو ئەو سیفەتانەی خودا کە لە کتێبی پیرۆزدا هاتوون، بەو پێیەی کە جگە لەو کەسانەی باوەڕیان پێیان هەیە کەسی تر بە باوەڕهێنان بەو سیفەتانە ناچار ناکرێت. ئێمەش پێی دەڵێین مەنهەجی ئیسلام، کە لەگەڵ لۆژیکدا یەکانگیر دێتەوە بریتییە لە سەلماندنی بوونی خودا و هەندێك لە سیفەتەکانی، هەروەها سەلماندنی ڕاستی و دروستی قورئانی پیرۆز، هەموو ئەوانەش لەڕێی بەڵگەی زانست و عەقڵەوە[2]، دوای ئەوە باوەڕهێنان بەو شتانەی تیایدا هاتووە دەبێتە شتێکی بەدیهی و حەتمی، هەموو سیفەتەکانی خودا دەگرێتەوە.

---

(١) The God Delusion P. 92-97

(٢) خوا یاریبێت بابەتی(سیفەتەکانی خودا لە زانست و فەلسەفەدا) لە کتێبی ئایندەماندا باسی دەکەین.

## خـوداى دۆوكـنز :

**ئەگەر و ڕێكەوت**
**بە هەموو شتێك رازییە، تەنیا خودا نەبێت!**

گەورەترین شت كە سەرنجی خوێنەری نووسینەكانی دۆوكنز رادەكێشێت، باوەڕی بێ سنوور و نا لۆژیكییەكەیەتی بە (ئەگەر و ڕێكەوت)ەوە، چونكە ئەو دووانەی كردۆتە لێكدەرەوەی هەموو كێشەكانی بەدیهێنان و تەنانەت كردوونیەتی بە خودای خۆی!

دۆوكنز باوەڕی وایە كە هەر ڕووداوێك، هەرچەندە ڕوودانی مەحاڵ بێت، دەكرێ ڕێگای ڕوودانی بەشێوەیەكی زانستی لەلاڕێی ئەگەر و ڕێكەوتەوە تەفسیر بكرێت! با بە یەكەوە سەرنجی ئەو نموونەیە بدەین كە دۆوكنز خستویەتییەڕوو[1].

((ئەگەر پەیكەری مەڕمەڕی مەریەمی موقەددەس بە دەستی ئاماژەمان بۆ بكات، ئەوا ئەو كارەی بە موعجیزە هەژمار دەكەین؛ چونكە ئەزموون و زانیارییەكانمان دڵنیامان دەكەنەوە كە مەحاڵە مەڕمەڕ بەم شێوەیە رەفتار بكات. ئەگەر مەنهەجی زانستی ڕوودانی موعجیزە رەتبكاتەوە، بەڵام بە هیچ جۆرێك ئەو ڕووداوە بە (مەحاڵ) دانانێت، ئەگەرچی ئەگەری ڕوودانیشی زۆر دوور بێت)).

دۆوكنز ئەو ئەگەرەمان بۆ ڕووندەكاتەوە و، دەڵێت: ((لە بارودۆخی ئاساییدا بەشەكانی مەڕمەڕ بەریەك دەكەون و ئاراستەی هەڕەمەكی پاڵ بە یەكترەوە

---

(1) The Blind Watch Maker. New York: Norton 1996. P.159
پاشان ئەو نموونەیەی لە كتێبی (وهم الإله) دا دووبارە كردۆتەوە P.373-374

دەمێنن تا دەچنە ئاستی یەکترەوە، هەر لەبەر ئەوەشە کە بەشەکانی پەیکەرەکە بە جێگیری دەمێننەوە. بەڵام ئەگەر گونجان coincidence - بە ڕێکەوتی ڕەها - رووبدات، هەموو بەشەکانی مەڕمەڕەکە لە قۆڵی پەیکەرەکەدا بە هەمان ئاراستە و لە یەك کات و ساتدا بجووڵێن، ئەوا دەکرێ قۆڵی پەیکەرەکە بەو ئاراستەیە بجوڵێت، پاشان ئەگەر ئەو بەش و تەنۆلکانە ئاراستەی جووڵەیان بگۆڕین - هەمدیسان بەڕێکەوتی ڕەها - ئەوا دەکرێ قۆڵی پەیکەرەکە بە ئاراستەی پێچەوانە بجووڵێت. بەم شێوەیە پەیکەرەکە بە دەستی ئاماژەمان بۆ دەکات)).

پاشان دۆوکنز دەڵێت: ((بۆ ڕوودانی ئەمە هیچ بەربەست و مەحاڵێکی بیرکاریانە بوونی نییە)).

یەکێك لە زانایانی فیزیا و بیرکاری(ئەگەری) ڕوودانی گونجانی لەڕێی ڕێکەوتەوە لە جووڵەی بەش و تەنۆلکەکاندا مەزندە کردووە. بەجۆرێك کە ڕنگا بە جووڵەی قۆڵی پەیکەرەکە بدات، گەیشتۆتە ئەو دەرەنجامەی کە هەموو تەمەنی گەردوون بەشی نووسینی بچوکی ئەو ژمارەیە ناکات ك دەلالەت لەسەر لاوازی ئەم ئەگەرە دەکات. ئەمە لە ئەگەری بازدانی مانگایەك لە زەمینەوە بۆ سەر مانگ[1] نزیکە! بەهەمان ئەم لۆژیکەش، دەکرێ مانگ بگۆڕێت بۆ تۆپەڵێکی گەورەی خۆراك! لەڕێی دووبارە داڕشتنەوەی بەشەکانی، بەوپێیەی ئەگەری ڕوودانی ئەوەش دەکرێ بیرکارییانە هەژمار بکرێت!

بۆ ئەوەی دۆوکنز لەبواری بایۆلۆجیادا بەرگێکی زانستی بەبەر ئەگەر و ڕێکەوتدا بکات، هەستاوە بە داتاشینی دەستەواژەیەکی ناڕوون، کە بریتییە لە دەستەواژەی (توانای بایۆلۆجی Biological Possible)، پێوەرێکی زۆر ناڕوونیشی بۆ دیاریکردووە؛ دەڵێت: هەر شتێك شایەنی ڕوودانە، هەتا ئەگەر (ئەگەر)ی ڕوودانیشی بکاتە ژمارەیەکی کەمتر لە ژمارەی فەلەکی less

---

(١) دووری ٢٤٠٠٠٠ میل، بە لەبەرچاوگرتنی خولانەوەی زەوی و مانگ و، لاوازی ماسولکەکانی مانگاو، بەریەککەوتنی مانگاکە بە بۆشایی و،...).

ئەگەر لەرێی پێناسەکەی دۆوکنز بڕۆین و than astronomical improbility لێی بپرسین، ئایا ئەو ژمارەیەش کە هەموو تەمەنی گەردوون بەشی نووسینی سفرەکانی ناکات ژمارەیەکی فەلەکی نییە؟!

**ئەی دۆوکنز، ئەمە پێناسەیە یان خەڵەتاندن؟!**

بە تێڕوانین لەوەی زۆرێك لە زانا بایۆلۆجییە بێباوەڕەکان دەرکیان بەوە کردووە کە مەحاڵە ژیان بەشێوەیەکی(خۆکرد) لەسەر هەسارەی زەویدا پەیدا بووبێت، بۆیە لە کێشەکە رایانکردووە بە بانگەشەی ئەوەی کە ژیان لە هەسارەیەکی ترەوە هاتۆتە سەر زەوی.

ئەومیان قەبووڵ کردووە، بەڵام ئەگەر و ڕێکەوتیان قەبووڵ نەبووە!

ئەگەر لەم نموونەیەوە بچینە سەر پرسی خوایەتی، دەبینین دۆوکنز دەڵێت: ((من ناتوانم بەتەواوەتی نەبوونی خودا بسەلمێنم، بەڵام ئەگەری بوونی خودا زۆر کەمە، هەر لەبەر ئەومیە من وا ژیان دەکەم وەك ئەوەی خودا بوونی نەبێت))[1]. سبحان الله! لەپرسی خوایەتیدا دۆوکنز ئەگەری بیرکاری لاوازی بۆ بوونی خودا کردۆتە مەحاڵ، بڕیاریداوە بە جۆرێك بژی وەك ئەوەی کە خودا بوونی نەبێت. بەڵام لە جووڵەی قۆڵی پەیکەری مەڕمەڕ ئەگەری زۆر زۆر زۆر کەمی کردۆتە شیاوی ڕوودان، بە پشتبەستن بەوە ئەوە رەتدەکاتەوە کە خودا بەو موعجیزەیە هەستابێت.

ئەگەر ڕێسای لۆژیکی بۆ دیاریکردنی موعجیزە بڵێت: ڕوودانی کارێك ئەو کاتە بە موعجیزە هەژمار دەکرێت ئەگەر ڕوودانی مەحاڵ بێت. ئەوا دۆوکنز یاساکەی پێچەوانە کردۆتەوە تا ببێتە: ڕووداوە مەحاڵەکان لە ڕێی ڕێکەوتەوە مەحاڵییان نامێنێت؛ چونکە ڕوودانی موعجیزەکان ئەگەرێکی زۆر دوورە! بەم شێوەیە خودای حەق گۆڕەپانەکە بۆ بەرژەوەندی ڕێکەوت چۆڵ دەکات، بۆ

(1) The God Delusion. P.51

خوداکەی دۆوکنز. با ئێستاش دوو ئوقنومەکەی[1] خوداکەی دۆوکنز: (ئەگەر) و (ڕێکەوت) شیبکەینەوە:

**(ئەگەری بیرکارییانە) واتای (توانای کرداری) ناگەیەنێت**

لەڕاستیدا تێکەوتنی مەنهەجی دۆوکنز لەبواری ئەگەر و ڕێکەوتدا بریتییە لەوەی کە (ئەگەری بیرکارییانە) واتای (توانای کرداری) تێکەڵ بە یەکتر دەکات. چونکە بانگەشەی ئەوە دەکات کە (توانای) ڕوودانی هەر ڕووداوێکی فیزیایی (وەك ئاماژەی پەیکەرەکە یان بازدانی مانگا بۆ سەر مانگ یان گۆڕانی مانگ بۆ تۆپەڵێك لە خۆراك) ئەگەرێکی کراوەیە تا ئەو کاتەی دەکرێ (ئەگەر)ی ڕوودانی لەڕێی ڕێکەوتەوە هەژمار بکرێت. گومانیش لەوەدا نییە کە ئەمە تێکەڵکردنێکی زۆر هەڵەیە.

بێنە بەرچاوی خۆت کە ڕۆژێ لە ڕۆژان گەڕایتەوە ماڵەوە و دڵخۆش و بەختەوەر بوویت، کاتێك هاوسەرەکەت دەربارەی نهێنی ئەو دڵخۆشییەت پرسیاری لێکردی، پێتگوت کە لەمانگی داهاتوودا موچەکەت بۆ ملیۆنێك جونەیە بەرزدەبێتەوە. لەو کاتەدا هاوسەرەکەت تووشی سەرسامی دەبێت و لێت دەپرسێت (چۆن)؟ (بۆچی)؟ بە چ میکانیزمێك و لەبەر چ هۆکارێك؟ تۆش لەوەڵامدا پێی بڵێی کە(ئەگەری بیرکارییانە) ڕێگا بەوە دەدات و ڕێژەی ئەگەرەکەی ٥٠٪ یە!

کێشەکە ئەوەیە- لەبەختی تۆ- هاوسەرەکەت بە قووڵی هەستاوە بە لێکۆڵینەوە لە بیردۆزی ئەگەرەکان، بۆیە گاڵتەت پێدەکات و پێت دەڵێت کە (ئەگەری بیرکارییانە) واتای ئەوە نییە کە هەر ڕووداوێك شیاوی ئەوە بێت کە بەبێ هیچ پێشەکییەك بێتە بوونەوە، کە لەگەڵ یاسا بەدیهێنەرەکانی دیاردەکە بگونجێت. جا کە ئەو پێشەکییانە لە بارودۆخی تۆدا بوونیان نییە، کەواتە(ئەگەری

---

(١) ئاماژەیە بۆ دەستەواژەی سێ ئوقنومەکە، کە مەسیحییەکان خودای بەسەردا دابەش دەکەن: باوك - کوڕ - ڕوحولقودس.

بیرکارییانە)شتێکی (مەحاڵ)ە کە ئەو کارە بێتە بوونەوە.گومان لەوەدا نییە کە قسەکانی هاوسەرەکەت تووشی بێهیوابیت دەکەن[1].

لە ڕاستیدا دۆوکنز دەیەوێت بانگەشەکەی خۆیمان لە بەرگی چالاکی ئەگەری بیرکارییانەوە بۆ بخاتەڕوو، ئێمەش لەڕێی هەمان لۆژیکەکەی هاوسەرەکەتەوە دەمکوتی دەکەین، پێی دەڵێین کە ئەگەری بیرکارییانە بۆ ئەوە کە پەیکەری مەڕمەڕ قۆڵەکەی بجوولێنێت بەهیچ جۆرێك بەواتای بوونی توانای کرداری بۆ ڕوودانی ئەو کارە نایەت، بەڵکو ئەمە کارێکی مەحاڵە، بەهۆی نەبوونی پێشەکییەکانی گونجانی جووڵەی بەش و تەنۆلکەکان، چونکە ڕێکەوت توانای ئەوەی نییە ئەوە ئەنجام بدات، هەروەك چۆن دوای کەمێکی تر بۆمان دەردەکەوێت.

هەروەها دۆوکنز دەکەوێتە هەڵەیەکی مەنهەجی تریشەوە، ئەو لەوە بێئاگایە کە ئەگەری زۆر کەمی بیرکارییانە دەمانگەیەنێتە ئاستی مەحاڵی توانای ڕوودانی کارەکە.لەبەر ئەوە پسپۆڕان لەکاتی لێکۆڵینەوە لە ڕێکەوت باس لە شتێك دەکەن کە بە (نزمترین ئاستی ئەگەر Universal Probability bound) ناسراوە، مەبەستیان ئەوەیە کە ئەگەری ڕوودانی کارێك بەڕێکەوت دەچێتە ئاستی مەحاڵەوە، ئەگەر هاتوو ئەگەرەکە لە ئاستێکی دیاریکراو کەمتربێت. پسپۆڕان ئەو ئەندازەیەیان بە $١ \times ١٠^{-١٥٠}$ مەزەندە کردووە، ئەو ئەندازەیەش شیاوە بە بەراورد لەگەڵ ئەگەری جوڵانی بەڕێکەوتی قۆڵی پەیکەری مەڕمەڕی عەزرا.

ئەم دوو هۆکارە (ئەگەر واتای توانای ڕوودان نییەو، نزمترین ئەندازەی ئەگەر) وا لە ئوقنومی یەکەمی خواکەی دۆوکنز دەکەن(ئەگەری) کە خوایەکی بێتوانابێت.

---

(١) با نموونەیەکی تر بێنینەوە کە جیاوازی نێوان (ئەگەری بیرکارییانە) و (توانای کرداری) ڕوون بکاتەوە: ئەگەر چەند کارتێکی یاریکردن بە ئاسماندا فڕێ بدەین و، لێیان بگەڕێین بکەونەوە سەر زەوی، ئەگەری ئەوەی کە ئەو کارتانە بە ڕیزبەندی بکەونە سەر زەوی، بابڵێین ئەگەرەکە ١/ملیۆن بێت. بەڵام چی ڕوودەدات ئەگەر ئەو کارتانە لەکاتی بوونی زریاندا بە هەوادا بدەین؟ ئەوکاتە ئەگەری بیرکارییانە زۆر کەمتر دەبێتەوە بۆ نموونە ١/بلیۆن یان ١/تریلیۆن. بەڵام لێرەدا ڕێگرێك هەیە کە پێی دەڵێن مەحاڵی کردەیی. چونکە زریانەکە لێنەگەڕێ کارتەکان بکەونە سەر یەك و کارتەکان هەر یەکە و بە لایەکدا دەدات.

## حەقیقەتی ڕێکەوت :

حەقیقەتی ڕێکەوت چییە؟ حەقیقەتی ئوقنومی دووەمی خواکەی دۆکنز چییە، کە کردوویەتی بە جێگرەوەی خودای زیندوو، کردگار، کاربەجێ، بەدیهێنەر؟ بەوەڵامەکەی ئەرستۆ بۆ ئەو کەسانەی لە سەردەمی ئەودا باوەڕیان بەڕێکەوت هەبووە، وەڵامی ئەو پرسیارە دەدەینەوە:

((ڕێکەوت بۆ تەفسیرکردنی هیچ شتێك شیاو نییە، چونکە خۆی هیچ شتێك نییە)). ئەگەر بێین قسەی وەك (ڕوودانی ڕووداوێك بە ڕێکەوت ئەگەرێکی شیاوە)، دەبینین جەوهەری پرسەکە بریتییە لە (ڕوودانی کارەکە) ئەوەك (ڕێکەوت) کە هیچ شتێك نییە.

با ئەوە بە نموونەیەك ڕوون بکەینەوە: ئەگەری ئەوەی لەڕێی (ڕێکەوت)ەوە لەکاتی فڕێدانی زاردا ژمارە (٥)ت بۆ دەربچێت بریتییە لە٦/١، ئایا ٦/١ شتە یان هۆکارە؟! لە ڕاستیدا دەرچوونی ژمارە(٥) لەڕێی ڕێکەوتەوە چەند هۆکارێکی ڕاستەقینەی لە پشتەوەیە، وەك: ئێمە زارێکمان هەیە کە (٦) ڕووی هەیە، دەکرێ زارەکە بەشێوازێکی دیاریکراو و بە هێزێکی دیاریکراو بجوڵێنرێت و فڕێ بدرێت، بەهەمان ئەگەری وەك یەك یەك شێوەی زارەکە هەڵی ئەوە دەرەخسێنێت کە لەسەر یەکێك لە ڕووەکانی بووەستێت...بەم شێوەیە. لە ڕاستیدا گوتنی ئەوەی کە لەڕێی ڕێکەوتەوە ژمارە (٥)مان دەستکەوتووە، ئەوە شێوازێکی کورتکراوەیە بۆ گوزارشتکردن لە دەرەنجامی هەموو ئەو هۆکارانە. لە ڕاستیدا ئەگەری ٦/١ ون دەبێت، ئەگەر بێت و هۆکارەکان بگۆڕین کە باسمان کردن: وەك ئەوەی کە زارەکە فڕێ بدەینە کوورەیەکی زۆر گەرم و بتوێیەوە، یاخود کونەکانی زارەکە بە ماددەیەك پڕبکەینەوە کە ژمارەکان ون ببن...

با ئاستی نموونەکەی پێشوو بەرزتر بکەینەوە، تا دڵنیا ببیتەوە کە (ڕێکەوت) لە حەقیقەتدا بوونی نییە. ئایا دەزانی کە لەکاتی فڕێدانی زاری تاوڵەدا چەند جارێك بەدوای یەکدا (ئەگەر بێت و هەمان هۆکارەکانی هێزی فڕێدانی

زارەکەو، گۆشەی فرێدانی و...) جێگیر ببن، ئەمەش واتای ئەوە دەگەیەنێت کە ئەوەی ئێمە ناوی ڕێکەوتمان لێناوە لەڕاستیدا دەرئەنجامی چەند هۆکارێکی زۆری بێ شومارە کە لە ژماردن و کۆنترۆڵکردنیان بێتواناین، بەڵام دێین و دەستەواژەی (ڕێکەوت) لە دەرئەنجامەکانی دادەنێین.

کەواتە ڕێکەوت هۆکارێکی سەرەتایی نییە، بەڵکو دەرئەنجامێکی ناوەندییە کە بەدوای چەند هۆکارێکی تردا دێت. بەم شێوەیە ئوقنومی دووەمی خوداکەی دۆوکنز دەکەوێت، کە کردوویەتی بە خودایەکی کردگار.

**قوڕەکەی خەستتر کرد**

لەکاتی هەوڵدانی بۆ ڕزگارکردنی خوداکەی(ڕێکەوت)، دۆوکنز پەنای بردۆتە بەر دابەشکردنی ئەندازەی گەورەی نائەگەری بۆ چەند بەشێکی بچووک، دۆوکنز گریمانەی ئەوەی کردووە کە دەکرێ هەموو ئەمانە لە ماوەی چەند ملیۆن ساڵێکدا بە (ڕێکەوت) ڕوویدەن.

سەرەڕای ئەوەی کە بێتوانایی ڕێکەوتمان لەئەنجامدانی هەر شتێکدا سەلماند، ئێستا با پێکەوە لەگەڵ پێناسەکەی دۆوکنز بڕۆین: گریمان میکانیزمی پێکهاتنی بەشی هیمۆگلۆبینمان لەڕێی ڕێکەوتەوە بۆ (١٠٠٠) هەنگاو دابەش دەکەین، لەبەردەم هەر هەنگاوێکدا دوو ئەگەرمان دەبێت، یان ڕوویدات و لە دروستبوونی بونیادی بەشی هیمۆگلۆبین نزیکمان بخاتەوە، یان ئەوەتا ڕوونەدات. ئەگەری ئەوەی کە ئەو هەزار هەنگاوە بە سەرکەوتوویی تەواو ببن بریتییە ٢١٠٠٠ واتا نزیکەی ١٠٣٠٠، لە ڕاستیدا ئەو ئەگەرە لە پەیدابوونی بەشی هیمۆگلۆبین لەڕێی ڕێکەوتەوە و بە یەك قۆناغ کە دەگاتە ١٠١٩٠!

ئەمە ئەو پرسەیە کە دۆوکنز لێی بێئاگا بووە.

بەم شێوەیە خوداکەی دۆوکنز(ئەگەری و ڕێکەوت) دەبێت بە وەهم و سەراب. چونکە (ئەگەری) ناتوانێت توانا بەدیبێنێت، هەروەك چۆن ڕێکەوت هەر لە بنەڕەتدا بوونی نییە.

پاك و بێگەردی بۆ ئەو خودایەی لە کتێبە پڕ حیکمەتەکەی خۆیدا فەرموویەتی:

﴿ وَمَن يَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ لَا بُرْهَـٰنَ لَهُۥ بِهِۦ فَإِنَّمَا حِسَابُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿١١٧﴾ ﴾ (المؤمنون: ١١٧).

واتە: (هەر کەسێك خودایەکی تر بڕیار بدات و بیکاتە هاوبەشی خودا، لەکاتێکدا کە هیچ بەڵگەیەکی بەدەستەوە نییە، ئەوا بەڕاستی حیساب و لێپرسینەوەی لەلای پەروەردگاریەتی، بێگومان بێ باوەڕان سەرفراز نابن).

## ئەفسانەی دروستکەرە کوێرەکەی کاتژمێر :

دۆوکنز ویستی پاڵپشتی لە خوداکەی (ئەگەر و ڕێکەوت) بکات کە بێتوانایە لە ناڕاستەکردنی کرداری پەرەسەندنی بایۆلۆجیدا، بۆیە درۆیەکی تری بۆ دروستکردوین، کە ناویناوە (هەڵبژاردنی سروشتی کەڵەکەبوو)، لە کتێبەکەی (دروستکەرە کوێرەکەی کاتژمێر Blind Watch Maker)،[1] کەبووە هۆکاری بەناوبانگبوونی. لە کتێبەکەدا دۆوکنز ڕێگا بۆ خستنەڕووی دید و بۆچوونە کەڵەکەبووەکەی دەربارەی پەرەسەندن خۆش دەکات، دەڵێت:

((دەستەواژەی دروستکەری کاتژمێر(کە ناونیشانی کتێبەکەمە) لە پەیامی (لاهوتی سروشتی) وەرگرت کە زانای لاهوت و ئاییناسی ویلیام بالی لە ساڵی ١٨٠٢ز بڵاویکردەوە، ئەو پەیامە بە باشترین خستنەڕووی (بەڵگەی دیزاین) دادەنرێت، کە بە واتای ئەوە دێت بوون و هەموو ئەو شتە سەرسوڕهێنەرانەی تێیدا هەیە بەڵگەن بۆ بوونی خودایەك کە هەستاوە بە دیزاینکردن و بەدیهێنانی.

---

(١) د. مصطفی إبراهیم فهمی کتێبەکەی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی و، کتێبخانەی (الأسرة) بە ناونیشانی (الجدید في الإنتخاب الطبیعي) لە ساڵی٢٠٠٢ چاپی کردووە، کتێبە وەرگێردراوەکە ٤٢٥ لاپەڕەی گەورەیە.

بالی(پەیامی لاهووتی سروشتی) بە برگە بەناوبانگەکەی دەستپێدەکات: گریمان لەکاتی تێپەڕبوونم بە کێڵگەیەکدا قاچم لە بەردێك گیر بوو، پرسیم: چۆن ئەو بەردە گەیشتۆتە ئێرە؟ لەوانەیە وایدابنێم کە هەر لە ئەزەلەوە بەردەکە لێرەبووە. بەڵام گریمان لەجیاتی بەردەکە کاتژمێرێکم لەو شوێنەدا دۆزییەوە، وانازانم کە بیر لە هەمان وەڵامی پێشوو بکەمەوە)).

بالی لە قسەکردن بەردەوام دەبێت، ئەو وردی و شارەزاییە دەردەخات کە میلەکانی کاتژمێری بەدیهێناوە، ئەو وردبینەی بەشەکانی کاتژمێرەکەی بەیەکەوە بەستۆتەوە، پاشان دەڵێت: دۆزینەوەی شتێکی وەك کاتژمێر لە کێڵگەیەکدا، وردی و جوانی دیزاینەکەی ناچارمان دەکات کە بڵێین(پێویستە کاتژمێرەکە دروستکەرێکی هەبێت کە دروستی کردووە بۆ ئەوەی ئەو ئامانجە بەدیبێنێت کە بۆی (دروستکراوە)).

بالی دەرئەنجامەکە گشتگیر دەکات و دەڵێت: ((ئەو وردی و دیزاینەی لە کاتژمێرەکە بوونی هەیە و بەڵگەیە لەسەر بوونی داهێنەرێك، هەمان شتیش لە گەردووندا بوونی هەیە، بەڵکو گەردوون بێ ئەندازە گەورەتر و وردترە)).

هەروەها بالی بۆچوونەکەی بە نموونەیەکی تری بەناوبانگ ڕوونەدەکاتەوە، کە بریتییە لە چاوی مرۆڤ، چاوی مرۆڤ لەگەڵ ئامێرێکی دیزاینکراوی وەك تەلیسکۆبدا بەراورد دەکات، وایدەبینێت ئەگەر دان بەوەدا بنێین کە تەلیسکۆب بۆ یاریدەدانی بینین دیزاینکراوە و دروستکراوە، ئەوا لەپێشترە بڵێین چاو(کە بریتییە لە سەرچاوەی بنەڕەتی بینین) دیزاینەرێك و بەدیهێنەرێکی لە پشتەوەیە)).

پاشان دۆوکنز قسە لەسەر ئەوە دەکات و دەڵێت: ((بەڵگەکانی بالی بە دڵسۆزییەکی بەرزەوە دارێژراون، بە باشترین زانیاری زانستی بایۆلۆجیای ئەوسا پاڵپشتی کراون، بەڵام تەلیسکۆب و چاو و، کاتژمێر و گەردوون بەراوردێکی ساختەیە)).

چونکە دروستکەری ڕاستەقینەی کاتژمێرەکان ڕووانینی بۆ پێشەوە و ئاییندە هەیە؛ جا میل و بەشەکانی دیزاین دەکات، پلان بۆ بۆ پەیوەندییەکانی نێوانیان

دادەڕێژێت، لەو ماوەیەشدا ئامانجێکی ئایینده‌یی لەبەرچاوی خۆیدا داناوە. هەرچی درووستکەری کاتژمێرە لە سروشتدا، بریتییە لەو کردارە خۆکردە کوێرانە ناهۆشیارانەی داروین وەسفی کردووە(کە بریتییە لە هەڵبژاردنی سروشتی)، کە لە ئێستادا بۆمان دەرکەوتووە کە پەیدابوونی ژیان تەفسیر دەکات، بەبێ ئەوەی عەقڵ و ئامانجیشی هەبێت)).

هەروەها دۆکنز وایدەبینێت کە کرۆکی داروینیزم بریتییە لە حەقیقەتێکی سادە و ساکار، ئەویش ئەوەیە کە((زۆربوون لەبوونی بازدانی بۆماوەییدا بەرێکەوت(هەڕەمەکیتی) ڕوودەدات، پاشان هەڵبژاردنی سروشتی(ناهەڕەمەکی) بەدوادا دێت، ئەگەر بێت و کاتی تەواویان بۆ بڕەخسێت، ئەمەش دەبێتە هۆی کرداری پەرەسەندن لەژیاندا بە ئەندازەیەکی زۆر دوورتر لە خەیاڵ)).

هەروەها دۆکنز جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کە (هەڵبژاردنی سروشتی پەرەسەندن کۆنترۆڵ دەکات هەڵبژاردنێکی (ناهەڕەمەکییە)، ئەگەرچی لە هەمان کاتدا بێ عەقڵە و بەرەو هیچ ئامانجێکی ئایینده‌یی ناڕوات، هەرچەندە بە سەرنجدان بە هەنگاوی پێش ئەو وا دەردەکەوێت کە شتێك وەدیدێنێت وەکو ڕۆیشتنە بەرەو ئامانجێك. ئەو لەو کاتەی بەرەو کۆمەڵە دیزاینێکی ئاوێتە دەچێت، هاوشێوەی درووستکەری کاتژمێری ئاڵۆز دەردەکەوێت، بەڵام درووستکەرێکی کوێری کاتژمێرەکانە و هیچ دیدێکی ئایینده‌یی نییە!)).

هەرچی بازدانی هەڕەمەکییە، دۆکنز وایدەبینێت کە ڕۆڵی لاوەکی هەیە لە پەرەسەندندا، هەروەها وایدەبینێت کە تەنیا گۆڕانکارییەکی سادەیە و بەهۆی هەڵبژاردنی سروشتی ناهەڕەمەکییەوە بەسەر یەکترەوە کەڵەکە دەبێت بۆ پێکهێنانی شتێکی ئاڵۆزتر، تا بەهۆی تێپەڕبوونی کاتێکی زۆرەوە دەگەنە ئەوپەڕی ئاڵۆزی و پێکهاتنەوە.

## بەڵگەی مەیموونەکان :

ئەگەر(ئەگەر و ڕێکەوت) خودای دۆوکنز و هەموو داروینییەکان بێت، ئەوا بۆ بەڵگەهێنانەوە لەسەر توانای خوداکەیان پەنا دەبەنە بەر بەڵگەی مەیموونەکان دەدرێتە پاڵ تۆماس هیکسلی[1] لایەنگیری یەکەمینی داروین، کە بانگەشەی ئەوە دەکات کە ئەگەر واز لە کۆمەڵێك مەیموون بێنین کە لە ئامێری تایپکردن بدەن و کاتی تەواویان پێبدرێت ئەوا رەنگە بتوانن یەکێك لە هۆنراوەکانی شکسپیر، یان یەکێك لە شانۆگەرییەکانی یاخود هەموو بەرهەمەکانی شکسپیر بنووسنەوە.

ئەم بەڵگەیە بە بەڵگەی زانستی و عەقڵی و بیرکارییەوە وەڵامی درایەوە و بە گاڵتەجاڕی ناویان برد، تا ئەو ئەندازەیەی وای لە سێر ئەنتۆنی فلو کرد بە کۆمەڵێکی زبڵ و خاشاك ناوی ببات. یەکێك لەو بەڵگانە بریتی بوو لە بەڵگەی گەورە زانای بیرکاری جیان کارلۆ ڕۆتا[2] کاتێك سەلماندی کە هەموو تەمەنی گەردوون بەشی نووسینەوەی تاکە شانۆگەرییەك لە شانۆگەرییەکانی شکسپیرناکات، ئەگەرێتو مەیموون لە هەر نانۆچرکەیەکدا جارێك لە ئامێری تایپەکە بدات. هەروەها راس گریك[3] ئەوە ڕووندەکاتەوە کە بۆ ئەوەی مەیموون بتوانێت هۆنراوەیەکی ٦٠٣ پیتی لە ڕێی ڕێکەوتەوە بنووسێت پێویستی بە $١٠^{١٠١٧}$ ساڵ هەیە، لە کاتێکدا تەمەنی گەردوون تەنیا ١٣.٧ بلیۆن ساڵە. هەر

---

(١) Tomas Huxley: (١٨٢٥-١٨٩٥ز)، زانای بایۆلۆجیا، بەریتانییە، گرنگی بە شیکاری بەراوردکاری دەدات، یەکێك بوو لە خوێنگەرمترین کەسەکانی داروین تا وای لێهاتبوو ناوی Darwins Bulldog یان لێنابوو. گومانیش لەوەدا نییە کە دانەپاڵی بەڵگەی مەیموونەکان بۆ هیکسلی هەڵەیە، چونکە ئەو لە دیبەیتە بەناوبانگەکاندا بەکاریهێناوە لە ساڵی ١٨٦٠ز، لە کاتێکدا تایپ لە ساڵی ١٨٧٤ز دا داهێنراوە.

(٢) Gian-Carlo Rota: (١٩٣٢-١٩٩٩ز)، فەیلەسوف و زانای بیرکاری، ئیتاڵییە و بەڕەگەزنامە ئەمریکییە.

(٣) Russel Grigg: لە ساڵی ١٩٢٧ز لە نیوزلەندا لە دایك بووە، پسپۆڕی کیمیا بوو و، یەکێك بوو لە لایەنگرانی چەمکی بەدیهێنانی تایبەت.

لەبەر ئەوە سێر فرێد هۆیل[1] جەخت لە سەر ئەوە دەکاتەوە کە مادده ئەندازەی هەرجۆرێك بێت و هەرچەند کاتی پێبدرێت ئەوا هێشتا هەر بێتوانا دەبێت لە بەدیهێنانی ژیان بەرێکەوت، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێکی زانستی ئاماری رووت، پاشان دەڵێت: لەراستیدا ئەو ڕاستییە ئامارییانە بەسن بۆ ئەوەی داروین و بیردۆزەکەی بنێژن.

بۆ دەرچوون لەم تەنگژەیە، دۆوکنز هەستاوە بە هەوڵدان بۆ پێشکەشکردنی ماچی ژیان بۆ خوداکەی (ئەگەر و ڕێکەوت)، بۆیە هەستاوە بە خستنەڕووی ئەوەی ناوی ناوە میکانیزمی (هەڵبژاردنی سروشتی کەڵەکەبوو)، بانگەشەی ئەوەی کردووە کە ئەمە (ئەگەری) زیاتر دەکات و ڕۆڵی ڕێکەوت لە پەرەسەندنی داروینیدا رەتدەکاتەوە، دەیکاتە کردارێکی زیرەکانە بەڵام ناهۆشیارە!! باسەرنجی دۆوکنز بدەین بزانین چی دەڵێت.

## هەڵبژاردنی سروشتی کەڵەکەبوو :

ریچارد دۆوکنز جیاوازی نێوان هەڵبژاردنی سروشتی کەڵەکەبوو و هەڵبژاردنی یەك هەنگاوی دەکات، دەڵێت: ئەگەر ژمارەیەك بەردی قەبارە جیاواز لە بێژنگ بدرێت، ئەوا دوو کۆمەڵە بەردمان دەستدەکەوێت، کۆمەڵەیەکیان بەردەکانی لە کونەکانی بێژنگەکە گەورەترەو کۆمەڵەیەکیشیان بەردەکانی لە کونەکانی بێژنگەکە بچوکترە.

بەڵام ئەگەر بەرهەمی کرداری لە بێژنگدانەکە بێنین و چەند جارێك لە بێژنگی وەها بدرێت کە بەشێوەیەکی پلەبەند کونەکانی بچوك ببنەوە، ئەوا زۆر بەوردی قەبارە جیاوازەکانی بەردەکانمان بۆ جیا دەبێتەوە. ئەمە هاوشێوەی هەڵبژاردنی سروشتی کەڵەکەبووە، کە لەرێی ئەوەی زۆری لە دوای یەك

---

(١) Sir Fred Hoyle: (١٩١٥-٢٠٠١ز)، گەورە زانای فەلەکناسی بەریتانی، بەشدارییەکی گەورەی هەبوو لە پێشخستنی بیردۆزی تەقینەوە گەورەکەی گەردوون هەبووە.

جیاکردنەوەی تێدا ڕوودەدات، تا بەرهەمی کۆتایی نەوەی یەکەمی هەڵبژاردنی سروشتی دەبێتە سەرەتایەك بۆ نەوەی دواترو، بەم شێوەیە.

بۆ جەختکردنەوە لەسەر سنووورداری توانای (هەڵبژاردنی یەك هەنگاو)، دۆوکنز نموونە بە تاکە بەشێکی هیمۆگلۆبین دێنێتەوە، دەڵێت: (بەشی هیمۆگلۆبین لە چوار زنجیرەی ترشە ئەمینییەکان پێك دێت کە لە یەکتری ئاڵاون. با لەو چوار زنجیرەیە تەنیا سەرنجی یەکێکیان بدەین، کە لە ١٤٦ ترشی ئەمینی پێکدێت و ئەگەر ٢٠-ی جۆری جیاوازی ترشی ئەمینی بوونی هەبێت کە لە زیندەوەراندا بڵاوبوونەتەوە، ئەوا ژمارەی ئەو ڕێگایانەی بەهۆیانەوە دەتوانین ٢٠ جۆر لە زنجیرەیەکدا ڕیز بکەین کە درێژییەکەی ١٤٦ یەکەبێت، بریتییە لە ژمارەیەکی وەها کە لە ژمارە نایەت و مەحاڵە بتوانین وێنای بکەین، زانایانی بایۆلۆجی ناوی (ژمارەی هیمۆگلۆبین)[1] لەو ژمارەیەوە دەنێن، کە((بە نزیککراوەیی دەگاتە ١ کە ١٩٠ سفری لەگەڵدابێت)).

ئەمە ئەگەرەکەیە ئەگەر ئێمە چاوەڕێ بکەین تا یەکێك لە چوار زنجیرەکەی هیمۆگلۆبینمان بە یەك هەنگاو لەڕێی ڕێکەوتەوە دەستبکەوێت، بەشی هیمۆگلۆبینیش تەنیا بەشێکی زۆر بچووکە لەپێکهاتەی زیندەوەردا، بۆیە ئاشکرایە کە هەڵبژاردن بە یەك هەنگاو بە هیچ جۆرێك نزیك ناکەوێتەوە لە هێنانەکایەی ئەو سیستەمە کە لە زیندەوەردا هەیە.

هەرچی هەڵبژاردنی سروشتی کەڵەکەبووە ئەوا شتێکی ترە، بۆ شیکردنەوەی ڕۆڵی ئەو میکانیزمە، دۆوکنز نموونە بەناوبانگەکەی مەیموونەکە بەکاردێنێت و دەڵێت: تۆماس هیکسلی ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە ئەگەر کاتی پێویست بە مەیموون بدرێت تا بەشێوەیەکی هەڕەمەکی لە ئامێری تایپ بدات، ئەوا

---

(١) ئەڵقەی یەکەمی زنجیرەکە دەکرێ هەر ترشێکی شیاو بێت لە ٢٠ ترشە ئەمینییەکە، ئەڵقەی دووەمیش دەکرێ هەر ترشێکی گونجاو بێت لە ٢٠ ترشەکە، لەبەرئەوە ژمارەی گریمانەکراو بۆ زنجیرەکان کە لە دوو یەکە پێکهاتووە، بریتییە لە ٢٠×٢٠=٤٠٠ و ژمارەی گریمانەکراو بۆ زنجیرەکان کە لە سێ یەکە پێکهاتووە، بریتییە لە ٢٠×٢٠×٢٠=٨٠٠٠، و ژمارەی گریمانەکراو بۆ ئەو زنجیرەیەی ١٤٦ یەکەیە و ٢٠ جار جارانی خۆی کراوەتەوە، ژمارەیەکمان بۆ دەردەچێت کە مرۆڤ شۆك دەکات.

دەتوانێت هەموو نووسینەکانی شکسپیر بنووسێتەوە، لەوانەیە ڕوودانی ئەوە بە هەڵبژاردنی یەك هەنگاو دوور بێت، بەڵام بە هەڵبژاردنی کەڵەکەبوو ئەگەرێکە و دەکرێ روو بدات.

پاشان دۆوکنز دەڵێت: با کاری مەیموونەکەمان دیاریبکەین، با وا دابنێین لەسەری پێویست نییە کە هەموو نووسینەکانی شکسپیر بنووسێتەوە، بەڵکو تەنیا ڕستەیەکی بچووکمان بۆ بنووسێت بۆ نموونە ئەو ڕستەیەی دەڵێت: (پێم وایە لە ڕاسۆ دەچێت Me think its like a weasol[1]) کە لەسەر زاری هامیلت هاتووە لە شانۆگەری (عطیل)ی تراژیدیا بەناوبانگەکەی شکسپیر.

ڕستەکە لە ٢٨ پیت بە سپەیسەکانەوە پێکهاتووە، گریمان مەیموونەکە بە زنجیرەیەك هەوڵی جیاواز هەڵدەستێت، کە هەر هەوڵێك بریتیی بێت لە ٢٨ لێدان لە تەختەکلیلی کۆمپیوتەر، ئەگەر مەیموونەکە برگە ڕاستەکەی نووسی ئەوا تاقیکردنەوەکە کۆتایی پێدێت، بەڵام ئەگەر نەیتوانی ئەوا ڕێگای پێدەدەین کە هەوڵێکی تر بدات کە لە ٢٨ لێدانی تر پێکهاتبێت.

لەبەرئەوەی هیچ مەیمونێکی وەها شك نابەم، بۆیە ناچاربووم کۆمپیوتەرەکەم بەرنامەڕێژ بکەم، تا بە شێوازێکی هەڕەمەکییانە بەکارەکە هەڵبستێت. بە بەکارهێنانی هەمان شێوازی ژماردن کە بۆ ژمارەی هیمۆگلۆبینەکە ئەنجامماندا، دەبینین کە هەلی مەیموونەکە- کۆمپیوتەرەکە بۆ گەیشتن بە دەستەواژە دروستەکە کە لە ٢٨ پیت پێکهاتووە، بریتییە لە(١\٢٨) کە ٢٨ جار جارانی خۆی کرابێتەوە. ئەمەش ئەگەرێکی زۆر کەمە، نزیکە لە ١×١٠-٤٠،بە کورتی ئەو دەستەواژەیەی کە داوای دەکەین دوای ماوەیەکی زۆر زۆر نەبێت نایەت، ئیتر واز لە باسکردنی هەموو نووسینەکانی شکسپیر بێنە.

ئەمە سەبارەت بە هەڵبژاردنی یەك هەنگاو، ئەی هەڵبژاردنی کەڵەکەبوو چی لێدێت؟ کە زۆر زۆر کاراترە لەوەی بیری لێدەکەیتەوە. با جیاوازییەکە بزانین، جارێکی تر مەیموونەکە / کۆمپیوتەرەکەم بۆ نووسینی هەمان ڕستە بەکارهێناوە،

---

(١) ڕاسۆ(ابن عرس) Weasel: یەکێکە لە ئاژەڵی مەمکدارە گۆشتخۆرەکان.

بەڵام دووبارە بەرنامەڕێژم کردەوە، بۆ ئەوەی هاوشێوەی لە بێژنگدانی بەردەکان بێت لە چەند بێژینگێکی بەدوای یەکدا:

١- کۆمپیوتەر بەشێوەی ریزبەندی هەڕەمەکی ٢٨ پیت و سپەیسی نووسی و ئەم دەستەواژەیەمان دەستکەوت:

WDLMNLT DTJBK WIREZLMQCO P

٢- دەرفەتێکی ترمدا بە کۆمپیوتەرەکە تا ئەم ریزبەندییە هەڕەمەکییە چەند جارێك دووبارە بکاتەوە، (بەجۆرێك بەرنامەڕێژم کرد) تا هەندێ هەڵەی هەڕەمەکی لە کۆپیکردنەکە = بازدانەکە روویدات.

٣- هەر جارێك کۆمپیوتەرەکە پیتەکانی ریزبەندی بازدانە نوێکەی دەپشکنی، یەکێکیانی هەڵدەبژارد بۆ ئەوەی زۆر لە دەستەواژە داواکراوەکە نزیك بێت!!! پاشان ریزبەندییەکی تری لە ٢٨ پیت و سپەیس پێکهاتوو بنووسێت، بە بەکارهێنانی ئەو پیتانەی هەڵیبژاردوون، ئەو پیتانە بەرهەمی (ئەوەی) دواتر بوون:

WDLMNLT DTJBK WIREZLMQCO P

٤- هیچ پێشکەوتنێکی بەرچاومان بەدی نەکرد! لەبەر ئەوەی کردارەکە دووبارە دەبێتەوە، جارێکی تر بازدان لە ڕێکخستنی پیتەکاندا رووی دەداو(هەڵبژاردن) ئەنجام دەدرا!!! ریزبەندییەکی تری نوێ دەبیردەوە، ئەمەش نەوە لە دوای نەوە بەردەوام دەبوو.

٥- دوای دە نەوە(هەوڵ) پیتە هەڵبژێردراوەکان بریتی بوون لە:

WDLDMNLS ITJISWHRZREZ MECS P

٦- دوای بیست نەوە پیتەکان بریتی بوون لە:

MELDINLS IT ISWPRKE Z WECSEL

٧- دوای سی نەوە:

METHINGS IT IS WLIKE B WeCSeL

٨- نەوەی چلەمین زۆر لە دەستەواژە داواکراوەکە نزیکمان دەخاتەوە:

METHINKE IT IS LIKE I WEASEL

٩- لە نەوەی چل و سێیەمین گەیشتین بە ئەنجامی کۆتایی.

پاشان هەمان تاقیکردنەوەمان ئەنجامدایەوە، لە نەوەی شەست و چوارەمین گەیشتین بە دەستەواژە داواکراوەکە.

لە هەوڵی سێیەمدا، دوای ٤١ نەوە لە هەڵبژاردنی کەڵەکەبوو گەیشتین بە هەمان دەستەواژە.

دۆوکنز دەرەنجامەکانی تاقیکردنەوەکەی دەخاتەڕوو:

ئەگەر پرسەکە بۆ هەڵبژاردنی بە یەك هەنگاو لێبگەڕێین بۆ نووسینی ئەم ڕستەیە، بەو پێیەی هەر هەوڵێك بەتەواوەتی نوێ بێت، ئەوا نزیکەی ١×١٠^٣٠ ساڵ دەخایەنێت، ئەمەش ملیۆن ملیۆن ملیۆن جار لە تەمەنی گەردوون زیاترە. لەکاتێکدا ئەگەر کۆمپیوتەرە بەرنامەڕێژکراوەکە بە هەڵبژاردنی کەڵەکەبوو سنووردار بکرێت (بەو پێیەی کە هەر پەرسەندنێك هەر چەند بچووکیش بێت بەکاربهێندرێتەوە، وەك بناغەیەك بێت بۆ هەنگاوی دواتر)، ئەوا ئەنجامدانی هەمان کار ١١٤ چرکە تا ئەو کاتەی کە بۆ خواردنی ژەمێك پێویستە دەخایەنێت!!

لەبەر ئەوە ئەگەر ڕێگایەك بوونی هەبێت!!! ئەوا دەکرێ هەڵبژاردنی کەڵەکەبوو بە ئاڕاستەکردن و یاریدەی سروشتی کوێرانە بتوانێت ئەو کارە بکات!!! دەرەنجامەکان سەرسوڕهێنەر دەبن!

لەڕاستیدا هەمان شت لەسەر ئەو هەسارەیەدا ڕوویداوە، ئێمە خۆمان بە جوانترینی ئەو دەرەنجامانە هەژمار دەکرێین ئەگەر سەرسوڕهێنەرترینی نەبین.

کەواتە، باوەڕ بوون بەوەی کە پەرسەندنی داروینی (هەڕەمەکییە)، ئەوا باوەڕێکی تەواو ساختەیە، چونکە حەقیقەت پێچەوانەی ئەوەیە!! چونکە ڕێکەوت

ڕەگەزێکی زۆر لاوازی پێکهاتەی داروینیزمە!! بەڵام گرنگترین ڕەگەز تیایدا بریتییە لە هەڵبژاردنی کەڵەکەبوو، کە(نا هەڕەمەکیتی لە کرۆکیدایە)!!!!

**چەند هەڵەیەکی جەوهەری**

خوێنەری بەڕێزم، با پێکەوە سەرنجی ئەو تاقیکردنەوەیە بدەین کە دۆوکنز لەسەر ئامێری کۆمپیوتەردا ئەنجامیداوە، کە تاقیکردنەوەیەکی سادەو ساکاری پڕ لە (هەڵەی جەوهەرییە)،

چەمکی (هەڵبژاردنی سروشتی کەڵەکەبوو) بە بادا دەدات، متمانەی مەنهەجە زانستییەکەی دۆوکنز لەق دەکات.

**یەکەم:** لە هەنگاوی (٣)دا، دەقی دەستەواژەکەی دۆوکنز بخوێننەوە:

((لە هەرجارێك کۆمپیوتەرەکە پیتەکانی ریزبەندی بازدانە نوێیەکەی دەپشکنێ و ئەوەیانی هەڵبژارد، کە لە هەموویان زیاتر لە دەستەواژە داواکراوەکە دەچوو!!)).

دۆوکنز دان بەوەدا دەنێت کە کۆمپیوتەرەکەی (بەرنامەڕێژ) کردووە، بۆ ئەوەی ریزبەندییەکان (بپشکنێت) و ئەو دەستەواژەیە (هەڵبژێرێت) کە لە هەموویان زیاتر لەدەستەواژە داواکراوەکە بچێت (کە پێشتر دیاریکراوە)! ئێمەش دەڵێین: ئایا ئەمە هەڵبژاردنی سروشتییە؟ یاخود دیزاینکردن و هەڵبژاردنێکی زیرەکانەیە بۆ گەیشتن بە رستەیەك کە پێشتر دیاریکراوە و بە ئاڕاستەکردنی بەرنامەی کۆمپیوتەرەوە ئەنجام دەدرێت، ئیتر چۆن دوای ئەوە دۆوکنز بانگەشەی ئەوە دەکات کە درووستکەری کاتژمێرەکانی کوێرە؟!

ئایا ئەمە پەرەسەندنێکی ئاڕاستەکراو نییە بۆ ئامانجێکی دیاریکراوی پێشوەختە، کە عەقڵێکی زیرەك بەسەریدا زاڵە.

**دووەم:** سەرنجی هەنگاوی یەکەم بدە، کە تێیدا کۆمپیوتەر ریزبەندییەکی هەڕەمەکی نووسی کە لە ٢٨ پیت و سپەیس پێکهاتبوو، لە هەنگاوی دووەمدا

ریزبەندی تری بەدواداهات. ئەمە لە بەرنامەی کۆمپیوتەردا ئاساییە، بەڵام لە بایۆلۆجیادا دروست نییە. بۆچی؟

بۆ نموونە با لەسەر بەشی هیمۆگلۆبیندا جێبەجێ بکەین. لەدۆخی ریزبوونی هەرەمەکی یەکەمدا بۆ ١٤٦ ترشی ئەمینی، ئایا دەرمنجامەکەی بەشێکی وەها دەبێت کە بە توانایەکی کەمیشەوە بێت کار بکات بۆ ئەوەی بمانگوازێتەوە بۆ قۆناغی دووەم، لەگەڵ بوونی هەڵەیەکی هەرەمەکی بچووکدا، یان ئەوەتا ریزبوونی یەکەم تەنیا ریزبوونێکی هەرەمەکی ترشە ئەمینییەکان دەبێت کە توانای هیچ کارێکیان نییە و هەرگیز ئەو خراپییانەی بۆ ئەوەی دواتر ناگوازنەوە، تەسلیمی هەنگاوی دووەمیشمان ناکات، لەو بارودۆخەدا ئەو زنجیرەیەی پەرەسەندن کە کۆمپیوتەر لە ٤١ یان ٦٣ یان ٤٣ هەنگاودا ئەنجامیداوە ناتوانێت هەنگاوی یەکەم ببڕێت. یان ئەوەتا بەدیهێنەرێك بوونی هەیە کە ئەو ریزبەندییە هەرەمەکییەی لە هەنگاوی یەکەمدا بوونی هەیە کردوویەتی بە ئاوێتەیەکی ئەندامی کە توانای کارکردنی هەیە و شیاوە بۆ بۆماوەیی، ئەگەر دۆوکنز دان بەوەدابنێت ئەوا لەگەڵ هەندێك لە خەلقییەکان و لایەنگرانی پەرەسەندنی خوداییدا هاوڕا دەبێت.

**سێیەم:** دەقی دەستەواژەی دۆوکنز بخوێنەوە:

((لەبەر ئەوە ئەگەر ڕێگایەك بوونی هەبێت کە لە ڕێگەیەوە هەڵبژاردنی کەڵەکەبوو بە یاریدەی(ناڕاستەکردنی) هێزە کوێرەکانی سروشت روو بدات، ئەوا دەرمنجامەکان سەرسوڕهێنەر و نامۆ دەبن!!)).

من پرسیارێکم هەیە: ئەو ڕێگایە چییە کە توانا بە هێزە کوێرەکانی سروشت دەبەخشێت کە بتوانێت کرداری هەڵبژارنی بەرنامە بۆداڕێژراو ئەنجام بدات، هەر وەك چۆن لە کۆمپیوتەردا ڕوویدا؟ گومان لەوەدا نییە کە ڕێگایەکی زۆر زیرەکانە و بە توانایە.

**چوارەم:** سەرنجی دۆوکنز بدە لە شوێنێکی تردا چی دەڵێت: ((هەرچی بازدانی هەڕەمەکییە ئەوا ڕۆڵێکی لاوەکی هەیە لە پەرەسەندندا!! چونکە تەنیا سەرەتای

گۆڕانێکی بچووکە لەگەڵ هەڵبژاردنی سروشتی ناهەڕەمەکیدا کەڵەکە دەبێت)).

زۆربەی داروینییەکان لەگەڵ ئەو قسەیەی دۆوکنز ناکۆکن، چونکە وایدەبینن کە هەڵبژاردنی سروشتی هەڵدەستێت بە دووپاتکردنەوە یان ئەرێنکردنی بازدانی هەڕەمەکی کە بە ڕێکەوت روو دەدات، هیچ ڕۆڵێکی لە بنیاتناندا نییە، چونکە هەڵبژاردنی سروشتی بازدانە هەڕەمەکییەکان بۆ نەوەکانی دوای خۆی دەگوازێتەوە و دەیانداتە پاڵ یەکتر، بەڵام ئەوەی گرنگە لێرەدا خودی گۆڕانکارییە هەڕەمەکییەکە خۆیەتی.

وادابنێ کە کاروانێکی ئۆتۆمبێلی بار گواستنەوە (هەڵبژاردنی سروشتی) هەڵدەستێت بە گواستنەوە و کۆکردنەوەی هەموو جۆرە کەلوپەلێك لە شوێنی دروستکردن و بەرهەمهێنانییانەوە بۆ عەمبار. ئەگەر پێکهاتەی کۆتایی ناو عەمبارەکە سەرنجمان رابکێشێت، ئایا دەکرێ کوالێتی کەلوپەلە عەمبارکراوەکە بدرێتە پاڵ توانای کاروانی گواستنەوە یاخود دەدرێتە پاڵ دروستکەرەکەی؟ بەهەمان شێوە ئەگەر بەهرە و شارەزایی دروستکەری کاتژمێر پێویست بێت(کە بەشەکانی لێکدەدات)، ئەوا کوالێتی میل و پێکهاتەکانی کاتژمێرەکە و هاتنەوەی لەگەڵ مەرجەکاندا گرنگترە.

پێنجەم: ئەوانەی دان بە بازدانە هەڕەمەکییەکاندا دەنێن کە لەرێی ڕێکەوتەوە پەیدا دەبن، بانگەشەی ئەوە دەکەن کە کات توانای ئەنجامدانی هەموو شتێکی هەیە، هەر بۆیە کاتێك دەکەونە نێو گیروگرفتەوە، بەوە بەرگری دەکەن کە پەرەسەندن لەماوەی هەزاران ساڵدا رووی نەداوە، بەڵکو لە ماوەی سەدان ملیۆن ساڵدا ڕوویداوە. ئەو بیانوهێنانەوەیە بە کات، بێئاگابوونە لە یاسای داینامیکای گەرمی، کە دەڵێت، هەر سیستەمێکی داخراو(سیستەمێك کە وزەو ڕێکخستنی لە دەرەوە بۆ نایەت) بەرەو زیادکرنی (ئینترۆپیا entropy)[1] دەڕوات، واتا بەرەو زیادبوونی بێتوانابوون بەرامبەر سوود وەرگرتن لە وزە، بەمەش بەرەو یەکسانبوونەوەی گەرمی دەڕوات، واتا بەرەو مردنی هێواش.

---

(١) ئەنترۆپیا رەنگدانەوەی نارێکخراویی دامەزراوەیەك نیشاندەدات.

ئەمەش مانای وایە کات- بە تەنیا- هۆکاری رووخاندنە نەوەك هۆکاری بنیاتنان، واتا کاتێك سیستەمێکی هەرەمەکی وەك خۆی جێبهێڵین، ئەوا شیدەبێتەوە و دەڕوخێت و بارودۆخی بەرەو باشبوون ناچێت، بۆ ئەوەی پارێزگاری لێبکات و بەرەو بنیاتنانی ببات، ئەوا پێویستە لەڕێی ڕێکخستن و پلانی تایبەتەوە ئاراستە بکرێت.

**شەشەم: دۆوکنز و بیردۆزی ئەگەرەکان و یاسای ڕێکەوت.**

زانایانی بیرکاری نموونەیەك دێننەوە و لەڕێیەوە بیردۆزی ئەگەرەکان شیدەکەنەوە:

وا دابنێ کە پێنج تۆپی بچووکت خستە گیرفانتەوە کە تەنیا دانەیەکیان سوور بوو، دەستت خستە گیرفانتەوە بۆ ئەوەی هەر جارێك و تۆپێك دەربێنی، بە ئامانجی ئەوەی تۆپە سوورەکە دەربێنیت.

ئەگەر لە دوای هەرهەوڵێك تۆپەکە (ئەگەر سوور نەبوو) بخەیتەوە گیرفانتەوە، ئەوا هەموو جارێك دەرفەتی دەرهێنانی تۆپە سورەکە بریتییە لە ٥:١، هەتا ئەگەر هەزاران جاریش هەوڵ بدەیەوە.

زانایانی بیرکاری ئەم جۆرە پەیوەندییەی نێوان هەوڵە دووبارەکان بە (واقیعی سەربەخۆ (Independent events) وەسف دەکەن، واتا ئەو هەوڵانەی کار لە یەکترناکەن.

بەڵام ئەگەر لەهەر هەوڵێکدا کە تۆپە سورەکەت بۆ دەرنەچوو، لەبری ئەوەی بیخەیتەوە گیرفانتەوە فڕێی بدەی، ئەوا هەلی دەرهێنانی تۆپە سوورەکە لە هەوڵی یەکەمدا بریتییە لە ٥:١، لە هەوڵی دووەمدا (دوای فڕێدانی تۆپی یەکەم) هەلەکە دەبێتە ٤:١ پاشان ٣:١ و بەم شێوەیە، زانایانی بیرکاری ئەم جۆرە هەوڵدانە بە (واقیعی ئاڵوگۆڕانە Mutually EXCLUSIVE) واتا ئەو هەوڵانەی کاریگەری ئاڵوگۆڕانەیان لە نێواندا هەیە.

لەژێر رۆشنایی ئەم جۆرە تێگەیشتنە، دەگەڕێینەوە بۆ هەوڵەکانی مەیمون / کۆمپیوتەرەکەی دۆوکنز بۆ نوسینی رستەی (وادەزانم لەراسۆ دەچێت ME

(Think it is like a weasel): دۆوکنز پێمان دەڵێت کە هەلی مەیموونەکە بۆ نووسینی ئەو ڕستەیە لەڕێی ڕێکەوتەوە بە نزیکەی یەك لە سەر دە هەزار ملیۆن ملیۆن ملیۆن ملیۆن ملیۆن ملیۆن مەزەندە دەکرێت، واتا (١٠^٤٠)، دواتر دەڵێت: ئەگەر بتوانین ١٠ مەیمون کۆبکەینەوەو هەر یەکێکیان کۆمپیوتەرێکی بخەینە بەردەست، ئەوا گومان لەوەدا نییە کە یەکێکیان دەستەواژەکە دەنووسێت!!

دۆوکنز لەمە بێئاگایە کە هەوڵی مەیموونەکان دەچنە ژێر جۆری یەکەمی ئەگەرەکان (واقیعە سەربەخۆکان Independent events). بەڵام دۆوکنز لە جۆری دووەم هەژماری دەکات (واقیعی ئاڵوگۆڕ Mutually exclusive)، کاتێك ئەوە دووپات دەکاتەوە کە (بێگومان) یەکێك لەو مەیموونانە ئەو ڕستەیە دەنووسێت! ئەمەش بە هیچ جۆرێك هەر یەکێکیان ئەوە دووبارە ناکاتەوە کە مەیموونەکانی تر نووسیویانە، هەروەها هەر مەیموونێك ناچار بکات کە ئەوەی جاری پێشوو نووسیویەتی دووبارەی نەکاتەوە(وا نازانم توانای ئەو کارەشی هەبێت)، لەبەر ئەوە هەلی هەر مەیمونێك لە هەر هەوڵێکدا بریتییە لە ١٠^٤٠ هەتا ئەگەر بلیۆنان جار ژمارەی مەیموونەکان زیاد بکەین، ئەوەی تێنەگەیشتنی دۆوکنز بۆ بیردۆزی ئەگەرەکان دڵنیا دەکاتەوە ئەو قسەیەیەتی کە دەڵێت: ئەگەر بۆ ماوەی نیو ملیۆن ساڵ ڕۆژانە لە شەقامێك بپەڕیتەوە، ئەوا(گومانی تێدا نییە)کە لە یەکێك لە جارەکان ئۆتۆمبێل لێتدەدات. گومان لەوەدا نییە کە ئەو حەتمییەتە لە هەڵەدا نقوم بووە. چونکە لە ڕاستیدا هەلی ئەوەی کە ئۆتۆمبێلێك لێت بدات لە هەر جارێکدا هەر وەك خۆیەتی، هەتا ئەگەر دەیان ملیۆن ساڵ لەو شەقامەدا بپەڕیتەوە، چونکە لێرەدا ڕووداوەکان- هەروەك نموونەی مەیموونەکان- سەربەخۆن نەوەك ئاڵوگۆڕ.

دوای شیکردنەوەی هەڵە جەوهەرییەکانی تاقیکردنەوەی مەیموون/ کۆمپیوتەرەکە، کە دۆوکنز ئەنجامیداوە، دەبینین تاقیکردنەوەکە پێچەوانەی بنچینە سەرەکییەکانیپەرەسەندنی داروینییە، چونکە سێ هەنگاوی تێدا هەیە کە پێویستییان بە عەقڵێکی زیرەك هەیە، ئەوانیش:

١- بوونی ئامانجێکی دیاریکراو(رستە ئامانجەکە)، کە لە سەرەتاوە کۆمپیوتەرەکە هەوڵدەدات پێی بگات.

٢- لە هەر هەنگاوێکدا کۆمپیوتەرەکە هەڵدەستێت بە بەراوردکرنی بژاردەکان بە رستە ئامانجەکە.

٣- کۆمپیوتەرەکە هەڵدستێت بە هێشتنەوەی نزیکترین دەرەنجام لە ئامانجەکە و دوورکەوتنەوەی ئامانجەکانی تر.

لەڕاستیدا ئەو بەربەستانە وا لە نموونەکەی دۆوکنز دەکەن کە ببێتە بەڵگەیەکی تەواو بێکەڵك و (ساختەکاری) میکانیزمەکانی تێدا ئەنجامدراوە بۆ بەدەستهێنانی ئەوەی دەمانەوێت بیسەلمێنین، ئەمەش بە بەڵگەی بازنەیی Circular Proof ناسراوە.

دیڤید بێرلینسکی ئەو واتایە دووپات دەکاتەوە، کاتێك دەڵێت: ((لەڕاستیدا ئەو دە زانیارییانەی لە دەرەنجامەکانی هەڵبژاردنی سروشتی کەڵەکەبوودا بوونیان هەیە(بەو جۆرەی کە دۆوکنز خستویەتییەڕوو) لە تێخراوەکاندا بوونیان هەبووە، کە بریتییە لە رستەی ئامانج کە پێشتر دیاریکراوە و لەنێو پیتە ئەبجەدییەکاندا هەڵبژێردراوە، میکانیزمە ئاڕاستەکارە زیرەکەکان هەستاون بە دۆزینەوەیان لەنێو هەموو پیتەکاندا و پارێزگارییان لێیان کردووە و کەڵەکەیان کردووە. ئەمە ئەوە دەسەلمێنێت کە هیچ هەڵبژاردنێکی کەڵەکەبوو بەبێ میکانیزمێکی زیرەکانە بوونی نییە.

بۆ سووککردن و بارگرانی نموونەکەی پێشوو و ئەو فێڵە ئاشکرایەی تێیدا هەبوو. دۆوکنز خۆی دانی بەوەدا دەنێت کە نموونەکەی ورد نییە، ئەمەش بەهۆی ئەو سێ هۆکارەی خستومانەتەڕوو، بانگەشەی ئەوە دەکات کە دەکرێ نموونەکە دەستکاری بکرێت بۆ تێپەڕاندنی ئەو خاڵانە(ئەگەر رێگایەك بۆ ئەوە هەبووایە ئەوا پێش بڵاوکردنەوەی کتێبەکەی ئەوەی دەکرد). دۆوکنز بەو دانپێدانانەی گرنگی و حەتمییەتی بوونی زیرەکییەك لەدامەزراوەکەدا دەسەلمێنێت، ئەمە ئەوەمانە کە دۆوکنز بەو نموونەیەی هەوڵیداوە نەرێی بکات.

## هەڵبژاردنی کەڵەکەبوو و ئاڵۆزی نەشیاو بۆ وردکردنەوە (الإختزال):

دۆوکنز بە فێڵکردن و ساختەکردن وازناهێنێت هەروەك لە نموونەکەی پێشوودا کردی، بەڵکو بانگەشەی ئەوە دەکات کە میکانیزمی هەڵبژاردنی سروشتی کەڵەکەبوو توانای بەدرۆخستنەوەی چەمکی ئاڵۆزی نەشیاو بۆ وردکردنەوەی[1] هەیە، کە مایکل بیهی ختویەتییەڕوو، بەڵێدانێکی کوشندە بۆ پەرەسەندنی داروینی هەژمار دەکرێت.

بۆ وەڵامدانەوەی بیهی، دۆوکنز بەشێوازە فێڵزانییەکەی خۆی پرسەکە بۆ چەند هەنگاوێك ورد دەکاتەوە تا سەر لە هەندێ کەس بشێوێنێت:

١- وادابنێ کە ژمارەی هەنگاوە پێویستەکان بۆ گۆڕینی بوونەوەرێکی بێچاو بۆ بوونەوەرێکی بینا بریتییە لە (س).

٢- وادابنێ کە ژمارەی هەنگاوە پێویستەکان بۆ ئەو گۆڕانە زۆر گەورەیە، هەر هەنگاوێك بە ئەندازەیەکی زۆر بچوك لە هەنگاوی پێش خۆی جیاوازە، بەجۆرێك کە دەکرێت هەر هەنگاوێك بە ڕێکەوت روو بدات.

٣- ئایا ناکرێت هەر هەنگاوێك بینایییەکی باشتر لەوەی پێش خۆی بەدیبێنێت کە یارمەتی زۆربوون و مانەوەی، بەو جۆرەی رێگا بە هەنگاوی دواتر بدات کە روویدات؟

دۆوکنز وا خەیاڵ دەکات کە ئەو شێوازەی ئەو توانای وردکردنەوەی هەر ئاڵۆزییەکی هەیە بۆ چەند هەنگاوێك کە دەکرێ بە پەرەسەندنی داروینی پەیدا ببن. لەو نموونەیەدا دۆوکنز کەوتۆتە هەڵەیەکی شەرمنانەوە، چونکە کاتێك لەسەر بۆچوونەکەی پێشووی ڕەخنەی لێگیرا، بەوەی کە ئەو قۆناغەی

---

(١) لەتەوەرەی حەوتەمدا بە دوور و درێژی ختوومانەتەڕوو.

٥٪ چاوی تێدا هەیە، ئەوا ئەو پێکهاتەیە بە هیچ جۆرێك نابینێت، کەواتە بە هیچ جۆرێك یاریدەی زۆربوون نادات بەو ئەندازەیەی کە ڕێگا بە مانەوە و نزیکبوونەوەی لەچاوی بینا، لەو کاتەدا دۆوکنز بەوە وەڵامیدایەوە کە ئەو چاوەی ٥٪ درووستبووە دەتوانێت بینایی٥٪ بداتە ئاژەڵەکە، ئەمەش یارمەتی دەدات بۆ زۆربوون و پاشان پەرەسەندن! دۆوکنز لەوە بێئاگایە کە نە ٥٪ نە ٥٠٪ نە ٨٠٪ی چاو ناتوانێت بە هیچ جۆرێك ببینێت.

هەڵوەستەکەمان لەگەڵ چەمکی هەڵبژاردنی سروشتی کەڵەکەبوودا بە نموونەیەك کۆتایی پێدێنین کە بەکارهێنانی بەربڵاوبوو، بەهێزی و ڕەونەقی خۆشی لەدەست نەداوە، پرۆفیسۆر(ئیدوین کۆنکلین)[1] دەڵێت: ((ئەگەر بڵێین ژیان لە دەرەنجامی ڕووداوێکی خۆکرد ڕوویداوە، لەناوەڕۆکیدا وەك ئەوە وایە کە پێشبینی ئامادەکردنی فەرهەنگێکی گەورە بکەین لەو حەرف و پیتانەی لە ئەنجامی تەقینەوەیەکدا پەرش و بڵاوبوونە، کە بەڕێکەوت لە چاپخانەیەکدا ڕوویداوە)).

## جیهانە ڕەوشتییەکەی دۆوکنز:

دیدی ئیسلامی (و ئاییني بەشێوەیەکی گشتی) وایدەبینێت کە دامەزراوەی ڕەوشتی مرۆڤ دامەزراوەیەکی فیکرییە، ئایین هەڵدەستێت بە قووڵکردنەوە و ڕوونکردنەوەی چەمکە ڕاست و هەڵەکانی و، ئاگادارکردنەوەی مرۆڤ لەو پاداشت و سزایەی بۆیان دیاریکراوە[2]. هەروەها وایدەبینم کە پەیڕەوکردنی هەندێك بێباوەڕان لە ڕەوشتە چاکەکان بەشێکی دەگەڕێتەوە بۆ فیترەتی ئەو

---

(١) Edwin Konklin: (١٨٦٣- ١٩٥٢ز)، مامۆستای بایۆلۆجیاو زانستی ئاژەڵ بووە لە زانکۆکانی نۆهایۆ و پەنسلڤانیا. هەروەها سەرۆکی یەکێتی ئەمریکی بوو بۆ پێشکەوتنی زانستەکان، هەروەها سەرۆکی کۆمەڵەی ئەمریکی بوو بۆ زانستە سروشتییەکان.

(٢) بۆ دڵنیاکردنەوەی ئەوەی کە ئاین دامەزراوە فیترەیەکەی ڕەوشت تەواو دەکات، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: من بۆ (تەواوکردنی) ڕەوشتە باش و بەرزەکان نێردراوم.

چەمکانە، بەشێکیشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەو ڕەوشتانەی لە دەروونی مرۆڤدا چەسپاون وەکو عورف و کەلەپووری لێهاتووە، ئەمەش دوای ئەوەی لە سەردەمانی ڕابردوودا ئایینە ئاسمانییەکان زۆر جەختیان لێکردوونەتەوە.

## داروینیزم لە پشتەوەی ڕەوشتی خوداو پێغەمبەرەکانەوەیە !!

لەکتێبی (وهم الإله)دا ریچارد دۆوکنز لە هەردوو تەوەرەی پێنجەم و شەشەمدا دێتەسەر سەلماندنی چەمکی پەیدابوونی ئایینەکان لەڕێی پەرەسەندنەوە، زۆر هەوڵدەدات پچڕانی پەیوەندی ڕەوشت بە ئایین و فیترەتەوە بسەلمێنێت، برەو بەوە دەدات کە ڕەوشت بۆماوەییە، وەردەگیرێت و فێری دەبین، هەڵبژاردنی سروشتی لە دەروونی مرۆڤدا چەسپاندوویەتی.

هەروەها دۆوکنز خودا بەو شێوەیە وەسف دەکات وەك ئەوەی پەیمانی کۆن وەسفی دەکات و خراپترین سیفەتەکان دەداتە پاڵ خودا، کە: ((هیچ و پووچ، ستەمکار، نالێبووردە، رقنەستوور، فەوتێنەر، خوێن و لەناوبردنی خۆش دەوێت، رقی لە مرۆڤە، رقی لە ئافرەتە، منداڵکوژە، ئارەزووەکانی کۆنترۆڵی دەکەن، ڕەگەز پەرستە، پاکتاوی ڕەگەزی ئەنجام دەدا، شێتی گەورەییە، ماسۆشیست و دڵپیسە، سەرباری هەموو ئەوانەش شانازی بەو سیفەتانەیەوە دەکات. لەبەر ئەوە شتێکی نامۆ نەبوو کە پێغەمبەرەکانی خۆی لەسەر ئەو سیفەتە نزم و خراپانە هەڵبژاردووە))[1].

---

(١) لە کتێبی The God Delusion. P.31. بۆ بەڵگەهێنانەوە لەسەر وەسفکردنی خودا بەوجۆرە ڕەوشتانە، دۆوکنز چەند نموونەیەك لە کتێبی پیرۆز دێنێتەوە.

- پێغەمبەر (لوط) دوو کچەکەی دەخاتە پێش پیاوانی سادوم کە ویستیان پەلاماری میوانەکان بدەن. سفر التکوین ١٩: ٤-١١.

- لوط کچەکانی خۆی دووگیان دەکات. سفر التکوین ١٩: ٣٠-٣٨.

- خەریك بوو ئیبراهیم ئیسحاقی کوڕی سەر ببڕێت. سفر التکوین ١:٢٢-١٩.

دۆوكنز دەڵێت كە ئەو سیفەتە نزمانەی خوداو پێغەمبەرەكانی (وەك چۆن لە پەیمانی كۆندا هاتووە) بە تەواوەتی لە گەڵ ئەو ڕەوشتانەدا یەكانگیرە كە پەرەسەندن دەریان دەدا، هەروەها لەگەڵ ململانێ لە پێناو مانەوە و پارێزگاریكردن لە جینەكان (جینە خۆپەرستەكە) دێتەوە، هەربۆیە پێویست ناكات لەسەر ڕەفتارەكانیان لۆمەی بەنی ئیسرائیل و پێغەمبەرەكانیان بكرێت لەسەر ئەوەی كە وەك نامێری جینی ڕەفتارییان كردووەو بە شوێنكەوتنی حەتمییەتی جینی لەپێناو بەرژەوەندییەكانی خۆیان تێكۆشانیان كردووە.

### پێویستە ڕەوشتەكانمان لەكوێوە سەرچاوە بگرن؟

سەرەڕای ئەوەی كە دۆوكنز پەیدابوونی بەها ڕەوشتییەكان دەگێڕێتەوە بۆ پەرەسەندن، بەڵام ئەوە ڕەتدەكاتەوە كە ڕەوشتەكانی پەرەسەندن مەرجەعی ئێمە بن، ئەو واتایە زۆر جار لە كتێبەكەیدا دووبارە دەكاتەوە. سەرنجی بدە كاتێك دەڵێت: لەڕاستیدا پەرەسەندنی داروینی نموونەی وەك هیتلەر نەبێت بەرهەم ناهێنێت،كۆمەڵگەی داروینیش تەنیا كۆمەڵگەیەكی فاشیستی بەرهەم دێنێت كە پڕ دەبێت لە دەمارگیری و ڕەگەزپەرستی و پاكتاوی ڕەگەزی.

هەر لەبەر ئەوە لە كتێبی(جینە خۆپەرستەكە)[1] دەڵێت: من بۆ ئەو ڕەوشتانە خوێنگەرم نیم كە پەرەسەندن دایهێناون، چونكە ئەگەر ئێمە بەشێوەیەكی خۆپەرستانە لە دایكبوویتین، ئەوا ئەگەر بمانەوێ لە كۆمەڵگەیەكدا بژین

- موسا ٣٠٠ كەسی لە بەنی ئیسرائیل سەربڕی، كاتێك خۆی سەرقاڵی وەرگرتنی دە وەسیەتەكە بوو لە خودا لەسەر كێوی سەینا و ئەوانیش گوێرەكەیەكیان لە زێڕ دروستكردبوو و دەیانپەرست. سفر الخروج ٣٢:٢٥-٢٩.

-پێغەمبەر یەشوع هەموو دانیشتوانی ئەریحای كوشت. سفر يشوع ٦:٢١.

- خودا لە كەنعان جەنگی پیرۆزی بەرپاكرد. سفر التثنيه:٢٠: ١٠-١٨.

لەو دوو نموونەیەی كۆتایی دۆوكنز خودا بە هیتلەر دەچوێنێت لە جەنگی پۆڵەندا، بە سەددام حوسەین لە لەناوبردنی كوردەكان و، قەڵاچۆكردنی فەلەستینییەكانیش لەلایەن جولەكەكانەوە هەر دەخاتە ملی خودا و دەڵێت بۆ گێڕانەوەی خاكە پیرۆزەكە.

(١) The selfish gene. 2.3

کە تاکەکانی بۆ بەدیهێنانی ئامانجی بەرز هاریکاری یەکتر بکەن، ئەوا نابێت چاوەڕوانی یارمەتی لە سروشتە بایۆلۆجییەکەمان بکەین، بۆیە پێویستە خۆمان ڕێزو قوربانیدان فێری منداڵەکانمان بکەین.

لەهەمان کاتدا دۆوکنز ئەوە ڕەتدەکاتەوە کە منداڵەکانمان بە پەروەردەیەکی ئایینی پەروەردە بکەین، بەجۆرێك لە خراپ بەکارهێنانی منداڵ Child abuse هەژماری دەکات، ئەگەر بێتو چەمکی هەڵەیان لەمێشکدا بچێنیت بەبێ ئەوەی توانای ڕەتکردنەوە و تاوتوێکردنیان هەبێت، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کاتێك گەورە دەبن ئازادی هەڵبژاردنیان بکوژێت. دۆوکنز لەوبارەیەوە زمانلدرێژی دەکات و دەڵێت: ((ئەگەر دەستدرێژیکردنی پیاوانی کەهەنوت بۆ سەر منداڵەکان کارێکی قێزەون بێت، ئەوە خراپترو قێزەونترە کە لەڕووی دەروونییەوە تێکبشکێندرێن، بەوەی وایان لێبکرێت کە هەموو ژیانیان بە ترس لە ئاگر بەسەرببەن)).

دەکرێ ئێمەش لەگەڵ دۆوکنزدا هاوڕابین لەوەی کە ئازادی هەڵبژاردن بخەینە بەردەم منداڵەکانمان کاتێك کە گەورە دەبن! بەڵام بەو مەرجەی کۆمەڵگەش هەڵنەستێت بەچاندنی تۆو چەمکە بێباوەڕییەکان لە دەروونیاندا، بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی هاوسەنگ گەورە ببن. وا نییە دۆوکنز؟!

ئەم خستنەڕووە دۆوکنز دەخاتە هەڵوێستێکی دژیەکی سەیرەوە. چونکە ئەو بۆچوونی وایە کە ڕەوشتەکان سەرچاوەیەکی ئاسمانیان نییە، جا چ سەرچاوەکە فیترەت بێت یان ئایین، لەهەمان کاتدا دۆوکنز دەڵێت نابێت ڕەوشتەکانمان لە سروشتەوە وەربگرین، چونکە جگە لە ململانێ هیچیان پێنادات! کەواتە ئەو ڕەوشتە لەکوێ بێنین کە دۆوکنز ئامۆژگاریمان دەکات شوێنی بکەوین؟ دۆوکنز بۆ دەرچوون لەو تەنگ و چەڵەمەیە چارەسەرێکی سەیر دەخاتەڕوو.

لەرابوونێکی ڕەوشتیدا دۆوکنز جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ناکرێ ڕەوشتەکانمان لە چەمکەکانی ململانێی داروینیزم وەربگرین، ئەوانەی لەکتێبی بنچینەی جۆرەکان و بنچینەی مرۆڤ و جینە خۆپەرستەکە و پەیمانی کۆندا

هاتوون! بەڵکو پێویستە لەسەرمان بە وردی سەرنجی ئەو کتێبانە بدەین و چەمکە باشەکان Nice وەربگرین بیانکەینە ڕەوشت و ئەوانەی تر پشتگوێبخەین.

پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە: پێوەرمان چییە بۆ چەمکی باشی و چاکی؟

بۆ دیاریکردنی پێوەرەکانی ئەو چاکییە دۆوکنز دەمانباتە لای (پەیمانی نوێ)،دەڵێت: ((مەسیح یەکێك بوو لە گەورەترین چاکسازانی مێژوو و کەسێکی دینداریش بوو[1]، مەسیح خودای جولەکە (یەهودا)ی دڵڕەقی فێڵبازی ڕەتکردەوە، لەبری ئەو خودایەکی باش و چاك و دڵنەرمی خستەڕوو، بۆیە شتێکی سەیر نەبوو کە هەستان بە لە خاچدانی))[2]. لەشوێنێکی تردا دۆوکنز دەڵێت: ((مەسیح ئەوەی ڕەتکردەوە کە بەهاکانی لەو ژینگە جولەکەیە وەربگرێت کە تێیدا گەورە بوو بوو(ژینگەی پەیمانی کۆن)، تەنانەت ئەوەشی قەدەغەکرد، بەمەش بوو بە نموونەیەك بۆ دینداری حەق))[3].

ئێمەش لە دۆوکنز دەپرسین: مەسیح بەها ڕەوشتییەکانی لە کوێ هێنا؟ گومان لەوەدا نییە کە سەرچاوەکەی هەڵبژاردنی سروشتی نەبوو، ئەو کردار نزم و خراپ و ئازاربەخشە deeply nasty (دۆوکنز خۆی بەم شێوەیە وەسفی دەکات)، کە داروین وەسفی کردووە بەوەی کردارێکی شەیتانییە کە سروشتی دڵڕەق و بێبەزەیی پێی هەڵدەستێت، جگە لە بەهێزەکان و دڕندەکان تێبینی هیچ یەکێکی تر ناکات.

وەك دەستگرتن بە داروینیزم و هەڵاتن لە دانانان بەوەی کە ڕەوشتەکانی دڵنەرمی و چاکی - کە مەسیح بانگەوازی بۆ دەکات - سەرچاوەیەکی ئاسمانی هەیە، دۆوکنز پێمان دەڵێت کە هەڵبژاردنی سروشتی Super Nice دەرداوە

---

١) دۆوکنز دەڵێت: لەڕاستیدا مەسیح هیچ بژاردەیەکی تری لەبەردەمدا نەبوو جگە لە دینداری، چونکە هیچ کەسێك لە سەردەمی ئەودا نەیدەتوانی بە ئازادی ببێتە کەسێکی بێباوەڕ، لەترسی ستەمی جولەکەکان!

(٢) لە وتارێکدا بە ناونیشانی Atheists For Jesus.

(٣) The God Delusion. P.250

(چۆن؟ نازانین) وەك (قوربانیدان و ڕێزو سۆزداری و بەزەیی و میهرەبانی) بۆ ئەوەی تاکەکانی یەك کۆمەڵگە پەیڕەوییان لێبکەن تا یارمەتی مانەوەیان بدات، لەگەڵ وازنەهێنان لە بەهاکانی ململانێ لە مامەڵەکردن لەگەڵ کەسانی تردا. هەروەها سەرەڕای ئەوەی کە ڕەوشتە زۆر نەرم و نیانەکان بە گێلایەتی و گەمژایەتی دادەنرێن، بەڵام لەسەرمان پێویستە بەدوایاندا بگەڕێین و بیانچنین Picks and choose و ڕەوشتە نزم و خراپەکانیش فڕێ بدەین.

ئەگەر بمانەوێت لەگەڵ دۆوکنز سنگفراوانبین تا ئەوپەڕی سنگفراوانی، ئەوەی لێ قەبووڵ بکەین کە ڕەوشتی بۆ سەر دوو جۆردا دابەشکردووە، ڕەوشتی نەرم و نیان لەگەڵ کەسانی نزیکدا و ڕەوشتی دوژمنکارانە لەگەڵ نەیارانماندا، ئەوا چۆن دەتوانین بوونی چەمکی ڕەوشتی باش تەفسیر بکەین کە بوونەوەران بەرامبەر بە جۆرەکانی تردا ئەنجامی دەدەن (وەك میهرەبانی مرۆڤ لەگەڵ ئاژەڵ)، کە بە(جیهانی ڕەوشت Universal) ناسراوە، لەگەڵ پەرەسەندندا تێکدەگیرێت؟ ئەو پرسیارە پرسیارێکی لەناکاو نەبوو بۆدۆوکنز و ڕاستەوخۆ وەڵامیداوە بەوەی کە جیهانێتی ڕەوشت (هەڵەیەکی پەرەسەندنە Evolutionary Misfiring) واتا ئاگری دۆستانەیە بە زمانی ئێستا. واتە لە بەرژەوەندی نەك لە دژ!.

## هەر جامێك ئەوەی لێدەرژێ کە تێیدایە :

کەمێك پێش ئێستا باسمان لەوەکرد کە هەندێك لە بێباوەڕان پەیڕەوی لە هەمان ئەو بەها بەرزانە دەکەن، کە دیندارەکان پەیڕەوییان لێدەکەن، ئەو لێکچوونەشمان بە فیترەت و کلتوور تەفسیر کرد کە هەردووکیان لە ناییینەوە سەرچاوەیان گرتووە. هەرچی دۆوکنزە ئەو لێکچوونە بۆ ئەوە دەگێڕێتەوە کە مرۆڤەکان هەمان پێکهاتەیان هەیە و یەك ڕەگەزن و دەکەونە ژێر کاریگەری

هەمان بارودۆخی پەرسەندنەوە[1]، ئەمەش هەڵەیەکی زانستی گەورەیە، چونکە بارودۆخی پەرسەندنی مرۆڤ زۆر لە یەکتر جیاوازبووە.

سەرەڕای بوونی هەندێك (لێکچوونی رووکەش) لەنێوان بێباوەڕان و دیندارەکاندا، بەڵام (جیاوازییەکی قووڵ) هەیە لە دامەزراوەی ڕەوشتی هەر یەکێکیاندا، تا ئەو ئاستەی دۆوکنز خۆیشی دان بەوەدا دەنێت گەردوونێك خودا لەسەر عەرشەکەیدایە زۆر جیاوازە لە گەردوونێکی بێ خودا! هەروەها دیدی جیاوازی هەر یەکێکیان بۆ خودی مرۆڤایەتی هۆکارێکی تری پشت ئەو جیاوازییەیە، چونکە گومان لەوەدا نییە کە لێکەوتە ڕەوشتییەکانی دامەزراوەیەك تەنیا وەك ئاژەڵ سەیری مرۆڤ دەکات، لە رەگ و ریشەوە جیاوازە لە دامەزراوەیەك کە مرۆڤ دەکاتە جێنشینی خودا لەسەر زەوی و، دەڵێت کە لەسەر شێوەی خودا بەدیهێنراوە.

با سەرنجی هەندێك لە لێکەوتە ڕەوشتییەکانی ئەو جیاوازییە بدەین.

## لەبـــاربـردن :

ئایینە ئاسمانییەکان لەباربردنیان حەرام و قەدەغە کردووە، بەوپێیەی کوشتنی نەفسەو خودا کوشتنی حەرام کردووە، ئەگەرچی دۆوکنز لە حەرامبوونی کوشتندا لەگەڵ ئایینە ئاسمانییەکاندا هاوڕایە، بەڵام کاتێك دێتە سەر باسی لەباربردن ئەوا زۆر بە ئاسانی ئەو یاسایە پێشێل دەکات.

دۆوکنز ستایشی[2] بۆچوونەکانی فەیلەسوفی بێباوەڕی پەرسەندن پیتەر سینگەر[3] دەکات، کە دەڵێت دیدی ڕەوشتی ئەوە دەکاتە شتێکی حەتمی

---

(١) The God Delusion. P.271

(٢) The God Delusion. P. 271

(٣) Practical Ethics. Cambridge University Press 197. P. 261-373

کە پێویستە لەگەڵ هەموو ئەو بوونەوەرانەی توانای مێشکی پەرەسەندوویان هەیە وەك یەك رەفتار بکەین، واتا پێویستە وەکو ئاژەڵ رەفتار لەگەڵ مرۆڤدا بکرێت[1].

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت سەرچاوە هزرییە رەوشتییەکانی دۆوکنز تەنیا بە پەرەسەندنی داروین ناوەستێت، بەڵکو مەزهەبی سوودگەرایی (جۆن ستیوارت میل)[2]یش دەگرێتەوە، کە خۆی جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە مەزهەبەکەی نوێکردنەوەی مەزهەبی ئەبیقۆری[3] کۆنە، کە وایدەبینێت رەوشت لە چەمکە هاوبەشەکانی مرۆڤ سەرچاوە ناگرێت، بەڵکو لە توانای زیادکردنی چێژو کەمکردنەوەی ئازار سەرچاوە دەگرێت.

## کوشتنی بەزەیی:

بەهەمان دیدی بەرەوادانانی لەباربردن، دۆوکنز بۆ بابەتێکی تریش خەرێکەرمە، کە بە(کوشتنی بەزەیی Euthanasia) ناسراوە، کە ئایینە ئاسمانییەکان رەتیدەکەنەوە.

ئەو چەمکە وای دەبینێت لە رووی رەوشتییەوە رەوایە مرۆڤ بڕیار لەسەر کۆتاییهێنان بەژیانی خۆی بدات بۆ رزگاربوون لەو کۆژان و ناخۆشییانەی تێیاندا

---

(١) لەبەر ئەوە سینگەر کوشتنی ئەو منداڵانەی تازە لەدایکبوون بە رەوا دەزانێت، ئەگەر باییایی ئەیانەوێت بیانهێڵنەوە، هەر لەبەر هەمان هۆکاریش بە کوشتنی کەسانی بێهێزو بێتوانا رازییە ئازییەکان ئەنجامیانداوە، چونکە ئێمە بە هەمان شێوە رەفتار لەگەڵ ئاژەڵاندا دەکەین کە هەمان کێشەیان هەیە. ئەوەی جێگای سەرسوڕمانە ئەوەیە کە سینگەر لێکۆڵینەوەیەکی بڵاوکردۆتەوە و تیایدا باس لەوە دەکات کە دیندارەکان و بێباوەڕان پەیڕەوی لە هەمان چەمکە رەوشتییەکان دەکەن!

(٢) John Stuart Mill: (١٨٠٦-١٨٧٣ز) گەورە فەیلەسوفی ئابووریناسی بەریتانی یەکێکە لە سەرانی فەلسەفەی سوودگەرایی.

(٣) مەزهەبێکە دەدرێتە پاڵ ئەبیقۆر(٣٤٠-٢٧٠ پز ز)، لەسەر ئەوە دامەزراوە کە چێژوەرگرتن ئامانجی ژیانی مرۆڤە. کە بە چێژی سێکسی دەستپێدەکات، تا دەگاتە چێژی عەقڵی.

دەژی. کێشە گەورەکەی ئەو چەمکە ئەوەیە کە ڕێگا بەکەسانی نزیك دەدات کۆتایی بەژیانی کەسانی تری وەك بەساڵاچوان و نەخۆش و پەککەوتە و منداڵەکان بێنن، ئەمەش لەڕاستیدا ڕوویداو لە نیوزیلەندا یاسایەکی بۆ دەرچوو.

## خواردنی گۆشتی مرۆڤ :

لە دیدی پەرەسەندندا هیچ بیانویەك نییە خواردنی گۆشتی مرۆڤ قەدەغە بکات Cannibalism! چونکە پەرەسەندن باش و خراپی چەمکە ڕەوشتییەکان لەیەکتر جیاناکەتەوە، بەڵام پەیدابوونیان تەفسیردەکات. بەهەمان شێوە بەهاکانی ئازادی و میهرەبانی ڕێگرنین لەبەردەم سودوەرگرتن لە گۆشتی مرۆڤ بۆ هەموو بوارێك، بەتایبەت کە خواردنی گۆشتی مرۆڤ دەکرێ بەشێکی زۆری کێشەی خۆراك لە وڵاتە هەژارەکاندا چارەسەربکات، هەروەها گیروگرفتی ڕزگاربوون لە تەرمەکانیش چارەسەر دەکات! دۆوکنز خۆبەدوورگرتنی شێرەکان لە خواردنی گۆشتی یەکتر دەگێڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەمە لە ڕووی پەرەسەندنەوە سوودی نییە، تەنانەت دەبێتە هەڕەشە بەسەر ڕەگەزەکەوە ئەگەر هەموو شێرەکان دەستبکەن بە خواردنی یەکترو هەمان ڕەفتار پەیڕەو بکەن[1].

ئێمە ئەو لۆژیکە بەوە ڕەتدەکەینەوە، کە وەك مرۆڤ شێرەکانیش سوود لە لاشەی مردووی یەکتر دەکەن نەوەك لە زیندووەکان، بەڵام ئەوە ڕوونادات! هەروەها دەڵێین بەپێی ڕێساکانی پەرەسەندن خواردنی گۆشتی هەمان کۆمەڵەی مرۆیی دەکرێ زیانبەخش بێت، بەڵام خواردنی گۆشتی دوژمنان سوودبەخشە!

---

(1) The selfish gene. P. 83

## ناوەکان لەیەك دەچن و ناونراوەکان جیاوازن :

لەوەی رابورد بۆمان دەردەکەوێت کە جیاوازییەکی قووڵ لەنێوان چەمکە ڕەوشتییەکانی نێوان بێباوەڕان و دینداراندا بوونی هەیە، هەتا ئەگەر ناوەکانیش وەك یەك بن. بۆنموونە ڕەوشتێکی وەك (بەزەیی Kindness)، کە لەلای دینداران بەواتای چاودێری تەواوەتی کەسانی بێهێز و نەخۆش و ئەوانەی لەسەرمەرگدان دێت، بەڵام لەلای دۆکنز بەواتای ئەوە دێت کەوەك ئاژەڵ رەفتار لەگەڵ مرۆڤدا بکرێت! بەوپێیەی، کە بەلەباربردن رازییە بەبێ هیچ بەندوبارێك هەروەك چۆن بە خۆکوشتن (کوشتنی بەزەیی)ش رازییە.

ئەگەر بێینە سەر ڕەوشتی (بەخشندەیی Generosity) و پەیوەندی بە سکپڕی بەئارەزوومەندانەکانەوە، دەبینین، کە دیندارەکان گرنگی بە دایکە سکپڕەکان و منداڵە نائارەزومەندانەکانەوە دەدەن، هەرچی دۆکنزوهاوشێوەکانیەتی، ئەوا گرنگی بە پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری بێ بەرامبەری لەباربردن دەدەن.

لەم دوو نموونەیەدا، بۆمان دەردەکەوێت لەیەکچوونی ڕەوشتی نێوان دیندارەکان و بێباوەڕان ئەوا بە پلەی یەکەم لەیەکچوونی دەستەواژەکانە، هەرچی لایەنی کردەییە ئەوا بەتەواوەتی لەیەکتر جیاوازن و دەکرێ دژیەکیش بن، گومانیش لەوەدا نییە کە ئەمە شتێکی سروشتییە و دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی دید و بۆچوون بۆ سروشتی مرۆڤ.

لە کۆتاییدا دەپرسین؛ ئایا دۆکنز لەسەر حەق بوو کاتێك گوتی: لەسەر دینداران پێویستە لە دەرکردە ڕەوشتییەکانی پەرەسەندن نەترسن؟

**خوێنەری بەڕێز**

مەنهەجە فەلسەفییەکەی دۆوکنز لەسەر سێ کۆڵەگە دامەزراوە؛ ((هەڤدژی)) لە نێوان خودا و یاساکانی سروشت، کە پێویستە یەکێکیان وەك بەدیهێنەری گەردوون و بونەوەر هەڵبژێرین. کۆڵەگەی دووەم ((لێکچوون))؛ چونکە دۆوکنز وەك سوپەرمان سەیری خودا دەکات کە پێویستە وەك مرۆڤ بێت، هەر لەبەر ئەوەیە کە دۆوکنز زۆر بەقورسی لێپێچینەوەی لەگەڵدا دەکات ئەگەر بێت و بەشێوەیەکی پێشبینی نەکراو رێبکات! کۆتا کۆڵەگەش (ئەگەر)ە، کە بە پشتبەستن بەو کۆڵەگەیە دۆوکنز گەردوون و ژیان بەهەڕەمەکییەتی و ڕێکەوت بنیات دەنێت، بەهەمان کۆڵەگەش -ئەگەر- دۆوکنز ئەوە دووردەخاتەوە کە خودا بەکرداری خەلق هەستابێت!

لەڕاستیدا دۆوکنز بەم مەنهەجە فەلسەفییە ئەوەی ئارەزوی دەکات لە دەرئەنجامەکان دەیانکاتە پێشەکی و لەوانەوە دەست بە لێکۆڵینەوەکان دەکات، ئەمەش مەنهەجێکی سۆفستائی شەیتانییە و وەك شورایەکی پۆڵاین وایە و بیروباوەڕی بێباوەڕی دەپارێزێت! دۆوکنز خۆیشی یەکەمین قوربانی ئەو مەنهەجە بوو.

دۆوکنز بۆ رەتکردنەوەی خودای حەق لە گەڕانە منداڵکارەکانەوە دەستپێدەکات کە بریتییە لە گەڕان بەدوای هۆکاری یەکەمین کە هەموو شتێکی بەدیهێناوە. لە هەمان کاتدا دۆوکنز پەیڕەوی لە ((ئەگەر و ڕێکەوت)) دەکات وەك خودایەکی جێگرەوە کە هەموو شتێکی پێ تەفسیر دەکات. دۆوکنز لەوە بێئاگایە کە ئەگەری بیرکارییانە لە توانای کرداری جیاوازە، هەروەك چۆن لەوە بێئاگایە کە ڕێکەوت هۆکارێکی سەرەتایی و یەکەمین نییە، بەڵکو گوزارشتکردنە لە پەیوەندییەکانی نێوان هۆکارە ڕاستەقینەکان، کەواتە ڕێکەوت(هیچ شتێك نییە) هەروەك ئەرستۆ گوتویەتی.

بۆ دەرچوون لە تەنگ و چەڵەمەی مەحاڵی کردمیی، بەوەی کە هەڵبژاردنی سروشتی پەرەسەندنی بایۆلۆجی ئەنجامداوە، دۆوکنز گریمانەیەکی خستۆتەڕو کە ناوی ناوە هەڵبژاردنی سروشتی کەڵەکەبوو، بۆ بەڵگە هێنانەوەش لەسەر ئەوە چەند نموونەیەکی هێناوەتەوە کە نەفامی و نەزانییە بەرامبەر بە لۆژیك و بیرکاری و تەنانەت بەرامبەر بە مەنهەجی زانستیش، نامانەوێ بڵێین کە نیازپیسییەکەیریسوا دەکات!

هەروەها لەکاتی چارەسەرکردنی پەیدابوونی دامەزراوەی ڕەوشتی مرۆڤ دۆوکنز دەکەوێتە هەڵەیەکی ئابڕووبەرەوە، چونکە ئەو جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئەو دامەزراوەیە لەرێی پەرەسەندنی داروینییەوە پەیدا بووە، کە جگە لە دڕندەیی و کەمی و نزمی هیچی تر بەرهەم ناهێنێت، لە هەمان کاتدا وایدەبینێت کە ناوەڕۆکەکەی کۆمەڵێك ڕەوشتی باشە کە لە ئەنجامی کۆمەڵێك هەڵەی پەرەسەندنەوە پەیدابووە! و پێویستە لەسەرمان کە منداڵەکانمان لەسەر ئەو هەڵە باشانەوە گەورە بکەین. ئێمەش لێی دەپرسین: ئایا کەلەڕەقی لەگەڵ یاساکانی سروشتدا نابێتە هۆی لەناوچوونی ڕەگەزی مرۆڤایەتی؟!

خراپییەکانی دۆوکنز لە ئاستی بێتوانایی فەلسەفی و لاوازی بەڵگە زانستییەکانی نەوەستاوە، بەڵکو شێوازێکی چەواشەکارانەی ئاست نزمی بەکارهێناوە، کە وایکردووە هاوبیرەکانی بە دوورییەوە نەمێنن و بەوە وەسفی بکەن کە تەنیا بێباوەڕێکی ئاست نزمی سۆفستائی سەرەتایی و، ساختەکاری حەقیقەتەکانە، وەك مرۆڤێکی لەخۆبایی و خۆبەزلزان دەربکەوێت، دوای ئەوەی لە خواردنەوەدا زیادەڕۆیی کردووە، ئیتر دەستیکردووە بە بڵاوکردنەوەی جنێو و رق و کینەی بەسەر ئەو کەسانەی لەگەڵ بیرو بۆچوونەکانیدا ناکۆکن.

## تەوەرەی یازدەهەم

# تاقمەکانی بێباوەڕی نوێ

((ئەوەی لە بێباوەڕی نوێدا نوێیە بە تەنیا بریتی نییە لە دوژمنداری و چەواشەکارییەکەی، یاخود ڕەواجپێدانی لەلایەن ڕاگەیاندنەکانەوە، یاخود ئەوەی کە بەشێوەیەکی زانستییانە باس لە ئایین دەکات، بەڵکو نوێترین لایەنی بریتییە لە هێرشکردنە سەر ڕەفتارە ئیسلامییەکان، بەڵکو هێرشکردنە سەر خودی ئیسلام)).

ویلیام ئێمیرسۆن[1]

دەستەواژەی (بێباوەڕی نوێ New Atheism) لە ڕۆژئاوادا بەو بیرۆکانە دەوترێت کە کۆمەڵێك لە نووسەرە بێباوەڕەکان خستوویانەتەڕوو، ئەو هزرە پەیڕەوی لەوە دەکات کە تەنیا پێکەوەژیانی بێباوەڕی و ئایین بەس نییە، بەڵکو پێویستە هێرشبکرێتە سەر خوایەتی و چەمکە ئایینییەکان و ڕەخنەیان لێبگیرێت و بخرێنە بەر شیکاری زانستی و بابەتیانەوە، لەپێناو ئەوەشدا ئەو ڕەوتە لێکدانەوەی ماددی / سروشتییان بۆ هەموو دیاردەیەك کردووە، هەر لە پەیدابوونی گەردوونەوە تا دەگاتە هەستە ڕۆحانییەکانی مرۆڤ.

---

(١) William Emerson: (١٩٢٣-٢٠٠٩ز)، ڕاگەیانکاری بەناوبانگی ئەمریکی، کە گرنگی بە مافەکانی مرۆڤ دەدات.

لەم دواییانە (لەنێوان ساڵانی٢٠٠٤-٢٠٠٧ز) چڕی و پڕییەکی زۆری لە نووسینی کتێب لەو بوارەدا بەخۆیەوە بینی، بەناوبانگترین نووسەرانی ئەو بوارەش ئەو کۆمەڵەیە بوون کە لە ساڵی(٢٠٠٤) ناوی (چوار سوارچاک)ەکیان لێنرا، کە بایۆلۆجی (ریچارد دۆوکنز)، فەیلەسووف (دانیال دێنیت)، پزیشکی دەمار (سام هاریس)، راگەیاندکار(کریستۆفەر هیتچنز) لەخۆدەگرێت. کۆمەڵێکی تریش[1] هاتنە پاڵ ئەو کۆمەڵەیەوە کە گرنگترین ئەندامەکانی؛ زانای فیزیای بیرکاری(ستیڤن هۆکینگ) بوو کە بەم دواییانە نکۆڵی لە بوونی خودا کرد.

هەروەها لەساڵی ٢٠١٠ز راگەیاندکاری گەورە تۆم فلین[2] وتارێکی نووسی تیایدا بێباوەڕی نوێی خستە قەبارەی ڕاستەقینەی خۆیەوە، تیایدا هاتووە: پێویستە هەست بەو هەڵەیە بکەین کە دەربارەی بزووتنەوەی بێباوەڕی نوێ دەوروژێندرێت، چونکە نە نوێیە، نە بزووتنەوەیشە! ئەوەی نوێیە درووستکردنی شەپۆلێکە لە لایەن خانە گەورەکانی چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێب بۆ فرۆشتنی ژمارەیەکی زۆری کتێبەکانیان تا کار گەیشتۆتە ئەوەی کە بە ملیۆنان دانەیان لە کتێبەکانی ئەو بوارە فرۆشت و لیستی پڕفرۆشترین کتێبەکانیان داگیر کرد، گومانیش لەوەدا نییە کە بێباوەڕی نوێ چەند رەهەندێکی سیاسی هەیە، کە گرنگترینیان رەواجدانە بە ترس لە ئیسلام و چەوساندنەوەیتی (Islamophobia)، بۆیە نووسینەکان کۆمەڵەی(چوار سوارچاکەکە) رقئەستوورییەکی بەرامبەر بە ئیسلام پێوە دیارە، هەروەك چۆن چەمکەکانی سامویل هێنتینگتۆن لە کتێبەکەی

---

(١) راگەیاندنی رۆژئاوایی سێ کەسی تر دەداتە پاڵ ئەم کۆمەڵەیە کە بۆچوونەکانیانمان لە تەوەرەکانی کتێبەکەدا خستۆتەڕو، ئەمانیش:

- Vector Stenger: زانای فیزیای تەنۆلکە وردەکان، ئەمریکییە، نووسەرێکە گرنگی بە سادەکردنەوەی زانستەکان دەدات و، وەك گومانکار پۆلێن دەکرێت، لە ساڵی ١٩٣٥ز لەدایك بووە.

- Laurence Crausn: لەساڵی ١٩٥٤ز لە ویلایەتە یەکگرتووەکان لە دایك بووە و، مامۆستای فیزیای بیرکارییە، دۆوکنز لە دیدارە رۆژنامەوانییەکانی زۆر پشتی پێدەبەستێت.

- A.C.grayling: فەیلەسوفێکی بەریتانییە و گرنگی بە زانستە مرۆییەکان دەدات، لە ساڵی ١٩٤٩ز لەدایك بووە.

(٢) Tom Flynn: نووسەر و راگەیاندکاری ئەمریکی، سەرۆکی ئەنجوومەنی مافەکانی مرۆڤ لەویلایەتە یەکگرتووەکان، لە ساڵی ١٩٥٥ز لە دایك بووە.

(ململانێ ژیارستانییەکان The Clash of Civilizations)[1] بۆ قووڵکردنەوە و چەسپاندنی دووژمنایەتییە لە دەروونی گەلاندا لە دژی ئیسلام، ویلیام ئێمێرسۆن وەك ئاماژەیەك بۆ ئەو واتایە دەڵێت: ((ئەوەی لە بێباوەڕی نوێدا نوێیە بە تەنیا بریتی نییە لە دوژمنداری و چەواشەکارییەکەی، یاخود ڕەواجپێدانی لەلایەن ڕاگەیاندنەکانەوە، یاخود ئەوەی بەشێوەیەکی زانستییانە باس لە ئایین دەکات، بەڵکو نوێترین لایەنی بریتییە لە هێرشکردنە سەر ڕەفتارە ئیسلامییەکان، بەڵکو هێرشکردنە سەر خوودی ئیسلام)).

من زۆر بە توندی وەسفکردنی بێباوەڕی نوێ بەوەی کە بێباوەڕییەکی زانستییە ڕەتدەکەمەوە، چونکە بە هیچ جۆرێك شایەنی ئەو وەسفە نییە، لەبەر ئەوەی ئەو نووسەرانە ئەگەرچی باس لە پرسی زانستیش بکەن، بەڵام شێوازی خستنەڕووی بابەتەکانیان زۆر دوورە لە مەنهەجی زانستی و بێ مەبەست نین، هەروەها ئەوەش ڕەتدەکەمەوە کە چوار چەواشەکارترین کەسانی ئەو ئاڕاستەیە بە(سوارچاك) وەسف بکرێن، دەستەواژەی (سوارچاك) لە هەموو زمانەکاندا وەك ئاماژە بۆ کەڵەپیاو بەکاردێن، کە ژیانی خۆی لەپێناو حەق و وەستانەوە دژ بە ناحەق دەبەخشێت، پاشان وەسفکردنی ئەو بێباوەڕانە بە(سوارچاك) شێوازێکی ڕەواجدانی ڕاگەیاندنە بۆ کەمکردنەوەی پێگەی ئایینەکان و دەرخستنی ئەو کەسانە بەوەی ئەو جۆرە کەسانە لایەنگیری ئەو ڕەوتەن، بەجۆرێك کە ئایین جەنگەکەی لەگەڵ بێباوەڕیدا بەر لە دەستپێکردنی بدۆڕێنێت.

لەبەر ئەوەی ئەو کەسایەتییە بێباوەڕانە باس لەو بیرو بۆچوونانە دەکەن کە لە دەروازەی یەکەمدا باسمان کردوون، هەروەك چۆن ڕیچارد دۆوکنز لە بیرۆکەکانیدا وەك لە تەوەرەی پێشوو باسمان کرد کە لەگەڵیاندا یەکانگیر دێتەوە، لەم تەوەرەیەدا بە کورتی باس لە بەناوبانگترین کتێبەکانیان دەکەین

---

(١) بیردۆزی ململانێ ژیارستانییەکان: دوای ڕووخانی یەکێتی سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٩٠ز وەك بەهێزترین هێزی جیهان ناوبانگی دەرکرد، بیردۆزەکە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئەو پەیوەندییەی ژیارستانییەتە جیاوازەکانی جیهان ڕێکدەخات(چینی، هیندی، ئیسلامی، ڕۆژئاوایی، ئاردۆسۆکسی) لە قۆناغی دوای شەڕی سارددا بریتییە لە(ململانێ).

کە راگەیاندنی ڕۆژئاوا شانازییان پێوە دەکات، بۆ ئەوەی دەست بخەینە سەر ڕێڕەو و مەنهەجی هەر یەکێك لەو کتێبانە و ئەو جیاوازییە بچووك و کەمەی لەنێوانیاندا هەیە نیشان بدەین.

## ستیڤن هۆوکینگ[1] :

گومان لەوەدا نییە کە ستیڤن هۆوکینگ ناوبانگێکی گەورەی جیهانی هەیە، ئەمەش بەهۆی بلیمەتی و ڕۆچوون لە پسپۆڕییەکەیدا کە بریتییە لە فیزیای تیۆری، هەروەها بەهۆی ئەو سۆزدارییەی جیهان بۆیان نیشاندا بەهۆی بەهێزی و هیممەتبەرزی لە بەرامبەر نەخۆشییە گەورەکەی کە تووشی پەککەوتەیی کرد، هەر لە سەرەتای گەنجییەوە تووشی ئەو نەخۆشییە بوو، تا بوو بە نموونەیەکی بەرزو پێشەوای زۆر کەس.

ئەگەرچی ستیڤن هۆوکینگ بۆ ماوەی چەند ساڵێك لەسەر هەمان کورسی دادەنیشێت کە ئیسحاق نیوتن لەسەری دادەنیشت لە زانکۆی کامبریدج، بەڵام جیاوازییەکی گەورە هەیە لەنێوان ئەو دوو پیاوەدا، لەڕووی هزری بابەتیانەو قووڵی دیدی فەلسەفییەوە، بۆیە نەنگی نییە کە هزری فەلسەفەی هۆوکینگ بخەینە ژێر لێکۆڵینەوە و ڕەخنەی لێبگرین، بەڵام تا ئەو ئاستەی کە لە پسپۆڕییە زانستییەکەی دوور بین،چونکە ئێمە بۆ باسەکەمان کارمان بەو لایەنەی نییە.

بۆ ماوەی چەند ساڵێك هۆوکینگ دەرگای بەڕووی پرسیارکردن دەربارەی بوونی خودا بەکراوەیی جێهێشتبوو، لە کۆتایی کتێبی (مێژوویەکی کورتی کات)[2]دا دەڵێت: ((ئەگەر کۆکەرەوەی بیردۆزەکان)مان بۆ هێزەکانی فیزیا

---

(١) Stephen Hawking: لە تەوەری چوارەمدا ناساندوومانە.

(٢) History of timeA brief، لەساڵی ١٩٩٨ز دەرچووە.

دۆزییەوە، ئەوا سەرکەوتنێکی گەورەمان بۆ عەقڵی مرۆڤ بەدەستهێناوە، ئەو کات لە عەقڵی خودا تێدەگەین)). دیندارەکان بەم بۆچوونە خۆشحاڵبوون و گوتیان کە هۆوکینگ زانایەکی باوەڕدارە، ئەو قسەیەیان وەك بەڵگە لەسەر ڕاستی هەڵوێست و باوەڕەکەی هێنایەوە. بەڵام لە کۆتا کتێبیدا(دیزاینە مەزنەکە)[1] هۆوکینگ هەڵوێستەکەی خۆی گۆڕیوە، دەڵێت: ((بوارێك بۆ دانانان بە بوونی خودا نەماوەتەوە[2])).

ئا لەو کاتەوە ریچارد دۆوکنز بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە گوتی: ((ئەگەر داروین بە خۆشحاڵییەوە خودای لە زانستی بایۆلۆجیا دوور خستبێتەوە Kick Out بەڵام هێشتا شوێنێکی لە زانستی فیزیا مابووەوە، تا ئەو کاتەی ستیڤن هۆوکینگ لەوێش کردییە دەرەوە)). ئایا ئەو بانگەشەی دۆوکنز ڕاستە؟! با ببینین:

## دیزاینە مەزنەکە The Grand Design :

لە کتێبەکەیدا(مێژوویەکی کورتی کات) هۆوکینگ ئەوەی خستەڕوو، کە ئەو ڕووداوانەی لەگەڵ تەقینەوە گەورەکەی گەردووندا ڕوویاندا، یاخود ئەوانەی کە لەدوای تەقینەوەکە ڕوویاندا، یاسا و نەگۆڕە فیزیاییەکانی تێکشکاندبوو، بۆیە پێویستی بە دەستخستنە ناوی خودایی هەبوو. پاشان هۆوکینگ ئەو بۆچوونەی لەکتێبەکەی(دیزاینە مەزنەکە) گۆڕیوە و ڕایگەیاندووە کە یاسا و نەگۆڕە فیزیاییەکان کە لە ئێستادا دانراون توانای بەدیهێنان و پێکهێنانی گەردوونیان هەیە، کەواتە هیچ پێویستییەك بۆ دانانان بە بوونی خودا بوونی نییە. سەرنجی قسەکەی بدە کاتێك دەڵێت: چونکە یاسایەکی وەك هێزی

---

(١) The grand design، لە ساڵی ٢٠١٢ز دەرچووە و، زانای فیزیایی لیۆناردۆ ملۆدنیۆ بەشداریکردووە.

(٢) پاش کەمێکی تر هۆکاری گۆڕینی هەڵوێستەکەی دەخەینەڕوو.

کێشکردن بوونی هەیە، کەواتە گەردوون خۆی لە نەبوونەوە بەدیهێناوە! بەڕاستی ئەو قسەیە لەگەڵ چەمکە بێباوەڕییەکانی دۆکنزدا یەکانگیر دێتەوە و، پڕە لە هەڵەی زانستی و لۆژیکی مەترسیدار، لەوانە:

**یەکەم:** هۆوکینگ کەوتۆتە ناو هەمان ئەو چاڵەوە کە زۆربەی بێباوەڕان تێیکەوتوون، تەنانەت ئەگەر پێگەی زانستی بەرزیشیان هەبووبێت، ئەویش بریتییە لەوەی کە هەر شتێك بە یاساکانی سروشت لێکبدرێتەوە پێویستی بە بوونی خودا نییە، ئەمەش تێکەڵکردنێکی ساکارانەیە لەنێوان خودای بەدیهێنەر(وەك هۆکاری یەکەم) و هێزەکانی سروشت(وەك میکانیزم)، ئەمە ڕێك وەك ئەوە وایە کە تەفسیرکردنی کاری بزوێنەری فڕۆکە لەنێوان یاسای کاردانەوەی نیوتن[1] و دیزاینی دیزاینەری بزوێنەرەکە، کە ئەندازیاری بلیمەت(سێر فرانك ویتڵ)[2]ە، یەکێکیان هەڵبژێرین. لەڕاستیدا هەڵبژاردن لەنێوان میکانیزم و هۆکاری یەکەم هەڵەیەکی ڕوونە، چونکە لێرەدا تۆ لەنێوان(ئاستە جیاوازەکان)و (جێگرەوەکان) یەکێکیان هەڵدەبژێری، ئەمەش هەڵەیەکە کە لە لۆژیکدا بە (هەڵەی جۆری Category Error) ناسراوە.

سێر ئیسحاق نیوتن نەکەوتۆتە ناو ئەم هەڵە سادە و ساکارەوە، چونکە کاتێك یاسای کێشکردنی دۆزییەوە نەیگوت لە ئێستادا کە گەیشتووم بە یاسای هێزی کێشکردن ئیتر پێویستیمان بە بوونی خودا نییە، بەڵکو لەو کاتەدا بەناوبانگترین کتێبی مێژووی زانستەکانی نووسی بە ناونیشانی(ڕێساکانی بیرکاری Principia Mathematica) کە تیایدا نووسیویەتی: ((ئومێدەوارم ئەم کتێبە بڕوا بە مرۆڤی بیرمەند بێنێت، کە باوەڕ بە خودا بکات)).

لەڕاستیدا یاساکانی سروشت ئەوە بۆ مرۆڤ ڕووندەکەنەوە کە چۆن بزوێنەری فڕۆکە کار دەکات، بەڵام ئەوە ڕەت ناکەن کە کەسێك ئەم بزوێنەرەی داهێناوە،

---

(١) هەموو کارێك کاردانەوەیەکی هاوشێوەی خۆی هەیە لەهێزداو پێچەوانە لە ئاڕاستەداو، کاری بزوێنەری فڕۆکەش بەم یاسایە دەبەستێت.

(٢) Sir Frank Whittel: (١٩٠٧-١٩٩٦ز)، ئەفسەری ئەندازیار لە لەشکری ئاسمانی شاهانەی بەریتانی، داهێنەری بزوێنەری دووکەڵدار.

بۆیە گومان لەوەدا نییە کە یاساکانی سروشت ئەو کارەیان نەکردووە، بەڵکو هەمان ئەو یاسایانە پێویستییان بەهێزێك هەبووە کە بیاننوسێتەوە و بیانهێنێتە بوون و کردەییان پێببەخشێت، بۆ نموونە مادده(کە سادەترین شتە) ئەو یاسایانەی بەسەردا جێبەجێ دەبێت و ریتڵ لە درووستکردنی بزوێنەرەکەدا بەکاریهێناوە، بێگومان یاساکانی سروشت ئەو ماددەیەیان بەدینەهێناوە.

ئێمە لێرەدا لەبەردەم سێ شت داین (هۆکاری یەکەم - مادده - ئەو یاسایانەی رەفتاری مادده رێکدەخەن)، گومانیش لەوەدا نییە کە یاساکان خۆیان بێتوانان لە ئەنجامدانی هەر کارێك، چونکە یاساکان هیچ نین جگە لە وەسفێکی بیرکارییانە بۆ ئەو شتانەی کە ناتوانن لەژێر کاریگەری باروودۆخێکی دیاریکراودا روودەن[1]، یاسای بیرکاری بەوپەڕی سادەیی پێت دەڵێت، ئەگەر تۆ (أ)ت هەبوو، ئەوا (ب) یش بەدەستدێنیت، بەڵام پێویستە لە سەرەتادا (أ)ت هەبێت. لەڕاستیدا باوەڕبوون بەوەی یاساکانی سروشت توانای بەرهەمهێنانی (مادده - وزە) و دانان و کاراکردنی خۆیانیان هەیە، تەنیا خەیاڵێکی زانستی نەزۆکە!

هۆکینگ لە کتێبەکەیدا (مێژوویەکی کورتی کات)دا، ئاگاداری ئەو حەقیقەتە بوو - بەرلەوەی لە کتێبی دیزاینە مەزنەکە - نکۆڵی لێبکات - گوتوویەتی: لەڕاستیدا گەیشتنی زانست بە یاساکانی فیزیا واتای ئەوە نییە کە ئەو یاسایانە گەردوونیان بەدیهێناوە و، وەڵامی ئەو پرسیارە ناداتەوە کە بۆچی هەر لە بنەڕەتدا گەردوون پەیدا بووە. ئایا ئەگەر بە(کۆکەرەوەی بیردۆزەکان)ی یاساکانی فیزیا بگەین، واتای ئەوەیە کە بیردۆزەکە خۆی خۆی بەدیهێناوە، یان بیردۆزەکە خۆی پێویستی بە بەدیهێنەر هەیە؟ هەروەها ئایا ئەم بەدیهێنەرە جگە لە نووسینەوەی یاساکان رۆڵێکی تری لە گەردووندا هەیە؟.

**دووەم:** قسەکەی هۆکینگ (لەبەر ئەوەی یاسایەکی وەك یاسای کێشکردن بوونی هەیە، ئەوا گەردوون خۆی خۆی لە نەبوونەوە بەدیهێناوە)، ئاماژەیە بۆ ئەوەی، کە پەیدابوونی گەردوون شتێکی حەتمی بووە و لە دەرەنجامی

---

(١) چەمکی یاساکانی فیزیامان بەدووررو درێژی لە تەوەرەی دووەم و سێیەمدا باس کردووە.

هێزی کێشکردندا هاتۆتە بوون، سەرەڕای ئەوەی کە تەنانەت تاکە بەڵگەیەکی زانستیش لەسەر ئەو حەتمییەتە بوونی نییە، چونکە هێشتا نازانین گەردوون بۆچی هاتۆتە بوون، لەبری ئەوەی وەك دۆخی پێشووی لە نەبوونی بەردەوامبێت.

سێیەم: کاتێك هۆوکینگ پەیڕەوی لەوە کرد کە گەردوون خۆی خۆی لە نەبوونەوە بەدیهێناوە، کەوتە هەڵەیەکی زانستی و عەقڵی گەورەوە، چونکە بۆچوونەکەی بەو واتایە دێت، شتێك کە هێشتا بەدینەهاتووە توانای بەدیهێنانی خۆی هەیە. نالۆژیکییەت هەر نالۆژیکییەتە هەتا ئەگەر لەلایەن زانایەکی گەورەی جیهانیشەوە بێت[1].

چوارەم: هۆوکینگ لە نووسینەکانیدا ئەوەی ڕوون نەکردۆتەوە ئاخۆ بۆچی گەردوون شوێنی ئەو ڕێکخراوییە وردە موعجیزەیە دەکەوێت کە ئەنیشتاین و بیرمەندە گەورەکانی تری تووشی تێرامان کردووە و بەرەو باوەڕبوون بە خودای بردوون. باشتر بوو هۆوکینگ بیر لە دانایی(ئالان ساندراج)ی باوکی زانستی ئەلەکناسی نوێ بکاتەوە کاتێك گوتویەتی: ((من وایدەبینم کە مەحاڵە ئەم ڕێکخراوییە لە پشێوی و ناڕێکخراوییەوە پەیدا بووبێت، بۆیە پێویستە ڕێکخەرێك بوونی هەبێت. لەڕاستیدا خودا لەلای من زۆر ناڕوونە، بەڵام تاکە تەفسیرە بۆ موعجیزەی بوون بە هەردوو بەشەکەیەوە: بۆچی شتێك لەبری هیچ شتێك بوونی هەیە؟ بۆچی ئەم ڕێکخراوییە سەرسوڕهێنەرە بوونی هەیە؟

پێنجەم: یەکێك لەو بیروڕایانەی کە هۆوکینگ لە کتێبی (دیزاینە مەزنەکە) ڕەواجی پێدەدات بریتییە لە گەیشتن بە بیردۆزی یەکخستنی گەورە، کە هەر چوار هێزە گەورەکەی سروشت لە هاوکێشەی بیرکارییانەی هاوبەشدا کۆ بکاتەوە، کە ئەمە گەرەنتییە بۆ تەفسیرکردنی هەرچی وردی بێسنووری گەردوونە و بۆ ئەوەی پێویستبوون بە بوونی خودا نەهێڵێت. لەوەدا لەگەڵ هۆوکینگدا هاوڕاین، کە گەیشتن بە بیردۆزێکی لەم جۆرە واتا بوونی ئەوپەڕی پەیوەندی و دیزاین

---

(١) لە تەوەری چوارەم(گریمانەی نموونەی فرەگەردوونی)مان تاوتوێ کردووە کە هۆوکینگ بۆ تەفسیرکردنی پەیدابوونی گەردوون لە نەبوونەوە دەیخاتەڕوو و، ڕای گەورە زانایانی فیزیا و ئەلەکناسیمان دەربارەی ئەو کەم و کوڕی و دژیەکییە لۆژیکییانەی تیایدا هەیە خستۆتەڕوو.

لە بنچینەی گەردووندا، بەڵام بە بوونی ئەم وردییە بێسنوورە پێویستە نەبوون بۆ هۆکاری یەکەم بکەیتە دەرئەنجام، ئەوە کەموکورتییەکی عەقڵییە، چونکە پێچەوانەکەی ڕاستە.

**شەشەم:** هۆوکینگ دانی بە گونجاوی بنچینەی گەردووندا ناوە بۆ پەیدابوونی ژیان(بنەمای مرۆیی)و بۆ لێکدانەوەی ئەوەش پەیڕەوی لە رای چەند گەردوونی دەکات، ئەم بانگەشەیەشمان لە تەوەری چوارەمدا پووچەڵ کردۆتەوە. ئەوەی ئێمە تووشی سەرسوڕمان دەکات، دەستگرتنی هۆوکینگە بە گریمانەی (چەند گەردوونی) کە جگە لە خستنەڕوویەکی فەلسەفی جیاوازی تەواو دوور لە ڕاستییەکان هیچی تر نییە.

**حەوتەم:** ئەگەر لە ڕێسا و بیردۆزە بیرکارییەکانەوە بچینە سەر زانستی بایۆلۆجیا، هۆوکینگ بە شوێنکەوتنی شێوازێکی سۆفستائی بەناوبانگ شۆکمان دەکات، ئەویش خستنەڕووی بۆچوونە بێباوەڕییەکانە، بەوەی ئەوانە پێشەکی دانپێدانراون، بێئەوەیکە هیچ بەڵگەیەکیشیان لەسەر هەبێت. سەرنجی بدە کاتێك دەڵێت: هیچ لێکدانەوەیەك بۆ پەیدابوونی زیرەکی مرۆڤ و توانای گەیشتنمان بە یاساکانی سروشت و دانانی بیردۆزە زانستییەکان هیچ شتێك لە بەردەممدا نابینم جگە لە هەڵبژاردنی سروشتی داروینی، چونکە بەردەوام زانست هەلی باشتر بۆ ژیان دەدۆزێتەوە.

لەوانەیە ئەو بانگەشەیە لە هۆوکینگ وەربگرین سەبارەت بەدۆزینەوە زانستییەکان، کە پەیوەندی ڕاستەوخۆیان بەمانەوەی ڕەگەزی مرۆڤایەتییەوە هەیە، بەڵام زۆرێك لە دۆزینەوە زانستییە وردەکان ناچنە ژێرباری هەڵبژاردنی سروشتییەوە. پۆڵ دێڤیز ئەمە ڕووندەکاتەوەو دەڵێت: ((گومان لەوەدانییە کە هەڵبژاردنی سروشتی ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە هەندێك لە بەهرەو چالاکییەکانمان، وەك بازدان بەسەر جۆگەی ئاو و هەڵگرتنەوەی ئەو بەروبوومەی لە درەختێك کەوتووە، بەڵام واینابینم کە هیچ ڕۆڵێکی هەبێت لە گەیشتن بە چەمکە زانستییەکان، کە هیچ پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆیان بەمانەوەی ڕەگەزی

مرۆڤایەتییەوە نییە؛ وەك زانینی ئەوەی چی لەناو گەردیلە و كونەرەشەكان یان بیردۆزی (الاوتار)دا ڕوودەدات، یان چەمكە فەلسەفییەكانی وەك ئامانج لە بوون و پەیدابوون و سەرەنجاممان، بەڕاستی پەرسەندنی داروینی هیچ پەیوەندیەكی بەو جۆرە بابەتانەوە نییە)). هۆوكینگ پرسەكە بە شێوەیەكی شەرمنانە سادەكردۆتەوە بۆ ئەوەی پشتگیری پێ لە بۆچوونە بێباوەڕییەكانی بكات.

**هەشتەم:** یەكێك لەشتە چاوەڕواننەكراوەكانی هۆوكینگ ئەوەبوو ڕایگەیاند كە فەلسەفە مردووە[1] Philosophy is died،ئەمەشی بۆ ئەوە گێڕایەوە كە فەلسەفە لەگەڵ دۆزینەوە زانستییەكاندا ڕێناكات، بەتایبەتی لەبواری فیزیادا.

گومان لەوەدا نییە كە ئەم بانگەشەیە بەتەواوی لەگەڵ ڕاستیدا یەكانگیرە، چونكە فەلسەفە زانستێكی پراكتیكی نییە، بەڵكو شێوازێكی فیتری مرۆڤە لە بیركردنەوەو گەڕان بەدوای پرسیارە تەوەرییەكانی بوون، تا ئەو ئاستەی كە گوتراوە: هەموو مرۆڤەكان فەیلەسوفن، لەوانەیە ئەم بانگەشە هۆوكینگییە ڕاست بوویێت ئەگەر پێوەرمان بۆباری تەندروستی فەلسەفە بریتی بێت لەنووسینی ئەوەی كە مرۆڤی فەلسەفی زۆر لاوازە: دیزاینە گەورەكە! بەڵام - سوپاس بۆ خوا-هێشتا فەیلەسوفی گەورە هەن، كە جیهانی هزریان پڕكردووە لە بیركردنەوەی نوێ و شیكردنەوەی قووڵ و دەرەنجامی دروست، هەڵوەستەكەمانلەگەڵ هۆوكینگدا بەوە كۆتایی پێدێنین، كە دەڵێین: ئەگەر فەلسەفە مردبێت، ئەوا نووسینەكانی فەیلەسوفەكان تەنیا خەیاڵە و ئەگەر فەلسەفە لە تافی لاوێتیدابێت - كە ئەمەش ڕاستییەكەیە - ئەوا قسەكەی هۆوكینگ هەڵە و درۆیە.

---

(١) ئەمە لە بروسكەیەكدا هاتووە كە بۆ Google Zeitgeist Conference ناردوویەتی لە ٢٠١١/٥/١٧.

## دانیێل دێنیت[1]

### بیرۆکە مەترسیدارەکەی داروین[2] Darwin's Dangerous Idea

دانییێل دێنیت یەکێك بوو لە یەکەمینەکانی گاڵتەجاڕی بێباوەڕی نوێ لەساڵی (١٩٩٥ز)دا، لە ڕێی کتێبەکەی، بە ناونیشانی (بیرۆکە مەترسیدارەکەی داروین) بە ناوبانگ بوو، دێنیت ئەم بیرۆکە مەترسیدارە شیدەکاتەوە و دەڵێت: جیهانی زیندەوەران بە هەموو ئەو وردی و لایەنە سەرسوڕهێنەرانەی تێیدا هەیە، ئەوەی وا دەردەکەوێت کە دیزاینێکی وردی سەرسوڕهێنەری تێدا بەکارهاتووە، لەلایەن خودا دیزاین نەکراوە و بەدینەهێنراوە، یاخود لەلایەن هەر شتێکی تری هاوشێوەی خودا، بەڵکو بەرهەمی هەڵبژاردنی سروشتی بوو، کە هەستاوە بە لە بێژنگدانی بازدانە بۆماوەییە هەڕەمەکییەکان، ئەم کردارە کردارێکی میکانیکی ناهۆشیارانە بوو، ئەو گونجاو و ڕێکخراوییەی بەبێ یاریدەی هیچ عەقڵێك[3] لە پشێوی و ناڕێکخراوییەوە بەدیهێناوە، هەروەها دێنیت لە کتێبەکەیدا)وەك هەر لایەنگرێکی تری پەرەسەندن) پەیڕەوی لەوە کردووە کە(ژیان) لەڕێی پەرەسەندنی کیمیایی هەڕەمەکییەوە پەیدا بووە، کە دەچێتە ژێر باری ڕێسا کیمیایی و فیزیاییەکانەوە.

---

(١) Daniel Denett: فەیلەسوفێکی ئەمریکییە، گرنگی بە فەلسەفەی زانستەکان و فەلسەفەی عەقڵ دەدات و ١٠ کتێبی لەو بوارانە هەیە، لەساڵی ١٩٤٢ز لەدایك بووە.

(٢) Darwin's Dangerous Idea. New York: Semon and Sushter 1995

(٣) P.50

## بۆچی بیرۆکەی داروین مەترسیدارە؟

دینیت بەوە وەڵاممان دەداتەوە کە ئەو بیرۆکەیە ناچارمان دەکات چاو بە هەموو چەمکەکانی منداڵیماندا بخشێنینەوە دەربارەی ژیان و ڕەوشت و جوانی و بەهاکان، ئەو بیرۆکەیە لە کۆتاییدا دەبێتە هۆی ئەوەی کە بە تەواوی نکۆڵی لە بوونی خودا بکەین. هەروەها دینیت وایدەبینێت کە ئەو بیرۆکەیە دەمێنێتەوە و باڵ بەسەر گەردووندا دەکێشێت(چونکە مانەوە بۆ باشترینە)، لەکاتێکدا چەمکە ئایینییەکان نامێننەوە و لەناو دەچن، لەبەر ئەوە پێشنیاری ئەوە دەکات هەندێك مرۆڤی دیندار لە باخچە رۆشنبیرییەکانی ئاژەڵان بهێڵینەوە، بۆ ئەوەی نەوەکانی ئایندە بیانبینن. بەمەرجێك عەقڵی منداڵەکانیان بە بیرۆکەکانیان دەربارەی خودا ژەهراوی نەکەن [1].

هەروەها دێنیت دەڵێت: ((هەر مرۆڤێك لەم ڕۆژگارەدا گومانی لەوە هەبێت کە ئەو جۆراوجۆریەتییەی ژیان بەهۆی پەرەسەندنی داروینییەوە ڕوویداوە، ئەوا کەسێکی نەزانە و لێی نابوردرێت))[2]. ئای لەم کێشەیە؛ ئایا ئەگەر پەرەسەندن وەك چەمکێك قەبوڵ بکەم و هەرەمەکییەتی ڕەتبکەمەوە بەهۆی ئەوەی کە لەڕووی زانستی لۆژیکییەوە مەحاڵە، دەبم بە کەسێکی نەزان و تەنانەت شیاوی لێبوردنیش نابم؟!

وا دیارە وەسفکردنی کەسانی تر بە نەزانی لەلای داروینییەکان زۆر گرنگە، چونکە دێنیت یەکەم کەس نەبووە کە ئەو کارەی کردووە، ئەوەتا دۆوکنز لە ساڵی ١٩٨٩ز لە ڕۆژنامەی نیویۆرك تایمزدا دەڵێت: ((لە حەقیقەت لام نەداوە ئەگەر هەر کەسێك کە باوەڕی بە داروینیزم نەبێت بە نەزان یان گێل یان شێت یان دڕندەیەکی ئازاردەر وەسفی بکەم)). دۆوکنز لە دێنیت بەخشندەترە، چونکە

---

(١) P.516

(٢) P. 46 لە کتێبەکەی Breaking The Spell

مافی هەڵبژاردنی لەنێوان چوار وەسفی خراپ و کەم و کورتی پێداوین، هەروەك چۆن ئەوەی رەتنەکردۆتەوە کە لێمان ببوورێت، بەڵام دێنیت زۆر توندتر بووە، بەو پێیەی کە ئەو بواری لێبوردنی نەهێشتۆتەوە. بەڵام لە کۆتاییدا هەمان زمانی زبری پڕ لە فیز و یەکلاکەرەوەیان بەکارهێناوە، بۆیە شیاوی ئەو وەسفەن کە خۆیان بۆ خۆیان دایانناوە، بەوەی کە بێباوەڕی ئوسوڵی توندڕەون.

## بەتاڵکردنەوەی جادووەکە[1] Breaking The Spell :

دوای دە ساڵ لە نووسینی کتێبەکەی پێشووی، دێنیت کتێبی (بەتاڵکردنەوەی جادوو)ی بڵاو کردەوە، کە بەشێکی بچووکی بۆ (بیرۆکە مەترسیدارەکە) زیاد کردووە، نووسیویەتی: ((لەڕاستیدا بیرۆکەی بەدیهێنان بە بێ پێویستبوون بە عەقڵێك بە سەر دامەزراوە ڕەوشتییەکانمان و هەست و سۆزە ئایینیەکانمان و داهێنانە هونەرییەکانمان و گرنگیدانە زانستییەکانیشماندا جێبەجێ دەبێت، چونکە عەقڵ و زیرەکی بەر لە پەیدابوونی گەردوون پەیدا بوون، نەوەك دوای پەیدابوونی گەردوون)).

## بەڵگەکەی دێنیت Dennett's Argument :

وەسفکردنی پەرەسەندنی داروینی بە مەترسیدار لەلایەن دێنیتەوە لە چوار تەوەرەوە سەرچاوە دەگرێت:

**یەکەم:** دەکرێ هەر خاسییەتێك لە خاسییەتەکانی جیهان بۆ میکانیزمی میکانیکی کوێرانە بگێڕدرێتەوە، کە هیچ ئامانج و دیدگایەکی نییە.

**دووەم:** پێویست بەوە ناکات کە باوەڕ هاوبەشی عەقڵ بێت وەك سەرچاوەیەکی زانیاری، تەنانەت لە پرسە غەیبییەکانیشدا.

---

(١) Breaking The Spell. New York. Penguin 2006

**سێیەم:** لەڕاستیدا بیرۆکەی بوونی خودای بەرجەستەبوو لە شێوەی مرۆڤدا بیرۆکەیەکی منداڵانەی نالۆژیکییە.

**چوارەم:** لەڕاستیدا بەڵگە کلاسیکییەکان لەسەر پرسی خوایەتی؛ بەڵگەی بەدیهێنان، بەڵگەی دیزاین.. ڕاست نین، کەواتە پێویستە هەر کەسێك کە بانگەشەی بوونی خودا دەکات بەڵگەیەکی بەرجەستەی زانستی بخاتەڕوو.

پێشتر، لە تەوەرەکانی کتێبەکەدا بەڵگەکانی هەڵەیی پەرەسەندنی داروینیمان خستەڕوو، هەروەها هەڵەیی چوار تەوەرەکەی بەڵگەکەی دینیتیشمان خستۆتەڕوو، هەروەك چۆن بەڵگەی یەکلاکەرەوەو حاشاهەڵنەگریشمان لەسەر بوونی خودا خستۆتەڕوو. بەڵام وادابنێ کە هەموو ئەو بەڵگە زانستی و فەلسەفییانەی خستمانەڕوو بڕوایان بە دینیت و بێباوەڕانی تر نەهێنا، ئایا ئەوە واتای ئەوە دەگەیەنێت کە داننان بەبوونی خودا شتێکی نالۆژیکییەو دژی عەقڵە؟!

گەورە فەیلەسووفی ئەمریکی ئالڤین پلانتینگا وەڵامێکی ناخهەژێنی ئەو پرسیارە دەداتەوە، دەڵێت: ((بەدرێژایی مێژووی فەلسەفەی کۆن و نوێ و هاوچەرخ هەمیشە کەسانێك هەبوون کە باوەڕیان وابووە هیچ بەڵگەیەکی باوەڕپێکەر لەسەر بوونی کەسانی تر تەنانەت لەسەر بوونی خۆشیان نییە، یاخود لەسەر بوونی جیهانی دەرەوە، یان ڕووداوەکانی ڕابردوو، بەڵام سەرەڕای ئەوەش هیچ کەسێك ئەو قسەیەی نەکردووە کە باوەڕبوون بەبوونی ئەوجۆرە شتانە نالۆژیکییە)).

هەروەها پلانتینگا دەربارەی دینیت دەڵێت:((لەڕاستیدا دینیت و کەسانی تر کە پەیڕەوی لە ڕێبازی سروشتی دەکەن هیچ شتێك دەربارەی فەلسەفەی ئایین نازانن کە سێیەکی فەلسەفەی داگیرکردووە، بەڵام سەرەڕای ئەوەش لەباسکردنی فەلسەفەی ئایین و هێرشکردنە سەری سڵ ناکەنەوە، بەڵام پێویستە ئەوە باش بزانن کە چارەگی کۆتایی سەدەی بیستەم چەند شەپۆلێکی پاشەکشێی فەلسەفەی ماددیگەرایی لەبەرژەوەندی فەلسەفەی ئایینی بەخۆیەوە دیوە)).

پلانتینگا قسەکانی دەربارەی دینیت بەوە کۆتایی پێدێنێت کە دەڵێت: ((دینیت لەوە بێئاگایە کە مرۆڤی ئەمریکی هێشتا باوەڕی بە خوداو ئایین هەیە، هەتا

ئەگەر سرووتەکانیشی جێبەجێ نەکات، ئەوەتا ئامارەکان سەلماندوویانە کە زیاتر ٨٥/ی ئەمریکییەکان باوەڕبوون بەپەرەسەندنی داروینی ڕەتدەکەنەوە، ڕەخنە لەوە دەگرنکە لە قوتابخانەکاندا بە منداڵەکانیان بگوترێتەوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە هزری داروینی مەترسی بۆ سەر زانست زیاتر بووە نەوەك بۆ سەر ئایین!)).

## سـام هـاریس[1] :

### کۆتـایی باوەڕ The End of Faith

کتێبی (کۆتایی باوەڕ)، کە سام هاریس لە ساڵی ٢٠٠٥زدا بڵاویکردەوە، بوو بە کارتی وەرگیرانی لە دەستەی بێباوەڕاندا. چونکە لە کتێبەکەدا، هاریس ڕەواج بە فیکرەیەك دەدات کە بێباوەڕان زۆرکات دووبارەی دەکەنەوە، سەرەڕای کەڵەکەبوونی بەڵگەکان لەسەر درۆینەیی ئەو بانگەشەیە؛ ئەویش ئەوەیە کە ئایین هۆکاری کوژانەکانی مرۆڤایەتییە. ئەوەی شتێکی نوێ بوو لەو بوارەدا و هاریس خستییەڕوو، ئەوەبوو کە دەیگوت نابێت لەژێر سایەی ژیارستانییەتی زانستی پێشکەوتوودا ڕێگا بەگەڕانەوەی ئەو کەسانە بدەین کە لەڕێی کرداری ئایینی تیرۆریستی هەولآ بۆ چوونە بەهەشت دەدەن و، کەسانێکی زۆر لەخەڵکی بێتاوان دەکوژن. تا ئێرە ئێمەش لەگەڵ هاریسدا هاوڕاین.

بەڵام هاریس، بە ناوی توانای ئوممەت لەسەر بەرگەگرتن، خراپترین شێوازی توندڕەوی بەکاردەهێنێت، دەستەکات بە تۆمەتبارکردنی دیندارە میانڕەوەکان و دەڵێت ئەوان ئەو خاکە گونجاوەن کە توندڕەوەکانی تێدا پەیدادەبن، لەبەر ئەوە

---

(١) Sam Haris: لە مانگی ئەپرێلی ١٩٦٧ز لە ویلایەتە یەکگرتووەکان لەدایك بووە. یەکێکە لە پزیشکانی مێشك و دەمار و، بیرمەند و ڕاگەیاندکار و فەیلەسوفە و، ژمارەیەك دانراوی هەیە، کە گرنگترینیان و لە هەموویان زیاتر پەیوەست بە بێباوەڕی ئەو دوو کتێبە بوون کە باسمان کردن.

داوا لە حکومەتەکان دەکات کە ڕێگا بە ئازادی بیروباوەڕ نەدەن! بەو پێیەی کە بیرۆکە کردار بەرهەمدێنێت، هەروەك چۆن داوا لە کۆمەڵگە ژیارستانییەکان دەکات کە واز لە ڕێزگرتنی ئایینەکان بێنن! بەڵگە تەورییەکەی هاریس بۆ هەموو ئەو بانگەشانە؛ بریتییە لەوەی کە پێشکەوتنی زانستی هەمیشە مرۆڤ بەرەو ئایینلەیەکی گەشتر دەبات، ئایین تاکە بوارە کە بیرۆکەی پەککەوتە و کەموکورتی ڕابردووی هەڵگرتووە. لەسەر کۆمەڵگە ژیارستانییەکان پێویستە کە ئەو بیرۆکانە بخەنە ژێر هەمان ئەو مەنهەجە زانستییەی کە فیزیاو کیمیاو پزیشکی و زانستەکانی تری پێ شەن و کەو دەکات. پاشان هاریس بە گاڵتەجارییەوە دەڵێت؛ ئەگەر ئێمە خۆمان گرتووە لەبەرامبەر کەسێکدا بانگەشەی ئەوە دەکات کە بوونەوەری ئاسمانی - بۆنموونە - لەڕێی وشککەرەوەی قژ (مجففە) پەیامی بۆ دەنێرێت، ئەوا هەرگیز ڕێگا بەو کەسە نادەین کە قوتابخانە دابمەزرێنێت بۆ ئەوەی بیرۆکەکانی بە منداڵەکانمان بڵێتەوە، هەروەك چۆن ڕێگاشی پێنادەین کە لەڕێی ڕاگەیاندنەکانەوە قسە بۆ خەڵك بکات. پاشان هاریس زیاتر پەرە بەو نموونەیە دەدات و دەڵێت: چۆن ڕێگا بەوە دەدەین کەسانێك سیاسەتەکانی وڵاتەکەمان و جیهان دابڕێژن کە باوەڕیان وایە ئەو کتێبەی لەتەنیشت جێگای خەوتنیانە خودایەکی غەیبی پڕیکردۆتەوە، ئەو بیرۆکانەی تێیدا هەیە شیاوی قسە لەسەرکردن نییە[1].

لە ڕاستیدا بانگەشەکەی هاریس بۆ ئەوەی ئایین بەهەمان مەنهەجی زانستە سروشتی و پراکتیکییەکان بخوێندرێت، دەرخەرینەزانییەکی ئابڕوبەرانەی هاریسە بەرامبەریە مەنهەجی زانستەکان، چونکە گومان لەوەدا نییە کە هەر زانستێك لە زانستە مرۆییەکان (دەتوانین بە شێوەیەکی کاتی جارێ ئایین لەوە بەدەربکەین) مەنهەجێکی تایبەت بەخۆی هەیە بۆ شێوازی لێکۆڵینەوە و گوتنەوە و فێرکردنی، بۆنموونە ئێمە مێژوو و جوگرافیا و زانستی دەروونناسی و فەلسەفە و ئابووری بەهەمان مەنهەجی زانستە سروشتییە پراکتیکییەکان ناخوێنین، بەڕاستی ئەوە تێکەوتنێکی وایە کە قوتابی قۆناغی ناوەندیش ناکەوێتە هەڵەیەکی لەم چەشنە.

---

(١) لێرەدا مەبەستی لە جۆرج بۆشی کوڕە، کە پەیڕەوی لە ڕەوتی ڕاستی توندڕەو دەکرد.

**پەیامێك بۆگەلی مەسیحی Letter to a Christian Nation**

پێچەوانەی کتێبەکەی پێشووی، کە پڕ بوو لە قسەی دووبارە و دوور و درێژ، ئەم کتێبەی لە سەد لاپەڕە کەمترە. پێچەوانەی ناونیشانەکەی، هاریس لەو کتێبەدا هێرش دەکاتە سەر پەیڕەوانی هەموو ئایینەکان، بەتایبەتی مسوڵمانان.

کتێبەکە بانگەشە بۆ ئەوە دەکات کە ئایین تەنیا بەرپرس نییە لە بڵاوبوونەوەی توندڕەوی و توندوتیژی، بەڵکو بەرپرسیشە بەرامبەر بە نەفامی و گەمژەیی، بۆ ئەوەش نموونە بە هەڵوێستی ڕەتکەرەوەی باڵی ڕاستی توندڕەوی ئەمریکی دێنێتەوە بەرامبەر بەو پرسە زانستیانەی بۆی خرانەڕوو؛ وەك پەرەسەندنی بایۆلۆجی و خانە قەدییەکان و لەباربردن. پاشان هاریس بە گاڵتەجاڕییەوە دەڵێت؛ ئەگەر ٥٠٪ی سکپڕییەکان بەشێوەیەکی خۆکردانە بەبێ دەستتێوەردانی هیچ کەس لەسەرەتاکانی سکپڕیدا لەبار بچن، بەبێ ئەوەی کە خانمەکە ئاگاداری هیچ بێت، ئەوا خودا دەبێتە گەورەترین ئەنجامدەری تاوانی لەباربردن، کە ئایین لێی بەرپرسیارە! هاریس لەگاڵتەجاڕییەکەی بەردەوام دەبێت و دەڵێت: بەهیچ جۆرێك ئایین هیچ سوودێکی بۆ یەکلاکردنەوەی ئەو پرسە زانستییانە نییە و هەرگیز ناتوانێت بۆ نوێژخوێنانی شیبکاتەوە.

هاریس بە دڵنیاییەوە دەڵێت، ئەگەر دیانەکان بە عەقڵێکی کراوە و هۆشیار کتێبی پیرۆز بخوێننەوە، ئەوا زۆرینەی لێ ڕەتدەکەنەوە، بەڵام لە بەختڕەشی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە، کە ژمارەیەکی کەمی ئەمریکییەکان عەقڵێکی کراوەیان بۆ وەرگرتنی حەقیقەت هەیە.

پاشان دەڵێت: ئەوەی جێگای سەرسوڕمانە ئەوەیە کە مافی خۆکاندیدکردن بدەین بە کەسانێك کە باوەڕیان وایە نوح جوتێك نێرو مێی دایناسۆڕی سواری کەشتییەکەی کردووە، باپیرە گەورەمان لە کۆکراوەی پاشماوە و گیانێکی خودایی بەدیهێندراوە!

هاریس شتگەلێکی وەها دەداتە پاڵ مسوڵمانان ئەوە دەسەلمێنن کە هیچ زانیارییەکی دەربارەی ئەو ئایینە نییە، دەپرسێت: بۆچی مسوڵمانان دەڵێن قورئان قسەی خودایە و رەتیدەکەنەوە هەمان شت بەرامبەر بە کتێبی جولەکە و دیانەکان بڵێن؟ بۆچی لۆمەیان دەکەن کە بیروباوەڕییان لەوان جیاوازە؟ هەروەها دەڵێت: چ درۆیەکی گەورەیە؛ ئەو بانگەشەیەی دەڵێت ئیسلام بانگەواز بۆ ئاشتی دەکات و بەرپرس نییە بەرامبەر بە رەفتاری تیرۆریستە ئوسوڵییە توندڕەوەکان.

لە سێ برگەی پێشوودا بانگەشەکانی هاریسمان دژ بە ئایینەکان خستەڕوو، کە لە وتارەکەی (بۆ گەلی مەسیحی) باسی کردوون، ئێستاش ئەو قسە بێبنەمایانەی بە کورتی پووچ دەکەینەوە و دەڵێین:

-ئایینەکان بەرپرس نین بەرامبەر بە تەسکی ئاسۆی زانستی رەوتی ڕاستی ئەمریکی، کە توندڕەوە لە دەمارگیری بۆ تەفسیرە کلتورییەکانی پەیمانی کۆن.

- لێپرسینەوە لەگەڵ خودا لەسەر حاڵەتەکانی لەباربردنی خۆکرد جۆرێکە لە( لێکچوون - المماثلة) کە لە میانی قسەکردنمان دەربارەی مەزهەبە فەلسەفییەکەی دۆوکنز، هەڵەییمان سەلماندو بە کارێکی خراپمان لە قەڵەمدا.

- هاریس لەکاتی قسەکردنی دەربارەی داینەسۆڕەکان و کەشتییەکەی نوح کەوتۆتە هەڵەیەکی زانستییەوە، چونکە داینەسۆڕەکان ٦٣ ملیۆن ساڵ پێش نوح لەناوچوون!

- هاریس هیچ شتێك دەربارەی رەمزییەتی بەدیهاتنی مرۆڤ لە دوانەیی رۆح و ماددە نازانێت و تێناگات، کە بریتییە لە جەوهەری بوونی مرۆڤ، لەجیاتی ئەوەی هەوڵبدات تێبگات دەست دەکات بە گاڵتەپێکردن.

- لە کۆتاییشدا دەڵێین هاریس لەوە بێئاگایە کە مسوڵمانان رێزێکی تایبەتی بۆ کتێبی پیرۆز، جولەکە و دیانەکان دادەنێن و دەڵێن لە بنەڕەتدا کتێبی ئاسمانین، هەروەك چۆن لەوەش بێئاگایە کە هەرسێ ئایینەکە لە زۆربەی بیروباوەڕەکانیاندا

یەکانگیرن، تەنانەت مسوڵمانان باوەڕیان بە ئایینی جولەکە و مەسیحی هەیە. هەروەها هاریس لە زۆرێك لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بێئاگایە کە بانگەواز بۆ ئاشتی دەکات و شەڕ و تیرۆر بە خراپ دەزانێت. لەڕاستیدا تۆمەتەکانی هاریس بۆ ئیسلام تەنیا نەزانی و بێئاگایی ئەو دەردەخەن و ئەوەش دووپات دەکەنەوە کە هاریس قسە لەسەر شتێك دەکات کە نایزانێت.

بینیتان بیرۆکەکانی هاریس چەند لاوازن، ئەوانەی کە راگەیاندنەکانیان پڕ کردووە!

## کریستۆفەر هیتچنز[1]

**خودا گەورە نییە: چۆن ئایین هەموو شتێکی ژەهراوی کردووە.**
**God Is Not Great: How Religion poisons Every Thing**

ئەم کتێبە: کە لە ساڵی (٢٠٠٧ز)دا دەرچووە، بەناوبانگترین کتێبی هیتچنزە، لە هەموویان زیاتر پەیوەندی بە پرسی بێباوەڕییەوە هەیە. ناونیشانی کتێبەکە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە هێرش دەکاتە سەر دوو لایەنی تەواوکەری یەکتر: خودا و ئایین.

ئەم کتێبە ئایین وەك بەرهەمێکی پەرەسەندووی فرۆیدی ئالۆزیکی نا موحتەمەل وەسف دەکات، رەواج بە دەمارگیری و هۆزایەتی و ڕەگەزپەرستی و جەنگ و دەستدرێژیکردنە سەر منداڵەکان دەدات، هەروەك چۆن بانگەشە بۆ نەزانیش دەکات، تەنانەت دەڵێت ئایین بریتییە لە لوتکەی وەهم و خەڵەفان.

---

(١) Christopher Hitchens: نووسەرو رۆژنامەنووسی بەریتانی-ئەمریکی، لە ساڵی ١٩٤٩ز لەدایك بووە و، لە دیسەمبەری ٢٠١١ز بەهۆی شێرپەنجەی بۆری خۆراك مردووە.

هەروەها هیتچنز لەکتێبەکەیدا گاڵتە بە پرسیارە تەوەرەییەکان دەکات، کە ئایین و فەلسەفە گرنگییان پێدەدەن. بۆ نموونە وەڵامی ئەو پرسیارە دەداتەوە کە دەڵێت: بۆچی ئێمە لێرەین؟ دەڵێت: چونکە لەسەر دوو قاچ وەستاوین!

هەروەها ناونیشانی سەرەکی کتێبەکە(خودا گەورە نییە) دژی درووشمی مسوڵمانانە (الله اکبر- خودا گەورەترە)، ئامانجی یەکەمیشی لە پشت ئەوە هێرشکردنە سەر سەددام حوسەین و ئەو تیرۆریستانەی دەدرێنە پاڵ ئیسلام.

هەروەها هیتچنز بانگەشە بۆ ئەوە دەکات کە مسوڵمانان باوەڕیان بە بیردۆزی پیلانگێڕی (نظرية المؤامرة) هەیە، ژیارستانییەتی ڕۆژئاوایی بەوە تۆمەتبار دەکەن کە بە ئەنقەست ئایدز و پەککەوتەیی منداڵەکان و بێتوانایی سێکسی و نەخۆشیەکانی تر لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا بڵاودەکەنەوە! هەروەها جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە کتێبەکە لە ڕەخنەگرتنیدا ئەوەندەی مامەڵە لەگەڵ ڕەفتارە خراپەکانی ئەو کەسانەدا دەکات کە بۆ ئایین خۆنگەرمن، ئەوەندە مامەڵە لەگەڵ خودی ئایین ناکات.

هەروەك چۆن هیتچنز بەڕاشکاوی دەڵێت قورئانی پیرۆز تەنیا کۆکراوەی ئەفسانەکانی جولەکە و مەسیحییەت و ئەفسانەکانی پێشووی خۆیەتی، ئەو دەرەنجامەمان بۆ دەردەکات کە قورئان پڕیەتی لە وەرگرتن و هەڵدزی!

**خوێنەری بەڕێز:**

**گەواهیدەرێك لە خۆیان گەواهیدا**

مایکل شێرمەر[1] بیرمەند و نووسەری ئەمریکی بواری فەلسەفە و مێژوو و زانست، یەکێك بوو لە مەسیحییە توندڕەوەکان، پاشان وازی لە مەسیحییەت هێنا، هەندێ جار خۆی بە بێباوەڕ وەسفکرد، هەندێ جاریش بە گومانکار و هەندێ جاریش بە نەزانکار (لا أدري).

شێرمەر کۆمەڵەی گومانکارەکان skepticsی دامەزراند و بوو بە سەرنووسەری گۆڤاری (گومانکار Skeptic).

شێرمەر وتارێکی نووسیوە لە (گۆڤارەکانی زانستەکانی ئەمریکی Scientific American) لە ژمارەی سێپتێمبەری ٢٠٠٧ز، ناوونیشانی وتارەکە(بێباوەڕی لۆژیکی Rational Atheism) نامەیەکی کراوە بۆ بەڕێزان دۆوکنز و دێنیت و هاریس و هیتچنز) بوو، ئەو وتارە وەك کاردانەوەیەك بوو بەرامبەر بەدەمارگیری کۆمەڵەی ئەو چوارە بەرامبەر بە ئایین، تیایدا مەترسی ئەو دەمارگیرییەی دەرخستووە، چۆن لەسەر ئەو چوارە و(هاوشێوەکانیان) پێویستە کە شێوازە دوژمنکارییەکەیان بۆ باسکردنی پرسی خوایەتی و ئایین بگۆڕن، ئەها خوێنەری بەڕێز، ئەوە پوختەی پەیامەکەیە:

**بێبـاوەڕی لۆژیکی :**

((لەگەڵ ماڵئاواییکردن لە سەدەی بیستەم و پێنانە ناو سەدەی بیست و یەکەمدا، ڕووبەڕووی سێ دیاردە بووینەوە کە هەڕەشەن بۆ سەر زانست و ئازادی.

---

(١) Michel Shermer: کۆمەڵەی گومانکارەکانی دامەزراند، کە ٥٥٠٠٠ ئەندامی هەیە و، گۆڤاری گومانکار گرنگی بە پووچەڵکردنەوەی ئەو دیاردانە دەدات کە بە درۆ دەدرێنە پاڵ زانست. لە ساڵی ١٩٥٤ز لەدایکبووە.

**یەکەمیان:** هێرشکردنە سەر خوێندنی پەرەسەندنی بایۆلۆجی و لێکۆڵینەوە لە خانە قەدیبیەکان.

**دووەم:** پەرەسەندنی پەیوەندی نێوان کڵێسا و حکومەت و، پشتگیریکردنی حکومەت لە هەندێك لە جۆرەکانی باوەڕی و پشتگوێخستنی جۆرەکانی تر.

**سێیەم:** بڵاوبوونەوەی تیرۆری ئایینی توندڕەو لە جیهاندا بە گشتی و لە ویلایەتە یەکگرتووەکان بەتایبەتی.

ئەو ململانێیە بووە هۆی دەرکەوتنی بێباوەڕی کۆمەڵە چوار کەسییەکە، کە بۆ ماوەیەکی زۆر لە سەرووی لیستی پرفرۆشترین کتێبەکاندا ریزبەندی ڕۆژنامەی نیویۆرك تایمز بوون. هەموو نووسینەکانیش بە دەورەی قسەکەی ریچارد دۆوکنزدا دەخولێنەوە، کە دەڵێت: پێویستە هەموومان ئەوە بزانین کە بێباوەڕ بوون جوان و جوامێرانەیە، تۆ دەتوانی بێباوەڕێکی هاوسەنگ، بەڕەوشت، بەختەوەر و داهێنەر بیت.

دەکرێ لەوەدا لەگەڵیاندا هاوڕا بین، کە هەرکات چەمکە ئایینییەکان لەگەڵ حەقیقەتە زانستییەکان و بنەماکانی ئازادی سیاسیدا تێکگیران، ئەوا پێویستە هەڵوێستێکی توند و یەکلاکەرەوەمان هەبێت، بەڵام پێویستە ئاگاداری ئەوە بین کە زیادەڕەوی نەکەین، بۆ ئەوەی نەکەوینە چاڵی توندڕەوی و دووژمنایەتی، بۆ ئەوەش پێویستە رەچاوی ئەو چەند خاڵە بکەین:

**یەکەمیان:** لەڕاستیدا ئەو بزووتنەوانەی بە بەرهەڵستی نەبێت بە هیچی تر رازی نین(لێرەدا ئاماژە بۆ بێباوەڕی نوێ دەکات)، خۆی شکست بەخۆی دەهێنێت، تەنانەت رەواجیش بەو کۆمەڵەیە دەدات کە هێرشی دەکاتە سەر، بۆیە پێویستە لەپێناو بەدیهێنانی شتێکدا کە دەمانەوێ تێبکۆشین، نەوەك لەپێناو لادانی شتێك کە نەمانەوێت.

**دووەم:** ڕۆڵی ئێمە - هەروەك داروین دەڵێت- بریتی نییە لە خستنەڕووی بەڵگە لە دژی باوەڕبوون بە خودا، بەڵکو بریتییە لە ڕووناککردنەوەی عەقڵەکان، ئەویش لەرێی خستنەڕوو و شیکردنەوەی بەرهەمەکانی زانست.

**سێیەم:** لەسەرمان پێویستە - هەروەك كارل ساگان دەڵێت - ڕەوشتی باشمان هەبێت و گاڵتە بە دیندارەكان نەكەین، چونكە ئەگەرچی ئەو گاڵتەجارییە چێژبەخشە، بەڵام كەسانی تر لە خۆمان و بیرۆكەكانمان دەڕەوێنێتەوە.

**چوارەم:** (ڕەفتاری هاوشێوە)، ڕێسای زێڕینە بۆ ڕەفتاركردن لەگەڵ دیندارەكاندا. ئەگەر ئێمە ئەوە ڕەتدەكەینەوە كە دیندارەكان حوكمی پێشوەختمان بەسەردا بدەن، ئەوا پێویستە ئێمەش هەمان شت نەكەین.

**پێنجەم:** هەروەك مارتن لۆسەركینگ[1] ئاماژەی بۆ كردووە، پێویستە خۆمان بە خیانەت لەقەڵەمدانی ئەو كەسانە بە دوور بگرین كە بۆچوونی جیاوازیان هەیە، پێویستە ڕێز لە بیروباوەڕیان بگرین، چونكە ئازادی ئێمە كە باوەڕمان نەهێناوە، بەندە بە ڕێزگرتن لە ئازادی كەسانی تر كە باوەڕ بێنن.

لەكۆتاییدا ئەوە دڵنیا دەكەمەوە كە بێباوەڕی عەقڵانی، كە ڕێز لە حەقیقەتە زانستییەكان و دەسەڵاتی عەقڵ دەگرێت، لەسەری پێویستە ئەوە بزانێت كە(بنەمای ئازادی) لە سەرووی زانست و ئایینەوەیە).

پوختەی پەیامەكە كۆتایی هات.

بەڵكو دەستەی بێباوەڕی نوێ پەند لەهاوبیرێكی خۆیان وەربگرن، كە دەركی بە مەترسی توندڕەوی و دەمارگیرییەكەیان كردووە؛ تا وایان لێهاتووە كە لە دیندارە توندڕەوە ئوسوڵییەكان توندڕەوترن كە قسەیان لەسەر دەكەن و هێرشیان دەكەنەسەر.

---

(١) Martin Luther King: (١٩٢٩-١٩٦٨ز)، پێشەوایەكی ئەمریكییە، كە بە ڕەچەڵەك ئەفریقییە، قەشە و چالاكوانێكی سیاسی مرۆیی بوو، یەكێك بوو لەو كەسانەی داوای كۆتایی هێنان بە ڕەگەزپەرستی و دژایەتی ڕەشپێستەكانی دەكرد، بچوكترین كەس بوو كە خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی بەدەستهێنا، لە ساڵی ١٩٦٨ز تیرۆركرا.

## تەوەرەی دوازدەهەم

## بێباوەڕی لە جیهانی ئیسلامیدا

((نیوەی تاوانی بڵاوبوونەوەی کوفر و بێباوەڕی لە جیهاندا لە ئەستۆی دیندارەکانە.. چونکە بە کارە خراپەکانیان و قسە نەشیاوەکانیان وایان لە خەڵك کردووە رقیان لە خودا ببێتەوە))

شێخ محمد الغزالی[1]

دیاردەی بێباوەڕی بە یەکێك لە مەترسیدارترین دیاردەکان دادەنرێت لەبەردەم گەشەسەندنی ژیانی رۆحیدا، لە هەموو ژیارستانییەتەکاندا شوێنێك بۆخۆی دەکاتەوە، کاتێك خەڵك دەگەنە قۆناغی خۆشگوزەرانی، ئەمەش لەبەر ئەوەی هەندێك لە دەروونەکان هەست و توانا ئایینییەکانیان لەلا تەواو دەبێت و ئارەزووی چێژ و حەزی هەستی زیاتر دەکەن.

شێوازی بێباوەڕی بەپێی رۆحی ئەو ژیارستانیەتەی تیایدا هەڵدەقوڵێت جیاوازی هەیە، نیچە باسی لە بێباوەڕی رۆژئاوایی کردووە و گوتوویەتی:

---

(١) شێخ محمد الغزالی: یەکێك بوو لە بەناوبانگترین بانگەوازکاران بۆ نوێکردنەوەی هزری ئیسلامی لە سەدەی بیستەم و، دژایەتی توندڕەوی و زیادەڕەوی لە ئاییندا دەکرد، لە پارێزگای (البحیرە) لە میسر لەدایك بووە(١٩١٧-١٩٩٦ز).

((خودا مرد))، بێباوەڕی یۆنانی گوتوویەتی: ((ئەو خوداوەندانەی لە شوێنە پیرۆزەکاندا بوون مردن))، ئەوا بێباوەڕی عەرەبی دەڵێت: ((بیرۆکەی پێغەمبەرایەتی و پێغەمبەران مرد)).

ئەمەش لەبەر ئەوەی، کە بێباوەڕیی لە جیهانی ئیسلامیدا لەو ڕۆحە دەردەچێت کە وەك پەیوەندییەکی دابڕاو و تەواو دوور[1] سەیری پەیوەندی نێوان مرۆڤ و خودا دەکات، هەر بۆیە پێغەمبەر (کە واسیتەی نێوان خودا و بەندەکانە) مەترسیدارترین پێگەی هەیە لە ژیانی ئایینی ئیسلامیدا.

لە واقیعیشدا لە دەرەنجامی کۆتاییدا هیچ جیاوازییەك لەنێوان دوو هەڵوێستەکە نییە، چونکە هەردووکیان لە کۆتاییدا دەبنە هۆی نکوڵیکردن لە ئایین؛ چونکە بە نکوڵیکردن لە بوونی خودا لەلایەن یۆنانییەکانی کۆن و ڕۆژئاوای هاوچەرخ ئایین ون دەبێت، هەروەها بە نکوڵیکردن لە پێغەمبەرایەتی و پێغەمبەرانیش لەلای کەسی عەرەبیدا ئایینەکان ون دەبن، بەمەش هەموو ڕێگاکان بەرەو خوودی خودایەتی دەگیرێن، لە کۆتاییشدا لە هەردوو دۆخدا باوەڕبوون بە زیندوبوونەوە و پاداشت و سزا و پەیڕەویکردن لە چاکە و دوورکەوتنەوە لە خراپە بوونیان نامێنێت، ئەمەش بریتییە لە جەوهەری ئەوەی کە بێباوەڕان بە هەموو جۆر و بەشەکانیانەوە پێی تۆمەتبار دەکرێن[2].

---

(١) بیروباوەڕی ڕاستی ئیسلامی خاڵییە لە چەمکەکانی (وحدە الوجود و الحلول والاتحاد) کە لە ئاینەکانی تردا بوونیان هەیە.

(٢) ئەم پێشەکییەی پێشوو بە دەستکاری و کورتکردنەوەوە لە کتێبی (تأریخ الإلحاد فی الإسلام)ی فەیلەسووف دکتۆر عبدالرحمن بدوی وەرگیراوە.

## بێباوەڕی لە قورئانی پیرۆزدا :

زۆرێك لە موفەسیرانی قورئانی پیرۆز وایدەبینن کە قورئانی پیرۆز باسی پرسی بوونی خودای نەکردووە، بەوپێیەی شتێکی فیترییە و لە دەروونی مرۆڤدا چەسپێنراوە[1]، لەبەرئەوە ڕاستەوخۆ چۆتە سەر باسکردنی جۆرە جیاوازەکانی لادان لەو فیترەتە، بەڵام ئێمە لەگەڵ ئەو رایەدا نین، چونکە زۆرێك لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز باس لە سەلماندنی حەقیقەتی بوونی خودا دەکەن، هەروەك چۆن بانگەوازی مرۆڤ دەکات کە سەرنجی بەڵگەی ئاسۆکان و دەروونەکان بدات تا بۆی دەربکەوێت کە قورئان حەقە و خودا حەقە.

هەروەها قورئانی پیرۆز بەوپێیەی کە ئاڕاستەی هەموو مرۆڤایەتی کراوە و کۆتایی پەیامە ئاسمانییەکانە، ئەوا شتێکی سروشتییە کە گفتوگۆ لەگەڵ هەموو مرۆڤایەتیدا بکات، سەرەتا لە باوەڕدارە ڕاستگۆکانەوە تا دەگاتە ئەوانەی بانگەشەی خوایەتی دەکەن، بە تێپەڕبوون بە هەموو جۆرەکانی گۆڕان و لادان کە تووشی فیترەتی مرۆڤایەتی دەبن، ئێستاش فەرموو لەگەڵ گرنگترین جۆرەکانی لادان بەو جۆرەی کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتوون:

١- پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿١﴾ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ﴿٢﴾ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ﴿٣﴾ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ﴿٤﴾ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ﴿٥﴾ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِىَ دِينِ ﴿٦﴾﴾ الكافرون: ١ - ٦

---

(١) هەروەها هەندێك وایدەبینن کە خەڵکی مەککە دانیان بە بوونی خودا دەنا، بۆیە هیچ بیانووێك بوونی نەبووە بۆ سەلماندنی بوونی خودا، بەڵام ئەم بۆچوونە ڕەتدەکرێتەوە، چونکە قورئانی پیرۆز تەنیا بۆ خەڵکی مەککە دانەبەزیوە، بەڵکو بۆ خەڵکی هەموو جیهان و هەموو کات و هەموو شوێنێك دابەزیوە.

قورئانی پیرۆز دەستەواژەی (الكافرون) بۆ ئەو کەسانە بەکاردەهێنێت کە فیترەتیان تووشی جۆرە جیاوازەکانی گۆڕان و لادان دەبن، (کفر) بە واتای شاردنەوە و داپۆشین دێت، واتا فیترەتیان بە پیسی داپۆشراوە، ئەو کەسانە لەوانەیە (بانگەشەکارانی خوایەتی) یان (نکۆڵیکاران) یان (هاوەڵدانەران) یان (گومڕا) بن.

٢- قورئانی پیرۆز لەڕێی چیرۆکە قورئانییەکانەوە باسی (بانگەشەکارانی خوایەتی)مان بۆ دەکات؛ وەك نەمروودی ئیبراهیم و فیرعەونی موسا، ئەم بانگەشەیەش خراپترین جۆری لادانە لە فیترەتی تەندرووست، لە سەردەمی ئێستاشماندا قوتابخانەکانی هزری ماددیگەرایی کە نکۆڵیکارانی خودا کردوویانن بە خودا و دەیانپەرستن؛ وەك داروینیزم و مارکسییەت، هەروەها بانگەشەکە ئەو کەسانەش دەگرێتەوە کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکەن.

قورئانی پیرۆز دەربارەی ئەو کەسانەی بانگەشەی پێغەمبەرایەتی و خوایەتی دەکەن فەرموویەتی:

﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا أَوْ قَالَ أُوحِيَ إِلَيَّ وَلَمْ يُوحَ إِلَيْهِ شَيْءٌ وَمَن قَالَ سَأُنزِلُ مِثْلَ مَا أَنزَلَ اللَّهُ ... ﴾ الأنعام: ٩٣.

واتە: (کێ لەوە ستەمکارترە کە درۆ بۆ خوا هەڵبەستێت و یاخود بڵێت: منیش وەحی و نیگام بۆ هاتووە، لە ڕاستیشدا هیچی بۆ نەهاتبێت، هەروەها ئەو کەسەش کە وتویەتی: منیش وەك قورئان کتێبێك دادەبەزێنم وەك خوا دایبەزاندوە...).

٣- قورئانی پیرۆز ناوی دەهرییەکان(الدهريه) لەو کەسانە دەنێت کە نکۆڵی لە بوونی خودا دەکەن، ئەم دەستەیەش لەناو عەرەبدا درووشمەکەیان بریتییە لە: هیچ شتێك نییە جگە لە منداڵدانێك کە فڕێمان دەداتە دەرەوە و گۆڕێك کە قووتمان دەدات و جگە لە ڕۆژگار و زەمانە(دەهر) هیچی تر لەناومان نابات، خوای پەروەردگار دەربارەیان فەرموویەتی:

﴿ وَقَالُوا۟ مَا هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهْرُ ... ﴾ الجاثية: ٢٤.

واتە: (خوانەناسان دەیانگوت: ژیان تەنها ئەم ژیانی دنیایەیە، دەمرین و دەژین بە نۆرە، هەر ڕۆژگارو زەمانە کاریگەرن تیاماندا و دەمان مرێنن و هیچی ترا!).

هەروەها لە (موسوعة المفاهیم)ی (المجلس الأعلی للشؤون الإسلامیة)دا هاتووە کە (الدهریە) مەزهەبی هەموو ئەو کەسانەیە کە باوەڕیان بە قەدیمی کات و مادده و گەردوون هەیە، نکۆڵی لە خوایەتی و خەلق و چاودێری و زیندووبوونەوە و حەشر و حیساب دەکەن. هەروەك چۆن وایدەبینن کە ژیان و مردن سروشتی شتەکان و جوولەی ئەستێرەکانە، وایدەبینن کە ژیان هەر ٣٦ ساڵە و خولێکی هەیە و دوای ئەوە هەموو شتەکان وەکو خۆیان لێدێتەوە. (الدهریة) پێش ئیسلام لە وڵاتی هیندستان بوونی هەبووە، لەوانە مەزهەبی (السمنیة) کە نکۆڵی لە خوایەتی و وەحی و پێغەمبەرایەتی و پەیام دەکەن، باوەڕیان وایە جگە لە هەستەکان هیچ ڕێگایەك بۆ مەعریفە نییە[1].

هەروەها (الدهریة) بنچینەی هەموو مەزهەبەکانی بێباوەڕی و ماددیگەراییە، کە مرۆڤایەتی ناسیویەتی، هەروەك چۆن دەکرێ فەلسەفەی ماددیگەرایی نوێ بە نوێترین وێنەی دەهرییەی کۆن هەژمار بکرێت، ئەو دەهرییانەش کە نکۆڵی

---

(١) ئەم برگەیەمان لە وتارێکی د.محمد عمارە کورت کردۆتەوە، کە لە ڕۆژنامەی الأهرام ٢٠٠٩/٤/٦ز دا بڵاوکراوەتەوە. ئەو دیبەیتە بەناوبانگە لەنێوان(السمنیە) و جەهمی کوڕی سەفوان(لەساڵی ٧٤٥ك کۆچی دوایی کردووە) کە پێشەوای (الجبریە)یە ئەنجام دراوە، جەهم لەوەدا لەگەڵ (السمنیە)دا هاوڕابوو کە هیچ شتێك بوونی نییە جگە لەوەی هەستی پێدەکەین. ئا لەو کاتەدا گورزیان لێ وەشاند و پێیان وت کە خوداکەت هەستپێکراو نییە، کەواتە بوونی نییە. دوای ئەوە جەهم پەیامێکی نارد بۆ واسڵی کوڕی عەتا(کە لە ٧٤٨ك کۆچی دوایی کردووە) کە پێشەوای موعتەزیلەکان(ڕەوتی عەقڵانی) بوو کە تیایدا داوای چارەسەر کردنی کێشەکەی لێ کردبوو، واسڵ وتی لێیان بپرسە ئاخۆ ئەو عەقڵەی باوەڕیان پێی هەیە شتێکی هەستپێکراو و بەرجەستەیە؟ بەو قسەیە وای لێ کردن کە بگەنە ئەو دەرئەنجامەی کە زانراو تەنیا ئەو شتانە ناگرێتەوە کە هەستەکان هەستی پێ دەکەن، بەڵکو ئەوانەش دەگرێتەوە کە بە بەڵگە دەسەلمێنرێن. ئا لەو کاتەدا چوونە خزمەت واسڵ و بوون بە مسوڵمان.

لە بوونی خودا دەکەن لە هەموو کافرەکان لە(بێباوەڕان)ی هاوچەرخ نزیکترن.

٤- قورئانی پیرۆز باسی ئەو بانگەشەیەی بۆ کردووین کە دوای چوارده سەده کەسانێك دێن دەیکەن دەربارەی درووستبوونی گەردوون و مرۆڤ لە نەبوونەوە. پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿ أَمْ خُلِقُوا۟ مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ أَمْ هُمُ ٱلْخَٰلِقُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾ الطور: ٣٥

واتە: (ئایا ئەوانە بەبێ هیچ شتێك، هیچ هۆیەك، هاتوونەتەکایەوە؟! یان هەر خۆیان دروستکارن؟!).

سبحان الله، ﴿مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ﴾ واتا بەبێ مادده و بەبێ هۆکاری یەکەم، ﴿هُمُ ٱلْخَٰلِقُونَ﴾ واتا مەخلوق (گەردوون و مرۆڤ) خۆیان خۆیان بەدیهێناوە، هەردووکیشیان لەلای بێباوەڕانی هاوچەرخدا هەیە.

٥- قورئانی پیرۆز باسی کۆمەڵێکمان بۆ دەکات کە دان بە بوونی خودای بەدیهێنەردا دەنێن، بەڵام وایدەبینن دوای ئەوەی یاساکانی تێدا داناوە وازی لە گەردوون هێناوە، پاشان ئەم (القیومیە)انە نکۆڵی لەوە دەکەن کە خودا بە پاراستن و رێککاری و رزق و...چاودێری گەردوون بکات، پەروەردگار دەربارەیان فەرموویەتی[1]:

﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ... ﴾ العنکبوت: ٦١.

واتە: (سوێند بە خوا ئەگەر پرسیار لە بێباوەڕان بکەیت: کێ ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە، ڕۆژو مانگی رام کردووە، بەدڵنیایی و بێ دوودڵی دەڵێن: (الله) دروستی کردوون).

٦- قورئانی پیرۆز پێمان دەفەرموێت لەناو کافرەکاندا کەسی وا هەیە کە باوەڕیان بە بەڕێوەبەرێتی و چاودێری خودا بۆ بوونەوەر(القیومیە) هەیە، فەرموویەتی:

---

(١) ئەم واتایە لە چەند شوێنێکی تریشدا هاتووە: لقمان ٢٥، الزمر ٣٨، الزخرف ٩.

﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّن نَّزَّلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ مِنۢ بَعْدِ مَوْتِهَا لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ... ﴾ العنكبوت: ٦٣.

واتە: (خۆ ئەگەر لێیان بپرسیت: کێ ئاو لە ئاسمانەوە دەبارێنێت، جا زەوی پێ دەبوژێنێتەوە، دوای ئەوەی خامۆش و مردوو بوو، ئەوە بەدڵنیاییەوە دەڵێن: (الله).

بەڵام نکوڵی لەوە دەکەن، کە خودا لەڕێی پێغەمبەرانەوە پەیوەندی بە مرۆڤەوە کردبێت، واتا نکوڵی لە ئایینەکان دەکەن. ئەم کۆمەڵەیەش بە واتای هاوچەرخ لە بەرامبەر پەروەردگارییەکان(الربوبیون) دان.

ئەو کۆمەڵەیە ئامانجیان - بە پلەی یەکەم - لە نکوڵیکردن لە ئایین بریتییە لە نکوڵیکردن لە زیندوبوونەوە و پاداشت و سزا، چونکە ئا لەو کاتەدا هیچ بیانوویەك نامێنێت بۆ پەرستشەکان و پەیڕەویکردن لە فەرمانەکانی خودا و قەدەغەکراوەکانی، بەمەش هەموو واتا و بەهایەك لە خوایەتی دادەماڵن.

﴿ وَقَالُوٓاْ أَءِذَا كُنَّا عِظَـٰمًا وَرُفَـٰتًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ خَلْقًا جَدِيدًا ﴿٤٩﴾ ﴾ الإسراء: ٤٩

واتە: (ئەوانە بە سەرسامییەوە دەڵێن: باشە ئەگەر بووینە ئێسکی رزیوو پرووکاو، ئەوە سەر لەنوێ زیندوو دەکرێینەوە؟!).

﴿ زَعَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَن لَّن يُبْعَثُواْ ۚ قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّى لَتُبْعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْ ۚ وَذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٧﴾ ﴾ التغابن: ٧.

واتە: (ئەوانەی بێ باوەڕ بوون بە بۆچوونی خۆیان وتیان: هەرگیز زیندوو ناکرێنەوە، پێیان بڵێ: وا نییە، سوێند بە پەروەردگارم، بەڕاستی هەر زیندوو دەکرێنەوە، پاشان ئاگادار دەکرێن لە هەموو ئەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامتان دەدا، ئەوەش بۆ خوا زۆر ئاسان و سادەیە.).

هەروەك چۆن پەروەردگار ئەوە ڕوون دەكاتەوە كە ڕەتكردنەوەی ئەو كۆمەڵەیە بۆ ئایین بۆ هۆكاری دەروونی دەگەڕێتەوە (بەتایبەتی خۆبەزلزانی)، لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا زۆری لەو شێوەیە دەبینین، دەفەرموێت:

﴿ وَقَالُوا لَوْلَا نُزِّلَ هَٰذَا الْقُرْآنُ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ الْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ ﴿٣١﴾ ﴾ الزخرف: ٣١.

واتە: (هەروەها بیانوویان گرت وتیان: ئەوە بۆ ئەم قورئانە دانەبەزێنرا بۆ سەر پیاوێكی گەورە لە پیاوە گەورەكانی دوو شارەكە؟!).

٧- دوای بانگەشەكاران و نكۆڵیكاران (هاوبەشدانەران) دێن، هاوبەشدانەر (المشرك) ئەو كەسەیە كە باوەڕی بە بوونی خودا هەیە، بەڵام لەگەڵ خودا شتێكی تر دەپەرستێت، بە بیانووی ئەوەی كە لە خودای نزیك دەكاتەوە:

﴿ ... وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَىٰ .. ﴾ الزمر: ٣.

واتە: (ئەوانەش جگە لەو زاتە كەسانی تر و شتی تر دەكەنە پشتیوانی خۆیان دەڵێن: ئێمە ئەم بت و شتانە ناپەرستین تەنها لەبەر ئەوەی لە خوا نزیكمان بخەنەوە).

ئەم كۆمەڵەیەی كافرەكان لە هەموو كۆمەڵەكان زیاتر دژایەتی ئیسلامیان كرد لە سەرەتاكانی هاتنی ئیسلام لە شاری مەككەدا.

جۆرێكی تر لە جۆرەكانی هاوەڵدانان كە قورئانی پیرۆز باسی دەكات، ئەوەیە كە مرۆڤ (ئارەزوو)ی خۆی بكاتە هاوەڵ بۆ خودا، واتا خۆی تەسلیمی حەز و ئارەزووەكانی خۆی بكات:

﴿ أَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَٰهَهُ هَوَاهُ ... ﴾ الفرقان: ٤٣.

واتە: (ئایا نابینیت ئەو كەسەی كە ئارەزووی خۆی كردۆتە خوای خۆی).

٨- (الضالون) کۆتا جۆری کافرەکانن، کە بریتین لەو کەسانەی دوای ئەوەی حەقیان ناسی لێیان لادا، تایبەتترین بەشی ئەو کۆمەڵەیەش مەسیحییەکانن، قورئانی پیرۆز بۆی ڕوون کردووینەتەوە کە زۆربەیان لە واتای ڕاستەقینەی یەکخواپەرستی لایانداوە کە پێغەمبەرەکەیان بۆی بانگەوازی کردبوون، مەسیح و مەریەمی دایکیان کردۆتە هاوبەشی[1]:

﴿ وَإِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ءَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِى وَأُمِّىَ إِلَٰهَيْنِ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ قَالَ سُبْحَٰنَكَ مَا يَكُونُ لِىٓ أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِى بِحَقٍّ ۚ إِن كُنتُ قُلْتُهُۥ فَقَدْ عَلِمْتَهُۥ ۚ تَعْلَمُ مَا فِى نَفْسِى وَلَآ أَعْلَمُ مَا فِى نَفْسِكَ ۚ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿١١٦﴾ ﴾ المائدة: ١١٦.

واتە: (کاتێکیش خوا (هەر لە قیامەتدا) فەرمووی: ئەی عیسای کوڕی مەریەم، ئایا ئەوە تۆ بەخەڵکیت وتوە: منیش و دایکیشم بە دوو خوا دابنێن لە خوار خوای پەروەردگارەوە؟ عیسا لە وەڵامدا وتی: پاکی و بێگەردی و بێ هاوەڵی شایستەی تۆیە، بۆم نییە من شتێك بڵێم بۆ خۆم کە مافی من نەبێت؟! (چۆن حەق بەخۆم دەدەم شتی وا بێت بە زارمدا؟!) خۆ ئەگەر شتی وام وتبێت ئەوە بەڕاستی تۆ دەیزانیت و لێت شاراوە نییە. چونکە تۆ دەزانیت بە هەرچی لە دڵ و دەروونمدا هەیە، بەڵام من نازانم بەوەی کە لە دەریای علم و زانستی بێ پایانی تۆدا هەیە، چونکە بەڕاستی هەر تۆ زانا و شارەزای نهێنی و پەنهانی).

هەروەها لە ئوممەتی موحەممەدیش (صلى الله عليه وسلم) ئەو گومڕایانە بوونیان هەیە، کە حەقیان ناسیوە و دواتر لە ڕێگای خودا و بەڵگەکانی لایانداوە.

٩- دەستەواژەی (یلحد) لە قورئانی پیرۆزدا، کاتێکیش خوا (هەر لە قیامەتدا) فەرمووی: ئەی عیسای کوڕی مەریەم، ئایا ئەوە تۆ بەخەڵکیت وتوە: منیش و دایکیشم بە دوو خوا دابنێن لە خوار خوای پەروەردگارەوە؟ عیسا لە وەڵامدا

---

(١) هێشتا هەندێك لە مەسیحییەکان باوەڕیان بە یەك خودایی هەیە و، باوەڕیان بەوە هەیە کە کتێبی پیرۆز دان بەوەدا دەنێت کە مەسیح پێغەمبەری خودایە و، نکۆڵی لە هەموو ئەو بیر و باوەڕە گومڕایانە دەکەن کە هاتوونەتە ناو مەسیحییەتەوە، ئەوانە ناوی (شهود یهوا) یان لێنراوە.

وتی: پاکی و بێگەردی و بێ هاوڵی شایستەی تۆیە، بۆم نیە من شتێك بڵێم بۆ خۆم کە مافی من نەبێت؟! (چۆن حەق بەخۆم دەدەم شتی وا بێت بە زارمدا؟!) خۆ ئەگەر شتی وام وتبێت ئەوە بەڕاستی تۆ دەیزانیت و لێت شاراوە نییە، چونکە تۆ دەزانیت بە هەرچی لە دڵ و دەروونمدا هەیە، بەڵام من نازانم بەوەی کە لە دەریای علم و زانستی بێ پایانی تۆدا هەیە، چونکە بەڕاستی هەر تۆ زانا و شارەزای نهێنی و پەنهانیدا، بە سێ واتا هاتووە:

یەکەم: ﴿وَلِلَّهِ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ فَادْعُوهُ بِهَا ۖ وَذَرُوا الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَائِهِ ۚ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٨٠﴾﴾ الأعراف: ١٨٠

واتە: (هەر بۆ خوایە هەموو ناوە جوان و پیرۆزەکان، جا (ئەی ئیمانداران) بەو ناوانە دوعا و نزا بکەن و هاناو هاوار بۆ ئەو زاتە بەرن، واز بهێنن لەوانەی کە لە ناوە پیرۆزەکانی خوادا لادان دەکەن و (سیفەت و ناوەکانی خوا بەکاردەهێنن بۆ غەیری خوا)، لە ئایندەدا پاداشتی ئەو کارو کردەوانەیان وەردەگرن کە ئەنجامیان دەدا).

ئەم (ئیلحادە) بریتییە لە لادان لە ناوەکانی خودا، واتا لارکردنەوە و لادانی بۆ باتڵ، بۆنموونە سیفەتەکانی (العدمیە، یان الجبر، یان الحلول والاتحاد،...) دەدەنە پاڵ خودا...پاك و بێگەردی بۆ خودا[1].

دووەم: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي آيَاتِنَا لَا يَخْفَوْنَ عَلَيْنَا ...﴾ فصلت: ٤٠.

واتە: (بەڕاستی ئەوانەی کە سەرسەخت و بێ بروان و دژایەتی ئایەت و فەرمانەکانی ئێمە دەکەن و لێی لادەدەن. خۆیان ناشارنەوە لە ئێمە).

---

(١) لەو بارەیەوە ئیبن تەیمییە دەڵێت:

وأصل ضلال الخلق من كل ملة ... هو الخوض في فعل الإله بعلة

هەروەها دەڵێت: کارەکانی خودا بە (بۆچی) پرسیاریان لێ ناکرێت (واتا بیر لە هۆکارەکەی ناکەینەوە بەڵکو بیر لە حیکمەتەکەی دەکەینەوە) و سیفاتەکانی خودا بە (چۆن) پرسیاریان دەربارەوە ناکرێت.

ئەم ئیلحادە بریتییە لە لادانی واتاکانی قورئانی پیرۆز بۆ مەبەستێکی جیاواز لە مەبەستی خودای پەروەردگار.

سێیەم: ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُ بَشَرٌ لِّسَانُ الَّذِي يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِيٌّ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِيٌّ مُّبِينٌ ﴿١٠٣﴾﴾ النحل: ١٠٣

واتە: (سوێند بە خوا ئێمە بەڕاستی دەزانین بێ باوەران دەڵێن: ئەم قورئانە تەنها کەسێك فێری دەکات، (بەمەر جێك) زمانی ئەو کەسەی ئەوان دەڵێن قورئان فێری محمد دەکات، عەجەمیەو عەرەبی نییەو رەوان نییە، لەگەڵ ئەوەدا ئەم قورئانە بە زمانی عەرەبی و پاراو و ڕوون و ئاشکرا دارێژراوە).

لێرەشدا ئیلحاد بەواتای دانەپاڵ هاتووە، واتا کافرەکان وەحی و فەرموودەکانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دەدەنە پاڵ کاهینەکان، لەکاتێکدا ئەوان زمانیان ئەعجەمی غەیرە عەرەبی بوو کەچی زمانی ئەو عەرەبی بوو.

لەوەی رابورد، بۆمان دەردەکەوێت کە قورئانی پیرۆز هەموو جۆرەکانی گومڕابوون و لادانی لە فیترەتی ساغ و سەلیمی مرۆڤی باس کردووە، هەر لەبەر ئەوەیشە کە زانایانی عەقیدە باسی (توحيد الربوبية و توحيد الألوهية و توحيد الأسماء والصفات)[1]مان بۆ دەکەن. بۆیە دەڵێین.. سبحان الإله الواحد الأحد، وأشهد أن لا إله إلا الله و أن محمدا رسول الله.

---

(١) توحيد الربوبية: بریتییە لە خوا بەیەك دانان لە کردارەکانی وەك خەلق و رزق و زیندوکردنەوە و مراندن و هی تر.

توحيد الألوهية: خوا بە یەك دانانە لە پەرستشەکاندا وەك نوێژ و ڕۆژوو و حەج و زەکات و هی تر.

توحيد الأسماء والصفات: واتا خودا بەو سیفاتانە وەسف بکەین یان بەو ناوانە ناوی بنێین کە خۆی یان پێغەمبەرەکەی وەسفیان کردووە یان ناویان ناوە.

## جەنگەکانی هەڵگەڕانەوە (حروب الردة)

گۆڕەپانی عەرەبی ئیسلامی لەدوای وەفاتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دوو ڕووداوی بەخۆیەوە بینی کە لێکۆڵەران ناویان ناون جەنگەکانی هەڵگەڕانەوە (حروب الردە). ڕووداوی یەکەم بریتییە لە ڕووداوی (بانگەشەکردنی پێغەمبەرایەتی)، لەو کەسانەش (مسیلمة الكذاب و طليحه بن خويلد الأسدي و الأسود العنسي و سکاح و هی تر)، ئامانجی ئەم بانگەشەیەش بریتی بوو لە بەدەستهێنانی پێگە و دەسەڵات لە ژینگەیەکدا کە هۆزەکانی لەپێناو دەسەڵاتدا لە ململانێدا بوون. ڕووداوی دووەمیش بریتی بوو لە (نەدانی زەکات)، کاتێك کە هەندێك لە هۆزەکان ڕەتیان کردەوە زەکاتەکەیان بدەنە دەسەڵاتی ناوەندی لە مەدینە، خەلیفە ئەبوبەکریش ئەمەی وەك هەڕەشە لەسەر یەکێتی ئوممەت و کیانەکەی هەژمار کرد، ئەگەر ڕووداوی یەکەم بریتی بێت لە هەڵگەڕانەوە و بێباوەڕییەکی ڕاستەقینە، بەڵام نابێت ئەم دید و بۆچوونە بەسەر ڕووداوی دووەمیشدا بگشتێندرێت.

ئەم فیتنانە بەجۆرێك ڕوویان لە دوورگەی عەرەبی کرد، کە جگە لە خەڵکی مەککە و مەدینە و هۆزەکانی دەوروبەریان کەس لەسەر ئیسلامی ڕاستەقینە نەمایەوە، لەبەر ئەوە خەلیفە ئەبوبەکر دە لەشکری پێکهێنا بۆ شەڕکردن لەگەڵ سەرانی فیتنە و سەرکەوتووبوو لەو کارەیدا تا خەلافەتی ئیسلامی جێگیر بوو.

## زندیقـەکان

دوای کۆتایی هاتنی جەنگی هەڵگەڕاوەکان، مسوڵمانان سەرقاڵی بڵاوکردنەوە و چەسپاندنی دەوڵەت و پارێزگاریکردن لە سنوورەکانی بوون، هەروەك چۆن سەرقاڵ بوون بە ململانێکانی فیتنە گەورەکە و، دامەزراندنی دەوڵەتی ئەمەوی پاشان عەبباسی و شەڕکردن لەگەڵ بەرهەڵستکاران، ئەم ژینگەیەش لەبار بوو بۆ دەرکەوتنی زۆر مەزهەب و کۆمەڵە، وەك خەواریجەکان و جەبریەکان و قەدەریەکان و مورجیئەکان و موعتەزیلەکان...

## پەیدابوونی بێباوەڕی لە ژیارستانییەتی عەرەبی ئیسلامیدا :

لەماوەی سەدەکانی سێیەم و چوارەمی کۆچی، ئیسلام گەیشتە تەواوترین وێنەی خۆی کە ژیارستانیەتی عەرەبی توانیبێتی پێی بگات، وەك شوێنکەوتنی یاساکانی گەشەسەندنی ژیارستانیش، لە زۆر لایەنەوە وردە وردە بەرەو نزمبوونەوە ڕۆیشت، بەتایبەتی لە لایەنی ئایینی، ئەمەش هۆکاری سەرەکی بوو لە پشت پەیدابوونی بێباوەڕی، چەند هۆکارێکی تری یاریدەدەریش هەبوون.

نەزعەی گەلایەتی (النزعة الشعوبية) گرنگترین هۆکاری یاریدەدەر بوو بۆ دەرکەوتنی بێباوەڕی، مەبەستمان لە هەوڵدانی شکستخواردووەکانە، کە ژیارستانیەتی ئیسلامی لەسەر ژیارستانیەتی ئەوان دامەزرابوو بۆ تۆڵە سەندنەوە (بەتایبەتی فارسەکان)، ئەمەش بووە هۆی بووژانەوەی دەمارگیرییان بۆ ئایینە کۆنەکەیان، لە ژینگەیەکدا کە تیایدا ئایین هۆکاری یەکلاکەرەوە بوو بۆ دامەزرانی نەتەوە و دەوڵەتەکان. لەدوای ئەوە نەزعەی ماددیگەرایی (النزعه

المادية)[١] دێت، کە عەقڵ زۆر بە بەرز دادەنێت و بە فەرمانڕەوای یەکەم و کۆتایی هەژمار دەکات کە ناکرێ فەرمانەکانی ڕەتبکرێنەوە، ئەم ئەزعەیە لە جیهانی ئیسلامیدا لە دەرەنجامی بڵاوبوونەوەی کلتور و ڕۆشنبیری یۆنانی بوو لەو ماوەیەدا، جا چ بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ بێت، یان لەڕێی دەسەڵاتی کیسرا ئەنۆشیروانەوە.

هەروەها ئەزعەی هەستی (النزعة الحسية) بە سێیەم هۆکاری بارێدەدەر دادەنرێت بۆ دەرکەوتنی بێباوەڕی، چونکە ئەو جۆرە کەسانە دڵیان بە بەند و بارەکانی ئایین توند دەبوو، کە دەبووە هۆی دیاریکردنی سنوورێك بۆ ئارەزووە بێ سنوورەکانیان، ئەم جۆرە رەفتارانەش بە ڕوونی لە دەستەیەکدا بەدی دەکەن کە لە سەر زاری بەدڕەوشتی گەورەیان (أبو نواس)ەوە بە (عصابه المجان)ناسراون.

## زندیقەکان کێن؟

(زندیق) وشەیەکی فارسییە، لە (زندکرای)داتاشراوە، بە واتای ئەو کەسەی کە شوێنی کتێبی (زند)ی زەردەشت[٢] دەکەوێت. پاشان ئەو دەستەواژەیە بۆ ئەو کەسانە بەکاردەهێنرا - کە دوای ئیسلامیش - پەیڕەویان لە مەزدەك[٣] و مانی[٤] کە بانگەوازی بۆ پەرستنی دوو خودای ئەزەلی جیهان دەکرد (ڕووناکی

---

(١) هەمیشە بە بزووتنەوەی ڕۆشنگەری (الحركة التنويرية) ئاماژە بۆ ئەزعەی ماددیگەرایی دەکرێت. ئەو دەستەواژەیەش لە زۆر ماوەی جیاوازدا بەکارهاتووە، کە بەناوبانگترینیان لە سەردەمی ڕونیە. گومانیش لەوەدا نییە کە ئەم دەستەواژەیە بەلای چەمکە ماددییەکاندا دەچێت، لەبەرئەوە بەکارمان نەهێنا. چونکە ئێمە بە ڕۆشنگەری نازانین!

(٢) زەردەشت: دامەزرێنەری ئاینی زەردەشتی (مەجوسیەت)ە، پێش نزیکەی ٣٠٠٠ساڵ. کە ئێستا بە وڵاتی ئێران و دەوروبەری ناسراوە و، بە کۆنترین ئاینەکانی یەك خوا پەرستی دادەنرێت.

(٣) مەدەك: بانگخوازێکی فارسی بوو، ئاینی (مەزدەکی) دامەزراند، کە باوەڕی بە دوو خودای (خێر و شەڕ) هەیە و، مەزدەکیەت باوەڕی بە هاوبەشێتی سامان و ئافرەت هەیە. کیسرا ئەنۆشیروان ئەو ئاینەی ڕەت کردەوە و ئاینی زەردەشتی گێڕایەوە.

(٤) مانی: دامەزرێنەری ئاینی مانەوییە لە سەدەی سێیەمی زاینیدا، کە ئاینێکی تێکەڵە لە ئاینی زەردەشتی و

و تاریکی)، سەربڕینی ئاژەڵ و خواردنی گۆشت حەرام دەکات، هەموو ئەو حەرامانە حەڵاڵ دەکات کە چێژ بە مرۆڤ دەبەخشن؛ وەك مەی خواردنەوە و سێکس لەگەڵ کەسانی نزیك، هەروەك چۆن ڕەواج بە بیروباوەڕەکانی هیند دەدات کە باوەڕی بە کۆپیبوونی ڕۆحەکان و (الحلول و الاتحاد و وحدة الوجود) هەیە.

پاشان واتای وشەی زندیق فراوان بوو تا وای لێهات بە هەموو ئەو کەسانە دەوترا کە بیدعەچی و بێباوەڕ بوون، هەروەها هەموو ئەو نووسەر و شاعیرانەش کە بەدڕەوشت بوون، لە کۆتاییشدا بە هەموو ئەو کەسانە دەوترا کە بە ڕوونی پێچەوانەی مەزهەبەکەیان دەجوڵانەوە، بەتایبەت مەزهەبی ئەهلی سوننە.

زندیقە شعوبییەکان لە فەرمانڕەوایی ئیسلامی بێزار بوون، دەستیان کرد بە هەوڵدان بۆ دەستگرتن بەسەر حوکمدا، ئەمەش لە ڕێی نزیککردنەوەی فارسەکان (وەك بەرامیکەکان) لە خەلیفەی عەبباسی، یاخود ئەنجامدانی شۆڕش و کۆدەتا لە دژی.

هەروەك چۆن دەستیان کرد بە هەوڵدان بۆ تێکدانی بیروباوەڕی مسوڵمانان لە ڕێی ڕازیکردنی گەنجان بە پەیڕەویکردن لە بانگەوازی مەزدەك، کە بانگەشە بۆ نقوومبوون لە ئارەزووەکاندا دەکات. هەندێك لە کتێبە مێژوویەکان ئەوەیان تۆمار کردووە کە هەندێك لەو زانا گەورانەی بەشداری گەورەیان لە بنیاتنانی ژیارستانیەتی عەرەبیدا هەبووە، وەك جابری کوڕی حەییان و محەمەدی کوڕی زەکەریای ڕازی هەر ڕێزیان بۆ بیروباوەڕە فارسییەکان هەبووە.

سەبارەت بە دیدی ئایینیش، زندیقەکان شەپۆلێك بوون لە ژیانی بەدڕەوشتی و بێ فەرمانیکردنی خودا درێژبوونەوە تا گەیشتنە بێباوەڕی بە تەواوی واتا، کە بریتییە لە نکۆڵیکردن لە خوایەتی[1]، لەوانە ئیبن ڕاوندی، کە بە بەناوبانگترین کەسایەتی بێباوەڕە زندیقەکان دادەنرێت.

---

بردایی و مەسیحییەت و، وەك مەزدەکیەت باوەڕی بە خودای خێر و شەڕ هەیە. بەڵام بانگەواز بۆ داوێنپاکی دەکات.

(١) لە بەیتەشیعرە بێباوەڕییەکانی بشار بن برد:

إبليس أفضل من أبيكم آدم فتبينوا يا معشر الفجار

النـــار عنصره وآدم طينـه والطين لايسمو سمو النار

پەیڕەوی لە هەمان ئەو لۆژیکە دەکات کە بووە هۆی دەرکردنی ئیبلیس لە ڕەحمەتی خودا.

## ئیبـن راونـدی :

**دکتۆر یوسف زیدان[1] ئیبن راوندیمان پێ دەناسێنێت و دەڵێت:**

((کەسایەتی ئیبن راوەندی بێباوەڕ (أبو الحسین أحمد بن یحیی بن إسحاق، کە لە دەوروبەری ساڵانی ٣٠١ کۆچی مردووە)[2] یەکێکە لە سەیر و سەمەرەترین کەسایەتی لە مێژووی عەرەبی ئیسلامی، تەنانەت لە مێژووی هەموو مرۆڤایەتیشدا، چونکە ئەو پیاوە ژیانێکی زۆر سەیر ژیاوە، کە تیایدا بەشێوەیەکی سەیر ئایین و مەزهەبەکانی گۆڕیوە.

ئیبن راوندی لە سەرەتادا جولەکە بوو، دواتر مسوڵمانبوونی خۆی راگەیاند، بۆ ئەوەی بێتە ناو بازنەی پارێزگاری ئیسلامی و ژێر سایەی دەوڵەتی عەبباسی کە - ئەوکات - لە لوتکەی سەربڵندیدا بوو.

هەروەها بینی موعتەزیلەکان لە هەموو کۆمەڵەکانی تر زیاتر لە خەلیفەی عەباسییەوە نزیکن، بۆیە بووە موعتەزیلە! چەند کتێبێکیشی لەسەر ئەو مەزهەبە دانا. بەڵام موعتەزیلەکان لەناو خۆیاندا پێگەیەکی شیاویان پێ نەدا و ئەوەی هەوڵی بۆ دەدا پێیان نەدا، هەر بۆیە لێیان هەڵگەڕایەوە و هێرشیکردنە سەر و کتێبێکی لەسەر نووسین بە ناوونیشانی: (فضیحة المعتزلة) بە پێچەوانەی کتێبەکەی جاحیز(فضیلة المعتزلة!).

---

(١) دکتۆر یوسف زیدان، مامۆستای فەلسەفە و بەڕێوەبەری پێشووی ناوەندی دەستنووسەکان لە کتێبخانەی ئەسکەندەرییە. ناساندنی ئیبن راوەندیش لە وتارێکیەوە وەرمان گرتووە بە ناوونیشانی((أحقاد ابن الراوندی))، لە گۆڤار ئۆکتۆبەر بڵاوکراوەتەوە لە ١٩٩٤/٣/٢٧.

(٢) دەوترێت کە لە تەمەنی چل ساڵیدا مردووە، هەندێکیش دەڵێن لە تەمەنی هەشتا ساڵیدا.

موعتەزیلەکانیش هەستان بە هێرشکردنە سەر ئیبن ڕاوندی و هاندانی خەلیفە لە دژی، بۆیە ڕایکرد و پەنای بردە بەر دوژمنانی دەوڵەت لە شیعەی باتینی، کتێبێکی لە دژی مەزهەبی سوننە نووسی، لە بەرامبەر بڕی ۳۰۰دینار! ناوونیشانی کتێبەکەش (فی الإمامە) بوو. دوای ماوەیەك، ئیبن ڕاوندی هەستی کرد کە شیعەکان لە دەستی سوننەکان ناپارێزن، پێی وابوو کە دەکرێ جارێکی تر لە سوننەکان نزیك ببێتەوە، هەر بۆیە کتێبێکی نووسی بە ناوونیشانی: (فی التوحید).

پاشان ئیبن ڕاوندی بۆی دەرکەوت کە ئامانجەکەی لەلای سوننە بەدینەهێناوە، بۆیە کەوتە دژایەتییان، لە شیعەش هەڵگەڕایەوە..بۆیە لە بازنەی ئیسلام چووە دەرەوە بە سوننە و شیعەوە و پەنای بردە بەر جولەکە.جارێکی تریش ئیبن ڕاوندی پێنووس و هزرەکەی بۆ بەدیهێنانی ئامانجە دنیاییەکانی خستەوە کار، ئەمجارەیان کتێبی (البصیرە)ی بۆ جوولەکە نووسی و تیایدا پشتگیری جوولەکەی کردووە و بەرپەرچی ئیسلامی داوەتەوە، ئەمەشیان لە بەرامبەر ٤٠٠درهەم کە لە جولەکەکانی وەرگرت..دوای ماوەیەك ویستی ڕەددی کتێبەکەی بداتەوە و ئەو شتانە ڕەتبکاتەوە کە دژی ئیسلامە، بەڵام جولەکە ١٠٠ درهەمی تریان پێدا، ئەویش لەو کارەی پەشیمان بووەوە!.

لەکۆتاییدا، ئیبن ڕاوندی دژی هەموو ئایینەکان و هەموو پێغەمبەران وەستایەوە و کتێبی (الفِرِنْد)ی دانا بە واتای (بێ هاوتا)، بۆ ئەوەی تیایدا تانە و تەشەر لە پێغەمبەران و پێغەمبەرایەتی بدات، پاشان کتێبە بەناوبانگەکەی دانا (الزمردە) و تیایدا تانە و تەشەر لە هەموو پەیامە ئاسمانیەکان دەدات و گومان دەخاتە سەر خودی خودایەتیش..

بەم شێوەیە ئیبن ڕاوندی ژیانی خۆی لەنێو مەزهەبەکان و ئایینەکان بەسەر بردووە، ڕۆژگارە دراماتیکییەکەی خۆی بە هەوڵدان بەدوای سەربەرزی دنیایی بەسەر بردووە، ئەو سەربەرزییەی ئیبن ڕاوندی بە هیچ جۆرێك پێی نەگەیشت، بەڵکو نازناوی: گەورە بێباوەڕی مێژووی ئیسلامی لێنرا.

هەرچی بیری بێباوەڕی ئیبن راوەندییە، ئەوا وێنەی نموونەیەکە لەوەی زندیقە بێباوەڕەکان لەسەری بوون؛ ئەو بیرانەش بریتین لە:

١- قورئانی پیرۆز دەقێکی جوان نییە، دەکرێ لەو باشتر بنووسرێت. گرنگینەدانی عەرەبیش بۆ کێبڕکێکردنی قورئان دەگێڕێتەوە بۆ سەرقاڵبوونیان بە جەنگ و فیتنە و ئاشووبەوە.

٢- هیچ بیانوویەک بۆ ناردنی پێغەمبەران نییە؛ چونکە ئەوەی پەیامبەر دەیهێنێت یان ئەوەتا مەعقولە یان نا مەعقولە، ئەگەر مەعقول بێت ئەوا عەقڵ دەتوانێت بەبێ پێویستی بە پێغەمبەر پێی بگات، ئەگەر نامەعقولیش بێت ئەوا مەقبول نییە.

٣- خودا پێویستی بە ناردنی پێغەمبەران نییە، چونکە خودا توانای ئەوەی هەیە مرۆڤ تا ئەو ئەندازەیە بەرز بکاتەوە کە بە عەقڵی خۆی بگاتە چاکە و چاکی.

٤- وەهم و ئەفسانە دەوری وێناکردنی خودایان داوە لەلایەن مرۆڤەوە؛ چونکە بیری مرۆڤ بێ توانایە لە دەرککردن بە بەدیهێنەر و زانینی وەسفەکانی.

٥- حەج و سرووتەکانی وەرگیراون لە بنچینەی ئایینی هیندۆسی و عاداتی بتپەرستین کە لە سەردەمی جاهیلیەتدا پیادە دەکران، تەوافکردن بە دەوری کەعبە هیچ جیاوازییەکی نییە لەگەڵ تەوافکردن بە دەوری خانوویەکی تردا.

٦- جەنگەکانی پێغەمبەر بریتی بوون لە چالاکی داگیرکاری.

٧- ئەو فریشتانەی خودا لە شەڕی بەدردا دایبەزاندن زۆر بێ توانا و بێهێز بوون، چونکە توانیان تەنیا حەفتا پیاو بکوژن، هەروەها بۆچی خودا فریشتەکانی لە جەنگی ئوحوددا نەنارده خوارەوە کاتێک کە پێغەمبەر لەناو کوژراوەکاندا ون بووبوو!!

٨- ئیبن راوەندی گاڵتە بە وەسفەکانی بەهەشت دەکات و دەڵێت: شیرێکی تێدایە کە کەسی برسی نەبێت نایخوات، زەنجەبیلی تێدایە کە لە خواردنەوە خۆشەکان نییە، ئیستەبرەقی تێدایە کە قوماشێکی زبرە.

لێرەدا پێویستە بیرۆکەکانی ئیبن راوندی (و بیرۆکەکانی زندیقەکان) پووچەڵ بکەینەوە، بۆئەوەی وەك ئەو کەسانە نەبین کە تەنیا تەپ و تۆزمان درووست کردبێت و چاوی خەڵك ئازار بدات:

١- گومان لەوەدا نییە کە ئیعجازی قورئانی پیرۆز چەند لایەنەیە، خودای پەروەردگار تەحەددای کافرەکانی کردووە کە بتوانن «١٠» سورەتی وەك ئەو بێنن، یاخود یەك سورەت، تەنانەت ئایەتێکیش! ئەو تەحەددییەش تا ئێستا هەر بەردەوامە و سەرەڕای ئەوەی کە ئیبن راوندی بانگەشەی بۆ دەکات کە قورئان لەو بارەیەوە تاك نییە، بەڵام خۆیشی نەهاتۆتە نێو گۆڕەپانی تەحەددییەوە!

٢- عەقڵ بەبێ یاریدەی پەیامە ئاسمانییەکان ناتوانێت بگات بە ڕاستییەکانی بوون، زۆرێك لە فەیلەسووفەکانیش بە بیروباوەڕەکانیشەوە دانیان بەوەدا ناوە.

٣- هەموو ئەو ئایینانەی کە مرۆڤ پەیڕەوییان لێدەکات سرووت و پەرستشی هاوشێوەیان تێدا هەیە، لەوانەش حەج، چونکە سەرچاوەی هەموو ئایینەکان بریتییە لە خودای بەدیهێنەر، ئیبن راوندیش باش دەزانێت کە عەرەبەکان پێش هاتنی محمدیش (صلی الله علیه وسلم) حەجیان ئەنجام دەدا کە لە ئیبراهیم (علیه السلام)ەوە بۆیان مابووەوە.

٤- ئەوەی لە جەنگەکانی پێغەمبەری کۆڵیبێتەوە دەزانێت کە یان بەرگریکردن بووە لە بەرامبەر هێرشێك، یان بۆ ئاسایشی ئایینی نوێ بووە. ئەو غەنیمەتەش کە لە شەڕەکاندا دەبرا یان گێڕانەوەی ماڵ و سامانی کۆچکەران (المهاجرین) بوو کە لێیان داگیر کرابوو، یان ڕۆیشتن بوو لەسەر یاسای شەڕ لەناو عەرەبدا.

٥- وانەی مەبەست لە هاتنەخوارەوەی فریشتەکان لە جەنگی بەدردا بریتی بوو لەوەی مرۆڤایەتی فێر بکرێت کە خودا پشتیوانی لەو کەسانە دەکات کە ڕاستگۆیانە پشتی پێ دەبەستن و پەنای بۆ دەبەن، هەرچی وانەی مەبەستە لە جەنگی ئوحود ئەوا بریتییە لە گرنگی دەستگرتن بە هۆکارەکانەوە، کە گرنگترینیان گوێڕایەڵیکردنی سەرکردەیە، کە ئیبن راوەندی لێی بێئاگا بووە،

هەروەها پەروەردگار نەیویستووە فریشتەکانی، هەموو هاوەڵدانەرانی بەدر بکوژن، چونکە دەیزانی زۆربەیان دێنە ناو ئیسلامەوە و ئەوەش ڕوویدا.

٦- ئەوەی گرنگی بە زانستەکانی قورئان بدات دەزانێت کە وەسفی بەهەشت لەسەر ئەو شێوەیە هاتووە کە ئەوسا لەلای عەرەب ناسراو و خۆشەویست بووە، بۆئەوەی بتوانن وێنای بکەن، بەڵام حەقیقەت زۆر لە سەرووی ئەوەوەیەو بە تەواوەتی جیاوازە. چونکە ئەوەی لە بەهەشتدا هەیە نە هیچ چاوێك بینیویەتی نە هیچ گوێیەك بیستوویەتی نە بە خەیاڵ و دڵی هیچ کەسێکیشدا هاتووە.

ئەمەیە ئیبن راوەندی بێباوەڕی دووڕووی چەند ڕەنگ، کە ڕۆژهەڵاتناسان تایبەتیان کردووە و چەندین توێژینەوەیان لەسەر کردووە، مەدحی شان و شەوکەت و ئازادی بیر و هەوڵە رۆشنگەرییەکانیان کردووە[1]!

## چەند وانەیەك لە بزوتنەوەی زندیقەکان:

بەر لەوەی کە لاپەڕەی زندیقەکان بپێچینەوە، پێویستە لە گرنگترین وانە و پەندەکانی تێبگەین:

لە سەرەتای بزوتنەوەی زندیقەکان،خەلیفەکانی ئەمەوی و عەبباسی بە زیندانیکردن و ئەشکەنجەدان و کوشتن ڕووبەڕووی پیاوانی ئەو بزوتنەوەیە بوونەوە، ئەمەش بووە هۆی زیاتر بڵاوبوونەوەی بیر و چەمکەکانیان، پاشان خەلیفەی عەباسییان ئاگادارکردەوە کە باشترین کەس کە بتوانێت روبەڕووی ئەو کۆمەڵەیە ببێتەوە موعتەزیلەکانن (خاوەنی قوتابخانەی عەقڵی لە ئیسلامدا)، کە خەلیفەکان ئەوانیشیان بەهۆی رازی نەبوونیان لە هزریان خستبوویاننە

---

(١) د.یوسف زیدان قسە لەسەر ژیانامە و هزری ئیبن راوەندی دەکات و دەڵێت: وا دیارە کە وەچەی ئیبن راوەندی لەدوای خۆی نەبڕاوەتەوە-سەرەڕای ئەوەی هیچ منداڵێکیشی لەدوای خۆی بەجێ نەماوە- چونکە لە هەموو سەردەمێکدا کەسانی وا دەبینین کە بۆ بەرژەوەندی دنیایی دەنووسن، تەنانەت لە ئێستادا رێڕەوە هەلپەرستییەکەیان پەرەپێداوە و، فێڵ و تەڵەکەی وایان داهێناوە کە ئەوان هەر بە بیریشیاندا نەهاتووە.

زیندانەوە، خەلیفە موعتەزیلەکانی ئازاد کرد، بە هەموو لایەکدا بڵاوبوونەوە و کەوتنە دیبەیت لەگەڵ زندیقەکان، سەرکەوتوو بوون لە گێڕانەوەی زۆریەیان لە گومڕابوونیان.

ئەو وانە و پەندەی کە پێویستە لەم لاپەڕەیەی مێژووی ئیسلامی وەری بگرین ئەوەیە کە شەڕی هزر بە ستەم و سەرکوتکردن ناکرێت، بەڵکو پێویستە شەڕی هزر بە هزر بکەین، هەر ئەوەیشە کە ئێمە ئامانجمانە کاتێک باسی نوێکردنەوەی هزری ئایینی دەکەین، تەنانەت ئامانجمان لە نووسینی ئەم کتێبەش دەربارەی (وڕێنەی ئیلحاد) هەر ئەوەیە، تا ببێتە ئامرازێکی یارىدەدەر بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی شەپۆلی بێباوەڕی لە ناوچەکەمان.

## بێباوەڕیی هاوچەرخ :

هەروەك چۆن نەزعەی عەقڵانی ماددیگەرایی لە هەردوو سەدەی سێیەم و چوارەمی کۆچیدا بووە هۆی دەرکەوتنی بزوتنەوەی زندیقەکان لە جیهانی ئیسلامیدا، ئەوا هەمان نەزعە لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمەوە بۆتە هۆی دەرکەوتنی ئاراستەی بێدینی لە میسردا.

ئەو شاندانەی کە محمد علي و کوڕەکانی دوای خۆی لە میسرەوە دەیانناردن بۆ ئەورووپا - بەتایبەتی فەڕەنسا - بۆ ئاشنابوون بەو ئاڕاستە عەقڵانیانەی کە ئەورووپایان تەنیبوو، ئەوەی کە بە فەلسەفەکانی ڕۆشنگەری (فلسفة التنویر) ناسرابوو، کە لە ئەدەبی جیهانیدا بە شێوەیەکی گشتی دەرکەوت. بە هەمان شێوە میسرییەکان ئاشنابوون بە پاشماوەکانی هزری ماددیگەرایی بیردۆزی داروین و چەمکەکانی فرۆید، کە لەو کاتەدا لە ڕۆژئاوا خواستێکی زۆری لەسەر بوو. هەروەها خەونی مارکسییەتی بێباوەڕی کە لە سەرکەوتنی شۆڕشی روسیا و

خەیاڵەکانی شارە پیرۆزەکە خۆی دەنواند مێشکی زۆرێك لە گەنجەکانی پڕ کردبوو. هەموو ئەو هۆکارانەش پێکەوە بوونە هۆی پەیدابوونی چەند جۆرە هزرێکی دژ بە ئایین.

گەورە بیرمەندی کوێتی د.محمد العوضي[1] ئەو جۆرە هزرە دژە ئایینانە بەسەر پێنج کۆمەڵەدا دابەش دەکات، کە بریتین لە بەگومانەکان (المتشككون) و ڕاڕاکان (المؤدلجون) وەك مارکسییەکان و بەڕۆژئاواییکارەکان (التغربيون) و سیکۆلارەکان(العلمانیون)، لە کۆتاییی هەموو ئەوانەشدا بێباوەڕان (الملحدون) دێن. د.محمد العوضي سەرنجمان بۆ ئەوە ڕادەکێشێت زۆرێك لەوانە دواتر ڕابوونێکی فیکرییان بەسەردا هاتووە و هۆشیان بۆ گێڕدراوەتەوە بە زانینی گرنگی و خۆشەویستی بۆ ئایین و ژیارستانیەت و کلتوور، لە گرنگترینی ئەو کەسانەش د.عبدالرحمن البدوی و د. زکی نجیب محمود و د.گە حسین و مامۆستا محمد حسین هیكل و د.سلیمان مظهر و شێخ علی عبدالرازق و مامۆستا خالد محمد خالد و د.مصطفی محمود و د. عبدالوهاب المسیری و هی تر[2].

وەك تەواوکارییەك بۆ ڕەهەندەکانی ئەفسانەی ئیلحاد، هزری دوو کەسایەتی دەخەینەڕوو کە نموونەن بۆ بێباوەڕی هاوچەرخ، ئەوانیش د.ئیسماعیل ئەدهەم، کە بە مولحیدۆکە(المليحد) وەسف دەکرێت، بەهۆی ئەوەی کە بەر لەوەی تەمەنی بگاتە سی ساڵ مردووە و بەهۆی بچووکی کتێبەکەی کە بەناوی بۆچی من بێباوەڕم (لماذا أنا ملحد) ناسراوە، هەروەها عبدالله القصیمی کە بێباوەڕە هاوچەرخەکان بە باوکی ڕۆحی خۆیان هەژماری دەکەن.

---

(١) لە وتارێکدا بە ناونیشانی گەڕانەوەی هۆش (عودة الوعي)، کە لە کۆنگرەی چوارەمی دامەزراوەی فۆڕشەبابی جیهانی لە قاهیرە پێشکەشی کرد، لە ٢٠١٣/٦/٢١.

(٢) د. محمد العوضي بەڵێنی پێداوین کە کتێبێك لەسەر گۆڕانی ئەو زانایانەی عەرەب لە دژایەتی کردنی ئاینەوە بۆ هۆشیاری و خۆشویستنی ئاین و ژیارستانیەت و کلتوور بنووسێت.

## مولحیدۆکە (الملیحد) د. إسماعیل أدهم :

بە رەچەڵەك تورکە، لە ئەسکەندەریە لە ساڵی ١٩١١ز لەدایك بووە، دکتۆرای لە بیرکاریدا لە زانکۆی مۆسکۆ لە یەکێتی سۆڤیەت وەرگرتووە، لە ساڵی ١٩٣١ز، لە زانکۆی سان پترسبۆرگ وەك مامۆستا کاری کردووە، پاشان لە زانکۆی ئەتاتورك لە تورکیا، پاشان لە ساڵی ١٩٣٦ز گەڕایەوە میسر. لە ساڵی ١٩٣٧ بیرمەندی ئیسلامی أحمد زکی أبو شادی وتارێکی نووسی بە ناوونیشانی بیروباوەڕی خودایەتی(عقیدە الألوهیة)، هاوڕێکەی ئیسماعیل ئەدهەم بە وتارێك وەڵامی دایەوە –کە دواتر کرایە نامیلکە- بە ناوونیشانی بۆچی من بێباوەڕم(لماڎ أنا ملحد)، کە تیایدا باس لە کۆژانەکانی خۆی دەکات لە کاتی گومانیدا و چۆن لە کۆتاییدا بە پەیڕەویکردن لە بێباوەڕی کۆتایی هاتووە، لەو کاتەدا لە جیهانی عەرەبیدا کەم بوون ئەوانەی ئەزموونی بێباوەڕی خۆیان نووسیوەتەوە.

ئیسماعیل ئەدهەم باس لە کاریگەری خوێندنەکەی و ژیانی دەکات لە یەکێتی سۆڤیەتدا و دەڵێت: ((ئەنجامی ئەو ژیانە ئەوەبوو کە من نکۆڵی لە ئایینەکان بکەم و واز لە هەموو بیروباوەڕێك بهێنم و تەنیا باوەڕ بە زانست و لۆژیکی زانستی بێنم، ئەوەی زیاتریش پێداگری کردم ئەوەبوو کە بەختەوەرتر و دڵنیاتر بووم لەوکاتەی لەگەڵ دەروونمدا لە کێبڕکێ دابووم بۆ پارێزگاریکردن لە بیروباوەڕە ئایینییەکەم)).

ئەگەر لە پاڵنەرەکانی پشت بێباوەڕی ئیسماعیل ئەدهەم ورد ببینەوە، دەبینین هۆکاری دەروونی ڕۆڵێکی گەورەی گێڕاوە، ئەدهەم لە نامیلکەکەیدا باس لەوە دەکات کە باوکی هەڵەشە و توند بووە، هەروەك چۆن ئامۆژنی کە پەروەردەی دەکرد هەر لە منداڵییەوە ناچاریان دەکرد سرووتە ئایینیەکان ئەنجام

بدات و قورئان ئەزبەر بکات. هەرچی دایکییەتی ئەوا مەسیحی بوو، دوو خوشکەکەیشی لە ئاییندا شوێنی دایکیان کەوتبوون، هەرسێکیانی بە لێبوردەیی و خۆشەویستی وەسف دەکرد، لە هەمان کاتدا گاڵتەیان دەکرد بە باسی موعجیزە و ڕۆژی قیامەت لە کتێبی پیرۆزدا، سەردانی کڵێسایان نەدەکرد. هەروەها ئیسماعیل ئەدهەم پێمان دەڵێت کە دەمارگیری ئیسلام و گاڵتەکردنی بە ئاینی مەسیحی بووە پاشخانێکی دەروونی، کە سەرسامبوونی بە زانست و بیری مارکسیەت لەسەر بنیاتنرا، لە کاتی ژیانی لە یەکێتی سۆڤیەتدا.

هەروەها دوای کەمتر لە سێ ساڵ، لە یەکێك لە شەوانی مانگی یۆلیۆی ساڵی ١٩٤٠ز دا، لەناو ئاوی ئەسکەندەرییەدا تەرمی ئیسماعیل ئەدهەم بە خنکاوی دۆزرایەوە، کاغەزێکیان لە جلەکانیدا دۆزیەوە کە تیایدا وتارێکی بۆ سەرۆکی ئەنجوومەنی نوێنەران نووسیوە، کە ئەو خۆی خۆی کوشتووە، بەهۆی بێزاربوونی لە ژیان، هەروەها وەسیەتی ئەوەی کردووە کە تەرمەکەی لە گۆڕستانی مسوڵمانان نەنێژرێت و بسووتێنرێت. ئەو بەختەوەری و دڵنیایی دەروونییە کوا کە ئیسماعیل ئەدهەم لەکاتی بێباوەڕیدا باسی لەوە دەکرد کە تیایدا دەژی؟!!

دەتوانین چەمکە بێباوەڕییەکانی ئیسماعیل ئەدهەم لە چەند خاڵێکدا کۆبکەینەوە:

- بێباوەڕی بریتییە لە باوەڕبوون بەوەی کە گەردوون هۆکار و بەدیهێنەرەکەی لەناو خۆیدا هەیە، هیچ شتێك لە پشت جیهانەوە نییە.

- پێشوازیکردنی هزری مرۆڤ لە چەمکی خوایەتی، هۆکارەکەی بۆ بوونی هێزی ڕازیکەری فەلسەفی ناگەڕێتەوە، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە زانایان ناویان ناوە بیانوو هێنانەوە(التبریر) و بیری خوایەتی بەهۆی ئەو ترس و نەزانییەوە جێگای خۆی کردۆتەوە کە لەڕێی دیاردە سروشتییەکانەوە تووشی دەروونی مرۆڤی دەکات، گومانیش لەوەدا نییە کە زانینی تەواومان بۆ هزری خوایەتی ئەو پیرۆزییەی ناهێڵێت کە پێشتر بۆیمان دادەنا.

- ئەگەر پێویست بێت هەموو شتێك هۆكارێك و بەدیهێنەرێكی هەبێت، ئەوا بۆچی خودا خۆی لەو بنچینەیە بەدەر دەكات (واتا پێویستە خوداش بەدیهێنەری هەبێت!).

- ئەدهەم بوونی هەموو شتێكی گەردوون بە ئەگەر و ڕێكەوتەوە تەفسیر دەكات، نموونەش بە نموونەی پیتەكانی چاپ دێنێتەوە كە دەكرێ لەڕێی ڕێكەوتەوە و بەهۆی تەقینەوەیەكەوە لە تەنیشت یەكەوە ریز ببن، وتارێك یان هەموو قورئانی پیرۆز بنووسێتەوە.

- ئیسماعیل نامیلكەكەی پێشكەش بە (هزر ئازادەكان، ئەوانەی كۆت و بەندەكانی هزریان شكاندووە، لەپێناو ئازادكردنی عەقڵی مرۆڤایەتی لە ئەفسانە ئاینییەكان و دروشمە نیشتمانییەكان، ئەوانەیش كە دەستی كۆمەڵانی خەڵكیان گرتووە بۆ ژیانی ڕاست، پێشكەش دەكات، بەڵكو تێیدا دیدێكی ئازاد و دوور لە دەمارگیری و چەقبەستوویی ئاینی تێدا بدۆزنەوە)).

سبحان الله...

چ ژیانێكی دروست و تەندروستە كە مولحیدۆكە باسی دەكات، لەوانەیە مەبەستی لەو كوشتارگانە بێت كە شیوعییەكان لە یەكێتی سۆڤێتیدا ئەنجامیانداوە و ئەو لەو وڵاتەدا فێربووە و پێی كاریگەر بووە. بەڕاستی ئەوە هەمان بانگەشەی تاقانەیی عەقڵی پێگەیشتووە كە بێباوەڕە نوێیەكان لە سەدەی بیست و یەكەمدا بانگەشەی بۆ دەكەن. هەروەها هەمان ئەو بیانووانەی بێباوەڕانە كە لە تەوەرەكانی كتێبەكەدا خستوومانەتەڕوو، ئەو تروسكاییە درۆیینەیەشمان تێدا كوژاندۆتەوە كە بە نێوچاوانی زانستەوە دراوە، كەواتە هیچ پێویست بەوە ناكات زیاتر لەسەری بڕۆین و وەڵامەكان دووبارە بكەینەوە[1].

---

(١) لێرەدا پێویستە ئاماژە بۆ ئەو بارودۆخەی ئازادی بیرو ڕا و ئازادی بیروباوەڕە بكەین كە لە سییەكانی سەدەی بیستەمدا باوبوو و، بووە هۆی بێداركردنەوەی بارودۆخی ئازادی بیروڕا لە وڵاتە عەرەبییەكانی تر لە سەدەی بیستەمدا.. وتاری بیروباوەڕی خودایەتی (عقيدة الالوهية) كە مامۆستا أحمد زكي أبو شادي نووسی، هاوڕێكەی ئیسماعیل ئەدهەم بە وتاری بۆچی من بێباوەڕم وەڵامی دایەوە و، ئەبو شادی بە (بۆچی من باوەڕدارم) وەڵامی دایەوە و، هاوڕێكەی ئەدهەم بە نامیلكەی بۆچی من بێباوەڕم وەڵامی

## کارەساتی عبدالله القصیمی[1] :

عبدالله القصیمی (١٩٠٧-١٩٩٦ز) بیرمەندێکی سعودی بوو، لە هەموو بیرمەندانی عەرەب زیاتر مشتومڕی ناوەتەوە، ئەمەش بەهۆی هەڵگەڕانەوەی لە پێگەی بەرگریکار لە ئیسلام و سەلەفییەت بەرەو بێباوەڕی.

بۆچی؟...

گۆڕانی قصیمی بۆ ئاڕاستەیەکی پێچەوانە چەند تەفسیرێکی بەدوای خۆیدا هێناوە، کە هەموویان بە دەوری لایەنی دەروونیدا دەخولێنەوە. قصیمی خۆی گومانکار بوو، تەنانەت لە کاتی بەرگریکردنی لە ئیسلامیش گومانگەلێکی هەبوو دەربارەی خودا و پێغەمبەرەکەی.

بەهەمان شێوە ئەو پیاوە میزاجێکی توندڕەوی کاردانەوەی هەبوو، چونکە ئەو بەردەوام یاخی و توند بوو، جنێوی بەمە دەدا و نەفرەتی لەوە دەکرد و گاڵتەی بەوە دەکرد و ئەوی دەشکاند و تفی لەوی تر دەکرد، لە سەرەتادا لە دژی دوژمنانی ئایین وابوو، دواتریش لە دژی لایەنگرانی ئایین.

ئەوانەی قصیمییان دەناسی باس لەوە دەکەن، کە ئەو پیاوە ئاڵوودەی سواربوونی شەپۆلە فکرییە باوەکان بوو، بۆنموونە کاتێك دەرفەتی سواربوونی شەپۆلی سەلەفیەت هەبوو سواری بوو و سوودی لێبینی، تا ئارەزووەکانی خۆی

---

دایەوە و مامۆستا محمد فرید وەجدی بە وتارێك لە گۆڤاری ئەزهەر وەڵامی دایەوە بە ناونیشانی (بۆچی ئەو بێباوەڕە). دیبەیتەکە بابەتیانە و بە ئەدەبی گفتوگۆ بەڕێوەچوو، ئەمە بەو پشێوی و ململانێیە بەراورد بکە بە دۆخی دوای شۆڕشەکانی بەهاری عەرەبی.

(١) بە دەستکاری و کورت کردنەوە لە وتارێکی ماڵپەڕی صید الفواد وەرمانگرتووە، لە نووسینی نووسەرێك بە نازناوی (صخرە الاخلاص).

تێدا بەتاڵ کردەوە لەگەڵیاندابوو، پاشان کاتێك شەپۆلەکانی نەتەوەیی و چەپ و شیوعییەت و هی تر دەرکەوتن سواری ئەوانیش بوو، مینبەرەکانیانی بۆخۆی قۆستەوە و بۆ فەلسەفە بێباوەڕییەکانیان خوێنگەرم بوو.

لە کۆتاییشدا ئەو پیاوە زۆر خۆبەزلزان بوو، تا ئەو ئەندازەیەی کە لە هۆنراوەیەکدا بەم شێوەیە مەدحی خۆی دەکات:

ولو أن ما عندی من العلم والفضل يقسم في الآفاق أغنى عن الرسل

واتە: (ئەگەر ئەو زانست و چاکە و فەزڵەی لەلای من هەیە، لە ئاسۆکان دابەش بکرێت، پێویست بە پێغەمبەران نامێنێت).

لەم دێڕە هۆنراوەیەدا لایەنە نادیارەکانی ئەو پیاوە و پاڵنەرە بێباوەڕییەکانی ئاشکرا دەبن.

القصيمي لە بواری بەرگریکردن لە ئیسلام بە تەنیا نەبوو، هەر بۆیە ویستی لە بوارێکدا تەنیا بێت و خۆی دەربخات، ئەگەر چاوت بکەوێتە سەر بەرگی کتێبەکەی (هذه هي الأغلال) ئەوەت بۆ دەردەکەوێت، کە لەسەر بەرگەکە نووسیویەتی: (مێژوونووسانی هزر ئەوە تۆمار دەکەن و دەڵێن کە بەم کتێبە گەلانی عەرەب بەرچاویان ڕوون بوو و ڕێگای عەقڵیان دۆزیەوە)، وادیارە کارەساتی (خۆبەزلزانی) کە ئیبلیسی گیرۆدەکرد، تووشی ئەو پیاوەش بووە.

کاتێك دەربارەی هۆکاری هەڵگەڕانەوەی پرسیاریان لێکرد، گوتی کاتێك بەخۆی و بە بیروباوەڕیدا چۆتەوە و لە تەرازووی عەقڵی داوە، زانایانی ئایینی هێرشیان کردۆتە سەر و شکاندوویانە، لەبری ئەوەی تێیبگەن و ئامۆژگاری و ئاڕاستەی بکەن، ئەو هەڵوێستەش بۆتە هۆی ئەوەی عیناد بێت و لەسەر گوڕانی سووربێت. سبحان الله. میسرییەکان زۆر دانا بوون کاتێك لە پەندێکیاندا گوتوویانە عینادی تووشی کوفرت دەکات (العناد يورث الكفر)، ئەوەتا لێرەدا ڕوویداوە!

کام لەو هۆکارانەی پێشوو لە پشت کارساتی (القصيمي)یەوەن؟ لەوانەیە هەموویان.

## پاشماوە بیروباوەڕییەکانی القصیمی:

**دوای لادانی لە ڕێگای ڕاستی باوەڕ، القصیمی نزیکەی ١٠ کتێبی نووسی، کە لە دەوری چەند بابەتێك دەخوولایەوە:**

- زماندرێژی و سنووربەزاندن بەرامبەر بە زاتی خودایی و تانەو تەشەردان لێی بە شێوەیەکی چەواشەکارانە.

- جنێودان بە پێغەمبەران و وەسفکردنیان بە وشەی نەشیاو و گاڵتە پێکردنیان.

- گاڵتەکردن بە هەموو شەریعەت و ئایینەکان و ڕەخنەگرتن لێیان بە شێوازێکی بریندارکەر و رووخێنەر و عەیبدار.

- کەمکردنەوەی پێگەی عەرەب و گاڵتەکردن بە هەموو کەسێکی عەرەبی.

- گاڵتەکردن بە پرسە ئیسلامی و عەرەبییەکان.

- باسکردنی کۆژانەکانی مرۆڤ و چارەڕەشی و خەم و پەژارەکانی بە شێوەیەکی نامۆ و ڕەق.

چارەمان نییە، هەر دەبێ هەندێك نموونە لەسەر بیر و شێوازی نووسینەکانی بخەینەڕوو:

لە کتێبی (هذا الكون ما ضميره)دا، لەژێر ناوونیشانی (في غار حراء لم أجد الإله ولا الملاك)دا دەڵێت:

((چوومە ناو ئەشکەوتەکەوە..ئەشکەوتی حیرا.. ئەشکەوتەکەی محمد و خوداکەیی و فریشتەکەی.. ئەشکەوتە پیسە وشکە شوومە نائومێدەکە.. وەك وەڵامدانەوەی فەرمان چووم.. چوومە ئەو ئەشکەوتەی کە وەچەی خستەوە و میراتی جێهێشت و فێرکردنی ئەنجامدا و قسەی کرد و کتێبی دانا و هانی

کوشتنی دا و بووە هۆی ئەمری بێبەزەییترین و بەهێزترین و گەمژەترین و بەردەوامترین پرسە خوایەتییەکان و پێغەمبەرایەتی و ئایین و وەحشیگەری! ئیتر ئەو ئەشکەوتە مردووە.. ئەو ئەشکەوتە خۆی کوشت، چونکە وەحی بۆ مرۆڤی عەرەبی نارد.. وەحی بۆ پێغەمبەری عەرەبی نارد. چی پێگوت؟ هیچ ژمێریاری و ئامارێك ناتوانێت ئەندازەی ئەو خەسارەتمەندییە بژمێرێت کە بەهۆی ئەو وەحییەوە تووشی ژیان و مرۆڤ بووە.. ئایا هیچ خودایەك ئەوەندە زیانی لەخۆیداوە، ئەوەندەی خودا بە ناردنی وەحی بۆ مرۆڤێکی عەرەبی لەخۆیدا؟!

خودایە گوێگرە. بە گوێیەك گوێگرە جیاواز لەو گوێیانەی تاقیمان کردەوە و ئاسیمان.. ئەگەر ئەوەی گوێیەکانی تۆی درووست کردووە گەورەترین هونەرمەند بوویێت. ئەوا بەبێ کار و فەرمان دروستی کردوون.. بەڵکو دژی ئەو فەرمانەی کە پێویستە پێیان هەڵبستێت.

خودایە تۆ لەسەر قەبارەیەك هاتیت کە هەموو قەبارەکان ئەوە رەتدەکەنەوە کە وەك تۆ وابن یان بەشێك بن لە تۆ..تۆ ئەی خودایا بێ قەبارەیت...

چەند شتێکی مەترسیدارە کە هیچ رێکخراوێك یان دادگایەك نییە کە دادوەر و گەواهیدەرانی لە هەموو خۆر و ئەستێرەکان پێکهاتبێت..بۆئەوەی کە تەوراتی مرۆڤ و ئینجیل و قورئانەکەی لەسەر بێبەزەیی و چەواشەکاری و دەبەنگییەکەی دادگایی بکات!)).

هەروەها لەژێر ناونیشانی: لماذا يسارع المتخلفون إلى الدخول في الإسلام:

((محمدی پێغەمبەر رایگەیاند کە ئەو کۆتا پێغەمبەرە و بە هاتنی ئەو دەرگاکانی ئاسمان داخران، بۆئەوەی چیتر پەیوەندی بە زەمینەوە نەکات بەو شێوەیەی کە لەگەڵ پێغەمبەراندا پەیوەندی کردووە..دوای ئەوەی کە ئەندازەی گەورەیی دژایەتیکردنی ئاسمان و شێواندنی بەهۆی ناردنی پێغەمبەرانەوە خوێندەوە و بینی و زانی....دوای ئەوەی کە ئەندازەی ناشرینی و رقئەستووری و دژایەتی پێغەمبەرانی بۆ زەمین هەست پێکرد.

ئەگەر خودا بت سزا بدات لەسەر ئەوەی کە بتە، ئەوا تا ئێستا هیچ سزایەك نییە و نەزانراوە کە بۆ سزادانی پێغەمبەری عەرەبی و پێغەمبەرایەتیعەرەبی بەس بێت!

پێغەمبەری عەرەبی محمد چۆن وەسفی خودای کردووە؟ بە فێڵبازی و خۆبەزلزانی، خۆشەویستی و رق و رازیبوون و نارەزایی، بە خۆشبەختی و دڵتەنگی و دژایەتی و نارەزوو و رەفتارەکانی..نە هەبووە و نە دەشبێت، کەسێکی هەجوکاری وەك محمدی پێغەمبەر لە هەجووکردنی خودادا!

قورئان بەناوبانگترین و گەورەترین و بێبەزەییترین و بێ ئابڕوترین کتێبی مەدح و هەجووکردن و شانازیکردن و پڕوپاگەندەیە..پێشتر بەبێ هاوتابوو و هەر وایش دەمێنێتەوە لە بێئابڕوویدا..قورئان ناشیرینترین و مەترسیدارترین و چەواشەترین و چەپەڵترین شێواز و دارشتنە)).

ئەوەندەی گواستمانەوە بەسە..و داوای لێبوردنیش دەکەین لەسەر ئەوەی گواستمانەوە

پێویستیت بەوە نییە، کە قسە لەسەر قسەکانی بکەی یان شیبکەیتەوە یان وەڵامی بدەیەوە

لەوانەیە ئەوەی گواستمانەوە ئەو رق و کینە و بەخیلییەی دەرخستبێت کە ئەو پیاوە لە دەروونیدا هەیبووە. لەوانەیە ئەو قسانەی سەلمێنەری ئەو قسەیەمان بێت کە وتمان لەرووی دەروونییەوە تەواو نەبووە..بێباوەڕ بم یان نا، بۆچی ئەوە پەلکێشم بکات بۆ کەمکردنەوە لە ئاست و پێگەی ئەوەی کەسانی تر باوەڕیان پێی هەیە و بەپیرۆزی دەزانن!!

## القصیمی لە تەرازوودا :

ئەم بابەتە بە قسەی بیرمەند و ئەدیب و شاعیر میخائیل نعێمە کۆتایی پێدێنین، کە دەربارەی کتێبی (العالم لیس عقلاً)ی القصیمی نووسیویەتی، قسەکانی ئاڕاستەی القصیمی دەکات و دەڵێت:

((لە ڕاستیدا ئەم کتێبە کتێبێکی رووخێنەر و نەرێنکردنی پلە یەکە، خودا و ڕەوشت و بەها بەرزەکان و شۆڕشەکان و پێشەوا بەرزەکان و ئامانجە پیرۆزەکانی رووخاندووە، بەڵام ئەوە جێی سەرسوڕمان نییە، چونکە تۆ لە تەوەرەی یەکەمی کتێبەکەدا ئەوە نەرێ دەکەی کە بوونی مرۆڤ هیچ واتایەکی هەبێت، جا کەسێك کە هیچ واتایەك نەزانێت بۆ بوونی مرۆڤ و بلیمەتییەکەی نەزانێت، چۆن قسەکانی واتایەکیان دەبێت؟!

پێنووسەکەت تەنیا ئازار و تاڵی و قێزەونی و رقی لێدەچۆڕێت، ئەگەر رقنەستوورییەکەت توانیبای بۆمبی پێ درووست بکرێت ئەوا بۆمبێکی بەهێزتر و مەترسیدارتر لە بۆمبەکەی هیرۆشیمای لێ درووستدەکرا!)).

القصیمی لەیەکێك لەنەخۆشخانەکانی قاهیرە مرد..هەندێ کەس بانگەشەی ئەوە دەکەن کە بەر لە مردنی تەوبەی کردووە، تەوبەی کردبێت یان نا، ئەو ئێستا لەبەردەم پەروەردگاری خۆیەتی..

## بێباوەڕی لە ماڵەکانماندایە :

لە ڕاگەیاندنی عەرەبیدا(و میسری بەتایبەتی) باس لەوە دەکرێت کە شەپۆلێکی بێباوەڕی بەم دواییانە لەنێو گەنجانی عەرەبدا دەرکەوتووە، ئایا ئەو قسانە تا چەند لە ڕاستییەوە نزیکن؟

لە ڕاستیدا هیچ توێژینەوەیەکی وردمان بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە لەبەر دەستدا نییە[1]، بەڵام من خۆم هەستم بە ڕاستی بوونی ئەو شەپۆلە کردووە، چونکە لە دوو ساڵی ڕابردوودا گفتوگۆم لەگەڵ دەیان گەنجی بێباوەڕ و

---

(١) پەیمانگای گالوپی ئەمریکی لە نێوان ساڵانی (٢٠٠٦-٢٠٠٧ز) دا لێکۆڵینەوەیەکی بڵاوکردۆتەوە، کە ١٤٣وڵاتی لەخۆگرتووە، بە ڕێژەی ١٠٠٠کەس لە هەر وڵاتێکدا، لێکۆڵینەوەکە باسی لەوە کردووە کە میسرییەکان لە هەموو گەلانی جیهان دیندارترن بە ڕێژەی ١٠٠٪ و ئەستۆنیا کەمترینیانە بە ڕێژەی ١٤٪، دوای میسریش بەنگلادیش و مەغریب و جیبۆتی و ئیمارات دێن.

هەروەها ڕۆژنامەی واشنتن پۆست لە ٢٠١٣/٦/١٥ دا لێکۆڵینەوەیەکی بڵاوکردۆتەوە کە پەیمانگای گالوپی نێودەوڵەتی Win Gallup (لە پەیمانگای گالوپی بەناوبانگ) لە ساڵی ٢٠١٢ لێکۆڵینەوەیەکی لەسەر ٥٠هەزار کەس لە ٥٤ وڵاتی جیاوازدا ئەنجامداوە دەربارەی بیروباوەڕیان.

لێکۆڵینەوەکە دەریخستووە کە ٥٩٪ی نموونەکە موسڵمانن و، ٢٣٪یان بێ ئاینن و ١٣٪یان بێباوەڕن. بەرزترین ڕێژەی بێباوەڕی لە چین بوو، لە کاتێکدا لە ساڵی ٢٠٠٥ و ٢٠١٢لە پاکستان ڕێژەی بێباوەڕی لە ١٪ بۆ ٢٪ بەرزبووەوە و، لە مالیزیا لە ٤٪ بۆ سفر دابەزی، بەمەش ئەم دوو دەوڵەتە نزمترین ڕێژەی بێباوەڕییان تێدا هەیە.

ئەوەی جێگای سەرسوڕمانە ئەوەیە کە لێکۆڵینەوەکە دەریخستووەکە ڕێژەی بێباوەڕیی لە سعودیەدا ٦٪ و بەمەش بەرزترین ڕێژەی بێباوەڕی لەوێیە و لە پێشەوەی وڵاتە ئیسلامییەکانەوە دێت! کە ڕێژەکەی هاوتایە لەگەڵ هەندێك لە وڵاتە عەلمانییە ئەورووپییەکانی وەك بەلجیکا!

گومان لەوەدا نییە کە ئەم دوو لێکۆڵینەوەیە وردی زانستییان پێویستە، چونکە نموونەی تەنیا هەزار کەس لە هەر وڵاتێك-نازانرێت چۆن ئەو کەسانە چۆن لە ناوەندە جیاوازەکانی زانستی و هزری و کۆمەڵایەتی و ئابووری هەڵبژێردراون- بۆ پێوانەکردنی دینداری کە زۆر باوە وادەکات کە هەر توێژینەوەیەکی بەم شێوەیە ڕاستگۆیی و بێلایەنی لەدەست بدات. دەشکرێ نیازی خراپی لەپشتەوە بێت!

گومانکاردا کردووە، هەروەک زانیومە چەند کۆمەڵەیەکی بێباوەڕی لە زانکۆ و قوتابخانەکاندا (بە قوتابخانەی ئیسلامی و مەسیحیشەوە) بوونیان هەیە، نووسراوی ئەو جۆرە هزرە بەسەر قوتابییەکاندا دابەش دەکەن، هەروەک چۆن لە یانە و جێگای کۆبوونەوەی گەنجانیشدا ئەو کارە دەکەن. ئەوە سەرەڕای بوونی دەیان پێگە و پەڕەی بێباوەڕی عەرەبی لەسەر ئینتەرنێت، سەرباری دەرکردنی چەندان گۆڤار و چاپکراوی بێباوەڕیی زۆر گرانبەها و رازاوە، کە لە وڵاتە عەرەبییە جیاوازەکاندا دابەش دەکرێن. یەکێك لە پێگە بێباوەڕییە گەورەکان باسی لەوە کردووە کە لە دوو هەفتەی کۆتایی مانگی دێسەمبەری ساڵی ٢٠١٢ز دا ٣٥٠ گەنجی بێباوەڕی نوێی میسری خۆیان لە پێگەکەدا تۆمار کردووە، کە نیوەی ئەو ژمارەیە لە تەمەنی ١٥-٢٥ ساڵیدان.

## پاشخانەکانی شەپۆلی بێباوەڕیی

گومان لەوەدا نییە کە تۆڕی زانیارییەکان (ئینتەرنێت) کاری ئاشنابوونی گەنجانی بە هزری بێباوەڕی ئاسان کردووە، هەروەک چۆن تۆڕە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکان رێگای بۆ ئاڵوگۆڕکردنی ئەو بیرۆکانە ئاسان کردووە. ئەو شەپۆلە بێباوەڕییەش لەدوای شۆڕشەکانی بەهاری عەرەبیی زیاتر بوو، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە گەنجان سەرکەوتوو بوون لە رووبەڕووبوونەوەی رەمزەکانی دەسەڵاتی ئەو وڵاتانە، ئەمەش بووە هاندەرێك بۆ هەندێکیان کە تەحەددای رەمزی گەورەتر بکەن، کە بریتییە لە خوایەتی و ئایین، هەروەک چۆن دۆخی ئازادی کە ئەو شۆڕشانە هێنایانە کایەوە رێگای بە دەربڕین و ئاشکراکردنی ئەو هزرانەدا. گومانیش لەوەدا نییە کە شکستی ئەزموونی ئیسلامی سیاسی (بەتایبەتی لە میسر) رەنگدانەوەی نەرێنی بەسەر ئەو بوارەوە دەبێت.

لەبەرامبەریشدا، گوتاری کلاسیکی ئایینی بێتوانا بوو لە ململانێکردنی ئەو هزرە و بەڵگە زانستی و فەلسەفییەکان، ئەمەش بەهۆی ئەوەی کە تەنیا بە خستنەڕووی کلتووری وازیهێناوە و دابڕاوە لە بەرهەمە زانستی و ژیارستانییە نوێیەکان، چەند توێژینەوەیەکیش ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە هزری ئایینی کورتبین گرنگترین هۆکاری شەپۆلی بێباوەڕی هاوچەرخن لە وڵاتە عەرەبییەکاندا.

ئەو پاشخانانە دەمانخەنە سەر دوو ڕێڕەوەوە، کە ڕێڕەوی سێیەمیان نییە، یەکەمیان (ڕێگای ڕۆژئاوایی کڵێسایییە)، کە تیایدا ئایین لەگەڵ زانست و عەقڵدا بەریەک دەکەوێت، بۆتە هۆی بەرهەمهێنانی ژیارستانیەتێکی مادیگەرایی بێباوەڕی ستەمکارانە، کە یەکەم بەرهەمی لەو جۆرەبوو لە مێژووی مرۆڤایەتیدا. ڕێگای دووەمیش (ڕێگای ڕۆژهەڵاتییە)، کە خەلافەتی عەبباسی لە هەردوو سەدەی سێیەم و چوارەمی کۆچیدا پەیڕەوی کرد، لەو کاتەی چەند فەلسەفەیەکی دژ بە ئیسلام و خوایەتی دەرکەوتن، چارەسەرەکەش بریتی بوو لە بانگهێشتکردنی گوتارێکی نوێی ئایینی بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو ڕەوتانە، کە بریتی بوو لە بیری موعتەزیلەی عەقڵانی، بۆیە پێویستە ڕێگایەک هەڵبژێرین.

## بێباوەڕی سۆفستائی و جۆرەکانی :

بەڵگەکانی بێباوەڕی لە هزری ڕۆژئاواییدا بەدەوری پرسە زانستییەکاندا دەخولێنەوە، بەتایبەتی بەدیهێنانی گەردوون و پەیدابوونی ژیان و بیردۆزی پەرەسەندن و توێژینەوە نوێیەکان لە بوارە زانستییەکاندا، کە بە (بێباوەڕیی مادیگەرایی سروشتی) ناودەبرێت، هەرچی هزری بێباوەڕی نێو گەنجانی ئێمەیە، ئەوا ڕۆڵی پرسە زانستییەکانی تێدا کەمە، لەکاتێکدا کە بارودۆخی گشتی ڕۆڵێکی گرنگنی تێدا دەگێڕێت، هەروەک چۆن پاشخانی دەروونیش ڕۆڵێکی گەورەی هەیە.

(چەند چەمك و نموونەیەكی مەعریفی[1] هەڵە Paradigm Errors) لە پشت ئەو بێباوەڕییەوەن كە لەنێو گەنجەكانماندا پەیدابووە، كە لە كۆمەڵێكەوە بۆ كۆمەڵێكی تر جیاوازی هەیە، دەتوانین ناو لە هەموویان بنێین((بێباوەڕی سۆفستائی)).

لەوەندەی لە تەوەرەكە ماوە لەڕێی ئەزموونی تایبەتی خۆم؛ چ لە گفتوگۆكانم لەگەڵ بێباوەڕاندا یاخود لەڕێی خوێندنەوە و ئاگاداریم لە پێگە ئەلیكترۆنییەكانیان یان نووسینەكانیان جۆر و هۆكارەكانی بێباوەڕیی سۆفستائی لە نێو گەنجەكانماندا دەخەمەڕوو، بۆ هەر جۆرێكی بێباوەڕی یان كەموكوڕییەك لە نموونەی مەعریفیدا ناوێكم بۆ داناوە، كە لەگەڵ خاسیەتەكانی بگونجێت و لە جۆرەكانی تری جیا بكاتەوە، هەرچەندە لە تەوەرەكانی پێشووتری كتێبەكە زۆرێك لەو جۆرانەمان هەڵتەكاندووە، لەبەرئەوە بە كورتی دەیانخەمەڕوو و وەڵامیان دەدەمەوە:

## ١- بێباوەڕیی منداڵكارانە:

لە تەمەنی منداڵیماندا ڕاهاتبووین لەگەڵ هاوتەمەنەكانمان گفتوگۆ بكەین، هەر یەكێكمان دەیویست ئاستی خوێندنەوە و ڕۆشنبیرییەكەی نیشان بدات، من زۆربەی كات ئەو پرسیارەم دەكرد: ئەگەر خودا گەردوونی بەدیهێناوە، ئەدی كێ خودای بەدیهێناوە[2]؟

سەرەڕای ئەوەی كە ئەو پرسیارە منداڵكارەیە بە توێژینەوە كوژراوە، هەزار ساڵ بەر لە ئێستا لەلایەن زانایانی عیلمی كەلامی مسوڵمانان و پیاوانی

---

(١) نموونەی مەعریفی بریتییە لەو چاویلكەیەی مرۆڤ لەڕێیەوە ژیان دەبینێت و، دەكرێ بە (المفاهیم الحاكمە)ش ناوببرێن.

(٢) د. مصطفی محمود كتێبەكەی (رحلتي من الشك إلى الإیمان) بە هەڵوێستێكی هاوشێوە دەستپێدەكات كە چۆن لە منداڵیدا كردوویەتی. گومان لەوەدا نییە ك تارمزووە منداڵییەكان لەیەك دەچن.

نابینی و لاهووتی مەسیحی وەڵام دراوەتەوە، کەچی بێباوەڕانی ناوچەکەمان و جیهانیش بە بەڵگەی جەوهەری دادەنێن بۆ بێباوەڕبوونیان، هەروەها دەبێ بزانین کە تەنیا منداڵکارەکان ئەو پرسارە ناکەن، بەڵکو گەورەکانیش، تەنانەت ریچارد دۆوکنز کتێبەکەی (وهم الإله) لەسەر ئەو پرسیارە بنیاتناوە!!

پوختەی وەڵامدانەوەی ئەو بەڵگە بێباوەڕییەش بریتییە لەوەی، کە هەموو بوونێکی بەدیهێنراو پێویستە بەدیهێنەرێکی هەبێت (هۆکار)، جا ئەگەر بێین و بەدوای ئەو هۆکارانەوە بڕۆین ئەوا بێگومان دەگەینە هۆکاری یەکەم کە لە پشت هەموو بەدیهێنراوەکانە و پێویستە بەدیهێنەری نەبێت، زانایانی لۆژیك(مەنتیق) چەمکی (التسلسل یمتنع)ی لێدەنێن، بەواتای ئەوەی کە هەر دەبێ لە شوێنێکدا بووەستین، کەواتە پرسیارکردن دەربارەی هۆکار و بەدیهێنەری هۆکار و بەدیهێنەری یەکەم پرسیارێکی گەمژانەیە! ئەگەر ئێمە نەتوانین (وێنای) بەدیهێنەرێك بکەین کە بەدیهێنەری نەبێت، ئەو پرسیارە بەڵگەی عەقڵی و لۆژیکی هەیە (التسلسل یمتنع) و بەڵگەی زانستیشی هەیە کە بریتییە لە پێویستی گەردوون و ژیان و مرۆڤ بۆ دیزاینەرێکی زیرەك، کە ئەو دوو بەڵگەیەش ئەوەمان لەسەر پێویست دەکەن کە لەڕووی عەقڵییەوە دان بە خودا بنێین وەك بەدیهێنەری یەکەم.

کەواتە پرسی خودای ئەزەلی بەعەقڵ دانپێدانراوە ئەگەر وێناش نەکرێت[1]، ئەوەتا زانستی هاوچەرخ چەند چەمکێکمان بۆ دەخاتەڕوو کە وێنا ناکرێن، بەڵام بە عەقڵ دانپێدانراون، چونکە بە بەڵگەی بیرکاری دڵنیا کراونەتەوە، نموونەی ئەوەش وەکو ئەوەی بیردۆزی کوانتەم پێمان دەڵێت کە دەکرێ تەنۆلکەی ژێر گەردیلەیی لەیەك کاتدا لە چەند شوێنێك بێت!

---

(١) لە هەردوو تەوەری تۆیەم و چواردەیەمدا بەدرێژی باسمان لەوە کردووە.

## ٢- بێباوەڕیی هەرزەکارانە

ماوەی تەمەنی هەرزەکاری بە قورسترین قۆناغی تەمەنی مرۆڤ دادەنرێت، چونکە لەو قۆناغەدا مرۆڤ هەست بە خودی خۆی دەکات و متمانە بە خۆی و عەقڵی دەکات، بۆچوون و بڕیارە عەقڵییەکانی خۆی دەکاتە مەرجەع و لەژێر ڕۆشناییدا بڕیار لەسەر ڕاستی و هەڵەیی کەسانی تر دەدات، تەنانەت خۆی بە هاوتای گەورەکان دەزانێت و لێیان یاخی دەبێت و هەر بۆچوونێکی گەورەکانی بە دڵ نەبێت ڕەتیدەکاتەوە، هەروەك چۆن ئارەزووی خۆدەرخستنی بەسەردا زاڵە، ئەو سیفەتانە (چ لە هەرزەکاراندا هەبن یان لە گەورەکاندا) بوونەتە هۆی پەیدابوونی چەند جۆرێکی بێباوەڕیی، بۆیە شایەنی ئەوەیە کە هەر یەکێکیان ناوێکی لێبنێین:

### أ- بێباوەڕیی هاوتایی و خۆبەگەورەزانی:

هەرزەکار (چ لە تەمەنی هەرزەکاریدا بێت یان گەورە بێت وەك دۆوکنز) وەك پیاوێکی خاوەن توانای سنوورشکێن (سوپەرمان) سەیری خودا دەکات، بۆیە بە بەراوردکردنی بە کردارەکانی خۆی خودا هەڵدەسەنگێنێت.

لە دیبەیتێکدا کە لەنێوان من و جەمسەرێکی بێباوەڕیدا ڕوویدا، یەکێك لە کەناڵە ئاسمانییەکانیش پەخشی کرد، بێباوەڕەکە گوتی: ڕۆژێکیان مێشوولەیەکم کوشت و تەحەددای خودام کرد - ئەگەر بوونی هەیە - با تەحەدداکەم قەبوڵ بکات و بتوانێت مێشوولەکە زیندوو بکاتەوە. تەحەددا بە زیندووکردنەوەی مردوو یەکێکە لە جۆرەکانی هاوتایی و خۆبەگەورەزانی، بێباوەڕانی گەلانی لەناوچووش بۆ پێغەمبەرەکانیان کردووە، من وامدەزانی لەگەڵ لەناوچوونیان ئەوەش لەناوچووە، بەڵام ئەوەتا بێباوەڕانی هاوچەرخ بەشێوەیەکی گەمژانە هەمان شت دووبارە دەکەنەوە، ژیان چی بەسەردێت ئەگەر خودا تەحەددای

هەموو بێباوەڕان قەبوڵ بکات؟ بێگومان ژیان دەبێتە گاڵتە و یاری، بێباوەڕان دەبن بە خودا[1].

جۆرێکی تری هاوتایی و خۆبەگەورەزانی ناتەواو سکاڵای هەندێك کەسە لەوەی کە دەڵێن لەنێوان ئێمە و خودا هیچ (پەیمان)ێك بوونی نییە کە گەرەنتی بێت بۆئەوەی کە خودا بەڵێنەکەی بەجێدەگەیەنێت و بەهەشتمان پێدەبەخشێت ئەگەر گوێڕایەڵی بکەین!

هەستکردن بە هاوتایی دەبێتە هۆی سەپاندنی بۆچوونەکانمان بەسەر خودادا، نموونەش لەسەر ئەوە پرسیاری هەندێك کەسە کە دەڵێن: خودا چ سوودێك لەوە دەبینێت بە درێژایی تەمەنمان بیپەرستین؟ بەو کەسانە دەڵێم: یاساکانی دامەزراوەکە(یان یارییەکە وەك خۆیان دەڵێن) خودای بەدیهێنەر دایاندەنێت، بەندەی بەدیهێنراو تەنیا گوێڕایەڵی و پابەندبوونی لەسەرە، بۆ نموونە ئەگەر تۆ بەشداری لە یاری تۆپی پێدا بکەی پێویستە بە یاساکانیەوە پەیوەست بیت، ناکرێ یاساکانی تۆپی دەستی تێدا جێبەجێ بکەی!

بەهەر حاڵ، گوێڕایەڵ و پەرستنمان هیچ لە دەسەڵات و گەورەیی خودا زیاد ناکات، بێفەرمانی و تاوانەکانیشمان هیچ لە دەسەڵات و گەورەیی خودا کەم ناکات، سوودمەندی یەکەم و کۆتایی هەر بەندەیە.

ب- بێباوەڕیی یاخی

لەو دیبەیتەمەدا کە لە کەناڵێکی ئاسمانیدا پەخشکرا، بێباوەڕەکە ویستی بەرزراگرتنی بەهای ئازادی لەلای خۆی نمایش بکات، گوتی: من ئامادەم بە ئازادی بچمە دۆزەخەوە نەوەك وەك بەندەی خودا بچمە بەهەشتەوە! لە ڕاستیدا یاخیبوونی ئەم بێباوەڕە بەهۆی شانازی کردنیەوە نییە بە ئازادی و رەتکردنەوەی کۆیلایەتی، چونکە لە پێگەکەی خۆی لە تۆڕی زانیارییەکان بۆ هاوڕێ

---

[1] ئەو تەحەددیەمان بە دوور و درێژی لە تەوەرەی دەیەمدا پووچەڵ کردۆتەوە، لەمیانەی قسە کردنمان دەربارەی ڕێڕەوی فەلسەفی ریچارد دۆوکنز.

کچەکەی نووسیوە (پەرستراوەکەم)! لەڕاستیدا ئەوە بە دیاریکراوی یاخیبوونە لە پەرستنی خودا.

کرۆکی کێشەکە، کە بێباوەڕیی هاوتایی و خۆبەگەورەزانی و یاخیبوون بەرهەم دێنێت، بریتییە لەوەی کە ناتوانرێت پێوانەی زانست و کردارەکانی خودای رەها و ئەزەلی کە کات و شوێنی دامەزراوەی هۆکارەکان ناتوانن سنووورداری بکەن لەسەر زانست و کارەکانی مرۆڤ کە سنووردارن و بەهۆکارەکانەوە پابەندن بپێورێن، ئەو جیاوازییانەش بوونەتە هۆی ئەوەی بڵێین هیچ شتێك هاوشێوەی خودا نییە، واتا بەتەواوەتی لە مرۆڤ جیاوازە، لەو جیاوازیانەش ئەوەیە کە خودا وەك مرۆڤ کارەکانی لە پێناو ئامانجێك یان پێویستییەك ئەنجام نادات.

شەیتانی نەفرەتلێکراو کەوتە ئەو تاوانە مەعریفییەوە، لە خودا یاخی بوو، خۆی وەك هاوتای خودا و دادوەر بەسەر فەرمانەکانییەوە دانا، هەر بۆیە رەتیکردەوە کڕنووش بۆ ئادەم ببات، بەهۆی ئەوەی کە پێشێلکردنی لۆژیکە شەیتانییەکەی لەلایەن خوداوە؛ چونکە ئەو خۆی لە ئاگرە و ئادەمیش لە قوڕ!

ج- بێباوەڕیی (جیاواز بە دەناسرێی):

باوکەکە پێی گوتم کە کوڕەکەی لەوەدا سەرکەوتوو نەبوو کە هاوشێوەی خوشك و براکانی لە خوێندن سەرکەوتوو بێت، بۆیە دەستی کرد بە قسەکردن لەگەڵ کەسانی تردا لەسەر پرسی خوایەتی، پاشان بەتەواوەتی پەیڕەوی لە بێباوەڕیی کرد. کاتێك گفتوگۆم لەگەڵدا کرد، هەستم بەوە کرد کە شانازی بەخۆیەوە دەکات، بەهۆی ئەوەی کە بۆتە بابەت و باسی قوتابخانە و قوتابی و مامۆستاکان هەموو باسی دەکەن، هەروەها ئەو کارەی بۆتە هۆی ئەوەی کە دەرفەتی ئەوەی بۆ برەخسێنێت لەگەڵ ژمارەیەك لە زانا و بیرمەندەکان دابنیشێت و گفتوگۆ بکات، باوکەکەی بە هیوای ئەوەی کە لەو بیروباوەڕە هەڵەیەی پەشیمانی بکەنەوە دەیانهێنێت تا لەگەڵیدا دابنیشن.

لە ڕاستیدا پێشێلکردنی کلتور و عادەتەکانی کۆمەڵگا و چەمك و بەها چەسپاوەکانی، ئاسانترین ڕێگایە بۆ پەیداکردنی دەنگۆ و ناوبانگ لەنێوان هاوتەمەنەکاندا و لەبەردەم کەسانی تردا[1].

### د- بێباوەڕیی بێباکیی

دایك و باوکەکە سکاڵای کوڕەکەیان لەلام کرد کە بۆتە بێباوەڕ و بانگی ئەوانیش دەکات کە بچنە سەر ڕێگەکەی ئەو، ئەوە ڕەتدەکاتەوە کە لەگەڵ هیچ کەس گفتوگۆ بکات؛ چونکە (بەو شێوەیە ئاسوودەیە). بەدوای گەنجەکە و دایك و باوکەدا نارد و داوام لێکرد کە گفتوگۆم لەگەڵدا بکات، ئەگەر قەناعەتی پێکردم ئەوا منیش پاڵپشتی هەڵوێستەکەی دەکەم و قەناعەت بە دایك و باوکیشی دەهێنم، بەڵام ئەگەر هەڵە بوو ئەوا پێویستە بزانێت کە دەستگرتنی بەو هەڵوێستەیەوە بارێکی وای دنیا و دوارۆژی دەخاتە سەر شان کە پێی هەڵناگیرێت.

گەنجەکە بە داواکەم ڕازی بوو و یەکترمان بینی، پێیگوتم: بە بێباوەڕیم ژیانم جێگیرە و بەختەوەرم، ئیتر بۆ خۆم بە باسی خوایەتی و ئایین سەرقاڵ بکەم، لەکاتێکدا کە وا هەستناکەم هیچ پێویستییەکم بە باوەڕهێنان پێیان هەبێت؟

پێمگوت، چی دەڵێی دەربارەی ئەو قوتابییەی کە وانەکانی ناخوێنێت؛ بە بیانووی ئەوەی کە بەبێ خوێندن ژیانی جێگیرە، هەروەها لەبەر ئەوەی وایدەبینێت پێویست بەوە ناکات لەپێناو ئەوەدا خۆی ماندوو بکات و ئازار ببینێت؟ لە ڕاستیدا ئەو قوتابییە هەست بەوە ناکات کە ئەو ژیانە ئاسوودەیەی سەرەنجامی

---

(١) هەڵوێستی دکتۆر زکی مبارك ئەو جۆرە هەڵوێستە بەرجەستە دەکات، کاتێك لە نامەی ماستەرەکەیدا کە بە ناونیشانی(الأخلاق عند الغزالي) بوو هێرشی کردبووە سەر ئیمامی غەزالی، دوای ئەوەی کە ڕێزەوەکەی ڕاست کردەوە و بەهای مەنهەجی ئیسلامی بۆ دەرکەوت لە پێشەکی تێزی دکتۆراکەیدا کە بابەتەکەی (التصوف الإسلامي) بوو نووسی: ((ئەی غەزالی داوای لێبوردن دەکەم، بۆ ئەوەی بەناوبانگ بم هێرشم کردە سەرت، چونکە لەوانەیە ناوبانگ لەسەر شانی گەورەکان و کەڵەپیاوان بەدەست بێت)). ئەو بابەتە لە کتێبی (المعارك الأدبية)ی أنور الجندي وەرگیراوە.

خراپی هەیەلئایا لەو کاتەدا لەسەر دایك و باوکی و مامۆستاکانی پێویست نییە کە ئامۆژگاری بکەن و ئاراستەی بکەن بۆ ئەو شتانەی بەرژەوەندی ئەوی تێدا هەیە، تەنانەت ئەگەر خوێندنەکەش بە ئارەزووی خۆی نەبێت، هەتا ئەگەر گرنگی ئەوەش نەزانێت؟

هەروەها گوتم: نابێت مرۆڤ تەنیا بەپێی ئەو شتانە بژی کە بەختەوەری بۆ دێنن، بەڵکو پێویستە بەپێی ئەو شتانە بژی کە عەقڵ بۆی ئاراستە دەکات، لەسەری پێویستە کە دوای ئەوەی دەزانێت سەرچاوە و سەرەنجامی چییە ڕێگاکەی دیاری بکات، ڕێخۆشکردنەکەم بۆ دانیشتنێکمان بەوە کۆتایی پێهێنا: لە ڕاستیدا ژیان بەپێی (ئارەزوو) ژیانی هەرزەکارەکانە، هەرچی ژیانی پێگەیشتووەکانە ئەوا بەپێی عەقڵە، کەواتە ئەو (بێباکییە)ی ئێستات پاساوێك نییە بۆ باوەڕنەهێنان.

گەنجەکە قەناعەتی بە لۆژیکەکەم هات و رازی بوو گفتوگۆم لەگەڵدا بکات.

٣- بێباوەڕیی پەروەردگارێتی:

ئەم جۆرەی بێباوەڕی هاوشێوەی ئەو بێباوەڕییەیە کە لەکاتی هاتنی پێغەمبەردا لە مەککە باو بوو، چونکە زۆربەی قورەیشییەکان باوەڕیان بە بوونی خودا هەبوو، بەڵام نکوڵییان لەوە دەکرد کە خودا پێغەمبەرێکی ناردبێت:

﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٦١﴾ ﴾ العنكبوت: ٦١.

ئەوانەش دەڵێن: دان بە بوونی خودا دەنێین، بەڵام ئایینەکان تەنیا بانگەشەن و هۆکاری ئەو ئازار و مەینەتەن کە لە دنیادا هەیە، پێویستیمان پێیان نییە. هەندێکی تریش دەڵێن: بەڵگەتان چییە کە خودا ئێمەی بۆ ئامانجێك بەدیهێناوە، بۆچی ناکرێ ئێمەی بەدیهێنابێت و وازی لێهێنابین؟ چۆن خودا خۆی بە

شتێکی بێ نرخی وەك ئێمەوە سەرقاڵ دەکات؟ ئایا ئەو پێویستی بە ئێمە هەیە؟

بەوە وەڵامیان دەدەینەوە، کە: ئەگەر مرۆڤێك بەبێ هۆکار کارێك بکات بە گێلی دادەنێین، ئەی چۆن دەچێتە عەقڵەوە کە خودا بەبێ هیچ حیکمەتێك یان ئامانجێك بوون و مرۆڤ بەدیبێنێت؟!

هەروەها دەڵێم: ئەو کەسەی بەدوای حەقیقەتدا دەگەڕێت پێشوازی لە هەموو یارمەتییەك دەکات بۆ گەیشتن بە حەقیقەت، بۆیە خەلیلی خودا ئیبراهیم (سەلامی خودای لەسەر بێت) و (پێغەمبەرانی تریش) لە چاودێری کردنی ئاسماندا بەدوای خودا دەگەڕان، لە کۆتاییشدا فەرمووی:

﴿...قَالَ لَئِن لَّمْ يَهْدِنِي رَبِّي لَأَكُونَنَّ مِنَ الْقَوْمِ الضَّالِّينَ ﴿٧٧﴾﴾ الأنعام: ٧٧.

واتە: (ئەگەر خودا ڕێنموونیم نەکات لە کۆمەڵی سەرلێشێواوان دەبم).

ئەگەر ئێمە بۆ ئامانجێك بەدیهێنرابین، ئایا ستەم نییە لەڕێی ئایینە ئاسمانییەکانەوە بۆ ئەو ئامانجە ڕێنموونی نەکرێین؟!

ڕاستی بابەتەکەش ئەوەیە کە (ئەوانەی دان بە پەروەردگاریتیدا دەنێن و نکوڵی لە ئایینەکان دەکەن) لەگەڵ ئەوانەی (بێباوەڕن) وەك یەك وان، چونکە نکوڵیکردن لە ئایین کرۆکی خودایەتی بەتاڵ دەکاتەوە؛ کە بریتییە لە تەکلیف خستنە سەر مرۆڤ لەڕێی ئایین بە فەرمان و قەدەغەکردنەکانییەوە و، ئەوەی لە دوای مردن دێت وەك زیندووکردنەوە و لێپرسینەوە و پاداشت و سزا[1].

---

(١) لە تەوەرەی چواردەیەمدا بەشێوەیەکی فراوانتر باس دەکەین.

### ٤- بیباوەڕیی ناچاری و زۆرەملێیی:

هەندێکیان گوتیان: پێویست بوو خودا بەرلەوەی من بەدیبێنێت پرسم پێبکات! بە چ حەقێك خودا لێپرسینەوە لەگەڵ مندا دەکات کە نەیپەرستم، ئەی ئازاد نیم؟ (چۆن کەسێك لەسەر یارییەك، کە خۆی نایەوێت بیکات لێپێچینەوەی لەگەڵدا دەکرێت)؟!

منیش پێمگوت: ئەگەر بە دڵت نییە دەتوانی لە یارییەکە پاشەکشە بکەی!

گوتی: چۆن؟!

گوتم: بە خۆکوشتن! هیچ سەرەنجامێکیش نییە کە لێی بترسی، چونکە تۆ باوەڕت بە زیندووکردنەوە و حەشر و حیساب نییە! هەروەها گوتم: خۆنەکوشتنت و ترسان لە ئەنجامدانی ئەو کارە باشترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە لە بەدیهێنانت لەلایەن خوداوە رازیت، تەنانەت تۆ بەرلەوەی لە شەقام بپەڕیتەوە چەند جارێك سەیری لای ڕاست و چەپت دەکەی و لە خەمی ژیانتدای.

بەڵگەکەم کاری تێکرد و گوتی: لەوانەیە شتێکی لەو جۆرە بوونی هەبێت کە تۆ باسی دەکەی، ئەوکات خوداکەت سزام دەدات، چونکە ئەو وەك بەندە مامەڵە لەگەڵ ئێمەدا دەکات.

پێمگوت: لە کۆتاییدا گەیشتی بە حەقیقەت، چونکە پەیوەندی خودا بە ئێمەوە پەیوەندی نێوان گەورە و بەندەیە، ئەوە ئەو شتەیە کە هەمیشە بە بیانووی هاوتاکردنی سیفات و کردارەکانی خودا بە مرۆڤ خۆتی لێدەدزیەوە، هەروەها دادگەری لەوەدایە کە خودا لەگەڵ بەخشندەیی و میهرەبانیدا بەهێز و تۆڵەسێن و ملکەچکاریش بێت، ئیسلام ئەو تێگەیشتنە پەیڕەو دەکات و بەهێزی و جوانی لەگەڵ یەکدا کۆدەکاتەوەو بەتەنیا بەوە وازناهێنێت کە وەك مەسیحییەت بڵێت (خودا خۆشەویستییە) یان وەك ئایینی جولەکە بڵێت (خودا تووڕەیە)، خودا وەك

هەموو ناوە پیرۆزەکانییەتی، بە بەهێزەکان و جوانەکانەوە، هەر کەسێکیش ئەوە نەزانێت ئەوا ناسینی بۆ خودا تەواو نییە.

هەروەها هەندێکی تر سکاڵای ئەوەیان دەکرد کە خودا لەسەر هەڵبژاردنەکانمان لێپێچینەوەمان لەگەڵدا دەکات، لەکاتێکدا کە ئەو خۆی هەندێك شتی بەسەردا سەپاندووین، وەك خێزان و وڵات و نەخۆشی و زۆر ڕووداو کە لە ژیانماندا ڕوودەدەن. بەو جۆرە کەسانەم گوت: خودا لەسەر ئەو شتانە لێپێچینەوەمان لەگەڵدا ناکات، چونکە لێپێچینەوە تەنیا لەسەر ئەو شتانەیە کە بواری هەڵبژاردنی تێدا هەیە، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئازادی مرۆڤ سنووردارە نەك ڕەها، چونکە ئازادی ویست بەپێی توانایە، هەر لەبەر ئەوە هەرچەند مرۆڤ لە پلیکانەی فەرمانبەرێتیدا زیاتر سەربکەوێت ئازادی زیاتر دەبێت، وانییە؟!

بێباوەڕان باوەڕداران بەوە تۆمەتبار دەکەن کە جەبرین، چونکە باوەڕیان بەوە هەیە خودا هەموو ئەو ڕووداوانەی کە تا ڕۆژی قیامەت ڕوودەدەن لە (اللوح المحفوظ)دا تۆمار کردووە و ئێمە ناچارکراوین شوێنی ئەوە بکەوین کە تۆماری کردووە، بێباوەڕان وایدەبینن ئەم جەبری و ناچارییە ستەمێکی ڕوون و ئاشکرایە، پێمگوتن: (زانستی خودایی) کە کات سنوورداری ناکات دەرخەری ئەوەیە کە ڕوودەدات نەك ناچارکەر بێت. با ئەوە بە نموونەیەك ڕوون بکەینەوە: بێنە بەر چاوت مرۆڤێك ئامێری کاتی داهێنا، سەد ساڵ کاتەکەی پێش خست، بینی کە نەوەکانی لە ئاییندەدا چی دەکەن، پاشان گەڕایەوە بۆ کاتی ڕاستەقینەی خۆی و ئەو شتانەی بینیبووی نووسییەوە، ئایا ئەوەی ئەو پیاوە نووسیویەتەوە ناچارکەرە بۆ ئەو ڕووداوانەی ڕوودەدەن؟! زانستی خودایی دەرخەر بەم جۆرەیە، ئەوەش لەگەڵ ویستی خودادا تێکناگیرێت، چونکە خودا خۆی ویستوویەتی ئێمە ویست و ئیرادەمان هەبێت.

## ٥- بێباوەڕی خودای بێ توانا :

گەنجە بێباوەڕەکە، کە زەردەخەنەیەکی پیسی لەسەر روو دیاربوو پێیگوتم: ئایا خوداکەت دەتوانێت خودایەکی لەخۆی گەورەتر و بەهێزتر درووست بکات؟ ئایا دەتوانێت بەردێکی وا گەورە دروست بکات کە خۆی نەتوانێت هەڵیبگرێت؟

خاوەن زەردەخەنە پیسەکە وایزانی کە خستوومیەتە تەنگ و چەڵەمەوە؛ چونکە ئەگەر بڵێم خودا دەتوانێت، ئەوا بەو کارەم ئەوە لە خودا نەرێ دەکەم کە گەورەترین و بەهێزترینە، ئەگەر لە دەرەنجامەکەش رابکەم و بڵێم نەخێر ناتوانێت، ئەوا دەڵێم کە خودا بێتوانایە، حاشای خودا.

بە گەنجەکەم گوت، هەر یەك لە دوو پرسیارەکەت تێکگیرانێکی بەدیهییان تێدا هەیە، پاشان خۆیان خۆیان هەڵدەوەشێننەوە و ناکرێ بە هیچ جۆرێك بخرێنەڕوو.

هەروەها گوتم: تۆ داوای شتێك دەکەی کە لە رووی عەقڵییەوە مەحاڵە، وەك ئەوە وایە بازنەیەکی چوارگۆشە دروست بکەی! چۆن داوا دەکەی کە خودا خودایەك درووست بکات (گەورەتر بێت یان بەهێزتر یان بچوکتر یان بێهێزتر)، لە کاتێکدا پێویستە خودا درووستکراو نەبێت؟! هەروەها چۆن داوا دەکەی کە بەردێك درووست بکات کە نەتوانێت هەڵیبگرێت، لەکاتێکدا هەموو درووستکراوێك سیفاتەکانی لە درووستکەرەکەی وەردەگرێت، لەرووی بەدیهییەوە ناکرێت لق یان بەش لە بنچینە و هەموو گەورەتر بێت. دوو پرسیارەکەت لەرووی عەقڵییەوە مەحاڵن.

زەردەخەنە پیسەکە نەما و رەنگی رووی گۆڕا.

## ٦- بێباوەڕی خودای فێڵباز :

بێباوەڕەکە گوتی: ئێوە بانگەشە بۆ ئەوە دەکەن کە ئیسلام ئایینی حەقە، چۆن خودا پێغەمبەران بە ئایینێکی خراپەوە بۆ گەلان رەوانە دەکات؟ بۆچی خودا تەنیا جەختی کردۆتە سەر ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و گەلانی تری بە تەواوەتی لە ئایینەکان بێبەش کردووە[1]؟ دوای ئەوە خوداکەتان لێپێچینەوە لەگەڵ مرۆڤەکاندا دەکات و گەلانێك دەخاتە ناو ئاگرەوە کە هیچ تاوانێکیان نییە، بەڕاستی خوداکەتان ستەمکار و فێڵبازە.

ئەوانە لە بەدیهییاتەکانی ئایین بێئاگان، چونکە هەموو پەیامە ئاسمانییەکان ئیسلامن، ئایینی حەق و ئایینی باتڵیان تێدا نییە، شوێنکەوتووانی کۆتا پەیام ئەرکی ئەوەیان لەسەرە کە نیشانی خاوەن پەیامەکانی پێشووی بدەن کە چ گۆڕانکارییەك بەسەر پەیامەکانیاندا هاتووە و چۆن شێوێندراون.

هەروەها خودا هیچ گەلێکی لەوە بەدەر نەکردووە کە پەیامی بۆ نەناردبێت:

﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ ... ﴾ النحل: ٣٦.

واتە: (بۆ هەموو گەلێك پێغەمبەرمان ناردووە تا ئاگاداریان بکاتەوە کە خودا بپەرستن و خۆتان لە هەر پەرستراوێکی تر بەدوور بگرن). تەنانەت خودا ئەو گەلانە سزا نادات کە پەیامیان پێنەگەیشتووە:

﴿ ...وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ﴾ الإسراء: ١٥.

واتە:(ئێمە سزا بۆ هیچ گەلێك نانێرین تا لەپێشدا پێغەمبەرێکی بۆ نەنێرین).

لە ڕاستیدا خوا فێڵباز نییە، بەڵکو ئەوە بێباوەڕانن کە فێڵ لە خۆیان دەکەن.

---

(١) هەندێك لە بێباوەڕان بەوە دەڵێن (خراپی دابەشکردنی ئاینەکان)!

### ٧- بێباوەڕی خودای ستەمكاری بێ بەزەیی[1]:

بێباوەڕی سۆفستائیی بە بانگەشەی ستەمكاری خودا دەگاتە لوتكە، هەندێكیان دەڵێن: چۆن خودا بەخشندە و میهرەبانەكەتان مرۆڤێكی تاوانبار، لەسەر چەند تاوانێك كە لەو ژیانە كورتەدا ئەنجامی داوە(ئەگەر زۆریش بن) سزایەكی هەتا هەتایی بۆ دەبڕێتەوە كە مرۆڤ بەرگەی ناگرێت؟!

بەو كەسە نارازییەم گوت: ئەی بۆچی بەو بەهەشتە سەرسام نەبووی كە لە بەرامبەر چەند پەرستشێكی كەم پێت دەبەخشرێت و تاهەتایە تێیدا دەمێنیتەوە؟! بەڵگەكەی تۆ لەكاتێكدا نرخی دەبێت كە گەورەیی سزا لەبەرامبەریدا بەهۆی پەرستنەوە تەنیا رزگاربوون بێت لەو سزایە، بەڵام لە بەرامبەر گەورەیی سزا گەورەیی پاداشتیش هەیە، خودا تەنیا بەوە وازی نەهێناوە، بەڵكو رێگای بەهەشتی پێ نیشانداویت و بەڵێنی داوە لەكاتی تەوبەدا تاوانەكانیشت بۆ بگۆڕێت بە چاكە، هەروەها گوتم: مرۆڤ ئەگەر قسە بە سەگێك بڵێت كە بێزاری كردووە ئاساییە، بەڵام بڕوات لەسەرئەوە سووكایەتی بە دایك و باوكی بكات ئەوا بۆ ئەو كارەی هیچ پاساوێكی نییە، مەبەستم لەوەیە كە سەیری گەورەیی تاوان مەكە، بەڵكو سەیری ئەوە بكە كە تاوانەكە بەرامبەر بە كێ ئەنجامدراوە.

گەنجە بێباوەڕەكە وەڵامی دامەوە و گوتی: وشەی سزا و داتاشراوەكانی نزیكەی چوارسەد جار لە قورئانەكەتاندا دووبارە بۆتەوە، لەوانەیە لە هەر وشەیەكی تر زیاتر دووبارە بوویێتەوە، ئایا ئەوە بەڵگە نییە لەسەر بێبەزەییەتی خودا؟ پێمگوت: تۆ شتەكان پێچەوانە دەكەیتەوە و بەزەیی دەكەیتە بێبەزەیی، ئایا پێویست نەبوو كە بڵێیت خودا چوارسەد جار ئاگاداری كردوونەتەوە، لە هەر

---

(١) گیروگرفتی خراپە و ئازار بە یەكێك لە نموونەكانی بێباوەڕیی خودای ستەمكار و بێ بەزەیی دادەنرێت و، پێگەیەكی ئەوەرەیی هەیە لە هزری بێباوەڕیدا (بەتایبەتی بێباوەڕیی رۆژئاوایی)، بۆیە بە تایبەتی لە تەوەرەی چواردەیەمدا دەیتوێژینەوە.

جارێکدا ڕێگای ڕزگاربوونی بۆ وەسف کردووین؟ بۆ ئەو قسەیەشم نموونەیەکم هێنایەوە: رات چییە بەرامبەر بە دایکێك کە منداڵەکانی ئاگادار دەکاتەوە، بەوەی هەرکات - کە لە ماڵ چوونە دەرەوە - لەکاتی پەڕینەوە لە شەقامدا هۆشیار بن؟ ئایا ئەو دایکە بەوە وەسف دەکەی کە بێ بەزەییە لەبەرئەوەی منداڵەکانی ئاگادار کردۆتەوە و ئەو ئاگادارییەی وا لە منداڵەکانی دەکات کە ئەگەری ڕووداوێك لە مێشکیاندا دابێن و ئاگادار بن؟! یاخود ئەو ڕەفتارەی دایکەکە تەواوی خۆشەویستی و بەزەییە؟

پاشان گوتم: ئایا تۆ ئەوە لە خودا چاوەڕوان دەکەی دەست لە پشتی شیوعییەکانی وەك (ستالین و مارتسی تۆنگ و...)بدات، کە نزیکەی ٩٤ ملیۆن کەسیان کوشتووە لەپێناو بڵاوکردنەوەی مەزهەبە بێباوەڕییە خراپەکەیاندا؟!

ئایا چاوەڕێی ئەوەی کە خودا پاساو بۆ هیتلەر بێنێتەوە کە نزیکەی ٣٠ ملیۆن کەسی کوشت لەبەر ئەوەی ژیانی کورت بووە؟!

گەنجەکە لەسەر کەللەڕەقییەکەی پێداگر بوو و گوتی: چۆن خوداکەتان داوا لە پێغەمبەرەکەی ئیبراهیم دەکات کە کوڕەکەی سەر ببڕێت، ئەوە چ بێ بەزەییەکە کە داوا لە باوکێکی بەساڵاچوو بکەیت کە تاقە کوڕەکەی کە لە پیریدا پێیبەخشراوە سەر ببڕێت؟ پێمگوت: ئایا تۆ شتێکی وات لێ داواکراوە؟ بە نەخێر وەڵامی دایەوە. گوتم: ئایا جگە لە ئیبراهیم ئەو داواکارییە لە هیچ کەسێکی تر کراوە؟ گوتی نەخێر. پاشان هەڵوێستەکەم شیکردەوە: ئیبراهیم گوتی هیچ شتێك یاخود هیچ کەسێك لە دڵی ئەودا لە خودا خۆشەویستتر نییە، بۆیە شتێکی سروشتی بوو لەسەر ئەو قسە گەورەیەی بەو داواکارییە قورسە تاقی بکرێتەوە، بۆیە لەبەر پەیوەستی ئیبراهیم بە کوڕەکەیەوە داواکارییەکە تاقیکردنەوەی بوو بە سەربڕینی کوڕەکەی، هەروەها خودا ڕێگای بەوە نەدەدا کە ئیبراهیم منداڵەکەی بکوژێت، بەڵکو لە پاداشتی ئەوەدا خودا ئیبراهیمی کردە خەلیل و خۆشەویستی خۆی و ئەو هەڵوێستەی کرد بە جەژنێك کە تا ڕۆژی قیامەت مرۆڤایەتی یادی دەکەنەوە.

هەروەها گوتم: دوای هەموو ئەوەش، بێبەزەیی خودا و ستەمکارییەکەی بەڵگە نییە لە دژی بوونی، بەڵکو دەکرێ بەڵگە بێت لە دژی بەزەییەکەی، کەواتە ئەوە بەڵگە نییە بۆ بێباوەڕیی، حاشای خودا کە ستەمکار یان بێبەزەیی بێت، بەڵکو ئەو بەخشندە و میهرەبانە، بەڵام بەخشندەیی و میهرەبانی ڕەهای خوداییی، نەک میهرەبانی بێهێزی مرۆیی، بۆیە نابێت بە پێوانەکانمان بیانپێوین.

## ٨- بێباوەڕیی فورسی و گەمژێتی :

گەنجەکە پێیگوتم: چۆن خودا ئارەزووم پێدەبەخشێت و پاشان داوام لێدەکات بەکاریان نەهێنم؟ هەروەها چۆن داوام لێدەکات پارەکەم بە زەکات بە فیڕۆ بدەم، کات و توانام لە نوێژدا خەرج بکەم، هەردووکیشیان بە ناوی حەج و عومرە بلۆرێنم؟

پێمگوت: مرۆڤ ئاژەڵ نییە، کە تەنیا ئارەزووەکان بیجوولێنن، ئەوەی لە مرۆڤ داواکراوە بریتییە لە ئاڕاستەکردنی ئەو ئارەزووانە و ڕێنموونیکردنیان، لە هەمان کاتدا ئەوە بەرزبوونەوەی دەروون و ڕۆحە.

بێباوەڕان کە دەیانەوێت ئارەزووەکانیان بەرەڵا بکەن لەو منداڵە دەچن کە تەنیا دەیەوێت یاری بکات،بەڵام باوکەکەی ناچاری دەکات هەندێك کات بۆ خوێندن تەرخان بکات، چونکە ئەوە لە ئاییندەدا سوودی دەبێت.

هەروەها ئەگەر ماددیگەراکان ئەوە ڕەتدەکەنەوە کە هەندێك پارە و کات لەپێناو خودا خەرج بکەن و ئەوە بە گەمژێتی دادەنێن، ئەی بۆچی هەندێکیان وەك پەیڕەویکردن لە ڕێساکانی شیوعییەت بڕە پارەیەکی زۆر لەپێناو کۆمەڵگادا خەرج دەکەن؟!

### ٩- بێباوەڕی وێنانەکردن:

گەنجێکی بێباوەڕ پێیگوتم: من ناتوانم وێنای خودایەك بکەم کە بەدیهێنەری نەبێت، یان بوونێکی ئەزەلی و ئەبەدی، یاخود بوونێك کە لە هەموو کات و شوێنێك بوونی هەبێت، هەروەها ناتوانم وێنای ئەوە بکەم مرۆڤ ئیرادەی هەبێت لە کاتێکدا کە ئیرادەی خودا رەهایە..پاشان گوتی: چۆن داوام لێدەکەی باوەڕم بە خودایەك هەبێت کە من ناتوانم وێنای شێوەی یاخود وێنەی کردارەکانی بکەم.

لێرەشدا ئەوە دووبارە دەکەینەوە بنچینەی کێشەکە لە پرسی بێباوەڕیدا بریتییە لەوەی کە زانست و کرداری رەهای خودایی بە تەرازووی زانست و کرداری سنوورداری مرۆڤ بپێوین. تا لێرەدا بێتوانایی لە وێناکردن درووست دەبێت و ئەمەش دەبێتە هۆی نکۆڵیکردن.

### ١٠- بێباوەڕی پارێزەری شکستخواردوو:

شێخ محمد الغزالی لە قسەیەکیدا کە تیایدا دەستی خستۆتە سەر برینەکان دەڵێت: لە ڕاستیدا ئیسلام پرسێکی حەقە، بەڵام پارێزەرەکەی کەمتەرخەم و بێهیواکەرە..زۆربەی ئەو گەنجە بێباوەڕانەی گفتوگۆم لەگەڵدا کردوون زۆر بە توندی ڕەخنەیان لە گوتاری ئایینی هەیە، بەتایبەتی لە دوای شۆڕشەکانی بەهاری عەرەبی، هەروەها ڕەخنەیان لە ڕۆڵی تەوژمی ئیسلامی سیاسیش هەیە، لە هەنگاوی دواتریشدا هەموو ئەو هەڵانە خرانە ئەستۆی ئیسلامەوە.

هەڵەیەکی مەعریفییە ئەگەر کەموکوڕییەکان بگشتێنم، ئەنگییەکانی جێبەجێکردن بخەمە ئەستۆی هەموو دامەزراوەکە..ئەمە هاوشێوەی نەخۆشێکە کە لەدوای نەشتەرگەرییەك کاریگەری لاوەکی لە جەستەدا پەیدابووە، ئیتر

نەك هەر گومانی لە توانای پزیشکەکان پەیدابووە، بەڵکو گومانی لە سوودی پزیشکی و نەشتەرگەریش دروستبووە.

## ١١- بێباوەڕی نەپێکانی ئامانج:

پێیگوتم: ئایا ئامانجی ئایینەکان هاندانی مرۆڤ بۆ ئاوەدانکردنەوەی زەوی نییە، هاندانیان بۆ ئەوەی لەنێوان خۆیاندا بە ڕەوشتێکی باش ڕەفتار بکەن؟ هەروەها گوتی: ئێمە دەبینین گەلانێك كە بێباوەڕن کەچی بە باشترین شێوە پەیڕەوی لەم دوو ئامانجە دەکەن، هەروەك چۆن زۆر تاکی بێباوەڕ هەن لەم دوو ئامانجەدا زۆر لە دیندارەکان پەیوەستترن، ئیتر چ پێویستییەکمان بە ئایین هەیە؟ هەروەها چۆن کەڵەپیاوانێك كە خزمەتی گەورەیان پێشکەش بە مرۆڤایەتی کردووە وەك نیوتن و ڤۆڵتا و ماکسوێل و ئەنیشتاین دەچنە دۆزەخ؟[1]

پێمگوت: ئەو بانگەشەیە یەکێکە لە گەورەترین هەڵەکان و لە هەمرو هەڵەیەك دەربارەی ڕۆڵی ئایین باوترن، لە ڕاستیدا ئاوەدانکردنەوەی زەوی و ڕەوشتی باش ئامانجی ئایین نین، بەڵکو لە ڕاستیدا دوو ئامرازن! چونکە ئامانجی ئایین بە پلەی یەکەم ئەوەیە كە پەروەردگاری بە مرۆڤ بناسێنێت، پاشان سەرچاوەکەی و سەرەنجامەکەی و، سەرەنجامی باشیش بەدەستنایەت مەگەر بە بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خودا نەبێت..ڕێگای ئەوەش بریتییە لە ئاوەدانکردنەوەی زەوی و ڕەوشتی باش، بە مەرجێك کردەوەکانی بەندە بە مەبەستی بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خودا بێت..بەڵام ئەگەر ئەو ئامانجە لەبەرچاو نەگرین، ئەوا کردەوەکانمان-هەرچەند باش بن- ئەوا دوورە بتوانن ئەو سەرەنجامە بەدیبێنن، پێویستە مرۆڤ داوای پاداشت لەو کەسانە بکات كە کاری لەپێناودا کردوون.

هەروەها گوتم: ئەوەی كە باسم کرد ڕۆڵی سەرەکی ئایینە، بەڵام ئەگەر پرسیارم لێبکەی دەربارەی کەسانێکی دیاریکراو ئاخۆ ئەهلی بەهەشتن یان

---

(١) ئەو چوار گەورە زانایەی كە بێباوەڕەکە بە نموونە هێنانیەوە باوەڕێکی قووڵیان بە خودا هەبووە!!

دۆزەخ؟ لە وەڵامدا پێت دەڵێم کە کلیلی بەهەشت بەدەست بەدەست من یان بەدەست هیچ مرۆڤێکی تر نییە، هەموو شتێك بەدەست خودایە.

## ١٢- بێباوەڕیی بەرجەستە:

لەو دیبەیتەدا کە لە کەناڵە ئاسمانییەکاندا پەخش کرا پێیگوتم: لە ڕاستیدا پرسی بوونی خودا پرسێکی زۆر گرنگە، بۆیە پێویستە بەڵگەکانی هاوشێوەی پرسەکە گرنگ و بەهێز بن، لەبەر ئەوە پێویستە بەڵگەکە بەڵگەی بەرجەستە و تاقیگەیی بن، تەنانەت من ئەگەر لە ڕێگا بە خودا بگەم و تەوقەم لەگەڵدا بکات هێشتا بەس نییە! لەسەر خودا پێویستە بۆم بسەلمێنێت کە ئەو ڕۆزی بەخش و ژێنەر و...هتد، چۆن داوام لێدەکات باوەڕ بە شتێك بێنم کە نەمدیوە؟

پێمگوت: ئەو قسانەت پڕن لە هەڵەی زانستی، چونکە بەڵگەی بەرجەستە کە تۆ داوای دەکەی بێهێزترین جۆری بەڵگەیە! چونکە هەستەکان مرۆڤ دەخەڵەتێنن و بە هەڵەیدا دەبەن، ئەوە نییە ئێمە پەلکە زێڕینە و تراویلکە(سەراب) دەبینین کەچی لە بنەڕەتدا بوونیان نییە! لە هەمان کاتدا ئێمە ناتوانین زۆر شت ببینین کە زانست بوونیانی سەلماندووە، وەك هێزی کێشکردن و کونە ڕەشەکان.. هەرچی بەڵگەی تاقیگەییە ئەوا تەنیا لە زانستە تاقیگەییەکانی وەك فیزیا و کیمیا بەکاردێن، کاتێك تۆ لە پرسی خوایەتیدا داوایان دەکەی ئەوا داوای شتێك دەکەی کە لە جێگای خۆیدا نییە، وەك ئەوە وایە کەسێك بیەوێت بە گوێچکەکانی ببینێت![1] لەبەرئەوە بەهێزترین بەڵگەکانی پرسی خوایەتی بریتین لە بەڵگە بیرکاری و عەقڵییەکان.

بەڵام تۆ کە بە خودا بگەیت و لە بەردەمتدا مردوو زیندوو بکاتەوە و بڵێی ئەوە بەڵگە نییە لەسەر خوایەتی، ئەوا زانست لە ئاییندەدا ئەوە دەسەلمێنێت کە ئەمە شتێکی مەحاڵ نییە و دەکرێ ڕوویدات! پێشتر کەسانی هاوشێوەی ئێوە

---

(١) جۆرەکانی بەڵگە زانستییەکان و ئەندازەی بەهێزییانمان لە تەوەرەی دووەمدا خستۆتەڕوو.

ئەو قسانەیان بە پێغەمبەرەکانیان گوتووە، کاتێك موعجیزەی خوداییان نیشانداون گوتوویانە ئەوە سیحر و جادووە و پێغەمبەران سیحرباز و جادووگەرن..ئەو زانستەی پێی دەڵێن زانستی ئایینە، ئەوەیە کە پێی دەڵێن خودای پڕکردنەوەی بۆشاییەکان، کە هەرکات بێباوەڕان رووبەڕووی بەڵگەیەك بوونەوە لەسەر خوایەتی کە ناتوانن وەڵامی بدەنەوە دەڵێن لە ئاییندەدا زانست ئەوە وەڵام دەداتەوە!!

## ١٣- بێباوەڕی ئارەزووبازی [١]:

زۆرێك لە گەنجانمان دەچنە وڵاتانی رۆژئاوا و وڵاتانی شیوعییەتی (پێشوو)، ئامانجیان ژیانێکی پڕ لە پەیوەندی سێکسییە لە دەرەوەی بازنەی هاوسەرگیری و بەناوی هاوڕێیەتی و خۆشەویستییەوە.

ئەو جۆرەی ژیان لەڕێی دەزگاکانی راگەیاندن و کەشی ئازادەوە دێتە ناو ماڵەکانمانەوە، هەروەك چۆن پێگە و سایتەکانی بەدڕەوشتی ئەندازەیەکی زۆر لە شتی وروژێنەر نیشانی گەنجەکانمان دەدەن.

لە دەرەنجامی ئەوەش، هەندێك لە گەنجەکانمان تینووی ئەو جۆرە ژیانەن، پەروەردەی ئایینیش بۆتە بەربەستێکی رەوشتی و بارێکی قورسی دەروونی کە ماندوویان دەکات، لە ئەنجامدا هەندێکیان پەنا دەبەنە بەر لادانی رۆڵی دامەزراوەی خودا و ئایین لە ژیانیان و نکۆڵی لێدەکەن.

هەر لەبەر ئەوەیە ئەم جۆرەی بێباوەڕیی لە جیهانی رۆژئاوادا بوونی نییە، چونکە گەنجەکانیان کێشەی ئەوەیان نییە لە یەك کاتدا دیندار بن و ژیانێکی ئازاد بژین!

---

(١) شێخ عبدالحلیم محمود، شێخی پێشوی مزگەوتی ئەزهەر، ناوی بێباوەڕیی سك و داوێن لەو جۆر بێباوەڕییە دەنێت.

## ١٤- بێباوەڕی گرێی کەموکوڕی:

هەر لە دوای زنجیرەی یەکەم لە دیبەیتەکەم لەگەڵ بێباوەڕەکەدا کە لە کەناڵە ئاسمانییەکان پەخش دەکرا، هاوڕێیەك پەیوەندی پێوە کردم و پێیگوتم کوڕەکەی کە پێشتر بێباوەڕ بووبوو داوای لێکردووە کە نوێژی عەسری لەگەڵدا بکات، کاتێك دەربارەی نهێنی ڕاستکردنەوەی هەڵوێستەکەی پرسیارم لێکرد، کە هێشتا دیبەیتەکە لە سەرەتایدایە، کوڕەکە گوتی: کاتێك ئێمە لە ئینتەرنێتدا ئەو بێباوەڕە و بێباوەڕانی ترمان دەبینی کە قسەیان بۆ ئێمە دەکرد وایان لێدەکردین هەست بەوە بکەین کە ئەوان زانا و دانان و قۆرخی عەقڵ و زانستیان کردووە، ئایین و پیاوانی ئایین لەڕووی زانستییەوە دواکەوتوون و لەڕووی عەقڵییەوە بێتوانان و جگە لەوەی کە لە کلتووردا هاتووە ناتوانن هیچی تر بڵێن، بەمەش کەوتوونەتە دەرەوەی کات و ژیارستانیەتەوە..هەروەها گەنجەکە گوتی، بەڵام کاتێك بەشی یەکەمی دیبەیتەکەم بینی و سەرنجی بەڵگە زانستی و فەلسەفییەکانی (د. عەمر)م داو، بێ توانایی بێباوەڕەکەم بینی کە ناتوانێت وەڵامی بداتەوە، بۆم دەرکەوت ئەوانە لە بنەڕەتدا چەندە قەزەم و فێڵبازن، بۆم دەرکەوت کە ئایین چەند گەورەیە و ئەگەر بەجوانی بەڵگەکانی بخرێنەڕوو ناتوانرێت وەڵامی بدرێتەوە و وەلا بنرێت.

## ١٥- بێباوەڕی پەیمان شکاندن:

پێیگوتم: ئێوە بانگەشەی ئەوە دەکەن خوداکەتان لەڕۆژی گەردیلەدا پەیمانی لێوەرگرتووین بیپەرستین، بەڵام نە من نە تۆ نە هیچ مرۆڤێك ئەو پەیمانەیان لە یاد نییە، ئیتر چۆن خودا ئەو پەیمانە کە لێگەڕاوە لەبیری بکەین دەکاتە بەڵگە لەسەرمان و ئەگەر بیشکێنین دەمانخاتە ئاگرەوە؟

پێمگوت: ئەگەر سیناریۆکە بەو شێوەیە بوایە کە تۆ دەیڵێی ئەوا بەڵگەکەتم قەبوڵ دەکرد، بەڵام بابەتەکە بەو شێوەیە نییە.

ئێمە وانەکەمان وەرگرتووە ئەگەرچی هەڵوێستەکەشمان بیرچوویێتەوە، چونکە پەیمانەکە هێشتا لە دەروونی هەر یەکێکماندا بوونی هەیە، لە فیترەتی ساغ و بێ خەوشدا خۆی دەنوێنێت، کە دەرك بە بوونی خودا دەکات، هەروەها خودا بەڵگەی خوایەتی لە گەردوون و دەروونەکانیشدا داناوە، پەیامە ئاسمانییەکانی ناردووە تا هانی عەقڵ بدەن کە بیر لەو بەڵگانە بکاتەوە، ئەو پەیمانە بیری مرۆڤ بخەنەوە کە لەبیری کردووە و لە فیترەتیدا پووکاوەتەوە، هەر لەبەر ئەوەیە قورئانی پیرۆز پڕە لە بانگەوازکردن بۆ یادخستنەوە و بیرهێنانەوە، تەنانەت پێغەمبەری ئازیز وەك یادخەرەوە نێردراوە:

﴿ فَذَكِّرْ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٌ ﴿٢١﴾ ﴾ الغاشیە: ٢١.

واتە: (بیریان بخەرەوە، تۆ بیرخەرەوەیانیت).

## ١٦- بێباوەڕی سادەیە:

گەنجە بێباوەڕەکە پێیگوتم: ئێوەی دیندار بە چاوێکی زۆر ئاڵۆز سەیری مرۆڤ دەکەن، ئێوە مرۆڤتان خستۆتە ڕیزەوی غەیبی وەهاوە تا گەیاندووتانە ئەو ئاستەی لەگەڵ خودایەکی غەیبیدا پەیوەندی بەستبێت! لەکاتێکدا کە مرۆڤ وەك ئاژەڵانی تر بوونەوەرێکی سادەیە! کار دەکات و بەرهەم دێنێت و بەکاردەهێنێت و چێژ وەردەگرێت و...هتد.

بە گەنجەکەم گوت: ئەو شێوازەی دید و بۆچوونەی وەك تۆ هۆکاری کارەساتی مرۆڤی سەردەمی ژیارستانیەتی هاوچەرخە، د.عبدالوهاب المسیری باسی لەو کارەساتە کردووە، کاتێك دەڵێت: ژیارستانیەتی نوێ -لەدیدی مندا- ژیارستانیەتێکی عەقڵانیی ماددییە(نەك تەنیا عەقڵانیی)، چونکە دەستکەوتە

گەورەکانی (تەکنۆلۆجیا - زانست - هەژموونی بەسەر جیهاندا) بەرهەمی دیدە ماددییەکەیەتی، کە پێویستی بە دوورخستنەوەی زۆر ڕەگەزی ڕەوشتیی و مرۆیی (ڕەگەزی نامادددی)هەیە، ئەمەش بۆ سادەکردنەوەی واقیع بە ئامانجی کۆنترۆڵکردنی (بەوپێیەی شتی سادە نەبێت کۆنترۆڵ ناکرێت).

گومانیش لەوەدا نییە مرۆڤ قوربانی یەکەمی ئەو سادەکردنەوەیە، چونکە دوای ئەوەی کە ڕەگەزە ڕەوشتی و مرۆڤایەتییە بەرزەکانی لێ داماڵران تەنیا لایەنە ماددییەکەی ماوەتەوە، بەمەش وایلێهاتووە ئاسایی بێت بدرێتە پاڵ سروشتی کوێرانەوە.

لە تەوەرەکانی کتێبەکەدا بێتوانایی سروشتمان لە بەدیهێنانی بوون و مرۆڤ سەلماندووە، هیچ ڕێگایەک نەماوەتەوە جگە لە دانانان بە بوونی خودای بەدیهێنەر کە بوون و بوونەوەری بەدیهێناوە.

## ١٧- بێباوەڕی خودایەکی تر:

هەندێك لە بێباوەڕان لە گاڵتەجاڕیدا ڕۆچوون، دەڵێن: من چوزانم کە ئەو خودایەی بانگەوازم دەکات بۆ پەرستنی بەدیهێنەر و ڕۆزیدەر و شیفابەخش و...هتد؟ بۆچی نابێت ئەوەی ئەو کارانە دەکات خودایەکی تر بێت یان چەند خودایەك بن؟ لەکاتێکدا (کە لە ناخمدا گاڵتەم بەو قسانە دەهات، بەڵام دەرم نەدەخست)، گوتم: ئەوکاتە ئەو خستنەڕووەی تۆ جێگای قەبوڵە کە لە شەقامدا بگەین بە خودایەك و بڵێت من بەدیهێنەر و ڕۆزیدەر و شیفابەخشم و... بێ ئەوەی بەڵگەیەکمان پێشکەش بکات داوامان لێبکات کە بیپەرستین، بەڵام بابەتەکە بەو شێوەیە نییە!

حەقیقەتی پرسەکە ئەوەیە کە ئێمە کردارەکانی بەدیهاتن و ڕۆزیبەخشین و شیفاهێنان و.. هتد بینیون و هەستمان پێکردووە و لەوە تێگەیشتووین کە پێویستە بکەرێکی گەورە و پاکیان هەبێت، پاشان ئایینە ئاسمانییەکانمان بۆ هاتوون و

ئەوەی کە بۆی ناردووین و گفتوگۆی لەگەڵدا کردووین خۆی دەناسێنێت و دەفەرموێت (من خودام )، هەموو ئەو کردارانەی داوەتە پاڵ خۆی، داوای لێکردووین بیپەرستین. واینابینی ئەگەر خودای تر بوونیان هەبوایە کە بەدیهێنەر و ڕۆزیدەر و شیفابەخش و...هتد بوایەن ئەوا لە بەرامبەر ئەو بانگەشەیدا بێدەنگ نەدەبوون و حەقیقەتەکەیان بۆ بوونەوەرەکانیان ڕوون دەکردەوە، تەنانەت لەگەڵ ئەو بانگەشەکارەدا پرسەکەیان یەکلایی دەکردەوە؟!

هەرچی پرسی چەند خوداییە، ئەوا ئەگەر لەلای هاوەڵدانەراندا لە کۆندا پێگەیەکی هەبووبێت، ئەوا زانست بە جۆرێك کە هیچ گومانێك ناهێڵێتەوە سەلماندوویەتی کە بەدیهێنەر یەکێکە و تاك و تەنیایە، ئەمەش دوای ئەوەی گەیشتین بەوەی کە یاساکانی سروشت یەکێکن،ماددەی خاو کە بوونی لێ پێکهاتووە یەکێکە، شێوازی بەدیهێنانیش هەر لە گەردیلەوە تا گەلەستێرە یەکێکە، ئەوە سەرەڕای ئەو بەڵگە فەلسەفی و عەقڵییانەی کە دەربارەی یەکخواپەرستی لە کتێبە ئاسمانییەکاندا هاتوون.

## ١٨- بێباوەڕیی گومانەکان:

زۆرێك لە بێباوەڕە لاوەکان بۆ هێرشکردنە سەر خوایەتی و ئایین پەنا دەبەنە بەر گومان خستنە سەر ڕاستگۆیی قورئانی پیرۆز و ئینجیلی کتێبی پیرۆزی مەسیحییەکان، نکۆڵی لەوە دەکەن لەلایەن خوداوە نێردرابن، ئەو گومانانەش لەدوای چەند خاڵێك دەخولێنەوە، گرنگترینیان:

• بیردۆزی پەرەسەندنی داروینی گرنگترین ئەو کۆڵەگانەیە کە بێباوەڕان پشتی پێدەبەستن، چونکە ئەوان وادەزانن کە ئەو بیردۆزە بۆمان دەسەلمێنێت کە پێویستیمان بە بوونی خودا نییە، هەروەك چۆن ئەوان وادەزانن کە ئەو بیردۆزە چەمکی بەدیهێنانی تایبەتی دەسەلمێنێت کە تەفسیرە کلتوورییەکانی قورئانی پیرۆز و سفری تەکوینی تەورات باسی دەکەن.

• ئەوان دەڵێن زۆرێك لە تەفسیرەکان باس لە ئایەتی شمشێر دەکەن لە قورئانی پیرۆزدا دەکەن، کە دەیان ئایەتی نەسخ کردۆتەوە کە باس لە ئازادی هەڵبژاردنی بیروباوەڕ، دەگەنە ئاستی کوشتنی ئەوانەی کە باوەڕیان بە ئیسلام نییە، ئەمەش ئیسلامی کردۆتە ئایینی ترس و تۆقاندن.

• ئەوان دەڵێن کتێبە ئاسمانییەکان ڕۆڵێکی گرنگ لە دامەزراوەی باوەڕ و مەعریفە و هەست دەدەن بە دڵ، لە کاتێکدا زانست ئەوە دڵنیا دەکاتەوە، کە دڵ تەنیا ترومپایەکە بۆ خوێن و هیچی تر.

• ئەوان دەڵێن کتێبە ئاسمانییەکان باسی چەند چەمکێك دەکەن کە زانست دانیان پێدا نانێت؛ وەك حەوت ئاسمانەکە، ئەوەی کە ئەیزەکەکان ڕەجمی شەیتانەکان دەکەن، خۆر لە کۆتایی ڕۆژدا بۆ ئەوە ون دەبێت تا لەژێر عەرشی خودا کرنوش ببات و...

• ئەوان دەڵێن کتێبە ئاسمانییەکان چەند ڕووداوێکیان تێدا هەیە کە هیچ بەڵگەیەکیان لەسەر نییە، وەك لافاوەکەی نوح و هاوەڵانی ئەشکەوت و قوتدانی یونس پێغەمبەر لەلایەن نەهەنگەوە و گەلی یەئجوج و مەئجوج و ئەو منداڵەی کە بەبێ باوك لەدایك بووە و...

• ئەوان دەڵێن کە کتێبە ئاسمانییەکان هەندێك ڕووداوی (وەك لافاوەکەی نوح و نەهەنگەکەی یونس)یان لە ئەفسانەکانی پێش خۆیان وەرگرتووە.

• ئەوان دەڵێن قورئانی پیرۆز چەند رەفتارێکی حەڵاڵ کردووە کە نابێت ئایینێکی ئاسمانی پەیڕەوییان لێ بکات، وەك کۆیلە و کەنیزەك و رەجم و بڕینی دەستی دز، هەروەك چۆن ژمارەیەکی زۆری هاوسەرگیری بۆ پێغەمبەرەکەی حەڵاڵ کردووە و لە شوێنکەوتووانی قەدەغە کردووە.

• ئەوان دەڵێن ژیانی پێغەمبەر پڕ بووە لە شەڕ و بردنی غەنیمەت، دوای ئەوەش هاوەڵانی پێغەمبەر بە زەبری شمشێر ئایینیان بڵاوکردۆتەوە.

بۆ وەڵامدانەوەی ئەو بانگەشانە، دەڵێین، لە ئێستادا ئایین پەیڕەوی لە چەمکی (پەرسەندنی بایۆلۆجی ئاراستەکراو) دەکات کە لەگەڵ ئایینیدا یەکانگیرە[1]. هەروەك چۆن زانست سەلماندوویەتی کە دڵ ڕۆڵی لە دامەزراوەی ئیمانی و مەعریفی و شعوریدا هەیە، ئەگەرچی ئەو بابەتە پێویستی بە لێکۆڵینەوەی زیاتر هەیە[2]. بە هەمان شێوە چیرۆکە هاوبەشەکانی نێوان کتێبە ئاسمانییەکان و ئەفسانەکان، دوای ئەوەی لە کتێبە ئاسمانییەکانی زۆربەی ژیارستانییەتەکاندا هاتوون وەك ئەفسانەیان لێهاتووە.

هەرچی بانگەشەی حەلاڵکردنی خوێنی کافرەکانە، ئەوا ئایەتی ١٩٠ی سورەتی البقرة وەڵامی دەداتەوە، کە باس لەوە دەکات پێویستە دوژمنایەتی بۆ ئەو کەسانە بێت کە شەڕ لەگەڵ مسوڵماناندا دەکەن:

﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ١٩٠ ﴾ البقرة: ١٩٠.

واتە:(شەڕ لەگەڵ ئەوانەدا بکەن کە شەڕتان لەگەڵدا دەکەن و دەستدرێژی مەکەنە سەرهیچ کەس،چونکە خودا دەستدرێژیکارانی خۆشناوێت).

هەرچی چەمکی ئاسمان (السماء)ە لە کتێبە پیرۆزەکاندا، ئەوا هاوواتای وشەی گەردوون (الکون)ە، ئەگەر وشەی (الکون) بخەینە شوێنی (السماء) ئەوا واتاکە لەگەڵ چەمکە زانستییەکان دێتەوە، بەڵام قورئانی پیرۆز ئەو وشەیەی بەکارهێناوە کە لەنێوان خەڵکی ئاسایی و زاناکاندا باوە، هەرچی حەوت ئاسمان و حەوت زەمینە ئەوا چەمکی غەیبین و پێویستیمان بەوە نییە بەدوای تەفسیرێکی زانستیدا بگەڕێین بۆ ڕوونکردنەوەیان.

هەروەها ژمارەیەك چەمك هەن پێویستە وەك چەمکی ڕەمزی سەیریان بکرێت، وەك کڕنوشبردنی خۆر لەژێر عەرشی خودا، کە بە واتای ئەوە دێت خۆر

---

(١) وردەکاری ئەوە لە تەوەرەی شەشەمی کتێبەکەدا، لەمیانی باس کردنی داروینیزمدا باس کراوە.

(٢) وردەکاری ئەو بابەتە لە تەوەرەی شەشەمدا هاتووە، لە میانی قسەکردنمان لەسەر داروینیزم.

دەچێتە ژێر باری یاسا و ڕێسا گەردوونییەکان، چەند چەمکێك هەن کە قورئانی پیرۆز خستوونیەتەڕوو و هێشتا نەگەیشتووینەتە واتایەك بۆ ڕەمزییەتەکەیان.

هەرچی ڕووداوە ناوەخۆییەکانن کە لە هەندێك ناوچەی زەمین ڕوویانداوە، وەك هاوەڵانی ئەشکەوت و یەئجوج و مەئجوج و هی تر، ئەوا ناساییە ئەگەر بەڵگەیەکی مێژووییان لەسەر نەبێت، چونکە یەکێکن لەو چیرۆکانەی کە بە گێڕانەوە هاتوون، قورئانی پیرۆز بۆمان دەگێڕێتەوە هەروەك چۆن ڕووداوێك بۆ ئەوەکانت دەگێڕیتەوە و ئەوانیش داوای ئەوەت لێناکەن بەڵگەیەکی زانستییان بۆ بێنیتەوە.

هەرچی گومانەکانی ترن، وەك بڵاوبوونەوەی ئایین بە زەبری شمشێر و جەنگەکانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و کۆیلە و کەنیزەك و بڕینی دەستی دز و هاوسەرەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ئەوا زۆر کتێبی تایبەتمەند بە وەڵامدانەوەی گومانەکان درۆیی هەندێکیانیان سەلماندووە و حیکمەتی ئیسلامیان لە مامەڵەکردن لەگەڵ هەندێکی تریاندا ڕوون کردۆتەوە.

هەندێك کات جۆرێکی تایبەت لە بێباوەڕی گومانەکان بۆ گەنجەکانمان دەخرێتەڕوو، پێیان دەگوترێت پێویستە باوەڕیان بە خودا هەبێت چونکە خودا حەقە و بەڵگەی زانستی زۆری لەسەر هەیە، بەڵام قورئان نا؛ چونکە پڕە لە هەڵە..لەم جۆرەدا دان بە خودادا دەنرێت لەگەڵ نکۆڵیکردن لە ئیسلام. لەوانەیە هەنگاوی دواتر بریتی بێت لەوەی بڵێن با بەدوای ئایینی حەقدا بگەڕێین. دەکرێ ئەوە پێشەکییەك و ڕێخۆشکردنێك بێت بۆ بانگەواز بۆ پەیڕەویکردن لە مەسیحییەت.

ئەوانە باوترین جۆر و هۆکارەکانی نێو گەنجەکانمان بوون. هەمووشیان شیاوی وەڵامدانەوەی عەقڵانین. گومانیش لەوەدا نییە کە شەیتان و دەروونی فەرمانکار بە خراپە لە هەوڵدان بۆ دەستبەرداربوون لەو گوتارە عەقڵانییە و ئەو بەڵگە بەهێزەی هەیەتی دەدەن، هەروەك چۆن لە پێشکەشکردنی شێواز و بەڵگەی تر ناوەستن بۆ هەڵاتن لە دانان بە خوایەتی و ئایین.

**خوێنەری بەڕێز...**

لەم تەوەرەیەدا گوزەرمان کرد بە خستنەڕوونێکی کورتی بێباوەڕیی بە درێژایی مێژوو لە جیهانی ئیسلامیدا، لەوانەیە دەرکەت بەوە کردبێت -هەروەك باسمان کرد- کە ڕۆڵی چەمك و بەڵگە زانستییەکان تیایدا کەم بووە، بەپێچەوانەی ئەوەی لە بێباوەڕیی ڕۆژئاوادا بەدی دەکەین، لە بری ئەوە هۆکارە دەروونییەکان بە سەریدا زاڵە و زۆربەیان لە ویستی دەستبەرداربوون لە بەندوبارە ڕەوشتییەکان خۆیدەبینێتەوە کە ئایینە ئاسمانییەکان فەرزیان دەکەن، لەبەر ئەوە وا دەردەکەوێت کە من ڕاست بووم کاتێك ناوم لە بێباوەڕیی هاوچەرخی ناوچەکەمان نا (بێباوەڕیی سۆفستائی).

لە تەوەرەکەدا هەڵوەستەمان کرد لەگەڵ هزری ئیبن راوندی پاشان ئیسماعیل ئەدهەم پاشان عبدالله القصیمی، گەشتێك بوو بە مێژوو و جوگرافیادا، کە لە عێراقدا لە سەدەی نۆزدەهەمەوە درێژدەبێتەوە تا دەگاتە میسر لە سەرەتای سەدەی بیستەم، تا دەگاتە سعودییە لە کۆتایی ئەم سەدەیە..ئیتر ئەو گەشتە گەشتێك بوو لەگەڵ بەناوبانگترین سێ بێباوەڕ لە جیهانی ئیسلامیدا. هەروەها پێویستە باسی هزری بێباوەڕی لە ناوچەکەمان (چ لەڕووی مێژوویەوە یان لەڕووی ئەزموونی تایبەتیمان لە دەرەنجامی مامەڵەکردنمان لەگەڵ جۆرەکانی بێباوەڕیی سۆفستائی لەنێو لاوەکانمان) بە کۆمەڵێك وانە و ئامۆژگاری کۆتایی پێببێنین کە بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردنمان لەگەڵ شەپۆلی هەنووکەیی بێباوەڕیدا سوودێکی دەبێت:

١- ژینگەی بەخێوکردن و پەروەردە و فێرکردن ڕۆڵێکی گەورەیان لە ئاڕاستەی بێباوەڕیدا هەیە، ئەوە بە ڕوونی لە ژیان و گەورەبوونی شپرزەی ئیسماعیل ئەدهەمدا دەردەکەوێت لە نێوان دەمارگیری و ڕەقی و توندی ئایینی کە باوکی و ئامۆژنی بەسەریاندا دەسەپاند لەگەڵ شلگیری و گاڵتەجاری دوو

خوشکەکەی، ئەو زانیارییە بێباوەڕییانەی لە یەکێتی سۆڤییەتیشەوە فێریان بوو کارەکەیان تەواو کرد.

٢- بونیادی دەروونی مرۆڤ ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە ئاڕاستە بێباوەڕییەکاندا، چونکە ئەو سێ کەسایەتییەی باسمانکردن لەڕووی دەروونییەوە کەسانی هاوسەنگ نەبوون؛ ئەوەتا ئیسماعیل ئەدهەم لە تافی لاویدا خۆی دەکوژێت، چونکە ئارامی لە ژیاندا بەدەستنەهێناوە کە بەلای ئەوەوە هیچ واتایەکی نەبووە، ئەوەتا ئیبن راوندیش چۆن توندڕەو و هەڵپەرست بوو و هەر جارە و سواری شەپۆلێك دەبوو، لە کۆتاییشدا کەسایەتی القصیمی کە لە هەموو لایەکەوە خۆبەزلزانی لێدەچۆڕا.

٣- گەڕان بە دوای ناوبانگ و جیاوازی، بە کارکردن بە لۆژیکی(جیاواز بە؛ دەناسرێی)، هۆکارێکی هاوبەشی نێوان ئەو کەسانە بوو کە باسمانکردن.

٤- بێباوەڕیی لەسەر دوو هەڵەی گەورە دامەزراوە، کە پێویستە هەوڵێکی گەورە بدەین تا لە عەقڵ و دەروونی بێباوەڕاندا دەیانسڕینەوە، ئەوانیش بریتین لە:(باوەڕی ئایینی لە هەموو بارودۆخێکیدا کوێرە)و، (زانست گەردێکی باوەڕی تێدا نییە).

٥- لەسەر بانگخوازان پێویستە زانیاری تەواویان لەسەر هێڵە پانییەکانی فەلسەفە ماددییەکان و چۆنییەتی وەڵامدانەوەیان هەبێت، هەروەك چۆن پێویستە زانیارییان لەسەر چەمکە زانستییەکان و چۆنیەتی هەڵێنجانی بەڵگەکانی بوونی خودا لەو چەمکانەدا هەبێت، بینیمان چۆن بیری مارکسی و شۆڕشی زانستی بە دۆزینەوەکانییەوە لە پشت بێباوەڕبوونی د. ئیبراهیم ئەدهەمەوە بوون، ئەو هەنگاوە یەکێکە لە گرنگترین ئەو لایەنانەی ئێمە داوای دەکەین لە نوێکردنەوەی هزری ئایینی.

٦- پێویستە بە نەرم و نیانی و گفتوگۆ مامەڵە لەگەڵ گومانەکاندا بکرێت، نەك بە هەڵەشەیی، کە ئەو دوو هۆکارە لەپشت بێباوەڕبوونی (القصیمی)یەوە بوون.

٧- پێویستە ئازادی گفتوگۆ هەموو کۆمەڵگا بگرێتەوە، چونکە بۆچوونە دروستە راشکاوە ئازادەکان توانای هەڵتەکاندنی بەڵگەکانی بێباوەڕییان هەیە، ئەوە ئەو مەنهەجەیە کە خودا لە قورئانی پیرۆزدا رێنموونی کردووین:

﴿...قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿١١١﴾﴾ البقرة: ١١١.

واتە: (فەرموون بەڵگەکانتان بخەنەڕوو ئەگەر ڕاست دەکەن).

کەواتە (هزر بە هزر نەبێت وەڵام نادرێتەوە و بێدەنگ ناکرێت)، ئەوەیان گەورەترین ئەو وانەیەیە کە لە کتێبەکەماندا مەبەستمانە بیگەیەنین و فێری ببین...

## تەوەرەی سێزدەیەم

# ڕێگای بەرەو خوداچوون

((فەلسەفە بە سەرکەوتنێکی گەورە کاری سەرەکی خۆی بە کۆتا گەیاند، کاتێك گەیشتە تەفسیرکردنی بوون بە هەبوونی خودایەکی بەدیهێنەر، کە گەردوونی بەدیهێناوە و ئامادەی کردووە بۆ پێشوازیکردن لە بوونەوەرە عاقڵ و داناکە، کە مرۆڤە)) سێر ئەنتۆنی فلو.

((زانست هزری ئیسلامی تەواو بێ کەموکورتی دەربارەی خودا پێشکەش کردم)).
د.مستەفا مەحموود

ژیانی مرۆڤ بە ((گەشتێك بەناو زەمەن)) هەژمار دەکرێت، سەفەرکردن بۆ گەشت و سەیران یان خوێندن یان چارەسەر بە ((گەشت بەناو شوێن)) دادەنرێت، ئەو گەشتانەش لە ڕووی پاڵنەرو دەرەنجامەکانیانەوە جیاوازیان هەیە، ((گەشتکردن بەرەو خودا)) ئامانجی زۆربەی مرۆڤەکانە، چونکە بریتییە لە ئامانجی بوونی مرۆڤ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدۡحٗا فَمُلَٰقِيهِ ﴿٦﴾ ﴾ الانشقاق: ٦.

واتە: (تۆ ئەی ئادەمیزاد لەو ڕۆژەدا بە پەلە ئەڕۆی بۆ لای خوای خۆت و پێی ئەگەی).

هەروەها ئەم گەشتە گەشتی مەخلوقە بەرەو خالق، گەشتی بەدیهێنراوە بەرەو بەدیهێنەرەکەی، گەشتێکە لە جیهانی بینراوەوە بەرەو جیهانی غەیب، بەرەو مەلەکوت و جەبەرووت.

هەروەها گومانیش لەوەدا نیە کە قورئانی پیرۆز ڕێگای بەرەو خوداچوونی بۆ ڕووناک کردووینەتەوە و ڕێگایەکی ڕاستی بۆ دیاری کردووین، پێغەمبەری خوداش(صلی الله علیه وسلم) تا ڕێڕەوەکە تەواو بوو ژیانی دنیای جێنەهێشت:

﴿..ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ ..(٣)﴾ المائدة: ٣.

واتە: (ئەمڕۆ ئایینم بۆ تەواوکردن و ئایەتەکانم هەموو بۆ ناردن، ڕێوشوێنی ئایینی ئیسلامتان بۆ ڕوون بویەوە و نیعمەتی خۆم ڕژاند بەسەرتاندا).

سەرەڕای ئەوەی کە ڕێگا ڕاستەکەی بەرەو خوداچوون تەنیا یەك ڕێگایە، بەڵام ئەوەتا عاریفێك دەڵێت: (ڕێگاکانی بەرەو خوداچوون بە ئەندازەی ژمارەی بوونەوەرن)، هەر لەبەر ئەوەیە کە ڕێگای بەرەو خوداچوونیان بە ژمارەی نیوە تیرەکانی بازنە چواندووە، کە چەقەکەی بریتییە لە خودا و هەر مرۆڤێکیش بریتییە لە خاڵێك لەسەر چێوەی بازنەکە، بەمەش چەندین نیوە تیرەی بازنە بوونیان دەبێت(کە دەوروبەر بە ناوەند و چەقی بازنەکە دەگەیەنن) کە بە ئەندازەی ژمارەی مرۆڤەکان دەبێت؛ ئەها ئەوە مرۆڤێکە بیرکردنەوە لە ئایەتەکانی کتێبی نووسراوی خودا (قورئانی پیرۆز) لە خودای نزیك کردۆتەوە، ئەوەی تریان بیرکردنەوە لە کتێبی بینراوی خودا (گەردوون و دەروونەکان) لە خودای نزیك کردۆتەوە، سێیەمیان بە شوێنکەوتنی سوونەتی پێغەمبەری بەڕێز(صلی الله علیه وسلم)، چوارەمیان لەوانەیە لە زمانی عەرەبیش تێنەگات، بەڵام دڵی بە ئاوازی قورئان یان سروودێکی ئایینی کاریگەر دەبێت و...بەم شێوەیە.

## عەقڵ لە چالاکییەکی ئیمانیدا

لەم تەوەرەیەدا گەشتی عەقڵ و ئیمانی چوار بیرمەندی گەورە دەخەینەڕوو، کە هەر یەکێکیان گومان و پاڵنەری خۆیان هەبووە ببێتە هۆی ئەوەی ماوەیەکی زۆر بێباوەڕ بێت، پاشان لە قۆناغێکی پڕ لە پشێوی دەروونی و فیکریدا ژیاوە، تا بەرەو ڕێگای خودا هیدایەت دراوە، گەشتی هەر یەکێکیان بەو جۆرەی کە گونجاوبێت لەگەڵ کەسایەتی و جۆری هزرەکەیدا باس دەکەین.

ئەو چوار گەشتە بریتین لە:

گەشتی سێر ئەنتۆنی فلو: ڕێگاکەیشی زانستی و فەلسەفە بوو.

گەشتی د.جیفری لانگ: ڕێگاکەیشی باوەڕی ناو دڵ و تێڕامان بوو لە قورئانی پیرۆز.

گەشتی د. مستەفا محمود: ڕێگاکەیشی گومان و پرسیارکردن بوو.

گەشتی د.عبدالوهاب المسیری: ڕێگاکەیشی بریتی بوو لە تێڕامان لە زاتی مرۆڤ و ژیارستانی ماددی.

ئەو چوار گەشتەش پێکەوە یەکدەگرن و وێنەیەکی گشتگیرمان پێشکەش دەکەن کە زۆربەی لایەنەکانی باوەڕی لە خۆ گرتبێت، کە هەر یەکە لە پرسیارەکانی عەقڵ و ئارەزووەکانی دەروون تێر دەکات، من خۆشم بە زۆر لایەنی گەشتی ئەو کەڵەپیاوانە کاریگەر بووم.

## گەشتی سێر ئەنتۆنی فلو :

سێر ((ئەنتۆنی فلو))[1] (مامۆستی فەلسەفەی بەریتانی)، ناوێکی پڕشنگداری بوارەکانی هزر و فەلسەفە و بێباوەڕیی و دینداریە! بە شایەنەوە بە گەورەترین بێباوەڕی سەردەمی نوێ هەژمار دەکرا، نووسینە زۆر و زەوەندەکانی بوو بوون بە نەخشەرێگای هزری بێباوەڕی بە درێژایی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم، لەبەر ئەوە بڕیارماندا کە گەشتە ئیمانییەکەمان لەگەڵ ئەودا دەستپێبکەین.

لە نۆی دیسێمبەری ساڵی ٢٠٠٤ دا، جیهان تووشی شۆك بوو بەهۆی هەواڵێکەوە کە تا ئێستاش لە ناوەندی فەلسەفی و زانستی و ڕۆشنبیری و ئایینەکاندا دەنگ دەداتەوە؛ ئەنتۆنی فلو(دوای ئەوەی هەشتا ساڵی تەمەنی تێپەڕاند) ئێستا باوەڕی بەوە هەیە کە ((خودایەك هەیە)). ئاژانسی هەواڵی ئەسۆشیێتد پرێس هەواڵەکەی لە ژێر ئەم ناونیشانە بڵاو کردبووەوە:

((بێباوەڕێکی بەناوبانگ باوەڕ بە بوونی خودا دەهێنێت، بەهۆی پاڵنەرو بەڵگەی زانستییەوە))

Leading atheist now believes in God, more or less based on Scientific evidence.

هەواڵەکە هاوڕێ بێباوەڕەکانی ئەنتۆنی فلو و تەنانەت قوتابییەکانیشی تووشی هستریا کرد، تا ئەو ئەندازەیەی ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوایی ئازاد پڕ بوو لە گاڵتەجاڕی و دەربڕینی بێزاری لەو گۆڕانەدا!

---

(١) Sir Antony flew: لە ١٩٢٣/٢/١١ لە لەندەن لە دایك بووە و لە ساڵی ٢٠١٠ کۆچی دوایی کردووە.

چەندین جار داوا لە ئەنتۆنی فلو کرا کتێبێك بنووسێت تیایدا گەشتەکەی لە منداڵێکی دیندار بۆ پیاوێکی بێباوەڕ پاشان بۆ پیرەپیاوێکی هەشتا ساڵی کە باوەڕی بە خودا هەیە بخاتە ڕوو، لە کۆتاییدا لە ساڵی ٢٠٠٧ ز ئەو کتێبەی کە چاوەڕوان دەکرا دەرچوو[1]، بە ناونیشانی : ((خودایەك هەیە: چۆن دڕندەترین بێباوەڕ لە بێباوەڕیی هەڵگەڕایەوە)).

There is a God; How the world's most notorious atheist changed his mind.

## گەشتی هزری ئەنتۆنی فلو:

أ- بێباوەڕێکی بچووك لە ماڵێکی دینداردا، بەبێ هیچ پاڵنەرێکی ڕوون: فەیلەسوفەکەمان خۆشەویستی دانایی و ئارەزووی عەقڵی و مەنهەجی شیکاری و ورد لە لێکۆڵینەوەدا لە باوکییەوە وەرگرتبوو کە پیاوێکی گەورەی ئایینی و مەسیحی بوو، پاشان ڕۆڵی پیاوانێك هات کە بە ئازادی بیر ناسرابوون، بۆ ئەوەی ئەو چەمکانە لە مێشکیدا بچەسپێنن. کە هەندێکیان لە قوتابخانەکەی خۆیدا مامۆستابوون و دیبەیتیان لەگەڵدا دەکرد پاشان مامۆستاکانی لە زانکۆدا، بەهەمان شێوە دۆخی بیری ئازاد کە لە باندی فەلسەفەی سوقراتدا هەبوو لە زانکۆی ئۆکسفۆرددا، هەموو ئەو هۆکارانە کاریگەرییەکی گەورەیان لەسەر ئەنتۆنی فلو هەبوو تا پسپۆڕی فەلسەفە هەڵبژێرێت.

ئەنتۆنی فلو لە کتێبەکەیدا پێمان دەڵێت کە ئەو پەروەردەیەی لەو ژینگەیەدا پاڵنەرێکی بەهێزبووە بۆ ئەوەی بڕواتە ناو جیهانی هزرەوە، بەڵام بە هیچ جۆرێك ئەوە ناکاتە هۆکار کە پاڵنەری بوویێت بۆ بێباوەڕی. لەبەر ئەوە دەڵێت

---

(١) من ئەو کتێبەم وەرگێڕاوە و پوختەم کردۆتەوە و کردوومەتە بەشێك لە کتێبەکەم (رحلة عقل). ئەم کتێبە لە لایەن نووسینگەی تەفسیر و هەمان وەرگێڕەوە بەناو نیشانی (گەشتی عەقڵ) کراوەتە کوردی و بڵاو کراوەتەوە.

هێشتا خۆیشی نازانێت بۆچی چەمکی خوایەتی ڕەت کردۆتەوە! لەوانەیە گیروگرفتی (خراپە و ئازار) گەورەترین پرس بێت کە بۆتە هۆکاری ئەوەی فلو لە تەمەنی پازدە ساڵیدا بەرەو بێباوەڕیی بچێت، چونکە نەیتوانیوە ئەو خراپە و ئازارەی کە تووشی مرۆڤ دەبێت لە گەڵ خۆشەویستی و بەزەیی خودا بۆ بەندەکانی بەیەکەوە بگونجێنێت.

ب-ئەنتۆنی فلو جلێکی زانستی فەلسەفی جوانی بەبەر بێباوەڕیدا کرد، کە شایەنی نەبوو: لەتەمەنی بیست و حەوت ساڵیدا ئەنتۆنی فلو توێژینەوەکەی (ساختەی زانستی لاهوت)ی بڵاو کردەوە، کە بەڵگەکانی بێباوەڕیی خۆی تێدا بڵاو کردەوە، لە هەمان کاتدا، بانگەوازی بۆ ئەوە دەکرد پێویستە گفتوگۆ لە نێوان فەیلەسوفەکان و باوەڕداراندا بەردەوام بێت. لە کتێبەکەی دواتریدا، بانگەوازی کرد بۆ شوێنکەوتنی مەنهەجی زانستی بۆ وەڵامدانەوە و هەڵتەکاندنی چەمکەکانی ئایین و خوایەتی، هەروەك چۆن داوای لە دیندارەکان کرد کە بەڵگە لەسەر بوونی خودا بخەنەڕوو، کە پێش ئەوە ئەرکی بێباوەڕان بوو بەڵگە لەسەر نەبوونی خودا پێشکەش بکەن.

ج- گۆڵپارێزی بێباوەڕیی: ئەنتۆنی فلو بوو بە گۆڵپارێزی بێباوەڕیی لە ڕۆژئاوا، چونکە زۆر بۆ وتاردان و دیمانە تەلەفزیۆنییەکان، هەزاران بینەر ئامادەی دیبەیتەکانی دەبوون، کە لەگەڵ دیندارەکاندا ئەنجامی دەدا و لە ڕێی دەزگاکانی ڕاگەیاندن پەخش دەکران.

د- هەنگاوەکانی لە بێباوەڕییەوە بۆ گومان بۆ دڵنیایی و باوەڕ: ئەنتۆنی فلو پێمان دەڵێت کە هێڵێکی دیار بوونی نییە لە گەشتە هزرییەکەی لە بێباوەڕییەوە بەرەو باوەڕهێنان بە بوونی خودا، هەروەها فلو ڕاشکاوانە باس لەوە دەکات کە پێشکەوتنە زانستییە گەورەکان کە لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا ڕوویاندا لە پشت گۆڕانەکەیەوەن، چونکە ئەو دۆزینەوە زانستییانە ئەومیان دووپاتکردەوە کە گەردوون و ژیان و هەموو ئەو ئاڵۆزییە سەرسوڕهێنەرەی تێیاندا هەیە ناکرێ بۆ ڕێکەوت و هەڕەمەکیتی بگێڕدرێنەوە، پێویستە خودایەکی دانا و بە توانای

لە پشتەوە بێت، ئەو یاسا ڕێك و پێك و جێگیرانەی لە بووندا بوونیان هەیە ڕەنگدانەوەی ئەوەن کە دەتوانن ناوی بنێن بیری خودا (فكر الإله).

## زانستی نوێ و خودای بەدیهێنەر:

ئەنتۆنی فلو وایدەبینێت کە زانستی نوێ پێنج ڕەهەند نیشان دەدات کە ئاماژەن بۆ بوونی خودای بەدیهێنەر:

١- گەردوون سەرەتای هەیە و لە نەبوونەوە هاتۆتە بوون، هەوڵی زانا و فەیلەسوفە مادیگەراکان سەرکەوتوو نەبوون لە گەیشتن بە تەفسیرێکی ڕازیکەر بۆ پەیدابوونی گەردوون لە نەبوونی ڕەهاوە و بەبێ نەبوونی خودای بەدیهێنەری گەردوون.

٢- سروشت بە پێی چەند یاسایەکی جێگیر و بەیەکەوە پەیوەندەوە بەڕێوە دەچێت، ئەمەش ئەوەمان لەسەر پێویست دەکات کە دان بە دانەری ئەو یاسایانەدا بنێین، ئەوەی لێرەدا زیاتر بەڵگەیە لەسەر بوونی خودای بەدیهێنەر، بریتییە لەوەی کە ئەو یاسایانە هەموو بوونەوەر دەگرنەوە و، بەیەکەوە پەیوەندیدارن، دەکرێ بە هاوکێشەی وردی بیرکاری لە کەمتر لە لاپەڕەیەکدا بخرێنەڕوو.

٣- ژیان هەر لە سەرەتاوە بە هەموو وردی و ئامانجدارێتی و زیرەکی ئێستای پەیدابووە، گومان لەوەدا نییە کە ڕێکەوت و هەڕەمەکێتی و، ئەو یاسایانەی سروشت کە دەیان زانین، هەموویان پێکەوە ناتوانن ئەوە تەفسیر بکەن کە ژیان لە ماددەی نا زیندووەوە پەیدا بووە، ئەنتۆنی فلو لە ڕێی لێکۆڵینەوە لە بەشی DNA و شێوازی ئەنجامدانی فەرمانەکانی گەیشتە ئەو دەرئەنجامە.

٤- گەردوون؛ بە هەموو بوون و یاساکانییەوە، بارودۆخێکی نموونەیی بۆ پەیدابوونی مرۆڤ و ژیانی فەراهەم دەکات، ئەوەش بە بنەمای مرۆیی ناسراوە. هەرچەند زانیاریمان دەربارەی وردەکارییەکانی بنچینەی گەردوون زیاتر بێت،

زیاتر دڵنیا دەبینەوە لەوەی کە بۆ پێداویستیەکانی مرۆڤ گونجاوە، ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە گەردوون بۆ پێشوازیکردنمان ئامادەکراوە. لە هەمان کاتدا، ئەو تەفسیر و لێکدانەوانەی کە زانا و فەیلەسووفە ماددیگەراکان(وەك گریمانەی چەند گەردوونی) دایاننناوە جێگای گاڵتەپێکردنە، وادەکات داننان بە خودای دیزاینەری گەردوون لە ڕووی زانستیەوە بەهێزتر و ڕازیکەرتر بێت.

٥- عەقڵ، تایبەتمەندی مرۆڤە. تواناکانی عەقڵی مرۆڤ لە بیرکردنەوەی لۆژیکیانە لە پرسە مادییەکان و چەمکە رووتەکان و، دەرككردن بەوەی لە دەوروبەرمانە و ئەوەی لە ناخماندایە و، دەرككردنی مرۆڤ بە خودی خۆی، ناکرێ بە شێوەیەکی خۆکرد لە مێشکی ماددی مرۆڤەوە پەیدابووبێت! بەو پێیەی زمانی کارۆکیمیایی مێشك، کە لە ڕووی چالاکییەوە لە خانە زیندووەکانی تری مێشك جیاواز نییە، ناتوانێت بە هەموو ئەو کارانە هەڵبستێت و ئەو ئەندازە گەورەیەی داهێنانەکانی ژیارستانیەتی مرۆڤایەتی بەرهەم بێنێت. هیچ ڕێگایەکمان لەبەردەمدا نییە جگە لەوەی پەنا ببەینە بەر جیهانی دواوەی سروشت بۆ تەفسیرکردنی توانا بێسنوور و سەرسوڕهێنەرەکانی عەقڵ.

ئەنتۆنی فلو خستنەڕووی بەڵگە ئیمانییەکانی بەو وشانە کۆتایی پێدێنێت:

بەرهەمەکانی زانستی نوێ بە تەنیا پاڵنەر نەبوون بۆ ئەوەی کە بیرو ڕاکانم بگۆڕم، بەڵکو چاوم خشاندەوە بەو بەڵگە فەلسەفییە کلاسیکیانەشدا کە پێشتر بەرەو بێباوەڕیان بردم، پاشان هەمان ئەو ڕێسا سوکراتییەم پەیڕەو کرد کە بە درێژایی ژیانی فەلسەفی بێباوەڕیم شوێنی کەوتبووم:

(شوێنی بەڵگە بکەوین جا بۆ هەر کوێمان ببات)[1]، بەڵام بەڵگە ئەمجارە بەرەو باوەڕی بردبووم.

---

(1) To follow the argument where it leads

**کۆتایی ڕێگا :**

ئەنتۆنی فلو پێمان دەڵێت، ئەگەرچی باوەڕی بەخودای بەدیهێنەری گەردوون هەیە، بەڵام هێشتا دوو بۆچوون هەن کە هەر لەسەردەمی بێباوەڕییەوە پەیڕەویان لێدەکات و بۆچوونی بەرامبەریان نەگۆڕاوە:

**یەکەم:** فلو بیرۆکەی بەرجەستەبوونی خودای ڕەها لە شێوەی مرۆڤ (مەسیح) ڕەتدەکاتەوە، وەك چۆن مەسیحییەکان باوەڕیان وایە.

**دووەم:** هێشتا فلو بەڵگەی عەقڵی و زانستی لەسەر پەیوەندی نێوان خودا و مرۆڤ لە ڕێی وەحییەوە دەستنەکەوتووە.

پاشان ئەنتۆنی فلو باوەڕی بە خودای بەدیهێنەر هەیە، بەڵام باوەڕی بە ئایینە ئاسمانییەکان نییە، کەواتە دەکرێ فلو بە لایەنگری ئایینی سروشتی (پەروەردگارییەکان - الربوبیون Diests) هەژمار بکرێت، ئەگەرچی کاتێك مرد هێشتا هەر بە دوای بەڵگەکانی پەیوەندیکردنی خودا لەگەڵ مرۆڤ دەگەڕا.

لێرەدا بیروباوەڕی ئەنتۆنی فلو دەربارەی خودا تۆمار دەکەین، کە لەسەر ئەو بیرو باوەڕە مرد و دەیگوت:

من باوەڕم بە خودای تاك و تەنیا هەیە،

خودایەك کە بوونی واجبە،

نا ماددییە، هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نایەت،

توانای ڕەهای هەیە، زانستی ڕەهایە،

تەواوی خێرو چاکەیە[1].

---

(١) گومان لەوەدا نییە کە ئەم وەسفە بە ئەندازەیەکی زۆر لەگەڵ بیرو باوەڕی ئایینە ئاسمانییەکاندا دێتەوە.

هەروەها فلو وایدەبینێت کە فەلسەفە کارە سەرەکییەکەی خۆی بەسەرکەوتنێکی گەورە کۆتایی پێهێنا، کاتێك گەیشتە تەفسیرکردنی بوون بە بوونی خودای بەدیهێنەر، کە گەردوونی بەدیهێنا تا ئامادە بێت بۆ پێشوازیکردن لە بوونەوەرێکی عاقڵ، کە بریتییە لە مرۆڤ. لەبەر ئەوە بەردەوام ئەو قسەی دووبارە دەکردەوە و دەیگوت: گەیشتنم بە بوونی خودا لە ڕێی عەقڵەوە بوو، بە بێ پێویستی دەسخستنە ناوی غەیبی سنوورشکێن وەك وەحی موعجیزە(هەروەك چۆن لە ئایینە ئاسمانییەکاندا ڕوودەدات)، گەشتەکەم گەشتی عەقڵ بوو نەوەك گەشتی باوەڕێکی دڵی و ڕۆحی.

لەبەر ئەوە لە گۆڤاری (تایم)ی ئەمریکی لە بارەی دەرچوونی کتێبەکەی ئەنتۆنی فلو نووسی: لەسەرووی هەموو دۆزینەوە زانستییەکانی سەردەمی نوێ ئەو دۆزینەوەبوو کە ((خودایەك هەیە)).

## گەشتی د.جیفری لانگ [1]:

گەشتی زانای بیرکاری ئەمریکی (جیفری لانگ)[2] بە ئەزموونێکی گرنگ و بە سوود دادەنرێت لە بێباوەڕییەوە بەرەو باوەڕ ومسوڵمانبوون. جیفری لانگ گەشتە ئیمانییەکەی خۆی لە کتێبەکەیدا (الصراع من أجل الإيمان)دا تۆمار کردووە، کتێبەکەی پێشکەشی سێ کچە باوەڕدارەکەی خۆی کردووە، وەك وەڵامێك بۆ پرسیاری یەکێکیان: باوکە گیان بۆچی مسوڵمان بوویت؟

---

(١) بەدەستکارییەوە لە خستنە ڕووی کتێبی (الصراع من أجل الإمان)وەرمگرتووە کە لە لایەن ناوەندی (النماء) خراوەتە ڕوو، ئەو کتێبەی کە جیفری لانگ گەشتەکەی لەگەڵ ئیسلامدا تێدا باس کردووە.

(٢) Jeffrey Lang: مامۆستای بیرکاری لە زانکۆی کانساس لە ویلایەتە یەکگرتووەکان. لە خێزانێکی کاسۆلیکی لە شاری بردیگبۆرت لە ساڵی ١٩٥٤ز لەدایك بووە.

## خەونەکەی جیفری لانگ:

جیفری ڕۆمانی گەشتە دوور و درێژ و قورسەکەی بە خەونێك دەستپێدەکات کە لە ماوەی دە ساڵدا زیاتر لە دەجار بینیویەتی، دەڵێت: لە ژوورێکی بچوکدا بووم، کە هیچ کەلوپەلێکی تێدا نەبوو، زەمینی ژوورەکە فەرشێکی لەسەر ڕاخرا بوو کە ڕەنگە سەرەکییەکانی سوورو سپی بوون، دیوارەکانی ژوورەکەش هیچیان پێوە نەبوو و ڕەنگیان خۆڵەمێشی بوو، لە بەرامبەرمان پەنجەرەیەکی بچووك هەبوو، لە شێوەی دەلاقەیەکی بچووك، کە ژوورەکەی ڕووناك دەکردەوە. ئێمە کۆمەڵێك پیاو بووین کە ڕووبەڕووی دەلاقەکە لەسەر چۆك دانشتبووین،من لە ریزی سێیەم دانیشتبووم، هەستم بە نامۆیی و غوربەت دەکرد، چونکە هیچ یەکێکیانم نەدەناسی، لەوانەیە لە وڵاتێکی تر بوویم.. هەموومان پێکەوە و بە شێوەیەکی ڕێك و پێك هەڵدەستاینەوە و دەچەماینەوە تا سەرمان دەگەیشتە سەر زەمینەکە، دووبارە لەسەر چۆك دادەنیشتینەوە...دۆخەکە زۆر ئارام و بێدەنگ بوو. کاتێك سەیری پێشەوەم کرد، زانیم کە کەسێك پێشەوایەتیمان دەکات، لەمنەوە دوور بوو، کەوتبووە لای چەپمەوە، ئەو کەسە بە تەنیا لە ناوەڕاستەوە و لە ژێر پەنجەرەکەوە وەستا بوو، تەنیا پشتیم لێ دیار بوو، ئەو کەسە عەبایەکی سپی لەبەر دابوو، عەمامەیەکی سپی بە سوور نەخشێنراویشی بەسەرەوە پێچابوو، لەو کاتەدا لە خەو هەڵدەستام و هەستم بە ئاسوودەیی دەکرد.

## بێباوەڕی و سەرگەردانی :

جیفری (کە وەکو باوەڕی مەسیحی لە ئاوهەڵکێشرابوو، لە ناوەندێکی کاسۆلیکی لە باشوری ویلایەتی کۆنیکتیکت پێگەیشتووە) ئاوڕی لەو خەونە دووبارەیە نەدایەوە، دوای ئەوەی کە زیرەکی و عەقڵی بیرکارییانەی و سەرسامی

بە بیری لۆژیکی و رازینەبوونی لە زۆرێك لە بیروباوەڕەکانی مەسیحییەت بەرەو بێباوەڕیی برد. جیفری هەڵوێستەکەی دەربارەی ڕەمزییەت و پیرۆزی خاچ (کە بریتییە لە مردنی کوڕە مرۆڤەکەی خودا لە سەر خاچ، وەکو قوربانی و فیدای تاهەتایی بۆ مرۆڤایەتی) دەکاتە ئاماژە بۆ قۆناغی گۆڕان لە مەسیحییەتەوە بەرەو بێباوەڕی، دەڵێت: ((کاتێك بووم بە بێباوەڕ خاچم فڕێدا، ئەوەش هاوڕێ لەگەڵ هەستێکی ناخم بە سەرگەردانی (واتە لە ناخەوە هەستم بە سەرگەردانی دەکرد)، چونکە ئەو ڕەمزانە کاریگەرییەکی گەورەیان بەسەرمانەوە هەیە، ئەگەر لە دەستیان بدەین تووشی پشێوی دەروونیمان دەکەن، بەتایبەت ئەگەر جێگرەوەکەی ئامادە نەبێت)).

لە سەرەتادا جیفری وایدەزانی کە بەختەوەری لە نازناوی ئەکادیمیدایە، لە ڕۆژی تاوتوێکردنی تێزی دکتۆراکەی و ڕاگەیاندنی ئەنجامەکەی ئەو خۆشییەی چەشت، بەڵام هەر لەگەڵ گەڕانەوەی بۆ شوقەکەی، خۆشییەکەی بەبادا چوو، هەرکات دەیویست بیری لە گێڕانەوەی خۆشییەکانی دەکردەوە زیاتر نوقمی دڵەڕاوکێ و بێهیوایی و ڕەشبینی دەبوو، جیفری خۆی باس لەوە دەکات، دەڵێت: ((ئێمە هیچ نین جگە لە ئاژەڵانێك کە دەمانەوێت دڵخۆش بین، بەڵام ئایا ئەوە هەموو ژیانە؛ سەرکەوتنێك کە لێی بێزار دەبی و یەکێکی تری بە دوادا دێت،هەروا بەم شێوەیە؟!)).

جیفری بە دەروونێکی سووتاووەوە وەسفی تاکی بێباوەڕ دەکات، باسی سروشتی پەیوەندییەکانی تاکی بێباوەڕ و کاردانەوەکانی و ئاڕاستە فیکری و بیروباوەڕی و کۆمەڵایەتییەکانی دەکات، لە میانەی ئەو باسەدا سایکۆلۆژیەتی دوورەپەرێزی و لاوازی تاکی بێباوەڕ شیدەکاتەوە، دەڵێت: ((زۆر بە خێرایی دەرکم بەوە کرد کە هیچ کەس وەك کەسی بێباوەڕ هەست بە تەنیایی ناکات، کاتێك کەسی باوەڕدار هەست بە تەنیایی دەکات لە قووڵای دڵییەوە یادی خودای تاك و تەنیا دەکات و لێی دەپاڕێتەوە، دەتوانی هەست بەوە بکات کە وەڵامی دراوەتەوە، بەڵام کەسی بێباوەڕ لەو نیعمەتە بێبەشە؛ چونکە پێویستە لەسەری ئەو پاڵنەرە وەلا بنێت، گەمژایەتییەکەی بە بیر خۆی بخاتەوە. کەسی بێباوەڕ

خودای جیهانە تایبەتییەکی خۆیەتی، کە جیهانێکی زۆر بچووکە، مەودای هەستەکانی سنوورەکانی جیهانەکەی دیاری دەکەن، ئەو سنوورانەش بەردەوام لە کورتی دەدەن. کەسی بێباوەڕ بە هیچ شتێك پێداویستییەکانی پڕ نابنەوە؛ چونکە بیروباوەڕەکەی پێیدەڵێت کە ژیان هیچ ئامانجێکی نییە، هەروەها شتێکی تەواو یان ڕەها بوونی نییە. هەر لەبەر ئەوە کاتێك شوێنی نموونە کۆمەڵایەتییە باوەکان کەوتم[1]، لەبەر ئەوە نەبوو کە من پێزانینم بۆیان هەیە، بەڵکو لەبەر ئەوەی کەشتیی ژیان دەجووڵێنن.

گومانیش لەوەدا نییە کە بەردەوام لە دەروونی مرۆڤدا پێویستییەکی فیتری هەیە بۆ بەزاندنی سنووری ڕەهەندە ماددییەکانی و ڕۆیشتن بە ئاراستەی هێزی دواوەی سروشت، کە یاریدەی دەدات و بەرەو ڕاستی ڕێنموونی دەکات و وایلێدەکات هەست بە ئارامی و ئاسایش بکات، ئەگەر کەسی دیندار باوەڕی بە شتگەلێك هەبێت کە لەسەرووی هەستەکانییەوەن، ئەوا کەسی بێباوەڕ ناتوانێت متمانە بەو شتانە بکات و، هیچ شتێکی ڕاستە قینەی لە ژیاندا نییە، تەنانەت خودی حەقیقەتیش بوونی نییە.

زۆربەی کات دەبینی کەسی بێباوەڕ بە خودی خۆیەوە سەرقاڵە، بەردەوام هەوڵدەدات پارێزگاری لە یەکێتی و هاوسەنگی دەروونی بکات، تا بە واتاداری بمێنێتەوە، لە هەمان کاتدا پێویستە لەسەری کە دەستتێوەردانی هێزە دەرەکییەکان لە جیهانەکەیدا قەبوڵ بکات، بەتایبەتی پەیوەندییە مرۆییەکان، بە بێ ئەوەی بتوانێت جڵەوگیریان بکات، چونکە کەسی بێباوەڕ پێویستی بە دوورەپەرێزی و تەنیایی هەیە، بەڵام لە هەمان کاتدا پێویستیشی بە پەیوەندی بەستن لەگەڵ کەسانی تردا هەیە)).

کارەساتی تاکی بێباوەڕ دەگاتە لوتکە کاتێ بیر لە مردن دەکاتەوە، لەو بارەیەوە جیفری دەڵێت: ((ئێمە هەمووومان بۆ نەمری هەوڵ دەدەین، مرۆڤی باوەڕدار دەتوانێت وێنای ڕێگای بەدیهێنانی ئەوە بکات، بەڵام تاکی بێباوەڕ

---

(١) مەبەستی لە کلتورەکانی کۆمەڵگا و پێوەر و چەمکەکانیەتی.

لەسەری پێویستە بیر لە چارەسەری کاتی بکاتەوە، وەك پێکهێنانی خێزان و هاوسەرگیری یان نووسینی کتێبێك یان داهێنانێك، یان قوربانیدان یان ئەنجامدانی پاڵەوانێتییەك، لە بیری کەسانی تردا بمێنێتەوە. ئامانجی بەرزی تاکی بێباوەڕ چوونە بەهەشت نییە، بەڵکو ئەوەیە کە خەڵك باسی بکەن)).

## ڕێگا بەرەو ئیسلام [1]:

جیفری لانگ دەڵێت: ((لە زانکۆی سان فرانسیسکۆ پەیوەندیم لەگەڵ قوتابییەکی خۆم کە عەرەب بوو بەهێز بوو، تەفسیرێکی وەرگێڕدراوی قورئانی پیرۆزی بە دیاری پێشکەشکردم، کاتێك بۆ جاری یەکەم خوێندمەوە وام هەستکرد ((قورئان من دەخوێنێتەوە!)).

ڕۆژێکیان بڕیارمدا لە مزگەوتی زانکۆ سەردانی ئەو قوتابییەم بکەم. بە پلیکانەکاندا چوومە خوارەوە و لەبەردەم دەرگاکە وەستام و ترسم لەوە هەبوو کە بڕۆمە ژوورەوە، بە هەڵەداوان گەڕامەوە سەرەوە، پاشان هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا و هاتمەوە خوارەوە، قاچەکانم توانای هەڵگرتنمیان نەبوو! دەستم خستە سەر دەسکی دەرگاکە و دەستەکانم دەستیان بە لەرزین کرد، پاشان ڕامکردەوە سەر پلیکانەکان...

هەستم بە شکست دەکرد، بیرم لەوە دەکردەوە کە بگەڕێمەوە بۆ نووسینگەکەم..

چەند چرکەیەکی پڕ لە هەستی دژیەکم بەڕێکرد، کە ناچاریان کردم سەرم بەرەو ئاسمان بەرز کەمەوە، دە ساڵە من ڕێگری لە خۆم دەکەم لەوەی سەیری ئاسمان بکەم! بەڵام ئیتر بەرگرییەکەم شکستی هێناو پاڕانەوەم دەست پێکرد: ((خودایە، ئەگەر تۆ دەتەوێ بڕۆمە ناو مزگەوتەکەوە، ئەوا هێزم پێببەخشە)).

---

(١) ئەم بەشەیان بە دەستکارییەوە لە پێگەی (صید الفوائد) وەرگیراوە. بە ناونیشانی (هكڑا أسلم جيفري لانج)، لە نووسینی د.عبدالمعگی الدالاتی.

بە پلیکانەکاندا چوومە خوارەوە، دەرگاکەم کردەوە، لە ژوورەوە دوو گەنج گفتوگۆیان دەکرد، وەڵامی سڵاوەکەیان دامەوە، یەکێك لێی پرسیم: ئایە هیچ شتێك دەربارەی ئیسلام دەزانی؟ وەڵامم دایەوە. بەڵێ، بەڵێ.

دوای گفتوگۆیەکی دوور و درێژ حەز و ویستی خۆم بۆمسوڵمانبوون ئاشکرا کرد، یەکێکیان پێیگوتم: بڵێ: (أشهد)، بڵێ: (أن لا إله)، گوتم: (أن لا إله) - من بە درێژایی ژیانم باوەڕم بەو دەستەواژەیە هەبوو - گوتی: (إلا الله)، گوتی : (وأشهد أن محمدا رسول الله) منیش لە پشتییەوە دووبارەم کردەوە)).

جیفری لانگ قسە لەسەر ئەو ساتە دەکات و دەڵێت: ((ئەو وشانە وەك ئاوی سازگار بە گەرووی سووتاوی پیاوێکدا چوونە خوارەوە کە خەریك بوو لە تینوویەتیدا دەمرد، من بە هەر یەکێك لەو وشانە هێزم وەردەگرتەوەو دووبارە دەژیمەوە..

دەچوومە پاڵ شوێنکەوتووانی هەموو پێغەمبەرانەوە، ئەوانەی باوەڕیان بە هەموو ئەو پێغەمبەرانە هەبوو کە لەسەردەمە جیاوازەکاندا بۆ هەموو ڕەگەز و نەتەوەکان نێردرا بوون، هەروەها وەك شوێنکەوتەو بە ڕاستدانەر دەستم بۆ ئەو پێغەمبەرە درێژ کردبوو کە پێش چواردە سەدە بۆ مرۆڤایەتی نێردرابوو، ئەوە بە واتای پەیڕەویکردن دێت بە شێوازێکی جیهانی کە پیرۆزی قەدیمییەتی پێبەخشراوە، هەڵگرانی کۆمەڵێك پەیامی ئاسمانی مژدەیان بە هاتنی محمد (صلی الله علیه وسلم) داوە.

هەستم بە پارێزراوی و ئارامی و ئازادی کرد، هەستمکرد ئیتر بۆم هەیە ئەو زاتەم خۆشبوێت کە بەخششەکانی سنوورێکیان نییە و ئەویش منی خۆش بوێت، بەڕاستی نوقمی ئەو ڕەحمەتە بووم کە لە خۆشەویستییەکی پاك و بەرزەوە هەڵدەقوڵا؛ بەڕاستی دووبارە گەڕامەوە بۆ پشت و پەنام!!)).

ئەوە هۆشیاری تیژ و دەرککردنی ڕۆحی و دڵی و عەقڵییە کە لەکاتی دەربڕینی شەهادەت، بە هەموو پێویستی و ڕەهەندەکانییەوە هەستی پێدەکرێت.

هەروەها جیفری دەڵێت: ((دوای دوو ڕۆژ لەو ڕووداوە ئامادەی یەکەمین نوێژی هەینی بووم، لە ڕکاتی دووەمدا بووین، ئیمامەکە قورئانی دەخوێند. ئێمەش لە پشتیەوە ڕیز بوو بووین، شانمان بە شانی یەکترەوە دابوو، بە جۆرێك دەجووڵاین وەك بڵێی یەك جەستەبین، من لە ڕیزی سێیەم بووم، نێوچاوانمان دەخستە سەر فەرشە سوورەکەوە، کەشەکە زۆر نارام بوو و شوێنەکە زۆر بێدەنگ بوو!! ئیمامەکە لە ژێر پەنجەرەکەوە بوو کە ڕووناکی تێدا دەهاتەژوورەوە، عەبایەکی سپی لەبەردابوو! لەناخی خۆمەوە هاوارم کرد: ئەمە خەونەکەیە! بەڵێ خۆیەتی...دەمپرسی: ئایا من لە ئێستادا خەون دەبینم؟! چاوەکانم پڕبوون لە فرمێسك، دوای ئەوە ئیمامەکە گوتی: السلام علیکم ورحمه الله، نوێژەکە تەواو بوو، چووم لە دیوارە خۆڵەمێشیەکان ڕامام! ترس دایگرتبووم، ئەو کاتە بۆ یەکەمجار هەستم بەو خۆشەویستییە کرد کە لە گەڕانەوە بۆ خودا نەبێت بەدەستنایەت)).

شتێکی سروشتی بوو کە دەربارەی نهێنی مسوڵمانبوونی، پرسیار لە دکتۆر جیفری لانگ بکرێت، ئەویش لە وەڵامدا دەیگوت: ((لە ساتێك لە ساتە تایبەتییەکانی ژیانمدا، خودا بە زانست و ڕەحمەتی فراوانی، ئەو خەڵاتەی پێبەخشیم، دوای ئەو ناخۆشی و ناسۆرانەی تیایاندا دەژیام، دوای ئەوەی ئامادەیی تەواوی تێدا بەدی کردم بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە ڕۆحییەی کە لە دەروونمدا هەبوو، ئیترمسوڵمان بووم.. پێش ئیسلام واتای خۆشەویستیم نەدەزانی، بەڵام کاتێك قورئانم خوێندەوە هەستم بە شەپۆلێك لە ڕەحمەت و میهرەبانی کرد، هەستم بەوە دەکرد کە خۆشەویستی لە ناو دڵمدایە و لەگەڵ خوێنم هاتوچۆ دەکات، چونکە ئەوەی منی بەرەو ئیسلام ڕێنموونی کرد خۆشەویستی خودا بوو، کە لە بەرامبەریدا هیچ هێزێك بەرگەی ناگرێت)).

### تێگەیشتنی جیفری لانگ بۆ ئیسلام :

((ئیسلام ملکەچبوونە بۆ ویستی خودا، ڕێگایەکە بۆ بەرزبوونەوەیەکی بێسنوور، بۆ پلەیەکی بێسنووری ئاشتی و ئارامی، ئیسلام داینەمۆی هەموو تواناکانی مرۆڤە، ئیسلام پەیڕەوییەکی خۆویستانەی لاشەو عەقڵ و دڵ و ڕۆحە)).

((دوای ئەوەی مسوڵمانبووم هەوڵمدەدا لە نوێژەکاندا ئامادە بم تا گوێبیستی قورئان بم، سەرەڕای ئەوەی کە عەرەبیم نەدەزانی. کاتێك دەربارەی ئەوە پرسیاریان لێکردم، وەڵامم دایەوە: بۆچی منداڵی شیرەخۆرە بە دەنگی دایکی ئارام دەبێتەوە و بێدەنگ دەبێت؟! هیوادارم بۆ هەمیشە لە ژێر پارێزگاری ئەو دەنگە بژیم)).

((نوێژ پێوەری سەرەکی ڕۆژانەیە بۆ پێوانی ئەندازەی ملکەچی مرۆڤی باوەڕدار بۆ پەروەردگاری خۆی، ئای هەستێکی چەند جوانە، کاتێك بە تەواوی سوجدە دەبەی لەناکاو هەستدەکەی بۆ بەهەشت بەرزکرایتەوە، بە هەواکەی هەناسە دەدەیت و بۆنی خۆڵەکەی دەکەیت و بۆنی گوڵاوەکەی هەڵدەمژی، وا هەستدەکەی خەریکە لە زەوی بەرز دەکرێیتەوە، دەخرێیتە ناو دەستی خۆشەویستی بەرز و گەورەوە)).

((بەڕاستی نوێژی بەیانی لە هەموو پەرستشەکان کاریگەرتر و وروژێنەرترە، چونکە پاڵنەرێك هەیە واتلێدەکات بەیانی زوو لە خەو هەڵبستیت - لە کاتێکدا هەمووان خەوتوون - بۆ ئەوی گوێبیستی مۆسیقای قورئان بیت کە ئەو بێدەنگییەی پڕ کردووە، وا هەست دەکەیت کە ئەم جیهانە جێ دەهێڵیت و لەگەڵ فریشتەکاندا سەفەر دەکەیت بۆ ئەوەی بڕۆی یادی خودا بکەیت و خودا بەرز ڕابگریت)).

## جیفری و قورئان، ڕووبەڕووی یەکتر[1]:

پەیوەندی نێوان قورئانی پیرۆز و جیفری لانگ بە سروشتێکی تایبەت دەردەکەوێت، کارلێکی و چالاکی و کێبڕکێ، جیفری بە عەقلانیەتێکی کراوە و لۆژیکییەتێکی توند و بیرێکی شیکاری هۆکاری مامەڵەی لەگەڵ قورئاندا کردووە، کە پڕ بووە لە پرسیار و هەستی جیاواز و وریاکەرەوە.

جیفری پێمان دەڵێت کە ئەو بڕیاری دا لەگەڵ قورئان بکەوێتە جەنگ و کێبڕکێیەکی عەقڵییەوە، هەرکە لاپەڕەیەکی لە وەرگێڕدراوە ئینگلیزییەکە دەخوێندەوە، لە شەودا بیست تا سی پرسیاری دەنووسی، دواتر قورئان دەیبەزاند، چونکە لە ئایەتی دواتر یان لە لاپەڕەی دواتر یان لە سورەتی دواتر وەڵامێکی بەهێزی دەمکوتکەری بۆ پرسیارەکانی دەستدەکەوت، پاشان لەو پرسیارانە پرسیاری تر درووست دەبوون، جیفری وای هەست دەکرد کە ئیتر دەستی لە قوڕگی قورئان گیرکردووە بەڵام پاش ماوەیەکی تر دووبارە قورئان تووشی شکستی دەکرد، چونکە دوای ماوەیەك ئەو وەڵامەی دەدۆزیەوە کە هەموو دەرگایەکی گومان و دوو دڵی و هەستکردن بە مەحاڵی بەسەردا دادەخست.

جیفری ئەو بارودۆخەی وەسف دەکات، دەڵێت: ((قورئان بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ و تایبەتی تەحەددات دەکات، وەك بڵێی مافی بەسەرتەوە هەبێت؛ گفتوگۆت لەگەڵدا دەکات و ڕەخنەت لێدەگرێت و شەرمەزارت دەکات، من بەڕوونی ئەوەم بۆ دەرکەوت کە خاوەنی قورئان زیاتر لە خۆم من دەناسێت، هەمیشە قورئان پێش بیرکردنەوەم دەکەوت و ئەو بەربەستانەی ڕادەماڵی کە ماوەی چەند ساڵێك بوو بنیادم نابوون، قورئان لەگەڵ پرسیارەکانم دەدوا، من ڕووبەڕوو لە

---

(١) سەرەڕای ئەوەی کە جیفری لانگ عەرەبی نەزانیوە و، مامەڵەکردنی لەگەڵ وەرگێڕانی ئینگلیزی واتای قورئاندا بووە، کە ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی لە پەیوەندی ڕاستەوخۆی بەدەقی قورئانییەوە بێبەش بێت، بەڵام زۆر بە قوڵی لەگەڵ قورئاندا تێکەڵ بووە زۆر هۆشیارانە لەگەڵ مەنهەج و ڕۆحی ئیسلامدا تێکەڵ بووە.

لاپەڕەکانی قورئاندا بەدیداری خۆم گەیشتم، هەستم بە دەستبەستراوی دەکرد، بەو پێیەی بە جۆرێك ڕێگاکەمم دەبڕی کە تەنیا یەك بژاردەم لەبەردەمدا بوو، بەڕاستی لەوەی بینیم ترسام)).

## جیفری لانگ و مەنهەجی قورئان :

جیفری لانگ وایدەبینێت کە قورئان مەبەستییەتی کۆمەڵگا چاك بکات، نەوەك ڕووخاندنی و پاشان دووبارە بنیاتنانەوەی لە خاڵی سەرەتاوە، بۆیە ئەوەی باش بوو هێشتییەوە و چاکسازی تێدا ئەنجامدا، پاشان دەستی کرد بە بنیاتنانی نوێ، هەروەها قورئانی پیرۆز ئامانجییەتی وا لەمسوڵمانان بکات بە شێوازێکی نوێ بیر لە ئایین بکەنەوە؛ چونکە بناغەیەکی نوێ بۆ ژیانیان دادەنێت، دیدو بۆچوونیان بەرامبەر بە جیهانێك بۆ جیهانێکی تری بەرز و باڵاتر بەرز دەکاتەوە. ئەم مەنهەجە مرۆڤی عەرەبی لە لاساییکردنەوە بەرزکردەوە بۆ جیاوازی، لە هەڵەشەییەوە بۆ ڕێکخراوی، لە غەیبییەتەوە بۆ زانست؛ لە حەدسەوە بۆ لێکدانەوەی هۆشیارانە، لە کۆتاییشدا کۆمەڵگا بە شێوەیەکی نموونەیی ڕێکدەخات.

یەکێك لە گرنگترین ئەو شتانەی کە جیفری تێبینی کردووە و، هەموو ڕۆژهەڵاتناسێکی هاوچەرخ تێبینی دەکات. بریتییە لەوەی قورئان بیروباوەڕ لە ڕێی (تەحەدداکردنی عەقڵ و هۆشیارکردنەوەی بیری تێفکرین و بیرکردنەوە) دەخاتەڕوو، بۆ نموونە کاتێك قورئان لەگەڵ کافران و سپڵە و نکۆڵیکاران گفتوگۆ دەکات، بە تەحەدداوە لێیان دەپرسێت:

﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَا .. ﴿٤٦﴾ ﴾ الحج: ٤٦.

واتە: (ئایا ئەمانە بەسەر ئەرزدا نەڕۆیشتوون تا دڵێکی وایان ببێ بە هۆی ئەو دڵەوە عەقڵیان ببێ و بزانن دەبێ چی بکەن کە خوا بە تاك و تەنیا زانینە...).

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى الْأَرْضِ كَمْ أَنبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ ﴿٧﴾ ﴾ الشعراء: ٧.

واتە: (ئایا ئەوانە ناڕوانن بۆ زەوی کە چەند جۆرە درەخت و شینایی و سەوزە و داری بەردارمان تیا ڕواندووە لە هەرجۆرێکی پڕقازانج و بەسوود؟).

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿ أَوَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ.. ﴿٩﴾ ﴾ الروم: ٩.

واتە: (ئایا ئەمانە بە زەویدا نەگەڕاون تا سەیر بکەن سەرەنجامی ئەوانە چۆن بووە کە پێش ئەمان بوون؟).

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿ أَفَلَمْ يَنظُرُوا إِلَى السَّمَاءِ فَوْقَهُمْ.. ﴿٦﴾ ﴾ ق: ٦.

واتە: (ئایا ئەمانە سەیری ئاسمانیان نەکرد بەسەر سەریانەوە چۆنمان دروست کردووە).

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿ أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى الْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ ﴿١٧﴾ ﴾ الغاشیە: ١٧

واتە: (ئەوە بۆ ئەوکافرانە سەیری وشتر ناکەن چۆن خولقێنراوە؟).

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿ أَفَرَأَيْتُم مَّا تَحْرُثُونَ ﴿٦٣﴾ أَأَنتُمْ تَزْرَعُونَهُ أَمْ نَحْنُ الزَّارِعُونَ ﴿٦٤﴾ ﴾ الواقعە: ٦٣ - ٦٤.

واتە: (ئایا سەرنجتانداوەلەو زەویەی کە دەیکێڵن و دەیچێنن؟ * ئایا ئێوە دەیروێنن، یان هەر ئێمەین ڕوێنەر و بەرهەم هێنەر).

ئەو پرسیارانە جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە بەڵگەی ڕاستی پەیامەکە لە مێژوو و کلتورەکان و زەوی و گەردوون و سروشت و هی تردا هەیە، چونکە قورئانی پیرۆز بە ئایەتەکانی گفتوگۆ لەگەڵ ئەوانەدا دەکات کە کەسانی دانان

﴿ يُؤْتَ ٱلْحِكْمَةَ .. (٢٦٩) ﴾ البقرة: ٢٦٩، و ئەوانەی زانان ﴿ ..ٱلْعَـٰلِمُونَ (٤٣) ﴾ العنكبوت: ٤٣، و ئەوانەی خاوەن عەقڵن ﴿ .. أُوْلُوا۟ ٱلْأَلْبَـٰبِ (٩) ﴾ الزمر: ٩، ئەوانەی بیر دەکەنەوە ﴿ ..يَتَفَكَّرُونَ (١٣) ﴾ الجاثية: ١٣.

جیفری وەسفی ڕۆڵی گەورەی قورئان دەکات لە دووبارە بنیاتنانەوەی بیروبۆچوونەکەی بەرامبەر بە جیهانی گەردوون، دەڵێت: ((قورئان فەرمانمان پێدەکات کە بەچاوی ڕەخنەوە سەیری ڕەفتار و بیروباوەڕەکانمان بکەین، چونکە ناتوانین ڕێگای ڕزگاری بدۆزینەوە مەگەر لە ڕێی گەڕان بە دوای حەقیقەت و تەسلیمبوون بە حەقیقەتەوە نەبێت. یەکێك لە ئامانجەکانی قورئان ئەوەیە فێرمان بکات بە وردی بە دوای هۆکارەکاندا بگەڕێین و لێکدانەوە بکەین، ئەوەمان بۆ دەربکەوێت کەچی لە دەروونماندا دژیەك و پێچەوانەیە. لەبەر ئەوە لە زۆرێك لە نموونە و چیرۆك و ئامۆژگارییەکانی قورئاندا وانەی وا دەبینین کە پەیوەستن بە بیرکردنەوەی ڕاست و بیرکردنەوەی هەڵەوە.

هەروەها بۆ تەواوکردنی دیدی بابەتیانە دەبینین کە قورئان زۆر جەخت لەسەر گرنگی بەڵگە دەکاتەوە لە کاتی گفتوگۆدا، ئەوەتا خودای پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿ وَقَالُوا۟ لَن يَدْخُلَ ٱلْجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوْ نَصَـٰرَىٰ ۗ تِلْكَ أَمَانِيُّهُمْ ۗ قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَـٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ (١١١) ﴾ البقرة: ١١١.

واتە: (کیتابییەکان ئەڵێن: جوولەکە و گاور نەبێ کەس ناچێتە بەهەشت. ئەمە ئارەزوو خەیاڵاتی پڕوپووچی ئەوانە. پێیان بڵێ ئەگەر ڕاست دەکەن ئیسباتی بکەن و دەلیلی لەسەر بێننەوە خۆ بەتەنها قسەو گەزاف نابێ).

لەبەر هەموو ئەو شتانەی باسمان کرد، شتێکی نامۆ نەبوو، کە هەردوو کتێبەکەی جیفری (حتى الملائكة تسأل) و (حتى الخليل ابراهيم يريد أن يطمئن) گرنگترین کتێبەکانی جیفری لانگ بن، چونکە ناونیشانی هەردوو

کتێبەکە ئاماژەن بۆ ئەوەی کە بیرکردنەوە و پرسیارکردن جەوهەری باوەڕن تەنانەت لەلای فریشتەکان و لە لای باوکی پێغەمبەران ئیبراهیمیشەوە (علیه سلام).

ئەمە گەشتی ئیمانی جیفری لانگ بوو، وەك لە سەرەتادا باسمانکرد ڕێگاکەی تێکەڵەیەك بوو لە باوەڕی دڵ و وردبوونەوە لە قورئانی پیرۆز. ئەو باوەڕەی لە دڵیدا جێگیر بوو، بووە هۆی بەدیهێنانی ئەو خەونەی کە بە درێژایی دە ساڵ بوو دەیبینی، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە خودا هەڵیبژاردووە و ئەو بەڵگەیەی نیشانداوە کە ڕەتناکرێتەوە، هەرچی وردبوونەوەیە لە قورئانی پیرۆز، ئەوا تینوێتی جیفری لانگی شکاند و وەڵامی هەموو پرسیارەکانی دایەوە و هەموو کون و کەلەبەرێکی گومانی بەسەردا داخست.

هەروەها لە گەشتی ڕابردووی ئەنتۆنی فلو - وەك خۆی وەسفی کردبوو - باسمان لەوە کرد کە هیچ کاریگەری دڵی تێدا نەبوو و تیایدا لەسەر ئەوە وەستاین کە دانی بە خوایەتی دانا بە بێ دانتان بە هیچ ئایینێك، ئەوا گەشتی جیفری لانگ باوەڕی دڵی پشکێکی گەورەی لە گەشتەکەدا بەرکەوتووە، هەروەك چۆن نەك هەر گەیاندی بە ئایینی حەق، بەڵکو گەیاندی بە ئیسلام.

لەبەر ئەوە جیفری لانگ نەیدەتوانی وێنای ئەوە بکات کە ڕۆژێ لە ڕۆژان لە دەرەوەی بازنەی باوەڕ بژی، لەو بارەیەوە لە یەکێك لە پاڕانەوەکانیدا دەڵێت: ((پەروەردگارم، ئەگەر جارێکی تر بەرەو باوەڕنەبوون بە تۆ ڕۆیشتم، ئەوا بەرلەوە بمفەوتێنە و ژیانم لێبستێنەوە، خودایە من ناتوانم بۆ ڕۆژێکیش بە بێ باوەڕبوون بە زاتی تۆ بژیم)).

## گەشتی د.مستەفا مەحمود :

د.مستەفا مەحمود بە خاوەنی بەناوبانگترین گەشتی ئیمانی لە جیهانی عەرەبی دادەنرێت لە سەردەمی نوێدا، کە گەشتەکەی بە شێوەیەکی زۆر کورت و ڕوون و سەرنجڕاکێش لە کتێبە ناوازەکەیدا (گەشتەکەم لە گومانەوە بۆ باوەڕ - رحلتي من الشك إلى الإيمان) خستۆتەڕوو، ئامۆژگاری هەموو کەسێك (باوەڕداربێت یان گومانکار یان بێباوەڕ) دەکات کە بە وردی ئەو کتێبە بخوێنێتەوە و لێی بکۆڵێتەوە، هەر لەو کتێبەشەوە گەشتەئیمانییەکەی د.مستەفا مەحمود بە کورتی دەخەینە ڕوو.

## کۆڕانەکانم لەگەڵ گومانەکاندا: یاخیبوونی عەقل :

پێش ماوەیەکی زۆر کە بیرم نایەتەوە.. لەوانەیە لە سێزدە ساڵی بۆ چواردە ساڵی یان بەر لەوەش بووبێت.. هەر لە تەمەنی هەرزەکارییەوە بە یاخیبوونەوە لە هاوتەمەنکانم دەپرسی: ئێوە دەڵێن کە خودا دنیای بەدیهێناوە، چونکە هەر بەدیهێنراوێك پێویستە بەدیهێنەرێکی هەبێت و هەموو دروستکراوێك دروستکەرێکی هەبێت و هەموو بوونێك بەدیهێنەرێکی هەبێت.. باشە بەڕاستمان داناو باوەڕمان پێهێنا.. کەواتە دەپێم بڵێن کێ خودای بەدیهێناوە؟ یان ئەوەتا خۆی خۆی بەدیهێناوە؟ ئەگەر خۆی خۆی بەدیهێناوە و ئەو دید و بۆچوونەتان لەو بارەیەوە ڕاست بێت... ئیتر بۆ لە دید و بۆچوونەکەتاندا ئەوەش ڕاست نییە کە دنیاش بە بێ بەدیهێنەر خۆی بەدیهێناوە و ئیتر کێشەکە کۆتایی بێت.

سەرسامبوون بە عەقڵی خۆم، کە خەریك بوو وردە وردە دەبووەوە، سەرسامبوونم بە بەهرەی قسەکردن و وەڵامدانەوەی بەڵگەکان کە وامدەزانی تەنیا لەلای خۆم هەیە، ئەو سەرسامییە لە پشت گفتوگۆکەمەوە بوو، نەوەك گەڕان بە دوای حەقیقەت و دۆزینەوەی ڕاستییەکان.

پەرستنی خودام ڕەتکردەوە و لە پەرستنی نەفسی خۆمدا نوقم بووم و بەو تروسکاییە سەرسام بووم کە هەر لەسەرەتای هەرزەکاریدا لە هزرمدا داگیرسا، هەروەها لە بنەماکانی مەنتیق بێئاگابووم لە کاتێکدا خۆم خەریکی چارەسەرکردنی پرسەکانی مەنتیق بووم؛ هەستم بەوە نەکرد کە من لەگەڵ خۆمدا هەڤدژم کاتێك دان بە بەدیهێنەردا دەنێم پاشان دەڵێم کێ خودای دروستکردووە؟ و دەیکەم بە بەدیهێنراو لە کاتێکدا کە ناوی دەنێم بەدیهێنەر، ئەمەش خودی سۆفستائیەتە.

چونکە داننان بە هۆکاری یەکەمی بوون لەسەرمان واجب دەکات دەبێ ئەو هۆکارە لە خودی خۆیدا واجب الوجود بێت، نەوەکو پشت بە هۆکاری تر ببەستێت یان پێویستی بە هۆکاری تر هەبێت بۆ ئەوەی بێتە بوون، بەڵام ئەگەر هۆکار پێویستی بە هۆکاری تر هەبێت ئەوە دەیکاتە یەکێك لە ئەڵقە هۆکارییەکان و نایکاتە هۆکاری یەکەم.

بابەتەکە پێویستی بە سی ساڵ لە نقومبوون لە کتێب و هەزاران شەو لە خەڵوەت و بیرکردنەوە و گفتوگۆکردن لەگەڵ دەروونمدا و دووبارە بیرکردنەوە و دووبارە و دووبارە بیرکردنەوە هەبوو. پاشان هەڵگێڕ و وەرگێڕکردنی هزرم بۆ هەموو لایەك بۆ ئەوەی ڕێگای قورس و دڕکاوی بەرەو خودا ببڕم، بەڕاستی بابەتەکە ئاسان نەبوو.. چونکە نەمویست ئەو پرسە بە ئاسانی و سادەیی وەرگرم.

خۆ ئەگەر گوێم لە دەنگی فیترەت بگرتایە ئەوا خۆم تووشی ئەو ئازار و مەینەتیانەی جەدەل نەدەکرد..و فیترەت بەرەو خودای دەبردم.. بەڵام من لە سەردەمێکدا هاتم کە هەموو شتێکی تێدا ئاڵۆز بوو و دەنگی فیترەت لاواز بوو تا ئەو ئاستەی کە ببوو بە چرپە، دەنگی عەقڵ بە جۆرێك بەرز بوو، بووە غرور و ئاڵۆزی. عەقڵیش لەوەدا بووراوە کە زێدەڕۆیی دەکات، بەو پێیەی

خۆی لەبەردەم هەرەمێکی گەورەی دەستکەوتدا دەبینێتەوە، خۆی بە بنیاتنەری ژیارستانیەتێکی سەرسوڕهێنەر دەزانێت، لە پیشەسازی و کارەبا و مووشەك و فرۆکە و ژێرئاوگەڕ، بە جۆرێك خۆی دێتە بەرچاو کە وشکانی و دەریا و ئاسمانی خستۆتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. بۆیە وا خۆی بینیوە کە توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، خۆی خزاندۆتە هەموو شتێکەوە و خۆی کردۆتە فەرمانڕەوای هەموو ئەو شتانەی کە دەیزانێ و نەیدەزانی.

## هیچ خودایەك نییە جگە لە زانست.

کاتێك منداڵ بووم لە کتێبخانەی (البلدیة)ی تەنتادا نقووم بووم، نووسینەکانی (شلبی و شمیل و سلامە و موسی)م دەخوێندەوە و فرۆید و داروینم دەناسی. و ئارەزووی کیمیا و سروشت و بایۆلۆجیام دەکرد. و تاقیگەیەکی بچووکیشم لە ژوورەکەمدا هەبوو کە گازی دوانەئۆکسیدی کاربۆن و دوانەئۆکسیدی گۆگردم ئامادە دەکرد، مێش و مەگەزم بە کلۆر دەکوشت و بۆقەکانم تێدا شیکار دەکرد.

ئەو هەواڵانەی لە جیهانی ڕۆژئاوا پێمان دەگەیشتن و سەرنجمانی ڕادەکێشا. هەموو شتێکمان لە ڕۆژئاوا وەردەگرت؛ کتێب و دەرمان و جل و بەرگ و شەمەندەفەرو ئۆتۆمبێل و خواردنە لە قوتوکراوەکان و تەنانەت پێنووس و دەبوس و دەرزی، شێوازەکانی فێرکردن و قاڵبەکانی دانانی ئەدەبی لە چیرۆك و شانۆ و ڕۆمان، تەنانەت پەڕەکانی ڕۆژنامەکانیشمان لەوان وەردەگرت.

هەروەها دەربارەی پاڵەوانەکانی ڕۆژئاوا و بلیمەتەکانیان خەونەکانمان و پێشەوا بەرزەکانمان هەڵدەچنی..دەربارەی پاستێر و مارکۆنی و ڕۆنتێگن و ئەدیسۆن و...ناپلیۆن و ئەبراهام لینکۆڵن و. کریستۆفەر کۆلۆمبۆس و ماجێلان.

ڕۆژئاوا بریتی بوو لە پێشکەوتن.. ڕۆژهەڵاتی عەرەبیش بریتی بوو لە دواکەوتن و بێهێزی و بێهیوایی و ڕووخان و چوونە ژێر قاچەکانی داگیرکاری، بۆیە شتێکی سروشتی بوو کە هەموو ئەو شتانەی لە ڕۆژئاواوە بۆمان دەهاتن

لە چاوی ئێمە بریتی بوون لە ڕووناکی و حەق و. بریتی بوو لە ڕێگای هێز و ڕزگاربوون.

پاشان چوومە کۆلێژی پزیشکی، لەگەڵ کتێبە پزیشکییەکاندا فێری دیدی زانستی بووم و.. ئەوەی کە هیچ بڕیارێك دروست نییە بەبێ بەڵگەی واقیع و هەست، هەروەها زانست لە هەستپێکراو و بینراو و بەرکەوتووەوە دەستپێدەکات و، خودی زانست کرداری کۆکردنەوەی بەڵگەکان و دەرهێنانی یاساکانە، ئەوەی ناکەوێتە ژێر هەستەکانەوە دیدی زانستی تێدا نییە، غەیب لە حوکمی زانستدا هیچ بەهایەکی نییە.

ئەو دەنگەی جیهانی پڕ کردبوو بریتی بوو لە.. زانست.. زانست.. زانست.. و جگە لە زانست هیچی تر نا..دیدی بابەتیانە ڕێگاکەیە.

باشتە غەیبییەکان ڕەتبکەینەوە و لە دانانی بخوور و گوتنەوەی ئەفسانە و خورافیات وازبێنین، ئەوەی تانك و زرێپۆش و فڕۆکەمان پێدەدات، ئایینەکان و پەرستشەکانمان لێوەردەگرێت؟؟

## خودا خۆی زاڵ دەکات :

زانست وێنەیەکی زۆر ڕێکخراوی پێشکەش کردم..هەموو شتێك، لە گەڵای دارەوە تا دەگاتە باڵی پەپوولە تا گەردی لم گونجان و ڕێکخراوی و جوانی تێدا هەیە، هەموو گەردوون بە پێی ئەندازە و یاسای ورد بنیاتنراوە، هەموو شتێك بە ئەندازەو ژمارە دەجووڵێت، هەر لە گەردیلەی زۆر بچوکەوە بگرە تا دەگاتە خۆر و هەسارەکانی و تا دەگاتە گەلە ئەستێرەی گەورە، کە فەلەکناسی پێمان دەڵێت زیاتر لە ملیۆنێك ئەستێرەی تێدا هەیە.

هەموو ئەو بوونە یێکۆتایە لە بچوکترین ئەلیکترۆنەوە تا گەورەترین گەلەستێرەی ئاسمانی وەك پارچە مۆسیقایەکی بەیەکەوە گونجاو دێتە بەر

چاوم. کە هەموو جوڵەیەکی بە ئەندازەیە. هاوشێوەی لاشەی تەواوە کە ڕۆحی بەبەردا دەکرێت، هەر لەبەر ئەوە نەمدەتوانی نکۆڵی لە خودا بکەم یان هێزی خودایی دووربخەمەوە، زانست ئامرازێکی پێبەخشیم کە لەرێیەوە خودا بە ڕێگایەکی ماددی ببینم.

## تەمی یەکێتی بوون (وحدة الوجود):
## بەدیهێنراو بەدیهێنەرە!

لەو قۆناغەدا وا وێنای خودام دەکرد کە بریتییە لە وزەی ناوەکی گەردوون، لە دامەزراوەی جوان و ڕێك و پێکدا ڕێکی خستووە، لە زیندوەر و بێگیان و زەوی و ئاسمان، خودا ئەو جوولەیەیە کە زانست لە گەردیلە و پرۆتۆپلازم و فەلەکەکاندا دۆزیویەتیەوە..خودا بریتییە لە زیندوویی پەنهان لەناو هەموو شتێکدا.

بوون لە دید و بۆچوونی مندا بێسنوور و بێکۆتایی بوو، هەر لەبەر ئەوە بوونی ماددی درێژ بووەوە بۆ ئەزەل و ئەبەد، بەبێ سەرەتا و بەبێ کۆتایی. بەبێ ئەوەی پێویستی بە گریمانەکردن هەبێت بە غەیب و شتە نادیارەکان.

بەمەش کەوتمە داوی بیری یەکێتی بوون(وحدە الوجود)ی هیندی و فەلسە نوێیەکانی دواتری[1]. کە هەموو ئەو فەلسەفانە لە زەوییەوە دەستپێدەکەن. لە پێنج هەستەکەوە و..دان بە شتە غەیبییەکاندا نانێت و..دوانەیی نێوان بەدیهێنراو و بەدیهێنەر. چونکە هەموو بەدیهێنراوەکان بریتین لە بەدیهێنەر..خودا لە ڕووناکییەکی سپی دەچێت؛ تەنیا و سادە. بەڵام لەناوەخۆیدا حەوت ڕەنگەکەی پەلکەزێڕینەی لەخۆ گرتووە.

بۆ ماوەی چەند ساڵێك لەناو ئەو تەمە هیندییە و ماریگوانای سۆفیگەرییەدا ژیام، یۆگام ئەنجامدا و لە سەرچاوەکانی خۆیەوە خوێندم و لەسەر دەستی

---

(١) فەلسەفەی سپینۆزا و بیری پێرگسۆن، دەربارەی ناوکی بەدیهێنەر.

مامۆستا هیندییەکانی خۆی وەرمگرت، ماوەیەکی زۆر بەبیری کۆپیبوونی ڕۆحەکانەوە سەرسام بووم[١].

## ئەمەکە ڕوویەوە، یەک جۆر چنراو، واتا یەک بەدیهێنەر

پاشان لە دۆخی ناڕازیبوون و بڕوانەهێنان هۆشیار بوومەوە، لەگەڵ خۆمدا هەستم بەوە کرد کە ئەو جۆرە بیرکردنەوە دەربارەی خودا زۆرێك لە تێکەڵی تێدا هەیە، جارێکی تریش زانست ڕێنیشاندەرو ڕزگارکەر و ڕێنموونیکارم بوو، توێژاڵی زیندووی ژێر مایکرۆسکۆب شتێکی تری پێگوتم.

یەکێتی بوونی هیندی دەستەواژەیەکی شیعری سۆفیگەری بوو کە چێژی پێدەبەخشی. بەڵام ڕاست نەبوو! حەقیقەتی دڵنیا کە زانست دەیگوت ئەوە بوو کە لە ماددە خامەکەدا یەکێتی هەیە. یەکێتی لە ڕشتە و ڕێسا سەرەتاییەکان و یاساکان. یەکێتی ماددەی سەرەتایی کە هەموو شتێکی لێوە دروستکراوە. چونکە ژیان بە ڕووەك و ئاژەڵ و مرۆڤیشەوە لە ڕشتەی کاربۆن لەگەڵ هایدرۆجین و ئۆکسجین پێکهاتوون.. هەر لەبەر ئەوە هەموویان بە سووتان دەبن بە خەڵوز و.. هەموو جۆرەکانی ژیان لەسەر تاك خانە و داتاشراوەکانی دامەزراوە.

هەروەها لە فەلەك و فیزیا و کیمیا و زانستە ئەتۆمیەکان ئەوە فێردەبین کە خودی کاربۆن و هەموو ڕەگەزە جیاوازەکان لە کولانی یەك ڕەگەز لەناو کورەی ئەستێرە گەورەکاندا پەیدا بوون، کە هایدرۆجینە، دەیگۆڕێت بۆ هیلیۆم و کاربۆن و سلیکۆن و کۆپتاڵ و نیکل و ئاسن تا کۆتایی لیستی ڕەگەزەکانی تر، بە هەڵوەشاندنەوەی و دووبارە بنیاتنانەوەی لە پلەی گەرمی و پەستانی زۆردا.

---

(١) ئەو هێزە بە واتای ئەوە دێت کە ڕۆح لە دوای مردنی مرۆڤ دەچێتە لاشەیەکی تری باشترەوە(ئەگەر باش بێت)، ئەگەر خراپیش بێت دەچێتە لاشەیەکی خراپ یان ئاژەڵەوە. ئەو قۆناغە لە ژیانی د.مستەفا مەحمود لە هەردوو ڕۆمانەکەی(العنكبوت)و(الخروج من التابوت)دا ڕەنگیداوەتەوە.

هەموو ئەوانەش جۆرەکانی بوون دەگێڕنەوە بۆیەك خاو..بۆ دەزوویەکی ئاوریشمی خاو..کە گەردوون بە وردەکاری و دیزاین و شێوازی جیاواز لێیەوە بەدیهاتووە، جیاوازی نێوان جۆرێك و جۆرێکی تر و بوونەوەرێکی تر بریتییە لە جیاوازی نێوان پەیوەندییە چۆنیەتی و چەندێتییەکان. لە هاوکێشە و شەفرەی پێکهاتنندا..بەڵام ماددە خاوەکە هەر یەکێکە. ئەوەش نهێنی هەستکردنە بە نزیکی و خزمایەتی لە نێوان مرۆڤ و ئاژەڵدا، لە نێوان دڕندە و دارستاندا، لە نێوان لوت و گوڵی بۆنخۆش، لە نێوان چاو و دیمەنی جوانی خۆرئاوابوون.

ئەوە نهێنی گونجان و ڕێکخراوییە، هەموو ئەو شتانەی لە گەردووندا هەن تاکی خێزانێکن و لە یەك باوکن، ئەمەش بە هیچ جۆرێك بە واتای ئەوە نایەت کە بڵێین خودا بریتییە لە بوون، بەدیهێنەر بریتییە لە بەدیهێنراو. دوای ئەوە بۆم دەرکەوت کە یەکێتی بوون تەنیا شەتەحاتێکی هیندی سۆفیگەری نەفسانەییەو. سادەکردنەوەیەکی ویژدانییە کە زانست بە ڕاستی دانانێت و عەقڵ پێی ئاسودە نییە. بابەتەکە هاوشێوەی دۆخی کەسی ڕەخنەگری هونەرییە، کاتێك دەچێتە پێشانگایەکی وێنەو، لەنێو هەموو تابلۆکاندا یەکێتییەکی هونەری بەدیدەکات..چونکە هەموویان لەسەر هەمان ماددەی خاو کێشراون.. بە هەمان ڕەنگ کێشراون..لەوەش زیاتر ئەوەیە کە شێوازی وێنەکێشان یەکێکە، بۆیە دەرئەنجامی سروشتی لەوەدایە دۆخێکی وەها بە خەیاڵی ڕەخنەگرەکەدا بێت کە وێنەکێشی هەموو تابلۆکان یەکێکە. بۆ نموونە لەوانەیە پیکاسۆ یان شاگال یان مۆدیلیانی بوبێت..چونکە یەکێتی نێوان ئەو تابلۆیانە واتای ئەوەیە کە وێنەکێشەکە یەکێکە، بەڵام بە هیچ جۆرێك بە واتای ئەوە نایەت کە ئەو بەدیهێنراوانە خۆیان بەدیهێنەرن.

دیدی زانستی، کە لە دیاردەکانی بەدیهاتن و بەدیهێنراوەکاندا وردبوویێتەوەو پێمان دەڵێت کە یەکێتییەکیان لە نێواندا هەیە. یەکێتی شێواز و یەکێتی ڕێساکان و یەکێتی ماددەی خاو، هەموو ئەوانە ئەوەمان پێدەڵێن کە بەدیهێنەریان یەکێکە و هیچ هاوبەشێکی لەگەڵدا نەبووە تا ڕێی پێبدات شێوازەکەی بگۆڕێت، پاك و بێگەردی بۆ خودای بەدیهێنەرو وێنەکێشی هەموو بوون.

**هاوسەنگییە گەورەکە :**

لە ڕێی گەشتەکانی بە کات و شوێندا، لەگەڵ گەردیلە و گەردوون و ژیاندا، لەگەڵ بنچینەی لاشەی مرۆڤ و فرمانەکانیدا، د.مستەفا مەحمود هەمیشە چاوی لەسەر هاوسەنگی گەورەی جیهان بوو، هاوسەنگییەك ئەگەر هەڵەیەك لە بەشێك لە هەزار بەش یان ملیۆن بەش یان ملیار بەشدا ڕوویبدایە، ئەوا ئەو جیهانە پەیدا نەدەبوو، د.مستەفا مەحمود باس لەو هاوسەنگییە دەکات و دەڵێت: لە ڕاستیدا باوەڕبوون بەوەی کە ئەو ڕێکخراویی و گونجانە لە ڕێی هەڕەمەکی و ڕێکەوتەوە پەیدا بووبێت ئەوە خودی سادەو ساکارییە، وەك ئەوە وایە بڵێین تەقینەوەیەك لە چاپخانەیەکدا ڕوویداوە بۆتە هۆی ڕێکسختنی پیتەکان و فەرهەنگێکیان نووسیوە.

هەروەها ئەو زانا کیمیاییە لەخۆباییەی گوتی هەوا و ئاو و خۆڵ و بارودۆخی پەیدابوونی سەرەتای ژیانم بۆ فەراهەم بکەن، منیش مرۆڤێکتان بۆ دروست دەکەم، ئەو کیمیاگەرە هەر زوو دانی بەوەداناوە کە پێویستی بە هەموو ڕەگەزەکان و بارودۆخەکان هەیە، ئەمەش داننانە بە بێتوانایی بەرامبەر بە لاساییکردنەوەی دروستکردنی ئەو بەدیهێنەرەی کە هەموو شتێکی بەدیهێناوە و بارودۆخەکەیشی بەدیهێناوە..ئەگەر ئەوەی داوای کردووە بۆی دابین بکەین، گریمان توانی مرۆڤێك دروست بکات. ئەوە ناڵێت ڕێکەوت ئەو مرۆڤەی بە دیهێناوە، بەڵکو دەڵێت من دروستمکردووە..کەواتە پێویستە دروستکەرێك بوونی هەبێت.

هەروەها قسەکردن لەسەر ئەو مەیمونەی کە لەسەر کیبۆرد دابنیشێت و بۆ کاتێکی بێکۆتایی هەوڵی بێکۆتایی بدات، دەتوانێت بە ڕێکەوت دێڕێکی شکسپیر یان ڕستەیەکی واتادار بنووسێت، ئەمە قسەیەکی ڕەتکراوەیە بەسەریدا[1].

---

(١) لە تەوەرەی دیبەیدا، لە کاتی ڕەخنە گرتنمان لە چەمکی(هەڵبژاردنی سروشتی کەڵەکە بوو) ئەو بانگەشەیەمان وەڵام داوەتەوە

ئەو هاوسەنگییە گەورەیە و گونجانە سەرسوڕهێنەرە کە لە ملیۆنان وردەکاری پێکهاتووە، هاوار دەکەن کە ئەو بەدیهێنراوانە بەدیهێنەریان هەیە، ئەویش خودای بەتوانایە، کە هەموو سیفەتێکی تەواوەتی تێدا هەیە، ئەوە ئەو خودایەیە کە ئایینەکان وەسفیان کردووە، نەك ئەو یاسا کەڕانەن کە زانستییە ماددییە لاڵەکان باسی دەکەن..نەخودای ئەفلاتونیش کە لە جیهانی نموونەییدا خۆی حەشارداوە..هەروەها ئەو بوونە ماددییەش نییە بە تەواوەتی وەك چۆن شوێنکەوتووانی یەکێتی بوون(وحده الوجود) وێنای دەکەن.

## زانست لە شتە غەیبیەکاندا نقوم بووە :

کاتێك بە عەقڵی زانستیمان گوت، کە خودا سنووردار نییە و ناکەوێتە ناو مەودای بینینەوە. بێ کۆتاییە و..غەیبە، وەڵامی داینەوە: کە ئەو بۆیە دان بە خودا دانانێت، چونکە باوەڕبوون بە غەیب لە زانستدا نییە، چونکە بواری زانست جیهانی هەستەکانە، بەو دەستپێدەکات و بەویش کۆتایی دێت.

بە عەقڵی زانستی دەڵێین: درۆت کرد، چونکە لە ئێستادا نیوەی زانست بۆتە غەیبی!.

چونکە کاتێك نیوتن یاسای کێشکردنی دۆزییەوە، زۆرشتی بۆ تەفسیرکردین. کەوتنی سێوەکە لە درەختەکە، قورسی چوونە سەر چیا و، قورسی بەرزکردنەوەی بەردە گەورەکە، هەڵواسانی مانگ بە ئاسمانەوە..ئەوە بیردۆزێکە واقیعی بۆ تەفسیر کردووین. بەڵام سەرەڕای ئەوەش ئەو کێشکردنە غەیبە و هیچ کەس لایەنە پەنهانەکانی نازانێت. نیوتن خۆی لە پەیامێکدا بۆ بێنتلی هاوڕێی دەڵێت: شتێکی ناڕوونە ماددەیەك کە ژیانی تێدا نییە و هەستی نییە کار لە ماددەیەکی تر بکات و ڕایبکێشێت، سەرەڕای ئەوەی هیچ پەیوەندییەکیان لە نێواندانییە. بەڵام ئەوەتا بۆتە بیردۆزێکی زانستی کە باسی دەکەین و باوەڕمان پێی هەیەو بە بیردۆزێکی زانستی دادەنێین، کە لە ڕاستیدا غەیبە.

بەهەمان شێوە ئەلیکترۆن و شەپۆلی وایەرلێس و گەردیلە و نیوترۆن، هیچیانمان نەدیوە، کەچی باوەڕمان بە بوونیان هەیە، بەهۆی کاریگەرییەکانیان، هەروەها زانستی تایبەتی لەسەر دادەمەزرێنین و کارگە و تاقیگەی بۆ دروست دەکەین. لەکاتێکدا بەرامبەر هەستەکانمان غەیبن.

زانست بە هیچ جۆرێك(ماهییەت)ی هیچ شتێکی نەزانیوە، ئێمەش جگە لە ناوەکان هیچی تر نازانین..ئێمە دەستەواژەکان ئاڵوگۆڕ دەکەین بێئەوەی هیچ لە شتە شاراوەکانی بزانین، خوداش ئادەمی تەنیا فێری ناوەکان کرد و ناولێنراوەکانی پێ نەناساند:

﴿ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا .. ﴿٣١﴾ ﴾ البقرة.

واتە: (ئادەمی فێری هەموو ناوەکان کرد). ئەمانە سنوورەکانی زانستن.

ئێمە لەسەردەمی زانستی غەیبی و گەڕان بە ناو گریمانەکاندا دەژین، بۆیە لە ئێستادا زانست بۆی نییە ڕەخنە لە شتە غەیبییەکان بگرێت، لە کاتێکدا گوێچکەکانی خۆی پڕبوون لە شتی غەیبی.

بۆیە باشترە باوەڕ بە زانای غەیب بێنین..بەدیهێنەری میهرەبانمان. کە شوێنەوارەکانی لە هەر چاوترووکانێك و ترپەی دڵێك و ساتێکی بیرکردنەوەدا دەردەکەوێت.

بەم شێوەیە زانست بیرۆکەیەکی ئیسلامی تەواوەتی دەربارەی خودا پێشکەش کردم.

## بەڵگەی ڕۆح و نەفس و لاشە :

د.مستەفا مەحمود دەڵێت: لە کاتی خوێندنی شیکاریمدا، وام هەستدەکرد ئەگەر شیکاری لاشە بکەم دەتوانم لە ڕۆح تێبگەم و هیچ جیاوازییەك لە نێوان ئەو دوانەدا نییە؛ ڕۆح لاشەیە..عەقڵ مێشکە..کەسایەتیش بریتییە لە کاردانەوەکان و کۆی کردارە ڕەنگدانەوەکان. سۆزیش لە کۆتاییدا برسێتییەکی جەستەییە، ئەمەش واتای ئەوەیە کە نەفس هیچ نییە جگە لە پاڵنەری برسیەتی و سێکس و کۆمەڵێك هەستکردن کە بە هۆیانەوە لاشە دەزانێت پێویستی بە چی هەیە.

پاشان هۆشیار بوومەوە و بۆم دەرکەوت کە مرۆڤ پارووەنانەکەی و ماڵ و جێگای گەرمی خەوتنی دەکاتە قوربانی ئامانجی ڕووتی وەك دادگەری و حەق و چاکە و ئازادی. ئیتر کوا پاڵنەرەکانی برسیەتی و سێکس لێرەدا؟!. جەنگاوەر لە مەیدانی جەنگدا لەسەر تۆپ و تفەنگەکەیدا خۆی دەکاتە قوربانی سبەی کە هێشتا نەهاتووە. ئەمە لە کوێی تەفسیری ماددیدایە؟! ئێمە لەبەردەم سەلماندنێکی حاشا هەڵنەگرداین کە نەفس و زاتی مرۆڤ حەقیقەتێکی بەرزترن لە جەستە، تەنیا پێداویستی هەستی نین کە لە ئاوێنەی ناخدا ڕەنگ بدەنەوە.

ئەگەر من خۆم لاشە بم، چۆن دەتوانم خۆم بەرێوە ببەم و بیخەمە ژێر ڕکێفی خۆمەوە؟ لە ڕاستیدا هەژموونی ناخ بەسەر ڕەگەزەکانی لاشە و ئارەزووەکان گەواهی دەرخەری ئەو ڕەگەزە بەرز و جیاوازەن کە زاتی مرۆڤی لێوە پێکهاتووە.

لە ڕاستیدا ئەو ویست و ئیرادە بەهێزەی لاشە دەکاتە قوربانی خۆی، پێویستە بە سروشتی خۆی حەقیقەتێکی بەرز و بڕیاردەر و دەسەڵاتداری هەبێت. لەڕێی نەفسەوە کار لە لاشە دەکەم، لەڕێی عەقڵەوە کار لە نەفس دەکەم، لەڕێی دیدگاوە سنوور بۆ عەقڵ دادەنێم. ئەو جیاوازییەی نێوان بوونە ماددییەکەو بوونێکی لەو بەرزتر کە بەڕێوەی دەبات سەلماندنێکی واقیعیە کە بەرەو ڕۆح

ڕێنموویینمان دەکات، وەك حەقیقەتێکی بەرزترکە سنووری لاشەی تێپەڕاندووە و دەسەڵاتی بەسەردا هەیە، بە هیچ جۆرێك کلك و پاشکۆی نییە کە بە مردنی بمرێت.

کرداری دەرکپێکردن و هۆشیاری لە کاتی لەخەوهەستاندا بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگرە لەسەر ئەوەی کە لەهەر ساتێکدا دووشت بوونیان هەیە. شتە هەستپێکراوەکەو نەفسی هەستپێکراو کە لەدەرەوەیەتی، ئەمە یاسایەکی ناسراوە، کە گۆڕانکاری لە دەرەوە نەبێت هەستی پێناکرێت، هەر لەبەر ئەوەیە کە ناتوانین جووڵەی زەوی ببینن لە کاتێکدا لەسەری نیشتەجێین، بەڵام لە مانگەوە دەتوانین ئەو جووڵەیە ببینین.

هەمیشە بەم جۆرەیە. ناتوانی هەموو لایەنەکانی بارودۆخێك ببینی مەگەر لە دەرەوەی بوەستیت و وەك بابەتێك سەیری بکەی. لەبەر ئەوە ناتوانی هەست بە ڕۆیشتنی کات بکەی مەگەر خودی هەستپێکەرت لە دەرەوەی کات بێت. ئەمەش دەرەنجامێکی سەرسوڕهێنەرە، ڕۆح و خودی هەستپێکەر وەك بوونێکی سەربەخۆی بەرزتر و زاڵتر بەسەرکاتدا خۆی دەسەلمێنێت کە تێپەڕداندووە و لە دەرەوەی بازنەکەیدایە.

ئا ئەوەتا ئێمە لەبەردەم دوانەیەکی مرۆیی ڕاستەقینەداین، بەشێکی نوقمی کاتە، کە لەگەڵیدا تێدەپەڕێت و لەگەڵیدا گەورە دەبێتو لەگەڵیدا پیردەبێت، بەشێکیشی لە دەرەوەی کاتە و لە شوێنێکی ئارامەوە سەرنجی لاشە دەدات، بێئەوەی تێکەڵی ببێت هەستی پێدەکات، هەر بۆیە گەورە نابێت و پیرنابێت و ناپووکێتەوە و تێناپەڕێت. ئەو کاتەش کە لاشە دەمرێت و دەبێتەوە بە خۆڵ، ئەو جەوهەرە هەروەك خۆی دەمێنێتەوە و ژیانی تایبەتی خۆی بێ کات بەڕێدەکات. هیچ ناوێکیش بۆ ئەو جەوهەرە شك نابەین جگە لەو ناوەی کە ئایینەکان لێیاننناوە کە بریتییە لە(ڕۆح).

ئێمە کاتێك هەست بە جوانی دەکەین و لە ناشرینی جیادەکەینەوە، هەست بە حەق دەکەین و لە ناحەق جیایدەکەینەوە، هەست بە دادگەری دەکەین و لە ستەم

جیایدەکەینەوە. ئەوا هەر جارێك بە پێوەرێك پێوانەی دەکەین. بە ڕاستەیەکی جیاواز لەو ڕووداوەی دەبینین. کەواتە ئێمەش لە هەمان پێگەوە دەبینین. پێگەی ڕۆح.

کاتێك ژیانی خۆمان دەژین هیچ بەهایەك بۆ مردن دانانێین و هەر ساتێك بە جۆرێك رەفتار دەکەین کە هیچ گرنگییەك بۆ مردن دانانێین. وەك شتێکی نامەعقول سەیری مردن دەکەین. ئێمە لە ڕاستیدا بیر لەو(من)ە قووڵە دەکەینەوە و ڕەفتاری پێدەکەین کە (ڕۆح)ە، سروشتیی خۆی وایە مردن ناناسێت، چونکە مردن بۆ ئەو ڕۆحەی لە دەرەوەی کاتدا دەژی هیچ نییە جگە لە گۆڕینی جل و بەرگ. تەنیا ڕاگوزەرییەکە. هەرچی لەناوچوون و نەمانە ئەوا ڕۆح نایناسێت.

ڕۆح، ئەو خاڵەی کەوتۆتە چەقی بازنەکەوە، هەموو ڕووداوە کاتییە دنیاییەکانی بە دەوریدا دەخولێنەوە، کەچی ئەو خۆی بەبێ جووڵە و لەناوچوون هەر لە شوێنی خۆیدایە.

ئەم گەڕەی گەشتە ئیمانییەکەی د.مستەفا مەحمود بە قسەی کۆتایی خۆی کۆتایی پێدێنین دەربارەی ئەو گومانانەی کە گەنجانی سەردەم پێیانەوە دەناڵێنن، دەڵێت:

هیچ کات زانستیی ڕاستەقینە لەگەڵ ئاییندا هەڤدژ نەبووە بەڵکو پاڵپشتی کردووە، لە ڕاستیدا زانست عەقڵ دەخاتە گومانەوە. بەتایبەتی ئەگەر ئەو عەقڵە خۆی بە گەورە ببینێت و بە عەقڵانیەتی خۆی سەرسام بێت. بەتایبەتی ئەگەر جەنگەکە لە سەردەمێکدا بەرپا ببێت عەقڵ خۆی وا ببینێت کە هەموو شتێکە. هەروەها ئەگەر نیشانە و بەڵگەکانی ژیارستانیەتی ماددیگەرایی هاوار بکەن، کە تیایدا فڕۆکە و کەشتیی ئاسمانی و مانگە دەستکرد، هەموو ساتێك هاوار بکەن.

من ماددەم. من هەموو شتێکم.

## گەشتی د. عبد الوهاب المسیری:

ئەم گەڕە بە گەشتە ئیمانییەکەی د. عبد الوهاب المسیری کۆتایی پێدێنم، کە بێ دوودڵی لە هەموو گەشتەکانی تر قووڵترە، هەروەك چۆن لە هەموویان زیاتر کاریگەری لەسەر بیر و کەسایەتی من هەبووە، لەوانەیە ئەمە بۆ پەیوەندی تایبەتیم لەگەڵ ئەو بگەڕێتەوە، ئەوەش کە ئاگاداری هەموو وردەکارییەکانی گەشتەکەبووم کاریگەری خۆی هەبوو، دوای ئەوەی کتێبێکم لەسەر نووسی بە ناونیشانی (رحلة عبدالوهاب المسيري الفكرية، قراءة في فكرة وسيرته)[1].

## تۆوی گومان:

د. المسیری دەڵێت: کاتێك لە قۆناغی کۆتایی قوتابخانەی دەمەنهوری ناوەندی بووم، کە تەمەنم شازدەساڵان بوو، هەندێك پرسیار زۆر بە توندی هێرشیان بۆ هێنام، گرنگترینیان پرسیارکردن بوو دەربارەی سەرچاوەی خراپە و حیکمەت لە بوونیان لە جیهاندا، بنچینەی گەردوون و مرۆڤ. لەو ساڵەدا دەستم کرد بە خوێندنی فەلسەفە، کە زیاتر چاوی کردمەوە، یارمەتیدەرم بوو بۆ جۆراوجۆرکردنی پرسیارەکانم و قووڵکردنەوەیان و دارشتنەوەیان بە شێوەیەکی ڕێکخراو.

هیچ کام لە ئەندامانی خێزانەکەم توانای ئەوەیان نەبوو وەڵامێکی تێروتەسەلی ئەو پرسیارانەم بدەنەوە، چونکە زۆربەیان بە پێی داب و نەریت نوێژیان دەکرد و بە ڕۆژوو دەبوون، هەرچی هاوتەمەنەکانی خۆم بوون ئەوا لە ئاستی فیکری

---

(١) ئەم خستنەڕووە لە کتێبەکە وەرگیراوە.

مندا نەبوون، هەر بۆیە ئەوانیش توانای گفتوگۆکردنیان نەبوو لەگەڵ مندا، ئەمەش وای لێکردم واهەست بکەم کە باوەڕی ئایینی تەنیا بابەتێکی ترسنۆکانە و ڕێگریکردنە لە پرسیارکردن، ئەمەش شتێکە ئەوانەی لە تەمەنی منداڵ دان قبوڵی ناکەن.

لە کۆتاییدا، چوومە لای مامۆستای زمانی عەرەبی (کە مامۆستای وانەی ئایینیش بوو) تا پرسیاری لێبکەم، وەڵامی دامەوە کە ئەم جیهانە بەدیهێنراوە پێویستە بەدیهێنەرێکی هەبێت، بەمەش بابەتەکە بەتەواوی ڕوون دەبێتەوە، لێرەدا پرسیم: ئەی کێ خراپە و ئازاری بەدیهێناوە؟ گوتی عەقڵ بێ توانایە لە هەستکردن بەو جۆرە شتانە، لەگەڵ وەڵامە سادەکەدا بە تەنیا جێهێشتم، کە هیچ سوودێکی بۆ دەردەکەم نەبوو، بەڵکو باوەڕەکەمی پارچە پارچە کرد، کارەکە گەیشتە ئەوەی ڕامگەیاند کە هەتا وەڵامی پرسیارەکانم دەستدەکەوێت نە نوێژدەکەم نە بەڕۆژوودەبم.

پاشان دوای ئەوەی چوومە زانکۆی ئەسکەندەرییە بازنەی گفتوگۆم لەگەڵ هەندێك ڕۆشنبیردا فراوان بوو، هەروەها لە کۆلێژی ئاداب، بەشی زمانی ئینگلیزی (کە لێی وەرگیرام)، کۆمەڵێك بیانی تێدابوو کە بە ئازادییەکی تەواو باسیان لەو جۆرە بابەتانە دەکرد، ئەمەش دەرفەتی ئەوەی پێدام پرسیاری زیاتر بکەم، تا کار گەیشتە ئەو ئاستەی گومان بووە پێکهاتەی سەرەکی دید و بۆچوونم.

## بۆشاییەك کە بە مارکسییەت نەبێت پڕنەبووەوە:

ئەو گومانانەی لەلام دروستبوون بۆشاییەکیان خستە دڵمەوە، ئیتر بوارێك بۆ شێوازە کۆنەکان نەمایەوە، پێویست بوو کە ئەم بۆشاییە بیروباوەڕییە (یان ئایدۆلۆژییە) پڕ بکرێتەوە، لەبەر ئەوەی من لە دژی ستەمی کۆمەڵایەتی ڕاپەڕیبووم، ئەوا بە نزیککراوەیی شتێکی حەتمی بوو کە بەرەو مارکسیەت

بڕۆم. لە ڕاستیدا گرنگیدانی من بە مارکسیەت لەسەرەتادا لە ڕووی فکرییەوە بوو، تا ئەو کاتەی کە بە یەکێك لە ئەندامانی حیزبی شیوعی گەیشتم، کە لە ساڵی ١٩٥٥ کردمی بە ئەندامی حیزبەکە، پاشان بەهۆی شارەزاییم لە زمانی ئینگلیزی و سەرچاوە سەرەتاییەکانی بیری مارکسییەت.

## ڕەفتاری هاوبیرەکانم لە مارکسییەت ساردیان کردمەوە

دوای ماوەیەك، هەستم کرد ڕەفتاری هاوڕێکانم پێچەوانەی هەموو بەهاکانی ئاینی و مرۆڤایەتی بوون، هەروەها هەستی بەخۆسەرسامبوون لەلای هەندێکیان زۆر زیاد بوو، هەروەك چۆن ئازادی تەواوەتیان دابوو بەخۆیان،، هەروەك چۆن مارکسیەتی هەندێکیان لە ڕقێکی چینایەتی کوێرانە سەرچاوەی گرتبوو، نەوەك لە باوەڕبوون بە پێویستی بەرپاکردنی دادگەری لە زەویدا. تەنانەت زۆر کات هەستم بەوە دەکرد کە هەندێکیان بەهۆی چینەکەیەوە مارکسی بوو، ئەگەر دەرفەتی ڕاکردنی لە چینەکانی هەبوایە بۆ چینە ستەمکارەکان، ئەوا بێ هیچ دوودڵییەك دەچووە پاڵیان و مارکسیەتەکەی تەڵاق دەدا.

ڕیزەکانی حیزب پڕبوون لە کەسانی بیانی و ئەندامانی کۆمەڵە جولەکەکان و خوێنگەرمی بۆ جەنگ دژی فرانکۆ لە ئیسپانیا، لە هەمان کاتدا پشتگوێخستنی جیهاد لە دژی سەهیۆنییەکانی فەلەستین! چونکە ئەم جۆرە جیهادە بە کەوتنە ناو دواکەوتوویی عەرەبی هەژمار دەکرا، - لە دیدی ئەواندا -چارەسەرکردنی ململانێی عەرەبی - ئیسرائیلی بریتی بوو لە هاوپەیمانی نێوان کرێکار و جوتیارە ئیسرائیلییەکان و عەرەب لە دژی سەرمایەدار و دەرەبەگە عەرەب و جولەکەکان[1]!.

---

(١) د.المسیری لەسەر زاری هاوڕێیەکی فەلەستینی بۆمان دەگێڕێتەوە، کە هەندێك لە شیوعییە ڕۆژئاواییە توندڕەوەکان چوونەتە ناوەندێکی ڕاهێنانی کەسی فیدایی، لەوکاتەدا تەقەیان لێکراوە، ئەوانیش وەك مرۆڤی ئاسایی لە پشت ئۆتۆمبێلەکان خۆیان حەشارداوەو دەستیان کردووە بە خوێندنی دوعای ئاینی و داوای یارمەتیان لە خودا کردووە!

لەبەر هەموو ئەو شتانە دەستلەکارکێشانەوەم پێشکەش کرد و داوام کرد کە وەك هاوڕێی حیزب هەژمار بکرێم نەوەك وەك ئەندامی حیزب.

## گەڕانەوەی هۆش:

دەکرێ (گەشتی وجودی فیکری) لە ژیانی د. المسیریدا لە پێنج قۆناغدا کۆبکرێتەوە:

- هەژمورنی نموونەی ماددی فەلسەفی(هزرە ماددییەکان) بەسەریەوە، دوای ئەوەی لە دەمەنهور پاشان لە ئەسکەندەرییەدا تووشی گومان بوو[1].

- پاشان بە پلەبەندی هەستکردنی بەوەی کە نموونەی ماددی بێتوانایە لە زانینی هەموو لایەنەکانی مرۆڤ. ئەمەش بەهۆی سادەیی و ساکاری و وردکردنەوە و ئیختیزالیەتی نموونەکە.

- پاشان هەستکردنی زیاتری بە پێکهاتەی مرۆڤ و دوانەیی(ماددە و ڕۆح).

- پاشان دانانان بەوەی کە مرۆڤایەتی مرۆڤ سەرچاوەکەی ڕەگەزێکی غەیبییە (ڕۆح)، بوونی خودا نەبێت ناتوانێت تەفسیری بکات.

- پاشان سەرنجدان و وردبوونەوە لە ئایینە ئاسمانییەکان و ڕۆژهەڵاتییەکان و هەڵبژاردنی ئیسلام وەك ئایین.

د. المسیری باسی ئەو قۆناغە دەکات و دەڵێت: گەشتەکەم لە بێباوەڕییەوە بۆ گومان پاشان بۆ باوەڕ، گەشتێکی تەواو عەقڵی بوو، بزوێنەری یەکەمی بریتی بوو لە سروشتی پێکهاتووی مرۆڤ، هەروەها ڕاگوزەریم لە تەسکی

---

(١) ئەم نموونەییەمان لە دیدی د.المسیریدا لە کۆتایی تەوەرەی یەکەمدا تاوتوێ کردووە، لە ژێر ناونیشانی(بەدوای یەکدا هاتنی هزری ماددی و ژیارستانیەتی ماددی و پاشان بێباوەڕی)، بینیمان کە چۆن ئەم بە دوای یەکدا هاتنە مرۆڤ بەرەو بێباوەڕی دەبات.

ماددیگەرایییەوە بۆ فراوانی مرۆڤایەتی کارێکی ئاسان نەبوو، چونکە من وا بە ئاسانی نەمزانی کە دوو یاسا بوونیان هەیە: یەکێکیان بۆ مرۆڤ و ئەوەی تریان بۆ مادده، ئەوەك تەنیا یاسایەکی ماددی کە هەردووکیان لەسەری بڕۆن. گۆڕانەکەم کردارێکی دوورو درێژ و ماندووکەر بوو زیاتر لە نیو سەدەی خایاند، چونکە لە ڕاستیدا فەلسەفەی ماددیگەرایی فەلسەفەیەکی زۆر ئاسوودەیە، واقیع و وجودی مرۆڤایەتی لە یاسای ماددیدا ورد دەکاتەوە، لەبەر ئەوە توانای ئەوەی هەیە وەڵامی واقیعی و خێراو ئاسوودە بخاتە بەردەستی مرۆڤ.

## پێشەکییەکانی دۆزینەوەی خود :

سەرەڕای قەناعەتی عەقڵی د. المسیری بە بێباوەڕی، بەڵام هەستکردن بە دەرچوونی مرۆڤ لە ماددیگەرایی لە ویژدانیدا شاراوە بوو، زۆر هۆکاریش هەبوون کە یاریدەدەری ئەو هەستە بوون تا پێکبێت و بەرجەستە ببێت، د. المسیری باسی ئەو هۆکارانە دەکات و دەڵێت:

١- لەکاتی گەورەبوونمدا لە ناو کۆمەڵگەیەکی کلاسیکی لە دەمەنهور تۆوی بەزەیی کەوتە ناو خاکەکەمەوە، ڕۆشنبیری ئیسلامیشم کە هەر لەو کاتەدا وەرمگرت ئەو تۆوەی ئاودا.

٢- ئەدەب (کە لە پسپۆڕییەکەیدا خوێندم) تاکە پسپۆڕی بوو کە هێشتا بەو جۆرە ڕەفتاری لەگەڵ مرۆڤدا دەکرد کە بوونەوەرێکی ئاوێتە و پێکهاتەیە، ناکرێ لە ژێر ڕۆشنایی ڕەگەزێك یان دوو ڕەگەزدا تەفسیر بکرێت(پێچەوانەی ئابووری - بۆ نموونە - کە لە زۆربەی کاتەکاندا تەنیا لە چوارچێوەی بەرهەمەکانی ئابووریدا ڕەفتار لەگەڵ مرۆڤدا دەکات).

٣- کاتێك بڕیارمدا هاوسەرگیری لەگەڵ د.هودا بکەم، لەو کاتەدا هەڤدژیی ئەو نموونەیە دەرکەوت کە هەژموونی بەسەر مندا هەبوو(هزری ماددیگەرایی) لەگەڵ سۆزداری و ئەو ڕەفتار و قوربانیانەی لێیەوە پەیدا دەبێت.

٤- کاتێك خودا کچەکەم (نور)ی پێدام، بینیم کە منی عەقڵانی ماددی ڕووبەڕووی موعجیزەیەك دەبمەوە، وای لێکردم لە بیرکردنەوەدا نقووم بم، منداڵێك لە دایك دەبێت، دوای لەدایکبوونی بە چەند ساتێك بەچاوە فراوانەکانی سەیری دەوروبەری خۆی دەکات، هەروەها بینیم هاوسەرەکەم لەشەو و ڕۆژێکدا گۆڕاو بۆ دایکێك کە بە دوو مەمکەکانی شیری بە بچکۆلانەکەی دەداو شێتانە وابەستەی بوو بوو. کچە هاوڕێکەی زانکۆم، کە لەگەڵیدا دەچوومە سینەما و گەشت و سەیران، ئێستا بۆتە دایك و چۆتە ناو جیهانێکی نوێ کە من بە سەرسامی لە کەنارەکانیدا وەستاوم، هەست بە غوربەت دەکەم، پاشان جارێکی تر تووشی شۆك بووم کاتێك هاوسەرەکەم بڕیاریدا کە چیتر لە خوێندنی باڵا بەردوام نەبێت؛ تەنیا لەبەر ئەوەی کە نایەوێت کچەکەی لە ئەنجامدانی هەموو فرمانە بایۆلۆجییەکان بێبەش بکات، بە جۆرێك لەگەڵ ئیقاعە جەستەییەکانی بگونجێت و لەڕووی عەقڵییەوە هێوری بکاتەوە. لەو کاتەدا تووشی شۆك بووم، چونکە هەرگیز بیرم لەوە نەکردبووەوە، جگە لە کار و دەستکەوتی ماددی بیرم لە هیچی تر نەدەکردەوە لە مەیدانی ژیاندا.

پاشان دەستمکرد بە بیرکردنەوە و تێڕامان لەو بوونەوەرە نوێیە کە هاتبووە نێو ژیانمەوە: ئایا دەکرێ تەنیا بەرهەمی کارلێکە کیمیاییەکان و ئەنزیمەکان و غودە و ماسولکەکان بێت؟ ئایا ئەم مرۆڤە بەرهەمی ئەندامە ماددییەکانە و بەرهەمی ڕێکەوتە، یان ئەوەتا شتێکی تر هەیە کە دەکەوێتە دەرەوەی سنووری ڕووە ماددیکەوە؟ ئایا بەڕاستی مرۆڤ بەشێکە لە سروشت و، ملکەچی یاساو ئارەزووەکانیەتی یان ئەوەتا نهێنی و شاراوەی خۆی هەیە؟ دیاردەی مرۆڤ بۆ من بوو بە دیاردەیەکی ناماددی و ناسروشتی بە هەموو پێوەرەکان بوو بە موعجیزە.

٥- شەوێك هەیە هەرگیز لە یادی ناکەم، کە من ناوی دەنێم (شەوی گریانی منداڵەکە)، کاتێك نوری کچمان، کە هێشتا دوو ساڵی تەواو نەکردبوو، بە دەنگێکی بەرز دەگریا، ترس و خەمێکی تێکەڵ بەیەکتر، نەماندەزانی هۆکارەکەی چییە، هەرکاتێك دایکی هەڵی دەگرت و دەیخستە سەر شانی بێدەنگ دەبوو، بەڵام کاتێك من لێی نزیك دەبوومەوە بەدەنگی بەرز هاواری

دەکرد، تاکو نووست دایکی هەر لەگەڵیدابوو، ئەوکاتە هەستم بە هەندێك لەو نهێنیانە کرد و تێگەیشتم کە چەند پێویستیمان بە دایك هەیە.

٦- کاتێك خودا کوڕەکەمان (یاسر)ی پێبەخشین، خۆم و هاوسەرەکەم واماندەزانی کە لەسەرپەروەردەکردنی منداڵ ڕاهاتووین، کەچی بینیمان بە تەواوی لە خوشکەکەی جیاوازەو بەخێوکردنی پێویستی بەشارەزای زیاتر هەبوو، چونکە کچەکەمان حەزی لە تاقیکردنەوە بوو و توانای زمانەوانی زۆری هەبوو، هەرچی یاسر بوو، ڕقی لە تاقیکردنەوە بوو و لە جیهانی ژمارەکاندا دەژیا، لە ئەنجامی ئەو جیاوازییەشدا لە بیروباوەڕمدا چەسپا کە مرۆڤی موعجیزە هۆکارە بۆ بۆماوەیی و ژینگەییەکان تێدەپەڕێنێت کە یاسر و نور تیایدا هاوبەشبوون، هەروەك چۆن گرنگی خێزانم بۆ دەردەکەوت لە کرداری گەشەکردن و پەروەردەکردندا، هەروەها پرسیم، چۆن فەرمانبەرێکی تایبەت بە پەروەردەی منداڵ لە کۆمەڵگەی شیوعیەتیدا - هەرچەند پسپۆڕبێت - دەتوانێت پێداویستییە دەروونییەکانی منداڵ بزانێت، کە لە منداڵێکەوە بۆ منداڵێکی تر دەگۆڕێت.

٧- پاشان بە ژیاننامەی پێشەوای مسوڵمان ماڵکۆڵم ئێکس[1] ئاشنابووم، پێشتر پێشەوا و بازرگانی ماددەی هۆشبەر بوو، کاتێك چوو بۆ زیندان، مسوڵمانە ڕەشپێستەکان بڕوایان پێهێنا کەمسوڵمان ببێت، ئیتر ژیانی دەستی بە گۆڕان کرد، چونکە جیهانیەتی دیدی ئیسلامی بۆ (خودای جیهان) بۆ دەرکەوت، کە لە هەمان کاتدا دووربینە و نزیکبینە بەرامبەر بە خودا، هەروەك چۆن سروشتی کۆمەڵەی ئیسلامی بۆ دەرکەوت(لە بەرامبەر تاکێتی خۆپەرستی کۆمەڵگەی ئەمریکی). لە کاتی هاتنی بۆ مەککە بۆ حەج، ماڵکۆڵم ئێکس بۆی دەرکەوت کە دەکرێ یەکسانی لە نێوان مرۆڤەکاندا بەدیبێت، بۆیە بڕیاریدا ڕقی لەبەرامبەر سپی پێستەکاندا نەهێڵێت، گەڕایەوە ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆ ئەوەی حیزبێکی

---

(١) Malcolm X : (١٩٢٥ – ١٩٦٥ز)، ئەمریکی – ئەفریقییە، مسوڵمانە، یەکێکە لە بانگەواز حوازانی مافی مرۆڤ و، بە یەکێك لەو گرنگترین ئەو ئەمریکییانە دادەنرێت لە مێژووی ئەمریکادا کە بە ڕەچەڵەك ئەفریقییە، کاتێك لە زیندان دابوو پەیوەندی کرد بە کۆمەڵەی ئوممەتی ئیسلام، کە بەخێرایی بوو بە پێشەوای، پێش ئەوەی تەمەنی چل ساڵی تەواو بکات دەمارگیرە سپی پێستەکان کوشتیان.

نوێ دابمەزرێنێت کە تیایدا سپیپێست و ڕەشپێست پێکەوە کار بکەن بۆ ڕەتکردنەوەی ماددیگەرایی، بەڵام بە گوللەی ڕەگەزپەرستان بە ناحەقی پێکرا.

چەند نازداری مامۆستاکەم (المسيري)؛ ئەو شتانەی بە سادەیی بەسەر ئێمەدا تێدەپەڕن و بە بەدیهییان دەزانین، تۆ شیلەی باوەڕی لێ دروست دەکەی کە دڵ مەست دەکات، بەڵگەی خوایەتی لێ دەردێنی کە کڕنوش بە عەقڵ دەبەن.

## چەند وێستەگەیەک لە گەشتی باوەڕدا :

د. المسيري دەڵێت: لە پێناو گەیشتن بەو گۆڕانکارییەم لە بێباوەڕییەوە بەرەو گومان ئینجا بەرەو باوەڕ بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕیم، لە هەر قۆناغێکدا هەوڵم دەدا کە هەر لەو قۆناغە بمێنمەوە - بۆ ئەوەی لە ماددیگەرایی نزیکتر بم - و بە ناچاری نەبێت لێی دوور نەکەومەوە، بەڵام دوای ئەوەی ماددیگەرایی لە وەڵامدانەوەی پرسیارەکانم بێتوانا دەبوو و لە پێشەکەشکردنی ئاسوودەیی دەروونیم شکستی دەهێنا، ئەوکات بە ناچاری دەچوومە قۆناغێکی تری نوێوە.

## قۆناغی یەکەم: دەرکەم بە پێکهاتەی دیاردەی مرۆڤایەتی کرد

(قۆناغی یەکەم) ئەوکاتە دەستی پێکرد کە تێبینیم کرد هەندێک لە نووسینە ئەدەبی و فەلسەفییەکانی ڕۆژئاوا (بەتایبەتی ئەوانەی بەوە وەسف دەکران کە کتێبی سۆفیگەرین) کەوتوونەتە هەڵەو تێکەڵکردنێکی گەورەوە، بەو پێیەی جیاوازی لە نێوان شتی(ڕۆحی)و(ماددی) ناکەن، بۆیە شتێکی ئاسایی و باو بوو کە کەسێک لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا سەردانیکردنی بۆ مۆزەخانە یان چوونی بۆ چێشتخانە یان ڕۆیشتن بۆ سەیرکردنی شانۆگەرییەک یان

کۆنسێرتێک(تەنانەت لایەنی سێکسیش) بە ئەزموونێکی (ڕۆحی) هەژمار بکات! لەو کاتەدا بۆم دەرکەوت کە ئەوانە پەیڕەوی لە(ڕۆمانییەتێکی ماددی) دەکەن کە تیایدا ڕۆح و ماددە یەکدەگرن و پیرۆزی و ناپیرۆزی تێکەڵ دەبن. ئەم دووانەیە ساختەیەیان جیاوازییەکی ڕاستەقینە لەنێوان دوو ڕەگەزدا نیشان نادات، بەڵکو جیاوازییەکە تەنیا لە ناوەکەیاندایە.

ئەمە هەمان ئەو بیرە شاراوەیەیە کە لەپشت سەرمایەداری و ئیمپریالی فەلسەفە فاشییەکانەوە[١] هەیە، چونکە هەمووان بانگەواز دەکەن کە فیردەوس لێرەیە(یۆتۆپیای تەکنەلۆجی)[٢]! دەرکم بەوە کرد کە ئەم هزرە باوەڕی بە سەرکەوتنی ماددەوە هەیە و سەربەخۆیی و جیابوونەوەی مرۆڤ لە سیستەمی سروشتی ماددی ڕەتدەکاتەوە و بانگەشەی ئەوە دەکات کە ئەمە هەموو جۆرەکانی خۆشگوزەرانی بۆ مرۆڤ بەدیدێنێت!

ئەوسا وازم لەو جۆرە بۆچوونەم بەرامبەر جیهان هێنا کە تاکە بوونێکی ماددی سادەیە و تەنیا لەسەر پەیوەندییە ئابوورییەکان دامەزراوە، لە ساکاری ماددیگەرایی و وردکردنەوەی چووەمە سەر دەرککردن بە پێکاتەی دیاردەی مرۆڤایەتی.

## قۆناغی دووەم: پەیڕەویم لە ڕەگەزی گەردوونی کرد

داننانم بە تایبەتمەندێتی مرۆڤ ناچاریکردم کە لە جیهانی ماددەدا بە دوای چەمکی جێگیردا بگەڕێم کە سەربەخۆیی و ئازادی و پیرۆزی مرۆڤ بسەلمێنێت، لە هەمان کاتدا لە چوارچێوەی ماددیگەرایدا بیهێڵنەوە، کە زۆر لەیەک دوورن!

---

(١) فاشیزم Fascism : حوکمێکی ستەمکارییانەیە، لەسەر دەمارگیری نەتەوەیی دامەزراوە، وەک نازییەت و سەهیۆنیەت.

(٢) واتا تەکنەلۆجیا خەونی شارە پیرۆزەکە و فیردەوسی زەمینی بۆ مرۆڤ بەدیدێنێت.

بەهۆی ئەوەی کە بوونی (ڕەگەزی خوایەتی)م لە مرۆڤدا ڕەتکردەوە، پەیڕەویم لە شتێك کرد کە ناوم نا (ڕەگەزی گەردوونی)، ڕەگەزە گەردوونییەکان چەند چەمکێکی مەعنەوی شاراوەن، کە لەناو جیهانی ماددەدا بوونیان هەیە و بە درێژایی مێژوو لە مێشکی مرۆڤدا چەسپاون کە بەرژەوەندییەکانی بەدیدێنێت، ئەمەش وای لێکردم هەست بە ئەندازەیەك لە تایبەتمەندێتی مرۆڤ بکەم.

نموونەی ڕەگەزە گەردوونییەکان کە بۆ ماوەیەك پەیڕەویم لێکرد وەك (گرنگی هاوسەنگی و تێگەیشتن لەگەڵ سروشتدا)، چونکە تێبینی ئەوەم کردبوو کە مرۆڤ بە ناوی (پێشکەوتن) سامانە سروشتیەکان بە خێراییەکی زۆر و نابەرپرسانە بەکار دەهێنن، ئەمەش توشی فەوتانمان دەکات: ژینگەیەکی پیس، جیهانێك کە لەسەر ماددەی خاودا پێشبڕکێ دەکەین، هەسارەیەکی ڕووت و بێ سەوزایی، ڕووبارەکان ترشی کوشندەیان هەڵگرتووە لە بری ناوی سازگار، هەواکەش ئەندازەیەکی باشی لە دوانەئۆکسیدی کاربۆن هەڵگرتوە.

هەروەها کاتێك ڕۆژانە ڕۆژنامەکان دەخوێنمەوە بیر لەوە دەکەمەوە کە چ ئەندازەیەکی زۆر بە ماتۆڕی کارەبای بڕاونەتەوە بۆ ئەوەی ئەو هەواڵانەم پێ ڕابگەیەنن کە هیچ پێویستییەکم پێیان نییە و لە هەواڵەکانی تەلەفزیۆندا گوێم لێیان بووە. بۆم دەرکەوت کە پێشکەوتنی زانستی دەبێتە هۆی کارەساتێکی گەردوونی، ناتوانین لە ڕێی ئەو چەمکانەوە لە دژی ئەو ناڕاستەیە بوەستینەوە کە بەدرێژایی مێژوو لە دەروونماندا چەسپاون، کە جەخت لەسەر هاوسەنگی و تێگەیشتن لە گەڵ سروشتدا دەکەینەوە.

هەروەها تێبینی ئەوەم کرد کە ئەو داڕمانە تا ناخی مرۆڤیش درێژ بۆتەوە، چونکە مرۆڤ خەریکە خۆی لەدەست دەدات و لە بێئاگاییەکی تەواودا دەژین بە هۆی ماددەی هۆشبەر و هاوڕەگەزبازییەوە و دەستکردن بە ئەنجامدانی تاقیکردنەوەی وا کە بێگومان دەبنە هۆکاری پەیدابوونی مرۆڤی شێواو. لەو کاتەدا دەرکم بە بنچینەی چەسپان لە ڕێی مێژوودا کرد، کە بریتییە لەوەی (مرۆڤی هۆشیار لەو مرۆڤە باشترە کە هۆشی لەدەست داوە، پەیوەندی سێکسی

نموونەیی بریتییە لە پەیوەندی نێوان پیاو و ژن، نەوەك لە نێوان دوو تاکی هەمان ڕەگەز (هاوڕەگەزبازی)).

بەهەمان شێوە گرنگیدانم بە مێژوو نموونەیە لەسەر چەمکی (ڕەگەزی گەردوونی)، چونکە مێژوو بەرهەمی مرۆڤە نەوەك بەرهەمی سروشت / ماددە، ئەو گرنگیدانەش ڕەنگدانەوەی هەبوو بۆ (گرنگی دووپاتکردنەوەی ناسنامەی نەتەوەیی)، بۆ گوزارشتکردن لەو ناسنامەیە دەستم کرد بە گۆڕینی هەندێك لە شێوازەکانی ژیان، بۆ نموونە، لەو ئاهەنگانەدا کە لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا بۆ ماڵئاوایی کردنم ساز دەکران جامانەیەکی گوندیم لەسەر دەکرد و بۆ نیشاندانی ئەوەی کە گەڕانەوەم بۆ نیشتیمانەکەم گەڕانەوەیەکی جەستەیی نییە، بەڵکو گەڕانەوەیەکی ڕۆحییە.

لەوانەیە دوژمنایەتی کردنم بۆ سەهیۆنیەت (زایۆنیزم) بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە ئایدۆلۆژیایەکە نکۆڵی لە مێژوو دەکات، پاشان دوژمنایەتی مرۆڤ و بەهاکان دەکات، هەر لەبەر ئەوە پەیڕەوم لە پرسی فەلەستین کرد، کە بوو بە پرسێکی تەوەرەیی لە ژیانمدا؛ چونکە پرسێکە ناوەڕۆکێکی ڕەوشتی ڕوونی هەیە کە ناکرێ دانووستانی لەسەر بکرێت (ڕەگەزێکی گەردوونییە)، لە دیدێکی داروینی ماددی دڕندانەوە(مانەوە بۆ بەهێزترینە) نەبێت ناتوانرێت ڕەتبکرێتەوە.

## قۆناغی سێیەم: دەرکم بە فیترییەتی چاکە و خێر کرد

تێبینی ئەوەم کرد کە زۆربەی مرۆڤەکان، سەرەڕای ئەو خراپە و دڕندەییەی تێیاندا هەیە ئەندازەیەکی گەورەی خێر و چاکەشیان تێدا هەیە، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی چەند پرسیارێك خۆیان بخەنە ڕوو: چۆن تەفسیری ئەو چاکەیە بکەین؟ ئایا مرۆڤی سروشتی/ماددی توانای ئەنجامدانی چاکەی هەیە؟ بۆچی چاکە بکەم و خۆم لە خراپە بەدوور بگرم؟ لەسەر چ ئاستێك دەتوانین حوکم بەسەر شتەکانەوە بدەین بۆچی فەرمان بە چاکە بکەین و قەدەغەی خراپە

بکەین؟ ئایا چاکە و خراپە بوونیان هەیە؟ ئایا کاتێك بە هۆی بارووذۆخەوە هەموو شتێك دەکەوێت (داننان بە واقیع) ئایا هەموو شتێك نابێتە شتی ڕەوا؟...

چەند پرسیارێك هەمیشە بەبیرمدا دەهاتن و ماندوویان دەکردم و ئەوەندەی نەمابوو بمفەوتێنن، بە تایبەتی کاتێك کارێکی باشم ئەنجامدەدا کە خەرجییەکی زۆری هەبووایە و زۆرم لەسەرم کەوتبا. بە ڕاستی کارێکی ماندووکەرە مرۆڤ لە هەموو کارێکدا کە ڕووبەڕووی دەبێتەوە هەست بە دڵەڕاوکێ بکات و، لە ڕێی دوو نموونەی دژیەکی ناخییەوە کە لە ناخیدا ململانێ دەکەن بڕیار بەسەر کارەکەدا بدات؛ یەکێکیان ماددی و ئەوی دیکەیان مرۆیی. پاشان مرۆڤ بێت بەبێ هۆ دووەمیان بەسەر یەکەمیاندا هەڵبژێرێت. ئەم گەڕانە گەرم و گوڕەم بۆ ماوەی چارەگە سەدەیەك بەردەوام بوو بەر لەوەی کە بگەم بەو بڕوا و قەناعەتە ئیمانییانەی کە ئێستا لەسەریانم.

لەوانەیە قەسیدەی (دەریاوانە کۆنەکە)ی کۆلێردج[1]، کە قەسیدەکە سەر بە شیعری ڕۆمانتیکییە[2] زۆر یارمەتیدەرم بووبێت. قەسیدەکە چیرۆکی دەریاوانێك باس دەکات کە خاسیەتی رووکەش و سوودگەرایی مادیگەراکانی هەیە، کە شەڕ لەگەڵ باڵندەی بەترۆس/قەترەسی سپی زەبەلاحدا دەکات(کە ڕەمزی کۆمەڵی مرۆڤایەتی و ڕەمزی خودایە)، لەو کاتەدا ڕووبەڕووی جیهانێکی ماددی بێ خودا دەبێتەوە، کە خاڵییە لە هەموو بەزەیی و خۆشەویستییەك و، ژیان دەبێتە وێرانە و کەشتییەکەی لە جووڵە دەکەوێت و، تەنانەت ناوی دەریاش بۆگەن دەبێت. بە پلەبەندی دەریاوانەکە بۆی دەردەکەوێ کە جیهانی ماددە و حیساباتی قازانج و زیان لە جیهانی مرۆڤدا زۆر سوودی نییە. دوای ئەوە جیهانەکەی لە جیهانی ماددە دەگۆڕێت بۆ جیهانێك کە گیان و پیرۆزی لەبەردا بێت، بەمەش دەرك بە جوانی بچوکترین و ناشیرینترین زیندەوەرە دەریاییەکان دەکات

---

(١) Samuel T.Coleridge: (١٧٧٢-١٨٣٤ز)، شاعیر و فەیلەسوفی رۆمانتیکی بەریتانییە.

(٢) ڕەوتی ڕۆمانتیکی لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەیەمدا وەك کاردانەوەیەك بەرامبەر ماددیگەرایی ڕۆشنگەری ڕۆژئاوایی پەیدابوو، کە کاریگەری بەسەر بوارەکانی فەلسەفە و ئەدەب و شیعر و هونەرەوە هەبوو و، ڕەوتەکە بە ئاراستەی مرۆیی و هەست و سۆز و سرووشتی جیادەکرێتەوە.

و پیرۆزیان دەکات و ئارەزووی زاڵبوون و کۆنترۆڵکردن لەدەستدەدات. بەمەش نەفرەت نامێنێت و بەرەکەت جێگای دەگرێتەوە، ئەمەش دوای ئەوەی سەلماندی کە توانای خۆشەویستی و هەستکردن بە جوانی و دەربازبوونی هەیە لە جیهانی ماددەدا. دوای دابڕانێکی زۆر دەگەڕێتەوە ناو کۆمەڵی مرۆڤایەتی.

ئەم قەسیدەیە کاریگەرییەکی قووڵی لە ناخمدا بەجێهێشت و وایلێکردم کە بە دوای جیهانی نەبینراودا بگەڕێم.

لە بەرامبەر مەترسی ماددیگەرایی و ڕێژەیی ڕەها هۆشیاربوومەوە و، بۆم دەرکەوت کە مەحاڵە مرۆڤ بەبێ ناوەند و بەها و مەرجەعییەتێك لە جیهانی ماددیدا بژی. بۆم دەرکەوت کە بەبێ جیاکردنەوەی چاکە و خراپە و نەبوونی پێوەرەکان ناکرێ حوکم بەسەر شتێکدا بدرێت، چونکە حوکمدان بەسەر شتێکدا پێویستی بە بوونی زەمینەیەکی فەلسەفی و ڕەوشتی هەیە کە هەندێك سەلمێنراو و بەدیهییاتی لەخۆ گرتبێت کە یاساکانی ماددە و جووڵە تێدەپەڕێنێت و، وادەکات کە توانای بڕیاردان و جیاکردنەوەمان هەبێت.

## قۆناغی چوارەم: سەرچاوەی ئازادی ویست

نووسینەکانی جۆن ستیوارت میل[1] - بەتایبەتی ئەوانەی کۆتایی - هۆشیان دەبردم، چونکە بڕوا و قەناعەتەکانی ئەم فەیلەسوفە نەفعی و لیبڕالییە لە کۆتاییەکانی ژیانیدا تووشی پشێوی و ناجێگیری بوو بوون، بەردەوام دەیگوت: ((سوکراتێکی ناڕازی بەم باشترە نەوەك بەرازێکی ڕازی)).

منیش دەمپرسی: ئەگەر بەراز لە جیهانی هەستەوەرەکان و ماددەدا بژی و دەربارەی هیچ کام لە ڕەوشت و بەها ڕەهاکان پرسیار نەکات، تووشی هیچ

---

(١) John Stuart Mill: (١٨٠٦-١٨٧٣ز)، فەیلەسوف و ئابووری ناس و سیاسەتمەداری بەریتانی، یەکێك بوو لە بانگخوازانی مافی مرۆڤ.

هێرشێکی گومان و پرسیار نەبێت، ئەی چی دەربارەی سوقرات؟ بۆچی نارازییە؟ بۆچی لە بەرازی ڕازی بەباشتری بزانین؟

فەیلەسوفەکە وەڵاممان دەداتەوە: ((بەراز بەبێ ویستی خۆی بوو بە بەراز، هەرچی سوکراتە ئەوا خۆی ویستی کە هاوشێوەی بەراز نەبێت (ئازادی ویست) کەواتە ئازادی ویست بریتییە لە دەرگای چوونە ژوورەوە بۆ کرداری بەراوردکردن و بە باشترزانین))، هەروەها دەرگای ئەوەیە کە ئێمە مرۆڤین.

لەوکاتەدا لە خۆمم پرسی: ئەگەر پەیدابوونمان پەیدابوونێکی تەواو ماددی بێت، ئیتر سەرچاوەی ئەم ئازادی ویستە چییە؟ دەستمکرد بە بیرکردنەوە، ئایا بریتییە لەو ڕوناکییەی خودا لە دەروونماندا دایدەنێت تا بەهۆیەوە گوزارشت لە خۆی بکات؟

## قۆناغی پێنجەم، ماڵئاوا گومان، کتێبی فیردەوسی زەمینی (الفردوس الأرضي).

لە کتێبەکەمدا ((الفردوس الأرضي)) (کە لە ساڵی ١٩٧١ دەستم پێکرد و لە ساڵی ١٩٧٩ تەواو بوو) کۆژانەکانی خۆمم تێدا خستەڕوو هەموو پرسیارەکانی خۆمم تێدا گەنگەشە کرد. لەوەش گرنگتر، کتێبەکە پڕە لە ئاماژەی ئایینی، بۆ نموونە کاتێك دەربارەی بزوتنەوەی هیپز[1] نووسیم وتارەکەم بەم دەستەواژەیە کۆتایی پێهێنا: ((بەڕاستی بۆ کەسی بێهۆش کە عەقڵی لە دەستداوە بێدەنگی

---

(١) بزوتنەوەی هیپز Hippies: دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی بوو، کە لە بنەڕەتدا بزوتنەوەیەکی گەنجان بوو لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا لە شەستەکان و حەفتاکانی سەدەی بیستەم دەستی پێکرد. بە بزوتنەوەی ژیاندنەوە و نوێکردنەوەی بەهاکانی سەرمایەداری دادەنرێت، لە دەسەڵاتی گەورەکان و دیمەنەکانی ماددیگەرایی و نەفعی و کلتوری بە کاربردن یاخی بوو، بانگەشەی بۆ جیهانێك کە ئازادی و یەکسانی و خۆشەویستی و ئاشتی باڵی بەسەردا بکێشێت دەکرد. بە درێژ کردنی قژیان و پۆشینی جل و بەرگی فراوان و شۆڕ و گەڕان و گەشت کردن بە ئارەزووی خۆیان وەك گوزارشت کردن لە نزیکیان لە سروشت و خۆشەویستیان بۆ سروشت خۆیان جیا کردۆتەوە.

پیرۆزترینی پیرۆزییەکانە، هەرچی ئادەمە، ئەوا پێویست بوو هەموو ناوەکان فێرببێت تا ببێتە مرۆڤێکی تەواو و فریشتەکان سوجدەی بۆ ببەن)).

لە کتێبەکەدا باسی ساتەوەختی دەرکەوتنی(ماددیگەرایی)م کردووە لە ژیانی نۆرمان بۆدۆرتز (بیرمەندی سەهیۆنی جولەکە)، بەو شێوەیەی خۆی باسی دەکات: ((گومان لەوەدا نییە کە باشترە دەوڵەمەند بی نەوەک هەژار، باشترە فەرمان بدەی نەوەک فەرمان وەربگری، باشترە ناسراو بی نەوەک بێناو و نەناسراو)).

هەڵوەستەیەکم لەسەر ئەو بۆچوونەی کردوو بۆم دەرکەوت کە هەرکات وتاری کتێبەکانی دەبێتە بابەتێکی گەرم بۆ گفتوگۆ لەسەرکردن، ئەوا لە دڵیدا دەبێتە جێگای شانازی، لەبەر ئەوە نا کە وتارەکە باشە (فەرمان بە چاکە دەکات و قەدەغەی خراپە دەکات)، یاخود لەبەر ئەوەی قازانجێکی بۆ بەدیهێناوە (بازرگانییەکی بە قازانج یان ئافرەتێکی بۆ مارەکردن بۆ فەراهەم کردبێت)، بەڵکوو لەبەر ئەوەی ئەو وتارە ئەوی کردۆتە بابەتی گفتوگۆ. ئەوە شتە گرنگەکەیە، کە خۆی براوە بێت، بەڕاستی مرۆڤ خۆی بۆتە کاڵا، بەداخەوە.

بەمەش بۆدۆرتز ژیارستانیەتی ئەمریکی بەرجەستە دەکات، چونکە ئەو باوەڕی بەوە هەیە کە سەرکەوتنی (دەرەکی) پێوەرە بۆ توانا (ناوەکییەکان)، بەمەش ئیمپریالیزمی دەروونی ئەمریکی بە تەواوەتی مرۆڤی ئەمریکی لەناو بردووە و کردوویەتی بە شتێك کە پێوانە بکرێت.

لەبەرامبەر ئەوەشدا، لە کتێبەکەدا ژیاننامەی پێشەوای ڕەشپێستی مسوڵمان مالکۆڵم ئێکسم خستۆتە ڕوو، بەم دێڕانە دەستم بە باسکردنیکردووە: کاتێك چاوەکانت دەنووقێنی دەبینیت، چونکە مرۆڤ بینین و دیدگای هەیە، چاوێکی ماددی کە شتەکان دەبینێت، ئەوی تریان (ڕۆحی)یە، کە بەربەستەکان دەبڕێت و دەگاتە بنچینەی شاراوە و سروشتی وجود (دوانەیی ماددە و ڕۆح کە ژیانی مرۆڤی خودایی جیادەکەنەوە). هەروەها لە مالکۆڵم ئێکس فێردەبین کە پێویستە مرۆڤ بەردەوام خەون بە جیهانی پاکی و بێگوناحیەوە ببینێت،

بەمەش پارێزگاری لە ئەندازەیەکی باش لە پاکی ڕۆحی دەکات. ئیسلام لە لای مالکۆڵم ئێکس ئەم خەونە پاکە بوو، چونکە چوارچێوەیەکی نموونەیی پێبەخشی، کە لە چەمك و ڕەوشتەکانی کۆمەڵگا ماددیگەراکەی ڕزگاری کرد (پێچەوانەی بۆدۆرتز کە لە میحرابی خودای سەرکەوتنی ماددیگەرایی ئەمریکیدا خەریکی پەرستن بوو). مالکۆڵم ئەوەی بۆ دەرکەوت ئەو کاتەی دڕندە بوو بەهۆی ئەوەوە نەبوو کە لە ناخیدا خراپەیەکی پەنگخواردوو بوونی هەبێت،بەڵکو بەهۆی ئەوەی کە لە جیهانی سپیپێستە ماددیەکان بوو، کە لەسەر کێبڕکێی دامەزرابوو و تیایدا مرۆڤ مرۆڤی دەخوارد. ئەو ڕەتی کردەوە خۆی بە شەیتانی دەمارگیری و ماددیگەرایی بفرۆشێت، لە کۆتاییشدا ژیانی خۆی لە پێناو ئەو هەڵوێستەیدا بەخشی.

ئەم ژیاننامەیە بەڕاستی سروودێکە بۆ بەرزڕاگرتنی ڕۆحی مرۆڤ کە توانای بەرگەگرتن و سەرکەوتنی هەیە.

## قۆناغی شەشەم: بانگدەر بانگی دا، منیش نوێژم کرد

کتێبەکەم (الفردوس الأرضي) بە دەنگی بانگدەر بۆ بانگی بەیانی کۆتایی پێهات، گوێم لە دەنگی دەبوو، بەڵام نوێژم نەدەکرد، چونکە بۆ من هێشتا کاتی نەهاتبوو، هێشتا لە تەسکایی ماددیگەرایی بەرەو فراوانی مرۆڤایەتی دەرنەچووبووم، من لەو کات و ساتەدا بەردەوام و بێ وەستان خەریکی بیرکردنەوە بووم، پێویست بوو چەند ساڵێکی تر چاوەڕوان بم بەر لەوەی نوێژ بکەم، کاتێك دەستم بە نوێژ کرد، لەسەرەتادا تەنیا لەبەر خاتری کوڕەکەم ئەوەم دەکرد، تا ئازادی هەڵبژاردنی لە نێوان گومان و باوەڕدا پێبدەم (چونکە پێشتر خوێندبوومەوە کە شاعیر ویلیام بیتلەر ییتس[1] زۆر لە باوکە بێباوەڕەکەی تووڕە بوو، چونکە لەوە بێبەشی کردبوو کە باوەڕ هەڵبژێرێت و بێباوەڕی بۆ کردبووە تاکە بژاردە،بۆیە

---

(1) William B.Yeats: (١٨٦٥- ١٩٢٩ز)، ئەدیب و شاعیری ئێرلەندی.

کاتێك هەستی بە پێویستی کرد بۆ باوەڕ و شتێك کە جیهانی ماددە تێبپەڕێنێت، کە ئەوە هەستێکی فیتڕی مرۆڤایەتییە، لە شتە غەیبییەکاندا نقوم بوو، وەك ئامادەکردنی ڕۆحەکان لەبەردەمیدا، تا کار گەیشتە ئەوەی جیهانێکی ئەفسانەیی تەواوی بۆخۆی دروستکرد، کە لە زۆر لایەنەوە لە ئایین دەچوو). من نوێژی هەینیم لەگەڵ کوڕەکەمدا لە مزگەوتێکی کۆنی شوێنەواردا دەکرد، لە دوای نوێژ لە مزگەوتەکە و بەها ئەندازیارییەکەی و ژیارستانیەکەیمان دەکۆڵییەوە، کتێبی ڕێبەریشمان لەگەڵ خۆماندا دەبرد، وەك ئەوەی من دەمویست لە یەك کاتدا نوێژخوێن و گەشتیار بم، پاشان لەسەرەتاکانی هەشتاکاندا بە دڵسۆزانە دەستمکرد بە نوێژکردن، گرنگیدانم بە ئەندازیاری مزگەوتەکە بوویە بەشێك لە باوەڕەکەم نەوەك پاساوی.

## چەند هەڵوەستەیەك لە گۆڕەپانی یەقیندا

بەم شێوەیە د. المسیری سەیری مرۆڤ دەکات:

((مرۆڤ بوونەوەرێکی ئازادە مێژوو دروستدەکات، بەشێکە لە سروشت و لە سروشت جیاوازە، ناکرێ بدرێتە پاڵ سروشت، بوونەوەرێکە بەرهەمی ژیارستانی هەیە، ئەمەش تایبەتمەندێتی نەتەوەیی و مرۆڤایەتی پێدەبەخشێت، ئەمە باسی مرۆڤی خودایییە (لەبەرامبەر مرۆڤی سروشتی / ماددیگەرایی)).

هەروەها د. المسیری بەم شێوەیە سەیری ئایین دەکات:

((من ئایینم وەك نموونەیەکی مەعریفی تەواو و بێ کەموکوڕی بینییەوە، نەوەك وەکو تەنیا بەشێك کە لە خودی خۆیدا هیچ گرنگیەکی نەبێت، هەروەها بۆم دەرکەوت کە پێکهاتەی ئایینی تەنیا ڕووکار نییە، بەڵکو لە ڕەگی کیان و

ناسنامەومیە. هەروەك چۆن هەستم بەوە کرد نایین لەو واقیعە ماددییەی تیایدا دەژین کاریگەری خۆی هەیە، نەوەك بەشێکی داخراو بێت لە جیهانی غەیب، لەبەر ئەوە بۆشایی نێوان (مرۆڤی مرۆڤ) لەگەڵ وێنای ماددی سادە و ساکار زیادی کرد، ڕۆڵی هزرو بیرکردنەوە (جیهانی ڕۆح) لە پێشکەشکردنی تەفسیر بۆ دیاردەی مرۆڤ، واتە نایین لە دیدی مندا بەشێوەیەکی پلەبەند بوو بە بەشێك لە کیانی مرۆیی نەوەك شتێکی جیاواز لەو کیانە)).

د. المسيري بەم شێوەیە سەیری بوونی خودا دەکات

((لە ڕاستیدا بوونی خودا تاکە گەرەنتی بوونی (مرۆڤی مرۆڤە)، بەهەردوو بەشی ماددی و ناماددییەوە، چونکە خودا بریتییە لەو جەوهەرەی مرۆڤ بەرەو ڕووی دەڕوات تا لە خاکێتی ڕزگاری ببێت، پاشان بە نەبوونی خودا مرۆڤ دەبێتە ماددەیەکی سروشتی کەڕولاڵ، کە دەچێتە ژێر باری یاساکانی ماددەوە، دەکرێ ئەندازەگیری بکرێن و لێیان بکۆڵدرێتەوە و کۆنترۆڵ بکرێن، هەروەها بە نەبوونی خودا مرۆڤ دەبێتە چەندێتییەکی ماددی، دەکرێ لە چوارچێوەی کۆمەڵێك هاوکێشەی بیرکاریانەی مردوو لێکبدرێنەوە، کە دەکرێ بزانرێن و پێشبینی بکرێن))[1].

ڕەحمەتی خودات لێبێت مامۆستاکەم (د.المسيري)، خودا لەبەهەشتدا بمانکاتە دراوسێی تۆ..

---

(١) بۆ نموونە: کە دەڵێن ئەگەر تووشی ئەو هەڵوێستە بووی ڕەفتارت بەم شێوەیە دەبێت.

**خوێنەری بەڕێز :**

ئەمە گەشتەکەمان بوو، لەگەڵ چوار عەقڵی بلیمەتدا، گوێمان لە هەموو ئەو لێدانانە گرت کە لە دەرگای حەقیقەتیاندا تا گەیشتن بە گۆڕەپانی یەقین، هەروەها وەك چۆن لە سەرەتای تەوەرەکەدا باسمان کرد، ئەو چوار گەشتە هەوێنی ڕێکخەری زۆربەی لایەنەکانی دامەزراوەی باوەڕمان نیشان دەدەن.

گەشتی ئەنتۆنی فلو گەشتێکی عەقڵی بوو، باوەڕی دڵ هیچ ڕۆڵێکی تێدا نەگێڕا. گەشتی پیاوێك کە هەشتا ساڵی تەمەنی بەڕێکرد، زۆربەی لە خزمەتی بێباوەڕیدا بوو، لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا بوو بە پێشەوای ڕەوتی بێباوەڕی. پیاوێك کە بەدرێژایی ژیانی بە دوای بەڵگەدا ڕۆیشت، لەسەرەتادا بەرەو بێباوەڕی برد، پاشان دووبارە شوێن بەڵگە کەوتەوە و ئەمجارەیان بەرەو باوەڕی برد. بەڵگە باوەڕییەکانی فلو زادەی بیرکردنەوە بوون لە واتا فەلسەفییەکان کە لەپشتەوەی تەقینەوە گەورەکەی گەردوونەوە بوون، کە گەردوونی لێ پێکهاتووە، هەروەها واتا فەلسەفییەکانی پشت بنچینە و شێوازی کارکردنی کۆدی بۆماوەیی زیندەوەران (DNA).

ئای بەرهەمی عەقڵی فەلسەفی دادگەر چەند گەورەیە کاتێك بەقووڵی بیر لە دەرئەنجامەکانی زانستی نوێ دەکاتەوە. بەڕاستی گەشتەکەی ئەنتۆنی فلو بەرجەستەکردنی فەرموودەی پەروەردگار بوو، کە دەفەرموێت:

﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٥٣﴾ ﴾ فصلت: ٥٣.

واتە: (ئێمە لەمەوپاش بەڵگەو نیشانەکانی خۆمانیان لە جیهان و لە نەفسی خۆیانا پیشان دەدەین تا بۆیان دەرکەوێ قورئان ڕاستە و کەلامی خوایەو لە خواوە هاتووەتە خوار بۆ سەر پێغەمبەر، ئاخۆ بەس نییە بۆ ئادەمیزاد بۆ گێڕانەوەی لە گوناهو لە بێ فەرمانیی خوا ئەمە کە خوای تۆ ئاگای لە هەموو شتێ هەیە؟).

ئەگەر گەشتەکەی ئەنتۆنی فلو گەشتێکی عەقڵی بووبێت کە باوەڕی دڵ هیچ ڕۆڵێکی تێدا نەگێڕابێت، بەم ڕێگایە گەیشتبێتە بوونی خودا بەبێ باوەڕهێنانی بەهیچ ئایینێك، ئەوا باوەڕی دڵ لە گەشتەکەی جیفری لانگدا پشکێکی گەورەی بەردەکەوێت، کە لەو خەونەدا خۆی دەبینێتەوە کە چەندین جار و بەدرێژایی ١٠ ساڵ دووبارە بووەوە، تا دواجار لە واقیعدا ڕوویدا، هەروەها ئەگەر ئەنتۆنی فلو باوەڕەکەی لە بیرکردنەوە لە کتێبی بینراوی خودا (گەردوون و دەروون)ەوە سەرچاوەی گرتبێت، ئەوا باوەڕەکەی جیفری لانگ زادەی بیرکردنەوە بوو لە کتێبی خوێندراوی خودا (قورئانی پیرۆز) کە پشکی گەورەی لە باوەڕەکەی جیفری لانگدا بەردەکەوێت، لە کۆتایشدا گەشتەکەی باوەڕهێنانی تەنیا بەخودای تێپەڕاند و باوەڕی بە ئیسلام وەك ئایین و محمد(صلی الله علیه وسلّم)وەك پێغەمبەر هێنا.

هەروەها گەشتەکەی د. عبد الوهاب المسیری بە گەشتێکی جیاواز و سوودبەخش دەبینم، لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا گەشتی لەم جۆرەم نەبیستووە، ئەگەر دەرککردن بە خراپەکانی ژیارستانیەتی هاوچەرخ دەرگایەك بووبێت لەبەردەمد. المسیریدا بۆ ئەوەی خراپییەکانی هزری ماددیگەرایی بزانێت، ئەوا لەو کارەدا کەسانی تری وەك ڕۆجێ گارودی هاوبەشییان کردووە. بەڵام بیرکردنەوە لە خودی مرۆڤایەتی و گوزارشتکردنی ئەدیب و شاعیران لەو خودە، ئەزموونێکی قووڵ و سوودبەخش بوو، کە یارمەتیدەری بوو بۆ دەرککردن بەو دوانەییەی مرۆڤ جیادەکاتەوە (پێیەکانمان لە خاکدایە و سەرمان لە ئاسمان)، کە ئەمەش بووە بزوێنەری گەورە و تایبەتی بۆ د. المسیری بۆ دەرککردن بە خودایەتی کە سەرچاوەی خودی مرۆڤایەتییە.

بەهەمان شێوە پەیوەندی ئاسمان لەگەڵ زەمیندا یەکێك بوو لە بەڵگە بەدیهییەکانی بوونی خودایی، هەروەك چۆن ئیسلام ئایینی حەق بوو، کە لەگەڵ بیرو بۆچوونەکانی د. المسیریدا دەهاتەوە، وەك لە تەوەرەی دواتردا باس دەکەین.

هەرچی گەشتەکەی د.مستەفا مەحمودە، ئەوا بە شێوەیەکی نموونەیی بەرجەستەی سەرلێشێواوی گومانکاران و گەنجانمان دەکات، ئەو گومان و پرسیارانەمان نیشان دەدات کە لە عەقڵی گەنجەکانماندا دروستدەبن.

دەکرێ ئەم گەشتە بە تێکەڵەی سێ گەشتەکەی تر هەژمار بکرێت، کە هەر یەکێك لە لایەنێك لە لایەنەکانیدا بەشداری کردووە؛ چونکە لێکۆڵینەوەی زانستی و بیرکردنەوەی فەلسەفییانە لە گەردوون و دەروون، تەسلیمبوون بە گەورەیی قورئانی پیرۆزی لەخۆ گرتووە. ئەو بیرمەندە گەورەیە لەوەدا سەرکەوتوو بووە کە لە ڕێی نووسینە سادەکراوەکانییەوە پرۆژە فیکرییە تەواوەکەیمان بۆ بخاتەڕوو. لە ڕێی ئەو نووسینانەوە دەتوانی بەوردی پێشکەوتن و گەشەسەندنی هزری هەست پێبکەی، لێرەوە ئامۆژگاری هەموو ئەو کەسانە دەکەم کە گرنگی بە ئایین و جیهانی هزر دەدەن بە قووڵی نووسینەکانی بخوێننەوە.

ئەم تەوەرەیە بە وەڵامە ئیمانییەکانی د.مستەفا مەحمود کۆتایی پێدێنم، کە وەڵامی ئەو کەسانە دەداتەوە کە دەپرسن: بۆچی خودا ئێمەی بەدیهێناوە؟ حیکمەت لەو سزایە چییە کە پێیەوە دەناڵێنین؟ د.مستەفا مەحمود وەڵامیان دەداتەوە، دەڵێت: قورئان لە کۆی ئایەتەکانیدا پێمان دەڵێت کە خودا مرۆڤی بە فزوولییەتێکی فیترییەوە هێناوەتە سەر زەوی. بۆ ئەوەی سەرەتا شتە پەنهان و نەزانراوەکانی زەوی بناسێت، پاشان خۆی بناسێت. هەروەها لە ڕێی ناسینی خۆیەوە دەرك بە پەروەردگاری بکات و. پێگەی ئەو پەروەردگارە بەرز و بەڕێزە بزانێت و بیپەرستێت. بەمەش شیاوی خۆشەویستی و بەخششەکانی دەبێت. خودا بۆ ئەوە ئێمەی بەدیهێناوە. بۆ ئەوەش سزامان دەدات تا لە بێئاگاییمان هۆشیارمان بکاتەوە و شیاوی خۆشەویستی و بەخششەکانی بین.

خودا بە خۆشەویستی مرۆڤی بەدیهێناوە..

بۆ خۆشەویستی بەدیهێناوە..

بۆ خۆشەویستیش سزای دەدات.

پاك و بێگەردی بۆ خودای بەرز و مەزن، کە بە لوتف و میهرەبانی خۆی ئێمەی بەدیهێناوە.

## تەوەرەی چواردەیەم

# دەرچوون لە زەلکاوی بێباوەڕی

((زۆر جێی نیگەرانییە کە خودا بوونی نەبێت، هەموو ئەو بەها و ڕەوشتانەی کە دەکرێ وێنابکرێن بە نە بوونی ئەو بە هەوادا دەچن، ئەوسا خێرو چاکەی فیتڕی بوونیان نابێت، چونکە مەرجەعیەت و پێوەرێك بوونی نامێنیت)).

ژان پۆل سارتەر!

فإن كنت لا تدري فتلك مصيبة وإن كنت تدري فالمصيبة أعظم[1]

ئەگەر نازانی ئەوە کارەساتە ئەگەر بشزانی کارەساتەکە گەورەترە.

ئەم وتە حەکیمانەیە قووڵە مەترسی ئەو دۆخەمان بۆ دەردەخات کە بێباوەڕان تیایدا دەژین، دەیانخاتە یەکێك لەم دوو دەستانەوە؛ یان ئەوەتا نەزانن، کە ئەو جۆرە کەسانە فێرکردنیان ئاسانە، یان ئەوەتا کارەساتەکە خۆ بەزلزانی شەیتانی هاوشێوەی ئیبلیسی گەورەیە. لە ڕاستیدا بێباوەڕان لە هەردوو دۆخدا خۆیان بە

---

(١) ئەمە ئەو دێڕە شیعرییە کە ئیمامی (ابن القيم الجوزية) هۆنراوە ناوازەکەی دەربارەی بەهەشت پێ بە کۆتا هێناوە، کە تیایدا گلەیی لەو کەسانە دەکات کە هەوڵ بۆ بەهەشت نادەن. لە ڕاستیدا پێش ئەو عومەری کوڕی خەتتاب لەو نامەیەی کە بۆ (عەمری کوڕی عاص)ی ناردووە ئەو قسەیەی تێدا نووسیوە، کاتێك عەمر داوای لێبووردنی کرد لەسەر ئەوەی نەیزانیوە کوڕەکەی لە کوڕی قیبتییەکەی داوە دوای ئەوەی لە ئەسپ سواری لێی بردۆتەوە.

دانا و کاربەجێ لە قەڵەم دەدەن، کەسانی تر بە دواکەوتوو و نەزان و گێل دەزانن، کەواتە ئەوان لە زەلکاوێکدا دەژین، هەرچەند بەڵگە زانستی و عەقڵییەکان لەسەر بوونی خودایی زیاتر و گەورەتر ببن، ئەوا کەللە ڕەقییان زیاتر دەبێت و بۆگەنی زەلکاوەکەیان زیاتر دەبێت،جا بۆ ئەوەی لێی دەربچن، ئەوا لەسەریان پێویستە ئاگاداری ئەو حەقیقەتە بن، ئەمەیە کە لەو تەوەرەیەدا یارمەتییان دەدەین.

## ئادگار و سیفاتەکانی زەلکاوەکە :

زەلکاوی بێباوەڕی بەچەند ئادگار و سیفاتێك جیادەکرێتەوە، کە لە ڕێی تەوەرەکانی کتێبەکەدا بە تێرو تەسەلی ڕوونمان کردۆتەوە، لێرەدا لە چەند خاڵێك کورتیان دەکەینەوە:

### لە ڕووی بیرو باوەڕەوە، ئێمە ئاژەڵی هەرەمەکی فانی لەناوچووین

زۆرێك لە بێباوەڕان هیچ ئەنگییەك لەوەدا نابینن کە دان بەبوونی خودادا بنێن! بەو مەرجەی کە ئەمە دانننان بە زیندووبوونەوە و ژیانەکەی تری دوای مردنی بەدوادا نەیەت:

﴿ زَعَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَن لَّن يُبۡعَثُواْۚ قُلۡ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتُبۡعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلۡتُمۡۚ وَذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ۝٧ ﴾ التغابن.

واتە: (کافرەکان بە خەیاڵی خۆیان گومانیان وایە کە هەرگیز زیندوو ناکرێنەوە. تۆیش، ئەی پێغەمبەر! پێیان بڵێ: بەڵێ وەڵڵا! قەسەم بەخوای

پەروەردگارم بەڕاستی گشتتان زیندوو ئەکرێنەوە و پاشان پێتان ڕائەگەیەنرێ کە چیتان کردووە لە دنیادا و ئەمەیش بۆ خودا کارێکی ئاسانە).

گۆڕانێکی ڕیشەیی و تەوەرەیی بەدوای نکۆڵیکردن لە زیندبوونەوەی دوای مردندادێت، چونکە مرۆڤ؛ ئەو بوونەوەرە هەمیشەییەیە، کە بۆ نامانجێک بەدیهێنراوە، تەکلیفی لەسەرە و چاودێری دەکرێت و لەلایەن خوداوە لێپێچینەوەی لەگەڵدا دەکرێت، دەبێتە ئاژەڵێکی هەڕەمەکی لەناوچوو:

﴿ وَقَالُوا۟ مَا هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهْرُ ۚ وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ الجاثية.

واتە: (کافرەکان وتیان: لە ژیانی ئەم دنیایەمان بەولاوە ژیانێکی تر نییە و پاش ئەم ژیانە ئەمرین و ژیان ئەبڕێتەوە، لە چەرخ و گەردوون بەولاوە کەس نامانمرێنێ و هیچ زانیارییەکیشیان لەم بارەوە نییەو لە خۆیانەوە قسە ئەکەن و هەر بە خەیاڵ و گومانی خۆیان وا ئەڵێن).

## لە ڕووی ڕەوشتییەوە: هەموو شتێك ڕەوایە

((زۆر جێی نیگەرانییە ئەگەر خودا بوونی نەبێت، هەموو ئەو بەها و ڕەوشتانەی، کە دەکرێ وێنا بکرێن بە نەبوونی ئەو بەهەوادا دەچن، ئەوسا خێرو چاکەی فیتری بوونیان نابێت، چونکە مەرجەعیەت و پێوەرێك بوونیان نامێنێت، ئیتر ناڵێین لەبەر ئەوەی خودا بوونی هەیە پێویستە دەستپاك بین، پێویستە درۆ نەکەین..دیستۆڤیسکی ڕاستی کرد کاتێك گوتی: ئەگەر خودا بوونی نەبێت ئەوا هەموو شتێك ڕەوایە)).

بەڕاستی خاوەنی ئەم قسەیە حەقیقەتی پێکاوە، چەندە باوەڕی پتەو و بەهێز بووە. نەخێر. ژان پۆل سارتەر! کاتێك ئەو قسەیەی کرد باوەڕدار نەبوو، بەڵکو

ئەو شایەتێك بوو لە گەورە بێباوەڕە بەرێزەکان[١]! سارتەر قسە لەسەر وتەکەی دیستۆفیسکی دەکات، دەڵێت:

((ئەمە خاڵی دەستپێکە لە فەلسەفەی بوونگەراییدا، چونکە تیایدا مرۆڤ بێهیواو سەرگەردان دەبێت، چونکە هیچ شتێك لە ناوەوە و دەرەوەدا ناکرێ پێیەوە پەیوەست بێت، تەنانەت توانای ئەوەیشی نابێت کە بیانوو بۆ خۆیشی بێنێتەوە)).

تەنانەت پێشەوای بێباوەڕانی هاوچەرخ (ڕیچارد دۆوکنز)یش هەست بە مەترسی نەبوونی ئایین دەکات! دەڵێت: ((ناتوانی بەها و ڕەوشتە ڕەهاکان لەسەر هیچ بناغەیەك دابمەزرێنی ئایین نەبێت!))[٢] لە شوێنێکی تریشدا دەڵێت: (لە جیهانێکدا کە جگە لە هێزی کوێرانەی سروشت و کاریگەری جینەکان هیچی تری تێدا نەبێت، هەموو شتێك تێکدەچێت و لەناو دەچێت و هەندێك کەسیش تیادەچن و تەنیا مرۆڤە زۆر بەبەختەکان ڕزگار دەبن، لەوەشدا هیچ لۆژیك و دادگەرییەك نابینیتەوە. ئەو جۆرە پرسانە پرسی تەواو لۆژیکین لە جیهانێکدا کە خاڵیە لە دیزاین و ئامانجدارێتی، کە چاکە یان خراپەی تێدا نەبێت، لە جیهانێکدا کە جگە لە کوێرانەیی و گرنگینەدان هیچی تێدا نییە، چونکە DNA نە هیچ دەزانێت نە هۆشیارە. ئەمە ئاوازی (دی ئێن ئەی)ە، هیچی ترمان لەبەردەمدا نییە جگە لەوەی لەگەڵ ئاوازەکەیدا سەما بکەین))[٣].

دۆوکنز دەیەوێت بڕوا بە جیهانێك بکەین کە ڕەوشتی تێدا نەبێت، ئەو کارەساتانەی کە تیایدا ڕوودەدەن (جەنگە جیهانیەکان - پاکتاوی ڕەگەزی - جەنگەکانی خاچپەرستان - بۆمبە ئەتۆمییەکان) هیچ نین جگە لە شوێنکەوتنی فەرمانە جینیەکان، لەبەر ئەوە پێویست بەوە ناکات کە لۆمەی ئەو تاوانبارانە بکەین یاخود لێپێچینەوەیان لەگەڵدا بکەین. ببورە، جیهانێکی ئاوا لۆمە و لێپێچینەوە تیایدا واتایەکیان نییە.

---

(١) من بەرێزەوە وەسفی دەکەم و باسی دەکەم، چونکە بە دڵسۆزی بە دوای حەقیقەتدا دەگەڕا و، هەوڵەکەی بە باوەڕهێنان بە خودا تەواو بوو. کاتێك لەسەر جێگاکەی بەر لە مردن باوەڕی هێنا.

(٢) A Devil's chaplain. P.93 : کاهینی شەیتان.

(٣) River out of Eden. new york. Basic Box1992. P.133

## لە رووی زانستییەوە: تووشی لە خۆباییبوون بوون بەهۆی زانست و زانایانەوە

زۆرێك وا دەزانن کە زانست وەك وەحی ئاسمان لە هەڵە پارێزراوە، ئەگەرچی بەردەوامیش ڕای خۆی دەگۆڕێت! هەندێکی تریش وادەزانن زانست تاکە مەرجەعیەتە و خاوەنی قسەی کۆتاییە. ئەگەر ئەو قسەیە بۆ زانستە تاقیگەیی و جێبەجێکارییەکان ڕاست بێت، ئەوا ئەو قسەیە بۆ زۆربەی ئەو زانستانە هەڵەیە کە زۆرترین ئامادەییان لە ژیانی ئێمەدا هەیە؛ وەك ئایین و سیاسەت و بەها و ڕەوشتەکان. ئەوەی هەڵەکە گەورەتر دەکات دید و بۆچوونی هەندێك کەسە بەرامبەر بە زانا تاقیگەیی و جێبەجێکارییەکان کە بە چاوێکی بەرز و پیرۆز سەیریان دەکەن و لە هەموو بابەتێکدا داوای ڕای ئەوان دەکەن هەتا ئەگەر ئەو بابەتە لە دەرەوەی پسپۆڕییەکەشیان بێت، ڕاو بۆچوونەکانیان بە متمانەوە و بێگومانەوە وەردەگرن وەك ئەوەی ئەوان چینی نوێی بیرمەند و فەیلەسوف و پیاوانی ئایینی بن!.

## لە رووی فیکرییەوە: مەزهەبی ماددیگەراییان کردۆتە ئایین

هەندێ کەس (پرسی بوونی خودایی) لە چوارچێوەی (لێکۆڵینەوە فەلسەفییەکاندا) کورتدەکەنەوە، کە بەرپەرچی وەڵامی پرسیارە بوونگەراییە تەوەرەییەکان دەدەنەوە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوە تێدەپەڕێنێت، چونکە (پرسێکی زانستی)یە و لە تەفسیرکردنی ئەوەدا بەشداری دەکات کە بە تەواوەتی زانست لە پێشکەشکردنی تەفسیرێك بۆی بێتوانایە، هەروەها (پرسێکی ڕەوشتییە) بۆ ناسینی چاکە و خراپە، بەهەمان شێوە (پرسێکی ڕەفتاری)شە ڕێگای بەدەستهێنانی بەختەوەری لەم ژیانە و ژیانی دوارۆژ بۆ مرۆڤ دیاریدەکات. لە ڕاستیدا پرسی بوونی خودایی هەموو ئەو بوارانە و زیاتریش لە خۆ دەگرێت.

لەبەر ئەوە کاتێك دۆوکنز کتێبەکەی (وهم الإله)ی بڵاوکردەوە، بەتەنیا تانە و تەشەری لە چەمکە فەلسەفی و تیۆریەکان نەدا، بەڵکو تانەی لە چەمکە زانستی و ڕەوشتی و ڕەفتاریەکاندا. هەروەها کاتێك بێباوەڕان نکۆڵی لە بوونی خودا دەکەن و وادەزانن کە لە دەستی ئایین ڕزگارییان بووە (وەك خۆیان دەڵێن)، ئەوا لە ڕاستیدا دەکەونە دەستی مەزهەبی ماددیگەراییەوە کە وەڵامی هەڵەیان بۆ هەموو پرسیارە فەلسەفییە تەوەرمییەکان پێشکەش دەکات. با سەرنجی گرنگترین ئەو پرسیارانە و وەڵامی ماددیگەراکان بۆ ئەو پرسیارانە بدەین:

ئایا خودایەك بوونی هەیە؟.. نەخێر

پێویستە چۆن بژین؟.. هەر چۆنێك پێتخۆشە

پێگەی ئێمەی مرۆڤ لە گەردووندا چییە؟.. وەك هەر بوونەوەرێکی ترە.

پەیوەندیمان بە بوونەوەرەکانی ترەوە چییە؟.. ئێمەش یەکێکین لە ئاژەڵەکان.

ئایا ژیانێك لە دوای مردن بوونی هەیە؟.. نەخێر

وەڵامەکانی ئایینی مەزهەبی ماددیگەرایی بەم جۆرەن! بۆ پرسیارە فەلسەفییە تەوەرمییەکان و تەحەددای هەموو بێباوەڕان دەکەم کە تاکە بەڵگەیەکی زانستی لەسەر ئەم پرسیارانە بخەنەڕوو، ئیتر بۆمان دەردەکەوێت کە بانگەشەی بێباوەڕان ئەوەی کە ئەوان لە دید و بۆچوونەکانیان بەرامبەر بە مرۆڤ و گەردوون لە زانستەوە دەخەنەڕوو بانگەشەیەکی درۆینەیە.

## ئەوانەی بە دوای حەقیقەتدا دەگەڕێن گاڵتە بە بێباوەڕان دەکەن :

جۆن هێمفری[1] (بێژەرە بەناوبانگەکەی ڕادیۆی بەریتانی BBC) خۆی بە نەزانکار وەسف دەکات، بیروباوەڕەکانی لە کتێبێکدا خستۆتەڕوو کە ناوی ناوە ((ئێمە گومان لە خودا دەکەین))[2]، سەرەڕای ئەوەش، دوای ئەوەی گفتوگۆی لەگەڵ زۆرێك لە بێباوەڕە نوێیەکان کردووە بە تەواوەتی هەڵوێستەکانیان ڕەتدەکاتەوە، ئەم گفتوگۆیە تەنزئامێزەی لەسەریان نووسیوە کە تیایدا وەڵامی بانگەشەکانیان دەداتەوە:

- بێباوەڕەکە گوتی: زۆربەی کات باوەڕداران ساکار و گێلن، یاخود بە لایەنی کەمەوە وەك کەسە بێباوەڕەکان شارەزا و چاوکراوە نین.

• هێمفری وەڵامی دایەوە: ئەو بانگەشەیە بە هیچ جۆرێك ڕاست نییە، بە هیچ جۆرێك شیاوی ئەوە نییە کە باس بکرێت و سەرنجی بدەین. ئەگەر دۆوکنز لە کتێبەکەیدا (وهم الإله) بانگەشەی ئەوە دەکات کە هیچ پەیوەندییەك لە نێوان زیرەکی و باوەڕەوە بوونی نییە، لەو قسەیەشیدا ئەوە بە بەڵگە دەهێنێتەوە کە زۆرکەم لە ئەندامانی دامەزراوەی شاهانە باوەڕیان بە خودای بەرجەستەبوو لە شێوەی مرۆڤدا هەیە، بۆیە بانگەشەیەکی لەم جۆرە هیچ بەهایەکی نییە. ئەگەرچی دەزانم هەندێك لە باوەڕداران گێل و گەمژەن، بەڵام بێباوەڕانی واش دەناسم ئەگەر گڵۆپی کارەبا بسووتێت متمانەم پێیان نییە بتوانن بۆم بگۆڕن (دۆوکنز لێرەدا ئاماژە بۆ خۆی دەکات).

---

(١) John Humphrys: ڕاگەیاندکاری بەناوبانگی بەریتانی. گۆڕانکاری زۆر گەورەی لە ڕۆڵی ڕاگەیاندنی بەریتانی بینی، لە ساڵی ١٩٤٣ لە دایك بووە.

(٢) In God we Doubt

- کەسە دیندارە زیرەکەکان ساویلکەن، هەر لەبەر ئەوەیە ئایین وەك (گۆچان)ێك بەکاردێنن و لە ژیانیاندا پشتی پێدەبەستن.

• لەڕاستیدا ئەم قسەیە هیچ گرنگییەکی نییە، من زۆر بێباوەڕ دەناسم گۆچانی تر لە جیاتی ئایین لە ژیانیاندا بەکاردێنن، بۆ نموونە مەی.

- دیندارەکان لە ڕووبەڕووبوونەوەی مردن دەترسن و ناتوانن ئەوە قبوڵ بکەن کە لەناوچوونێکی یەکجارەکییە، هەر لەبەر ئەوەیە کە چاویان بڕیوەتە ژیانێکی دوای زیندووبوونەوە.

• لەوانەیە، بەڵام ئەمە واتای ئەوە نییە کە ئەوان هەڵەن، چونکە زۆر کەسی بێباوەڕ دەناسم لە ناوەندەکانی چارەسەری شێرپەنجەدا ڕاکشاون و لە ترسی مردن دەلەرزن.

- هیچ منداڵێك بوونی نییە بە فیترەت مەسیحی بێت، بەڵکو لە کاتی گەورەبوونیاندا مێشکیان دەشۆرنەوە، ئەمەش لە کرداری تەعمید و لەئاوهەڵکێشانەوە دەست پێدەکات.

• بەڕاستی، هەر لەبەر ئەوەیە هەندێکیان کە گەورە دەبن واز لە بیروباوەڕەکەیان دەهێنن، بەڵام زۆرێکیشیان دەست بە ئایینەکەیانەوە دەگرن.

- ئەو کەسانەی دیندارن بە زۆرەملێ بەرەو دینداری پەلکێش دەکرێن.

• ئەوە لە هەندێك بارودۆخدا ڕاستە، بەڵام باوەڕ بکە ئەوانە باوەڕدار نین، بەڵکو خۆیان بە باوەڕدار نیشان دەدەن.

- ناڕاستەکردنی منداڵەکانمان بۆ دینداری، جۆرێکە لە (خراپ بەکارهێنانی منداڵان Child abuse)، ڕێك وەك ئەوە وایە کە دەستدرێژی سێکسییان بکرێتە سەر. پێویستە لێیان بگەڕێن کە گەورەبوون خۆیان ئازادانە و بەبێ هیچ پاڵەپەستۆ و ناڕاستەکردنێك بیروباوەڕەکەیان هەڵبژێرن.

• کێشە نییە، بەڵام بەو مەرجەی کۆمەڵگە و ڕاگەیاندنیش واز لە خەڵەتاندنیان بێنن بە خۆشیەکانی ژیانی ئازاد و بێ کۆت و بەندی بێباوەڕی، بۆ ئەوەی ئازادی هەڵبژاردنەکە ڕاستەقینە بێت.

- ئەگەر لەماوەی هەفتەیەکدا بیروباوەڕی ئایینی لەناونەبەین، ئەوا ژیارستانیەتەکەمان لەناودەچێت!

• گومان لەوەدانییە کە هەندێك لە توندڕەوە دیندارەکان مەترسیدارن یاخود هەندێکیان شێتن، پێویستە بە شێوەیەکی هەستیار و جدی مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت. بەڵام ئەوە نزیکی ٤٠٠٠ ساڵە لەگەڵ ئایینە یەکخواپەرستەکان دەژین، لەبەرامبەردا دەتوانم هەندێك ڕەفتاری تری بێباوەڕانت بۆ باس بکەم کە مەترسییان زۆر زیاترە بەسەر ژیارستانیەتەکەمانەوە.

- بێباوەڕەکە گفتوگۆکەی بەوە کۆتایی پێهێنا: متمانەت بەو قسانەم هەبێت، چونکە من بە قەناعەتەوە بێباوەڕم.

• هیمفری وەڵامی دایەوە: جا بۆچی متمانەت پێبکەم؟!

پاشان هیمفری بە گاڵتەجارییەوە دەڵێت: وامەزانە کە من بەو گفتوگۆیە تەنزئامێزە بیروڕاکانی بێباوەڕانم شێواندووە، چونکە ئەوە ڕووی ڕاستەقینەی ئەوانە، ئەوە شێوازی گفتوگۆی ئەوانە.

خوێنەری بەڕێز...

لەوەی ڕابورد لەم تەوەرەیەدا، گومڕایی و مەترسی ئەو بیروباوەڕانەمان ڕوونکردەوە کە بێباوەڕان هەیانە، ئێستاش کاتی ڕۆڵی دەرچوون لە زەلکاوەکە و چوونە ناو دامەزراوەی باوەڕهاتووە.

## سیانەیی دامەزراوەی باوەڕ

گومان لەوەدا نییە کە پرسی باوەڕ پرسێکی ئاوێتەیە، دەکرێ بۆ سێ ئاست دابەش بکرێت، هەرکات ئەوەی پێشوو بەدیهات ئەوەی دواتر خۆکردانە خۆی دەخاتەڕوو، بەمەش دامەزراوەی باوەڕ تەواو دەبێت:

**یەکەم:** ئایا خودا بوونی هەیە؟

**دووەم:** ئایا خودا لەگەڵ بەدیهێنراوەکانیدا لە ڕێی پەیامە ئاسمانیەکانەوە لە پەیوەندیدابووە؟

**سێیەم:** کام لە پەیامە ئاسمانییەکان بۆ شوێنکەوتن و پەیڕەویکردن شیاوترە؟

### یەکەم: ئایا خودا بوونی هەیە؟

لە تەوەرەکانی ڕابردووی کتێبەکەدا بانگەشەکانی بێباوەڕانمان وەڵامدایەوە، هەروەك چۆن بەڵگەی زانستـ و عەقڵی و فەلسەفیمان لەسەر ئەوە خستەڕوو کە (خودایەك بوونی هەیە). (بەڵگەی زانستی) جەخت لەسەر دوو لایەن دەکاتەوە:

یەکەمیان؛ زانستە سەرەتاییەکان، چونکە پەیدابوونی گەردوون لە نەبوونەوە، پەیدابوونی ژیان لە ماددەی نازیندوو، پەیدابوونی عەقڵی مرۆڤ، پرسگەلێکن ناکرێ سروشتی کوێرانە بتوانێت ئەنجامیان بدات و پێویستە بەدیهێنەرێکی زیندووی زانای بەتوانایان هەبێت.

بەشی دووەمیش؛ ئەو ئاڵۆزییەی کە دامەزراوەی گەردوون و ژیان و عەقڵی مرۆڤی لەسەر بنیاتنراوە، بە جۆرێك کە ناکرێ تەنیا لەڕێی یاسا و ڕێساکانی سروشت بەڕێوەبچن، پێویستە خودایەکی بێنیاز و بەتوانای لە پشتەوەبێت.

بێباوەڕان دەست بەوەوە دەگرن کە(زانست) بێتوانایە لە بەرامبەر سەلماندن یان نەرێکردنی بوونی خودایی، بەو پێیەی کە لە دەرەوەی چوارچێوەی بوونی ماددییەوەیە (وەك ئێمەی دیندار بانگەشەی بۆ دەکەین) کە زانست مامەڵەی لەگەڵدا دەکات. هەر لەبەر ئەوە بەڵگە زانستییەکانمان بۆ سەلماندنی پەیدابوونی بوون و بنچینەکەی و بەردەوامبوونی خاسیەتی زیرەکی هەیە و پێویستی بەدیزاینەرێکی زیرەك هەیە، ئەو دیزاینەرە زیرەکەش جگە لە خودای بەدیهێنەری دانای بەتوانا هیچی تر نییە.

لە تەوەرەکانی کتێبەکەدا (بەڵگەکانی عەقڵ و فەلسەفە)مان لەسەر بوونی خودایی خستەڕوو، لە ڕێی یەکگرتنی عەقڵی هاوچەرخ لەگەڵ زانستی نوێدا، ئەمە واتای ئەوە نییە کە ئەو بەڵگانە پێشتر نەخراونەتەڕوو، بەڵکو عیلمی کەلام بەر لە هەزار ساڵ ئەو بەڵگانەی لە قورئانی پیرۆز هەڵێنجاوە و خستوویەتیەڕوو، لە هەموو ئەو بەڵگانەش باوتر و قەبوڵکراوتر لە بیروباوەڕی ئیسلامیدا بریتین لە:

**١- بەڵگەی خەلق و بەدیهێنان**[1]: کە لەبەرامبەر بەڵگەی گەردوونیدایە، واتای ئەوەیە کە پەیدابوونی گەردوون لە نەبوونەوە بەڵگەیە لەسەر بوونی خودای بەدیهێنەر. قسەی کابرای دەشتەکی ئەو بەڵگەیە کورتدەکاتەوە کاتێ گوتی: قشپلی وشتر بەڵگەیە لەسەر بوونی وشتر، شوێن پێ بەڵگەیە لەسەر ڕێگا، ئیتر

---

(١) لەلای ئیبن ڕوشد بە بەڵگەی (الاختراع) ناسراوە، هەروەك چۆن بە بەڵگەی(الحدث)یش ناسراوە.

چۆن ئاسمانی پڕ ئەستێرە و زەمینی پڕ کون و کەلەبەر بەلگەنین بۆ بوونی خودایەکی بەدیهێنەری بەتوانا.

﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ﴾ آل عمران: ١٩٠

واتە: (بێگومان لە درووستکردنی ئاسمانەکان و ئەرز و یەك بەدوای یەکداهاتنی شەو و ڕۆژدا چەند دەلیل و نیشانەی ئاشکرا هەیە بۆ ئەوانەی خاوەن فام و هۆشن، دەلالەت ئەکەن لە گەورەیی و دەسەڵاتی خودا، لەوەی کە یەکە و هاوبەشی نییە. ئەم ئایەتانە بە ئاشکرا ئەوە ئەگەیێنن کە ئەم کەون و کائیناتە بەبێ دروستکەرێ نابێ).

٢- بەڵگەی واجببوون (الوجوب): کە لە بەرامبەر زنجیرەبەستنی بوونەوەرانە لە بەدیهێنەردا تا دەگاتە بێکۆتایی (ڕیزبەستن ڕێگرە)، کەواتە پێویستە بەدیهێنەری یەکەم و بێ بەدیهێنەر هەبێت کە هەموو بوونەوەری بەدیهێناوە و (واجب الوجوب)ە[١].

﴿ أَمْ خُلِقُوا۟ مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ أَمْ هُمُ ٱلْخَٰلِقُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾ الطور: ٣٥.

واتە: (یا بۆ بیر لەبوونی خۆیان ناکەنەوە: بێ ئەوەی دروستکەرێ هەبێ دروستی کردبن دروست بوون، یان خۆیان خۆیانیان درووست کردووە؟).

٣- بەڵگەی پوختی و سیستماتیك (ئەندازەگیری - التقدیر): کە لەبەرامبەر بەڵگەی (ڕێکخستنی ورد)دایە، بە واتای ئەوە دێت کە وردی بونیادی گەردوون و یاسا و ڕێساکانی بەڵگەن لەسەر بوونی خودای بەدیهێنەر.

﴿ ٱلَّذِى خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ طِبَاقًا ۖ مَّا تَرَىٰ فِى خَلْقِ ٱلرَّحْمَٰنِ مِن تَفَٰوُتٍ ۖ فَٱرْجِعِ ٱلْبَصَرَ هَلْ تَرَىٰ مِن فُطُورٍ ﴿٣﴾ ﴾ الملك: ٣.

---

(١) فەیلەسوفەکانی وەك فارابی و ئیبن سینا و دیکارت و لۆك و لایبنتز و هی تریش ئەو بۆچوونەیان هەیە.

واتە: (ئەو خوایەی حەوت ئاسمانی چین لەسەر چین دروست کردووە، لە دروست کراوی خوادا فەرق و جیاوازی نابینی، جارێکی تریش چاو بگێڕە، بزانە هیچ کەلێن و کەلەبەرێ لە کاری خوادا ئەبینی؟

﴿ وَتَرَى ٱلْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِىَ تَمُرُّ مَرَّ ٱلسَّحَابِ ۚ صُنْعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ أَتْقَنَ كُلَّ شَىْءٍ ۚ إِنَّهُۥ خَبِيرٌۢ بِمَا تَفْعَلُونَ ﴿٨٨﴾ ﴾ النمل: ٨٨.

واتە: (کێوەکانی سەر زەوی ئەبینی وا گومان ئەبەی کە وەستاو و ئارامن، لە ڕاستیدا وەك پەڵە هەور ئەبزوون چونکە شتی گەورە کە بەجارێ بجووڵێ ئادەمیزاد هەست بە جوڵەی ناکات. ئەمەیش کاری ئەو خوایەیە کە هەموو شتێکی بە باشی دروست کردووە، بێگومان خوا ئاگادارە لە هەر کارێ کە ئێوە ئەیکەن).

﴿ إِنَّا كُلَّ شَىْءٍ خَلَقْنَـٰهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾ ﴾ القمر: ٤٩.

واتە: (بەڕاستی ئێمە هەموو شتێکمان لەسەر ئەندازەو هەڵسەنگاندن و بەپێی حیکمەتێك درووستکردووە).

٤- بەڵگەی چاودێریکردن و گرنگیپێدان (ئامانجدارێتی - الغاية): کە لەبەرامبەر (بنەمای مرۆیی) دایە، بەواتای ئەوە دێت، کە گەردوون بە جۆرێك بنیاتنراوە بە تەواوی بۆ دەرکەوتنی ژیانی مرۆڤ گونجاوبێت، ئەو بەڵگەیەش بۆ سیفاتەکانی جوانی و میهرەبانی خودایی دەگەڕێتەوە.

﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْ .. ﴿٣٢﴾ ﴾ إبراهيم: ٣٢.

واتە: (خودا ئەو خوایەیە ئاسمانەکان و ئەرزی دروستکردووە و لە ئاسمانەوە ئاوی ناردۆتە خوارەوە، بەو ئاوە گەلێ بەرو میوەی دەرکردووەو کردوونی بە ڕزق و ڕۆزی بۆ ئێوە. هەروەها کەشتی بۆ ملکەچ و دەستەمۆ کردوون، بۆ ئەوەی هاتوچۆ بکات لە دەریادا بە فەرمانی خودا. ڕووبارەکانیشی بۆ ڕامکردوون تا سوودیان لێ وەربگرن).

٥- بەڵگەی ڕامکردن و کار ڕاپیکردن: وەك بەڵگەی چاودێریکردن، تایبەتە بە سیفاتەکانی گەورەیی و دەسەڵاتی خودایی.

﴿ وَٱلْأَنْعَٰمَ خَلَقَهَا ۗ لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ وَمَنَٰفِعُ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٥﴾ وَتَسْتَخْرِجُوا۟ مِنْهُ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا وَتَرَى ٱلْفُلْكَ مَوَاخِرَ فِيهِ وَتَحْمِلُ أَثْقَالَكُمْ إِلَىٰ بَلَدٍ لَّمْ تَكُونُوا۟ بَٰلِغِيهِ إِلَّا بِشِقِّ ٱلْأَنفُسِ ۚ إِنَّ رَبَّكُمْ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿٧﴾ وَٱلْخَيْلَ وَٱلْبِغَالَ وَٱلْحَمِيرَ لِتَرْكَبُوهَا وَزِينَةً ۚ وَيَخْلُقُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨﴾ ﴾ النحل: ٥ - ٨.

واتە: (خودا ئاژەڵ و ڕەشەوڵاخ و وشتریشی بۆ درووست کردوون کە بەرگ و پۆشاك بۆ گەرم بوونەوەتان و چەند قازانجی جۆراوجۆری تریان تێدایە وەك زاوزێ و سواربوون و بار پێبردن، هەروەها لە شیر و ماست و ڕۆن و لە گۆشتەکەیشیان ئەخۆن. زینەت و جوانیشیان تێدایە بۆتان کە لە لەوەڕگاوە ئەیانهێننەوە بۆ ماڵ و لە ماڵەوە دەریان ئەکەن بۆ لەوەڕگا. بارتان بۆ هەڵئەگرن بۆ شارێ کە بە زەحمەتێکی زۆر نەبوایە نەیئەگەیشتنێ. بەڕاستی خودای ئێوە میهرەبان و بەڕەحمە. ئەسپ و هێسترو کەریشی بۆ دروستکردوون تا سواریان ببن. هەروەها بۆ زینەت و جوانی لە سواربوونا یا لە بەجێ هێنانی پێویستییەکانی ژیانداو پاش ئەم چەرخەیش شتی وەها دروست ئەکات کە هەر نایانزانن).

خودا هەموو ئەو بوونەوەرانەی ڕامکردووە تا لە خزمەتی مرۆڤدا بن.

٦- بەڵگەی تایبەتمەندی: بەواتای ئەوەی کە ئەوەی لە گەردووندا دەیبینین دەکرا لەسەر شێوازی تریش بەدیبهێنرێن، بەڵام خودا باشترین شێوازی هەڵبژاردووە.

﴿ أَفَرَءَيْتُمُ ٱلْمَآءَ ٱلَّذِى تَشْرَبُونَ ﴿٦٨﴾ ءَأَنتُمْ أَنزَلْتُمُوهُ مِنَ ٱلْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ ٱلْمُنزِلُونَ ﴿٦٩﴾ لَوْ نَشَآءُ جَعَلْنَٰهُ أُجَاجًا فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ ﴿٧٠﴾ ﴾ الواقعە: ٦٨ - ٧٠.

واتە: (یان خەبەرم بدەنێ لەبارەی ئەو ئاوەوە کە ئەیخۆنەوە. ئایا ئێوە لە هەورەوە باراندووتانەتە خوار، یا ئێمەین باراندوومانە؟ ئەگەر بمانویستایە تاڵ

و تفتمان ئەکرد بە جۆرێ ئاگر بەربداتە دەم و نەخورێتەوە. دەی سوپاسی خوا ناکەن کە وای لێ نەکردووەو بە شیرینی بۆی باراندوون؟).

﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَىٰ رَبِّكَ كَيْفَ مَدَّ الظِّلَّ وَلَوْ شَاءَ لَجَعَلَهُ سَاكِنًا ثُمَّ جَعَلْنَا الشَّمْسَ عَلَيْهِ دَلِيلًا ﴿٤٥﴾ ﴾ الفرقان: ٤٥.

واتە: (ئەوە تۆ ناڕوانی بۆ کاری خوای خۆت چۆن سێبەری بەسەر پانتایی زەویدا کێشاوە وەك لە پاش ڕۆژاوا‌وە تا خۆرکەوتنی ڕۆژی دوایی، ئەگەر ئارەزووی لێ بوایە ئەو سێبەرەی تا دنیا دنیایە ئەهێشتەوە. پاشان ڕۆژی لە کەناری ئاسمانەوە دەرکردو کە ڕۆژ دەرکەوت، ئەو ڕۆژدەرکەوتنەی کرد بە دەلیلی ئەوە کە سێبەر شتێکی جێگرتوو بوو لەبەر ئەوە کە لەهەندێ شوێنا مایەوە لە هەندێ شوێنا نەما وەك فەرموویەتی (ثُمَّ جَعَلْنَا الشَّمْسَ عَلَيْهِ دَلِيلًا) واتە: ڕۆژمان کرد بە دەلیل و بەڵگە لەسەر بوونی سێبەر.

﴿ قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِن جَعَلَ اللَّهُ عَلَيْكُمُ اللَّيْلَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ اللَّهِ يَأْتِيكُم بِضِيَاءٍ أَفَلَا تَسْمَعُونَ ﴿٧١﴾ قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِن جَعَلَ اللَّهُ عَلَيْكُمُ النَّهَارَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ اللَّهِ يَأْتِيكُم بِلَيْلٍ تَسْكُنُونَ فِيهِ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٧٢﴾ ﴾ القصص: ٧١ - ٧٢.

واتە: (دیسان ئەی موحەممەد! تۆ بەو کافرانە بڵێ کە هاوبەش بۆ خوا دائەنێن ئەگەر بهاتایە خوا ڕۆژی تا ڕۆژی قیامەت بەسەرتانەوە ڕاگرتایە و شەوی بۆ نەهێنانایە، چ خوایەکی ساختە لە خوای ڕاستەقینە بەولاوە شەوێکی بۆ ئەهێنان تیا بحەوێنەوەو بخەون و ماندوێتیی ڕۆژتانی تیا دەرچێ؟ ئەوە بۆ ناڕوانن خوا چ لوتفێکی لەگەڵ کردوون تا باوەڕی پێ بکەن و سوپاسی بکەن؟).

پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگارم کە بەڵگەکانی بوونی خۆی لە کتێبی بینراوی خودا (گەردوون و دەروونەکان) داناوە:

﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٥٣﴾ ﴾ فصلت: ٥٣.

واتە: (ئێمە لەمەوپاش بەڵگەو نیشانەکانی خۆمانیان لە جیهان و لە نەفسی خۆیانا پیشان ئەدەین تا بۆیان دەرکەوێ قورئان ڕاستەو کەلامی خوایەو لەخواوە هاتووەتە خوار بۆسەر پێغەمبەر. ئاخۆ بەس نییە بۆ ئادەمیزاد بۆ گێڕانەوەی لە گوناهو لە بێ فەرمانی خوا ئەمە کە خوای تۆ ئاگای لە هەموو شتێ هەیە؟).

هەروەك چۆن بەڵگەکانیشی لە کتێبی نوسراویدا (قورئانی پیرۆز) داناوە:

﴿ لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَٰطِلُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِۦ ۖ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ ﴿٤٢﴾ ﴾ فصلت: ٤٢.

واتە: (کتێبێکە شتی هیچوپووچی نە لە پێشیەوە و نە لە دوایەوە تیا نییە، واتە نە لە باسی ڕابوردووی و نە لە باسی داهاتوویا شتی ناڕاست و نادروست نییە، لە لایەن خوایەکەوە هاتووەتە خوارەوە کە خاوەن حیکمەت و ستایش کراوە).

## گیروگرفتی خراپە و ئازار:

لەوانەیە (گیروگرفتی خراپەو ئازار) گرنگترین بەڵگە بێت لەو بەڵگانەی کە بێباوەڕان بۆ بەهێزکردنی نکۆڵیکردنیان لە بوونی خودا دەیخەنەڕوو، لەو بەڵگەیەوە زۆرێك لە بەڵگەکانی تر سەرچاوە دەگرن کە لە تەوەرەکانی کتێبەکەدا خستومانەتەڕوو. لە بەر گرنگی و تەوەرەیی ئەو بەڵگەیە لە هزری بێباوەڕیدا وامان بە باش زانی کە بە شێوەیەکی قووڵتر بیخەینە ڕوو لە کاتی باسکردنی دامەزراوەی باوەڕ لە ڕەگ و ڕیشەوە هەڵیبتەکێنین.

لەگەڵ هاتنی سەدەی چوارەمی پێش زایین، فەیلەسووفی کۆنی یۆنان ئەبیقۆر Epicurus (٣٤١ - ٢٧٠ پ.ز)، کە بە یەکەمین فەیلەسووفی بێباوەڕ

دادەنرێت (گیروگرفتی خراپەو ئازار)ی خستەڕوو، کە بە (بەڵگەی ئەبیقۆری) ناسراوە، بەم شێوەیە دایڕشتووە:

ئایا خودا دەیەوێت ڕێ لە خراپە بگرێت و ناتوانێت؟. کەواتە خودا تەواوی توانا نییە.

ئایا خودا دەتوانێت ڕێ لە خراپە بگرێت بەڵام ئەوە ناکات؟.. کەواتە پیس و دڕندەیە.

ئایا خودا دەیەوێت ڕێ لە خراپە بگرێت و توانای ئەوەیشی هەیە؟.. کەواتە خراپە لە کوێوە هاتوە؟

ئایا خودا توانای نییە و نایەوێت ڕێ لە خراپە بگرێت؟.. کەواتە بۆچی بە خودای دابنێین[1]؟

فەیلەسوفە (ڕەواقییەکان)[2] وەڵامی ئەبیقۆرییەکانیان داوەتەوە، بەوەی کە ئەو خراپەیەی ئێمە دەیبینین خزمەتی چاکەی گشتی دەکات کە خودا دەیەوێت.

گیروگرفتی خراپە و ئازاری هاوچەرخ لەسەر ئەو پرسیارە وەستاوە کە بێباوەڕان بە هۆیەوە تەحەددای باوەڕداران دەکەن: چۆن دەکرێ خودا بەخشندە و میهرەبان بێت(خودا خۆشەویستییە لە بیروباوەڕی مەسیحییدا)، لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگا بەو هەموو ئازارو خراپەیە دەدات کە تووشی مرۆڤ دەبن. بێباوەڕان تەحەددایەکە بەرزتر دەکەنەوە و دەڵێن بەتەنیا سەردانیکردنێکی نەخۆشخانەی چارەسەرکردنی شێرپەنجەی منداڵان بەسە بۆ ئەوەی مرۆڤ بەرەو بێباوەڕی ببات.

---

(١) ئەبیقۆر دوای ئەوە پەیڕەوی لە دوو خودایی کرد، یەکێکیان بۆ چاکەو ئەوەی تریان بۆ خراپە. لەوانەیە ئەمە سەرەتای بزوتنەوەی فیکری بوربێت، کە وای لە (مەزدەك) کرد لە وڵاتی فارسدا ئاینی ململانێی نێوان خودای چاکەو خراپە دابمەزرێنێت.

(٢) ئەم قوتابخانەیە لە ئەسینا دامەزرا، لە سەرەتاکانی سەدەی سێیەمی پێش زایین، وەك مەزهەبێکی فەلسەفی لەسەر ڕەوشت و ئاین دامەزرا لە لایەن فەیلەسوف (زینۆن).

هزری ئیسلامی زۆر بەرپەرچی بۆ ئەم گیروگرفتە پێشکەشکردووە، گرنگترینیان بریتییە لەوەی کە ئەو خراپە و ئازارە تاقیکردنەوەی خودایە بۆ مرۆڤەکان، ئەو ئازارەی تووشی مرۆڤ دەبێت بۆ پاککردنەوەیەتی لە تاوانێکی پێشتر یان ڕێخۆشکردنە بۆ خێرێکی دواتر. هەروەها خراپە لە بنچینەی شتەکاندا بوونی هەیە؛ بۆ نموونە ئەو ئاوەی کە یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی بریتییە لە تینوێتی شکاندن نقومکردن و خنکاندنیش یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی، هەروەك چۆن ئاگریش تایبەتمەندییەکانی گەرمکردنەوە و سووتاندنە[1].

هەندێك وایدەبینن کە حیکمەتێکی شاراوە لە پشتەوەی بوونی چاکە و خراپەوە هەیە کە ئێمە نایزانین، یانەوەتا ئەوە ویستی خودایە و ناتوانین دەربارەی پرسیار بکەین.

هەروەها هزری ئیسلامی چەند تەفسیرێك بۆ بوونی شەیتانی نەفرەتلێکراو دەکات، کە گەورەترین سەرچاوەی خراپەیە، لەوانە بوونی پێویستە بۆ تەواوکردنی دامەزراوەی ئامانج لە ژیاندا، هەروەها بۆ دەرخستنی توانای خودایی لە بەدیهێنانی شتە دژیەکەکان، هەروەها بۆ دەرخستنی سیفاتە بەهێزەکانی خودا، هەروەها دەرخستنی سیفاتە جوان و بەزەیی و لێبوردەییەکانی خودا.

وەڵام و تەفسیرەکان زۆر زۆرن و ریزیان بەستووە...

بەڵگەی ئێمەش بۆ گیروگرفتی خراپە و ئازار(معضلة الشر والألم)، ئەوەیە کە دیدی ئێمە بۆ چاکە و خراپە لەسەر دید و بۆچوونمان بۆ حەقیقەتی ژیانی دنیا و ئامانج لە بوونی مرۆڤ تیایدا، کە لەلای دیندارەکان لە ماددیگەراکان جیاوازە (چ جای بێباوەڕان)[2].

---

(١) ابن القیم دەڵێت: خراپە و ئازار یان چاکە و بەزەیی یاخود دادگەری و حیکمەتن، یاخود چاکسازی و ئامادەکردنن بۆ چاکەیەك کە لە دوایاندا ڕوودەدات، یاخود بۆ ڕێگرتنە لە خراپەیەکی لەو قورستر.

(٢) بێ توانایی دیندارەکان لە پێشکەشکردنی تەفسیرێکی ڕازیکەر بۆ ئەو پرسە ئەوەیە کە ئەوان دەیانەوێ لە چوارچێوەیەکی ماددیدا ئەوە بکەن! گومانیش لەوەدا نییە کە ئەم شێوازە پێچەوانەی بەدیهییاتی مەنهەجی زانستییە، کە پێویستە لە ڕێی دید و بۆچوونی خۆتەوە مامەڵە لەگەڵ پرسێکدا بکەی ئەوەك لە ڕێی دید و بۆچوونی لایەنی بەرامبەر و ناڕازی.

چونکە دیدی ماددیگەرایی وایدەبینێت کە ژیانی دنیا هیچ مەبەستێکی لە دواوە نییە، هیچ ئامانجێك ئاڕاستەی ناکات، هەرکات مرۆڤ مرد ئەوا فەنا دەبێت، چونکە هیچ زیندووبوونەوەیەك لە دوای مردن بوونی نییە. کەواتە مرۆڤ لەسەری پێویستە گەورەترین ئەندازەی خۆشی و چێژ بۆخۆی دەستەبەر بکات، ئیتر هەموو ئەو ئازارانەی هەستیان پێدەکات و لەو چێژ و خۆشییانە بێبەشی دەکەن دەبنە شەڕ و خراپەیەك کە هیچ گومانێك ناهێڵنەوە.

لەو دید و بۆچوونەوە بۆمان دەردەکەوێت کە هەرچی شەڕ و ئازاری مرۆڤ توشی دەبێت و لە ژیانی دنیایدا پێیاندا تێدەپەڕێت بە شێوەیەکی هەڕەمەکی پەیدابوون، ئیتر داننان بە بوونی خودایەك کە تەواوی بەزەیی و خۆشەویستییە و ژیان ڕێکدەخات دەبێتە قسەی پووچ و بێ بنەما.

هەرچی دیدی ئیسلامییە، ئەوا ژیانی دنیا وەك سەرەتایەك بۆ ژیانی هەتا هەتایی تەماشا دەکات، کە مرۆڤ بە مردن و زیندووبوونەوە و حەشر و حیساب و پاداشتدا پێیدەگات. هەروەها ئیسلام وایدەبینێت بوونمان لەو ژیانەدا مەبەست و ئامانجێکی هەیە، کە بریتییە لە ناسینی خودا:

﴿ وَمَا خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾ الذاريات: ٥٦.

واتە:(من جنۆکە و ئادەمیزادم بۆ هیچ دروست نەکردووە بۆ ئەوە نەبێ کە بمپەرستن).

لێرەدا پەرستش بە واتای ناسینە، واتا ناسینی خودای پەروەردگار مەبەست و ئامانجی بوونمانە لە ژیانی دنیاماندا. ئەو ناسینەش لە ڕێی هەستکردن بە ناوە پیرۆزەکانی خودا و سیفاتە بەرز و بەڕێزەکانیەوە دەبێت کە دابەش دەبن بەسەر دوو کۆمەڵەی سەرەکیدا: جوانی و بەرزی؛ سیفاتەکانی جوانی وەك (الرحمن، الرحيم، الغفار، الوهاب، الرزاق، البر، الرؤوف، و...) ناوەکانی بەرزیش وەك (العزيز، الجبار، القهار، القابض، الخافض، المذلّ، المنتقم، المانع، الضارّ، المميت، و...) لە ناسینی خوداش پەرستنی خودا بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ دێتە ئاراوە، وەك

ئەنجامدانی سرووتەکانی پەرستن و پەیوەستبوون بە فەرمانەکان و دوورکەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکان، هەروەها ئاوەدانکردنەوەی زەوی.

لەسەر ئەم بۆچوونە، ژیانی دنیا وەك (لیژنەی تاقیکردنەوە) وایە بۆ زانینی ئاستی ئەوەی کە بەندە لە ڕێی دەرککردن بە ناوە پیرۆزەکانی خودا و سیفاتەکانی بە جوان و بەرزەکانەوە بە دیهێناوە، هەروەها بۆ زانینی ئەندازەی گوێڕایەڵیکردنی پەروەردگاری لە ئەنجامدانی پەرستشەکان و پەیوەستبوون بە فەرمان و قەدەغەکراوەکانی خودا و بنیاتنانی ژیارستانیەتەکان.

بە پێی ئەنجامی ئەو تاقیکردنەوەیەش سەرەنجامی مرۆڤ لە ژیانەکەی تریدا یان خۆشیەکانی بەهەشت یان سزا و ناخۆشییەکانی ئاگری دۆزەخە.

لە ژێر ڕۆشنایی ئەم دیدوبۆچوونە بۆ ژیان، دیدی ئایینی توانای ئەوەی هەیە تەفسیرێکی ڕازیکەر بۆ ئەو خراپە و ئازار پێشکەش بکات کە تووشی مرۆڤ دەبن. چونکە ئەو کارەساتانەی لەسەر زەوی ڕوودەدەن و مرۆڤ بەهۆیانەوە زیانی لێدەکەوێت، وەك گڕکانەکان و زەمینلەرزە و لافاوەکان، تەنیا نیشاندانی ناو و سیفاتەکانی خودان. لە هەمان کاتدا وەك تاقیکردنەوەن بۆ مرۆڤ و لە بەرامبەر ئارامگرتن پاداشت و لە بەرامبەر ناڕەزایەتیش سزا وەردەگرێت. بەمەش مرۆڤ لە ڕێی ئەو کارەساتانەوە بەرزی و بەهێزی خودای بۆ دەردەکەوێت، هەروەك چۆن لە ڕێی بەخششە خوداییەکان جوانی خودای بۆ دەردەکەوێت، لەو بارەیەشەوە گوتراوە، هەرکەسێك تەنیا سیفاتەکانی جوانی خودا بناسێت ئەوا خودای نەناسیوە.

لێرەدا پرسیارێك خۆی دەخاتەڕوو؛ تاوانی ئەو کەسانە چییە کە تووشی کارەساتەکان و نەخۆشییەکان و...و. دەبن؟ دیدی ئیسلامی زۆر بە سادەیی وەڵامی ئەو پرسیارە دەداتەوە و دەڵێت: ژیانی دنیا بە بەراورد بە ژیانی هەتا هەتایی تەنیا چرکەساتێکە، هەموو ئەو ناخۆشییانەی مرۆڤ بینیویەتی بە نیعمەتێکی بەهەشت لە یاد دەچن، هەروەك چۆن پێغەمبەرمان ئەو مژدەیەی پێداوین، هەروەها هەر چەند ناخۆشی و کۆژانەکانی مرۆڤ لە دنیادا زیاتر ببن،

ئەوا خۆشییەکانی بەهەشتیش زیاتر دەبن، تا ئەو ئەندازەیەی کە مرۆڤی باوەڕدار ئاوات بەوە دەخوازێت ژیانی دنیای هەمووی هەر ناخۆشی بوایە.

گیروگرفتی خراپە و ئازار لە پشت بێباوەڕبوونی زۆرێك لە فەیلەسوفە ماددیگەرا هاوچەرخەکان بوو، لە ناویاندا فەیلەسوفی گەورە سێر ئەنتۆنی فلو، کە لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا پێشەوای بێباوەڕانی جیهان بوو. کاتێك فلو گەڕایەوە ناو بازنەی باوەڕ، ڕایگەیاند کە بوونی خراپە و ئازار لە ژیانی مرۆڤدا بوونی خودا نەرێ ناکات، بەڵکو وامان لێدەکات چاو بە سیفاتە خوداییەکاندا بخشێنینەوە. هەروەها فلو باس لەوە دەکات کە ئەو کارەساتانە لایەنی ئەرێنی خۆیان هەیە، بۆ نموونە ئەمە داوای توانا ماددییەکانی مرۆڤ دەکات کە بتوانن شتێك داهێنن کە خۆیان لەو کارەساتانە بپارێزن، هەروەك چۆن وا لە سیفاتە دەروونییەکانی دەکات یارمەتی برای مرۆڤایەتی خۆی بدات، ئەم دوو هۆکارەش کاریگەری گەورەیان لەسەر بنیاتنانی ژیارستانییەتەکان هەبووە بە درێژایی هەموو سەردەمەکان. پاشان فەیلەسوفە گەورەکە دەڵێت، هەرچەند لێکۆڵینەوە لە سەر ئەو پرسە بکەین و لێکدانەوە پێشکەش بکەین، هێشتا تەفسیرە ئایینیەکە لە هەموویان ڕازیکەرتر و گونجاوتر و لە هەموویان باشتر لەگەڵ سروشتی ژیاندا دێتەوە.

**ڕزگاربوون...**

ئاستی یەکەم (ئایا خودا بوونی هەیە) لە دامەزراوەی سیانەیی باوەڕدا بە خستنەڕووی چوار چەمك کۆتایی پێدێنین، کە وایدەبینین ڕێگای ڕزگاربوون و دەرچوونە لە زەلکاوی بێباوەڕی:

**چەمکی یەکەم:** نابێ وا بیربکەینەوە کە بە تەنیا لێکدانەوەی خۆکار (فیزیایی) لێکدانەوەی زانستییە. چونکە ئەگەر لێکدانەوەی خۆکار(میکانیزم - الآلية) ڕووبەڕووی (چۆن) How? ببێتەوە، کە زانست لێی دەکۆڵێتەوە، ئەواڵە ڕووی عەقڵییەوە لەگەڵ لێکدانەوەی ئامانجی بۆچی Why? تێکنا گیرێت کە

بەدیهێنەری گەردوون و مرۆڤ مەبەستیانە، بۆیە پێویستە پێناسە زانستییەکە فراوان بکەین تا هەردوو لایەنەکە لەخۆ بگرێت[1].

لەبەر ئەوە هیچ هەڤدژییەك لە نێوان دوو لێکدانەوەکەدا بەدی ناکەین، بە هیچ جۆرێك بوونی یەکێکیان نیشانەی نەبوونی ئەوی دیکەیان نییە (هەروەك بێباوەڕان وایدەبینن)، چونکە زۆربەی کاروبارەکانی ژیانمان دوو هۆکار هەڵیاندەسوڕێنن: خواردنی خۆراك، کە ئامانجداری و خۆکاری تێدایە. خواردنی دەرمان دیسان ئامانجداری و خۆکاری تێدایە. لێخوڕینی ئۆتۆمبێل...

گرنگترین هەڤدژی کە لە نێوان عەقڵی سەردەمەکانی ناوەڕاست و سەردەمی ئێستادا هەیە، ئەوەیە کە یەکەمیان ئایینی مەسیحی دەستی بەسەردا گرتبوو کە بە ئامانجداری بەسترابووەوە. هەرچی دووەمیانە ئەوا خۆکاریی دەستی بەسەردا گرتبوو.

لە ڕاستیدا جیاکردنەوە، پاشان کۆکردنەوەی لێکدانەوەی ئامانجی و لێکدانەوەی خۆکاریی گرنگییەکی زۆری هەیە بۆ تێگەیشتن لە مێژووی هزری مرۆڤایەتی و تێگەیشتن لە هەموو ژیان و، لە کۆتاییدا زانینی ئامانجی بوونمان.

**چەمکی دووەم:** بێباوەڕان وایدەبینن کە هەر شتێك بتوانرێت لەڕێی یاساکانی سروشتەوە لێکبدرێتەوە ئەوا پێویستی بە خودا نییە! بۆیە هەر کاتێك زانست

---

(١) با نموونەیەك لەسەر ئەوە بێنینەوە: پیاوێك بەسەر چیایێکدا سەردەکەوێت و، خەڵك دەربارەی پرسیار دەکەن. لێرەدا دوو وەڵامی جیاواز هەن. یەکەمیان، بۆ ئەوە سەردەکەوێت کە دیمەنە سروشتییەکان لەسەر چیاوە سەیر بکات. کە ئەمە لێکدانەوەیەکی ئامانجییە بۆ دیاردەکە، چونکە ئەو ئامانجەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە پیاوەکە بۆی سەر چیاکە دەکەوێت.

هەرچی وەڵامی دووەمە، ئەوە زنجیرەیەك هۆکار و ئەنجامەمان بۆ دەخاتەڕوو کە هەنگاوەکانی پیاوەکەی بۆ دەبرێت: چونکە ئەو خواردنەی خواردوویەتی سەرچاوەی وزەکەیە کە کۆئەندامی جوڵە سوودی لێوەرگرتووە، پاشان لایەنێکی دەرەکی ئەو وزەیەی بەکارهێناوە. ئیتر ماسوولکەکانی پیاوەکە گرژبوون پاشان هەڵبووبەتەوە پاشان گرژبوون و پاشان خاوبوونەتەوە. تا لە کۆتاییدا لاشەکەیان گەیاندۆتە سەر چیایەکە. ئەمەش لێکدانەوەی هۆکار یان میکانیکییە. لێکدانەوەیەکە ڕووداوەکە لە دواوە پاڵدەنێت. لە کاتێکدا لێکدانەوەی ئامانجی لە پێشەوە ڕووداوەکە ڕادەکێشێت.

دەگاتە تەفسیرێك بۆ دیاردەیەك وایدەبینن كە ئەمە لە باڵانس و پێگەی خودا كەمدەكاتەوە! پێشتر ئەو گومانەمان وەڵامدایەوە كە بوونی یاسا سروشتییەكان كە كاری گەردوون رێكدەخەن لەگەڵ ئەوە تێكنا گیرێت كە خودا بكەرەكە بێت، لەرێی وشەی (كُن)ەوە:

﴿ إِنَّمَآ أَمۡرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيۡـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٨٢﴾ ﴾ یس: ٨٢.

خودا وایویستووە كە بوون بە گوێرایەڵی هۆكارەكانەوە پەیوەست بێت، تەنانەت خودا (ئەگەرچی توانای ئەوەی هەیە ڕاستەوخۆ كارەكان ئەنجام بدات) ویستوویەتی كە گەردوون بە میكانیزمی هۆكارەكان بەڕێوە ببات[1]:

﴿ وَنَزَّلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ مُّبَٰرَكٗا فَأَنۢبَتۡنَا بِهِۦ جَنَّٰتٖ وَحَبَّ ٱلۡحَصِيدِ ﴿٩﴾ ﴾ ق: ٩

﴿ إِن يَشَأۡ يُسۡكِنِ ٱلرِّيحَ فَيَظۡلَلۡنَ رَوَاكِدَ عَلَىٰ ظَهۡرِهِۦٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّكُلِّ صَبَّارٖ شَكُورٍ ﴿٣٣﴾ ﴾ الشورى: ٣٣.

**چەمكی سێیەم:** هەندێك كەس دەڵێن، ئەگەر دانمان نا بە خودا كە گەردوونی بەدیهێناوە و، ئەو یاسایانەی لە سروشتدا داناوە كە بەڕێوەی ببەن، ئیتر چ پێویست دەكات بڵێین خودا یەكە بە یەكەی كاروبارەكانی گەردوون چاودێری دەكات و رێكدەخات؟

فەیلەسوفەكانی یۆنان (لە سەرووی هەموویانەوە ئەرستۆ) بەر لە هەموان ئەو چەمكەیان خستۆتەڕوو. دەڵێن خودا دوای ئەوەی گەردوونی دروستكردووە و، ڕێكی خستووە و بە شتێكەوە خەریك بووە كە لە گەورەیی بوەشێتەوە، بە خۆیەوە خەریك بوو. فەیلەسوفەكان بەو پاكڕاگرتنەی خودا لە سەرقاڵ بوون بە جگە لە زاتی خۆی، لە بەدیهێنراوەكانی دایانبڕیوە و، كردوویانە بە خودایەك كە هیچ گرنگی لە ژیانی ئێمەدا نەبێت.

---

(١) لە كۆتایی تەوەری دووەمدا لە ژێر ناونیشانی (یاساكانی زانست لە میكانیزمەكانی كاری خودان) دا بە درێژی باسمان لەو چەمكە كردووە.

بەڵام ئایینە ئاسمانییەکان ئەم دەرگایەیان بە ڕووی گومانکاراندا داخستووە، هەروەها بە ڕووی ئەوانەشدا کە دارەکە لە ناوەڕاستەوە دەگرن. ئەو ئایینانە بۆیان ڕوونکردووینەتەوە کە خودا بە درێژایی کات کاری بوونەوەر بەڕێوە دەبات، لە ڕێی یاساکانەوە بۆ نموونە هێزی کێشکردن بەخۆی کارناکات، بەڵکو خودا هەموو ساتێك وزەی پێدەبەخشێت، هەموو یاسا سروشتییەکانی دی بە هەمان شێوە.

ئەگەر خودا بەردەوام (بوون) بەڕێوە نەبات، ئەوا هێزی کێشکردن و هێز و یاساکانی تر لە کار دەکەون، بەڵکو سروشت خۆشی تووشی داڕمان دەبێت. واتا هێشتا خودا بەردەوامە لە دروستکردنی سروشت و یاساکانی، هەر ساتێك سەرلەنوێ بە شێوەیەکی بەردەوام دروستی دەکاتەوە.

**چەمکی چوارەم:** لە ڕاستیدا بەڵگەکانی بوونی خودایی هەستپێکردنیان لەڕووی عەقڵییەوە حەتمین، هەتا ئەگەر عەقڵ لە وێناکردنی هۆکاری یەکەم کە بەدیهێنەری نییە بێتواناش بێت[1].

لە کۆتاییشدا دەڵێین، بازدانە زانستییەکان، لە یاساکانی جووڵەی نیوتن، تا دەگاتە پەیوەندی نێوان بارستە و وزەی ئەنیشتاین، تا دەگاتە ڕەفتاری گەردیلە و تەنۆلکەکانی بچوکتر لە گەردیلە(فیزیای چەندیی)، تا دەگاتە بنچینەی DNA، تا دەگاتە مێشك و ئەو نهێنیانەی تا ئێستا لەبارەیەوە زانراون...چەندان ڕەهەند و دووری و قووڵایی گەورەتر و گەورەترمان بۆ دەردەخەن بۆ بەڵگەکانی بوونی خودایی و گرنگیدانی بە مرۆڤ.

گومان لەوەدا نییە، کە ئەو چوار چەمکە، زۆرێك لەو هەڤدژییە رووکەشە چارەسەر دەکات کە لە نێوان دیدی زانستی و دیدی ئایینی هەیە دەربارەی بوونی ئەو زاتە، خودای دانای بە توانا لەسەر عەرشەکەیەتی.

---

(١) ئەوەمان بە درێژی لە تەوەری دوازدەیەمدا باسکردووە.

## دووەم: ئایا خودا پەیوەندی بە مرۆڤەوە کردووە؟

خودا دامەزراوەی پەیوەندی لەگەڵ مرۆڤدا بە ریزبەندییەکی سەرسوڕهێنەر لە قورئانی پیرۆزدا باسکردووە:

- خودا بەوە دەستپێدەکات نکۆڵی لەوە دەکات مرۆڤی بەبێ هیچ حیکمەتێك بەدیهێنابێت:

﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ ﴾ المؤمنون: ١١٥.

واتە: (ئاخۆ ئێوە واتان گومان نەبرد ئێمە ئێوەمان بێ سوود و بێ مەبەست دروست کردووە و ئێوە ناگەڕێنەوە بۆ لای ئێمەو هیچ پرسیارو وەڵامێ لە ئارادا نییە؟).

- پاشان خودا نکۆڵی لەوە دەکات کە ئامانج لە خەلق تەنیا گاڵتەبێت، دەفەرموێت:

﴿ لَوْ أَرَدْنَا أَن نَّتَّخِذَ لَهْوًا لَّاتَّخَذْنَاهُ مِن لَّدُنَّا إِن كُنَّا فَاعِلِينَ ﴿١٧﴾ ﴾ الأنبياء: ١٧.

واتە: (ئەگەر بمانویستایە ئەسبابی بێ ئاگای ڕابواردن دروست بکەین هەر لای خۆمان دروستمان ئەکرد ئەگەر مەبەستمان کردنی شتیوا بوایە).

خودا لە دوای ئەم نکۆڵیکردنە ئەوە دەسەلمێنێت کە ئامانج لە بەدیهێنانی مرۆڤ بریتییە لە پەرستنی خودا:

﴿ وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾ الذاريات: ٥٦.

واتە: (من جنۆکەو ئادەمیزادم بۆ هیچ دروست نەکردەوە بۆ ئەوە نەبێت کە بمپەرستن. پەرستن لێرەدا بەو واتا گشتگیرەیە کە باسمان کرد، کاتێك دیدی ئیسلامیمان لە ژیان خستەڕوو).

جەختکردنەوە و دڵنیاکردنەوەی قورئانی پیرۆز بۆ پەیوەندی خودا لەگەڵ مرۆڤ بە چەند بەڵگەیەکی عەقڵی تەواو دەکەین:

١- بەڵگەی حیکمەت: ئەگەر مرۆڤ خانوویەک دروست بکات، پاشان جێی بهێڵێت، نە خۆی تێیدا نیشتەجێ بێت و نە بە کرێشی بدات و نەبۆ منداڵەکانیشی هەڵبگرێت، ئەوا بە گێل و نەفامی دەزانین، چونکە مرۆڤی ئاسایی هیچ شتێک بەبێ مەبەست و ئامانج ناکات، چ جای خودای حەکیم و کاربەجێ؟ ئایا شتێکی بەدیهی نییە کە خودا مرۆڤی بۆ هۆکارێک یان ئامانجێک بەدیهێنابێت؟

٢- بەڵگەی فیترەت: خودای پەروەردگار پەرۆشییەکی فیتری بۆ زانینی سەرچاوەی پەیوەندی کردن لەگەڵ ئەو سەرچاوەیەدا لە دەروونی مرۆڤدا داناوە، هەروەها زانینی ئامانجی بەدیهێنانی و سەرەنجامی دوای مردنی. هەر لەوکاتەی کە عەقڵی مرۆڤ هۆشیاری بۆ پەیدابووە ئەو پرسیارانەی لە عەقڵدا هەڵقوڵاوە و بۆ وەڵامدانەوەیان مرۆڤ ئەفسانەکانی داڕشتووە، پاشان فەلسەفەی دامەزراندووە کە لەسەر ئەو پرسیارە وجودییە تەوەرەییانە دامەزراوە. هەروەها خودا توانای خستنەڕووی ئەو پرسیارانە و گەڕان بە دوای وەڵامەکانی بە مرۆڤ بەخشیوە.

ئایا بۆ خودا شتێکی نەشیاو نییە کە ئەو فیترەتەی لە مرۆڤی بەدیهێنراوی خۆیدا دایناوە بەبێ هیچ یارمەتی و ڕێنموونی و هیدایەتێک جێبهێڵێت؟

٣- بەڵگەی ڕەوشتی: گەورە فەیلەسوفی ئەڵمانی ئیمانوئێل کانت ئەو بەڵگەیە دەخاتەڕوو کە بە (بەڵگەی ڕەوشتی) ناسراوە، بۆ سەلماندنی پەیوەندیکردنی ئاسمان لەگەڵ زەویدا، بەم شێوەیە شیدەکاتەوە: ((لە ڕاستیدا تینوێتیمان بەڵگەیە لەسەر بوونی ئاو))، ئەمە واتای ئەوەیە منداڵ بەر لەوەی بزانێت کە ئاو بوونی هەیە ئارەزووی ئاو دەکات و تینووی دەبێت، ئەو تینوێتییەش گەورەترین بەڵگەیە لەسەر بوونی ئاو. کانت ئەندازەگیری لەسەر ئەو ئاوە دەکات و دەڵێت: ((بەهەمان شێوە پەرۆشیمان بۆ دادگەری بەڵگەیە لەسەر بوونی زاتێکی دادگەر))، چونکە مرۆڤ کە ئەو هەموو زوڵم و ستەمەی لەسەر زەوی دەبینێت، ناتوانێت ئەوە

قەبوڵ بکات کە ژیانی کەسی ستەمکار هەر لەسەر زەویدا کۆتایی بێت و ستەمکار بەبێ تۆڵەسەندنەوە ڕزگاری ببێت، هەر لەبەر ئەوەیە کە مرۆڤ زۆر بە بیرۆکەی زیندووبوونەوە و تۆڵەسەندنەوە لەو قیامەتە ئاسوودەیە.

گومانیش لەوەدا نییە ئەو مرۆڤەی ئەمە سەرەنجامەکەیەتی نابێت بەبێ ئاڕاستەکردن و ڕێنموونیکردن و، هاندان و ترساندن جێبهێڵدرێت، ئەمەش کاری پەیامە ئاسمانییەکانە.

**٤- بەڵگەی کتێبە ئاسمانییەکان:** ئەگەر ڕاستی تەنیا یەك کتێبی ئاسمانی بسەلمێنرێت کە باوەڕداران باوەڕیان پێیان هەیە و سەرچاوەکەی خودایە، ئەوا گومان لەوەدا نییە کە ئەمە (بەڵگەی ڕاستەوخۆیە) لەسەر پەیوەندیکردنی ئاسمان بە زەوی و پەیوەندیکردنی خودا لەگەڵ مرۆڤدا. هەر لەبەر ئەوەیە کە خودا ویستوویەتی بەڵگەی گونجاو بۆ کات و شوێن و هەموو گەلێك لەسەر ڕاستگۆیی و ڕاستی پێغەمبەر و کتێبەکانی بخاتەڕوو.

لە تەوەرەکانی کتێبەکەدا ئەوەمان خستەڕوو، کە دەکرێ بێباوەڕان بوونی خودا قەبوڵ بکەن، بەڵام زۆر بەتووندی دژی ئەوەن و لەو حەقیقەتە ڕادەکەن کە خودا لەگەڵ مرۆڤدا پەیوەندی هەبێت و ئایینی ئاسمانی بوونی هەبێت، هەموو ئەوەش لەبەر بوونی فەرمان و قەدەغەکردن لە ئایینەکاندا، کە دەبنە بەربەست لەبەردەم ئارەزووەکانیان، چونکە ئەوان دەیانەوێت ژیانێکی بێ کۆت و مەرج بژین. لەبەر ئەوە ئەو چوار بەڵگەیە بەڵگەی بەهێز و پێویستن لەسەر بوونی پەیوەندی نێوان خودا و مرۆڤ بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ بێباوەڕان.

کاتێك دەربارەی بەڵگەکانی پەیوەندی نێوان ئاسمان و زەوی پرسیار لە د. عبد الوهاب المسيري کرا، وەڵامێکی حەکیمانەی دایەوە، کە هەر چوار بەڵگەکەی باسمانکردن لەخۆی گرتووە، دەڵێت:

یەکێك لە دانپێندراوە عەقڵییەکان - لەلای من -ئەوەیە کە دانان بە بوونی خودا، دانان بە بوونی پەیوەندی نێوان خودا و مرۆڤ (ئایینەکان) بەدوای خۆیدا دێنێت، چونکە شتێکی مەعقول نییە خودا مرۆڤ وەك بوونەوەرێکی

عاقڵ بەدیبێنێت، کە بەهای بوون بزانێت، پاشان بیکاتە بوونەوەرێکی وا کە بە مردن لەناو بچێت، مرۆڤ وا بەدیهێنراوە کە بە تەواوەتی ئەوە ڕەتدەکاتەوە، هەروەها ئەوەش کە ڕەفتارەکانی لە ژیاندا سەرەنجامێکیان هەبێت، واتا واز لە ستەمکار بهێندرێت و تۆڵەی لێ نەسەندرێتەوە، مافی ستەملێکراویش بەهەدەر بڕوات، ئەمە لە کاتێکدا کە دادگەری لە فیترەتی مرۆڤدا چەسپاندووە. لە دیدی مندا ئەمە دامەزراوەیەکی لاسەنگە و بۆ وجود شیاو نییە، وانازانم خودای دانای بەتوانا ڕێگا بە شتێکی لەم چەشنە بدات.

د. المسیری خاڵی کۆتایی ڕوونتر دەکاتەوە و دەڵێت: تەواوکردنی دامەزراوەی وجود پێویستی بە بوونی ژیانێکی تر هەیە کە تیایدا لێپێچینەوە لەگەڵ مرۆڤدا بکرێت لەسەر کردەوەکانیان، بەتایبەتی من باوەڕم بەوە هەیە، کە دەرککردن بە چاکە و خراپە و ڕاست و هەڵە شتێکی فیترییە و لە دەروونی مرۆڤدا چەسپاوە. بۆچی ئێمە وەك بوونەوەرێکی ئازاد لە ویستماندا خەلقکراوین و ئەو پێوەرانەمان تێدا دانراوە ئەگەر لەسەریان لێپێچینەوەمان لەگەڵدا نەکرێت؟.

کەواتە هەریەکە لە خاسیەتی (حیکمەت)ی خودا و خاسیەتی (فیترەتی چاکە و خراپە و ئازادی ویست) لە مرۆڤدا ئەوە دەکەنە شتێکی حەتمی کە خودا ئەوە بۆ مرۆڤ ڕوون بکاتەوە ئاخۆ بۆچی خەلقی کردووە، بۆی دڵنیا بکاتەوە کە مردن واتای فەنابوون نییە، ڕێگای هەڵبژاردنی چاکە و خراپەی نیشان بدات، ئەمانەش لە ڕێی ئایینە ئاسمانییەکانەوە نەبێت ئەنجام نادرێت.

## سێیەم: کام لە پەیامە ئاسمانییەکان بۆ شوێنکەوتن شیاوترە؟

دوای ئەوەی بە بەڵگە بوونی خودامان سەلماند، هەروەها بەدیهییەتی باوەڕبوون بە ئایینە ئاسمانییەکانمان سەلماند، کە لە ڕێیانەوە خودا پەیوەندی بە مرۆڤەوە دەکات، ئێستاش نۆرەی پرسیارێکی گرنگ دێت، کە زۆر جار بێباوەڕە لاوەکان دەیخەنەڕوو: گریمان دانمان بە بوونی خودا و ئاییندانا، کام ئایین هەڵبژێرم؟ و بۆچی؟

هەندێك کەس وادەزانن کە چەمکە ئایینییەکان چەمکی ڕێژەیین، پێویستە بە بەراوردکردنیان بە ئایینەکانی تر حوکمیان بەسەردا بدرێت، بەڵام لە ڕاستیدا ئایین حەقیقەتێکی ڕەهایە؛ بەو پێیەی دەکرێ بە شێوەیەکی بابەتیانە لە ڕێی سێ پێکهاتەکەی (ناوەڕۆکی پەیامەکە - پەیامبەر - خودا)[1] وە هەڵبسەنگێنرێت.

پێکهاتەی یەکەم: تایبەتە بە ناوەڕۆکی دەقی ئایینی و سروشتەکەی، پێویستە دەقی ئایینی ڕاست بەم پێوەرانەی خوارەوە جیابکرێتەوە:

١- خودای بەدیهێنەر بە مرۆڤ بناسێنێت.

٢- ئامانجی بوونی مرۆڤ ڕوونبکاتەوە.

٣- چەمکە ئایینیەکان لە چوارچێوەی تێگەیشتنی عەقڵی مرۆڤدا بین.

٤- ئایین بەڵگەی عەقڵی لەسەر ئەو چەمك و بیروڕایانە بێنێتەوە کە دەیانخاتەڕوو.

---

(١) ئەو چەمکانەی لە ژێر ئەو ناونیشانەدا خستومانەتەڕوو، لە کتێبی ئەندازیار (د.محمد الحسینی اسماعیل) وەرگیراون : الدین و العلم و قصور الفکر البشری. کە لە ساڵی ١٩٩٩ چاپ کراوە.

٥- هیچ هەڤدژییەك لە نێوان چەمکە ئایینیەکاندا نەبێت کە پەیامەکە دەیخاتەڕوو.

٦- دەقی ئایینی لەگەڵ یاسای سروشتی ڕەوشتی مرۆڤ تێکنەگیرێت.

٧- چەمکە ئایینیەکان لەگەڵ چەمکە زانستییەکاندا تێکنەگیرێن.

٨- لە واقیعی ژیانی مرۆڤ جیانەبێت.

٩- واتای دەقی ئایینی لەگەڵ پێشکەوتنی ژیارستانی مرۆڤ بڕوات، چونکە هێشتنەوەی چەمکەکان لە کاتی هاتنەخوارەوەیاندا، واتا خودا پێشکەوتنی زانستی و ژیارستانی لەبەرچاو نەگرتووە.

**پێکهاتەی دووەم:** تایبەتە بە چەمکی پەیامبەر و سیفەتەکانی، پێویستە کە:

١- پەیامەکە چۆنیەتی پەیوەندی بەدیهێنەر بە پەیامبەر و بوونەوەرەکانی دیاری بکات.

٢- پەیامەکە ڕوونی دەکاتەوە کە پەیامبەران بەرپرسن لە گەیاندنی پەیامی خودا، پەیامبەران بۆ ئەوە نەهاتوون کە خۆیان بناسێنن.

٣- پەیامەکە ئەوە دووپات بکاتەوە کە پەیامبەران ترۆپکی تەواوەتی سنوورداری مرۆڤن، بەو پێیەی ئەوان پێشەوای مرۆڤایەتین بۆ مرۆڤ. ئەمەش بەهۆی چەمکێکی زۆر بەرزتر لە چەمکی پاڵەوانانی گەلان لە داستان و ئەفسانەکاندا.

**پێکهاتەی سێیەم:** تایبەتە بە چەمکی خودا و سروشتەکەی، پێویستە ئایینی ڕاست ئەمانە لەخۆ بگرێت:

١- بەڵگەی حاشا هەڵنەگری خودای بەدیهێنەر لەسەر بوونی، لەسەر سروشتی بوونی لە دەروونی مرۆڤدا.

٢- وەسفکردنی خودا بە تەواویی و کەمالاتی ڕەها، بەوەی کە حیکمەت و توانای خودایی لە سەرووی حیکمەت و توانای مرۆڤایەتییە.

٣- لە کاتی خستنەڕووی سیفاتەکانی خودا هیچ چارەمان نییە لە کاتی قسەکردنماندا هەر دەبێ ئەو وشانە بەکار بێنین، کە بۆ مرۆڤ بەکاریان دێنین، وەك بوون و تووڕەیی و بەزەیی و بیستن و بینین. چونکە ئێمە هیچ کەرەستەیەکی ترمان لەبەردەستدا نییە تا تێڕوانینەکانمان دەربارەی خودا لێ دابڕێژین، ئەمەش لەلای زانایانی عەقیدەو بیروباوەڕ بە (ویستی لێکچوون) ناسراوە، ئەوە بە هیچ جۆرێك ئەوە ناگەیەنێت کە خودا لە ئێمە دەچێت.

قورئانی پیرۆز بە شێوازێکی وا لەگەڵ ئەو هەڵوێستە مامەڵەی کردووە کە هەرچی هەڵە تێگەیشتنە نەیهێشتووە:

﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ۝١١ ﴾ الشورى: ١١

پەروەردگار شێوازی وێکچوون (بیسەری بینەر)ی بەکارهێناوە، بەڵام بەرلەوە ئاگاداری کردووینەتەوە کە ئەو وێکچوونە لە چوارچێوەی بە پاك و بێگەردداناني ڕەهایە (هیچ شتێك وەك ئەو نییە).

ئەم سێ بەندەی باسمان کردن، هێڵە پانەکانن، کە دەکرێ لە ڕێیانەوە بە شێوەیەکی بابەتییانە بڕیار لەسەر ڕاستی و هەڵەی ئایینێك لە ئایینەکان بدەین.

بۆیە شتێکی بەڵگەنەویستەکە هیچ پێگەیەك بۆ ئەو ئایینانە نەبێت کە خودا بە سیفاتی نزمی مرۆڤ وەسف دەکەن، یاخود بە سیفاتی بتپەرستی و ئەفسانەیی. یاخود ئەوانەی لەسەر وێنەی ئاژەڵ یان مرۆڤلادەرێکی گەمژە خودا وێنا دەکەن، کە مرۆڤە دروستکراوەکان لەوەوە داناتر و زیرەکتر و بە تواناترە!

هەروەها هیچ پێگیەکیش بۆ ئایینێك نابێت، کە دەقەکانی پێمان دەڵێن پێغەمبەرەکانیان داوێنپیس و بکوژ و خوێنڕێژ و خیانەتکارن.

هیپ پێگەیەك بۆ ئایینێك نییە کە دەقەکانی لێوانلێون لە قسەی ئەوپەڕی بێڕەوشتی و قێزەونترین ماناکانی.

بەر لە هەموو شتێك، هیچ پێگەیەك بۆ ئایینێك نییە كە بەڵگەی عەقڵی ڕوون و یەكلاییكەرەوەمان نەداتێ بۆ بڕیاردان لەسەر ڕاستی و دروستی ئەو پەیامەی هێناوییەتی، ئیسلام دیارترین نموونەی لەسەر ئەوە هێناوەتەوە، قورئان بە ڕیزكردنی بەڵگەكان وازی نەهێناوە، بەڵكو تەحەددی نكۆڵیكارانیشی كردووە لەوە بتوانن بەڵگەی عەقڵی پێشكەش بكەن لەسەر قسەكانیان:

﴿ وَمَن يَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ لَا بُرْهَـٰنَ لَهُۥ بِهِۦ فَإِنَّمَا حِسَابُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿١١٧﴾ ﴾ المؤمنون: ١١٧

واتە: ئەو كەسەی خوایەكی تر بڕیار بدات و بیكاتە شەریكی خوا، لە كاتێكدا هیچ بەڵگەیەكی بەدەستەوە نییە، ئەوا بەڕاستی حیساب و لێپرسینەوەی لای پەروەردگارێتی، بێگومان بێباوەڕ و خوانەناسان سەرفراز نابن.

﴿ قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَـٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿٦٤﴾ ﴾ النمل: ٦٤.

واتە: ئەگەر ڕاست دەكەن فەرموون بەڵگەكانتان بێنن.

ئا ئەمانە ئەو پێوەرە بابەتییانەن، كە پێویستە دەستیان پێوەبگرین لە كاتی هەڵبژاردنی ئەو دینەی شیاوی شوێنكەوتنە.

## بۆچی ئیسلام؟

لە کاتی گەڕانەوەی لە بێباوەڕی و ئیلحادەوە بەرەو بازنەی باوەڕ، پرسیار لە د. عبد الواهب المسیری گەورە بیرمەندی مسوڵمان کرا. بۆچی ئیسلامی هەڵبژارد، بۆ ئایینێکی تر نا؟ وەڵامی دایەوە:

((سەرەتا، پێویستە بزانین هەموو پەیامە ئاسمانییەکان یەك ئایینن ئەویش (ئیسلامە)، کە خۆبەدەستەوەدان و تەسلیمبوونە بە خوای تاك و تەنیا، هەربۆیە باوکی پێغەمبەران ئیبراهیمی خۆشەویستی خوا ناوینناوین: (مسوڵمان).

ئەم چەمکە بەڵگەنەویستە، یەك عەقیدە و باوەڕە، تا لێرەوەیە کە ناکرێ خوا لە ڕێگەی چەند ئایینێکەوە لەگەڵ مرۆڤایەتی بکەوێتە پەیوەندی کە عەقیدە و باوەڕی جیاواز هەڵبگرن. بەڵام ئەوەی دەبینین لە جیاوازی نێوان چەمك و ماناکانی ئەوانەی بە ئایینی جیاواز دادەنرێن، دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەربوونیان بە فەلسەفە و زانستە باو و باڵادەستەکانی ژیارستانییەتەکانی تر.

ئایینەکانی جیهانیش (جگە لە ئیسلام) بەسەر دوو کۆمەڵەی گەورەدا دابەش دەبن؛ یەکەمیان بیروباوەڕەکانی ڕۆژهەڵاتی دوور وەك ئایینی هیندۆسی و بودایی و هی تر، کۆمەڵەی دووەمیش ئایینی مەسیحی و جولەکە، کە لە ڕۆژئاوادا باون و بەرێژەیەکی کەمتر لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دەبینرێن[1].

ئەگەر سەرنجی بیروباوەڕەکانی ڕۆژهەڵاتی دوور بدەین، دەبینین کە خاڵی هاوبەشی هەرە گەورەی نێوانیان بریتییە لە (یەکێتی بوون - وحدة الوجود)، کە بە واتای ئەوە دێت خودا لە زاتی خۆیەوە بوونی بەدیهێناوە، مرۆڤ دوای

---

(١) جگە لە کۆچی جولەکە بۆ خاکی داگیرکراوی فەلەستین.

کۆتاییهاتنی ژیانی لە دنیادا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی لەگەڵ بنچینەیەکدا (کە خودایە) تێکەڵ ببێتەوە، هەروەك چۆن دڵۆپی ئاوی باران دەگەڕێتەوە ناو دەریا. جا هەرچەند پەیڕەوانی چەمکی یەکێتی بوون بیروباوەڕەکەیان بە فەلسەفی بکەن، ئەوا بە سادەیی هەر بەواتای ئەوە دێت کە مرۆڤ بریتییە لە خودا، یاخود بەلایەنی کەمەوە بەشێکە لە خودا)).

هەروەها د. المسيري دەڵێت: ((من وەك خۆم باوەڕم بە دوانەیی بەدیهێنەر و بەدیهێنراو، پەروەردگار و بەندە هەیە، کە دوانەیی سەرەکین لە پەیوەندی خودا بە مرۆڤەوە، بەڵام ئەوەی کە هەندێ کەس بەهەڵەمدا بیەن و بڵێن کە بەدیهێنراو بریتییە لە بەدیهێنەر، من خودام (یان بەشێکم لە خودا) و (خۆشم ئاگام لێی نییە)، ئەوا سەبارەت بە خودا یان سەبارەت بە خۆم بەوە ڕازی نابم)).

هەرچی دەربارەی ئایینی مەسیحی و جولەکەیە د. المسيري دەڵێت: ((ئەم دوو پەیامە ئاسمانییە بە پلەی یەکەم لەسەر ئەو موعجیزانە دامەزراون کە پێش دوو هەزار ساڵ ڕوویانداوە (وەك لە دایکبوونی موعجیزەی مەسیح و زیندووکردنەوەی مردوو، چارەسەرکردنی نەخۆش، موعجیزەی گۆچانەکەی موسا، دوولەتکردنی دەریا)، موعجیزەش تەنیا بۆ ئەو کەسە بە بەڵگە هەژمار دەکرێت کە دەیبینێت)).

پاشان د. المسيري دەڵێت: ((بە هەمان شێوەی ئایینی مەسیحی و جولەکەش بەشێکیان لە باوەڕبوون بە یەکێتی بوون تێدا هەیە، هاوشێوەی ئایینی هیندۆسی، چونکە مەسیح(سەلامی خوای لێبێت) ئوقنوم(وێنە)یەکە لە ئوقنومەکانی خودا، هەروەها لە ئایینی جولەکەشدا دەبینین کە خودا چۆتە بەر گەلە پیرۆزەکە (جولەکە) و خاکە پیرۆزەکە (خاکی میعاد).

هەرچی ئیسلامە، ئەوا موعجیزەکان ڕۆڵێکی تێدا نابینن، ئەوەتا لە هەموو ژیاننامەی پێغەمبەر ناوی تاکە هاوەڵێکیش نادۆزیتەوە کە بە هۆی بەهێزترین دوو موعجیزە سەلمێنراوەکە مسوڵمان بووبێت؛ موعجیزەی ئیسراو میعراج و لەتکردنی مانگ، کە قورئانی پیرۆز پشتڕاستی کردوونەتەوە.

هەرچی بەڵگەکانی خوایەتی پەیامە لە ئیسلامدا ئەوا لەسەر عەقڵ و ئاگادارکردنەوەی فیترەت دامەزراون، لەبەر ئەوە ئیتر پێویستمان بە بوونی پەیامی تر نەماوە و ئیسلام بۆتە کۆتایی پەیامە ئاسمانییەکان.

بەهەمان شێوە دوانەیی بەدیهێنەر و بەدیهێنراو، پەروەردگار و بەندە لە قورئانی پیرۆزدا زۆر بەڕوونی دەردەکەوێت:

﴿ قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ۝٢ لَمۡ يَلِدۡ وَلَمۡ يُولَدۡ ۝٣ وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ ۝٤ ﴾ الإخلاص: ١ - ٤.

واتە:(تۆ، ئەی موحەممەد، بڵێ: ئەو شتەی من ئێوەی بۆ بانگ ئەکەم ئەوەیە کە خودا تاك و تەنیایە. هەر ئەو خوایە لە تەنگانەدا پشت و پەنایە. کەسی لێ نەبوە، لە کەسیش پەیدا نەبوە، کەسیش هاوچەشن و هاوپایەی نییە).

ئایەتی یەکەمی سورەتەکە بوونی بەدیهێنەرێك کە فەرمان دەکات و بەدیهێنراوێك کە فەرمانی پێدەکرێت دەسەلمێنێت، ئەویش لە ڕێی وشەی (قُل)، ئایەتەکانی تریش نکۆڵی لەوە دەکەن کە هیچ لێکچوونێك لە نێوان بەدیهێنەر و بەدیهێنراودا هەبێت، بە بێ ئەوەی بەوە لە پێگەی بەدیهێنراو کەم بکاتەوە، تەنانەت خودا لە قورئانی پیرۆزدا بە پێگەی بەندایەتی ستایشی پێغەمبەرەکەی کردووە:

﴿ سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِيٓ أَسۡرَىٰ بِعَبۡدِهِۦ لَيۡلٗا مِّنَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ إِلَى ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡأَقۡصَا ٱلَّذِي بَٰرَكۡنَا حَوۡلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنۡ ءَايَٰتِنَآۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ۝١ ﴾ الإسراء: ١.

واتە: (پاکی و بێ عەیبی بۆ ئەو خودایە کە شەوڕەویی بە بەندەی خۆی کرد کە موحەممەدە (صلی الله علیه وسلم) لە (مسجد الحرام)ەوە لە مەککەوە بۆ (مسجد الاقصا) لە قودسی شەریف، ئەو مزگەوتی ئەقصایەی کە خۆی و دەوروبەریمان موبارەك کردووە. بۆ ئەوەیش شەوڕەویمان پێ کرد تا هەندێ نیشانەی قودرەتی خۆمانی پیشان بدەین و دڵی پێ دابمەزرێ. بەڕاستی خودا شنەواو بینایە و ئاگای لە هەموو شتە).

بەهەمان شێوە ڕێژەیی ئیسلامی (النسبة الإسلامية) یەکێك بوو لە هۆکارە گرنگەکان کە وایکرد د. المسيري لەناو هەموو ئایینە جیهانییەکاندا ئیسلام هەڵبژێرێت؛ ڕێژەیی ئیسلامی بەو واتایە دێت کە تەنیا خودا نەگۆڕە، هەموو شتێکی تر گۆڕاوە، ئەمەش ڕێگا بە جیاوازی دید و بۆچوونەکان دەدات. لە هەمان کاتدا ئەم ڕێژەییە نایێتە هۆی ونبوون و لەناو چوون، چونکە سەرچاوە باڵاکە ناگرێتەوە، وەك چۆن لە هەندێك فەلسەفە هاوچەرخەکاندا بەدیدەکەین.

هاتنەوەی گرنگترین و گەورەترین ڕەگەزی بیروباوەڕی ئیسلامی لەگەڵ بیری د. المسيريدا یەکێك بوو لە گرنگترین ئەو هۆکارانەی بوونە هۆی ئەوەی د. المسيري ئیسلام هەڵبژێرێت، مەبەستمان لەوەیە کە خودا (پەروەردگاری هەموو جیهان و بوونەوەرە)، بەدادگەری و میهرەبانی خۆی هەموویان لەخۆ دەگرێت، لەوەشدا ئیسلام لە هەموو ئایینەکانی تر جیاوازە؛ بۆ نموونە ئایینی هیندۆسی ناوەکەی لەگەڵ هیندییەکان داتاشراوە چونکە تایبەتە بە خۆیان، ئایینی جولەکە ئەوەی بە مەرج گرتووە کە کەسێك دایکی جولەکە نەبێت بە جولەکە هەژمار ناکرێت! هەروەها مەسیح(سەلامی خوای لێبێت) بۆ (سەگە گومڕاکانی بەنی ئیسرائیل) نێردراوە (وەك خۆی باسی کردووە). بەمەش ئیسلام بۆتە ئایینی هەموو مرۆڤایەتی و بۆ هەموو کات و شوێنێك، هەروەك چۆن لە هەموو ئایینەکانی تر لێبوردەترە و زیاتریش ئایین و بیروباوەڕەکانی تر قەبوڵ دەکات.

دوای چوار چەمکەکەی ڕابردوو (ڕوونی دوانەیی پەروەردگار و بەندە، سنووورداری ڕۆڵی موعجیزەکان، ڕێژەیی ئیسلامی، جیهانگیری بانگەوازی ئیسلامی) د. عبد الوهاب المسيري ڕەگەزی پێنجەم دەخاتەڕوو کە لە پشت پەیڕەویکردنیەتی لە ئیسلامدا، ئەو ڕەگەزەش تایبەتە بە قورئانی پیرۆز، کە کتێبی پیرۆزی ئیسلامە، چونکە قورئانی پیرۆز بەبێ گومان قسەی خودایە و لەگەڵ قسەی پێغەمبەران و شوێنکەوتوان و شیکەرەوەکان تێکەڵ نەبووە، وەك چۆن لە ئایینەکانی تردا هەیە. هەروەها ئێمە بە دڵنیاییەوە دەزانین کە هەر ئایەتێك لە ئایەتەکانی قوئانی پیرۆز کەی و بۆچی هاتۆتە خوارەوە، چ

پەیوەندییەکیان بە پێش خۆیان و دوای خۆیانەوە هەیە. ئەم وردی دارشتنەش لە هیچ کتێبێکی تری پیرۆزدا بەدی ناکرێت[1].

هەروەها بەر لەوەی پێغەمبەری ئیسلام (کە وەحی بۆهات) بگەڕێتەوە لای پەروەردگاری، ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز لە زیاتر لە شوێنێك نووسرابوونەوە، ئەوە سەرەڕای ئەوەی دەیان بەڵکو سەدان هاوەڵ ئەزبەریان کردبوو. بەرلەوەی دوو ساڵ بەسەر وەفاتی پێغەمبەری خودا (صلی الله علیه وسلم) تێبپەڕێت(لەسەردەمی خیلافەتی ئەبوبەکری صدیق) قورئانی پیرۆز لە یەك سەرچاوەدا کۆکرایەوە، بەو شێوەیەی کە ئێستا لەبەردەستماندایە.

دەتوانین ئەو کاتە هەست بە گرنگی ئەو وردی و پاکییە بکەین، کە بەراوردی بکەین بە کتێبەکانی تر، بۆ نموونە کتێبی پیرۆزی هیندۆسەکان (ڤیدا) کە هیچ دەربارەی بنچینەکەی - سەرچاوەکەی - چۆنیەتی نووسینەوەی - کاتی نووسینەکەی نازانین. هەروەها زۆرێك لە مێژوونووسە دیان و جولەکەکان بە ڕوونی باسی ئەوەمان بۆ دەکەن کە زۆر لایەنی ناڕوون لە بنچینە و نووسینەوەی تەورات و ئینجیلدا بوونیان هەیە.

دەکرێ خستنەڕووە عەقڵییەکەی د. المسیری، لەگەڵ ئەو بەڵگە عەقڵی و فەلسەفی و زانستییانەی کە لە قورئانی پیرۆزدا لەسەر خوایەتی هاتوون، یارمەتیدەرێکی باشی لاوی بێباوەڕ دەبن و بۆ ئەوەی بە ئاسانی ئایینێك هەڵبژێرێت.

---

(١) لە دیبەتێکمدا لەگەڵ یەکێك لە خۆبەزلزانبێباوەڕەکان، کە لە ڕێی ئینتەرنێتەوەبوو، بێباوەڕەکە هەوڵێکی زۆریدا کە بۆم بسەلمێنێت کە دەستکاری قورئانی پیرۆز کراوە. چونکە وشەی (هو) لە هەندێك لە نوسخەکانی قورئانی پیرۆزدا هاتووە بەڵام لە نوسخەکانی تر نەهاتووە و، نکۆڵی لەوە کرد کە ئەمە بەهۆی جیاوازی قیرائاتەکانەوە بێت. وەڵامی بێباوەڕەکەم دایەوە و گوتم : گریمان ئەوە ڕاستبێت ئەوە بەڵگەیە لەسەر وردی ڕێکخراوی دەق، چونکە تەنیا پیتێك لە نێوان ٣٢٠هەزار پیت بەڵگەیە لەسەر وردی و، زانایانی قورئانی تەفسیر بۆ ئەوە هەیە. هەروەها پاشان بە گاڵتەوە گوتم: وام گومان دەبرد بۆم دەسەلمێنی کە هەندێك لە نوسخەکانی قورئان باس لەوە دەکەن کە موحەممەد(صلی الله علیه وسلم) پێغەمبەر بووە و هەندێکی تریش دەڵێن کوڕی خودا بووە!

بەمەش سیانەی باوەڕ لە دیدی عەقڵدا تەواو دەبێت: خوایەتی - پەیوەندی - پەیام.

نکۆڵیکردن لە دامەزراوەی باوەڕ گرەوێکی شکستخواردووە.

لەسەدەی حەڤدەهەمی زایینیدا فەیلەسوف و زانای بیرکاری و فیزیا بلیز پاسکاڵ[1] ئەوەی خستەڕوو کە بە(گرەوەکەی پاسکاڵ Pascal's Wager) ناسراوە، کە بەڵگەیەکی فەلسەفییە و بانگەواز بۆ باوەڕهێنان بە خودا و ئایین دەکات، بەو پێیەی کە ئێمە ئەگەر ئەو ڕێگایە بگرینەبەر و لەسەر ئەو بیروباوەڕە بژین، ئەگەر دواتر ناڕاستیشی بسەلمێندرێت هیچ نادۆڕێنین، بەڵام ئەگەر نکۆڵی لە خوایەتی بکەین و پاشان بوونی خودا بسەلمێنرێت ئەوا لە دنیا و دوارۆژدا شکستێکی گەورە دێنین و تووشی دۆڕانێکی گەورە دەبین.

بە زیاتر لە پێنج سەد ساڵ پێش پاسکاڵ، فەیلەسوف و شاعیر (أبوالعلاء المعری٩٧٣-١٠٥٧ز) هەمان بەڵگەی فەلسەفی بە شێوازێکی ڕوون و ڕاستەوخۆ و ورد لە دوو دێڕە شیعردا خستۆتەڕوو:

قال المنجم والطبيب كلاهما: لاتحشر الأجساد، قلت: إليكما

إن صحّ قولكما فلست بخاسر أو صح قولي فالخسار عليكما

واتە: (فاڵچی و پزیشك گوتیان: لاشەکان حەشر ناکرێن. منیش پێمگوتن: ئەگەر قسەکەی ئێوە ڕاست دەربچێت ئەوا من هیچم لەدەست نەداوە، بەڵام ئەگەر قسەکەی من ڕاست دەربچێت ئەوا ئێوە خەسارەتمەند و زیانلێکەوتوو دەبن).

ڕۆژێکیان لە گەورە فەیلەسوفی بێباوەڕ (بێرتراند راسل)یان پرسی: چی دەبێت ئەگەر مردی و بۆت دەرکەوت کە بەرەو جیهانێکی تر دەڕۆی، لەبەردەم خودا وەستای، لێی پرسی: بۆچی باوەڕت بەمن نەهێنا؟ ئەوسا چۆن وەڵام دەدەیەوە؟ راسل گوتی: پێی دەڵێم بەڵگەکانی بوونت بەس نەبوون.

---

(١) Blaise Pascal: (١٦٢٣-١٦٦٢ز)

باوەڕم وایە خوداش پێی بفەرموێت: بەڵگەکانم بۆ باوەڕهێنانت بوونیان پڕ کردبوو، بە بەڵگەی ئەوەی، کە ملیۆنان زاناو فەیلەسوف بە درێژایی مێژوو باوەڕیان بەمن هێنا. هەروەها لەوانەیە خودا پێی بفەرموێت: گریمان بەڵگەکانی بوونم بەس نەبوون، ئەوا بۆ کەسێکی فەیلەسوفی وەك تۆ شیاوتر نەبوو کە ئەگەری زیان لەسەر خۆی لابەرێت؟ ئایا کاتێك لە دنیادا بووی و کەسێك پێی ڕاگەیاندبای کە خەریکە ماڵەکەت دەسوتێت و هیچ بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەشی نیشان نەدابایت، ئایا بەخێرایی بەرەو ماڵەوە ڕاتدەکرد بۆ ئەوەی کە لەو قسەیە دڵنیا ببیتەوە و پیاوانی ئاگرکوژێنەوەت بانگ دەکرد، یاخود چاوەڕێت دەکرد تا وێنەیەکی فۆتۆگرافییان بۆ دەناردی کە بۆتی دەردەخست ماڵەکەت دەسوتێت و دووکەڵی لێ بەرزدەبێتەوە[1]؟!

خستنەڕووی مەرجەکەی پاسکاڵ بە واتای ئەوە نییە، کە باوەڕبوونمان بە خودا و ئایین لەسەر ئەوە بنیاتبنرێت کە تەنیا خەوتانی[2] خۆمان بکەین و لەسەر گریمانە دابمەزرێت، بەڵکو بەو خستنەڕووە ئەوە ڕوون دەکەمەوە، کە باشترین بژاردە بریتییە لەوەی کە بەو جۆرە ڕەفتار بکەین کە خودا بوونی هەیە، جا ئەوە سەلمێنراو بێت یان نا. هەرچی پرسی باوەڕە ئەوە پرسێکی زانستییە و دەکرێ بە بەڵگەی حاشاهەڵنەگر بسەلمێنرێت و یەکلایی بکرێتەوە.

---

(١) ئەم مەرجە لەسەر (چەمکی ئەگەر) دامەزراوە، کە فەلسەفەی بێباوەڕی ڕیچارد دۆوکنزی لەسەر دامەزراوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕیچارد دۆوکنز چەمکەکەی پاسکاڵ ڕەتدەکاتەوە!!

(٢) مشوری خۆمان بخۆین.

**خوێنەری بەڕێز :**

چەندین جار لە تەوەرەکانی کتێبەکەدا باسی ئەوەمان کرد کە هزری ئایینی کورتبین (مەسیحی و ئیسلامی) هۆکارێکی سەرەکی بوو لەپشت بێباوەڕبوونی کەسانێکی زۆر، بە چ جۆرێك مرۆڤی سەرلێشێواو لە گوتاری ئایینیدا ئەوەی دەستدەکەوێت کە تینوێتی بشکێنێت و لەسەرگەردانی و گومان و بێباوەڕی ڕزگاری ببێت؟!

بەر لەوەی کەسانی تر بە کەمتەرخەمی لە گەڕان و لێکۆڵینەوە تۆمەتبار بکەین کە کردوونیەتە نێچیرێکی ئاسانی هزری مادیگەرایی، ئەوا پێویستە بە دیدێکی ڕەخنەگرانە سەرنجی هزری ئایینی بدەین، کە دەست بخەینە سەر کەم و کوڕییەکان، پێشنیاری چارسەرێکی وا بکەین کە ئەو هزرە بکاتە هۆکارێکی ڕاکێشەری عەقڵە ڕاستگۆیەکان، ئەوانەی ڕاستگۆیانە بەدوای حەقیقەتدا وێڵن، لەبری ئەوەی ببینە هۆکاری ڕەوینەوە لە ئایین، بەمەش گەشتەکەمان لەگەڵ ئەفسانەی بێباوەڕیدا کۆتایی پێدێت.

## نوێکردنەوەی هزری ئایینی :

لەم ماوانەی دواییدا دەستەواژەی نوێکردنەوەی (گوتار)ی ئایینی زۆر دەبیستین، دوای ئەوەی گوتارە باوەکە پێتوانابوو لە خستنەڕووی ئیسلام بە شێوەیەکی ڕاستەقینە ودرووست، ئەمەش زۆر یارمەتیدەربوو بۆ دەرکەوتنی ئەو شەپۆلە بێباوەڕییەی لە نارچەکەماندا دەرکەوت، هەروەك چۆن کاریگەرییەکی زۆری هەبوو بەسەر نیشاندانی وێنەیەکی ناشیرینی ئیسلام لە ڕۆژئاوادا.

ئەوەی سەرنجی گوتاری ئایینی دابێت دەرکی بەوە کردووە کە کەموکورتییەکەی تەنیا لە شێوە شێوازدا نییە، بەو پێیەی ئەگەر چاکی بکەین کارەکەش چاك دەبێت، بەڵکو ئەم (گوتارە) کەموکورتییەکی گەورە لە (ناوەڕۆك)ەکەیدا دەنوێنێت کە پێویستە ڕاستەوخۆ چاك بکرێت، واتە پێویستی بە چارەسەر و چاودێرییەکی چڕ هەیە بە زمانی ئێمەی پزیشکان[1].

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلّم) ئەو میکانیزمەی خستۆتەڕوو، کە ئەو توانایە بەو ئایینە ببەخشێت لەسەدەی شەشەمی زایینی لە دوورگەی عەرەبیدا هاتۆتە خوارەوە شیاو بێت بۆ هەموو کات و شوێنێك، فەرموویەتی: ((إن الله يبعث لهذهِ الأمة على رأس كل سنة من يجدد(يصلح) لها (أمر) دينها ))[2].

---

(١) گومان لەوە دانییە کە پرسی نوێکردنەوەی هزری ئایینی زۆر بە لق و پۆپ و گشتگیرە، کە تا ئێستا سەدان توێژینەوەی لەسەر کراوە، بەڵام هێشتا مافی خۆی پێنەدراوە و، چەند هەنگاوێك نەچێت بەرەو چاکسازی نەڕۆیشتووە، لەبەر ئەوە لە لاپەڕەکانی دواتردا هێڵە پانییەکانی ئەم پرسە دەخەینە ڕوو، بە جۆرێك کە خزمەتی بابەتی ئەم تەوەرەیە بکات، کە بریتییە لە دەرچوون لە زەلکاوی بێباوەڕیی و بێباوەڕان.

(٢) ئەم فەرموودەیە فەرموودەیەکی سەحیح و بەناوبانگە کە هاوەڵی بەڕێز ئەبو هورەیرە گێڕاویەتیەوە، وشەی (يصلح) و(أمر) یش لە هەندێك ریوایەتدا هەیە، رواه أبو داود، وصححه السخاوي والحاكم والبيهقي وابن الحجر و الألباني.

واتە: (خودا سەری هەموو سەد سالێك كەسێك بۆ ئەم ئوممەتە دەنێرێت تا پرسی ئایینەكەی نوێ بكاتەوە).

فەرموودەكە پێویستی ئوممەت بۆ(نوێكردنەوە) و (چاكسازی) پرسی ئایین ڕوونەكاتەوە، ئەگەر نا دوادەكەوێت. پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلّم) نەیفەرمووە كەسێك ئوممەت هۆشیار دەكاتەوە یان ئوممەت دەگێڕێتەوە بۆ ئایین، جیاوازییەكەش ڕوون و ئاشكرایە، چونكە گۆڕانی بارودۆخی مرۆڤایەتی لەگەڵ پێشكەوتنی ژیارستانی پێویستی دەكات دامەزراوەی ئایینی چەقبەستوو نەبێت، ئەگەرنا ژیارستانیەت دەبەستێتەوە و ناچاری وەستانی دەكات و هەر لەسەدەی شەشەمی زایینیدا دەیهێڵێتەوە، بەتایبەت كە ئیسلام كۆتا ئایینی ئاسمانییە و بۆ هەموو كات و شوێنێك گونجاوە.

سبحان الله، ئوممەت چەند زۆر باس لەو فەرموودەیە دەكات و چەند كەم كاری پێدەكات! ئەوەتا پێش هەزار ساڵ دەرگای نوێكردنەوە داخراوە، بەمەش ئوممەت بۆ خوارەوەی ژیارستانیەتی مرۆڤایەتی دابەزیوە، شێخ(محمد الغزالی) ئەم سەرەنجامە وەسف دەكات و دەڵێت: ((ئوممەتێك عەقڵی خۆی ڕەتبكاتەوە و لەسەردەمی هەزار ساڵ پێش ئێستا بیهێڵێتەوە، وا باشتربوو لەسەر چوار پێ بڕۆیشتایە(وەك ئاژەڵ) ئەگەر ڕەحمی خودا نەبوایە)).

لە توێژینەوەیەكدا ڕۆبێرت بێللا[1]، كە یەكێكە لە گەورە زانایانی زانستی كۆمەڵناسی لە كۆنگرەیەكدا لە ساڵی ١٩٦٨ لە زانكۆی هارڤارد بەسترا پێشكەشی كرد، دەڵێت: لە ڕاستیدا یاساكانی ئیسلام(جیهانی)(پێشكەوتوو) تەنانەت (شۆڕشگێڕ)ین، ئەو شكستانەی تووشی ئەو یاسایانەش بوون بۆوشكی ی چەقبەستوویینانا گەڕێنەوە، وەك چۆن زۆر كەس بەوە تاوانباری دەكەن، بەڵكو پێچەوانەكەی ڕاستە، لەوانەیە شكستەكانی لە هەندێك سەردەمدا بەهۆی ئەوە بوویێت كە یاساكانی هاوچەرخانەتر بوونە لەوەی سەركەون.

-------

(١) Robert N.Bellah: مامۆستای زانستی كۆمەڵناسی بوو لە زانكۆی كالیفۆرنیا، یەكێكە لە گرنگیدەران بە پەیوەندی زانستی كۆمەڵناسی بە ئاینەكانەوە.

لێرەدا پرسیارێك خۆی فەرز دەكات؛ چۆن بانگەوازێكی جیهانی پێشكەوتووی شۆڕشگێڕی بە جۆرێك دواكەوتووە تا بۆتە بار بەسەر هزر و بۆتە میكانیزمێك بۆ تووشكردنی كۆمەڵگە بە چەقبەستوویی؟!

ئەگەر بارودۆخی ئیسلام لەسەردەمی درەوشانەوەیدا بەراورد بكەین بە بارودۆخی لە سەردەمەكانی دواكەوتنی ژیارستانیەتی ئیسلامی، ئەوا دەبینین دوو هۆكاری مەترسیدار لە هزری ئیسلامیدا چەسپێنراون تا وەها نیشانی خەڵك دراو نەوەك ئەوەی لە ئوسولاً و بنچینەكانی ئایین بن.

یەكەمیان، دەركەوتنی چینێكە كە لێكدانەوەی دەقە پیرۆزەكانی بۆ خۆی قۆرخكردووە و خۆیان بە شایەنی قسەكردن بە ناوی ئایین دەزانن و لە بڕیارەكانیاندا ئەو بۆچوون و مەزهەبانە بەكار دەهێنن كە لەگەڵ بڕیارەكانیاندا یەكانگیر دێنەوە، بۆچوونە ناكۆكەكانیش وەلا دەنێن، واتە چینێكی (كەهەنووتین) ئەگەر بە ڕاشكاوانەش ئەو ناویان لێنەنرێت.

هۆكاری دووەمیش، لەوەدایە كە ئەم چینە تەشریع و وەڵام و چارەسەرەكانی پێشوویان وا داناون كە(ڕێنمایی ناچاركەرن و بەشێكن لە بنچینەكانی ئایین)، ناكرێ هەموار و دەستكاری بكرێن یان بگۆڕدرێن، چ ئەوەی پەیوەندی بە پرسیارەكانی بیروباوەڕ (العقیدە)وە هەیە یان ئەوەی پەیوەندی بە ژیانەوە هەیە[1].

---

(١) لە كتێبی (نحو ثورە فی الفكر الدینی) نووسینی د.محمد النویهی. كە دكتۆرای لە زانكۆی لەندەن بەدەستهێناوە و، سەرۆكی بەشی زمانی عەرەبییە لە زانكۆی (الخرگوم)، لە (گنگا) لە میسر لە دایك بووە، لە ساڵی ١٩١٧ز.

## هزری ئایینی چەقبەستوو :

دوو هۆکاری پێشوو بوونە هۆی پەیدابوونی هزرێك، کە لەگەڵ بانگەوازی پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بۆ چاکسازی و نوێگەری ناهێتەوە، بۆیە شایەنی ئەوەیە بە هزرێکی چەقبەستووی تەقلیدی وەسف بکرێت، کە خەریکە لە ئێستادا ئەم جۆرە گوتارە هەژموونی خۆی بەسەر گوتاری ئایینیدا دەسەپێنێت.

ئەگەرچی ئەم جۆرە گوتارە پێش هەزار ساڵ دەرکەوتووە، ئەوەش دوای داخرانی دەرگای ئیجتیهاد(لە دوای وەفاتی ئەبو حامد غەزالی)، لەسەردەمی نوێدا هەنگاوی مەترسیداری بەخۆیەوە دیوە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو جیاوازییە گەورەیەی هێز و سامان و ڕابوونەی کە ڕۆژئاوا تیایدا دەژی، لەگەڵ ئەو دواکەوتوویی و بێهێزییەی کە پەیڕەوانی ئەم هزرە لە ڕۆژهەڵاتدا تیایدا دەژین. لەبەر ئەوە سەرەڕای ئەو ڕق و کینەیەی ئەو جۆرە کەسانە لە بەرامبەر ژیارستانیەتی ڕۆژئاوا هەیانە، کە دەگەڕێتەوە بۆچەند بارودۆخێکی مێژوویی کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی داگیرکاری ڕۆژئاوایی، وایدەبینن کە کەلتورەکەیان پەناگە و بەربەستە لەبەردەم لافاوی ژیارستانی. سەرەڕای ئەوەش زۆربەی زۆری ئەوانەی بانگەشە بۆ ئەو ڕەوتەدەکەن ئەو گەنج و لاوانەن کە خوێنگەرمن و زوو کاریان تێدەکرێت و لەلایەن زۆر هێزو لایەنی جیاوازەوە بەکاردەهێنرێن، چ لە ناوەوەی کۆمەڵگەی ئیسلامی بێت یان لە دەرەوەی، بۆیە بوونەتە نێچیری دەستی بەرژەوەندی و ئارەزووە سیاسییەکانی کەسانی تر.

هزری ئیسلامی چەقبەستووی لاساییکەرەوە بەوە کورتدەکرێتەوە کە هەوڵ بۆ گەڕانەوە بۆ ڕابردوو و دەستگرتن بەو شێوازەی ژیانی ئیسلامیانە دەدات، کە

لەسەردەمی سەرەتای هاتنی ئیسلامدا باو بوو، بە بیانووی پاککردنەوەی ژیان لەو پیسی و بیرۆکە خراپانەی لە ڕۆژئاواوە هاتوون، بۆ بەدیهێنانی ئەوەش، لایەنگرانی ئەم جۆرە هزرە عەقڵیان دەخەنە لاوە، هەوڵدەدەن لاسایی پیت بە پیتی دەقەکان بکەنەوە و بۆ ئەو مەزهەبەی پەیڕەوی لێدەکەن دەماگیرن.

بە پشت بەستن بەم مەنهەجە لە ڕەتکردنەوەی نوێگەری و بەکارهێنانی عەقڵ، لایەنگران و پەیڕەوانی ئەم جۆرە هزرە لە دژی هەر نوێگەرییەکی ئایینی و تەنانەت دنیاش وەستاونەتەوە، تەنانەت شێخی ئەزهەر لەسەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەمدا فەتوایەکی دەرکرد تیایدا ڕایگەیاند کە چوار مەزهەبەکە بە ڕەهایی باشترینن، بە بیانووی ئەوەی کە تەنیا پێشەواکانیان زانست و تێگەیشتنی قووڵیان هەبووە، هەرکەسێك لێیان دوور بکەوێتەوە دەکەوێتە هەڵە لە دوای هەڵەوە، کەواتە لەسەردەمی ئەودا ئەوانەی شایەنی نوێکردنەوە و تەفسیرکردنی دەقە پیرۆزەکانن بوونیان نییە[1].

## ئەزموونێکی تایبەتی بە ئازار:

هەروەك چۆن لە تەوەرەی دوازدەهەمدا هەندێك لە گفتوگۆکانم باسکردووە کە لەگەڵ گەنجە بێباوەڕەکاندا ئەنجاممداون، لێرەدا ئەزموونی تایبەتی خۆم دەربارەی هزری پێچەوانەی ئەوان باس دەکەم، کە ڕەنگدانەوەی چەقبەستوویی هزری باو و بە پیرۆزدانانیەتی لەسەر حیسابی:

١)ئایین! ٢) زانست! ٣) عەقڵ! ٤) حەق! ٥) بەهاو ڕەوشت!

ئەم گفتوگۆیەی خوارەوەم لەگەڵ یەکێك لە گەورە زانایانی ئایین بوو، کە بۆ چەند ساڵێك لە بەرزترین پێگەی فەتوادان بوو لە میسر!

---

(١) زۆرێك لە پیاوانی ئەزهەری پیرۆز لە ئێستادا پەیڕەوی لەڕەوتێکی نوێگەری ڕۆشن دەکەن، ئەو فەتوایەش کە شێخی ئەزهەر داویەتی لە ماوەیەکی مێژوویی میسر بووە کە چەقبەستوویی بەسەر ئەو دامەزراوە بە هێزدا زاڵ بووە.

شێخ لە مزگەوتە مێژووییەکەدا، کە ڕاهاتووین بۆ نوێژکردن رووی دەکەینێ، خەریکی خوێندنەوەی وتاری هەینی بوو، لەمیانەی قسەکانیدا باسی ئەوەی کرد کە دەکرێ ماوەی سکپڕی ئافرەت بە پێی مەزهەبەکانی مالیکی و شافیعی و حەنبەلی[1] بگاتە چوار ساڵ، شێخ گوتی کە ئەویش بە فەتوایەکی لەو جۆرە ڕازییە.

تووشی سەرسوڕمان بووم، کە چۆن شێخ هێشتا دەستی بەم بۆچوونە فیقهییە گرتووە کە هەڵەیی و هۆکارەکانی لە ڕابردوودا بووە[2]، ئەمە سەرەڕای ئەوەی زانست سەلماندوویەتی و بڕاندوویەتیەوە کە ماوەی سکپڕی لە نۆمانگ تێپەڕ ناکات، تەنیا دەکرێ دوو هەفتە بەسەر ئەوکاتەدا بڕوات، ئیتر بۆچی دەست بەو بۆچوونەوە بگرین کە زانست هەڵەیی سەلماندووە؟!

لە دانیشتنێکی تایبەت لەگەڵ شێخدا پێمگوت: ئەو فەتوایەی تۆ دەیدەیت پێچەوانەی زانستی ڕاشکاو و ڕاستە. لێی پرسیم: ئایا گەیشتنی ماوەی سکپڕی بە چوار ساڵ بە مەحاڵی عەقڵ دادەنرێ یان بە مەحاڵی کرداری؟ وەڵامم دایەوە: بە مەحاڵی عەقڵی دانانرێت، چونکە مێینەی فیل و نەهەنگ بۆ ماوەیەکی نزیك لەوە سکپڕدەبن.

گوتی: کەواتە لە ڕووی (عەقڵییەوە) دەکرێ ئەگەر بۆ جارێکیش بێت ماوەکەی بگاتە چوار ساڵ!

لێم پرسی: ئایا موفتییەکان لەسەر ئەگەری عەقڵی فەتوا دەدەن؟ یان لەسەر ئیمکانیەتی واقیعی؟ پاشان گوتم: لە ڕووی ئەگەری عەقڵییەوە ڕێی تێدەچێت کە مانگی ڕەمەزان ببێتە سەد ڕۆژ، خۆر ئاوانەبێت یان لە ناوەڕاستی ئاسمان بوەستێت...

---

(١) هەندێك ڕاوبۆچوون لە مەزهەبی مالیکیدا ماوەی سکپڕی دەگەیەننە پێنج ساڵ.

(٢) کتێبەکانی فیقهی مالیکی باس لەوە دەکەن کە هاوسەری (محمد بن عجلان) لە هەر سکپڕییەکدا ماوەکەی چوار ساڵ بووە، کە ئافرەتێکی بەڕەوشت و باش بووە. بۆیە لەسەر قسەی ئەو ئیمامی مالیك فەتوای ئەوەی داوە کە دەکرێ ماوەی سکپڕی بگاتە چوار ساڵ و ئیمامی شافیعی و حەنبەلیش لەوەوە وەریان گرتووە.

زۆر شت هەن کە لە ڕووی عەقڵییەوە مەحاڵ نین، بەڵام ئایین و زانست دەکەون، ئەگەر حوکمەکانمان بە پێی ئەگەرە عەقڵییەکان بدەین.

شێخ هەوڵیدەدا پزیشکێك بۆ فەتوا هەڵەکەی بدۆزێتەوە و گوتی: ئیسلام توندە لەبارەی ناموسەوە و ڕێگە نادات بە هیچ جۆرێك بوختان بۆ ئافرەت هەڵببەسترێت.

لێم پرسی: ئایا ئیسلام هانی زیناکردن دەدات، یان قەبووڵی ئەوە دەکات منداڵێك کە منداڵی من نییە بدرێتە پاڵ من و سەیری ناموسی کچەکانم بکات کە لە دایکێکی ترن و برایان نییە و بە فێڵ ببێتە هاوبەشی منداڵەکانم لە میراتدا؟!

پاشان گوتم: بەم شێوەیە ئەم فەتوایە نەك هەر پێچەوانەی زانست و عەقڵ و حەقە، بەڵکو پێچەوانەی بەهاو ڕەوشتیشە، هەروەها پێچەوانەی ئایینیشە؛ ئایا پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا ئەوەی دیاری نەکردووە کە ماوەی سکپڕیی و شیر پێدان دوو ساڵ و نیوە، ئیتر چۆن سکپڕیی بەتەنیا دەگاتە چوار ساڵ؟![1].

---

(١) سەرنجی ئەم دوو ئایەتە پیرۆزە بدە:

﴿ وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ ﴿١٤﴾ ﴾ لقمان: ١٤

واتە: ئادەمیزادمان ڕاسپاردووە دەربارەی باوك و دایکی. دایکی لە کاتی سستی لە سەر سستیدا، کە کاتی دوو گیانییەتی، لە سکی خۆیا هەڵی گرتووە. جیابوونەوەی لە سکی دایکی و بە لە دایك بوونی و، لە کۆش و بەرمەمکانی بە برینەوەی لە شیر لە دوو ساڵایە. ڕامان سپاردووە کەوا بەرانبەر بەم ئازاروو نەزیەتەی دایکت لە گەڵتی کێشاوە سپاسی منیش و باوك و دایکیشت بکە و سەرەنجامیش دێیتەوە بەر دەستی خۆم پاداشت یان سزای کرداری دنیات ئەدەمەوە.

﴿ ...وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا ۖ وَحَمْلُهُ وَفِصَالُهُ ثَلَاثُونَ شَهْرًا... ﴿١٥﴾ ﴾ الأحقاف: ١٥

واتە: هەڵگرتنی لە سکیدا و لە شیربڕانەوەی سی مانگی ڕەبەق ئەخایەنێ. ئایەتەکەی سورەتی (لقمان) ئەوەی دیاریکردووە کە ماوەی شیرپێدان دەگاتە دووساڵ، هەروەها ئایەتەکەی سورەتی (الاحقاف) ئەوەی دیاریکردووە کە سکپڕی و شیرپێدان پێکەوە دەگەن بە دوو ساڵ و نیو. بە پشت بەستن بەم دوو ئایەتە زانایان فەتوای ئەوە دەدەن کە کەمترین ماوەی سکپڕی بریتییە لە شەش مانگ، بەڵام باسیان لە درێژترین ماوەی سکپڕی نەکردووە

دوای ئەوەی دنیای لەبەردەم تەنگ بوو، شێخ لە بۆچوونەکەی پاشگەزبووەوە و گوتی: لە ڕاستیدا کۆڕبەندی توێژینەوە ئیسلامییەکانی ئەزهەری پیرۆز لە ئێستادا فەتوای ئەوە دەدەن کە زانست وایدەبینێت ماوەی سکپڕی نۆمانگە!

سبحان الله! سەرەڕای ئەوەی کە کۆڕبەندی توێژینەوەکان لەسەر قسەی زانست فەتوا دەدات، کەچی شێخ پێچەوانەی ئایین و زانست و عەقڵ و حەق و ڕەوشت، بەرگری لە پیرۆزی کەلتوور دەکات، بۆ ئەوەی لە ژێر ڕۆشنایی زانست و واقیعدا چاو بە فەتوا کۆنەکانیدا نەخشێنێتەوە.

جارێکی تر وا ڕێککەوت کە لە یەکێك لە وانەکانی شێخ ئامادەبم، باسی (الناسخ و المنسوخ)ی دەکرد لە قورئانی پیرۆزدا، کە چۆن لەسەر هەرکەسێك پێویستە بەباشی لێی تێبگات کە بەر لەوەی خۆی بداتە بەر تەفسیری ئایەتێك لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز، زیاتر لە کاتژمێرێك جەختی لەسەر ئەوە کردەوە. دوای وانەکە چوومە لای شێخ لە نووسینگەکەی و پێم گوت: بەڕێزم من بە شتێکی ڕەوای دانانێم کە باسکرد لەوەی فەرموودەیەکی پیرۆز ئایەتێکی قورئانی نەسخ کردبێتەوە، یاخود ئەوەی کە سورەتی (الاحزاب) لە سورەتی (البقرة) گەورەتر بووبێت و پاشان زۆربەی ئایەتەکانی نەسخ کرابنەوە، هەروەها گوتم: ئەم جۆرە تێگەیشتنە بۆ (الناسخ و المنسوخ) تانەیەکی مەترسیدارە لەسەر پارێزراوی قورئانی پیرۆز.

ئا لەوکاتەدا شێخ گوتی: من باوەڕم بە (الناسخ و المنسوخ) نییە!! بەڵکو باوەڕم وایە کە کتێبی خودا بەر لە بەدیهێنانی بوونەوەریش بەم شێوەیەی ئێستای لە(اللوح المحفوظ)دا پارێزراو بووە!!

سبحان الله!.. ئایا بە پیرۆزدانانی کلتوور گەیشتۆتە ئەو ئاستەی دەربڕینی خوێنگەرمی بۆ ئەو شتانەی نکۆڵییان لێ دەکەین؛ تەنانەت گەیاندنیان وەك حەقیقەت بۆ کەسانی تر؟! لاحول ولا قوه إلا بالله.

دوای ئەوە بە چەند ساڵێك، لە کەناڵێکی ئاسمانی گوێم لە شێخ بوو کە هێشتا هەر دەستی بە بۆچوونەکانی پێشوویەوە گرتووە و زۆر بە جددی بەرگریان

لێدەکات، واتا ئەم جۆرە تێگەیشتنە بە تەنیا بۆ ئەو کەسانە نەخراوەتەڕوو کە گرنگی بە زانست دەدەن،تەنانەت گەیشتۆتە عەقڵی خەڵکی ئاساییش!!

## خاسیەتەکانی هزری ئایینی چەقبەستوو :

ئەگەر سەرنجی ئەزموونە تایبەتییە بە ئازارەکەی من و ئەو سیفاتە گشتییانەی لە هزری ئایینیباو بدەین، دەبینین کە شەش بنچینە و ڕێسای سەرەکی هەیە:

**یەکەم:** وەرگرتنی ڕووکەشی دەقەکان و، بە پیرۆزدانانی کلتوور و کارەکانی پێشینان.

هزری ئایینی چەقبەستوو لە زۆربەی لێکدانەوەکانی بە ڕووکەشی لێکدانەوەکانی وازدێنێت، بە بێ لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندی و دانایی، ئەم ئاڕاستەیەش بۆتە هۆی لادانێکی زۆر لە ئامانجەکانی شەریعەت و بنچینەکانی[1].

هەر وەك چۆن ئەم ڕەوتە لە تێگەیشتنیان لە ئایین بە تەواوی پشت بە ڕای پێشینان دەبەستن، تا ئاستی پیرۆزی بەرزیان دەکەنەوە، بە جۆرێك ناکرێ قسەیان لەسەر بکرێ یان چاویان پێدا بخشێندرێتەوە.

لە هەمان کاتیشدا، ئەم ڕەوتە کارە کلتوورییە عەقڵییە ڕۆشنەکان پشتگوێ دەخات و وەریان ناگرێت، سەرەڕای ئەوەی کە شانازیان پێوە دەکات کاتێك کە باسی وەرگرتنی ڕێڕەوی زانستی ئەورووپا دەکات لەمسوڵمانانەوە (هەروەك لەگەڵ هزری ئیبن ڕوشددا ڕوودەدات)، هەروەها هەندێك جاریش بۆ ئەوەی بیکاتە بەهانە بۆ بە ڕەوادانانی سوود وەرگرتن لە هەندێك لە بەرهەمەکانی

---

(١) نموونەی ئەوە پەیڕەویکردنی ئەم هزرەیە لە بە ڕەوادانانی جێبەجێنەکردنی سزای دزی بەسەر ئەو کەسەدا کە ماڵی دەوڵەت بدزێت، بە بیانووی ئەوەی دزەکە بەشێکی لەو ماڵەدا هەیە!

هزری ئەورووپی، ئەگەر پێویست بکات! تا بەم شێوەیە گوتاری چەقبەستوو ڕێڕەوێکی هەڵاوێری پەیڕەو دەکات لە کاتی مامەڵەکردنی لەگەڵ زۆربەی پرسە ئایینی و ژیانییەکاندا.

**دووەم: پشتگوێخستنی مێژوو لە تەشریعدا.**

پشتبەستن بە کلتووری باوەڕبوون بە هاوشێوەی کێشەکانی ئێستا و ڕابردوو، هەروەها وێناکردنی جێبەجێکردنی هەمان چارسەری ڕابردوو بۆ چارسەرکردنی کێشە هاوچەرخەکانی، لێ پەیدا دەبێت، ئەمەش بۆتە هۆی هەوڵدان بۆ وەستاندنی ڕەوڕەوەی مێژوو و تەنانەت گێڕانەوەی بۆ سەردەمی دابەزینی قورئانی پیرۆز، وەك ئەوەیە کە داوای دەستکاریکردنی سەردەم دەکەن تا لەگەڵ دەقدا بێتەوە! لەبری ئەوەی لە ژێر ڕۆشنایی واقیعی مێژوویی خوێندنەوە بۆ دەقەکان بکەن.

ئەم ڕەوتە لە حەقیقەتێکی بنچینەیی بێئاگایە، ئەویش ئەوەیە کە ئیسلام هەر لەسەرەتای دەرکەوتنییەوە ڕەچاوی بارودۆخی واقیعی کردووە، ئەمە بە ئاشکرایی لە پلەبەندی چاکسازی و گۆڕینی حەرامەکاندا دەردەکەوێت، وەکو ڕێبازی قەدەغەکردنی ئارەق و کۆیلە و کەنیزەك و پەیوەندی پیاوی نامسوڵمان بە ئافرەتی مسوڵمان و هی تر[١].

لاساییکەرەوەکان خۆیان لەم حەقیقەتانە بێئاگا دەکەن و داوا لەمسوڵمانانی سەدەی بیست و یەکەم دەکەن، کە لەسەردەمی شۆڕشی زانستەکان و بۆشاییەکانی ئاسمان و پەیوەندییەکان وئینتەرنێتدا دەژین، هاوشێوەی ژیانی مسوڵمانانی سەرەتای مەککە و یەثریب بژین، بەڵام چۆن و بۆچی؟ هیچ وەڵامێکیان نیە.

لەبەر ئەوە ئەگەر پرسێك هاتە پێشەوە کە فەقیهی موقەللید هەڵبستێت بە لێکۆڵینەوەو هەڵاوێرکردنی بۆچوونە کۆنەکان، ئەوا ئەو بابەتە هەڵدەبژێرێت کە

---

(١) ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەو واتایە دووپات دەکاتەوە کاتێك بە عائیشەی فەرموو: (لولا قرب قومك من الجاهلية لهدمت الكعبة و بنيتها على قواعد إبراهيم).حدیث صحيح : واتا: لەبەر نزیکی گەلەکەتەوە نەبوایە لە جاهیلیەت، ئەوا کەعبەم دەڕوخاندو لەسەر بناغەی ئیبراهیم دروستم دەکردەوە.

لە پرسەکەیەوە نزیکە و ناگەڕێتەوە بۆ دەقە بنچینەییەکەی قورئان و سوننەت، وەك ئەوەی کە عەقڵ نەزۆك بێت و نەتوانێت حوکمیان لێوە هەڵبێنجێت[١].

**سێیەم:** جیاوازینەکردن لە نێوان هزری مرۆیی و ئاییندا.

هزری دواکەوتوو ئەوە پشتگوێ دەخات کە بۆ هاوەڵانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) ڕوون بوو، کە جیاوازیکردنە لە نێوان دەقە ئایینییەکان و ئەزموونی مرۆیی و زادەی عەقڵ، بەڵگەش لەسەر ئەوە ئەوەیە، کە زۆر لە هاوەڵان لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)یان دەپرسی ئاخۆ ئەم ڕەفتارەی وەحییە یان زادەی عەقڵ و ئەزموونە، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) ڕێسایەکی گرنگی بۆ جیاوازیکردن لە نێوان دوو حاڵەتەکەدا داناوە، کە فەرموویەتی (أنتم أعلم بأمور دنیاکم)[٢]. واتا: ئێوە لە کاری دنیاتان شارەزاترن.

**چوارەم:** بە فیڕۆدانی ڕۆڵی عەقڵ و زانست لە ژیاندا.

هزری لاساییکەرەوە پەیڕەوی لەوە دەکات کە قورئانی پیرۆز لێکدانەوەی بۆ هەموو دیاردە کۆمەڵایەتییەکان و تەنانەت دیاردە سروشتیەکانیش کردووە، بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئەو یاسایانەی ئەو دیاردانە بەڕێوە دەبەن، ئەمەش واتا ڕەتکردنەوەی ڕۆڵی هەریەکە لە عەقڵ و زانستە، کە بۆتە هۆی پشتلێکردنەوەو کەمتەرخەمییەکی زۆر لە لەبەرچاوگرتنی هۆکارەکان، ئەمەش دووچاری ئەو دۆخە دواکەوتوویەی کردووین کە لە ئێستادا جیهانی ئیسلامی پێیەوە دەناڵێنێت.

سەرەڕای ئەوەش گوتاری چەقبەستوو لە هەموو بۆنەیەکدا ئەوە دووپات دەکاتەوە کە ئیسلام ئایینی زانست و عەقڵە، ئەم هەڤدژییەش بۆتە هۆی پشێوییەکی زۆر لە عەقڵی مرۆڤی مسوڵماندا. هەروەها ئەم جۆرە گوتارە هێرش دەکاتە سەر زۆربەی هەوڵ و داهێنانەکانی عەقڵی مرۆڤ و لە پێگەی کەم

---

(١) ئەم ڕێڕەوە بۆتە هۆی تێکەڵکردنێکی زۆر، کە وای لە زۆر کەس کردووە - بۆ نموونە - وێنەی فۆتۆگرافی ڕەت بکەنەوە، تەنیا لەبەر ئەوەی کە پێشینان وێنەیان حەرام کردووە، کە لەکاتی ئەواندا بریتی بووە لە پەیکەر تاشی.

(٢) حدیث صحیح رواه مسلم عن أنس.

دەکاتەوە، لەبەر هیچ نا، تەنیا لەبەر ئەوەی بەرهەمی عەقڵیرۆژئاوایی یان عەلمانی یان بێباوەڕ یان مارکسییە.

**پێنجەم: حەرامکردنی ئیجتیهاد لەو شتانەی کە دەقیان لەبارەوە هاتووە.**

هزری لاساییکەرەوە وایدەبینێت هەمیشە دەرفەت بۆ بەڵگەی دەقەکانە بەو شێوەیەی کە پیاوانی خۆی لێی تێگەیشتوون، ئەگەر ئەمە لەسەر حیسابی بەرژەوەندیش بێت، بێئاگان لە قسەی پێشەوا عەلی کوڕی ئەبوتالیب، کاتێك فەرموویەتی: (قورئانی پیرۆز چەند ڕوویەکی لەخۆ گرتووە، قورئان نوسراوێکی نێوان دوو بەرگە و قسە ناکات، بەڵکو پیاوان قسەی لەبارەوە دەکەن)، هەر ئەم تێگەیشتنە قووڵەش بۆتە هۆی پەیدابوونی مەزهەبەکان و چەندەها بۆچوون و قوتابخانەش لەناو مەزهەبەکاندا.

بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم ڕاجیاییەش، لاساییکەرەوەکان ڕێسایەکیان داناوە، دەڵێت: (لا اجتهاد مع النص). واتە: لە کاتی بوونی دەقدا بواری ئیجتیهاد نییە. کە ئەم ڕێسایە بۆتە هۆی پەکخستنی بەڵگەکان بە پێی تێگەیشتنی خۆیان، واتا دان بە فرەمەزهەبی دانانێن لە فیقهی ئیسلامیدا. سەرەڕای ئەوەی کە فیقهی ئیسلامی شانازی بە بوونی چەند نموونەیەکەوە دەکات کە تیایدا بە مامەڵەیەکی جیاواز لە مامەڵە ڕووکەشەکەی دەق مامەڵە کراوە، وەك ڕەفتارەکانی پێشەوای بڕواداران عومەری کوڕی خەتتاب، کە دەرخەری ئەوەن عومەر دانایی و مەبەستی (الحكمه والقصد) لە پێش ڕووکەشی دەقەکە داناوە، واتا عەقڵی بەسەر نەقڵدا زاڵ کردووە[1].

---

(١) بۆ نموونە پێشەوا عومەر لە ساڵی برسێتیدا سزای بڕینی دەستی دزی هەڵگرت، ئەگەر چی دەقی ئایەتەکە گشتگیرە، هەروەها پێدانی بەشی (والمؤلفه قلوبهم)ی ڕاگرت سەرەڕای ڕاشکاوی ئایەتەکە، هەروەها هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتانی ئەهلی کیتاب قەدەغەکرد ئەگەر چی دەق ڕێگاشی پێداوە، هەروەها دابەشنەکردنی خاکی(سواد العراق) لەگەڵ غەنیمەتەکاندا ئەگەرچی پێغەمبەر لە خاکی خەیبەریش کردی، هەروەها سێ تەڵاقی لە یەك کاتدا بە تەڵاق کەوتن و سێ تەڵاق هەژمار کرد نەك بەیەك تەڵاق، هەروەها زیادکردنی سزای جەڵدەکانی مەیخۆر لەو سزایەی کە لەسەردەمی پێغەمبەر و خەلافەتی ئەبوبەکر ناسرابوو، هەروەها تۆڵەسەندنەوە لە کۆمەڵە کەسێك ئەگەر کەسێکیان کوشتبێت، نموونەی تر زۆرن کە بەرژەوەندی لە پێش واتای ڕووکەشی دەق دانراوە.

**شەشەم: بەکارهێنانی (بنەمای حاکمییەت)[1] بۆ بەرژەوەندی.**

تیشکی درووشمی (حاکمییەت تەنیا بۆ خودایە) بە درێژایی مێژوو جێگیربووە، بووە مایەی لاساییکەرەوەکان دەسەڵاتی تەفسیرکردنی دەقەکان و ڕوونکردنەوەی حوکمی خودایان قۆرخ کرد، کە ئەمەش بووە هۆی بوونی تەنیا یەك حیزب و بانگەشەکردنی ئەوەی کە حیزبی خودایە.

ئەگەر جێگای شانازی مرۆڤ بێت کە تەسلیمی (حاکمییەت تەنیا بۆ خودایە) ببێت، ئەوا یاسا تایبەتییەکانی کاروباری دنیا پێویستییان بە تەئویل و ئیجتیهاد هەیە[2]، بەڵام ئەگەر گوتاری ئایینی پێداگری لەسەر ئەوە بکات کە حاکمییەت بۆ ئەو بازنانەیەش پەلکێش بکات، ئەوا بێگومان ئەم کارە دەبێتە هۆی کۆیلەکردنی خەڵك بۆ حوکمەکانی چینی پیاوانی ئایین[3] و لەبری ئەوەی حاکمییەت، لە دیکتاتۆریەتی هەندێك فەرمانڕەوا ڕزگارمان بکات، دەمانخاتە داوی دیکتاتۆریەتێکی مەترسیدارتر کە بریتیە لە دیکتاتۆریەتی پیاوانی ئایین! چونکە بەرەنگاربوونەوەی حاکمییەتی فەرمانڕەواکان و هەوڵدان بۆ گۆڕینیان شتێکی ڕەوایە، بەڵام بەرەنگاربوونەوەی حاکمییەتی زانایانی ئایین بە کوفر و بێباوەڕی و دەرچوون لە دژی خودا دادەنرێت، بەمەش ململانێکە لە ململانێی نێوان مرۆڤ و مرۆڤ دەگۆڕێت بۆ ململانێی نێوان مرۆڤ و خودا[4].

---

(١) بیرۆکەی حاکمییەت دەگەڕێتەوە بۆ بەرزکردنەوەی قورئانەکان بەسەر شمشێرەکانەوە و بانگەشە کردنی حاکیمەتی خودا لە جەنگی (صفین) لە لایەن ئەمەوییەکانەوە، وەك فێڵێك بۆ چوونە ڕیزی لەشکرەکەی پێشەوا عەلی کوڕی ئەبوتالیب(خوا لێی ڕازی بێت).
ئەم کارە دووچاری کەمەنووتێکی وەك هەنووتەکەی سەدەکانی ڕاست و حاکمییەتی کڵێسار چەکی لێخۆشبونمان دەکات.

(٢) فەرمووەدی: (أنتم أعلم بأمور دنياكم). واتا : ئێوە بەکاری دنیاتان شارەزاترن.

(٣) هەروەك چۆن لە مەزهەبی شیعەدا ڕوودەدات، کە ئیمامەتیان کردۆتە بەشێك لە بیروباوەڕ (العقيدە).

(٤) هەروەك چۆن لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لە ئەورووپادا ڕوویدا.

### هاواری ئاگاداری.... نوێگەری بۆچی لە ئێستادا[١]

نوێکردنەوەی هزری ئایینی لە هیچ قۆناغێك لە قۆناغەکان یان سەردەمێك لە سەردەمەکان ئەوەندەی ئەمڕۆ پێویست نەبووە، تا ئەو ئاستەی کە بۆتە فەرزی عەین لەسەر هەموو کۆمەڵگاو زانایانی مسوڵماندا. هەرکەسێك چاوێك بە پێگە و پەڕە بێباوەڕییەکانی ئینتەرنێتدا بخشێنێت بۆی دەردەکەوێت کە هەڵمەتی ڕێکخراو و گەورە هەن کار لەسەر وروژاندنی گومانەکان دەکەن دەربارەی قورئانی پیرۆز و پێغەمبەری ئیسلام (صلی الله علیه وسلم) و شەریعەتی ئیسلام و مێژووی ئیسلام، ئەو هەڵمەتانەش پشت بە چەند قسەیەکی چەند کتێبێکی کلتوری ئیسلامی دەبەستن، بەتایبەت کتێبەکانی تەفسیرو ژیاننامەی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)و فەرموودە پیرۆزەکان و فیقه و مێژووی ئیسلامی، هەروەك چۆن قسەی ژمارەیەك لە گەورە زانایان و بانگخوازان بۆ پاڵپشتیکردنی بانگەشە بێباوەڕەکانیان دەبرن و ئەو بەشەی قسەکانیان کە خزمەت بە ئامانجەکەیان دەکات بەکاریدەهێنن.

لەبەر ئەوە بانگەوازکارانی بێباوەڕی و وروژاندنی گومانەکان دەربارەی ئیسلام لە ئێستادا پێویستیان بەوە نییە کە چیرۆك و قسە هەڵبەستن تا بگەنە مەرامەکانیان، تەنیا ئەوەندەیان بەسە بڕۆن لاپەڕەکانی کتێبەکانمان هەڵبدەنەوە و وشەکانمان بخوێننەوە، ئەوەی بیانەوێ دەستیان دەکەوێت و بگرە زیاتریش، بۆیە نوێکردنەوەی هزری ئیسلامی بۆتە شتێکی حەتمی و ناکرێ دوابخرێت، ئەمەش بۆ بەدیهێنانی چەند ئامانجێك، گرنگترینیان:

---

(١) دەتوانین بڵێین کە نوێکردنەوە لە سەدەی دووەمی کۆچی و لە ئیمامی شافیعییەوە دەستی پێکردووە، پاشان ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و کیندی و رازی لەسەدەی سێیەمدا و پاشان ئەبو حەسەنی ئەشعەری و فارابی. لە سەدەی پێنجەمیشدا ئیمامی غەزالی پاشان فەیلەسووف ئیبن ڕوشد و تا دەگاتە ئیبن تەیمییە، لە سەدەی هەشتەمیشدا فەیلەسووف ئیبن خەلدون و ئیبن قەیمی جەوزی، تا دەگاتە جەمالەددینی ئەفغانی لە سەدەی دەیەمی کۆچی، پاشان پێشەوا موحەمەد عەبدە لە سەدەی یازدەهەمدا، ئومێدوارین ئەم کاروانە هەر بەردەوام بێت.

١- لابردنی ئەو شتانەی هاتوونەتە ناو بیروباوەڕ(العقیدە)وە[1] و ئاسانکاری و لابردنی زەحمەت لەسەر گەلانی مسوڵمان و، بەرەنگاربوونەوەی بیدعە و خورافیاتەکان و لابردنیان لەسەر ڕێگای ئیسلام و، ڕێگرتن لە بانگخوازانی توندڕەوی و تەسککردنەوەی حوکمەکان.

٢-چەسپاندنی میانڕەوی ئایین و لێبووردەیی لە فیترەتی دەروونی شوێنکەوتوانیدا، بە جۆرێك کە بنەماو مەبەستە بەرزەکانی ئیسلام لەگەڵ فیترەتی دەروونەکان و پێداویستییەکانیدا بێتەوە، بۆ ئەوەی دەروونەکان بە پەرستشەکان ئارام ببنەوە و وزەکەیان لە پێناو کاری چاکە و بەرژەوەندی کۆمەڵگەی ئیسلامی و مرۆڤایەتی بە گشتی بخەنەگەڕ.

٣- پێویستە میانڕەوێتی ئیسلام بۆ جیهان نیشان بدرێت، نەك بۆ خۆنزیکخستنەوە لە کەسانی تر، بەڵکو لە پێناو گەیاندنی بانگەوازی لێبووردەیی و میانڕەوی بۆ هەموو مرۆڤایەتی، چونکە پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)بە ڕەحمەت بۆ هەموو جیهان نێردراوە.

٤-لە ئێستادا جیهانی ئیسلامی تووشی دواکەوتوویی بووە، ئەمەش نوێکردنەوەمان لەسەر پێویست دەکات لە پێناو بەکارخستنی پرۆژەکانی چاکسازی لە وڵاتانی ئیسلامی لە هەموو بوارەکاندا؛ ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی، تا جیهانی ئیسلامی ببێتە هێزێکی کارا لە چوارچێوەی سیستەمی نوێی جیهاندا.

٥- نوێگەری بۆتە پێویستییەکی ئایین بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو کارەساتانەی بە هۆی گوتاری توندڕەوی ئایینییەوە هاتوونەتە کایەوە، گرنگترینیان تاوانە تیرۆریستییەکانی دەرەکی و ناوەخۆیین، کە بوونەتە پەڵەی ڕەش و وێنەی ئیسلامیان لە هەموو جیهاندا ناشیرین کردووە، دواکەوتوویيان تووشی وڵاتانی مسوڵمان کردووە.

---

(١) وەك تۆمەتبارکردنی ئەو کەسەی باوەڕی بە کردەیی هۆکارەکان(فاعلیە الأسباب)هەیە، بە شیرك و دەرچوون لە نەگۆڕەکانی بیروباوەڕ.

٦- نوێنگەری بۆتە شتێکی حەتمی بۆ هێورکردنەوەی جەنگی جیهانیی سێیەم[1] کە ڕۆژئاوا لە ڕێی ویلایەتە یەکگرتوەکانەوە لە دژی جیهانی ئیسلامی بەرپای کردووە، کە لە دوای ڕوخانی دوو تاوەرەکەی بازرگانی جیهانی لە نیویۆرك دەستی پێکرد، تا وای لێهاتووە هەر کردارێکی تیرۆرستی لە جیهاندا ئەنجامبدرێت دەدرێتە پاڵ مسوڵمانان.

٧- گومان لەوەدا نییە کە نوێکردنەوەی هزری ئایینی چەقبەستوو تاکە ڕێگای ناساندن و ئاشکراکردنی ئەو شەپۆلە بێباوەڕییە هاوچەرخەیە کە ڕووی لە ناوچەکەمان کردووە، دوای ئەوەی ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە گوتاری ئایینی باو بەرپرسی یەکەمە بەرامبەر بەم شەپۆلە.

لە ڕاستیدا بەرپرسیارییەتەکە زۆر قورسە و چیاکان دەچەمێنێتەوە، ئیتر چیتر بێدەنگبوون لە بەرامبەر خراپی و هەڤدژییەکانی ناو کلتوورەکەمان کە چەندین ساڵە کەڵەکە بووە سوودێکی نابێت، ئەم هەڤدژییەش لەناو دۆخی شۆڕشی و زانست و عەقڵدا دەرکەوتووە. زانایانمان لەبەر ئەوە بێدەنگییان هەڵبژاردووە تا لەگەڵ ئەو کەسانەدا نەکەونە کێشەوە کە کلتوور بە پیرۆز دەزانن، بەڵام پرسەکە بەرگەی هیچی تر ناگرێت، چونکە ڕۆژانە گەنج و لاوەکانمان دەکەونە بەر تیری گومان و تووشی شۆك دەبن.

---

(١) جەنگی جیهانی سێیەم، جەنگی ساردی نێوان دوو سەربازگەی سەرمایەداری و شیوعییەت بوو.

## بنچینەکانی نوێکردنەوەی هزری ئیسلامی :

لەوەی ڕابردوو بۆمان دەردەکەوێت کە نوێکردنەوەی هزری ئیسلامی پێویستە لەسەر ئەم بنچینانەی خوارەوە دابمەزرێت :

١- داماڵینی پیرۆزی لە کلتوور و، دەرککردن بەوەی کلتوور زادەی عەقڵی مرۆڤە، بۆ ئەوکات و شوێنە گونجاو بووە کە تیایدا خراوەتەڕوو[١].

٢- بە تەنیا وەرنەگرتنی ڕووکەشی دەقەکان و، ڕۆچوون لە مەبەست و حیکمەتەکانی شەریعەت و، بەرزکردنەوەی بەهای بەرژەوەندی[٢].

٣- جەختکردنەوە لەسەر چەمکی (حاکمییەت بۆ خودایە) لە بابەتەکانی بیروباوەڕ (العقیدە)دا، لە بابەتەکانی پەیوەست بە ژیانیشەوە دەست بە فەرموودەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)ەوە بگرین کە دەفەرموێت: (ئێوە بەکاری دنیاتان شارەزاترن).

٤- کردنەوەی دەرگای ئیجتیهاد و بەرزکردنەوەی بەهای عەقڵ.

٥- بەرزکردنەوەی بەهای زانست و کار لە ژیاندا[٣].

---

(١) خودا فەرمانی ئەوەی پێ کردووین کە بەتەنها ئەو بپەرستین، بەڵام بۆچی پێداگری بکەین لەسەر پەرستنی کلتوور.

(٢) ڕەحمەت - کە لەناوی خوا داتاشراوە - پێویستە ئاسانکاری بۆ بەندەکان فەراهەم بکات کە پێچەوانەی دەق بجووڵێنەوە. مادام ئەوە دەبێتە هۆی فەراهەم کردنی بەرژەوەندی بۆ موسڵمانان و ڕێ گرتن لە ڕژانی خوێنیان بە ناحەق. لە وانەیە باشترین نموونەش لەسەر ئەوە بریتی بێت لە ڕەوایی ڕەجمکردنی شەیتان بە درێژیی ڕۆژ لە میینادا. دوای ئەوەی ئەوە دەرکەوت کە پێداگری کردن لەسەر ڕەجم کردن لە دوای نیوەڕۆ دەبێتە هۆی ڕژانی خوێن و سەدان حاجی. هەرچی لەبەر چاوگرتنی شوێنە، ئەوا باشترین نموونە گۆڕینی فەتوایە لە لایەن ئیمامی شافیعییەوە دوای ئەوەی لە عیراقەوە چوو بۆ میسر.

(٣) ئیشی پوخت وەك نوێژ لەسەر هەموو موسڵمانێك واجبە، تەنانەت بۆ ئاستی جیهادیش بەرز دەبێتەوە ﴿ وَءَاخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِى ٱلْأَرْضِ يَبْتَغُونَ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ ۙ وَءَاخَرُونَ يُقَـٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ ﴾ المزمل: ٢٠

٦- داننان بە شەرعییەتی فرە مەزهەبی و دابەزاندنیان بۆ سەر واقیعی مسوڵمانان، لە هەمان کاتدا ڕێگەدان بە خۆنەبەستنەوە بەمەزهەبێکی دیاریکراو، ئەگەر هەڵبژاردنی حوکمە شەرعییەکان لە ڕێگەی ئەو مەزهەبانە لەگەڵ نەگۆڕەکانی ئاییندا تێکنەگیرێن.

## بانگەوازێك بۆ ئاشتبوونەوە :

هەروەك چۆن دواکەوتویی مەسیحیەت لە سەدەکانی ناوەڕاست لە ئەوروپا بووە هۆی دەرکەوتنی گەورەترین شەپۆلی بێباوەڕی لە مێژوودا، ئەوە ئەمرۆی ئێمە زۆر لە دوێنێی ئەوان دەچێت، چونکە پێشەکییەکان هەمان شتن لە جیهانی ئیسلامیدا، ترسم لەوە هەیە لە یەکچوونی پێشەکییەکان لە یەکچوونی دەرەنجامەکانی لێ بکەوێتەوە.

---

واتا: هی تری واتان تیا نەبێ بە زەویدا نەگەڕێن کاسبی نەکەن و داوای ڕزق و ڕۆزی لە خوا نەکەن و، هی تری واشتان تیا نەبێ لە غەزادا نەبن و شەڕ نەکەن لە ڕێی خوادا.

هەروەها ئیسلام مسوڵمانی زانا و نەزانی یەکسان نەکردووە، بەڵکو پلەی فریشتەکانی بەیەکەمیان بەخشیوە:

﴿ شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَالْمَلَائِكَةُ وَأُولُو الْعِلْمِ قَائِمًا بِالْقِسْطِ ۚ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿١٨﴾ ﴾ آل عمران: ١٨

واتا: خودا شەهادەت ئەدا کە هیچ کەس نییە بەڕاستی عیبادەت و بەندەگی بۆ بکرێ خۆی نەبێ، فریشتە خاوەن زانستە ورياكانيش ئەم شایەتییە ئەدەن. خودا دادپەروەرە لە حوکمیدا و لە ڕۆژیدانیدا بە خەڵك و، لە هەمرو کردوەیەکیدا. بێگومان شاهیدی ڕاستەقینە لە هەمرو کارێك و لە هەمرو شتێکدا خودایە، جیهانی دروستکردوە هەر ئەویش ئەو دەلیلانەی دروستکردووە کە دەلالەت لە بوون و یەکیەتیی خودا ئەکەن و هەر ئەویش تەوفیقی زاناکانی داوە کە ئەو دەلیلانە بزانن. خودا نییە ئەو نەبێ کە دەسەڵاتدارە خاوەن حیکمەتە. هەروەها پێی ڕاگەیاندووین کە زانست دەبێتە هۆی ترسان لە خودا:

﴿ وَمِنَ النَّاسِ وَالدَّوَابِّ وَالْأَنْعَامِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ كَذَٰلِكَ ... ﴿٢٨﴾ ﴾ فاطر: ٢٨

واتا: لە ناو بەندەکانی خوادا هەر زاناکان لە خوا ئەترسن چونکە ئەوان باش شارەزای کارو کردەوەی خوان و پەی بە گەورەیی خوا ئەبەن.

لە ڕاستیدا هزری ئیسلامی چەقبەستوو لەگەڵ هەموو لایەنەکانی ژیاندا تێکدەگیرێت، لەگەڵ ئایین، لەگەڵ عەقڵ، لەگەڵ مرۆڤ، لەگەڵ مێژوودا، لەگەڵ زانست، لەگەڵ سروشت، تا ئەو ئەندازەیەی کە بۆتە پاڵنەری یەکەم بۆ بێباوەڕبوونی گەنج و لاوەکانمان. بۆیە چارەسەرکردنی کێشەکە تەنیا بە نوێکردنەوەی (گوتار)ی ئایین ناکرێت، بەڵکو پێویستە پەل بکێشێت بۆ نوێکردنەوەی (هزر)ی ئایینیش، هەڵە نیم ئەگەر بڵێم (نوێکردنەوە یان چاکسازیکردن لە پرسی ئاییندا)، ئایا ئەمە فەرمایشتی پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) نییە؟ گومانیش لەوەدا نییە، ئەمە بەدی نایەت تا ئاشتەواییەکی ڕاستەقینە(نەك ڕووکەش) لە نێوان ئایین و هەموو بوارەکانی ژیاندا نەکرێت.

## یەکەم: ئاشتبوونەوە لەگەڵ ئاییندا [1]

گومان لەوە دانییە کە یەکەمین قوربانی دەستی هزری دواکەوتووی چەقبەستوو - لە هەموو ئایینەکاندا - بریتییە لە ئایین!

یەکێك لەو شتانەی کە جێی شانازی و سەرسامیمانن لە ڕابردووماندا و جێی داخە بۆ حاڵی ئێستامان، بریتییە لەوەی کە ئێمە لە گەنجینەی کلتوورماندا چەندان نموونەی پرشنگدارمان هەیە بۆ تێگەیشتنی عەقڵانی کە لە ئاسمانی ڕوونی ئاییندا پرشنگدارن و لە ڕێڕەوی ڕابوونی ڕاستەقینەی ئیسلامیدا دەدرەوشێنەوە، ئەوو نموونانەمان دەستدەکەون:

لەلایەن هاوەڵانی پێشەنگ، لەوەی بەرژەوەندییان لە پێشەوە دادەنا، وەك فیقهی عومەری کوڕی خەتتاب[2](خوا لێی ڕازی بێت).

---

(١) لە کتێبی (البحث عن العقل : حوار مع فکر الحاکمیة و النقل)، نووسینی د.محمد نور فرحان، مامۆستای فەلسەفەو مێژووی یاسا لە کۆلێژی ماف لە زانکۆی (الزقازیق)، شارەزای دەستوور و خاوەنی خەڵاتی ڕێز لێنان لە لایەن دەوڵەتەوە لەسەر زانستە کۆمەڵایەتییەکان لە ساڵی ٢٠٠٣ و، گەورە ڕاوێژکاری نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ مافەکانی مرۆڤ.

(٢) کەمێك بەر لەو بابەتە چەند نموونەیەکی فیقهی بەرژەوەندیمان لەلای پێشەوای باوەڕداران خستەڕوو.

لەلایەن زانایانی ڕاوبۆچوون و پێشەواکەیان ئەبو حەنیفەی نوعمانی خاوەن بنەمای (الاستحسان)[١].

لە فیقهی بەرژەوەندییەکاندا[٢] لەلای مالیکی و حەنبەلیەکان.

لە ڕێسایەکانی گەورە شۆڕشگێڕو فەقیە ئیبن ئیسحاقی شاگبی خاوەنی بیردۆزی (المقاصد في الشريعة)[٣].

هەروەها لە ڕێسایەکانی فیقهی بەرژەوەندیەکاندا (فقه المصالح)[٤] کە لە سەدەی هەشتەمی کۆچیدا لەسەر دەستی پێشەوا نجم الدين الگوفی گەیشتە لوتکە.

هەروەها لە ڕێساکانی ئیبن حەزمی ظاهیری، کە ئازادی بەخشی بە عەقڵی مسوڵمانان، کاتێك بنچینەی (أصل الإباحة)[٥]ی دانا.

هەروەها لە بۆچوونەکانی پێشەوا (ابن القيم الجوزيه)دا، کە قەدەغەیکردووە شوێنی کەسەکان بکەوین و لاساییان بکەینەوە.

جێی سەرسوڕمانە کە ئەم توێشووە فیقهییە عەقڵانییانە لە لای زانا هاوچەرخەکانی فیقهی نەقڵیدا بە شاراوەیی ماوەتەوە و لە باشترین بارودۆخدا تەنیا لە هۆڵەکانی وانەوتنەوە و ناوەندەکانی توێژینەوەی ئەکادیمی باس

---

(١) (الاستحسان) لە لای پێشەوا ئەبوو حەنیفەدا بریتییە لە لادانی موجتەهید لە شوێنکەوتنی قیاسێکی دیار بۆ قیاسێکی نادیار، یان لە حوکمێکی گشتگیر بۆ حوکمێکی تایبەتی، بە پشت بەستن بە بەڵگەیەك کە لە عەقڵیدا هەڵقوڵاوەو ئەو لادانەی بە باشتر زانیوە.

(٢) فقه المصالح : تایبەتە بە پارێزگاریکردن لە پێنج بنچینەکە، کە بریتییە لە مەبەستی یاسا دانەر(الشارع): (پاراستنی ئاین و نەفس و ڕەچەڵەك و عەقڵ و سامان).

(٣) ئیمامی شاگبی وایدەبینێت کە شەریعەت بەهەموو بەشەکانیەوە گرنگی بە بەرژەوەندی بەندەکان دەدات، بۆیە ناکرێ حوکمەکانی شەریعەت بە بابەتی پەرستشی ڕەها هەژمار بکرێن.

(٤) ئیمامی گوفی (سێەم گەورە زانای مەزهەبی مالیکی) وایدەبینێت کە بەرژەوەندی عەقڵی ئوممەت و تاکەکانی لە عادەت و ڕەفتارەکاندا بەڵگەیەکی شەرعیە(واجبە) پەیڕەوی لێبکرێت.

(٥) بنچینە لە شتە سوود بەخشەکاندا کە شەرع حوکمێکی تایبەتی بۆ دیاریکردوون بریتییە لە ڕەوایی، هەروەك چۆن بنچینە لە شتە زیانبەخشەکاندا بریتییە لە قەدەغەکردن.

دەکەن بە بێ ئەوەی پەلکێشی ناو گۆڕەپانی گوتاری ئیسلامی ئەمڕۆی بکەن. ئایا ئەمە لەبیرچوونە و تاوانەکە لەسەر ئەو کەسانە هەڵدەگرێت، یان پشتگوێخستنێکی بە ئەنقەستە و پێی تۆمەتبار دەکرێن؟

ئەگەر بمانەوێ چینەکانی هزری ئیسلامی بەپێی پشتبەستنیان بە نەقڵ و نزیکییان لێیەوە تا دەگاتە ئەوانەی زیاتر پشت بە عەقڵ دەبەستن، ئەوا ڕیزبەندییەکەی بەم شێوەیە دەبێت:

موحەددیسەکان(واتا ڕاوییانی حەدیس) و موفەسیران کە پشت بە ڕیوایەت دەبەستن لە تەفسیرکردندا.

پاشان فەقیهانی حەدیس کە پشت بە نەقڵ و ڕیوایەت دەبەستن.

پاشان فەقیهانی ڕاوبۆچوون کە لە عەقڵ و زانینەوە نزیکن.

پاشان زانایانی عیلمی کەلام لە ئەشعەرییەکان و ئەهلی سوننە.

پاشان زانایانی عیلمی کەلام لە موعتەزیلە و ئەهلی عەقڵ.

پاشان فەیلەسوفەکان.

لە دەرەوەی هەموو ئەمانەش ڕۆڵی سۆفییەکان (المتصوّفة) دێت، کە گرنگی بە حەقیقەت دەدەن نەك بە شەریعەت، پشت بە بەسیرەت دەبەستن نەك بە تێگەیشتن، خۆیان لە عەقڵ و نەقڵ بە دوور دەگرن.

ئەگەر مرۆڤ بەناو ئەم باخ و باخاتەی هزری ئیسلامیدا ڕێبکات، سەرسام دەبێت بەم هەموو بەروبومە جیاوازانە کە مێژووی هزری ئیسلامیان پڕکردووە. پاشان ئایا ئەم بەروبوومانە بریتی نین لە ناساندنی درەختی(ئایین)؟ ئەگەرچی - بەکردەیی- هەموویان لە گۆڕەپانەکەدا ونبوون و جگە لە هزری دواکەوتوو هیچی تری نەماوەتەوە، ئایا زەرەرمەندی یەکەم ئایینی ئیسلام نییە؟ ئایا ئەوە دژایەتیکردنی ئایین نییە دواکەوتووەکان پەیڕەوی لەوە بکەن کە حەرامە پیاوی حەنەفی ئافرەتی شافیعی بخوازێت؟ بە بیانوی ئەوەی کە گومان لەباوەڕەکەی

هەیە؟! پاشان هەندێکیان بێن وەك ئەندازەگیرییەك لەسەر هاوسەرگیری ئەهلی کیتاب بڵێن ئەم هاوسەرگیرییە دروستە!!

کەواتە ئاشتبوونەوە لەگەڵ ئاییندا بەوە دەکرێت کە ئەم بەروبوومە لە لاپەڕە پێچراوەکاندا بهێنرێتە دەرەوە بخرێتە ژیانی کردەییەوە.

## دووەم : ئاشتبوونەوە لەگەڵ عەقڵدا

هزری چەقبەستوو هیچ ڕۆڵێکی عەقڵ لە ئاییندا قەبووڵ ناکات، تەنیا لە لێکۆڵینەوە لە دروستی دانەپاڵی فەرموودەکان نەبێت بۆ لای پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) تەنانەت لەو لایەنەشەوە ئیبن قەییم (کە لە ساڵی ٦٩١ك لەدایکبووە) پێمان دەڵێت کە لاساییکەرەوەکان و فەقیهەکانی پێشوو بە پێی گونجاندنیان لەگەڵ مەزهەبەکانیان فەرموودەکانی پێغەمبەریان پێ هەڵاوێر دەکرد، واتا مەزهەبیان دەکردە خاوەنی حوکم بەسەر فەموودەدا نەك فەرموودە بکەن بە خاوەنی حوکم بەسەر مەزهەبدا[1]!! لە هەمانکاتدا ئەوانە لە گوتارەکەیاندا پێداگری لەسەر ڕۆڵی عەقڵ دەکەنەوە لە دامەزراوەی ئیسلامیدا، چەندەها کتێبی گەورەیان لەسەر نوسیوە.

ئەوەی ئێمە داوای دەکەین لە ئاشتەواییدا، ئەوەیە کە لاساییکەرەوەکان - بەڕاستی - دەرك بەوە بکەن کە ئیسلام ڕۆڵێکی تەوەرەیی و گرنگ دەداتە عەقڵ لە هیچ دامەزراوەیەکی تردا هاوشێوەی نییە، ئەم ڕۆڵەش لە مانەی خوارەوەدا دەردەکەوێت:

١- بەڵگەهێنانەوە لەسەر بوونی خودا و ڕاستی ئایینی ئیسلام.

٢-تێگەیشتن لە دەقەکان بە جۆرێك کە ڕێ بەوە دەدات بگاتە کرۆك و حیکمەتەکەی.

---

(١) إعلام الموقعين عن رب العالمين.

٣- ئیجتیهادکردن لە هەڵێنجانی ئەحکام بە پێی پێداویستی ڕۆژگار.

٤- ڕەچاوکردنی حیکمەتی تەشریع ولایەنگیریکردنی بەرژەوەندی، کە هاوەڵان پێش پەیدابوونی زانستی فیقە و ئوسوڵی فیقە هەستیان پێکردبوو، ئەگەرچی لەگەڵ یەکێک لە دەقەکانیش تێك بگیرێت[1].

هەروەها پێویستە گرنگی بەو قسەیە نەدەین کە لاساییکەرەوەکان دەیکەن، کاتێك دەڵێن ئێمە لەکوێی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا و شوێنکەوتوانین، ئێمەش پێیان دەڵێین هەر گەلێك بەسەردەمی خۆیان شارەزایە و وانازانم کە بەرژەوەندی لە هیچ خاوەن عەقڵێکی دادگەر ون ببێت.

هەروەك دروست نییە ئەوە بکەینە بیانوو کە خودا شەریعەتی داناوەو ئەو لە ئێمە باشتر بەرژەوەندیەکانمان دەزانێت، چونکە هاوەڵان و شوێنەکەوتوانیش ئەومیان دەزانی، بەڵام نەبوو بە ڕێگر لەبەردەمئیجتیهادکردن لەبەرژەوەندی ئوممەتدا، ئەمەش بەشێك بوو لە تێگەیشتنیان لە واتای جێنشینی خودا لەسەر زەوی، پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) ئەم بابەتەی یەکلاکردۆتەوە کاتێك فەرموویەتی: (ئێوە بە کاری دنیاتان شارەزاترن).

## سێیەم: ئاشتبوونەوە لەگەڵ مرۆڤدا

کاتێك هزری چەقبەستوو عەقڵی مرۆڤ لە پێگەی خۆی دادەبەزێنیت، سەرەڕای ئەوەی کە عەقڵ دوێنراو و تەکلیفکراو و لێپرسراوە لە لایەن خوداوە! ئەم هزرە مرۆڤ وا دادەنێت کە بێتوانایە لە زانینی بەرژەوەندی خۆیی و لە هەمان کاتدا جێنشینی خودایە! هەروەها مرۆڤ دەکاتە کۆیلەی چەند بۆچوونێك کە

---

(١) وەك نمونەکانی عومەری کوڕی خەتتاب کە پێشتر باسمان کردن، هەروەها ئەوەی کە دایکی باوەڕداران عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) کردی کاتێك بینی کە حیکمەتی ڕێگادان بە ئافرەتان بۆ چوونە مزگەوت نەماوە فەرمووی: ئەگەر پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) دەیزانی کە ئافرەتان چی دەکەن، ئەوا مزگەوتی لێ قەدەغە دەکردن هەروەك ئافرەتانی بەنی ئیسرائیل.

پیرۆزی کردوون، ئەگەرچی لە ڕووی ئایین و زانستی و عەقڵ و مرۆڤایەتی و ڕەوشتییەوە هەڵەییان سەلمێنراوە! هەروا لەو کاتەی ڕەفتارگەلێکی نامرۆڤانە بەسەر مرۆڤدا دەسەپێنێت وەك هاوسەرگیری بچووکەکان و خەتەنەکردنی کچ و شیرپێدانی گەورە! لەو کاتەی هزری ئایینی چەقبەستوو پشتگیری لە هەموو ئەمانە دەکات ئەوا مرۆڤایەتی لە مرۆڤ دادەماڵێت و ڕێگای دوژمنکاری نیشان دەدات.

بۆ ئەوەی هزری ئایینی باو بۆ ئاشتەوایی ئامادە بکەین پێویستە پێگەی مرۆڤی بیربخەینەوە بە بێ چوونە ناو وردەکارییەکانەوە، با ئەو کارەش بە چەند نموونەیەکی قورئانی پیرۆز و فەرموودەی دروست و حوکمی زانایان بێت:

﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً.. ﴿٣٠﴾ ﴾ البقرة: ٣٠.

واتە: (باسی ئەوە بکە کە خودا فەرمووی بە فریشتەکان: من دەمەوێ لەسەر ڕووی زەوی جێنشینێ بۆخۆم دروست بکەم...).

﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ.. ﴿٣٤﴾ ﴾ البقرة: ٣٤.

واتە: (یادی ئەو کاتە بکەرەوە کە فەرمانمان بە فریشتەکان دا سوجدەی قەدرگرتن بەرن بۆ ئادەم، هەموو گورج سوجدەیان بۆ برد ئیبلیس نەبێ...).

- لە فەرموودەیەکی قودسیدا هاتووە: (أنا عند ظنّ عبدي بي وأنامعه إذا ذكرني فإن ذكرني في نفسه ذكرته في نفسي وإن ذكرني في ملأ ذكرته في ملأ خير منهم، و إن تقرب إلي بشبر تقرّبت إليه ذراعاً وإن تقرّب إليّ ذراعاً تقرّبت إليه باعاً و إن أتاني يمشي أتيته هرولة)[1].

واتە: (من لەلای گومانی بەندەکەمم، من لەگەڵیدام ئەگەر یادم بکات، ئەگەر لە دەروونی خۆیدا یادم بکات منیش بە هەمان شێوە یادی دەکەم، ئەگەر لە لای کۆمەڵێك یادم بکات، لەلای کۆمەڵێکی باشتر یادی دەکەم، ئەگەر

---

(١) رواه مسلم في حديثه عن ابن هريره.

بستێك لێم نزیك ببێتەوە، گەزێك لێی نزیك دەبمەوە، ئەگەر گەزێك لێم نزیك ببێتەوە بە گەزو قۆڵێك لێی نزیك دەبمەوە، ئەگەر بە ڕۆیشتنی ئاسایی بۆ لام بێت بە ڕاکردن بۆ لای دەڕۆم).

- (لزوال الدنیا أهون عند الله من سفك دم مسلم بغیر حق)[1].

واتە: (لەناوچوونی دنیا لەلای خودا ئاساییترە لە ڕژانی خوێنی مسوڵمانێك بە ناحەق).

- وتحسب أنك جرم صغیروفیك انطوا العالم الأكبر[2].

واتە: تۆ(ئەی مرۆڤ) وا دەزانیتەستێرمیەکی بچووکیت، بەڵام جیهانی گەورە لە تۆدا پێچراوە.

(ئائەمەیە مرۆڤ ئەی خاوەنانی هزری چەقبەستوو، بۆیە پەلەبکەن و لەگەڵیدا ئاشتبەرەوە)[3].

## چوارەم: ئاشتبوونەوە لەگەڵ مێژوودا

گومان لەوەدا نییە، کە یەکێك لە کێشە گەورەکانی عەقڵی عەرەبی ئیسلامی هاوچەرخ بریتییە لە نەبوونی توانای زانینێکی زانتسییانەی مێژوو، تەنانەت دوورکەوتنەوەو وازهێنان لەو زانینە، چونکە ئێمە زیاتر مەیل و سۆزداری و خۆشەویستیمان بۆ ڕۆمان و چیرۆك و ئەفسانە هەیە، نەوەك بۆ قەبوولکردن و تێگەیشتن لە مێژوو وەك حەقیقەتێکی بابەتی کە لەسەردەمێکی ڕابردوودا ڕوویداوە، جیاوازی نێوان لۆژیکی چیرۆك و لۆژیکی مێژوو بریتییە لەوەی

---

(١) في سنن النسائي و جامع الترمذي و سنن ابن ماجه و البیهقي، عن عبدالله بن عمر، صححه الألباني.

(٢) من أقوال علي بن ابي طالب.

(٣) عن كتاب (البحث عن العقل، حوار مع فكر الحاكمیه والنقل) للدكتور محمد نور فرحان، مكتبة الأسرة.

کە ئێمە خۆمان چیرۆك دەگێڕینەوە، واتا گێڕانەوەی مێژووە بەو جۆرەی کە دەمانەوێ نەك بەو جۆرەی لە واقیعدا ڕویداوە[١].

لە ڕاستیدا دیدی ئەفسانەیی بۆ مێژووەکەمان دەڵێت: ئێمە سەربڵند بووین و لە لوتکەدا بووین و پێویستە بگەڕێینەوە بۆ کلتوور تا بگەینەوە بەو سەر بڵندییە، لەبەر ئەوەی (کۆتایی ئەم ئوممەتە چاك نابێت بەوە نەبێت کە سەرەتاکەی پێ چاك بوو)[٢]. ئەم ئەفسانەگەرایانە بۆ ساتێکیش لەوە نەوەستاون کە هۆکارە پێویستییەکان بۆ ڕاستکردنەوەی بارودۆخی دواهەمینی ئەم ئوممەتە دابین بکەن، ئێمە لەوە بێئاگاین کە لە بەرامبەریشدا بارودۆخی ئەم ئوممەتەش تێکناچێت بەوە نەبێت کە سەرەتاکەی پێ تێکچووە!

مێژوو مێژووی تاکی مسوڵمانە نەك مێژووی ئیسلام، ئەم مێژووەش پڕە لە نموونە و جۆری جیاوازی خەلیفەکان، کە تیایاندا هەبوو چاك و پاك بوو، تیاشیاندا هەبوو ستەمکار و خراپ بوو، هەیانبوو سینەفراوان بوو بۆ گلەیی و گازاندەکانی گەلەکانیان، هەشیانبوو بە هەموو ئامرازێك ڕووبەڕووی گەلەکەی دەبووەوە، تا کۆتایی ڕەفتار و سروشتە جیاوازەکان. هەروەها مێژووەکەمان پڕە لە جەنگ، کە هەندێکیان جیهاد بوون لە پێناو خودا و هەندێکیشیان لە پێناو فراوانکردنی دەسەڵات بوون. هەروەها مێژووەکەمان پڕە لە فیتنە کە ململانێی نێوان ئەو مرۆڤانە بووە کە هەندێکیان نیازی جیهاد و سەرخستنی ئیسلامیان هەبووە و هەندێکی تریشیان بۆ تەماعی نەفس و گەیشتن بە دەسەڵات بووە. لەبەر ئەوە پێویست بەوە ناکات بەرگری لەو شتانە بکەین کە لە مێژووی مسوڵمانانندا ڕویداوە، وەك بڵێی بریتی بێت لە ئیسلام.

---

(١) مێژووی مسوڵمانان وەك (ئیبن کپیر و ئیبن أپیر و ئیبن تەباتەبا ئەلعەلەوی و ئیبن جەریری و تەبەری و ئیبن ئیسحاق و پاشان ئیباس و الجبرتی) نووسیویانەتەوە، زۆر لایەنی چیرۆکی ئەفسانەییان تێدا هەیە، کە عەقڵ بە ڕاستیان دانانێت و لە بەرامبەر شیکردنەوەی زانستیدا خۆیان ناگرن، بێباوەڕانیش ئەمەیان بەهەلزانیوە بۆ هێرشکردنە سەر ئیسلام. لە واقیعی ئێستاشماندا بارودۆخەکە هەر وەکو خۆیەتی، بۆیە شکستی ١٩٦٧ مان بە نەکسە و جەنگی خەلیجمان بە(دایکی جەنگەکان) ناونا.

(٢) ئەم قسەیە پێشتر زیادی کوڕی ئەبوسوفیان کردوویەتی، وەك هەڕەشەیەك لە خەڵکی بەسرە!

بانگەوازکردن لە پێناو ئاشتەوایی، بانگەوازە بۆ بە ئایینی نەکردنی مێژوو، واتا بانگەوازکردنە بۆ ڕێزگرتن لە بابەتێتی و خوێندنەوەی بە شێوەیەکی درووست، لەمەوە چەند سوودێکمان دەست دەکەوێت، گرنگترینیان:

١- ئەوە باش بزانین کە سەرەتای ئەم ئوممەتە بە ڕابوونی عەقڵ و هیممەتبەرزی چاك بوو، کە لەڕێی باوەڕ و کردنەوەی دەرگا لە بەرامبەر تێکەڵبوونی کلتوورەکان بەدی هات. هەروەها ئەوەش بزانین کە کۆتایی ئەم ئوممەتە بە زاڵکردنی بەرژەوەندی تەماعکارییە سیاسییەکانی هەندێك لە کۆمەڵانیمسوڵمان و دەستە و تائیفەکانی مسوڵمان بوو لەسەر حیسابی بەرژەوەندی گشتی ئوممەت، هەروەها نقومبوونی فەرمانڕەواکان لە یاری و ڕابواردندا و زۆربوونی بزوتنەوەی پەرتەوازەیی و دەرچوون.

٢- هەروەها ئەوەش بزانین کە کۆمەڵگەی نموونەیی بە گۆڕانی بەرەو باشتر بەدیدێت، (تێگەیشتنی ئێستای ڕۆژئاوا بەم شێوەیەیە) نەك بە جێگیربوون و لەنگەرگرتن، وەك عەقڵی ڕۆژهەڵاتی باوەڕی پێی هەیە کە سۆزی ڕۆمانسی بۆ ڕابردووی کاری تێدەکات، بەبێئەوەی بە چاوی ڕەخنەوە سەیری بکات. ئەمە لە کاتێکدا کە قورئانی پیرۆز زۆر بە ڕاشکاوی ئیدانەی پەنابردنە بەر لاساییکردنەوە و ڕابردوو دەکات[1].

---

(١) ﴿ بَلْ قَالُوٓا۟ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّهْتَدُونَ ﴿٢٢﴾ وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقْتَدُونَ ﴿٢٣﴾ ۞ قَٰلَ أَوَلَوْ جِئْتُكُم بِأَهْدَىٰ مِمَّا وَجَدتُّمْ عَلَيْهِ ءَابَآءَكُمْ ۖ قَالُوٓا۟ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ الزخرف: ٢٢ - ٢٤.

واتا: نەخەیر شتی وا نییەو هیچ کتێبێکی خواییان پێش قورئان بۆ نەهاتووەتە خوارو، مەسەلەکە ئەوەندەیە ئەڵێن: باو و باپیری خۆمانمان لەسەر ئەم ئاینی بتپەرستییە دیوەو، ئێمە لەسەر شوێن پێی ئەوان ڕێی خۆمان ئەدۆزینەوە هەر بەم جۆرە ئێمە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردووە لە هیچ ئاوەدانییەکا ئادەمیزاد بترسێنێ لە خوا، ئیللا دەست ڕۆیشتووەکانی ئەو ئاوەدانییە بەو پێغەمبەرەیان وتووە: ئێمە باوك باپیرەی خۆمانمان لەسەر ئاینێ دیوەو ئێمە بە شوێن پێی ئەوانا ئەڕۆین و چاولێکەرییان ئەکەین. جا تۆ پێیان بڵێ: ئەی ئەگەر من شتێکی ڕێپیشاندەرترتان لەوەی باوك و باپیری خۆتانتان لەسەر دیوە، بۆ بهێنم، هەر شوێنی من ناکەون و لەسەر ئەوەی خۆتان و باوك و باپیرتان ئەمێننەوە؟ ئەوانیش لە وەڵاما وتیان: ئێمە باوەڕمان بەوە نیە کەوا بە ئێوەدا نێرراوە..

٣- خۆ ڕزگارکردن لە باری قورسی چەند هەڵوێستێکی نەرێنی لە مێژووی ئیسلامدا، وەك باسمان کرد کە یەکێکە لە دەرگاکانی بێباوەڕی گەنجەکانمان.

لە کۆتاییدا دەڵێین، ئەگەر سەرنجدان لە ئاسۆکان خوێندنەوەی شوێن بێت، ئەگەر سەرنجدان لە دەروونەکان خوێندنەوەی ناخ بێت، ئەوا سەرنجدان لە مێژوو خوێندنەوەی کاتە. ئەگەر ئاسۆکان و دەروونەکان یاسایەکیان هەبێت کە بەڕێوەیان ببات، ئەوا مێژووش یاسای خۆی هەیە، بۆیە قورئانی پیرۆز لە ئایەتێکدا کە شەش جار دووبارە بۆتەوە بە شێوازێکی جوان و نکۆڵیکاری پڕ لە گلەیی و گازاندە لەو کەسەی کە سوود لە ڕووداوەکانی مێژوو وەرناگرێت دەفەرموێت[1]:

﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ .. ﴿١٠﴾ ﴾ محمد: ١٠.

واتە: (ئایا ئەمانە نەگەڕاون بە زەویدا بۆ ئەوە سەیر کەن سەرەنجامی ئەو کەسانە چۆن بووە کە لە پێش ئەوانا بوون؟...).

---

﴿ قَالُوا أَجِئْتَنَا لِتَلْفِتَنَا عَمَّا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا وَتَكُونَ لَكُمَا الْكِبْرِيَاءُ فِي الْأَرْضِ وَمَا نَحْنُ لَكُمَا بِمُؤْمِنِينَ ﴿٧٨﴾ ﴾ يونس: ٧٨.

واتا: فیرعەون و دەستەو دائیرەکەی بە مووسایان وت: ئایا تۆ بۆ ئەوە هاتووی بۆ لامان لەو ڕێو شوێن و یاسای عیبادەتە هەڵمانگەڕێنیتەوە کە باوك و باپیری خۆمانمان لەسەر دیوە، تا ئێمە بێ دەسەڵات و بێ هێز ببین و گەورەیی و دەسەڵات لە سەر زەویدا بۆ ئێوە بێت؟ هەرگیز شتی وەها نابێت و ئێمە ئیمانتان پێ ناهێنین. ﴿ قَالُوا وَجَدْنَا آبَاءَنَا لَهَا عَابِدِينَ ﴿٥٣﴾ ﴾ الأنبياء: ٥٣.

واتا: وتیان: باوك و باپیرانی خۆمانمان وا دیوە ئەم پەیکەرانەیان ئە پەرست.

﴿ قَالُوا بَلْ وَجَدْنَا آبَاءَنَا كَذَٰلِكَ يَفْعَلُونَ ﴿٧٤﴾ ﴾ الشعراء: ٧٤.

واتا: بت پەرستەکانیش وتیان: مەسەلە قازانج و زیانگەیاندن نی یە، مەسەلە ئەوەیە ئێمە باوك و باپیری خۆمانمان دیوە ئەوانیش هەروایان ئەکرد و ئەم بتانەیان ئەپەرست.

﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا ۚ أَوَلَوْ كَانَ الشَّيْطَانُ يَدْعُوهُمْ إِلَىٰ عَذَابِ السَّعِيرِ ﴿٢١﴾ ﴾ لقمان: ٢١.

واتا: کە پێیان بوترێ: شوێنی ئەو کتێبە بکەون کە خودا ناردوویەتیە خوارەوە بۆ پێغەمبەر، ئەڵێن: نەخێر، شوێنی ئەو ڕێوڕەسمانە ئەکەوین کە باوك و باپیرانی خۆمانمان دیوە لەسەریان ئەڕۆیشتن. جا ئایە ئەگەر شەیتان ئەمانەت بۆ ئازارو سزای ئاگری بڵێسەداری دۆزەخیشتان بانگ بکا، هەر شوێنی ئەکەون؟

(١) سێ جار پرسیار بە (أفلم) کراوەو سێ جاریش بە(أولم).

## پێنجەم: ئاشتبوونەوە لەگەڵ زانستدا

هەڵدێری نێوان هزری ئایینی چەقبەستوو و زانست تا دوای شۆڕشی زانستی لە ئەورووپادا دەرنەکەوت، تا لەم کاتەدا ئەم هزرە تووشی شۆك بوو بەرامبەر بەو چەمکە زانستییە نوێیانەی لە بواری گەردوونناسی و پەیدابوونی مرۆڤ هاتنە ناو گۆڕەپانەوە و لەگەڵ لێکدانەوە کلتوورییەکانی دەقە پیرۆزەکان تێکدەگیران. جا بۆ ڕۆیشتن لەگەڵ ڕێڕەوی خۆیان لە بە پیرۆزدانانی کلتوور، دواکەوتوو و چەقبەستووەکان دەستیان کرد بە ڕەتکردنەوەی چەمکە زانستییە نوێیەکان بە بیانووی ئەوەی کە تەنیا گریمانەن و نەسەلمێنراون، یاخود بە بیانووی ئەوەی کە بریتیین لە گریمانە نەك حەقیقەتی زانستی[1].

هەروەها ئەگەر بێینە جیهانی ئیسلامی، دەبینین کە موفەسیرە کلتوورییەکان ئەوپەڕی توانای خۆیان خستۆتە گەڕ هەروەك چۆن پەنایان بردۆتە بەر وشەی (زانست) لە سەردەمی خۆیاندا بۆ تەفسیرکردنی ئەو ئایەتانەی قورئانی پیرۆز، کە ئاماژەی زانستییان تێدایە، بۆیە جێی ڕەخنە نین ئەگەر تەفسیرەکەیان لەگەڵ ئەوەدا جیاواز بێت کە زانستی هاوچەرخ پێی گەیشتووە. هەرچی زانایانی هاوچەرخن ئەوا هیچ بیانوێکییان نییە بۆ دەستگرتن بە کۆن لەسەر حیسابی زانستی نوێ، ئەوەی قوڕەکەی خەستتر کردووە ئەوەیە کە لاساییکەرەکان تەفسیرە کلتوورییەکانیان کردۆتە دادوەر بەسەر ڕاستی و دروستی چەمك و بیردۆزە زانستییەکان.

لەوانەیە پەرەسەندنی بایۆلۆجی -- کە پەیڕەوی لەو بۆچوونە دەکات کە لاشەی مرۆڤ بە پەرەسەندن لە بوونەوەرانی لە خۆی نزمتر پەیدا بووە-- گەرمترین خاڵی بەریەککەوتنەکە بێت، چونکە سەرەڕای ئەوەی کە چەمکی

---

(١) ئەوە دووبات دەکەینەوە کە لەتەوەرەی دووەمدا باسمان کرد، بەوەی کە بیردۆزە زانستیەکان لە بەڵگەدا وەك حەقیقەت و یاسای زانستی وان، وەك بیردۆزی هێزی کێش کردنی زەوی و بیردۆزی فیساگۆرس لە سێگۆشەی گۆشە وەستاودا.

پەرسەندن لە ئێستادا بۆتە حەقیقەتێکی تەومەیی لە زانستی بایۆلۆجیدا، بەڵام هێشتا هزری لاسایکەرەوە پشت بە تەفسیرە کلتورییەکان دەبەستێت دەربارەی ئایەتەکانی خەلقی مرۆڤ لە قورئانی پیرۆزدا، تەنانەت تۆمەتیش بۆ زانست دەبەخشنەوە، جارێ بە نەفامی، جارێ بە پیلانگێڕان لە دژی ئایین[1].

لە پێناو بەدیهێنانی ئاشتەوایی لە نێوان زانست و هزری ئایینی ڕەتکەرەوەی زانست، ئەم کتێبەی بەردەستت نوسراوە.

لایەنگرانی ئەم جۆرە هزرەی ئایین تەنیا دوو ڕێگایان لەبەردەمدایە بۆ ئەوەی لەم هەڤدژییە ڕووکەشە دەربچن کە لە نێوان زانست و ئایین لەسەر ئێمەیان فەرزکردوە:

**ڕێگای یەکەم:** دانان بەوەی کە قورئانی پیرۆز کتێبی زانست نییەو، لە پرسە زانستییەکاندا بگەڕێنەوە بۆ لای زاناکان، پاشان ئەوپەڕی توانای خۆیان بدەن بۆ تەئویلکردنی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز لە ژێر ڕۆشنایی چەمکە زانستییە نەگۆڕەکان.

**ڕێگای دووەم:** جیاکردنەوەی زانست و ئایین لە پرسە زانستیەکانداو، هەوڵنەدان بۆ پەیوەستکردنیان بە یەکترەوە، بۆ نموونە دەربارەی بە دیهاتنی مرۆڤ دەڵێن قسەی زانست ئەوەیەو قسەی ئایین ئەوەیە، بەمەش ئەوەی هی قەیسەرە بۆ قەیسەر دەبێت و ئەوەی هی خوداشە بۆ خودا دەبێت، ئەم ڕێڕەوە لە ڕۆژئاوادا پەیڕەو دەکرێت بۆ دیاریکردنی پەیوەندی نێوان زانست و ئایینی مەسیحییەت.

وا نازانین وەکو مسوڵمان پێویستیمان بە ڕێڕەوی دووەم هەبێت، چونکە لە قورئانی پیرۆز یان لە فەرموودەی دروستدا نەنگییەك بوونی نییە هەوڵ بۆ شاردنەوەی بدەین یان نەتوانین لەگەڵ زانستدا یەکی بخەین. لە ئێستادا پێویستە

---

(١) لە تەوەرەی شەشەم و حەوتەمدا باسی چەمکی پەرسەندنی ناڕاستەکراومان خستەڕوو، کە قسەی زانست و ئاین پەکدەخات لەم بوارەدا. هەروەك چۆن لە کتێبەکەمان(كيف بدأ الخلق)دا لە تەوەرەی دوازدەیەم و سێزدەیەمدا قسەی زانست و ئاینمان بەیەکەوە بەستۆتەوە دەربارەی بەدیهاتنی مرۆڤ. لە چاپی (مكتبة الشروق الدولية) چاپی سێیەم ٢٠١٣.

لاساییکەرەوەکان واز لەوە بێنن کە ڕۆڵی دادوەر ببینن بەسەر چەمك و بیردۆزە زانستییەکانەوە.

## شەشەم: ئاشتبوونەوە لەگەڵ سروشت[1]

لە نێوان هەندێك لە قوتابخانە ئیسلامییەکان و سروشتیەکاندا ململانێیەکی توند پەیدا بوو، لەو کاتەوەی کە - بە نیەتی پاکەوە - سروشتیان بە پشێوی و هەرەمەکی تۆمەتبار کردووە! سەرەتاکانی ئەم ململانێیەش دەگەڕێتەوە بۆ بیروباوەڕی ئەشعەرییەکان کە پێیان وابوو جەختکردنەوە لەسەر پاکی و توانای خودا پێویستی بەکەمکردنەوەی توانای مرۆڤ و سروشت هەیە، بۆیە پەیڕەوییان لە دیدێکی ڕوخێنەر کرد بۆ جیهان!

ئەشعەرییەکان هەموو پەیوەندیەکی نێوان هۆکار و ئەنجام(بە زمانی عیلمی کەلام: هەموو پەیوەندییەکی هۆکارییان لە ڕووداوەکاندا نەرێ کرد) و وایان بینی کە دانان بە هۆکارەکان لەگەڵ ڕەهایی توانای خودایی و کردارەکانی بەدیهێنەردا تێکدەگیرێت، بەمەش باوەڕبوون بە هۆکارێتی(السببیە)یان بە شیرك داناوە! سەرەڕای ئەوەی کە باوەڕبوون بە هۆکارێتییان بە مەترسییەکی گەورە لەسەر موعجیزە هەژمارکردووە کە سنوری هۆکارەکان دەبڕێت.

لە پێناو نەرێکردنی هێزو یاساکانی سروشت وەك هۆکاری کاریگەر، ئەشعەرییەکان تیۆری (اقتران و المعادە)یان داناوە، کە وایدەبینێت ئێمە هەردوو ڕووداوی (گەرمکردنی ئاو و کوڵان) بە پەیوەندی هۆکارەکان بە دەرنجامەکانەوە هەژمار دەکەین، کە لە ڕاستیدا تەنیا کارلێککردنە، واتا هیچ پەیوەندییەکی هۆکاری لە نێوان گەرمکردن و کوڵاندا بوونی نییە، ئێمەین ئەم پەیوەندییەمان وێناکردووە[2]! بەم خستنەڕووە ئەشعەرییانەیە، هیچ یاساو ڕێسایەك لە سروشتدا

---

(١) لە کتێبی(الطبیعیات في علم الکلام: من الماضي إلى المستقبل) نوسینی د.یمنی طریف الخولی

(٢) لەبەر ئەوە لە ئەشعەرییەکاندا دەبینین نوسراوە کە چەقۆ نابڕێت، بەڵکو لەکاتی بڕیندا ئەو سیفەتەی

بوونی نییە، بەمەش عەقڵ شکێنراوە، ئەمە بووە بانگی ڕاگەیاندنی شەوەزەنگی بێ توانایی عەقڵی ئیسلامی، بەمەش شیاوی ئەو ناوە بوو کە زانایان لێیان نا (کارساتی ئەشعەرییەکان)[1].

لە بەرامبەریشدا، موعتەزیلەکان[2] پەیڕەوییان لە (مذهب الطبائع) کرد، کە دەڵێن خودای پەروەردگار هەموو شتێکی بە سروشتێکی جێگیر جیاکردۆتەوە کە بە هۆیەوە کار ئەنجامدەدرێت، وەك سووتانی بۆ ئاگر و تێرئاوبوون و نقومبوونیش بۆ ئاو. بەمەش موعتەزیلەکان جیاوازییەکی جەوهەرییان لە نێوان جیهانی حەتمی سروشت و جیهانی ئازادی مرۆڤ داناوە و نەکەوتوونەتە ناو چاڵی ئەرزکردنی ئازادی مرۆڤ بە هۆی حەتمییەتی یاساکانی سروشتەوە، هەروەك چۆن فەیلەسووفەکانی ئەورووپا تێی کەوتن. بەراوردی نێوان مەزهەبی (الطبائع)و تیۆری (الاقتران والمادە) بە(دراماى موعتەزیلە ئەشعەرییەکان) ناونراوە.

لە ناو ئەشعەرییەکانیشدا هەیە کە پەیڕەوی لە مەزهەبی (الطبائع) کردووە، بۆ نموونە ئیمام ئەبو حامد ئەلغەزالی. هەروەك چۆن ئیبن خەلدوون(کە ئەشعەرییە) مەزهەبی (الطبائع) پەلکێش دەکاتە جیهانی ئاوەدانی و مرۆڤەوە، وایدەبینێت کە کۆمەڵگاکان لە جوڵەیاندا پەیڕەوی لە یاسای کۆمەڵایەتی دەکەن. بە هەمان شێوە پێشەوا ئیبن تەیمییە و قوتابییەکەی ئیبن قەیم پەیڕەوییان لە

---

پێ دەبەخشرێت و بە هەمان شێوە ئاگر ناسووتێنێت و لە کاتی سوتاندا ئەو سیفەتەی دەبەخشرێت، بەڵام تا ئێستا ئەشعەرییەکان ئەوەیان بۆ ڕوون نەکردووینەتەوە کە بۆچی خودا فەرمانی بە ئاگر کرد کە ئیبراهیم نەسووتێنێت، ئایا ئەمە واتای ئەوە نییە کە ئەگەر فەرمانی نەکردبا دەیسوتاند؟! واتا سوتان یەکێکە لە خاسیەتەکانی ئاگر.

(١) ئەوەی کە جێی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە دیڤید هیوم(گەورەترین فەیلەسوفی بێباوەڕ لەسەدەی هەژدەهەمدا) باوەڕی بە ناکارای هۆکارەکان هەیە لەگەڵ چەمکی (الاقتران والمادە)دا هاوڕان بۆ سەلماندنی هەرەمەکی بوون و پەیڕەو نەکردن لە هیچ یاسایەك بۆ پشتگیری کردن لە چەمکە بێباوەڕییەکانی. واتا لەگەڵ ئەشعەرییەکاندا هاوڕایە لە تێڕوانین بۆ هۆکارەکان ئەگەرچی لە ئامانجدا لە گەڵیان جیایە.

(٢) خاوەنانی قوتابخانەی عەقڵانی لە ئیسلامدا.

مەزهەبی (الطبائع) کردووە، زۆر بە قووڵی خستوویانەتە ڕوو. جگە لە غەزالی و ئیبن خەلدوون دەبینین کە هەموو ئەشعەریەکان ڕەخنەی توند لە مەزهەبی (الطبائع) دەگرن و ئەو کەسانەی دانی پێدا دەنێن بە شیرك تۆمەتبار دەکەن!

ئەگەر زانایانی عیلمی کەلام لە موعتەزیلەکان نەکەوتبێتنە تۆمەتبارکردنی سروشت بە پشێوی و هەڕەمەکێتی، ئەوا کەوتوونەتە دژایەتیکردنی، کاتێك بە ڕاشکاوی ڕایانگەیاند کە ئەوان سروشت تەنیا بۆ سەلماندنی بوونی خودا بەکاردەهێنن، نەوەك بۆ شیکردنەوەی و لێکۆڵینەوە لێی و تێگەیشتن و زاڵبوون بە سەریدا و سوود لێوەرگرتنی، بەو پێیەی کە سروشت – لە لای ئەوان – تەنیا هەڵگرێکی کردارو ویستەکانی خودایە. بەمەش بەکارهێنانی سروشت لەلای موعتەزیلەکان بە شێوەی ستوونی بووە کە بۆ سەرەوەی سروشت بەرزمان دەکاتەوە، ئێمەش پێشوازی لەوە دەکەین بە مەرجێك شێوەی ئاسۆییشی تێکەڵ بکرێت و سروشت بکاتە جیهانێکی زیندوو بۆ مرۆڤ، کە تیایدا نیشتەجێبووە و، تیایدا لەگەڵ کەسانی تر پەیوەندی دەکات، بۆ بەدیهێنانی پەیامەکەی و جێنشینییەکەی لەسەر زەویدا.

کێشەکە گەورەتر دەبێت، سەرنجدان لە ئاسۆکان و وەبەرهێنانی سروشت ون دەبێت، واجبی شەرعی دەبێتە جێگرەوەی واجبی ڕوانین و تێفکرین، شەعائیر و عەقائیدەکان گەورە و زۆر دەبن(ئایا باوەڕدار باوەڕی بە پەنجا یان بیست بیروباوەڕ هەیە؟) هزری بابەتییانە ون بووە و زانستە پراکتیکی و سروشتییەکان کەم بوونەتەوە، سروشت لەناو براوە.

لەبەر ئەوە هەندێ کەس کەوتنی ژیارستانیەتی عەرەبی دەگێڕنەوە بۆکارساتی موعتەزیلەکان، کە هزرو دەسەڵاتیان تیادا توایەوە، خۆ ئەگەر ئەوە نەبوایە ئەوا پێشکەوتنی زانستی لەسەدەی نۆزدەیەمدا لە دەوڵەتی ئیسلامی پێگەیەکی تری دەبوو.

## ئاشتەوایی :

لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، پیاوانی کڵێسا لە ئەوروپا بەوە دەسەڵاتیان پەیدا کرد، کە ئەوان بە تواناترین مرۆڤن لە خوێندنەوە و تێگەیشتنی کتێبی پیرۆز، لە هەمان کاتدا زانایان پێداگریان کرد لەسەر ئەوەی ئەوان بە تواناترن لە خوێندنەوەی کتێبێك کە هیچی لە ئینجیلەکان کەمتر نییە بۆ بەڵگەیی لەسەر توانای خوداو جوانی بەدیهێنراوەکانی، کە کتێبی بەرزی سروشتە، یان بڵێین تەوراتی سروشت[1].

سەدان ساڵ پێش ئەوە (أبو الهذیل العراف و النظام و ابن الهیثم و البیروني و ابن رشد) زانستە سروشتیەکانیان وەك زانستی پراکتیکی کردۆتە بەڵگە لەسەر بوونی خودا و یەکخواپەرستی.

ئێمە پێشەنگ بووین لە ڕاگۆڕینەوە لەسەر خوێندنەوەی کتێبی پیرۆز و کتێبی سروشت(کتێبی نوسراوی خوداو کتێبی بینراوی خودا)، گەیشتووینەتە بە عەقڵانی کردنی سروشت و بە سروشتکردنی عەقڵ. بەڵام پێشەنگی مێژوویی چ سوودێکی هەیە؟! زانستی ڕۆژئاوایی، سروشت و عەقڵی کردۆتە دووانە، لە کاتێکدا عەقڵی عەرەبی مسوڵمان بێتوانابیەکی جێی داخ و دواکەوتوویەکی شەرمەزارکەری هەیە کاتێك ڕووبەڕووی سروشت دەبێتەوە.

ئەوەی بۆ ئاشتەوایی پێویستە ئەوەیە کە بیرمەندی لاساییکەرەوە ئەوە بزانێت خودا تایبەتمەندییەکانی لە شتەکاندا داناوە، هەر زاتی خۆیەتی کە

---

(١) زانای لاهووت بارۆمەر ئەم ج ـکەی داناوە، لەسەر هەمان واتا جۆن ڕای(١٦٩١ز) کتێبێکی بە ناونیشانی(حکمە الرب کما تتجلی فی أفعال الخلق)داناوە. پاشان ویلیام بالی(١٧٤٣-١٨٠٥) کتێبەکەی (اللاهوت الگبیعي) بلاوکردەوە.

لە ڕێی یاساکانی سروشتەوە پەیوەندی نێوانیان ڕێکدەخات، واتا دەرک بە گونجاندنی (مذهب الطبائع) بکەن لەگەڵ ویستی خوداییدا.

ئاشتبوونەوەکە ئەوکاتە بەدی دێت کاتێك دەکەوینە ناوەندی هەردوولا، لایەنێك کە نکوڵی لە سروشت و هەست دەکات، کە لاساییکەرەوەکان تیایدا نقومبوون، لایەنێکیش کە سروشت و هەستی پیرۆز دەکات، کە ماددیگەراکان تیایدا نقوم بوون. حەق ئەوەیە کە هەردوولا تێکەڵ بە یەکتر بکرێن:

﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٥٣﴾ ﴾ فصلت: ٥٣.

واتە: ئێمە لەمەوپاش بەڵگەو نیشانەکانی خۆمانیان لە جیهان و لە نەفسی خۆیانا پیشان ئەدەین تا بۆیان دەرکەوێ قورئان ڕاستەو کەلامی خوایەو لە خواوە هاتووەتە خوار بۆسەر پێغەمبەر. ئاخۆ بەس نییە بۆئادەمیزاد بۆ گێڕانەوەی لە گوناهو لە بێفەرمانیی خوا ئەمە کە خوای تۆ ئاگای لە هەموو شتێ هەیە؟).

ئایەتەکە بۆمان ڕووندەکاتەوە کە هەست (سَنُرِيهِمْ) و سروشت (ٱلْءَافَاقِ وثَمَرَٰتٍ) دەبنە دەرگایەکی فراوان بۆ باوەڕ. واتا بەڵگەکانی خوایەتی لەبیرکردنەوە لە سروشت سەرچاوە دەگرن.

هەر ئەوەیشە مامۆستاکەمان دکتۆرە (يمنى الخولى) لە بانگەوازەکەیدا (نحو علم كلام جديد) بانگەوازی بۆ دەکات.

هەر لەو بارەیەشەوە فەیلەسوفی گەورە (محمد ئيقبال) دەڵێت: (ئەفلاتون بۆ سوکراتی مامۆستای بە وەفابوو و وەك ئەو تانەی لە هەست داوە؛ چونکە هەست لە دیدی ئەودا ئاماژەیە بۆ گومان نەك یەقین. ئەمە زۆر دوورە لە ڕێساکانی قورئان کە بیستن و بینین بە نیعمەتەکانی خودا لەسەر بەندەکانی هەژمار دەکات).

لە پرۆژەی ئاشتەواییەکەشدا؛ پێویستە ئایین دیدی هزریی بۆسروشت درووست بکات، لە بابەتێکی هەستی و ویژدانییەوە بیکاتە بابەتێکی عەقڵی

زانستی، بۆ ئەوەی ڕابوونی ژیارستانیەت و گەورەیی ئوممەت بگێڕێتەوە، ئەو پڕۆژەیە لە جیهانی ئیسلامیدا لەسەدەی نۆزدەیەمەوە وەستاوە.

لە ڕاستیدا ململانێی ڕاستەقینە کە ڕووبەڕووی موسوڵمانی سەردەم دەبێتەوە و هەرگیز خودا بەوە ڕازی نابێت خەمساردی تێدا بکرێت، ململانێیەکە لەگەڵ بیروباوەڕ و فەلسەفەکانی دژی ئیسلامدا نییە، بەڵکو ململانێیە لەگەڵ لەشکری چاوچنۆکی سروشت، بۆ نەهێشتنی نەزانی و هەژاری و پەککەوتەیی و نەخۆشی، کە لە هەمان کاتدا ململانێیە لە پێناو دەست درێژنەکردنمان بۆ خواردن و پۆشاک و دەرمانی کەسانی تر.

## نموونەیەکی بەپێز بۆ ئاشتەوایی و نوێگەری خەلقی مرۆڤ لە نێوان زانست و قورئاندا :

ئاسمان ئەگەر وایش دەربکەوێت کە هەورە بەهۆی بەربڵاوی هزری ئایینی لاساییکەرەوەی چەقبەستوو و بەهێزی لایەنگرانی بۆ بەرگریکردن لێی، ئەوا گۆڕەپانەکە خاڵی نییە لە عەقڵی ڕۆشن کە لەپێناو ئایندەی ئیسلام و ئایندەی ڕۆڵەکانی بێدارن. ئەزهەری پیرۆزیش بە میانڕەوییەکەی شوێنێکی لە نێو ئەو عەقڵانەدا داگیرکردووە، بۆیە لێرەدا هەڵوێستێك باس دەکەم کە ڕۆشنبیری هزری هەندێك لە پیاوانی ئەزهەر دەردەخات، پێچەوانەی ئەوەی هەندێك کەس ڕەواجی پێدەدەن بە تانەدان لەم دامەزراوە بەهێز و پیرۆزە:

پرسی خەلقی مرۆڤ یەکێکە لە پرسە گەرمەکان کە ململانێی تێدا دەردەکەوێت لە نێوان زانستی نوێ، کە لەئێستادا بەبەڵگە پەیڕەوی لە چەمکی پەیدابوونی مرۆڤ لە ڕێی پەرەسەندنەوە دەکات، لەگەڵ هزری لاساییکەرەوە(مقلد) کە پەیڕەوی لە چەمکی خەلقی تایبەتی دەکات، بەپێی تەفسیرە کلتورییەکان بۆ ئایەتەکانی خەلق لە قورئانی پیرۆزدا . هەرکاتێ هەوڵێك دەردەکەوێت بۆ هاوئاهەنگکردنی چەمکی زانست و چەمکی کلتوری بۆ خەلقی مرۆڤ،

لاساییکەرەوەکان نارەزایەتی دەردەبڕن، گاڵتەی پێ دەکەن، تەنانەت ئەو کەسە کافریش دەکەن کە هەوڵ دەدات ئەو کارە بکات. بەڵام هەندێك لە کەڵەپیاوانی ئەزهەر بابەتییانە بەرامبەر بەو پرسە مامەڵە دەکەن، کە دەچنە سەر مێژووی هزری ئیسلامی ڕۆشن، مسوڵمانان بۆ چەند سەدەیەکی دواتر شانازی بەو لاپەڕانەوە دەکەن، فەرموو ئێستاش هەڵوێستەکان:

• د.عبدالصبور شاهین[1] (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لە ساڵی ١٩٩٨ز کتێبی (أبي آدم، قصه الخلقيه بين الأسطوره و الحقيقة)ی بڵاوکردەوە، تیایدا چیرۆکی خەلقی مرۆڤی باسکردووە، بەو جۆرەی کە خۆی لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز تێگەیشتووە، تیایدا بەڕاشکاوی باسی لەوە کردووە کە ئایەتەکانی قورئان ئاماژەیان تێدا هەیە بۆ ئەوەی کە مرۆڤ لە بوونەوەرێکی سەرەتایی بۆ بوونەوەرێکی عەقڵی پەرەی سەندبێت.

دوای ئەوە لایەنگرانی قوتابخانەی تەقلیدی چوار دۆسیەیان لەسەر کردەوەو داوای ئەوەیان دەکرد کە تەکفیر بکرێت! بۆیە دادگا داوای لە کۆڕبەندی توێژینەوە ئیسلامییەکان کرد کە ڕای خۆیان لەسەر کتێبەکە بڵێن، کۆڕبەندەکەش لیژنەیەکی زانستی پێکهێنا بۆ لێکۆڵینەوە لە کتێبەکە، دوای ئەوە ڕاپۆرتی خۆیان پێشکەش کرد، کە لەگەڵ خۆی و کتێبەکەیدا دادگەری و عەقڵ سەرکەوتن؛ لە ڕاپۆرتەکەدا هاتووە[2]: (لیژنە هیچ ڕەخنەیەکی لەسەر ئەو مەنهەجە نییە کە نووسەر پەیڕەویکردووە؛ چونکە ئامانجی لێکۆڵینەوەکەی دیاریکردووە، بەوەی کە هەوڵێکە بۆ تێگەیشتن لەو دەقانەی لەبارەی ڕووداوەکانی چیرۆکی خەلق لە قورئانی پیرۆزدا هاتوون، هەروەها هەوڵێکە بۆ هاوئاهەنگکردنی وێناکردنی قورئانی و ئاڕاستەی زانستی (زانستەکانی بایۆلۆجیا و جیۆلۆجیاو ئەنترۆپۆلۆجیا) لە وێناکردنی ژیانی مرۆڤایەتی لەسەر ئەم زەمینە. لەبەر ئەوە

---

(١) د.عبدالصبور شاهین: (١٩٢٩-٢٠١٠ز) مامۆستای زمانی عەرەبی لە کۆلێژی (دار العلوم و الضليع في علوم القرآن).

(٢) چیرۆکی جەنگی لەسەر کتێبی (أبي ادم) و ڕاپۆرتی کۆڕبەندی توێژینەوە ئیسلامییەکانم لە کتێبەکەمدا (كيف بدأ الخلق) لا٣٢٣-٣٢٦ مكتبه الشروق الدوليه- الطبعه الثلاثة - ٢٠١٣ باسکردووە.

مادام ڕەچاوی پیرۆزی دەقەکان بکرێ و، پێچەوانەی پایەیەکی ڕاشکاوی ئایین نەبێت و، مادام بۆچونێکی عەقڵییەو ڕێز لە لۆژیك دەگرێت و پاڵپشتی لە باوەڕی باوەڕداران دەکات بەوەی کە کتێبی خودا دەکرێ نهێنی وای تێدا بێت کە لەدیدی زانایان ون بووبێت، دەکرێ خودا خۆی — سبحانه — ڕێگا بەوە بدات کە هەندێك لەو نهێنیانە ئاشکرا ببن و بینایی ڕۆشن ببێتەوە...))

نووسەر بۆچوونەکەی لەم قسەیەیدا کۆکردۆتەوە، کە دەڵێت: خەلقی مرۆڤ لە قوڕەوە دەستی پێکردووە، واتا لە شێوەی پرۆژەیەکی مرۆیی، پاشان خودا کردوویەتی بە وەچە

﴿ .. مِن سُلَٰلَةٍ مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ﴿٨﴾ ﴾ السجدة: ٨.

واتە: (لە پوختە و خولاسەیەك دروستی کردووە لە ئاوێکی سووك و بێ بایەخ).

پاشان تەواوکردن و ڕۆح بەبەرداکردن، لە کۆتایشدا بوو بە (مرۆڤ). بە تێپەڕبوون بەو قۆناغە مێژووییە دوورودرێژانەدا...

لیژنەکە وای نابینێت کە ئەوەی نووسەر نووسیویەتی ئەوەندە هەوڵدان بێت بۆ پەککستنی قسەی زانست و ئایین، بەو ئەندازەیەی کە وەك هەوڵێك دەردەکەوێت بۆ تێگەیشتن لە دەقی قورئان، لیژنە لەگەڵ هەندێك بەشی ئەو هەوڵە هاوڕا نییە.

بەڵام لە هەمان کاتدا لیژنە واینابینێت کە نووسەر لە تەئویلکردنی دەقەکانی قورئاندا ئەوەندە سنووری بەزاندبێت کە پێچەوانەی نەگۆڕەکانی بیروباوەڕ بێت یان دژی زانراوێکی ئایین بێت.

لیژنەکە باوەڕی وایە پێویستیمان بەم جۆرە نەوەیەی مسوڵمانان هەیە بۆ بەردەوامی هەوڵدان و کۆششکردن و چاوگێڕان بە ئاسۆ و دەروونەکاندا و، ڕۆیشتن لەگەڵ پێشکەوتنە زانستییە گەورەکاندا کە شێوازی ژیانی خەڵکی گۆڕیوە، لەم سەردەمەدا کە خەریکە مرۆڤایەتی ماڵئاوایی لێدەکات، ئەمەش بە ئیجتیهادی بەردەوام و فیقهێکی نوێکراوە و دیدگایەکی وردبین دەبێت بۆ

پێداویستییەکانی خەڵك، کە لەئێستادا بەزوویی دەگۆڕێت(بە گۆڕانی شوێن و کات و بارودۆخ). بۆ ئەوەی هەموو ئەمانە بە شێوەیەکی سروشتی لە ڕێی مەنهەجێکی زانستی ئوسوڵی وردەوە ئەنجام بدرێن، کە تیایدا لێکۆڵەر پێچەوانەی هیچ لە نەگۆڕەکانی عەقیدە یان شەریعەت نەجوڵێتەوە و، بە هیچ جۆرێك سڵ نەکاتەوە لە وتنی حەق بە شێوەیەکی بێلایەنانە (ڕاستگۆیی و بوێری).

لێرەدا ڕاپۆرتی لیژنەکە تەواو دەبێت، خودا پاداشتی بەخێری ئەندامانی بداتەوە لەسەر چاکەیان بەرامبەر بە زانست و عەقڵ و ئیسلام.

• د.حسن حامد عطیه[1] کتێبی(قچیه الخلق)ی ساڵی ١٩٩٩ز بڵاوکردەوە، تیایدا پەیڕەوی لە چەمکی(پەرەسەندنی بایۆلۆجی ئاڕاستەکراو)کردووە، کە ئێمەش پەیڕەوی لێ دەکەین و لە تەوەرەی شەشەمی ئەم کتێبەدا باسمان کردووە، هەروەك چۆن خۆی داوە لە قەرەی تەئویلکردنی ژمارەیەك لە ئایەتە قورئانییەکان کە دەربارەی خەلقن، بەڵام لەژێر ڕۆشنایی چەمکی پەرەسەندن، لە جیاتی تێگەیشتنی باو دەربارەی خەلقی تایبەتی.

د.عبدالمعطي البیومي، ڕاگری کۆلێژی (أصول الدین - جامعة الأزهر)، هیچ هەڵدژییەکی نەبینییەوە لە نێوان هەوڵەکانی د.حسن حامد و نەگۆڕەکانی بیروباوەڕ، تەنانەت پێشەکیشی بۆ کتێبەکە نووسیوە و تیایدا هاتووە: ((خوێنەری ئەم کتێبە گومانی لەسەر ڕاستی باوەڕی نووسەرەکەی بۆ دروست نابێت، چونکە نووسەر بەردەوام پەروەردگاری بەرز ڕادەگرێت و هەموو کارێك و خەلقیش دەداتە پاڵ خودا، بۆ ساتێکیش لە سەلماندنی فراوانی زانستی خودا و دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا درێغی ناکات، هەمیشە شایەتی بۆ توانا و زانستی خودا دەدات لە خەلقدا و نموونە دێنێتەوە بە فەرموودەی پەروەردگار:

﴿ إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾ ﴾ القمر: ٤٩.

---

(١) د.حسن حامد باعطیە: مامۆستای زانستەکانی بایۆلۆجی و پەرەسەندن.

واتە: (بەڕاستی ئێمە هەموو شتێکمان لەسەر ئەندازەو هەڵسەنگاندن و بەپێی حیکمەتێك دروست کردووە).

لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز لە ژێر ڕۆشنایی بیردۆز و زانستەکان دەربارەی خەلقی مرۆڤ و ئاژەڵ و پەیوەندیان بە یەکترەوە لە قۆناغەکانی سەرەتای خەلقدا لێکداوەتەوە.

لەوەدا دەبینین کە ئێمە هەندێ کات لەگەڵیدا هاوڕاین و هەندێ کاتیش ڕای جیاوازمان هەیە، ئەمەش شتێکی ئاساییە مادام ئێمە خەریکین تەفسیری مرۆڤێك بۆ قورئانی پیرۆز دەخوێنینەوە، لەگەڵ تەسلیمبوونێکی تەواو لە لایەن ئێمەو نووسەر و خوێنەریش بە یەکسانی بە دەقی پارێزراوی قورئان لە هەڵە و بە بیروباوەڕە ئیسلامیە سەلمێنراوەکان و بە قورئانی پیرۆز، کە هەڵەی تێگەیشتن و تەفسیرەکان هیچ شتێك لە ڕاستی و درووستی کەمناکەنەوە، چونکە ئەم قورئانە لە زاتی خۆی دا ڕاستەو لە ڕێگای سەلماندنیشیدا هەر ڕاست و درووست دەمێنێتەوە.

((لەوەتەی قورئانی پیرۆز دابەزیوە، هەر سەردەمەو دیدێکی نوێ بۆ قورئانی پیرۆز هەبووە، بە پێی ڕۆشنبیری باوی سەردەم و کرانەوەی ئاسۆکانی زانست و زانیاری، هەرکەسێکیش کە قورئانی پیرۆز دەخوێنێتەوە بەو ئەندازەیەی خودا تێگەیشتن و زانست و ڕۆشنبیری و زانیاری دەربارەی کاروبارەکانی ژیان پێبەخشیوە لێی تێدەگات، ئەوە لە قورئان وەردەگرێت کە خۆی هیدایەتی پێ وەربگرێت یان هیدایەت بدرێت یان کەسانی تر هیدایەت بدات.

لەگەڵ ئەوەشدا قورئان بەشی هەمووان دەکات، بەهۆی گشتگیری وشەکانی و دەوڵەمەندی واتاکانی، د.مۆریس بۆکای[1] لە کتێبەکەیدا ((دراسة الكتب المقدسة في ضوء المعارف الحديثة)) سەرنجمان ڕادەکێشێت بۆ ئیعجازی قورئانی پیرۆز و

---

(١) Maurice Bucaile : (١٩٢٠-١٩٩٨ز) پزشکێکی فەرەنسی، مەسیحی بوو، پاشان بوو بە مسوڵمان. چەند کتێبێکی هەیە لەسەر پەیوەندی نێوان قورئانی پیرۆز و زانست و مێژوو، هەروەها چەند دانراوێکی هەیە لەسەر کەسایەتی فیرعەون. بۆکای هەردوو زمانی عەرەبی و هیرۆگلۆفی دەزانی.

پێمان دەڵێت کە تاکە کتێبی ئاسمانییە تەنانەت تاکە هەڵەیەکی زانستیشی تێدا نییە، ئەمەشی بۆ ئەوەی گێڕاوەتەوە کە قورئان - بە پێی قسەی ئەو - نەچۆتە ناو وردەکارییەکانەوە، بەڵکو حەقیقەتەکانی بە شێوازێکی گشتی خستۆتەڕوو کە بەشی هەموو عەقڵێك دەکات و دەرگاش بۆ ئیجتیهاد واڵادەکات، لەگەڵ ئەوەشدا لەگەڵ حەقیقەتە زانستییەکاندا یەکانگیر دێتەوە)).

((هەروەها مادام بیرۆکەکانی کتێبەکە لەسەر باوەڕهێنان بە بەدیهێنەر وەستاوە و دان بە پیرۆزی ئەو دەقەدا دەنێت، ئەوا دوای ئەوە کێشە نییە ئەگەر مرۆڤ لە لێکدانەوەکەیدا هەڵەبکات یان نەیپێکێت)).

((بۆیە ئێمە ئەوە دەزانین بەستنەوەی تەفسیری قورئان بەبیردۆزە زانستییەکان لەلای زۆر کەس جێگای مەترسین، نەوەك بیردۆزەکە هەڵبوەشێتەوە و باوەڕ بە حەقیقەتی دەقە قورئانییەکە بلەرزێت، بەڵام ئێمە وایدەبینین کە ئیجتیهاد - هەرچۆنێك بێت - بۆ تێگەیشتن لە دەق جیاوازە لە دەقەکە، بۆیە ئەگەر هەڵەیی ئەو بۆچوونەش بسەلمێنرێت، ئەوا کێشەیەك نییە و شتێکی ئاساییە؛ چونکە دەقەکە هەر لە پێگەی خۆی دەمێنێتەوە؛ لەمەشدا تەفسیری زانستی لەگەڵ تەفسیرەکانی تردا جیاواز نییە.

بە درێژایی سەردەمەکان، موفەسیرەکان زۆر تەفسیری جیاوازیان بۆ قورئان کردووە و هەیانە ڕاست دەرچووە و هەشیانە هەڵە، بەڵام قورئان سەرەڕای بۆچوونە جیاوازەکان هەروەك خۆی ماوەتەوە، با تەفسیری زانستیش یەکێك بێت لەو تەفسیرانە، وەك تەفسیرەکانی تر ڕاست و هەڵەی تێدابێت، قورئانیش هەر وەك خۆیی و بێ هەڵەو پەڵە دەمێنێتەوە)).

((ئەوەی نووسەر کردوویەتی شتێکی نوێ نییە، چونکە زۆرێك لە گەورە زانایان ڕێگایان لەبەردەم ئەم جۆرە تەفسیرانە واڵاکردووە، کۆنترینی ئەو موفەسیرانەش ئیمامی فەخری رازییە کە تەفسیرە گەورەکەی (مفاتیح الغیب) پڕە لە تەفسیری گەردوونی، چونکە لەسەردەمی ئەودا زانستی گەردوونناسی جێگای لێکۆڵینەوە و قسە لەسەرکردن بووە، بەهەمان شێوە شێخ عەلی تەنتاوی

جەوهەری، کۆلەگەی موفەسیرە زانستییەکانی سەردەمی ئێمەو، شێخ محمد فەرید وەجدی کە لەسەرووی ئەو موفەسیرانە دێت بواری پەرەسەندنیان کردۆتەوە، بەتایبەتی دڵنیاکردنەوەی ئەوەی کە بەهیچ جۆرێك دەست لە یاسایەك لە یاساکانی ئایین یان دەقێك لە دەقە پیرۆزەکانی قورئان و فەرموودە نادات و، بۆچوونەکانی (ابن مسکویه و الفارابي و ابن خلدون)مان بیردەخاتەوە لە پۆلێنکردنی جۆرەکاندا، مامۆستا (عباس العقاد)یش لەسەر هەمان ڕێگا ڕۆیشت و سەرسوڕمانی خۆی دەربڕی بەرامبەر ترسی هەندێك کەس لە بیردۆزەکەو مەترسی لەسەر ئایین، لەکاتێکدا ئایین بەرامبەر ئەو بیردۆزە و بیردۆزەکانی تریش پارێزراوە)).

((لەو سۆنگەیەشەوە پێویستە هەڵوێستمان بەرامبەر بەو بیردۆزە و ئیجتیهادەکانی تر دەمارگیری و ترس و دڵەڕاوکێ نەبێت، بەڵکو پێویستە بە شێوەیەکی بابەتییانە لێی بکۆڵینەوە و بە بەڵگەوە وەڵامی بدەینەوە و بە باشترین شێوە گفتوگۆی لەسەر بکەین، هیچ زیانێکیش لە ئایین ناکەوێت، چونکە بەم جۆرە گفتوگۆیە ئایین لە دڵەکاندا بەهێزتر دەبێت و لە عەقڵەکاندا جێگیرتر دەبێت و هەڵەیی و ڕاستی ڕای خاوەنەکەی هیچ کاریگەرییەکی بەسەرەوە جێناهێڵێت)).

خودا لەسەر زانست و ئیسلام پاداشتی خێری د.عبدالمعگی البیومي بداتەوە.

• د.محمد عمارة (بیرمەندی ئیسلامی و سەرنووسەری گۆڤاری الازهر)داوای لە د.عمرو شەریف (نووسەری ئەم کتێبە کرد)، کە کتێبێکی سادە لەسەر بێباوەڕی (الإلحاد) بنووسێت، بۆ ئەوەی وەك دیاری پاشبەند لەگەڵ گۆڤارەکە دابەش بکرێت، کتێبەکە کە دەرچوو بە ناونیشانی (وهم الإلحاد) لەگەڵ ژمارەی موحەررەمی ١٤٣٥کۆچی گۆڤارەکەدا، کتێبەکە ژمارەیەك چەمك دەخاتەڕوو کە پێچەوانەی بیرکردنەوەی لاساییکەرەوەی کلاسیکین بۆ بەرپەرچدانەوەی بۆچوونی بێباوەڕان و دەرخستنی پەیوەندی نێوان زانست و ئایین، لەوانە دانان بە پەرەسەندنی ئاڕاستەکراوی بایۆلۆجی، کارایی هۆکارەکان، ڕۆڵی مێشك لە هەستە ڕۆحییەکاندا و هی تر.

سەرەڕای ئەوەش گۆڤاری ئەزهەر کتێبەکەی گرتەخۆ و د.محمد عمارە پێشەکییەکی بۆ نووسی کە دەوڵەمەندتری کرد و مەدحی مەنهەجەکەی کرد، بەو پێیەی کە پردێکە زانست و ئایین بە یەکەوە دەبەستێتەوە، لە پێشەکییەکەیدا هاتووە:

((ئەم کتێبە کتێبێکی زانستی ورد و قووڵە، بەڵام سەرەڕای ئەوەش ڕوون و سەرنجڕاکێشە، ئاستە زانستییە جیاوازەکانی تێدا هەیە کە هەر خوێنەرێك بە جیاوازی پێگەی زانستی و ئاستی فکرییان بەشی خۆیان لە کتێبەکە وەردەگرن کە باوەڕیانی پێ بەهێز بکەن و گومانەکانی بێباوەڕانی پێ هەڵبتەکێنن)).

خودا لەسەر زانست و عەقڵ و ئیسلام پاداشتی بەخێری د.محمد عمارە بداتەوە.

• لەوانەیە گەورە بیرمەندی ئیسلامی د.مستەفا مەحمود(ڕەحمەتی خوای لێبێت)یەکەمین کەس بێت کە چەمکی پەرەسەندنی ئاراستەکراوی لە جیهانی ئیسلامیدا خستەڕوو، کاتێك گوتی: تەنیا یەك پیت کێشەکە چارەسەر دەکات کە بریتییە لە زیاد کردنی پیتی(ی)بۆ وشەی (تطور)، کە بە واتای پەرەسەندنە، تا ببێتە(تگوير) بە واتای پەرەپێسەندن، پێش زیاتر لەچڵ ساڵ د.مستەفا مەحمود لە وتارو کتێب و بەناوبانگترین بەرنامە تەلەفزیۆنییەکەی جیهانی عەرەبی بەرنامەی (العلم و الإيمان)دا باسی لە(پەرەسەندنی ئاراستەکراو) و (پەرەپێسەندنی خودایی)کردووە.

پیاوانی ئەزهەر هیچ نارەزایەتییەکیان لەسەر ئەو خستنەڕووە دەرنەبڕی، گوێمان لە تاکە دەنگێکی نارازی نەبوو لە گۆڕەپانی ئیسلامیدا، بەڕاستی پیاوانی هزری ئیسلامی ئەوسا ئاسۆ فراوانتر و بە متمانەتر بوون لە مەنهەجەکەیانداو زیاتر ڕێزیان لە زانست دەگرت لەو دۆخەی کە ئێستا ئێمەی تێداین. بۆیە لە ڕۆژگاری د.مستەفا مەحمود گوێمان لە هزری بێباوەڕی نەدەبوو وەك چۆن ئێستا دەیبیستین.

خودا پاداشتی بەخێری کەڵەپیاوە ڕۆشنبیرەکانی ئیسلام بداتەوە لەسەر هەڵوێستیان بەرامبەر زانست و عەقڵ و ئیسلام.

**خوێنەری بەڕێز :**

گەشتی دەرچوون لە زەلکاوی بێباوەڕی و بێباوەڕان بەوە دەستپێدەکات کە دەرك بەو ئاستنزمییە بکەین کە بێباوەڕی بەرهەمی دێنێت لە ڕووی بیروباوەڕ و ڕەوشت و زانست و هزرەوە، هەروەك چۆن پێویستە ئاگاداری ئەو درۆیەی بێباوەڕان بین کە گوایە پێشکەوتنی زانستی و ژیارستانی لە ڕۆژئاوادا بەرهەمی بێباوەڕییە، تەنانەت لە دیبەیتەکانیاندا بەردەوام دەڵێن ئێمە ئەمەو ئەوەمان کردووە و، بەڵام ئێوە لە ڕووی ژیارستانییەوە دواکەوتوون!

ئەو پێشکەوتنە زانستییەی ڕۆژئاوا بەرهەمی ئەو گەورە زانایانەیە کە زۆربەیان باوەڕیان بە خودای تاقانە هەبووە، بەهەمان شێوە ئەوەی لە ژیارستانیەتی هاوچەرخیشدا هەیە لەو چەمك و ڕەفتارە ڕەوشتییە ئەرێنیانە بەرهەمی ئەو کلتوورەن کە چەمکە ئایینییەکان لەو کۆمەڵگانەدا چەسپاندوویانن.

دوای ئەوە - بۆ دەرچوون لە زەلکاوەکە - ڕۆڵی لێکۆڵینەوە بە شێوەی دامەزراوەی سێ ڕەهەندی باوەڕ دێت؛ سەلماندنی بوونی خودا و پەیوەندی لەگەڵ مرۆڤدا و هەڵبژاردنی ئایینی حەق، هەریەك لە ڕەگەزەکانی ئەم دامەزراوەیە بەڵگەی زانستی و فەلسەفی خۆی هەیە.

هەروەها نابێ لەو ڕاستییە ڕابکەین، کە گوتاری باوی ئایینیمان بەرپرسە لە بەرامبەر پەلکێشکردنی هەندێك لە لاوەکانمان بەرەو بێباوەڕی، بۆیە زەلکاوەکە بە نوێکردنەوەی هزری ئایینی و ئاشتکردنەوەی ئایین و عەقڵ و مرۆڤ و زانست و سروشت نەبێت بەتەواوی وشك نابێت.

بیرمەندی بەریتانی ڕۆب لاسێ[1] (بتپەرستی Idolatry) بەوە وەسف دەکات کە(لەبری ئەوەی لە پێناو خالق بژی لە پێناو مەخلوق بژی)[2]، پاشان لاسێ

---

(١) Rob Lacy : (١٩٦٢-٢٠٠٦ز)،ئەکتەرو بیرمەندی بەریتانی، دەقی قسەکەی لاسێ :
Living for the product interested of the producer

(٢) لەفەرموودەی دروستدا هاتووە، کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (تعس عبد الدينار

دەڵێت؛ ئەگەرچی ئێمە بۆ تەلەفزیۆن و کۆمپیوتەر ناچەمینەوە و کڕنووشیان بۆ نابەین، بەڵام زۆرکات لە پێناو ئەوشتانەدا دەژین و زیاد لە پێگەی خۆیان بەرزیان دەکەینەوە و لە دەروونماندا لە جێگەی خودا دایاندەنێین، وادەزانین کە تەواوی ئازادی لەوە دایە.

لەڕاستیدا ناتەواوی لە شتە گرنگەکاندا ئەوەیە کە گرنگترین شتی ژیان (خودا) نزم بکەینەوە و شتی تر بەرز بکەینەوە، بەم جۆرە تێگەیشتنە ماددیگەرایی جۆرێکە لە بتپەرستی، چونکە مەخلوق (سروشت) لە خالق بەرزتر دەکرێتەوە، ئەمەش بە دوو ڕێگا ئەنجام دەدرێت، یان بە نەرێکردنی خوایەتی یان بە دانانی لە دەرەوەی بازنەی کار(ئایینی سروشتی).

ئاڵدۆس هیکسلی ئاماژە بۆ ئەم واتایە دەکات و دەڵێت: ((پەیرەویکردنی مرۆڤ لە چەمکی بێباوەڕی و فەلسەفەی لەناوچوون (لەناوچوون لە دوای مردن) بە پاڵنەری گەڕان بە دوای ئازادییەوە بوو، دوای ئەوەی بەها ئاسمانییە بەرزەکانمان ڕەتکردەوە بۆ بەدیهێنانی ئازادی سێکسی، ڕەنگدانەوەی ئایینمان لەسەر سیاسەت و ئابووری ڕەتکردەوە دیسان بە پاڵنەری ئازادبوون)).

ئەگەر هەمووان باوەڕیان هەبێت، ئەوا هەر باوەڕێك لێکەوتەی خۆی هەیە، ئێمە کاتێك گەردوون لە خودا دادەبڕین،ئەوا ڕێگری لە مرۆڤ دەکەین کە بەدیهێنەری بناسێت،تا ئەو ئەندازەیەی کە مرۆڤ کۆژان و ئازارەکانی بەدەردراوی هێزەکانی سروشتی کوێرانە بزانێت،بەهۆی ئەوەی کە خراپ ڕەفتاری لەگەڵدا کردووە، واتا مرۆڤ وایدەبینێت کە تاوان و خراپیەکانی حەقی سروشتن نەك حەقی خودا.

ئەم کتێبەی بەردەستت ڕێبەری بەرەو خوداچوونە، ئەم تەوەرەیەش وەك خەرمانی کتێبەکەو خەرمانی گەشتەکە وایە، بۆیە کە خەریکین مالئاوایی لە یەکتر دەکەین ڕێگام پێ بدە کە گەشتەکە بەم وچانەی بیرکردنەوە کۆتایی پێبێنم:

---

تعس عبد القطيفه تعس عبد الخميصه تعس وانتكس و إذا شيك فلا انتقش، إذا أعطى رضي و إذا منع سخط).

**خوێندنەوەیەك لە هەردوو كتێبەكە :**

باوەڕبوون بە خودا لەسەر دوو كۆڵەگەی سەرەكی دامەزراوە: یەكەمیان بەڵگەكانی سەر خوایەتی و تاقانەیی، زانست ئەو ئەركەی گرتۆتە ئەستۆ بە خوێندنەوەی هاوچەرخانەی كە لەسەر گەردوون كردوویەتی و لەڕێی بەڵگەی گەردوونی ئەو بەڵگانەی دەرخستووە.

كۆڵەگەی دووەمیش بریتییە لە زانینی ئەو شتانەی خودا پێشكەشی هەموو بونەوەرانی دەكات، لە چاودێری و بەخێوكردن، كە زانست لە ڕێی بنەمای مرۆیی زۆرێك لە لایەنەكانی ئەم چاودێرییەی ڕوونكردۆتەوە.

پاشان، گەردوون كتێبی بینراوی خودایە، كە پێویستە فێری خوێندنەوەی ئایەتەكانی ببین، ڕێك وەك چۆن ئایەتەكانی كتێبی پیرۆزی خودا دەخوێنینەوە كە بۆ پێغەمبەرەكەی (صلى الله علیه وسلم)ناردوویەتی، بۆ ئەوەی گونجان و هاوئاهەنگی و تەواوكاری نێوانیان هەست پێ بكەین.

لەبەر ئەوە، قورئانی پیرۆز لە كاتی باسكردنی پرسی باوەڕ بۆ كتێبی گەردوون ڕێنموونیمان دەكات، بۆ ئەوەی لە دڵی مرۆڤدا بە خوێندنەوەی هەردوو كتێبەكە(قورئان و گەردوون) بەڵگەكانی خوایەتی و بەڵگەكانی چاودێری و ئاگاداربوون تەواو ببن.

سەرنجی فەرموودەی پەروەردگار بدە:

﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْـَٔافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٥٣﴾ ﴾ فصلت: ٥٣.

واتە: (ئێمە لەمەوپاش بەڵگەو نیشانەكانی خۆمانیان لە جیهان و لە نەفسی خۆیانا پیشان ئەدەین تا بۆیان دەركەوێ قورئان ڕاستەو كەلامی خوایەو لە خواوە

هاتووەتە خوار بۆسەر پێغەمبەر. ئاخۆ بەس نییە بۆئادەمیزاد بۆ گێڕانەوەی لە گوناە و لە بێ فەرمانیی خوا ئەمە کە خوای تۆ ئاگای لە هەموو شتێ هەیە؟).

لەم ئایەتەدا، پەروەردگار پێمان دەفەرموێت کە لە گەردوون(الآفاق) و مرۆڤ(أنفسهم)بەڵگەی وای داناوە کە مرۆڤەکان نەوە دوای نەوە دەیاندۆزنەوەو بە یەقینەوە بۆیان دەردەخات کە حەقە، ئەمەش بریتییە لە بەڵگەی گەردوونی لە قورئانی پیرۆزدا.

پاشان مرۆڤ پلە دوای پلە لە زانستدا بەرز دەبێتەوە تا دەبێتە زانایەکی ڕاستەقینە، بەمەش دەگاتە پلەی لەخواترسان.

﴿ ...إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُا۟.. ﴿٢٨﴾ ﴾ فاطر: ٢٨.

واتە: (.. هەر زانایان لە خوا ئەترسن...).

پاشان سەرنجی دوو ئایەتەکەی سورەتی (إبراهیم ٣٢-٣٣)بدە:

﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْ ۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْفُلْكَ لِتَجْرِىَ فِى ٱلْبَحْرِ بِأَمْرِهِۦ ۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْأَنْهَٰرَ ﴿٣٢﴾ وَسَخَّر لَكُمُ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ دَآئِبَيْنِ ۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ﴿٣٣﴾ ﴾ إبراهيم: ٣٢ - ٣٣.

واتە:(خودا ئەو خوایەیە ئاسمانەکان و ئەرزی دروست کردووە وە لە ئاسمانەوە ئاوی ناردۆتە خوارەوە، بەو ئاوە گەلێ بەرو میوەی دەرکردووە و کردونی بە ڕسق و ڕۆزی بۆ ئێوە. هەروەها کەشتی بۆ ملکەچ و دەستەمۆ کردوون، بۆ ئەوەی هات و چۆ بکات لە دەریادا بە فەرمانی خوا. ڕوبارەکانیشی بۆ ڕامکردوون تا سودیان لێ وەربگرن. خۆر و مانگیشی بۆتان ڕامکردووە بەردەوام و، شەو و ڕۆژی بۆ ڕامکردن و بۆ ژیوار پەیداکردن و بۆ حەسانەوەتان).

تێبینی ئەوەت کرد کە چۆن خودا بەڵگەکانی چاودێری و ئاگاداربوون(بنەمای مرۆیی) لە قورئانی پیرۆزدا ڕوونکردۆتەوە، لەهەمان کاتیشدا ئاڕاستەی کردووین بۆ تێڕامان و چێژوەرگرتن لە گەردوون و دەوروبەرمان، دوو ئایەتە پیرۆزەکە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە خودا:

- ئاسمانەکان و زەوی لە نەبوونەوە بەدیهێناوە.

- خۆری بۆ کردووین بە ئەستێرەیەکی نموونەیی و مانگیشی کردۆتە شوێنکەوتەیەکی نموونەیی.

- هەروەها سودەکانی شەو و ئارامییەکەی و ڕۆژ و چالاکییەکەی بۆ ڕوون کردووینەتەوە.

- هەروەها لە ئاسمانەوە ئاوی بۆ ناردووینەتە خوارەوە.

- هەروەها بەروبوومی بۆ لە زەوی دەرهێناوین.

- سامانە سروشتییە ئاسانەکانی وەك ڕوبارەکان بۆ مەیسەرکردووین.

- تەنانەت ئەوەی بە دەستی خۆشمان درووستی دەکەین بە ڕێنموونی ئەوە (وەك کەشتییەکان).

- هەروەها نهێنییەکانی یاساکانی بۆ ئاشکرا کردووین کە هێزەکانی سروشت (بە فەرمانی ئەو) بەڕێوە دەبەن.

لە کۆتایشدا سەرنجی فەرمودەی پەروەردگار بدە کە دەفەرمووێت:

﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٩١﴾ ﴾

آل عمران: ١٩٠ - ١٩١.

واتە: (ئەوانەی بە پێوەو بە دانیشتنەوەو بەڕاکشانەوە، واتە: لە هەموو حاڵەتێکدا ناوی خودا ئەهێنن و بیر لە دروستکردنی ئەرز و ئاسمانەکان ئەکەنەوەو دەڵێن: خودایە! تۆ ئەمانەت بە خۆڕایی و بێ کەڵك درووستنەکردووە، پاکی و بێخەوشی بۆ تۆیە، خوایە! تۆ لەوە دووری کە شتی بێ هودە دروست بکەیت. خوایە بمانپارێزە لە سزای ئاگری دۆزەخ. ئەڵێن: خوایە ئەو کەسەی بیخەیتە دۆزەخ ئەوە بە تەواوی ئابڕووت بردووەو ماڵوێرانت کردووە. بێگومان ئەو ستەمکارانەی ئەیانخەیتە ئاگری دۆزەخ، هیچ یارمەتیدەرێکیان نییە).

ئەم دوو ئایەتە بە جۆرێك ئایەتەکانی کتێبی گەردوونی بینراو و کتێبی قورئانی نووسراوی تێکەڵ بە یەکتر کردووە کە عەقڵ و دڵ سەرسام دەکات، ئەوە ڕووندەکاتەوە کە خوێندنەوە لە هەردوو کتێبەکە دەبێتە هۆی بەدیهێنانی باوەڕی تەواو بە خودا و ئایین.

خودا ئەوانەی بە خاوەن عەقڵ و هۆش (أولوا الالباب) وەسفکردووە، کە بیر لە بەدیهاتنی ئاسمانەکان و زەوی دەکەنەوە، پاشان ئەو کەسانە بەوە وەسف دەکات کە یادکردنی خودا و بیرکردنەوە تێکەڵ بە یەکتر دەکەن.

پاشان قورئان ڕاستەوخۆ و بە بێ دانانی هیچ ئامرازێکی لێکدەر یان پەیوەندی، بۆمان باس دەکات کە یادی خودا و بیرکردنەوە چەند ئەنجامێك بەدی دێنێت:

- باوەڕبوون بە خودا (ربّنا).

- باوەڕبوون بەوەی کە خودا بەدیهێنەرە (خلقت).

- باوەڕبوون بە حیکمەتی خودا (ما خلقت هذا باطلاً).

- پاکڕاگرتنی خودا (سبحانك).

- باوەڕبوون بە زیندووکردنەوە و پاداشت و سزا کە لە پەیامەکەیدا هاتووە (فقنا عذاب النّار).

خودا ئێمەش لەو کەسانە هەژمار بکات کە دەربارەیان فەرموویەتی (إنما یخشی الله من عباده العلماء). واتە: بەڕاستی لە بەندەکان تەنیا زاناکان بە حەق لە خودا دەترسن.

# پێرستە وشە

ئـ

## ب

**ت**

ج



ح



خ

د

## ر



## ز



## چ

## گ



## س

## ناوەڕۆك

# خورافەی ئیلحاد

ئـەم کتێبـە لـە ڕێـی دوو پـڕۆژەی فیکـری زۆر گرنـگ و هەسـتیار لـە وردێنـەی بێباوەڕیی دەکۆڵێتەوە، ئەوانیش :

١- نوێکردنـەوەی هـزری زانسـتی؛ بـە جۆرێـك زانایـان بزانـن کـە هیـچ تێکگیرانێـك لـە نێـوان زانسـت و ئاینـدا نییـە، تەنانـەت گونجانێکـی زۆریـش لـە نێوانیانـدا هەیـە، سەرچاوەکەیشی ئەوەیە کە زانستی نوێ لە ئاینەوە سەرچاوە دەگرێت.

هەروەهـا ئـەوەش بزانـن کـە گەیشـتن بـە میکانیزمەکانـی دیـاردە زانسـتییەکان لەگەڵبوونـی ئامانجێـك لـە پشـتیانەوە تێکناگیرێـت، بەمـەش لـە کۆتایـی ڕێـگادا زانسـت دەمانگەیەنێتـە ئـەوەی کـە دان بـە بوونـی خـودای بەدیهێنـەری بـوون و بەڕێوەبەر و پارێزەریدا بنێین))).

٢- نوێکردنـەوەی هـزری ئایینـی؛ بـە جۆرێـك کـە گوتارێکـی ئایینـی وا بێنێتـە کایـەوە کـە هۆکارێکـی سەرنجڕاکێشـان بێـت، دوای ئـەوەی گوتـاری بـاو هۆکارێکـی دوورخەرەوە بووە لە بازنەی باوەڕدا.

وەك پێغەمبـەر (صلـى اللـه عليـه وسـلم) فەرموویەتـی: خـودا لـە سـەرووی هەمـوو سەد ساڵێك کەسێك لەم ئوممەتەدا دەنێرێت کە ئاینەکەی بۆ نوێ بکاتەوە.

ئوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە
هەولێر - شەقامی ٣٠مەتری تەنیشت مناری چۆلی

+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice

نرخی 18.000 دینار

